


ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوی کتێب: کەشتیی فریشتەکان (کتێبی یەکەم)
ناوی نووسەر: بەختیار عەلی
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٢٥٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٣٩٦)ی سالی (٢٠١٢)ی پێدراوە.
ISBN: 978-1-63068-954-4



ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

ئەگەر من تارماییم یاخود سەراب، یان هەر خودی خۆمم، دواجار هیچ نیم جگە لە بەرهەمی خەیاڵی خۆت، خەیاڵە جۆشدار و شپرزەکەی خۆت، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە من نیم، هەر کات من لە خەیاڵی تۆدا بوونم هەبێت، وە گەر جگە لە خەیاڵی تۆ لە هیچ جێگایەکی دیکەشدا نەبم ، ئەوە مانای من لە سروشتدا بوونم هەیە و دەژیم، چونکە خەیاڵی تۆ دواجار بەشێکە لە سروشت.

لە ڕۆمانی «قەشەی ڕەش» ـی تشیخۆڤەوە

ئەو کەسەی فریشتەیەک لە ناوەوەڕا ڕۆشنیدەکاتەوە، مەرج نییە بزانێت فریشتەیەک ڕۆشنیکردۆتەوە.

تۆمای ئەکوینی

هەمووان خەون بە ژیانی ئەبەدییەوە دەبینن، بەڵام زۆربەی خەڵک ئەو ژیانە ئەبەدییەیان لە سەر زەوی دەوێت، نەوەک لە ئاسمان.

تینسی ولیامز

# پسمامان

چیرۆکی یەکترناسینی «نزار ئیدریس» لەگەڵ «لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی» مێژوویەکی درێژی هەیە. یەکەمین یەکتربینینیان دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێک بەر لە دەرکەوتنی «نەغەدە ماردینی» لە ژیانی هەردووکیاندا، ئەو دەرکەوتنەی شتێکی بنەڕەتی لە ژیانی کەسیان ناگۆڕێت، لە بەرئەوەی تا ئەو جێگایەی من لە ڕۆحی هەردووکیان شارەزابم، کەسیان لەو مرۆڤانە نین بکرێت ئاسان بگۆڕێن. فریشتەگەلێک کە لە گۆڕینی هەست و بیرکردنەوەی مرۆڤ بەرپرسن، ڕێگایان نەکەوتۆتە سەر عەرشی دڵی ئەوان. ڕەنگە خانمی ماردینیش تەنیا لەبەر ئەوە خۆشیویستبن، چونکە زانیویێتی لەو مرۆڤانە نین ئەڤین بیانگۆڕێت. هەر کەس ئەو دوو پیاوەی لە سەرەتاوە ناسی بێت، تێدەگات هەردووکیان هەموو هۆ و بەهانەیەکیان هەیە ڕقیان لە یەکتر بێت. من کە ساڵانێکی درێژ هەندێجار بەشدار و هەندێجار چاودێر و هەندێجار ناوبژیوانی ئەو شەڕە دووروودرێژەبووم کە لە نێوان ئەواندا بوو، دەبێت بڵێم، بەپێی تێبینییە سەرەتاییەکانم لە سەر مرۆڤ، وادەبینم ئەم بوونەوەرە بەدبەختەی ناوی مرۆڤە، هەردەم بەهانەیەکی زۆر و هۆگەلێکی فرەی بۆ کینە و جەنگ هەیە، دەتوانێت لەو سۆنگە و پاڵنەرانەی ناشێت وەک بەهانەی جەنگ تەماشابکرێن، شەڕ بەرپابکات، زۆرجاریش بۆ ڕقی درێژ و ململانێی بێکۆتا هۆیەکی پێویست نییە. لەزەتبردنیشی لە هەوای سەرکەوتن و

بینینی شکستی ئەوانیدی، هۆکەی تەنیا ترسی دێرینی مرۆڤ نییە لە مرۆڤ، بەڵکو سووربوونێکی ترسناکە لە سەر بینینی گەورەیی و بڵندیی خۆی لە سەر حیسابی نزمێتی و بچوکی ئەوانی تر. مرۆڤ دەتوانێت بێهیچ بەهانەیەک، بێهیچ هۆکارێک بچێتە جەنگی گەورەوە. سەرەتا من یاریدەدەری «لیڤیتانت هۆمەر» بووم لە بەندیخانەی «پسمامان». من لە مانگی ٥ ی ساڵی ١٩٧٤ دا بۆ یەکەمجار لیڤیتانتم ناسی، ئەوکات من وەک هەزاران قوتابی کوردی دی دەستم لە خوێندنی زانکۆ هەڵگرت و چوومە ریزی شۆڕشەوە... بڕێکی زۆری خوێندکارانی هاوڕێم چوونە دیوی ئێران و لە ئۆردوگاکانی سەر سنوور نیشتەجێبوون، من ئێوارەیەکی باراناویی و تۆف لە بنکەیەکی پێشمەرگە ناوی خۆم نوسی و داوامکرد بمنێرن بۆ جەنگ. ئەو پیاوەی کە لە سەر مێزەکە دانیشتبوو، کەسێکی کەتەی بەخۆوە بوو، گەرچی هێشتا هەوا ساردبوو، بەڵام ڕانکوچۆغەیەکی شاڵی خۆڵەمێشی لەبەردابوو، جامانەیەکی سووری قووتی بەستبوو، یەک لە سەر یەک چای تۆخی بە قەندی ئێرانییەوە دەخواردەوە، سەیرێکی منی کرد، ئەو کات جورمێکی لاوازم بوو، لەڕ و بێهەیبەت دەردەکەوتم. کابرا چاویلکەیەکی پزیشکیی پانی لە چاودا بوو، چاوە کزەکانی بە ڕوونی لە پشت شوشەکانەوە دەبینران، بێئەوەی زۆر بیربکاتەوە گووتی «ها پێم بڵێ، تۆ عەرەبی دەزانیت... عەرەبی دەزانیت یان نا؟ تۆ بە کەڵکی شەڕ نایەیت، یان بڕۆ بۆ ئێران، یاخود دەتنێرم بۆ بەندیخانەی پسمامان، لەوێ لیڤیتانت هۆمەر کەسێکی دەوێت خوێندەوارییەکی باشی هەبێت و عەرەبی بزانێت. بەوەدا تا سێی دانیشگات خوێندوە دەبێت عەرەبییەکی باش بزانیت... وانییە، دەیزانیت یان نا؟». دەنگی کابرا بە ناو شریخە و چەخماخەی ڕیزێک هەورەگرمەدا گەیشتە گوێی من. ئەوە یەکەمجارم بوو ناوی لیڤیتانت هۆمەر ببیستم. من بە دەنگی بەرز بە کابرای شاڵپۆشم گووت «بەڵێ قوربان... بەڵێ... عەرەبی دەزانم».

کابرا قومێکی لە دیشلەمەکەی دا، بەڵام ئەمجارە بە چەشنێک گەرم بوو، هەستمکرد زبانی داغانکرد. بەتوڕەییەوە چاکەی تفکردەوە سەر زەوییەکەی بەردەمی و دەستیکرد بە جنێو و زیقەزیق، کەسێک لە دەرەوە بە پەرداخێک ئاوی ساردەوە هات و کابرا دوای چەند هاوار هاوارێکی درێژ بە منی گووت «برۆ... برۆ لە دەرەوە چاوەڕوان بە. سەعاتێکی تر جێبەکەی پسمامان دێت. ئێستا برۆ، هەر ئێستا پێشمەرگەیەک پەیدا دەکەم لەگەڵت بێت». ڕۆژێکی بێئەندازە تاریک و تۆف بوو، لەو ڕۆژە باراناوییانەی بەهار، کە تیشکێک نییە جوانییەکمان بۆ ڕۆشنبکاتەوە، ڕۆشنییەک لە ئاسماندا نییە مرۆڤ لە ڕێگایەوە هەست بە ئومێد بکات، زەویش بە چەشنێکی ترسناک نەرم دەبێنواند. هێند باران باریبوو وام هەستدەکرد گەر چەند ڕۆژێکی دی بەوجۆرە ببارێت سەرتاپای دونیا وەک ئیسفەنجێکی ڕزیوی لێدێت و چیتر ناکرێت بە سەر زەویدا برۆین. من لە ڕۆژانی بارانی درێژدا ئەو هەستە ترسناکەم هەبوو کە بشێت چیاکان وەک کڵۆ خوێیەکی ڕەش بتوێنەوە و ئێمە لە ناو لیتەیاندا بخنکێین. ئەو ڕۆژە ئاسمان بێوەستان توڕەیی بە سەرماندا ڕۆدەکرد. ڕێگاوییانەکان زۆربەیان خاڵی و چۆڵ بوون. پێشتر ناوی گوندی پسمامانم نەبیستبوو. کە گەیشتینە ئەوێ جگە لە ژمارەیەک ماڵی پەرتەوازە، هیچی دیم نەبینی. هەندێک سەگ بە کەساسی پێمان وەڕین... دڵنیابووم لە بەر بارانی وا بێوچان و لە ژێر ئەو هەموو چەخماخەیەدا غەریزەی سەگەکان تین و تاوی ڕۆژانی ئاساییان نەمابوو. پسمامان وەک زۆربەی گوندەکانی تری وڵات لە جێگایەکی عاسیدا بوو، ئاشکرا ئەوەی پسمامانی لەوێدا دروستکردبوو کەسێک بووە ترساو لە هەموو دونیا. گوندەکە بنکەیەکی بچوکی پێشمەرگە و زیندانێکی گەورەی شۆڕشی تێدابوو. بینای بەندیخانەکە کۆنە مەخفەرێکی پۆلیس بوو کە پێدەچوو چەند جارێک لە قەوارەی پێشووی خۆی گەورەتر کرابێت. تاکە بینایەک بوو لە بەردی

سپی و چیمەنتۆ بێت، هەتا مزگەوتی بچوکی گوندەکە لە بلۆک و دارەڕا و چینکۆ بوو. بینای زیندانەکە لەو ڕۆژەدا گەلێک غەمگین دەینواند... دوو پاسەوانی خەواڵوو پێشوازیان لێکردم و یەکێکیان بە هەنگاوگەلێکی خاو بەرەو ژووری لیڤیتانت پێشمکەوت. کە چوومە ژووریٚ، ئەو لە فانیلەیەکی بێقۆڵی سپیدا، لە نزیک سۆبایەکی گەورە خەوتبوو، هەموو گیانی نیشتبووە سەر عارەق. ژوورەکەی بە جۆرێکی ترسناک کونبڕ بوو. ژوورەکە تاکە پەنجەرەیەکی بچوکی تێدابوو، ئەویش هەوابڕ بە دەڵقێکی تەلّغ گیرابوو. کە لە سەر سەری وەستام، گەنجێکی کەڵەگەت و سمێڵ ڕەش و باریکم بینی، قژی بە جۆرێکی سەیر بۆ دواوە هەڵدرابووەوە. کاتێک لە ژوور سەری بووم، وەک جۆرە هۆشێکی نهێنی و نەزانراو کە لە خەوتنیشدا بە ئاگایە ڕایوەشاندبێت، بە جوڵەی پیاوێکی دوژمندار ڕاپەڕی و دەم و دەست پەلاماری چەکەکەی دا و ڕوویکردە من. بێئەوەی بترسم یان بجوڵێمەوە تەماشامکرد و گووتم «ئێوارەتان باش، جەنابی لیڤیتانت».
وەک شەرم لەو پەرچە کردارە خێرایەی خۆی بکات، دەمانچەکەی دانا و دەستێکی قووڵی بە قژە ڕەشە پڕەکەیدا هێنا و بێئەوەی سەیری من بکات، دەستێکی خستە سەر ناوچاوانی و گووتی «ئێوارەت باش»... هەستمکرد خەونێکی ناخۆشی دیبێت، بەڵام بە دەنگێک وەڵامیدامەوە وەک لە مێژبێت بمناسێت. گووتم « لە بنکەی سەرەکییەوە ناردویانم تا لێرە ببم بە یاریدەدەری تۆ». ئەو هێشتا خەیاڵی لای ئەو داخورپان و ڕاچڵەکینە لە ناکاوە بوو کە دەرکەوتنی کتوپڕی من لە ژوورەکەدا خولقاندبووی. بە دەنگێکی گڕ و خەواڵوو گووتی «ئاە یاریدەدەر... یاریدەدەر. یاریدەدەرێکی ترمان کەمبوو. واهەستدەکەن هەموو کەس پێویستی بە یاریدەدەرە. گەر یاریدەدەری وەرە ئەسپە نەخۆشەکان بکوژین». وام هەستکرد بەشێکی هۆشی هێشتا لە خەودایە. گووتم «من لێرەم بۆ ئەوەی کاروباری زیندانەکەتان لەگەڵدا هەڵسوڕێنم... هەر

شتێک کە دەشێت بنوسرێت، من بینوسم، لە وەرگرتنی شەهادەتی زیندانە عەرەبەکاندا کۆمەکتانبکەم». بە سەرسامییەوە گوتی «زیندانی عەرەب؟ زیندانی عەرەبمان لا نییە». کە هەستا پیاوێکی کەڵەگەتم بینی، نێرێکی بێئەندازە جوان، کەسێکی باریک بە قژێکی ڕەشی چڕ و دوو چاوی گەورەوە. هێشتا عارەقەی خەوی پێوەبوو. بە دەستەسڕێکی سپی کە لە ژێر سەرینەکەی دەریهێنا، پشتملی سڕی و بە دەنگێکی بێزار، وەک دەنگی ئەو پاسەوانانەی بەیانیان زوو لە خاڵەکانی پشکنیندا دەوەستن، گوتی «تۆ ناوت چییە، کێ تۆی ناردوە بۆ لای من؟». وەک ئەوەی دیل بم و لە تۆماری زینداندا خۆم ناونوسبکەم، گوتم «ناوم وەفا ڕەفعەتە... بە وەفای ڕەفعەت بەگ بانگمدەکەن. خوێندکاری پۆلی سێهەمی دانیشگای بەغداد، کۆلێژی ئەدەبیات، بەشی عەرەبی بووم. کە شۆڕش دەستی پێکردەوە بڕیارمدا دەست لە خوێندن هەڵبگرم و بێمە ڕیزی پێشمەرگەوە. لە بنکەی حاجی باهیر، پیاوێکی شاڵ لەبەر ناردمی بۆ لای تۆ، شاڵێکی خۆڵەمێشیی لەبەردا بوو، شاڵێکی خۆڵەمێشی... ئیتر لەوە زیاتر هیچی تر نازانم». لەبەرخۆیەوە گوتی «ئێستا زۆربەی ئەو کوڕی قەحبانە بە هاوین و زستان شاڵی خۆڵەمێشی لەبەردەکەن... سەیر نییە ئەویش ئێستا شاڵی خۆڵەمێشی لەبەربکات، ها سەیر نییە». بە پەلە خۆی گۆڕی، شەرواڵ و مراخانییەکی ڕەشی لەبەرکرد و گوتی «باشە بەخێربێیت. تۆ ئیشێکی زۆرت نییە. کاری سەرەکیت ئەوەیە گوێ لە من بگریت... گوێبگرە وەفا... وانییە، ناوت وەفا نییە؟ گەر یەکێک لەو کوڕی قەحبانە تۆی ناردوە تا بزانێت من لێرە چی دەکەم، پێمبڵێ. من ناتوانم بێهۆ دەرتبکەم، بەڵام گەر هاتوویت بۆ ئەوەی بزانیت بارودۆخی زیندانییەکان لە چیدایە، قسەبکە... بۆ ئەوەی لەگەڵ یەک ڕێبکەوین». من بە دەنگی بەرز گوتم «هیچ کوڕی قەحبەیەک منی نەناردوە بۆ ئێرە. پیاوێکی شاڵ لە بەر ناردمی بۆ ئێرە، نازانم

گەر کوڕی قەحبە بێت یان نا... هیچ کەس بە چاویدا دیار نییە کوڕی قەحبەیە یان نا». ئەو وەڵامە لە سەرەتاوە جۆرە ڕێزێکی قووڵی لە نێوان من و ئەودا دروستکرد، ڕێزێک ساڵانێکی دوورودرێژ ژیا و بەرگەی چەندین گۆڕانکاری گەورە گەورەی دونیای گرت. دوای بێدەنگییەکی کەمێک سەنگین و درێژ، پشتێنەکەی بەست و بە ئەسپایی گوتی «باوەڕت پێدەکەم... بە ڕاستی باوەڕت پێدەکەم».

دوایی چووین بۆ ئەوەی ئەسپەکان بکوژین.

لە کادانێکی گەورەدا پێنج ئەسپ و هێسترێکی نەخۆشمان بینی، پێکڕا بە جۆرێکی سەیر لەڕ بووبوون، دیمەنێکی ترسناکیان بوو، پێدەچوو بە دەست دەردێکی ناوازەوە بناڵێنن، زگیان بە شێوەیەکی ترسناک هەویکردبوو، چاویان وەک چاوی ئەو کەسانەی دەبرێن بۆ تیرباران دەرپۆقیبوو. لیڤیتانت بە خۆی و تفەنگێکەوە پێش من کەوت و گوتی «دەردێکی ترسناک لە ناو ڕەشەوڵاغاندا بڵاوبۆتەوە... گەر نەوەستێت زیانی زۆر لە شۆڕش دەدات، زۆربەی کۆمەک و هیمدادی ئێمە بۆ سەنگەرەکانی پێشەوەی شەڕ، بە هێستر و گوێدرێژ و ئەسپ دەچێتەڕێوە... دەبێت هەموو ئەسپ و هێسترێکی نەخۆش بکوژین. ئاژەڵی نەخۆش وەک مرۆڤی نەخۆش سوودێکی ئەوتۆی نییە. ئێمە لە شۆڕشداین، دەبێت شتە سوودبەخشەکان هەڵگرین». دوایی ماوەیەک بێدەنگ بوو و بێئەوەی سەیرمبکات، گوتی «مرۆڤی لاواز ناتوانێت لێرە بژی... کەسی زەعیف ناتوانێت لەگەڵ مندا کاربکات، زیندانی پسمامان ناوبانگی خۆی هەیە و دەبێت ئەو ناوبانگەی بمێنێت. کە منیان نارد بۆ ئێرە، بۆ ئەوەبوو ناوبانگی زیندانەکە ڕزگاربکەم. بەڵام ئێستا کۆمەڵێک بێشەرەف، کەسانێک کە نازانن واجیبی ئێمە چییە، دەیانەوێت بە ناوی ئینسانییەتەوە لێرە دەرمانپەڕێنن. بەڵام سەرەتا دەبێت ئەم ئەسپە نەخۆشانە بکوژین، بۆ ئەوەی دەردەکەیان بڵاونەبێتەوە... دەبێت هەموو

ئەم ئەسپە نەخۆشانە بكوژین».

بێئەوەی بوەستێت، چووە سەر یەكێك لە ئەسپەكان و كلاشینكۆفەكەی خستە سەر پێ و دەستی پیادا نا و تەنیا یەك فیشەكی تەقاند. گوللەكە لە نێوچاوانەوە ئەسپەكەی سمی و خوێنێكی كەمی لێهات. من بێئەوەی بەزەییم بە ئەسپەكەدا بێتەوە، سەیری ئەو جوڵە لاواز و نائومێدەی چوارپەلیم كرد كە كەمێك بەرزیكردنەوە و وەك لە ئازارێكی گەورە رزگاری بووبێت، خاو هێنانییەوە سەر زەوی. لیڤیتانت كلاشینكۆفەكەی بۆ درێژ كردم و گووتی «بەوجۆرە، هەموویان بكوژە... بەوجۆرە، ترس و دوودڵی ناوێت».

من كەسێكی رۆمانسی نەبووم، لەو رۆشنبیرانە نەبووم كە دەچنە شۆرشەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە ئازارێكی گەورەی ویژدان رزگاربكەن، لەوانەی ئەودەم بە لێشاو دەهاتنە ریزی شۆرشەوە تا خۆیان لە گوناهێكی نادیار پاكبكەنەوە، تا بیسەلمێنن كوری میللەتن. لەوانەش نەبووم لە شۆرشدا خۆیان لە دەزگاكانی راگەیاندندا دەشاردەوە، دەیانەویست لە دوورەوە ژیانی شۆرش بژین... من لێرەبووم بۆ جەنگ، بۆ كوشتن، بۆ تەقەكردن. شۆرش لای من بە مانای یەكەم ئامادەگی بوو بۆ خوێنرشتن. بە هەستی جەنگاوەرێكەوە كە لە خوێن ناترسێت، بێئەوەی هیچ بڵێم تفەنگەكەم وەرگرت و بە شێوازی ئەو، بێئەوەی ترسێك نیشانبدەم یان دەستم بلەرزێت، یەك دوای یەك، بە ئارامی و سەبرێكی وەستایانەوە ئەسپەكانم كوشت. پێدەچوو لیڤیتانت چاوەرانی ئەوەی لە من نەكردبێت، وەك منداڵێكی شاری منی بینیبێت لەوانەی شۆرش دوور بە دوور سەیدایاندەكات، بە هێمنی و بە خەندەیەكەوە گووتی «بەوجۆرە بە دڵمیت... بەدڵمیت... گەر دەتەوێت تەماشای ئەسپە كوژراوەكان بكەیت و ببینیت مەخلوقاتە بێكەڵكەكانی خودا چۆن گیان دەسپێرن، كەمێك لێرە بمێنەرەوە. من ئارەزوویەكی زۆرم هەیە،

سەیری هەموو شتێکی مردوو بکەم... مەخلوقات لە کاتی ئازار چەشتن و مردندا ڕوخسارێکی تریان هەیە، زۆر حەزدەکەم سەیری چاویان بکەم... بەڵام من کارم هەیە... کارم هەیە و دەبێت بڕۆم».

وەک ئەوەی ئیشێکی گرنگم جێبەجێکردبێت، بە شانازییەوە بە لیڤیتانتم گووت «منیش دێمە دەرێ... دێمە دەرێ... نامەوێت لێرە بمێنمەوە».
لیڤیتانت بە خێرایی پێشمکەوت و گووتی «ئەوەی لە مردووەکاندا ڕقم لێیەتی ئەوەیە، هەندێکیان زۆر بە یادەوەرییەوە دەنووسێن، یادەوەری تاکە جلێکی پیسی ئینسانە ناتوانێت زوو زوو بیشوات، بەڵام من لە خەیاڵمدا سندوقێکی ڕەش و داخراوم هەیە، هەموو مردوەکان فڕێدەدەمە ئەو سندوقەوە».

ئەوە سەربوردی سەعاتی یەکەمم بوو لەگەڵ لیڤیتانتدا. ئەوکات نەمدەزانی ئەو پەیوەندییەی لەم ڕۆژە تۆفانەدا دروستبووە، ژیانێکی دوورودرێژ لەگەڵمدا دەژی... سەربوردی ئەویش وەک چیرۆکی نەوەیەکی لێدێت هەرگیز ئەوەندە هێمن نازین، بتوانن بێ ئازاری ڕۆژانە، شەوان بە ئارامی بخەون.

# دەربارەی منداڵی نزار ئیدریس

ئاخۆ منداڵان لە سەر سروشتی باوانیان دروستدەبنەوە؟ هەر کەس بیەوێت چیرۆکی سەردەمێکی درێژ بگێڕێتەوە، دەبێت کەم تا زۆر وەڵامی جۆرە پرسیارێکی وەها بداتەوە... نا من لەوانە نیم کە هەر شتێک لە ژیانی گەورەکاندا ڕوودەدات، بیگێڕمەوە بۆ کاریگەریی پەروەردەی سەرەتایی و دوای ئەو خورافەتە گەمژانەیە بکەوم کە دەڵێت هەر چی بەڵایەک مرۆڤ لە نەوەدساڵیشدا بە سەر خۆی و ئەوانی دیدا دەیهێنێت، ڕیشەکەی لە

یەکەم سالانی سەرەتای ژیانیدایە. گەر بتوانن ئەم چیرۆکە تا کۆتایی بخوێننەوە، رەنگە رووونتر بزانن باس لە چی دەکەم. مرۆڤ بوونەوەرێکی لەوە ئالۆزترە، بکرێت بۆ وەها رەوت و کلێشەیەک کورتبکرێتەوە. دیارە ئالۆزییەکەی لەوەوە نەهاتووە کە ماشینێکی بێخەوش و سەنعەتێکی سروشتی بێگەردە، نا.. تەواو بە پێچەوانەوە. من وەفای رەفعەت بەگ، کە ئێستا لەو پەڕی نائومێدییەوە ئەم چیرۆکە دەگێڕمەوە، وادەبینم کە مرۆڤ بوونەوەرێکی ناتەواوە، ماشینێکە لە کارخانەیەکی ساختەکار دەرچووە، دروستکەرێکی هەیە بە مەبەست یان بێ مەبەست پڕیکردوە لە کەموکورتی ترسناک، بە جۆرێک گەر ورد بڕوانین دەبینین توانا و هێزی مرۆڤ بەراورد بە سەختی ئەو دونیایەی تێیکەوتووە، شایەنی پێکەنینە. نا من زۆر گاڵتەم بەوانە دێت کە ئەگەر منداڵ لە ژینگەیەکی بەددا گەورەبوو، لە بابێکی سەرخۆش و چەقۆکێش، بەڵام دواتر بلیمەت دەرچوو، دەڵێن بلیمەتییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو منداڵییە سەختەی، بۆ ئەو ژینگە دڵڕەقە کە توانا و ئیرادەی تێدا خرۆشاندوە، بەڵام هەمان منداڵ گەر ببێتە پیاوکوژ، هەمان تیورەساز و هەمان دەستە لە پزیشکانی عەقڵ و دەروون دەڵێن، ئەوە دەرەنجامێکی سروشتییە، کەسێک لە دایک و بابێکی وەها بووبێت، هەر دەبێت جۆرە پیاوکوژێکی وای لێدەرچێت. نزار ئیدریس نمونەی ئەوجۆرە مرۆڤە بوو کە شتێکی لێدەرچوو تەواو جیاواز لە دایک و باوکی.

منداڵیی نزار لەو منداڵییە سارد و غەمگینانەبوو، کە گێڕانەوەی دەتوانێت دڵی هەموومان تەنگبکات. منداڵیی نزار، دابەشبوونێکی قووڵ و گەورەیە لە نێوان باوکێکی مەلادا کە لە بڵندگۆی مزگەوتی گەڕەکەوە بەردەوام پڕ بە ئاسمان هاواردەکات، شەڕ بە کۆلان و هەور و ئادەمیزادان دەفرۆشێت، دەقیرێنێت، کەف دەردەدات، لە سەر مینبەر دەبووڕێتەوە، فەتوا دەردەکات، خەڵک دەخاتە گریان. ئەم دونیایە لەگەڵ دونیای دایکیدا

کە بەردەوام بە ناسکی گۆرانی دەڵێت و لە سەرەخۆ لە ناوماڵەکەدا سەمادەکات، هیچ شتێک گۆیان ناکاتەوە. باوکی پیاوێکی بێوێنەبوو لە باڵابەرزی و کەتەییدا، لەو جۆرە نیوە دێوانەی کاتێک بە ڕێگادا دەڕۆن بە حوکمی هێزی هەنگاو و سەنگی لەشیان، شتەکانی نزیکیان دەلەرێنەوە. مەلا ئیدریسی ئەستێی، لەو دیندارە ڕەشپەرستانەیە کە لە گەنجییەوە دەتوانن بە نیگا و قسە و تێڕوانینە ئەخلاقگەراکانیان هەستی ترس و پیری لە دەوروبەری خۆیاندا بچێنن، لەوانەی بەلاغەتێکی وەها شەیتانیان هەیە دەتوانن وابکەن بۆ ئەوەی کارێکی بەدیشمان کردبێت، خۆمان بە ئەهلی دۆزەخ و بە شایستەی سزای خودا ببینین. بەردەوام جبەیەکی ڕەشی درێژی لەبەردا بوو، مێزەرێکی سپی لە شیفۆنی تەنک دەبەست. شیفۆنێک لە سەری ئەودا هەموو نازکی خۆی لە دەستدابوو، لەبری ئەوەی ویقاری بداتێ، ترسناکتر و سامدارتری کردبوو. دەنگێکی وەها گڕ و گەورەی هەبوو، لە کاتی وتاری دینیدا نەوەک تەنیا شیشەی بڵندگۆکانی دەلەراندەوە، بەڵکو شوشەی پەنجەرەکانی گەڕەک، چلچرای هەڵواسراو بە سەقفەکاندا دەلەرێنێتەوە و دەیانهێنێتە جوڵە. کەسێک بوو دەیتوانی هەموو شتێک بترسێنێت، ژنە بچوک و بێجورمەکەی نەبێت کە بەردەوام مەلای وەک کەسێکی لاواز دەبینی کە لە ترسی شتێکی نادیار هاواردەکات و دەقیرێنێت و بە ناوی خوداوە کینە بە بادەدا. لە منداڵییەکی زووەوە شەڕێکی گەورە لە نێوان مەلا ئیدریس و پەریسا خاندا لە سەر شێوازی پەروەردەکردنی منداڵەکە بەرپادەبێت، شەڕێک کەم و زۆر لە هەموو خێزانێکدا هەیە، دەرەنجامەکەشی شتێکە، جیاوازترە لەوەی شەڕکەران چاوەڕوانیدەکەن. دایکی دەیویست منداڵەکە لە جیهانی مزگەوت و دونیای خوتبە ترسناکەکانی باوکی دووربخاتەوە و بیخاتە بەر خوێندنێکی ئاسایی کە تێیدا کوڕەکە هەست نەکات قەرزێکی بەرامبەر دونیا لە سەرە. ئێستا ماف بە خۆم دەدەم، بڵێم هەر لە بنەڕەتەوەرا

پەریسا خان ویستویێتی کوڕەکەی بۆ ژیانێکی ئاسایی دوور لە هەموو ترسێک ئامادەبکات، شتێک لە بوێری تێدا بچێنێت کە دواتر لە ناخی نزاردا بە ڕێگایەکی چەوتدا تێپەڕی بێت. ڕەنگە هۆی ئەو خواستە قووڵەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خانمی دایک، بێدینی و ژیانی سادە و ئاسان وەکو یەک تەماشادەکات و پێکەوە گرێیاندەدات. پەریسا خان باوەڕی وابوو، دەتوانێت بێئەوەی پێویستی بە هیچ مەلایەک یاخود دینێک بێت، بژی. هەڵبەت گەر دوور بڕوانین دەشێت بێدینی گەلێک مانای هەبێت، لە چەند پلەیەک و چەند ئاستێک دروست بووە. جگە لە ئەزموونی خانم من لە ئەزموونی خۆشمەوە تێدەگەم کە بێدینی مانای بێخودایی نییە. خانمی پەریسا خانمێکی بێدین بوو، بێئەوەی بێخودا بێت... سەیر لەوەدایە کە ئەو هیچ شێوە پەیوەندییەکی لە نێوان دین و خودادا نەدەدۆزییەوە. ڕەنگە پێتان سەیر بێت گەر بڵێم خانمی پەریسا خودای بە تاکە پشت و پەناش بەرابەر زوڵمی دینداران دەزانی، پێشی وابوو، بەشی هەرە زۆری دینداران دوژمنی هەرە گەورەی خودان. بۆ ئەوەی لەو حاڵەتەش تێبگەین، دەبێت شتێک لە ژیانی ڕاستەقینەی پەریسا بزانین، کە ئەگەرچی خانمێکی بچکۆلانە بوو، بەڵام ناسکی و وردییەکی سیحراوی هەبوو، دەنگی مۆسیقایەکی نەرم و نەغمەیەکی هێمنی وەهای تێدابوو، وایدەکرد مرۆڤ چاوانی لێکنێت و تەنیا گوێبیستی ئەو ئاوازانە بێت کە لە گەروی دێنە دەرێ. نزار باڵای باوکی و ناسکی ڕوخساری دایکی بە ئیرس بۆ دەمێنێتەوە، وەک پەریسا خانیش دەنگخۆش و چەپەنەی بوو. چیرۆکی شووکردنی پەریسا بە کەسێکی وەک مەلا ئیدریس بە سەرهاتێکی سەیرە. مەلا و پەریسا خان لە مایسی ساڵی ١٩٥٦ دا لە گوندێکی نزیک مەهاباد یەکتر دەناسن، وەلێ بەڵگەنامەی زەماوەندیان دۆکۆمێنتێکی دەوڵەتی پادشاهی عێراقە. چیرۆکەکە وەک بیستوومە بەمجۆرەیە، مەلا ئیدریس کە لە

باب و باپیرانییەوە مەلازادەبووە، بە فەرمانی بابی دەکەوێتە گەشتێکی درێژ بە تخوبی کوردستانی خۆرهەڵاتدا تا بۆ خۆی کیژی «خێزانێکی ئیماندار» بخوازێت. پێدەچێت ئەوە خەونێکی دێرینی بابی بووبێت تا تاقانە کوڕی ببێتە نەسیبی خێزانێکی ئاینی و مەلازادە، بەوەدا بابی ڕای وابووە کوردانی عێراق تاعوونی فەسادێکی بێچارەیان لە ناودا بڵاوبۆتەوە و بە سوڕێکی شەیتانی مێژووی خۆیاندا دەڕۆن. بۆ ئەوەی خانەوادەی خۆی لە ئاگری ئەو فەساد و پیسییە بپارێزێت، ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکات تێشوو هەڵگرێ و تا کیژی خانەوادەیەکی مەلازادە نەخوازێت، نەگەڕێتەوە بەم وڵاتەدا، چونکە وەک ئەو گووتوویێتی لە نێو ژنانی مەملەکەت و شاری خۆیدا داوێنێک بە پاکی نەماوە و هەر کیژێک ئەو بیکاتە هاوسەر، ناتوانێت دڵنیابێت کە پێشتر دەستی دی بەرنەکەوتووە و لێوی دی نەیگەستووە. ئیدریس کە تازە بە تازە خوێندنی ئاینی تەواوکردوە و تەیارە بۆ وەرگرتنی کاری مەلایی لە جێگایەکی وڵاتدا، وەک بابی ئەو گومانە قووڵەی لە ژن و کچانی مەملەکەت هەیە و بە ئومێدی دۆزینەوەی خانمێکی پاکیزە، کە پێشتر پەنجەی هیچ کەسێکی بەرنەکەوتبێت و لێوی کەس نەیگەستبێت، لە سنووری سەردەشتەوە ئاودیوی ئێران دەبێت و دەست بە سەفەرێکی درێژ و پڕ نائومێدی دەکات. مەلا ئیدریس خەونێتی دەستی بگاتە کیژی یەکێک لە مەلا ناودارەکان، یان کیژی ئیمام جومعەی یەکێک لە شارە گەورەکان... لە هەموو شارەکانی خۆرهەڵات لادەدات، دەمێنێتەوە، دەچێتە مزگەوتەکان، لە پشت ئیمامە ناودارەکانەوە سوژدەدەبات و هەڵدەستێتەوە، خۆی لە ئیمام جومعەکان نزیکدەکاتەوە، بەڵام قەڵافەتێکی هێند بڵند و دەنگێکی وەها بەرز و جووتێک چاوی وەها سامناکی هەیە، هەر خانمێک دەیبینێت گەرچی بە هەیبەت و باڵای سەرسام دەبێت، بەڵام دەمودەست توندی و دڵڕەقییەکی وەهای تێدا دەخوێنێتەوە، دەترسێت و خۆی ناداتە دەست

جۆرە وەسوەسەیەکی وەها، شوو بە پیاوێکی لەمجۆرە بکات.

ئیدریس شار دوای شار نائومێدی خۆی تاقیدەکاتەوە. پێدەچێت لەو گەشتەوە ڕقی لە ژن و گومانی لە ئادەمیزادان گەورەتربووبێت... هیچ شتێک لە کینەی پیاوێک ترسناکتر نییە کە جار دوای جار ژنان نائومێدیبکەن. گەشتی مەلا ئیدریس بە خۆرهەڵاتی نیشتیماندا دوو ساڵ دەبات، لەو سەفەرەدا داوای دەستی دەیان خانمی مەلازادە دەکات کە پێکڕا بە حورمەتەوە داوای قەبوول ناکەن و بەهانەشیان ئەوەیە کە «لەبەر شوو لە شاری خۆیان سەفەر ناکەن». دواجار لە گەشتی گەڕانەوەدا، مەلا لە یەکێک لە گوندە بچوکەکانی دەوروبەری مەهاباد لادەدات تا شەوێک پشوبدات. لەو شەوەدا لەماڵی مەلای گوند، پەریسا دەناسێت کە کیژێکی دەنگخۆش و گورجە و بە جلێکی شۆڕی خانمانی ئەوێوە لە ماڵدا هەڵدەسوڕێ. ئەو شەوە لە نێوان مەلا مەسعودی بەسیری باوکی پەریسا و مەلا ئیدریسدا گفتوگۆیەکی بێوێنە و قووڵ دادەمەزرێت، سەبارەت بە پرسیارێکی گەلێک پێچاوی و ئاڵۆز «ئایا ئینسان بەبێدینی لە دایک دەبێت یاخود بە ئیمانداری». مەلا ئیدریس ڕای وایە کە خودا هەموو ئادەمیزادان بە ئیمانداری دروستدەکات و دواتر بە کاریگەری فیتنە و فریوی دونیا مرۆڤ لە ئیمان وەردەگەڕێت. مەلا مەسعودی بەسیری بە پێچەوانەوە ڕای وایە، خودا هەر لە ئەزەلەوە هەندێ مرۆڤ بە بێدینی دروستدەکات، بەڵگەشی پەریسای کیژی خۆیەتی کە هەر لە منداڵییەوە هیچ تێگەیشتنێکی بۆ دین و هیچ تیشکێکی ڕەسەنی ئیمان لە دەرونیدا نییە. مەلای بەسیری بە ڕوونی دەڵێت «ئیمان حاڵەتێکی دەرونییە، مرۆڤ کە دێتە دونیاوە دەشێت قابیلییەتی کوفری لەگەڵ خۆیدا هێنابێت یاخود نا». مەلا ئیدریسیش سوورە لە سەر ئەوەی ئیمان تۆوێکی خوداییە و لە دەرونی هەموو مرۆڤێکدا هەیە، بەڵام ئاودان و خزمەتکردنی لە سەر مرۆڤەکانە. لەو

شەوەدا مەلا ئیدریس بە دەنگە زلەکەی بە بابی پەریسا دەڵێت «گەر ئێوە کیژی خۆتان بە من ببەخشن و بە مێرد قەبووڵمبکات، وادەکەم ئەو تۆوی ئیمانە ئەزەلییە لە دڵیدا سەوزبێت و ئێوەش لە بەردەم باری تەعالادا پاک و ڕووسور دەربکەون». پەریسا ئەو شەوە بە پێکەنینەوە، وەک فریشتەیەکی ڕۆحسووک دەڵێت «مەلا ئیدریس، شووت پێدەکەم، بۆ ئەوەی بزانیت ئینسان دەتوانێت بێ دین بژی و هیچ عەیبێکیشی نەبێت».

هەر کەسێک لە ئێمە لەو ساتەوەختەدا لەوێ بایە دەیگووت «ئەم خانمی پەریسایە گرەوێکی دۆڕاو دەکات». مەلا لە هەموو ڕوویەکەوە لەم کچە ناسک و باریکە بەهێزتر دەردەکەوت، کیژەکە شارەزاییەکی لە زانستە دینییەکاندا نەبوو، بەڵام باوەڕی وابوو باوەڕهێنان بەدین بێ بناغەیەکی پێشینە لە دەروندا ناژی و دەبێتە هەستێکی درۆزن. بەڵام خانمی ناسک، هێزی شادیی و ژیان لە دەمارە بچوک و لە خوێنە گەرمەکەیدا وەها بەجۆش بوو، لە خۆی ڕادەبینی ڕۆژێک لە ڕۆژان مەلا بخاتە سەر کەڵکەڵەکانی خۆی و جبەی پێ فڕێبدات و کارێکبکات لە یەکێ لە شارە گەورەکاندا پیشەیەکی نوێ بدۆزێتەوە. مەلا هەر شەوی یەکەم هەستێکی تێدا دروستبوو کە ئەم ئەزموونە شتێکی نوێ و سەختە کە بە دووری نازانێت شەیتان کلکێکی لە یارییەکەدا هەبێت، تا زەفەر بە ئیمانی ئەو بەرێت. بەڵام پێی شەرمبوو دوای دوو ساڵ بێ ژن بگەڕێتەوە بۆ لای شار و خانەوادەی خۆی... ئێستا بوونی ژنێک لە ژیانیدا لە هەر شتێکی دی گرنگتر بوو، دەیتوانی بۆ لادانی ئەو شەرم و ئابڕووچوونە هەموو شتێک بکات، هەتا ئیمانی خۆشی بنێتە بەر تاقیکردنەوەوە. بەوجۆرە ژن و مێردایەتی ئەو جووتە لە جەنگێکی هێمنەوە دەستی پێکرد، کە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا بووە یارییەکی ئاڵۆز. بەوەدا مەلا هەم زل و هەم دەنگ بەرز و بێڕەحم بوو، دەبوو پەریسای ناسک

لە شەوی یەکەمەوە چەکە نهێنییەکانی خۆی بخاتە کار. دڵتەزێنترین چەکی خانمێکیش ئەوەیە نەهێڵێت لە شەوی بوکێنیدا مێردەکەی ئاسان دەستی بۆ بەرێت. ئەوە چەکێکە لە هەرە چەکە کوشندەکان، گەر هوشیارانەش بەکاربێت، ئەنجامی بێوێنەی لێدەکەوێتەوە. لە جۆرە کرداری وەهاوە سەری سندوقێکی عەجایەب هەڵدەدرێتەوە، کە دەشێت هەموو شتێکی تێدابێت، هەموو دەردێک و هەموو دەرمانێک، زۆر نهێنی گەورەی پاشەڕۆژ و زۆر ڕێزی گەورە و زۆر گومانی قووڵ. دەبێت بزانین کە پەریسا لەوە ئاگادار بووە کە مەلا ئیدریس دوو ساڵە شارە و شار بۆ ژن دەگەڕێت، ئەو دۆخەی خوێندۆتەوە کە چ چاوەڕوانییەکی شێتانە و چ حەزێکی نێرانەی کڵپەکردو لە دەمارە ئەستوورەکانیدا بووە، لەو شەوەدا بەر لەوەی بهێڵێت پەنجەی بۆبەرێت، سوێندێکی بە خودا و بە ئیمان و بە تەلاق لێوەردەگرێت، بۆ ئەوەی بیخاتە سەر ئیمانی خۆی نابێت توندوتیژی و زەبر بەکاربهێنێت، هەر کاتیش دەستی بەرزکردەوە و ئەزێتی ئەویدا ژن و مێردایەتیان بەتاڵ بێت و کاریان بەیەکەوە نەمێنێت. مەلا ئیدریس جگە لەوەی بەو مەرجە ڕازی بێت، چارێکی نییە... ئەوە لە سەرەتاوە تا کۆتایی قەڵغانێکی ئەستوور بۆ پەریسا دروستدەکات، بتوانێت دڵخۆش، ئازاد، بێغەم لە ماڵدا گۆرانی بڵێت و سەمابکات و پێویستی بە هیچ ئیمانێک نەبێت.

هەر لە سەرەتاوە خانمی ناسکی سابڵاغی، بە مێردە زلەکەی گووت «کە خیانەت ناکەم، لە بەرئەوە نییە ئاین پێمدەڵێت «زینا مەکە»، بەڵکو من خۆم نامەوێت خیانەتبکەم. کە دزی ناکەم، لە بەرئەوە نییە دیانەت دەڵێت «دزی مەکە»، بەڵکو پێویستیم بە دزی نییە. کە کەس ناکوژم لە بەرئەوە نییە ئاین دەڵێت «پیاومەکوژە»، بەڵکو خۆم حورمەتێکی گەورەم بۆ ڕۆحلەبەران هەیە».

شەڕی درێژی نێوان مەلا ئیدریس و پەریسا لە شەڕی نێوان هەنگێکی

بچوک و دێوێکی گەورە دەچێت. پەریسا هیچ نییە جگە لە هەنگێکی بزۆک و بەجوڵە کە بەردەوام بەدەوری دێوێکی گێژدا دەسوڕێتەوە... ئەو دەفڕێت، گۆرانی دەڵێت، بەدەوری خۆیدا شادی بڵاودەکاتەوە، بە گۆرانییەکانی مەلا مەستدەکات، ئارەزووی دەجوڵێنێت، شەهوەتی دەخاتە جۆش، تورەیی خاودەکاتەوە، وادەکات ئارامتر قسەبکات... بە جۆرێک مەلا هێدی هێدی هەستدەکات، هێندەی قاچی دەخاتە ئەم دیوی دەرگای ماڵ و ڕوو لە خێزانی خۆی دەکات دەبێتە مرۆڤێکی دیکە، دەبێتە کەسێکی جیاواز کە پێویستی بە ویقار و هاواری دەرەوە نییە. مەلا ڕۆژ دوای ڕۆژ دەگاتە ئەو بڕوایەی، ژنەکەی ئەو تاکە مەخلوقێکی دونیایە پێویستی بە هیچ شەرعێک و یاسایەک نییە، چونکە ئەوەی خودا لە مرۆڤی داوادەکات، خودا بە جۆرێکی نهێنی لە ئاکاری ئەم خانمەدا نوسیوێتی، ئەو جوانییە کەسانی دی بەزەبری ئیمان و بە دەستکرد لە خۆیاندا دروستیدەکەن، خانمی سابڵاغی بێ زۆر لە خۆکردن، بێئەوەی پێویستی بە ڕێسا و شەریعەت بێت، لە ئەزەلەوە لە ڕۆحیدا نەخشکراوە. بەڵام مەلا کە دەڕواتە دەرێ، کە دەچێتە سەر مینبەر، کە دەست بە خوتبەدان دەکات چ ئاگرێک ناتوانێت لە ماڵەوە دایگرسێنێت، چ ئیمانێک ناتوانێت لە ماڵەوە جۆشیدات، چ تورەییەک لە ماڵەوە خامۆشیدەکات، لەوێ هەمووی دەردەهاوێتە دەرێ و بە دەنگێکی گڕکانئاسا، وەک هاواری دڵێکی بریندار دەیکات بە ئاسماندا. خوتبەکانی مەلا ئیدریس پڕدەبن لە تورەیی گەورە، لە تۆمەتبارکردنی دونیا بەبێ دینی، لە ناڵین و شەکوا لە بڵاوبونەوەی کوفر، لە بانگهێشت بۆ کوشتن و وێرانکردن. بەرامبەر ئەم هاوار و نەڕەوازییەی مەلا، پەریسا لە ماڵەوە لە کاتی چێشت لێنان، کاتی نانکردن، کاتی قاپشۆرین، کاتی گسکدان، هەردەم گۆرانی دەڵێت... هەتا ئەو کاتانەش کە مەلا لەگەڵ پەریسادا دەخەوێت، ئەو لە جیاتی ناڵەونرکەی ژنانە بە ئاوازێکی نەرم گۆرانییەکانی خۆی دەبێژێت.

لە کاتی خەویشدا مەلا هەمیشە لە دەنگی گۆرانی ئەو بەئاگادێتەوە و دەبینێ ژنەکەی بە خەوتنەوە لە جێگاکەیدا دانیشتووە و گۆرانی دەڵێت، یان بەدەم خەوەوە ژوورەکان دەگەڕێت و ئاوازەکانی دەچڕێت و هیچ هاوارێکی ئەو بێداری ناکاتەوە.

نزار لەو پێکدادانە سەیرەدا گەورە دەبێت، لە بەریەککەوتنی دەنگی ناسک و ئەفسوناوی دایکی، لەگەڵ دەنگی توڕە و جەنگاوەرانەی مەلا.... ئەو بەرهەمی پێکدادانی دوو دونیایە... دواتر کیمیای نهێنی ئەو دوو دەنگە هەمیشە بەدوای نزارەوە دەبن.

منداڵیی نزار، منداڵییەکی ئاسان نەبوو، باوکی سووربوو لە سەر ئەوەی بیبات بۆ مزگەوت و وابکات گوێی لە وتارە ئاگرینەکانی خۆی بێت، دایکیشی سووربوو لە سەر ئەوەی فێری گۆرانی بکات. گەر بە زۆری دایکی نەبایە مەلا نەیدەویست کوڕەکەی هەر بچێتە قوتابخانە، کە زانستی کافرانی تیادەخوێنن، لەوێ دۆزینەوەی ڕووبەری سێگۆشەیەک لە دۆزینەوەی خودا بە گرنگتر سەیردەکرێت. بەڵام پەریسا بە مێردەکەی گووت «مردنم پێ باشترە، لەوەی دایکی منداڵێک بم نەچۆتە بەر مەدرەسە... بە خودایەک من دەیناسم و تۆ بەو جیق و فیق و فیغانەت دڵی عالەمی لێدەتۆرێنیت، ئاگر لە خۆم بەردەم لام ئاسانترە لەوەی نزار بەبێ فێربوونی حیساب و ئینگلیزی لەم دونیایەدا بژی». بەڵام سەردانی مەکتەب ئەو ئەرکەی لە کۆڵی نزاری منداڵ نەکردەوە، ڕۆژانە چەند سەعاتێک لە حەوشی مزگەوتدا بمێنێتەوە و لە پاکردنەوەدا کۆمەکی باوکی و مجەوەری مزگەوتەکە بکات و لە سەر لێواری حەوزی مزگەوتیش، لە گەڵ سەیرکردنی ماسییە گێژ و وەڕزەکاندا، گوێ لە هەموو وشەیەک بگرێت کە پیاوانی ئیماندار لە سەر ئاین و زیندەگی و گوناهـ دەیگۆڕنەوە. زانینێک دواتر کۆمەکیدەکات، گەلێک گاڵتەجاڕانە سەیری دونیا بکات.

بە تێپەڕینی کات، مەلا ئیدریس گەیشتە ئەو بڕوایەی پەریسا و ئەو

مەخلوقی سەر یەک ئەستێرە و مرۆڤی یەک دونیا نین، هەر یەکەیان سەر بە بەرێکی گەردونن و لە بەشێکی دووری دونیاوە هاتوون. هەر یەکێکیان نوێنەری شتێکی جیاوازی ئەم سەر زەمینەن. لە بەرئەوە جگە لەوەی جیهانی ماڵەوە و دەرەوەی خۆی بە تەواوی جیابکاتەوە چارەی نەبوو، لە ماڵەوە تەسلیمی ئەو دەنگ و مۆسیقا سیحراوییەی خانم دەبوو، لە دەریشەوە دەبووە ئەو ماشێنە بێڕەحمەی لە سەر خودا گەورە و بچوکی دەخستە بەر شکایەت. مەلا هەر زوو وازی لەوە هێنا لە دڵی پەریسادا بە دوای ڕیشەی ئیمانێکی نهێنی و خەوتوودا بگەڕێت، ژیانی خانەوادەگی لەگەڵ پەریسادا لە زۆر ڕووەوە ئاسایی بوو، سەرسامبوو بەم ژنەی لە کاتی «جیماع»یشدا هەر گۆرانی دەڵێت. ئەوەی مایەی نیگەرانی هەردووکیان بوو نزار بوو، کە هەر یەکەیان بە هێمنی بۆ دونیای خۆی ڕادەکێشا و زۆرجاریش ئەو ڕاکێشانە منداڵەکەی لە ناخەوە دەخستە بەر مەترسی پارچەپارچە بوون، بەڵام چما مرۆڤ جگە لە پارچەپارچەبوون دەروازەی تری هەیە. ژیانی نزاریش لە نێوان جیهانی قووڵ و بێبڕانەوەی ئاوازەکانی دایکی و هاوارە ترسناکەکانی باوکیدا دابەشبوو کە هەتا بانگ هەڵدانەکانی بە جۆرێک توند و توڕەبوو، لەوە نەدەچوو ئیمانداران بۆ لای خودا بانگبکات، بەڵکو وەها دەهاتە گوێی وەک هەڕەشەی پەلامارێکی خودایی نزیک بۆ سەر ئادەمیزادان بخوێنێتەوە. نزاری منداڵ ڕۆژ دوای ڕۆژ هەر دوو ئەو دونیا جیاوازە دەباتە ناو خۆی و دواتر بە جۆرێکی تایبەتی دەیبەخشێتەوە بەئێمە. کاتەکانی نزاری منداڵیش لە نێوان ماڵەوە و خوێندن و مزگەوتدا بە جۆرێکی ئەندازەیی وەها دابەشدەبن، دواتر ئەو دابەشبوونە سەیرەی نزارمان لە نێوان ژن و سیاسەت و بازاڕدا پیشاندەداتەوە. لەو منداڵییە زووەوە هەستدەکات کە کۆمەڵێک هێزی نهێنی لە ناوەوە داگیریانکردوە، بێئەوەی لێیان بترسێت، یان خۆی بشارێتەوە، یاخود بچێتە جەنگەوە

لەگەڵیاندا، تەسلیمی هەموویان دەبێت، هەر زوو نەفرەتێکی نهێنی و قووڵی بەرابەر ئەو سێ کوچکە کلاسیکییەی «ماڵ، مەکتەب، مزگەوت» تیا سەوزدەبێت، لە بری ئەوان سێکوچکەیەکی شەیتانی تر دادەڕێژێت، سێکوچکەی «ژن، حیزب، بازاڕ». لەو تەمەنە زووەوە خۆی دەداتە دەست هەموو ئەو دەنگە نادیار و بەهێز و نهێنیانەش کە دواتر بێهیچ هۆیەک یان بەهانەیەک یان سیستمێکی دیاریکراو، لە دەرونیدا دەدوێن و دەردەکەون. بەڵام لە ناو هەموو ئەو جەنجاڵییەدا، شتێک کە هەمیشە وەک شەپۆلی ئەفسوناویی دەیبات و لە ڕۆحەوە بێشەرمییەکی روونی تیا دەجوڵێنێت، خۆنەدۆزینەوەیەتی لە نێوان مۆسیقا ئەفسوناوییەکەی لێوی دایکی و هاوارە ترسناکەکانی گەرووی باوکیدا.

# لە زیندان

لیڤیتانت شەوی یەکەم ژوورێکی تایبەتی لە زیندانەکەدا بۆ جیاکردمەوە و وەک بیرم بێت بە هێمنی پێیگوتم «کاک وەفا، ئێمە لێرە زیندان دەبەین بەڕێوە. ئیشی بەڕێوەبردنی زیندانیش سەختترین ئیشی دونیایە، چونکە بە سەرێک ئەوە ئێمە نین خەڵک دەگرین و دەستبەستیان دەکەین و دەرگایان لە سەر دادەخەین... ئەوانەی دەگەنە لای ئێمە پێشوەخت گیراون، ئێمە دەسەڵاتێکمان لە گرتن و زیندانکردنیاندا نییە. بەڵام هیچ کەس لە دەرەوە لەمە تێناگات... لە دەرەوە تاوانباری گەورە ئێمەین. بەڵام بەوەدا من و تۆ لەحوکمی شۆڕشدا دەژین. شۆڕشیش کاری تۆڵەسەندنەوەیە نەوەک عەدالەت، دەبێت بزانین کە هیچ شتێک لە ژیانی ئێمەدا بە ڕەحم و زەعیفی ناروات بەڕێوە. عەدالەت گەر هەبێت لەم دەور و دوکانی جەنگەدا بەرقەرار نابێت. شۆڕش حاکم و دادگای

تەواوەتی خۆی نییە، بەرپرسەکانی شۆڕش، ئامیرهێز و ئامیربەتالیۆن و سەرلقەکان دەسەڵاتێکی بێچەندوچونیان هەیە... ئەوانەی دێن کەس بە تەواوی نازانێت کێیان تاوانبارە و کێیان گوناهی نییە. بەڵام من ئەوەم بۆ گرنگ نییە و ئەوەی دەگاتە پسمامان دیلی منە. هەموو ئەوانەی دێن بۆ ئێرە خۆیان بە بێتاوان دەزانن، لەوانەیە هەمووشیان بێتاوان بن، بەڵام ئیشی من و تۆ لێرە ئەوەیە هەیبەتێک بدەین بەم ئیشەی خۆمان. ئیش لەگەڵ خەڵکی دیل و زیندانی جۆرە لیاقەتێکی تایبەتی دەوێت... ئیشمان ئەوەیە بۆ خۆمان و بۆ سەرکردەکانمان و ئەوانی سەرەوەمان بسەلمێنین ئەم زیندانە سوودی هەیە... دەستکەوتی بۆ شۆڕش تێدایە... بەرهەم دەداتە پێشمەرگەکانمان و گەر نەبێت دەشێت شۆڕش ڕووبەڕووی مەترسی ببێتەوە. بیرت نەچێت، ئەوەت بیر نەچێت، بوونی زیندان باشترە لە نەبوونی».

من دەمزانی هەر کەسێک قسە بە دوژمنانی ئازادی بڵێت یەکەم کەس پەلاماریان دەدات، ئەوانەن کە پاسی زیندانەکان دەکەن. بەڵام لای خۆمەوە دام نەنابوو تا مردن فەرمانبەری زیندان بم، ئیشەکەی خۆم وەک کارێکی ڕاگوزەر، بۆ سەردەمێکی دیاریکراو سەیردەکرد، کە شۆڕش پێی سپاردوم. دواتریش لە هەر دەمێکی ژیانمدا باسی ئەو ڕۆژانەم کردبێت، بە کەمێک شەرمەوە گووتوومە «کارێک بوو ئەو دەم شۆڕش خستبوویە ئەستۆم و نابەدڵ جێبەجێمدەکرد». ئەو کات هێشتا گەنج بووم، پەیوەندیکردنم بە شۆڕشەوە دوای بیرکردنەوەیەکی وردبوو، بڕوایەکی گەورەم بە شۆڕش هەبوو، لەو باوەڕەدا نەبووم شۆڕش کارێکی خراپ بکات... هەموو ئەوانەی لەو سەردەمەدا دوای بانگەوازی شۆڕش کەوتین، شۆڕشمان وەک هەڵگری مەشخەڵی عەدالەتێکی خودایی و وەک نوێنەری هەقێکی ڕەها تەماشادەکرد. دوای ئەو هەموو ساڵە ئێستا وادەبینم کە لەو دەمەدا ئێمە سەدان هەزار کەس بووین کە پێکرا

ئامادەبووین لە پێناوی میللەتدا بمرین. وشەی خودا چ سیحرێکی لە سەر ئیمانداران هەیە، ئەوکات وشەی میللەتیش جۆرە سیحرێکی وەهای لە سەر ئێمە هەبوو. من نە ئەو کات و نە ئێستاش بە دروستی نازانم کە وشەی میللەت چ واتایەکی دیاریکراوی هەیە. ئەو شەوە کە لە سەر قەرەوێڵەیەکی ئاسن، لە ژوورێکی سارد و لە سەر دۆشەکێکی لۆکەی کۆن پاڵکەوتم و لێفەیەکی ئەستوورم دا بەخۆمدا، میللەت لای من ئەو شۆڕشگێرانە بوون کە چەکیان هەڵگرتبوو، ئەو جووتیارانە بوون کە لە گوندەکاندا بە نیگای کز و غەمگین و نەخۆشەوە لە ژێر باراندا سەیریاندەکردین، ئەو هەموو ژن و منداڵە نەخۆشە بوون کە هەفتەیەک لەوەوبەر لە شارۆچکەیەکی بچوکدا بۆردومان کوشتبوونی... بەڵام ساڵ دوای ساڵ ئەو وێنەیە زیاتر و زیاتر لە خەیاڵمدا کاڵبووەوە، بە جۆرێک ئێستا ئەو وشەیە مانایەکی دیاریکراوی نییە لەلام. دەبێت بڵێم یەکێک لەو گرفتە گەورانەی لەگەڵ بەرەو پێشچوونی تەمەندا تووشیبووم، ئەوەیە کە زۆر لە وشەکان مانای کۆنکرێتی خۆیان دۆڕاند. لە راستیدا گەورەترین دۆڕانێک مرۆڤێک لە ژیانیدا تووشی بێت، نە دۆڕانی موڵک و ماڵ، نە دۆڕانی عەزیزان، نە دۆڕانی پلەوپایە، نە لە دەستدانی عەشقە... بەڵکو لە دەستدانی ئەو وشە گەورانەیە کە لە گەنجیدا ئامادەیە بۆیان بمرێت. ئەو یەکەمین شەوەی لە زیندانی پسمامان سەرم خستە سەر بالیفەکەم، باوەرم وابوو هەر ئیشێک لەم زیندانەدا بیکەم، کارێکی باشە و بۆ شۆڕشی دەکەم، بۆ ئەو جووتیارە هەژارانەی دەکەم کە بەردەوام فڕۆکەکانی دەوڵەت بۆردومانیدەکردن. گەرچی هیچ شتێکم لە کاری حیزبی نەدەزانی و پێشتر ئەندامی رێکخراوەکانی حیزب نەبووم، بەڵام بەشداریکردنم لە شۆڕشدا بەجۆرە فەرمانێکی ئەخلاقی دەزانی.

ئەو شەوە بێئەوەی بزانم بۆ چەند جارێک خەبەرم بووەوە و دیمەنی ئەسپەکانم دەهاتەوە پێشچاو، چاوە ترساوەکانیان، هەست و هەناسەیان

لەو ساتەدا كە تفەنگەكەم لە نێوچاوانیان نزیكدەكردەوە، ئەو هەڵمە گەرمەی لە لەشی ماندوویان هەڵدەستا، ئەو لەرزە نادیار و كاریگەرەی لە جوڵەی دەست و پاشووەكانیاندا بوو. دڵی خۆم بەوە دەدایەوە كە كوشتنی ئەسپەكان سوودێكی بۆ شۆڕش هەیە، بە خۆمم دەگووت «لەبەر ئەسپەكانی دی، لەبەر ئەو پێشمەرگانەی لە پێشەوە چاوەڕوانی كۆمەك دەكەن، دەبوو ئەسپەكان بكوژین».

گەرچی مانگی مایس بوو، كە دەبێت خۆشترین و جوانترین مانگەكانی وڵاتی ئێمە بێت، بەڵام ئەو بارانە زۆرەی كە چەند ڕۆژ بوو دەباری، دونیای وەها تەزاندبوو، من لە پێخەفی شەومدا و لە ژێر لێفەیەكی ئەستووریشەوە، هێشتا هەر دەلەرزیم. من لەو ساتەوە ئەو پرسیارە سەیرە لە خەیاڵمدا خولقا كە بە هەموو هێزی خۆم دەمویست خەفەیبكەم و بیكوژێنمەوە «ئاخۆ پێویست بوو ئەسپەكان بكوژین... پێویست بوو ئەسپەكان بكوژین؟» شەو چەند جارێك هەستام، بەڵام ئەو هەستەی كە شۆڕشگێڕم و ئێستا چالاكییەكی دیاریكراوم هەیە لەوە گەورەتربوو بهێڵێت هەست بە گوناه بكەم. ئەو كات نەمدەزانی شۆڕش چۆن ئیشدەكات، چ جۆرە ماشێنێكە، لە خەیاڵی ئەودەمدا هەستێكی تەماوی و نادیارم هەبوو كە ئامادەگی من لەو زیندانە دووردەست و چەپەكەدا، شتێكە هەموو كەس دەیزانێت، لە سەرۆك و سەركردە باڵاكانەوە تا هەموو ئەو گوندەكییە ڕیشهاتوو و شارییە قنجانەی هاتبوون شۆڕش لە گوناهێكی نادیار پاكیانبكاتەوە. ئەو هەستەی كە هەموو جیهان بە جۆرێك لە جۆرەكان خەبەرداری بەشداری منە لە شۆڕشدا، جۆرە هەستێكی دڵنیایی پێدەبەخشیم و ئەو هێزەی دەدامێ بە ئارامی درێژە بە ژیان بدەم. بۆ ڕۆژی دوایی بەهۆی بێخەوی شەوەوە بەیانی درەنگ لە خەو هەستام. من لە منداڵییەوە ئەو عادەتەم گرتبوو بەیانیان كەمێك زوو هەستم و یەكەم ئیشم ئەوەبێت

بچمە بەر پەنجەرە و تەماشای ئاسمان بکەم. ئەوە نەریتێکی کۆن بوو کە پێدەچێت بگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی پێگرتن و ئاشنابوونم بە ڕۆیشتن. ناوامەزانن ئاسمان جێگایەکی زۆر گرنگە لەلام، یەکێک لەو شتانەی وادەکات بەیانیان سەیری ئاسمان بکەم، حەزمە لە بێدەنگی و هیچ نەکردن و هێمنی، حەزدەکەم ساتێکی بەتاڵ و بۆش بژیم. ئاسمان تاکە جێگایەکە کاتێک لێیدەڕوانم دەتوانم دڵنیابم هیچی تێدا نییە، لەگەڵ زەویدا هەستی وەهام بۆ سەوز نابێت. لە کاتی ئاساییدا ئەو نیگای بەیانییە هەم یەکەم و هەم دواهەمین نیگای ڕۆژمە لە ئاسمان، ئیدی گەر شتێکی تایبەتی نەبێت، هۆیەک نابینیم جارێکی دی سەر بۆ بالا بەرزبکەمەوە، بەڵام ئەو ڕۆژانەی سەرەتام لە پسمامان، بە هۆی هاتوچۆی بەردەوامی فڕۆکەکانەوە، دەبوو زیاد لە جارێک سەیری ئاسمان بکەم. من بوونەوەرێکی زەوینشینم، پیاوێکی عەردپەرستم، تا ئەم چیرۆکە زیاتر بچێتە پێشێ، ڕوونتر تێدەگەن کە مەبەستم چییە. لای من ئاسمان جگە لە باران و هەتاو شتێکی دی ئەوتۆ گرنگی لێوەنایەت، هەر سەربەرزکردنەوەیەکیش بۆ ئاسمان بەدوای خودادا بێت، بە دوای ئەستێرەیەکدا بێت، بە دوای فڕۆکەیەکدا بێت، ماندوومدەکات. ئاسمان بۆیە لە ژوور سەرمانەوەیە، بۆ ئەوەی تێبگەین هیچ شتێک جگە لە بۆشایی و تەپوتۆز لە ژوور سەرمانەوە نییە. لەو ساتەدا کە ئەسپەکانم کوشت و لە دەرەوە باران دەباری و بروسکان چەخماخەیان دەدا، دەمزانی ئاسمان لەگەڵ من قسە ناکات، بەڵکو گرمەیەکی بۆش و بێمانای لێدێت، کە هاواری بێزارییەتی لە بەتاڵی بێسنووری خۆی.

لیڤیتانت کە زانی لە خەو هەستاوم ناردی بە دوامدا. بە پەیامنێری خۆی گوتبوو، حەزدەکات پێکەوە بەرچاییبکەین. پەیامنێری لیڤیتانت «تائەوکاتیش نەمدەزانی وشەی لیڤیتانت مانای چی» کوڕێکی منداڵی دوازدە ساڵانە بوو، کوڕی خێزانێکی هەژاری پسمامان بوو. من لە

سەرەخۆ خۆم گۆڕی و لە جانتاکەمدا پشتێنێکی نوێم دەرهێنا و بەستم. بچووبامایە بۆ هەر جێگایەک، تەنیا یەک دەست جلم لەگەڵ خۆمدا دەبرد، بەڵام گەر جلی کوردیم لە بەربایە یان ئەورووپی، هەمیشە زیاد لە پشتێنێکم لەگەڵ خۆمدا هەڵدەگرت. ئارەزووم ئەوەبوو لە کاتی ڕۆژدا چەند جارێک پشتێنەکەم بگۆڕم. ئەوکات دەستێک جلی کوردی شینباوم لە بەردابوو، پشتێنێکی ڕەشی کودەریم لە سەری بەست و چووم بۆ لای لیڤیتانت کە لە سەر مێزێکی چکۆلانە چاوەڕوانیدەکردم، هەمان ئەو مێزەبوو کە لە کاتی ئاساییدا نوسراوەکانی زیندان و ماشێنی چاپ و فانۆسەکەی لە سەر دادەنا. لیڤیتانت گووتی «کاک وەفا لەگەڵمدا بخۆ، لە کاتی شۆڕشدا هەنگوین و گوێز و پەنیری پێستەت بۆ بەرچایی هەبێت کەم نییە، ئەوە دەست هەموو خوداپێداوێک ناکەوێت. دەی لە بەختی ئێمە شۆڕش هەژار نییە... نا .. بەسکی برسییەوە شۆڕش ناکرێت. ئەوە بیروبۆچوونی منە. ئێمە خۆ شیوعی نین بەسکی برسییەوە شۆڕش بکەین. گەر شیوعییە مەلعونەکان شۆڕشیان کرد، کە دڵنیام لەوە ترسنۆکترن بیر لە شتی وابکەنەوە، دەتوانن ڕۆژی ژەمێک نان بخۆن و تەواو، دوای ئەوە با دەرد بخۆن. ئێمە شۆڕشێکی کرێکارانەمان هەڵنەگیرساندوە، لە بەرئەوە پێویست ناکات بەبرسێتی ڕۆژانی خەباتمان ڕابکێشین، بەڵی پارەیەکی زۆرمان لە ئەمریکاییەکان بۆ هاتووە. بەختمان هەیە... بەختمان هەیە... ئەمرۆ حەزمکرد پێکەوە نان بخۆین و پتر یەک بناسین، بۆ شەویش شەرابم هەیە. زوو زوو شەرابم بۆ دێت، دەتوانم هەمیشە شەرابی باشم هەبێت. ئێرانییەکان شەرابی خۆش لە ئەورووپاوە دەهێنن... ئەهلی کەیفن». لیڤیتانت هەتا گەر قسەی خۆشیشی بکردایە، هەر ڕوویەکی گرژ و مۆنی هەبوو. خۆی قیافەتێکی ئێجگار ڕێک و ڕوخسارێکی گەلێک جوانی هەبوو، کە بە خەسارم دەزانی لە زیندانێکی واچەپەکدا دیلیبکات و بیشارێتەوە، جوانی لیڤیتانت لەوانە بوو مرۆڤ

پێیبڵێت «عەزیزم هەزاران ئافرەت لە دەرەوە چاوەڕوانی ئەم جوانییەی تۆن... تۆ بۆ لێرەدا خۆت دیلکردوە، چی دەکەیت لەم کونجەدا؟». بەڵام ئەو سێبەرە تاریکەی سەر ڕوخساری، ئەو هەستەی پێدەبەخشیم کە دەشێت شتی ترسناکی لە دەست بێت. دەنگێکی قووڵ و بێسۆزی هەبوو، جوانی دەرەوەی ئارامبەخش نەبوو، بێئەوەی بە خۆی بزانێت بە سەیرکردن و بێدەنگییە درێژەکانی دەیترساندیت. هەستمکرد دەزانێت لێیدەترسم، بەڵام خۆشحاڵ بوو بەو هەستە، نەیدەویست بیرەوێنێتەوە، دەیەویست گەورەتر و کاریگەرتری بکات. چایەکی لە پیاڵەیەکی زەڕلێدا بۆ تێکردم و گووتی «پێش تۆ دوو کەسی تریان بۆ ناردم، هەردووکیانم برد و گووتم ئەسپەکانم بۆ بکوژن. بە هەمان ئەو چەشنەی کە تۆم برد... کەسیان نەیانتوانی. هەردووکیان ئەژنۆیان وەک شەقشە دەلەرزی. کە سەرەتا تۆم بینی گووتم : دیسانەوە، دیسانەوە یەکێکی تر لەم شارییە ترسنۆک و خاوخلیچکانەی دەبن بە بار بە سەر شۆڕشەوە، بەڵام تۆ باش بوویت. ئەو دووانەی پێشووم دەمودەست گێڕایەوە بۆ جێگای خۆیان، سەرو نامەم بۆ نوسین و گووتم سوپاس... ئێوە بەکەڵکی ئیشی زیندان نایەن. هەر بە ڕاستی بە کەڵکی ئیشی زیندانیش نەدەهاتن. یەکێک نەتوانێت ئەسپێک یان هێسترێکی نەخۆش بکوژێت، ناتوانێت لە زیندانێکی بە ناوبانگی وەک پسمامان کاربکات.... شوێنەکە هەیبەتی خۆی هەیە».

لیڤیتانت سفرەیەکی کۆنی دابوو بە سەر مێزەکەدا و دوو نانی تەڕکراوی لە سەر سینییەکی زۆر زۆر بچوک قەدکردبوو، کەمێک هەنگوین و گوێز و پەنیری خستبووە سەر سفرەکە. لەگەڵ دروستکردنی پارووێەکی بچوکدا گووتی «ها وەفا بەگ پێتوایە کەسانی وەها زەعیف، بەرگەی ئیشی زیندان بگرن؟... تۆ دەڵێیت چی؟». من قومێکم لە چاکە دا و گووتم «جەنابی لیڤیتانت، بڵێم چی... ئەسپ مەخلوقێکی جوانە... کوشتنی

ئەسپ وەک کوشتنی کەروێشکێک یان سەربڕینی مریشکێک نییە. نیگای ئەسپێک کە پڕدەبێت لە ترس و نائومێدی، درەنگتر بیردەچێتەوە، ئەسپ بەوەدا ویقار و هەیبەت و جوانییەکی تایبەتی هەیە، کوشتنی ئاسان نییە، زێدەڕەویی نییە گەر بڵێم کوشتنی ئەسپێک وەک کوشتنی ئینسانێک سەختە، چونکە ئەویش وەک مرۆڤ پرە لە هێز و جوانی».

لیڤیتانت زەردەخەنەیەکی جوانی گرت، بە جوڵەیەکی نەرم و لێزانەوە پارووییەکی بچوکی دیکەی دروستکرد و بەر لەوەی هەڵیبرێت و بیبات بۆ زاری گووتی « وەفا بەگ، تۆ لە سەر هەقی. ئەسپ خۆشەویستە، دەکرێت بیکوژیت بێئەوەی ڕقت لێبێت. بەڵام خۆشەویستی شتێکە و ڕەحم شتێکی ترە. شۆڕشگێڕ دەبێت خۆشەویستی هەبێت، بەڵام ڕەحم... نا... ڕەحم ئینسان دەگۆڕێت بۆ حەیوانێکی بێکار کە هیچ ئیشێکی گەورەی بۆ ناکرێت. من ڕقم لە ڕەحمە، بەڵام خاڵی نیم لە خۆشەویستی... دیارە مەبەستم خۆشەویستی ئینسان نییە ».

دەنگی ساردبوو، خاڵی بوو لە غەم. قسەکردنی، تاریکی و نسرمی ناو ڕۆحی خۆمی بەیادا هێنامەوە. ئەو ساردییەم بەیادا هاتەوە کە ئەسپەکانم پێ کوشت، ئەو بێهەستی و نەبوونی عاتیفەیەی تفەنگەکەم پێ بەرزکردەوە و خستمە سەر سەری ئەسپەکان، ئەو ناڵینە توندەی دەنگی فیشەکەکە کاتێک لە نێو سەری ئەو گیانەوەرە بەستەزمانانەدا دەتەقییەوە. پێشتر توانای وام لە خۆمدا هەست پێ نەدەکرد، شۆڕش لای من وێنەیەکی تری هەبوو، کە هاتمە ڕیزی شۆڕشەوە و لە بنکەی حاجی باهیر خۆم وەک پێشمەرگە ناونوسکرد، پتر ئەوەم لە خەیاڵدا بوو لە پێشەوەی سەنگەرەکاندا ئێشک بگرم و لە ژێر بۆردومانی سەختدا بە چیادا سەربکەوم و لەگەڵ هەزاران جەنگاوەری تردا پەلاماری پایەگا و بنکە گەورەکانی سوپا بدەم... ئەوەی لە خەیاڵمدا بوو کۆمەڵێک وێنەبوو کە بە کاریگەری تەماشاکردنی هەندێ فیلمی جەنگ لە سەرمدا

سەوزبووبوون. کوشتن و ئازاردان لە خەیاڵی مندا هێشتا بەشێک بوون لە سەحنەی جەنگ، خۆم دەبینی کە ڕووبەڕووی سەربازێکی عەرەبی ترساو دەوەستم و دەزانم گەر نەیکوژم ئەو دەمکوژێت. خۆم دەبینی دەچمە سەر هەندێک ئەفسەری زامدار و ئەوەم بیردەکەوێتەوە کە ئەم و هاوڕێکانی وڵاتەکە و میللەتەکەمیان ئەتککردوە و نابێت بەزەییم پێیاندا بێتەوە، بەڵام هەرگیز ئەوەم بە خەیاڵدا نەهاتبوو بتوانم لەیەکەم ڕۆژی پێشمەرگایەتیمدا وا سارد، بێعاتیفە، بێترس کۆمەڵێک ئەسپی نەخۆش و هێسترێکی لەڕ بکوژم. ئەو ڕۆژە لە سەر مێزی بەرچاییەکەمان لە لیڤیتانتم پرسی «واتێدەگەم ڕەحم و خۆشەویستی سەر بە یەک خێزانن و یەک ڕیشەیان هەیە، تێناگەم چۆن مرۆڤ دەتوانێت خۆشەویستی لە دڵدا بێت و ڕەحمی لە دڵدا نەبێت؟». ئەو لە کاتی بەرچاییدا بە لکی پشتێنەکەی زوو زوو دەمی دەسڕی، لێوانی پاککردەوە و وەک پیاوێکی تێر پاڵیدایەوە و گووتی « گەر خۆشەویستی نەبێت، من و تۆ چی دەکەین لێرە. خۆشەویستی شۆڕش، خۆشەویستی سەرۆکەکانمان، عەشقی هێز، موحیبەتی ئەوانەی دەسەڵاتمان دەدەنێ و دەمانپارێزن... من باس لە خۆشەویستی ئینسان ناکەم، لە مەیلی پیاو بۆ ژن یان بە پێچەوانەوە، ئەوە جۆرێکە لە نەخۆشی. باس لە خۆشەویستی شتێک دەکەم کە وادەکات، شانازیم گەورەتر و گەورەتر بێت. گرنگ ئەوەیە شتێک بمجوڵێنێت، بمخاتە ناوەڕاستی جەنگی ژیانەوە، شتێک لە ڕێگایەوە هەستبکەم بەهێزم. قسەم لە عاتیفەیەکی پڕوپوچ نییە بۆ ژنێک، بەڵکو ئەو شتەم خۆشدەوێت کە نامێڵێت لاوازبم... نامێڵێت تەنها بم و بترسم. بەڵام ڕەحم زەعیفییە... ڕەحم چییە، من قێزم لە ڕەحم دێتەوە. ڕەحم جگە لەوەی ئەو ئاگرە دەکوژێنێتەوە کە دەبێت لە ئینساندا بسووتێت، هیچی تر نییە. خۆشەویستی مانای دونیا بۆ ئەوە وێرانبکەیت کە دەتەوێت... دونیای بۆ وێرانبکەیت. بەڵام ڕەحم سۆزێکی

نزمە، سۆزی بەشەرە لاوازەکانە، سۆزی ئەوانەیە کە ژێردەستن و بە درێژایی ژیانیشیان ژێر دەست دەمێننەوە. شۆڕشم بۆیە حەزلێیە وادەکات لاوازنەبم، گرنگ نییە مرۆڤ چییە، گرنگ ئەوەیە لاواز نەبێت. ئەگەر خۆشەویستی بووە مایەی لاوازیی ئەوکات فڕێدە، خۆشەویستی ژنیش هەر دەبێت درێژکراوەی قودرەت بێت. من دوێنێ تۆم زۆر بە دڵ بوو، ڕەحمم تێدا نەبینیت. گەر شتێک لە ڕەحم لە تۆدا بایە دەمبینی... وەفا بەگ دەمبینی... لە دەستتدا، لە چاوتدا، لە هەناسەتدا. بەڵام تۆ یەکێکیت لەو بەشەرانەی بێڕەحم دروستبوویت».

نەمدەزانی ئەو قسانەی ستایشن یان سەرزەنشت. نەمدەزانی دوای ئەو قسانە چۆن سەیری خۆم بکەم، تا ئەودەم تووشی دۆخێکی وەها نەبووبووم بپرسم «ئاخۆ چ جۆرە مرۆڤێکم... بێڕەحمم یاخود بەرەحم؟». ڕەنگە هەندێک مرۆڤ تا دەمرن تووشی هەڵوێستێکی وەها نەبن، نەکەونە بەر زوڵمی ساتێک، پرسیاری وەها لە خۆیان بکەن. بەڵام هەستێکی نادیارم هەبوو کە ئیدی لە ڕەوتی ژیانی داهاتوومدا گەلێک جاری دیکە ڕووبەڕووی ئەم پرسیارە دەبمەوە. هێندە زۆر ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبمەوە، کە ئیدی کردن و نەکردنی وەکو یەک وەهایە. ئەو ڕۆژە بەزەردەخەنەیەکی ساردەوە، بە نیگایەکەوە کە هەستێکی تایبەت و مانایەکی ئەوتۆی بۆ لیڤیتانت نەدەگواستەوە، وەک یەکێک سوپاسێکی بێدەنگی ستایشێکی هەم بەد و هەم شەڕانی بکات، سەیرمکرد و هیچم نەگووت. قورس بوو لەلام دان بەوەدا بنێم کە پیاوێکی بێڕەحمم، قورسیش بوو لەلام خۆم وەک ڕەحمدارێکی لاواز دەربخەم کە لە کوشتنی ئەسپەکان پەشیمانم. لیڤیتانت هۆمەر چەند چایەکی خواردەوە و چەند جارێک ستایشی ئەو هەنگوینە کێوییەی کرد و بەچێژێکی بێوێنەوە هەندێ کاکڵەگوێزی تایبەتی خستەبەردەمم و دواجار گووتی «سبەی ڕەشید وەیبابی ئامێرهێز دێتە ئێرە. سەردانی

زینـدان دەكات، چەنـد ڕۆژە خەریكـی ڕێكخسـتنی شـتەكانین... وەیبـاب كەسـێكی بێڕەحمـە. لـە بێڕەحمتریـن كەسـانێكە مـن دیبێتـم... دەیەوێـت هەمـوو ئەوانـەش لـە سنووری هەرێمـی ئـەودا شتێكیان بـە دەسـتە بێڕەحـم بـن، ئـەوە تەنیـا خواسـتێتی... بەزەیـی شـێتیدەكات». مـن بێدەنـگ نانـم دەخـوارد. پـاش ئێسـتێكی درێـژ پرسـیم «دەبێـت چـی بكەیـن تـا ڕەشـید وەیبـاب دڵنیابێـت كـە ئێمـە بێڕەحمیـن؟؟». لیڤیتانـت جارێكـی دی بـە لكـی پشـتێنەكەی دەمـی سـرِی و گووتـی «شـتێكی تایبەتـی ناكەیـن، ئێمـە لـە زینـدان لـەوە بێڕەحمتریـن كـە وەیبـاب دەیەوێـت».

هـەر ئـەو ڕۆژە بـۆ یەكەمجـار «نـزار ئیدریـس» ـم لـە بەندیخانـەی پسـامان بینـی.

# ئەو شەوەی بولبولیار منی بینی

لـە دوای ڕاپەڕیـن و لـە كاتـی ڕەوە گەورەكـەدا، لـە ئۆردوگایەكـی سـەر سـنوور، لـە چادرێكـی شـیندا، ڕێكەوتـی «هۆشـەنگی بولبولیـار»م كـرد، كـە زیـاد لـە دوو هەفتەبـوو، بەدوایـدا دەگـەڕام. ئـەو ڕۆژە بـە ڕیشـێكی درێـژەوە «سـەمبولی ئەبـەدی شۆڕشـگێڕان»، لـە ژێـر ئـەو چـادرەدا لـە دەسـت دەردێكـی نادیـار دەینالآنـد، نیوەبێهـۆش لـە سـەر دۆشـەكێكی سـپی ڕاكشـابوو، یەكێـك بـە چەنـد بەتانییەكـی ئەسـتوور داپۆشـیبوو. مـن بـە هەمـوو دەردی خۆمـەوە، بـە غەمێكـی ترسـناك لـە چاومـدا، بـە برینێكـی كوشـندەوە لـە ڕۆحمـدا، بـۆ ئـەو دەگـەڕام، جگـە لـەو فریادڕەسـێكی دیكـەم پـێ نەدەزانـی. مـن لـە هەمـوو جێگایـەك، لـە بـن هـەر چادرێـك و لـە نـاو هـەر لۆرییەكـدا كـە هەڵهاتووانـی دەگواسـتەوە، بـۆ ئـەو گەڕابـووم، ئـەو تاكـە هیـوام بـوو. چەنـد ڕۆژ بـوو شـارم بـەدوادا دەكێـڵا و نەمدەدۆزییـەوە،

ئێستاش کە دەهاتە بەر دەستم، بەو بێهۆشی و ڕوخسارە نەخۆشەوە دەمبینی. هەردووکمان نەخۆش بووین، بەڵام هەر یەکەمان بە هۆیەک و بە دەردێکەوە دەماننالآند. من بە ناو بەرپرسی لیژنەیەکی ڕێکخستن و سەرپەرشتیکردنی کاروباری ئاوارەکان بووم، بەڵام نەتوانام هەبوو هیچ ڕێکبخەم و نە سەرپەرشتی هیچ شتێک بکەم. کاتێک چوومە سەر پێخەفی «بولبولیار» و دەستم لە ناوچاوانی دا، بە جۆرێک گەرم بوو ترسام لە چەند سەعاتێکی کەمدا ئەو نەخۆشییە بیکوژێت. دەمودەست بەڕێکەوتم بۆ لای ئێرانییەکان تا تکابکەم ڕەزامەندی تایبەتم بۆ بنوسن و بە زووترین کات نەخۆشەکەم بگوازمەوە بۆ بیمارستان. بەوەدا هۆشەنگی بولبولیار لەوێ کەسێک یان خزمێکی نزیکی نەبوو، دەمتوانی خۆم لەگەڵ ماشینەکەدا تا دیوی ئێران بڕۆم و لە بیمارستانێکی بچوکدا لە مەریوان بیخەوێنم. بولبولیار گەر بشفڕیبایە بۆ ئاسمان دوای دەکەوتم، هەر چییەکم کردوە دەبوو نەهێڵم بمرێت، چەندین شتی گرنگ و گەورە بەوەوە گرێدرابوون... نەدەبوو ئەو بمرێت. ئەوکات نەمدەزانی مانەوەی بولبولیار لەوەش گرنگترە کە من دەرکیدەکەم. ئەو شەوە لە بیمارستان بەدیار بولبولیارەوە بووم، کاتێکی زۆرم هەبوو، بیر لە ماهییەتی ئەم پیاوە بکەمەوە کە دەبوو لە چاوەڕوانی مردندا هاوڕێ و هاوسەفەری بم. نازانم بۆ ئەو شەوە لە بیمارستانی مەریوان، بیرم لەوە کردەوە ئاخۆ بولبولیار، ئەم پیاوە مەلەکدۆستە، دەکرێت دوای ئەو هەموو دابڕانە، هەر بە شۆڕشگێڕ حیسابیبکەین یاخود نا؟. پێدەچێت هۆی ئەو پرسیار و خولیایە ئەوە بێت کە من چیتر گومانم لە هەموو شۆڕشگێڕانی دونیا بوو، لە مرۆڤدا بەدوای شتێکی تردا دەگەڕام، بەڵام ئەو شتە چی بوو، نەمدەتوانی ناوی بنێم.

بەپێی بڕوای ئەو سات و کاتەم، سێ جۆر لە شۆڕشگێڕ هەبوون. جۆری یەکەمیان کەسانێکن هەمیشە بە شۆڕشگێڕیی دەمێننەوە، شۆڕش

لای ئەوان جۆرێکە لە تورەیی ئەبەدی، لە ناڕەزایی ئاگرین دژ بە دونیا، هەوڵێکی بێوچانە بۆ وێرانکردنی هەموو شتێک. ئەوە بەرهەمی ڕۆحێکە کە هەرگیز لەگەڵ دونیادا تەبانابێت و لەگەڵ شتەکاندا ئاشت نابێتەوە. ئەمجۆرە شۆڕشگێڕە ڕقێکی تایبەتی بەرامبەر ناهەقییەکی تایبەتی نییە... بەڵکو ڕقێکی گەورە و وزەیەکی ناوەکی گەورەی دژ بە دونیا لە ناودایە، هەندێجار تورەیی خۆی ئاڕاستەی شتێکی تایبەتی دەکات و زۆرجاریش شتێکی تایبەتی نییە بیکاتە دوژمن و بە گشتی دەرهەق بە هەموو وجود تورەیە... بەڵام مەبەستی هەبێت یان نەبێت، وزە دژ و ناڕەزابوونە گەورەکەی هەمیشە ئامادەیە. ئەمانە شۆڕشگێڕە ئەبەدییە تورەکانن کە لە هەموو ئان و زەمانێکدا شۆڕشگێڕن و بە شۆڕشگێڕی دەمێننەوە. گەورەترین سیفەتی ئەمجۆرە لە شۆڕشگێڕی ئەبەدیی ئەوەیە، کە شەڕی براوە لە مێژوویاندا هەیە، بەڵام ساتی سەرکەوتن، یاخود دواهەمین سەرکەوتن لە ژیانی و بیرکردنەوەیاندا بوونی نییە... شۆڕشگێڕی ئەبەدی کەسێکە کە هەرگیز ناگاتە کۆتایی، واتە ساتێکی نییە ناوی ساتی تەواوبوونی شۆڕش بێت.

جۆری دووەم لە شۆڕشگێڕ ئەوەیە کە بۆ ساتێکی سەرکەوتنی دیاریکراو دەگەڕێت، عەودالی کۆتاییەکی تایبەتە... عەقیدە و باوەڕ لای ئەو نرخێکیان نییە. بە دوای ئەو ساتەوەختەدا دەگەڕێت کە غروری خۆی بەرامبەر دونیا تێربکات. ساتێک بتوانێت سەر بەرزبکاتەوە و بە جیهان بڵێت «دەبینیت، دەبینیت هەوڵی من بە خۆڕا نەڕۆیشت... ڕەنجم بە هەدەر نەچوو». شۆڕشگێڕی ئەبەدی ناتوانێت وەها بە جیهان بڵێت، ئەو چەندە شت لە دونیادا بگۆڕێت هەست ناکات هیچی گۆڕیوە. بەڵام شۆڕشگێڕە مێژووییەکان، ئەوانەی لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراودا شۆڕشگێڕن و دواتر وەردەگەڕێن، تەنیا بۆ ئەو ساتەوەختە گەورەیەی سەرکەوتن دەگەڕێن، سەرکەوتنێکی مەزن، بیسەلمێنێت ئەوان لە سەر

شانۆی مێژوو ئامادەبوون و کارێکیان ئەنجامداوە. کاتێک دەستیانکەوت، کە زانیان بوون بە خاوەنی جەنگێکی براوە، بوون بە خاوەنی ساتێکی مێژوویی کە شاهیدی شۆڕشگێڕێتی ئەوانە، ئیدی دەبنەوە بە یەکێک لە منداڵە دەستەمۆ و گوێڕایەڵەکانی جاران و دەچنەوە ژێر چنگی یاساکان و دەکەونە هەوڵی کوشتنی هەر غەریزەیەکی یاخیبوون و هەر خەیاڵێکی شۆڕشگێڕانە لە وانی دیشدا. بڕی هەرە زۆری شۆڕشگێڕەکانی دونیا لەمجۆرەن، ئەوەندەی لە هەوڵی گۆڕینی مێژووی تایبەتی خۆیاندان، لە هەوڵی گۆڕینی جیهاندا نین. گۆڕینی دونیا لای ئەوان لە سەرکەوتنی ئەواندا بەرجەستە دەبێت. هاتنی ئەوان بۆ دەسەڵات سەرەتا و کۆتایی گۆڕینی جیهانە. لێرەوە هەموو شۆڕشگێڕە مێژووییەکان بە چەشنێکی ئەفسانەیی ئەو ساتەوەختە مێژووییەی سەرکەوتنی خۆیان دەپارێزن، دەیکەن بە جەژن، دەیگێڕنەوە، دەیکەنە فیلم، دەیکەنە پشوی ڕەسمی... ساتی سەرکەوتنی خۆیان ساتی لە یەکدانی شۆڕش و ئەبەدییەتە.

جۆری سێهەم، شۆڕشگێڕە نائومێدەکانن، ئەوانەی شۆڕش لە ژیانیاندا تەنیا لە ڕێگای پەیوەندی بە ئومێد و نا ئومێدییەوە لێکدەدرێتەوە. شۆڕش سەرەتا جۆرێکە لە هەڵهاتنی گەورە لە نائومێدییە تایبەتییەکان، بازێکی گەورەیە بۆ ناو ئومێدێکی گەردونی، ئومێدێک کە خودی بچوکی مرۆڤ بە خودی دەستەجەمعی و کۆگەلی مرۆڤایەتییەوە گرێدەدات... شۆڕش لێرەدا پەرچەکردارێکە دژ بە دۆڕاندن و نوشستە شەخسییەکانی مرۆڤ، بەڵام لە ڕێگای خۆبەستنەوە بە ئومێدێکەوە کە ڕێگا بۆ خۆشبەختی ئەوانی دیش خۆشدەکات. ئەوەی لای من لەم شۆڕشگێڕە نائومێدانەدا جێگای سەرنجە، گەڕانی نائومێدانەیانە بە دوای ئومێد دا... واتێدەگەم کە بزوێنی سەرەکی ئەم شۆڕشگێڕانە نە وێرانکردنی جیهان، نەگۆڕینی دونیا، نە تۆمارکردنی سەرکەوتنێکی مێژوویی گەورەیە، بەڵکو خۆشەویستییەکی بێسنوورە بۆ تەواوی شتەکان، بۆ ڕەگەزی ئادەمیزاد،

بۆئەو شتانەی بە شایستەی پاراستنیان دەزانن. دیارە دەرەنجامەکانی ئەمجۆرە لە شۆڕشگێڕیی وێرانکردنی خودە بە ئومێد یان نائومێدیی، بەڵام بەدەگمەن ڕێدەکەوێت ئەم چەشنە لە شۆڕشگێڕ ئەو خودوێرانییە ببینن. ئەمانە تا سنووری مەستی و بێهۆشی باوەڕیان بە پەیامی خۆیان هەیە، پەیوەندیان بەوەوە نییە لە سەر شانۆی جیهان لە سەر سەحنە تاریکەکانی مێژوو چی ڕوودەدات، تەنیا و تەنیا دوای ئومێدە وێڵ و هەمیشەییەکەی خۆیان دەکەون. لە بەرئەوە، گەرچی زۆر نائومێدن، کەچی هێمنی و ئارامییەکی سەیریان هەیە، تێکشکاو نین، بەڵام نیشانەی سەرکەوتنیان پێوە دیار نییە. زۆر سەیری دوور دەکەن، بە جۆرێک شتی زۆر تایبەت دەبینن کە ئێمە نایبینین. لەزەت لە نائومێدییە گەورەکانی خۆیان دەبینن، چونکە ئەوە پتر وادەکات دوای ئەو خواستە ئەستەم و نەگیراو و ئەفسانەییە بکەون، کە ناتوانن ناوی بنێن. شۆڕش لای ئەوان بە پێناسەکانی ئێمە جۆرێکە لە خۆوێرانکردنی خۆویست و خۆشبەختانە، ئەمانە خاوەنی هیچ نین، هیچیان ناوێت، پەلاماری شتەکان نادەن، هیچ تێکناشکێنن، کەس ناکوژن، شۆڕشگێڕی تفەنگ نین، بەڵام دەیانەوێت هێندە لە دونیا دووربن، نەتوانن پیسیانبکات... بەختەوەرییەکی کوشندە لە دواکەوتنی سەرابدا دەبینن... لای ئەم شۆڕشگێڕانە پاکی و باوەڕهێنان بە جوانی مرۆڤ کەرەستەیەکە بۆ سزادانی خود و بارکردن و وێرانکردنی.

گەر لە من دەپرسن، هۆشەنگی بولبولیار سەر بە چ جۆرێک لە شۆڕشگێران بووە، بێ بیرکردنەوەیەکی درێژ و بێ خۆماندووکردنێکی گەورە دەڵێم، نزیکە لە چەشنی سێهەم، بەڵام دوور و نزیک هیچ شتێک لەگەڵ چەشنی دووەمدا کۆی ناکاتەوە، ئەو لەو مرۆڤدۆستە ئەبەدییانەیە کە دواهەمین هیوای خۆیان دەخەنە سەر خەیاڵی شۆڕشێکی تایبەتی، شۆڕشێک لە شۆڕشی شۆڕشگێڕە ئاساییەکانی وەک ئێمە ناچێت، شۆڕشێک لە پێناوی ڕزگارکردنی خاکێکدا نییە کە ئێمە دەیبینین، لە

پێناوی نیشتمانێکدا نییە ئێمە بۆی دەمرین، لە پێناوی جۆرە سەرکردە و مرۆڤێکدا نییە ئێمە دەیانناسین، بەڵکو لە پێناوی رزگارکردن و پاراستنی شتێکی نهێنی و تاریکی ناو مرۆڤ خۆیایەتی، لە پێناوی ئەوەدایە دەستی مرۆڤ بگرێت و چیتر خۆی وێران نەکات، لە پێناوی شتێکدایە ڕەنگە بۆ هەموومان ناچیز و بێمانا دیاربێت، بەڵام لای ئەوان زۆر گەورەیە، لە پێناوی ئەوەدا مرۆڤ قووڵتر سەیری ناوەوەی خۆی بکات، زۆرتر گوێ لە دەنگە دوورەکانی ژێر ڕۆحی خۆی بگرێت، کە لە کاتی ئاساییدا کەس گوێی لێیان نییە. ناسینەوەی ئەو دەنگە بۆ کەسانی وەک بولبولیار سەرەتای سەرهەڵدانی هەموو دونیایەکی تازەیە. نا مەبەستم لە جۆرە سۆفیگەرییەکی دەرونی نییە، مەبەستم نییە بڵێم بولبولیار لە چەشنی ئەو دەروێش و ڕەبەن و یۆگاچییانەیە کە بۆ وزەیەکی نهێنی ناو جەستە و ڕۆحی خۆیان دەگەڕێن. بەڵکو ئەوەیە لە ڕۆحی هەر یەکێکماندا دڕێک هەیە، بەبێ گوێگرتن لەو دڕە نهێنی و قووڵەی ناو خۆمان، بەبێ دواندنی بە درێژیی، بەبێ دانیشتن لەگەڵیدا و قسەکردن، مرۆڤ دەبێتە بوونەوەرێکی ڕووکەشگیر و تەنکاونشین. دیارە هێشتا زۆر زووە بزانن بولبولیار لە چ چیرۆکێکی سەیرەوە گلا. بۆ ئەوەی لە مرۆڤێک تێبگەین بەس نییە بزانین سەر بە چ هێزێکی سیاسییە، چ کتێبێک دەخوێنێتەوە، بڕوای بە چ دینێک هەیە... دەکرێت هەموو ئەو شتانە دەرکەوتەی ڕوکەش و زووگوزەربن و شتێکی قووڵ لە سەر مرۆڤ ئاشکرانەکەن. ئەوەی ڕاستی مرۆڤ ڕوونتر بەیاندەکات، پەیوەندی نهێنی و قووڵێتی بە ژیانی خۆیەوە. پەیوەندییەک کە زۆربەمان بایەخێکی گەورەی پێنادەین، لە بری ئەوەی قورسایی گەورەمان بخەینە سەر ئەو پەیوەندییە، قورسایی گەورەمان دەخەینە سەر پەیوەندیمان بە خودا، بە نەتەوە، بە مرۆڤەکانی ترەوە. بەڵام لە هەر شت گرنگتر بۆ تێگەیشتنی مرۆڤ، ئەو گەمەیەیە کە بە ژیانی خۆی دەیکات. ژیانی ناوەکی و

ژیانی دەرەکی. ئەو شەوە کە لە بیمارستان بەدیارییەوە خەوتم، بۆ من کەسێکی نامۆ و نەناس نەبوو، لە هەندێ سەردەم و قۆناغدا زۆریش لە یەکدی نزیک بووین... دواجار لە سەرەتای ڕاپەڕیندا یەکمان بینییەوە، ڕۆژێکی سەیربوو، توند باوەشمان بە یەکدا کرد و گریاین. من لە پێشدا دەمانچەکەمم خستە سەر سەری بیکوژم، بەڵام نەمتوانی... دوایی ئەو توند باوەشی پیاکردم و تێگەیشت لە چ حاڵێکی دەرونی سەختدا دەژیم. بەڵام بۆ ئەوەی بزانن بۆ ویستم بیکوژم، بۆ دوایی باوەشمان بەیەکدا کرد، دوا ئەوە چی ڕوویدا و چ دوو شتێکی سەیر ژیانی هەردووکمانی هەژاند، هێشتا دەریایەک لە چیرۆک و نهێنی لە نێوانماندایە. ئەو ڕۆژە کە بیمار و بێهۆش لە سەر سەری وەستام، نەمدەزانی ئاخۆ گەر بە ئاگابایە، قەبووڵیدەکرد بەو چەشنە ببمە پاسەوانی یاخود نا؟ بە خۆم و دەفتەری تێبینییەکانمەوە تا بەیانی لە نزیکییەوە ئێشکم گرت. پێم ئەفسوس و حەیف بوو، بەم چەشنە بە لاوی و بە هۆی تایەکەوە «کە دوور نییە تای نائومێدی بێت» بمرێت، من تا ئەو کاتەش تەواو هۆی نەخۆشییەکەیم نەدەزانی. لە بیمارستانی مەریوان، نەخۆش و بێسەرپەرستان و خەڵکانی بەهەلاکەت چوو بە جۆرێک زۆربوون، دکتۆر و تیمارپێچان فریا نەدەکەوتن بە هانای هەمووانەوە بڕۆن... بە درێژایی شەو لە سنوورەکانەوە خەڵکانی پیر و ژنانی دووگیان و گەنجانی زامدار و نەخۆشی لە هۆشچوو دەهاتن بەمدیودا. من و هۆشەنگ لە کونجێکی بچوکی قاوشێکی شێداردا لە سەر زەوییەکە جێگایەکمان بەرکەوتبوو. نەخۆشەکەی من دوو دەرزی دژە تای وەرگرت و دکتۆرەکان هەندێک پشکنینی گشتیان بۆ کرد و گوتیان دەینێرن بۆ بیمارستانی سنە. من بە درێژایی شەو دەبوو لە ڕێگای قوماشی تەڕەوە تای داگرم و نەهێڵم دۆخی بۆ بەدتر وەرگەڕێت. بە هەر نرخێک بووە نەمدەویست بمرێت.... هۆشەنگ بە درێژایی شەو جگە لە هەندێک نرکەی کەم، دەنگێکی

وەهای لێنەهات دڵنیامبکات لە مەرگ نزیک نییە و هێشتا ئازاری ژیان گینگڵی پێدەدا. هەندێک جار چاوی هەڵدەبڕی، بەڵام پێنەدەچوو هیچ ببینێت.

ئەوەی دەمویست بژی و نەمێڵم مەرگ زەفەری پێبەرێت، چیرۆکێک بوو کە بەشێکی دەگەڕایەوە بۆ زنجیرێک هۆکار و ڕووداو کە هەندێکیان گشتی و زۆریان تایبەتی بوون، ئەو تەنیا کەس بوو دەیتوانی من لە بەربوونەوەیەکی کوشندە بۆ بنی خەرەندێکی تاریک بپارێزێت، یان هەندێک شتم بۆ ڕزگاربکات، بتوانم وەک مرۆڤ جارێکی تر قاچ لە سەر زەوی دابنێم. ئەو سەرەتا ئەندامی گروپێکی چەپی توندڕەوبوو کە بە یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە و لەتکردنی حیزب تۆمەتبارکرابوون. دواتریش لە چیرۆکی شاردنەوەی نەغەدە ماردینییەوە گلا و کەسانێک لە حیزبدا دەیانەویست بیکوژن. من هۆشەنگم لە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشدا ناسی، ئەو کات قوتابی زانکۆ بوو، سەیرترین ڕووداو لە نێوانماندا دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی هەشتاکان، سەردەمێک هەمووان بەدوایدا دەگەڕاین، ئەو ڕووداوە وایکرد من وەک بوونەوەرێکی ناوازە و گرنگ بۆ ژیانی خۆم و ڕەنگە بۆ دونیاش سەیریبکەم. تا ئەو کات، کەسێک بوو وەک هەر کەسێکی تر، بەڵام لەو شەوەدا بۆم دەرکەوت، نە من «وەفای ڕەفعەت بەگ» کەسێکم وەک هەر کەسێکی دی، نە ئەویش «هۆشەنگی بولبولیار» کەسێکە وەک هەر کەسێکی دی. من ئەوکات لەوە سەرسامبووم کە چۆن گەنجێکی وا هەژار، بێپشت و پەنا، کە لە یەککاتدا هەم دەوڵەت و هەم شۆڕش ڕاویدەنێن، دەتوانێت وا مەحکەم خۆی بشارێتەوە. بەڵام کە لە زیندانی حیزب لە گوندی «توتنباغی» بینیمەوە، تەواو سەرسام و دەستەپاچەبووم، هۆشەنگ ئەودەم لەگەڵ گەنجێکی دیکەی هەژاردا بەناوی حەسیب مەهدییەوە گیرابوو. حەسیب کوڕێکی لاوازی چاویلکە لە چاو بوو، وەک زۆربەی چەپەکان بە چەشنێکی

بیمارانە، بێوچان باسی تەزادی ئەساسی و شەرایتی موبارەزەی تەبەقاتی دەکرد. من میوانی ئەو هێزەبووم کە هۆشەنگ و حەسیبی گرتبوو... ئەو دەم لە تخوبی باشوورەوە لەگەڵ مەفرەزەیەکی بچوکدا خەریکی گواستنەوەی هەندێ نامەی زۆر نهێنی بووم بۆ شەخسی سەرۆک، هێزەکە بە فەرمانێکی سەرەوە ئەو دوو گەنجەیان لە ماڵی پیرەمێردێکی گوندەکیدا گرتبوو. فەرماندەی هێزەکە پیاوێک بوو لەوانەی دوگمەیەکی نهێنیان هەیە کە تەنیا فەرماندارانی سەروو خۆیان دەزانن لە کویادایە و دەتوانن پەنجەی پێدابنێن، کەسێکی کوڵەبن و ڕەشتاڵە و مل ئەستووربوو، بە جووتێک دەستی گۆشتن و خڕەوە، شۆڕش هەر کارێکی پێ ڕاسپاردبایە وەک مەکینەیەکی کۆککراو جێبەجێیدەکرد. لە کاتی ئاساییدا مرۆڤێکی خۆشڕوو و زمان شیرین بوو، بەڵام گەر کەسانی سەروو خۆی فەرمانیان پێبدایە دایکی خۆی سەرببڕێت، بێئەوەی بپرسێت بۆ، دەمودەست سەریدەبڕی. هەمیشە شانازی بە گوێڕایەڵی و دڵسۆزی خۆیەوە بۆ شۆڕش و سەرکردەکان دەکرد. من و ئەو لەو خاڵەدا زۆر لە یەک دەچووین، ئەوە کردبووینی بە دوو دۆستی نزیک کە زۆر گوێمان لە یەکتر دەگرت. من ئەوکات کارێکی تایبەتیم بەو زیندانە نەبوو، من هەر ڕاگوزەر لەوێوە هاتبووم، نیشتەجێی سەرەکیم ناو شار بوو، بە ڕێکەوتیش بولبولیارم لە زیندانەکەی توتنباغی بینییەوە. کاتێک بینیم نەمویست خۆم وادەربخەم دەیناسم و نرخێکی تایبەتی هەیە لەلام، بەڵام تێگەیشتم کەسانێک لە بیرۆی باڵای حیزب لە بولبولیار پڕن و بڕیاری کوشتنیان داوە. لە سەردەمی ئێستاماندا کردنەوەی کۆمپانیایەکی ساختە چەند ئاسانە، لەساڵانی هەشتاشدا دەرکردنی بڕیاری کوشتن بۆ کەسێک وا ئاسان بوو. ئەو کات بولبولیار لە گۆڤارێکی بچوک و نهێنیدا کاریدەکرد کە گروپێک گەنجی وەک خۆی بە ناوی «کڵپەکان»ـەوە دەریاندەکرد، گۆڤارەکە گەرچی ژمارەیەکی کەمی لێدەردەچوو، کەمیش دەبینرا و

دەناسرا، بەڵام دوژمنایەتییەکی سەرسەختی خەتی شۆڕشی دەکرد. دەمێک ساڵ بوو حیزب بە دەست ئەم گروپە ئایدۆلۆژییە جیاوازانەوە دەیناڵاند کە هەموویان لە بنهەنگڵی شۆڕش خۆی دەرچووبوون. من پێشتر ڕۆڵی گرنگم لە سەرکوت و بێدەنگکردنیاندا بینیبوو، کەچی وەک هێزێکی نهێنی بمجوڵێنێت، هەمیشە دەستم لەم بولبولیارە دەپاراست. ئەوکات من سەردەمانێکی تایبەتی ساردی و دڵڕەقی دەژیام و ژیان و مردنی کەسم بۆ گرنگ نەبوو. کاتێک لە زیندانی توتنباغی لە شەرواڵ و کراسێکی کۆن و دڕاودا بینیمەوە، بێباک بووم بەرامبەری و گووتم گەر دەیانەوێت بیکوژن بابیکوژن بە من چی. بولبولیار لە توتنباغی کەوتبووە داوێکەوە من نەمچنیبوو، بۆیە بەلامەوە گرنگ نەبوو ئازادیبکەم. لە سەرەتاوە سەرنجمدا ئەو دوو گەنجە بە جۆرێکی تایبەتی و مەحکەم لە دیلەکانی دیکە جیاکراونەتەوە، بەڵام بۆ ئەوەی ناچار نەبم هیچ شتێک دەربارەی ڕابوردوو بۆ هەڤاڵی بەرپرس بدرکێنم، سەبارەت بەوان شتێکی ئەوتۆم نەپرسی کونجکۆڵی بجوڵێنێت. بەخۆم گووت گەر لە ئەنجومەنی باڵاوە بیانەوێت بیکوژن... بۆ نا... دیارە قازانجی شۆڕشی تێدایە. ئێستا لە دەستێکی لەوە مەحکەمتردا بوو من بتوانم ئاسان دەریبهێنم، بۆیە بڕیارمدا وەک دوو دیلی ئاسایی سەیریانبکەم، لەو دیلە زۆر و زەبەندانەی لە شۆڕشدا گیرابوون و بە جۆرێک لە جۆرەکان بە سزای شۆڕش گەیشتبوون. هەتا ئەوکات کە لە ئەنجومەنی باڵاوە فەرمانی کوشتنی هەردووکیان گەیشت، بێباک لە دەلاقەیەکی دەرگای زیندانەکەوە سەیرمکردن و هەستم بە هیچ نەکرد... دڵنیابووم هەر دووکیان دوو شۆڕشگێڕی ڕاستەقینەن، سەر بە جنسێکن لە ئادەمیزاد کە من هەوڵمداوە و نەمتوانیوە ببمە هاوشێوەیان. لە شۆڕشدا پێشتر کوشتنی گەنجانی وەهام بینیبوو، کوشتنی ناسیاو و هاوڕێی خۆم دیبوو. بەڵام دیمەنی هۆشەنگی بولبولیار بەو ڕیشە پڕ و برۆ باریکانەیەوە، بەو

نیگایەوە کە لە نیگای شۆڕشگێڕە ڕۆمانسییە دێرینەکان دەچوو، بەو هەستە تایبەتییەوە کە هێزێکی نهێنی تێدایە لە ئادەمیزادەکانی تردا نییە، چەند ساڵ بوو ئەو خواستەی لادروستکردبووم بیپارێزم، بەڵام ئێستا تادەهات دڵڕەقتر دەبووم، لە حیکایەتی خراپتر و لە ئازاردانی زۆرتر و لە بێباکی قووڵتردا ڕۆدەچووم. بۆ ئەوەی بێباکییەکەم نائاسایی دیارنەبێت و هەڤاڵی فەرماندە گومان لە بێدەنگیم نەکات، لابەلا و وەک شتێکی ڕاگوزەر پرسیم: دەبێت هۆی کوشتنی ئەم جووتە چی بێت؟.

فەرماندە کەسێکی نهێنیپارێز بوو، بەڵام من گەر سەیری چاویم بکردبایە دەمزانی ڕاست یاخود درۆ دەکات. ئەو ڕۆژەی لە کاتی پیاسەکردنێکی دوو قۆڵیدا پرسیارەکەم لێکرد، گووتی من جگە لەوەی فەرمانی لە خۆم بالاتر جێبەجێدەکەم هیچیتر نازانم، منیش باوەڕم پێکرد. دڵنیابووم گەر شتێکی بزانیبایە لە لەرەی دەنگ و شێوەی نیگایدا دەمخوێندەوە. بەڵام سەیربوو لەلام کە فەرماندە داوای لێکردم شەوی تیربارانکردنی هەردوو دیلەکە ئامادەبم و خۆم سەرپەرشتی ئەو کارە بکەم، بزانم ئاخۆ ژیان لە لاشەکانیاندا ماوە یاخود نا. من میوانێک بووم وەستابووم تا هەندێک مەترسی سەر ڕێگا دەرەوێتەوە و ئیدی بڕۆم، ئێستا بۆ دەبێت بۆ بینینی دیمەنی تیربارانکردنی دوو گەنجی وەها ئامادەبم و شەهادەت لە سەر مەرگیشیان بدەم. ئەگەرچی بینینی کوشتنی بولبولیار بۆ من سەخت بوو، بەڵام بێباکیم لەوێشدا کاری خۆی کرد و وایکرد سڵ لە جۆرە شەوێکی وا نەکەمەوە، جگە لەوەش دەمویست لە یاداشتەکانمدا ئەو کوشتنە بنوسم و بۆ ئەبەد تۆماریبکەم. ئەوەش بۆ خۆی بەهانەیەکی کەم نەبوو تا ئەو کوشتنە نەملەرزێنێت و بڕۆم و لە نزیکەوە بیبینم. پەشۆکان و تێفکرین و هاتوچۆ بێسەبرەکەی مایەی سەرسامی من بوو، دەمزانی لە دۆخێکدا شتەکان بێگرێ و کەم کێشەبن شڵەژانی وەها نایەتەگۆڕێ. تا شەو درەنگ دادەهات و تاریکی

قورستر دەبوو، فەرماندار نائارامتر دەردەکەوت. هەستمکرد ئەو دوودڵی و ڕاراییەی لەم پیاوەدا هەیە هۆکارەکەی دەروونییە و لە سۆنگەیەکی سیاسی یان لە کانی ترسێکی دییەوە نەهاتووە. دواجار کە کات گەیشتە وادەی خۆی، بە هاوڕێتی من و چوار پێشمەرگەی تر چووینەدەرێ، دوو پاچ و دوو خاکەنازمان هەڵگرت و بەرەو زیندان ڕۆیشتین. بولبولیار لە بەیانییەوە دەیزانی کە ئەمشەو دەکوژرێن... فەرماندار خۆی بەر لە خۆرهەڵاتن بەئاگای هێنابوون و هەواڵی تیربارانەکەی پێگووتبوون. ئێمە کە چووینە زیندانە شێدار و ساردەکەوە سێ فانۆسمان بە دەستەوە بوو، من وەک هەمیشە و بۆ ئەوەی هیچ وردەکارییەک لە دەست نەدەم، بۆ ئەوەی بتوانم دواتر لە یاداشتەکانمدا هەموو شتێک بنوسم، بە هێمنی و ساردییەوە سەیری تەواوی شتەکانم کرد، بەڵام جگە لە دەموچاوی سەیر و شاعیریانەی هۆشەنگی بولبولیار هیچ شتێک سەرنجی ڕانەکێشام. حەسیب، کە پێدەچوو منداڵتر و ترساوتر و کەم ئەزموونتر بێت، پەشێویی و زەردییەکی تۆخ لە سەر ڕوخساری بوو، لێوی کەمێک دەلەرزی، بەشێکی ئەو لەرزە بە کاری ترس و بەشێکی بە کاری سەرمای شەو بوو. من تا ئەوکات گوێم لە دەنگی کەسیان نەبووبوو، شێوەشیان لەبەرچاوم لە شێوەی گوناهبارانی گەورە نەدەچوو. بەڵام ئەو ساردییە ئەبەدییەی ناو ناخم، ئەو بێلایەنییە قووڵەی لە خۆمدا هەستم پێدەکرد، ڕێگربوون لە بەردەم ئەوەی شتێک بکەم یان بڵێم... هەردووکیان لەوە لاوازتربوون بتوانن ڕابکەن، برسێتی و سەرمای زیندان تێکیشکاندبوون، دوو جەستەبوون ئامادە بۆ سەیرکردنی مردنی خۆیان. لە چاوی هۆشەنگدا ئەو شانازییە دێرین و ئەبەدییەم بینییەوە کە لە هەموو دەورو زەمانێکدا لە چاوی شۆڕشگێڕاندا هەیە، جۆرە نیگایەکە کە لە بەر ڕۆشنایی فانۆسەکەدا گەورەتر دەردەکەوت. نیگای یەکێک کە دەزانێت بۆچی دەمرێت، یان لایەنیکەم ئەو هەستە بە

خۆی دەدات کە دەزانێت بۆچی دەمرێت. جۆرە سەیرکردنێکە شتێکی قووڵ لە شانازی و لە نائومێدیشی تێدایە، جۆرە نیگایەکە بۆ دوور... زۆر دوور، وەک ئەوەی بڵێت لە جێگایەکی تر یەک دەبینینەوە. گەرچی تەنیا چەند ساتێکی کەم لە ژوورەوە بووین، کە چووینە دەرەوە هەستمکرد دونیا بەرەو ساردتر گۆڕاوە. هۆشەنگی بولبولیار لەو ترس و غەمگینییەشدا منی ناسییەوە، هەڵبەت منی دەناسییەوە، پێشتر چەندین جار یەکدیمان دیبوو. بەڵام وەک یەکتر ناسینمان شتێکی بێنرخ و بێمانا بێت و هیچ شتێک لەمشەو نەگۆڕێت وەها دیاربوو. نیگاکانی بەرەو من شتێکی تایبەتی تێدابوو، کە ئەو کات دەمودەست نەمخوێندەوە و نەمزانی چییە. خۆی هێمنییەکی گەورەی پێوەدیاربوو، هێمنی کەسێک بیەوێت بەرامبەرەکەی بترسێنێت. لەو چەند ساڵەی شۆڕشدا هەندێجار دەرفەتی ئەوەم بۆ ڕەخسابوو لە نزیکەوە سەرنج لەو کەسانە بدەم کە بۆ مردن دەبرێن... هیچ کەسێکم نەبینیبوو لەوانە چاوەڕوانی موعجیزەیەک نەبێت. پەیوەندی مرۆڤ و تیرباران هەردەم لە سەر موعجیزە بەندە. ئەوەی کە تیرباران دەکرێ تا دوا چرکە، تا ئەو ساتەش کە دوا هەناسە دەدات، هەر چاوەڕوانی موعجیزەیە. هەتا ئەو مرۆڤانەی کە هەرگیز باوەڕیان بە موعجیزە نەبووە، لەو ساتەدا هیچ چارێکیان نییە جگە لەوەی باوەڕ بە موعجیزە بهێنن. ئەوەی جێگای سەرنجی من بوو، ئەوەیە زۆرجار بکوژانیش چاوەڕوانی جۆرە موعجیزەی وەهان، بکوژانیش دەیانەوێت شتێک ڕووبدات و دەست بگێڕنەوە و ئەو کارە نەکەن کە هەر دەبێت بیکەن. من لەو باوەڕەدام هەموو پیاوکوژێک... هەموو پیاوکوژێکی دونیا لەو ساتەدا کە دەکوژێت، چاوەڕوانی موعجیزەیەکە نەهێڵێت ئەوە ڕووبدات کە هەر دەبێت ڕووبدات. بەڵام من وەک کەسێک کە ژیانم لەو شوێنە سەیر و لە نزیک ئەو ڕووداوە عاجباتیانەوە بە سەر بردبوو، دەتوانم بڵێم شتێک نییە ناوی موعجیزە بێت. هەرکات شتێک بێتە پێشی بکوژان

دەستبگێڕنەوە هۆکەی ناگەڕێتەوە بۆ موعجیزەیەک، بەڵکو بۆ نهێنییەک کە لەو ساتەدا لە بەرچاوی ئێمە بەیان نییە و لە بەهانە و تەلیسمی پشتی تێناگەین. ئەو ڕۆژە کە هۆشەنگ و هاوڕێکەیمان برد بۆ مردن، لە چاوی هۆشەنگدا ئەو چاوەڕوانییە گەورەیەی موعجیزەم نەبینی. هەستم نەکرد زۆر توند بە ژیانەوە نوسابێت، بەڵام لەبری ترس و کۆیلەیەتی بۆ ژیان، ئەو ناسکییەم چاوکرد کە جار جار لە ڕوخساری پیاوانی تێکشکاودا دەردەکەوێت، شتێک من بە ناسکی دۆڕاوەکان ناویدەنێم. جۆرە نیگایەکە گلەییەکی نائومێدانەی دەرهەق بە دونیا تێدایە، گلەییەکی نەرم بەڵام قووڵ و پڕ لە حەسرەت، ئاوێنەی ڕۆحێکە گەرچی چیتر ناتوانێت ئازاری کەس بدات، بەڵام تێدەگات دونیا چ ئازارێکی داوە. ئەو شەوە کە لە سەر ڕوناکی فانۆس و لە ناو کزەی نیوەشەودا سەیری ئەو نیگایانەی هۆشەنگم دەکرد، واهاتە خەیاڵم کە خۆی بە مەبەست هەموو شتێک دەکات تا ئەو ناسکییە گەورەیەش بشارێتەوە و وەک پیاوێک دەرنەکەوێت بیەوێت لە ڕێگای مەرگی خۆیەوە پەیامێکی تایبەتی بۆ دونیا بنێرێت. وەک ئەوەی بزانێت گەر پەیامێکیشی هەبێت، ئەوانەی دەوروبەری، ئەوانەی دەیبەن بۆ مردن، لەو پەیامە تێناگەن.

لەبیرمە ئەو شەوە فەرماندار وەک جاران نەبوو. من بیستبووم کە بێباک و کەمخەم خەڵکانی زۆری تیربارانکردوە، لە شەڕدا جەنگاوەرێکی بکوژ و بێباک بووە، بە جۆرێک وامدەزانی کوشتن بۆ ئەو، وەک کارێکی سادەی لێهاتووە کە نە هەستی کینەی لە پشتە و نەمایەی پەشیمانیشە. بەڵام ئەو شەوە ئەویش وەک ئەوانەی دەبوو بکوژرێن پەشێوبوو، وەک ئەوان دەلەرزی... من هیچ تێنەدەگەیشتم، هیچ تێنەدەگەیشتم. نزیکی کیلۆمەترێک دوور لە گوندەکەوە، گۆرستانێکی بچوک هەبوو. هەموو بە بێدەنگی دەڕۆیشتین، هەستمکرد شتێکی قورس لە هەوای شەودا دڵی هەموانی گرتووە، شتێک تەنیا لە بۆی ئەو خوێنە هەڵناستێت کە

کەمێکی دی لە پێشدەمماندا دەڕێژرێت، بەڵکو لە کۆی مانای دونیا و لە سروەی نێو تاریکی و شەماڵی کوشندەی ئەم سەرزەمینەوە دێت کە شەو توند هەناسەی بەستووە... وەک ئەوە نەبوو کە ئێمە وەک مرۆڤ نەتوانین هەناسەبدەین، وەک ئەوەبوو جیهانی چواردەورمان، درەختەکان و ڕووەکە بچوکەکانیش نەتوانن هەناسەبدەن. کە گەیشتینە گۆڕستانەکە، من هەستم بە هەناسەتوندییەکی زۆر کرد. هەر یەک لە هۆشەنگ و حەسیبی بچکۆلە بە هێمنییەکی گەورەوە سەیری ئێمەیان دەکرد، چاوەڕوانی ئەوە بوون شتێک ڕووبدات، دڵنیابووم ئەو چەند ساتە کەمەی ماویانە لە سەر ڕۆشنایی جوڵە و کرداری ئێمەدا بیر لە ژیان دەکەنەوە. لەو ساتەدا کە سەیری روخساری هەردووکیانم دەکرد خەیاڵم لای ئەو راستییە سەیرەبوو کە مرۆڤ تا ساتی مردن، جارێکیش چییە بە تەواوی ناتوانێت بگەڕێتەوە ناو خۆی و لەوێدا دیوارێک دروستبکات و نەهێڵێت ئەوانی دی لێوەی دزەبکەنە ئەودیو. هەردوو دیلەکە هێندەی سەیری ئێمەیان دەکرد و لە جوڵە و نیگای ئێمە ڕادەمان، خەریکی بیرکردنەوە لە مردنی خۆیان نەبوون... هەستمکرد ڕەنگە ئەوە جۆرە بەختەوەرییەک بێت کە مرۆڤ دەتوانێت تا دواسات کاتی خۆی لە تێڕامان لەوانی دیدا بباتەسەر. مرۆڤ لای من هەمیشە ئەو مەخلوقە بێمانایەیە کە هەموو ژیانی لەسەیرکردن و تێڕامان لەوانی دیدا بەهەدەردەدات، هێندەی لەوانی دی دەڕوانێت سەیری خۆی ناکات، گەر سەیری خۆشی بکات، بۆ ئەوە سەیریدەکات تا ببینێت ئەوانی دی چۆن دەیبینن. بۆ نمونە، من خۆم یەکێکم لەوانەی ژیانم لە سەیرکردن و چاودێری ئەوانی دیدا بردۆتە سەر، گەلێک درەنگ، کەوتمە سەر بیرکردنەوە و تێڕامان لە خۆم، کەوتمە پرسیار لە خۆم: من چیم و بۆ هێندە لەوانی دی ڕادەمێنم، بۆ عومرم لە تەماشای ئەوانی دیدا بەهەدەر دەدەم؟. لە راستیدا واتێدەگەم، ئینسان بۆ ئەوەی بتوانێت تەماشای خۆی نەکات، ناچارە بەردەوام

لەوانی دی بڕوانێت. ئینسان مەخلوقێکە تەنیا بەرگەی دیتنی ڕوخساری دەرەوەی خۆی دەگرێت و هیچی تر، کە زۆر لە ناخی خۆی ڕوانی دەشێت شتی ترسناک ببینێت... ترسناکتر لەوەی خۆی چاوەڕوانیکردوە. بە هەرحاڵ بۆ ئەو دوو گەنجە و لەو شەوە تاریکەدا، کە فاسیلەی ژیان و مەرگ تەنیا موویەکی باریک و چرکەساتێکی تەنگ بوو، بیرکردنەوە لە ناخ نەشیاو و ناپێویستیش بوو. فەرماندە بێئەوەی گەرمی و جونبشی جارانی تێدابێت، سەرو پاچی دایە دوو دیلەکە و بێئەوەی خۆشییەک لە دەنگیدا بێت گووتی، «گۆڕەکانی خۆتان هەڵکەنن». قسەی فەرماندار سارد و دەنگی وەک کزەی شەو وشک بوو. هەستمکرد لەو ساتەدا ئەوەی کە دەبێت کارێکبکەن، شتێک لە ترسی مردنی لێتەراندن. ئەوانەی لە شۆڕشدا دەمانکوشتن، زۆریان دەبایە خۆیان گۆڕی خۆیان هەڵبکەنن، من سەرنجی ئەوەم دابوو کە هەموو کوژراوەکان بە گەرمییەکی نائاساییەوە ئەو کارەیاندەکرد، کە بیرم دەکردەوەوە و دەمهێنایە پێشچاوی خۆم، قورس بوو تێبگەم بۆ لە دواساتی ژیانی خۆیاندا شان دەخەنە ژێر کارێکی وەها قورس و بێمانا. لە ئەندێشە و خەیاڵاتی خۆمدا دەمگووت کاری وا بۆ من نەکردەیە، ساتێک هاتە سەر کوشتنم، با ئەوان گۆڕەکەم بۆ خۆشبکەن و خۆیان پاچکاری زەویم بۆ لە ئەستۆ بگرن. بەڵام کە قووڵ تێدەفکرام، دەگەیشتمە ئەو باوەڕەی، هەموو شانۆگەرییەکە لە سەر سێ بنەمای سەرەکی بەندە، یەکێکیان درێژکردنەوەی ژیانە بۆ چەند چرکەساتێکی تر، دووەمیان چاوەڕوانکردنی ڕوودانی موعجیزەیەکی خودایییە لەو چرکەساتانەدا، سێهەمیش بە جوڵە و جونبوشی پاچکاری، لەش تا ئاقارێک بەرن وەها ماندوو بێت مەرگی پێ سەخت نەبێت.

ئەو شەوە من ئارامییەکی سەیرم تێدابوو، وەک ئەوەی تەواوی وێنەکان دیمەنی دووبارەی شانۆنامەیەکی دێرین بن، کە من پێشتر هەموو سەحنەیەکیم چەندجار بینیوە و لە یادەوەریدا هەڵمگرتوون. هۆشەنگی

بولبولیار بەر لە حەسیب گۆڕەکەی خۆی تەواوکرد، ئەو کاتەی خەریکی پاچکاری بوو، بەسەبر و هێمنی کەسێکەوە کاریدەکرد، جێگایەکی خۆش بۆ دواهەمین ماڵی بسازێنێت. تا لە کۆتایی نزیک ببووینایەتەوە، حەسیب زیاتر دەلەرزی، وەک ئەوەی گوێی لە دەنگی مردن بێت، گوێی لە چرپە و ترپەی بێت. هەردووکیان کە تەواوبوون بە هێمنی پاچەکەیان دانا و سەیرێکی ئێمەیان کرد.

ساتێکی سەیربوو، بولبولیار لە ناکاو سەیرێکی قووڵ و درێژی منی کرد و وەک خەیاڵی لای مردنی خۆی نەبێت، گووتی «هەڤاڵ دەبینم چی لە پشتی تۆیە، دەبینم». ئەوە ئەو ڕستەیە بوو کە هەموو ژیانی منی لە بنەوەرا گۆڕی و ئەو موعجیزە خوداییەش بوو کە ژیانی بولبولیاری ڕزگارکرد. کەس تێنەگەیشت بولبولیار مەبەستی چییە، بەڵام من دەمزانی دەڵێت چی.. دەمزانی. وەک شێت فەرماندەم بردە ئەو لاوەو پێمگووت «بولبولیار نابێت بکوژرێت.. نابێت بە هیچ جۆرێک بکوژرێت». فەرماندە هیچ لەو گۆڕان و شپرزەبوونە کتوپڕەی من تێنەگەیشت، من بەتوڕەییەوە یەخەیم گرت و گووتم «هەڤاڵ تێدەگەیت، ئەو کۆمەڵێک نهێنی دەزانێت پەیوەندی بە ژیان و مردنی منەوە هەیە... تێدەگەیت... لەبەر ئەوە نابێت بمرێت». فەرماندە سەراسیمە گووتی «هەڤاڵ ئەمری ڕەمیکردنەکەی لە مەکتەبی سیاسی حیزبەوە دەرچووە. نازانم چی بکەم و چیت پێبڵێم». ئینجا بە حەپەسانەوە گووتی «باشە هەڤاڵ... باشە... لێیدەگەڕێم، بەڵام دوایی خۆت چارەیبکە». بەتوڕەییەوە گووتم «خەمت نەبێت، من چارەیدەکەم... خەمت نەبێت، من خۆم هەموو شتێک لەگەڵ هەڤاڵانی ئەنجومەندا دەبڕێنمەوە». دوای ئەوە فەرماندە گەڕایەوە بۆ لای دیلەکان و پاش کەمێک بیرکردنەوە چووە ناو گۆڕەکەی هۆشەنگ و بە وردی سەیریکرد و دەستێکی کێشا بە پشتی بولبولیاردا و بە خەندەیەکی ساردەوە گووتی « هۆشەنگ ئاغا ئەم گۆڕە بۆ تۆ زۆر

باشە، هەستدەکەم بە ئەندازەی باڵات بێت، نە گەورە بێت و نە بچوک. بەڵام پێدەچێت ئەمشەوە شەوی مردنی تۆ نەبێت. ئەمرم بۆ هاتووە نەتکوژم... گەر بە دەستی من بووایە لێدەگەڕام حەسیبیش بژی. بەڵام خۆتان پێشمەرگە بوون و دەزانن، ئەمر ئەمرە، ببورە حەسیب، دەزانم مردن شتێکی ئێجگار وا سادەش نییە، بەڵام ئەوەی ئەمشەو دەکوژرێت تۆیت... بە تەنیا». منیش بێباکانە دەستم بە سەرمدا هێنا و بێئەوەی بزانم بۆ، بەدەر لە ویستی خۆم، دڵڕەقانە سەیری حەسیبم کرد و بە دوای فەرماندەردا گووتمەوە «تۆ بە تەنها». وەک ئەوەی خۆشحاڵبم کە ئەمشەو ئەو بە تەنیا دەمرێت، شادییەکی نهێنی لە دڵ و دەنگمدا بوو. کە ئەو وشانە لە زارم ترازان و سەیری چاوانی حەسیبم کرد، بۆ یەکەمجار ئەو سامە گەورەیەم لە چاوانیدا بینی کە سامی چرکەساتەکانی پێش مردن بوو، ئەوە نیگایەکی تایبەتییە کە تێیدا چاو بە هەموو گەورەیی خۆی بۆ سەیرکردنی سامی مردن و ماڵاواییکردن لە دونیا دەکرێتەوە، بە جۆرێک وادەزانم کە بەو نیگا گەورە و کراوەیە کەسی مردوو دەیەوێت بەر لە دوا ماڵاوایی، هەرچی شتێک تا ئەوساتە لە دونیادا نەیبینیوە، بیبینێت. هۆشەنگی بولبولیار وەک پێشتر سارد و بێدەنگ دیاربوو، بەڵام من خەندەیەکی تاریک و نهێنی و نادیارم لە ڕوخساریدا بینی، بزەیەک هێندەی خەندەی گاڵتەجاڕی و بێباکی و غەم بوو، خەندەی بەختەوەری نەبوو. وەک ئەوەی گاڵتەی بە شتەکان بێت، سەیرێکی فەرماندەری کرد و هیچی نەگووت. دوای بێدەنگییەکی کورت، فەرماندە دوو لە پێشمەرگەکانی بانگکرد و گووتی «هۆشەنگ بگێڕنەوە بۆ زیندانی خۆی و دەرگاکەی مەحکەم قفڵبکەن، تادێمەوە خۆتان پاسەوانی بن. ها حەسیب دەبینیت یەکێک لە باشییەکانی مردن ئەوەیە، ئیتر کەس دەرگات لە سەر داناخات... کەس... تادەگەیتە ئەو دونیا کاری وات لە کۆڵ دەبێتەوە». گاڵتەکەی فەرماندە هەم نابەجێ و هەم ئازاربەخش

بوو. هەستم بە ئازارێکی گەورە کرد لە دڵمدا، پڕ بە دڵ حەزمدەکرد بڕۆم و ئەو جێگایە بەجێبهێڵم... بەڵام سەیرکردنی کوشتن، سیحرێکی گەورەی لە سەرم هەبوو، دەبوو تا کۆتایی بمێنمەوە.

دوای ڕۆیشتنی هۆشەنگ، ئەژنۆکانی حەسیب شل بوون و وەک یەکێک دەست لە هەموو ئومێدێک بەردا، توند پەنجەکانی خۆی لە یەک گیرکرد و کەوتە سەر ئەژنۆ و چاوی نوقاند، وەک ئەوەی نەیەوێت هیچ ببینێت، ئیتر چاوی نەکردەوە، هەرگیز چاوی نەکردەوە... من وام دەزانی گەر لە دوا ساتیشدا بێت، دەمێک کە گوللەکان دەیپێکن بێویستی خۆی چاودەکاتەوە و دوا سەیری دونیا دەکات، وامدەزانی لە دواجاردا تەسلیمی ئەفسونی ئەم دونیا قەشەنگە دەبێتەوە و دوا نیگای لێدەهاوێت، بەڵام ئەو دوا وزەی ناو لەشی خۆی لەوەدا سەرفکرد کە چاوی توندتر و توندتر دابخات و نەهێڵێت هیچ وێنە و ڕۆشناییەکی نوێ بۆ ناوەوە دزەبکەن. ئەو ساتەش کە گوللەکانی فەرماندار پێکایان، چاوی بە هەمان توندی نوقاندبوو، بە جۆرێک کە لە سەر سەری وەستام و بە سەر دوا ساتەکانی ژیانیدا نوشتامەوە، دڵنیابووم ئەم لەشە بچوکە هەموو شتێک دەکات تا ئیرادەی بە سەر ڕۆحکێشانی خۆیدا هەبێت. من کە ترپەیم گرت و دڵنیابووم چیتر دڵی لێ نادات، بە هێمنی دەستم خستە سەرچاوی و بێئەوەی شتێکی بایەخدار بڵێم، گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، یەک خولیام هەبوو هۆشەنگی بولبولیار ببینم و تێبگەم چۆن دەتوانێت نهێنی گەورەی ژیانی من ببینێت، ئەو نهێنییەی ئەو نەبێت کەس نایبینێت. ساتێکی سەیری تری ژیانم بوو، لەو ساتانەی کە تێیدا هەستم بە هیچ نەدەکرد، نە بە غەم، نە بە شادی، بەڵکو بۆشاییەکی گەورە ناخمی دەگرت و وایدەکرد هەست بە هیچ نەکەم.

# لیڤیتانت چۆن لە مانای ئەشکەنجە تێدەگەیشت

دوای دوو ڕۆژ مانەوە لە زیندانی پسمامان، لە نزیکەوە دڵڕەقی ڕاستەقینەی لیڤیتانتم بینی، ئەوەی زیندانەکان لە شوێنێکی زۆر شێدار و بێجێدا دەخەوتن، چ کەرەستەیەکی خۆ گەرمکردنەوەیان نەبوو، بەتانی و ڕاخەرێکی کەمیان لە ژێردابوو، لە شتە سادە و لە دیاردە ئاساییەکانی زیندانەکە بوو. من ئەوکات ئەو هەلومەرجە نەیترساندم و پێم نەنگییەک نەبوو دیلەکان لە جۆرە جێگایەکی وەها و لە ژێر بارودۆخێکی لەو جۆرەدا بژین. نزیکی هەشتا دیلمان لەوێکانە هەبوو کە پێکڕا هەموو کوردبوون... دوایی تێگەیشتم کە سەربازە عەرەبەکان لە جێگایەکی دیکە و لە زیندانێکی تایبەتیتردا دیلدەکرێن و لە هەلومەرجێکی کەمێک باشتریشدا ژیان دەبەنەسەر. گرتووخانەی پسمامان زیندانێکی گشتی بوو، خەڵک بە هەر تۆمەتێک بگیرابایە دەیانهێنایە ئەوێ. لە شێتی ئاساییەوە تێیدا بوو تا هەندێک لەوانەی بە تۆمەتی کۆمۆنیستی یاخود جاشێتی گیرابوون، بەڵام زۆربەیان ئەو کەسانە بوون کە لەو دەڤەرانەدا کێشەیان هەبوو، لە خەڵکانی زۆر بێخەتاوە تا کەسانێکی عەشایەر کە خوێش و نزیکی خۆیان کوشتبوو. ڕۆژانە دەبوو پاسەوانەکان چەند زیندانێک ببەن بۆ چیاکان بۆ داربڕین و چیلکە کۆکردنەوە. هەندێک بێگاری تریش لە بەرنامەدا بوو کە بەرپرس و کەسانی حیزبی لەو دەڤەرەدا داوایاندەکرد. لیڤیتانت بەوەوە نەدەوستا و دوو ژووری تایبەتی بۆ سزا و ئازاردان دروستکردبوو. ڕۆژی دووەمی کارکردنم لەوێ بردمی بۆ بینینی ژووری ئەشکەنجە چکۆلانەکەی خۆی، لە ڕێگادا بەرەو ئەوێ یەکەمین گفتوگۆی فەلسەفیانەی من لە شۆڕشدا دەستی پێکرد. لیڤیتانت

بە مۆنییەکەوە پێیگوتم «مرۆڤ بەوەدا جەستەی هەیە، لاوازە و هەر واش دەمێنێتەوە... خاڵی لاوازیمان وەک ئینسان جەستەیە نەوەک ڕۆح، هەر کات دەستمان بە سەر جەستەی کەسێکدا گرت، درەنگ یان زوو دەتوانین دەست بە سەر ڕۆحیشیدا بگرین. هەر لەبەر ئەو هۆیەش ئینسان قابیلی شکستە، چونکە ئینسان هەرچییەک بکات ناتوانێت خۆی لە ترسی ئازار ڕزگاربکات. گەر ئازار نەبایە دەبوو دروستیبکەین... دەبوو دایبهێنین... ئەگەر ئازار نەبایە ئینسان تەنیا جانەوەرێکی یاخی دەبوو، تەنیا ئازار دەتوانێت ئینسان جڵەوبکات... ئەوە تەنیا لغاوە کە دەتوانین بیکەینە دەمی ئەم هێسترە چەموشەی ناوی بەنیئادەمە».

لە ساڵانی دواتریشدا هەرکاتێک گوێم لە قسەکانی دەگرت، ئەو هەستەی لا جێدەهێشتم کە خۆی لە جنسێکی جیاوازتر و بەهێزتر لە ئینسان دەبینێت.

من لە ژیانی دوورودرێژی شۆڕشگێڕیمدا تەنیا چەند کەسێکی کەمم بینیوە کە هەرکات وشەی ئینسانیان بەکارهێنابێت، مەبەستیان ئەوانی دیکە بووە نەوەک خۆیان. خۆیان هەمیشە شتێکی باڵاتربوون لە ئینسان، گرنگتر و ئازادتر و مەعسومتر. لیڤیتانت یەکێک بوو لەوانە.

من ئەوکاتیش شتێکم لە سەر لاوازیی ئینسان دەزانی، بەڵام لە لیڤیتانتم پرسی « پێتوانییە خۆدزینەوە لە ئازار، تاکە نیاز و تاکە ئارەزووی مرۆڤ بێت؟». پرسیارێکی سادە و تێپەڕبوو کە هەر کتوپڕ بە خەیاڵمدا هات. لە ڕاستیدا منیش وامدەبینی کە ئێمە هەموومان و هەمیشە لە ئازار ڕادەکەین... بەڵام دەرەنجامگیرییەکانی لیڤیتانت بۆ من سەرەڕەژێن و غەماوەر بوون. گوتم «جەنابی لیڤیتانت، جەنابی لیڤیتانت... ئازار ئەبەدییە... تاکە شتێکە کە ئەبەدییە، چونکە شێوە و ڕەنگی نییە». ئەوکات گەنج بووم، توانای تەعبیرم نزم و شێوەی زمانم لە خوارێ بوو، کە گوتم ئازار شێوەی نییە، مەبەستم بوو بە

لیڤیتانت بڵێم، ئازاری لەش کوشندەترین شێوەی ژان و ئێش نییە، بەڵکو لەو ئێشە سامناکتر ژانی بیرکردنەوەیە... بیرکردنەوەکان دەتوانن ئامێرێکی ترسناک بن و وەک ماشێنێکی قیمەکردن لە ناوەوە بمانجنن. ئەوسا نەمدەزانی لیڤیتانت یەکێکە لەو پیاوە سەیر و ئاڵۆز و بێبارانەی لە ژیانمدا دەیانبینم. ئەو بێ خۆماندووکردنێکی زۆر لە نیازم تێگەیشت و گووتی «وەفای ڕەفعەت بەگ، ئەوەی ئینسان زۆر لێی دەترسێت ئازاری لەشە... ئێمە لێرە ئیشمان وا لە زیندان، وەزیفەمان ئەوەیە بزانین ئینسان زۆرتر لە چ ئازارێک دەترسێت. من ئەو ماوەیەی لێرە بردومەتە سەر، ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر تێدەگەم ئینسان تەنیا کەمێکی ڕۆحە، کەمێکی تێفکرینە، زۆری گۆشتە، زۆری ئێسکە، زۆری ترس و ئارەزووە. لە ناو ئەم شاخ و بەردەڵانەدا، بیرکردنەوە ناتوانێت ئینسان ئازاربدات، لێرە سەروکارمان لەگەڵ جووتیار و گوندەکی و خەڵکی بێئیشی قەزا و ناحییەکان و خەڵکی سادەدایە... هەتا کۆمۆنیستە خوێندەوارەکان، ئەوانیش ئەوەندەی لەوە دەترسن لەشیان بەرگە نەگرێت و زەلیل بن لە هیچی تر ناترسن... تەنیا شتێک کە ئینسان دەستەمۆ و زەلیل دەکات، لە شێتی... ها ڕۆح؟ من گومانم هەیە گوندەکییەکان و خەڵکی ناو ئەم چیایانە ڕۆحیان هەبێت... ڕۆح قسەیەکی پوچە، دەستکردی خوێندەوارەکانە، دەستکردی ئێوەیە».

بۆچوونی ئەو لە سەر گوندەکی و جووتیارەکان مایەی ناڕەحەتییەکی گەورەی من بوو. بۆ ئەوە هاتبوومە چیا تا لە پێناوی ئەواندا خەباتبکەم. ئەوەی لیڤیتانت بەوجۆرە وەک ئاژەڵی بێڕۆح تەماشایدەکردن بۆ من قەبووڵ نەدەکرا. بێئەوەی هیچ بڵێم یان نیازی خۆم ئاشکرابکەم، ئەو دووردڵیمی خوێندەوە و گووتی «هەموو ئەو خوێندەوارانەی دێنە شۆڕشەوە، بە خەڵکانی جووتیار مەستن. بە قودسییەتەوە سەیری گاوانەکان دەکەن، وادەزانن ئەم گوندەکییە پیس و چەپەڵانە خەڵکی موقەدەسن، دێن و

پڕن لە خەیاڵاتی خۆفیداکاری لە پێناوی ڕەش و ڕووتاندا. هەر کەستان چەک هەڵدەگرێت بەو نیازە دێت لە پێناوی ڕەنجدەر و جووتیارانی کورددا بمرێت. من حەوت ساڵە لەگەڵ ئەم شۆڕشەدام، هەموو کون و کەلەبەری دەناسم. کونج و کەلێنێکی نییە سەرم پێدانەکردبێت... لەم حەوت ساڵەدا، لە زیاد لە هێزێک و لە زیاد لە ناوچەیەکدا ئیشمکردوە، هەم پێشمەرگە بووم و هەم ئەندامی چالاکی حیزب. هەر خوێندەوارێکم بینی بێت، بۆ ئەوە هاتووە خۆی ئازاربدات، بۆ ئەوە هاتووە خۆی فیدابکات، زۆربەتان دێن بۆ ئەوەی بمرن، یاخود لایەنیکەم ئەوەتان لە پێشچاوە کە دەشێت بمرن، پێشوەخت زەعیفن و مردنتان خستۆتە حیسابەوە، ئەوەتان قەبووڵکردوە. بەڵام من ، من... لە جۆرێکی ترم... من لە نێوان شار و گوند دا گەورەبووم، هەم خەڵکانی خانەدان و خوێندەوارم بینیوە، هەم لەناو ڕەش و ڕووتاندا ژیاوم. هەم خوێندەوارییەکی کەمم هەیە و هەم دەزانم وەک ئەم گوندەکیانەش زەوی بکوتم. بەڵام دڵم سەر بە هیچیان نییە... دڵی من سەر بە هیچ شتێک نییە... هیچ شتێک. مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت تا کۆتایی بمێنێتەوە، دەبێت ئەو خەیاڵە لە سەری خۆیدا دەربکات لە پێناوی شتێکدا بمرێت. وەفای ڕەفعەت بەگ، جگە لە ئێوە، جگە لەم خوێندەوارە بێمێشکانەی کە خودا سەرتان لێتێکدەدات و دێنە شۆڕشەوە، کەس لێرە نایەوێت لە پێناوی هیچدا بمرێت».

من گەرچی زۆر سڵم لێدەکردەوە، بەڵام زۆرم لە خۆم کرد و گووتم «کەوایە ئێمە بۆ لێرەین، بۆ هەموو هاتووینەتە ڕیزی شۆڕشەوە. شۆڕشگێڕ کەسێک نییە کە دەبێت لە پێناوی میللەتدا بمرێت؟». بە سەرسامییەوە سەیریکردم و بە گرژییەکی کتوپڕەوە گووتی « من نەهاتووم بمرم، من بیرم لێکردۆتەوە، هەموو شۆڕشێک بەدووجۆر لە مرۆڤ دەکرێت، جۆری یەکەم شۆڕشگێڕە گەمژەکانن کە دێن بۆ ئەوەی بمرن، بۆ ئەوەی شەهیدبکرێن، بۆ ئەوەی بەپێی خۆیان خۆیان فڕێبدەنە هەلاکەتەوە.

ئەوە ئەو شۆڕشگێڕانەن کە لە دژی ئازار ڕانەپەڕیون، پێویستیان بە ئازارە، وادەردەخەن ئامادەن بەرگەی هەموو دەرد و ئازارێک بگرن. ئەوانە شتێکیان پێویستە بۆی بمرن، هەندێکیان ئازایانە بۆی دەمرن و هەندێکیان ترسنۆکانە... بەڵام من خۆم لە ئازار ڕادەکەم. شۆڕش هیچ نییە جگە لە یاخیبوونێکی گەورە لە ئازار، شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە ئەوەیە کە دەکوژێت بۆ ئەوەی بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئازار نەچێژێت، بۆ ئەوەی لە ریزی بەهێزەکاندا بێت، لە بەری براوەکاندا... شۆڕش بەر لە هەر شتێک بۆ ئەوەیە من دواهەمین کەس بم کە دەمرێت، دواهەمین دۆڕاوبم، دواهەمین بم لە ڕیزی ئەوانەی ئازار دەچێژن. بەڵام ئازار لە هەموو شوێنێکدایە، بچین بۆ هەر جێگایەک پڕە لە جەلاد کە بەجلی ئاساییەوە دانیشتون، هەر کەسێک لەوانەی لەم زیندانەدا دیلە یان لەوەوبەر دیلکراوە یان سبەی دیلدەکرێت دەتوانێت بێتە جێگاکەی ئێمە. هەر کەسێک جوان بیری لە چارەنوسی خۆی و دڕ و دڕندەیی ئەوانی تر کردەوە دەبێت بە جەلاد... سەیرمبکە... وەفای ڕەفعەت بەگ، من کە لەم زیندانەدا بووم بەجەلاد لە بەریەک شتە، بۆ ئەوەی نەهێڵم ئازارمبدەن. من لە ترسی ئازار لێرەم... لە ترسی ئازار».

کە وایدەگووت چاوانی نیگایەکی سەیری تێدابوو، بریسکەی ترسێکی گەورە کە کەمجار لە چاویدا دەمبینی.

ئەو ڕۆژە کە پێکەوە چووین بۆ پشکنینی زیندان و بینینی ژووری بچوکی ئەشکەنجە، دڵنیابووم پیاوێکی ترسناکم ناسیوە، شتێک لە ناوەوەم پێیدەگووتم کە لیڤیتانت گەرچی لێرە وەریگرتووم و گەلێک ڕوخۆشە لەگەڵمدا، بەڵام لە بێدەنگی و زیرەکیم دەترسێت، زیرەکی گەنجێکی دانیشگایی کە خاڵی نییە لە ساردی و بێڕەحمی و بێدەنگی، کە لە شوێنێکی وەهادا هەرسێکیان دەشێت چەکی کاریگەربن و لە داهاتووی دووردا جێ بە لیڤیتانت لەقبکەن. من دڵنیابووم لە کەسی

لیڤیاتانتدا یەکێکم ناسیوە جێگای متمانە نییە. لە نیهانی خۆمدا گووتم هەر کەسێک بیەوێت دواهەمین کەس بێت بمرێت ترسناکە، چونکە منیش بۆ خۆم دەمەوێت دواهەمین کەس بم. بەڵام ورد سەیری دەوروبەری خۆم و لیڤیاتانتم کرد و هیچم نەگووت. ئەوە سەرەتای دارشتنی کاراکتەری شۆڕشگێڕانەی من بوو، وەک پیاوێکی بێدەنگ و نهێنکار و ئاڵۆز... کە دواتر بووە هۆی ئەوەی ساڵ دوای ساڵ بە پایەکانی شۆڕشدا هەڵزنێم و دوای ڕاپەڕین کونجێک لە حوکمدا داگیربکەم.

ژووری ئەشکەنجەی لیڤیاتانت جێگایەکی ناچیز و بچکۆلەبوو، کە یەکەمجار چوومە ژوورەوە، شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشم تێدا نەبینی. من وامدانابوو هیچ نەبێت هەندێ کەرەستە و ئامێری سەرەتایی ئازاردان ببینم، بەڵام لە ڕاستیدا جگە لە کورسی و مێزێکی ئاسنی کۆن، کە هەردووکیان ژەنگ خواردبوونی هیچی تێدا نەبوو. لە لیڤیاتانتم پرسی «ئەی کەرەستەکانی ئازاردانت لە کوێیە، بەچی ئەشکەنجەی دیلەکانت دەدەیت؟». پێکەنی و گووتی «بە دەستی خۆم، لە دەست زیاتر بۆ ئەشکەنجە کەرەستەیەکی باشتر لە دونیادا نییە. جارجار گەر شوڵکێک، قامچییەک، گۆپاڵێک بەکاربهێنم تەنیا بە هەوای تاقیکردنەوە ئەوە دەکەم». کەمێک بۆنی ژوورەکەی کرد و گووتی «لە ڕێگای ئەشکەنجەوە هێزی خۆم تاقیدەکەمەوە، دەمەوێت بزانم توانای من تاکوێ دەگات. لە ڕێگای ئامێرەوە دەتوانم بۆ دوور بڕۆم، ئازار بگەێنمە دوا سنووری خۆی، ئەو سنوورەی کە چیتر گەڕانەوەی تێدا نییە. بەڵام هەر کەرەستەیەک یان مەکینەیەک بخەمە کار، لەزەتی ئەوەم لێزەوتدەکات هەستبکەم ئەوەی لە شەڕدایە منم. کە ئامێر پەیدابوو جەستەی زیندانییەکەی ژێر دەستیشت دەبێتە مەکینەیەکی تر، دەبێتە جەنگ لە نێوان دوو مەکینەی گەورەدا، بەڵام من مەبەستم نییە کەس بکوژم، مەبەستم ئەوەیە تێبگەم توانای من بە سەر ئەو کەسەی لە بەردەممدایە تا کوێ دەگات. پەیوەندی جەلاد

بەو کەسەوە کە ئەشکەنجە دەخوات، لە پەیوەندی دوو زۆرانباز دەچێت... دوو زۆرانبازی سەرسەخت. گەر ئامێرێک لە گۆڕێ بێت، ئەوە ئامێرەکان دەیبەنەوە، ئەوە ئامێرەکان دەبن بە سەر دیلەکاندا سەردەکەون، بەڵام من دەمەوێت دیلەکان تێبگەن ئەوە منم بە سەریاندا سەردەکەوم».

ژوورەکە بۆنێکی نائاسایی لێ نەدەهات، من هیچ ئاسەوارێکی تایبەتیم نەبینی... بە ئەسپایی بە لیڤیتانتم گووت «ژوورێکی گەلێک ئارامە... زۆر هێمنە». بۆ یەکەمجار دەستی خستە سەر شانم و وەک هاوڕێیەک سەیریکردم و گووتی « ژووری ئەشکەنجە وەک قازان وایە، قازانێک بە دەست خانمێکی پاک و تەمیزەوە. وەختێک کە خاڵییە، دەمێک هیچی تێدا نییە و ئاشپەزێک نەیخستۆتە سەر ئاگر، بەدەگمەن شوێنەواری خواردنێکی پێشینی پێوەیە، لەوانەیە ساف و بریسکەدار و پاک بێت. بەڵام کە دەچێتە سەر ئاگر، کە پڕدەبێت لە هەڵم، کە شتێک لە هەناویدا دەکوڵێت، ئەوسا گوێت لە هاوارەکانی هەناوی، لە گردبوونەوەی بوخار و گەرمی دەبێت. ژووری ئەشکەنجەش وەهایە، لە ڕۆژی ئاساییدا نابێت شوێنەوارێکی پێوە دیار بێت، دەبێت پاکبکرێتەوە، جوان ڕایبگریت، بۆ ئەوەی بۆ هەموو میوانێک وەها بێت، وەک ئەوەی بەتایبەت بۆ ئەو دروستکرابێت. وەک ژووری ئوتێلێکی خاوێن کە هەر ڕۆژ بۆ میوانێکی نوێ ئامادەدەکرێت، بە جۆرێک هیچ میوانێک ناتوانێت بزانێت کێ پێش ئەو لەوێ بووە، چییانکردوە، چ بۆنێکیان بووە... ئەوە شتێک نییە تەنیا سوودی بۆ ئەوانە هەبێ کە ئەشکەنجە دەدرێن، سوودی بۆ منیش هەیە، کە هەر جارێک ئەو کارە دەکەم وەهایە وەک نوێ بم... وەک لە سەرەتاوە دەست پێبکەمەوە».

ئەو ڕۆژە پێکەوە سەرێکمان لە ناو زیندانەکەش دا، نزیکی دوازدە ژوور بوو. زیندانییەکان ریشن و چڵکن و ماندووبوون. یەکەمجار نزار ئیدریسم لە یەکێک لەو ژوورانەدا بینی. ڕوخسارێکی هەبوو لەوانەی گەر

مرۆڤ جارێک بینی ئیدی هیچ کات لە یادی ناکات. کوڕێکی باڵابەرز و باریک بوو، بە دەموچاوێکی خڕی فریشتەئاساوە، لووتێکی قنج و قژێکی زۆر کورتی بوو، بە ئەستەم ریشی هاتبوو. شتێک یەکسەر سەرنجی مرۆڤی رادەکێشا، شەڕانگێزیی ناو چاوانی بوو، ئەو چاوانەی تورەیی و گاڵتەجاڕییەکی زۆریان لە نێودا بوو. چاوی گەنجێکی جوان بەڵام یاخی و رام نەکراو... لە خۆباییبوون و بێباکییەکی سەیر لە هەموو شتێکیدا بوو. کە ئێمەی بینی بە دەنگی بەرز گووتی «کابرای جەلاد هات». بێڕێزییەکی ئەبەدی لە هەڵسوکەوت و نیگایدا بوو، بێڕێزییەک بەرامبەر شتێکی دیاریکراو نا، بەڵکو بەرامبەر گەردون، بەرامبەر بە کۆی شتەکان، بەرامبەر ئەوەی ئێمە هەین و هەموومان لە سەر ئەم ئەستێرەیەین. لەو جۆرە بێڕێزیانەی وادەکات ئەوانی دی هەم لێیبترسن و هەم بە گرنگ تەماشایبکەن. مرۆڤ دەیتوانی ببینێت ئەو بە جۆرێک لە جۆرەکان هەموومان بە هیچ دەبینێت. لە یەکەم ساتەوە دیاربوو هەستێکی بچوکیشی نییە سەبارەت بەوەی کە لە سەرێتی حورمەت و ئەدەب بەرامبەرمان نیشانبدات. من لە هەموو زیندانەکەدا تەنیا دیمەنی ئەو زۆر سەرنجی راکێشام... دیلەکانی تر، هەموو مەخلوقاتی ترساو و لاوازبوون کە پێدەچوو سەرماو برسێتی هەموو شانازی و غرورێکی لێسەندبێتنەوە. بەڵام ئەو وەهابوو، وەک ئەوەی هەموو وزەی دونیا لە جەستە و هەموو توانای زەمین لە دڵیدا بێت. بینینی زیندانەکە شتێکی ئەوتۆ گرنگی بۆ من تێدانەبوو، بەتایبەت هەستمکرد لیڤیتانت هەموو دیلەکان بە یەک چاو تەماشادەکات و جیاوازییەک ناکات لە نێوان ئەوەی لە سەر دەمەقاڵێیەکی بچوک گیراوە لەگەڵ ئەوانەدا کە خەڵکیان کوشتووە. ئەو گووتی «من لێرە تەنیا پاسەوانم، وەک ئەفسەرێکی سەرەتایی تەحقیق کاردەکەم، دوای ئەوەی کە لێپرسینەوەی یەکەم لەگەڵ دیلەکاندا ئەنجام دەدەم، دوای ئەوەی لە ژێر ئەشکەنجەدا چ زانیارییەک پێویستە دەیبیستم، شتەکان

دەدەمە دەست حاکم نوری نەقشەبەندی. من دوای ئەوە چیتر سەری خۆم بەو چیرۆکە کۆنانەوە نایێشێنم. لێرە ڕۆژانە چیرۆکی تازەمان هەیە. من لەم زیندانەوە تێگەیشتم کە ئینسان تاکە نەسلێکی ناو گیاندارانە کە ناتوانێت پێکەوە بژی... هەموو ئاژەڵ و باڵندەکانی تر بە ڕوونی دەتوانن تەنها بۆ خۆیان یان پێکەوە لەگەڵ هاوجنسانیاندا بژین. بەڵام ئینسان نا... ئینسان نەدەتوانێت تەنهایی و نەدەتوانێت پێکەوەژیان هەڵبژێرێت... گەر ماوەیەکی درێژ لێرە بمێنیتەوە، دەتوانیت لەوە تێبگەیت، بەوەدا منیش ئەو دەردەی هەموو بەنیئادەمییەکانم هەیە، نە بەرگەی تەنهایی و نە بەرگەی پێکەوە ژیان دەگرم، لە بەرئەوە ئەم ئیشە یارمەتیمدەدات نە تەواو تەنها بم و نە زۆر نزیکیش بم لە کەس».

هێدی هێدی لە زیندانەکە هاتینەدەرێ و بەرەو بەرزاییەکی پشت پسمامان سەرکەوتین، ئاسمان تەواوی هەوربوو، بەڵام هێمنی زەوی دوای ئەو هەموو بارانە هەم جوان و هەم غەمگین بوو. دوای بارانی دوورودرێژ، زەمین هەمیشە غەمێکی قووڵی پێوەدیارە، کە لە غەمی ئەبەدی ئینسان دەچێت دوای پێکەوەخەوتن و ویساڵی عاشقانە. لە دڵمدا بوو دەربارەی «نزار ئیدریس» لە لیفیتانت شتێک بپرسم، بەڵام وەک ئەوەی بتوانێت بە وردی هەموو خەیاڵاتی من بخوێنێتەوە، گووتی «دڵنیام دەتەوێت دەربارەی ئەو گەنجە بێحورمەتە بپرسیت کە لە ژووری پێنجەمدا بینیمان... ئەوە تاکە کەسێکە بە دەستییەوە دەناڵێنم. ئەوە دزە، ناوی نزارە، هەموو وەک دزێکی بێئامان باسیدەکەن. بەر لە دوو هەفتە هێنایان بۆ ئێرە، دەمانچە و سەعاتی هاوڕێیەکی خۆی دزیبوو... لە کاتێکدا ویستبووی لە یەکێک لە بازاڕەکانی ڕانیەدا بیفرۆشێت، پێشمەرگە دەیگرن و بە کەلەپچەکراوی دەیهێنن بۆ ئێرە. تاکە کەسێکە لە ژێر ئەشکەنجەدا هیچ ناڵێت. هەتا هێنانی بۆ ئەشکەنجە ئاسان نییە. لەشێکی سەرسەخت و مێشکێکی نەخۆشی هەیە. من لە شەوی یەکەمەوە

لە بیری ئەوەدابووم بیکوژم... بەڵام بەوەدا خەزوری لای بەرپرسانی شۆڕش حورمەتی زۆرە، هەمان شەو نامەیەکی ئامیربەتالیۆن «حەمەدی ئاغا» م بۆ هات کە داوادەکات بە هەموو جۆرێک ژیانی بپارێزم و ئازاری نەدەم». من بە گومانەوە سەیرمکرد و پرسیم «بەڵام تۆ ئەشکەنجەی دەدەیت یان نا؟». لیڤیتانت بە هێمنی لەگەڵ مندا هەنگاوی دەنا و قسەیدەکرد، تا دەهات پتر بە دەنگ و شێواز و جوڵەی ڕادەهاتم، تا زیاتر قسەمان بکردبایە کەمتر سەرنجی ڕەخنەگرانە و ناڕازیم بەرابەری دەما... ئەو بە دەنگێکی کەمێک بەرز و بە تۆنێکی دڵنیا گوتی «هیچ کەسێک نییە بێتە ئێرە و من ئەشکەنجەی نەدەم. وەک گوتم، هەمووی لە یاری نێوان دوو زۆرانباز دەچێت، کە دەبێت یەکێکیان ئەویدیان بخات. وەک هەر یارییەکی قورسی تر. گەمەی جەلادییش گەمەیەکە بردنەوە تێیدا مسۆگەر نییە. من چەند ساڵە لە شۆڕشدام کەسم خۆش نەویستووە، بەڵام وەک ئەوەی ڕقم لەم دزە بێئابڕووەیە ڕقی وەهام لە کەسیش نەبووە... نەوەک تەنیا لە بەرئەوەی بێحورمەتە... نەوەک لە بەرئەوەی وەک پێویست نانوشتێتەوە، بەڵکو لە بەرئەوەی توانای لە سەر بەرگەگرتنی ئازار گەورەیە... هەموو ئەوانەی دەتوانن زۆر بەرگەی ئازار بگرن ترسناکن، هەموویان ترسناکن، چونکە مەیلێکی زۆریان بۆ ژیان و خۆشی و کەیف تێدایە».

دواهەمین ڕستەی بە تووڕەیی لە زار هاتەدەر. ئەوە سەرەتای هەستکردنم بوو بە ڕقی گەورەی لیڤیتانت لە نزار ئیدریس. بەڵام لیڤیتانت لەوانەبوو کە بۆ هەموو شتێک بەهانەڕێژییەکی وردی دەکرد. نەیدەویست هەستەکانی وەک هەستی ڕووت دەربکەون، بەڵکو وەهابوو، وەک ئەوەی بەردەوام بەهانەی عاقڵانەیان بۆ بدۆزێتەوە. بێئەوەی ڕاستەوخۆ سەیری من بکات و وەک لە بەرخۆیەوە شتێک بدرکێنێت گوتی «توانای لە سەر بەرگەگرتن و ژیان، لە توانای من لە سەر ئازاردان گەورەترە».

ئەو ڕۆژە هەستمکرد لەوە زیاتر نایەوێت لە سەر نزار ئیدریس بدوێت، وەک ئەوەی بیرکردنەوەی زۆر لەو لە ناخەوە بریندارییکات، قسەکانی گۆڕی و گووتی «چیتر با باسی زیندان نەکەین». پێکەوە بە سەر بەرزاییەکدا سەرکەوتین و لیڤیتانت بە درێژایی ڕێگا لە سەر درەخت و جۆری گیا و جەشنەکانی گوڵی کێوی و بەکارهێنانە جیاوازەکانیان ڕوونکردنەوەی دەدامێ. وەک کەسێکی سروشت پەرست بینیم کە بە عەشق و هێمنییەوە دەتوانێت لە سەر باڵندە و هەور و گیا قسەبکات، لەو ڕۆژەدا زۆر شت لە سروشت و لە ناوی گژوگیا و باڵندە لەو فێربووم، پێموایە گەر دواتریش لە ناو سروشتدا کاری بکردبایە، لەوانەبوو کەسێکی قەشەنگ و هێمنی لە خۆیدا بدۆزیایەتەوە، بەڵام ساڵانێک دواتر کە بە ڕێکەوت باسی ئەو ڕۆژەم بۆ کرد، کە یادم هێنایەوە چەندە زانیاری زۆری لە سەر سروشت هەبووە، شار وەها بردبووی، ڕۆحی وەها لەم سەر زەمینە ترازابوو، نیگایەکی سەیری کردم و وەها بوو وەک یادی نەبێت کە ڕۆژێک ناو سروشتی دیوە. دواتر کە گەڕاینەوە بۆ گرتووخانەی پسمامان، من مۆڵەتم لە لیڤیتانت وەرگرت و شەو بۆ پشوو گەڕامەوە ژووره بچوکەکەی خۆم، هێشتا لە خۆبایبوون و شەڕانگێزییەکەی نزار ئیدریسم لە پێشچاو بوو. هەستمکرد شتێک لە ناوەوە پاڵم پێوەدەنێت ئەم مرۆڤە زیاتر بناسم. وەک نمونەی ئاژەڵێکی ڕام نەکراو دەهاتە پێشچاوم، کە دەتوانێت زۆر شت لە دەوری خۆی وێرانبکات. من لە ناو جێگاکەدا بیرم لەوەکردەوە کە ڕۆژانی داهاتوو بە هەر بۆنەیەکەوە بووە لە نزیکەوە قسە لەگەڵ نزار و زۆر لە زیندانییەکانی تردا بکەم، نیەتم لەوە هێنابوو سوودێکی زۆر لەم ماوەیە ببینم تا پتر لە ژیانی دەوروبەرم تێبگەم. من هێشتا خۆمم وەک گەنجێکی کاڵفامی دونیا نەدیدە دەناسی کە پێویست بوو پتر خۆم بناسم. بەرامبەر بەو ئەزموون و قسەزانییەی لیڤیتانت هەستم بە لاوازی دەکرد، خۆم تەنیا وەک خوێندکارێکی ناکامڵی شاری هاتە بەرچاو کە

کوێرانە دوای خەونی شۆڕش کەوتووە، بێئەوەی هیچ دەربارەی دونیا بزانێت. گەرچی هێشتا ئازاری کوشتنی ئەسپەکان هەر لە دڵمدا بوو، بەڵام دەمویست بژیم و دونیا تاقیبکەمەوە... کوشتنی ئەسپەکان تەنیا سەرەتایەک بوو بۆ من. دەمویست دەمێک کە شۆڕش تەواودەبێت و سەردەکەوین، منیش کۆمەڵێک چیرۆکم هەبێت بیگێڕمەوە. شتێک کە ڕۆحی ئەزموون و سەرکێشی گەنجانە بوو لە ناوەوە دەیبزواندم، بەڵام دەمزانی لە دونیایەکی وا پڕ جەنگ و کێشەدا، هیچ ئەزموونێک پاک و سادە تێناپەڕێت. ئێستا دڵنیام ئەزموون وشەیەکە بەکاریدەهێنین بۆ ئەوەی ئارامتر بە سەر گوناهەکانماندا ڕابووڕین. ئەزموون ئەو تێکەڵبوونە ترسناکەیە بە دونیا، ئەو ڕێگای دۆزەخەیە کە دەبێت بیبڕین تا تێبگەین ئێمە چ جۆرە جانەوەرێکین.

## هەڵهاتنی نزار ئیدریس لە زیندان

لە ڕۆژی دواییدا نزار ئیدریس لە زیندان هەڵهات.

وادەبێت نزار و ٥ دیلی دیکە دەچنە چیا بۆ داربڕین. نزار لە دەرفەتێکدا لە دەست پاسەوانەکان هەڵدێت و لە ناو دۆڵ و دارستانەکاندا خۆی ونده‌کات. ئەوە گورزێکی کوشندەبوو بۆ لیڤیتانت کە دەسەڵاتی خۆی بە ڕەها و هێزی خۆی نەشکستە دەبینی. کاتێک هەواڵی ڕاکردنەکە گەیشتە ئەو، بە پەلە ناردی بە دوای مندا و داوای لێکردم لە بەڕێوەبردنی کاروباری زینداندا یارمەتی بەرپرسی پاسەوانەکان بدەم، کە وەهابوو لە کاتی ڕۆیشتنی ئەودا هەموو بەرپرسیارێتییەکی لە ئەستۆ دەگرت. خۆی و هێزێکی بچکۆلانە لە پاسەوانەکان بەرەو سۆراغکردنی نزار ئیدریس کەوتنەڕێ. لیڤیتانت گەلێک تووڕەبوو، بە جۆرێکی هیستری هاواری

بە سەر هەمووانـدا دەکـرد، ڕەنگـی ڕەش هەڵگەڕابـوو، چاوانـی گێژییەکـی ترسـناکیان تێدابـوو کـە کینەیەکـی قـووڵ و بەلێشـاویان دەردەخسـت. مـن گەرچـی لـە هـۆی تووڕەبوونەکـەی دەگەیشـتم، بـەڵام پەشـۆکانی بـەو چەشـنە مایـەی نیگەرانیـم بـوو. مـن دڵنیابـووم دۆزینـەوەی نـزار ئاسـان نییـە، گەنجێکـی بـە توانـا لـە ڕۆیشـتندا ئاسـان دەتوانێـت تـا کەوتنـی تاریکـی خـۆی بشـارێتەوە، دوای ئـەوەش هێـزی ئـەوەی هەیـە بـە جۆرێـک دووربکەوێتـەوە گرتنـی ئاسـان نەبێـت. ئـەو ڕۆژە لیڤیتانـت و یاوەرەکانـی تـا نیوەشـەو نەگەڕانـەوە... وەک پێشـبینیمکرد، شـتێکی ئەوتۆیـان دەسـت نەکەوتبـوو، هیـچ کـەس نەیتوانیبـوو زانیارییەکـی سوودبەخشـیان پێبـدات. لیڤیتانـت دڵنیابـوو کـە نـزار شـەو لـە نـاو ئـەو کێوانـەدا ماوەتـەوە و بـۆ بەدواداچوونـی، پێویسـتی بـە هێزێکـی گـەورە دەبێـت. بـەوەدا نـزار زیندانێکی ترسـناک نەبـوو، مـن وام بـە بـاش دەزانـی لێیگەڕێـن بـڕوات و چاوەڕوانـی ئەوەبیـن خـۆی لـە جێگایەکـی دیکـەدا بەزمـێ دروسـتبکات و سـەر لـە نـوێ بگیرێتـەوە. لیڤیتانـت جگـە لـەوەی گـوێ بـۆ پێشـنیارەکەی مـن بگرێـت چاری نەبـوو، بـەڵام کـە لـە ئامێرێکـی بێتەلـەوە پەیوەنـدی بـە ڕەشـید وەیبابـەوە کـرد، ئـەو هەڵهاتنەکـەی گێڕابـووەوە بـۆ کەمتەرخەمـی و بێباکـی لیڤیتانـت و پاسـەوانەکان، داوایکردبـوو گـەر لـە ژێـر زەویشـدا بـووە بدۆزرێتـەوە. سـەیربوو لـەلام ڕەشـید وەیبـاب تۆمەتـی کەمتەرخەمـی بخاتـە پـاڵ لیڤیتانـت کـە بـە دەسـتێکی ئاسـنین و سیسـتمێکی دڕنـدە شـتەکانی بەڕێوەدەبـرد... هـەر ئـەو شـەوە هەواڵـی ڕاکردنـی دیلێـک لـە پسـمامان بـە زۆربـەی ناوچەکانـدا پەخشـبووبوو، زۆربـەی کەرتەکانـی پێشـمەرگە و هێـزەکان ئاگادارکرابوونـەوە. بـۆ بەیانـی ڕۆژی دواتـر، نوێنەرێکـی وەیبـاب هـات و ماوەیەکـی درێـژ لەگـەڵ لیڤیتانـت کۆبـووەوە، مـن بـە درێژایـی ڕۆژ خەریکـی دروسـتکردنی هەنـدێ فایـل و دۆسـییەی تایبەتبـووم بـۆ بەندیخانـە، تـا شـێوەیەکی نـوێ و ڕێکییەک بـدەم بـە کاروبـارەکان، لـە ڕاسـتیدا ئـەوە لـە خەیاڵمـدا نەبـوو کـە مـن بـۆ

کاری ڕاونان و گرتنەوەی نزار بخرێمە حیسابەوە، من لەو کارەدا هەم نوێ بووم، هەم ئەزموونێکی ئەوتۆم نەبوو، هەم شارەزاییشم لەو دەڤەرەدا نەبوو. شەو لە ژوورەکەی خۆمدا لە بەر قوتیلەیەکی بچکۆلە دانیشتبووم و خەریکی نوسینەوەی یاداشتەکانی ئەو ڕۆژەبووم، کە لیڤیتانت هاتوو و بە زمانێکەوە کە بەشێکی تکا و بەشێکیشی فەرمان و تێخوڕین بوو پێیگوتم، سبەینێ بە سەفەرێک بکەومەڕێ و هیچ کارێک نەکەم جگە لەوەی شوێنپێی نزار هەڵگرم و سۆراغی بزانم. سەرەتا داواکارییەکەم بە گاڵتە دەزانی و پێموابوو لیڤیتانت جگە لەوەی دەیەوێت بمقاڵێنێت و شپرزەمبکات، نیازی دیکەی نییە. بەڵام ئەو «گەرچی هێشتا خەفەت و توڕەیی دوێنێ بەری نەدابوو» بە زمانێکی دۆستانەوە گوتی «عەزیزم وەفا، جگە لە تۆ کەسی ترم نییە، کەسێکی نەناسراو، وریا، بێڕەحم... کەسێک بتوانێت هێمنانە بگەڕێت و دەوروبەری بخوێنێتەوە». من بە لیڤیتانتم گووت «جەنابی لیڤیتانت هۆمەر، تۆ فەرماندەی منی، من چیم پێبکرێت دەیکەم، بەڵام من شارەزاییەکی زۆرم لەم دەڤەرەدا نییە، خەڵکی ناناسم، ڕەنگە هەستانم بەو کارە دەرەنجامی وەهای نەبێت». لیڤیتانت بە بێسەبری، وەک ئەوەی کاتی نەبێت من تێبگەێنێت، یاخود تەواوی ڕوونکردنەوەکانی خۆی بە زیاد بزانێت، گووتی «لە تۆ زیاترم نییە، من لەگەڵ نوێنەری وەیبابدا کە بەرپرسێکی گرنگی ناو دەزگای ئەمنییەتی شۆڕشە دانیشتم، نزار ئیدریس دەبێت بگیرێتەوە، لێرەدا هەم هەیبەتی شۆڕش و هەم هەیبەتی پسمامان لە گۆڕێیە. هەندێ نهێنی گەورە هەیە کە شۆڕش دەیزانێت. حەزدەکەم پێتبڵێم ئەو کوڕە دەم هەراش و جنێو فرۆشێکی خراپە و لە کاتی گرتندا و لێرەش سووکایەتی بە شۆڕش کردوە. ها، ئەوە بەس نییە؟ بەس نییە دوای بکەوین و بیگرینەوە. هەتا دەتوانیت لە زیندانییەکان بپرسیت و بزانیت چۆن باسی شۆڕشی بۆ کردون. وەک شتێک کە دەکرێت ئینسان هەموو

ناوێکی لێبنێت شۆڕش نەبێت. هەموومانی بە دز و چەتە ناوناوە. ها... ئەوە بەس نییە کە تێبگەیت... شتی تریش هەیە، شتی تریش هەیە کە ئێستا لە تاقەت و توانامدا نییە باسیانبکەم». دەمزانی لیڤیتانت، دەیەوێت تاوانەکانی نزار گەورەتر و گەورەتر بکات تا من توندتر بخاتە ژێر ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو فەرمانەوە. پرسیم «بەڵام چۆن و لە کوێوە دەست پێبکەم؟». لیڤیتانت لە کاتی پەشۆکانیشدا توانای قسەی لە دەست نەدەدا. ئێستا دڵنیابووم بە ڕاستی دەیەوێت لە پسمامانم دووربخاتەوە گووتی «من تۆم پێشنیارکردوە بۆ ئەوەی ببیت بە بەشێک لە دەزگای ئەمنیەتی شۆڕش. ئەمە یەکەم ئیشت دەبێت، تۆ لە بنکەی ڕەشید وەیباب نامە و مۆڵەتی تایبەت وەردەگریت، هەر سبەی پەیوەندی دەکەیت بە مامۆستا ئەسعەد ناوێکەوە لە بنکەی وەیباب لە گوندی هۆمەرجان، ئەو شارەزای کاروباری ئەمنییەتە و هەموو شتێکت پێدەڵێت. گرنگ ئەوەیە نزار ئیدریس بدۆزیتەوە... زانیاری لە سەر کۆبکەیتەوە. ئیشی تۆ ئەوە نییە بیگریت، بەڵکو ئیشی تۆ ئەوەیە کاتێک زانیاریت لە سەری بوو مامۆستا ئەسعەد ئاگاداربکەیتەوە. ئەوەندە هەیە تۆ وەک هەواڵگرێکی شاردراوە کاردەکەیت، بزانە بەوە خزمەتێکی گەورە بە شۆڕش دەگەیێنیت کە هەزارجار لە کاری ئێرەت بە سوودترە... بڕۆ... لە ئێستاوە ئەوە کاری تۆیە».

دوای چەندین ساڵیش لەو چرکەیە کە لە گوندی پسمامانەوە بەرەو هۆمەرجان بەڕێکەوتم، نەمدەزانی ئاخۆ کارێکی دروستمکردوە یان نا، کاتێک ئەوەم قەبووڵکرد ببم بە بەشێک لە دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش و لە هەموو قۆناغەکانی دواتریشدا بوومە چالاکوانێک و لە هەموو دەزگاکانی کۆکردنەوەی زانیاری و پاراستنی ئاسایشدا ڕۆڵی گرنگم بوو. زۆرکەس وەک ڕێوییە نهێنییەکەی شۆڕش ناویاندەنام، هەم کەسێکی وریا و کونکۆڵ بووم، هەم بۆ ئەوانی سەرو خۆم تابلێی دڵسۆز و بەندەئاسا

ڕەفتارمدەکرد. بەڵام هەرچییەک بێت ئەو گەشتەم لە پسمامانەوە بۆ هۆمەرجان ژیانی لە بنەوەڕا گۆڕیم، تا گەیشتمە هۆمەرجانیش خەیاڵم لای ئەوەبوو بە مامۆستا ئەسعەد بڵێم کە من شۆڕشگێڕێکی ئاساییم و پێم باشە چەکێک هەڵگرم و لە مەیدانەکانی جەنگدا وەک جەنگاوەر خزمەتبکەم. بەڵام کە گەیشتمە هۆمەرجان و مامۆستام بینی، شتەکان ڕەوتێکیان وەرگرت کە گەڕانەوەی بۆ نەبوو.

مامۆستا ئەسعەد پیاوێکی سمێڵ تاشراوی سووروسپی بوو، ئەودەم پیاوی وا بێ سمێڵ لە شۆڕشدا کەم بوو، پیاوی سمێڵ تاشراو دەبوو تانە و تەشەری زۆر قەبووڵبکات، کە تەحەمولی لە توانای هەر کەسێکدا نەبوو. سمێڵ لای ناسیونالیستە کوردەکان تا قەفی زلترپایە، نیشانەی ئەستووریی پیاوەتی و کوردایەتی بوو. بەڵام ئەوەی مامۆستا توانیویێتی بێسمێڵ جێگای خۆی لە شوێنی وەهادا بکاتەوە، شوێنی ئافەرین و ستایش بوو. ئاشکرا تەمەنی لە سەروو چلەوە بوو، بەڵام بە دیمەن گەنج و بە زمان شیرین و بە ڕوخسار ڕوخۆش بوو. وەک زۆربەی بەرپرسەکانی شۆڕش ژووری تایبەتی نەبوو، هەموو شتە نهێنییەکانی بەدەم پیاسەوە، لە سەر بانی بنکەکە یاخود بە گەڕان بە دامێنی گوندەکەدا، نزیک چۆم، لە پاڵ پەڵە چنارانی کەناردا باسدەکرد. ئەو ساڵانەی دواتریش لە شۆڕشدا بردمنەسەر، حاڵ هەمیشە بەو چەشنەبوو، هەموو نهێنییە گەورەکان لە کاتی پیاسەکردندا باسدەکران، بنکەکان بچوک و هەمیشەش جەنجاڵ و پڕبوون، ژوورەکانیان کەم و هەردەم پڕ میوان و بێگانەبوون. بەرپرسانی بەستەزمان دەبوو هەردوو دەست بخەنە پشتی قوونیان، یان ڕاستە و ڕاست دەستێک بۆ ژێر پشتێن ڕەوانەبکەن و بە خوماری کەسێکی دڵسۆزەوە بۆ دایکی وەتەن، بە دەم هەوای ڕۆیشتن و پیاسەوە نهێنییە گەورەکان تاوتوێبکەن.

مامۆستا ئەسعەد، گەرچی لە بەرپرسە گەورەکانی ئەمنییەت

و ئاسایشی ئەو ناوەبوو، بەڵام جێگایەکی تایبەتی و سیستمێکی ڕێکخراوەیی بۆ کاروبارەکانی خۆی نەبوو. من نامەکەی لیڤیتانتم دایە و ئەو بەبایەخێکی بێوێنەوە خوێندییەوە، وەک زۆربەی پیاوە سوورکارەکان ئاسان بوو تێبگەیت هەست بە چی دەکات. مامۆستا دوای کەمێک بیرکردنەوە، گووتی «ڕاستە... ڕاستە». من نەمدەزانی مەبەستی لە وشەی «ڕاستە» چییە، دواتر تێگەیشتم کە ئەوە هیچ نییە جگە لە وشەیەکی بەردەوامی سەرزاری کە بە هۆ و بێهۆ دووبارەیدەکاتەوە، بە بۆنە و بێبۆنەش دەیڵێتەوە، هەتا دڵنیابووم لە کاتی گووتنیدا تەواو هۆشی لای خۆی نییە. هەر کەسێکیش ئەوی نەناسیبایە، بەو وشەیە دەکەوتە دوودڵی و پەشۆکانەوە، چونکە زۆرجار کە دەپەڕییە ناو ڕستە و قسەکان، دەبووە مایەی لە یەکدان و ناکۆکی. ئەو ڕۆژە وەک هاوڕێیەکی دێرین، بە زەردەخەنەی کەسێکەوە بزانێت ئەرکێکی گەورەی لە سەرشانە، گووتی «کوڕم وەفا، ئیشێکی باشتکردوە کە بڕیارتداوە لە پێناوی ئەمنییەتی شۆڕشدا کاربکەیت. ئێمە پێشمەرگەمان زۆرە، پێشمەرگە وەکو خۆڵ وەهایە، بەڵام خەڵکانێکی خوێندەوار کە بە هوشیارییەوە خزمەت بە ئەمنییەتی شۆڕش بکەن، ئەوەمان کەمە. گەنجانێکی شاری و ئەهلی دانیشگا کە دێنە ناو شۆڕش... ڕاستە ڕاستە... زۆر دڵسۆزن، بەڵام کەمیان ئازایی ئەوەیان هەیە، بەم ڕێگایەوە خزمەت بە شۆڕشبکەن... هەندێکیان دەترسن، هەندێکیان دەڵێن جاسوسی هەر جاسوسییە، هەندێکیشیان بە کەڵکی ئەو کارە نایەن، چونکە ئەمە ئیشێکە سەبر و فێڵبازی و بێڕەحمی دەوێت». من ویستم بڵێم کە بە ڕاستی نامەوێت لەم بوارەدا کاربکەم، بە ڕاستی من لەو کەسە ترسنۆکانەم کە تۆ لە دەستیان بێزاریت. بەڵام دوودڵییەکی ناوەخت، ترسم لەوەی کتوپڕ مامۆستا نائومێد بکەم، وەستاندمی و قسەکەم گێڕایەوە و نەمدرکاند. ئەوە ئەو چرکەیە بوو کە دەکرا وەرگەڕێم و بڵێم

«سوپاس، گەر کارێکی ترتان بە من هەیە ئامادەم، بەڵام جاسوسی... ڕۆیشتن بە شوێن پێی خەڵکدا... نا، مامۆستای خۆشەویست بمبورە، من بۆ شتێکی تر هاتوومەتە ناو شۆڕش».

ژیان بەوجۆرەیە و زۆرجار چارەنوسمان هەمووی لە یەک چرکەساتدا دەستنیشاندەبێت، چرکەساتێکی بێبایەخ، چرکەساتێک کە لە دەمی خۆیدا هیچ مانایەکی نییە، وادەزانی شتێکە دێت و دەڕوات، وادەزانی کە بڕیارت لە مەسەلەیەک دا دەتوانیت دواتر وەرگەڕێیت و چاکیبکەیتەوە. بەڵام نا، ئێستا دەزانم ئەوە چەند ئەستەمە... بە ڕاستی ئەستەمە. مرۆڤ گەر لە ساتی یەکەمدا نەیتوانی بەر بەدەردێک بگرێت، ئیدی بەر پێگرتنی ئاسان نییە. زۆرجار ئەو ساتە وردانە ڤایرۆسی وەهایان تێدایە مرۆڤ دەبێت دەرد و بیمارییان تەواوی تەمەن، بە دوای خۆیدا ڕاکێشیت. من بێئەوەی بە ڕوونی و ئازایی بڵێم «ببورە مامۆستا، من بیرم لێکردۆتەوە و کاری وا بە من ناکرێت». گووتم «وادەزانم ئیشم ئەوەیە بە دوای نزار ئیدریس ناوێکدا بگەڕێم کە لە زیندانی پسمامان هەڵهات». مامۆستا ئەسعەد بە دەم خەیاڵەوە گووتی «راستە... ڕاستە... لە دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش، خەڵکێکی خوێندەوارمان دەوێت کە بتوانێت دەوروبەری خۆی بە وردی بخوێنێتەوە. تۆ تا هەندێ کار ئەنجام نەدەیت نابیتە ئەندامی دەزگا. ئەوەی تۆ کەسێکی نەناسراویت، سوودێکی گەورەی هەیە، تۆ وەک غەریبەیەکی بێوەی خۆت نیشاندەدەیت، کە بە دوای خزمێکیدا دەگەڕێت کە لەگەڵ نزار ئیدریس ناوێکدا هاوڕێ بووە. تۆ خۆت وا دەرناخەیت کە بۆ نزار دەگەڕێیت... یەکەم شتێک فەرمانبەری ئەمنییەت ڕەچاویبکات، ئەوەیە کە نەهێڵێت خەڵکی بزانن بۆ چی دەگەڕێت». من بە فزوڵێکی گەنجانەوە پرسیم «بەڵام پێمبڵێ جەنابی مامۆستا، بۆ دەبێت لە دوای نزار بگەڕێم... ئەوە ئیشێکی عاقڵانە نییە، من بکەومە ڕێگا و نەزانم بۆ لە دووی کەسێک دەگەڕێم، وانییە، دەبێت بزانم ئەم نزارە چ دەردێتی،

چ کارێکی کردوە شایستەی ئەم هەموو گرتن و ڕاونانەیە». «ڕاستە... ڕاستە. نزار گەنجێکی سەرەڕۆیە... بەڵام لێرەدا هەیبەتی شۆڕش لە کاردایە. ئەوەی من دەیزانم لە سەری ئەوەیە کە جگە لەوەی بێڕێزی بەرامبەر شۆڕش و سەرۆک کردوە، کۆمەڵێک گومان و تۆمەتی تریشی لە سەرە کە تا ئێستا بەلادا نەکەوتوون و ساغ نەبوونەتەوە، هەروەها ساڵی پار سکی کچی مامۆستایەکی پڕکردوە کە لە یەکێتی مامۆستایاندا پلە و پایەیەکی بەرزی هەیە. باوکەکە پیاوێکی سەرسپی بە حورمەتە... ڕاستە کچەکەش بە سەر و ڕوخسار لە ئافرەتێکی بەحورمەت دەچێت، بەڵام هەندێجار ژێر کەوا و کراس لەشی وەها حەشەرییان تێدایە کە بە چاو نابینرێن. شۆڕش ئامۆژگاری باوکەکەی کرد کە کچەکە بکوژێت و منداڵە زۆڵەکە زیندەبەچاڵبکات. بەڵام باوکەکە دڵی نەهات و ئەوەی لێ نەوەشایەوە. بە هەرحاڵ برام بە هەرحاڵ. ڕاستە، منیش بە باوکەکەم گووت کچەکە بکوژە و مەسەلەکە کۆتایی پێبهێنە، بەڵام شتەکان وادەرنەچوون، من بزانم منداڵە حەرامزایەکە ئێستا لای نەنکێتی، دەڵێن کوڕێکی جوانە و منداڵێکی تا بڵێی شیرینە. هەر ئەو شیرینییە وایکرد کە ئەو مامۆستا بەڕێزە دان بە خۆیدا بگرێت و گوێ نەداتە حەیاچوون و واز لە ڕاونان و بەدواداچوونی جیانەتکار بهێنێت و داوابکات نزار گەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بووە کیژەکەی مارەبکات، تا منداڵەکە لە داهاتوودا تەزکەرەیەکی هەبێت. بەڵام نزار بە درێژایی ماوەی دووگیانی کچەکە و دواتریش وەک کەسێکی بێباک، لەم شار و لەو گوند و لەو شارۆچکەدا دەردەکەوت و لە هەموو جێگایەک بەزمێکی دەنایەوە، بێئەوەی نە پۆلیسی خۆماڵی و نە بەرپرسانی حیزب بتوانن دەستگیریبکەن. دواجار کە شۆڕش دەستیپێکردەوە و خەڵک بە هەزاران هاتنە ڕیزی شۆڕشەوە، نزاریش کە وەک من و تۆ خۆی بە شۆڕشگێڕێکی سەرسەخت دەزانێت لە شاردا نەمایەوە، بەڵام خۆشبەختانە لە کاتێکدا لە چایخانەیەکی

سـەر سنوور دەیـکات بـە جەنـگ و جـەدەل، یەکێـک دەیناسـێتەوە و دەگیرێـت. لـە زینـدان کێشـەکەی دەکەوێتـە بـن دەسـتی حاکـم باسـیت، کـە پیاوێکـی بەرێـز و خۆشـبڕوایە. لـەوێ سـوێند بـۆ حاکـم دەخـوات کـە هەمـوو هەڵەکانـی خـۆی چاکدەکات و دەبێـت بـە مرۆڤێکـی نـوێ و کچەکـە دەهێنێـت و دەشـبێت بـە پێشـمەرگەیەکی دڵسـۆزی کوردسـتان. بـەوەدا گەنجێکی قسـەزان و جـوان و فێڵبـازە، ئاسـان حاکـم لەخشـتەدەبات و هـەر لـەو هەفتەیـەدا و لـە بەردەمـی حاکـم باسـیتدا قسـەی خـۆی دەباتەسـەر و کچەکـە مـارەدەکات. ئیـدی هەمـوو وادەزانـن گۆڕانێکـی گـەورە بـە سـەر نزاردا هاتـووە و لەوانەشـە پاشـەڕۆژێکی رونـاک چاوەڕوانیبـکات. بـەڵام پێدەچێـت تەواویـی شـانۆگەرییەکەی نـاو زیندانـی هیـچ نەبووبێـت جگـە لـە ڕیاکاریـی و فێڵێکـی گـەورە تـا خـۆی ڕزگاربـکات و لـە تەنگانـەی دیلـی بێتـەدەرێ. ئەوەبوو وەک بیستم هـەر هێنـدەی لـە دەرگای گرتووخانـە چـووە بەردیـودا جارێکـی تـر نـە لـە ژنـە بەسـتەزمانەکەی پرسـیوە و نـە هیچیـش لـە قسـە و ئەخلاقـی جارانـی گـۆڕاوە. ڕاسـتە ڕاسـتە... نـاوی خـۆی لـە بەتالیۆنـی شـێخ حەسـەنی باسـاکی دەنوسـێت، بـەڵام دوای دوو هەفتـە دەمانچـەی هاوڕێیەکـی و سـەعاتەکەی دەدزێـت و هەڵدێـت، وەک دەڵێـن شەکریشـی شـکاندووە و بـە سـەرۆک بارزانیشـی گوتـووە «دەرەبەگێکـی گـەورە... پادشـای دەرەبەگـەکان... پیـاوی شـای ئێـران». خـۆت دەزانیـت ئـەوە بۆنـی دەم و دووی شیوعییە جاشـەکانی لێدێـت. هەڵبـەت شـۆڕش لەوانـە نابوورێـت، لـە هیـچ کـەس نابوورێـت قسـە بـە سـەرۆک بڵێـت. بـەڵام بڵێـم چـی، ڕەنگـە گرتنـی بـۆ خـۆی هیـچ نرخێکیشـی نەبێـت، هێنـد هەیـە زیندانـی پسـمامان ناوێکـی باشـی هەیـە و نابێـت لـە دەسـتی بدەیـن. مـن دڵنیـام ئەمجـارە ئاسـان ناگیرێتـەوە. مـن پێمگووتـراوە بایەخێکـی گـەورە بدەمـەوە بـە گرتنـی، ئێمـە فەرمانمـان هەیـە کـە لەگـەڵ کاری وەهـادا دەسـتسوکی نەنوێنیـن».

مامۆستا هەم بە هێمنی و هەم بە ڕوونی و هەم بە ڕوخۆشی قسەیدەکرد. دواتر هەندێک وردە زانیاری تری دەربارەی نزار خستە بەردەستم و ئەو تەنها وێنەیەشی دامێ کە پێدەچوو دوا وێنەی ئەو بێت و بەر لە هاتنی من لە زیندانی پسمامان گیرابێت. کە وێنەکەی دایە دەستم تکایکرد بیپارێزم، چونکە ئەوە تەنها وێنەیەکە هەیبێت. من تەماشامکرد و بە هێمنی وێنەکەم دایەوە دەستی، نیگاری نزار ئیدریس لەو ڕۆژەوە بە جۆرێک لە خەیاڵمدا چەسپابوو، پێویستیم بە هیچ وێنەیەک نەبوو تا بیناسمەوە.

چەند سەعاتێک بەوجۆرە لەگەڵ مامۆستا ئەسعەددا قسەمانکرد، لە کاتی ئەو گفتوگۆیەدا هەستمدەکرد لەگەڵ دونیای شۆڕشدا تێکەڵدەبم، شتێکم پێدەکرێت و دەتوانم کارێکبکەم شۆڕشگێڕە ئەزموونـدارەکان دڵخۆشبکات. مامۆستا وەک بزانێت من بۆ جۆرە هەستێکی وادەگەڕێم، بەردەوام هەوڵیدەدا واپیشانیبدات ئەو کارەم شتێکی بایەخدارە. ئەو شەوە لەگەڵ ئەو مامەوە و بە قسە و تێبینی و وردەکارییەکانی مامۆستا خۆشحاڵ بووم کە وێنەی پیاوێکی دڵسۆز و کوردپەروەرم تێدا دەبینی کە ئەمنییەتی شۆڕشی لە هەر شتێکی دی لاگرنگترە. دەبوو شەو، هەم شوناسی تایبەت و هەم مۆڵەت و هەم نامەی داواکاری کۆمەکم بۆ هەموو هێز و بنکەکانی پێشمەرگە بۆ بنوسێت و ئەوە روونبکاتەوە کە من بە کارێکی نهێنی و گرنگی دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش بەڕێکاوەم و چی کارئاسانییەکم دەوێت پێویستە بۆم فەراهەمبکرێت. من لە دڵەوە هەستێکم هەبوو کە ئەو کێشەیەی نزار شتێکی گرنگ و بایەخدار نییە، هەر لەبەر ئەوەشە گەنجێکی بێئەزموونی وەک منی دەخەنە دوا و دەیدەنە دەست کەسێک هیچ شارەزاییەکی نییە، بەڵام دواجار دەیانەوێت کارێک بۆ من بدۆزنەوە و وەهاش دەرنەکەوێت کە شۆڕش دەرهەق بە زیندانیانی هەڵهاتوو کەمتەرخەمی دەکات. من ئەو شەوە لە مامۆستا ئەسعەدم

پرسی « مامۆستام، بۆ دەبێت کەسێکی وەک من بە نهێنی بچێت بە سۆراغی نزارەوە، لە کاتێکدا شۆڕش لە زۆربەی گوندەکان بنکە و هێزی هەیە . چاکتر نییە ئەوان بەو کارە هەستن» . مامۆستا پێکەنی و گووتی «گوێبگرە، ئێستا ناڕێکییەکی گەورە زۆربەی هێزەکانی گرتۆتەوە، شۆڕش مەکینەیەکی ئاڵۆز و ناڕێکە، تا گەورەتریش بێت ئاڵۆزتر و ناڕێکتر دەبێت. گەورەترین کێشەی ئەم ئامێرە ئەوەیە کە هیچ کەس بەدروستی نازانێت دەبێت چی بکات، کەس لە ناویدا وەزیفەی دیاریکراوی نییە ... هەموو دەیانەوێت شەڕبکەن، یاخود واخۆیان دەردەخەن هاتوون بجەنگن، بەڵام دەمێک جەنگی قورس و ڕاستەقینەش دێتە پێشێ، هەموو هەڵدێن. ڕاستە ڕاستە ... نزار لەو دیلانەیە کە بە ئاسانی ناگیرێت، دەتوانێت باش خۆی بشارێتەوە، ئێمە مەترسی ئەوەمان هەیە کار بۆ شیوعییەکان بکات، یان نیازی شتێکی تری هەبێت. ئەو توانای ئەوەی تێدایە کار لە پێشمەرگە سادەکان بکات و سەرلق و ئامیرهێزە نەخوێندەوارەکان بخەڵەتێنێت... کەسێکە جێگای گومانێکی گەورەیە، هەم زیرەکە و هەم شەڕانییە، گەرچی مەکتەبێکی زۆری نەخوێندوە، بەڵام کتێبخوێن و دەمهار و چەنەهەراشە، دەنگێکی سیحراویشی هەیە کە ژنان بە جۆرێکی سەیر دەنێتە ژێر کاریگەری خۆیەوە . وەک بیستوومە، دەتوانێت ئەفسونێکی زۆری لە سەر ئەوانی تر هەبێت. لێرەوە ناتوانم بەبێ چاودێری بەجێیبهێڵم. گەر ڕێکەوتیکرد و هێزەکانی دی گرتیان من ئاگادارتدەکەمەوە، هەوڵدەدەم هەمیشە ئاگادارت بم و بزانم لە کوێیت. گەر ڕۆژێک گەڕایتەوە و من لێرە نەمابووم تۆ پەیوەندی بە ڕەشید وەیباب خۆیەوە دەکەیت، ئەو بە کارگێڕە گەورەکانت دەناسێنێت و لەوێوە فەرمانی تر وەردەگریت. لە هەر جێگایەک بوویت، گەر هەواڵی گرنگت هەبوو، داوابکە بنکەی ڕەشید وەیبابت بە بێتەل بۆ وەربگرن و ئیتر چیت هەبوو پێمبڵێ، یان شیفرەیەکی تایبەتیت دەدەمێ، بەو شیفرەیە و بە ڕستەی کورت پەیوەندیم

پێوەدەکەیت... من بەردەوام ڕێنمایی تازەت بۆ دەنێرم و خەڵکێکیش دەبێت ئەو ڕێنماییانەت پێ ڕابگەیێنن».

بۆچوونەکەی مامۆستا ئەسعەد لە سەر شۆڕش وەک ئامێرێکی ئاڵۆز، ڕاست بوون. ئامێرێک کە دەتوانێت تەنیا هەندێک وەزیفەی گشتی جێبەجێبکات و بۆ ئەوە نەکراوە شتی ورد و تایبەتی ڕاپەڕێنێت. من لە ساڵانی داهاتوودا وێنەی شۆڕش وەک مەکینەیەکی گەورە و جوان نەبەستراو پتر لە خەیاڵمدا چەسپی. بەڵام ئەوکات شتەکانم سادەتر دەبینی، خوێنی گەنجێتی وایدەکرد، واتێبگەم شۆڕشگێڕەکان بوونەوەری خوداکردن و هەر خۆشیان بەهەشتسازی سەر زەوین. ئەو شەوە سەرەتای ژیانێکی تازە و دووروودرێژ بوو، سەرەتا خۆشیم لێدەبینی، بە خزمەت و لە خۆبوردن و نیشتیمانپەروەریم دەزانی... دواتریش کە دونیا گۆڕا، من بە جۆرێک لە ناو جەنگەڵەکانیدا ونبووبووم، ڕێگایەکی ئاسانم نەدەدۆزییەوە بێمەدەرێ.

# نزار و باوکی

وەک دواتر زانیم ژیانی نزار ئیدریس لەوە ئاڵۆزتربوو کە مامۆستا ئەسعەد بۆ منی گێڕایەوە. پێدەچێت مردنی زوو وەختی دایکی کاریگەرییەکی خراپی لە سەری هەبووبێت. ئەو تەمەنی دوازدە ساڵ دەبێت کە شەوێک بێهۆیەکی دیاریکراو دایکی لە نیوەشەوەوە هەڵدەستێت و دەستدەکات بە گۆرانی گوتن و تا ساتی گیانبەخشینی لە دەمەوبەیاندا لە گۆرانی ناوەستێت. دکتۆرەکان جگە لە کاریگەری سیحراوی دەنگە خۆشەکەی خۆی، هۆیەکی تایبەتی بۆ مردنەکە نادۆزنەوە، هەتا مەلای مێردیشی کە پیاوێکی بێزەوق و بێسەلیقە بوو، لەو باوەڕەدا بوو دەنگی

خانمی خێزانی بە جۆرێک خۆشبووە خانم خۆی بەرگەی نەگرتووە... دڵنیاشبوو گەر بهاتبایە و دەنگی خۆی تۆماربکردبایە و بە ڕاستی ببووایەتە گۆرانیبێژ، بەو دەنگەی، خەڵکانی تریشی دەکوشت. نزار هەندێک لەو دەنگە سیحراوییەی دایکی بۆ دەمێنێتەوە، گۆرانییەکانی ئەو لە ناو خۆیدا هەڵدەگرێت و لە کاتی پێویستدا وەک چەکێکی گرنگ بەکاریاندەهێنێت. هەتا دەڵێن هۆیەک کە حاکم باسیت وا ئاسان وازی لێهێناوە ئەوەبووە، لە بەردەم دادگادا گۆرانییەکی بێوێنەی چڕیوە، ئاوازێکی وا جەنابی حاکمی خستۆتە سەر ئەو بڕوایەی دەنگێکی وەها ئاسمانی، هەتا گەر گوناهی گەورەشی کردبێت، نابێت سزابدرێت. لە زیندانی پسمامانیش، هەر بە هۆی گۆرانییەوە ڕادەکات. من دواتر ئەوەم زانی، چونکە پاسەوانەکان ڕێکەوتبوون نهێنییەکە لە نێوان خۆیاندا گۆڕبکەن و نەیدرکێنن، وادەبێت لە کاتی داربڕیندا نزار گۆرانییەکی خۆش دەڵێت، پاسەوانەکان وەها بە دەنگی مەستدەبن، لێدەگەڕێن بە بیانووی داربڕین و بەدەم گۆرانییەوە لە چاوان ونبێت، کاتێکیش مەستی بەریاندەدا، ئەو بە جۆرێک دوورکەوتۆتەوە ئیتر ناگیرێت.

بەڵام دایکی جگە لە دەنگخۆشی، شتێکی دیکەشی تیا دەچێنێت کە تا کۆتایی لە ناویدا دەژی و دەمێنێتەوە، ئەویش بێباوەڕی تەواوەتییە بە دین. بەڵام ئەو ئیلحادە بێسنوورە لای نزار بە پێچەوانەی دایکییەوە دەرکەوتەی ترسناکی دەبێت. من لەگەڵ پیربوون و گۆڕانی دەورووزەماندا بۆم دەرکەوت، وەک چۆن بڕواداران بە خودا دوو چەشنن، یەکێکیان ئیمان دەیانگۆڕێت بۆ مرۆڤی ناسک و مرۆڤدۆست، ئەویدیان ئیمان دەیانکاتە جانەوەری ترسناک و دوژمن بە ئینسان، مولحیدەکانیش هەمان شێوە دوو بەرەن، هەیانە لە ڕێگای ئیلحادەوە دەبن بە دڵی گەورە و هۆشی کراوە و عاشقی بە وەفا بۆ مرۆڤ، هەشیانە هەر لە سەر ئەو بنەمایانەی ئیلحاد، دەبنە دڕندە و خوێنخۆر.

نـزار دوای مردنـی دایکـی دەبێتـە کەسێکی دی... باوکـی بـە جۆرێکـی ترسـناک دەیخاتـە ژێر فشارەوە کـە دەسـت لـە خوێندنـی ئاسـایی هەڵبگرێت و بچێتـە بـەر مەکتەبێکـی دینـی و لـە مزگەوتـدا خزمەتبکات. ئـەوە کوڕەکـە دەگۆڕێـت بـۆ دوژمنێکـی سەرسـەختی باوکـی. بـە جۆرێـک، لـەو تەمەنـەوە هیـچ شـتێک نامێنێـت نەیـکات بـۆ ئـەوەی ئیدریسـی ئەسـتێی بـکات بـە گاڵتەجـاڕ و لـە جوغزێکـدا داینێـت نەفـرەت لـە خـۆی و لـە ئـەو و لـە ژیانیـش بـکات. مـەلا کـە بـەردەوام لـە مینبـەرەوە شـار دەهێنێتـە لـەرزە و قسـە بـە عارەقخـۆر و قومارچـی و فاسـیدەکان دەڵێـت، کـە چاودەکاتـەوە دەبینێـت کوڕەکـەی خـۆی لـە چواردەسـاڵیدا هەمـوو شتە خراپەکانـی ئـەو تەمەنـە دەکات. جگەرەدەکێشێت، مـەی دەنۆشێت، دزی دەکات، شـەڕدەکات و هـەر بـە فیتـرەت ئوسـتادی ئافرەتبازانیشـە. وەک بیسـتوومە کوڕەکـە هـەر لـەو تەمەنـەوە حاڵەتێکـی ترسـناکی لادان و خلیسـکانی ئەخلاقـی بـووە، زۆر خێـرا بەبـاڵا هەڵیـداوە و زۆر زوو توانایەکـی گـەورەی قسـەکردن و خۆدەرخسـتنی تێـدا دروسـتبووە، بـە جۆرێکیـش جـوان بـووە، هیـچ کات لـە نزیکبوونـەوەی یەکەمـدا لـە ئافـرەت کێشـەی نەبـووە... وەک دەڵێـن لـە تەمەنـی چواردەسـاڵیدا بـە تـەواوی لـە خوێنـدن دەردەکرێـت. وادەگێڕنـەوە کـە هـۆی سـەرەکی دەرکردنـی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی لـە پشـووی سێهەمی ڕۆژێکـی چوارشـەممەدا، لـە پێشـچاوی هەمـووان مودیـری خوێندنگاکـەی داوەتـە بـەر زللـە و مسـت و ددانێکـی شـکاندووە، بـە مەرجێـک ئـەو پیـاوە بچـوک و سەرسپییە، پێشـتر تاکـە زامنـی بـووە تـا بـە هـۆی دزی و شـەڕەوە لـە خوێنـدن دەرنەکرێـت. ئـەو ڕۆژەش کـە دەردەکرێـت بـە سەرخۆشـی دەچێتـە سـەر مینبـەری مزگەوتەکـەی باوکـی و بڵندگۆکان دادەگیرسێنێت و دەکەوێتـە گاڵتەکـردن بـە مامۆسـتاکانی خوێندنـگا و بـە باوکـی و هەموویان بـە کۆمەڵێـک مانـگای ڕەش و حوشـتری گـەورە ناودەبـات. باوکـی بە سـەگێک دەشـوبهێنێت کـە بـەردەوام حەپـەی دێـت و خـەو لـە خەڵـک حەرامـدەکات.

هەر لەو ڕۆژەدا و بە دەموپلێکی مەستەوە، داوایکردوە هەموو باوکەکان بکوژن... هەموو باوکەکان، هاواریکردوە با سەردەمێکی نوێ دەست پێبکات کە خوێندنی تێدانەبێت، باوکی تێدا نەبێت، خودای تێدا نەبێت.

کاریگەری ئەو ڕووداوە لە سەر مەلا ئیدریسی ئەستێی زۆر گەورە دەبێت. لەو ڕۆژەوە بە دڵێکی شکاوەوە واز لە مەلایەتی دەهێنێت و بۆ ئەبەد مینبەر چۆڵدەکات. پێدەچێت بەرگەی ئەو ئابڕووچوونە گەورەیەی نەگرتبێت کە لە تەواوی شاردا بڵاودەبێتەوە. دوای ئەو حەیاچوونە، مەلا لە پیاوێکی دەنگ زلەوە دەبێتە کەسێکی کزۆڵەی دەنگ نوساو، هەموو هەوڵێک دەدات کوڕەکەی بگێڕێتەوە سەر ڕێگایەکی ڕاست و پێکەوە بگوازنەوە بۆ شارێکی دیکە. بەڵام زۆر نابات بەیانییەک خەڵکی گەڕەک مامۆستا بە خنکاوی لە حەوزی مزگەوتە دێرینەکەی خۆیدا دەدۆزنەوە، نیشانەکان هەموو وەهابوون کە یەکێک لە بەیانییەکی زۆر زوودا، مەلا ئیدریسی بە زۆر لە حەوزی وسڵ دەرکردنەکەدا خنکاندوە. لە پرسەکەی باوکیدا نزار غەمێکی ئەوتۆی پێوەدیار نابێت، بەڵکو دەڵێن کە بەردەوام خەندەیەکی گاڵتەجاڕ و شەیتانی و بێباکانە لە سەر لێوی بووە. خزم و کەسانی مەلا ئیدریس لە ترسی ئابڕوچوونێکی گەورەتر و بۆ بەرگرتن لە پێشهاتی ناخۆشتر، بە دوای هۆکاری مردنەکەدا ناچن و هەمووی وەک ڕێکەوتێکی خودایی تەفسیردەکەن. بەڵام ئەوەی زانراوە ئەوەیە، نزار دوای مردنی باوکی،ماڵی مامۆستا دەکاتە شوێنی کۆبوونەوەی خۆی و هاوڕێ گەنجەکانی و ژیانێکی بێجڵەو دەست پێدەکات کە هەر کەسێکی ئاسایی و بەحورمەت دەترسێنێت. ئەوەی سەیرە ئەوەیە کە نزار لەو تەمەنەوە زیرەکییەکی گەورە لە فێڵکردن و دەستبڕیندا پیشاندەدات، سەرکێشییەک و ئارەزوویەکی گەورە بۆ یاخیبوون و بێڕێزی نواندن بەرامبەر هەموو دەسەڵاتێک. گروپێکی بچوک و شێت لە گەنجانی بێسەرپەرشت و یاخی لە دەوری خۆی کۆدەکاتەوە، کە هەموو بێشەرمانە و بە دەنگی بەرز

ئەوە ڕادەگەیێنن کە دروشمیان ئەوەیە «باوکت بکوژە و ژیانی خۆت بژی». توانایەکی گەورەی لە سەر وتاردان و قسەکردن تیادەردەکەوێت، لە پاڵیشیدا مەیلێکی گەورە بۆ خوێندنەوە، لە هەر جێگایەکیش هەر کتێبێکی دەستبکەوێت دەیدزێت. بە ئاشکرا لە هەموو شوێنێکدا دەڵێت کە دەخوێنێتەوە بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانە بزانێت کە مەلا ئیدریسی باوکی نەیویستوە بیانزانێت. بێباک پەیوەندی لەگەڵ کچاندا دەبەستێت و جێیاندەهێڵێت، بێباک قسە لە نەبوونی خودا دەکات، هیچ وشەیەک ناگێڕێتەوە، هەتا چاوقایمی دەگاتە ئەوەی بانگەشەی ئەوەبکات کە گەنجان بچنە سەر مزگەوتەکان و بیانگۆڕنە سەر شوێنی کۆبوونەوە و ژوان و یەکتربینین. هەندێ لە پیاوانی ئاینی جگە لە سێبەری کافرێکی کۆمۆنیست، هیچی تری تێدا نابینن. زۆر لە کۆمۆنیستەکانیش خۆیان بە دوور دەگرن و تەنیا وەک گەنجێکی بێجڵەو و کەمحەیا سەیریدەکەن کە تا بۆی دەکرێت هەوڵدەدات بێشەرم و بێئابڕوو دەربکەوێت. دەمێک سکی ڤینۆسی کچی مامۆستا سابیر پڕدەکات، هەردووکیان تەمەنیان حەڤدە ساڵ دەبێت، ئێستاش کەس بەدروستی نازانێت، چۆن کچی خێزانێکی واناسراو، کە کچی خۆیان بە گەلێک پەرژینی قایم دەپارێزن، کەوتۆتە باوەشی کەسێکی وابێپەرێز و بێشەرمەوە. هەموو ئەوەی لێدەگێڕنەوە کە نزار هەتا لەگەڵ ئافرەتیشدا کەسێک نەبووە فێڵبکات یان ڕووی خۆی مەکیاجبکات. هەموو دەڵێن هەر کچێک یان ئافرەتێکی ناسیبێت، بێئەوەی خۆی شیرینبکات یان درۆبکات، گوتوویێتی «جوجە گیان، گەر دەتەوێت بەیەکەوە دەخەوین، گەر پێتخۆشە چیت حەز لێیە لە ناو جێدا بۆت دەکەم، بەڵام جوجەی ماڵم، من کەڵکی دڵداریم پێوە نییە، هەموو شتێک دەزانم ئەوە نەبێت». ساڵانێک دواتر کە ڤینۆسی مامۆستا سابیرم لە دەستێک جلی ڕەش و لەچکێکی ڕەشدا لە چلەی باوکیدا بینی، پێیگوتم کە نزار ئەودەم هەموو ئەو قسانەی پێگوتووە،

بەڵام ئەم بە جۆرێک عاشقی بووە، بیری لە هیچ نەکردۆتەوە. دوای سک پڕبوونی ڤینۆس و ئاشکرابوونی بەدکارەکەی، براکانی مامۆستا سابیر و خزمانی پێکرا بڕیاردەدەن کیژەکەش و نزاریش بکوژن، بەرپرسی ناوچەی حیزبیش ئاگاداردەکرێتەوە و ڕەزامەندی خۆی لە سەر ئەو شەرەفشۆرییە دەردەبڕێت. بەڵام مامۆستا سابیر کچەکەی دەشارێتەوە و ناچێتە ژێرباری کاری وەهاوە، هەڵبەت لە سەر ئەو بێشەرمییەی هەم لە حیزب و هەم لە نێو خزماندا ڕیسوادەبێت، بەڵام مامۆستا پێیوایە ژیان لە شەرەف موقەدەسترە، لە بەرئەوە کچ و کچەزاکەی خۆی سەرسەختانە دەپارێزێت و ناهێڵێت کەس دەستیان بۆ بەرێت. لەو نێوەشدا نزار خۆی وندەکات و سەروسەدایەکی لە شاردا نامێنێت.

ئەو ڕۆژەی من لە هۆمەرجانەوە بەرەو باکوری خۆرهەڵات بەڕێکەوتم، نەمدەزانی چۆن بەدوای نزار ئیدریسدا بگەڕێم. هێند هەبوو مامۆستا ئەسعەد لە سەر کاغەزێکی سپی نەخشەیەکی بۆ کێشابووم کە بە کوێدا بڕۆم و لە کوێوە دەست پێبکەم و چۆن درێژە بە سەفەرەکەم بدەم. نەخشەکە ناوی چەندەها گوند و شارۆچکەی بچوکی تێدابوو. ئەوە یەکەمین سەفەری ڕاستەقینەی من بوو بە کوردستاندا.:. ئەوەی مۆڵەت و پسوڵە و پارەی تەواوم پێ بوو، وایدەکرد هەست بە دڵنیایی و شانازیبکەم. دوای چوار ڕۆژ ڕۆیشتن بۆ یەکەمجار یەکەمین سەرەداوم دەربارەی نزار دەستکەوت. وەهابوو، من دەگەیشتمە هەر بنکەیەکی گەورە، دەمپرسی ئاخۆ سەبارەت بەو کوڕە دیلەی زیندانی پسمامان هیچ هەواڵێک هەیە. لە چوارەم ڕۆژدا لە یەکێک لە بنکەکانی پێشمەرگە، ئەو هەواڵەم دەستکەوت کە نزار ئیدریس نامەیەکی ناردوە بۆ «مەنسوور ئاغای زێڕوەلی» کە ئامیر هێزێکی گەورە بوو، بەوە ناسرابوو کە زۆر ڕقی لە ڕەشید وەیبابە و داوای یارمەتی لێکردوە.

ئەوەی هەواڵەکەی پێگووتم شتێکی دەربارەی ناوەڕۆکی نامەکەی ئەو

نەدەزانی، بەڵام گووتی گەر مەنسوور ئاغا بیگرێتە خۆی، ئیدی کەس ناتوانێت دەستی بۆ بەرێت. زێڕوەلی پیاوێکی بەهێزبوو، هەم ئاغا و هەم ئامێرهێز بوو، ماڵ و مەجلیسیشی شوێنی کۆبوونەوەی ڕۆشنفیکران و خەڵکانی هونەرمەند بوون، بەوە ناسرابوو گەر بە دڵی نەبێت، فەرمانی سەرکردەکانی سەروو خۆی جێبەجێ ناکات، بێئەوەی کەس بتوانێت دەست بۆ خۆی یان پلەوپایەی بەرێت. من هەر ئەو ڕۆژە هەواڵم بۆ مامۆستا ئەسعەد نارد و بە ئاڕاستەی بنکەی سەرەکی مەنسوور ئاغا، لە گوندی سێئاسکێ کەوتمە ڕێگا. گوندەکە بە پێ سێ ڕۆژێک لە منەوە دووربوو، گەر لە ڕێگاوبان ماشێنم چنگ بکەوتایە لەوانەبوو ڕێگاکە بۆ دوو ڕۆژ یان ڕۆژ و نیوێک کورتبکەمەوە، بەڵام بەوەدا لە سەر هەندێ ڕێگا مەترسی تۆپباران و لە سەر هەندێکی تر ئەگەری هێرشی فڕۆکە و پەلاماری سوپا هەبوو، تێپەڕین و پەلەکردن ئاسان نەبوون، من بە هۆی تێکچوونی ماشێن و باران و ڕێگیرانەوە بە چوار ڕۆژ گەیشتمە سێئاسکێ. کە گەیشتمە ئەوێ، نزار ئیدریس شەش ڕۆژ بوو لە دیوەخانی زێڕوەلی هەم خۆی کردبووە نزیکی ئاغا و هەم لە دیوەخاندا کۆمەکیدەکرد و شەوانیش لە مەجلیسدا گۆرانی دەچڕی. ئەو یەکەمجار کە گەیشتبوو، بێئەوەی خۆی بشارێتەوە یان شوناس و چیرۆکی خۆی بگۆڕێت، لە بەردەم مەنسوور ئاغا و ژمارەیەک لە خوێندەوارانی شاردا، کە میوانی هەمیشەیی مەجلیسی ئاغا بوون، بە زمانێکی کاریگەر، بە بەلاغەتێک کە کەمجار لە گەنجێکی وەها دەوەشێتەوە، بە دەنگێک توانایەکی ئەفسوناوی تێدایە، چیرۆکی هەڵهاتنی لە پسمامان وەک خۆی و بەدروستی گێڕابووەوە. گووتبووی «من گەنجێکی بێ دایک و باوک بووم و هەر گەنجێکی وەک من دەشێت هەڵە بکات». گووتبووی کە لیڤیتانت لە زیندانی پسمامان ئازارێکی ترسناکی داوە، چەندەها ڕۆژ بێهۆیەکی دیاریکراو یا بێ داواکارییەکی تایبەت خستوێتیە ژێر لێدانی

بەردەوامەوە. گووتبووی کە دەیان دیلی دیکەش لەوێ لە ژێر ئەشکەنجەی بێهۆ و قورسدان، ئەوەی لەو گرتووخانەیەدا ڕوودەدات جیاوازییەکی نییە لەوەی لە گرتووخانەکانی بەغدا یان لە زیندانەکانی محەمەد رەزا شادا ڕوودەدەن، ئازاری زیندانەکان و سووکایەتیکردن بە ئینسانیەتیان لەو پەڕیدایە. مەنسوور ئاغا دەیزانی هەموو ئەو شتانەی نزار دەیانگێڕێتەوە دروستن... خوێندەوارەکانی شار لەوێ زۆر پشتی ئەو گەنجەیان گرتبوو. گەر پشتگیری و لە ئامێزگرتنی سەعید یۆنان و ئیسماعیل موسا نەبایە کە هەردووکیان ئەوکات دوو ڕۆشنبیری دیاربوون، دوو نوسەر بوون لە سەرەتای کاری ئەدەبی و پێشکەوتنی گەورەی خۆیاندا بوون، ئەستەم بوو مەنسور ئاغا واناسان دیلێکی هەڵهاتوو، لە گەورەترین و ناودارترین زیندانی شۆڕش بگرێتە خۆی.

کاتێک گەیشتمە سێئاسکێ بێئەوەی کات بە فیڕۆبدەم دوو بە دوو قسەم لەگەڵ مستەفا ئاغای، جێگری ئامیرهێزدا کرد، کە هەر برای مەنسوور ئاغا خۆی بوو. گووتم کە شۆڕش بۆ کارێکی نهێنی منی ناردوە بۆ ئێرە و دەبێت ماوەیەک لێرەبم. هەڵبەت مەنسوور ئاغا پیاوێکی زیرەک بوو، دەیزانی بنکە و دیوەخانەکەی بووە بە شوێنی کۆبونەوەی چەندەها گەنج و خوێندەواری شاری، خۆی دەرگای بۆ هەموو ئەو نوسەر و هونەرمەندانە کردبووەوە کە لەگەڵ لێشاوی خەڵکدا پەیوەندیان بە شۆڕشەوە کردبوو، بەڵام کەسیان جێگایەکی تایبەتی و نیشێکی ئەوتۆیان نەبوو. مەنسوور ئاغا دەیزانی، تەنیا لە ژێربالی ئەودا دەتوانن بە ئارامی دانیشن و پەرتەوازە و سەرگەردان نەبن... خۆی کەسێکی زانست دۆست و واقعبین بوو، دەیزانی سەرکردە بەرزەکان زۆر حورمەتی لێدەنێن و تێگەیشتنیان بۆ ئەوە هەیە کە حەزی بە خزمەتی زانا و ڕۆشنبیرانی بێدەرامەتە. هەموو لەوە تێگەیشتبوون کە زۆر بەوە بەختەوەرە ماڵەکەی وەک جێگای کۆبونەوەی ڕۆشنبیران و

خۆی وەک پشت و پەنای خوێندەواران دەربکەوێت. لە بەرئەوە نوسەران و منەوەرانی ئەهلی شار، لە هەموو جۆر و چیزەیەک ڕوویان تێدەکرد. من کە چیرۆکی پەنابردنی نزار ئیدریسم بۆ ماڵی مەنسوور ئاغا بیست، سەرسامبووم لەو بڕیارەی نزار. من وام حیسابکردبوو کە نزار دوو ڕێگای لە بەردەمدایە، یان ئەوەیە رابکات بۆ ئێران و هەوڵبدات لەوێ چارێک بۆ خۆی بدۆزێتەوە، یان بگەڕێتەوە بۆ ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عێراق و تەسلیمی بەعسییەکان بێتەوە. ئەوەی هیچیانی نەکردبوو هەم بلیمەتی و هەم سەرکێشی و چاونەترسییەکی گەورەی تێدابوو. کە نزار دەگاتە سێناسکی، خۆی تا شەو حەشاردەدات و چاوەڕێ دەبێت تا دیوەخانی ئاغا پڕدەبێت لە رۆشنبیران و ئەهلی زانست، لەو کاتەدا فرسەت دەهێنێت و خۆی دەکات بە ناو مەجلیسی گەرمی قسە و پێکەنیندا و وەک کەسێک کە جورئەت و چاوقایمی سنوورێکیان بۆ نییە، لە بەردەم ئاغادا دەوەستێت و دەڵێت «من ناوم نزار ئیدریسە، لە زیندانی پسمامان هەڵهاتووم، ئێستا پەنام هێناوە بۆ ئێوە و دەمەوێت زیندانی ئێوەبم و ئەگەر دەکوژرێم، بە فەرمانی ئێوە بکوژرێم». لەوێ هەموو چیرۆکی خۆی دەگێڕێتەوە، زمانێکی وەها کاریگەر بەکاردەهێنێت کە خوێندەواران بە بەلاغەت و ڕەوانی سەرسامدەبن. دەچێتە ناوەڕاستی مەجلیسەکەوە و دەپرسێت «مەنسوور ئاغای بەڕێز، تۆ چەند وەختە خەبات دەکەیت، خۆت بۆ کورد دەدەیت بە کوشت. بۆچی خەباتتکردوە، بۆچی شەهیدت داوە، بۆچی خوێن لە سەر ئەم خاکە ڕژاوە... بۆچی؟.. بۆ ئەوە نییە کە کورد ئازاد بێت، بۆ ئەوە نییە ئینسانی ئەم مەملەکەتە ئابڕوویان پارێزراو بێت، بۆ ئەوە نییە بەشەری هەژار و کوردی پەشۆڕووتی وەک ئێمە شتێک لە سەربەرزیان بۆ بمێنێتەوە. بەڵام ئەوەی لە زیندانی پسمامان بە دەستی کەسێکی وەک لیفتانت هۆمەر بۆتانی من بینیومە، دوورە لەم ئامانجانەوە. شۆڕشێک کە سووکایەتی بە شۆڕشگێڕان بکات،

کە خۆی گرتووخانەی ترسناک دابمەزرێنێت، کە ڕەچاوی عەدالەت نەکات، شۆڕشێکە ناگات بە ئامانج». ئەوە ساتی یەکەمی دەرکەوتنی نزار ئیدریسە لە سەر سەحنەی شۆڕش. ئەوە یەکەم وتارێتی کە بۆنی تورەییەکی شۆڕشگێڕانەی لێدێت... ئاخۆ ئەوە ساتێکی ڕاستگۆیانەی شۆڕشگێڕێکە کە لە سەرەتای هەستکردنیدایە بە زوڵمە گەورەکان یان نمایشی کەسێکی دوو ڕووە، کە دەتوانێت دونیای دەوروبەری خۆی بە زیرەکی بخەڵەتێنێت؟. ئەوە دواتر بۆ من و دونیاش زیاتر روون دەبێتەوە.

لە ڕاستیدا ئەوە پرسیارێکی گەورە بووە لای من: ئاخۆ مرۆڤ دەتوانێت بگاتە پلەیەک لە زیرەکی و وردبینی، بشێت شۆڕشگێڕێکی ڕاستەقینە لە قۆڵبڕ و نمایشبازێکی شارەزا جیابکاتەوە؟ دەتوانێت یاخیبیانێک کە بەراستی دژ بە هەموو ئەم گەردونە هەڵدەستن لە لێبوکانیک جیابکاتەوە کە تەنیا لە دوی شەپۆل دەڕۆن و شوێن بانگەشەی مێگەلە گەورەکانی مێژوو دەکەون؟. سەبارەت بە خۆم دەبێت بڵێم کە لە دوای هەرەسی گەورەی شۆڕشەوە لە ناوەڕاستی حەفتاکاندا، هەرکات بەشداری بزووتنەوەیەک بووبم، هەوڵ بووە بۆ تێگەیشتن لە درۆ و خەیاڵ و جوانی ناو شۆڕش، بۆ ڕوانین بووە لە گیانفیدا ڕاستەقینەکان و هەڵاوێردنیان لە کەسانێک کە شۆڕش تەنیا جبەیەکی ئاوریشمینە لەلایان و دەیدەن بە سەر خواست و ئارەزووە نهێنییەکانی خۆیاندا. بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ و ساڵ دوای ساڵ ئەوەم زیاتر بۆ ئاشکرابوو کە وەڵامی ئەو پرسیارە تا پلەی مەحاڵ سەختە. هەستدەکەم لەو شەوەوە کە چیرۆکی ئەو قسانەی نزار ئیدریسم لە دیوەخانی مەنسوور ئاغادا بیست، ئەو پرسیارەم لا دروستبوو، ئاخۆ شتێک بە ناوی شۆڕشگێڕیی ڕاستەقینەوە بوونی هەیە، ئەگەر هەیە دەبێت چی بێت و چۆن بێت؟ ساڵانی دواتر و لە شۆڕشی نوێشدا ناوە ناوە، کە هۆشم وەبەرهاتۆتەوە، بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارەوە بووم. هەرچییەک بێت ئەو ڕۆژە کە نزار لە

دیوەخانی مەنسوور ئاغادا دەردەکەوێت، ئەو نمایشە بە زیرەکی دەبات بەڕێوە و وادەکات هەموو لەوەدا پشتیبگرن کە سزاکان و دۆخی زیندان و عەدالەت دەرهەق بە گیراوەکان لە شۆڕشدا دەبێت ڕێگایەک و شێوەیەکی تر بگرێتە بەر. ئەو شەوە شانۆی یەکترناسینی نێوان سەعید یۆنان و نزارە، بەڵام ئەوەی دواتر مانا و نرخی هەیە، خودی ئەم یەکترناسینە نییە، بەڵکو نزیکبوونەوەی منە لە هەر یەک لەو دوو ڕۆحە جیاوازە، کە لە ناخدا شتێکی هاوبەشیان نییە. نزار گەنجێکی ڕام نەکراوە، شۆڕشگێڕێکە لە مەتریالێکی نەپاڵاوتە، کەسێک جگە لەوەی گەرداوێکی ترسناک لە خوێنیایەتی، شەهوەتێکی بێڕەحمی زیندەگی دەیهەژێنێت، زمانێکی پاراویش لە دەمیدایە کە وەک با بۆی بجوڵێنێت دەزانێت جوان بایبدات، سیفەتی بەرچاو و چەکی ئەوتۆ گرنگی نییە. سەعید یۆنانیش، ساڵانێکی درێژە لە ئەدەبیاتی شۆڕشی دونیادا دەخوێنێتەوە، هێشتا گەنجە، هێشتا نەبۆتە ئەو نائومێدە گەردونگەرایەی شکستی خۆی بە شان هەڵدەگرێت، کەسێکە هێشتا خەون بە عەدالەتی سەرتاسەری و شۆڕشی گەردونییەوە دەبینێت، بیر لە ڕێگا جیاوازەکانی گۆڕینی دونیا دەکاتەوە. ئەو شەوەی من و سەعید یۆنان و نزار ئیدریس لە دیوەخانی مەنسوور ئاغادا کۆبووینەوە، سەعید تەمەنی بیست و حەوت، نزار لە کۆتایی هەژدە و من بیستودوو ساڵانم بوو... هەر سێکمان گەنج، هەر سێکمان لە سێ ڕێگاوە هاتبووین، وەها دیاربوو هیچ شتێک کۆمان ناکاتەوە، وەها دیاربوو، وەک ئەوەی سێ کەسین دواتر بە سێ ڕێگادا دەڕۆین کە هەرگیز ناچنەوە سەریەک. بەڵام هەمیشە چێوەیەکی نەبینراو هەیە ئادەمیزادە جیاوازەکان کۆدەکاتەوە، هەمیشە پەرژینێکی نهێنی هەیە کە شتە جیاوازەکان دەخاتەوە ناو یەک جێگا و دەیانپەستێتە ژێر یەک خانە و شورایەکی ئاسنینیان بەدەوردا هەڵدەچنێت. مرۆڤەکان چەندە لە یەک دووربن ئەو زەمانە و مێژووەی تێیدا دەژین وایان

لێدەکات لە یەکدی بچن، چەندە بیانەوێت دوور لە یەک بڕۆن، هێزێک هەیە دەیانخاتەوە ناو هەمان چێوە.

من دوو ڕۆژ دوای گەیشتنم بە سێئاسکێ، بە بەکارهێنانی ئەو شیفرە ئاڵۆز و سەیرەی مامۆستا ئەسعەد فێری بەکارهێنانی کردم، تێکستێکی بچوکم نوسی و چیرۆکەکەم گەیاندە ئەو، پێم ڕاگەیاند لە سایەی مەنسوور ئاغادا دیلە هەڵهاتووەکەمان لە پشووی خۆشیدا دەژی و لێرە وەک کەسێکی بەحورمەت قەبووڵکراوە. وەڵامی مامۆستا ئەسعەد ئەوە بوو کە من لەوێ بمێنمەوە و نزار بنێمە ژێر چاوەدێری بەردەوامەوە. من دڵنیابووم ڕەشید وەیباب و لیڤیتانت ڕێگای کەناڵە ڕەسمییەکان و فشاری سەرۆکایەتی دەگرنەبەر و کارێکدەکەن لە پیاوە زۆر باڵاکانی شۆڕشەوە فەرمان بۆ گرتنەوە و وەرگرتنەوەی نزار دەرچێت. بەڵام وەک مەنسور ئاغا بە کاری منی زانیبێت، ئەو شەوە لە دیوەخاندا هێرشێکی ئاگرینی کردە سەر کەسانی وەک وەیباب و بە مایەی ناشیرینکردنی ڕووی شۆڕشی لەقەڵەمدان.

لەو نێوەندەدا من سەرگەردان هەردەبوو چاوەڕوانی پێشهاتەکان بکەم. گەرچی مەنسوور ئاغا و مستەفای برای خۆشیان بەوە نەدەهات جاسوسێکی وا لە ماڵیاندا بێت، بەڵام بۆ ئەوەی لاسەنگی زۆرتر دروست نەکەن و کێشەکان قووڵتر نەکەنەوە، بە بێدەنگی ئامادەگی منیان وەک جاسوسێکی بێتوانا و شەرمن قەبووڵکرد. هەمووی چەند ڕۆژێکی کەمی برد تا هەموو زانیان من بە مەبەستی چاوەدێری نزار هاتوومەتە ئەو دەڤەرە، بەڵام کەسانێکی بەدبین شتەکەیان وا نیگاردەکرد وەک ئەوەی من چاوی مەقامە باڵاکانی شۆڕش بم و لە سەرەوەڕا ناردبێتیانم بۆ ئەوەی هەموو جوڵەیەکی مەنسوور ئاغا و هاوکارانی بخەمە ژێر چاوەدێرییەوە. هەتا دەنگۆیەکی بچوک بڵاوبووەوە کە لە داهاتووی نزیکدا و بە ئەمری سەرۆک، مەنسوور ئاغا لە پۆستی ئامیرهێزی دەردەکرێت و دەکرێتەوە

بە پێشمەرگەیەکی ئاسایی و لەوانەشە بدرێتە دادگای شۆڕش.

لە ڕاستیدا ناکۆکی نێوان مەنسوور ئاغا لەگەڵ هەندێک کەسایەتی گرنگ و بە توانای ناو شۆڕشدا مێژوویەکی دووروودرێژی هەبوو، هەندێک لە کێشەکان ڕیشەی زۆر کۆنیان هەبوو، دەکرێت بڵێم پاشماوەی جەنگی دێرینی نێوان خێڵەکانی ئەم دەڤەرە بوون کە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە سەدەی نۆزدەوە تا ئەو سەردەمە هاتبوون. گەرچی شۆڕش ئاغای هەموو هەرێمەکانی لە یەک سوپای گەورەدا کۆکردبووەوە، بەڵام ئاشکرا کینە و قینی دێرین وەک هەمیشە لە ژێرەوە کاریاندەکرد. لە یەکەم هەفتەکانی ژیانی نێو شۆڕشەوە هەستمکرد کە چۆن جێدەستی جانەوەرێکی ئەفسانەیی لە سەر بەردێک جێدەمێنێت، ئاوها جێدەستی کینەی کۆن لە سەر هەموو بەردێکی وڵاتەکە دەبینرێت. باپیرانی وەیباب و باپیرانی مەنسوور ئاغا، چەندین سەدە لە ناکۆکی و جەنگدا ژیابوون، خوێنی زۆر لە نێوانیاندا بوو، بەڵام ئەو جەنگە ئەمڕۆ شێوەیەکی ژێرەوانکێی وەرگرتبوو. هەر یەک لە ڕەشید وەیباب و مەنسوور ئاغا هەوڵیاندەدا ئەوی دییان لای سەرکردە گەورەکانی شۆڕش لکەدار و لاوازبکەن. وەیباب ئاغایەکی دڕ بوو، پێشمەرگەکانی خۆی وەک سەپان و گاوان سەیردەکرد، بە خزمەتکار و بەردەست ناویدەنان، زۆربەی جەنگاوەرانی بەشێک بوون هەر لە خێڵ و ڕەعییەتەکەی کە دەبوو لە کاتی جەنگ و فەرماندا گیانفیدایی بنوێنن. ئەو غەریبانەی لە ژێر دەستی ئەودا کاریاندەکرد، بۆ ئەوە بوو بەو کارانە هەستن کە پیاوانی ڕەعییەتە نەخوێندەوارەکەی خۆی پێیان نەدەکرا. بە پێچەوانەی وەیبابەوە، مەنسوور ئاغا کەسێکی بەڕەحم و منەوەر بوو، زۆر لەو خوێندەوارانەی شار کە لە هێزەکانی دیکەدا جێگایان نەدەبووەوە و کەس نەیدەویستن، ئەو لە هێزەکەی خۆیدا وەزیفەی دەدانێ و لە دیوەخانی خۆیدا حورمەتی لێدەگرتن. پتر وەک سیاسییەک و ڕۆشنبیرێک ڕەفتاریدەکرد، ئاغایەتی خۆی تەنیا

بەرامبەر گروپێکی کەم لە ڕەعییەت و دەستوپێوەندانی خۆی پیشاندەدا. ئەوە کارێکی کردبوو ئەوانەی پشتوپەنای ڕەشید وەیبابن لای سەرۆکانی باڵا، وەک لاواز و شلۆک وێنابیکەن و بڵێن کە ئەو توندی و هێزەی نییە کە دەبێت ئامیرمێزێک لە جێگایەکی وابایەخداردا ببیبێت، هەتا هەندێکیان تۆمەتی ئەوەیان بۆ دەتاشی کە مەنسوور ئاغا لە دڵدا کۆمۆنیستە و لە ژێریشەوە هەواداری یەکسانی هەموو خەڵکە. بەرامبەر بەوە وەیباب کەسانی دڵڕەقی وەک لیڤیتانتی زۆر لە دەور بوو. زۆربەی سەرلق و ئامیربەتالیۆنەکانی لە کەس و خوێشە نزیکەکانی خۆی بوون کە بێرەحمانە سزا و دارکاری جووتیارەکانیان دەکرد، خەڵکیان فرێدەدایە ناو ئاوی سارد و بەستووی مزگەوتەکانەوە، سەرانەی زۆریان لە ڕێبوار و کڕیار و جووتیارەکان دەسەند، کچ و ژنە سەپانەکانیان بۆ شەو و دوو شەو داگیردەکرد و دواتر دەیاندانەوە دەست خاوەنیان، دەستیان بۆ زەخیرەی خەڵک دەبرد و باجیان لە سەر دێوەرە بچوکەکانیش دادەنا. بە جۆرێک وەک دواتر زانیم بڕێکی زۆری گیراوان لە بەندیخانەی پسمامان خەڵکانی هەژاربوون کە نەیانتوانی بوو بەو شێوەیە ڕەفتاربکەن کە یاساکانی ڕەشید وەیباب دەیەوێت. پسمامان وەک نزار ئیدریس ناویدەنا، گرتووخانەی شۆڕش نەبوو، بەڵکو زیندانێکی تایبەتی ماڵی وەیباب بوو کە کەسێکی درندەی وەک هۆمەر بۆتانی دەیبردەڕێوە. وەک دواتر تێگەیشتم مەنسوور ئاغا بە لە خۆگرتنی نزار ئیدریس و هێشتنەوەی لای خۆی هەم دەیویست بە فەرماندارە بەرزەکان بڵێت، کە لە ژێر سایەی وەیبابدا هەم ستەمی زۆر و هەم پاشاگەردانی هەیە، دەیویست وەیباب و تاقمەکەی وەک کۆمەڵێک زوڵمکاری گەمژە پیشانبدات کە هەم ئازاری خەڵک دەدەن و هەم ناتوانن دەرگای گرتووخانەکەشیان توند دابخەن.

شەڕی ئاغاکانی نێو شۆڕش هەمیشە لە ژوورەکانی پشتەوە و لە ڕیواقە نهێنییەکانی ناو سیاسەتدا بەردەوامبوو. ئەوەی نزار ئیدریس توانی

ئەو کینە و بوغزە بۆ خۆی بەکاربهێنێت، یەکێکی دی بوو لە مەکرە گەورەکانی، سەرەتای دۆزینەوەی بوو بۆ ئەو تەکنیکی یاریکردنەی دواتر بە درێژایی ژیانی ڕەچاویدەکات. من لە ڕۆژانی دواتردا مامۆستا ئەسعەد چەند جارێک پەیوەندی پێوە کردم و پێیگووتم لە شوێنی خۆم ژوورێکی بچوک پەیدابکەم و گوێبگرم و بەردەوام تێبینییەکانم تۆماربکەم و سەر دێرە گرنگەکانیشی بۆ ئەو بنێرم.

هەر لە ڕۆژانی سەرەتای کارکردنمەوە وەک هەواڵگر و سیخوڕ، نزیکییەکی سەیرم لە نێوان کاری خۆم و کاری ڕۆماننوساندا بینی، دەبێت بڵێم کە من کاری چاوەدێری و تێبینی نوسیم بە شەوقێکی بێوێنەوە ئەنجامدەدا، بە وردی هەموو شتێکم دەخستە سەر کاغەز، کەمترین شتم فەرامۆش نەدەکرد و هەوڵمدەدا کە بچوکترین وردەکاری فەرامۆش نەکەم. بایەخێکی تایبەتیم بە وەسفی شوێنەکان و شتەکان دەدا، دەفتەری تێبینییەکانم پڕکردبوو لە لیستی دابەشبوونی کات و شوێن، سەعات دوای سەعات لە هەر جێگایەک بوومایە دەمنوسی، بە بێلایەنییەکی کەموێنەوە، وەسفی کەسەکان و جل و بەرگ و شێوەی جوڵە و چەشنی قسە و کاتی خەندەکانیانم تۆماردەکرد. لە دەفتەرەکەمدا چەندەها لاپەڕەی دوورودرێژم بۆ وەسفی گوندی سێناسکێ و دانیشتوانی تەرخانکردبوو، بە وەسفی ئینسانەکان و جۆری ڕەفتارەکانیانەوە نەدەوەستام و دەمگواستەوە بۆ وەسفی ئاژەڵ و مەڕومالات و ڕەشەوڵاغەکانیشیان... وەسفی وردم لە سەر تەواوی سەگەکانی گوند دەنوسی، هەتا ئەوەم لە یاد نەدەکرد کاتی خوێندنی کەڵەشێر و شێوەی گارەگاری مامرەکانیان لای خۆم تۆماربکەم. بە جۆرێک کە دوای ئەو هەموو ساڵە، ئەمڕۆ کۆپی دەفتەرە دێرینەکانی ئەودەم دەردەهێنمەوە، دەتوانم چاو لێکبنێم و تەواوی ئەو کون و کەلێنە گەورانەی کە زەمەن کردوێتییە یادەوەریم پڕیانبکەمەوە. شەوان هەمیشە تادرەنگ لە بەر فوتیلەیەکدا دەمامەوە و بە خەتێکی جوان کە

هیچی لەو خەتە خوار و خۆنەگر و نارێکانەی ئەمرۆم نەدەچوو، پەڕە دوای پەڕە سەرنج و تێبینییەکانی خۆم دەربارەی شتەکان تۆماردەکرد، هەردەم چەند لاپەڕەیەکم بۆ وەسفی نزار ئیدریس و قسە و کردار و ڕەوشتی ئەو ڕۆژەی تەرخان بوو. من لەو سەرەتایەوە لە یەک ڕاستی گەورە تێگەیشتم کە کاری سیخوڕی، لە جەوهەریدا گەرچی کارێکی بەدە و پێویستی بە چاوێکی گومانکار و دەموچاوێکی دوو دیو هەیە، بەڵام پێویستییەکی گەورەشی بە زیرەکی و وریایی و بینینی وردەکارانە هەیە. لە ڕاستیدا تەواوی ئەو تێبینی و وردەکاریانەی من لە سەر دەیان گومانلێکراو لە ساڵانی شۆڕشدا کۆمکردنەوە، ئەوەیان پێدەگووتم کە خەڵکانی ئێمە، جگە لە نهێنییە جنسییەکانیان، هەر یەکەیان کۆمەڵێک نهێنی بچوک و بێمانا و کەم زیانی خۆیان هەیە کە هەردەم لە نهێنییە گەورە و ترسناکەکان پتر هەڵیاندەگرن و دەیانپارێزن. یەکێک لە شتە هەرە سەرنجڕاکێشەکانی کاری سیخوڕیی، ئەوەیە کە مرۆڤ جۆرە پەیوەندییەکی تازە لەگەڵ نهێنیدا دەبەستێت، من تا ئەو دەم ئینسانم وەک بوونەوەرێکی خاوەن نهێنی سەیر نەدەکرد، ئینسان لەلام بوونەوەرێکی ڕۆشن و ڕووتەخت و کەملۆچ بوو. بەڵام مرۆڤ هێندەی شوێنی خۆی وەک هەواڵگر لە ناوەڕاستی شتەکاندا وەرگرت، هێندەی زانی کە وەزیفەی لە دونیادا بۆتە ئەوەی بە دوای نهێنی و تایبەتمەندی و دیوە تاریکەکەی ئەوانی دیدا بگەڕێت، ئیتر شێوەی سەیرکردنی بۆ مرۆڤ لە بنەوەڕا دەگۆڕێت، مرۆڤ لەلای دەبێتە بوونەوەرێک بە ڕووبەرێکی تاریکەوە، بە لۆچی گەورەوە کە کردنەوە و تێگەیشتنی، زۆرجار هەم سەخت و هەم ترسناکە.

من ژوورێکی چکۆلەم لە ماڵی پیرەمێرد و پیرێژنێکدا بە پارەیەکی کەم بە کرێگرت. بوونم وەک چاوەدێرێکی دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش لای کەس شاردراوە نەبوو، بە جۆرێکی ناڕاستەوخۆش هەموو بوونی من و

بوونی نزار ئیدریسیان پێکەوە گرێدەدا. بەڵام مەنسوور ئاغا نەیدەویست لەگەڵ دەزگای ئەمنییەتی شۆڕشدا بچێتە کێشەی گەورەوە، سەرانی دەزگای ئەمنییەت سەربەخۆییەکی خۆیان و هێزێکی تایبەتیان هەبوو، کە ئاغا دەیویست بێلایەن ڕایانبگرێت و نەیانکاتە پشت و پەنای وەییاب. ئاشکرا هێزی ئەوان لە هێزی سەرکردەکانی پێشمەرگە گەورەتر بوو، ڕۆژێک منی بانگکرد و پێیگووتم کە ئەو ئامادەیە هەموو هاوکارییەک پێشکەش بە من بکات، بەڵام منیش لە سەرمە زانیاری هەڵە لە سەر ئەو و دیوەخانەکەی بۆ سەرەوە بەرز نەکەمەوە. من بە هێمنی جاسوسێکەوە کە دەزانێت چی دەڵێت و چی دەکات، خۆم لە تەم ئاڵاند و وەک کەسێک کارێکی زۆر ترسناک و نهێنی پەنهانبکات، گووتم کە ئیشی من تەنیا شتێکی بچوکە و کەس ڕاینەسپاردوم زانیاری لە سەر ئێوە و هیچ کەسێکی دی کۆبکەمەوە. ئەویش دەستێکی بەسمێڵیدا هێنا و بە هێمنی گووتی «هەتا ئەگەر واش بێت، شۆڕش ئازادە و دەبێت هەموومان چاوەدێریبکات، چونکە کوردستان لە هەمووماں گرنگتر و عەزیزترە». ئەو ڕێز و ڕێناسانییەی مەنسوور ئاغا نواندی بۆ من، کۆمەکیکردم شەوان بچمە دیوەخانەکەی و لە نزیکەوە فەزای دانیشتن و گفتوگۆکانی چاوەدێریبکەم.

دەرکەوتنی من لەو مەجلیسانەدا، سەرەتا کاریگەرییەکی خراپی بەجێهێشت، هەر کات من دەگەیشتمە دیوەخان لە ناکاو بێدەنگییەکی قورس و گوماناوی باڵی بە سەر هەمووانـدا دەکێشا. یەکێک لە کێشە هەرە گەورەکانی پیاوانی ئەمنییەت ئەوەیە، ڕوو لە هەر جێگایەک بکەن، لە شوێنێکی سروشتی و پڕ ژیانەوە دەیگۆڕن بۆ شانۆیەکی پڕ نمایش. هیچ کەس وەک پیاوانی ئاسایش مرۆڤانی دی ناگۆڕن بۆ ئەکتەر، هەر هێندەی ئەوان دەردەکەون، خەڵکی نەبادا هەڵەیەک بکەن، دەمامکێکی قورس دەنێنە سەر دەموچاویان و بە جۆرێکی جیاواز لە جەوهەری خۆیان

ڕەفتاردەکەن، لە بەرئەوە کەمجار ڕێدەکەوێت پیاوانی ناسراوی ئاسایش، بتوانن تادەمرن مرۆڤێک بە ڕاستی بناسن و کەسێک بە پاکی و بێ دەمامک ببینن. لە ڕاستیدا ماوەیەکی ویست تا مەجلیسی مەنسوور ئاغا و خوێندەوارەکانی بە بوونی من ڕاهاتن. لە ڕۆژی یەکەمەوە ویستم ئەو سەرنجە لای بینەران و گوێگرانم جێبهێڵم کە من کەسێکی خوێندەوارم و شتێکی بەد و ترسناکم لێ ناوەشێتەوە، تووشبوونیشم لەگەڵ ئەم کارەدا دەگەڕێتەوە بۆ نیازپاکی و دڵسۆزیم بۆ شۆڕش. شتێک لە سەرەتاوە سەرنجی زۆر ڕاکێشام، بێباکی نزار ئیدریس بوو دەرهەق بە من. لە چەند ساتی یەکەمدا ئەو ڕاستییەم بۆ دەرکەوت کە سۆنگەی گەورەی مانەوەی نزار لای مەنسوور ئاغا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بڕوا سەیرەی بە خۆی. بۆچوونە ئیلحادی و کوفربازییەکانی نزار، لای ئاغا نەوەک هەر قەبووڵکراوبوون، بەڵکو شوێنی ستایش و ئافەرینیش بوون. نزار لە هەر بارودۆخێکدا بایە، وەک تێکشکاو دەرنەدەکەوت، بە دەنگی بەرز قسەیدەکرد، دەیتوانی بە سەلیقەی سادە و زمانی ڕەوانی خۆی، زیاتر لە ڕۆشنبیرانی دیوەخان سەرنج بۆ خۆی ڕابکێشێت. لە ماوەی یەکەمدا خۆی وادەرنەدەخست کە بایەخێک بە من دەدا و نرخێکی ئەوتۆم بۆ دادەنێت، وەک زۆربەی ئەوانەی چاوەدێری دەکرێن وا ڕەفتاریدەکرد وەک ئەوەی ئاگادار نییە و شتێک نییە هۆکار بێت بەدیوی مندا وەربگەڕێت. ئەو ڕەفتارانەی لە ناوەوە گینگڵیان پێدەدام، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ جۆرە هێمنییەکم تێدا دروستدەبوو، لە هێمنی یاریکەری شەترەنج دەچوو کاتێک بە سەر یارییەکی قورس و پڕ ئەگەردا دەنوشتێتەوە. من چەند شەو دەچووم بۆ دیوەخان و شتێکی وەهام نەدەبیست قابیلی تۆمارکردن بێت، دیوەخان هەر بۆنی نوکتە و چیرۆکی ڕاو و سەربوردی شەڕ و هەواڵی بۆردومانە بەردەوامەکانی لێدەهات. شەوان کە دەگەڕامەوە لە سەر دەفتەرەکەم پتر باسی فەزای دیوەخان و جلوبەرگی ئاغا و چۆنێتی

چا خواردنەوەکانی ئەو و قسەوباسی نێوان ڕۆشنبیرانم دەنوسییەوە. جارێک لە جارەکان وا ڕێکەوت کە لە ئەڵقەی دانیشتنی دیوەخاندا بکەومە تەنیشت سەعید یۆنانەوە. یۆنان ئەودەم، لە ڕۆژنامە کوردییەکانی بەغدادا هەندێک شیعر و وتاری ئەدەبی بچوکی بڵاوکردبووەوە. کوڕێکی باریک بوو بە قژێکی خاو و دەموچاوێکی لاواز و چاویلکەیەکی پزیشکی گەورەوە، لەوانەبوو کاتێک لە نزیکیشەوە قسەی لەگەڵدا دەکردی وەک هەر لە دوورەوە بتبینێت وەهابوو، پێڵوانی لەیەک نزیکدەکردەوە و وا دەیڕوانی وەک ئەوەی سەیری توحفەیەکی بەبەها و سەیر بکات. ئەو شەوەی قسەم لەگەڵ کرد، لەوە تێگەیشتم کە ئاستی ڕۆشنبیریی لە توانای نوسینی باڵاترە. یەکەمین جار ئەو پرسیارێکی مانادارى لێکردم و گووتی «بەڕای ئێوە سنووری حەرام و حەڵاڵ لە شۆڕشدا تا کوێیە؟. شۆڕشگێڕ تا چەند بۆی هەیە لاسایی دوژمنەکانی بکاتەوە، مانای هەمان ئەو کەرەستانە بەکاربهێنێتەوە کە لە دۆخی ئاساییدا دەزگا سەرکوتکەرەکانی حکومەت بەکاریدەهێنن؟». دیارە پرسیارێکی سەخت بوو، ڕاستە من قوتابی زانکۆ بووم و خوێندنەوەی سیاسیم هەبوو، بەڵام ئەوە سەختترین پرسیارێک بوو دەکرا کەسێک لەو ئان و ساتەدا لە منی بکات. من بێئەوەی خۆم وەک نەزانێک دەربخەم، ئەوەم بە هەل زانی تا وەڵامێک بدەمەوە کەمێک ئەو وێنەی جاسوسە بەدە لە سەر خۆم کاڵبکەمەوە و شتێک بنوێنم وێنەیەکی ترم بداتێ و سەرنجێکی تر جێبهێڵێت. گووتم «مامۆستا سەعید، من دوو جۆر ئەخلاقییەت دەبینم، دوو جۆر لە ئەخلاقییەتی هەمیشە جیاواز، ئەخلاقیاتی بیرکردنەوە و ئەخلاقیاتی کار... ئینسان مەخلوقێکە لە هەر بەرەیەکی سیاسیدا بێت، هەمیشە بەر ئەو هەڵبژاردنە قورسە دەکەوێت، ناتوانێت ئەخلاقیاتی کاری وەک ئەخلاقیاتی بیرکردنەوەی بێت. ئەوە تەنیا بیرکردنەوەیە دەتوانێت دڵسۆزی بەها باڵا و بەرزەکانی خۆی بێت، بەڵام کار؟ هەموو لاوازیی

و خەوشـی ئینسـان لـە کاردا دەردەکەوێـت. کار پەیوەسـتە بـە کۆمەڵێـک مەرجەوە کـە زۆر گـوێ بـە حوکمـی ئەخـلاق نـادات. بـۆ نمونـە، هەمـوو لـە بیرکردنـەوەدا لـە سـەر ئـەوە تەبایـن کـە مـرۆڤ لـە کاتـی تەنگانـەدا دەبێـت یارمەتـی ئەوانـی دی بـدات، ئەمـە وەک بیرکردنەوە کەسمان دژی نین، هەموو دەتوانیـن پێشـبڕکێ لـە سـەر ئـەوە بکەیـن کاممـان باشـترین و ئینسـانیتر بیردەکەینـەوە، بـەڵام کـە دێتـە سـەر کار ئینسـان تاچەنـد دەتوانێـت بـۆ ئـەو بیرکردنەوەیـە بـە وەفـا بێـت... هـا بـرام مامۆسـتا یۆنـان، وابهێنـە بەرچـاوت کـە منداڵێـک کەوتۆتـە ئاوێکـی خـوڕەوە و خەریکـە دەخنکێـت، تـۆ گـەر بچیتـە ئـەو ئـاوەوە، دەشـێت پەنجـا لەسـەد وەک ئـەو بخنکێیـت و پەنجـا لـە سـەدیش منداڵەکـە رزگاربکەیـت... تـۆ کامیـان دەکەیـت، مـن کامیـان دەکـەم، ئینسـان بـە گشـتی کامـە ڕێگایـان هەڵدەبژێرێـت؟. ئەگـەر بـە ئەخلاقیاتـی بیرکردنـەوە بێـت، دەبێـت هەموومـان بیـر لـە مردنـی خۆمـان نەکەینـەوە و بێتـرس لـە گیانـی خۆمـان و بـۆ ڕزگارکردنـی ئـەو منداڵـە بێگوناهـە خۆمـان بهاوینـە نێـو شـەپۆلان، بـەڵام ئـەی لـە ئەخلاقیاتـی کاردا چۆنـە؟. لـە ئەخلاقیاتـی کاردا کەسـمان گـوێ لـە دەنگـی بیرکردنـەوە ناگریـن و بێئـەوەی ژیانـی خۆمـان بخەینـە مەترسـییەوە لەوێکانـە هەڵدێیـن و لـە دوورەوە سـەیری خنکانـی منداڵەکـە دەکەیـن... پێمبڵـێ مامۆسـتا یۆنـان تـۆ هەڵدێیـت یاخـود نـا؟».

مەنسـوور ئاغـا بـە وردی گوێـی لـە قسـەکانم دەگـرت، ئـەو پیاوێـک بـوو گەلێـک کەیفـی بەوجـۆرە گفتوگـۆ ئاڵۆزانـە دەهـات، کـە دوو چەشـنە بیرکردنـەوەی جیـاواز، دەگەنـە سـەر سـنووری ئەوەی هەر یەکەیـان بێڕەحمانـە پرسـیاری سـەخت و بێـوەڵام بخاتـە بەردەمـی ئەویدیـان. پرسـیارەکەی مـن کەمەکێـک سـەعید یۆنانـی جوڵانـد و بەجلـە کوردییـە تەنکەکانییـەوە کـە هێنـدەی تـر لاوازیـان کردبـوو، چاویلکەکـەی بەرزکـردەوە و چەنـد جارێـک سـەیری دەوروبـەری خـۆی کـرد و گـوتـی «شـتەکان هەموویـان یەکەمجـار

لە بیرکردنەوەدا ڕوودەدەن. دەشێت ئەخلاقیاتی بیرکردنەوە دوورتر لە ئەخلاقیاتی کار بڕوانێت، بەڵام بەبێ ئەخلاقیاتی بیرکردنەوە شتێک نییە ناوی ئەخلاقیاتی کار بێت. ئەوەی تۆ دەیڵێیت وەک ئەوە وایە بڵێین ئەو فڕۆکە چییە بەعسیانەی گوندەکان بوردوماندەکەن، ئەوانەی لە قەلادزێ و هەڵەبجە خەڵکیان قەتڵ و عام کرد، بە هۆی ئەخلاقی بەدی خۆیانەوە ئەو کارەیانکردوە، نەوەک بە هۆی بیرکردنەوەی سیاسی بەدیانەوە... وانییە، برادەر وانییە؟». ئەو شەوە هەستمکرد کە من دەتوانم بێ زۆر لە خۆکردن لە هەندێ کێشەی ئاڵۆزەوە بئاڵێم و لەگەڵ پرسیاری زۆر سەختدا دەرگیر ببم. من بە کەمێک لاقرتییەوە، وەک ئەوەی بخوازم بە ڕۆحێکی ساردەوە ئازاری یۆنان بدەم، گووتم «ئاه، لێگەڕێ کاک سەعید .. لێگەڕێ، مرۆڤ لە زۆربەی ساتەوەختە سەختەکاندا، لەو ساتانەدا کە دەبێت وەڵامی پرسیاری قورس بداتەوە و ڕوو بە ڕوو لە بەرامبەر ئەخلاقی ڕاستەقینەی خۆیدا بوەستێت، هەر کاتی بیرکردنەوەشی نییە. نا لێگەڕێ، ئینسان لەو ساتانەدا کاتی بیرکردنەوەی هەر نییە... من لە یەکەم ڕۆژی شۆڕشدا ناچاربووم، بەڵێ ناچاربووم چوار ئەسپ و هێسترێک بکوژم، لە تۆ وایە من پێش ئەوەی بێم بۆ شۆڕش بیرم لەوە کردبووەوە کە ناچاردەبم چوار ئەسپ و هێسترێک بکوژم، لە تۆ وایە هیچ مرۆڤێک پرسیاری وا لە خۆی دەکات؟ لە تۆ وایە کاتێک ڕووبەڕووی بڕیارێکی کتوپڕ دەبینەوە کاتی ئەوەمان دەبێت بیر لەوە بکەینەوە، ئایا ئەمە بەپێی بیرکردنەوە لەگەڵ ئەخلاقدا گونجاوە یان نا؟ ئایا کاتێک منداڵەکەی پێشدەممان ئاو لووشی دەدات و بۆ بنی خۆی هەڵیدەگرێت، کاتی ئەوەمان دەبێت بپرسین، ئەخلاقی بیرکردنەوەمان فەرمانی بە چییە، یان ڕاستەوخۆ فیترەتی ترسنۆکمان دێتەسەرێ و پێماندەڵێت، بڕۆ و لەم گوێ ئاوە ونبە؟ ». لەو کاتەدا نزار ئیدریس بۆ یەکەمجار سەیریکردم و بە گەرمییەکی کتوپڕ و چاوەڕوان نەکراوەوە

گووتی «تۆ لە سەر هەقی، کاک وەفا لەوەدا تۆ لە سەر هەقی... مرۆڤ هیچ کات، وەکو پێویست کاتی نییە بیر لە ئەخلاق بکاتەوە، هیچ کات وەک پێویست کاتی وەهای نییە. من... من هەموو شتێک دەکەم بێئەوەی بیربکەمەوە. ئینسان لە پێشدا کاردەکات، ئەوسا بیردەکاتەوە. من دەزانم تۆ باسی چی دەکەیت، سوێند دەخۆم کە تۆ ئەسپەکانت کوشتووە بێئەوەی بیر لەوە بکەیتەوە کە ئەسپ کوشتن چییە. هەر مرۆڤێکی سروشتی، هەر مرۆڤێک لە مرۆڤ بچێت، یەعنی ئەو حەیوانە درەی تێدابێت کە لە ناوماندایە، ئەسپەکان دەکوژێت ئینجا بیر دەکاتەوە بۆ کوشتم... بەڵام شتێک لەو حەیوانەدا هەیە کە یارمەتی دەدات دەرک بە مەعنای ئیشەکەی خۆی بکات. من لە ئەزموونی حەیوانەکەی ناو خۆمەوە قسەدەکەم، ئەو حەیوانە شتێکی گەمژە نییە. گەر هەست بە مانای ئیشەکەی خۆشی نەکات هەست بە گرنگییەکەی دەکات». من بێئەوەی زۆر سەیری نزار بکەم، گووتم «بەڵێ مرۆڤ وایە، مرۆڤ سەرەتا دەیەوێت بژی. تۆ سەرەتا دەتەوێت بژیت، دوایی بیردەکەیتەوە چۆن ژیاویت و دەتەوێت چۆن بژیت. وزەیەک لە مرۆڤدایە بۆ کار، بۆ خراپە، بۆ چاکە، توانای ئەو وزەیەش لە هێزی بیرکردنەوە گەورەترە. بەڵام سەبارەت بەو حەیوانە... سەبارەت بەوە». نزار ئیدریس وەک ئەوەی ئیلهامی لە قسەکانی من وەرگرتبێت، وەک ئەوەی بێویست و ئاگای خۆم بەهانەم بۆ هەموو کردارە بەدەکانی ئەو تاشیبێت، قسەکانی پێبڕیم و گووتی «سوێند دەخۆم... سوێند دەخۆم... کە من عەشقدەکەم، کە عەشقدەکەم بیر ناکەمەوە، پێمبڵێ کاک سەعید، تۆ کە ژنێکی رووت دەبینیت چی دەکەیت؟ بیردەکەیتەوە؟ ها. پرسیار دەکەیت، دەڵێیت وای دایە گیان بە ئەخلاق بم یان نا؟ خودا هەیە یان نا؟ جەهەنەم هەیە یان نا؟ یان دەمودەست لەویادا ئەو ژنە رووتە دەخۆیت؟. لەویا وەک هەر کەسێک کە دەیەوێت بژی بە دەستەکانی خۆت ئەو جەستەیە

دەگریت و دەتەوێت چێژی لێببینیت، یان چی؟ ها. دادەنیشیت و بیر لەوە دەکەیتەوە خودا لەم ساتەوەختەدا چۆن تەماشای جەنابت دەکات؟ بەشی هەرە زۆری ئینسانەکان واناکەن، لەو ساتەدا هیچ ئاین و یاسا و شەریعەتێکیان یاد نامێنێت... مامۆستا سەعید تۆ کامیان دەکەیت؟... من حەیوانەکەی ناوم بیرناکاتەوە، بەڵام دەزانێت ئەو لەزەتە چ مانایەکی هەیە، دەزانێت چەند گرنگە ئێستا و لێرەدا ئەو گوناهە بکات. گەر ئەوە نەزانێت، ئاە، گەر ئەوە نەزانێت، هەموو شتێک زۆر بێمانا دەبێت».
ساتێکی سەیر بوو، ساتێک بوو ئیتر لە یادم نەکرد. من و نزار ئیدریس وەک نوێنەری ژیانێکی هار، بەرامبەر سەعید یۆنان دەوەستاین کە پێی لە سەر شتێک دادەگرت تا ئەوسات بۆم ڕوون نەبوو چییە. بەڵام لەساتی یەکەمەوە جیاوازی قووڵی نێوان خۆم و نزار ئیدریسیشم بینی، کە بە خەندە بێشەرم و نیگا بێناموسەکانی، وەک دڵنیابێت هیچ شتێک نایوەستێنێت، قسەیدەکرد. من لەو ساتەدا کە سەعید یۆنان پرسیاری لێکردم، بەرگریم لەوە دەکرد کە ئینسان جگە لەوەی لێبگەڕێ ژیان بیبات، جگە لەوەی بە ناچاریی و بەردەوام بەرامبەر نادیار بوەستێت چاری تری نییە. من مەبەستم بوو پێ لە سەر ئەوە دابگرم کە مرۆڤ مەحکومە بەوەی گەمەی ژیان بەبێ ئەخلاق بباتە سەر، چونکە ژیان هیچ نییە جگە لە زنجیرەیەک پرسیاری نادیار و ڕۆژانە و جیاواز کە ئەزموون و تاقیکردنەوەی هیچ ڕۆژێک لە ڕۆژەکان لەوانی دی ناچێت و بە کەڵکی سەردەمێکی دی نایەت. ویستم پێیبڵێم، بڕوانە من هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم کە ببم بە ئەسپکۆژ و سیخوڕ، لە بەرئەوەی مرۆڤی ئێمە، کە لە سەردەمانێکی تاریک و بێپاشەڕۆژدا دەژین، کە بەو چەشنە دەچینە ناو جەنگەڵی ژیانەوە، ئیرادەمان بە سەر کرداری خۆماندا نامێنێت، دەستێکی تاریک دەمانبات، زۆر تاریک. ئەو دەستە لە دروستکراوی هێزێکە کە بەشێکی لە ناو خواست و غەریزە تاریکەکانی

دڵی خۆمانەوە دێت و بەشێکی دیشی لەو جەنگەڵەوە هەڵدەقوڵێت کە تیا دەژین. لێرەوە بیرکردنەوە لە سنوورەکانی ئەخلاق هیچ نییە جگە لە پرسیارێکی پوچ، چونکە ژیانێک کە سبەینێی دیار نەبێت، ئەستەمە پرەنسیپی نەگۆڕی بۆ دابنێین. بەڵام من دەشمزانی لە ناو مرۆڤدا هێزێکی تر هەیە کە دەیەوێت ئاڕاستەیبکات، بەڵام هێزێکی لاوازە، دەنگێکی کپە، خواستێکە مرۆڤ دەتوانێت فەرامۆشیبکات. جیاوازی نێوان من و نزار لەوەدا بوو، نزار باسی لە ماشێنێکی ترسناکی ناو خۆی دەکرد، لە هێزێکی گەورە و تێکشکێنەر کە پێویستی بە هیچ مۆراڵێک نییە، ئەو ئەوەی بەلاوە گرنگ بوو غەریزە تێکدەرەکانی بەربداتە جیهان و بیرنەکاتەوە، بەڵام من وانەبووم، من ئەخلاقم پێ گرنگ بوو، بەڵام پێم مەحاڵ بوو.

سەعید یۆنان پیاوێکی زیرەک بوو، هەر لە سەرەتاوە دەرکی بەو جیاوازییە کرد، بێئەوەی وەڵامی ئەو پرسیارە بێپەردە و سەیرەی نزار ئیدریس بداتەوە، ڕوویکردە من و بە خەندەیەکی پەشۆکاوەوە، گووتی «بەڵام کاک وەفا، دوای ئەوەی ئەسپەکانت کوشت، هەستت بەچی کرد... هەستت بە ئاسوودەیی کرد یان بە شەرم؟. ئەوە بۆ خۆی گرنگ نییە کە ئەسپەکانت کوشتوە، ئەوە گرنگ نییە. بەڵام پێمبڵێ ئەی ئەگەر من سبەی ئەسپی نەخۆشت بخەمە بەردەست، دەیانکوژیت؟ سبەینێ کۆمەڵێک ئەسپی نەخۆشت بدەمێ دووبارە دەیانکوژیتەوە». من بێوەستان گووتم «نازانم. ئەوەشی من باسی لێدەکەم ئەو نەزانینەیە. ئێمە لە شۆڕشداین، شۆڕش ئینسان مەحکومدەکات هەندێ کاربکات کە لە کاتی ئاساییدا نایەوێت، شۆڕش سەردەمێکی ئاسایی نییە، لەبەرئەوە مرۆڤی ئاسایی دروست ناکات. نا، من مرۆڤێکی ئاسایی نیم، مرۆڤێکی ئاسایی نیم. چونکە نە کاتم هەیە بیر لە ئەخلاق بکەمەوە و نە ئیرادەی ئەو بیرکردنەوەیەشم هەیە. هەموو ڕۆژێک شتێکی نوێ دێتە

پێشێ، مرۆڤ ناچاردەکات کارێکبکات کە بیری لێ نەکردۆتەوە، هەموو ڕۆژێک شۆڕش داوایەکی هەیە کە دەبێت بیگەێنێتە ئەنجام کە لە داوای دوێنێ ناچێت... مرۆڤی ئاسایی کاتی هەیە، بەڵام من کاتم نییە».

ئەوە یەکەمجاربوو هەستی وا داگیرمبکات، دەنگم توند دەلەرزی، هەستمکرد هەموو سەیرمدەکەن، بەری دەستم عارەقێکی ساردی دەردەدا و نیگام پەرتییەکی کتوپڕی پێوە دیار بوو، خوێن پەڕیبووە سەر کوڵمم و چاوم شێتانە دەینواڕی. هەموو بەرامبەر ئەو تێکچوونە لە ناکاوەی من هەستیان بە شتێک لە ترس کرد، بێئەوەی پەشیمان ببمەوە، بە دەنگێک هەم لاوازیی و هەم سەرسەختی پێوە دیار بوو، سەیری ئاغام کرد و گووتم «من کەسێکی ئاسایی نیم، ناتوانم ئاسایی بم، کە شۆڕش گووتی ئەسپەکان بکوژە دەبێت بیانکوژم، کە شۆڕش فەرمانیدا من مرۆڤ بکوژم دەبێت بیکوژم... بەڵێ دەیکوژم... چونکە گەر بڵێم: لێگەڕێن بابیری لێبکەمەوە، لێگەڕێن بابزانم عەقڵم و ئەخلاقم چۆن بڕیاری لە سەر دەدەن، چیتر شۆڕشگێڕ نیم... چیتر شۆڕشگێڕێکی دڵسۆز نیم».

سەعید یۆنان وەک ئەوەی بزانێت شتەکان بە قازانجی ئەو شکاونەتەوە، گووتی «ئا، جەنابی مەنسوور ئاغا، من لەمە دەترسم... لەوەی شۆڕش خەڵکانێک دروستبکات، نەتوانن بیربکەنەوە و بەس بتوانن کاربکەن، بەس بتوانن بکوژن و بڵێن ئەوە فەرمانی فەیلەسوفەکانی شۆڕشە. من لەوە دەترسم». جێگای خۆی کەمێک گۆڕی، ڕووی تەواو لە من وەرگێڕا و سەیری هەندێک لە ئامادەبووانی مەجلیسەکەی کرد، کە زۆریان تا ئەودەم هەر لەو پەشۆکانە کتوپڕەی منیان دەڕوانی. لەوساتەدا دیمەنی دەموچاوە باریک و لاوازەکەی یۆنان دەیترساندم، دیمەنی چاوە بێشەرمەکانی نزار دەیترساندم، نیگای سەیری مەنسوور ئاغا کە لە ناکاو وەک بە گومانەوە لێم بڕوانێت دەیترساندم. ئەوە

یەکەمین ساتم بوو کە لە هێمنی و دۆخی ئاسایی خۆم دەردەچووم، یەکەمین جارم بوو هەستمدەکرد من کەسێکی ئاسایی نیم. من بێویستی خۆم، وەک یەکێک خۆی بۆ شتێکی کتوپڕ ئامادەبکات چوومە سەر چۆک و گووتم «من مرۆڤێکی ئاسایی بووم، جاران مرۆڤێکی ئاسایی بووم. کە شۆڕش تەواو بوو دەبمەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی، لە شۆڕشدا هێزێک هەیە گەورەترە لە بیرکردنەوە. بیرکردنەوە ترسناکە، گەر بیربکەینەوە، گەر هەموومان بیربکەینەوە شۆڕش دەڕوخێت. ئینسان بەرلەوەی ژیانی خۆی پێشکەش بە شۆڕش بکات، دەبێت بیرکردنەوەی خۆی بۆ بکات بە قوربانی. من بیرکردنەوەی خۆم دەکەمە قوربانی، هەر ئینسانێک ببێتە شۆڕشگێڕ ناچارە شتێک لە خۆیدا بکوژێت... ئا برادەران... ئا... شتێک لە خۆیدا بکوژێت، من تازە تا شۆڕش کۆتایی نەیەت نابمەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی. هیچ ئینسانێک نییە کۆمەڵێ شتی خۆی نەکوژێت... من ئەستەمە ببمەوە بە مرۆڤێکی ئاسایی... ئەستەمە... ئەستەمە».

من بە گشتی کاراکتەرێکی کپ بووم، لەمجۆرە مەجلیسانەدا هێمنییەکی تەلیسماوی و پڕ نهێنیم لە خۆم دەپێچا و بە وریاییەوە تەماشامدەکرد، بەڵام هەندێجار لە خەت دەردەچووم و بەوجۆرە دەتەقیمەوە. هەڵبەت بۆ ئەوانیدی خودی هێمنییەکەشم شوێنی گومان بوو، وەک دەیانگووت لە هێمنی پشیلەیەکی ڕەش و لاواز دەچێت کە لە سەر سەرینێکی ئاوریشم خۆی درێژکردبێت و تەنیا لە پێناوی ترساندنی ئەوانی دیدا تەماشابکات.

ئەو شەوە سەعید یۆنان، پاڵی بە منەوە نا تا ئەوسەری شتەکان بڕۆم و بە جۆرێکی ئابڕووبەرانە لە بەرچاوی هەمووان خۆم رووتبکەمەوە، وایکرد دوودڵی ناو دەنگم و تاریکایی نێو دەروونم ئاشکرابکەم. ئەم سەعید یۆنانە باریکەی ئەمشەو، هیچی لەو سەعید یۆنانە دڵتەنگ و تێکشکاوە نەدەچوو کە چەندەها ساڵ دواتر دۆزیمەوە و تکام لێکرد

لە مەسەلەیەکی ترسناکدا کۆمەکم پێبکات و توانا گەورەکانی خۆیم بۆ حیکایەتکردن بخاتە بندەست... داوایەک دەرەنجامێکی تراژیدیی لە سەر ژیانی من و ئەویش هەبوو. لە نزیکەوە دەستی خستە سەرشانم و بە بۆڵەبۆڵێکەوە کە وەک قسەکانی دی روون و وەک ڕستەکانی پێشووی ئاشکرا نەدەبیستران، گووتی «مەسەلەکە پەیوەندی بە سنووری ئەخلاقەوە هەیە. گەر شۆڕش داوات لێبکات، من بکوژیت، ها... گەر داوات لێبکات من بکوژیت، دەمکوژیت؟ کەواتە من دەکوژیت، عەزیزم لێرەدا کەسێکمان هەیە کە دەتوانێت بمانکوژێت». ئینجا بە جۆرێکی سەیر دەنگی بەرزکردەوە و گووتی «لێرەدا هەڤاڵێکمان هەیە دەتوانێت هەمووومان بکوژێت. گەر شۆڕش پێیبڵێت بکوژە، دەتوانێت هەمووومان بکوژێت... پێمبڵێن ئێمە بۆچی شۆڕشدەکەین، بۆ ئەوەی مرۆڤ ئازادبکەین یان بۆ ئەوەی کەسێکی وەها دروستبکەین کە لە نیهانیدا، لە خوێنیدا، ئەو توانایەی تێدا دروست ببێت بێترس تفەنگەکەی دەربهێنێت و هەر کەسێک دڵی بیگرێت بیکوژێت، دوای ئەوەی دەنگێکی نادیار، یەکێک بە ناوی شۆڕشەوە پێیدەڵێت «بیکوژە... دەی بیکوژە». ها جەنابی ئاغا، پێمبڵێ پاشەڕۆژمان بەمجۆرە بە کوێ دەگات؟ تەکیلفمان چییە گەر نیشتیمان ئازادبکەین، بەڵام نیشتیمانێک بێت پڕبێت لەوانەی دەتوانن بێدوودڵی بمانکوژن».

نزار ئیدریس لە خوار ئاغاوە دانیشتبوو، لە نێوان ئەو و ئاغادا دوو کوڕی گەنجی بێدەنگ هەبوو کە لە دووانە دەچوون، بەڵام دووانە نەبوون، پێدەچوو نەزانن تەواوی ئەو باسە لە سەر چییە. ئاغا، دەستی خستە سەرشانی یەکێکیان و گووتی «عەبدول، بڕۆ عارەق بێنە... ئەمشەو شەوێکی خۆشە... شەوێکی خۆشە». ئینجا ڕوویکردە من و وەک ئەوەی نەیەوێت ڕستەکانی یۆنان شەوەکەم لێبشێوێنن، بە ویقاری ئاغایەکەوە کە دەتوانێت لەگەڵ گەلێک کێشەی فەلسەفی سەختدا

دەرگیربێت، گووتی « من لەگەڵ تۆدام برادەر، لەگەڵ تۆدام... بەڵام ئینسانی ئاسایی چییە؟ پێمبڵێ، ئینسانی ئاسایی کێیە؟. من دەتوانم ئینسانی خۆفرۆش بکوژم، کەروێشک بکوژم، کەو بکوژم، بەڵام ڕەنگە لە ناکاو دڵم بیگرێت و نەتوانم کەڵەشێری منداڵەکەم سەربڕم... من ئاساییم؟ چ کاتێک ئاساییم، ئەو کاتەی کە خۆفرۆشەکە دەکوژم یان ئەو کاتەی دەستم ناچێتە کەڵەشێرەکە؟ نازانم کەی من ئاساییم و کەی ئاسایی نیم... برۆ عەبدول شەراب بێنە... من حەزم لەم شەوانەیە، ئا عەزیزم... حەزم لەو شەوانەیە کە ئاسایی نین... مەستدەبین و تا درەنگ دەخۆینەوە».

نزار ئیدریس ئەو فاسیلە کورتەی بەکارهێنا و سەیرێکی سەعید یۆنانی کرد و گووتی «من لەوە ناترسم خوێن بڕێژین، لەوە ناترسم. مامۆستا ئەوەی تۆ بەو جۆرە لە خوێن ڕشتن دەترسیت، مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ سەگێکی ترسنۆک. بەڵام هەموو شتێک دەبێت مەعنای هەبێت، دەبێت شتێک بشکێنیت، دەبێت مرۆڤ هەستبکات کە شتێک دەشکێنێت. من حەزم لەو زرنگە و زرمەیەیە، وەختێک شتەکان دەشکێن، حەزم لە دەنگی لەتبوون و زرمە و زرینگەی شکانیانە. ئا، من حەزم لەوەیە گوێم لە شتێکی گەورە بێت ورد و خەراش دەبێت، شتێک ئەوانی تر ناتوانن بیشکێنن. من کە لە زیندانی پسمامان هەڵهاتم لە بەرئەوە نەبوو لە ئازار دەترسم... جەنابی ئاغا... خۆت دەزانیت، من باوەڕم بە خودا نییە، باوەڕم بە هیچ شتێک نییە، هەتا باوەڕم بە شەرەفیش نییە... ها کەس هەیە لە ئێوە باوەڕی بە شەرەف نەبێت... کەستان هەیە هەستێت و بڵێت من باوەڕم بە شەرەف نییە، شەرەفی خۆتان، شەرەفی دایکتان، شەرەفی خوشکەکانتان؟؟. بەڵام من باوەڕم پێ نییە... هیچ کێشەیەکم نییە گەر تۆ پێمبڵێیت، بێشەرەف، بێئابڕوو، بێنامووس. هیچ کێشەیەکم نییە کە سوێندی درۆت بە شەرەفم بۆ

بخۆم، نا هیچ کێشەیەکم نییە. بەڵام وامەزانە کە هیچ ئیمانێکم نییە. نا وامەزانە کە من شتێک نییە بمبەستێتەوە. من ڕقم لەو کەسانەیە کە بێئەوەی بزانن بۆ، ئازار دروستدەکەن. من کە زگی کچی مامۆستا سابیرم پڕکرد، کە ئەو کچەم کونکرد، کە هەڵبەت ئێستا بە ناو ژنی شەرعی منە، شەرعێک کە باوەڕم پێی نییە، لە بەرئەوە نەبوو ئازاریبدەم، لە بەرئەوە نەبوو تێکیبشکێنم... نا من حەزم لەوەیە ئەو شتە تێکبشکێنم کە هەموو پێیدەڵێن ناموس، دەست بۆ ئەو شتە بەرم کە خەڵکانی ئاسایی تەنیا لە کاتی توڕەیی و شەڕدا و بە نیازی سووکایەتی دەستی بۆ دەبەن، بەڵام من نا .. من نا... من دەمەوێت وابژیم، وەک یەکێک کە دڵنیایە شتێک لە سەر زەمین نییە ناوی ئابڕوو بێت، ناوی حەرام بێت. من دەمەوێت وابژیم وەک ئەوەی شتێک لە سەر زەمین نییە پێشوەخت هەموو شتێکی بۆ من دیاریکردبێت... من لەگەڵ خۆشەویستی و عەدالەتدا هەم، لەوە زیاتر هیچی تر... هیچی تر... دین و پەروەردە و دەسەڵات... هەموو جۆرێکیان... هەموویان بۆ جەهەنەم. بەڵام من ڕقم لە لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی بوو. ئەو لە پسمامان ئازاری دەداین بێئەوەی بزانێت بۆ. من هیچ باکم بەوە نییە کە حەیوانەکەی ناو خۆم بەرەڵابکەم. خۆ هەموو حەیوانێک لە ناوماندایە، هەموو حەیوانێکی دڕ لە گیانماندایە، حەیوانێکی لە سەگ بەدتر. من بۆیە لەدایکبووم بۆ ئەوەی بژیم، بۆ ئەوەی بژیم پێویستە ئەو جانەوەرەی ناویشم لەگەڵمدا بژی... دەبێت بژی. بەڵام ئەوەی کە ناکرێت، ئەوەی بۆ من نابێت، ئەوەیە کە شتێک تێکدەشکێنیت بۆ خۆتی نەکەیت... کاک وەفا گەر تۆ ئەسپەکانت بۆ خۆت کوشتبێت، ئا گەر تۆ ئەسپەکانت لە بەرخاتری خۆت کوشتبێت، لە بەر هاواری ئەو حەیوانەی ناوەوەت، لەبەر هاوار و لورەی ئەو گورگەی ناو ناخی خۆت، ئەوا سڵاوی منت لێبێت. بەڵام گەر ئەسپەکانت بۆ لیڤیتانت یان

بۆ شۆڕش کوشتبێت... نا... من سڵاوی وات بۆ نانێرم... لیڤیتانت پیاوێکی پیس و پۆخڵە، چەپەڵترین مەخلوقی ناو شۆڕشە، نا لە بەرئەوەی وەک جانەوەرێک ئازاری خەڵک دەدا، بەڵکو لە بەرئەوەی وەک جەلادێک ئەوە دەکات. جگە لەوەی دەسەڵاتی خۆی تاقیبکاتەوە هیچی تر ناکات. من ڕقم لێیەتی، چونکە جگە لەوەی کە دەیەوێت ئیرادە و تەحەمولی ئەوانی تر بشکێنێت هیچی تری ناوێت... ئەگەر شتێکی تری بویستایە، گەر ئامانجێکی بەرزتری ببووایە من ڕێزم بۆی هەبوو... دوژمنم بوو، بەڵام ڕێزم بۆی هەبوو. ئەوەیە، ئەوەیە شتەکان دەگۆڕێت. لیڤیتانت هیچ حەرامێکی نییە بیشکێنێت، هیچ حەرامێکی نییە... جگە لەوەی دەسەڵاتی خۆی تاقیبکاتەوە هیچی تر ناکات، بۆیە من لە بەردەمیدا نانوشتێمەوە... نە ئەمڕۆ، نە سبەی، نە بۆ هەتاهەتایە».

ئەوە ئەو ساتەبوو کە تێیدا ویستم سەری ماچبکەم... لەو ساتەدا شتێک لە ڕێزی قووڵ لە دڵی مندا بەرامبەر نزار سەری هەڵدا. ئەگەر لەو ساتەدا چاوە بێشەرمەکانیتان بدیبایە، جوانییە دڕندە و بێباکییە گەورەکەی، وەک من دەکەوتنە ژێر ئەفسونییەوە. کە سەیری نیگای ئاغام کرد، هەمان ئەو هەست و مەستییەم لە ناویدا بینییەوە کە لە نیگای منیشدا هەبوو. لەویادا تێگەیشتم بۆ مەنسوور ئاغا ناتوانێت بیگرێت، بۆ حاکم باسیت نەیتوانیوە حوکمیبدات، لە بەرئەوەی لە قووڵایی شەڕانگێزییەکەیدا جوانییەکی نهێنی و ئەفسوناوی هەبوو کە هەمووانی مەستدەکرد.

لەو کاتەدا عەبدول لەگەڵ منداڵێکی تردا بە چەند شوشەیەک عارەق و بە چەند قاپێک لە بستە و بادەمی ئێرانی و هەندێک تێکەڵە لە باسوق و نۆک و مێوژەوە گەڕایەوە. لە کاتێکدا ئەوان خەریکی دانانی

عارەق و قاپە چەرەسەکان بوون. یۆنان بە دەنگی بەرز گووتی «چ جیاوازییەکی هەیە تۆ بۆ خۆت یان بۆ شۆڕش من بکوژیت؟ لەوانەیە بۆ تۆ جیاواز بێت، بەڵام بۆ من، بۆ من کە دەکوژرێم، بۆ کەسانێک کە منیان خۆشدەوێت، بۆ دایکم و باوکم، بۆ منداڵە هەتیوەکانم هیچ ناگۆڕێت. پرسیارەکە ئەوەیە شۆڕش بۆ چییە و بەرهەمی چییە؟ بۆ ئەوەیە دونیا بگۆڕین یان زۆرترین پیاوکوژ دروستبکەین. شۆڕش بۆ ئەوەیە ئازاری مرۆڤ بۆ مرۆڤ نەمێنێت یان خواستی بۆ کوشتن گەورەتر بکەین؟ ها... بۆ کامیانە؟. من زۆرجار سەرم لێدەشێوێت، زۆرجار هەستدەکەم ونبووم. نا مەڵێ کە من لە خوێن دەترسم و ترسنۆکم و بانگەشە بۆ ئەوە دەکەم شۆڕشگێران دەست لە وەزیفە پیرۆزەکانیان هەڵگرن. منیش وەک ئێوە بۆ شۆڕش هاتووم، بەڵام ئێستا دەپرسم مرۆڤ بۆ شەڕدەکات، لە پێناوی چیدا؟ بۆ ئەوەی بە تەنیا خۆی ئازادبکات و هیچی تر، بە تەنیا خۆی؟ شۆڕش ئەوەیە مرۆڤ ئازادی خۆی وەک جانەوەر بەربداتە گیانی ئەوانی دی؟ ها، ئەوەیە یان چی؟ ».

من کەمێک وەستام و دەستم بە ناوچاوانمدا هێنا و گووتم «شۆڕش بۆ ئەوەیە مرۆڤ فێری ئەوە بێت دەستبەرداری خۆی بێت، دەستبەرداری خۆپەسەندی و خۆپەرستی خۆی بێت. هەڵبەت لە دەرەوە زوڵمێکی زۆر هەیە، کوردستان لە ژێر دەستاندایە، لەوەبگەڕێ کە هەموو بۆ نیشتیمان لێرەین. من گومانم لەوە نییە کە هەموومان لە پێناوی کوردستاندا لێرەین، هاواری دایکی وەتەن هەڵیگرتووین و هاتووینە ئەم شاخانە. بەڵام شۆڕش خۆی، ئەوەی دەبێت هەموو شتێک بە وریایی و ڕێکی بڕوات، ئەوەی هێزێکمان هەبێت بتوانێت بەرەنگاری دوژمن ببێتەوە، ئەوەی نەڕوخێت و هەرەس نەهێنێت... پێویستی بەوەیە مرۆڤ هەستەکانی خۆی، هەستە بچوکەکانی خۆی

بخاتە ئەولاوە. هەر کەسێک دێتە شۆڕشەوە ئیرادەی ئازادی خۆی تەسلیمی شۆڕش دەکات. ها پێمبڵێ، شتێک هەیە ناوی شۆڕشگێڕ بێت، بێئەوەی ئیرادەی ئازادی خۆی تەسلیمی شۆڕش نەکردبێت. ها... شتێک هەیە ناوی شۆڕش بێت، لە کاتێکدا من بەردەوام دوای خەیاڵات و هەڵبژاردنی ئازادی خۆم بکەوم. شتێک هەیە ناوی شۆڕش بێت، گەر جەنگ لە باشوور بێت و من بڵێم ئەز کەسێکی ئازادم و دەڕۆم بۆ باکوور. ها عەزیزم، ئەمە چ شۆڕشێکە تێیدا ئینسان تەنیا باسی ئازادی خۆی بکات، بڵێت ئەخلاقیاتی من لە ئەخلاقیاتی شۆڕش بەرزترە و من دەبێت بە گوێی ویژدانی خۆم بکەم... من هاتووم بۆ ئەوەی خۆم بڕیاربدەم چ کارێکدەکەم. ئەمە چ شۆڕشێکە، برادەر گیان؟ یەکەمین سیفەتێک لە شۆڕشگێڕدا هەبێت، ئەوەیە دەستبەرداری ئەو خودە ترسناک و بچوکەی خۆی بێت و ئامادەبێت بۆ شتێک بمرێت کە ئەوانی تر بۆی هەڵدەبژێرێن. دەبێت گوێ لە دەنگەکانی ناوەوەی خۆی نەگرێت، بەڵێ، دەبێت گوێ لەوانە نەگرێت. لێرەدا ئەخلاق نامێنێت... بەڵێ عەزیزم کاک سەعید، باسی ئەخلاقم بۆ مەکە، لێرە و لە سەر ئەم سفرەیە ئەخلاق جێگایەکی نییە. من کاتێک لە ئەخلاقی خۆم بەرپرسیارم کە خۆم بڕیاربدەم. شۆڕشگێڕ کەسێکە چیتر لە ئەخلاقی خۆی بەرپرسیار نییە. لێرەوە گەر من تۆ بکوژم، ئەوا من نیم کە دەتکوژم... من چیم... من کێم... تا بڕیاربدەم تۆ بکوژم. شۆڕشگێڕ دواجار داشێکی شەترەنجە و یەکێکی تر دەیجوڵێنێت، دەبێت بە خۆشحاڵیشەوە قەبووڵی بێت، بەڵێ مامۆستا بە خۆشحاڵییەوە. من کە تۆ بکوژم، بە خۆشحاڵییەوە دەتکوژم، چونکە ئەوە من نیم... من نیم. ئەوە وەفای ڕەفعەت بەگ نییە کە تۆ دەکوژێت، بەڵکو شۆڕشە دەتکوژێت... من جگە لە کەرەستەیەک هیچی تر نیم، هیچی تر. ئاە، بەڕێز نزار ئیدریس من خۆم دوور دەگرم، خۆم دوور دەگرم لەو

ئازادییەی تۆ بۆ خۆتت دەوێت. تۆ بە تەنیا بۆ خۆتت دەوێت... نا، شۆڕشگێڕ کەسێکە دەبێت دەستبەرداری خۆی و ئازادی خۆشی بێت، ئەوەیە شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە».

کە قسەکانم تەواوکرد هەموو گیانم دەلەرزی، لێوەکانم وشکبوون، چاوم شتێک لە گێژی و دەنگم لەرزێکی ترسناکی تێدابوو. نزار ئیدریس نیگایەکی تێگرتم کە پڕبوو لە بوغزێکی نهێنی، لە قینێکی شاردراوە و گووتی «بەڵێ ئەوە ئەو شۆڕشەیە کە ئێمە تیا دیلین. ئەو شۆڕشەیە کە شۆڕشی من نییە، شۆڕشی ئەوانەیە کە لە بەردەم سەرۆکەکانیاندا سوژدەدەبەن و دەنوشتێنەوە، ئەو شۆڕشەیە کە لە کۆیلەیەتی ڕزگارمان ناکات. ها... دەزانم ئێستا ئێوە پێمدەڵێن کۆمۆنیست، وەک شیوعییە خائینەکان سەیرمدەکەن... بەڵام وانییە. شۆڕش لای من شتێکی ترە، ئەوەیە لەو کۆیلەیەتییە ڕزگارمان بێت کە تۆ باسیدەکەیت. شۆڕش لە یەک کاتدا مانای هەیە کە دژی هەموو دەسەڵاتێک بێت، لە دەسەڵاتی خوداوە لە ئاسمان تا دەسەڵاتی باوک و دەسەڵاتی دایکیشمان لە سەر زەوی تا دەسەڵاتی ئەخلاق لە ناوماندا. هەموو شۆڕشگێڕێک درەنگ یان زوو ناچاردەبێت دەستی خۆی بە خوێنی یەکێک سووربکات، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو ساتەدا کە دەکوژێت، لەو ساتەدا کە شتێک وێراندەکات، هەست بە ئازادی خۆی بکات، هەستبکات خۆی گەیشتۆتە ترۆپکی تامکردنی ژیان، هەستبکات ئیش بۆ خۆی دەکات، کرێگرتەی کەس نییە، نۆکەری خودا و عەبدی خوداش نییە، بۆ هیچ کەسێکی تر ئیش ناکات، شۆرش ئەو ساتی ئازادییەیە کە تامی درندانەی ژیان دێتە ناو دەممانەوە. ئەوەیە شۆڕشگێڕ بچێتە سەرشانی ئەوانی تر، بتوانێت یاریی خۆی فێڵزانانە بەڕێوە بەرێت، لەوانەیە ڕێگای ترسناک بێت، لەوانەیە سەخت بێت، بەڵام شۆڕشگێڕ ئەو کەسەیە کە بە تەنها بۆ خۆی ئیشدەکات... بە تەنها بۆ خۆی... منیش هەمان شێوە وەک ئێوە بۆ

شۆڕش هاتبوومەدەرێ، بەڵام لە یەکەم ڕۆژەوە دەزانم ئەمە شۆڕشی من نییە، ئەو شۆڕشە نییە کە من بەدوایدا دەگەڕێم».

یۆنان یەکەمین پێکی هەڵدا، ئاشکرا وەک هەمیشە سەرسامبوو بە بەلاغەتی کوشندەی ئەم گەنجە بێڕەوشتە. کەمێک بیریکردەوە و بە دەنگێکی کز گوتی «شۆڕش مەحاڵە... گەر وابێت شۆڕش مەحاڵە».

نەمزانی تەواو مەبەستی چییە، بەڵام قسەی هەردووکیان منی دەهریکرد، لە حاڵێکدا کە هەستم بە پەشۆکان و توڕەییەکی گەورە دەکرد، گووتم «شۆڕش مەحاڵ نییە، شۆڕش شەڕە، شەڕە و هیچی تر... شەڕێکە کە دەبێت ببرێتەوە، دەبێت هەموو شتێک بکەین بۆ ئەوەی تێیدا سەربکەوین... گەر یەکێک... ».

سەعید یۆنان قسەکانی بە دەنگی بەرز پێبڕیم و گووتی «نا... شۆڕش مەحاڵە... شۆڕش، بریتییە لە گۆڕینی دونیا، بریتییە لە گۆڕینی مرۆڤ. ئەوەش مەحاڵە... ئەوەی من دەیبینم، ئەوەیە کە ئێمە نازانین بۆ لێرەین. ئا جەنابی ئاغا، ئێمە نازانین بەرەو کوێ دەڕۆین. ئێمە میللەتێکی کوێرین کە هەموو تفەنگمان پێیە، میللەتێکی کوێر، سەدان هەزار کوێر کە چەکمان هەڵگرتووە و دەڕۆین. سەدان هەزار چەکداری نابینا کە وەک لەشکرێکی بێهۆش مارشدەکەین. پێمبڵێن چۆن مەحاڵ نییە مرۆڤی کوێر شۆڕش بکات، چۆن مەحاڵ نییە؟».

من لە جێگای خۆمەوە وەک یەکێک گوللە پێکابێتی، هاوارمکرد «مەحاڵ نییە، شتێک نییە ناوی مەحاڵ بێت، هیچ شتێک لە شۆڕشدا ناگاتە پلەی کوێری، هێند هەیە مرۆڤ دەبێت ڕۆحی خۆی بە کرێبدات. تا تۆ لە شۆڕشدا بیت دەبێت ڕۆحی خۆت بە کرێبدەیت، بیخەیتە ڕەهنەوە. من ڕۆحی خۆم بە کرێداوە... هێندە هەیە ڕۆحی خۆم بە کرێ داوە... بە کرێ و هیچی تر».

ئەو قسانەم بۆ ئەو سەردەمە گەلێک سەیر و سەخت بوون. لەو شەوەدا من دڵی شۆڕشگێڕێکی فانەتیکم لە سینەی خۆمدا دۆزییەوە. شۆڕشگێڕێک جگە لە ڕۆحی دەستەجەمعی شۆڕش، ڕێزی هیچ شتێکی تر ناگرێت. ئەو شەوە لە شەوە زۆر گرنگەکانی ژیانم بوو، نەوەک تەنیا لەبەر ئەوەی کە دڵنیابووم، من بە چ ڕێگایەکدا دەڕۆم، بەڵکو لە نزیکەوە بینیم هەر یەک لە سەعید یۆنان و نزار ئیدریس چۆن بیردەکەنەوە. شەو تادرەنگ لەو جەنگە درێژەدا بووم، تا مەست بوومایە پتر پێم لە سەر ئەوە دادەگرت، کە شۆڕش بریتییە لە بەکرێدانی ڕۆح، لە وازهێنان لە ئیرادە، لە ئیشکردن بۆ ئەوانی تر، لە دەستبەرداربوون لە ئازادی خۆت. لە ساتێک لە ساتەکانی ئەو شەوەدا کە من لە ترۆپکی مەستیدا بووم هاوارمکرد «شۆڕش تەنیا بە کۆیلە دەکرێت. مرۆڤی ئازاد ناتوانێت شۆڕشگێڕ بێت... من کۆیلەم، کۆیلەم».

لە دوای سێهەمین پێک من ئاگام لە دونیا نەما. شتەکانی دواتر تەنیا وەک سێبەری کاڵ و ئاڵۆز دێنەوە یادم، کە یادەوەریم تیژدەکەمەوە جگە لە پێکەنین و قریکەی ئەوانی دەوروبەرم، هیچی دی نایەتەوە بیرم، هەندێ لە ساتەکانی گێژی و وێنەی لێکپچڕاوی سیماکان و دەنگی کپ و بێمانای ئەوانی تر هێشتا لە خەیاڵمدا ماون، بەڵام هەمووی لە ژێر تەمێکی گەورەدان، تەمی هوشیارییەک ناتوانێت دڕ بە تەلیسم و تاریکی مەستی بەرێت. بۆ ڕۆژی دوایی بیمار و نەخۆش لە ژێر لێفەیەکی ئەستوور و ڕەشدا بە ئاگاهاتمەوە، دڵنیابووم شەو مەستی دەستی لێوەشاندوم و بێهۆشیکردوم، کە هەستام بەلامەوە گرنگ نەبوو، شەو لە حاڵی مەستیدا چیم کردوە و چی ئابڕوچوونێکم بە سەر خۆمدا هێناوە، ئەوەم بەلاوە گرنگ بوو بگەمە دەفتەری یاداشتەکانم و ئەوەی لە بیرمە وەکو خۆی تۆماربیکەم.

# ڕفاندنی نزار ئیدریس

لیڤیتانت خۆی لە پێشەوە دەڕۆیشت، ئەو سەلیقە گەورەیەی هەیە کە دەتوانم ناوی بنێم سەلیقەی سەگ. شەو ناتوانێت فێڵی لێبکات، تیشک ناتوانێت فێڵی لێبکات، بڕوای بە هیچ شتێک نییە، هەتا بە چاوەکانی خۆشی... هەتا بە گوێی خۆشی، تەنیا شتێک باوەڕی پێیەتی ئەو توانا گەورەیەی هەستکردنە بە مەترسی لە ناو دڵیدا. ئەو خواستەیە بۆ ڕاوکردن و ڕەدوونان و گەڕان بە دوای خوولیایەکی ئەستەمدا. یەکەمجارە شەو لەگەڵیدا بچمە ئەرکێکی سەختەوە، هەستدەکەم چاوی لە تاریکیدا بە هەمان ڕوونی و ڕۆشنی ڕۆژ دەبینێت. لە تاریکیدا وادەبینم کە سەر نێوچاوانی پڕبێت لە دڵۆپی شەونم... وەک ئەوەی زۆر لە ناو نەسیمی بەربەیانێکی تاریکدا وەستابێت، وەک ئەوەی ئەو زەردەخەنە پەنهانەی سەر ڕووی، ئاوێنەی فێنکییەکی نهێنی بێت کە تەنیا ئەو لە خوێنی خۆیدا هەستی پێدەکات. لە تاریکیدا ڕەشتر لە شەو دەنوێنێت، بەوەدا قەترانیترە، بەڕۆشنی دەتوانم بیبینم، وەک ئەوەی شەو سپی بێت و ئەو لە ناکاو وەک پەڵەیەک لە زوڵمەت لە سەر ئەو تەختە ڕوناکە دەرکەوتبێت. لە وچانە کورتەکاندا شتێکی دیاریکراو ناڵێت، وەک ئەوەی تەنیا بە سێبەرەکەی حوکممانبکات، وەک ئەوەی دڵنیابێت هەموو لە تاریکیدا بێ هیچ گرفتێک دەیبینین... وەک ئەوەی بتوانێ بە غەریزە سەرەتایی و چاوە کێوییەکانییەوە نیازی هەموومان بخوێنێتەوە. وەک ئەوەی هەموومان بە بەشێک لە لەشی خۆی سەیر بکات، بە درێژکراوەیەکی خورافی خەونەکانی خۆی، بە دەستکردی توانای بینین و بۆنکردن لە ناو خۆیدا. وەک ئەوەی دەنگی پێی ئێمە لە دوای ئەوەوە تەنیا سەدای دەنگی پێی

خۆی بێت، دەنگدانەوەیەکی بۆشی هەنگاوە گەورەکانی ئەو بێت و هیچی تر... ئێمە هەمیشە لە دوی دەڕۆین، بە جۆرێک دەڕوات وەک ئەوەی سزای زەویبدات، وەک ئەوەی بە قووڵایی زوڵمەت بڵێت من بەڕێوەم بۆ لای تۆ، وەک شەو بترسێنێت و کۆمەڵێک گیانەوەری نەبینراو بەرەو قیامەت پێش خۆی بدات. لە وچانەکاندا خۆی بەپێوە پشووی دەدا، وەک بترسێت لەوەی تاریکی لە خۆیدا ونیبکات. بە دەست غوبارێکی تەنکی لە خۆی دەتەکاند کە من بە ڕوونی ئاسەواری گەردە تاریکەکانیم لە هەوادا دەبینی... بە جۆرێکی ترسناک بێدەنگ بوو، لەو ساتەوەی کەوتبووینە ڕێ هیچی نەدەگووت، جگە لە هەنگاوە گەورەکانی کە بە جۆرێکی سامناک شەوی دەتەراند و زوڵمەتی لە دەوری خۆی دەردەکرد، ئاشکرا دەیویست تاریکی بە تاریکتر لە خۆی بشکێنێت. هەستمکرد، کەسێکە دەتوانێت بە بێدەنگی حوکمی ئێمەبکات، ئێمە حەوت پیاو بووین وەک کۆیلە دوای کەوتبووین، هیچ ئیشێکی دیمان نەبوو جگە لەوەی بزانین ئەو چی دەکات. تەنیا ئیرادەی خۆمان نەخستبووە ژێر دەستی، بەڵکو ژیان و هەست و سەرسامی خۆشمان نابووە ژێرپێی. لەو تاریکییەدا هەستی من بە کۆیلەیەتی، نەهەستێک بوو بریندارمبکات، نە هەستێک بوو وابکات یاخیبم، نە بۆنی ناڕەزایی و تووڕەیی لێدەهات، بە پێچەوانەوە، بۆنی ئارامی و دڵنیاییم لێدەکرد... خۆشحاڵ بووم کە ئەو لە پێشمەوە دەڕوات، بەختەوەربووم بە ونبوونم لە دوای ئەوەوە... بە جۆرێک وامدەزانی تا دەگاتە سەر سنووری شەرمەزاری، هەمووان بە دار و بەرد و باڵندەی شەوەوە، بەختەوەریم دەبینن.

من هەفتەیەک بوو لە سێئاسکێ گەڕابوومەوە، دوو مانگی تەواو بوو لەوێبووم، هەموو هەوڵەکان بۆ ڕازیکردنی مەنسوور ئاغا، بە گرتن و تەسلیمکردنەوەی نزار بە زیندانی پسمامان بێهودەبوون. ئاغا بە بوونی

کەسێکی وا ناوازە و بێحورمەت لە کۆشکەکەیدا بەختەوەر بوو، بیروبۆچوونە سەرپەڕەکانی نزار لە سەر خودا و ئافرەت و ناموسی ئینسانی بە جۆرێک دوورە یاسابوون، هەتا ڕۆشنبیرە هەرە ڕادیکالەکانی ئەو سەردەمەی دەبەزاند. ئاغا لە نزاردا ئەو باڵندە تاک و بێوێنەیەی دەبینی کە هەم ئازا، هەم سەیر، هەم شایەن بە ژیانە. لەو دوو مانگەدا کە من لە نزیکەوە لە سێئاسکێ ژیانی نزارم تۆماردەکرد، ڕۆژ دوای ڕۆژ بڵندبوونەوەی نرخ و باڵاگرتنی گرنگی ئەوم دەبینی. لەو نێوەندەدا وەک پیاوێکی لێبوکم لێهاتبوو کە شتێکی کەمی ماوە خەڵک ڕوو بەڕوو گاڵتەی پێبکەن و چاو بە چاو جنێوە ناشیرینەکانی خۆیان بدەن بە ڕوویدا... مەستبوونە شەوانەکانم و شانازیکردنی زۆرم بە وەفاوە بۆ شۆڕش، وێنەی کەسێکیان پێبەخشی بووم کە لە ناوەوە ڕۆحێکی پوچم هەڵگرتووە. ئەوەی هەموو شەوێک مەستدەبووم، دەرشامەوە، دەلەرزیم، بەدەم عارەق دەردان و کەفکردنەوە لە هۆش خۆدەچووم، بووبوو بە نەریتێک هەمووان کەیفیان لێدەبینی. من پێشتر لە سەردەمی ئامادەیی و کاتێک خوێندکاری دانشگا بووم، فێری زۆرنۆشی نەبووم، لە پێکێکی بچوک زیاتر فرم نەدەکرد، سێ بیرە دوا سنوورم بوو. بەڵام لە شەوانی دیوەخاندا، وەک ئەوەی بە ئەنقەست بمەوێت خۆم لە سڕبوونێکی گەورەدا نوقمبکەم و دۆخی خۆم لە بیربچێتەوە، بێ بیرکردنەوە دەمخواردەوە. هەموو شەوێک کە دەچووم و دەستم بە خواردنەوە دەکرد، بزەو نیگای ئەوانی تر کە لە بنەوەڕا لاقرتیاندەکرد و پلاریان دەهاویشت، پتر وایدەکرد لە مەیدا مەلەبکەم. هەمیشە بەیانیان درەنگ بە ئاگا دەهاتم... تا دەهات ڕوخساریشم وڕتر دەردەکەوت، بەڵام هیچ کات لەوەدا کەمتەرخەمیم نەدەکرد کارەکانم ڕاپەڕێنم و نوو نوو چ زانیارییەکم دەستدەکەوێت بیگەیێنم. وەک هەر هەواڵگرێکی تازەپیاکەوتوو، سەرەتام پڕبوو لە دڵسۆزی، ڕاپۆرتەکانم هەموو وردەکارییەکیان تێدابوو، زۆر شتم دەنوسی کە مەبەستم تەنیا ئەوەبوو نیشانیبدەم بە چ وردییەک

و دڵسۆزییەک کاردەکەم. مامۆستا ئەسعەد دڵنیابوو لە مندا کادرێکی تایبەتی بۆ دەزگای ئەمنییەت دەستکەوتووە، بەڵام دڵنیابووم گەر لە نزیکەوە مەستی شەوانم ببینێت و بزانێت لە چ بارێکی دژواردام، بەو جۆرە خۆشحاڵ نابێت. لەو بەینەدا هەندێک سەرانی گەورەی دەزگای ئەمنییەت سەردانی مەنسوور ئاغایان کرد و داوای تەسلیمکردنی زیندانییە هەڵهاتووەکەی پسمامانیان کرد، بەڵام گەر مەنسوور ئاغا بیویستبایە گوێی لە داوایەک نەبێت، وەها بوو وەک ئەوەی لە بنەوەڕا نەیبیستبێت. لە ڕاستیدا نەدەکرا شۆڕش لە پێناوی کەسێکی وەهادا و لە قۆناغێکی وا ناسکدا کە ئەگەری پەلاماری گەورەی دوژمن بۆ سەر هەموو دەڤەرەکە هەبوو، مەنسوور ئاغا لە خۆی عاسیبکات. من دڵنیابووم ئەوەی لە پشتەوە داوی هەموو ئەم بەدواداچوونە بەردەوامە دەبزوێنێت لیڤیتانت و ڕەشید وەیبابن، ئەو ماوە کەمەی من لیڤیتانتم تێدا ناسی، بەسبوو تێبگەم کە هەڵهاتنی نزار دەبێت بە گرێیەکی گەورە لەلای... ئەگەر نەبێت بە یەکێک لە گرێ هەرە گەورەکانی ژیانی.

لە ناکاو ڕۆژێک ناردیانەوە بە دوای مندا و پێیانگوتم پێویستە بگەڕێمەوە بۆ شوێنکاری خۆم لە پسمامان. لەوێ بۆ یەکەمجار بۆنی ئەمشەو هات بە سەرمدا، شەوێک کە دەمزانی درەنگ و زوو دێتە پێشێ. لیڤیتانت هەموو شتێکی ڕێکخستبوو، پلانی وەهابوو نزار ئیدریس بڕفێنین و بیگێڕینەوە بۆ پسمامان... من لە سەرەتاوە ئەوەم دەزانی... لە یەکەم شەوەوە کە نزارم لە دیوەخانی ئاغادا بینی، تێگەیشتم کە ئەم جێگایە وەک ماڵ و قەڵای سەختی ئەو وەهایە. نزار گەرچی دەرهەق بە هەموو بوونەوەر و مرۆڤێک کەم ڕێز و بادیهەوا بوو، بەڵام بەرامبەر مەنسوور ئاغا حورمەتێکی وەهای دەردەخست، بە ئاکاری ئەو نەدەچوو. هەستم نەدەکرد ڕێزی بۆ ئاغا دەستکرد یان فریودان یان هەر سوپاسگوزارییەکی ڕووت بێت، نا.. نزار لەوانەبوو گەر حورمەتی وەها

ساختەی دەربخستایە، دەمودەست پێوەی دیاردەبوو... خۆی نەیدەتوانی درێژەی پێبدات. بەڵام ڕێزی بۆ مەنسوور ئاغا، ڕێزێکی ڕاستەقینە بوو. باوەڕدەکەم هۆکەی ئەوەبێت کە شتێک لە سێبەر و کاراکتەری خۆی تێدا دەبینی. مەنسوور ئاغا لەو ئاغایانە بوو کە شتی گەورەی دەشکاند، دەچووە ناو ئەو جێگا حەرامانەوە کە لە کولتووری گوندەکی و خێڵەکییەکەی ئەودا نابەجێ بوون. ئەوەی بە ئاشکرا خەڵکانی بێئیمانی دەگرتە خۆی، مایەی توڕەیی و شوێنی دوودڵی هەموو هاوشێوەکانی بوو، ئاغا کەیفی بە پیاوانی دین نەدەهات و قەت نوێژیشی نەدەکرد، هەتا دەیگێڕنەوە لە گەنجیدا مەلای ئەودەمی سێئاسکێی دارکاریکردوە و سووکایەتییەکی گەورەی بە سەرداهێناوە.

لیڤیتانت هەموو ڕاپۆرتەکانی منی بە وردی خوێندبووەوە، ئەو وردەکارییە زۆرەی من دەرهەق بە هەموو کونج و کەلێنێکی گوندەکە نوسیبووم وێنەیەکی وەهای بۆ ئەو کێشابوو، هەستیدەکرد ماوەیەکی درێژ لە سێئاسکێ ژیاوە، من بۆ ئەوەی پتر بیخمە ناو دیمەنەکەوە، هەموو نامەکان و یاداشتەکانی خۆشم خستە بەردەست، لە یاداشتەکانمدا گەلێک وردەکاری زیاترم لە سەر گوندەکە تۆمارکردبوو. ئەو لە ڕێگای وەسفەکانی منەوە وەها شارەزای گوندەکە بوو، دڵنیابووم دەیتوانی بە چاوی بەستراوەوە بە ناویدا پیاسەبکات.

ئەو شەوە وەک سەگێکی سەلیقەدار، سەگێک کە دەزانێت دوای بۆنی چی کەوتوە، لە پێشمانەوە بوو. گەرچی من هەمیشە ڕقم لە ڕۆیشتنی شەو بووە، بەڵام ئەوەی دەمانویست خەیاڵێکی وا بەد جێبەجێبکەین، دڵنیایی پێدەبەخشیم. لەو شەوەدا و لە تاریکیدا پتر لیڤیتانتم دەناسی، تا ئەوکات شتێکی ئەوتۆم لە سەر ژیانی نەدەزانی، لە کوێوە هاتووە، بۆ پێیدەڵێن لیڤیتانت، کوڕی کێیە، بۆ چ ئومێدێک دەژی. تا ئەو شەوە ئەو پرسیارانەم بۆ گرنگ نەبوون، بەڵام هەندێک پرسیاری گرنگ هەن،

تەنیا لە شەودا دروستدەبن، لە ساتێکدا لە زوڵمەتدا بۆنی گیا و بۆنی عارەق و بۆنی خەون تێکەڵاودەبن.

ئێمە هەر حەوتمان کە دەڕۆیشتین دەنگی هەناسەمان دەهات، دەنگی ماندووبوونی جومگە و ئێسک و ماسولکەکانمان شەوی پڕکردبوو. ئەو نەبێت... ئەو نەبێت کە دەنگی نەدەهات... تەنیا بۆنی ژیانێکی لێهەڵدەستا کە وەک مردن لە سەرەخۆ و دڵڕەق بێت. وەک پیاوێک دەمبینی کە ژیانی پڕە لەو دەنگە سەیرانەی مرۆڤ تەنیا لە بێدەنگی نزیک مردندا گوێی لێدەبێت، تەنیا لە کەنارە دوور و ڕۆخە عاسییەکانی نێوان مان و نەماندا دەیبیستێت. دەنگێک کە نەدەتوانێت ببێت بە وشە، نەدەتوانێت ببێت بە مۆسیقا، نەدەتوانێت ببێت بە هاوار، بەڵکو دەنگێکە پتر وەک تەرجومانی تەلیسمێک وایە کە مرۆڤ تەنیا بە دڵ و لە دەرەوەی سنووری وشە و سنووری ئاواز و سنووری هاواردا دەتوانێت بیبیستێت... دەنگێکە، هەر وەک دەنگی خەونە لە ساتێکدا بەرەو حەقیقەت سەردەکەوێت، خەونێکی ترسناک کە دەیەوێت لەدایکببێت. لەو شەوەدا کە چیتر هەستم بە گەرمای تەموز نەدەکرد، لیڤیاتانتم وەک خەوێک لێدەردەکەوت کە زەوی دەوروبەرمان دەیبینێت. ئەو گەردانەی لە تاریکیدا لە جلە ڕەشەکانی هەڵدەستا، ئەو پزیسکە قەترانیانەی کە لێیدەکەوت، بۆنی ئەو کارلێکە قووڵانەی لێدەهات کە لەیەکدانی کانزاکانی زەمین و هەوای شەو پێکەوە دروستیدەکردن. هەستمدەکرد ئەو ڕۆحە شەڕانگێزەی نامۆ نییە بە هیچ درەختێک، بە هیچ بەردێک... ئەویش لە هەمان مەعدەن بوو، لە هەمان شت خولقابوو... بۆیە وەهابوو وەک ئەوەی پوشی سەر ترۆپکە نزیک و گەڵای بێداری درەختەکانی هاوسێمان بە وردی چاوەڕوانی هەر شتێکی بەدبکەن لە دەستی بوەشێتەوە... پیاوی ناو سروشتێکی دڵڕەق بوو، وەک ئەوەی گەرمای هاوین لە پشکۆی خۆی دروستیکردبێت، وەک نوێنەری هەتاوی کوشندەی تەموز

بێت، جگە لەوەی شتەکانی تا ئەندازەی سووتان دەترساند، هیچی دیم تیا نەدەبینی.

کە لە سێئاسکێ نزیک بووینەوە، بە ئامازە، بێئەوەی هیچ بڵێت وەستاندینی. گورگێک بوو بە سەلیقەی خۆی هەموو شتێکی دەبینی. لەوێوە نۆبەی من بوو تا بەردەمی ماڵی مەنسوو ئاغا پێشیانبکەوم، بەڵام وەک بیەوێت دڵنیابێت کە من جگە لە سێبەرێکی ئەو هیچی دی نیم، لە تەنیشتەوە نیگایدەکردم... نەمدەتوانی بیرکردنەوەکانی بخوێنمەوە، بەڵام کپییەکی قووڵ لە دڵیدا بوو، کە کپی ترس نەبوو، بەڵکو کپی تاریکی بوو کاتێک دەگاتە ترۆپکی چڕبوونەوەی خۆی.

ئەو شەش پیاوەی دی، مانگێک بوو مەشقی ئەوەیان دەکرد چۆن کەسێک بپێچنەوە و بیفڕێنن. لیڤیتانت فەرمانی بە من کرد کە وەک تاکە پاسەوان لە دەرەوە بمێنمەوە، من تەنیا کەس بووم، نەدەبوو ئەو ساتە ببینم کە لیڤیتانت سەری نزار هەڵدەداتەوە و دەستدەخاتە سەر دەمی و دەست و پێی دەبەستن و هەڵیدەگرن. نازانم شەو خێرا دەڕۆیشت، یان من هەستم بە زەمەن نەمابوو یان شتەکان وەک بروسکە ڕوویاندا. من تەنیا چەند چرکەیەک بوو وەستابووم، کە هەموو شتێک کۆتاییهات. بۆنی کوچە خەوتووەکانی سێئاسکێ، وەک بۆنی هەموو گوندەکانی تر تێکەڵەیەک بوو لە بۆنی گیا و شیاکە، بۆنی پوشی تەڕ و بۆنی کاری تازە لەدایکبوو، بۆنی لە یەکدانی هەناسەی جووتیاران و مێگەلە خەوتووەکانیان، بۆنی تێکەڵبوونی گەرمی گاشەبەردە نزیکەکان لەگەڵ سەرمای ناو لەشی ئەو مرۆڤانەی هەردەم بە دوای ئاگرێکی ونا وێڵن... لەو ساتەدا کە چرکە چرکە ژیان قورس دەبێت، کە سەعاتی تۆ ئیتر وەک سەعاتی هیچ ئادەمییەکی تر ئیش ناکات، کە هەستدەکەیت دڵی تۆ خێرا و دڵی دونیا بە خاوی لێدەدات... کە لە نێوان تۆ و نزیکترین شتدا فاسیلەیەکی سامناک دروستدەبێت... ئا لەو چرکەیەدا من تووشی وڕییەک دەبووم کە

نەیدەهێشت هیچ لە تاریكیدا ببینم. پشتم دەدا بە دیوارێكی تەنیشتی ماڵی مەنسوور ئاغاوە، بە بەردی ئەو ژوورەوە كە نزار تێیدا دەنوست، بۆ ساتێك خۆم وادەبینی كە بە جەشنێك تێكەڵ بە بەرد و دیوار و خۆڵی وشكی شەو دەبم ئیتر بۆ هەتاهەتایە لەوانە نابمەوە. دڵنیابووم لەو ساتەدا شتێك دەكەم، گەر لە قووڵایی خۆمدا لێیبڕوانم، هەمان ئەو ترس و سەرسامییەم تێدا دروستدەبێت كە لە كەسانی هوشیاردا دروستدەبێت ساتێك دەبینن هوشیاری خۆیان لە دەستدەدەن. ترسی مرۆڤێك كە هەمیشە ئەوە دەكات كە نایەوێت، سەرسامی ئینسانێك كە جار دوای جار ئەو كردەوە سەیرانەی لێدەوەشێتەوە كە لەگەڵ سروشت و خواستی خۆیدا ناگونجێن. بەڵام هێزێكی نادیار، ویستێك بۆ لە یادكردن دەیبردم. بە بێدەنگی هاوارمدەكرد: خودایە من چی دەكەم... چی دەكەم. ساتێك بوو هەستمدەكرد نزار ئیدریسم خۆشدەوێت... وەك چۆن ئەسپە كوژراوەكانم خۆشدەوێت... وەك چۆن بۆنی دڵنیاییم لە كوچەكانی سێئاسكێدا خۆشدەوێت. هەستمدەكرد دڵی مەخلوقێكی دیكە لەسینەمدایە، كە دڵی منە و دڵی منیش نییە. مەخلوقێكی دی كە نازانم چییە و كێیە و چی دەوێت. بەڵام خۆشەویستی من چ نرخێكی هەبوو، لە بەردەم ئەو نرخە باڵایەدا كە شۆرش هەیەتی، نرخێك كە لە هەموومان و لە هەر هەستێكی تایبەتی گەورەترە. هەستی من بەرامبەر نزار چ مانایەكی هەبوو، بەرامبەر ئەوەی كە ئەو لە بەرامبەر شۆڕشدا وەك یاخییەك و تێكدەرێك ڕەفتاریدەكرد.

من دەمبینین كە هەر شەشیان كەسێكی پێچراوەیان لە تاریكیدا دەهێنا. دەنگیان لێوەنەدەهات، وەك ئەوەبوو لە سەر خۆڵێكی نەرم بڕۆن، سووك لە تاریكیدا نێچیری خۆیان هەڵدەگرت و دەڕۆیشتن.

* * *

لەو شەوەوە چیرۆکی ڕاستەقینەی نێوان لیڤیتانت و نزار ئیدریس دەستی پێکرد. ئەوەی بەوجۆرە نزارمان ڕفاند سەرکەوتنێکی گەورە بوو. لیڤیتانت، سەرەتا نزاری خستە زیندانێکی یەک ژووری تەنهاوە و دەرگاکەی لە سەر داخست. تا ئەو ساتە نەمدەزانی کە لیڤیتانت ئەوەندە حەزی بە سەرکەوتنە. لەگەڵ گەڕانەوەماندا بۆ پسمامان ناردی بەدوای ئاسنگەرێکی پیردا تا دوو زنجیری گەورەی بۆ دروستبکات، زنجیرەکانی کردە دەست و پێی نزار و بۆ ڕۆژێکی تەواو بە پسمامان و گوندەکانی دەوروبەردا گێڕای. من کە لەو دۆخەدا چاوم بە نزار کەوتەوە، غەمێکی نهێنیم بۆ دەخوارد، دەمویست شتێک بکەم ئازاری لەوە کەمتر بێت. کە منی بینی گووتی «هەمووی ئیشی جاسوسێکی وەک تۆیە... ئیشی سیخوڕێکی ملهوڕی وەک تۆیە». دەنگی وەک هەمیشە لاقرتی و گاڵتەپێکردن و بێباکی تێدابوو، وەها بوو وەک گاڵتەم لە تەکدا بکات، نەوەکی توڕە بێت. لە زنجیرەکانیشیدا کەسێک بوو، شانازی مرۆڤێکی ئازادی نەدۆڕاندبوو. کە یەکەمجار بە چاوی کراوەوە و ڕوو بەڕوو تەماشای لیڤیتانتی کرد، پێیگووت «بۆ ئەوەندە لە پیاوی ئازاد دەترسیت؟».

ڕۆژی یەکەم، دوای ئەوەی دڵنیابووین نزار بە ساغی و بێکێشە گەیشتۆتەوە پسمامان، لە گۆڕەپانی گەورەی بەردەم زینداندا وەستاندمان و دەبوو هەمووان سەیریبکەن. لیڤیتانت ئەو ڕۆژەی کرد بە ڕۆژی ئاهەنگێکی گەورە، پارەی نارد لە ناو گوندەوە دوو مەڕیان هێنا و لە حەوشی زینداندا سەرمانبڕین، گۆشتی نارد بۆ بنکە نزیکەکان و هەندێکیشی بە سەر چەکدارەکاندا بەشییەوە، لە پشتی زیندانەکەدا ئاگرێکی کردەوە و تادرەنگ تەنووری بەندیخانەکە نانی بۆ گۆشتخۆر و مەستەکان دروستدەکرد. ئێمە، حەوت پیاوە ئازاکەی شەو، پێکەوە دەمانخواردەوە و قاقامان لێدەدا و بەختەوەربووین. لیڤیتانت ئارەزوویەکی سەیری بۆ گۆرانی و سەما دەرخست کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو.

من و ئەو پێکەوە لە سەر یەک قاپ شیشە برژاوەکانی خۆمان دادەنا و پیازی ئێرانی شیرینمان تێدەکرد، لیڤیتانت وەک نیشاندانی سوپاس فەرمانیدا کە گورچیلەی مەڕە کوژراوەکان دەبێت بۆ من بن. لەو ئێوارەیەوە کە لە دەوری ئاگرێکی گەورە ئاهەنگمانکرد، من و ئەو بووین بە دوو دۆستی نزیک. هەڵهاتنی نزار بۆ لیڤیتانت مەسەلەیەکی ترسناکی شەرەف بوو... بە درێژایی ئەو دوو مانگە وای هەستکردبوو ناموسی خۆی بە بارمتە لە چنگی مندا داناوە. دوایی تێگەیشتم کە ترسی ئەو هەرگیز لە لێپرسینەوەی بەرپرسانی سەرەوە و تورەیی ڕەشید وەیباب نەبووە، بەڵکو شتێک ئەوی لە دڵەوە ترساندبوو، گومانی بوو لە تواناکانی خۆی، ئەوە تاکە شتێک بوو دەیتوانی نەخۆشی بخات. چەند ساڵێک دواتر، ڕۆژێک بە منی گووت «مرۆڤ گەر خەونی گەورەی هەبێت، دەبێت ڕەحم بە خۆی نەکات». خەونی ئەو لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەوە بوو، لاواز نەبێت، وەک پیاوێکی بەزیو دەرنەکەوێت، پڕبێت لە شانازی گیانەوەرە بەهێز و خۆگرەکان.

لەبەر ئاگرەکەدا کە سەیرمدەکرد، لە یەک شت دڵنیابووم، ئەویش ئەوەیە ئێستا هەست بە هێزی خۆی دەکات، هەستدەکات دەتوانێت لەم جەنگەڵەدا خۆی وەک گەمەبازێکی سەخت و نەشکستە بناسێنێت، دڵنیایە دەتوانێت باوەڕ بەو گورگەی ناو خۆی بهێنێت. شیش لە دوای شیش گۆشتی دەخستە سەر ئاگر و بە سادەیی خزمەتی منی دەکرد و چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە. زوو زوو دەیگووت «تۆ منت ڕزگارکرد... تۆ منت ڕزگارکرد». نەمدەزانی بە دروستی لە چی ڕزگارمکردوە. ئێستا لەپاڵ ئەو ئاگرەدا، بە قاتێک ڕانکوچۆغەی شەکرییەوە، بە خەندەیەکی ڕۆشنەوە، بڕوای بە هێزی خۆی گەیشتبووە وە دۆخی جارانی. تا زیاتر سەفا و کەیفی پێوە دەربکەوتایە، زیاتر مۆنی و غروری پێشووشی لە ژێرەوە دەهاتەوە سەرێ. بۆ ڕۆژی دوایی کە بڕیاریدا نزار ئیدریس بە خۆی و

زنجیرەکانییەوە بە پسمامان و گوندەکانی دەوروبەردا بگێڕێت، داوایکرد من لە تەنیشتییەوە بڕۆم. ئەو ڕۆژە تا شەو نزارمان بە گوندەکاندا گێڕا، دیلە هەڵهاتووەکەی پسمامان، من بە هەمان ساردی و ترسی هەمیشەیی خۆمەوە لەگەڵیدا دەڕۆیشتم. نزار تەنیا شەڕواڵێکی ڕەشی لەبەردا بوو، دەستەکانی لە پشتەوە بە پەتێکی ڕەش شەتەک درابوون، بەڵام نە زنجیرەکانی قاچی، نە ئەو نمایشەی پێیدەکرا، نەیاندەتوانی زەلیلیبکەن. بە خەندەیەکی گەورە و گاڵتەجاڕانەوە دەڕۆیشت، وەک ئەوەی شانازی بە دیلێتی خۆیەوە بکات، پێدەکەنی و بە دەست و سەر سڵاوی لە خەڵک دەکرد. بە دەنگی بەرز بە خەڵکی دەگووت «بڕۆن کەسوکارتان بهێنن، دیلە هەڵهاتووەکەی پسمامان ببینێت». نیشانەیەکی غەمی پێوە نەبوو، چاوی لە منداڵان و کچان دادەگرت، بە لێو ماچی بۆ خەڵکانێک دەنارد کە دەوەستان و سەیریاندەکرد. ئێمە هەموو ئەو ڕۆژە لە ژێر خۆرێکی گەرمدا لە دوای نزارەوە دەڕۆیشتین، کە جەستەیەکی هەبوو دەیتوانی بەرگەی هەموو شتێک بگرێت. لە کاتێکدا شەرم و گەرما ئێمەی وڕکردبوو، نزار وا دیارنەبوو ماندووبووبێت یان شەرمبکات. ئەو وا خۆی نیشاندەدا کە سووکایەتی لیڤیتانت هەرچییەک بێت، ئەو بێباکە و دەتوانێت بەرگەی بگرێت. یەکێک لە یاوەرەکانی لیڤیتانت لە ڕێگای کامێرایەکی گەورەوە، بەردەوام ڕەسمی دیلەکە و پاسەوانە هاوسێکانی دەگرت. وێنەی گەنجێکی باریک و سپیکەلە و درێژ لە ژێر خۆرێکی گەرمدا. من و لیڤیتانت لە زۆربەی وێنەکاندا دەرچووین، هەر کە یەکەمجار ئەو وێنەیەم بینی هەستم بە شەرم کرد. لیڤیتانت لە زۆربەی وێنەکاندا مۆنە، بەڵام من لە گەنجێکی ترساو دەچم کە بە غەمێکی قووڵەوە بیر لە شتێکی ئاڵۆز دەکاتەوە. هەر سێکمان کەمە ڕیشێکی تەنکمان هەیە، ڕیشی نزار، ڕیشی زیندانییەکە کە دەستی بە گوێزاندا ڕاناگات، ڕیشی لیڤیتانتیش، ڕیشی پیاوێکە ئێستا بە سەرکەوتوویی لە

جەنگ گەڕاوەتەوە، ڕیشی منیش ڕیشی کەسێکە بیرکردنەوە و داڵغەی قووڵ کاتیان بۆ نەهێشتۆتەوە. لیڤیتانت هەندێ لەو وێنانەی بەملاولادا نارد، بۆ ئەوەی ئامیرهێز و سەرکردەکانی پێشمەرگە و کۆمیتەکانی حیزب لە سەرکەوتنی خۆی ئاگاداربکاتەوە. من سەرەتا تێنەدەگەیشتم بۆچی جەنابی لیڤیتانت سووربوو لە سەر ئەوەی نزار بەو جۆرە بە گوندەکاندا بگێڕێت... ڕاستە لیڤیتانت پیاوێکی دڵڕەق بوو، بەڵام دواجار کەسێکی شاری بوو کە زۆر دوای بەند و باوی ئەو نەریتە خێڵەکییە کۆنانە نەدەکەوت، ئەو چەندین ڕێگای لە بەردەمدا بوو بۆ ئەوەی ئازاری نزار بدات. بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ بۆم دەرکەوت کە لە نێو ئەودا خواستێکی ترسناکی خۆنمایشکردن هەیە، ئەو ڕۆژە هێندەی دەیویست دەسەڵاتی خۆی دەربخات، نەیدەویست سووکایەتی بە نزار بکات. بەڵام دڵنیابووم گەر نزار بمێنێت و لە زیندان ئازادبێت لێی نابووریت.

هەواڵی گێڕان و سووکایەتیکردن بە یەکێک لە زیندانە هەڵهاتووەکان بە جۆرێکی خێرا بە ناو هێزەکانی پێشمەرگە و خەڵکدا بڵاوبووەوە. مەنسوور ئاغا هەموو کرداری ڕفاندنەکەی بە ئەتککردن و ڕیسواکردنی خۆی دەزانی. دوای چوار ڕۆژ لە شەوی ڕفاندن، هەواڵی بەڕێکەوتنی هێزێکی گەورە بە سەرکردایەتی مستەفا ئاغا بەرەو پسمامان هەموومانی لەرزاند. مەترسی سەرهەڵدانی شەڕێکی گەورە لە نێوان دوو هێزی زەبەلاحی شۆڕشدا، ترسێکی بێوێنەی خستە دڵی سەرکردە گەورەکانمانەوە. ئەو هاوینە و بەر لە داهاتنی سەرمای زستان دەوڵەتی بەغداد هەموو کارێکی دەکرد، گورزی گەورە لە پێشمەرگە بوەشێنێت. هێزەکانی ئەو لە چەند قۆڵێکەوە هێرشی بەردەوامیان دەهێنا و بەرەو نێوجەرگەی کوردستان تەکانیان دەدا. گەر شەڕێکی وەها لە نێوان ڕەشید وەیباب و مەنسوور ئاغادا ڕوویبدایە، شۆڕش لە چەند هەرێمێکەوە ڕووبەڕووی

شکستی گەورە دەبووەوە. لە ناکاو ڕفاندنی نزار ئیدریس بابەتی هەرە سەرەکی دەنگوباسی نێو بنکەکان و گوندەکان بوو. هەواڵگەلێک کە دەگەیشتنە پسمامان دەیانگووت کە مەنسوور ئاغا داوایەکی سەرۆکی بۆ سەردان ڕەتکردۆتەوە و هەموو شتێکی بە ئازادکردنی نزارەوە گرێداوە. دەگووترا کە یەکێک لە سیاسییە هەرە باڵا و پایە بڵندەکانی شۆڕش لە بەرزانەوە دێت تا ئاگری ئەو تێکچوونە گەورەیە بکوژێنێتەوە. زۆری نەبرد، کە لە نیوەڕۆیەکی گەرمدا، ئەو بەرپرسە سەرسپییە بچوکە کە پێیاندەگووت ڕەوانەکراوی سەرۆک، گەیشتە پسمامان. ناوی مەلا باریک بوو، پیاوێکی مۆن کە ئەستەم بوو لە ڕوخساریدا ئاسەواری خەندەیەکی کۆنیش بدۆزیتەوە، لەوانەی دەموچاویان لە گاشەبەردێکی قەوزەگرتوو دەچێت. دوای سەعاتێک لە هاتنی، دوای ئەوەی نان و دۆیەکی سادەی خوارد، بە توڕەییەکی گەورەوە کە لە توڕەیی یەکێک دەچوو لە بازرگانییەکی گەورەدا فێڵی لێکرابێت، خۆی کرد بە لای لیڤیتانتدا و دوو سەعات لەگەڵیدا کۆبووەوە. ئەو کۆبوونەوەیە زۆر شتی لە ژیانی لیڤیتانت گۆڕی، دەتوانم بڵێم سەر لەبەر ژیانی بە ئاراستەیەکی دیدا برد. مەلا باریک، فەرمانێکی ڕوونی پێبوو کە نزار ئیدریس لە زیندانی پسمامانەوە بگوازرێتەوە بۆ زیندانی سەرەکی شۆڕش لە نزیک نیشتەجێی سەرۆکەوە. بڕیارەکە بۆ ئەوەبوو نزار لە چنگی لیڤیتانت و ڕەشید وەیباب دەربهێنن. دەبێت بڵێم لیڤیتانت لەوەوە ئیدی بڕوای بە شۆڕش نەما. دوای هاتنە دەرەوەی لیڤیتانت لەو کۆبوونەوەیە، ڕوخسارێکی تێکشکاوی هەبوو، نوێنەری سەرۆک پێیگووتبوو لە بەر زیندانییەکی هەڵهاتوو شۆڕش ناخەینە مەترسییەوە، ئەوەشی تێگەیاندبوو کە هەر سەرپێچییەک دەیخاتە بەر مەترسی ئەوەی بە قۆڵبەست بنێردرێت بۆ زیندانی گەورەی شۆڕش لە باکوور. قسەکانی مەلا باریک وەها توند و توانجدار بوون، شتێکی گەورەی لە ناخی ئەم پیاوە لە خۆباییەدا

شکاند. دوای چەند سەعاتێک لەو کۆبوونەوەیە، تەواوی زنجیرەکانیان لە نزار ئیدریس کردەوە و بە سوار جێبێکی لاندرۆڤەری سەوز بە هاورێتی مەلا باریک بردیان بۆ باکوور. شتەکان وەها خێرا و سەیر و نابەجێبوون، لیڤیتانت جگە لە حەپەسان و باوەڕنەکردن، هیچی دی پێوە دیار نەبوو. دوای بردنی نزار، لیڤیتانت تا سێ ڕۆژ لە ژوورەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە، کە هاتەدەر نەخۆش و تادار دیاربوو. بۆ شەو لیڤیتانت ونبوو، ئێوارەیەکی زۆر درەنگ زیندانی پسمامانی بەجێهێشت و نەگەڕایەوە. ئیتر من لیڤیتانتم تا ماوەیەکی درێژ نەبینییەوە.

# سەرەتایەکی نوێ لە کوچەی غەمپاشاوە

کوچەیەکی باریک و درێژە... باریک و درێژ وەک هێڵی دووکەڵێکی ڕەش، جگە لە بۆنی هەژاریی هیچی تری لێنایەت، بۆنی کوشندەی هەژاریی، ئەو بۆنەی ئەمڕۆ لە سەر لەشی کەم کەس دەتوانین بۆنیبکەین، ئەو بۆنەی خەڵکانێکی زۆر لێیدەترسن و شەرمی لێدەکەن، بۆنی نەبوونییەکی گەورە، بۆنی خاڵیبوونەوەی ژیان لە هەموو شتێک... بۆنی بۆشاییەکی سەنگین کە بە هیچ شتێک پڕ ناکرێتەوە، بۆنی نەبوونی گوڵ، نەبوونی ڕوناکی تەواوەتی، بۆنی کەڕووکردنی هەوا لە ناو خۆیدا، ڕزینی کات بە هۆی وەستانێکی ئەبەدییەوە، بۆنی دروستکردنەوەی هیچی لە هیچی و بۆ هیچی، بۆنی سەرمایەکی ئەبەدی کە لەوپەڕی گەرماشدا هەمیشە لە ئێسکەکانماندا دەمێنێتەوە و بەدەر لە هەر وەرزێک لە شوێنی خۆیەتی، سەرمایەک کە سەرمای هەژارییە، سەرمایەکی کوشندەیە، هەموو لەشێکیش هەستی پێناکات و تایبەتە بەوانەی کە هەژاری دەچێتە ئێسکەکانیانەوە، پەیوەندی بەو موچڕکە نهێنی و ترسناکانەوە هەیە کە لە کاتی هەستی

نەداریدا بە جەستەکاندا تێدەپەڕێت... کاتێک هەستدەکەیت هەموو ئەوانی دی دەتوانن خۆشبژین تۆ نەبێت، هەموو ئەوانی تر دەتوانن شتێکیان هەبێت تۆ نەبێت، هەموو ئەوانی تر دەتوانن لەو جێگایە بن کە دەیانەوێت تۆ نەبێت. ئەوە هەم سیحر و هەم ژانی بێبنی هەژارییە کە وادەکات مرۆڤی هەژار هەمیشە شتێکی دی بێت، هەستێکی تری هەبێت جیاواز لە هەستی مرۆڤانی ئاسایی، هەستێکی قووڵتر و تیژتر و پڕ ئازارتر کە ئەوانی دی هەرگیز تێیناگەن و ناتوانن سەرچاوە و خۆشی و ماناکەی بدۆزنەوە. بەڵێ خۆشییەکەشی... ئازیزان دەوێرم ڕاشکاوانە باس لە خۆشی هەژاری بکەم، باس لە موچڕکە ساردەکانی بکەم، باس لە تێکەڵبوونی بکەم بە جۆرێک لە شانازی و لە خۆباییبوونی نهێنی کە دەرەنجامی هەستێکی قووڵە بە تێکشکان. نا ئەوە تەنیا سەرکەوتن نییە کە هەستی شانازی لە مرۆڤدا دروستدەکات، ژێرکەوتنیش سیحر و جوانی خۆی هەیە. زیادەڕەوی نییە گەر بڵێم، زۆرجار دۆڕان جوانییەکی گەورەتر و نهێنیتری لە سەرکەوتن هەڵگرتووە. سەرکەوتنیش هەمیشە دوای دۆڕان جوانە، سەرکەوتنی یەکسەرە، ئەوەی مرۆڤ لە دایکدەبێت سەرکەوتووبێت مرۆڤ دەکاتە بوونەوەرێکی بێهەست و ترسناک. مرۆڤ بۆ ئەوەی قەشەنگ بنوێنێت، دەبێت هەمیشە زیاد لە دۆڕانێکی هەبێت، هەژاریش یەکێکە لەو دۆڕانە گەورانە. دۆڕانێک ڕۆژانە مرۆڤ پڕدەکات لەو هەستە سارد و غەمگینە، هەستێکە دەتترسێنێت و بەرەو لای خۆشی کێشتدەکات.

کاتێک ئەردەڵان هیرانی لەگەڵ خانمی نەغەدە ماردینیدا خۆیان کرد بە کوچەی غەمپاشادا، شتێک لەو سەرمایەیان بەرکەوت. هۆشەنگ بولبولیار لەم کوچەیەدا لەدایکبووبوو، لە ناو ژنە هەژارەکانیدا کە لەمسەری ژیانەوە بۆ ئەوسەر تەنیا بەدبەختیان دەژمارد. هەندێک پێیاندەگووت سوڵتانی غەمپاشا، هۆشەنگ لە ناو منداڵە چەتونەکانی

ئەوێدا گەورەبوو، ئەوانەی جگە لە زمانی دار و ددان و چڕنوک و بەرد زمانی تریان نەدەزانی، جگە لە هەژاری و خۆڵی کوچە و شەڕی بەردەوام، هیچ شتێکی دی کۆی نەدەکردنەوە، منداڵانێک هەر زوو فێردەبوون چەقۆ هەڵبگرن و جگەرەبکێشن و گلەیی لە دونیا بکەن، بەڵام سوڵتان وەک لە منداڵییەوە فریشتەیەک لەگەڵیدا لەدایکبووبێت، هێمن و لە سەرەخۆ بوو، نەوەک هەر ئەوە خاوەنی توانایەکی ئەفسوناویش بوو لە سەر بەرگەگرتن. سەبرێکی ئەیوب ئاسا و نەرمییەکی لە ئەندازە بەدەری هەبوو. ئەو ڕۆژە ئەردەڵان هیرانی بەناو کوچە تۆزاوی و پیسەکەی غەمپاشادا خانمی نەغەدەی دەبرد بۆ ماڵی هۆشەنگی بولبولیار، بۆ لای ئەیوبی شار، کوڕە بێدەنگ و ڕیشن و شیعر دۆست و شۆڕشگێڕەکەی غەمپاشا. کە ئەوان خۆیان کرد بە کوچەکەدا، ماوەیەک بوو غەمی هەرەسی شۆڕشی بەرزانی هێدی هێدی لە خەیاڵ و خولیاکاندا خەریکبوو کاڵدەبووەوە، خەڵکی لە فیکری ئەوەدابوون شتێکی تر ڕوودات و میللەت لە نوشوست هەستێتەوە. ئەوکات نەغەدە ماردینیش ژنێکی شوودار بوو، نەغەدە بە عەبایەکی ڕەشەوە کە توند لە خۆی ئاڵاندبوو لە دوای ئەردەڵانەوە دەڕۆیشت. هەندێک ژن لە پشت عەباشەوە، لە پشت پەچەشەوە، جۆرە درەوشانەوەیەکیان هەیە کە بەری پێناگیرێت، درەوشانەوەیەکی تایبەتییە، جۆرە شەبەنگێکە کە هەم بینین و هەم ناونانی سەختە.

لە سەرەتاوە دەبێت بزانن کە دەرکەوتنی ماردینی لەو کوچەیەدا لەگەڵ ئەردەڵان هیرانیدا، شتێکی سەیربوو. من پێشتر نەغەدە ماردینیم نەدیبوو. لە کوێ ببینم؟ ئەو کچی پزیشکێکی بەناوبانگی وەک دکتۆر جەلال ماردینی و ژنی کوڕێکی گەنجی وەک دکتۆر مستەفا شوکاک بوو. کە یەکەم ڕاپۆرتم لە سەر ژیانی خوێندەوە، مایەی سەرسامییەکی گەورەم

بوو، کچێکی وا گەنج کە لە خێزانێکی وا خانەدان و بووەیە، خۆی بخاتە مەترسیەکی وەها گەورەوە و بێتە ڕیزی شانە سەرەتاییەکانی شۆڕشەوە. من بەرپرسی یەکەمین کۆبوونەوەی ئەو شانە شۆڕشگێڕەبووم کە دەبوو لە شۆڕشی نوێدا دژ بە فاشیستەکان بەرگری دەست پێبکەینەوە. ئەو ڕۆژە کە لە کوچەی غەمپاشادا دەرکەوتم، لە جل و بەرگی پیاوێکی شاریدا خۆم گۆڕیبوو، شوناسێکی ساختەی مامۆستایی لە برکم بوو، بە ناوێکی دییەوە ژیانێکی نوێم دەست پێکردبوو. یەکەمجار کە خانمی ماردینیم بینی، هەستمکرد لە بەردەم کەسێکی بەهێزدام، یەکێک لەو مرۆڤانەی لە هیچ ناترسن. ژنان هەمیشە دوو چەشنن، بەشی هەرە زۆری ئەو ژنانەی لەدەوروبەرمانن، مرۆڤی جوان و سادە و ڕوخۆشن، یاخود ناشیرین و مۆن و بێدەروەستن، عاشقیان دەبین و عاشقمان دەبن، حەزیان لێدەکەین و وازیان لێدەهێنین، خۆشیاندەوێین و لێمان بێزاردەبن، لەگەڵیان دەخەوین و قسەیان پێدەڵێین، ڕقیان لێمان دەبێت و دواتر بێباک ڕیسواماندەکەن. بەڵام بۆ ئێمەی پیاو لە ناو هەموو ئەو جنسەدا هەندێجار هەندێک هەڵدەکەون کە شتێکیان تێدایە مرۆڤ ناتوانێت بیگرێت و وەسفیبکات، شتێکە ناچێتە ناو ئەو وێنە و پۆلێنە گەورەیەوە کە بۆ ئافرەت هەمانە. نەغەدە ماردینی لەو جۆرە بوو. دەمتوانی ناوی بنێم ژنێکی یاخی، شۆڕشگێڕێکی ئەرستۆکرات، یان خانمێک بۆ شتێکی نادیار دەگەڕا کە گرتن و ناونانی ئەستەم بوو... ئەوەی کە سەرسامیدەکردیت ناکۆکییەکانی ناوی بوو، هەر ئەوەش وایدەکرد لەیەککاتدا هەم مەخلوقێکی جوان و هەم ترسناک بێت. ترسناک تا ئەو ڕادەیەی هیچ پیاوێک نەوێرێت تەواو خۆی بداتە دەست و نەشتوانێت تەواو لە چنگی دەربازبێت. سیحری خانم شتێک نەبوو پەیوەندی بە ڕۆیشتن یان جوانی باڵایەوە هەبێت، بەڵکو پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە دەیتوانی پیاوان والێبکات بیری لێبکەنەوە، زۆر بیری لێبکەنەوە.

هەڵبەت نابێت بیرکردنەوە لەگەڵ عاشقبووندا تێکەڵاوبکەین. هەندێ مرۆڤ دەتوانن داگیرمانبکەن بێئەوەی هەستێکی تایبەتیمان بەرامبەریان هەبێت، دوای ئەو هەموو ساڵ و رووداوە، دەتوانم بڵێم تاکە کەسێک کە بە ڕاستی عاشقی نەغەدە ماردینی بوو، تەنیا دکتۆر مستەفا شوکاکی مێردی بوو. ژمارەی ئەو پیاوانەی بە ژیانی ژنێکدا دەڕۆن یەکسان نیین بە ژمارەی عاشقەکانیان، گەرچی ژنان خۆیان بۆ خود لە خشتەبردن و خودئارامی جۆرە حیسابکارییەکی واشبکەن. ژیانی هەموو ژنێک پڕە لە نیوەعاشق، عاشقی گەواڵەئاسا، عاشقی تەمەنکورت کە دێن بۆ ئەوەی زوو تێپەڕن و زوو بمرن... لەو جۆرە عاشقانەی تا کۆتایی تەنیا وەک پڕۆژەی عاشق دەمێننەوە، وەک کەسانێک کە دێن و دەشێت ببن بە عاشق یان نەبن، لەوانەی پێیان باش نییە سەوداسەرانە عاشق بن، بەڵکو دەیانەوێت بوارێک بهێڵنەوە تا ڕێگای هەڵهاتنیان هەبێت و هەر کات زەنگی مەترسی لێیدا، بتوانن لە جەنگی ئەڤین ڕابکەن و لە مەیدانی عەشق هەڵبێن. بەڵام خانمی ماردینی، گەرچی لە ژیانی درێژ و جەنجاڵی خۆیدا، چەندەها جار لەمجۆرە «نیوە ـ عاشق» «کورتە ـ عاشق» «لەتە ـ عاشق»ـانەی دیبوو، بەڵام خۆی شتێکی تێدابوو لە یادنەدەکرا. لە هەر کوێ یەکجار ئەم خانمەت بینیبایە، ئیتر بیرت نەدەکرد و زوو زوو دەهاتەوە خەیاڵت. نیوەعاشقەکانی ئەو زۆریان لەوجۆرە بوون کە ئەگەرچی کاراکتەر و هێزی نەغەدە دەیترساندن، بەڵام نەشیاندەتوانی لە یادیبکەن و دوای هەواڵی نەکەون، کورتە عاشقەکانیشی، ئەوانەی ماوەیەکی کەم شێتانە خۆشیانویستبوو و دواتر لە عەشقی بێزار بووبوون هەر حاڵیان هەمان حاڵ بوو. دەبوو بەردەوام لە ژیان و شوێن و چیرۆک و پێشهات و ڕووداوە سەیر و تازەکانی ژیانی ئەو بگەڕێن. گەرچی زانیارییەکانی من لە سەر ژن پتر لە زانیاری پۆلیسێک دەچێت، نەوەک زانیاری عاشقێکی ژنناس، بەڵام بە حوکمی نزیکیم لە ژیانی خانمەوە،

دەتوانم وەسفگەلێک دابڕێژم، کۆمەکتانبکات و بزانن وێنەی ئەو لە دیدی هاودەمانییەوە چۆن بووە. ئەگەر لە سەرەتاوە بمەوێت وێنەیەکی ورد لە سەر ئەو بکێشم دەڵێم، لە چەشنە تایبەتی و نایابەکەی ژنان، بەڵێ لە جۆرە عەشقسازەکەی ئەوان «کە هەڵبەت ئەوانیش وەک ئێمەی پیاوانی بەدبەخت، هەموویان ئەو شەرەفە خودابییەیان پێ نابڕێت، عەشقساز و ئەڤینبازین» دوو چەشنە مرۆڤ هەن، یەکێکیان دڵی پیاوان داگیردەکەن، بە جۆرێکی وەها هەر پیاوێک کەوتە داوی ئەم ئەڤینەوە، تاسەر لێواری مردن و تا ڕۆژی حەشر بە عاشقی دەمێنێتەوە، ئەمە هەرە جۆرە ترسناکەکەی خانمانن کە خۆشەویستیان یەکجار دادەگیرسێت و ئیتر نامرێت و هەمیشە بەردەوام دەبێت و وەک ئازارێکی ئەبەدی دەمێنێتەوە، ئازارێک کە وەک نەخۆشییەکی هەمیشەیی لە ناوەوە ژیان کلۆردەکات و خەیاڵ پوچدەکاتەوە و ڕۆح دەخوات، هەندێجار بە شێتبوونی عاشق و هەندێجار بە مردن و هەندێجاریش بە بیماریی ڕۆحیانە کۆتایی دێت. بەڵام جۆری دووەم لەبری دڵ خەیاڵ داگیردەکەن، جۆرێکن لە ئافرەت کە نەوەک دڵ بەڵکو دەچنە ناو خەیاڵمان و نایەنە دەرێ. خۆشمان ناوێن، بۆیان نامرین، دەتوانین خۆمان لە ژێر سایە و لە بن دەست و لە هێزیان دەربازبکەین، بەڵام ناتوانین بیریان لێ نەکەینەوە، هەرچییەک بکەین دواجار هەر لە خەیاڵماندان. لێیان دەپرسین، خولیامانە بزانین لە کوێن، لەگەڵ کێ دەژین، ئێستا ڕوخساریان چی بە سەر هاتووە، چ جۆرە ژیانێک لەگەڵ مێردەکانیاندا دەبەنەسەر، بەختەوەرن یان نا... ئەوان وەک چرایەکی نهێنی لە ناوماندان، لە ناکاو دادەگیرسێن و دەکوژێنەوە، دوور نییە نیوە شەو هەستین و لە کاتێکدا لە تاریکیدا بەڕێوەین بۆ ئەوەی پەرداخێک ئاو بخۆینەوە یان مێزەڵدانمان خاڵیبکەینەوە، وەک شەوقێکی خێرا لێماندەن و بێنەوە بیرمان... سەرهەڵدانەوەی یادگار و وێنەکەیان لە خەیاڵماندا هیچ یاسا و کاتێکی نییە، بەڵکو لە هەموو

ساتێکدا دەشێت تووشی ئەو دەردی خەیاڵە بێینەوە و بپرسین ئاه ئەی کیژی کۆن تۆ لە کوێیت؟ ئەو یادە کەم و زۆر پەیوەندی بە دڵمانەوە نییە، دەشێت دڵمان تەواو لە خزمەت ژنێکی دیدا بێت، دەشێت دڵمان تەواو عاشقانە کەسێکی تری بوێت، بەڵام خەیاڵ... کە دڵڕەقترین بەشی بوونمانە، بێڕەحمترین بەشی ژیانمانە، وازناهێنێت و بەردەوام لە ژێرەوە شۆڕشی خۆی دەکات و ئەو خانمە خەیاڵگیرانە زیندوودەکاتەوە. لێرەوە زۆرجار ئەو هەڵە ترسناکە دووبارە و سەدبارە دەبێتەوە کە تۆ لەگەڵ ژنێکدا دەخەویت و بە دڵ لەلای عاشقەکەتی کە چی خەیاڵی مەلعونت وەک ئەوەی ئاگاداری دڵ نەبێت و هیچ کاری بە جەرەیانی ئەو عەشقە قووڵەوە نەبێت کە لە ناخدا دەگوزەرێت، ناوی ئەوی دی دەخاتە سەرزارت و کێشەیەکت بۆ دروستدەکات نە خۆت و نە هیچ کەس گوناهیان تێیدا نییە. زیادەڕەوی نییە گەر بڵێم هیچ ئافرەتێک ناتوانێت بۆ هەمیشە خەیاڵ و دڵی پیاوێک بەیەکەوە داگیربکات، هەر وەک چۆن پیاوی وەهاش نییە لە یەککاتدا خەیاڵ و دڵی ژن داگیربکات... ئینسان هەمیشە لە سەردەمێک و لە قۆناغێکی ژیانیدا مەحکومە بە دابەشبوونێکی ترسناک لە نێوان دڵ و خەیاڵدا، هەر ئەوەشە کارێکدەکات مرۆڤ لە ناخدا و تا قیامەت بوونەوەرێکی لەت و پەرت پەرت و ئازارکێش بێت. خانمی ماردینیش لەوانەبوو کە بە جۆرێکی ترسناک دەچووە خەیاڵی پیاوانەوە... بەشی زۆری ناوبانگیشی لە گەنجی و دواتریشدا نەدەگەڕێتەوە بۆ شاعیرییەتەکەی، نە بۆ جوانییەکەی، نە بۆ ئازایی و چاو نەترسییەکەی، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بە هەر جێگایەکدا تێپەڕیبێت کەس لە یادی نەکردەوە و لە خەیاڵی ئەوانە دەرنەچووە کە بینیویانە.

کە لە کوچەکەی غەمپاشادا دەرکەوت ئاسان بوو بۆ هەمووان بزانن سەر بە خێزانێکی دارا و ئەرستۆکراتییە، ویقاری کچە گەنجە

بۆرژواکان لە هەنگاو و وەستانیدا بوو. ئەو چاویلکەیەی چاوی و ئەو عەبایەی کە دابووی بە سەریدا نیشانەبوون بۆ کەسێک کە کارێکی زۆر تایبەت هێناویەتە غەمپاشا. نەغەدە ماردینی پێشتر بە کوچەی وەهادا نەڕۆیشتبوو. گەرچی ماوەیەک بوو لە زانکۆ و بە هۆی ئەردەڵانی هیرانییەوە، هۆشەنگی بولبولیاری دەناسی، بەڵام شتێکی لە سەر ژیانی تایبەتی و شوێنی نیشتەجێبوونی ئەو نەدەزانی. هۆشەنگ خۆی کوڕێکی وەها هێمن و نیگایەکی وا سادە و ساردی هەبوو، ئەستەمبوو بەسەیرکردنی چاوی بزانیت چ جۆرە ژیانێک دەژی... ڕوخساری هۆشەنگ هەمیشە ڕوخساری مەخلوقێکی دەرە زەمینی بوو، لەو کەسانەبوو کە هەرگیز نابن بە دانیشتووی تەواوی دونیا، غەریبییەکیان تێدایە وەک نامۆ و تەریدە دەریاندەخات، وەک بێماڵێکی ئەزەلی دیارن، کە دەیانبینیت واهەستدەکەیت ئێستا لە غەیبەوە هاتوون و کەمێکی دی بۆ غەیب دەگەڕێنەوە. ئەوە یەکەم دیداری منیش بوو لەگەڵ هۆشەنگدا کە ئەو کات قوتابییەکی هەژاری پۆلی سێی زانکۆ بوو. لەو ڕۆژەدا کە من بە ناو ماڵە هەژارەکانی غەمپاشادا ڕۆیشتم، دەبوو بیرم لای هەژاریی نەبێت، سەفەری من بە ناو گوند و شارۆچکەکاندا بۆ دروستکردنی شانە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ، چەندین مانگ بوو درێژەی هەبوو. تا ئەوکات برێکی زۆر خەڵکی ڕەشورووت و گوندی کاولە و شارۆچکەی بێخزمەت و داڕوخاوم بینیبوو کە وایاندەکرد، چیتر خودی هەژاریی شتێکی سەیر یان پڕکاریگەر نەبێت لەلام. بەڵام لە بەر هەر هۆیەک بێت، هەژاری لە غەمپاشا ڕەنگێکی تۆختری هەبوو. من بە گشتی تا ئەمڕۆش باوەڕم وایە کە هەژاری کەمجار بەرهەمی گەورەی لێ سەوز دەبێت، بەڵام هەر پێمخستە غەمپاشاوە، بە جۆرێکی سەیر هەستمکرد لەم کوچەیەدا جۆرێک لە هەژاریی هەیە وەک هەژارییەکانی دی نییە، هەژارییەکی ئەبەدییە، هەژارییەکە جوانی خۆی دەبینێت و شانازی بە

خۆیەوە دەکات. ئەو بەتاڵی و ڕووتی و نەدارییە پێکڕا کارێکیانکردبوو، مرۆڤ ئەو هەستەی هەبێت کە لە جێگایەکدا دەژی کە چواردەوری بە بیابانێکی ناکۆتا دەورەدراوە، بیابانێک «هیچی» دەتوانێت لە ناویدا هەموو شتێک بێت، نەداریی دەتوانێت هێزێکی بێبن و گەورەی هەبێت. شتێک دەتوانم ناویبنێم دیکتاتۆرییەتی هەژاریی لەو جێگەیە زاڵ بوو، کە جۆرێک لە جێگا دروستدەکات کە هیچ مەکیاج و جوانکارییەک قەبووڵ ناکات.

ئەو ڕۆژە نەغەدە ماردینی لە نیهانیدا هەستیکرد ئەم جێگایە بە کەڵکی ژیانی ئەو نایەت، ئەو بۆ جۆرە جێیەکی لەم چەشنە دروست نەبووە، بەڵام ئەو هەستەی بە جۆرێکی بێبەزەیی و دڵڕەقانە لە خۆیدا خنکان. دەبێت بیرمان نەچێت، ئەو ڕۆژانە خانمی ماردینی سەرەتای گرگرتنی بەهرە و توانا شیعرییەکانیشی بوو، خوێنەرێکی سەرەتایی بەڵام باشی ئەدەبیاتی شۆڕشگێڕی ئەودەمە بوو... شتێک لە بیرکردنەوەیدا نەبوو دژ بە هەژاریی بوەستێتەوە، نەک هەر ئەوە وەک کچی دکتۆر جەلال ماردینی و ژنی دکتۆر مستەفا شوکاک هەمیشە لەوە دەترسا تۆمەتی بۆرژوازیبوونی بخرێتە پاڵ، لە بەرئەوە گەرچی هەوای غەمپاشا لە سەر دڵی زۆر قورس بوو، لە نیهانی خۆشیدا هیچی بۆ خۆی ئاشکرا نەکرد و ئەوەی نەدرکاند کە ژیانی بەردەوام بۆ کەسێکی وەک ئەو لە جۆرە کوچەیەکی وەهادا ئەستەمە.

من دوای نەغەدە ماردینی و ئەردەڵان هیرانی گەیشتمە کوچەی غەمپاشا. هیرانی گەنجێکی هێمن بوو، ئەویش کوڕی حاکمێکی ناسراو بوو. ئەو کات نەمدەزانی بۆچی لەو سەرەتای گەنجێتییەوە ڕێگای کەوتۆتە ناو ئەو شانە زۆر سەرەتاییانەی شۆڕشەوە، لەگەڵ ماڵی دکتۆر جەلال ماردینیدا بە خانەوادە نزیک و ناسیاو بوون. هیرانی هاوڕێی منداڵی نەغەدە بوو، لەو جۆرە کوڕانە نەبوو، هەر کات لە دەوری خۆی کیژێکی

بینی، دەمودەست بیر لە عەشق و پەیوەندی و شتی وەها بکاتەوە. هەر یەکەمجار کە بینیم وەک شۆڕشگێڕێکی ڕۆمانسی هاتە بەرچاوم، لەوانەی بەردەوام ژیانی تایبەتی خۆیان دەخەنە دواوە و دەیانەوێت بۆ شۆڕش بژین... کە سەیرمدەکرد وەهابوو وەک خۆم لە ئاوێنەیەکی دیکەدا ببینم، کەسێکی فانەتیکم دەدی کە باوەڕی بە شۆڕش لە باوەڕی بە ئینسان و خودا گەورەتر بوو.

نزار ئیدریس دواهەمین کەس بوو کە هات. من نزارم لەو ئێوارە دوورەوە نەبینیبوو کە تێیدا لە جێبێکی تایبەتیدا لە زیندانی پسمامانەوە بردیان بۆ زیندانی گشتی شۆڕش و پاش ماوەیەک لەوێ بەفەرمانی سەرۆک ئازادیانکرد. ڕوخسار و نیگا و جوانییەکانی هەر وەکو خۆیان بوون. من تێنەگەیشتم چۆن پەیوەندی بەم شانە سەرەتاییانەی شۆڕشەوە کردوە، سەرەتا ناوەکەیم بینی شتێک لە دوودڵی و ڕاڕایی دایگرتم، ناوی ئەوانی دی پێکڕا نهێنی بوون، ئەو تاکە کەسێک بوو کە قەبووڵی نەکردبوو ناوێکی نهێنی هەبێت. من ناوی نهێنیم جەنگیز بوو «کە دواتر تەواو جێگای ناوی ڕاستەقینەی خۆم دەگرێتەوە». نەغەدە ماردینی ناوی ڕۆزا بوو کە دواتر تەواو بیرچووەوە و هەمیشە هەر وەک خانمی ماردینی ناودەبرا. هۆشەنگ بە ناوی بولبولیارەوە هاتە ناو شۆڕشەوە، گەرچی ناوی ڕاستەقینەی خۆی بوو، بەڵام هەموو وەک ناوی نهێنی تێیگەیشتین. نزار بە ناوی «قەساب»ـەوە هات و وەک هەمیشە بۆشناخ و دڵڕەق و لە خۆبایی دەینواند. لە دڵەوە ئەم خرۆش و تێکەڵبوونەوەیم بە شۆڕش لاسەیربوو، کە هات و منی بینی، وەک باوەڕ بە چاوانی خۆی نەکات، زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێزی گرت و وەک بڵێ «دیسانەوە تۆیت... دیسانەوە تۆیت». بێباک سەیریکردم و بێحورمەتانە گووتی «هەڤاڵ پێدەچێت زەوی لەوە بچوکتر بێت کە باسدەکرێت و کەس تائێستا باش پێوانەی نەکردبێت». ئینجا بە بێحورمەتییەکی

بێوێنەوە گوتی «چییە.. هاوڕێی ئەسپکۆژ تۆش حەزت لە شۆڕشێکی نوێیە؟». ئەوە سەرەتای ئەو ناوە بوو کە بە درێژایی شۆڕش و تا ئەمڕۆ هەندێک کەس بۆ سووکایەتی دەیخەنە دوام «ئەسپکوژ».

ئەو ژوورەی کۆبوونەوەی یەکەممان تێداکرد، ژوورێکی سارد و بێڕەونەقی ماڵی هۆشەنگ بوو لە غەمپاشا، دوو بەڕەی کۆنی تێدا ڕاخرابوو، لەگەڵ کۆمەڵە دۆشەکڵەیەکدا کە بولبولیار بە جۆرێکی ئەندازەیی ڕێکی خستبوون، دیوارەکانی پێکڕا لە گەچی داکەوتوو و ژەنگگرتوو بوون. من دوو ڕۆژ لەوەوبەر لە ناوچە شاخاوییەکانەوە بە فەرمانێکی زۆر نهێنی سەرکردایەتی شۆڕش هاتبووم تا هەندێک شانەی شۆڕشگێڕانەی نوێ لە شاردا دروستبکەم و کاروباری شانە پەرتەوازەکان بگرمە ئەستۆ. یەکەمین کەسێک کە دەبوو پەیوەندی پێوەبکەم ئەردەڵان هیرانی بوو. ئەردەڵانی هیرانی پەیوەندی بە هۆشەنگەوە کردبوو کە هاوڕێی بوو لە زانکۆ، هەر خودی ئەردەڵانیش بە جۆرێک لە جۆرەکان نەغەدە ماردینی هێنابووە سەر ڕێگای خەباتکردن. بەڵام ئەوەی نزاری هێنابووە ڕیزی شۆڕشەوە نەغەدە ماردینی بوو.

ئەو ڕۆژە کە پێکڕا لە ژوورەکەدا کۆبووینەوە، من سەری قسەم گرتە دەست و سەرەتا بە هێرشێکی توند بۆسەر بارزانییەکان دەستم پێکرد. ئەوکات جگەرەکێشێکی بێپەروام لێدەرچووبوو، لە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولەوە بەردەوام جگەرەم دەکێشا و گەر بۆم بلوایە دەمخواردەوە. یەکێک بووم لەو کەسە کەمانەی بەرگەی شکستی شۆڕشم نەگرت و دۆخێکی دەرونی دژوارم بۆ دروستبوو. لە سەرەتاوە ئەو هەستەم هەبوو کە شۆڕش پرۆسەیەکە دەبێت تەواو بکرێت، شۆڕش شتێک نییە کە دەستی پێکرد بێ سەرکەوتن بگاتە کۆتایی، شتێکە کە داگیرسا جگە

لە سەرکەوتن هیچ ئەگەرێکی دیکەی لە بەردەمدا نییە. هەڵبەت ئەو شکستە ترسناکەی شۆرش، منی تووشی دوودڵی و غەمۆکییەکی کاتی کرد، وەک خەڵکانێکی زۆر پیشێکی درێژم هێشتەوە و بە غەمبارییەکی بێوێنەوە ئاوارەی تاران بووم، وازم لەوەشهێنا بۆ تەواوکردنی خوێندن بگەڕێمەوە بۆ زانکۆ و کامێرایەکی نوێم کڕی و کەوتمە بیرۆکەی ئەوەی بۆ ژیانی داهاتووم شتێک بکەم هەم لە سروشت و هەم لە شارستانییەتەوە نزیک بێت. دروستکردنی جێگایەک بۆ ئەسپ بەخێوکردن و بایەخدان بە ئەسپسواری بیرۆکەی ئەو دەمەم بوو. ئەوەی ئەودەم لەو خولیایەی دوورخستمەوە، دەستپێکردنەوەی شۆڕش بوو. شۆڕشگێڕبوون لە هەندێ قۆناغدا وەک نەخۆشی لێدێت، مرۆڤ ناتوانێت شۆڕشگێڕ نەبێت، لەو دەمەشدا من ئەو دەردەم بە جۆرێکی بێوێنە گرتبوو. زۆرجار بۆ شۆڕشگێڕ گرنگ نییە لە چ بەرەیەکەوە دەست پێدەکاتەوە، گرنگ ئەوەیە جێگایەک هەبێت تورەیی و نائومێدی خۆی بەرامبەر جیهان پیشانبدات. هەرەسی شۆڕش ئێمەی گەیاندبووە پلەیەک لە دوودڵی کە جێگای باوەڕ نییە. هیچ شتێک وەک هەرەسی شۆڕش پیاوان تووشی نەخۆشی دەروونی و جەستەیی ناکات، لە بەرئەوەی لە ساتێکدا، لە چرکەیەکدا شۆڕش دەبێتە بەشێکی ئۆرگانی جەستەمان، دەبێتە ئەو شتەی کە کۆی مانای بوونمانی لە سەر بەندە، لە بەرئەوە تێکشکانی شۆڕش هاوشانی نەخۆشی و تێکچوونی تەندروستیمان بوو. ئەو ڕۆژەی کە لە ماڵی هۆشەنگی بولبولیار کۆبووینەوە، ڕۆژێکی گرنگی ژیانم بوو... پێنج کەسی تورەبووین... بەر لە دەسەڵات و داگیرکەران لە خودی ژیان و لە گەردون تورەبووین. لەو بێمانابیە قووڵەی کە لە بن هەموو شتێک و لە پشت هەموو شتێک و لە دوای هەموو شتێکدایە. نزار ئیدریس دوای گەڕانەوەی بۆ شار لە قەسابخانەیەک کاریکردبوو، بە ڕاستی کاری سەربڕینی مەڕ و مانگا بوو، دەیگووت ئەو کارە وادەکات

بەرگەی ژیان بگرێت. نەغـەدە بە جۆرێک لـە جۆرەکان لـە هەمـوو شـتێکی دنیـا ناڕازیـی بـوو، هۆیەکـی دیاریکراوی بـۆ ئـەو ناڕازیبوونـە نەبـوو، بـەڵام دڵنیابـوو خـودی ئـەو ناڕازیبوونـە جوانیـدەکات... «مرۆڤـی ناڕازیـی هەمیشـە مرۆڤێکـی جوانـە» لـە سـەرەتای کۆبوونـەوەی ئـەو ڕۆژەمانـدا وایگـووت. ئـەودەم ئـەوەی لـە ژنـی دکتۆرێـک نەچێـت، هـۆکاری هەمـوو هەوڵێـک و ڕەفتارێکـی بـوو. هۆشـەنگیش سـوڵتانی غەمپاشـا، وەک نائومێدێکـی گـەورە دەهاتـە شۆڕشـەوە، شۆڕشـگێڕبوون لای ئـەو جۆرێـک بـوو لـە ئاشـکراکردن و ڕاگەیاندنـی نائومێدییەکـی ئەبـەدی.

ئـەو ڕۆژە بـۆ یەکەمجـار هەسـتم بەبوونـی شـتێکی نائاسـایی لـە نێـوان نەغـەدە ماردینـی و نـزار ئیدریسـدا کـرد. لـە سـەرەتاوە گومانێکـی قووڵـم بەرامبـەر خانمـی نەغـەدە هەبـوو، پێـم قەبـووڵ نەدەکرا، ژنـی دکتۆرێـک کـە لـە خێزانێکـی دارایـە بەوجـۆرە لەگـەڵ چـوار پیـاوی بێپاشـەڕۆژ و سەرکەشـدا تێکـەڵ ببێـت. ئـەوکات بـاوەڕم بـەوە نەبـوو کـە دەشـێت مـرۆڤ هەبێـت، هـەر بـە سروشـت و بـە پێکهـات نەگیـر و نادەسـتەمۆ بێـت. سەیریشـم لێهـات کچێـک بـەو نیـگا و ویقـارە ئەرسـتۆکراتییەوە دڵێکـی وەهـا شۆڕشـگێڕانە لـە سینەیدا بێـت... بـەڵام بـا هەرگیـز لـە ناسـینی مـرۆڤ و نهێنییەکانیـدا پەلەنەکەیـن، دوایـی ئـەم چیرۆکـە پێماندەڵێـت لـە پشـت خواسـتی هـەر کەسـێکمانەوە چ نهێنییـەک وەسـتاوە.

ئـەو ڕۆژە پلانمـان دانـا، عادیلـی مامـە بکوژیـن یەکێـک لـە پیـاوە نزیکەکانـی دەوڵـەت کـە گەلێـک بەدناوانـە کاری بـۆ فاشیسـتەکان دەکـرد. ئـەوە سـەرەتای ئیشـکردنەکانمان بـوو پێکـەوە... بـەڵام کۆتاییەکانمـان بـە کـوێ دەگات، ئـەوە دەبێـت عومرێکـی درێـژ بوەسـتین و ڕابمێنیـن و بیربکەینـەوە.

# دوای سی و دوو ساڵ لە کۆبوونەوەکەی غەمپاشا

دوای سی و دوو ساڵ لەو ڕۆژە، لە بەیانییەکی نیساندا، بە هێمنی بە سەر پلەکەکانی کۆشکەکەی نەغەدە ماردینیدا سەرکەوتم. خۆی لە قاتی سێهەم لە ڕۆبێکی ئاوریشمدا پێشوازی لێکردم، کراسێکی شیفۆنی کورتی لە ژێر ڕۆبەکەوە لە بەردا بوو. هەردووکمان نیشانەی تێپەڕینی کات و تۆزی سەردەمەکان لە سەر ڕوخسارمان نیشتبوو. هەردووکمان زیاد لە پێویست قەڵەوبووبووین، ئەو بۆنی عەتری «دۆڵچی گابانا» و من بۆنی عەتری «بۆس» م لێدەهات، ئەو ڕۆبێکی ژنانەی گوڵداری گرانی لە بەردا بوو، ژوورەکەی پڕبوو لە ئینجانەی هەمەجۆری کاکتۆس کە هەندێک بازرگانی تایبەت لە باشووری ئاسیاوە دەیانهێنا، بەرامبەر تەلەفزیۆنێکی پلازمای زۆر گەورە دانیشتبوو و لە کەناڵی «ئێم بی سی» سەیری بەرنامەیەکی تایبەت بە خۆلاوازکردنی دەکرد. کچە کارەکەرێکی نیپاڵی لە نزیکییەوە تۆزی نیشتووی دوای خۆڵبارینەکانی دوێنێی بەسپرایەکی تایبەت لە سەر کەلا و گوڵەکان دەسڕی و ئاوی ناو حەوزی ماسییەکانی دەگۆڕی. کە من گەیشتم، نەغەدە بە لوتفەوە دەنگی بەرنامەکەی کزکرد و وەک ژنێک قەڵەوی و تەمەن هیچیان لە ڕەفتارە سەیرەکانی نەگۆڕی بێت، بە دەنگێکی کەمێک نوساو کە لە هیچدا لە دەنگی سیحراوی کیژی کوچەکەی غەمپاشا نەدەچوو، پێیگووتم «جەنگیز، بەخێربێیت... ببورە ئەم ئەزێتەم خستیتە بەر. ببورە، بەڵام بیستوومە دەتەوێت یادگارییەکانت بنوسیتەوە. باشە، باشە... کارێکی باش دەکەیت. تۆ چۆنیت کاکە گیان. حەزدەکەم ڕێک و ڕاستبم لەگەڵت، بیستوومە دەتەوێت باسی منیش بکەیت، باسی ئەو کۆبوونەوەیە بکەیت

کە لەوێوە ژیانی شۆڕشگێڕانەمان دەستی پێکرد، کۆبوونەوەکەی غەمپاشا و هەموو ڕوداوەکانی دواتریش. هەموو شتێک لە سەرەتاوە بگێڕیتەوە... شتی خراپت دەربارە دەبیستم. ها ئەوەم بیستووە. گەر قسەکە ڕاستە پێمبڵێ... چونکە منیش دەمەوێت لە حیکایەتەکەدا کلکێکم هەبێت... دەمەوێت کلکێکم هەبێت».

من بە حورمەت و شەرمێکەوە کڵاوەکەمم داگرت، بە سەرێکی ڕووتاوەی زل و جووتێ چاوی بچکۆلە و سمێڵێکی تاشراوەوە، سەیرێکی قووڵم کرد. دڵنیابووم بەزەیی پێمدا دێتەوە، دڵنیابووم بە درێژایی ژیانی بەزەیی بە مندا هاتۆتەوە، بێئەوەی گوێ بە بەزەیی خانم بدەم کە ماوەیەک بوو بە چاوی بەزەییەوە سەیری هەموو کەسی دەکرد، بە شەرمێکەوە کە شەرمی ناچاری بوو گووتم «خانمی گەورەمان. بە دڵنیاییەوە، بە دڵنیاییەوە، من خولیایەکی وام هەیە، سەردەمی ئێمە پێویستی بە شایەتی کەسێکی دەستپاک هەیە کە شتەکان وەک خۆیان بگێڕێتەوە... وەک هەبوون... من لە ساڵانی ڕابوردوودا ڕۆژانە یاداشتەکانی خۆمم بە وردی تۆمارکردوە، بەڵێ خانم هەتا دەتوانم بڵێم زۆر زۆر بە وردی، هیچ شتێکی گرنگم جێنەهێشتووە کە لە سەردەمی خۆیدا روویدابێت».

خانمی نەغەدە گووتی «دەبێت گوێت لە من بێت. من نازانم تۆ چی دەنوسیت. بەڵام هەرچییەک بنوسیت من لە ناویدا دەبم، دەزانم من لە ناویدا دەبم». چاوانی کەمێک کزبووبوون. قژی بە بۆیەیەکی سورباو بۆیەکردبوو، لە قۆناغێکی تەمەندا بوو کە هەندێک بیبینن و بڵێن «ئۆه، خانم چەندە پیربووە»، هەندێکی دیش بڵێن « نا وەک خۆیەتی... لەگەڵ ڕۆژانی گەنجیدا شتێکی ئەوتۆی نەگۆڕاوە». ئەو قۆناغەی هەم ئافرەتان و هەم پیاوان تێیدا دەکەونە دوودڵییەکی قووڵەوە دەرهەق بە جوانی و شێوەیان، ئیدی نە بڕوایان بە ئاوێنە دەمێنێت، نە بە چاوی خۆیان، نە بە قسەی خەڵک. هەمیشە پێویستیان بەوەدەبێت گوێیان

لە ستایشی ئەوانی دی بێت، بۆ ئەوەی بڕوا نەدۆڕێنن و لە ناخەوە هەستێکی قووڵی لاوازیی دایان نەگرێت. بەڵێ نەغەدە دەنگیشی شتێک لە گڕی و هەناسەی تۆنی پیریتی تێکەوتبوو، بە پێچەوانەی جارانەوە کە دەنگێکی ژنانەی سەرنجڕاکێش و ئارەزووبزوێنی هەبوو. من بە سەرە گەورە و کەچەڵەکەی خۆمەوە، بەو چاوانەوە کە تێڕوانین و وردبوونەوەی دوورودرێژ کزیانکردبوو، بەو بێعەقڵییەوە کە نەدەبوو تێیبکەوم، گووتم «ئوە خانمی ماردینی، بێگومان من ناتوانم ئەم چیرۆکە بۆ تۆ بگێڕمەوە. لە ڕاستیدا ئەم چیرۆکە بۆ تۆ ناگێڕدرێتەوە، جگە لەوە گەر بێت و تۆ لە چیرۆکەکەدا نەبیت تامێکی نابێت». ڕەنگە ئەو ڕستەیە هەڵەیەکی گەورەی من بووبێت، بەڵام ئێستا دڵنیام، بەبێ ئەو ڕستەیەش شتەکان هەمان ڕێگایان دەگرت و چارەنوسی من بە هەمان گوزەری دیاریکراودا تێدەپەڕی. نەغەدە ماردینی زەردەخەنەیەکی گەورەی گرت و گووتی «جەنگیز ژیان هەردووکمانی زۆر شەکەتکردوە». تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، بە پێکەنینەوە گووتم «نا خانم، من و تۆ لە خۆشبەختەکانین... هەردووکمان لە خۆشبەختەکانین. هەر ئازارێکمان دیبێت زەمانە بۆی ژماردوین، ئێستا لە هیچمان کەم نییە و ئێوەش بوونەتە ژنێکی ناودار و بەختەوەر». بە کەمێک تێفکرینەوە گووتی «بۆ ئەوە ناڵێم. نا جەنگیز گیان بۆ ئەوە ناڵێم... بە هیچ جۆرێک ئەوە نیاز و مەبەستی من نییە. لەو ڕووەوە نە گلەییم هەیە، نە دەعوایەکت لەگەڵ دەکەم، بەڵام قسەم لە جۆرە شەکەتییەکە کە زەمانە بۆی ناژمێردرێت، باسم لەوەیە جۆرێک لە خۆشبەختی هەیە مرۆڤ زۆر غەمگیندەکات... جۆرێک لە خۆشبەختی هەیە خراپترە لە ئازار... زۆرجار واهەستدەکەم ئێستا و دوای ئەم هەموو ساڵەی خێروخۆشی لە وڵاتەکەدا، تۆزێک پێویستیم بە ئازارە... پێویستیم بە ئازار. ڕاستیت دەوێت جەنگیز بیری غەم دەکەم... بیریدەکەم. بەس ناتوانم غەمم هەبێت، ئەوە پەرێشانمدەکات،

چەند وەختە هەوڵدەدەم غەمم هەبێت، چونکە بێ غەم هیچ شتێکی تر لە ژیانمدا تامی نەماوە. تۆ هەست بەوە ناکەیت؟ من لە مێژە هەستدەکەم نیوەم مردوە، بەردەوام خۆم وادێتە پێشچاو وەک ئیفلیجبم و لایەکم لە کار کەوتبێت. تێکەڵییەک هەیە لە هەست و ئیحساسات کە ڕۆژانی گەنجی هەستم پێدەکرد، ئەوەم نەماوە. ئەی تۆ... ئەی تۆ چۆنیت؟. سەردەمێک لە بیرمە پێت گوتم هەمان دەردی منت هەیە».

من دەمزانی خانم باسی چی دەکات، سوێند بە هەموو ئەستێرەی ئاسمان و بە ژیانی هەموو بوونەوەرانی سەر زەوی، دەمزانی دەیەوێت بڵێ چی. بەڵام خۆم لێ نادیدەکرد، گەرچی لە ناخەوە تورەبووم، گەرچی نەمدەزانی بۆ ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە بانگمدەکات و وام پێدەڵێت، بەڵام گوتم «خانم نیازتە چی بڵێیت. ئەگەر مەبەستت ئەوەیە کە تۆ لەم ژیانەی ئێستات ناڕازیت، ئەم ژیانەی کە گەلێک خۆشبەختانە ئامێزی بۆ کردویتەوە... بەوە ناڕەحەت و ئەفسوردە دەبم، چونکە ئەم ساڵانەی دوایی هەمیشە تۆم بە نمونەی خانمی سەرکەوتوو زانیوە کە خەونێکی گەورەت هەیە و دوای دەکەویت، خۆت لە من باشتر دەزانیت کە تۆ چ ڕێگایەکی دوور و درێژت بڕیوە... بە پێچەوانەی منەوە کە جگە لەوەی وەک جاڵجاڵۆکەیەکی پیر و مەلعون لە ناوەڕاستی تۆڕێکی تاریکدا دانیشتووم و بێوچان سەیری دونیا دەکەم، هیچی دیم نەکردوە». خانم بە سەرسامییەوە سەیریکردم و گوتی «چۆن وادەڵێیت، جەنگیز... چۆن وادەڵێیت. تۆ بەرپرسی بەشێکی گرنگی لە دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش. تۆ هەمیشە پۆستی گرنگ و شوێنی گرنگت بووە، هەرگیز سەیرکەرێکی بێلایەن و مردوو نەبوویت. تۆ کەسێکی بەئاگایت... دەمانێک بە شەیتانی شۆڕش بانگیاندەکردیت، بیرتچۆتەوە». کڵاوەکەم خستەوە سەرم و بە ئەدەبێکەوە کە بووبوو بە بەشێکی هەمیشەیی کاراکتەرم «بەتایبەت کاتێک بەرامبەر بە بەرپرسانی گەورە دادەنیشتم» بە ئەسپایی گوتم

«نا خانم بیرم نەچۆتەوە. مرۆڤ شتی وای بیرناچێتەوە. نەغەدەی ئازیز، سوپاسی لوتف و تیژی یادەوەریتان دەکەم. بەڵام من هەمیشە بینەر بووم... ئەوەی دەبێت هەمیشە بە وردی سەیری دونیا و سەیری ناوەوەی ئینسانەکانی تر بکەم، پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بەوەزیفەکەمەوە نەماوە. لە ڕاستیدا ئەوە لە مێژە بووە بە خولیای تایبەتی خۆم و بووە بە نەخۆشییەک کە لە ناوەوە ئازارم دەدات. ئەوەی بزانم چی لە ناوەوەی ئینسانەکاندا ڕوودەدات، لە وەزیفەی دێرینی خۆم کە کۆکردنەوەی زانیارییە تێپەڕیوە و بووە بە خولیایەکی کوشندە بۆ تێگەیشتن لە ئینسان، ئەم جانەوەرەی کە هیچ هێزێک نییە بتوانێت لێی تێبگات، نە لە بەرئەوەی هیچ کەسمان لەوی دیمان ناچین، بەڵکو ئەمڕۆ تا سبەی ڕەنگمان دەگۆڕێت و دەشێت ببین بە بوونەوەری دی... ئەوەی زۆر ئازارمدەدات ئەوەیە هەموو عومرم بۆ تێگەیشتنی ئینسان دانا، بۆ چاوەدێرکردنی، بەس ئینسان لە حەربایەکی بێڕەنگ زیاتر هیچ نییە». بە هێمنی وەک چەقۆیەکی کوشندە بە سەر دڵمدا بکات، گوتی «بەڵێ وەک خۆت... بەڵێ وەک خۆت». ویستم بڵێم، بەڵێ خانم وەک من، وەک تۆ، وەک هەموومان، وەک هەموو ئەو کەسانەی ڕۆژێک لە شۆڕشدا بۆ ڕەنگێک دەگەڕاین، بەڵام هەم ڕەنگی خۆمان دۆڕاند و هەم هیچی دیشمان نەدۆزییەوە. بەڵام دڵنیابووم، ڕستەی وا کوشندە دەردم گرانتر و سزام خێراتر دەکات.

نەغەدە تازە چاویلکەی پزیشکی بەکاردەهێنا، لەوەوبەر هەمیشە جووتێ چاوی ڕۆشن و پرشنگداری هەبوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە جێی خۆی هەستا و پەردە نوێ و قەشەنگەکانی ژوورەکەی تەواو لادا. تیشکێکی زۆر هاتە ژوورەکەوە و منی لە ڕوناکییەکدا نوقمکرد کە گەلێک تیژ و ئازاربەخش بوو، لە مێژبوو حەزم لە تیشکی زۆر نەبوو، لە مێژبوو بەردەوام بەرەو تاریکی هەڵدەهاتم و کاتی تایبەتی

گەڕانم تەنیا شەوان بوو... شەوانی درەنگ... دەمێک کە ئینسانەکانی تر دەتوانن من و هەموو شتێکی تر فەرامۆشبکەن. هەڵبەت حەزم لە تاریکی پەیوەندی بەوەوە نەبوو کە ڕەفتار و ڕەوشتی شەمشەمەکوێرانم گرتبێت، بەڵکو دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕاستییە غەمگینەی کە شەو باشترین کاتە بۆ لە یادکردنی دونیا، بۆ نوقمبوون لە بێڕەنگییەکی قووڵدا. شەو هیچ نییە جگە لە کۆتایی هەموو جیاوازییەک، سەرکەوتنی ڕەهای یەک ڕەنگ کە کۆتایی بە هەموو هەمەجۆرییەکی ترسناک دەهێنێت. ناوازەیی ئینسان... بەڵێ ئەوە دەردە کوشندەکەیە، ئەوە سەرچاوەی ئازارەکانمانە، گەر هەموو سوورنەبین لە سەر ئەوەی کە مەخلوقاتی ناوازەین، هێندە ئازارمان نابێت. لە شەودا کە مرۆڤەکان دەخەون کە تاریکی دادێت، هەموو جیاوازییەکان دەخەون و ئینسان دەچێتەوە سەر ڕەسەنە بێسوود و ناچیزەکەی خۆی. دنیا جەوهەرە ڕاستەقینەکەی خۆی دەردەخات کە یەک ڕەنگی و تاریکییە. تاریکی جەوهەری گەردونە، لە گەردوندا هیچ شتێک لە تاریکی زۆرتر نییە، ئەو شاهی هەموو شوێنەکانە، هیچ شتێکیش نییە لە تاریکییەوە نەهاتبێت... نا، من زوڵمەتپەرست نیم، بەڵام دەزانم تاریکی هەمووومان یەکدەخاتەوە، هەموومان دەگێڕێتەوە بۆ ئامێزی یەک شتی قووڵ و بێسنوور، یەک ڕەنگ لە ناویدا جیاوازییە بچوک و سنووردارەکانمان نرخێکی نامێنێت و تەنیا هاویەکی و وەکیەکیمان بۆ دەهێڵێتەوە.

ڕوناکی لە ژوورەکەی خانمی ماردینیدا گەرچی گەلەک خواکرد و سروشتی بوو، لە خۆری ڕاستەقینەوە دەهات، بەڵام بۆ ئێستێک وامدەزانی هەڵەم و هەموو ئەو نورانە لە پرۆجێکتەری گەورە گەورە وە دێن و ڕوو لە ژوورەوە دەکەن. لەو کاتەدا وەک شتێکی دێرینی بەیادا هاتبێتەوە، بە ئەسپایی گوتی «دەشێت من و تۆ چەندی دیکە بژین... چەندی دیکە؟». من و ئەو لە سەرەتای پەنجاکانی تەمانماندا بووین،

من چەند ساڵێک لەو گەورەتربووم. بە پێکەنینەوە گووتم «وادەزانم شتێکمان بە بەرەوە مابێت». چ وەڵامێکی بێمانا بوو ئەوکاتە بەزارمدا تێپەڕی... چ وەڵامێکی بێمانابوو.

لە ناکاو لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستا، قەڵەوبوون کەمێک کورتیکردبووەوە، بەڵام بە هەیبەت و ویقارێکی لە ڕادەبەدەرەوەوە، گووتی «پێتوایە هەقی ئەوەت هەیە یادەوەرییەکانت بنوسیتەوە؟». شتێک لە نیگەرانی، لە زویربوون لە دەنگیدا بوو کە گەلێک کتوپڕ و ناکاو هاتەسەرێ، گووتم «وادەزانم یادەوەریی تایبەتیترین شتی ئینسانە. گەرچی من ڕقم لەوەیە مرۆڤ زۆر پێ لە سەر تایبەتمەندیی خۆی دابگرێت، بەڵام نەغەدە خان یادەوەریی فریوێکی گەورەی هەیە. گەر فەرامۆشیبکەیت، ناهێڵێت بخەویت. ناهێڵێت پشووبدەیت، ناهێڵێت ژیانێکی ئاسایی بژیت».

بە سەرسامییەوە سەیریکردم و گووتی «یادەوەریی شتێکی تایبەتی نییە، بەڵکو ئەو بەشەی مرۆڤە کە موڵکی خۆی نییە، ئەوەی بە عەقڵماندا دەگوزەرێت موڵکی خۆمانە، ئەوەی بە خەیاڵماندا دەڕوات هەروەها هەرماڵی تایبەتی خۆمانە و بۆ خۆمانە و کەس کاری بە سەرییەوە نییە، بەڵام ئەوەی لە یادەوەریماندایە، نا .. جەنگیزی برام. ئەوە بە تەنیا موڵکی ئێمە نییە». گەڕایەوە سەر کورسییەکەی و بە شتێک لە غەمەوە گووتی «کەواتە جەنگیز، دەتەوێت یادەوەرییەکانت بنوسیت و باسی منیش بکەیت». من جارێکی تر کڵاوەکەم داگرت و بە پێداگرتنێکی گەمژانەوە، گووتم «بەڵێ خانم... دەمەوێت وابکەم».

زەردەخەنەیەکی گرت... بۆ یەکەمجار پیریم بە ڕوونی لە ڕوخساریدا بینی. بەرامبەرم دانیشتەوە و وەک باس لە کارەساتێک بکات، گووتی «دەتەوێت باسی لیڤیانت و نزار ئیدریسیش بکەیت .. یەعنی تەواوی چیرۆکەکە بگێڕیتەوە؟». ئەوە ئەو ساتەبوو کە دەبوو من بوەستم

و بیریکەمەوە. تا ئەوکاتە نەمدەزانی بە چ هێمنی و ئارامییەکی ساردەوە باس لە شتێکی ترسناک دەکەم. بەڵام بێئەوەی دوودڵبم، بە ئارامییەوە سەیرمکرد و گووتم «دەمەوێت هەموو چیرۆکەکە بە باشترین شێوە بگێڕمەوە». بەهەمان هێمنی خۆیەوە، کە دڵنیابووم هێمنی پێش گەردەلوولە، وەک دایکێک بە دەست کوڕێکی هەرزەکارییەوە گیرۆدەبووبێت، سەیریکردم و گووتی «دەتەوێت هەموو چیرۆکەکە بە باشترین شێوە بگێڕیتەوە. بێئەوەی بیر لە دەرەنجامەکانی بکەیتەوە، بێئەوەی بیر لەوە بکەیتەوە دواتر چی دەبێت و دەشێت خەڵک چی بڵێن و چۆن تێبگەن».

لەو ساتەدا تەواو ئاشکرابوو، بۆ ئەوەندە دەترسم... سەرم دانەواند و گووتم «خانم تکادەکەم پەردەکان دابەوە، بەرگەی ڕوناکی زۆر ناگرم». ئەو تیشکە زۆرەی هاتبووە ژووریّ بە ڕاستی ئازاری دەدام. هەستا و کەمێک نزیکبووەوە، بۆنی عەترەکەی تەواو سستیکردم، دەستی گرتم و گووتی «گوێبگرە جەنگیز. دەبێت واز لە بیرۆکەی نوسینەوەی یاداشتەکانت بهێنیت... ئەوە بۆ تۆ نابێت، بۆ کەسێک نابێت کە نهێنی زۆر گەورە دەزانێت. ئەوە بۆ کەسانی وەک تۆ نییە... تێدەگەیت، تۆ بەرپرسێکی گرنگی دەزگای ئەمنییەتی شۆڕشیت... بەرپرسێکی گرنگی ئەو دەزگایەیت، کەس نییە لە جێگا و پلە و پایەی تۆدابێت و کاری وەها بکات. ئەوەی تۆ دەیکەیت یاریکردنە بە ئاگر... یاریکردنە بە ژیانی خۆت». کەمێک پاڵمدایەوە و هیچم نەگووت.

لەو کاتەدا چەندین سەعات پێکەوە دەستیانکرد بە لێدان، وەک ئەوەی دەستێکی ئەفسوناوی چەندەها کاتژمێری جیاوازی پێکەوە لە سەر یەک چرکە کۆککردبێت. لە هەموو ژوورەکانی ماڵی خانمی ماردینییەوە، بەندۆڵی گەورە دەجوڵان و وەختێکی نادیاریان ڕادەگەیاند، من بۆ یەکەمجار سەرم لەو هەموو کاتژمێرە سوڕما کە بەدیوارەکانی ماڵی

خانمەوە هەڵواسراون، سەرم لە جوڵەی ئەو چرکەژمێرانە دەسوڕما کە بێ پاش و پێش، هەموو پێکەوە دەجوڵان، وەک ئەوەبوو خانم لە ناو خولیایەکی گەورەی پێوانەکردنی کات و ژماردنی هەموو چرکەکانی ژیاندا بژی. ویستم لێیبپرسم «ئەم هەموو کاتژمێرە زۆرە بۆ؟» . ئەو پێشمکەوتم و گووتی «جەنگیزی برام، سەرت نەسوڕمێت... لەم خوشکە پیرەت تێبگە. هەموو ئەو کاتژمێرانە بۆ ئەوەیە پێمبڵێن کە کات دەڕوات. کات شتێکە دەڕوات و ناگەڕێتەوە. بۆ ئەوەی لە رابوردوودا نەژیم، بۆ ئەوەی بزانم کە هەمووی تێپەڕیوە و مردووە، هەر کات گوێم لە دەنگی ئەو بەندۆڵانە دەبێت زیاتر دڵنیادەبم کە لە ڕابوردوو دووردەکەومەوە» . سەیرمکرد بۆ ئەوەی بزانم ئاخۆ هیچ شتێک لەو شاعیرەی ناخی هێشتا لە ناویدا زیندووە... دەمزانی شاعیریش وەک فریشتە وایە، کە هاتە سەر مردن، لە هەر بەشێکی ڕۆح زووتر لە ناخی مرۆڤدا دەمرێت. بەڵام بە خوێندنەوەی ڕووتی ڕوخسار نەمتوانی بگەمە شتێکی دیاریکراو، نەمتوانی بچمەوە سەر ئەو ڕاستییەی لە مێژبوو بە ڕوونی دەمزانی. کە کاتژمێرەکان بێدەنگبوون، گووتی «کە هەستتکرد کات چەند بەخێرایی دەڕوات، ئیتر ناتوانیت بیر لە ڕابوردوو بکەیتەوە» . لە کۆتایی هەموو ڕستەیەکدا جوانییەکی دوور و دێرین و مردو لە ڕوخساریدا دەردەکەوتەوە. جوانییەک هەستمدەکرد، پتر جوانی ناو خەیاڵی منە، نەوەک جوانی سەر ڕوخساری ئەمڕۆی ئەو. دواجار بۆ ئەوەی هێمنمبکاتەوە هاتە تەنیشتمەوە و گووتی «پێمبڵێ، جەنگیزی پیر... هیلاک بوویت... ماندووبوویت لە ڕاکردن یاخود چی. تەنیا ئەوانە یاداشتی خۆیان دەنوسنەوە کە هەستدەکەن نزیکن لە کۆتایی» . من سەرم دانەواند و بە شەرمەوە گووتم «یادەوەری گەورەترین دوژمنی ئینسانە، چونکە تاکە شوێنێکە هەقیقەت وەک خۆی هەڵدەگرێت. هەموو ئازارەکان لەوێوە دێن، هەموو شتێکی مرۆڤ دەتوانێت درۆبکات، یادەوەری نەبێت» . جگەرەیەکی داگیرساند و بەر لەوەی مژی

یەکەمی لێبدات، قاچی خستە سەر قاچی و شتێک لە پێستی لە ژێر کراسە شیفۆنە سوورەکەیەوە دەرکەوت، سەیرێکی هێمنی منی کرد و بە دەنگە ژنانە ئەرستۆکراتییەکەیەوە، گوتی «هەموو ژیانم ڕقم لە هەقیقەت بووە». بە پێکەنینەوە گوتم «ڕق لەگەڵ هەقیقەتدا چ سودێکی نییە. ڕق ناتوانێت ڕێگری لە هەقیقەت بکات. هەقیقەت یەک چارەی هەیە، ئەویش ئەوەیە بەرگەی بگرین». ماوەیەک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی بیەوێت بەو بێدەنگییە بمخاتە دوودڵییەکی قووڵەوە، وەک ئەوەی دڵنیابێت دەتوانێت بەبێدەنگی گووشارێکی وەها بکات کە بە وشە ناتوانێت. دواتر زۆر بە هێمنی وەک شتێکی سادە و ئاسایی بڵێت، گوتی «ئاگادارم هەر تۆ نیت کە دەتەوێت یاداشتەکانت بنوسیتەوە... ئاگادارم... ڕاستییەکەی حیزب ئاگادارە، شەخسی سەرۆکیش ئاگادارە». وەک ئەوە وابوو بخنکێم، وەک ئەوە وابوو هەناسەم لێببڕێت، هەستمکرد پێویستیم بە هەوا و بێدەنگی و پشوویەکی درێژە، بەڵام بێئەوەی خۆم ئاشکرابکەم، پرسیم «کێی تر هەیە یادەوەری خۆی بنوسێت... کێی تر؟؟». لەو ساتەدا دڵنیابووم شتێک دەزانێت، دڵنیابووم شتێک دەزانێت... شتێک تەواو لێی دڵنیا نییە. بێئەوەی وەڵامبداتەوە، هەستا و پشتی تێکردم، گوتی «جەنگیز جارێکی تر بیر لە هەموو شتەکان بکەرەوە. یادەوەرییەکانی تۆ موڵکی خۆت نییە... هیچ کەسێک لەم وڵاتەدا یادەوەری موڵکی خۆی نییە...». بێئەوەی هیچ بڵێم لە جێگای خۆم هەستام، هێشتا دەنگی بەندۆڵی سەعاتەکان لە سەرمدا دەزرینگانەوە، بە هێمنی چاوم نوقاند و دەستێکم بە سەرمدا هێنا. لە مێژبوو وا نەلەرزی بووم... کە کڵاوەکەم گرت بە دەستمەوە، هەستمکرد دەستم دەلەرزێت، زۆر دەلەرزێت، لەرزێک، نەلەرزی ترسە و نە لەرزی پەشیمانی، بەڵکو لەرزی توڕەییە. لەو ساتەدا دیمەنی ئەسپە کوژراوەکانم هاتەوە یاد. دەنگی بەندۆڵی سەعاتەکان و دیمەنی ئەسپەکان لە خەیاڵمدا تێکەڵبوون. وەک ئەوەی ژوورەکە پڕبووبێت لە

هەناسەی ئەو ئەسپانەی لە پسمامان چەندین ساڵ لەمەوبەر کوشتمن، وابوو وەک ئەوەی بە گەورەیی لە بەردەممدا بن، وەک ئەوەی هەڵمی سینە و بوخاری جەستەیان بەرچاویان گرتبم. وەک ئەوەی لە بەردەممدا هەستنە سەر پێ و بە هێمنی بوەستن... بە نێوان تارمایی ئەسپەکاندا بەرەو ڕووی خانم ڕۆیشتم و بە دەنگێکی کز گوتم «خانم من باسی هەقیقەت ناکەم، هەقیقەت ناگێڕمەوە... تەنیا ئەو شتانە دەنوسم کە دیومن، ئەو شتانە کە لە ناویاندا ژیاوم و منیان دروستکردوە. منیان لە وەفای ڕفعەت بەگەوە گۆڕیوە بۆ لیوا جەنگیز. ئەو شتانە، ئەو شتانە و بەس». بێئەوەی سەیرمبکات، هەستیکرد هەموو گیانم دەلەرزێت، بێویستی خۆم عارەقێکی ساردم دەردەدا و وشەکان لە گەرومدا دەخنکان. بێئەوەی ئاوڕبداتەوە، لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستا و گوتی «جەنگیز بڕۆ... بڕۆ، حەمامێکی گەرم بکە و بیری لێبکەرەوە... بڕۆ... بەڵام بزانە یادەوەریت موڵکی خۆت نییە».

## یەکەمین نهێنی گەورەی ژیانم

هەموو کەسێک شتێکی هەیە نایبینێت، منیش لەو یاسایە بەدەرنیم. ڕاستە پۆستەکەم وەک فەرمانبەرێکی بەرزی ئاسایش ڕێگای ئەوەتان لێدەگرێت باوەڕ بە هەموو شتێکم بکەن، بەڵام لە ڕاستیدا منیش خاڵی نیم لە توانای نهێنی و بەهرەی شاردراوە.

پیاوانی ئاسایش لە هەر سیستمێکدا بن گومان لێکراون، شایستەی بڕوا نین، هەرکەس حەزیان لێبکات کەم هەست و بێخەیاڵە، بە گشتی دوورن لە ڕۆمانسییەت، لە سەر ئامادەیی هەمیشەگی بۆ ئازاردان و سەیرکردن و چاوەدێریکردنی مرۆڤ دەژین. هەڵبەت مرۆڤی وەها کە

ئیشی چاوەدێری و لێپرسینەوە و ترساندنی ئینسانەکانی ترە، شتێکی تێدایە لە مرۆڤی ئاسایی دووریدەخاتەوە. بە جۆرێک دەتوانم بڵێم پیاوان یان ژنانی ئاسایش، جۆرە مەخلوقێکی تایبەتن و ئاسان لە ژێر ئەو پۆلێنەدا ناوەستن کە بۆ خەڵکانی ئاسایی هەمانە. من واتێدەگەم خودای گەورەمان کە زەمین و ئاسمان و مەخلوقاتی دروستکرد، بۆ ئەوەی گەردون بگاتە کەماڵی خۆی، بۆ ئەوەی دەرفەت و ڕێگا بە هەموو ئەگەرە بێشومارەکانی ناو ئەم یارییە گەورەیە ببەخشێت، بۆ هەموو دیاردە و بوونەوەر و دۆخێک پێچەوانەکەی دروستکردوە، بۆ ڕەش سپی، بۆ خۆر مانگ، بۆ شەو ڕۆژی خولقاندوە... بۆ ئەوەی مرۆڤ لە هەموو ئەم شتانە تێبگات، مانای دروستکردوە، کە ئەویش دژێک و پێچەوانەیەکی هەیە کە بێمانابیە، وەک چۆن پڕ پێچەوانەی بۆشاییە، شوێن پێچەوانەی ناشوێن و ئێستا پێچەوانەی ئەبەدییەتە. ئەو ساتەی کە فریشتەی دروستکرد کەمێک وەستا و لە حیکمەتی قووڵی ئەم بوونەوەرە جوان و ناسکەی خۆی ڕاما. فریشتە تاکە بوونەوەرێکی ئەوە کە زاوزێ ناکەن و خۆیان ناتوانن خۆیان دروستبکەنەوە، لە بەرئەوە دەبێت خودا یەک یەک دروستیانبکات. دەمێک فریشتەکان ئاسمانیان پڕکرد و مەلەکوتیان بە جوانی خۆیان ڕازاندەوە، یەزدانی گەورەمان خۆشحاڵ بە دەستکردی گەورەی خۆی کەوتە بیرکردنەوە لە دروستکردنی دژێک بۆ ئەم مەخلوقە جوانانە، چونکە هەموو بوونەوەرێک بێ دژەکەی دەبێتە بوونەوەرێک کە لە دەرەوەی یاسای گەردونە، هەموو بوونەوەرێک تەنیا لە ڕێگای دژەکەیەوە دەگاتە کەماڵی خۆی... هەر شتێکیش سەر بە شانشینی خودا بێت و لە ژێر مەلەکوتی ئەودا بژی، دەبێت جگە لە خۆی دژێک و نەیارێکی هەبێت، چونکە هەتا باری تەعالا خۆشی بە هەموو تاکێتی و بێوێنەیی خۆیەوە دەستبەرداری ئەوە نەبووە کە نەیارێکی گەردونی و سمبولێکی دژی هەبێت کە شەیتانە. شەیتان لەدەستکردی خۆیەتی، چونکە خۆی

دەزانێت بەبێ بوونی دژێکی وا بەهێز و گەردونی، ئەستەمە بگاتە کەماڵی بێسنووری خۆی، کەماڵێک بوونی ئەو لە دووبارەبوونەوە و دەسەڵاتی ئەو لە بێمانایی و مەخلوقاتی ئەو لە یەک ڕەنگی دەپارێزێت. یەزدانی بە شکۆمان، دەمێک فریشتەکانی دروستکرد، وەک هەر شتێکی دی گەردون دەبوو ئەم شاکارانەش پێچەوانەیەکیان هەبێت... دژێکیان هەبێت، خودای گەورە زوو لەوە تێگەیشت کە مرۆڤ بە گشتی ناتوانێت پێچەوانەی فریشتە بێت، چونکە جگە لە فریشتە دەرەکی و گەڕۆکەکان، جگە لەو فریشتانەی خزمەتچی خودان و ڕەوانەکراوی ئەون، لە ناو هەموو مرۆڤێکیشدا فریشتەیەکی دیکەی شاردراوە هەیە، سەرەتا ئەوەی وەک جۆرێک لە هەڵەی گەردونی و نوقسانی لە خەلقدا تەماشاکرد، بەڵام پاش تێڕامانێکی قووڵ لە ماهیەتی مرۆڤ، تێگەیشت گەر ئەو فریشتەیە لە مرۆڤدا بێتەدەرێ، گەر لە تۆوی پەریزادان خاڵیانبکاتەوە، بوونەوەرێکیان لێدەردەچێت لە دڕندەکانی دی کوشندەتر و لە جانەوەرە بێزمانەکانی تر ترسناکتر. لە کاتێکدا ئەو دەیویست لە مرۆڤدا، کەماڵی خۆی بگەێنێتە ترۆپک و خاڵێکی ڕۆشن بۆ کۆتایی خەلق دابنێت و لە ڕێگای دروستکردنی ئەم موعجیزە گەردونییە سەیرەوە، مانایەکی گەورە بە وجود ببەخشێت. ئەو لە ئادەم راما و تێگەیشت کە مەخلوقی وەها ناتوانێت پێچەوانەی فریشتەبێت، لێرەوە لەناو جنسی ئادەمیزاداندا لقێکی کردەوە... جنسێک ئادەمین و ئادەمیش نین... بە شێوە لە مرۆڤ دەچن و لە دڵدا مرۆڤ نین، ئیشیان ئەوە نییە مرۆڤ بن، بەڵکو ئیشیان چاوەدێرکردن و نائاسوودەکردن و سزادان و لێپرسینەوەی مرۆڤە. جۆرە بوونەوەرێکن یەزدان دروستیکردن تا بەنیئادەم لە بوونی خۆی بخاتە گومانەوە، بیانخاتە شوێنێکەوە لە بوونەوەرەکانی دی قووڵتر بیر لە ناوەوە و دەرەوە، دەروون و ڕووکەش، جەوهەر و مەزهەر بکەنەوە. مرۆڤ بۆ ئەوەی ببێت بە بوونەوەرێکی بیرکەرەوە لە خۆی، دەبێت شتێکی تێدا بێت مرۆڤ نەبێت،

شتێک هەردەم وەک هەڕەشەیەکی ناوەکی لە تەواوی جنسەکە کاریکات، مرۆڤ تا لێواری دڕندە بگێڕێتەوە و ئەوەی نیشانبدات کە ئەو پەردەی لە نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا هەیە، پردێکی کراوە و بەرین و هەمیشەییە... ئێمە لەم سەردەمەدا و بە زمانی ڕۆژانەی خۆمان، بەمجۆرە مەخلوقانە دەڵێین کارمەندانی ئاسایش. دەشێت لە دەور و زەمانێکی تردا ناوێکی تریان هەبووبێت، دەشێت لە داهاتوودا وەزیفەکەیان شتێکی دیکە بێت، بەڵام وەک جنس، وەک ڕەگەزێکی تایبەت کە ئیشیان چاوەدێریکردن و سزادانە، هەر دەمێننەوە. ئەمجۆرە کارمەندانە کە لە سەر زەوی وەک جۆرە جنسێکی جیاواز لە ئادەمیزادان بڵاوبوونەتەوە، لە هەموو جێگایەکی دونیادا هەن، ڕوو لە هەر وڵاتێک، هەر سنوورێک، هەر جێگایەکی گرنگ بکەیت دەیانبینیت، جگە لە کینە و گومانیش هیچ شتێک لە چاویاندا نییە، هەتا کە لەگەڵ دز و تیرۆریست و تلیاکچیاندا دەکەونە جەنگەوە ، بۆ ئەوە نییە خەڵک بپارێزن و ئاشتی و ئاسوودەیی جیهانیی بچێنن، بەڵکو بۆ ئەوەیە بە مرۆڤە خراپەکانی دی بڵێن، ئێوە دەرهەق بە مرۆڤەکانی تر چەند دڕ و دڕندەبن، هێزێکی تر هەیە لە سەروو هەمووتانەوەیە و لە هەمووتان دڕ و بەهێز و کوشندەترە، کە ئێمەین. ئەوانە پێچەوانەی تەواوی فریشتەن، لە هەموو سەردەم و سیستم و جێگایەکدا یەک شت دەیانجوڵێنێت کە هەڵکۆڵینی ناخی ئینسانەکانی دی و ئازاردانی جەستەیانە، خواستیانە تێبگەن مرۆڤەکانی دی بیر لە چی دەکەنەوە، هەمیشە نامۆن و لە نێوان مرۆڤەکانی تردا وەک غەریبەیەک دەژین، کونجکۆڵ و هەراسانکەر و لە خۆبایین، لە بەردەم لاوازدا بەهێزن و لە بەردەم گەورەکانیشدا بە چۆکدا دێن، گەر بتوانن ئینسان وەک بوکەشوشەیەکی یاریکردن تەماشادەکەن و ئەو یارییەش وەک وەزیفە و فەرمان سەیردەکەن، وەک واجیبێکی بەرز. ئازاردان وەزیفەیانە و ئەو ئازاردانەش وەک نیشتیمانپەروەری دەبینن، ئەوە وایان لێدەکات وەک قەشە

و کەهنوتی سەردەمە دێرینەکان، وەزیفەی چاوەدێریی و یاریکردن و جەستەشکاندن وەک وەتەن دۆستی و خوداپەرستی بێت لایان، چونکە جگە لە هەڵکۆڵینی ناخی ئینسان خەونی تریان نییە، ئامادەن بە بچوکترین فەرمانی گەورەکانیان، تا ترسناکترین سنوور ئەوانی دی ئەشکەنجەبدەن. هەڵبەت مەبەستم لە هەموو فەرمانبەرێکی بچوک نییە کە بەرێکەوت رێگای دەکەوێتە ناو ئەو کارەوە، بەڵکو مەبەستم لەوانەیە وەک ئاسایش لە دایکدەبن، وەک جنسێک کە ئیشیان گەورەکردن و پاراستنی چاوە بزۆک و نەسرەوت و بەدگومانەکەی ناو مرۆڤە، وەک رەگەزێک بەر لەوەی لە ناو کۆمەڵگاوە لەدایکبن، لە ناو سروشتەوە لەدایکدەبن. ئەوانە مەخلوقێکی تایبەتین، لە سەر پلەکەی وجوددا دەکەونە نێوان مرۆڤ و شەیتانەوە، وەک چۆن لەوانەیە فریشتەکان لە سەر هێڵی هەمان ئەو ریزبەندییە بکەونە نێوان مرۆڤ و خوداوە. بەڵێ ئەزموونی دوورودرێژم لەو بوارەدا پێمدەڵێت، پیاوانی ئاسایش هەنگاوێک لە مرۆڤ دوور و شەقاوێک بەلای ئەهریمەندا رۆیشتوون. ئەوانیش لە جنسێکن کە خۆ بە خۆ زاوزێ ناکەن، گەر ژنێکی ئاسایش و پیاوێکی ئاسایش پێکەوە هاوسەریبکەن، منداڵێکی ئاسایشیان بۆ بەرهەم نایەت. ئاسایش بوون جۆرە توانایەکی شەیتانییە کە سەرچاوەکانی دەگەرێتەوە بۆ ئەو لادانە ترسناکەی خودا لە ناو جنسی ئادەمیزادانددا دروستیکردوە. مرۆڤ تا نەتوانێت لە جەوهەری خۆی وەک مرۆڤ دەرچێت، ناتوانێت ببێتە پیاوێکی راستەقینەی ئاسایش، ئاسایشێک بە دڵ و رۆح، بەو نیگا تایبەتییەوە کە هەمووتان بینیوتانە کاتێک بۆ کارێک یان بۆ شتێک لێیان نزیکدەبینەوە، یان وەک دیلێک دەکەوینە دەستیان، جۆرە نیگایەکی تایبەتە تەنیا لە چاوانی ئەواندا هەیە... هەڵبەت کە ئیشکردنی ئەوان لە دەزگاکانی ئەمنییەتدا وەزیفە نییە، واتە گوناهێکی گەورەیە فەرمانبەری ئاسایش وەک فەرمانبەرێکی سادە و ساکاری تر تەماشابکەین کە پۆستێکی

دیاریکراویان هەیە و موچەیەک بۆ ژیان دابیندەکەن. فەرمانبەری ئاسایش بەشێکە لە ئامێرێکی ترسناک، لە مەکینەیەکی زۆر گەورەی نەبینراو، کەسێکە کە دەزانێت ئەم مەکینەیە چاوێکی زۆر گەورەی هەیە، چاوێکی ترسناک کە وەک دەمی دەعجانێکی گەورە دەچێتە هەموو جێگایەکەوە، گوێیەکی زۆر گەورەی هەیە کە دەیەوێت هەموو شتێک ببیستێت. مەکینەیەکە هەر مرۆڤێکی سادە کەوتە چنگییەوە، گەر بەخت کۆمەکیکرد و توانی لە ژێر ددانەکانیدا دەربچێت و بێتەدەرێ، ناتوانێت تامردن ئەو گەشتە سامناکە، ئەو چاوە سەیرانە، ئەو نیگا گوماناوییە تیژە لە بیربکات. فەرمانبەری ئاسایش بەیانی کە دەچێتە جێکاری خۆی، پێدەنێتە دونیایەکی تر. دونیایەک وەک خەستەخانەیەکی سامناک وایە کە مرۆڤ بەوجۆرە دروستدەکاتەوە کە خۆی دەیەوێت... شوێنێکە ئینسانەکان رووتدەکاتەوە و تەماشایاندەکات، دەیەوێت شتگەلێکیان دەربارە بزانێت کە زۆربەی خەڵک خۆیان دەربارەی خۆیان نایزانن. من سەر بەو جنسە بووم، یەکێکی گرنگی ئەو جنسەش بووم، یاخود ماوەیەکی درێژ وامدەزانی سەرۆکێکی هەیبەتداری نێو ئەو خێڵەم، ژیانێکی دووردوردرێژ هەوڵمدەدا دڵسۆزانە سەر بەو جنسەبم. بەپێی ئەزموونی دووردورێژی خۆم لەوێدا دەتوانم بڵێم کە لە ئیشی ئێمەدا سزا مانایەکی گرنگی نییە، جەوهەری ئیشی ئێمە ئەوە نییە مرۆڤ لە سەر هەڵە و سەرپێچییەکانی سزا بدەین... لە هیچ کات و لە هیچ سەردەمێکدا ئەوە ئامانجی ئێمە نەبووە. گرنگ لای ئێمە سەیرکردنی ناوەوەی ئینسان و پەکخستنی نهێنییە گەورەکان و کوشتنی گومانەکانی ناو رۆحێتی. راستە ئێمە هەمیشە بە قازانجی هێزێکی دونیایی کاردەکەین، خزمەتکاری سەرۆکێکین، بەرگری لە دەسەڵاتێک دەکەین، بەڵام ئیشەکەمان مانایەکی گەردونی قووڵتر و گەورەتری هەیە، وەک چۆن مەلا و پیاوە دینییەکان وەزیفەیەکی گەردونیان هەیە و مرۆڤ بۆ جێگایەکی دی ئامادەدەکەن، ئیشەکەی ئێمەش هەمان

مانـای دینـی هەیـە، مـەلاکان وادەکـەن مـرۆڤ گـەورەیـی خـودای بیرنەچێتەوە، ئێمـەش وادەکەیـن مـرۆڤ بچوکـی خـۆی لـە یادنـەکات. بـۆ ئـەوەش دەبێـت مـرۆڤ لـە نـاوەوە بشـکێنین، لـە شـوێنە هـەرە تاریکەکانـی ناخـدا... وەزیفەکـەی ئێمـە کەمتـر دینـی نییـە لـە وەزیفـەی هەر خوداناسێک. نـاوەوەی مـرۆڤ پـڕە لـە شـاخی رەق و تونێلـی ترسـناک و ترۆپکـی عاسـی. پیـاوی ئاسایش دەیەوێت بـە سـەر هەمـوو ئـەو ترۆپک و بەنـاو هەموو ئـەو تونێلانەدا سـەفەربکات. وەک چـۆن کرێـکاران بـە چەکـوش بـەرد دەشـکێنن، ئەویـش کاری شـکاندنی دیـوارە ئەسـتوورەکانی ناخـی مرۆڤـە... ئیشـی ڕاسـتەقینەی هەمـوو دەزگاکـە لـەوەدا کـورت نابێتـەوە مرۆڤـەکان بترسـێنێت، بەڵکـو لەوەدایـە بـەردەوام ئـەوە بیـر مرۆڤ بخاتـەوە، چ بوونەوەرێکـی لاواز و بێدەربـاز و کـەم دەرفەتـە. بیـری بخاتـەوە کـە دواجـار ئـەو هـەر ڕێگایـەک بگرێتـە بـەر، یەکێـک هەیـە دەتوانێـت ڕێـگاکان بگۆڕێـت و بیانخاتـەوە سـەر دۆزەخ. بـە کورتـی پیـاوی ئاسـایش ئـەو کەسـەیە کـە ناهێڵێـت مـرۆڤ چێـژ لـە سـەربەخۆبوونی خـۆی وەربگرێت. ئیشـی مەکینەکـە ئەوەیە نەهێڵێت خەیاڵی ئینسـانەکان بـۆ دوور بـڕوات، ئیـدی دونیـا هـەر شـتێک دروسـتبکات جێـگای گومانـی سـەرۆک و سـەرکارانی سـەر ئامێرەکـە بێـت، ئـەوان لـەو مەکینـە گەورەیـەدا دەیهاڕن. گرنـگ ئەوەیـە هەمـوو شـتەکان لـە جێـگای خۆیـان بـن، ئیشـی ئامێرەکـە ئەوەیـە مـرۆڤ بگرێـت، لـە جێگایەکدا بیوەسـتێنێت و لەوێدا چاوەدرێریبکات و جوڵە و نیگا و گفتەکانی بخوێنێتەوە.

مـن لـەو کەسـانەم، ئەگەرچـی لـە گەنجێتییەکـی زووەوە ڕێمکەوتـە نـاو دەزگای ئەمنییەتـی و دواتریـش بـە هەمـوو پلەکانـدا سـەرکەوتم، بـەڵام نازانـم ئاخـۆ مـن وەک هەواڵگرێـک، وەک فەرمانبەرێـک لەدایکبـووم یاخـود نـا؟ شـتەکان لـە خوێـن و فیترەتمـدا بـوون یاخـود فێریـان بـووم؟. هـەر بـە سروشـت وەک خزمەتـکاری گـەورەکان هاتوومەتـە دونیـاوە یاخـود نـا؟. گەرچـی تـەواوی ئـەم کتێبـەم بـۆ ئـەوە نوسـیوە بـۆ ئـەوەی بزانـم «مـن چیـم

و کێم»، بەڵام هێشتا ناتوانم لەو ڕووەوە بڕیارێکبدەم، لە ڕاستیدا گەڕانی من بە دوای ماهییەتی خۆمدا گەڕانێکی هەمیشەیی بووە... بە پێچەوانەی هەموو یاریدەدەر و جێگرەکانم کە هەواڵگر و ئاسایشی ڕاستەقینەن، شتێک لە مندا هەیە کە زۆر زۆر نهێنییە و دەبێت ئێوە بیزانن. ئاسایشی ڕاستەقینە، نابێت دوو ژیانی هەبێت، پیاوانی ئەمنییەت هەمیشە لە دووژیانی دەترسن، ئیشیان ئەوەیە هەر مرۆڤێکی سادە کە دوو ژیان دەژی بیخەنە ژێر چاوەدێری و پشکنینەوە و بزانن لە ژیانی دووهەمیدا چ نهێنییەکی شاردۆتەوە. لە ساڵانی سەرەتای کارکردنمدا لەو دەزگایەدا، مامۆستا ئەسعەد پێیگووتم «ئیشی ئێمە ئەوەیە نەهێڵین شۆڕشگێڕەکان نهێنی تایبەتییان هەبێت»، دواتر «شێرخان» بە ڕوونی گووتی «هەر کەسێک لەگەڵ ئێمەدا کاربکات، دەبێت بزانێت ژیانی، ژیانی خۆی نییە... هەرکات قسەی لە ژیانی خۆی کرد، بە کەڵکی ئێمە نایەت، زۆر بیرمەکەرەوە، دەمودەست فیشەکێک بنێ بە دەمییەوە». ساڵگەلێکی دوورودرێژ ئەو ڕاستییەم هەڵگرت، بەڵام هەموو مرۆڤێک ساتەوەختێک لە ژیانیدا هەیە کە ساتی گومانی گەورەیە. ساتێکە هەستدەکەیت هەموو ژیانت بە هەڵەدا ڕۆیشتووە و چیتر ڕێگای گەڕانەوەشت لە بەردەمدا نییە. بۆ ئەوەی بە تەواوی بزانن باسی چی دەکەم، دەبێت پێتان بڵێم کە ئێمە وەک مرۆڤ هێزێکمان تێدایە کە نایبینین. هەندێ خەڵک چاوی دیکەیان هەیە کە بەکاریناهێنن، چاوێک گەر بە ڕاستی بیدۆزنەوە و پێی بڕوانن، جیهان بە جۆرێکی دی دەبینن. هەندێکی دی توانایەکی بێسنووری بیستنیان هەیە گەر بە ڕاستی بیخەنەگەڕ هەموو نهێنی گەورەی ئەم دونیایە دەدۆزنەوە. بەڵام تا بەربەیانێکی ساردی، ڕۆژێک لە ڕۆژانی ساڵانی هەشتا، من نەمدەزانی کە منیش لە ڕیزی ئەو کەسانەم و شتێکی نائاساییم هەیە. تائەو دەم من تەنیا ژیانێکم هەبوو، جگە لە نهێنییە گەورەکانی شۆڕش، نهێنی تایبەتی خۆمم نەبوو، ژیانی

من پێکڕا ئەو شتانەبوو کە وەفاداری منی بۆ شۆڕش و سەرکردەکانم دەردەخست. لە بەیانییەکی ساردی ئازاری ساڵی ٨٤ دا، شتێکم بینی کە سەر لە بەر ژیانی منی گۆڕی. شەوی پێشتر جەنابی سەرۆکم بینی بوو «خودا لە گوناهی خۆش بێت و بە بەهەشتی بەرینی بسپێرێت»، ئەوسا وەک ئەم ساڵانەی دوایی کەفتەکار و خەڕۆ نەبووبوو، وای لێ نەهاتبوو خەڵک لە تەلەفزیۆندا ببینن و لەبەر پێکەنین دەست بە زگیانەوە بگرن، هێشتا دەیتوانی بەپێی خۆی بچێتە سەر دەستشۆر و پیساییە موبارەکەکەی بکاتە تەوالێتەکانەوە، نا وەک ئێستا نەبوو، لە ناوەڕاستی کۆبوونەوە گەورە و گرنگەکاندا، هەڵیگرنە ژوورێکی پشتەوە تا وەک منداڵ داییییەکەی بۆ بگۆڕن... شتێکی تێدابوو بەراستی وایدەکرد لە سەرۆک بچێت. سمێڵێکی ماش و برنجی زل و پرچێکی سپی درێژ و ورگێکی ویقارداری هەبوو، بەڵام شێوەی دانیشتن و ڕۆیشتنی وەک ئێستا هەر لە سەرۆک نەدەچوو، ئەوەتەی من دەیبینم شێوەی ڕۆیشتنی لە نەخۆشێک دەچێت تازە بە تازە هەستابێتەوە سەرپێ و بڕوات. هەمیشە دوای خوان و خواردنە درێژەکانی توانای ڕۆیشتنی لەدەستدەدا. ئەو شەوە لە کۆتایی زستان کە پێکەوەبووین، منی راسپارد زانیاری نهێنی لە سەر یەکێک لە فەرماندەکانی پێشمەرگە بۆ کۆبکەمەوە کە وابڵاوبوو نەرم و نیانێکی زۆر لەگەڵ نەیارانی ئەودا دەنوێنێت، ئەو بە شێوە زمانە تایبەتییەکەی خۆی گوتی «هەوارم بۆ هاتووە، خەریکە لە گەر هەڤالانی حیزب ناپاکی دەکا»... ئەوەی وایدەکرد زۆر بەزەیم پێدا بێتەوە، ئەوە بوو هیچ کات پیتی «ڵ» ی بەدروستی بۆ نەدەهات.

بەیانییەکی زوو کە زەوی تەواو نوقمی زوقم و خوێسار بوو بەڕێکەوتم، هێشتا بەهاری ڕاستەقینە گوڕ و گڤەی خۆی تەواو دەرنەخستبوو. بەڵام من حەزم لە هەوای ساردی بەیانیان بوو، ئەودەم وەک نهێنیترین و کاراترین چاوی شۆڕش ناسرابووم، ئەوانەی دەیانزانی چ کارەم، ناویان

نابووم «جنۆکەکەی بابەگەورە»، هەموو دەیانزانی بەتایبەت بەکاری نهێنی هەڤاڵانی سەرەوە لە ڕێم. بەشێکی ژیانم لە شار و بەشێکی دی لە شاخ دەژیام، بەڵام لە هەر کوێ بووبم لە پێناوی شۆڕشدا بەڕێوەبووم. ئەو بەیانییە دوای سێ سەعات ڕۆیشتن گەیشتمە سەر ئاوی «سووریاوان». چەمەکە توێخێکی تەنکی سەهۆڵ گرتبووی، خۆر تازە دەردەکەوت، سەوزایی پێش بەهار هێدی هێدی سەری دەردەهێنا. عادەتم بوو لە سەر هەر چەمێک، شڵپێک ئاوم لە ڕوخسارم دەدا، گەرچی ڕۆیشتنی زۆر و بەردەوام وایکردبوو کەمتر شەکەتیم پێوەدیاربێت، بەڵام ئاوی فێنکی جۆگە و جوێباران هەمیشە تینێکی تازەیان دەدامێ. ئەو بەیانییە کە بۆ یەکەمجار بە سەر ئەو ئاوەدا نوشتامەوە، لە ژوور سەری خۆمەوە گوێچکەی دوو باڵی گەورەم بینی. سەرەتا وامدەزانی ئەوە دەرکەوتەی دوو هەوری بڵندن و من لە ئاوەکەدا و بەوجۆرە شێوەیە دەیانبینم، بەڵام سەرم بەرزکردەوە و شتێکی ئەو تۆم لە ئاسماندا نەبینی، جارێکی تر نوشتامەوە و سەرم بە سەر سەهۆڵاوە سافەکەدا شۆڕکردەوە، دووبارە نوکی تیژی ئەو دوو باڵە گەورەیە هاتنەوە پێشچاوم. جارێکی دی سەرم وەرچەرخاند و هیچم نەبینی... سێیەمین جار دووبارە و ئاشکراتر وێنەی سەرباڵەکانم بینییەوە، ئەمجارە لە ناو ئاوەکەدا بۆ ئاسەواری شتێک گەڕام، نەبا کوشتەی هەڵە و دەستخەڕۆی فێڵێکی ترسناکی بینین بم. بەڵام نا، نێو ئاوەکە هیچی تێدانەبوو. هەستام و ئاوڕێکم لە پشتەوەی خۆم دایەوە، جگە لە بێدەنگی بەیانییەکی سارد، جگە لە هێمنی سروشتێکی خۆشبەخت، هیچی دیم نەبینی، نە باڵندەیەک بە ئاسمانەوە بوو، نە بوونەوەرێک لە دوور و نزیک دیاربوو. جارێکی دی سەیری ئاوەکەم کردەوە و دیسانەوە سەرپەڕی ئەو باڵە گەورانەم بینییەوە... باڵی ڕاستەقینەی فریشتەیەک یان باڵندەیەک یان جانەوەرێکی خەیاڵی کە لە پشت منەوە یان لە ناو مندا باڵەکانی بە جۆرێکی ترسناک

ڕاکێشاوەتە دەرێ، بە هێمنی دەستم بۆ پشتەوەی خۆم برد بۆ ئەوەی بزانم دەستم بەر هیچ شتێک دەکەوێت... نا دەستم بەر هیچ شتێک نەکەوت. وەک ئەوەی کوشتەی وڕێنەیەک بم هەستام و لەو جێگایە دوورکەوتمەوە. لە شوێنێکی تری ڕۆخ و لە جێگایەکی دیکەی کەنارەوە نوشتامەوە. ئەوجارە ئیدی دڵنیابووم کە دوو باڵی درێژ و ڕاستەقینە لە پشتی منەوە دەکشێن و من دەتوانم بیانبینم. بەڵام باڵی چییە و لە کوێوە دەرەدەچن، نەمدەزانی... ئەوە سەرەتای سەرهەڵدانی گەورەترین نهێنی ژیانی من بوو. ئەو نهێنییەی منی لە ناوەوە دووکەرتکرد و ئەو تەبایی و هارمۆنییەتەی لەگەڵ خۆم و جیهاندا هەمبوو تێکیشکاند.

ئەو ڕۆژە بەپێ بە ناو گوندەکاندا ڕۆیشتم... زۆر ڕۆیشتم... دەگەیشتمە هەر ڕوبارێک و سەر هەر گۆمێک و کەنار هەر جۆگەیەک، بە سەریدا دەنوشتامەوە و لە ئاوێنەی ئاوەکاندا ئەو باڵانەم دەبینی. لە زۆر ڕێبوارم پرسی، ئاخۆ باڵێک لە پشت سەری منەوە دەبینن، وەک هەمیشە خەڵکان بە خەندەی گومان و پێکەنینی بێشەرمانەوە دەهاتنە وەڵام و دەیانگووت «هیچ نابینین». دوای ڕۆژێکی درێژ، گەیشتمە جێگایەک کە دەمتوانی بچمە پێش دەمی ئاوێنەیەکی گەورە و خۆم بە ڕوونی ببینم... سەرەتا وامدەزانی ئەوەی لە ئاوی ڕوبارەکاندا بینیومە، تەنیا فێڵی چاو و وڕێنەی ماندوێتی و خەیاڵاتی شەوی بێپشوو دروستیانکردوە، سەرەتا هیچی وەهام نەبینی، بەڵام ئاوێنە شتێکە لە شێوەی خودی ژیاندا دروست بووە، مرۆڤ سەرەتا لە نێویدا تەنیا ئەو شتانە دەبینێت کە خۆی دەیەوێت بیانبینێت، دواتر کە وردەبیتەوە، کە زۆر وردەبیتەوە ئەوسا ئەو شتانە دەبینێت کە ئاوێنە دەیانبینێت. من ئەو ڕۆژە ماوەیەکی درێژ لە بەردەم ئاوێنەکەدا وەستام، ئاوێنەیەکی کۆن بوو، وەک زۆربەی ئاوێنەی گوندەکان، تەڵخ و وێنەکاڵ و بەڵغاوی بوو... کە زۆر وەستام و سەیرمکرد، وردە وردە سێبەری تەمئاسا و کاڵی ئەو دوو باڵەم دییەوە کە

بە گەورەیی لە پشتەوە دیاربوون، جووتێ باڵی خۆڵەمێشی، وەک باڵی داڵێکی گەورە، دوو باڵ کە هەستم نەدەکرد بوونێکی مادیان هەبێت، بەڵکو تەنیا تەم بوون و من دەمبینین و هیچی تر.

یەکەم پرسیارێک ئێستا لە ئێوەی بکەم: گەر ئێوە بەیانییەک هەستن و لە بەردەم ئاوێنەدا دوو باڵی تەمئاسا و غوبارین لە پشتی خۆتانەوە ببینن چی دەکەن. بێگومان هیچ.. بەتایبەت کاتێک دڵنیابن هیچ کەسی دی ئەو باڵانە نابینێت... جووتێ باڵن و دەشێت هەبن و دەشێت نەبن، وەک هەر شتێکی دیکەی مرۆڤ کە دەشێت ببێت یان نەبێت، وەک ڕۆح کە دەڵێن هەیە و کەس لە بوونی دڵنیا نییە، وەک جانەوەرەکەی ناخمان کە دەڵێن هەیە و کەس نەیدیوە. منیش وام کرد، منیش هەمان شتم کرد، فەرامۆشمکرد و ڕۆیشتم... بوونی باڵ و نەبوونی دەبێت چ سوودێکی بۆ پیاوێک هەبێت، کە بەڕێگاوەیە بەرەو دۆزینەوەی نهێنی کەسێکی تر.

من دواجار کەسێک بووم لە دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش، باڵم هەبایە یان نەبایە، هیچی لەو پەیوەندییە ڕۆحییەی من نەدەگۆڕی بە سەرۆکەکانمەوە کە وەک وەفادارێکی بێوێنە و کەسێکی متمانەدار بۆ ڕۆژانی ترس و خەتەر سەیریاندەکردم.

## نەغەدە ماردینی و سەرەتاکانی شیعر

هۆی یەکترناسینی نزار ئیدریس و نەغەدە ماردینی، دەگەڕێتەوە بۆ دکتۆر مستەفا شوکاکی مێردی نەغەدە خان. نەغەدە کە یەکەم شیعری لە گۆڤارێکی پایتەختدا بڵاوبووەوە، هەستیکرد لە ڕێگای ئەو شیعرە چاپکراوەوە چۆتە جیهانێکی دیکەوە. یەکەمین بەیانییەک کە ئەوا ماردینی خوشکی گۆڤارەکەی لە بازاڕ بۆ کڕی و لە ناو زەرفێکی گەورەی پڕ

میوە و سەوزەدا هەڵیگرت، لەو باوەڕەدا نەبوو ئەم گۆڤارە کاریگەرییەکی وەها گەورەی لە سەر ژیانی خوشکە بچوکەکەی دەبێت کە وا بۆ ساڵێکە ژنی دکتۆر مستەفا شوکاکە... دکتۆریش هەم کوڕێکی گەنج، هەم دکتۆرێکی جوان و بە ویقار و هێمنە. نەوا ماردینی لە تاکسییەکەدا دەستیکرد بە خوێندنەوەی یەکەمین شیعری بڵاوکراوەی خوشکەکەی، کە لە لاپەڕە ٤٤ ی گۆڤاری «بەربەیان»دا بە ناونیشانی «ئومێدی شەو»، بە ناوی «نەغەدە جەلال ماردینی»ـەوە بڵاوبووبووەوە. شیعرەکە شتێک لە تاریکی وغەمی قووڵی پێوەدیاربوو، بەڵام خاڵی نەبوو لە چەندەها ئاماژەی سێکسی ئاشکرا کە نەوا بە زەردەخەنەیەکی نەرمەوە پێشوازی لێکرد. بەو شێوازە نوێیە نوسرابوو کە ساڵانێک بوو هەموو شاعیرە کوردەکان ڕەچاویاندەکرد. نەوا تەنیا سێ ساڵ لە خوشکەکەی گەورەتر بوو، بەڵام لە ناخەوە شتێکی تێدابوو تەواوی ئەمجۆرە شیعر نوسینەی ڕەتدەکردەوە، ئەگەر ڕاستتان دەوێت، خانمی نەوا یەکێک بوو لەلایەنگرانی شیعری قافیەدار. ساڵێک بەر لە ئێستا کۆلێژی زمانی کوردی لە بەغداد تەواوکردبوو، جگە لەو شاعیرە کلاسیکییە دێرینانە کە بە خۆیان و سەبکی سەنگین و وەزنی بێخەوشیانەوە دەیانبزواند، چ لەزەتێکی لەم دونیا بێتام و بێئاهەنگەی شیعری نوێ وەرنەدەگرت. ئەوەندەی بۆنی ئەو سەوزە ئاودار و تەماتە سوورانەی ناو زەرفەکەی دەیانبزواند، شیعری خوشکەکەی کاری تێنەکرد. کە گەیشتە بەردەمی ماڵی دکتۆر مستەفا شوکاک، لەو ساتەدا دکتۆر لە قاتێکی شەکەری و کراسێکی سپی و جووتێک پێڵاوی چەرمی ڕەشدا بە جانتایەکەوە لە پلەکانەی نهۆمی سەرەوە بە خێرایی دادەبەزی... نەوا ماردینی لە دڵی خۆیدا هەمیشە ئیرەیی بە نەغەدە بردوە کە هەر لە تەمەنێکی وا منداڵەوە، مێردێکی وەها نمونەیی دەستکەوتووە، کوڕێکی باریک و سپیکەلە و وردڕوخسار، بە زەردەخەنەیەکی وەها گەورەو و ڕۆشنەوە، بە

نیگایەکی وەها قووڵ و ناسکەوە، کە دڵی هەر کچێک دەتوێنێتەوە. بەڵام ئاه نەغەدە، هەندێک ئافرەت دەمرن و تێناگەن خودا چی پێبەخشیون، نەغەدەی خوشکیشی لەو کچە بەدبەختانەیە. ئەوا بۆ ساتێک وەستا و کە دکتۆر مستەفا شوکاکی بینی، یەکسەر خەیاڵی بۆ ئەوە چوو: ئاخۆ دەبێت دکتۆر و نەغەدە ئەمشەو سێکسیان کردبێت؟ ماوەیەک بوو هەر دکتۆری دەبینی، بە ڕوخسارە منداڵانە و عەتراوییەکەیەوە یەکسەر خەیاڵی بۆ ئەو پرسیارە دەچوو. بە هێمنی و شەرمێکەوە کە پتر شەرم بوو لەو پرسیارە کتوپڕەی ناو خەیاڵی خۆی، سڵاوی لە دکتۆر کرد. دکتۆر هەمیشە بە پێکەنینێکی گەورەوە پێشوازی لێدەکرد، تازە کاری موقیمی تەواوکردبوو، گەرچی نزیکی دەساڵ لە نەغەدە گەورەتر بوو، بەڵام هێند گەنج و پڕژیان دەینواند، لەگەڵ ئەودا هاوتەمەن دەردەکەوتن. شتێک لە شانازی دکتۆرێکی گەنج لە ڕوخساریدا بوو، بە نەغمەیەکی پڕخرۆشەوە خۆشحاڵی خۆی دەرخست و گووتی «هۆو ئەوا خان، چ بەیانییەکی ڕووناکە... ئەوە ئەمڕۆ چی ڕوویداوە، من هەست ناکەم ڕەشەبا بێت یان چی؟ دەبینیت... دەبینیت با خامۆشە، چی شتێک تۆی بۆ لای ئێمە هەڵگرتووە... خێرتهێنا عەزیزم. بەیانیت ڕووناکتر کردین... سەرکەوە سەرکەوە، خوشکتان تۆزێک بێتاقەتە، بینینی ئێوە حەتمەن غەمی بەیانیانی لە دڵ لادەبات. بمەدەرێ، عەزیزم زەرفەکەتم بدەرێ». دکتۆر لەو کەسانەبوو کە غەم و خۆشی، بە ڕاستی لە ڕوویدا دەردەکەوت. هەمیشە بەو ئاوازە پڕ ئاهەنگەوە پێشوازیدەکرد، هەمیشە بینینی دکتۆر شتێکی لە دڵی ئەوادا دەبزواند، نەیدەزانی چییە... حەز نەبوو، جۆرە ئارەزوویەکی ترە، ئارەزووییەکە توند لە هەموو مرۆڤێکدا هەیە گەر ژنە یان پیاو... ئارەزووییەکی نادیارە، ئارەزووی ئەوەی لە ناکاو دەم بخەیتە دەمی کەسێکەوە... کەسێکی دیاریکراو... هەر یەکێک لە ئێمە ئەو هەستەمان هەیە، مرۆڤ لە ژیانیدا لەوانەیە تەنیا بەرامبەر کەسێک

یان دووان ئەو جۆرە هەستە دایبگرێت، بەڵام هەستێکی شاردراوە و توندە، درەنگ یان زوو مرۆڤ داگیردەکات، زۆرجاریش بەهێز و بێمانا داگیریدەکات. حەزێکی تاریک و قووڵە کە سنووری تێگەیشتن و سانسۆری ڕەوشت و بەربەستەکانی دەرون دەشکێنێت و وەک چرایەکی گەورە لە خەیاڵماندا دادەگیرسێت. ئەوەی نەوەستیت... هیچ شتێک نەکەیت... بەڵکو بێ هیچ پێشەکی و قسەیەک دەم بخەیتە دەمی ئەو کەسەوە کە لە بەردەمتدا وەستاوە. ئەوا لە یەکەم ڕۆژەوە ئەم دکتۆر مستەفا شوکاکەی بینیوە، ئەو خولیایە بەردەوام وەک مۆتەکەیەکی بێمانا بە سەر سەریەوەیەتی. هەست ناکات دکتۆری خۆشدەوێت... بەڵام شتێک رایدەکێشێت بۆ ئەو ماچە... بۆ ئەو تەنیا ماچە کە رەنگە لەوێدا هەموو تینوێتی بۆ ئەم پیاوە تەواو بێت. هەر ئەو دەبینێت و لە بەردەمیدا دەوەستێت، ڕاستەو ڕاست ئەو حەزە هەموو خەیاڵی داگیردەکات. بەڵام دەزانێت ئەو ماچە چەندە دوورە، چەندە ئەستەمە، چەندە خەیاڵییە، چەندە نەکردەیە. وای لەو ئابڕووچوونە، دەم بخەیتە دەمی مێردی گەنجی خوشکە بچوکەکەت، وای... لە ناخی دڵەوە هەستیکرد هیچ شتێکی لەم پیاوە ناوێت ئەو ماچە تەنیایە نەبێت. یەک ماچ و دوای ئەوە رەنگە هەموو ژیانی نەیەوێت ئەم مێردی خوشکەی ببینێتەوە.

لە سەر پلەکەکان دکتۆر بە خێرایی پیاوێکی بە ویقارەوە زەرفەکانی بۆ سەرخست و لە شوێنی بەر ژوورەکانەوە بە دەنگە خۆشەکەی هاواریکرد «نەغەدە، مژدەیەکی خۆش... ئەوا خانی خوشکت لێرەیە... دەبینیت، هەمیشە شتێک لە دنیادا هەیە، غەمڕەوێن بێت».

نەغەدە لە ژێرکراسێکی تەنکی شەودا هاتەدەرێ، دوا مۆدێلی ئەو ژێرکراسە بەرۆک وازانە بوو کە لە کۆگاکانی نێو گەورەترین قەیسەری شاردا پیشاندەدران . قژێکی ئاڵۆزکاو و سیمای بوکێکی شەکەتی گەنجی هەبوو کە هەمیشە بەیانیان بە مەزاجێکی بەدەوە لە خەو هەڵدەستێت،

دەموچاوی کەمێک لە تەمەنی منداڵی خۆی گەورەتر دیاربوو، شتێک لە منداڵییەوە لە سیمایدا بوو، وەک ژنە ئیمپراتۆر، وەک عەشیقەی قەیسەر دەریدەخست. ئەوەی لە زووەوە خولیایەکی شێتانەی شیعر چووبووە سەری، بۆ هەمووان شتێکی سەیربوو، بۆ نەوا و بۆ دکتۆر جەلال ماردینی باوکی و بۆ دکتۆر مستەفا شوکاکیش کە هەر لە کاتی دەستگیرانیدا سەرسامی و ترسی خۆی لەو شاعیرەی ناوی پیشاندابوو. دەموچاوی نەغەدە لەو دەموچاوە جوانانەبوو کە بۆ زۆر شت دەشێت، نەوا وشەیەکی کوردی بۆ شێوە دەموچاوی ئەو نەدەدۆزییەوە، بەڵکو بەردەوام وشەی «کیبار» ـی بۆ بەکاردەهێنا. دەکرا ژنی دکتۆرێک بێت، دەکرا خانمی یەکەمی وڵات بێت، بەڵام سیمای بۆ ئەکتەرێکی سینەما و شاعیرەیەکیش دەگونجا. سیحری لە جوانییەکەیدا نەبوو، بەڵکو لەوەدابوو شکۆ و بڵندگەرایی و شانازییەکی ترسناکی تێدابوو... دەڵێم شانازییەکی ترسناک، چونکە جۆرێک لە شانازی هەیە دەشێت دونیا وێرانبکات بۆ ئەوەی هەرەس و لاوازیی خۆی نەبینێت. نەوای خوشکی تەنیا کەس بوو کە لە منداڵییەوە ئەو شانازیی و شکۆ بێپەروایەی لە چاویدا دەبینی، بەڵام ئەو بەیانییە کە لەو ژێر کراسەدا بینی، حەزیدەکرد زللەیەکی توندی لێبدات، زللەیەک بیگرێنێت. سینەی هەمووی کراوەبوو، بڕێکی زۆری مەمکی دیاربوو، دواجار دەرکەوتنی بەوجۆرە لە بەردەمیدا، وەک ئەوە بوو پێیبڵێ: تێبگە خوشکە نەگبەتەکەم، من چ جۆرە شەوێکم بردۆتە سەر. ئێستا ماوەیەکە ژنی دکتۆر مستەفا شوکاکە، واتە گەیشتوونەتە شوێنێک لە پەیوەندی سێکسیاندا کە نەوەک سەرەتا پڕ لە ترس و شەرم و لێک تێنەگەیشتنە، نەوەک دواتریش پڕە لە بێزاریی و میکانیکییەت و بێتامی، بەڵکو ئەو سەردەمەیە کە ژن و مێرد بە راستی لەزەت لە یەکتر دەبینن. نەوا بە وشەگەلی ناو شیعرەکەدا تێگەیشت کە نەغەدە لە تێکستەکەیدا ئاماژەی بۆ کۆمەڵێک هەستی جەستەیی

تایبەت کردوە، بەڵام لە پشت دێڕەکانەوە شتێکی تاریکیشی دەبینی، وەک دێڕی لە چەشنی «لە ترۆپکی خۆشی مندا تۆ دەمریت» «ئامێزت شتێک نییە کۆتایی نەیەت» «دەستەکانت خۆیان لە سەر لەشم مردنی خۆیان دەنوسنەوە». بەڵام ئەوا کەمێک دەستی گرت بە سەرییەوە و بە نازێکەوە بە دکتۆری گووت «ئا دکتۆر گیان، دەتوانیت بڕۆیت... غەمی نەغەدەت نەبێت، من دەزانم چۆن دەیخەمەوە سەر هەوای خۆی... من دەزانم». ویستی باسی بڵاوبوونەوەی شیعرەکەی نەغەدە بکات، بەڵام ترسا خۆشییەکی وەها هەردووکیان دابگرێت، لە پێشدەمی ئەودا باوەش بە یەکدیدا بکەن و ئەمیش تووشی دۆخێکی شەرم یان ئیرەیی یان تورەیی ببێت و شتێکبکات دەرەنجامی دیار نەبێت، بەوەش نهێنی قووڵ و تاریکی خۆی دەربارەی ئەو ماچە ئاشکرا بێت کە هەرکات مستەفا شوکاک دەبینێت بیری لێدەکاتەوە.

کە دکتۆر شوکاک رۆیشت، بە هێمنی دەستی نەغەدەی گرت و گووتی «شتێکی گرنگم هەیە بۆت، شتێک کە زۆر دڵت خۆشدەکات، دڵنیام چاوەڕوانتکردوە... سەیربکە... سەیربکە».

گۆڤارەکەی لە نێو سەوزەکاندا دەرهێنا. بۆنی تەرخونی لێدەهات. گووتی «بێزەحمەت سەیری لاپەڕە ٤٤ بکە... بێزەحمەت». نەغەدە کە شیعرە بڵاوکراوەکەی خۆی بینی، لە خۆشیدا قریشکەیەکی گەورەی کرد. ئەوە خۆشترین ساتی ژیانی بوو.

بڵاوبوونەوەی یەکەم نوسین لە ژیانی مرۆڤدا ڕووداوێکی سادە نییە. مرۆڤ ماوەیەکی درێژ لەو مەستی و گێژییەدا دەژی کە ئەو خۆشییە دروستیدەکات، بەڵام ئەو خۆشییە گەرچی یەکێکە لە هەرە خۆشییە گەورەکانی ژیان، گەرچی یەکێکە لەو خۆشیانەی مرۆڤ هەموو ژیانی هەوڵدەدات بە ڕێگای بڵاوبوونەوەی بەردەوامەوە دووبارە و چەندبارەی بکاتەوە، هاوشانە بە ساتێکی قووڵی تێفکرین و نامۆیی و ڕارایی کە

هەموو نوسەرێک لە ساتی یەکەمەوە تێیدەکەوێت. نەغەدە ماردینیش خالّی نەبوو لەو چرکە سەیرەی گومان و تێڕامان. نەغەدە بۆ ماوەیەک هەر بە سەرسامییەوە سەیری ناوەکەی خۆی دەکرد... لەو ساتەدا دەیویست پەیوەندییەک لە نێوان ناوی نوسراوی سەر گۆڤارەکە و خۆیدا بدۆزێتەوە. هەموو مرۆڤێک کە ناوی خۆی لە سەر گۆڤارێک دەبینیت، ئەو هەستە سەیرە دایدەگرێت کە ئەوە ناوی ئەو نییە. تا ئەو ساتەی مرۆڤ نوسینێکی بڵاونەکردۆتەوە، دڵنیایە کە خۆی و ناوەکەی یەکێکن، دڵنیایە ئەو لە کوێ بێت ناوەکەشی لەوێیە، دڵنیایە ناوەکەی کاروکردارێکی لێ ناوەشێتەوە و ناچێتە هەندێک جێگاوە کە خۆی ناچێت، کارگەلێک ئەنجام نادات کە ئەو نەیویستووە. بەڵام هێندەی بۆ یەکەمجار نوسینێک بڵاودەکەیتەوە، ئیتر ناوەکەت و وشەکانت لە دەستی تۆ دەردەچن... گەرچی هەموو نوسینێک خۆی ژیانی خۆی هەیە، بەڵام هەر تاوانێک ناوی سەر نوسین بیکات «کە زۆربەی تاوانگەلێکن نوسەر ئاگای لێیان نییە» بە جۆرێک لە جۆرەکان لە سەر نوسەرەکان دەکەوێت. لەو ساتەوە مرۆڤ بۆ یەکەمجار یەکەم تێکستی خۆی بە چاپکراوی دەبینێت، تێدەگات یان دەبێت قەبووڵی بێت کە ناوی لە دەرەوەی خۆی، لە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەو بڕوات و سەفەری بێسنوور و ئازاد و ترسناکی خۆی لە ناو ژیان و مێژوودا بکات، یاخود بێدەنگ بێت و چیتر ئەو ئازادییە بەو ناوە مەلعونە نەبەخشێت کە دوور لەو زۆرجار خەیاڵگەل و بیرکردنەوەیەک لەوانی دیدا دروستدەکات کە بیرکردنەوە و خەیاڵگەلی ئەو نییە، واتە وازبهێنێت و ئیدی هەموو ژیان، خۆی و ناوەکەی بە تەبایی پێکەوە بژین. جیاوازی نێوان مرۆڤی ئاسایی و نوسەران لە یەک شتدایە، مرۆڤی ئاسایی ناوەکەی ناتوانێت تاوانێک یان کارێکی گەورە بکات کە ئەو نەیەوێت، بەڵام نوسەران بەڵێ... نوسەران ناوەکەیان کارگەلێکی شەیتانی دەکات کە خۆیان نایانەوێت، پێی نازانن، زۆرجار هەر ناشیبیستن.

هەڵبەت لەوساتەدا نەغەدە ماردینی لەوە منداڵتر بوو هەموو ئەو شتانە بەو وردەکارییە بە خەیاڵیدا بڕوات، بەڵام هەر لە یەکەم ساتەوە هەستی بەو نامۆییە کرد، وەک ئەوەی هەستبکات ناوەکەی تەواو دوورکەوتۆتەوە. بەڵام خۆشی بینینی وشە چاپکراوەکانی خۆی، شادی ئەوەی لەمەولا هەمووان وەک شاعیر دەیناسن، بەختەوەری جیابوونەوەی لە دونیای ئەو مرۆڤ و شتە ئاساییانەی لە دڵەوە ڕقی لێیان بوو، بە جۆرێک گەورە بوون کە بە سەر ئەو غەمە خێرا و کتوپڕەدا زاڵ بوو.

ئەوا پێیگووت «دەبینیت، دواجار بوویت بە شاعیر... بوویت بە شاعیر». نەغەدە کە وەک منداڵ بەردەوام سەیری شیعرە چاپکراوەکەی خۆی دەکرد، بێئەوەی ئاگای لە خوشکەکەی بێت، گووتی «وەک خۆی چاپیانکردوە... هەستدەکەم وەک خۆی چاپیانکردوە». لەو ساتەدا وەستاو وەک بروسکەیەک لێیبدات، گەشایەوە و گووتی «من لە ئێستاوە شاعیرم، نەغەدە ماردینی شاعیرم... لە ئێستاوە شاعیرم». کەوای دەگووت، شتێک لە شانازی و غروری گەورە لە دەنگیدا بوو.

ئەوا لە سەرەخۆ خوشکەکەی ماچکرد و گووتی «چەندە خۆشحاڵم کە بەختەوەریت... چەندە خۆشحاڵم». نەغەدە بۆ ئێستێک گۆڤارەکەی دانا و باوەشی بە خوشکەکەیدا کرد. هەموو شتێک لە نێوانیاندا سادە و ئاسایی بوو. گووتی «باشبوو هاتی نازانیت چەندە بێزارم... نازانیت... دوێنێ نەچووم بۆ زانکۆ، تاقەتی هیچم نییە». ئەوا کە هەمیشە دەیویست ڕۆڵی خوشکە گەورەیەکی باش ببینێت، ئەگەرچی نۆری پێ سەختبوو دڵنەوایی نەغەدە بداتەوە «چونکە گەر یەکێک لەو نێوەدا شایستەی دڵنەوایی بێت ئەوە... ئەوایە، کە سێ ساڵ لەو گەورەترە و جگە لە وەڕزییش تا ئەمڕۆ، هیچی دی لە ژیان نەچنیوەتەوە». لە دڵی خۆیدا باوەڕی وابوو نەغەدە بەهانەیەکی نییە لە دەست شتێک بناڵێنێت و شکایەتێکی لە ژیندەگی هەبێت. بەو گەنجییە دکتۆرێکی جوانی وەک

مستەفا شوکاک عاشقی بووبوو، ڕاستە شتەکان لە نێوانیاندا بە قۆناغی دڵداری و خۆشەویستیدا تێنەپەڕی، هەموو شتێک بە بێ ترس و لەرزی عەشق بە خوازبێنی و دەستگیرانداریدا ڕابورد. بەڵام ئێستا هەموو دەزانن دکتۆر چەندە عاشقێتی... چەندە شەیدایەتی، بە جۆرێک کە پێکەوە دەبن لەوە ناکەوێت بەردەوام سەیریبکات، بۆ ساتێک فەرامۆشی ناکات، بە چاو لە دوای دەگەڕێت... ئاە... چی شتێک لەوە جوانترە شتەکان ئاوها سادە و ساکار بڕۆن، هەر لە سەرەتای تەمەنی شووەوە دکتۆرێکی وەها عاشقت بێت، بە قۆناغی دوودڵی و ڕاڕایدا نەڕۆیت... هەر زوو بێ هیچ بێنەوبەردەیەک خۆت لە ماڵ و مێردی خۆتدا ببینیتەوە. هەموو شتێک ئامادەبێت، خۆشەویستی، سێکس، جێگای نەرم، ماڵی خۆش، هێمنی... لە سەروو هەموو شیانەوە شاعیرییەت. چ ژیانێکی پێرفێکتە ئەم خوشکە خۆشبەختەی دەیباتەسەر، چ بەختەوەرییەکە کە تووشی کەم مرۆڤ و کەم کچی ئەم وڵاتە دەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەوا دەیزانی خوشکەکەی توڕەیە لە دونیا، توڕەیە تا ئەو جێگایەی دەشێت شتی مەترسیداری لێبوەشێتەوە.

لەو کچە گەنجانەیە کە خۆشبەختی بێزاریاندەکات. گرنگترین شت لای ئەوەیە هەستبکات دەژی، بێئەوەی نرخێک بۆ بەختەوەری یان ئازار دابنێت. ئەوەی لە چوار دیوارێکی هێمندا بەختەوەر بێت، هیچ نەبوو لای جگە لە مردنێک لە لۆکەدا، یان جۆرێک لە جۆرەکانی خنکان لە هەنگویندا. لەو کاتەوەی هوشیاری کراوەتەوە و خولیای خوێندنەوە و نوسین پەڕیوەتە سەری، ئەو بێزارییە بەردەوامەی بەرامبەر بە هەموو شتێک هەیە. بێزارییەکە بەردەوام نەغەدە دەیەوێت بە کرداری نائاسایی تەعبیری لێبکات.

ئەو ڕۆژە وەک منداڵێک سەری خستە ناو دەستی و دەستیکرد بە گریان. گوتی هەست بە بەدبەختییەکی گەورە دەکات، کە ژیان لەم

تەمەنـەوە خسـتوێتییە زیندانێکـی گـەورەوە لەگـەڵ پیاوێکـدا کـە دوورە، زۆر دوورە لـەو. ئـەو هـەر لـە سـەرەتاوە بـاوەڕی وابـوو کـە دکتـۆر مسـتەفا شوکاک ئـەو پیـاوە نییـە کـە ئـەو خەونـی پێـوە دەبینێـت. نـەوا و زۆر لـە کچانـی دیش سـەیریان لـە نەغـەدە دەهـات. دەبێت چ پیاوێـک هەبێـت لـە دکتـۆر باشـتر بێـت و بشـێت کچێـک عاشـقی بێـت. لـە ڕاسـتیدا دوای ئـەو هەمـوو ساڵە، ئێسـتا ڕاشکاوانە دەتوانـم بڵێـم، کـە پیـاوی خەونەکانـی لـەو ساتەدا کەسێک نەبـوو ژیـان بەپێـی پێـوەرە سـادە و ئاسـان و ئاسـاییەکان بباتەڕێـوە. پیـاوی خەونەکانــی یەکێـک بـوو بتوانێـت بـە هەمـوو هێـز و توانـای خۆیـەوە پەلامـاری ژیـان بـدات، هەمیشـە لـە دەرەوەی سـاتە سـادە و ئاسـاییەکان بـژی. ئـەو ڕۆژە نـەوا بـۆ یەکەمجـار گوێـی لـێ بـوو نەغـەدە گووتـی «دەمەوێـت ئـەم پیـاوە جێبهێڵـم... بـە ڕاسـتیمە نـەوا تـۆ نازانیـت مـن و مسـتەفا چەنـد لـە یەکتـر دووریـن».

نـەوا هەسـتیکرد خوشـکەکەی بـە سـەرەڕۆیی و منداڵـی خـۆی، نزیکـە ژیانـی خـۆی وێرانبـکات. ئـەو وەک کچـە بچکۆلـەی مـاڵ گەرچـی لـە هەمـووان زیاتـر نـاز و دەلالـی هەڵگیـراوە، گەرچـی ژیـان دەرفەتـی باشـتری خسـتۆتە بـەردەم، بـەڵام ئـەوەی شـتێکی دەوێـت جیـاواز لـەم ژیانـە سـادە و جـوان و هێمنـە، تووشـی دەردێکـی گـەورەی دەکات. بـەڵام نـەوا شـتێکی نەکـرد پەشیمانیبکاتەوە، وەک ئـەوەی لـە قووڵایـی دڵیـدا ئیرەییـەک هەبێـت بگاتـە ئاستی وێرانکردنـی ئـەم خوشـکە چکۆلانەیـەی کـە هـەم خۆشیدەوێت و هـەم پێـی وایـە بڕێـک لـە بەدبەختـی خـۆی هەڵقولاوی خۆشبەختی ئـەم کچەیـە کـە لـە لەدایکبوونییـەوە شـتێک لـە هێـز، لـە سەرکێشـی، لـە تاکـڕەوی تێدایـە و بـە هیـچ کەسـێکی دی ناچێـت. لـە دڵـی خۆیـدا وابیرکـردەوە «بـۆ نەغـەدە یـەک شـت گرنگـە... یـەک شـت... ئەوەیـە وەک خەڵـک نـەژی».

خوشـکەکەی دەیەوێـت هەمیشـە دیـوی ئـەو دیـوی ژیـان ببینێـت، ئـەو دیـوەی کـە خـۆی تێیـدا نەوەسـتاوە. ئەگـەر لـە بەهەشـتدا بێـت دەیەوێـت

دۆزەخ ببینێت. ئەگەر لە باغدا بێت دەبێت بیابان و گەر لە شادیدا بێت دەیەوێت بەدبەختی تاقیبکاتەوە. دڵنیابوو خوشکەکەی پێویستی پێیەتی، دڵنیابوو ئەگەر دابنیشێت لەگەڵیدا و چەند سەعاتێک قسەی لەگەڵدا بکات و تێیبگەیێنێت لەوانەیە نەغەدە بە جۆرێکی تر بیربکاتەوە، بەڵام بۆ بیکات؟. لە ناکاو ئەوەی بە خەیاڵدا تێدەپەڕی، گەر نەغەدە لە دکتۆر مستەفا شوکاک دووربکەوێتەوە لەوانەیە ئەم بتوانێت بیبات بۆ خۆی. بەڵام لە ناخیشدا ترسێکی کتوپڕ دایگرت، گەر نەغەدە لە دکتۆر جیاببێتەوە ئەم چۆن دکتۆر ببینێت، چ بە هانەیەکی هەیە، بڵێ چی؟. تا ئێستا خۆی لەوە بە شەرمنتر دەزانێت بوێرێت ئەوەی لە ناخیایەتی باسیبکات، خۆی لەوە بە لاوازتر دەزانێت، ڕۆژێک لە کاتێکدا دکتۆر بە خۆی و زەردەخەنە گەش و چاوە کاڵەکانییەوە لە بەردەمیدا دەوەستێت لێو بخاتە سەر لێوی و بڵێ «تەواو... تەواو... دکتۆر بوەستە... ئەوە ئەو ماچەیە کە من بۆی دەگەڕێم. دکتۆر بوەستە... هەمووی چەند چرکەیەکی کورتە و هەموو شتێک تەواو دەبێت، وەک ئازاری نەخۆشێک لە دوا تەقەڵدا دوای نەشتەرکارییەکی سەخت بەبێ بەنج، بوەستە دکتۆر مستەفا بوەستە. ئەوە ئەو چەند چرکەیەی ژیانە کە دەبێت من بە ڕاستی تێیدا بژیم».



بڵاوبوونەوەی شیعرەکەی نەغەدە، سەرەتای ڕۆژێکی تازەبوو لە ژیانیدا. ئەو ڕۆژە دوای ڕۆیشتنی ئەوای خوشکی، هەستی بە چەند ئارەزوویەکی تێکەڵ و توند کرد، ئارەزوویەک وایدەکرد جارێک بیر لەوەبکاتەوە لە ماڵ بڕواتە دەرێ و خۆشی ئەم ڕۆژە لە بەر هەتاو و لە هەوای پاکدا بژی، جارێکیش بەرەو سەر مێزی نوسینەکەی ڕایدەکێشایەوە، بۆ ئەوەی بنوسێت و ڕانەوەستێت. بەڵام نەیدەتوانی هیچیان بکات...

ژیان زۆرجار لە ناکاو ڕادەوەستێت، دروست لەو کاتەشدا ڕادەوەستێت کە دەبێت بجوڵێت. ئەوە ئەو ساتەبوو کە نەغەدە دەیویست شتێک بکات و نەیدەزانی ئەو شتە چییە. هەستێکی سەیرە کە ماوەیەک زوو زوو دایدەگرێت، هەستدەکات کە وزەی ئیشێکی گەورە لە ناخیدایە، گەر نەیەتەدەرێ دەیکوژێت، تووشی غەمۆکی دەکات. بەڵام لە ناکاو هەستی بە ڕاوەستانی هەموو شتێک کرد، وەک ئەوەی خۆی بە ئاماژەیەکی نهێنی، بە پەنجەیەکی سیحراوی فەرمانی بە شتەکان دابێت و وەستابن... وەک ئەوەی بیەوێت هەموو شتێک ڕابگرێت و بە هێمنی ڕابمێنێت، وەها بوو. ساتێکی سەیری ژیانی بوو، چووە بەر باڵکۆنی بەرز و دڵگیریماڵەکەیان و سەیری هەموو شتەکانی کرد... هەموو شتێک وەستابوو... هەموو شتێک... «ستیل لایف» لە ژێر لێوی خۆیەوە گووتییەوە. هەستیکرد درەختەکان هەموو وەستاون، هیچ گەڵایەکیان ناجوڵێتەوە، باڵندەکان لە کاتی فڕیندا وەستاون، هەنگەکان لە ڕێگایاندا بۆ گەیشتن بە باغ وەستاون، دەیەها پەپولە وەک دەستێک لە هەوادا نیگاریکردبن وەستاون، تیشک لە سەفەریدا بەرەو زەوی وەستاوە، گەڵاکان لە ڕێگای وەرینیاندا وەستاون، پشیلەکان لە کاتی سەیرکردنی هەوردا وەستاون، فریشتەکان کە بە سەر ماڵدا دەفڕن، منداڵانی دراوسێ لە کاتی ڕاکردندا، ئاو لە ساتی ڕژانیدا... هەموو شتێک وەستاوە. ئەو نەبێت، نەغەدە ماردینی نەبێت کە پێویستی بەوەیە هەموو شتەکان بوەستن بۆ ئەوەی بە ناویاندا تێپەڕێت. کە گەڕایەوە ژوورێ، هەستی بە هەمان وەستان و بێدەنگی شتەکان کردەوە، هەستیکرد ئەوەی دەیبینێت شتێکی خەیاڵی نییە، بەڵکو ساتێکی تایبەتی و دۆخێکی ڕۆحی و چرکەیەکی قووڵی دەسەڵاتی خۆیەتی بە سەر دونیادا... ساتێکە شتەکان دەوەستن بۆ ئەوەی ئەو بڕوات، بەڵام بۆ کوێ؟. بێئەوەی تەواو بیربکاتەوە، بێئەوەی تەواو خەیاڵی خۆی بخاتە سەر ئەو دیمەنە وەستاوە، ئەو ستیل

لایڤە گەورەیە «وەک ساڵانی دواتریش وەستانە درێژەکانی ناو عومری خۆی ناودەنا» بە پەلە خۆی گۆڕی. هەستیکرد زیندووە، هێزێکی لە ئەندازەبەدەری تێدایە، دەتوانێت شتەکان بوەستێنێت و بیانخاتەوە بزاڤ، لە بەردەم ئاوێنەکەدا سەری ڕوخساری خۆی کرد، هەستیکرد شتێکی تێدایە دەتوانێت بە هۆیەوە تا دەمرێت بەهێز بێت... بەڵام چییە ئەو شتە؟ ڕوخسارە ئەرستۆکراتییەکەیەتی، چاوە خەیاڵییەکانێتی کە هەمیشە مەست دیارە، لێوە پڕەکانێتی کە هاوارێکی نهێنی و ترسناکی تێدایە بۆ ماچ، باریکی چەناگەیەتی کە ڕوخسارێکی شاهانەی پێبەخشیوە، یان ئەو نێوچاوانە بەرزەیەتی کە هیچ کات قژە پەشۆکاو و گێژدار و پڕەکەی ناتوانێت دایپۆشێت؟؟.

ئەو ساتە یەک شت لە خەیاڵیدا بوو، بڕوات و دەست لە ژیان بدات... ژیان کە دڵنیابوو لەو دیو دیوارەکانی ئەمماڵەوە دەست پێدەکات. کێشەی مرۆڤەکان لەوەدایە کە بەردەوام ژیانی خۆیان بەجێگایەکی یۆتۆپی، بە سەرزەمینێکی خەیاڵی بەراورددەکەن، جێگایەک کە نییە و ژیانێک ئادەمیزاد هێشتا تاقی نەکردۆتەوە. ڕەنگە ئەوە تاکە بەڵگەش بێت لە سەر ئەوەی ئێمە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە بەهەشتدا بووین و دەرکردنمان لەوێ تا ئەمڕۆ وەک خواستێکی نهێنی بۆ گەڕان بۆ جێگا ونەکان، بۆ جێگایەک کە هەرگیز نایگەینێ، لە ناوماندا دەژی. ژیان ئەوەیە بەڕێکەوین بۆ ئەو جێگایەی هەرگیز پێی ناگەین... لەوە زیاتر هیچی دی نییە. ئەوەی ئەو ڕۆژە نەغەدە ماردینی دەبزواند ئەو شتە بوو کە نەیدەزانی چییە، شتێک بۆی گەرمی ئەو ترپە گەورەیەی لێبێت دەمێک دڵ بە شێتی خۆی بەدیوارەکانی سینەدا دەکێشێت، دڵ کە باڵدەگرێت و نازانین دەیەوێت بمرێت یان بفڕێت. دەیویست بۆنی ژیان لە لێواری خەرەندە ترسناک و دڵبزوێنەکاندا بکات، کاتێک هێزی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە بە خێراییەکی شێتانە بەرەو قەراغی مەرگ

بڕوات و لە سەر لێوارەکانی بوەستێت و لە یاخیبوون و ئازایەتی خۆی بڕوانێت.

کە هاتەدەرەوە جگە لای مستەفا شوکاکی مێردی جێگایەکی دیکەی لە خەیاڵدا نەبوو، ئەوەی بچێت بۆ خەستەخانە و بە ناویدا بگەڕێت، خولیای ئەو ساتەی بوو. شتێکی تایبەتی نەیدەبزواند، خواستێکی نەبوو بۆ ئازاری ئەوانی دی بگری... بەڵکو دەیویست جێگایەکی دی ببینێت، شوێنێکی دی کە چەشنێکی دی لە ژیانی تێدایە. وەک با هێنابێتی خۆی کرد بە ژوورەکەی دکتۆردا کە چاوەڕوانی ئەم سەردانە کتوپڕەی نەدەکرد. ساتێک نەبوو لە ژیانی دکتۆردا جوانتر بێت لەو ساتەی نەغەدەی تێدا دەبینی. وەک شێت دەرگاکەی داخست و ماچیکرد، وەک بیەوێت دووبارە لەوێدا لەگەڵیدا بخەوێت، دەجار پێیگووتەوە «شێتی تۆم... شێتی تۆم... شێتی تۆم». بەڵام نەغەدە بێئەوەی بایەخێکی پێبدا، گووتی «وای، بۆ ئەوە نەهاتووم. چیتە، شەو پێکەوەنەبووین؟... وازبهێنە دەی، ئیتر بەرمەدە. هاتووم خەستەخانەکە ببینم». مستەفا شوکاک بە ڕاستی عاشقی خانمی ماردینی بوو، دوو ساڵ لە مەوبەر هەر لەم خەستەخانەیەدا و بۆ یەکەمجار لای دکتۆر جەلال ماردینی باوکی بینی بووی. دکتۆر جەلال یەکێک بوو لەو پزیشکە کۆنانەی بە خۆشحاڵییەوە یارمەتی دکتۆرە گەنجەکانی دەدا. مستەفا بۆ پرسیارێک چووبووە لای دکتۆر جەلال، بەڕێکەوت لەو ساتەدا ئەم کچە عەیارەی دکتۆر، لە تەنوورەیەکی سپی و بلوزێکی شیندا، لەوێ بوو. دکتۆر شوکاک وەک هەر پیاوێکی بێمێشک و گەمژە، بێ هیچ قسە و چەندوچونێک دەمودەست عەشق وەک شەیتان دەستی لێوەشاند. نا جوانترین ژنێک نەبوو تا ئەوکاتە دیبێتی، بەڵکو سەیرترین، ئاڵۆزترین، زیندووترینیان بوو. وەک زۆربەی کچان لەو تەمەنەدا هەم پاکی و هەم بەدمەوایی تێکەڵکردبوو، ئەوەی بە چاو دەیگووت جیاوازبوو لەوەی بە

زار دەیدرکاند. ڕەنگە هۆی سەرەکی عاشقبوونی ئەوە بێت، یەکەمین ڕستەیەک لە لێوی ئەو بیستی ئەوەبوو «ئوە خوایە، ڕقم لە هەموو دکتۆری دونیایە». دیاربوو دکتۆر جەلالی باوکی داخوازییەکی بۆ جێبەجێ نەکردوە. کە دکتۆر مستەفا شوکاک بە خۆی و بەروانە سپییەکەیەوە لە بەردەمیدا دەرکەوت و گوێی لەو ڕستەیە بوو، بە پێکەنینەوە گووتی «منیش .. منیش کچی باش؟». بەو چاوە مەکربازانەی خۆیەوە، چاوی خوماری کچێکی زۆر گەنج گووتی «تۆش، بەڵێ تۆش، بۆ تۆ چییت؟... ڕقم لە هەموو دکتۆرەکانی دونیایە، چونکە بەردەوام بۆنی دیتۆڵتان لێدێت». ئەو ڕستەیە بەشی ئەوە بوو دکتۆر عاشقی بێت. دەتوانم بڵێم کە دکتۆر یەکێک بوو لەو پیاوە بەدبەختانەی بە دەستی خۆی دەرگای دۆزەخی لە سەر خۆی کردەوە. لەو ساتەوە ئەو خولیایە کەوتە سەری چۆن ئەم خانمە هی ئەو بێت. چۆن وابکات بەر لەوەی گەورەتر بێت، بەرلەوەی هوشیاری زیاتر بکرێتەوە و بکەوێتە ناوەڕاستی گێژەنی ژیانەوە، بیبات بۆ خۆی.

دکتۆر لە گەنجییەکی زووەوە بەو جۆرە بیری لە هاوسەری خۆی دەکردەوە، پەرییەک هیچ چاوێک نەیبینیبێت، هیچ نیگایەکی بەد تەماشای نەکردبێت، هیچ دەستێک بەری نەکەوتبێت... فریشتەیەک ڕاستەوخۆ لە دەستی خوداوە بەرێتەوە دەستی ئەو. لەو ساتەدا کە خانمی ماردینی بینی، پێیوابوو ئەو یەکەم کەسە ئەم فریشتەیەی دیبێت و دەبێت بۆ ئەو بێت، لەوەشدا لە سەر هەق بوو. دکتۆر شوکاک یەکەم کەس بوو بەوجۆرە نەغەدە ماردینی ببینێت، وەک ژنێک. پێشتر هیچ پیاوێک بە چاوی ژن، بە چاوی خانمێکی ئەفسوناوی، سەیری ئەوی نەکردبوو. لێرەدا دەبێت ئەو ڕاستییە تۆماربکەین کە یەکەم پیاو کە خانمێک دەکاتە ژن، ئەو کەسە نییە کە لەگەڵیدا

دەخەوێت، ئەو کەسە نییە پەردەی کچێتی لادەبات و بارێکی سەخت و ناشیرینی لەکۆڵدەکاتەوە. نا بە پێچەوانەوە... ئەو کەسەیە کە یەکەمجار وێنەی ژنێکی راستەقینەی تێدا دەبینێت، وادەکات ئافرەتێک لە رێگای نیگاکانی ئەوەوە لە منداڵییەوە بەرەو ژنێتی بگوازێتەوە. ژنێتی تەنیا گەشەیەکی سروشتی و هۆرمۆنی نییە، بەڵکو جۆرە باوەڕێکی تایبەتییە، جۆرە ئیمانێکی ژنە بە جەستە و توانای خۆی، کە بەبێ نیگای پیاو نایەتەدی. نیگای پیاو ئەو پردەیە کە خانمان بەرەو جەستەی خۆیان بە سەریدا دەپەڕنەوە. هیچ لەشێک نابێتە لەشێکی ڕاستەقینە تا نەبێت بە جێگای ئارەزووی کەسێکی دی، تا یەکێکی دی وەک لەش دانی پێدا نەنێت. ئەوەی هەزاران ئافرەت لە سەر زەوی هەن کە تەنیا وەک رۆحی ڕووت دەسوڕێنەوە، نهێنییەکەی لەوەدایە کە هەمیشە چاوەڕوانی نیگایەکن وەک جەستە دانیان پێدا بنێت... داننان بە جەستەی ئافرەتدا داننانە بە بەشێکی گەورەی بوون و گەورەیی و مەزنی ئەودا. هەڵبەت کە ئافرەت بەس جەستە نییە، بەڵام بەس رۆحیش نییە، هەڵبەت هیچ یەکێک لە ئێمە بەس لەش نین، بەڵام هەمووشمان بەس دڵ و سۆز و هەستی دەرونکار نین. لەم زەمانەدا هێندەیان دووپاتکردۆتەوە کە ژن تەنیا جەستە نییە، نزیکە هەمووان ئەوە لە یادبکەن کە بەڵێ بەشێکی گرنگی هەموو مرۆڤێک جەستەیە. لێرەوە یەکەمین کەسێک کە کچێکی منداڵکار دەکات بە ژن، ئەو کەسەیە کە ئەو بڕوایەی تێدا سەوزدەکات کە ژنە، چونکە ژنێتی بەرلەوەی دۆخێکی بایۆلۆژی بێت، هەستێکی دەرونییە.

حەزی دکتۆر مستەفا شوکاک لە نەغەدە ماردینی، لە ساتی یەکەمەوە شێتانە بوو. ساڵانێک دواتر کە بیری لە هەموو شتێک دەکردەوە، هەڵەی خۆی لەوەدا دەبینی کە لێ نەگەڕاوە شەیدابوونی بە خانم بە سەر پردی دڵداریدا بپەڕێتەوە. ئەوکات دکتۆر، گەرچی تەمەنی لە سەروو

بیست و نۆ ساڵەوە بوو، ئەزموونێکی وەهای لەگەڵ جیهانی ئافرەتدا نەبوو، ئەو نیوەعەشقانەی پێشووتر شتێکی وەها گرنگیان دەربارەی دونیای ژنان فێرنەکردبوو. ساڵانی خوێندنی لە بەغداد، کچانی کۆلێژ زۆربەیان عەرەب بوون و نرخێکی ئەوتۆیان بۆ گەنجێکی کوردی وەک ئەو دانەدەنا، هەمووش بە چەشنێک لە ناو فێربوون و خوێندندا نوقمبوون کاتێکی ئەوتۆیان بۆ خۆشەویستی نەبوو... ئەو کات نەیدەزانی هەندێک ئافرەت گەر بە خۆشەویستی شوو نەکەن، مێردەکانیان گەر پاشای چین و ماچینیش بن، ئەوە دەبێتە گرێی گەورەی ژیانیان. ئەودەم ئەوەی نەدەزانی کە شوو نەکردن لە عەشقەوە، مانگ دوای مانگ و ساڵ دوای ساڵ لە هەناوی ئافرەتدا وەک ماکی نەخۆشییەکی ترسناک گەورەدەبێت... ئەوەی نەدەزانی ئەو ئافرەتانەی بە ئەزموونێک یان بە زیاد لە ئەزموونێکی خۆشەویستیدا نارۆن، دواتر گەر لە بەهەشتیشدا بن، زەجر و بەدبەختییەکی ئەبەدی دەچێژن.

دکتۆر مستەفا شوکاک بە جۆرێک پەلەی بوو بگات بە نەغەدە ماردینی، کاتێکی بە خۆی نەدا داوای پەیوەندییەکی عاشقانە بکات و بوار بە کچە منداڵکارەکە بدات خەونی پێوە ببینێت. هەفتەیەک دوای یەکەم بینینی، ئێوارەیەک دکتۆر جەلال ماردینی هەموو خێزانە رێکپۆش و پاکوتەمیزەکەی خۆی لە ناوەڕاستی ژووری میوانەکەدا کۆکردەوە و بە دەنگە گەورە و شادیبەخشەکەی، وەک هەواڵی سەرکەوتن لە جەنگێکی دووروودرێژدا ڕابگەیێنێت، ئەوەی ئاشکراکرد کە دکتۆر مستەفا شوکاک، زیرەکترین و نەجیبترین و جوانترین دکتۆری گەنج لە خەستەخانەکەدا داوای دەستی نەغەدەی کردوە. هەڵبەت هەموو پێیان وابوو ئەوە خۆشترین هەواڵی دونیایە، نەوا بە هەلهەلە و دایکی بە فرمێسک پێشوازیان لە هەواڵەکە کرد، بەڵام خودی نەغەدە هەم سەرسام و هەم کەمێکیش گێژ دەرکەوت، سەرەتا وادیاربوو وەک ئەوەی زۆر بێباک بێت، دواتر لە

ناوەڕاستی هەمووانـدا دەسـتی بـە گریانێکی بـە کـووڵ کـرد کـە بـە کـەس ژێـر نەدەبـووەوە.

نەغەدە ساڵەهای ساڵ ئەو شەوەی بیرنەچووەوە.

ئـەو شـەوەی تێـیدا بـۆ یەکەمجار هەسـتدەکەیت یەکێـک عاشـقی تۆیـە، لـەو شـەوە گرنگتـرە کـە تێـیدا بـۆ یەکەمجار لەگـەڵ کەسێکدا دەخەوێـت... نەغـەدە تـا بەیانـی خـەوی لـێ نەکـەوت، بێئـەوەی بـە تـەواوی بزانێـت بـۆ. ئـەوکات وردە وردە شـیعری دەخوێنـدەوە و دەنوسـی. لـەو کاتـەوەی ئاشـنای شـیعر بـوو، کەمتـر بایەخـی بـە کەسـانێک دەدا کـە لـە بـواری زانسـتدا ئیشـدەکەن. بـەڵام بـۆ نـا... دواجـار مسـتەفا شـوکاک دکتـۆرە... کەسێکە وەک باوکـی. ئەمیـش دەتوانێـت وەک دایکـی بـژی و بەختـەوەر بێـت. هیـچ بەهانەیەکی لـە بەردەسـتدا نەبـوو بتوانێـت دژی دکتـۆر بەکاریبهێنێـت. ئـەوە نەبێـت بۆنـی دەرمانـی لێدێـت و شـاعیر نییـە. بەهانەیەکـی پـوچ. دواجـار چەنـد پیـاو لـەم شارەدا شـاعیرن یـان شـاعیری ڕاسـتەقینەن، گـەرواش بـن چەندیـان شایسـتەی خۆشەویسـتین، گـەر واشـبن چەندیـان دەشـێت ژنیـان نەبێـت و ئامـادەی دڵـداری بـن، گـەر واش بێـت کـێ دەڵێـت عاشـقی ئـەو دەبـن. لـە راسـتیدا «وەک دایکـی بـە وردی بـۆی ڕوونکـردەوە» ئـەوەی مسـتەفا شـوکاک لـە چاوەڕوانـی شـاعیرێکدا قەبـووڵ نـەکات. وەک دواکەوتنی کڵاوێکـی دڕاوی بابـردو وایـە.

ئـەو ڕۆژە کـە نەغـەدە ماردینـی دوای بڵاوبوونـەوەی یەکـەم شـیعری چـوو بـۆ خەسـتەخانە، بـە درێژایـی ڕێگاکـە یـەک پرسـیار لـە خەیاڵیدا بـوو «کـوا خۆشەویسـتی لـە ژیانـی منـدا؟ کـوا ژیـان لـە ژیانـی منـدا؟ کـوا شـێتی لـە ژیانـی منـدا؟ کـوا ئـازادی لـە ژیانـی منـدا؟ بـا ژنـی دکتۆرێـک بـم، بـا ژنـی پادشـا بـم، گـەر نەژیـم مـن چیـم؟؟». هەسـتیکرد ئەوەتـەی شـیعر دەنوسـێت، ئازاتـر و شـێتانەتر بیـر لـە ژیـان دەکاتـەوە... ڕەنگـە هۆکـەی ئـەوە بێـت، زۆر بەکارهێنانـی زمـان ترسـمان لـە هەمـوو حەرامـەکان دەشـکێنێت. لـە

تاکسییەکەدا بەرەو لای دکتۆر بڕوای تەواوی هەبوو کە شیعر وادەکات لە هیچ نەترسێت. شیعر لە ناوەوە داوای ژیانێکی تری لێدەکرد، ژیانێکی گەرمتر و شێتانەتر و زیندووتر.

گەرچی مستەفا شوکاک ئەو کەسەبوو هەستی ژنێتی لە نەغەدەدا دروستکرد، ژنێکی ڕاستەقینە و دڵڕفێن، بەڵام پێدەچوو نەغەدە ئێستا هەموو شتێکی بیرچووبێتەوە. ئەو ڕۆژە شیعرە بڵاوکراوەکەی خۆی پیشانی دکتۆردا و پێیگووت «ئیتر واز لە شیعر ناهێنم». ئەو ویستی ماچیبکات و بڵێ «نا عومری من، واز لەشیعر مەهێنە، بۆ وازی لێدەهێنیت». بەڵام بەر لەوەی هیچ بکات، نەغەدە پێیگووت «دەمەوێت بە خەستەخانەکەدا بگەڕێم». لە مێژبوو دکتۆر پێیدەگووت ڕۆژێک بێت و بیمارستانەکە بە تەواوی ببینێت... لە نزیکەوە سەیری ئازاری مرۆڤەکان بکات. بەڵام نەغەدە ئارەزووی لە جۆرە کاری وەها نەبوو. ئەم سەردانە لە ناکاوەی لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا، بۆ دکتۆر سەیربوو. دەبوو ئەو دوو سەعاتی دی لە کۆبوونەوەیەکی گرنگی دکتۆرەکان بێت. بە پەلە دەستی نەغەدەی گرت و گووتی «عومری من، تەنیا دوو سەعاتم هەیە... تەنیا دوو سەعات، دەتەوێت پێکەوە بچین بۆ نان خواردن یان ئێرە ببینیت».

نەغەدە سوور بوو خەستەخانەکە ببینێت.

دەتوانم بڵێم ئەوە گەشتێکی گرنگی ژیانی بوو. وەک چۆن من یەکەمجار نزار ئیدریسم لە زینداندا بینی، ئەویش یەکەمجار نزار ئیدریسی نیوە مردوو لە سەر یەکێک لە تەختەکانی بیمارستان بینی. کوڕێکی گەنجی بێهۆش، خەڵتانی خوێن، زامدار... کەسێک لە نێوان مان و نەماندا جۆلانێیدەکرد.

بینینی نزار سەرەتایەکی تازە بوو لە ژیانی خانمی ماردینیدا.

# هۆشەنگی بولبولیار ڕوویەکی دیکەی دونیا دەدۆزێتەوە

دوای ماوەیەک لە یەکەمین کۆبوونەوەمان بۆ گەورەکردنی حیزب و شانەکانی لە غەمپاشا.. شەوێکی زۆر ئاسایی هۆشەنگی بولبولیار لە ماڵی خۆیان هاتەدەرێ. لە ڕاستیدا ماڵی هەژاران، هەرگیز ماڵی ڕاستەقینە نییە. ماڵ تەنیا چوار دیوار نییە، تەنیا سەقفێک نییە، بەڵکو جیهانێکە، ئەو شوێنەیە مرۆڤ خەونی تێدا دەبینێت، بریتییە لەو جێگایەی مرۆڤ لەوێوە بانگ لە ژیان دەکات و شێوەی پێدەبەخشێت. ماڵ تەنیا کاتێک دەبێتە ماڵ، مرۆڤ بتوانێت شتێک لە جوانی جیهانی بۆ ڕاکێشێت، نەهێڵێت ژوورەکان ببن بە داوی بێدەنگی خۆیانەوە، نەهێڵێت دیوارەکان لە گەردونی داببڕن، نیشتەجێی گۆشەگیری نەبێت، بەڵکو خاڵی بەیەکدادانی ژیانی ئێمە و دونیا بێت بە توندی و شێتانە لەگەڵ یەکدا. واتە مرۆڤی ماڵدار کەسێکە وادەکات، جۆگەیەک لە جۆگە سافەکانی ژیان بێت و بە نێو ژوورەکاندا بڕوات. من لە گەشتی دووروودرێژی ژیانمدا چەندەها ماڵم بینیوە... گەر مرۆڤ وریا بێت، هێندەی چووە ناو ماڵێکەوە، هێندەی سەیری دیکۆر و تابلۆ و شێوازی مۆبێل و سروشتی پەردەکانی کرد زۆر شت دەربارەی ڕۆحی مرۆڤەکان دەخوێنێتەوە، دەزانێت ئاخۆ بەختەوەرن یان نا، دەزانێت چۆن بیر لە جوانی و ژیان و خۆشبەختی دەکەنەوە. بەڵام ماڵی بولبولیار، ماڵی هەژاریی جۆرێکی ترە. ماڵی هەژاریی جێگایەکە مرۆڤ خۆی تێدا دەشارێتەوە، چاڵێکە دەچینە ناوی بۆ ئەوەی دونیا نەمانبینێت، جێگایەکی دابڕاوە لە گەردون... هیچ لە دەرەوە ڕووی تێناکات، پردێکی نییە بە جێگاکانی دییەوە ببەستێتەوە،

پنتێکی ڕەهای گۆشەگیرییە، بۆ ئەوە دروستبووە لەوێدا خۆمان ونبکەین و بۆشایی هەژاریی خۆمان لەو گەردونە دارا و پڕسامانە بشارینەوە. ماڵی هەژاریی نەبێت، هەموو ماڵەکانی دیکەی دونیا دژی بۆشایین، خاوەنماڵ لە شەڕێکی هەمیشەییدایە دژ بە خاڵی بوون و بەتاڵبوونەوەی ڕووبەرەکان، لە ڕەنجدایە شوێنەکان پێکرا بە هۆکار و کەرەستە پڕبکاتەوە. بەڵام ماڵی هەژاریی تەنیا بۆ ئەوەیە لەشی خەڵکی نەدار بشارێتەوە. بە پێچەوانەی ماڵی دەوڵەمەندەکانەوە کە دەکرێنە پیشانگا تا مرۆڤ هێز و دەسەڵاتی خۆی بە سەر دونیا و خەونەکانی خۆیدا نیشانبدات. ماڵی هۆشەنگی بولبولیار لەو ماڵانە بوو کە لە ڕاستیدا مرۆڤ دەتوانێت بە شوێنی مەشقکردن بۆ ناو گۆڕ ناویبنێت، ئەو شوێنەی مرۆڤ بەر لە مردن دەتوانێت بچێتە ناوی و لەوێوە خۆی بۆ جەهەنەم ئامادەبکات. تاکە شتێکی ڕاستەقینە کە هۆشەنگی بولبولیار هەیبوو هەژاریی بوو. پێتان سەیرنەبێت کە ئەو وەک سەرمایەیەکی گەورە لە هەژاریی دەڕوانی. ڕستەیەک لەو دەمەدا زۆر دووبارەیدەکردەوە ئەوەبوو «هیچ سەرمایەیەک لە هەژاریی گەورەتر نییە... هەڵەی گەورەی مارکس ئەوە بووە لە سەر سەرمایەی دەوڵەمەندەکان نوسیویێتی، لە کاتێکدا دەبایە لە سەر سەرمایەی هەژارەکان بنوسێت». لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ چەند شانازی بە هەژارییەوە بکات، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە هەژاریی شتێکە مرۆڤ بێزاردەکات و دەبێت زوو لە دەستی دەربازبێت. بەوەدا مرۆڤ هیچ کات لە ڕۆژدا ناتوانێت هەژاریی لە یاد خۆی بباتەوە، چونکە لە ڕۆژدا هەژاریی لە ژیانی مادیی و دەرونی کەسی هەژاردا وەها دیارە هیچ شتێک نایشارێتەوە، بۆ ئەوە ناچارە پەنا بۆ شەو بەرێت. لە شەودا تاریکی دەتوانێت هەژاریی داپۆشێت، لە ناو شتەکانی دیکەی دونیادا ونیبکات، لە تاریکیدا شاه و گەدا هەردووکیان ڕەشن... لە بەرئەوە گەرچی هۆکانمان جودا بێت، بەڵام هۆشەنگی بولبولیاریش وەک من حەزی لە تاریکی بوو.

ئەویی شەو کە بولبولیار ڕۆیشتە دەرێ، کارێکی دیاریکراوی نەبوو، بەڵام حەزیدەکرد بڕوات و کەمێک خۆی بە تاریکی بشوات. بە کوچەی غەمپاشادا سەرکەوت. مرۆڤ بە ڕۆژ لە غەمپاشادا دەموچاوە دڕندەکەی هەژاریی بە ئاسانی دەبینێت، غەمپاشا لای هۆشەنگ کارخانەی هەرە گەورەی هەژاریی بوو، منداڵی ترسنۆک و چەقۆکێشی بێڕەحم و پیاوی نائومێد و ژنانی نەخۆشی بەرهەمدەهێنا. بەڵام ئەو شەوە زۆر نەبوو لە ماڵ چووبووە دەرێ کە لە سەر سوچی یەکێک لە کوچەکاندا تارمایی کەسێکی باڵابەرزی بینی، عەرەبانەیەکی دەستی گەورەی داوەتە پێش خۆی و پاڵی پێوەدەنێت. وەک دەنگێک لە ناوەوە بانگیبکات، بولبولیار دوای سێبەری ئەو پیاوە کەوت، تارماییەکە هێمن دەڕۆیشت، پێدەچوو هەموو ژیانی تەنیا پاڵی بە عەرەبانەوە نابێت، ئەوەی ئاسایی نەبوو قەوارەی عەرەبانەکە بوو. سەرەتا بولبولیار دوور بە دوور سەیریکرد. کابرای بازۆدەر کەسێکی بە سەبربوو، هەنگاوەکانی هەڵپە و خێراییان پێوە دیارنەبوو، تەنیا بە یەک ڕیتم عەرەبانەکەی بازۆدەدا... هۆشەنگ پێشتر نە لە تاریکی و نە لە ڕوناکیدا ئاوها دوای هیچ کەس نەکەوتبوو، هەرکات پیاسەی ناو تاریکی بکردایە، تەنیا بیری لە خۆی دەکردەوە، ئێستا قوتابی زانکۆ بوو، تاکە شتێک تا ئەو تەمەنە لە ژیانیدا دەستی پێیدا گەیشتبوو، تاکە سەرمایەیەک کۆیکردبووەوە هەژاریی بوو. ئەویش دوو شتی گەورەی پێبەخشیبوو ئازادی و نائومێدی. لەوکاتەوەی شۆڕش هەرەسیهێنا و سەدان هەزار چەکداری کورد دەستبەرداری تفەنگ بوون، ئەمیش وەک زۆربەی گەنجی دیکەی ئەو سەردەمە لە خەیاڵی هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی تازەدا بوو. بۆ نا... کە کوردپەروەرەکان و شیوعییەکان خیانەتیانکرد، دەبێت یەکێکی دی لە شوێنێکی ترەوە دەست پێبکاتەوە. بەڵام دواجار کێ دوای هۆشەنگی بولبولیار دەکەوێت، ئەو کێیە؟ لە دوو مانگ لەوەوبەرەوە لەگەڵ بازنەیەکی بچوکی کوڕانی

غەمپاشادا، کە هەندێکیان وەک خۆی قوتابی زانکۆ بوون، گروپێکیان بە ناوی منداڵانی غەمپاشاوە دروستکردوە، ئەوە ناوی هەمان ئەو تیپی فوتبۆڵەیە کە بە منداڵی هەموو یاریان لە ناودا دەکرد، بەڵام ئێستا لە مێژە کەسیان یاری ناکات، گروپەکەیان تایبەتە بە خوێندنەوەی ئەدەبیاتی سیاسی و فەلسەفی. زۆربەیان کوڕی بێپارە و نەدارن کە ئاسان کتێبیان چنگ ناکەوێت. بەڵام لە گروپەکەدا کارێکدەکەن، کتێب بسوڕێت و یەک ئەویدی لە ناوەڕۆکەکەی ئاگاداریکەنەوە. هەموو گەنجانێکن هەستدەکەن لە پەراوێزی دونیادا دەژین، کەسانێکی بێپاشەڕۆژن، خرۆشێکی گەورەیان بۆ وێرانکردنی ئەم جیهانە ترسناکە تێدایە، بیرۆکەی یەکسانی و دەسەڵاتی هەژاران، ئەفسونێکی گەورەی لە سەر تەواوی فەنتازیاکانیان هەیە. هەموو هەستدەکەن فڕێدراونەتە دەرەوەی دونیا... هەموو دونیا... بەڵام بولبولیار لەگەڵ ئەو هەستەدا تا ئەوپەڕی ڕۆیشتووە. بەر لە چەند ڕۆژێک، لە دانیشتنێکی ئەو هاوڕێیانەدا کە لە ژوورە خاڵی و ڕووتەکەی ئازاد بەهجەتدا ڕوویدا، کاتێک باس گەیشتە وەسفکردنی هەژاران وەک چینێک، بولبولیار بەو چاوانەوە کە هەمیشە سەیری شتێکی دوور دەکەن، بەو ڕیشە تەنکەوە کە ڕوخساری زیندانییەکی ئەبەدیی پێبەخشیوە، گووتی «هەژاران؟ شتێک نییە ناوی هەژاران بێت، وەسفکردنی هەژاران وەک چینێکی کۆمەڵایەتی، هیچ نییە جگە لە هەڵەیەکی گەورە. ئەوەی لە سەر زەوی هەیە، مرۆڤی هەژارە، هەر کەسە و هەژاریی خۆی بە جۆری تایبەتی خۆی دەژی. ئەزموونی هیچ هەژارێک لە ئەزموونی هەژارێکی تر ناچێت... ئەم ئەزموونانە هیچ کات کۆنابنەوە بۆ ئەوەی پێکڕا هەستێکی چینایەتی سفت و سۆڵ بخولقێنن. لە ئێوە وایە هەموو ئەوانەی برسین، وەک یەک هەستی برسێتی دەژین، هەموویان هەمان ئازاریان هەیە، وەک یەک بیر لە خواردن دەکەنەوە، وەک یەک بیر لە خوانی ڕازاوە دەکەنەوە؟. هەژاریی شتێکی ترە، جیاوازە لە برسێتی، جیاوازە لە

نەبوونی. ئەوەی لە هەژاریدا گرنگە، ئەوەیە دەمانخاتە دەرەوەی ئەم جیهانە، فڕێماندەداتە دەرەوەی هەموو ئینتیمایەک... ئەوانەی هەژاریی وەک کەرەستەیەکی سیاسی ڕووت بەکاردەهێنن، ئەوە منداڵی بۆرژواکانن».
هۆشەنگی بولبولیار بڕوای وابوو، تاکە هەستێکی ڕاستەقینە کە هاوشانی هەژارییە، تەنهاییە. تەنها شتێک کە هەرگیز لە هەژاریی جیانابێتەوە و بۆ ئەبەد پێکەوەلکاون تەنهاییە، تەنهاییەکی ڕاستەقینە. مرۆڤی هەژار هەمیشە تەنهایە... تەنهایی ئەوەی هەموو شتێکی ئەم سەر زەمینە لە تۆ دوورە و تۆ لە هەموو شتێک دووریت. مرۆڤ تا خۆی بە هەژاریی تەواوەتیدا تێنەپەڕێت ناتوانێت ئەو پەیوەندییە قووڵەی نێوان هەژاریی و تەنهایی بدۆزێتەوە. ئەو پەخشان و شیعرانەی منداڵی بۆرژواکان لە سەر هەژاریی دەیهۆننەوە، لە سەر چینێک دەتوانێت مێژوو بگۆڕێت، هیچ نین جگە لە خەیاڵاتی کەسانێک کە هیچ دەربارەی هەژاریی ڕاستەقینە نازانن، هەتا مارکسیش هەژاریی تەنیا وەک دۆخێکی مادیی ڕووت و بەرامبەر بوون و نەبوونی بەرهەم و سەرمایە ڕاگرتووە، کە لای بولبولیار بۆچوونێکی گەمژانەیە و بازدانێکی گەورەیە بە سەر ڕۆحی ڕاستەقینەی هەژاریدا... ئەو شەوە پڕ بە سینەی هەوای هەڵمژی و خۆشحاڵ بوو یەکێکە لە هەژارترین هەژارەکانی دونیا.

چەند ساڵێک دواتر کە چیرۆکی ئەو شەوەی بۆ من گێڕایەوە، گووتی «هەژاریی زۆر شتت پێشکەشدەکات، کە هیچ ئادەمیزادێکی دیکە نایبینێت. مرۆڤ کە خاوەنی هیچ شتێکی ئەم دونیایە نەبوو، دەرگای هەندێ دونیای تری لێدەکرێتەوە، جێگای تر و بوونەوەری تر دەبینێت کە کەسانی دی نایانبینن».

کە بولبولیار لە بازۆدەری عەرەبانە دەستییەکە نزیکبووەوە، کەسێکی کەتە و بە هەیبەتی بینی، ڕیشێکی پڕی هەبوو، ڕوخسارێکی گرد و جووتێک چاوی گەش کە تاریکی شەو نەیدەتوانی ڕوناکییەکی نهێنی

ناو گلێنەکانی خامۆشبکات. بولبولیاری هاوڕێمان سڵاوێکی لەو پیاوە بازۆدەرە کرد و پێیگووت «شەوباش». کەسێکی درێژ و بەقەڵافەتتر بوو لەوەی لە دوورەوە دەینواند، لەشێکی ڕێک و جوانی هەبوو، قژێکی کورت و سیمایەکی هێمن. گەورەیی عەرەبانەکەی بۆ بولبولیار سەیربوو، ئەو پێشتر عەرەبانەیەکی دەستی وەها گەورەی نەبینیبوو. پیاوەکە بێئەوەی وەڵامی بولبولیار بداتەوە، گووتی «کوڕم چیت ونکردوە... لە تاریکیدا بەدوای چیدا دەگەڕێیت، شەوی وەها هێمن هی ئەوەیە مرۆڤ لە ژوورەکەی خۆیدا بیر لەو شتانە بکاتەوە کە لە کاتی تردا ناتوانێت یان کاتی نییە بیریان لێبکاتەوە». بولبولیار گووتی «هیچ شتێکم ون نەکردوە... تەنیا کەمێک پیاسەدەکەم». پیاوەکە بە هێمنی پێکەنی و گووتی «ناوت چییە؟» « هۆشەنگ... هۆشەنگی بولبولیار» دەنگی لەوە ئارامتر بوو شەو بشڵەقێنێت. لەگەڵ گووتنی ناوی خۆیدا هەستی بە هەوایەکی فێنک کرد، بە سەرسامییەوە سەیری عەرەبانەکەی کرد و گووتی «ئەوەی سەیرە عەرەبانەکەتە، ئەم عەرەبانە گەورەیە». پیاوەکە گووتی «تەنیا من دەتوانم پاڵی پێوەبنێم... تەنیا من... هیچ مرۆڤێک ناتوانێت ئەم عەرەبانەیە بجوڵێنێت، مرۆڤ دەبێت بە ڕەوتێکی دوور و درێژدا تێپەڕێت تا وای لێدێت، تا هێزی ئەوەی دەبێت، ئەم عەرەبانەیە لە جێگای خۆی بجوڵێنێت». هۆشەنگی بولبولیار سەیری سێ چەرخەکەی کرد و گووتی «دەتوانم هەوڵبدەم پاڵی پێوەنێم، بەڵکو بیجوڵێنم». پیاوەکە گووتی «هەوڵبدە... هەوڵبدە... بەڵام بێسوودە». بولبولیار نیشتە سەر عەرەبانەکە و ویستی بیجوڵێنێت، بەڵام بۆی نەکرا، وەک هێزێکی نادیار و گەورە بەزەوییەوە گرێیدابێت، چەرخەکان لە شوێنی خۆیان نەجوڵان و نەسوڕان، بەڵام هێندەی پیاوە باڵابەرزەکە دەستێکی بچوکی لێدا، عەرەبانەکە دووبارە کەوتەوە جوڵە. هۆشەنگی بولبولیار بێئەوەی تێبگات لە هەموو لاکانەوە سەیری عەرەبانەکەی کرد و شتێکی

تایبەتی تێدا نەدۆزییەوە، هیچ نەبوو جگە لە عەرەبانەیەکی شینی گەورە. هۆشەنگ پرسی «ئەوە چۆن دەبێت، چ نهێنییەک لە پشتی ئەم ئامێرەیە، چ شتێکی لێدەکەیت بەوجۆرە دەوەستێت و ناجوڵێت». پیاوەکە پێکەنی و گووتی «لە هێزی تۆدا نییە بیجوڵێنێت... لە هێزی هیچ مرۆڤێکدا نییە». بولبولیار بە غەمێکی قووڵەوە سەیریکرد و لێیپرسی «ئەی تۆ کێیت؟ تۆ مرۆڤ نیت؟». پیاوەکە بە دەنگێکی بەرز وەڵامیدایەوە «من مەهدائیلم، مەهدائیلی فریشتە». وای گووت و جووتێک باڵی زۆر گەورەی لە پشتی خۆیەوە کردەوە، جووتێک باڵی خۆڵەمێشی زۆر گەورە کە شەقەی لێکترازان و کرانەوەیان بێدەنگی شەوی شکاند. بولبولیار ماوەیەک قسەی بۆ نەکرا، تەنیا سەیری ئەو باڵە زۆر گەورانەی فریشتەکەی کرد، پێشتر فریشتەی بە جۆرێکی تر هێنابووە پێشچاوی خۆی، وەک خانمێک کە دەستێک جلی سپی لەبەردایە و شەبەنگێکی گەورەی تیشک لە دەوریتی. بەڵام ئەم پیاوە گەورەیە، بە خۆی و ئەم سەر و ڕیشەوە، بەم چاوە گەورانەوە.. هیچی لە فریشتە نەدەچوو.

لە ڕاستیدا هۆشەنگی بولبولیار پێشتر زۆر بیری لە فریشتە نەکردبووەوە، گەر بیریشی لێکردبێتەوە، وەک بوونەوەرێکی فەنتازی بینیوێتی کە دەستکردی خەیاڵی مرۆڤە. هەرکەس بڕوای بە خودا نەبوو، باوەڕی بە فریشتەش نابێت، بولبولیاریش باوەڕی بە خودا نەبوو. لەو ساتەدا سەختبوو هەم بڕوا بە خودا بهێنێت و بە فریشتەش، پێیوابوو ئەوەی دەیبینێت، وڕێنەی ساتێکی بێهۆشییە و هیچی تر.

ئەوکات هەردووکیان لە ناوەڕاستی شەقامێکی باکووری شاردا، لە شوێنێک لە غەمپاشاوە زۆر دوور نەبوو، وەستابوون. بولبولیار گەرچی دیمەنەکە لە ناوەوە هەژاندبووی، گەرچی دەیویست باوەڕ بە چاوی خۆی نەکات، بەڵام وەک هەمیشە سارد دەرکەوت و گووتی «من باوەڕم

بە فریشتە نییە». مەهدائیل گووتی «پێویستت بەوە نییە باوەڕت بە فریشتە بێت تا من ببینیت... لە کاتی ئاساییدا من کەسێکی ئاساییم وەک تۆ». بولبولیار کە چاوانی تەواو کرابوونەوە و سەیری باڵە گەورەکانی مەهدائیلی دەکرد، گووتی «باڵەکانت گەورەن، لەگەڵ ئەوەشدا باوەڕت پێ ناکەم... شتێک نییە ناوی فریشتە بێت. لەوانەیە تۆ سیحرباز یان هەر شتێکی تر بیت». مەهدائیل گووتی «من لە بەردەمتدام، مرۆڤ هەموو ڕۆژێک ناتوانێت فریشتەیەک ببینێت، ئەوەی کە تۆ ئەم شەو من دەبینی، پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە، هەموو کەسێک ناتوانێت من ببینێت». مەهدائیل بە کاوەخۆ باڵەکانی خۆی کۆکردەوە و گووتی «ئەم عەرەبانەیەش عەرەبانەی فریشتەکانە». هۆشەنگی بولبولیار گووتی «بەڵام کاری ئەم عەرەبانەیە چییە. تۆ بەم سێ چەرخەیە چیدەکەیت، لە شەوێکی وەهادا فریشتەیەکی وەک تۆ عەرەبانەیەکی وەهای بۆچییە؟... هەر ئەوە خۆی نیشانەیە کە تۆ فریشتە نیت». مەهدائیل ئێستا گەڕابووەوە قەوارەی جارانی خۆی و بە ئارامی دەستی بە ڕیشیدا هێنا و دەستی برد و جگەرەیەکی دەرهێنا و بە هۆشەنگی بولبولیاری گووت «جگەرە ناکێشیت؟». بولبولیار سەری لەقاند و گووتی «نا جگەرە ناکێشم». بە هێمنی جگەرەکەی داگیرساند و گووتی «چەند وەختە دەمەوێت وازی لێبهێنم، بەڵام ناتوانم». بولبولیار بە سەرسامییەوە گووتی «چۆن فریشتەیەکیت جگەرە دەکێشیت و ناشتوانیت وازی لێبهێنیت... گەر فریشتەش بیت، کە باوەڕم بە شتی وەها نییە، فریشتەیەکی بەدیت، فریشتەیەکی لێکەوتەیت». مەهدائیل مژێکی قووڵی لە جگەرەکەیدا و گووتی «نازانم، ناتوانم حوکمی وەها بدەم، بەڵام بارودۆخی تەندروستیم بە هۆی جگەرەکێشانەوە زۆر باش نییە... لەوەدا هەق بە تۆیە». هۆشەنگی بولبولیار گووتی «تۆ فریشتەیەکی بەدیت... زۆر بەدیت، ئەگینا تائەمرۆ فریشتەی جگەرەکێشم

نەبیستووە». مەهدائیل گوتی «زۆر بیر لەوە مەکەرەوە، ئەوەیان شتێکی دیکەیە... هەندێ شەو مەستیش دەبم، شەرابیش دەخۆمەوە، چاوەڕوانی چی لە فریشتەیەکی تەنهای وەک من دەکەیت. من هەم کار و هەم ئازار و هەم بەرپرسیارێتیم زۆرە... هەندێجار بێ جگەرە و شەراب ناتوانم درێژە بە ژیانی خۆم بدەم... هیچ شتێک لەوە سەختتر نییە، مرۆڤ لە شارێکی وەهادا فریشتە بێت. بەڵام بۆ ئەوەی بتوانم پێتبڵێم ئەم عەرەبانەیەم بۆچییە، دەبێت چەندجارێکی تر یەک ببینین... من ناتوانم بڕوا بە یەکێک بکەم کە یەکەمجار دەیبینم. مرۆڤ دەبێت بە درێژایی ژیانی هێزی بینینی فریشتەی تێدابێت، ئەوسا دەتوانم نهێنییەکەی لا بدرکێنم... کێ دەڵێت ئەمە دواهەمین یەکبینینی نێوان من و تۆ نییە. گەر دواهەمین یەکبینینمان بێت، تۆ دەڕۆیت و نهێنی بینینی من لە ناخی خۆتدا دەخنکێنیت و دەڵێیت چیرۆکی ئەو شەوەم جگە لە وڕێنەیەکی بێمانا هیچی تر نەبووە... بۆ ئەوەی باوەڕ بە فریشتە بهێنیت، دەبێت بە درێژایی ژیانت هێزی بینینی فریشتەت هەبێت، ئەوە یاساکەیەتی... دەبێت مەلەکبین بیت». هۆشەنگی بولبولیار بە سەرسامییەوە گوتی «بەڵام چ کارێکم بە فریشتە هەیە. بۆ دەبێت بیانبینم؟ من هیچ کارێکم بە فریشتان نییە تا بمەوێت بیانبینم». بولبولیار تا ئەوکات وایدەزانی دەستخەڕۆی گەمەیەکی درێوە و ئێستا نا تۆزێکی دی شتێک ڕوودەدات سروشتی ئەم گاڵتە ناخۆش و ناشیرینە ئاشکرادەبێت. بەڵام مەهدائیلی فریشتە گوتی «نا هەموو مرۆڤێک ناتوانێت فریشتە ببینێت، بەڵام گەر هات و یەکێک فریشتەیەکی بینی، بۆ ئەوەیە باوەڕبهێنێت کە فریشتە هەیە. گرنگە بۆ مرۆڤ بزانێت فریشتە هەیە، گەر تۆ هەموو ژیانت لە سەر ئەو هەڵەیە بەردەوام بیت کە پێتوابێت فریشتە نییە، لەوانەیە ژیانت ڕەوتێکی دی وەربگرێت... بەڕێگایەکدا بڕۆیت کە نابێت پێیدا بڕۆیت». بولبولیار بە کەمێ تێڕامانەوە گوتی «بەڵام فریشتە دەتوانێت

چیم بۆ بکات... ها عەزیزم، دەتوانێت یارمەتیمبدات دەوڵەمەند بم یان لە تاقیکردنەوەدا دەرچم؟... یان چی». مەهدائیلی فریشتە بۆ یەکەمجار بە دەنگێکی بەرز پێکەنی و گووتی «قسەی بێمانا... قسەی بێمانا... تۆ دەڵێیت چی؟ ئەو شتانە دوور و نزیک پەیوەندییان بە فریشتەوە نییە، هیچ فریشتەیەک ناتوانێت کاری وەها بکات... بڕۆ هاوڕێم، پێ هەڵبگرە، گەر بتەوێت دەتوانیت کەمێک لەگەڵمدا بڕۆیت. من کارم هەیە و دەبێت کەمێکی تر ماڵاواییت لێبکەم». مەهدائیل وای گووت و بە ئارامی عەرەبانە گەورەکەی خۆی بەرەو پێش بازۆدا. هێندەی ئەو دەستی لە عەرەبانەکە دا، تایەکانی بە ئاسانی چەرخان. هۆشەنگی بولبولیار بە سەرسامییەوە سەیری جوڵەی عەرەبانەکەی کرد و گووتی «بەڵام تۆ بۆ لە فریشتە ناچیت... بۆ لە فریشتە ناچیت؟. من فریشتەیەکم نەدیوە وەک تۆ ڕیشن بێت، جلی ئاسایی لە بەردا بێت، هەموو گیانی تەپوتۆز بێت، پێڵاوێکی لاستیکی لە پێدا بێت... هەموو ئەو شتانە بەشی ئەوەدەکەن من گومانێکی قووڵم لەوە هەبێت کە تۆ فریشتەیت. باڵ بە تەنها بەس نییە، من دڵنیام باڵ بە تەنها بەس نییە تا دڵنیابم تۆ فریشتەیت، دەشێت تۆ هەر شتێکی تر بیت... جانەوەرێک بیت... من بیستوومە هەتا ئەژدیهای باڵداریش هەیە». مەهدائیلی فریشتە مژێکی قووڵی لە جگەرەکەیدا و بە خەفەتێکەوە سەیریکرد و گووتی «من توانایەکی ئەوتۆ ناوازەم نییە بیسەلمێنم فریشتەم... بە گشتی منیش کارێکی ئەوتۆم بەوە نییە کە شتی وا بسەلمێنم. لە دواجاردا هەموو مرۆڤێک ئازادە باوەڕ بە بوونی فریشتە دەکات یان نا. ئەوە دەکەوێتە سەر باوەڕی ئینسان خۆی، گەر باوەڕت بە بوونی فریشتە هەبێت دەیبینیت، گەر نا.. تۆ ئازادیت. دەتوانیت نەتبێت». هۆشەنگی بولبولیار گووتی «بەڵام ئاغای مەهدائیل، کاک مەهدائیل، تۆ لە مەخلوقێکی سەر زەمینی دەچیت... تۆ هیچت لە فریشتە ناچێت». مەهدائیل بە هێمنی عەرەبانەکەی پاڵنا

و گووتی «لەوەشدا لە سەر هەقی، من کەسێکی سەرزەمینیم... سەیری ئەو باڵانەم مەکە. من هەرگیز لە زەوی بەرزنەبوومەتەوە». جارێکی تر لە ناکاو باڵە گەورەکانی کردەوە و گووتی «سەیرکە، هۆشەنگی بولبولیار. سەیری ئەو باڵە گەورانەم بکە، هیچ باڵندەیەک باڵی وەهای نییە... بەڵام من هیچ کات نەفڕیووم... باڵەکانم باڵی فڕین نین، تەنیا نیشانەیەکە بۆ ئەوەی لەگەڵ فریشتەکانی تردا یەکتر بناسینەوە. گەر باڵەکانم نەکەمەوە هیچ فریشتەیەکی تر باوەڕم پێناکات».

هۆشەنگی بولبولیار کە کەوتبووە دوودڵییەکی سەیرەوە، بە سەرسامییەوە پرسی «فریشتەکان هەموو لە مەلەکوتەوە دێن. گەر هەبن لە مەلەکوتەوە دێن، گەر نەشبن ئەوا هیچ. لە هیچ جێگایەکەوە نایەن. گەر تۆ لە ئاسمانەوە نەهاتبیت، ناکرێت فریشتە بیت». مەهدائیل گووتی «من لەو فریشتانەم کە لە سەر زەوی لەدایک دەبن... قەت ئاسمانم نەبینیوە... هیچ کات، تۆ چەند دەتوانیت بفڕیت منیش هەر ئەوەندە، هیچ خەبەرێکم لە ئاسمان نییە». هۆشەنگی بولبولیار پرسی «ئێستا دەچیت بۆ کوێ؟». مەهدائیل گووتی «ئیشەکەم تا ئەندازەیەکی زۆر نهێنییە. ئەو مرۆڤانەی هێشتا متمانەی تەواویان نییە، بۆیان نییە بیزانن. لە بەرئەوە بمبورە کە ناتوانم کار و وەزیفەی خۆمت بۆ ئاشکرابکەم. بە گشتی ئەوەی من دەبینیت، نیشانەی هەبوونی ڕۆحێکی پاکە لە تۆدا، گەرچی یەکتر بینینمان بە دەست خۆمان نییە، واتە دەبێت هەموو شتەکان جێبهێڵین بۆ ڕێکەوت، بەڵام هیوادارم لە بیرم نەکەیت».

هۆشەنگی بولبولیار گووتی « نازانم بڵێم چی .. من لە هەموو شتێک بە گومانم، خۆم کەسێکی نائومێدم، لە بەرئەوە گەر یەکتر نەبینینەوە، ناتوانم باوەڕ بە شەوی وەها بکەم». مەهدائیلی فریشتە دەستی بۆ هاوڕێکەمان ڕاکێشا و گووتی «هەق بە تۆیە هاوڕێم... گەر ڕێکەوتی من یان فریشتەیەکی تر نەکەیتەوە، ئەمشەوە لە بیرکە. بینینی

فریشتەیەکی پیری وەک من بە تەنیا بەس نییە، تا مرۆڤ بۆچوونی خۆی دەربارەی دونیا بگۆڕێت». بولبولیار دەستی درێژکرد و تەوقەیەکی گەورەی لەگەڵ مەهدائیلی فریشتەدا کرد.

ئەوە یەکەمجاری بوو لە ژیانیدا تەوقە لەگەڵ فریشتەیەکدا بکات.

## لیڤیتانت لە شار

کە لیڤیتانت عومەر بۆتانی، زیندانی پسامانی بەجێهێشت، بێئەوەی بیر لە هیچ شتێک بکاتەوە، خۆی تەسلیمی یەکێک لە یەکە سەربازییەکانی سوپاکرد و گەڕایەوە بۆ شار. دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ، وەک پیاوێکی ماندوو، گەیشتە ماڵی خوشکەکەی. تایەکی بەرزی هەبوو، بە جۆرێکی سەیر ڕەش داگەڕابوو، ئازارێکی نادیار چەماندبوویەوە، وەک کەسێکی نەخۆش لە دەرگای ماڵی خوشکەکەیدا، بە ئەستەم دەیتوانی بەپێوە خۆی بگرێت، یەکەم ڕستەی ئەوەبوو «جێگایەکم بۆ داخەن، شتێکی تەنکم پێدادەن و لێمگەڕێن بخەوم» . تا ساڵانێک دواتر خوشکەکەی ئەو دیمەنەی لیڤیتانتی لە یادنەکرد، کوڕێکی نەخۆش کە شەو تا بەیانی بەدەم وڕێنەوە شتگەلێک دەبزرکێنێت ئەو لە هیچیان تێناگات. لیڤیتانت سێ هەفتە لە پێخەفی خوشکەکەیدا کەوت، ئەو ساتانەی هەڵدەستا مەزاجێکی تووڕەی هەبوو... گەرچی زیاد لە چوار ساڵ بوو خوشکەکەی و منداڵەکانی نەبینیبوون، بەڵام «مەهتاب» لە سەعاتی یەکەمەوە هەستیکرد براکەی دڵڕەقتر لە جاران گەڕاوەتەوە و لە بارودۆخێکی دەروونی دژواردا دەژی. مەیلێکی توندی بۆ شکاندنی شت و هاوارکردن تێدابوو. هەر لە ڕۆژی یەکەمەوە لە پێشچاوی خوشکەزاکانیدا وەک کەسێکی ترسناک دەرکەوت، کاتێک بانگیدەکردن دەبوو دەمودەست

وەک بەندە بگەنە بەردەمی، هەر ئیشێکی پێدەکردن دەبوو دەمودەست بکرێت. بینینی لیڤیتانت بەوجۆرە دڵی خوشکەکەی ترساند، ڕاستە ئەو هەر بێڕەحم بووە، بەڵام ئێستا تورەیی و بەدهەوایی لە کێشدا نەماوە. لە ڕۆژی یەکەمەوە قەرەوێڵەیەکی تایبەتی لە ژوورێکی تایبەتی بۆ جیاکردەوە و چەرچەفێکی سپی پاکی بە سەردا دا. بەڵام لیڤیتانت هێندەی ئەو بەرگ و سەرنوێنە سپیانەی بینی، وەک تووشی دۆخێکی هیستیری بووبێت شێتانە هەموویانی داماڵی و توریدان و پارەی فرێدا تا سەرنوێنی ڕەشی بۆ بێنن. لە هەفتەی یەکەمەوە لیڤیتانت ماڵی خوشکە بێوەژنەکەی پڕکرد لە شتی ڕەش... پەردەی ژوورەکان، متیلەکان، بیجامەکەی، گوڵدانەکان، جلە کوردییەکانی، قایشی سەعاتەکەی، تەزبێحەکەی... هەمووی ڕەش بوون. خوشکەزاکانی یەکەم کەس بوون کە ناویان نا «لیڤیتانتی ڕەش». بەپێی ساڵان گەلێک ناوی دیکەی بۆ دروستبوو «ڕەشمارا» «هۆمەرە ڕەش» «ڕەژوو». لەوانە ڕەشمارا لە هەموویان پتر بڵاودەبێتەوە و دەچێتە سەر زاری خەڵک.

لە هەفتەی یەکەمەوە ئاشکرابوو لیڤیتانت کەسێکی سروشتی نییە. تورەبوونەکانی لە تورەبوونی مرۆڤی ئاسایی توندتربوون، هەندێجاریش بوغزێکی نادیار بەر گەرووی دەگرت، ڕەش دادەگەڕا، چاوانی ئاگرێکی نهێنیان تێدەزا، نەرمە عارەقێکیش بە نێوچاوانیدا دەهاتەخوارێ. هەر کاتێکیش دەنوست لە سەر دەنگی هاواری خۆی ڕادەچڵەکی. هەموو هەوڵەکانی خوشکی بۆ ئەوەی لێی نزیکبێتەوە و شتێک لە هۆی ئەم دۆخە دژوارەی تێبگات بێسوودبوون، بەڵام بەوەدا «مەهتاب» براکەی زۆر خۆشدەویست، دوای نەمانی دایک و بابی و مێردەکەی ئەو تەنها کەسی بوو لە دونیادا، منداڵەکانی خستە ژێر ئەو خواستەی ڕێزێکی تایبەت لە خاڵیان بگرن و شتێک نەکەن نیشانەی ملکەچی و ڕەزامەندی نەبێت.

لەو ڕۆژەوە لیڤیتانت کەشێکی سەربازی سەختی لە ماڵەکەدا پیادەکرد،

کە قوربانی سەرەکی تێیدا «ڕۆژبا»ـی کوڕە گەورەی ماڵ بوو، کە تا ئەودەم خۆی تاکە شۆڕەسواری خێزان و خانەوادە بوو. ئەو دەم تەمەنی شازدە ساڵان بوو، هاتنی لیڤیتانت بۆ ئەو کارەساتێکی گەورەبوو، سەر لەبەر ژیانی لێتێکدا. لیڤیتانت نزیکی سێ هەفتە بە دەست ئەو نەخۆشییەوە دەیناڵاند، تایەکی سەختی لێدەهات، عارەقەیەکی ڕەشی دەردەدا، دەکەوتە وڕێنەکردن، بە دەنگی بەرز دەربارەی شتگەلێک دەدوا کە هیچ شفرەبازێک نەیدەتوانی بیانخاتە سەر ڕیزبەندییەکی ئاسایی و وەریانبگێڕێتە سەر زمانێکی ڕوون، کاتێکیش بە ئاگا دەهاتەوە، توندتر لە جاران ڕەفتاریدەکرد و خوشکەزاکانی زیاتر ئازاردەدا. لەدوای هەفتەی یەکەمەوە هەر سێ خوشکەزاکەی تێگەیشتن سزادان، لێدان، ڕیسواکردن، توڕەبوون، خاڵیبوون لە سۆز ئەوە سیفەتە سەرەکییەکانی ئەم میوانە تازەیەیە کە دایکیان پێیدەڵێت «خاڵە عومەر». مەهتابی خوشکی کە فەرمانبەرێکی بچوک بوو لە بەڕێوەبەرایەتی عەقارات، دەیزانی براکەی چەند ساڵە لە شۆڕشدا بەرپرسی زیندان بووە، مێژوویەکی درێژی لەگەڵ دیل و بەندیاندا هەیە، بەڵام ئەوەی گەیشتبێتە ئەو ئاستەی پێکرا ئادەمیزادەکانی نزیکی وەک کۆیلە مامەڵەبکات، نەدەچووە عەقڵەوە. بەڵام لە هەموو حاڵێکدا، عومەری برای دواهەمین کەسی خانەوادە و تەنها پشت و پەنایەتی لەم دونیایەدا و دەبێت بیپارێزێت. سێ هەفتەی یەکەم کە تێیدا نەخۆش بوو، گەرمای ئابیش مرۆڤی شێتدەکرد، گەلێک بەسەختی تێپەڕین. لە هەفتەی سێیەمەوە وردەوردە بێهۆیەکی دیاریکراو و بێوەرگرتنی هیچ دەرمانێک، لیڤیتانت بەرەو چاکبوونەوە ڕۆیشت. تا کەمتر تا بیگرتایە و سەرئێشەی هێورتر بایە، زیاتر لە دڵڕەقی دووردەکەوتەوە. لە کۆتایی هەفتەی چوارەمدا، خوشکەزاکانی هەستیانکرد خاڵیان گەر بیەوێت، لە هەندێک ساتەوەختدا دەتوانێت «جانەوەر» نەبێت و شتێک لە ڕەفتاری ئاسایی مرۆڤی تێدابێت.

لە کۆتایی هەفتەی چوارهەمدا، شەوێک خوشک و سێ خوشکەزاکەی دانا و بۆ یەکەمجار بە زمانی مرۆڤێکی ئاسایی، کەسێک دەتوانێت وەک مرۆڤ هەندێک ڕستەی سادە لە دەمی بێتەدەرەوە، پێیگووتن «من لە دەست شۆڕش ڕامکردوە، خۆتان دەزانن چەندین ساڵ من خزمەتکاری بارزانی و حیزبەکەی بووم... هەموو کەس دەزانێت، بەڵام ساڵانی دوورودرێژی خزمەتکردنم بۆ ئەو و حیزبەکەی، ڕێگرنەبوون لەوەی سووکایەتیم پێبکەن. هەمیشە ڕقم لەوەیە کەسێک بێت و بیەوێت نیشانمبدات من زەعیفم و هیچ نیم... نا ئەوە قەبووڵ ناکرێت... گەر شۆڕش بۆ پیاوی بودەڵە و ملشۆڕ دەگەڕێت، ئەوا سەرتاسەری هێز و بەتالیۆنەکان پڕن لە خەڵکانی لەو جۆرە. ڕاستە تۆ بۆ هەر کوێیەک دەڕۆیت یەکێک هەیە دێت و دەیەوێت پێتبڵێت تۆ لاوازیی و ئەو بەهێزترە. بەڵام نا... هەموو دەبێت بزانن، لیڤیتانت کەسێ نییە بەو جۆرە زەلیلبکرێت. وڵاتەکە ڕەحم بە پیاوی لاواز ناکات... لە بەرئەوە لە شۆڕش دوورکەوتمەوە... ئێستاش بڕیارمداوە لەمڕۆوە ژیانێکی تر بژیم. لە کوێ من دەسەڵاتم بێت عەدالەت لەوێیە».

هیچ یەک لە خوشکەزاکانی، لە دوا ڕستەکانی خاڵیان تێنەگەیشتن. بەڵام مەهتاب سەراسیمە پرسی «لیڤیتانت، دەتەوێت چ جۆرە ژیانێک دەست پێبکەیت؟ من خوشکتم و ئەوانەش خوشکەزاتان... لە ئێمە دڵسۆزترت لە دونیادا نییە». لیڤیتانت بە کاریگەری نەخۆشییەکەی دەنگێکی زبری هەبوو، وەک ئەوەی هەر حەرفێک بە گەروویدا دەڕوات، پێشتر بە سەر چەقۆیەکی کوولدا تێپەڕیبێت و ئەوسا بێتەدەرێ. کەچی ڕوخساری لەگەڵ ئاسەواری نەخۆشییەکەشدا هەر جوان بوو. جوانییەکی بێڕەحم... کە قسەیدەکرد وەک ئەوەی دەنگی لە ناو قووبەیەکی پۆڵادا گیری خواردبێت، زرینگەیەکی ئاسنینی هەبوو. لیڤیتانت گووتی «گەر بمزانیبایە چی دەکەم ئێستا پێمدەگووتی، بەڵام هەرچی بکەم پەیوەندی

بەوەوە دەبێت لە کوێدا دەسەڵاتێک بۆ خۆم پەیدادەکەم و دەبم بە کەسێک خەڵکی سڵێکم لێبکەنەوە و ڕێزێکم بۆ قایل بن... من بڕیارمداوە یاریبکەم». خوشکەزاکانی دووبارە هیچ تێنەگەیشتنەوە، بەڵام لیڤیتانت ڕووی تێکردن و دوای چوار هەفتە، یەکەم زەردەخەنەی گرت و گووتی « دڵنیام یارییەکی درێژخایەن دەبێت. دڵنیام پێویستیم بە ئێوە دەبێت... بە هەر سێکتان».

ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار خۆی هەستا و چایەکی ڕەشی لێنا و نانی خوارد و چووە دەرێ. قیافەتی ئەو ئەفسەرە گەنجانەی هەبوو کە ڕێکی باڵایان وادەکات ببن بە پاسەوانی شەرەف و بە شمشێرێکەوە پێش سەرۆکەکان بکەون. دڵنیابوو ئێستا زیندانییەکانی پسمامان و بەرپرسە حیزبییەکانی چیا، هەواڵی تەسلیمبوونەوەی ئەمیان لە بیرچۆتەوە. هەستیکرد ڕۆژێک لە ڕۆژەکان لە شۆڕشدا شتێکی گرنگ نەبووە، جێگایەکی ئەوتۆ ترسناکی نەبووە چۆڵکردنی کاریگەرییەک لە سەر ڕەوشی شتەکان دابنێت... زیندانەوان.. زیندانەوان چییە؟ دەتوانن هەزار کەس بۆ ئەو پۆستە بدۆزنەوە. بەڵام ئیشەکە بۆ ئەم شتێکی تر بوو، ئیشی خۆی بوو، خودا بۆ ئەوە دروستیکردوە سەرپەرشتی زیندان بکات. چەند ساڵ بوو پیاسەی بە شاردا نەکردبوو. ئەمڕۆ بەم دڵەوە کە خاڵییە لە بۆنی کوردایەتی، خاڵییە لە هەر ئارەزوویەک بیگێڕێتەوە بۆ چیا، خاڵی لە هەر خۆشەویستییەک بۆ هیچ شتێک، بەم شەقامانەدا دەڕوات و تێدەگات تەنیا جیاوازییەک لە نێوان زیندانی پسمامان و ئەم شەقامانەدا ئەوەیە کە ئەو لێرە هیچ نییە. ئینسانەکان لە هەر کوێ بن دیلن، لە هەر کوێ بن کۆیلەن، لە هەر کوێ بن بابەتێکن بۆ ئازار... ئەوە گوناهی ئەو نییە کە ئادەمیزاد بۆ جۆرە ژیانێکی وادروستبووە. لیڤیتانت لە یەکەم پیاسەیەوە بە گوزەر و قەیسەرییەکاندا تێگەیشت هەموو مرۆڤێکی ئەم شارە، هەموو ئەوانەی

لێرەدا دەژین، دەبێت ڕۆژێک بە دیلیدا تێپەڕن، بۆ ئەوەی خۆیان لە هەندێ خەیاڵات خاڵیبکەنەوە، تێبگەن ژیانی ئازاد چ درۆیەکی تێپەڕە، دیلی جەوهەری ژیان و ئازادیی ڕوکەشە تێپەڕەکەیەتی. هەموو مرۆڤێکی خاوەن عەقڵ دەمێک زیندان دەبینێت، تێدەگات جیاوازی نێوان زیندان و دەرەوە، هیچ نییە جگە لە درۆیەکی گەورە. دەزانێت زیندان تەنیا شوێنی ڕاستەقینەی دونیایە و جێگاکانی تر هەموویان لاسایی خراپ و بچوکی ئەون. لیڤیتانت بیریکردەوە کە ئازادی لەم شارەدا هیچ نییە جگە لەوەی مرۆڤ خۆی لە هەموو شتێک بدزێتەوە، لەشی خۆی لە ئازار بە دوور بگرێت. ئەوانەشی بە خۆیان دەڵێن ئازاد، هیچ نین جگە لەو ترسنۆکانەی ناوێرن بێن و لە زیندانەوە، لە جێگای ڕاستەقینەی ژیانەوە، لەو ژوورە داخراوانەدا کە لە هەر جێگایەکی تر زیاتر مرۆڤ دەتوانێت ئازایەتی خۆی تاقیبکاتەوە، دابنیشن و لە دونیا بنواڕن و لەوێوە سەیری ژیان بکەن. ئارەزوویەکی شێتانەی هەبوو کە زیندانێکی خۆی هەبێت، زیندانی خۆی بێت و بەس... زیندانێک دیلەکانی تەنیا دیلی ئەوبن، ئەوە ئەوپەڕی ئارەزووی بوو.

لەو ڕۆژەوە، لەو پیاسەیەوە، بەو نیگایانەوە کە نیوەی بۆنی شێتی و نیوەی بۆنی نەخۆشی لێدەهات، کەوتە گەڕان بە دوای جێگایەکدا کە دەشێت لە داهاتوودا ببێت بە جێگای ئەو، لەویادا جارێکی تر نزار ئیدریسی بیرکەوتەوە. لەو چوار هەفتەیەی پێشوودا زۆر ڕاگوزەر و تێپەڕ بە خەیاڵیدا گوزەریکردبوو، بەڵام ئێستا دەوەستا و بە ڕۆشنی دەیبینی. لە دڵی خۆیدا گوتی «دەیهێنمەوە... دەیهێنمەوە بۆ زیندان، بۆ جێگایەک هیچ کەس نەتوانێت ئازادیبکات». لەو ساتەدا پڕ بە سینەی هەوای هەڵمژی... هەستیکرد بەهێزە و دەیەوێت زۆر بەهێزتریش بێت.

# سەرەتای سەردەمێکی نوێ

## «گفتوگۆیەکی درێژی دی دەربارەی ماهییەتی شۆڕش»

کتێبتان لە قەسابخانەدا بینیوە؟. من یەکەمجار کتێبی وەهام لەلای نزار ئیدریس بینی... کتێب هەموو لاپەڕەکانی خوێناوی بێت. کتێبگەلێک هەم بەرگەکانیان خوێناوی و هەم حەرفەکانیان خوێناوی بێت... بۆنی خوێنیان لێبێت. کتێبی زۆر، کتێبی کەسێک کە هەم دەخوێنێتەوە و هەم قەسابیدەکات. دەیەوێت هەم چەقۆکەی تیژ و هەم بۆچوونەکانی کوشندە بێت. بەڵێ من ئەوەم لای نزار ئیدریس بینی. ڕۆژێکی سەیربوو کە تەواوی وردەکارییەکانیم لای خۆم پاراستووە، بەڵام ئێوە چ کارێکتان بە وردەکاری ڕۆژی وەها هەیە... ئەو کات قۆناغی دووەمی کارکردنی نزار بوو لەم قەسابخانەیەدا، پێشتر لەگەڵ لیڤیتانتدا بە جەنگ و جەهەنەمێکی دیکەدا ڕۆیشتبوو، ئێمە بۆیە دەچووین تکابکەین لەو قەسابخانەیە بێتەدەرێ. بەڵام ئەو کات سەردەمی دەست پێکردنەوەی شۆڕش بوو، هەر دوو کەسێک بەیەکگەیشتبان، قسە و باسیان دەهاتە سەر ئەوەی شۆڕش دەبێت چی بێت و چۆن بێت. ئەویی ڕۆژ، هۆشەنگی بولبولیار لە ناوەڕاستی قەسابخانەکەدا، لە نزیک گۆشت و خوێن و کەلاکی کەوڵکراوەوە بۆ یەکەمجار بۆچوونەکانی خۆی لە سەر شۆڕش پێگووتین، قسەکانی بۆ ئەو سەردەمە گەلێک دوور لە عەقڵ بوون، بەو ئەندازەیەی من لە دەفتەری یاداشت و لە نێو خەیاڵی خۆمدا پاراستوومن، ئێستا دووبارە دەیاننوسمەوە. دەشێت نوسینەوەی ئەم دیالۆگە عاجباتی و ساردانە بۆ هیچ کەسێک گرنگ نەبێت، بەڵام بۆ من کە لە ڕۆژان و ساڵانی داهاتووا زۆر سەروکارم لەگەڵ ئەم دوو کەسەدا دەبێت، هەر

یەکەیان بە ڕێگایەکدا دەڕوات و منیش لە تەک هەر دووکیاندا بە هەردوو ڕێگاکەدا دەڕۆم، بایەخێکی بێهاوتای هەیە. دەبێت بیرتان نەچێت، من دواجار بە دوای ئەو مۆتەکە و ئایدیا شەیتانیانەدا دەگەڕێم کە وایانکرد پێکەوە ئەم ڕۆژە تاریکانەی ئەمڕۆ دروست بن. چەندە مەبەستمە لە هەموو ئەو هێزە سەیرانە بڕوانم کە هێدی هێدی منیان هەم دروست و هەم لەت لەت کرد، مەبەستیشمە لەو هەموو بوونەوەرە سەیرانە بڕوانم کە لە کوچە تاریک و ساردەکانی ئەو مێژووەدا هاتنە ڕێگام، خەڵکانێک هیچ شتێک پێکەوە کۆی نەدەکردنەوە، هەندێکیان شەیتانی جەنگاوەر و هەندێکیان فریشتەی لاواز و بێسوود بوون، بەڵام هەموومان پێکڕا، ئەو سەردەمەمان دروستکرد، کە دواتر بوو بە ژێرخانی ئەم دنیا ترسناکەی ئەمڕۆ. دونیایەک وام لێدەکات بگەمە بونبەستێکی قووڵ و ناکۆتا، کە گەر دواجار لە مەرگدا تەواو نەبێت، لە گومڕایی زیاتر و پیسبوونی زیاتر و تەنهایی زیاتردا تەواودەبێت. ئەو قسانەی لێرەدا دەیانگوێزمەوە، نرخیان لە نرخی یاداشتی موجەرەد تێدەپەڕێت، هەندێک گفتوگۆ هەیە تەنیا لە سەردەمێکدا و لە چرکە ساتێکی دیاریکراوی مێژوودا و لە نێوان هەندێک کەسی زۆر تایبەتیدا ڕوودەدەن، نرخی ئەم گفتوگۆیانە لەوەدایە کە وەک یاقووتێکی دەگمەن وان، یەکجارەکین و دووبارە نابنەوە، نە سەردەم ڕێگای دووبارەکردنەوەیان دەدات و نە ئەو کەسانەی لەو ئان و ساتەدا کۆدەبنەوە و نوێنەرایەتی چەشنە نیگایەک دەکەن، لە کاتێکی دیکەدا هەمان تێڕوانینیان دەبێت، هەندێجار هەستدەکەم کە من زۆر خۆشبەختم کە چەند ساتێکی وا ناوازەم لە ژیانی خۆمدا بینی و لە نزیکەوە سەیری بۆچوونی گەرم و تاریکی ناو خەیاڵی هەندێک کەسم کرد. دەزانم خەڵکانێکی دەبەنگ هەن کە کتێبێک دەگرن بە دەستەوە پەلەیانە، هەمیشە دەڵێن کوا چیرۆکەکە... چیرۆک لای ئەوان تەنیا گێڕانەوەی کوشتن و کارەساتی گەورە و دیمەنی

عەشـقبازی داغ و جۆشـانە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا چیرۆکـی گـەورەی ژیـان هەمیشـە لـە شـوێنێکی دیدایـە. مـن لـە ژیانمـدا نەمتوانیـوە جیاکارییـەک لـە نێـوان ئـەوەی لـە بیرکردنـەوەی مرۆڤـدا ڕوودەدات بکـەم لەگـەڵ ئـەوەی کـە لـە سـەر شـانۆی ژیـان دەردەکەوێـت. دەزانـم ئـەوە شـێوە بیرکردنـەوەی هەمـوو پیاوانـی سـەر بـە دەزگای ئەمنییەتـە. ئێمـەی قارەمانانـی دەزگا، هەمیشـە دەمانەوێـت لـە ژیانـی ئینسـانەکانەوە بگەینـە نـاو بیرکردنەوەیـان و لـە بیرکردنەوەیانـەوە تەلیسـم و نهێنییەکانـی ژیانیـان دەربهێنیـن. لای مـن ئـەوە چیرۆکـی سـەرەکییە، تێبگـەم چـۆن بولبولیـار ساڵانێک دواتـر لـە شـەوە غەمگینەکـەی توتنباغیـدا، کاتێـک حەسـیبمان کوشـت، توانـی مـن ببینێـت. تێبگـەم بولبولیـار لـە سـەرەتاوە چـۆن شـتەکانی تـری بینیـوە، چ زنجیرەیەکـی ڕەش و بـەد وادەکات مـرۆڤ ئـەم ئەڵقـە بـەو ئەڵقـەوە ببەسـتێت، ئـەم خولیـا بـەو خەیـاڵ و ئـەو خەیـاڵ بـەم خولیـاوە گرێبـدات. ئەرکـی مـن بـە درێژایـی ژیانـم لـە ئەرکـی حیکایەتخوانـەکان سـەختتر بـووە، کـە تەنیـا چیرۆکێـک دەگێڕنـەوە، ئیشـی مـن نوقمبـوون بـووە تـا ئەنـدازەی خنـکان لـە دەیەهـا ڕۆحـدا کـە خۆیـان بـە دەگمـەن گەیشـتوونەتە کونجـە تاریکەکانـی ناخـی خۆیـان.

کورتەی قسەی بولبولیار ئەوی ڕۆژ دەربارەی شۆڕش بەمجۆرە بوو:

«هەڤـاڵان، هەرەسـی حەفتاوپێنـج وەهـا گـەورە مەگرن. شـۆڕش وەک هەر شـتێکی تـر دەشـێت بڕوخێـت. شـۆڕش لای مـن قـەت شـتێکی وەهـا گـەورە و گرنـگ نەبـووە. مـرۆڤ دەتوانێـت هەمیشـە شۆڕشـگێڕ بێـت، ئـەوەی گرنگـە شـۆڕش نییـە، بەڵکـو شۆڕشـگێڕەکانن. ئـەوەی دنیـا دەگۆڕێـت شـۆڕش نییـە، بەڵکـو شۆڕشـگێڕانن. تـۆ گـەر پاسـەوانی ڕۆحـی خـۆت نەبوویـت، ناتوانیـت پاسـەوانی ڕۆحـی نەتەوەیـەک یـان ڕۆحـی خەڵکانـی زەحمەتکێـش بیـت».

هەڵبـەت بولبولیـار هەمـوو قسـەکانی پێکـەوە نەدەکـرد، دەوەسـتا، ئێسـتیدەکرد، هەناسـەی وەردەگـرت، دەیڕوانـی، هەندێجـار کەمێـک دەسـتی

دەجولاند، خۆی کۆدەکردەوە، وشەی دەگۆڕی. بەلام من ئەمڕۆ هەموو ئەوانە لادەبەم و تەنیا قسەکانی دەگێڕمەوە، بۆ من وەک ڕەوانەکراوێکی سەرۆکەکان، وەک پەیامبەرێکی شۆڕش، ئەوە گرنگ بوو گوێکانم قووتبکەمەوە و گوێبگرم و لە ناو رستەکاندا بۆ ئەو بیرۆکانە بگەڕێم کە دەشێت زیانی بۆ پاشەڕۆژی سەرکردەکانم هەبێت. لەو سەردەمەدا چونکە شۆڕش هێشتا سامی خۆی نەچەسپاندبوو، خەڵکانی وەک نزار و بولبولیار دەیانتوانی ڕوونتر چی لە ژێرخانەکانی عەقڵیاندا هەیە و نهێنییە، بهێننە دەرێ.

بولبولیار بە هێمنییە کوشندەکەی خۆیەوە گووتی« بەڵێ ئەوانەی وەک من لە خوێن دەترسن دەزانن چیان دەوێت و ئەوانەشی ناترسن هەر دەزانن. ئەوانەی دەبن بە پاسەوانی دونیا دەزانن چییان دەوێت و ئەوانەشی تەنیا پاسەوانی ڕۆحی خۆیانن، دەزانن. زۆرجار شۆڕش خۆدزینەوەیە لە ترسێکی تایبەتی، مرۆڤ دەچێتە ڕیزی شۆڕشەوە بۆ ئەوەی بڵێت تەنها نیم. لە کاتێکدا شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە هەمیشە تەنهایە... لەو کاتەشدا کە لە ناو جەرگەی خەڵکدا هاواردەکات، هێشتا تەنهایە. چونکە ئەوەی مرۆڤ بە دەستی خۆی نەیگۆڕێت مێژوو نایگۆڕێت. ئەوە ئیشی شۆڕشە میللەتان ئازادبکات، نەوەک ئیشی شۆڕشگێڕان بێت. شۆڕشگێڕان پاسەوانی ڕۆحن. خەڵک بە دەستەجەمعی دەتوانن دەوڵەت بگۆڕن، بەلام ناتوانن خۆیان لە جانەوەرەکەی ناخیان بپارێزن. مێگەل و گاڕانە گەورەکان دەتوانن دەوڵەت بڕوخێنن، شۆڕشی چەکدار هەڵگیرسێنن، شۆڕشی درێژخایەن بەرپابکەن، شارەکان بسووتێنن، بەلام شۆڕشگێڕ دوور و نزیک پەیوەندی بەو شتانەوە نییە. دەشێت دەیان شۆڕش ڕووبدەن و مێژوو شۆڕشگێڕێکی ڕاستەقینەی تێدا نەبێت. شۆڕشگێڕ ئەوە نییە مێژوو دەگۆڕێت، بەڵکو ئەوەیە کە کۆمەک بە مرۆڤ دەکات نەبێتە جانەوەر، لەوە زیاتر هیچی تر نییە. گرنگ

ئەوەیە مرۆڤ کاتێک بۆ ئازادی شەڕدەکات نەبێتە جانەوەر، ئەوە تەنیا پرسیاری گرنگی مێژووە... پرسیارەکانی تر هەرچییەک بن و وەڵامیان هەر چییەک بێت، لە پەراوێزی ئەو پرسیارە گەورەیەدان. مرۆڤ بە درێژایی مێژوو چەند لە پێناوی ئازادیدا شەڕیکردوە، دە هێندە لە پێناوی پاراستنی کۆیلەیەتی خۆیدا شەڕیکردوە، بەشی هەرە زۆری شۆڕشەکان بۆ ئەوە نین مرۆڤ ئازادبکەن، بەڵکو بۆ ئەوەن کۆیلەیەتی مرۆڤ بپارێزن و ڕوخسارێکی تری بدەنێ. دەزانم تۆ وەک قسەی موجەڕەد سەیری وتەکانم دەکەیت، بەڵام ئا قسەی موجەڕەد نین».

لەو کاتەدا لە خەیاڵی خۆمدا ئەوەم تۆماردەکرد کە هەڤاڵ بولبولیار بۆچوونی وایە کە شۆڕشی ئێمە لەوانەیە بۆ پاراستنی کۆیلەیەتی بێت. ئەوە تێبینییەکی گرنگ بوو بیگوازمەوە بۆ سەرەوە.

«هەڤاڵی خۆشەویست حەتمەن ئەگەر سەیربکەیت، لە مێژوودا شەڕی ڕاستەقینە قەت لە نێوان ئاغا و کۆیلەدا نەبووە، بەڵکو لە نێوان کۆیلەیەکدا بووە کە دەیەوێت چیتر کۆیلە نەبێت، لەگەڵ کۆیلەیەکی تردا کە نایەوێت کۆیلە نەبێت. هەڤاڵ ئەگەر ورد بڕوانیت... بەڵێ ئەگەر ورد بڕوانیت، لە مێژوودا هەردەم ئەو کۆیلەیە سەرکەوتووە کە نایەوێت ئازاد بێت، هەر ئەو شەرکەرێکی ئازاتر بووە. بەڵام ئەوانەی کە نامانەوێت کۆیلەبین، نامانەوێت جانەوەر بین. هەموو سەردەمێ هەوڵی خۆمان دەدەین، گەرچی دەزانین مەحکومین بە شکست، گەرچی ئێمە نائومێدی ئەبەدیین، بەڵام دەستبەرداری ئەوە نابین پاسەوانی ڕۆحی خۆمان بین. من تا ئەو جێگایە ڕوخانی حکومەتم بۆ گرنگە، کە جێگایەک بۆ ئەوە بکەمەوە ژیان بگۆڕین... شۆڕشی دەستەجەمعی دواجار تەنیا بۆ ئەوە پێویستە دونیا وەها شلبکات، دەستبدات مرۆڤ ڕۆحی خۆی تیا بپارێزێت. وەک ئەوەی شانۆیەک سازبکەین، بۆ ئەوەی هەرکەس بتوانێت لە سەر تەختەکەی گۆرانی خۆی بڵێت، شتێک لە جوانی خۆی

نمایشبکات. شۆڕش دروستکردنی شانۆکەیە، نەوەک نمایشەکە بێت. نمایشەکە هەمیشە هی من و تۆیە بە تەنیا. بەڵێ، مامۆستا جەنگیز... دەرەنجامی شۆڕش هەرچییەک بێت، هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە شۆڕشگێڕ کەسێکی تەنهایە و شانۆیەکی تایبەتی بۆ نمایشی خۆی دەوێت. ئەو شانۆیە ناو مێژوو نییە، بەڵکو ناو ڕۆحی خۆمانە. شۆڕش کاتێک مانای هەیە من بتوانم ڕۆحی ونبووی خۆم بدۆزمەوە».

ئەوە قسەکانی هۆشەنگی بولبولیار بوو... ئەوی ڕۆژ کە لەگەڵ ئەودا بۆ یەکەمجار چووین بۆ قەسابخانەی گەورەی شار، بۆ شوێنی سەربڕینی مەڕ و مانگاکان، تا نزار ئیدریس ببینین.

بولبولیار وەک هەمیشە زۆر بەکاوەخۆ قسەیدەکرد، دانە دانە وشەکانی هەڵدەبژارد. جۆرێک لە هێمنی قووڵی پێوە دیاربوو، هێمنییەک هاوڕێی هەموو دەم و دۆخێکی ژیانی بوو. دەنگێکی کزی هەبوو، کە هەندێجار لە ناکاو زۆر بەهێز دەبوو، بە وردی دەیزانی دان بە چ حەرفێکدا دەنێت.

نزار بە هێمنییەوە گوێی لە قسەکانی گرت و بە بێحورمەتی و لاقرتێیەوە بە هەردووکمانی گووت «مامۆستایان بۆ خاتری خودا واز بهێنن و لە پێشدا تۆزێ بۆنی ئەم خوێنە بکەن. بۆیە هاتوومەتە ئەم قەسابخانەیە تا بە بۆنی خوێن ڕابێم». پڕ بە سینەی هەوای خوێناویی قەسابخانەکەی هەڵمژی... وەک گوڵاوی باغێک هەڵمژێت، وەک بۆی شوێنێک بە عەتر مەستیبکات. بۆ کەمێک چاوی لێکنا، زەردەخەنە هەمیشەییەکەی خۆی لە سەر لێوی بوو، زەردەخەنەی پیاوێک دەیەوێت پێمانبڵێت سەر بە جنسی ئێمە نییە.

دواتر چاویکردەوە و تەماشای ئێمەی کرد و پرسی «بۆنتانکرد؟ باشترە هەمووتان بۆنیبکەن، وڵاتەکە سەگ دەمی تێناوە. قسە هەیە بەعسییەکان هێزیان بردوە گوندەکان وێرانبکەن، هەموو سەر سنووری ئێران چۆڵدەکەن، بۆ ئەوەی لەگەڵ لەشکری شاهەنشا ئاریامیهردا باشتر بۆیان پاسبکرێت.

ماوەیەکی زۆر نابات ئەم شارانە دەبنە قەسابخانەی گەورە کە سەری خەڵکی تیا دەپەڕێت. لە شوێنێکی وەهادا گەر سەگ هەموو کەڵبەکانی خۆی دەرنەخات، نەوەک ڕۆح، کلکی خۆشی پێ پاس ناکرێت. مامۆستا بولبولیار، منیش هەرەسی شۆڕشی پێشووم بۆ گرنگ نییە. هەرەسی هیچ شۆڕشێکم بۆ گرنگ نییە، ئەوانە هیچیان شۆڕش نین، هەرەس بهێنن یاخود نا... هیچ لە هیچ ناگۆڕێت... لەوەدا لە سەر هەقی».

قاقایەکی بەرزی لێدا، دڵنیابوو شتێکی سەیر دەڵێت. بەڵام لە چاویدا ئەو بێباکییە هەبوو کە هەمیشە لێیدەترسام، بەو نیگا بێشەرمانەیەوە کە یەکەمجار لە سێئاسکێ نیگای منی پێکردبوو، ئێستا لە سەردەمێکی تردا، لە سەرەتای شۆڕشێکی دیدا، بە هەمان شێوە سەیری بولبولیاری دەکرد و دەیگووت «من بەردەوام لێرەدا ئەم گیانەوەرە بەستەزمانانە سەردەبڕم... بۆنی خوێن وادەکات نزیکبم، زۆر نزیکبم. تازە بووم بە جانەوەر مامۆستا. لێرەدا دەمەوێت لە ناو جەرگەی ئیشەکەمانەوە نزیکبم کە شەڕە، شەڕ لە دوای شەڕ لە دوای شەڕ. بە ڕاستیمە برادەر، ئێرە جێگایەکی باشە بۆ زەلامێکی وەک من، ئێرە مەکتەبی منە. مەکتەبەکانی تر سوودیان چییە؟. وڵاتەکە بەرەو جەنگ دەڕوات، بەعسییەکان ناهێڵن کەس بە خۆشی دانیشێت، لە شەڕدا کیمیا و فیزیا بۆ دوژمن باس ناکەین، بەڵکو سەریاندەبڕین. گەر دەتانەوێت سەربکەوین، وەرن و ماوەیەک لێرە ببن بە قەساب. ئەوەی بیەوێت شۆڕشبکات، پێویستی بە دەورەیەکی قەسابی دەبێت. بەڵام هەڤاڵانی من، برادەرانی سەنگەر، جەنابی بولبولیار، خەڵکان ناچنە شۆڕشەوە بۆ ئەوەی هیچ چاکبکەن، بەڵکو بۆ ئەوەی ئەو شتانە حەڵاڵبکەن کە لە کاتی تردا حەڵاڵ نین. جانەوەرەکەی دڵیشم دەیەوێت شتێکی نوێی بۆ حەڵاڵ بێت. گەر من بێ هیچ بەهانەیەک مرۆڤێک سەربرم، دەبم بە چی... بە جانەوەر... هەموو پێمدەڵێن، دڕندە، بەربەری، شێت...

ئێوەش هەروام پێدەڵێن، بەڵام لە شۆڕشدا... هاها لە شۆڕشدا تۆ دێیت و تیامدا دەپارێیتەوە خەڵکت بۆ بکوژم. من دەچمە شۆڕشەوە بۆ ئەوەی بەکاریبهێنم. شۆڕش کەرەستەیەکی مەلعونە کە ناچارم بەکاریبهێنم. هەر کەرەستەیەکی تر خزمەتی ئەو جانەوەرە بکات کە کاک بولبولیار تۆ دەتەوێت بیخنکێنیت، من بەکاریدەهێنم. گەر پێویستیکرد ریشی درێژی بۆ دەهێڵمەوە و دەبم بە ئیمامی زەمان. بەڵام ئەوەی تۆ پێتوابێت دەتوانیت ئینسان لە جانەوەرەکەی ناخی بپارێزیت، قسەی پوچ و بێمایەیە. شۆڕشیش وەک دەسەڵات هەر ئەو جانەوەرە دەیکات، شۆڕشگێڕیش وەک حاکم هەر هەمان جانەوەر دەیجوڵێنێت. دیارە ڕقم لە بەعسییەکانە، کێ هەیە ڕقی لە بەعسییەکان نەبێت... ئەوە بەجێی خۆی، بەڵام ئەوەم لا مەسەلەیەک نییە کێ دوژمنمە و کێ دۆست... ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە شۆڕشگێڕ تەنیا بە جانەوەرەکەی ناخمانەوە دەتوانێت لە سەر ئەو شانۆیە دەربکەوێت کە تۆ باسیدەکەیت». زەردەخەنەیەکی مەکربازانەی گرت و چەقۆی قەسابییەکەی بەرزکردەوە و بەردەوام بوو «مەگەر تۆش ڕقت لە بەعسییەکان نییە جەنگیز بەگ، بێگومان ڕقت لێیانە، بەڵام کەس بە تەنیا لە بەرئەوەی ڕقی لە بەعسییەکانە، شۆڕش ناکات. من شۆڕش هەرچییەکم پێبکات دەیکەم، من دڵسۆز و شتی وانیم... لە ڕۆژی یەکەمەوە تا قیامەت دڵسۆز نیم... مەبەستمە شۆڕش والێبکەم ئەو شتە بکات کە من دەمەوێت، شتێکی دەدەمێ بۆ ئەوەی شتێکم بداتێ. تو قەبری هەرچی ئەسحابەیە بەوجۆرە سەیرم مەکە، بەوجۆرە سەرت نەسوڕمێت. خۆ ئێرە سێناسکێ نییە بمرفێنێت. من قەت نەمگوتووە ئیش بۆ خۆم ناکەم... قەت نەمگوتووە... ئەوەتا ڕێک و ڕاست، وەک پیاوێکی ڕاستگۆ ڕوو بە ڕوو پێتدەڵێم من بە تەنیا ئیش بۆ خۆم دەکەم. ئەگەر عەیبێک لە مندا هەبێت ئەوەیە ئەو حەیوانەی دڵم لەگەڵ هەمووانیدا زۆر ڕاستگۆیە».

ورد سەیری هەردووکمانی کرد، هەرکات نیگایدەکردیت، ترس یان پەستییەکی قوڵت تێدا دروستدەبوو. بێئەوەی زمانی خۆی لە هیچ شتێک بپارێزێت، بێئەوەی پەرژینی هەبێت و قسەیەک لە زار بگرێتەوە، بۆ ئەوەی پەستمانبکات، بۆ ئەوەی تا دوا سنووری پەشۆکان بمانڕەنجێنێت، گووتی «من ناگەڕێمەوە ناو شۆڕش بۆ ئەوەی دونیا بگۆڕم یان کوردستان ئازادبکەم یان برسییەکان تێربکەم، یان تەبەقەیەکی گەمژە بە سەر تاقمێکی گەمژەتر لەواندا سەربخەم .. حە.. ئەوە ئیشی من نییە، لە توانامدا نییە ئەوە بکەم، گەر بشتوانم نایکەم. دنیا گەر میللەتی ژێردەستە و خەڵکی برسی لێببڕێت وای لێدێت نایناسینەوە، ئەی چۆن هەڤاڵ، من حەزم لێیە دنیا هەر بەو جۆرە بێت کە بە منداڵی دیومە. نا، نامەوێت وەها بێت کە نەیناسمەوە. رزگارکردنی وەتەن بۆ کاک جەنگیز بەجێدەهێڵم... هاهاها... با ئەو کوردستان ڕزگاربکات، با جەنابیان زەڕەیەک خاکی وەتەن نەدات بە قەسری قەیسەریی. من هەموو خاکی وەتەن دەدەم بە بەختێکی باش بۆ خۆم. بەختێکی باش. ژنان دەمێ بۆ بەختی باش دەگەڕێن دەبێت شووبکەن، ئێمەی پیاوان کە بۆ بەختی باش دەگەڕێین دەبێت سیاسەت بکەین، کە لە شوو بەدتر و بێماناترە. بەڵێ، من لە ترسنۆکەکانم... لەو ترسنۆکانەم کە دەچمە ناو شۆڕشەوە بۆ ئەوەی دونیا ڕێگام لێ نەگرێت، من لەو ترسنۆکانەم کە دێنە شۆڕشەوە بۆ ئەوەی بژین... بۆ ئەوەی بمێننەوە. هەموو پارتییەکە شەڕی کۆمەڵێک جانەوەرە و هیچی تر نییە. وەک ئەم قەسابخانەیە وەهایە... ئەوەم بەلاوە باشە چەقۆکەم بە دەستەوە بێت و زیندووبم، نەوەک هیچم پێنەبێت و مردبم».

نزار کراسێکی سپی درێژ و خوێناوی لەبەردابوو... مەبەستی بوو لەو جلە خوێناویانەدا بیبینین، ئاشکرا چێژێکی زۆری لە ئیشەکەی

خۆی دەبینی. لە دوای هەرەسی شۆڕشەوە، ڕاستەوخۆ بووبوو بە قەساب. لە سێئاسکێ وە شتێکم لە سەر بیروبۆچوونی دەزانی. بەڵام ئێستا کە لە سەرەتای شۆڕشی تازەداین، کە ئێستا من بەرپرسی سەرەکی ئەم پیاوەم، بە نهێنی لە شاخەوە دابەزیووم و هاتووم بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکانی ناو شار و شانە پەرتەوازە و بچوکەکان بخەمە ناو هەیکەلێکی ڕێکخراوەیی مەحکەم و تۆکمەوە، شێوەیەک بە ڕێکخستنەکان ببەخشم چالاکیانبکات و بیانپارێزێت. کاتێک گوێم لە نزار و بۆچوونەکانی دەگرت، کە خاڵی بوون لە لەخۆبووردنی شۆڕشگێڕانە، ئاشکرا و بێپەردە قسەی لەوە دەکرد شۆڕش بۆ خۆی دەکات. من ترسێکی ناوەکی گەورە دایدەگرتم. ترسێکی گەورەتر لە ترسی شەوانی سێئاسکێ. بەڵام لەو ساتەدا لە بری ئەوەی خەیاڵم بۆ ئەوە بڕوات چی بە نزار بڵێم، چۆن وەڵامیبدەمەوە، چۆن ڕێگا لەو بێحورمەتییە بە خوێنی شەهیدان بگرم. بیرم لەوە دەکردەوە، بۆ خودا مرۆڤەکانی وا جیاواز و دوور لە یەک دروستکردوە، بۆ ناکۆکی و لێک نەچوونمان دەگاتە پلەیەک هیچ شتێک کۆمان ناکاتەوە؟.

نزار ئێمەی بە ناو قەسابخانەکەدا برد و گوتی «من بە شەویش لێرە دەخەوم، نوێنێکم هەیە لەگەڵ خۆمدا دەیگێڕم. بەیانیان زوو قەسابی دەست پێدەکەین... کوشتاری ڕاستەقینە هەمیشە بەر لە بەیانییانە... بەر لە خۆرکەوتن، دەزانن بۆ؟. گوێبگرن، بۆ ئەوەی فریشتەکانی خودا، ئەوانەی ژمارەی مەخلوقاتی بۆ دەژمێرن، بەیانیان حیسابەکەیان لێ تێک نەچێت. بەرلەوەی ڕۆژ ببێتەوە، ئینسان لە سەر هەموو ئەم زەوییە هەڵدەسێت و دەستدەکات بە حەیوان کوشتن. هەموو بەیانییەک ئینسان بە کوشتنی ملیۆنەها گیانداری بەستەزمان دەست بە ژیانی خۆی دەکات. ها مامۆستا، گەر سەیربکەیت ئینسان تەپاڵەیەک، ڕیخێکی گەورەیە و لەو قوونی گەردونە بەربۆتەوە... ئەگینا چۆن بەر لەوەی

خـۆر بکەوێـت هەڵدەسـتێت و ملیۆنەهـا حەیـوان دەکوژێـت، ملیۆنەهـا، کاک جەنگیـز، ملیۆنەهـا... عەجایەبـە بتەوێـت بوونـەوەری وا دڕنـدە جوانبکەیـت. مـرۆڤ جانـەوەرە و تـەواو، دەبێـت بەوجـۆرە قەبووڵمـان بێـت، لـە سـەر ئـەوە حیسـاببکەین. یەکەمیـن قەسـابی دونیـا ئـادەم و حەوا بوون، من نەمبیسـتووە ئـادەم و حـەوا گیاخۆربووبـن، شـتی وات بیسـتووە کاک جەنگیـز؟. ئـەوان یەکـەم قەسـاب بـوون و منیـش کـوڕی دایـک و باوکـی خۆمـم. ئێمـەش لێـرەدا بەیانیـان سـەدان حەیـوان دەکوژیـن، ئیـدی ناچاریـن شـەو لێـرە بمێنینـەوە، شـوێنی خۆشـتنم هەیـە، شـوێنی خواردنـم هەیـە، زۆرجـار لـە پشـووەکانیشـدا وەک بەڕێزتـان دەبینـن کتێـب دەخوێنمـەوە، بـەڵام جەنابـی جەنگیـز بـەگ، مـن کتێـب بـۆ ئـەوە ناخوێنمـەوە فێرببـم. ڕاسـتت دەوێـت ئارەزوویەکـم لـە فێربـوون نییـە، کەسـی وەک مـن کـە کتێـب دەخوێنێتـەوە، بـۆ ئەوەیـە درۆکانـی خـۆی باشـتر بهۆنێتـەوە... لـەو بەشـەرانەم کتێـب تەنیـا فێـری درۆکردنـی کـردوم. ئـەوە گەمژەکانـن وادەزانـن کتێـب خوێندنـەوە مرۆڤـەکان، هەمـوو مرۆڤـەکان وەک یـەک دەکات بـە ڕۆشـنبیر. بەشـی هـەرە زۆری خەڵـک کـە کتێـب دەخوێننـەوە، دواتـر دەبـن بـە درۆزنـی بـاش، مـن سـەر بـەو بەشـەم. سـەر بـەو توخـم و تاقمـەم کـە ڕۆشـنبیریم لـە بـواری درۆکردنـدا دەخەمـە کار. گەرچـی مـن بەخەنـدەوە وادەڵێـم، بـەڵام ئـەو خەندەیـەش تەنیـا بـۆ فریـوە. ئـەو خەندەیـە بـۆ ئـەوە نییـە، تـۆ وابزنیـت مـن ڕاسـتی ناڵێـم. هـا کاک جەنگیـز، نازانـم دوای ئـەو قسـانەم مـن هـەر بـە کەڵکـی ئـەم شـۆڕشـە تازەیـەی تـۆ دێـم... ئاخـۆ شۆڕشـگێڕێکی نمونەیـم لێدەردەچێـت؟». 

مـن و بولبولیـار هەردووکمـان سەراسـیمە و دەسـتەپاچە و بێدەنـگ سـەیرماندەکرد و نەماندەزانـی بڵێیـن چـی. ئـەو ڕۆژە پانتۆڵێکـی بـۆر و تیشـێرتێکی قاوەیـم لـە بەردابـوو، هەوڵمـدەدا جلەکانـم بـە پاکـی بمێننـەوە، هەوڵمـدەدا زۆر سـەیری چـاوی نەکـەم، کـە ئـەو پرسـیارەی لێکـردم، گەرچـی

هەوایەکی دڵشکێن و هەناسەتاسێن لە فەزای قەسابخانەکەدا زاڵبوو، بەڵام دەبوو بە کاری هەمیشەیی خۆم هەستم و گوتم «بەڵام خوێندنەوە هەمیشە باشە، کتێب هەمیشە باشە، گەر درۆزنیش بیت، بڕێک لە جوانی دەکەوێتە درۆکانتەوە. بە هەرحاڵ درۆیەکی جوان هەمیشە لە درۆیەکی ناشیرین باشترە. وەکو تریش، برای خۆشەویستم، شۆڕش ئامێرێکی گەورەیە، ڕاستە ئەم شۆڕشەی ئێستامان جارێک بچوکە، بەڵام ڕۆژێک ئەمیش دەبێت بە مەکینەیەکی زل. ئیشی ئێمە وەک شۆڕشگێڕ ئەوەیە بیپارێزین... گرنگ ئەوەیە قازانجە تایبەتییەکانمان نەکەونە دژایەتییەوە لەگەڵ قازانجی شۆڕشدا». ئەم قسانە بۆ ئەمڕۆ گەلێک پڕوپوچ و ئینشائامێز دەردەکەون، بەڵام لەو سەردەمەدا بیروباوەڕی بە تینی من بوون. ئەوکات شۆڕشم بە گرنگتر لە هەر مرۆڤێک دەبینی، ئامادەبووم بە ئاسانی ژیانی خۆم و هەموو ژیانێکی تریشی بۆ بەختبکەم. نزار دەستە خوێناوییەکانی بەقژیدا هێنا و گوتی «من دەزانم، قەت شۆڕشگێڕێکی باشم لێدەرناچێت، بەوجۆرەی ئێوە دەتانەوێت، بەڵام دەزانم هەمیشە پێویستیتان بە من دەبێت... لای ئێوە جەنگیز بەگ شۆڕش گرنگە، شۆڕش لە سەرو هەموو شتێکەوەیە، بەڵام لای هەڤاڵ بولبولیار شۆڕشگێڕ گرنگە، وانییە؟ من وا لە قسەکانی ئێوە تێگەیشتم... بەڵام لای من تەنیا یەک کەس گرنگە، ئەویش منم».

قاقایەکی بێشەرمانەی لێدا، هەستمکرد دەیەوێت پەست و تورەمان بکات، دەیویست دەرزییەکمان پیادابکات ژانی بێت، دەیویست یەک شت بسەلمێنێت، ئەویش ئەوەیە کەسێکە دەتوانێت ڕەوشتی نەبێت. تا ئەندازەی خۆ نیشاندان وەک شەیتان لەگەڵ خراپەدا دەڕۆیشت. خۆشییەکی گەورەی لەوەدا دەبینی وەک خۆویستێکی ناجوامێر دەربکەوێت، بە ئەنقەست شتگەلێکی دەگووت خراپی دەربخەن، دەبێت ڕاستیش بڵێم و بڵێم کە لە جەوهەردا ئازایەتییەکی گەورەی تێدا بوو. دەیتوانی

ئەوانی دی تاسەر سنووری شێتی پەستبکات، دەیتوانی تا دەکرێت بێباک بێت، دەیتوانی لەگەڵ زیرەکی و قسەزانی خۆیدا شەڕانگێزییەکی وەها ئاشکرابکات، ببێت بە مەترسی بۆ سەر هەموو شتێک. بەڵام هەموو ئەو شتانەش بەیەکەوە، هەموو ئەو خراپە و بەدکاریانەش پێکڕا، کردبوویان بە کەسێکی جوان، کەسێک کە سیحرێک جێدەهێڵێت، وزەیەکی هەیە لای کەس بەدی ناکرێت.

بە هەمان لە خۆبایبوونی بەردەوامەوە، سەیری بولبولیاری کرد و گووتی «مستەر منیش بەلامەوە گرنگ نییە کوردستان یان کرێکاران، یان زەحمەتکێشانی دونیا ئازادبن... دەزانم ئەوە بۆ تۆش گرنگ نییە، دەبینیت، گەرچی تۆ ڕۆشنبیرێکی زانکۆیی و من قەسابێکی چڵکن و پیسوپۆخڵم، شتێک هەیە کۆماندەکاتەوە. دڵنیام گەر شۆڕش، کوردستان یان کرێکاران ئازاد نەکات، تۆ سەری خۆت لە خووم نانێیت، بەڵام بۆ پیاوە بەڕێزەکانی وەک کاک جەنگیز، ئەوە شتێکی گرنگە... ئەو لە چیاوە دابەزیوە و دەیەوێت لە ڕزگارکردنی کورددا بەشداربێت، بەڵام لای من قسەکانی هەمووی بۆ پێکەنینە. بۆ کاری وەها شانی خۆم نادەمە ژێر هیچ عەزابێک. مرۆڤ لە شۆڕشدا دەتوانێت بەس خۆی ڕزگاربکات. تۆ دەتەوێت ڕۆحی خۆت ئاسوودەبکەیت، من لە جیاتی ڕۆح جانەوەرێک لە ناخمدایە، دەبێت کارێکبکەم ئەو ئاسوودەبێت. با سەیربکەین و بزانین لە کۆتاییدا بە کوێ دەگەین و کێ کێ دەبەزێنێت، ڕۆحی پاکی تۆ یان جانەوەرەکەی من؟؟».

وەها خراپ و بەدفەساڵ هاتە بەرچاوم، ویستم تفێکی گەورەی لێبکەم. دەیزانی بیر لە چی دەکەمەوە، وەک گاڵتەیەکی نامەردانە بە من بکات بە دەنگی بەرز پێکەنی، هەموو فەزای قەسابخانەکە دەنگیدایەوە. بەو نیگایانەوە کە ئازاریاندەدام، گووتی «بەڵام جەنگیز بەگ، دەیەوێت هەموو دونیا ڕزگاربکات، خۆی نەبێت... هەموو دونیا

خۆی نەبێت». قسەکانی بۆ من زۆر بە ئێش بوون، بەڵام من کارێکی گرنگتر و گەورەترم هەبوو، لەوەی لێرەدا بچمە جەنگ و جەدەلەوە.

بە خێراییەکی شێتانەوە دەستیکرد بە پاککردنەوەی خوێنی ڕژاوی مەڕ و بزنەکان لە سەر کاشی بریقەدار و پاکی قەسابخانەکە. لەگەڵ ئێشدا بەهێمنییەوە سەیری بولبولیاری کرد و بەردەوام بوو « کاک بولبولیار، بەڵام وامەزانە من شۆڕشم بۆ گرنگ نییە. گەر شۆڕش نەبێت، گەر ئەو قەسابخانە و جەنگە گەورەیە نەبێت، ئەو گیاندارەی ناو ناخی من کە تۆ دەتەوێت بیکوژیت، ناتوانێت تێبگات زنجیری پساندوە و ئازاد بووە. هەر زەمانێک شۆڕشی تێدا نەبێت هەموو دیلین، من تێناگەم شۆڕش و شۆڕگێڕ چۆن دەبێت لە یەکدی جیاببنەوە. زۆر بیرم لێکردۆتەوە، پەیوەندیکردنی من بە شۆڕشەوە لەو بڕوایەوەیە کە ئەگەر شۆڕش نەبێت، چۆن بتوانم حەرامەکان بۆ خۆم حەڵاڵبکەم. بە تەنیا ئەوەم بۆ ناکرێت، شۆڕش دەبێت ئەوەم بۆ بکات. بۆیە شۆڕش پەیوەندی بە زاڵم و مەزڵومییەوە نییە، شۆڕشکردن بە مانای وێرانکردنی هەمیشەیی دونیا هەقێکی ئەبەدی ئێمەیە. دونیا بەهەشت بێت یان دۆزەخ، مرۆڤ هەر دەبێت شۆڕش بکات. مرۆڤ لە بەهەشتدا پتر لە هەر جێگایەکی تر پێویستی بە شۆڕشە... بەهەشت یەک شتە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی شۆڕش بکات، لە بەهەشتی ڕاستەقینەدا ساڵ دوانزەی مانگ شۆڕشە... هاها... گرنگیش نییە لە چ بەرەیەکدا شۆڕش دەکەیت، بەڵکو گرنگە ئەوەیە ئەوەی بۆ ئەوانی تر حەرامە بۆ تۆ حەڵاڵ بێت... شۆڕش ئەوەیە».

لەو ساتانەدا وەک کەسێکی شێت و جانەوەر و ترسناک دەمبینی کە حەزمدەکرد بە هەموو توانای خۆم بکێشم بە دەمیدا. وەک یەکێک لەو ڕۆحە شەڕانی و زیرەکانەی دەتوانن هەم بلیمەت و هەم سامناک بن. لە ناخی دڵدا ڕقم لە هەموو وشەیەکی بوو، ڕقم لە نیگای

بوو، کاتێک بە گاڵتەجارییەوە سەیری هەموو شتێکی دەکرد، ڕێزی بۆ هەموو شتێک کاتی و هەواداری بۆ هەر ئایدیایەک کورتخایەن بوو، زەردەخەنەیەکی جوان، بەڵام لە ناواخندا پیس و پڕ لە بێباکی لە سەر لێوی سەمایدەکرد. زەردەخەنەی مرۆڤێک کە باکی بە ژیانی ئەوانی دی و باکی بە هیچ بەهایەک نییە. لە ناخمدا ڕقێکی گەورەم بەرامبەری هەبوو، ڕقێک بەشی ئەوەی نەدەکرد پێی سەرسام نەبم، لەگەڵ هەموو توڕەیی و کینەمدا، سەرسامییەکی بێمانا و نادیار و نهێنیم پێی هەبوو. بەڵام بولبولیار، وەک لە کینەشدا هەزار بێت، تەنیا بێباک و سارد سەیریکرد، وەک ئەوەی تەواوی ڕستەکانی نەگەنە ئەو و شتێکی تێدا نەجوڵێنێنن. ساردی بولبولیار هۆیەک بوو نزار دوورتر بڕوات، دەیویست ئەم پیاوە هێمنە بگەێنێتە جێگایەک لە خۆی دەرچێت و ڕوویەکی شەڕانگێزانە دەربخات، کە بەبڕوای نزار، بەشێکی گرنگی هەموو ئادەمیزادێک بوو. بۆ ئەوەی پتر ئازاریبدات، گووتی «گەر تۆ دەتەوێت لە هەمانکاتدا شۆڕشگێڕبیت و بە ئەخلاقیش... لە بیریبکە... باشترە بڕۆیت و خۆت لە کونجی مزگەوتێکدا بشاریتەوە. بڕۆ و خۆت بە شتێکی دییەوە سەرقاڵبکە کە لەگەڵ ئەخلاقدا بگونجێت. ئەو ڕۆژەی مرۆڤ بڕیار بۆ شۆڕش دەدات، یەک ڕێگای لە بەردەمدایە، دەبێت بڵێیت خواحافیز ئەی ڕەحم، خواحافیز ئەی خۆشەویستی، ماڵاوا ئەی دڵی پڕ بەزەیی من... من دەبم بە شۆڕشگێڕ و تەواو... شۆڕشگێڕێکی بە ڕەحمیش، شۆڕشگێڕێکی عاشقیش، شۆڕشگێڕێک کە بیەوێت وانەی بەزەیی بەوانی دی بڵێتەوە، لە پیاوێکی باش بەولاوە هیچی تر نییە کە هەمووان بە سەر ئێسکیدا دەڕۆن و پێی پیادەنێن، پێ بە جومجومە پاکوتەمیزەکەیدا دەنێن، جومجومە بە ئەخلاقەکەی. دەیهاڕن، ئەویش دەبێت سوپاسیانبکات، لە بەردەمیاندا بنوشتێتەوە، ڕەحم پیشانبدات، لێبوردن، بەزەیی. دواجار ئەوە شۆڕشگێڕ نییە، ئەوە مرۆڤیش نییە،

بەڵکو فریشتەیەکی مردوە، فریشتەیەکی بێگیان کە لاشەی خۆی بە ناو وێرانەکانی دونیادا ڕادەکێشێت و بەختەوەرە بەوەی ئەوانی دی ئەتکیدەکەن و ئەم ناتوانێت کەس ئەتکبکات».



کە قەسابخانەکەمان جێهێشت. هۆشەنگی بولبولیار کەمێک بێباک دەردەکەوت. چاکەتێکی ڕەشی کۆنی لەبەردابوو، بێغەم و لەشسوک بە گورجی لە پاڵمدا هەنگاوی دەنا. دوای ئەو هەموو ئازاردان و ڕستە نابەجێیانەی نزار لە سەر موقەدەسترین شتی دونیا لای من، لە سەر «شۆڕش»، بۆ ئەوەی بولبولیار بهێنمە قسە و بەو بۆنەوە شتێک لە تۆزی ئەو هەموو پیسییە بتەکێنم کە نزار لە سەر دڵم باریکرد. پرسیم «هەڤاڵ، چۆن لە پەیوەندی نێوان شۆڕش و چاکە تێدەگەیت؟ گوێبگرە. شۆڕش لای من هیچ کات لە چاکە ناترازێت. مرۆڤی شۆڕشگێڕ، هەمیشە کەسێکی چاکەکارە. مرۆڤێکە کە کاتی نییە بۆ خۆی بژی. شۆڕشگێڕ تاکە کەسێکە ژیانی بۆ خۆی ناوێت. جیاکردنەوەی شۆڕش لە ڕۆحی بڵندی ئینسان، لە فەزیلەت، شۆڕش پڕدەکات لە خۆپەرستی، لە کەسانێک کە شۆڕش لایان شانۆیەکە نیازی خۆیانی لە سەر نمایشدەکەن» هەناسەیەکی غەمگینم هەڵکێشا و بە جیدییەتێکەوە کە تەعبیری لە ڕۆحی ئەو سات و سەردەمەی من دەکرد، گووتم «شۆڕش تاکە دەرمانێکە کە دەیخۆم و خۆم لە بیردەکەم، تەنیا حەبە ئەو نیوە خۆپەرستەی من دەکوژێت و وادەکات بۆ نیشتیمان بمرم، شۆڕش تەنیا تلیاکی منە. بەبێ ئەو تلیاکە من دەبم بە کەسێک تەنیا بۆ خۆم دەژیم».

سەرەتا بە کەمێک خەیاڵ و تێڕامانەوە، لە کۆتاییشدا بە جیدییەتێکی ناوازەوە گووتی « هەڤاڵی بەڕێز، من دەزانم هیوایەک نییە ئازار لە

سەر زەوی کەمبکەینەوە، زۆر جار هەوڵێک دەدەین بۆ ئەوەی ئازارەکان ناو بنێنین، پێیدەڵێین ئازاری کرێکاران، ئازاری نەتەوە، ئازاری زەحمەتکێشان، ئازاری کورد، ئازاری هەژاران... بەڵام دواجار ئازار بە جۆرێک لە جۆرەکان لە سەر زەوی نابڕێت. هەموو شۆڕشەکان شتێکن دژ بە ئازار، بەڵام ئازار دوایی نایەت، تا ئازار دوایی نایەت. لەوەدا لەگەڵ نزاردام کە شۆڕش قەت کۆتایی نایەت. بەڵام من کاتێک وەک هۆشەنگی بولبولیار شان دەخەمە ژێر ئەم بەردە قورسە، کە لێرەم، کە لەگەڵتدام، کە دەمەوێت ژیانی خۆم بخەمە مەترسییەوە، دەمەوێت بەرگری لە شتێکی تر بکەم، من خۆمم بۆ گرنگ نییە... من بەرگریکردن لە جنسی مرۆڤ کردومی بە هاوڕێی تۆ... بەڵێ جنسی مرۆڤ، کە جنسێکی بەدبەختە. شۆڕشگێڕ شتێکە دەبێت بەبێ شۆڕشیش لە سەر زەمین نەبڕێت، شۆڕشگێڕبوون پەیوەندی بە بوون و نەبوونی شۆڕشەوە نییە. ئەوەی من باسیدەکەم شۆڕشی منە، نەوەک شۆڕشی سوپا و هێزە گەورەکان. من شۆڕشگێڕێکی ئەبەدیم... من لێرەم بۆ ئەوەی بە دۆڕاوی شەڕبکەم، ئەوە ئامانجی منە... بە دۆڕاوی تا کۆتایی شەڕبکەم».

هەموو سەردەمێک سیاسی خەیاڵاوی خۆی دروستدەکات، هۆشەنگی بولبولیار سیاسییە ئەفسونبازەکەی ئەو ڕۆژگارە بوو. شتێکی تێدا بوو پێچەوانەی نزاری قەساب، هێمنییەک و نەزاکەتێک جیاواز لەو هەموو دڕندەیی و بێباکییەی لەودا هەیە، غەمخواردنێک بۆ ئینسان، کە پێشتر لای کەس نەمدیبوو. ئینسان لای ئەو مانایەکی تری هەبوو، نەدوژمن بوو، نەدۆست، بوونەوەرێک بوو دەیناڵاند و ئیشی ئەم ئەرەبوو ئازارەکانی ڕاژەنێت... ئەوە شۆڕشگێڕێتی بولبولیار بوو. بەڵام کە باسی «ناکۆتایی» شۆڕشی کرد، ترساندمی. ئەوەی شۆڕش کۆتایی نەبێت یەکێک بوو لە هەرە شتە ترسناکەکان کە دەشێت من بیری لێبکەمەوە. شۆڕش دەبێت کۆتایی هەبێت... مرۆڤ ناتوانێت تامردن شۆڕشگێڕ

بێت. بە جۆرێک لەو سیفەتی ناکۆتابوونەی شۆڕش ترسام، ئەو قسانەم گەیاندە ئەنجومەنی باڵا. ئەو کات لە هەر شتێ بترسامایە دەمکرد بە راپۆرتێک و دەمنارد بۆ سەرۆکەکانم لە سەرەوە. ئەنجومەن مەرجەعی گەورەی من بوو، ئەوان بە وردی گوێیان لە قسەکانم سەبارەت بە «ئەبەدییەت و ناکۆتابوونی» شۆڕش گرت، هەموو ئەو نیگا و دەموچاوە گرژەیان هەبوو کە من چاوەڕوانمدەکرد، هەموو رایان وابوو ئەو ڕۆژەی بەعسییەکان دەبەزێنین شۆڕش کۆتاییدێت و سەردەمێکی ئاسودە و هێمن و بێ شۆڕش دەست پێدەکات، هەموو کۆکبوون لە سەر ئەوەی شتێک نییە ناوی ناکۆتابوونی شۆڕش بێت. لەوێ، لە مەکتەبی کاروباری سیاسی، گەر نەمانزانیبایە شۆڕش کۆتایی هەیە، کەسمان نەماندەتوانی یەک ڕۆژ شۆڕشگێڕ بین.



دەبێت بڵێم کە هاتنم بۆ شار و پەیوەندیکردنم بە شانە بچوک و پەرتەوازەکانەوە، کارێکی ئاسان نەبوو. من شوناسێکی دروستکراوی مامۆستایەکی سەرەتاییم پێ بوو تا هاتوچۆی گوندەکانم بۆ ئاسان بێت، وەک مامۆستایەکی گەنج خۆم دەگۆڕی تا سەربازگەکان ڕێگریم لێ نەکەن. ئەوەی لە سەرەتاوە کێشەی من بوو، ئەم دوو پیاوە بوو، نزار و بولبولیار... هەردووکیان دوو کاراکتەری جیاوازبوون کە بە جۆرێک لە جۆرەکان هەر یەکەیان شۆڕشیان بە شێوازی خۆیان دەویست. گەورەترین مەترسی لە سەر شۆڕش ئەو کەسانەن کە شۆڕشی خۆیان لە شۆڕشی هەموان جیادەکەنەوە، یان ڕاستتر وایە شۆڕشی خۆیان تێکەڵی شۆڕشی ئێمە دەکەن و دەیانەوێت گەردنی ئێمە بە میلی نیازەکانی خۆیان باریکەن. هەستمکرد رازیکردنی ئەم دوو بوونەوەرە بە ڕێساکانی دیسپلینی حیزبی کارێکی ئاسان نابێت، گەرچی هەردووکیان

ئەوەیان پیشاندا کە کارەکانی حیزب بەباشی رادەپەڕێنن. لەگەڵ ئەوەشدا کاراکتەری مرۆڤەکان هەرچییەک بێت لە کاروکردارییاندا دەردەکەوێتەوە. دەبێت بڵێم بولبولیار شانەیەکی باشی لە غەمپاشا و زانکۆ دروستکردبوو، ئەوەی مایەی توڕەیی و نیگەرانی بوو، هێندەی لە شانەکەدا دیالۆگی فیکری و فەلسەفی دەکرا، ئەوەندەی خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوون، کارێکی شۆڕشگێڕانەی راستەقینەیان ئەنجام نەدەدا. من زۆر مەبەستم بوو بچمە یەکێک لە کۆبوونەوەکانی شانەکەوە، من هەمیشە ترسێکی نهێنیم لە خوێندەواران هەبووە، بەڵام ئەنجومەنی باڵا و بەرپرسان لە سەرکردایەتی شۆڕش، ئەوەیان لێقەدەغەکردم، نەدەبوو لە سەرۆک شانەکان زیاتر کەسی دی بناسم. بەوەدا من دیسپلینی حیزبیم لە هەر شتێک بەلاوە گرنگتر بوو، نەدەکرا کارێک بکەم لە سەرەتاوە وەک پیاوێکی سەرەڕۆ دەربکەوم، لەو سەردەمەدا دیسپلین لە هەر شت گرنگتر بوو، بەتایبەت بەعسییەکان دەیان کەسیان خستبووە خەتەوە تا زانیاری لە سەر ڕێکخراو و شانە تازەکان کۆبکەنەوە و شۆڕش لە لانکەدا بخنکێنن. ئەمە جگە لەوەی ئەشکەنجەی بەعسییەکان بە جۆرێک بوو، کەم کەس لە ژێریدا نەدەڕوخا و نهێنی نەدەدرکاند. من چەند نامەیەکم بۆ ئەنجومەنی باڵا نارد و گووتم کە هیچ چارێک نییە جگە لەوەی لە هەندێک جێگادا بە پەیکەری ڕێکخراوەکەدا بڕۆمە خوارێ و لە کۆبوونەوەی هەندێ شانەدا ئامادەبم، تا بزانم لە ژێرخانی شۆڕشدا و لە خانە سەرەتاییەکانیدا چی دەگوزەرێت، دوای چەندین داواکاری، لە ئەنجومەنی باڵاوە تێگەیشتنێکیان لە ترسەکانی من هەبوو و ڕێگایاندام بچمە نێو شانەکەی بولبولیارەوە.

ترسی من لە خوێندەواران لەو سەردەمەوە دەستی پێکرد کە لە سێئاسکی ڕۆشنبیرانم بینی، بەڵام بۆچوونە خەیاڵییەکانی بولبولیار ئێستا پتر دەیترسانم. لە ڕاستیدا زۆربەی ڕۆشنبیران شۆڕش وەک سەیرانێک

سەیردەکەن کە کەسێک بە جانتایەک کتێبەوە بۆ چیاکان دەیکات. من بە درێژایی سالآنی شۆڕش سەرنجمدا، ڕۆشنبیران هێندەی بۆ خواردن و خوێندنەوە دێن بۆ چیا، بۆ شتێکی دی نایەن. هەڵبەت منیش حەزم لە دیالۆگە فەلسەفییەکان بوو، بەڵام دواجار لەو سەردەمەدا بوونی هیچ فەلسەفە و ئایدیایەکم بۆ شۆڕش بە گرنگ نەدەزانی. لە نامەکانمدا بۆ هەڤاڵانی سەرکردایەتی، گووتم « شۆڕش ئەوەندەی پێویستی بە ئازایەتی و گیانفیدایی هەیە، پێویستی بە قەپۆزی زل نییە. من وادەزانم زۆربوونی ڕۆشنبیران لە شۆڕشدا، جگە لەوەی کە هێزی شۆڕشگێڕانەمان کزدەکات، لە دواجاریشدا لە زیندانی ژیانەوە دەمانباتە ناو زیندانی کتێب».

زۆربەی خەت و شانەکان بە جۆرێکی ورد ئیشیاندەکرد، بەڵام لەلایەن نزار ئیدریسەوە شتەکان خێراتر دەڕۆیشتن، توانای نزار لە سەر ڕێکخستن لەوانی تر گەورەتر بوو. بەڵام هەر جارێک بمدیبایە وا قسەیدەکرد وەک ئەوانەی پەیوەندیان بەوەوە هەیە ئەندامبن لە حیزبێکی تایبەتیدا کە خۆی سەرکردایەتی دەکات.

زۆربەی ئەندامانی شانەکەی نزار لە قەساب و عەتار و دەستگێڕ و گەنجانی سەرەڕۆبوون، لەو سەردەمەدا کە هێشتا سەرەتا بوو، دەمانویست ڕێکخراوەکانمان شتێکی ئەوتۆ نەکەن سەرنج ڕابکێشن، بەڵام نزار کە سەرەتا ئەردەڵانی هیرانی و دواتر من بەرپرسی بووم، هەمیشە بۆ خۆی و سەربەخۆ ئیشیدەکرد. لەگەڵ بولبولیاریشدا گەرچی من بە سەرزارەکی پەیوەندییم گەلێک دۆستانە بوو، بەڵام دیسپلینی شۆڕشگێڕانەم بواری نەدەدا چاوپۆشی لە هیچ بکەم. من لە ڕاپۆرتەکانمدا ئەوەم ڕوونکردەوە کە ئەو خەتەی هۆشەنگی بولبولیار نوێنەرایەتی بەشێکی دەکات، دەشێت لە سەر پاشەڕۆژی شۆڕش مەترسییەکی بەرچاو دروستبکات. بە وردی

هەڤاڵانم لەوە ئاگادارکردەوە کە کۆکردنەوەی ڕۆشنبیر و خوێندەوار و کۆلکە مارکسی شۆڕش دەگۆڕێت بۆ هەمانەیەکی بەتاڵ و لەشێکی ئیفلیج، بۆ یانەی کۆبوونەوەی کۆمەڵێک شۆڕشگێڕی بێکار، کە ناتوانن زمانی راستەقینەی کارکردنی شۆڕشگێڕانە بدۆزنەوە.

کە چووم بۆ ئەوەی جارێکی تر لەگەڵ منداڵانی غەمپاشادا کۆببمەوە، لای بولبولیار دەستەیەک لە گەنجانی زانکۆم بینی، هەندێک لە کوڕی هەژارترین خێزانەکانی شار. هەستمکرد کۆبوونەوەکانی پێشووتریان زۆربەی لە سەر هەندێک تەوەر و کتێبی تایبەتی بووە. لەو کۆبوونەوەیەدا «غەنی مامەند، هوشیار سوهەیل، ئازاد بەهجەت، سەفین خۆشناو » م ناسی. من دەمویست لە سەر سروشتی ڕێکخراوەکان قسەبکەم، دەربارەی ئەوانەی کە دەکرێت بیانهێنینە ڕیزی شۆڕشەوە، من لە مەکتەبی سەرۆکەوە پێیان گووتبووم کە زۆر بە خێرایی هەوڵبدەین بنکەی شۆڕش فراوانبکەین و جەماوەر کۆبکەینەوە. بەڵام زۆربەی گەنجەکانی گروپەکە بە حەماسێکی بێوێنەوە ئەدەبیاتی مارکسیان دەخوێندەوە، سووربوون لە سەر ئەوەی شۆڕش بە شوناسێکی کرێکارییەوە دەست پێبکات. من بیروبۆچوونی خۆم بۆ ڕوونکردنەوە و گووتم کە شۆڕش شوناسێکی دیاریکراوی نابێت، هەر شوناسێک دەشێت وەک قەفەزێکی ترسناکی لێبێت و وابکات ئاسان گەمارۆبدرێین. بە زمانی سیاسییەکی دڵسۆزی ئەو دەور و زەمانە، دەنگم لێهەڵبڕی و گووتم « شۆڕش هیچ نییە جگە لە هەوڵێکی بەردەوام بۆ گەورەکردنی تورەیی میللەت... هەموو میللەت... هەموو مرۆڤێک».

بولبولیار ئەو ڕۆژە یەکەم کەس بوو قسەیکرد. لە ڕاستیدا شانەکەی ئەوان وەک شانە حیزبییەکانی دی سەرۆک شانەی نەبوو، بولبولیار تەنیا وەک ئەندامی پەیوەندی کاریدەکرد، هەموو شانەکە لەوانە بوون کە باوەڕیان بە سەرۆک نییە، یاخود هیچیان نایانەوێت سەرۆک بن. بەڵام ئەوەی گرنگ بوو، من لە سەرەتاوە جیاوازییەکی قووڵم لە نێوان

بولبولیـار و هاوڕێکانیـدا بینـی، جیاوازییـەک کـە هەمیشـە گرنـگ و گـەورە دەمێنێتـەوە. «ئـازاد بەهجـەت» کـوڕە هەژارێکـی غەمپاشـا بـوو، باوکـی سەوزە و خەیار و تەماتـەی لـە سـەر عەرەبانەیەکـی دەستی دەفرۆشت، بـە منـی گـووت «ئـەو قسانەی ئێـوە لـە سـەر شۆڕشـی بنکەفـراوان، بۆچوونـی وردە بۆرژواکانـن... هەمـوو مرۆڤـەکان ناتوانـن شۆڕشـگێڕبن. شۆڕشـگێڕێتی سـیفەتی چینـی چەوسـاوەیە. گـەر مرۆڤـەکان هەمـوو شۆڕشـگێڕبن، کـێ شـۆڕش بـە سـەر کێدا بـکات؟ شـۆڕش چـۆن دەبێـت بـە قەشمەریاتی وەهـا دەسـت پێبـکات؟». بـە سەرسـامییەوە گووتـم «ئێمـە شـۆڕش بـە سـەر فاشیسـتە بەعسـییەکاندا دەکەیـن، هەموومـان وەک نەتـەوە ئـەو شۆڕشـە دەکەیـن. لەبیرتچۆتـەوە کـە ئێمـە دژ بـە عەرەبـەکان لـە جەنگدایـن؟».
ئـازاد، هوشـیاریی چینایەتـی خـۆی تێکـەڵ بـە خوێندنەوەیەکـی زۆر کردبـوو، ئـەوە لەبەرچـاوی مـن کـردی بـە کەسـێکی ترسـناک، ئـەو لـە سـەرەتاوە سـووربوو کـە مـن وردەبۆرژوایەکـی ترسـناکم و عەقڵـم پـڕە لـە قـوڕاوی ناسیونالیسـتە چەپەڵـەکان. لـە سـاڵانی شۆڕشـدا مـن سـێ جـۆر ئادەمیـزادم لـە نـاو شۆڕشـگێڕاندا بینـی، کـە هـەر سـێکیان بـۆ مـن مایـەی پەشـۆکان و نائارامـی بـوون، یـان لـە ڕاسـتیدا مـن ترسـناک دەمبینیـن: ئەوانـەی شۆڕشـگێڕ نیـن و لەبـەر هـەر هۆیـەک بێـت لـە شۆڕشـدا دەمێننـەوە، ئەوانـەی تەنهـا شۆڕشـگێڕان بـە مـرۆڤ دەزانـن و تـەواوی مرۆڤەکانـی تـر وەک دوژمنـی خۆیـان سـەیردەکەن، لەگـەڵ ئەوانـەدا کـە شـۆڕش لـە کتێبـەوە فێردەبـن. جـۆری سـێهەم ترسـناکترین جـۆری شۆڕشـگێڕن، ئەوانـەن کـە هەرگیـز ناگەڕێنـەوە، شـۆڕش بـۆ ئـەوە ناکـەن بچنـە ژێربـاری سـەرۆکێک یـان هێزێکـی سیاسـییەوە، بەڵکـو بـە ڕاسـتی بـۆ گۆڕینـی دونیـا شۆڕشـدەکەن، واتـە هەمـوو یارییەکـە زۆر بەجیـدی وەردەگـرن. ڕزگارکردنـی میللەتیـان پـێ گرنـگ نییـە، بەڵکـو گۆڕینـی دونیـا ئامانجیانـە... مـن سـەرەتا جیاوازییەکـی زۆر ڕوونـم لـە نێـوان ئـەو دوو چەشـنە ئومێـدەدا نەدەبینـی، بـەڵام ڕۆژێکیـان

«جەمال چاوشین» کە ئەندامێکی بەرزی ئەنجومەنی باڵا بوو، ئەو جیاوازییەی بە شێوازە کۆمیدییەکەی خۆی بۆ ڕوونکردمەوە و گووتی «ئەوانەی دەیانەوێت دونیا بگۆڕن، پێویستیان بە ئێمە نییە، من و تۆ لای ئەوان سەلکێ ترخێنەی وشک ناهێنین. لە ڕاستیدا ئێمە لەو کارەدا کەسانی بێمەنفەعەتین، تا بڵێی بێمەنفەعەتین، چونکە گۆڕینی دونیا بە ئێمە ناکرێت، ئێمە دەتوانین بەعسییەکان ڕاوبنێین، بەڵام لەدوای ئەوە چی لە دونیادا ڕوودەدات بەس خودا دەزانێت... ئەوانەی دەیانەوێت دونیا بگۆڕن، دەیانەوێت تێبگەن دوای ئەوەش چی ڕوودەدات... ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی باشیان لێدەرنەچێت، یەعنی بە دڵی ئێمە نەبن. مرۆڤی باش کاری وا گەورە ناگرێتە ئەستۆ، هەر وەخت ئینسان بەردی گەورەی هەڵگرت، گەر نەشیهاویشت هەر لێی بترسە».

ئازاد بەهجەت بە ئاشکرا پێش کۆبوونەوەکەمان، شتێک شەرابی خواردبووەوە، دواتر زانیم پێش هەموو کۆبوونەوەیەک خۆی مەستدەکات و ئەوسا دێت. گەرچی هەژاربوو، بەڵام هەموو فرۆفێڵێکی بەکاردەهێنا تا هەندێ هاوڕێی پارەدار پەیدابکات، بە پاڕانەوەی زۆر و بە خۆ هەژارکردن ڕازیانبکات شەرابی بۆ بکڕن. هەمیشەش بەهانەی ئەوەبووە کە مرۆڤ بەبێ مەستی ناتوانێت ئازادانە قسەبکات. گەنجێکی چاوشینی بچکۆلە بوو، دەموچاوێکی جوانی هەبوو، کاتێک قسەیدەکرد لە ژێرەوە بە چاو سەیری دەوروبەری دەکرد، گەرچی هەر حەرفێک لە زاری دەهاتەدەرێ بۆنی یەقینێکی تەواوی لێدەهات، بەڵام سەیرکردنەکانی هەمیشە شتێک لە گومانی قووڵیان تێدابوو، گومان لە هەموو ئەوانەی تەماشایاندەکات. بەردەوام دەستەسرێکی سوور لە پشتملیدا بوو ، زوو زوو دایدەگرت و دەموچاوی پێدەسڕی و دەیخستەوە پشتملی، کاسکێتێکی ئەستووری خوری کردبووە سەری کە لەگەڵ هەوا و جێگا و سروشتی دانیشتنەکەماندا نەدەگونجا، هەر کات کاسکێتەکەی دادەنا، دیمەنی باشتر و جوانتر

دەردەکەوت، گووتی «بێگومان ئێمە شۆڕش بە سەر نەتەوەیەکی تردا ناکەین، شۆڕشی ئێمە دژی هەموو ئەوانەشە کە تێناگەن شۆڕشگێڕان نیشتیمانیان نییە، نەتەوەیان نییە... بەڵکو تەنیا چینێکیان هەیە کە لە ڕێگایەوە مرۆڤایەتی ئازاد دەکەن. مامۆستا جەنگیز، هیوادارم سەرانی شۆڕشی نوێ بە ڕاستی بیریان لێکردبێتەوە، ئەم شۆڕشە نابێت بە هەمان ڕەوتی شۆڕشی بارزانییەکاندا بڕوات، نابێت سەرانی هەموو ئاغا و فیوداڵە نەگریسەکان بن، ئەوانەی میللەت وەک پاڵە و ڕەنجدەری خۆیان تەماشادەکەن. ئێمە لێرە وەک نوێنەرانی تەبەقەی زەحمەتکێش ئەوەیان لێ قەبووڵ ناکەین». من گووتم «ئەها... ئەها... بە ڕاستە؟ لێیان قەبووڵ ناکەن؟ زۆرچاکە من تەواوی قسەکانت بە وردی دەگەیێنم، وەکو خۆی بێ زیاد و کەم». هاوڕێکانی دیکەشی پێکڕا لە سەر ئەو بڕوایە بوون کە ڕۆحی شۆڕشی کۆن، ڕۆحێکی شەیتانی بووە، جانەوەران و تارمایی تاریک لە ناخەوەڕا دەستیان بە سەردا گرتووە، لەو شۆڕشانەبووە کە دەرگایان لە سەر سەردەمێکی تازەی کۆیلەیەتی کردۆتەوە، بۆیە گرنگە لە سەرەتاوە شۆڕشی نوێ بە ناوی ئەوانەوە قسەبکات کە دەتوانن دونیا لە ڕیشەوە بگۆڕن. غەنی مامەند هەرکات ئەو ڕستەیەی بەکاردەهێنا، بە جۆرێکی سەیر دانی بە حەرفەکاندا دەنا «دوننییا للە ڕڕڕیشششەوە بگگگۆۆۆڕڕڕیینن». کەوای دەگووت هەستمدەکرد خەریکە دەمارەکانی درزدەبەن و خوێن لە ڕەگەکانی مل و لاچاوانییەوە دێتەدەرێ.

بولبولیار دژی هەموومان وەستایەوە و گووتی «شۆڕش هیچ کات نە نەتەوە و نە چینێک ڕزگارناکات، شۆڕش بەرگری مرۆڤە لە خۆی، بەرگری مرۆڤە لە برای ئینسانی، تەنیا شتێک شۆڕش دەتوانێت بیکات ئەوەیە نەهێڵێت مرۆڤ بکەوێتە دۆخی دیلێتی تەواوەتی یان بگەڕێتەوە بۆ ژیانی ئاژەڵئاسا، لەو دووانە دەرچێت شۆڕش کارێکی تری نییە، ڕزگاریی شتێک نییە لە توانا یان لە بەرنامەی هیچ شۆڕشێکدا بێت».

پێشتر باوەڕم نەدەکرد بولبولیار بتوانێت وەها توند و لە ڕوو دەنگ بەرزیکاتەوە، هێمنی ڕوخساری لەگەڵ ئەو تۆنە توندەی ناو قسەکانی ئەوشەوەدا نەدەگونجا.

من لە ژیانمدا کەسانی زۆرم دیوە کە هەرگیز ئامادەنین بۆ بیروڕای خۆیان شەڕبکەن، لە ڕاستیدا بەشی هەرە زۆری ئادەمیزادان ئامادەنین لە پێناوی هیچ ئایدیایەکدا شەڕبکەن، گەر لە شەڕیشەوە بئاڵێن، ئەوە نیشانەی ئەوە نییە کە ئایدیاکانیان خۆشدەوێت و دڵسۆزی بۆچوونەکانیانن. نا بە هیچ جۆرێک، بەڵکو هەندێکیان شەرم دەیانگرێت، هەندێکیان دەترسن، هەندێکیان تەنیا وەک سەیرکەر دێن و دواتر دەکەونە جەنگەوە، هەندێکیان نایانەوێت تەنیا بمێننەوە. لە ڕاستیدا مرۆڤێک بدۆزینەوە کە بە دڵ و گیان بۆ بیروبۆچوونی خۆی بجەنگێت، نمونەیەکی دەگمەنە. بەڵام ئەو شەوە کە سەیری ئەو گروپە بچوکەم لە خوێندکارانی زانکۆ کرد، کە سەیری چاویانم کرد و بۆنی ئەو فەزایەم کرد کە لە ژوورە ناچیز و خاڵییەکەی ماڵی ئازاد بەهجەتدا بوو... بۆنی ئەوەم کرد لەم ژوورەدا کەسانێک هەن ئامادەن بۆ بیروبۆچوونەکانیان بمرن. کێشەی هەرە گەورەش ئەوەبوو کە بیروبۆچوونەکانیان بە جۆرێک لە جۆرەکان لەگەڵ سیاسەتی شۆڕشدا ناتەبا و دوژمن بوو... ئەوە خەتەرترین دۆزینەوەیەک بوو لە گەشتی ئەو جارەدا، هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە دوژمنانی شۆڕش بەوجۆرە گیانفیدا بن.

وەک هەمیشە بێدەنگ کارمکرد، هیچم لە سەر ترسەکانی خۆم نەگووت، پێکەنیم، گوێمگرت، یەک بەیەک سیفات و ناوی منداڵانی غەمپاشام لای خۆم تۆمارکرد، شەو کە گەڕامەوە بۆ ماڵێ، ئەو ڕاپۆرتەم نوسی کە تێیدا بۆ یەکەمجار ئەنجومەنی باڵا و شەخسی سەرۆکم بە وردی لە بوونی ئەم بوونەوەرە ترسناکانە ئاگادارکردەوە.

# پەتروس

کە یەکەمجار هۆشەنگی بولبولیار، نەغەدە ماردینی بینی، بێئەوەی بزانێت بۆ، بەرەو ڕووی ڕۆیشت، لە بەردەمیدا بەبێدەنگی وەستا، سەیرێکی قووڵ و درێژی کرد، بێئەوەی هیچ بڵێت، بێئەوەی بتوانێت دەمبکاتەوە، بێئەوەی وشەیەک بدۆزێتەوە، گەڕایەوە دواوە.

چەندین ساڵ دوای ئەوە کە نەغەدە ماردینی باسی ئەو ساتەی بۆ کردم، وەک تەنیا چرکەیەک تەماشای دەکرد کە دەکرا هەموو شتێک بگۆڕێت، تەنیا فرسەتێک کە دەکرا ژیانی ئاڕاستەیەکی تر وەربگرێت. ساتێک گەر بە ڕاستی کڵپەیەک لە ناخی هەردووکیاندا گڕیبگرتبایە، دەکرا ببێتە خاڵێکی وەرچەرخان. بەڵام ژن و پیاو وەهان، هەندێجار شتێک هەیە چەندە ئاگری پێوەبنێیت گڕناگرێت، هەندێجار گڕدەگرێت و هەرگیز ناکوژێتەوە، هەندێجار گڕدەگرێت و دەکوژێتەوە، ئیتر دواتریش چەندە بتەوێت بسووتێت و جارێکی تر کڵپەبکاتەوە نایکاتەوە، هەندێجاریش زۆر بێمانایە، زۆر ئازاربەخشە، زۆر کوشندەیە، گڕدەگرێت و دەکوژێتەوە... گڕدەگرێت و دەکوژێتەوە... گڕدەگرێت و دەکوژێتەوە و تامردنیش بەوجۆرە بەردەوام دەبێت.

ئەو ساتەی کە هۆشەنگی بولبولیار هێزێکی نهێنی بەرەو لای ماردینی ڕایکیشا، ئەو لە کافیتریای زانکۆ، لە ناو دەنگە دەنگی سەدان قوتابی کوڕ و کچدا، بە تەنیا لە سەر کورسییەک وەک ئەمیرەیەک، وەک ژنە جوانەکەی دکتۆر مستەفا شوکاک، وەک بووکەخانی زانکۆ، وەک خوێندکار، وەک شاعیرە، دانیشتبوو. بە ویقاری هەموو ئەو وەزیفە جیاوازانەوە، مەکیاژێکی سەردەمی حەفتاکانی کردبوو، بە بێدەنگیش

کۆلای دەخواردەوە. بولبولیار هەستیکرد شتێک بەرەو ئەم ژنەی ڕادەکێشێت، شتێک دواتر دەزانین خۆشەویستی نییە، سەرسامبوون نییە بە جوانی ئەو، سەرسامبوون نییە بە جلوبەرگی، بانگهێشتێکی ئیرۆتیریکی یان مستیکیانە نییە، شتێکی سەیرتر و ئاڵۆزترە، شتێک دواتر من ناویدەنێم وێڵبوونی بولبولیار بە دوای شیعری راستەقینەدا، بەڵام ئەو کات ناوی نییە، لەو ساتەدا کەسیان نازانن چییە. شتێکە نەغەدەش لە دوی خۆی کێشدەکات، پاڵی پێوە دەنێت لە جێگای خۆی هەستێت و بەرەو ئەم گەنجە بڕوات کە چاوی شتێکی تێدایە لە چاوی شاعیران دەچێت، بەڵام نا شاعیر نییە... شتێکیشی تێدایە دڵی نەغەدە کڵپەی بۆ ناکات، بەڵام هەستێکی نهێنیتر و ئارامبەخشتری لە عەشق تێدا دروستدەکات... دڵنیاییەکی بێسنوور و بێبن.

دوای دوو ڕۆژ کە نەغەدە ماردینی لە یەکەم کۆڕە شیعردا لە هۆڵی زانکۆ بەشداریکرد، وەک سێهەمین بەشدار چووە بەر مایکەکە و دەستیکرد بە خوێندنەوەی قەسیدەی «بۆنی پڵنگی بریندار». لە کاتی خوێندنەوەدا دووبارە هەستی بەو چاوە هێمن و قووڵ و جوانانەی هۆشەنگی بولبولیار کرد، هەستیکرد بە درێژایی شیعر خوێندنەوەکە ئەو چاوی لێ ناتروکێنێت. هەموو ژنێکی زیرەک دەتوانێت نیگای عاشقان لە نیگاکانی تر جیابکاتەوە، ئەو جیاکارییە شتێکی غەریزییە. هەر خانمێک هەستێکی ژنانەی کامڵی بێت، لە ئاست سەیرکردنی وادا دەتوانێت تێبگات ئایا نیگای عاشقانەیە یاخود نیگایەکە هیچ لە ژنێتی ئەو ناخوازێت. ئەمجۆرە نیگا پاک و بێلایەنەی دووهەمیان زۆر کەمە، غەریبە بە کولتووری سەیرکردنی پیاوانی ئێمە... بەڵام هەیە. زۆربەی ژنان نایانەوێت باوەڕ بەبوونی نیگای لەوجۆرە بکەن، نیگایەک پەیوەندی بە عەشق یان شەهوەت یان فزولی نێرانەوە نەبێت، بەڵکو سووک و سادە خواست و مانایەکی تری هەبێت. ئاە لێگەڕێن. ئافرەتان دەیانەوێت

هەموو سەیرکردنێکی ئێمە تەنیا بە جوانی جەستەی خۆیانەوە گرێبدەن، بەڵام من دڵنیایاندەکەمەوە کە وا نییە، ئێمەی پیاو چەندین جۆرە نیگامان هەیە، بەڵام ژنان هەمیشە هەموو جۆرەکانی ڕوانینمان تەنیا بۆ یەک شێوە کورتدەکەنەوە.

نەغەدە ئەو ڕۆژە دەمودەست تێگەیشت نیگاکانی بولبولیار نیگای عاشقانە نین، بەڵکو هەڵگری جۆرە مانایەکی ترن... نیگای کەسێکە لەدوورەوە خنکان و نوقمبوونی ئەم دەبینێت و دەیەوێت ڕزگاریبکات، نیگای پیاوێکە کە نایەوێت بیرفێنێت، بەڵکو دەیەوێت لە گێژەنێک دەریبهێنێت و دواتر ئازادیبکات. بۆ چرکەیەک هەستیکرد لە خاوەنی ئەم دوو چاوە هێمن و قووڵەوە زۆر نزیکە... بەڵام ئەم کوڕە کێیە کە شێوەی خاڵی نییە لە شێوەی کەسێک نهێنییەکی شاردراوەی هەڵگرتبێت؟. ئاە، خوایە... نەغەدە لەو دوو ساڵەدا دەیانجار بیری لە یەک شت کردبووەوە، یەک شتی زۆر بێمانا کە قەت ناوێرێت لای هیچ کەس بیدرکێنێت، هەتا کە خۆشی بیریدەکەوێتەوە خێرا پەردەیەکی پێدا دەدات و وازی لێدەهێنێت. بیری لە «جۆرەکانی پیاو» کردبووەوە، هەڵبەت لە ڕووی شێوە و ڕوخساری دەرەکییەوە نا، بە پێوانەی قەد و قەڵافەت و ماسولکە نا. بەڵکو جۆرەکانی پیاو بەو چەشنەی کە کامیان دەشێت زۆر سیحریان لە سەر ئەو هەبێت. وای خوایە، سەختترین شت بۆ ژنێک ئەوەیە بزانێت چ جۆرە پیاوێکی دەوێت. لەو ڕووەوە چەندە ژنان بە خۆیاندا هەڵدەن، چەندە بڵێن ئێمە جێگیرترین، کەمتر مەیل دەگۆڕین، باشتر لە پیاوان دەزانین چیمان دەوێت، من ناچمە ژێر باری قسەیان و بەڵگە و بەهانەیانم قەبووڵ نییە. من دڵنیاتاندەکەمەوە شتێکی دەگمەنە خانمێک بدۆزیتەوە بە تەواوی بزانێت چ جۆرە پیاوێکی دەوێت. کاری پیاوان لەو ڕووەوە سادەترە، ئەوان باشتر دەزانن چ جۆرە ژنێکیان دەوێت. بەڵام کێشەی پیاوان لەوەدایە کە دەزانن ئەو ژنەی

بۆی دەگەڕێن بوونی نییە، پیاوان هەمیشە بۆ ژنێکی خەیاڵی دەگەڕێن کە لە سەر زەوی نایدۆزیتەوە، خۆشیان ئەو ڕاستییە دەزانن و بێدەنگ ملدەدەنە بەر قەبووڵکردنی جێگر و ئەلتەرناتیڤەکانی ئەو خەونە، بەڵام خانمان وانین، ئەوان بە جۆرێک سادە و خۆشبڕوان پێیانوایە ئەو پیاوەی لە خەیاڵیاندایە هەیە، دەشێت ببینن و بیدۆزنەوە، لە ڕێگاویان یان لە شوێنی کار یاخود لە بەر ماڵە دراوسێدا ڕێکەوتیبکەن... ئەوەش تووشی بەدبەختی زۆریان دەکات. نەغەدە ماردینیش وەهابوو، خۆشی بە تەواوی نەیدەزانی چی دەوێت، ئێستا لەگەڵ دکتۆری مێردیدا دڵخۆش نەبوو، بەڵام بێئەوەی بزانێت بۆ. چ موسیبەتێکی گەورەیە شووبکەیت و لە پڕێکدا بێ هیچ هۆ و بەهانەیەک غەمگین بیت... بێئەوەی مێردەکەت خراپ بێت، لە هیچی کەم بێت، یان جوان نەبێت، یان خاڵی بێت لە عەشق، بەڵام تۆ وەک بەدبەختێکی ئەبەدی نەتەوێت بە چارەنوسی باشی خۆت ڕازی بیت و هەر بتەوێت شێتێتی خۆت بژیت و نەگبەتی خۆت تاقیبکەیتەوە. مرۆڤانێک لەم سەر زەوییەدا هەن تا بەدبەختی نەبینن نازانن کە ژیاون، هەستی ژیان لەلایان گرێدراوی ئەو بەدبەختیانەیە کە خۆیان بۆ خۆیانی دروستدەکەن، بەدبەختی ڕووداوێک نییە تووشیببن و ڕێکەوتێکی ناحەز نییە قەدەر بیخاتە سەر ڕێگەیان، بەڵکو خودی ژیانە کە لە مەستیدا دەستی لێدەدەن، گەر بێتو دەستیشی لێ نەدەن نازانن ژیاون، وامەستدەکەن ترپەی ڕاستی ژیان تەنیا لە ژێر خۆڵەمێشی نەهامەتیدایە و جگە لە دەستبردن بۆ بنی ئەو ژیلەمۆ گەرمە، چارێکیان نییە. لای نەغەدە «دونیای پیاو» هەمیشە جێگایەکی پڕ نهێنی و قووڵ و سەرشار بە فانتازی بووە. لەو ژنانە نەبوو ڕقی لە هەموو پیاوێک بێت، هەڵبەت ڕقی لە هەندێکیانە، بەڵام هەموویان نا. پیاوان دەشێت مەخلوقاتی قەشەنگ بن، دواجار برێکی زۆری ئاوەدانی ئەم ئەستێرەیە ئەوان دروستیانکردوە، هەڵبەت بێئەوەی لەو حاڵەدا خانمان بە کەم

بگرێت. ماردینی لەو ژنانەش نییە کە دوژمنی جنسی خۆیانن، ژنانێک شێتدەبن کاتێک خانمێکی لە خۆیان باشتر دەبینن. بەڵام دونیای پیاوان سیحراوی و فراوانترە، پریشە لە بانگەوازی فریوئامێز، لە دەنگگەلێک بەو دەڵێن «نەغەدە ماردینی تۆ لە کوێیت... وەرە... بۆ نایەیت». نەغەدە هەر کات بە شاردا دەگەڕا، ڕقی لەوە بوو پیاوان هەموو دونیایان داگیرکردوە، بەڵام سەرسام بوو بەوەی هەموو ئەم خانوو و شەقام و قولکە و شۆستانەی ئەو دەیانبینێت، پیاوان لە سەریەکیان ناوە و ئەوان بە زەویدا کێشیانکردوە. زۆرجار بیریدەکردەوە گەر پیاوان نەبوونایە دونیا لە چی دەچوو؟ واتە وادابنێین هەر لە ئەزەلەوە، ئادەم بمردایە و بە هەر هۆیەکی تر بێت حەوا بیتوانیبایە زاوزێبکات و جنسێکی وەک خۆی دروستبکاتەوە، ڕەنگی جیهان ئێستا چ جۆرێک دەبوو؟. گەر بەیانییەک هەستابایـن و بماندیایە هەرچی پیاوە بە ڤایرۆسێک مردون، ڤایرۆسێکی تایبەتی کە تەنیا پیاو دەکوژێت، ئەو کات ژیان چی لێدەهات، شارەکان چییان لێدەهات، سروشت چی لێدەهات؟؟؟. نەغەدە دڵنیابوو گەر پیاوان نەبوونایە، ئەم ئەستێرەیە زۆر ناخۆش دەبوو، وەک چۆن گەر ژنیش نەبایە، پیاو ئەم شتە سەیر و جوانانەی سەر ئەم ئەستێرەیەی بۆچی بوو؟. دڵنیابوو هەموو ئەم شتانەی پیاو دەیکات لە بەر ژنە، پێکڕای لە بەر ژنە... گەر ژن نەبایە، پیاوان لە دۆخی حەیوانی دەرنەدەچوون، هەمیشە وەک مانگایەکی زل دەکەوتن و گژوگیایان دەخوارد و دەیانبۆڕاند. ئەوەی پیاوی کردوە بە مرۆڤ بوونی ژنە لە سەر ئەم ئەستێرەیە. گەر شەوێک هەستین و هەموو ژنان بە ڤایرۆسێکی نادیار مردبن، دوای چەند ساڵێک پیاوان یان یەکتر قڕاندەکەن، یان دەبنەوە بەو حەیوانەی جاران و لە وێرانەی شارەکان و لە پیس و پۆخڵی خۆیاندا دەخنکێن. هەر یەکەمجار کە لەگەڵ مستەفا شوکاکی مێردیدا خەوت و گەیشتە ترۆپکی لەزەت، دوای تەواوبوون، دوای ئەوەی مستەفای مێردی شەکەت

لە عارەقی خۆیدا خەوی لێکەوت، لە دڵی خۆیدا گووتی «سوپاس خودایە کە پیاوان هەن». ئەوە یەکەمجار بوو لە دڵەوە سوپاسی خودابکات. ئەو ڕۆژەش کە هۆشەنگی بولبولیاری بینی، بێئەوەی هیچ هەستێکی جنسی بەرامبەری هەبێت، هەمان شتی گووت «سوپاس خوایە کە پیاوان هەن... سوپاس». دڵنیابوو کە نێرەکانیش لە ناخی دڵدا دەڵێن سوپاس خودایە کە ژن لە سەر ئەم ئەستێرەیە هەیە. بەڵام یەکەم پرسیاری ئەوەبوو، هۆشەنگ چ جۆرە پیاوێکە؟ سەر بە کام توخمە لە توخمە جیاوازەکانی ناو نێران؟. ئایا لەو پیاوانەیە کە وەک زیخی زبر وەهان، لە ڕەقی و تیژی و بێگیانی بەولاوە هیچی دیکەیان تێدا نییە یان لەو جۆرەیە کە وەک فەرشی ئاوریشمن و چەند بە سەریاندا ڕابکەیت نازاکێن. یاخود لەو پیاوانەیە کە نەفامترین ژنیش ناتوانێت بەرگەی بۆشی و بەتاڵیان بگرێت، چونکە هەندێک بۆشی هەیە، ئەوەندەی بۆنی گەمژەیی لێدێت، بۆنی سادەیی لێنایەت... بەڵام پیاوی بۆشیش هەیە جوانن، سادەن، وەک ئاو وەهان... بەڵام بۆشی چییە؟ نەغەدە تا زیاتر شیعری دەخوێندەوە، زیاتر لە مانای بۆشی تێدەگەیشت. یەکەم پێناسەیەک ماردینی لە دامێنی یەکەم دەفتەریی شیعردا نوسیوێتی، دەڵێت بۆشی «ئەوەیە، نەتوانێت لە سنووری ژیانی ڕۆژانە دەرچیت». هەموو ئەوانەی لە قەفەزی غەمە ڕۆژانەکاندا دیلن، بۆشن. بەڵام نیگاکانی هۆشەنگ بۆنی ژیانی ڕۆژانەیان لێ نایەت... بۆنی شتێکی دییان لێدێت، بۆنی سەرکێشییەک ڕۆح بەرەو دەرەوەی ئەم دونیایە دەبات.

ئەو ڕۆژە کە لە شیعرەکەی بووەوە، هەستیکرد چیتر کچە سادە و نەبینراوەکەی جاران نییە، ئیتر کەسێک نییە تەنیا بە مستەفا شوکاکی مێردیدا بیناسنەوە. ئەوە یەکەمجاری بوو شیعر بخوێنێتەوە، لە کاتی خوێندنەوەدا بەر ئەو هەقیقەتە سادەیە کەوت کە سیحری دەنگی پتر

لە سیحری شیعرەکە کاریگەری جێدەهێڵێت. وەختەبوو لە ناوەڕاستدا بوەستێت، ئەوە ئەو ساتەبوو کە تێگەیشت خوێندنەوەی شیعر چ کارێکی ترسناکە. مرۆڤ هەرگیز تێناگات، ئایا ئەوانی دی بە ڕاستی گوێ لە شیعرەکە دەگرن یان گوێ لە دەنگ و هەناسەی ئەو دەگرن، لە کامیان؟ مرۆڤ لە یەککاتدا ناتوانێت گوێ لە هەردووکیان بگرێت، هەم لە شیعرەکە و هەم لە خوێندنەوەکەی. ئەوە ئەو ڕاستییە ترسناکە بوو کە وەختە بوو لە سەر شانۆکەوە بیخاتە خوارێ. بەڵام کە دابەزی، کاتێک زرینگەی حەرفەکان هێشتا لە گەروی خۆیدا تازەبوون، کاتێک مۆسیقای دەنگی لە گوێی ئەوانی تردا بوو... هەستی بە سێبەری بولبولیار کرد، هەستی بەو هێمنییە کوشندەیەی ناو چاوەکانی کرد کە لەگەڵ جۆش و خرۆشی دڵی ئەودا نەدەگونجا. لە نزیکەوە بینی، تەواو لە نزیکەوە. پیاوان یان ناشیرینن یا جوانن... پیاوی مامناوەندی نییە. بەڵام جوانەکانیش دوو چەشنن، یەکێکیان ئەوانەن کە بەر لە هەر شتێک جوانییەکەیان دەتباتەوە بۆ ناو دونیا، بۆ ناو کۆشک، بۆ ناو بازاڕ، بۆ سەفەر، بۆ بۆنی عەتر، بۆ سێکس، بۆ ناو جێگا، بەڵام جۆرە جوانییەکی نێرانەی تر هەیە، کە دەتباتەوە بۆ کتێب، بۆ دەریا، بۆ فڕین، بۆ کەنارە دوورەکان، بۆ نهێنییەکانی ناو زوڵمەت، بۆ بیرکردنەوە لە بوون، لە ماهییەتی شتەکان. جوانی یەکەمیان چەشنێکی زۆرە، بەڵام جوانی دووهەم جۆرێکی دەگمەنە. کەم پیاو هەیە ئەو جۆرە جوانییە میتافیزیکییەی هەبێت، چاوانی پڕبێت لەو بانگەوازە نهێنییانە... هۆشەنگی بولبولیار یەکێک بوو لەوانە.

کە بەخۆی و سێبەرە فێنکەکەیەوە دەرکەوت، نەغەدە هەستی بە ترس و بە خۆشیش کرد، بێئەوەی هیچ بڵێت، هۆشەنگ لە بەرچاوی هەمووان کاغەزێکی دایە دەست... کاغەزێکی تایبەت بۆ ئەو، بۆ بووکی زانکۆ، بۆ ژنە شاعیرەکەی دکتۆر مستەفا شوکاک کە چاوی هەموو

زانکۆی لە سەرە. لە دڵی خۆیدا گووتی «ئێستا هەموو وا هەستدەکەن ئەمە نامەیەکی دڵداری بێت». بەڵام بە جەهەنەم، ئەوانی دی هەست بەچیدەکەن با بیکەن... کەی ئەوانیدی لە ژیانیاندا هەستێکی راستیان هەبووە. لەوێدا بێئەوەی هیچ بکات و هیچ بڵێت: راستەوخۆ کاغەزەکەی کردەوە... بە سەرسامییەوە لێیڕوانی بەخەتێکی زۆر جوان لە سەر ڕووبەرێکی سپی نوسرابوو، قەسیدەی پەترۆس، لە نوسینی شارڵ بۆدلێر.

# ڕۆژی ترسە گەورەکان

## «دوای ئەوەی لای نەغەدە ماردینی هاتمەدەرێ... چی ڕوویدا؟»

گەرچی من لە سەرەتای ٢٠٠٩ دا، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی نەبووم. «دیارە من سەردەمانێکیش هەبووە پێش ئەوەی هەردوو ئیدارە مەلعونەکە یەکبگرنەوە، بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بووم»، بەڵام وام هەستدەکرد هیچم لە بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی کەمتر نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا لەو باوەڕەدابووم کە بە هەموو حیسابێک لەو بەهێزترم و مەسەلەی پۆستە ئیدارییەکە هیچ نییە جگە لە چاوبەستێک، چونکە چەندین جار لەلایەن ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای حیزبەوە ئەرکی چاوەدێری خودی سەرۆکی ئاسایشیشم پێ سپێردرابوو. واتە متمانەی حیزب بە من وایکردبوو، چاوەدێری سەرۆکی چاوەدێران بکەم، جاسوس بم بە سەر شای جاسوسانەوە. بەڵام ماوەیەک بوو شتێک گۆڕدرابوو... کە لای خانمی ماردینی هاتمە دەرێ، قوڕگم تەواو وشکبووبوو، دڵنیابووم یەکێک چاوەدێریمدەکات. بە درێژایی هەموو ژیانم تەنیا من خەڵکم چاوەدێریکردبوو.. من ئەو کەسە بووم چاوم دەخستە دوای خەڵک و

زانیاریم کۆدەکردەوە و بە دوای نهێنیدا دەچووم، بەڵام ئێستا لای خانمی ماردینی دێمەدەرێ و هەستدەکەم چاوەدێریدەکرێم، جۆرە چاوەدێرییەکی تەپکەئاسا. لە دەزگا بەوجۆرە سیستمەمان دەگووت «چاوەدێری هەمە لایەنە». واتە کەسی چاوەدێرکراو دەخەیتە تۆڕێکی وەهاوە، دەیان چاو لە یەککاتدا سەیریدەکەن، لە هەموو لایەک و گۆشەیەکەوە، بە جۆرێک ئەوەی چاوەدێریدەکرێت، دەکەوێتە دوودڵی و گومانێکی گەورەوە، بەردەوام لە خۆی دەپرسێت، من راستم یاخود هەڵە، بە راست لە ژێر چاوەدێریدام یاخود هەمووی خەیاڵاتی نەخۆشی خۆمە، وەسوەسەی واهیمە ڕەش و ترساوەکانمە. ئەوانەی لە خۆیان دەترسن و پێیانوایە دەشێت کەسێک سیخوڕییان بە سەرەوە بکات، خەیاڵیان تەنیا بۆ ئەوە دەچێت کەسێک یان دووان دوایانکەوتبێتن و بیانەوێت بزانن چی دەکەن... کەس باوەڕناکات سەد کەس لە یەککاتدا بە دوای ئەوەوە بن. گەر چاوەکان زۆربوون سەری لێدەشێوێت، توشی دۆخێکی دەروونی دەبێت، باوەر بە خۆی ناکات، هەموو کەسی لێدەبێتە جاسوس و گومانی ئەوەی لادروستدەبێت کە هیچیان جاسوس نین و ئەو تووشی ترس و دڵەڕاوکێیەکی نابەجێ بووە. لەمجۆرە دۆخانەدا، کەسی چاوەدێرکراو نازانێت بەڕاست چاوەدێردەکرێت یان هەموو ئەو شتانەی لە نزیکی دەگوزەرێن دروستکراوی واهیمەکانی خۆیەتی. ئەو سیستمە لە داهێنانی خۆم بوو، من ئەوجۆرە تەکنیکەی چاوەدێریکردنم داهێنا کە بە ڕاستی کەسانێکی شێتکرد. ئەو تەکنیکە کاتێک ئاسان هاتە دەستمان و مەیسەربوو، کە نیوەی میللەت بە پەرۆشەوە دەیویست ببێتە ئاسایش و نیوەکەی دی بنێتە ژێر پۆستاڵی خۆیەوە، ژمارەی کارمەندانی بێئیشی دەزگا وەها زۆر بووبوون، دەبوو تەکنیکێک بگرینە بەر بیانخەینە کارەوە. ئێستاش کە لای خانمی ماردینی هاتمە دەرەوە، هەستمکرد حاڵم بە حاڵی جاڵجاڵۆکەیەک دەچێت، بووبێت بە داوی خۆیەوە. تووشی هەمان

ئەو دۆخە ڕۆحییە دەبووم کە پێشتر قوربانیانی ئەمجۆرە تەکنیکە تیا ژیابوون. ئەوەی دڵنیا نەبووم، بە ڕاستی لە ژێر چاوەدێریدام یان نا، زۆر ئازاری دەدام. بەر لە هەر شتێک گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، لە قاتی دووهەمی دەزگای گشتی کاروباری ئەمنییەت. سیم کارتێکی نهێنی و تایبەتم هەبوو، چوومە تەوالێتەکان، مۆبایلەکەم دەرهێنا و سیم کارتەکەم گۆڕی و تەلەفونم بۆ «واعیزی پیر» کرد. بە دەنگێکی کز و نوساو پێمگووت «واعیز گوێم لێبگرە. هەموو کۆبوونەوەکانی جەمعییەت رابگرە... هەمووی... خۆشت ئاگاداربە، هەستێکی خراپم هەیە... تێمدەگەیت، هەستێکی زۆر خراپم هەیە، واتێدەگەم بە دوامانەوەن».
مەبەستم کاروباری «جەمعییەتی ژیانی ون» بوو. جەمعییەتێکی نهێنی بوو، شتێک بوو لە چەشنی کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکان، کۆمەڵەی پەرلەمانتارە دێرینەکان، کۆمەڵەی زیندانە سیاسییەکان، جەمعییەتی ژنانی شاخ. بەڵام جەمعییەتەکەی ئێمە ژێرزەمینی کاریدەکرد، زۆر نهێنی بوو، من لە ژێر فشارێکی زۆردا دامەزراندبوو، نزیکی دوو سەد ئەندامی نهێنیمان هەبوو، خەڵکانی جۆراوجۆر لە ڕێکخراوەکاندا بوون، بەڵام هێشتا زووە پێتانبڵێم ئێمە لە «جەمعییەتی ژیانی ون» چ شتێک کۆیکردبووینەوە. نا .. هێشتا زۆر زووە بێمە سەر درکاندنی ئەو جۆرە نهێنیانەی کە دڵنیام گەر تەواوی ئەو پاشخانە درێژە نەزانن کە ڕووداوەکانی پێوە بەندە، درکاندنیان دەبێتە جۆرێک لە شێتی و کاری نادروست.

من لە سەرەتاوە دەمزانی دامەزراندنی جەمعییەتێکی لەمجۆرە زۆر ترسناکە، دەمزانی لە ڕیزی سیاسییە گەورەکاندا ترسێکی گەورە دروستدەکات، لە بەرئەوە سووربووم لە سەر ئەوەی زۆر بە نهێنی بمێنێتەوە، هەڵبەت بەهانەی تریشم هەبوو، کە لە کاتی خۆیدا بۆتان

ئاشکرادەکەم. چەند ساڵێک بوو، وەک جەمعییەتێکی بچوک و سنووردار و نهێنی دەست بەکاربووین و هەستم بەوە نەکردبوو شتێک لە کاروبارمان ئاشکرابووە، هەڵبەت ئێمە لە سەرەتای کارکردنندا بووین، ڕێنماییەکانی من بۆ ئەندامانمان ئەوە بوو هەمیشە شتەکان ئاسایی بخەنەڕوو، خۆیان وادەرنەخەن کە نهێنییەکیان هەیە، شتە هەرە ترسناکەکانیان لە شوێنی بەرچاوەدا دابنێن، چونکە پیاوانی دەزگا هەر وەخت بۆ شت دەگەڕێن، تەنیا کونج و کەلەبەر و شوێنی تاریک دەپشکنن. «واعیزی پیر»ی یاوەرم، کە کۆنە سافاکییەکی پیر بوو، تەمەنی لە سەروو حەفتاوە بوو، ئەو ڕێکخەری پەیوەندی و کۆبوونەوەکان بوو «کە هەندێکی بە دەمامکەوە دەکران»... ساڵەهای ساڵ کاری جاسوسیکردن بووبوو بۆ دەوڵەتی شاهەنشاهی، پەیوەندی نهێنی بۆ چەندەها گەورە ئەندامی حیزبە کوردییەکان لەگەڵ سەرانی تاراندا سازکردبوو، هەموو شتێکی لە سەر پەیوەندی کۆنی سەرۆکە کوردەکان بەو دەزگایەوە دەزانی. بەڵام دوای ڕوخانی شاهەنشا، ساڵانێک بوو لە بازاڕی کۆنەفرۆشان ئامێری کارەبایی کۆن و ماتۆر و تەسجیلی شکاوی دەفرۆشت. بولبولیار یەکەمجار ئەوی بینی و دواتر من و واعیزی بەیەکتر ناساند.

من ئەو ڕۆژە کە بە خێرایی تەلەفونەکەم لەگەڵ واعیزدا داخست، هەستمکرد بۆ یەکەمجار لە ژیانمدا ڕاستیم لە درۆ بۆ جیاناکرێتەوە.

یەکێک لە هەرە سیفەتە گرنگەکانی پیاوی هەواڵگر، زیرەکییە. جەوهەری زیرەکیش ئەوەیە بتوانیت ڕاستی لە درۆ جیابکەیتەوە. ئیشەکەی ئێمە هەمووی لە سەر ئەو جیاکارییە ڕاگیراوە. هەر کەسێک نەتوانێت ڕاستی لە درۆ جیابکاتەوە، بەکەڵکی ئەوە نایەت بێتە ئەم کایەیەوە. من لەو ساڵانەدا کە بە ناو ژوورەکانی دەزگادا دەڕۆیشتم و سەرم لار دەکردەوە و ئەو هەموو موحەقیقە گێلەم دەبینی کە ژوورەکان و ڕاڕەوەکان و ڕێگاکانیان پڕکردوە، دڵم بە جۆرێکی سەیر تەنگ دەبوو. زۆربەی

«ڕادۆزەکان» «کە هەڵبەت وشەیەک بوو، من لە مێژە بەرابەر موحەقیق داماتاشیبوو و لە بیرەوەرییەکانمدا بەکارمدەهێنا». خەڵکانی دەستوپێ سپی و بێ ئەلفوبێ بوون. هەتا کاتێک تاوانباران ڕاستیان دەگووت، هەر بە شەق و قایش و زللە دەکەوتنەوە گیانیان و بۆ ڕاستییەکی دی دەگەڕان کە بوونی نەبوو. خراپترین ڕادۆزی دونیاش ئەوەیە بۆ ڕاستییەک بگەڕێت بوونی نەبێت. زۆربەی ڕادۆزەکان لەو گەنجە دڵڕەق و نەخوێندەوار و بێبەهرانەبوون کە تەنیا دوو هونەریان دەزانی، توڕەبوون و لێدان، ئەو دووانەش ناتوانن بە تەنها مرۆڤ بگەێننە هەقیقەت. بەیانیان کە بە پلەکەکانی دەزگادا سەردەکەوم، یەکە یەکە دێنە بەردەمم، هەموو ڕقیان لێمە، بەڵام هەموو بە گەرمییەوە سڵاوم لێدەکەن. ئەمڕۆ زۆریان ناوی کوردیان هەیە، ڕادۆز سالار، ڕادۆز جوانڕۆ، ڕادۆز شیلان، ڕادۆز شاباز، ڕادۆز هیوا، رادۆز ئاڵا... زۆربەیان زۆر گەنجن، زۆرینەشیان ناتوانن هەقیقەت لە درۆ جیابکەنەوە، ژنە رادۆزەکانیش تەواو وەک پیاوەکان دڵڕەق و ترسناکن.

ئەو ڕۆژە لە تەوالێتەکانی دەزگاوە بە نهێنی تەلەفونم بۆ واعیزی پیر کرد. دڵنیابووم هەوڵدەدەن لەوێش بزانن دەڵێم چی. بەڵام پێم لە واعیز داگرت، کارێکبکات جەمعییەت بۆ ماوەیەک کارەکانی خۆی بوەستێنێت، پێشمگووت، لە دەزگاوە بە دزییەوە تەلەفونت بۆ دەکەم و نابێت هیچ کەس، هیچ شتێک بزانێت. دوای تەلەفونەکە بە هێمنی هاتمەدەرێ و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. سەیری هەندێ نوسراو و حەواڵە و فایلم کرد، بێئەوەی ئارەزوویەکم هەبێت بیانخوێنمەوە، شتەکانم کۆکردەوە، ویستم دوا بەشی دەفتەری یاداشتەکانی خۆم، کە لە بیرۆ دامنابوو دەریبهێنم و بیخەمە جانتاکەمەوە و سوار ماشینەکەم بم و بگەڕێمەوە ماڵێ. بەڵام دەستم بۆ ناو چەکمەجەکە درێژکرد و دەفتەرەکەم نەبینی. هەموو چەکمەجەکانی مێزەکەم گەڕام، هەموو دۆڵابەکانی ژوورەکەم، ژێر

مێزەکان، ناو جانتاکەم، ناو هەندێ سندوقی تایبەت بە فایلی گرنگ، بەڵام نەمدۆزییەوە. دڵم بە خێرایی لێیدەدا، دەستم عارەقێکی زۆری کردبووەوە، بە قورسی دەمتوانی هەناسە بدەم. چوومە بەردەمی ئاوێنەی ژوورەکە و خۆم بینی، سەرێکی زلی ڕووتاوە، زۆر زلتر لە سەری هەر کەسێکی تر کە تا ئەوکات دیبووم، جووتێک چاوی ترساو، دڵێکی پەشۆکاو، دوو لێوی ئەستوور کە دەلەرزین، سمێڵێکی ناشیرینی ماش و برنج. دڵنیابووم یەکێک دەفتەری یاداشتەکانی منی بردوە، دڵنیابووم. بە پەلە لە ژوورەکەم هاتمە دەرێ، نەمدەزانی ئاخۆ لەو وێنەیەی خۆم ڕادەکەم کە لە ئاوێنەکەدا بینیم، یان لەو ترسە ناوەکی و کتوپڕەی لە ناوەوە دەیهەژاندم.

من چیتر ئەو مرۆڤە نەبووم کە بەر لە سی ساڵ، وەک گەنجێک لە سەر دەستی مامۆستا ئەسعەد چوومە کاری ئەمنییەتەوە. چیتر جەنگیز خانی حیزب نەبووم، زوحاکی شۆڕش نەبووم، تەیمورلەنگی ئاسایش نەبووم، گورگە نهێنییەکەی دەزگا نەبووم، جنۆکەکەی بابەگەورە نەبووم، بەڵکو دڵێکی ترساو بووم، لە شتێک هەڵدەهاتم خۆم دروستمکردوە، دەزگایەک ڕاویدەنام خۆم بەرد بە بەرد سەریەکم ناوە. ئێستا کەسێک بووم هەم لە ناو دەزگادام و هەم لە ناویدا نیم... هەم بەشێکم لە حیزب و هەم حیزب ڕاوم دەنێت... هەم جەلادم و هەم قوربانی. کاتێک گەیشتمە لای ماشێنەکەم، دڵنیابووم چەندەها چاو سەیرمدەکەن... نانا... دڵنیابوون وشەیەکی هەڵەیە، گەر دڵنیابوومایە باش بوو، بێدەرد بوو.. من نە دڵنیابووم و نە دوودڵ... کەسێک بووم، بێئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچم، هەڵدەهاتم و لە هیچ شتێکیش دڵنیانەبووم.

# دەرکەوتنەوەی لیڤیتانت لە بەرگێکی دیکەدا

دوو مانگ بەر لە هەرەسی ساڵی حەفتاوپێنج و کۆتایی گەورەترین شۆڕش لە مێژووی کورددا، لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی، دوای ئەوەی جوان خۆی شت، قاتە ڕەشەکەی «کە تازە کڕیبووی» ئوتوکرد، قژی بە دەرمانێکی تایبەت داهێنا، بە ویقارێکی ترسناکەوە، ویقاری کەسێک بڕیارێکی زۆر گرنگی ژیانی خۆی دابێت و بڕوات جێبەجێیبکات، لە ماڵ چووە دەرێ. لەوسەریش کە هاتەو... لیڤیتانت گەورەترین هەنگاوی ژیانی خۆی نابوو، بووبوو بە ئەندام لە حیزبی فاشیستییەکاندا، حیزبی بەعس.

ئەو ڕۆژەی لیڤیتانت چووە ژوورێ بۆ ئەوەی خۆی وەک ئەندامی حیزب ناونووسبکات، ژمارەی بەعسییە کوردەکان بە پەنجەی دەست دەژمێردران.

بە درێژایی ژیانی، ئەو ساتەی بیرناچێتەوە کە چووە ژوورێ بۆ بینایەی «فەرع». لە ناوەوە بینایەکی سارد و نسرم و تاریک بوو، کەسێک بە جلی حیزبەوە، بە سمێڵی حیزبەوە، بە زەردەخەنەی حیزبەوە، پێشوازی لێکرد و بە ڕیواقێکی درێژدا بردی. لیڤیتانت هەستی بە سەرمایەکی کوشندە کرد، هەستیکرد ژوورەکان بەو عەلادینە بچوکانە گەرم نابنەوە کە بە ترسەوە لە ناوەڕاستی بێدەنگییەکی گەورەدا دەسووتێن. کە یاوەرەکە بەرەو ژووری بەرپرسی فەرع بردی، کەسی دی لە ریواقەکاندا نەبینی، جێگاکەی وەک شوێنێکی چۆڵ و بێدەنگ هاتە بەرچاو. لەو ساتەدا کە بەرەو لای بەرپرس بەرێگاوە بوو، دڵی لیڤیتانت لە ساردییەک و هێڵنجێکی گەورە زیاتر هیچی تێدا نەبوو. دەیزانی دەستی داوەتە یارییەکی گەورە، بەڵام بە درێژایی ژیانی باوەڕی وابووە

کە ژیان یارییەکی ترسناکە، زۆر زۆر ترسناک، یارییەک دەبێت بەوجۆرە بیکەیت کە لەگەڵ تۆدا دەگونجێت. ژیان لای لیڤیتانت بەوجۆرەیە، نە پاکە و نە پیس... بەڵام وەک هەر یارییەکی تر ڕێسا و یاسای خۆی هەیە، یارییەک بە پێچەوانەی یارییەکانی ترەوە هیچ دادوەرێکی نییە، ئەگەر هەشبێت، دادوەرێک نییە سەر بەم دنیایە بێت، یان لێرە ئەنجامەکەی خۆتت پێبڵێ، کەسێکی دوورە، زۆر دوورە کە یاریزانەکان نایبینن، دەتوانن بیری لێ نەکەنەوە، ئازادن لەوەی بڕوا بە بوونی بکەن یاخود نا. لیڤیتانت ئەو ڕۆژە بە باڵا بەرزەکەیەوە، کە لە باڵای دیپلۆماتە هەڵاوێردەکان دەچوو، بەبۆنی عەترێکەوە کە لای عەترفرۆشێکی پیر کڕیبووی، بۆنێک لە شیرکەتی کۆکۆشانێلەوە، لە بەردەم ڕەفیق «حاچم» دا وەستا. لەو ساتەدا هەستیکرد کارتێک ڕادەکێشێت کە کەم یاریزان دەوێرن ڕایبکێشن. بەعسیبوون لەو دەمەدا شتێک بوو وەک ڕۆلێتی ڕوسی، وەک ئەوەی دەمانچەیەک بخەیتە سەر سەرت و بێئەوەی بزانیت گوللەی لەبەرە یان نا، بیچرکێنیت. بەڵام هەر یاریکەرێک بیەوێت سەربکەوێت پێویستی بە شتێک لە شێتی هەیە، هیچ گرەوێک تەنیا بە عەقڵ نابرێتەوە. ڕەفیق حاچم سێ مانگ بوو بەرپرسی فەرع بوو، تا ئەو کاتە ڕێکەوتی ئەوەی نەکردبوو، کوردێکی پۆشتەوپەرداخ، بە تەواوی هۆش و عەقڵی خۆی، بێ هیچ زۆرلێکردنێک، بە ئارەزووی دڵ، بە هەڵبژاردنی خۆی ببێتە بەعسی. ئێستا لە بەردەمیدا گەنجێکی جوان دەبینێت، بەو پەڕی چاوقایمی و نەترسانەوە هاتووە ببێتە ئەندام لە حیزبدا. ڕەفیق کە بۆی عەترەکە مەستیکردبوو، باوەشی پیاکرد و گووتی «بارک الله فیک ابني». ئەوە یەکەمین هەواڵ بوو، لەو ڕۆژە ساردەدا تینێکی گەرم بخاتە دڵی ڕەفیقەوە کە بە چاوێکی پڕ فرمێسکەوە، گووتی «خوا دەتانگرێت، ئێمە یەک میللەتین... عێراق وڵاتی خۆتانە، بۆ وای لێدەکەن». لیڤیتانت ئەو ڕۆژە هیچ لە ڕەفیق حاچم تێنەگەیشت،

ئەو خەوی تری هەبوو، خەوی زۆر گەورە. لە پسمامانەوە فێربووبوو یاری بچوک نەکات. ئەوەی شەڕی پسمامانی دۆڕاند هۆکەی ئەوە بوو کە دەبایە لەوە بەهێزتر بێت کە هەیە. ئەوەی خۆی لە دیوارەکانی زیندانادا گیرکرد، ئەوەی هێزێکی گەورەی لە پشت نەبوو، ئەوەی دەسەڵاتێکی تایبەت بە خۆی نەبوو بەکاریبهێنێت، هۆی ئەو ناکامییە گەورەیەی پسمامان بوون کە قەت لە یادی ناچێت. ڕەفیق ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی فۆرمێکی درێژی زانیاری پێ پڕکردەوە لێیپرسی «حەزت بەوەیە ئاشکرا بۆ حیزب ئیشبکەیت یان بە نهێنی؟». لیڤیتانت سەیرێکی درێژی ئەم عەرەبە کزەڵە و لەرزۆکەی کرد کە سەرمای زستانی کوردستان لە پاڵتۆیەکی ڕەشدا گرمۆڵەیکردبوو، بێئەوەی وەڵامیبداتەوە، گووتی «ڕەفیق پێدەچێت زۆرت سەرما بێت». لیڤیتانت، دەنگێکی بەهێز و نیگایەکی عەسکەریی تیژ و ئیرادەیەکی ڕوونی هەبوو. تا ئەو دەم ڕەفیق حاچم هەر کوردێکی دیبوو، هەموویان لە دۆخی ترسدا بوون، بەڵام لیڤیتانت بۆ یەکەمجار وێنەی ئەو کوردەی بە ڕەفیق بەخشی کە بۆی دەگەڕا، وێنەی پیاوێک لەوانەی دەوڵەت بە دەستیانەوە داماوە، کوردێکی ڕاستەقینە لە جەنگاوەرەکان. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕەفیقی ڕاکێشا، ناوی لیڤیتانت بوو، لە بەرامبەر خانەی «لقب» دا لە فۆرمی زانیارییەکەدا، بە ئەسپایی پرسی: عەزیزی ئوستاز عمر، لیڤیتانت یەعنی چی؟. ئەو بە چاوە تیژەکانی سەیرێکی تری کرد و بە هێمنییەکەوە، بە چەشنێ بتوانیت لاوازیی زمانە عەرەبییەکەی بشارێتەوە، گووتی «ڕوتبەیەکی عەسکەرییە، روتبەیەکی بچوکە، لە زۆر لە سوپاکانی خۆرئاوادا هەیە، شتێکە وەک مولازم ئەوەل یان بچوکتریش... خۆی لیوتناتە.. ڕاستییەکەی لیوتناتە، بەڵام خەڵکێک لە سەردەمێکدا بە هەڵە وشەکەیان گۆڕیوە و وەک نازناو لکاندویانە بە خێزانەکەمانەوە، خۆت دەزانی ئێمە هەموو وشەیەک تێکدەشکێنین. باوکم بە لیڤیتانت هیجری بۆتانی ناسرا بوو، مامم بە

لیڤیتانت حەبیب. هۆکەی ئەوەیە باوکم لەگەڵ ئینگلیزەکان کاریکردوە، ئەوان ئەو نازناوەیان داوەتێ یان نازانم ڕەنگە خۆی دروستیکردبێت». دوای ئەو قسانە لیڤیتانت هەستی بە هێمنییەکی زۆرتر کرد. ڕەفیق حاجم دووبارە ئەو پرسیارەی لێکردەوە «دەتەوێت چۆن ئیشمان لەگەڵدا بکەیت، بە ئاشکرا یان بە نهێنی؟». لیڤیتانت سەیری چاوی کرد و گوتی «دەمەوێت لە مودیرییەتی ئاسایشی گشتی دابمەزرێم». ڕەفیق دەستی بادا و بۆ یەکەمجار بە شتێک لە بێئارامییەوە گوتی «ئەوەیان کاتی دەوێت، کاتی دەوێت. دەبێت حیزب تەواو دڵنیابێت، ئەوەیان بە دەست من نییە». لیڤیتانت هەستا و گوتی «دەمەوێت دەوڵەت شتێکم پێبسپێرێت بیکەم. نەهاتووم دانیشم». ڕەفیق فۆرمەکەی هەڵگرت و خستییە فایلێکی بۆر و گوتی «شەوی سێشەممەی داهاتوو، چوار وێنە بهێنە و وەرە... ئەو وێنانەمان دەوێت، بۆ ئەوەی ئیشەکانت جێبەجێبێت».

ساڵەهای ساڵ لیڤیتانت عومەر بۆتانی ئەو ڕۆژەی بیرنەچوو کە لە بەردەم مستەفای ڕەسامدا وەستا و ئەو بە کامێرا ئۆکۆردیۆنییەکەی خۆی، لە گڵۆپێکی گەورەوە تیشکێکی بەهێزی لێدا و بە دەنگە ناسک و میهرەبانەکەی گوتی «باشە کاکی خۆم، زۆر باشە. ئێستا لە سەر کورسییەکەت هەستە و وەرە با وەسڵێکت بدەمێ و سبەینێ وەرەوە». کە لە ستۆدیۆکە هاتە دەرێ شەوقی گەورەی فلاشەکە هێشتا لە چاویدا بوو، نەیدەزانی ئەوە یەکەمین وێنە دەبێت لە فایلێکدا کە دواتر ناحەزانی ئەو زۆر سوودی لێدەبینن. بۆ سبەی کە وێنەکەی وەرگرتەوە سەیری لە جوانییەکەی هات. دوای نزیکی سی ساڵ لەو ڕۆژە ئەو وێنەیە هاتە بەردەمی من، منیش سەیرم لێهات، نیگاری لیڤیتانت ئەوساش وەک ئێستا هەر تەماوی و ئاڵۆزبوو، زەردەخەنە دەستکردەکەی، نیگا ژنکوژەکەی، قژ داهێنانەکەی، یەخەی قاتە ڕەشەکەی، دووبارە وەک زەمانێک یەکەمجار لە

پسمامان بینیم سەرسامیانکردمەوە. بەڵام ئەمجارە بە وردی بە وێنەکەدا ڕووانیم و سەرنجی شتێکم دا کە ئەستەم بوو سی ساڵ لەمەوبەر بیری لێبکەمەوە یاخود بێتە خەیاڵم، نیگای لیڤیتانت خاڵی بوو لەو تەلیسمەی پیاوانی بەهێز هەیانە، هێندەی لە بازرگانێکی فرەزانی گەنج دەچوو، لە جەلادێک و پاوانخوازێک و بیناسازێکی دڵڕەق نەدەچوو... بەڵام شێوەی سەیرکردن و نیگاکردنی، ئەوەیان تێدا دەردەخست کە کەسێکە ناتوانێت هیچ شتێکی خۆشبوێت. لە سەیرکردنی ناو وێنەکەیدا ئامادەیی جەنگاوەرێکی بەد دەبینم، بۆ دونیایەک، دەزانێت هیچ کات خاڵی نابێت لە جەنگ.

لەگەڵ گرتنی ئەو وێنەیەدا ژیانی لیڤیتانت ئاڕاستەیەکی دی وەرگرت... دوای دوو مانگ لەو بەیانییە کە لە ستۆدیۆ مستەفا هاتەدەرێ، بووبوو بە هاوڕێی «ڕەفیق کەریم عەباوی» بەڕێوەبەری گشتی ئاسایش و ترسناکترین پیاوی شار. گەر لیڤیتانت دوای نسکۆی حەفتاوپێنج بچووبایەتە ڕیزەکانی حیزبەوە، وائاسان نەیدەتوانی ئەو تۆڕە گەورەیە دروستبکات و ئەو هەموو پەیوەندییە نزیکە لەگەڵ سەرانی دەزگای ئەمنییەتی دەوڵەتدا دابمەزرێنێت. لە دوای هەرەس ژمارەی ئەو کوردانەی دەچوونە ڕیزی بەعسییەکانەوە بێشوماربوون. لای ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک هەرەسی سوپای بارزانی بە دەیان هەزار چەکدارەوە، نیشانەی کۆتایی سەردەمی شۆڕشەکان بوو، کورد کەوتبووە جوغزێکەوە و هەموو زلهێزەکانی دونیا، ئەوانەی لە بەرەی سۆڤیێتن و ئەوانەی لە بەرەی کەپیتالیستەکانیشن، لێیاندەدا. شیوعییەکان شۆڕشەکەیان وەک بزووتنەوەیەکی کۆنەپەرست سەیردەکرد، لەو شۆڕشە بێسوودانەی مێژوو بەرەو پێش نابات و بۆنی تاپڕی خێڵەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدەی لێدێت. کەپیتالیستەکانیش وەک وەرەقەیەکی سیاسی بێسوود

سەیریاندەکرد، کە نەبوونی لە بوونی باشترە. لە ناویشەوە ژمارەی ئەوانەی باوەڕیان بە سوودی شۆڕش بوو، تادەهات دەچووە کزی. کۆتایی بارزانی، وەک ماڵاوایی ئەو باوکە بوو کە منداڵەکانی خۆی لە ناوەڕاستی ئاهەنگێکی گەورەدا بە مەستی و بێهۆشی جێدەهێڵێت، لە ناو ئەو کزی ئیرادە و مردنی ئەخلاقەدا ڕۆژانە سەدان کەس بە نهێنی و ئاشکرا دەچوونە ڕیزەکانی بەعسەوە. لیڤیتانت هەستیدەکرد گەڕانەوەی ئەو پێش هەرەس ناوبانگێکی باشی لای بەعسییەکان داوەتێ و متمانەیەکی گەورەی پێدەکەن. دوای هەرەس بە سێ مانگ، لیڤیتانت مۆڵەتی دروستکردنی «مەفرەزەی یەکەم»ی وەرگرت. ڕەفیق عەباوی ئەوەندە متمانەی پێ هەبوو، بواریدا لە چوارچێوەی هێزە تایبەتییەکاندا، هێزێکی چەکدار لە گەنجانی هەڵبژاردە بۆ خۆی دروستبکات... لە تەموزی ساڵی ١٩٧٥ دا بۆ یەکەمجار بە جلی بەڵەکی کۆماندۆ فاشییەکانەوە، بە بێرییەکی سەوزەوە، بە چاویلکەیەکی ڕەشەوە لە جێبێکی بێجی بچوکدا بینیمان، تەنیا ڕۆژبای خوشکەزای لە تەنیشتییەوە بوو، ئەویش وەک خۆی جلێکی بەڵەکی لەبەربوو، دەموچاوێکی ترساوی هەبوو، جووتێک چاوی نیگەران، بە نیگای مێردمنداڵێکەوە کە هیچ لە دونیا تێناگات، سەیری ڕێبوارانی دەکرد. لەو دەمەوە بە ویقاری ئەو خۆفرۆشانەوە کە دەزانن هەموو کەس ڕقی لێیانە بە سەر جادەکاندا دەڕۆیشت. سەیرکردنەکانی پڕبوون لەو هەستە قووڵەی بێباکی کە دواتر هەموو ژیان لەگەڵیدا دەمێنێتەوە. کە بە سەر شەقامەکاندا دەڕۆیشت نەماندەزانی بیر لە چی دەکاتەوە، نەماندەزانی لەناو شکۆی ئەو سەڵتەنەتە تازەیەدا کە لێخوڕینی ئەو جێبە و ئەو جلانە پێیان بەخشی بوو، چۆن لە دونیا دەڕوانێت. دڵڕەقییەکانی هەر زوو دەرکەوت... سەرەتا مەفرەزەیەکی دە کەسی دروستکرد کە چەکدارەکانی کۆمەڵێک گەنجی نەناس بوون، زۆربەیانی گەنجی سەرەڕۆ و منداڵی خەڵکی هەژار بوون، خۆی غروری

کەسێکی تێدابوو کە لە هەژارییەوە هاتووە، نیشانەیەکی دەوڵەمەندیمان تێدا نەدەبینی، بەڵام شەبەنگی دەسەڵاتێکی گەورەی لەدەوری خۆی پەخشدەکردەوە... شەبەنگی ئەوانەی لە هەژاریی هەڵدێن و هێزێکی گەورەیان دەکەوێتە دەست. هۆشەنگی بولبولیار جارێک پێیگووتم «هیچ شتێک لە غروری ئەو هەژارانە ترسناکتر نییە کە دەتوانن خۆیان لە دەست هەژاریی ڕزگاربکەن». پێوەی دیاربوو کە دەیەوێت هەموومان شاهیدی دەسەڵاتی ئەوبین، شاهیدی ئەوە بین کە ئەو یەکێک نییە لە ئێمە. یەکەمین دەرکەوتنی دوای هەرەس ئەو کاتە بوو کە لە تەلەفزیۆنە ڕەش و سپییەکەی ئەو زەمانەوە لەگەڵ ڕەفیق حاچمدا بینیمان چەکی لە پێشمەرگە کوردەکان وەردەگرتەوە و بۆ باوەشی حکومەتی نیشتیمانی بەخێرهاتنەوەی دەکردن. هێدی هێدی هەستمانکرد دەیەوێت بمانترسێنێت، سەرەتا بەس لیڤیتانت خۆی ناوی هەبوو، بەڵام دواتر ناوی «مەفرەزەی یەکەم» لە سەر هەموو زارێک بوو... پاش تێپەڕینی سێ مانگ بە سەر هەرەسدا، لە کۆبوونەوەیەکی ئاسایشدا ڕەفیق عەباوی پێیگووت «کە دەستی بۆ هەموو شتێک کراوەیە». یەکەمجار دڕندەیی خۆیمان لە چێشتخانەیەکدا بینی، کاتێک یەکێک لە شاگردەکانی دایە بەر لێدان لە سەر ئەوەی جۆری ئەو شلەیەی لێگۆڕاوە کە داوایکردوە... لێدانەکەی بە جۆرێک شێتانە بوو، خەڵکی هەموو بە لێشاو لە چێشتخانەکە ڕایانکرد، کەسانێک وەها خێرا و بە پەلە خۆیان دوورخستەوە مێز و کورسییەکانیان بە یەکدادا و قاپە برنج و فاسۆلیا و بامێکانیان قلْپکردەوە، لە خاوەن چێشتخانەکەشی دا، لەو کەسەش کە لە سەر دەغیلەکە دادەنیشێت، لە چێشتکەرەکان. ئەوە یەکەمجاربوو بە ئاشکرا هەمووان هەستبکەن لەزەتێکی زۆر لە لێدان دەبینێت، هەموو ئەو خۆشییە تاریکەیان لە چاویدا بینی، چاوی کەسێک دەتوانێت هەموومان وەک کۆیلە سەیربکات. ئەوەشی لە خاوەن چێشتخانەکە حەرامکرد تا

دوو ڕۆژ شتەکان کۆبکاتەوە، ئەوەی لێحەرامکرد دەرگاکانی قفڵبکات و دەڕابەکەی دابداتەوە، لە شەودا چەندان دز خۆیان کرد بە چێشتخانە واڵاکەدا و قاپ و سینی و مەنجەڵەکانیان برد و مەخزەنی ئازوقەکەشیان تاڵانکرد. لەو ڕۆژەوە دەچوو بۆ هەر چێشتخانەیەک دەمودەست هەموو کورسییەکانی نزیکی چۆڵیاندەکرد، بەڵام هەرگیز وانەبوو کە پارە نەدات یان وێری کەس قەبووڵبکات. هەتا جارێک کە خاوەنی یەکێک لە چێشتخانەکان سوور بوو لە سەر ئەوەی پارەی لێوەرنەگرێت، بە دەستێک لە پشت مێزەکەی خۆیەوە گرتی و بەرزیکردەوە و بە دەنگێکی هێمنەوە گووتی «سوپاس، زۆر سوپاس... بەڵام هیچ وەخت دووجار شتێک لە من دووبارەنەکەیتەوە». لە خۆی ترسناکتر گەنجانی مەفرەزەی یەکەم بوون، خۆی ویقاری ئەوەی هەبوو هیچ نەدزێت، دەست بۆ ماڵی خەڵک نەبات، ڕێزی ژنی لابێت. هەتا گەر نەتناسیبایە کێیە و هەندێ ڕۆژ لە سەر مێزی نانخواردنەکەی بتدیبایە، بە کەسێک دەچوو قووڵ بیر لە شتێک بکاتەوە. کە تێری دەخوارد و لەگەڵ چا خواردنەوەدا بە تەڵێک شقارتە دەکەوتە پاکردنەوەی ژێر ددانەکانی، تەنهاییەکی قووڵی پێوەدیاربوو، تەنهایی پیاوێک لە هەر کوێ بێت، لە هێز بەولاوە نرخ لە سەر هیچی دی دانانێت. بەڵام ئەندامانی مەفرەزەکەی شتێکی تر بوون، ڕۆژانە دەیاندا بە سەر بازاڕدا، لای مریشکفرۆشەکان مریشکیان دەدزی، پیکابەکەیان پڕ دەکرد لە قاز، لای میوە و سەوزە فرۆشەکان سندوقە تەماتە و ترێیان باردەکرد، لای قەسابەکان لاکیان لە قولاپ دادەگرت... بەزمیان سازدەکرد تا پارە لە خەڵک بستێنن، هەر کەسێکیش بە دڵی ئەوان قسەی نەکردبایە، بە کۆمەڵ پەلاماریاندەدا. دیارە زۆربەی خەڵک ڕقیان لە لیڤیتانت و مەفرەزەکەی بوو، بەڵام خەڵکانێکیش هەن ئەمجۆرە مرۆڤانەیان خۆشدەوێت. ئەوەی جێگای سەرسامییە ئەوەیە ژمارەی ئەوانەی ئەمجۆرە کەسانەیان خۆشدەوێت، زۆر لەوە زیاترن کە مرۆڤ

سەرەتا بیری لێدەکاتەوە. لە هەموو مرۆڤێکدا دیوێکی تاریک هەیە کە شەیدای خراپەیە، شەیدای ئەوانەیە کە دەتوانن دڵڕەق بن. نابێت لە بیرمان بچێت، مرۆڤ خۆی بوونەوەرێکی دڵڕەقە، لێرەوە مرۆڤە بەهێز و دڵڕەقەکان بەردەوام شتێکی تاریکی ناو ناخی خۆمان بیردەخەنەوە، ئەو دیوەی خۆمان پیشاندەدەنەوە کە ئێمە دەمانەوێت بیشارینەوە. بە درێژایی مێژوو وەهابووە، کەسانی بەهێز و دڵڕەق سیحرێکی سەیر لە سەر هەندێک خەڵک جێدەهێڵن کە هێز مەستیاندەکات... ئەو کەسانەی بە نازکی و قووڵی و لاوازیی سەرسامن هەمیشە کەمینەن، لێرەوە ئاسایی بوو لەو سەردەمەدا کە ئێمە هەموو پیاوی لاوازبووین، کە کورد وەک هێزێکی تێکشکاو لە ژێر پۆستاڵی سەربازە عەرەبەکاندا دەیناڵاند، هێزی لیڤیتانت، ویقارە سەربازییەکەی، ئەو سەیرکردنانەی کە توانایەکی شاردراوەیان تێدابوو، ئەو هەیبەتەی کە وای دەکرد وەک کەسێکی گرنگ دەربکەوێت، ژمارەیەک شەیدا بۆ خۆی بە دەستبهێنێت، کە لەودا کەسێکیان دەبینی، پێشتر بە خەوتوویی لە ناخی خۆیاندا بینیویانە. بەڵام شتێک کە هەمیشە لیڤیتانتی سەرسامکردوە، بەندیخانەیە... لیڤیتانت خواستێکی قووڵی تێدابوو کە زیندانی هەبێت. دواتر کە چەندەها جار لەگەڵ لیڤیتانتدا دانیشتم و لە دەیان بۆنەدا قسەمان لە دونیا کرد. لەوە تێگەیشتم کە پیاوی بەهێز لای ئەو کەسێک بوو لە سەروو قانونەوە. «کە یاسایەک هەبوو بمانگرێتەوە، کەواتە بەهێز نین» جارێک ڕاشکاوانە وای پێگووتم.

لە دوای هەرەسی شۆڕشەوە، تارمایی نزار ئیدریس لە خەیاڵیدا سەری هەڵدایەوە. بە جۆرێک لە جۆرەکان نزاری بەو بوونەوەرە ئەستەمە دەزانی کە گرتنی وزەیەکی گەورەی پێدەبەخشێت، ئەو نزاری لەم لابەلابوونەوە سەختەی ژیانی بە بەرپرس دەزانی، ئەو دڵی لە شۆڕش تۆران، ئەو

وایکرد تووشی سووکایەتی بێت، ئەو وایکرد ببێت بە دوژمنی حیزب. جگە لەوانە گومانێکی قووڵیشی دەرهەق بە خۆی تێدا دروستکرد کە ماوەیەکی درێژ نەخۆشی خست. لە ساتێکدا بۆی دەرکەوت ئەو مرۆڤە بەهێزە نییە کە بەخۆیەوە دەنازێت، بۆی دەرکەوت ئەم زیندانیانە هیچیان بە تەواویی لە ژێر رکێف و دەسەڵاتی ئەودا نین، هەرچییەکیش بکات دواجار هێزێکی لەو گەورەتر دەتوانێت هەڵیبوەشێنێتەوە. لەو باوەڕەدام لیڤیتانت دواتر زۆر بیری لە چییەتی دەسەڵاتی خۆی لە پسمامان کردۆتەوە، گەیشتۆتە ئەو ڕاستییە کە دەسەڵاتی زیندانەوان چەند سنووردار و بچوکە، چەندە بێتوانا دەمێنێتەوە گەر ئیشی تەنیا ئەوە بێت وەک بەڕێوەبەری زیندانێکی بچوک کاربکات، لەوە تێگەیشتووە کە ئەگەر دەیەوێت بە راستی توانای بە سەر ئینسانەکاندا بشکێت، دەبێت هێزێکی تری هەبێت، هێزێک ئەستەمە کلیلی هەموو تین و وزەی بە تەنیا لای خۆی بێت. کێشەی لەگەڵ ئەوەدا نەبوو کە دیلەکان دیلی ئەو نین، چونکە دواجار دیلی هەر کەسێک بن، دیلی هەرچییەک بن، دەبن بە دیلی ئەو، دوور لە چاوی دونیا دەکەونە بندەستی ئەوەوە. بەڵام هەر دیلێک بیەوێت ئیرادەی ئەو بشکێنێت، توانای ئەو تاقیبکاتەوە، بە گژ دەسەڵاتی ئەودا بچێتەوە، لەوە دەردەچێت دوژمنی شۆڕش یان دەوڵەت یان هەر شتێکی تر بێت و دەبێت بە دوژمنی تایبەتی ئەو. بە وردی نازانم لە چ ئان و ساتێکدا بیرۆکەی دروستکردنی شوێنێکی تایبەت بە خۆی پەرپوەتە سەری، بەڵام دەزانم لە پاییزی ساڵی حەفتاو پێنجدا، بۆ یەکەمجار ئەو پارچە زەوییە گەورەیەی وەرگرتووە کە دواتر دەبێت بە خولیای گەورەی ژیانی... پارچە زەوییەک بەعسییەکان وەک دیارییەک پێیدەبەخشن. ڕۆژانی سەرەتای لە حیزبدا هێندەی سەرقاڵی ئەوە بوو پەیوەندییەکانی خۆی مەحکەمبکات، عەرەبییەکی لە ئێستا باشتر فێرببێت، گەنجی دڵڕەق و دڵڕەقتر بدۆزێتەوە، خولیای تری نەبوو. دەڵێم

گەر ڕێکەوت نەبایە لە وانەبوو تەواو نزار ئیدریسی بیربچێتەوە. بەڵام مرۆڤ هەندێجار لە جێگای وەهادا چاوی بەیەک دەکەوێتەوە کە دەکرێت ئەوجۆرە ڕێکەوتانە بە پلانی شەیتان ناوبنێت. لیڤیتانت دەمەوئێوارەیەک لە نزیک یەکێک لە کتێبفرۆشییەکانەوە چاوەدێری هەندێ گەنجی دەکرد کە بەپێی ڕاپۆرتەکانی ئاسایش، خاوەنەکەی لە کۆمۆنیستە ماوییەکان بوو، ماوەیەک بوو ژمارەیەک گەنج کە گومان دەکرا عەودالی کتێبە مارکسییەکان بن، هاتوچۆی ئەو کتێبخانەیەیان دەکرد. لە کاتێکدا ئەو لە تاکسییەکی تایبەتی ئاسایشدا، بە یاوەری دوو کەسی دیکە چاوەدێری کتێبفرۆشییەکەی دەکرد، نزار ئیدریس وەک شەیتان لە ژێر زەوی دەربیبهێنێت، لە ناکاو لەوێدا دەرکەوت. لیڤیتانت وەک باوەڕ بە چاوانی خۆی نەکات، چاویلکە ڕەشەکانی داگرت و لە بەر خۆیەوە گووتی «نابێت ئەو بێت... نابێت ئەو بێت». بەڵام دڵنیابوو ئەوە، خۆیەتی نزار ئیدریسە. بێئەوەی هیچ بکات، هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و گووتی «هههههـ... من لە ژێر زەوی بۆت دەگەڕێم و تۆ لە سەر زەویت... وای کوڕی قەحبە... کوڕی قەحبە». دوائەوە جارێکی دیش چاویلکەکەی کردەوە چاوی و جارێکی دی دایگرتەوە، چاوی گلۆفی و بە هێمنی گووتی «کەواتە وەهایە، کەواتە خۆیەتی... پێدەچێت، هەموو شتێک دووبارە لێرەوە دەست پێبکاتەوە». هیچ کەسێک لە یاوەرەکانی نەیانزانی مەبەستی چییە. بەڵام بە دەنگێکی لە سەرەخۆ و ئارام ئەوانی دابەزاند و گووتی «بڕۆن بەلای هەر کارێکەوە کە حەزتان لێیەتی.. ئەمەیان بە تەنیا کاری منە». لەو ڕۆژەدا لیڤیتانت زانی کە نزار ئیدریس لە قەسابخانە کاردەکات و دەخەوێت و دەخوێنێتەوە. هەر ئەو ڕۆژەش بڕیاریدا سبەی بە خۆی و هێزێکەوە بدات بە سەر قەسابخانەکەدا.

***

دوای هەرەسی شۆڕش , نزار لە لۆرییەکی کۆندا گەڕایەوە بۆ شار، سێ شەو لە ماڵی مامۆستا سابیر لای ڤینۆسی ژنی مایەوە. نۆ مانگ بوو هیچی دەربارەیان نەدەزانی، دوای گرتن و بردنی بۆ پسمامان ئیدی سۆراغی نەکردبوون. لەو سێ شەوەدا نە وەک مێرد، نەوەک زاوا، نەوەک باوک رەفتاری نەکرد، ئەو شتانە دووربوون لە ئاکار و لەگەڵ سەیرکردنی ئەودا بۆ ژیان تەبا نەدەهاتنەوە. هەتا زۆر کەم سەیری «کۆسار»ی کوڕی کرد، کە ئەوکات بەچەیەکی بچوکی ساڵەوەختەی نەخۆش و بێزمان بوو. نزار وەک خۆی لە هەستێکی ترسناک بپارێزێت، وەک نەیەوێت خۆشەویستی ئەم منداڵە ژیانی بگۆڕێت، هەتا جارێکیش چییە ماچی نەکرد و نەیگرتە ئامێزی. بە ڤینۆسی ژنی گووت «کەدەبێت وەک منداڵێک گەورە بێت کە باوکی نییە... گەورەترین دیارییەک پێشکەش بە منداڵێکی بکەیت، ئەوەیە باوکی لێبستێنیتەوە». ساڵانێک دواتر کە ڤینۆسی مامۆستا سابیر، لە جلی ڕەشدا باسی ئەو ڕستەیەی بۆ کردم، ئاماژەشی بەو زەردەخەنە شەیتانی و پێکەنینە درێژەوەی نزار کرد، کە ئەو دەم لە سەر لێوانی بووە. ساڵانێک دواتریش جارێک بە منی گووت «باشترین باوک ئەوەیە، خۆی خۆی بکوژێت.. باوکی ڕاستەقینە هەمیشە لەگەڵ لەدایکبوونی منداڵەکەیدا دەبێت بمرێت، چونکە مانەوەی هیچ نییە جگە لە ئازارێکی قووڵ بۆ ئەو منداڵە». لە چ ئەزموون و لە چ ڕۆحێکی تاریکەوە ئەو ڕستانە دەهاتنەدەرەوە، نەمدەزانی.

کە نزار ئیدریس ماڵی مامۆستا سابیری بەجێهێشت، بەهانەی گەورەی ئەوە بوو گوایە نایەوێت کوڕەکەی لە سایەی باوکێکی دڵڕەقی وەک ئەودا گەورە بێت... ڕای وابوو منداڵەکە لە سێبەری ترسناکی ئەودا، بەدبەخت و بێنگین دەبێت و ژیانی خۆی ناژی. دەبێت بڵێم نزار لە گەڕانەوەیدا بۆ شار بێچارە بوو، گەرچی گەنجێکی بەهێز بوو، بەڵام نەیدەزانی

دەتوانێت چ ئیشێكبكات... بەر لەوەی وەک قەسابێک لە قەسابخانەی گشتی شار بگیرسێتەوە، ماوەیەک لە هەڵكەندنی زێرابدا كاریكرد، دواتر كە چووە قەسابخانە، هەستیكرد دنیای ڕاستەقینەی خۆی دۆزیوەتەوە. پێدەچێت سەرەتای كاركردنی لە قەسابخانە هێمنترین قۆناغی ژیانی بووبێت، ئەو شەوانەی لە قەسابخانە نەبایە، دەچووە لای «قزڵباش»ـی هاوڕێی كە خۆی و دایكی بە تەنیا دەژیان. قزڵباش قەسابێكی شارەزا بوو، هەر ئەویش نزاری بردە دونیای قەسابەكانەوە. ئەو لە خێزانێكی قەساب بوو، باوكی قەسابخانەیەكی گەورەی خۆی هەبوو، مامەكان و خاڵەكانی هەموویان ئیشی قەسابیان دەكرد... قەسابی وەک سوننەتێكی دێرین پشتاوپشت لە خێزانەكەدا مابووەوە. گەر شۆڕش و لیڤیتانت نەبوونایە، لەوانەبوو نزار ژیانی داهاتووی لەو قەسابخانەیەدا بباتەسەر. بەڵام ڕووداوەكان بە جۆرێک خێرا و بائاسا بوون، ئاڕاستەیەكی تریان بە ژیانی ئەویش و ئێمەش بەخشی. گرنگترین شتێک ژیانی نزاری گۆڕی بینینی نەغەدە ماردینی بوو. نزار ئیدریس هێشتا پەیوەندی بە شانە سەرەتاییەكانی شۆڕشەوە نەكردبوو كە ڕۆژێک لە شەڕێكی ترسناكی ناو قەسابەكانەوە ئاڵا... هۆی شەڕەكە ئەوەبوو خوشكەزایەكی قزڵباش كچی فەهمی قەسابی خواستبوو، ئاڵتونی بۆ كردبوو، كۆمەڵێكی زۆر دیاری بەخشیبوو، مەسرەفێكی زۆری كردبوو، لە پڕێكدا كچەكە كەوتبووە سەر ئەو كەڵكەڵەیەی كە شوو بە قەساب ناكات، چونكە «دەستیان بۆنی گۆشتی كاڵی لێدێت». بەڵام دوای پەشیمانبوونەوەی، ئامادەنەبوو ئاڵتون و دیارییەكان بگێڕێتەوە. قزڵباش گەنجێكی شەرمن و بێوەی بوو، چەند جارێک بە خۆشی فەهمی قەسابی ئاگاداركردەوە كە «هەڵوەشاندنەوەی شاییەكە، شتێكی ئاساییە... كچەكە پیرۆزی هەر كەسێكی تر بێت، بەڵام ئسووڵ وایە كە ئاڵتوونەكانمان بۆ بگێڕنەوە، چونكە كوڕەكە بە پاشەكەوتێكی زۆر، بە ڕەنجی چەندەها ساڵە ئەوەی

کۆکردۆتـەوە». دیـارە فەهمـی قەسـاب گوێـی لـەو شـتانە نەبـوو، کچەکـە دەیویسـت دەسـت لـە کـوڕە بـەردات و دەسـت لـە زێڕەکـە بـەر نـەدات. تـا کار گەیشـتە ئـەوەی ڕۆژێـک قزڵبـاش لـە بەرچـاوی هەمـوو قەسـابەکان و بـە گەروویەکـی پـڕ گریانـەوە داوای ئاڵتوونەکانـی لـە فەهمـی کـردەوە و ئەویـش لـە وەڵامـدا کەوتـە سـەرکۆنەکردن و لـووت شـکاندن و گاڵتەکـردن بـە قزڵبـاش و خوشـکەزاکەی کـە بـەڕای ئـەو دوو ژنـی گرینۆکـن و هیچیـان پیـاو نیـن و خاوەنـی ئـەو شـتە نیـن کـە پیـاو زۆر بـە گرنگـی دەزانێـت و شـانازی پێـوە دەکات. فەهمـی کـە پیاوێکـی چەقۆکێش و زل و بێڕەحـم بـوو، کاری گەیانـدە ئـەوەی بـە قزڵبـاش بڵێـت « وەرە شـەڕواڵەکەت دابکەنـە.. دایکەنـە بزانـم هەتـە. گـەر دایناکەنیـت مـن خـۆم بـۆت دادەکەنـم». نـزار ئیدریس تـا ئەوکاتـە و لـە بـەر خاتـری قزڵبـاش کـە تکایکردبوو ئـەو توخنـی ئـەم مەسـەلەیە نەکەوێـت، خـۆی گرتبـوو. بـەڵام کار بگاتـە ئـەوەی پیاوانـی فەهمـی پەلامـاری شـەڕواڵی هاوڕێکـەی بـدەن، ئیتـر نەیدەکـرا بوەسـتێت. تێکەڵبوونـی نـزار و پەلامـاردانـی بـۆ سـەر خێڵـی فەهمـی قەسـاب، شـەڕێکی زۆر تونـدی لێکەوتـەوە، کـە فەهمـی و دوو کـوڕی و نزاریـش بـە سـەختی تێیـدا بریندارب‌وون.

لـەو ساتەدا کـە ئەمبولانسـەکانی خەسـتەخانە بـە پەلـە نـزار ئیدریسـیان نیـوە گیـان لـەدەرگای بیمارسـتان کـرد بەودیـودا... لـە هەمـان سـاتدا نەغـەدە ماردینـی مەسـت لـە خۆشـی بڵاوبوونـەوەی یەکەمیـن شـیعریدا بـە هاوڕێـی دکتـۆر مسـتەفا شـوکاک، بـە نیـازی گـەڕان بـە هەمـوو بیمارسـتاندا، لـە ژووری دکتـۆرەکان هاتـەدەرێ... لـە هەمـان ساتیشـدا لیڤیتانـت عومـەر بۆتانـی، بەخـۆی و هەمـوو چەکدارەکانـی مەفـرەزەی یەکـەوە، خـۆی کـرد بـە نـاو قەسـابەکاندا و بـە دەنگێکـی گـڕ و ترسـناک، کـە لـە تـەواوی قەسـابخانەکەدا دەنگیدایـەوە هاواریکـرد «نـزار ئیدریـس وەرە دەرەوە».

# هەڤاڵ شێرخان

شۆڕشی نوێ لە هەلومەرجێکی زۆر سەختدا دەستی پێکرد. من دوای هەرەس یەکسەر نەگەڕامەوە بۆ شارەکانی خۆمان، بە جۆرێک ڕقم لە بەعسی و سەربازە عەرەبەکان بوو نەمدەتوانی بە سەرکەوتوویی بیانبینم، ناخۆشترین شت بۆ شۆڕشگێڕێکی ئیمانداری وەک من، کە شۆڕشم وەک دینی خۆم سەیردەکرد، ئەوەبوو دوژمنانی خۆم بە سەرکەوتوویی ببینیم. لەدوای کۆتایی شۆڕش، ساڵێک لە تاران مامەوە، بە جۆرێک وێنەی دونیا لەلام ڕەش بوو کە غەمۆکییەکی بەردەوام و قووڵ لە سەر ڕوخسارم بوو. کاتێکی زۆرم لە مەیخانەکان دەبردەسەر، بۆ یەکەمجار لەگەڵ خەڵکی خراپ و ئافرەتی داوێنپیسدا تێکەڵبووم. ئێستا، دوای ئەو هەموو ساڵە، دەتوانم دوو ڕاستی ترسناک بدرکێنم، یەکەم خوودانم بە ئافرەتانی لەشفرۆش پەرچەکردارێکی بەدی هەرەسی شۆڕش بوو، وەک چۆن شۆڕش مۆراڵی بەرزی خۆی دروستدەکات، هەرەسی شۆڕشیش مۆراڵی دزێوی خۆی هەیە. ئەو ماوەیە چی مەراقێکم هەبایە بە خواردنەوەی زۆر و لە باوەشی ڕوسپییە تارانییەکاندا دەمشتەوە. خاڵی دووەم، ئەوەیە ئەو پیاوانەی کە عومریان لە سەردانی ژنە سۆزانییەکاندا دەبەنە سەر، هەمیشە دوور لە ئافرەت دەژین، ئەوەی ڕۆحی ژن نەبینێت قەت ژنی نەبینیوە. چونکە لەشی ئافرەت ئەو ساتەی کە ڕۆحیت پێدەدات، تەواو جیاوازە لەو ساتەی کاتێک تەنیا جەستەی دەخاتە بەر دەستت. هەموو ئەو ساڵەی لە تاران بووم لەو دوو حیکمەتە زیاتر هیچی تر فێرنەبووم. من لەو ساڵەدا «سەفا» ی برام کە لە دیترۆیتی ئەمریکا نیشتەجێ بوو، بەردەوام پارەی بۆ دەناردم و من وەک دڕندەیەکی برسی کە هیچ شتێک

خواستی بۆ شەراب و شەوگەڕ تێرناکات خەرجمەکرد، دەمزانی گەر ژیانم بەوجۆرە بڕوات، نوقمبوونی بەدم لە تەنیایی و فەسادی دەروندا دەمکوژێت. ئێوارەیەکیان لە نزیکی سینەمای گۆلدن سیتی لە تاران هاوڕێیەکی زەمانی شۆڕشم بینییەوە، ئەو بە منی گووت کە کارێکی زۆر گرنگ و نهێنی پێمە و دەیەوێت لە جێگایەکی باش بمبینێت و قسەبکەین، من گووتم یان لە کافیەی نادری یاخود لە ڕیستورانت و باری چاتانوگا یەک دەبینین، دواجار لە سەر چاتانوگا ڕێکەوتین و دوو ڕۆژ دوای ئەوە لەوێ چاومان بە یەک کەوت. ئەو بە هێمنییەکی زۆر و بە دزییەوە پێیگووتم کە شۆڕش لە حاڵی ئامادەکاریدایە و هەڤالان گەڕاونەتەوە و ئەمجارە شۆڕشێکی نوێ دوور لە دەسەڵاتی بنەماڵە و لە سەر دەستی لاوانی ئازادیخواز هەڵدەگیرسێت. گووتی شۆڕشگێڕان پەیوەندیان بە شارەکانەوە کردوە و دەیانەوێت هێزێکی سەرەتایی دروستبکەن، ئیدی هەر کەسێک بیەوێت دەتوانێت پەیوەندیبکات. ئەو کە حاڵی پەرێشان و غەمۆکی قووڵی منی دەزانی، گووتی تۆ شوێنی متمانەیت و شۆڕش بێ کەسانی دڵسۆزی وەک تۆ ناتوانێت بە دروستی هەڵبگیرسێتەوە. من ئەو ساتە بە جۆرێک لە دەست خۆم بێزار و لە ژیانم تووڕەبووم، هەر کەس منی لەو زەلکاوی تارانە دەربهێنایە، گەر بۆ سەر ساجی جەهەنەمیش بایە دەچووم. گەڕانەوەم بۆ ناو شۆڕش سەرەتا هەڵهاتن بوو لەو دەردە خراپانەی لە تاران تووشیان هاتم. شەوێک لە تێرمینالی غەرب سوار ماشێنێک بووم و لە ڕێگای مەهابادەوە و بە کۆمەکی قاچاغچیان ئاودیوی سنووربووم و لە ناوچەی پشدەر خۆم گەیاندە ئەو ناونیشانەی هاوڕێکەم لە تاران بۆی بەیانکردم. دوای چەند شەوێک بە خۆم و کۆڵە پشتێکەوە لە چیاکان لەگەڵ یەکەمین مەفرەزەی شۆڕشدا بە سەرکردایەتی « هەڤاڵ شێرخان» ڕووەو خۆرئاوا بەڕێکاوەبووم. لە یەکەم ڕۆژەوە هەستمکرد شۆڕش لە هەموو کێشە ئەخلاقییەکانی خۆم پاکمدەکاتەوە. ئەوە بەو

مانایە نییە کە من بوویم بە کەسێکی باش و کەم قسور، بەڵکو هەستمدەکرد ئیدی شۆڕش، ئەم بکەرە نادیارە، ئەم دێوە ئەفسانەییە، سەنگی هەموو گوناهەکانم بە شانی خۆی دەکێشێت. «هەڤاڵ شێرخان» کەسێکی چەتەوڵ و بە هەیکەل بوو، دەموچاوێکی ئەسمەر و کونجی هەبوو، بە ڕوخسار پتر لە نەتەوە باشوورییەکانی وەک عەرەب و هیندی و سریلانکی دەچوو، خۆی ماوەیەکی کورت لە ئینگلتەرا ژیابوو، دواتر بەرگەی ژیانی ئەوێی نەگرتبوو، ژن و منداڵەکانی لە پیرمەنگەهام جێهێشتبوو، خۆی گەڕابووەوە بۆ کاری شۆڕشگێڕانە. ئەو یەکەم کەس بوو لە شۆڕشی نوێدا بیبینم. یەکەمین قسەی ئەوە بوو «ئەمجارە ترسناکترە لە جاران... ئەمجارە ترسناکترە». قەمسەڵەیەکی عەسکەری لە بەردابوو، جامانەیەکی کردبووە ملی، کڵاشینکۆفێکی بێقۆناغ و ڕیزێک نارنجۆکی دەستی پێبوو، کەسێک بوو لەوانەی لە ئامادەباشییەکی هەمیشەییدا دەژین. بەرلەوەی بڕواتە بریتانیا، ماوەیەک لەگەڵ «بەرەی میللی فەلەستینی» دا کاریکردبوو، هەتا قسە هەبوو کە لە پەلاماری ڕێکخراوی ئەیلولی ڕەشدا بۆ سەر ئاسنکێشە ئیسرائیلییەکان، لە گوندی ئۆلۆمپی میونخ، ڕۆڵێکی بچوکی هەبوو بێت. بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت ئەو قسانە زنجیرە ئەفسانەیەکن، هەندێ لە سەرکردە نوێکان بۆ خولقاندنی هەیبەت و ترس سەبارەت بە خۆیان دەیتاشن. گەرچی دکتۆر نەبوو، بەڵام بە حوکمی ئەوەی لە زەمانی گەنجیدا ساڵێک پەیمانگای تەندروستی خوێندبوو، هەر بە دکتۆر بانگیاندەکرد. من و ئەو لە ماڵی حاجی زرار یەکمان بینی، هەر یەکەم شەو پێشمکەوت و گوتی «هەڤاڵانمان لە ئەشکەوتی کونەبەورانن، دەڕۆین بۆ ئەوێ». ئەو شەوە من و ئەو، هێسترێکی بارکراو بە ئازوقەمان بە چیادا سەرخست و بە ڕێگایەکی نهێنیدا کە پێشتر من نەمدیبوو، بەرەو کونەبەوران کەوتینەڕێ. لە ڕێگا شتێکی ئەوتۆمان نەگووت، کەسمان زانیاری تەواومان لە سەر چۆنێتی

دابەشبوونی هێزە سەربازییەکان نەبوو، لە بەرئەوە دەبوو بە هێزی بۆن و بە کۆمەکی غەریزە ڕێبکەین. کونەبەوران لە ناو بەردەڵان و گاشستانێکی سامناکدا بوو، ئەشکەوتەکە لەبن کێوە بەردینێکی بەرزدا لە جێگایەکی نهێنی و مەحکەمدا زاری بە بچوکی کردبووەوە، بۆ کەسێک شارەزا نەبێت دۆزینەوەی سەخت و نەکردە بوو. لە ئەشکەوتی کونەبەوران نزیکی بیست چەکداری چڵکن و ڕیشهاتوو و برسیم بینی، کە بە خرۆشەوە چاوەڕوانی هاتنی ئازوقەیان دەکرد. پێدەچوو چەند ڕۆژێک بێت تەنیا بە شتێکی کەم دەریانبردبێت و لەوێدا نیوەبرسی ئێشکیان کێشابێت. ئەشکەوتەکە جێگایەکی تاریک و کەم تروسکە بوو، گەرچی وەرز ڕوو لە گەرمابوو، بەڵام پێشمەرگەکان لە ناوەوە ئاگرێکی گەورەیان کردبووەوە. گەرانەوەم بۆ ڕیزی پێشمەرگە خۆشبەختییەکی قووڵ و تەزوویەکی کامەرانی درێژی بە جەستەمدا هێنا، کە لە بەر ئاگرەکەدا وەستام و سەیری دەموچاوی ئەوانم کرد، تێگەیشتم ئەمە جیهانی راستەقینەی منە، ئەمە ئەو شوێنەیە من دەتوانم بێ درۆکردن لەگەڵ خۆمدا تیا بژیم. لەگەڵ چوونە ژوورەوەمدا بۆ ئەشکەوتەکە، پیاوێکی زل و درێژم بینی سەری بە کەساسی داخستبوو، ڕیشێکی سپی درێژ تاسەر سنگی هاتبوو، هەر دوو دەستی و هەر دوو قاچی بەسترابووەوە و لە کەناردا درێژبووبوو. من کە هێشتا بەراورد بە پێشمەرگەکانی تر تێر و پۆشتەوپەرداخ بووم، هەستمکرد ئەم مەفرەزە بچوکە زۆر لاواز و ماندووە، برسێتی و بێجێیی هەراسانیکردوە، بە پلەیەک ناتوانێت و نابێت شەڕی گەورەبکات. سەعاتی یەکەمم لەوێ ئارام ڕۆیشت و بە تەواوی جەنگاوەرانم گووت کە من لە تارانەوە هاتوومەوە و دەمەوێت ژیانی خۆم بۆ کوردستان تەرخانبکەم، لە شۆڕش بەولاوە ئاسۆیەکی تر لە ژیانمدا نابینم و جگە لە شەهادەت بۆ وەتەن، خەرێکی ترم نییە. قسەکانم لە دڵەوە دەهاتن و جۆشم هەوایەکی ساختە و زووتێپەڕ نەبوو، بەڵام شێرخان دوای سەعاتێک منی جیاکردەوە و گووتی «هەڤاڵ بەناوی

سەرکردایەتی و هەموو هەڤالانەوە پیرۆزباییت پێدەڵێم، گەر پێشمەرگەیەکی باشی شۆڕش بیت، دەبیتە جێگای شانازیمان. بەڵام بەر لەوەی تەواو خۆت یەکلابکەیتەوە، دەبێت من و تۆ هەندێک قسەبکەین» . ئیدی ئەوی ڕۆژ منی لە ئەشکەوتەکە دوور خستەوە و بەرەو ناو بێشە و جەنگەڵانێکی نزیک بردمی و گووتی «هەڤاڵ، دەزانیت ئێمە لە ژێر چ بارێکی سەختدا دەستمان بە شۆڕش کردۆتەوە. دەبینیت گوزەرانمان چۆنە، هەندێک ڕۆژ سەگ حاڵی لە حاڵی ئێمە چاترە. دوژمن لە گوندەکاندا چاوی زۆر دواخستووین، خەڵکێکی زۆری بەکرێگرتووە تا جاسوسی بە سەر هێزەکانمانەوە بکەن، لە هەموو دابەزین و نزیکبوونەوەیەکدا لە ئاوەدانی هەڤاڵێک یان زیاتر لە دەستدەدەین... ئەو سیخوڕ و خۆفرۆشانە ژیانی شۆڕشگێڕانمان دەخەنە مەترسییەوە. لە ترسی ئەوان هەندێک لە مەفرەزە سەرەتاییەکانمان هەڵوەشاندۆتەوە، هەفتەی ڕابوردوو، بە هۆی دەم لێدانی ئەوانەوە هەندێک لە هاوڕێکانمان گیراون، دڵنیام بەعسییەکان بەزیندوویی پێستیان کەوڵدەکەن و جەهەنەمی سووریان پیشاندەدەن. لە بەرئەوە عەزیزم وەک دەڵێن، شۆڕش بە دەستکێشی سپییەوە ناکرێت، من هەمیشە شۆڕشگیرم وەک کەسێک بینیوە کە ئیرادەی تۆڵەکردنەوە و دەست وەشاندنی لە دوژمن بەهێزترە... شۆڕشی ئەمجارەمان هی ئەوانە نییە کە لە خوێن دەترسن. نا شۆڕشی ئەمجارە، شۆڕشی ئەو پیاوە حیزانە نییە ئەگەر لووتیان پژا دەبورێنەوە. نا هەڤاڵ، من لە پێرمەنگەهامەوە هاتوومەوە بۆ ئەوەی ئیرادەی شۆڕشگێڕانەی میللەت ببزوێنم. هاتوومەوە بۆ ئەوەی تۆڵە لە دوژمنانی میللەت بکەمەوە... هەڤاڵ من خێر و خۆشیم زۆر بەجێهێشتووە... ناز و نیعمەتم زۆر بەلاوە ناوە، لە بەرئەوە من لێرەدا دیسپلینم دەوێت. وادەزانم هەڤاڵ تۆ خوێندەواریت و دەزانی ڕێک و پێکی و ملکەچی بۆ شۆڕش مانای چی. شۆڕش بە پشتێنی شلەوە ناکرێ، من لێرەدا ملکەچی تەواوم لێتدەوێت، دەمەوێت ئەو کارەبکەیت کە من

دەیڵێم... هەڤاڵ کە من گوتم کلاشینکۆفەکەت هەڵبگرە و هەموو هاوڕێکانت بکوژە، دەبێت بیانکوژیت. من ئەو هەموو ناز و نیعمەتەم بۆ ئەوە جێنەهێشتووە، لێرە ببم بە ڕابەری کۆمەڵێک ملهوڕ کە نازانن زەبتی شۆڕشگێڕانە یەعنی چی... پاشەڵێکی فشم گەرەک نییە بە شەق بیجوڵێنم. ئێمە هاتووین میللەتێک هەڵبستێنینەوە لە بەرئەوە دەبێت خۆمان لە پۆڵا قایمتر و دڵمان لە بەرد رەقتر بێت، لەوەدا چارمان نییە... هەر وەخت گەڕامەوە بۆ ناو نوێنە نەرمەکەی خۆم لە پێرمەنگەهام، کە چوومەوە ژێر متیلە حەریرەکەم، ئەوسا دەبم بە کەسێکی تر، دەبم بە کەسێکی هێمن و بە ویقار. بەڵام هەڤاڵ شۆڕش یەک مانای هەیە، ئەویش ئەوەیە واز لە نازو نیعمەت بهێنین و بکەوینە شەڕەوە... من و تۆ هەر دووکمان لێرەین بۆ ئەوەی دوژمن بکوژین. هەڤاڵ گەر پێشتر کەست نەکوشتووە کاتی ئەوە هاتووە ئەو ئیشەش تاقیبکەیتەوە... ها بەڵام قەت درۆ و دەلەسەی ویژدانی ئاسوودە فریوت نەدات، هەڤاڵ گەر ئێمە نەیانکوژین شۆڕش لە لانکەدا دەخنکێنن، شۆڕش لەوە لاوازترە بیر لە ڕەحم و بەزەیی بکاتەوە. پێمبڵێ تۆ دەتوانیت دڵێکت هەبێت وەک بەرد، دەتوانیت ڕەق بیت یان نا... چونکە لێرە من پێویستم بە گەڵوگوونی شل نییە، ناتوانم لەم چیاو برسێتی و سەختییەدا گەڵوگوونی شل بەدوای خۆمدا ڕابکێشم. پێویستیم بە کەسێک نییە بڵێت من ئینسانم خۆشدەوێت، من دۆستی بەشەرم، من پورزای مەلایکەتم... من لەو کەسانەم ناوێت، من جەنگاوەر و مرۆڤی دڵڕەق و شەڕکەرم دەوێت، یەکێکم دەوێت شەڕم بۆ بکات. لەبەر ئەوە هەڤاڵ، پێمبڵێ دەتوانیت خەڵک بکوژیت یان نا... پێمبڵێ بە دوو حەرف... بە دوو حەرف بێئەوەی ئەمسەرە و سەرم لەگەڵدا بکەیت، بێئەوەی بڵێیت «بەڵام... ئاخر... لەوانەیە... ئەگەر». لێرە هەموو پێمدەڵێن دکتۆر شێرخان، بە سەری هەردوو کچەکەی دکتۆر شێرخان کە لە غەریبی بەجێم هێشتوون و

هاتوومەوە خەباتبکەم، من هەموو گیانم گوێیە و حەزم لێیە دەنگت ببیستم... بڵێ، بە دکتۆر شێرخانی خۆت بڵێ، تۆ ناتوانیت ئینسان بکوژی، هەر ئێستا دەتنێرمەوە بۆ شار و لەوێ ئیشی ترم بۆ بکە... کارئاسانی ترم بۆ بکە، شتی ترم هەیە بۆت».

دکتۆر شێرخان دوای ئەو قسانە بێدەنگ بوو، بەڵام چاوی لە چاوم بڕیبوو. هەستدەکەم لەو ساتەوە ئیدی ڕقێکی نهێنی و تاریک لە نێوانماندا دروست بوو. دەیویست من بە دوو حەرف پێیبڵێم ئاخۆ دەتوانم مرۆڤ بکوژم یان نا... لەو ساتەدا ئەو ڕۆژەم هاتەوە یاد کە یەکەمجار پەیوەندیم بە شۆڕشی پێشووەوە کرد و لیفیتانت بردمی بۆ کوشتنی ئەسپەکان. لەو ساتەدا هەمان ساردی و ئیرادەی ئاسنین و بێباکی قووڵ لە ناومدا بوو. بەڵام بێئەوەی دەنگ زۆر بەرزبکەمەوە، بە دەنگێکی کپ، خنکاو، پڕگومان، چاوم لێکنا و تفێکم قووتدا و گووتم «دکتۆر دەتوانم». گەرچی بە هەموو توانا و ئیرادە و عەقڵەوە گووتم «دەتوانم»، گەرچی ناخم پەشیمانی تێدا نەبوو، گەرچی هیچ کەسێک و هیچ شتێک لەم دونیایەدا فشاری لێ نەکردم بۆ ئەوەی وشەی وا لە گەرووم بێتەدەرێ، بەڵام هەستمکرد نینۆکێکی نادیار، چقڵی شتێکی نەبینراو لە گەرووم دەچەقێت.

لەوساتەدا بۆ یەکەمجار شتێکی سەیر لە ناومدا جوڵا، وەک بومەلەرزەیەکی خەوتوو، لافاوێک کە پێشی لێگیرابێت، شوشەیەکی گەورەی نادیار لە سەر ڕەفەیەکی دووری ڕۆحەوە بەربێتەوە و بشکێت، مەکینەیەکی ترسناک بێهیچ هۆیەک بکەوێتە ئیش، دەرگایەکی گەورە لە ناکاو بەزرمە لە سەر هەموو ڕوناکییەک دابخرێت، تیشکێک لە جێگایەکی بڵندەوە بەربێتەوە و کوژاندنەوەی دەنگی بێت... شتێک لەو جۆرە... شتێک کە هەمیشە ناونان و باسکردنی ئەستەمە.

وەڵامە کورت و کز و نوساوەکەم دکتۆر شێرخانی خستە گومانەوە.

من لە پێناوی شۆڕشدا باکم بە کوشتن نەبوو، خۆتان دەزانن من پێشتریش شۆڕشگێڕم وەک مەکینەیەک بینیوە کە تەنیا ئەو کارانە دەکات کە شۆڕش دەیەوێت. بەڵام وێنەی کوشتن تا ئەو سەردەمەش لە خەیاڵمدا هەر کوشتن بوو لە جەنگدا... ئامادەبووم هەر سەربازێکی عەرەب بکوژم کە بەرامبەرم تەقەدەکات. بەڵام لە شۆڕشی پێشوودا نە جەنگم بینی و نەکاری کوشتنم پێسپێردرا. بەڵام دکتۆر شێرخان، ڕای وابوو هەموو پێشمەرگەیەک دەبێت ئەزموونی لەگەڵ کوشتندا هەبێت. «گەر لە خوێن بترسیت، لە شەڕدا ئەژنۆت پێ نامێنێت. دەبێت بزانیت یەک شت نرخی هەیە، ژیانی خۆت و هاوڕێکانت، لەوە بترازێت هیچ ژیانێکی تر نرخی نییە. گەر لەویادا گوونی ئینسانییەتت هەستێت و نەتوانیت تەقەبکەیت دەبیت بە مەترسی بۆسەر هەموو مەفرەزەکە».

بە درێژایی ئەو ڕۆژە شێرخان دوور بە دوور خستمییە بن چاوەدێری خۆی و بەردەوام سەیریدەکردم، بەوەدا ئەزموونێکی کارکردنم وەک سیخوڕ هەبوو، دەمکرا خۆم لە نیگاکانی بدزمەوە و ئەو سەرنجەی لا جێبهێڵم کە دڵخۆشم و لە نێو هەڤاڵاندا غەمێکم نییە. کە تاریک داهات، دکتۆر بە نیگا جیدی و سەیرکردنە تیژەکانییەوە هاتە بەردەمم و لە ناو هەموو پێشمەرگەکاندا بە دەنگی بەرز گووتی «هەڤاڵان گوێبگرن، من لە دوێنێوە فەرمانی سەرکردایەتیم پێگەیشتووە، دەبێت ئەم سەگە بکوژین». وای گووت و بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئەو پیاوە پیر و درێژە کرد کە لە بەیانییەوە تا ئەو دەمە بەو چەشنە لە سوچێکی ئەشکەوتەکەدا درێژ بووبوو. ئێمە سبەی بەرەو خۆرئاوا دەجوڵێین و ڕوو لە سنووری باکوور دەکەین، ئیشێکی زۆر گرنگمان هەیە جێبەجێبکەین، ناتوانین بارێکی وەها بەخۆمانەوە ببەستین. بەر لەوە دەبێت خۆمان لە دەست ئەم سەگە ڕزگاربکەین». ئێستێکی کرد و گووتی «ئەمشەو دەبێت بیکوژین... کێ دەیەوێت بیکوژێت... کێ؟». ساتەوەختێکی زۆر قورس بوو، هەمووان

بە خێراییەکی سەیر، بە جۆرێکی ئوتۆماتیکی دەستیان بەرزکردەوە، من نەبێت. من تا ئەو دەقیقەیە خەیاڵم لای پرسیارەکە و چۆنێتی کردنی بوو، بیرم لای ئەوە بوو سەیربکەم، بزانم چ یەکێک لە هەڤاڵان نرکەیەک یان پرسیارێک یاخود نایەکی لێ بەرزدەبێتەوە، بەڵام نەبوو... من لە هەمووان درەنگتر دەستم بەرزکردەوە. وەها بوو وەک ئەوەی شێرخان تەواوی ئەو دیمەنەی بۆ تاقیکردنەوەی من سازاندبێت، وەک پێمبڵێت ئەها دەبینیت تۆ تەنیا کەسێکی دوودڵی لە ناوماندا. کە دەستی منیشی بە بەرزی بینی پاش چەند چرکەیەکی بچوک گووتی «هەڤاڵ وەفاش دەیەوێت... هەڤاڵ وەفاش دەیەوێت... برادەران با دەرفەتێک بدەینە هەڤاڵی تازە، ترسی خۆی بشکێنێت و ئەزموونێک بۆ خۆی کۆبکاتەوە، وەرە هەڤاڵ وەفا... وەرە». ئەوکات لە کوپێکی پلاستیکی ئێرانیدا کە لە هەڤاڵێکم قەرزکردبوو چام دەخواردەوە، چاکەم دانا و سەیرێکی هەموو پێشمەرگەکانم کرد. لەوساتەدا لەوە پەست نەبووم کە کەسێک دەکوژم، بەڵکو لەوەی هەمووان وایاندەزانی من کارێکم پێسپێردراوە کە لە توانامدا نییە جێبەجێیبکەم. خۆم وەک ژنێکی شەرمن هاتە بەر چاو بە زۆر بۆ سەما بیخەنە سەر سەحنە. بەڵام من لە ناخدا ساردبووم و بێباکییەکی ناسنینم هەڵگرتبوو. بێئەوەی سەیری ئەو پیاوە درێژە بکەم کە لەوێدا ڕاکشاوە، لە شوێنی خۆم هەستام و دوای دکتۆر شێرخان کەوتم. شێرخان لە دەرەوە چرپاندی بە گوێمدا «هەڤاڵ کوشتن بەشێکە لە ژیان، پردێکی مەلعونە، هەرکات بمانەوێت لە سەردەمێکەوە بگوازینەوە بۆ سەردەمێکی تر ناچارین بە سەریدا بڕۆین». پاش کەمێک بە دوو پێشمەرگە پیاوە چەتەوڵە گەورەکەیان هێنایەدەرێ. لە بەر برسێتی و بێهێزی و ترس بە ئەستەم خۆی بە پێوە دەگرت. یەکەمجارم بوو بیبینم دەجولێت، بە درێژایی ڕۆژ بێجوڵە لە سوچی مردنی خۆیدا، وەک سرەوتی دوای مردن تاقیبکاتەوە، بێدەنگ و هێمن بوو. ئێستا وەک

شەقشەقە دەلەرزی، بەڵام ترس زمانی شکاندبوو. من ڕاموابوو لە دەمی ئەشکەوتەکە دووری بخەینەوە و لەخوارتر بیکوژین، دکتۆر شێرخان گوتی «هەر لە شوێنی خۆتدا... هەر لەوێدا... تەواوییکە، با هەست نەکەیت کارێکی گرنگ یان تایبەتی دەکەیت. وەک ئیشێکی ئاسایی وەریبگرە. چۆن خەڵک لە حەوش یان بەردەرگایماڵەکانیان کەڵەشێر سەردەبڕن، با هەمان هەستت هەبێت. خۆت مەخەرە بارێکی دەرونییەوە وەک ئەوەی کارێکی تایبەتی بکەیت. کوشتن لە ژیانی شۆڕشگێڕدا دەبێت ببێت بە شتێکی ڕۆژانە. هەڤاڵ ئێمە لە شەڕداین و بۆ شەڕ داومانەتە شاخ». بە ساردی یەکێکەوە کە نایەوێت بزانێت چی دەکات... کلاشینکۆفەکەم وەرگرت و چاوم نوقاند و هەناسەیەکم هەڵکێشا... هەناسەیەکی قووڵ... نا هەناسەکەم، هەناسەی کەسێک نەبوو کە کارێکی سەخت دەکات، بەڵکو وەک هەناسەی ئەو یاریزانانە بوو کە بەر لەدەستپێکردنی یاری نەفەسێکی قووڵ هەڵدەکێشن تا سینەیان سافتر و وزەیان بە تینتر بێت. لەو ساتەدا هەمان ئەو هەستەم هەبوو کە ساڵانێکی درێژ هاودەمی هەموو چرکەیەکی ژیانم بوو، ئەو هەستەی من کار بۆ شۆڕش دەکەم، ئەو هەستەی لە نێوان من و ئەم ئیشەدا هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ نییە. ئەو هەستەی کە ئەم دەستەی من چەکم پێگرتووە دەستی من نییە، بەڵکو دەستی بوونەوەرێکی لە من گەورەترە... لەوساتەدا باوەڕم وابوو ئەوەی ئەو تفەنگە بەرزدەکاتەوە و ئامادەیدەکات و دەیتەقێنێت، من نیم... بەڵکو ئەو خودا نادیار و بڵند و بەهێزەیە کە ناوی شۆڕشە.

کە یەکەم ڕێژنەی گوللەم بەو پیاوەوە نا، خۆم بە جۆرێکی توند ڕاچڵەکیم، نا بە هیچ جۆرێک ئازاری ویژدان منی ڕانەتەکاند، بەڵکو شتێکی کاریگەرتر و قووڵتر، هەستێک وەک ئەوەی گوللەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان و بە شێوەیەکی نادیار بەر خۆم بکەون. دوای تەقەکان بێویستی خۆم، لێی نزیک بوومەوە و تەماشامکرد و هەستم بە مردنی کرد.

هەستکردن بە مردنی ئەوانی تر ئاسان نییە. من دەمێ ساڵ دواتر لە کتێبێکدا کەوتم بە سەر ئەو ڕستەیەدا کە دەڵێت «هەر مرۆڤە و بە تەنیا بۆ خۆی دەمرێت». ئەها، ڕستەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشبوو، بەڵام ڕستەیەکی سادە و ڕووکەش هاتە بەرچاوم، لەو ڕستە زۆر و زەبەندانەی مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو دروستیاندەکات و بێئەوەی زۆر لێیان بڕوانێت بڕوایان پێدەهێنێت. من ئەو ڕۆژە هەستم بە مردنی ئەو پیاوە کرد، هەستێک وەک ئەوەی تۆ لە فیلمێکدا ببینیت پاڵەوانەکە دەچێتە ناو ئاوێکەوە و تۆش لەگەڵیدا ورد و درشت هەست بە هەموو هەستێکی بکەیت، هەستبکەیت چۆن ئاو بەر جەستەی دەکەوێت، چۆن لەشی تەڕدەبێت، چۆن پێشوازی لە ساردی یان گەرمی ئاوەکە دەکات. یاخود ببینیت کاراکتەرەکە لەگەڵ ژنێکدا دەخەوێت، تۆش هەموو ئەو هەستانەی لەگەڵدا بژیت، جوڵە و هەڵچوون و تەڕبوونەکانی پێکڕا لای خۆت هەست پێبکەیت. هەڵبەت نزیکی دوو مرۆڤ لەگەڵ یەکدا هەرگیز ناگاتە ئەو ئاستەی مردنی ئەو ببێتە مردنی تۆ... بەڵام دەگاتە ئەو ئاستەی مردنی ئەو ببێتە بەشێکی هەمیشەیی ژیانی تۆ. من لەو ساتەدا ساردبوونەوەی لەشی ئەو پیاوەم هەست پێکرد، ئەو ئازارەی لە نێوان سەر و خواری جەستەیدا سەمایدەکرد بە جەستەی مندا تێپەڕی. نا بە هەڵەدا مەچن و وابزانن «ناڕەحەتی ویژدان» منی بەرەو ئەوە بردبێت، وابزانن سۆزی من لەگەڵ ئەم کوژراوەدا جۆرە هەستێکی وای تێدا خولقاندبێتم. گەر واتێبگەن، هیچ شتێک لە ماهیەتی ئەو ساتە تێنەگەیشتوون کە من تێیدا یەکەم کوشتنی ناو چیرۆکی دوور و درێژی زیندەگی خۆم تۆمارکرد. هەستی من بە مردنی ئەو پەیوەندی بە شوێنی منەوە لە ناو کۆی دونیادا هەبوو، ئەو هەستەم پەیوەندی بەوەوە هەبوو کە هەمان ئەو ڕۆڵەم یاریدەکرد کە لە دەقی خودا دا بۆ من نوسرابوو. هەموو مرۆڤێک خودا تەنیا دەموچاوێکی تایبەتی

پێنابەخشێت، بەڵکو جێگایەکی تایبەتیشی پێدەبەخشێت. زەوی هیچ نییە جگە لە شوێنێکی خانە خانە، هەموو خانەیەکی مرۆڤێکی تایبەتی بۆ دەنێرێت. هیچ مرۆڤێک ناتوانێت خانەی خۆی بە خانەی یەکێکی دی بگۆڕێتەوە، مەسەلەکە هەر ئەوە نییە مرۆڤ نەتوانێت دایک و بابی یان خوشک و برا و خزمانی بگۆڕێت، بەڵکو ئەوەیە ئەو خانەیەش وەک بۆتەیەکی هەتاهەتایی داخراو وەهایە، دەتوانین خۆمانی لە ناودا بگۆڕین بەڵام ناتوانین خودی بۆتەکە بگۆڕین. هەر شتێک کە لە ژیاندا دەیبینین پەیوەندی بەو بۆتەیەوە هەیە... ئەوەی من ئەو شەوە هەستم بە مردنی ئەو پیاوە کرد، پەیوەندی بە ئامادەگی مردنەوە هەبوو لەوێدا، لە ناو ئەو خانەیەدا، لەو شوێنە داخراوەی زیندەگی مندا. کوشتنی ئەو پیاوە قەدەری من بوو، من بۆیە هەستەکانی ئەو ژیام، چونکە یەک یەکترمان تەواودەکرد، جەلاد هەمیشە تەواوکاری قوربانی و قوربانی هەمیشە نیوەی دووهەمی جەلادە، هەردووکیان گەر قەدەر کۆیانبکاتەوە بە جۆرێک لێک نزیکدەبن، وەک دووانەیەک دەنووسێن بەیەکەوە، بە جۆرێک هەستەکانیان بۆ یەکدی دەپەڕێتەوە و یەک ئەویدی لە حاڵی خۆی ئاگاداردەکاتەوە. من ئەو شەوە مەحکوم بووم بەوەی لەویادا بم... مەحکوم بووم بەوەی هەست بە مردنی ئەو پیاوە بکەم. گەر منیش نەبوومایە ئەو هەر دەمرد، بەڵام من دەبوو لەوێدا بم. من لە قووڵایی ژیانەوە ڕەوانەکرابووم بۆ ئەوەی لەوێدا بم. مەبەستم لەوەیە هەستی من بە مردنی ئەو پیاوە لەوەوە نەهاتبوو من چی دەکەم، بەڵکو لەوەوە هاتبوو من لە کوێم. بەڵام هەمیشە شتێک لە مرۆڤدا هەیە کۆمەکماندەکات قەبوڵی ئەو جەبرە نەکەین کە خانە داخراوەکە دەیسەپێنێت. واتە من قسەم لە سەر جەبرییەتێکی ڕەها نییە، ناڵێم کە نەدەکرا من ئەو کارە نەکەم. ئێمە لای خودا هەر یەکەمان کاراکتەرین لە ناو شانۆگەرییەکدا، هەر یەکەمان تێکستێک و ڕۆڵێکمان پێدراوە، بەڵام ئەوەی خودا لە ئێمەی

دەوێت ئەوەیە کە نە ئەو تێکستە بڵێینەوە و نە ئەو دەورە نمایشبکەین. خودا داوامان لێدەکات ئەو ڕۆڵە نەبینین کە ئەو نوسیویێتی، بەڵکو لەو ڕۆڵە یاخیببین... بەڵێ شتێک هەیە ناوی جەبر و قەدەرە، شتێکە پەیوەندی بە بوونی ئێمەوە هەیە لە شوێن و کاتێکی تایبەتیدا. بەڵێ خودا ژوورێکمان لە وجوددا پێدەبەخشێت، دەمانخاتە زیندانێک لە زیندانە داخراوەکانییەوە، جوغزێک لە جوغزە ئەبەدییەکانی، دەمانکاتە کاراکتەرێک لە کاراکتەرەکانی خۆی و تەماشاماندەکات. گەر نمایشمان تەواو وەک ئەو ڕۆڵە وابێت کە بۆمان نوسراوە، ئێمە ئەکتەری بەد و بێبەهرەین، تا زیاتر لەگەڵ دەقی نمایشەکەدا بڕۆین کەسێکی بەدمان لێدەردەچێت. هەموو نهێنی ژیان لەوەدایە کە ئەو شتە نەبین کە بۆمان دیاریکراوە، لە ناخماندا بوونەوەرێکی تر هەیە بەردەوام چاوەڕوانی ئەوەمان لێدەکات، ئەو شتە نەبین کە پێشتر بۆمان دیاریکراوە. قانونەکانی ناو خانە بچوک و بۆتە داخراوەکە کوێرانە جێبەجێ نەکەین... خۆمان لەو جەبر و مەحکومییەتە ئازادبکەین. بوونەوەرێکی تر هەیە پێماندەڵێت ئەگەر بە سەر هەموو شتەکاندا بچینەوە دەکرا هەموو چیرۆکەکان بە جۆرێکی تر بێت و هەموو تێکستەکە بە داڕشتنێکی تر و ناوەڕۆکێکی تر بنوسرێتەوە، بوونەوەرێک هەیە داوامان لێدەکات ژیانمان پێچەوانە بکەینەوە و ببینین کە دەکرا وەها نەبێت.. دەکرا ئەو شتە نەکەین کە شوێن نیشتەجێبوونمان لە دونیادا داوایدەکات. ئیشی ئەو بوونەوەرە نادیار و گەورەیەی ناخمان ئەوەیە کە پێمانبڵێت دەکرا شتەکان هەمووی بە جۆرێکی تر بن. ئەو بوونەوەرە تێکستێکی تری پێیە، کە تێکستی خودا نییە و تێکستی ئێمەیە، تێکستێکە گەر نمایشی نەکەین، هێدی هێدی ئەو بوونەوەرە پیردەبێت و دەمرێت. ئەو شەوە کە من هەستم بە مردنی ئەو پیاوە کرد، تێکستێکم نمایشدەکرد کە تێکستی من نەبوو، بەڵکو تێکستی قەدەر بوو. ئەو دەورەبوو کە بۆم دیاریکرابوو... مردنی

ئەو وایکرد زۆر بە ڕوونی شوێنی خۆم لەم گەردونەدا ببینم. ببینم کە ئیشم ئەوەیە بکوژم و بکوژرێم. بەلام با زیاتر لە سەر ئەو ساتە بدوێم، زیاتر پێتان بلێم ئەو مردوە چ هەستێکی تیا بەجێهێشتم.

مردن وەک تەقینەوەی بۆمبێک وایە کە بێحیساب پارچەکان لە دەوری خۆی بلاودەکاتەوە. هەموو مردنێک هەزاران پارچەی لێدەبێتەوە، کە بە جۆرێکی نەبینراو ئەوانی دی دەبڕێت و شتی سەیریان لە ناودا دروستدەکات. هیچ مردنێک نییە شتی تازە لە ناو زیندووەکاندا دروست نەکات. مردن شتێکە وەک ئەو ساتەی تۆپێک هێڵی گۆڵ دەبڕێت و دەچێتە بن تۆرەکەوە... کێ هەست بە گۆڵەکە دەکات، تۆپەکە یان ئێمە؟. مردن شتێکە لەو جۆرە، ئەو کەسەی دەمرێت خۆی بە تۆپەکە دەچێت، چونکە ئیتر نە چاوی هەیە ببینێت، نە هەستی هەیە تیا بژی، نە دڵی هەیە جەوری تەنهاییەکەی بکێشێت. ئەوە ئێمەین تەنهایی مردنی ئەو دەکێشین، ئێمەین دەخرۆشێین، ئێمەین هاواردەکەین، ئێمەین لە شوێنی خۆمانەوە وەک گوللەیەکی دوور پێکابینی بەرزدەبینەوە و دەقیژێنین، پێدەکەنین و دەگرین، هەستمان بە ژیان لە سنووری ئەزموونی ڕۆژانە دەردەچێت و دەبێتە خرۆشانێکی نوێی دەرون. لە مردنیشدا وەهایە، ئەوە ئێمەین هەستدەکەین ئەو بە تەنها مردووە، نەوەک ئەو. مردوەکان هەرگیز بەتەنها نامرن، بەڵکو هەموو مردوویەک بە جۆرێک لە جۆرەکان هەمووومان لەگەڵ خۆیدا دەکوژێت. ئەوەی لە مردندا لێیدەترسم، ئەوەیە کە هەموو مردنێک هەموومان پێکڕا لەگەڵ خۆیدا دەبات، هیچ مردنێک نییە لەگەڵ خۆیدا من و تۆی نەکوشتبێت، چونکە ئەو مردنە بۆشاییەک جێدەهێڵێت کە بەردەوام ئەو بۆشاییەمان بیردەخاتەوە کە ئێمەش جێیدەهێڵین. بۆ ئەوەی تێمبگەن، دەبێت بلێم ژانی من لەو ساتەدا لە ژانی ماسییەک دەچوو کە ماسییەکی تر دەخوات، بەلام لەوکاتەدا کە خەریکی خواردنە، دەڕوانێت و دەبینێت کە وا ماسییەکی گەورەتر

خەریکە خۆی دەخوات، ئەو ماسییەی تریش ماسییەکی گەورەتر و ئەوی دیکەش یەکێکی لە خۆی گەورەتر دەیخوات، بەوجۆرە تا کۆتایی... تا ئەوسەری گەردون... تا دەگەینە سەر خودا. ئەوەی من لەو ساتی کوشتنەدا هەستم پێکرد ئەو ژانە گەورەیە بوو کە سەر بەرز دەکەیتەوە و بۆشاییەکی بەرینی گەردون دەبینێت و تێدەگەیت هێزێکی زەبەلاح... دەلاقەیەکی تاریک لەوسەری گەردونەوە دەمی بۆ کردویتەوە و تۆش وەک ئەو، وەک ئەم مردوەی بەردەمت لە ناو هەمان ئەو تاریکییەدایت... بەڵام دڵنیام ئەو ژانەی ئەو پیاوە زەبەلاح و چەتەوڵەی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچکرد لەو ژانە بچوکتر بوو کە لە دڵی من ئاڵا، من سەرم بەرزکردەوە و وەک ئەو خۆم لە ناوەڕاستی مردندا بینییەوە. بەڵام جیاوازییەکەمان لەوەدا بوو، من مردنم دەبینی و ئەو نەیدەبینی. لەو ساتەدا هەستی من بە مردن لە هەستی ئەو بەهێزتر و تاریکتر بوو.

دکتۆر شێرخان بە ساردییەکەوە هاتە سەر تەرمەکە و بە لووتی پۆتینەکەی یارییەکی بچوکی بە سەری کوژراوەکە کرد، گووتی «دەستخۆش، دەبینیت شتێکی وەها قورسیش نییە». من نە ئەو کەسەم دەناسی کە کوشتوومە، نە ناویم دەزانی، نە دەمزانی چ کارەیە. بۆ ئەوەی بتوانم ئاسوودەبم، بۆ ئەوەی نەهێڵم سەنگی ئەو ساتە لە سەر دڵم بنیشێت، ئەو شەوە دەفتەری یاداشتەکانم دەرهێنا و هەموو شتێکم تۆمارکرد، دواجار نوسینی یاداشت، لەوە ڕزگاریدەکردم ڕووداوەکە بە سەختی وەربگرم. لە هەندێ ساتی تایبەتیدا ئەوەی نوسەرێک لە ناوتدا بێت شتەکان تۆماربکات، کۆمەکێکی گەورەت پێدەکات، تا پتر باوەڕ بهێنیت ئەوەی تاوانەکەی کردوە تۆ نیت، بەڵکو ئەوەی دەیگێڕێتەوە تۆیت. منیش نوسەرەکەی ناوم، ئەوەی یاداشتەکانی تۆماردەکرد، هەمیشە کۆمەکێکی مەزنی پێشکەشکردوم تا وابزانم گەورەترین بێگوناهی دونیام. ئەو شەوە خەوتم و بە ئاسوودەگییەکی قووڵەوە بە خۆم گووت «شۆڕش

چی بوێت، دەبێت هەموومان بۆیبکەین، شۆڕش لە سەروو هەموو شتێکەوەیە». بەڵام چەند جارێک لە خەو ڕاپەڕیم و هەر جارێکیش بەئاگا دەهاتمەوە، هەستمدەکرد تەزوویەکی سارد و تیژ بە لەشمدا تێدەپەڕێت، تەزوویەک دەمبینی لە سەرەوە بۆ خوارەوە بە جەستەمدا دادەبەزێت، وەک ئەوەی هێزێکی نادیار کەناڵێک لە لەشمدا بکاتەوە و دوو کەرتمبکات.

ئەوە سەرەتای کارکردنی من و هەڤاڵ شێرخان بوو پێکەوە، زۆری نەبرد ئەو بوو بە ئەندامی ئەنجومەنی باڵای حیزب و منیش بووم بە یەکێک لە بڕوا پێکراوە گەورەکانی ئەنجومەن. ئەو منی کرد بە ئەندامی پەیوەندی لە نێوان بیرۆی باڵا و ڕێکخراوە نهێنییەکانی شاردا... بەڵام لە قووڵایی دڵدا نە ئەو منی خۆشدەویست و نە من ئەو.

# سەرەتای پەیوەندییەکی تاریك

دکتۆر مستەفا شوکاک کە نزاری بە زامداری بینی، گوتی «وای خوای گەورە.. کێ وای لەم گەنجە جوانە کردوە؟». دکتۆر لەو کەسە هەست ناسکانە بوو کە بە ڕاستی لەگەڵ ژانی نەخۆشەکانیدا دەژیا. لەو کاتەوەی کە لە بیمارستان دامەزرابوو، هەموو وەک فریشتەیەک «کە خودا بە ڕەحمەتی خۆی کۆلێژی پزیشکی پێ خوێندوە» باسیاندەکرد. بەڵام دواجار کە دکتۆرم ناسی و چیرۆکی ژیانیم کەوتە بەردەست، سەیرم لەوە هات کە چۆن پیاوی وەها ناسک دەتوانێت پزیشک بێت. ئەوانەی زۆر هەست بە ئازاری مرۆڤ دەکەن، دوو کار لە دونیادا هەیە نابێت بیکەن، سیاسەت و پزیشکی... ئەم دوو ئیشە مەلعونە هەردووکیان سەروکارێکی زۆریان لەگەڵ ئازاری مرۆڤدا هەیە، هەردووکیان لە بنەڕەتدا وا دێنە پێشێ کە ژانی ئینسانەکان کەمدەکەنەوە و دەیانەوێت ئازار

لە سەر زەوی نەهێڵن، بەڵام زۆربەی کات یان دەستخەڕۆ و بێئەنجام دەمێننەوە یاخود کێشی غەم و بەدبەختی لە دونیادا زۆرتر دەکەن.

دکتۆر مستەفا شوکاک، لە حەسرەت بینینی نزاری بریندار، قۆڵی ژنە گەنجەکەی بەردا و لەگەڵ ئەوانەدا کە لە سەر خەوگەیەکی تایەدار زامدارەکەیان بەرەو بەشی فریاگوزاریی دەگواستەوە کەوتە ڕاکردن... نەغەدە ماردینی بێویستی خۆی، وەک ئەوەی بینینی ئەم گەنجە خوێناوییە سەیرترین شتی ژیانی بێت، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوانی دیدا بگاتە سەر بریندارەکە لەگەڵ دکتۆری مێردیدا کەوتە پەلەپەل، یەکەمجار بوو مرۆڤێک بەو جۆرە لە خوێنی خۆیدا ببینێ.

نزار چەقۆیەک لە پشتەوە پێکابووی، برینێکی قووڵیش لە سەر کەلەکەی چەپی بوو، بێوەستان خوێنی لێدەڕۆیشت و دەبوو دەمودەست بڕواتە ژێر نەشتەرگەرییەکی خێرا، نەبا کەم خوێنی یان خوێنبەربوونێکی ناوەکی بیکوژێت. دکتۆر مستەفا شوکاک، کە ئەمڕۆ دکتۆری بەرپرس بوو، بە پەلە خۆی کرد بە ژووری نەشتەرگەریدا. نەغەدە وەک ئەو خوێنە ڕایکێشێت، بە دوای دکتۆردا و دوور لە هەر ڕێسا و ڕێکخستنێکی بیمارستان خۆی کرد بە ژووری نەشتەرکاریدا. پەلەپەل و جەنجاڵی و ڕاکەڕاکەی تیمارپێچەکان نارێکییەکی وەهای دروستکرد، کەس سەرنجی نەغەدەی نەدا کە لە سوچێکدا وەک سەیری شتێکی ناوازە و یەکجارە بکات، سەیری نزاری نیوە مردووی دەکرد. بینی تیمارپێچەکان چۆن بە پەلە ڕووتیدەکەنەوە، ئەو قامەتە گریکییە سافەی بینی، ئەو لەشە خوێناوییەی بینی کە وەک لەشی خوداوەندێکی کۆن ڕێک و بێگرێ و باڵابەرز بوو، ئەو سنگە سپییەی خوێن سووریکردبوو، هەتا شتە نێرانەکەی بینی کە وەک سەری قۆپچەیەکی گەورە لە ناو تۆپەڵێک مووی چڕدا چووبووەوە یەک، بینی چۆن بە پەلە خوێنەکەی دەسڕن و دەرمانیدەکەن، چۆن دکتۆری مێردی بە خێراییەکی شێتانە دەست لە

هەموو لەشی دەدات، چۆن هەڵیدەگێڕێتەوە و لە پشتەوە ڕا، برینێکی گەورە دەسڕێت و زامپێچی تایبەت دەخاتە ناو برینەکە و دەریدەهێنێتەوە، چۆن دەرزییەکی گەورە ئامادەدەکەن، چۆن کچێک بە خێرایی دەرمانێکی تایبەت دەدات لە برینپۆشێکی سپی گەورە و دەینێتە سەر زامی نزیک کەمەری. بەڵام ئەوەی کە نەغەدە ماردینی لە هەر شتێک زیاتر سەیریدەکرد دەموچاوی نزار بوو. سەیری لێهات ئەم دەموچاوە لە ناو ئەو هەموو ئازار و ژانەدا، جوانی و بێباکی خۆی لە دەست نەداوە. هێشتا هەیبەتێکی ترسناکی تێدایە و ئەو سەرنجە جێدەهێڵێت کە بوونەوەرێکە لە قووڵایی ژیانەوە هاتووە... قووڵاییەکی نادیار، جێگایەکی عاسی کە نەغەدە ماردینی دەیەوێت بۆی بچێت... جێگایەک ژیان تێیدا جیاوازە لە ژیانی نێوماڵەکەی دکتۆر مستەفا شوکاک. دڵنیابوو ئەو شوێنەی ئەم کوڕەی لێوە هاتووە، جێگایەکی ترە، هەموو شتێک لەوێ ڕەنگێکی تۆختری هەیە، هەستەکان قایمتر و شێتانەترن، توڕەبوونەکان زیاتر لە توڕەبوون دەچن، عەترێکی دەستکرد بۆنی شتەکان داناپۆشێت، جوانییەکان بە هەموو سەرشێتی خۆیان و ناشیرینییەکان بە هەموو جەوهەری سروشتی خۆیانەوە لەوێن... دنیایەکە شتەکان وەک دونیای ئەو ڕێک نەخراون، بەڵکو هێشتا وەک بەشێک لە سروشت، وەک بەشێک لە یەکەمین پاکی و یەکەمین پیسی دەردەکەون. بۆ ساتێک هەستیکرد نزار بۆنێکی تایبەتی هەیە، بۆنێک کە تەنیا بۆنی خوێنە گەرمەکەی نییە، کە فەزای بیمارستانی پڕکردوە، بەڵکو بۆنێکی ترە کە تەنیا ژنێکی شاعیری وەک ئەو هەستی پێدەکات. خۆشحاڵبوو کە دەتوانێت بە خۆی بڵێت «ژنێکی شاعیر». بەراستی ئەو ژنێکی شاعیرە، هەستیکرد بۆ ئەم پیاوە زامدارەی لەوێدا کەوتووە، دەتوانێت شیعرێک بنوسێت. بیریکردەوە ناوی بنێت «بۆنی پڵنگی بریندار»... سەرسامبوو بە خۆی... بۆنی پڵنگی بریندار... یان خوێنی پڵنگی بریندار... کامیان...

كامیـان .. بـەڵام هەردووكیـان جوانـن. لـەو سـاتەدا كـە بیـری لـە دێـڕی یەكەمـی شـیعرەكەی دەكـردەوە، گوێـی لێبـوو نـزار یەكەمیـن نركـەی كـرد. شـتێك لـەو چركەیـەدا هاتـە خەیاڵـی ئـەوە بـوو، ئـەو وەك ژن، ئـەو وەك ژن لـە نێـوان ئـەم دوو جـۆر پیـاوەدا كامیانـی دەوێـت، ئـەم مێـردە جوانـەی كـە خەریكـە وەك فریشـتە ژیانـی ئەوانـی تـر ڕزگاردەكات، یـان ئـەم گەنجـە باڵابـەرزە زامـدارە كـە بۆنـی دڕندەیەكـی ڕام نەكـراو و بێئامـان و برینـداری لێدێـت. نەغـەدە تونـد چـاوی نوقانـد و بـە دەنگـی بـەرز لـە دڵـی خۆیـدا گووتـی «ئەوەیانـم دەوێـت كـە وەك دڕندەیەكـی بێئامـان وایـە»... دڵنیابـوو ئەوەیانـی دەوێـت... دڵنیابوونێكـی ترسـناك، دواتـر ناویدەنـا «دڵنیابوونێكـی كوشـندەی ژنانـە». ئـەوەی بـە ئـاگای هێنایـەوە هـاواری دكتـۆری مێـردی بوو كـە لـە كاتـی ئیشـدا و لـەو پـەڕی شـپرزەییدا چـاوی بـەو كەوتبـوو. «ئـاه، نەغـەدە. خێـرا بـۆدەرەوە... خێـرا بـۆ دەرەوە... تـۆ نابێـت لێـرە بیـت... نـا... نابێـت... باوەڕبكـە نابێـت، خوایـە گـەر دكتـۆر جەلالـی باوكـت بزانێـت، گـەر بزانێـت».

لـە ڕێـگادا بـۆ ماڵـەوە... نەغـەدە خەیاڵـی تەنیـا لای ئـەو دونیـا سـەیر و دوور و نەزانـراوە بـوو كـە ئـەم كـوڕە بیمـارەی لێـوە هاتـووە. بـاوەڕی وابـوو بـۆ ژنێكـی وەك ئـەو كـە دەیەوێـت شـیعرەكانی زۆر لـە ژیـان دوور نەكەونەوە، بـۆ شـاعیرەیەكی وەك ئـەو، ئەمجـۆرە زیندەگییـە ناسـكە كـە جگـە لـەوەی نانبخـوات و بخەوێـت هیچـی دیكـەی تێـدا نییـە، شـتێك نابەخشـێت، شـتێكی گـەرم و ئاگریـن كـە كۆمەكـی بەهـرەی بـكات. «چـۆن ببـم بـە شـاعیر، چـۆن ببـم بـە باشـترین شـاعیر گـەر شـێتێتی تاقـی نەكەمـەوە». هەڵبـەت وەك هەمـوو كچێـك مافـی ئـەوەی هەیـە دیوێكـی شـێتانەی خـۆی هەبێـت، دیوێـك دژی ئـەو هەمـوو عاقڵییـە ڕاپەڕێـت كـە لـە منداڵییـەوە، وەك كچـە بچكۆلـەی دایـە و بابـە، وەك كچـە عاقـڵ و بەحورمەتەكـەی دكتـۆر جـەلال ماردینـی، تێیـدا سـەوزكراوە. ناتوانێـت تـا هەتاهەتایـە هـەم شـاعیرە بێـت و هـەم وەك

ژنە بە حورمەتەکەی دکتۆر مستەفا شوکاک، خەریکی دروستکردنی تەپسی و جنینی بامێ و سوورکردنەوەی شفتە بێت... ناتوانێت تا ئەبەد لە نێوان حورمەتی ژنانی ئاسایی و شەرەفی شاعیرییەتدا دوودڵ بێت. بەڵام دەیەوێت چی بکات، دووبارە بگەڕێتەوە بۆ لای دایکی، بچێتەوە ژوورە تایبەتییەکەی خۆی، بچێتەوە نێو دونیای جاران، نێو قەفەزی کچە بچوک و ناسک و بەحورمەتەکەی دکتۆر جەلال ماردینی. هەرچۆنێک بێت لای مستەفا شوکاک کاتێکی زۆرتر و تەنهاییەکی زۆرتری هەیە کە هەردووکیانی وەک هەوا پێویستە. لە ڕاستیدا خانمی ماردینی لە دڵتەنگی و سەرسامی و بێزارییەکی گەورەدا بوو، ساتێکی دوودڵی قووڵ بوو. کە گەڕایەماڵەوە، دایە پرمەی گریان، لە نێوان فرمێسکەکانیدا بە دەنگی بەرز گووتی «عەفوومکە خوایە... هیچم بۆ ئەم پیاوە پێ نییە... هیچم بۆ ئەم پیاوە پێ نییە». مەبەستی دکتۆر موستەفا شوکاک بوو کە هەستی بە بەزەییەکی قووڵ کرد بەرامبەری. بەدەم هەنسکەوە، گووتی «شایستەی یەکێکی لە من باشترە. کچێک ئەم هەموو خەیاڵە خراپەی لە مێشکدا نەبێت... کچێک بە پیاوێکی گەورە و گرنگی بزانێت... نەوەک من... نەوەک من کە زۆر دوورم لێی». هیچ شتێک لەوە سەختتر نییە بۆ ئافرەت کە مێردەکەی وەک فریشتە بێت و ئەو خۆشی نەوێت. بۆ ساتێک گووتی «ئەو ژنانەی مێردەکانیان خراپن، بێکارن، نانی خواردنیان نییە، ئازاری خێزان و منداڵی خۆیان دەدەن، لە من بەختەوەرترن. خودایە لە من بەختەوەرترن. هەموو ئەوانە بەهانەیەکیان هەیە لە ماڵ ڕابکەن، بتۆرێن، بۆ ژیانێکی تر بگەڕێن، بۆ ئومێدێکی تر بگەڕێن، بۆ پیاوێکی تر بگەڕێن... بەڵام من... من... کە مێردەکەم ئەو پیاوەیە کە هەموو ژنان خەونی پێوەدەبینن... من چی... من چی... وای کە بێشانسم... وای». لە ناو فرمێسکەکانیدا، لەگەڵ هەنسکدا گووتی «من هیچ ڕێگایەکم نییە لێوەی ڕابکەم... هیچ

ڕێگایەکم نییە... دواجار بۆنی ئەم ماڵە خۆشەی دکتۆر مستەفا شوکاک دەمکوژێت، خوای گەورە یارمەتیم بدە شتێکی تر بژیم... خوای گەورە یارمەتیم بدە لە جەهەنەمی ئەمجۆرە بەختەوەرییە دەرچم». دوایی هەستا و دەموچاوی شت و سێ جار تەلەفونی بۆ ژوورەکەی مستەفا شوکاک کرد، بزانێت ئەو گەنجە ماوە یاخود مردووە. لە دڵی خۆیدا گووتی «خودایە بەڵکو سەلامەت هەستێتەوە، خودایە وابکە بژی، خودایە وابکە ساغ و سەلیم بێت».

نزار ئیدریس لە بەشی فریاگوزاری لەژێر نەشتەرکاریدا بوو کە لیڤیتانت و مەفرەزەکەی خۆیان کرد بە بیمارستانی گشتیدا. لیڤیتانت واهاتبوو نزار لەگەڵ خۆیدا بەرێت، بەڵام کە هەواڵەکەیان بە بەڕێوەبەری گشتی خەستەخانە و جێگرەکەی «کە ئەوکات دکتۆر جەلال ماردینی بوو» ڕاگەیاند، هەر دووکیان بە تورەییەوە هاتنەدەرەوە و لە پێشی ئەوەی چەکدارەکانی لیڤیتانت بیمارە بێهۆشەکە بدۆزنەوە، گەیشتنە بەردەمیان و ڕێگریان لێکردن. دکتۆر جەلال ماردینی هەڕەشەی ئەوەی لێکردن کە ئەگەر لە چاو تروکانێکدا نەچنە دەرەوە، تەلەفون بۆ بەڕێوەبەری ئاسایش و پارێزگار دەکات، زۆر بە خێرایش هەڕەشەکەی خۆی جێبەجێکرد. لیڤیتانت گەرچی بە گەرم و گوڕییەکی بێوێنەوە خۆی کرد بە خەستەخانەدا، بەڵام لەوێدا هەستیکرد هەڵەیەکی گەورەی کردوە، ئەگەر لە سەری بڕوات، دەرەنجامەکانی دەشێت باش نەبن. دواجار لیڤیتانت یاریکەر بوو، ڕاستە پڕبوو لە جۆش و تورەیی و کینە، کە هەر سێکیان بۆ جەنگاوەر سیفەتی پێویستن، بەڵام دەیتوانی بە زەین و هزری گەمەبازێکی زیرەکیش بیربکاتەوە. لە ناو خەستەخانەکەدا هەستیکرد کە گەورەیی بیناکە و زۆری ژمارەی ژوورەکان و بێئاگایی ئەو لە نەخشەکەی وادەکات کاری دۆزینەوەی نزار ئاسان نەبێت، لە بەرئەوە، بەرلەوەی شتەکان ئاڕاستەیەک بگرن نەگیرێنەوە، هێزکانی کێشایەوە و

لە بەر هەر دوو دەرگا سەرەکییەکەدا، دوو چاودێری نهێنی دانا بۆ هەواڵ و بەدواداچوون.

«گەنجەکە ژیانی لە مەترسیدایە، بەستەزمانە هێشتا بێهۆش لە ژێر بەنجدایە، بەڵام لیڤیتانت عومەر بۆتانی دەیەوێت بیگرێت... یان راستتر وایە بیرفێنێت». دکتۆر مستەفا شوکاک لە تەلەفونەکەدا وای بە نەغەدە ماردینی گووت کە سەرسامانە پرسی «بەڵام لیڤیتانت عومەر بۆتانی کێیە؟». مستەفا شوکاک بە غەمەوە بۆی ڕوونکردەوە «یەکێکە لەو سەگانەی دەوڵەت بەریداونەتە گیانی خەڵک». نەغەدە بەرلەوەی تەلەفونەکە دابنێت، بە گەرمییەکەوە کە دکتۆر پێشتر کەمجار سەرنجی دابوو، داوایکرد «بەڵام خۆ تۆ دەبێت شتێک بکەیت، ژیانی ڕزگاربکەیت... وانییە... تۆ دکتۆر نیت؟. باوکم لە خەستەخانەکە شتێکی گەورە نییە؟... دەبێت ئێوە نەهێڵن، ئەو بۆتانییە شتێکی لێبکات». مستەفا شوکاک سەرەتا لە ژنەکەی تێنەگەیشت، بەڵام کە خوداحافیزیان لە یەکدی کرد، ڕاستەوڕاست خەیاڵی بۆ ئەوەچوو کە لەوانەیە بە ڕاستی بتوانێت ئەم کوڕە گەنجە ڕزگاربکات. دکتۆر لە ناخەوە ڕقی لە بەعسییەکان بوو، ماوەیەک بوو ڕۆژانە خەستەخانە پێشوازی لە خەڵکانێک دەکرد کە بە دەست مەفرەزەکەی لیڤیتانت ئازار درابوون. ئێستا دەبێت چییان لەم گەنجە بوێت. بیریکردەوە گەر گەنجەکە خۆی جێگای هەبێت، ئەم دەتوانێت بە جۆرێکی نهێنی لە بیمارستان دەریبکات، شۆفێری ئەمبولانسەکە جێگای بڕوایە... زۆر جێگای بڕوایە. بۆ دواتریش، دەتوانێت ڕۆژانە بچێتە دیداری و زامەکانی دەرمانبکات تا هەڵدەستێتەوە. دەبێت بڵێم کە دکتۆر هیچ کات پیاوێکی ترسنۆک نەبووە، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەوە یەکەمین کردەی ئازایەتی گەورە بوو بیری لێبکاتەوە. دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ نزار هۆشی هاتبووەوە بەر خۆی، بەڵام حاڵێکی دژواری هەبوو، جوڵاندنی ئاسان نەبوو، برینەکانی نوێ بوون... خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیشتبوو،

گێژ و کەم توانا بوو. ئەو دکتۆر کە لە خەستەخانە هاتەدەرێ و سوار مۆسکۆڤیچە شڕەکەی بوو، هەستی بەوەکرد کە لە بەر هەردوو دەرگاکەدا جۆرە چاوەدێرییەکی بچوک هەیە، لە دەوری ماشێنێکی بچوک دووان لە پیاوەکانی لیڤیتانتی ناسییەوە وەستاون و جگەرەدەکێشن و بە دەنگی بەرز پێدەکەنن و قسەدەکەن. بێئەوەی گوێیان بداتێ گەڕایەوە بۆ ماڵێ و نەغەدەی بینی لە سەر مێزی نوسینەکەی خەریکی یەکەم ڕەشنوسی شیعری «بۆنی پڵنگی بریندار»ـە. نەغەدە لە کاتی شیعر نوسیندا، هەمیشە دێڕە تازەکانی چەند جارێک بە دەنگی بەرز دەخوێندەوە، دکتۆر لە کاتی خۆ گۆڕیندا گوێی لە ژنەکەی بوو کە دەڵێت «زۆر ویستوومە بۆنی مانگ بکەم... بەڵام مانگ وەک تۆ بۆنی نییە. زۆر ویستومە بۆنی خۆر بکەم... بەڵام خۆر وەک تۆ بۆنی نییە. هەندێک خوێن هەیە وەک خوێنی تۆ.... بۆنی باغی خودای لێدێت». دکتۆر تا ئەوکاتە دەرکی بە مەترسی شیعر بۆ سەر خەیاڵی ژنە نەشمیلەکەی نەکردبوو. لە کاتێکدا خەریکی لەبەرکردنی بیجامەکەی بوو، لە ژووری ئەودیوەوە گووتی «ئەوەی نوسیوتە شتێکی جوانە... ئەگەرچی من نازانم بە تەواوی مانای چی». نەغەدە هەستی بە شتێک لە پەستی و نیگەرانی کرد و بەکزییەکەوە وەڵامیدایەوە «منیش بە تەواوی نازانم مانای چییە. منیش بە تەواوی نازانم. بەڵام زۆر شت هەیە بە دڵتە بێئەوەی بزانیت بۆ... وانییە؟ ئەوە لە شیعردا زۆر زۆرە». دکتۆر شارەزاییەکی کەمی لە ئەدەبیاتدا هەبوو، بێئەوەی زۆر بیربکاتەوە، گووتی «وایە... وەک من... کە تۆم زۆر بە دڵە، بێئەوەی بزانم بۆ». نەغەدە قەڵەمەکەی دانا و هەستیکرد ناتوانێت لەوە زیاتر بنوسێت. ئەو دوا ڕستەیەی دکتۆر لە بری ئەوەی دڵی خۆشبکات، نیگەرانیکرد. لە دڵی خۆیدا پرسی «کامیان دەبێت سەختتر بێت، ئەوەی هیچ کەس خۆشی نەوێت، یان بەمجۆرە خۆشەویست بیت». بیریکردەوە گەر دکتۆر خۆشی نەویستبایە، ئێستا

کەسێکی ئازاد دەبوو. مرۆڤ ئازاد بێت بێئەوەی کەس خۆشیبوێت، هەزار جار لەوە باشترە خۆشەویست بێت، بێئەوەی ئازاد بێت... سەری خستە سەر مێزەکە و لە دڵی خۆیدا گووتی «لە نێوان خۆشەویستی و ئازادیدا، بێگومان ئازادیم دەوێت. خۆشەویستی سوودی چییە گەر وەک قفڵی زیندان وابێت». نەغەدە لە ناکاو هەستی بە ترسێکی ناوەکی قووڵ کرد، دەیزانی ئێستا دکتۆری مێردی خۆی دەشوات و عەترێکی پیاوانە لە خۆی دەدات و داوای لێدەکات لەگەڵیدا بچێتە ناو جێگاوە. بۆ ئەوەی ئەوە نەکات گووتی «دەبێت ئەمشەو، ئەو شیعرە تەواوبکەم... دوو سبەی لە زانکۆ کۆڕێکی شیعر خوێندنەوە هەیە». لەو ساتەوە کە ژن وای لێدێت لە ناوجێ ڕابکات، ئیدی هیوای پێکەوەژیان لەگەڵیدا زۆر کەمدەبێتەوە. بەڵام دکتۆر مستەفا شوکاک ئەو شەوە خۆی زۆر ماندووبوو، پێشتر بیری لەوە نەکردبووەوە هەرگیز نەخۆشێک لە دەست دەوڵەت بپارێزێت، بەڵام ئێستا دەیەوێت شتێک بکات، نەوەک لە بەرئەوەی ڕقی لە لیفیتانتە، بەڵکو لە بەرئەوەی واهەستدەکات ئیشی مرۆڤدۆستانەی پزیشک تەنیا لەوەدا دوایی نایەت تیماری نەخۆشان بکات و دەستیان لێبەردات، جەوهەری ئیشی پزیشک ڕێزگرتنی تەندروستی نییە، بەڵکو ڕێزگرتنی ژیانە. بە دەم چا لێنانەوە، دکتۆر باسی هەموو ڕوداوەکانی ئەو ڕۆژەی بۆ نەغەدە گێڕایەوە. گووتیشی بیری لێکردۆتەوە ئەگەر بکرێت و ئەو گەنجە جێگای هەبێت دەتوانێت کارێکبکات لە بیمارستان دەریبکات، بۆ ئەوەی وا بێکەس نەکەوێتە دەست پیاوانی لیفیتانت، بە دەنگی بەرز گووتی «مەعقول نییە لە شارێکی وەهادا ئینسان کەسێک نەدۆزێتەوە یارمەتیبدات، ڕاست نییە هەروا ئاسان گورگانخوارد بکرێ». نەغەدە بە نیگەرانییەوە گووتی «تۆ دەڵێیت ئەگەر جێگای هەبوو، ئەی ئەگەر جێگای نەبوو... ئەگەر جێگای نەبوو... دکتۆر گیان... ئەوکات بە ویژدانی تۆ ڕەوایە بیگرن و بیکوژن. تۆ بەعسییەکان ناناسیت؟. ئەوە بەس نییە کە شارەکەیان داگیرکردوە،

ئێستا دەیانەوێت یەکە یەکە سەر بە هەمووشمان شۆڕبکەن... بە ڕاستی ئەوە زۆرە. دەتوانیت لە ماڵی هاوڕێیەکت، لای کەسێکت، لێرە جێگایەکی بۆ چاکبکەین تا هەڵدەستێتەوە و خۆی ڕزگاردەکات». دکتۆر مستەفا شوکاک سەری لەو ئازایەتییە کتوپڕ و بێسنوورەی ژنەکەی سوڕما، بۆ ئەوەی وەک کەسێکی ترسنۆک دەرنەکەوێت، گووتی «بیرم لێکردۆتەوە، ئەگەر جێگای نەبوو، دەیبەمە ماڵی باوکم، لەوێ شوێنیان زۆرە... دەیبەمە ئەوێ». نەغەدە دەیزانی دکتۆری مێردی خاڵی نییە لە ئازایەتی و شەهامەت، بەڵام ئەم دەیویست زۆر لە نزیکەوە ئەو پیاوە برینداره بناسێت... لە ناکاو هەستیدەکرد ئەو حەزەی بۆ ناسینی ئەو گەنجە بریندارە، شتێکی نائاسایی و ترسناکی لە خۆیدا شاردۆتەوە، ئارەزوویەکی ڕەشی تێدایە کە بە وردی ناتوانێت ناوی بنێت. هەڵبەت کە نازانێت ئەو کوڕە کێیە، بەڵام خودی برینەکەی، خودی ئەو سیما کێویی و دڕندە و ڕام نەکراوەی کە دەڵێی هەر ئێستا لە دارستان هاتۆتە دەرەوە، بۆ کچێکی زوو خرۆشی وەک ئەو بەسە و زۆریشی زیادە تا هەستێکی تایبەتی بەرامبەر هەبێت. هەستیکرد ئەوەی زۆر بەتایبەت ڕایدەکێشێت «بۆنی دڕندەیی ژیانە» لەو گەنجەدا. لەو ساتەدا هیچ شتێک لای نەغەدە وەک بۆنی دڕندەیی ژیان خۆش نەبوو... ئەوەی خۆت بدەیتە دەست دیوە هار و بێئامان و پڕ وەیەکەی زیندەگییەوە، ئەوەی بوێریت پشکۆیەکی داغ بگریت... ئاە... چەند حەزی لەوە بوو دەستبەرێت و لە کورەیەکی گەرمدا، پشکۆیەک بە دەست دەربهێنێت. هەموو کچەکانی تر بۆ ئەوە دەژین کە خۆیان لەو کورەیە دوور بخەنەوە، بەڵام ئەم شایەنی ئەوەیە پێی بگووترێت «مەلەوانی نێو پشکۆ». دڵنیابوو گەر ئەم گەنجە بە ئاگا بێتەوە و شتێک لەم کوڕە لووس و ناسکانەی تێدا بێت کە ئادابی شار دەردەخەن، تووڕە دەبێت. لە چرکەی یەکەمەوە لە نزاردا بۆ کەسێک دەگەڕا بە یاسای دارستان بژی. ئەو شەوەی کە «بۆنی پڵنگی بریندار»

ـی نوسی، دڵنیابوو، بۆنی درەخت، بۆنی خۆڵ، بۆنی با، بۆنی تاریکی بانگیدەکەن... هەستیکرد شیعر دەیباتەوە بۆ سەرچاوە سەرەتاییەکان، بۆ ئەو هەستە سروشتییە ڕەسەنانەی کە مرۆڤ لە یادیکردون.

دکتۆر بەر لە خەوتن، شەو قسەی هەم لەگەڵ شۆفێری ئەمبولانسەکە و باوکیشیدا کرد و بە جۆرێکی هێمادار و پێچاو پێچ چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە و نیازی خۆی بۆ ڕوونکردنەوە. ڕۆژی دوایی دکتۆر مستەفا شوکاک، بەیانی زوو، بەر لەوەی نەغەدە لە خەو هەستێت، بە شەقامی ماستفرۆشەکاندا، بە ئاڕاستەی بیمارستان سوار مۆسکۆڤیچەکەی بوو. کە گەیشتە بیمارستان ژنانی پاککار بەردەمی ژوورەکەی ئەویان دەشت و زەوییەکەیان دەسڕی، بۆنی بەیانی و بۆنی تیژی دەرمانی خاوێنکردنەوەکە بە جۆرێک لە یەکیان دابوو، دکتۆر هەستی بە وزە و خۆشبەختییەکی ناوەکی کتوپڕ کرد. زۆرجار لە ناکاو هەستی بە وزەیەکی وەها زۆر دەکرد و توانایەکی لەو چەشنە بێسنوور دەچووە گیانی. هەستیکرد زۆر بەختەوەرە... دڵخۆشییەکەی هۆیەکی تایبەتی نەبوو، هێند هەبوو توانایەکی تایبەتی لە خۆیدا هەست پێکرد کە دەکرێت جگە لە نەشتەرگەری و برینپێچی، شتی دیکەش بکات. بێئەوەی بوەستێت یان بیربکاتەوە جلەکانی گۆڕی و چوو بۆ قاوشی ١٨، بۆ سەر قەرەوێڵەکەی نزار ئیدریس. نزار لە جێگاکەی خۆیدا بە ئاگابوو، بەڵام چاوانی زۆر ماندوو و هەستی زۆر پەرت و لەشی تەواو سست بوو. دکتۆر بە زەردەخەنە پاک و ڕووە منداڵانەکەی خۆیەوە دەستی خستە سەر شانی و گووتی «غەمت نەبێت... غەمت نەبێت... پێچە قورسەکەمان دوێنێ بڕی، کە هاتی ژیانت لە مەترسیدا بوو، بەڵام ئێستا هەموو شتێک باشە... دەستتم بدەرێ... بێزەحمەت ئەو دەستەی دیکەت... باشە... هەموو شتێک زۆر باشە». ئینجا کورسییەکی ڕاکێشایە بەردەمی و تەبەڵەکەی گرت بە دەستییەوە و هەندێ شتی لە سەر نوسی و لە

بەردەم نزاردا دانیشت و بەچرپەوە گووتی «گوێبگرە. نزار، شتێکی زۆر گرنگم هەیە پێتی بڵێم. دوێنێ کە تۆ بێهۆش بوویت. هێزێکی ئاسایش، دەزانیت؟ ئەوانەی کە بە مەفرەزەی یەک ناسراون هاتن تۆ بەرن. بەڵام هەرچۆنێک بوو نەمانهێشت. دەزانی هێزی کێن؟ پیاوێک بە ناوی عومەر بۆتانییەوە سەرۆکیانە. ها سەیرکە خۆفرۆشە کوردەکان وایان لێهاتووە لە ناوەڕاستی شاردا گەنجی کورد بۆ عەرەبەکان ڕاودەکەن. پیاوێکی دڵڕەقە و ماوەیەکە بۆ دەوڵەت ئیشدەکات، لیڤیتانتی پێدەڵێن، بەس خودا دەزانێت خەڵکی کوێیە و ئەم ناوە سەیرەی لە کوێ هێناوە. نازانم ئەو ناوەت بیستووە یان نا... هیچت وەیادا دەهێنێتەوە یان نا؟». نزار ئیدریس بە لاوازییەوە گووتی «هۆو دووبارە... دووبارە... ئەو نامەردە چی لە من دەوێت... چ بەدبەختییەکە، چ بەدبەختییەک، من بەمجۆرە زامدارم و ئەو لەم حاڵەدا زەفەرم لێدەهێنێت». دکتۆر بە ئەسپایی پرسی «ئەم پیاوە چ ڕقێکی لە تۆیە؟ تۆ کێیت؟ بۆ دەیەوێت بەوجۆرە بترپفێنێت؟».

«زیاد لە ساڵێک لەمەوبەر ئەو لە پسمامان بەڕێوەبەری زیندان بوو، منیش لەوێ دیل بووم، زۆری ئازار دەداین. ماوەیەک وەخت بوو من لە ژێر ئەشکەنجەدا بمرم، بەڵام خۆم لاواز دەرنەخست، خۆم نەنوشتاندەوە، ڕێگام نەدا بە سەرمدا سەریکەوێت. ڕۆژێک لەدەستی هەڵهاتم و دواتر چیرۆکێکی زۆر درێژی لێکەوتەوە کە ناتوانم ئێستا بیگێڕمەوە». نزار لە جلە سپییەکانیدا زۆر نائومێد دیاربوو، لە گورگێک دەچوو بە زامداری کەوتبێتە ناو تۆڕێکەوە، ڕوخساری شتێک لە شێوەی گورگ و شتێک لە جوانی پشیلەی تێدابوو. دکتۆر لە چاویدا بریسکەی نائومێدی و تیشکی جورئەتێکی شێتانەشی بە تێکەڵاوی بینی. بە پەنجە لەزگەی کانیۆلاکەی سەر مەچەکی بۆ قایمکردەوە و سەیریکرد و بە ئەسپایی گووتی «ئەگەر شوێنت هەیە بۆی هەڵبێیت، من دەتوانم کارێک بکەم لێرە دەرتبکەم، چونکە لیڤیتانت لە سەر هەر دوو دەرگا سەرەکییەکە

پاسەوانی خۆی داناوە و دەیەوێت بزانێت کێ دێتە دەرێ و کێ دەڕوات. من هەستدەکەم نایەوێت بتگرێت... واتە نایەوێت بەوجۆرە بتگرێت کە بەعسییەکان خەڵک دەگرن. نیازی شتێکی تری هەیە». ساڵانێک دواتر دکتۆر حەیفی لەوە دەهات کە بۆ وا زوو متمانەی پێکردوە، بۆ وا زوو خۆی خستۆتە مەترسییەوە بۆ ئەوەی ژیانی ڕزگاربکات. بەڵام ئەو سەردەمە وابوو، میللەتی شکستخواردو حەزی لە فیداکاری گەورەیە، دکتۆریش دەیویست شتێک بکات، لە بەرچاوی خۆی و لە پێشدەم ژنە گەنجەکەیدا شەرمەزار نەبێت. نزار وەک بێکەسییەکەی خستبێتییە جوغزێکی وەها نائومێدەوە باکی بە هیچ نەبێت، گووتی «شوێن؟ من شوێنم لە کوێ بوو دکتۆر... لەو قەسابخانەیە زیاتر جێگام نییە. بەڵام تازە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ قەسابخانەکە. ببێت و نەبێت قزڵباشیش خۆی شاردۆتەوە، ڕاستییەکەی چۆن مشکێک دەبێت بە تەڵەوە، بەوجۆرە بووم بە تەڵەی لیڤیاتانتەوە... هەندێک شت قەدەرە». دکتۆر مستەفا شوکاک نەیدەزانی قزڵباش کێیە. بۆیە دەستی نزاری گرت و گووتی «ترست نەبێت، من ئەوەش چارەدەکەم... ئەوەش چارەدەکەم، دەتوانیت ماوەیەک تا چاک دەبیتەوە لای دایک و باوکم بیت. ئەوان جێگایان هەیە، من خۆشم بەردەوام تیمارتدەکەم. لەوە مەترسە». نزار سەیرێکی درێژ و بێدەنگی کرد، بە زوبان هیچی نەگووت، بەڵام لە دڵی خۆیدا گووتی «مەسەلە چییە... ماوەیەکە لای باری تەعالا خۆشەویست بووم. بە هەر لایەکدا دەڕۆم فریشتەیەک دەخاتە سەر ڕێم... ببێت و نەبێت کافران خوایەکی باشتریان لە خودای ئیمانداران هەیە. دیارە کە ئێمە خوایەکی بەرەحمەتر و باشترمان لە خودای نوێژکەران هەیە، ئەگینا ئەمە چییە؟ دیارە وایە... دیارە وایە... دیارە کافرانیش خودای خۆیان هەیە کە دەیانپارێزێت». لە سەرەخۆ و بە ماندوێتی سەری لە سەر بالیفەکەی وەرگێڕا و لە ژێر لێوییەوە، وەک کەسێک کە هەرگیز فێرنەبووە سوپاسی

کەسی تر بکات، بە دەنگێکی کز گووتی «سوپاس دکتۆر... بەوجۆرە تۆ دووجار لە مردن ڕزگارمدەکەیت».

دوای سەعاتێک دکتۆر شوکاک هەموو شتێکی ڕێکخستبوو، بەر لە هەشتونیوی بەیانی، نزار لە دەرگای تایبەت بە ئەمبولانسەکانەوە لە بیمارستان دەرچوو... شتەکان وا ڕێکخران هیچ کەس گومانی بۆ دکتۆر و شۆفێری ئەمبولانسەکە نەچێت. دکتۆر خۆی لە خەستەخانە مایەوە و لە هەموو ڕەدهەکاندا کەوتە سەردانی نەخۆشەکان. شۆفێری ئەمبولانسەکەش دەرچوونەکەی وەک کارێکی ڕەسمی و بە نیازی هێنانی دەرمان لە گەنجینەی سەرەکی بیمارستان تۆمارکرد. دواجار نزار لە هیچ لایەکیشەوە داوای لە سەر نەبوو، لە بەرئەوە بە ئاسانی گەیشتە ماڵی حەسەن شوکاکی باوکی دکتۆر و تا هەستانەوەی لەوێ مایەوە.

# کوشتن لە سەردەمێکی دیکەدا

دڵنیابووم دەستیان بە سەر دەفتەری یاداشتەکانمدا گرتووە. یەکەمجار بوو ترسێکی کوشندە دامبگرێت، لەرزێک لە ناخمەوە دەهاتەدەرێ و کەنارەکانی ژیان و جەستەمی دەلەراندەوە. لە یاداشتەکانمدا هەموو شتێکم نوسیبوو. بەڵام ترسێکی پێشوەخت و پیشبینییەکی سەرەتایی وایکردبوو، ناوەکان بە گشتی بە پیتی یەکەم و دووەم، یان پیتی یەکەم و کۆتایی بنوسم. هەروەها ناوی ڕێکخراوەکەشم لە هەموو جێگاکاندا بە JJW نوسیبوو، کورتکراوەی جەمعییەتی ژیانی ون. ژمارەی ڕاستەقینەی دەفتەری یاداشتەکانی من لە سەروو دوو سەد دەفتەرەوە بوو. تەواوی ژیانی من لە سەرەتای پسمامانەوە تا ئەو بەیانییەی چووم بۆ بینینی خانمی نەغەدە ماردینی، لەوێدا بە تەواوی وردەکارییەکانەوە، سەعات

بە سەعات تۆمارکرابوون. ماوەیەک لەوەوبەر قاسەیەکی تایبەتیم کڕی و لە ژێر زەمینەکەی ماڵی مەستورە خان دامنا و دوای ئەوە هەموو دەفتەرەکانم دووجار کۆپیکرد، لە قاسەکەم خزاندن و قفڵمکرد. مەستورە ژنی شەهید ئەرسەلان هەلاج بوو، خانمێکی بێئەندازە بەڕێز و سەنگین و حورمەتدار بوو. لە هەر جێگایەک دەردەکەوت، هەموو پیاوان دەبوو لە بەری هەستن و حورمەت پیشانبدەن و ڕێوڕەسمی ڕێز و ئەدەب جێبەجێبکەن. هەمیشە وەک خاتوونێکی سەلار و سەنگین بە سەرپۆشێکی سپییەوە دەردەکەوت... هەمیشە لە وەفایەوە بۆ شەهید ئەرسەلان بەر لە هەڵبژاردنەکان، دەچوو بۆ تەلەفزیۆنی شار و لەوێوە باسی خەباتی بێوچانی حیزبی بۆ جەماوەر دەکرد، شیعری بە سەر سەرۆکدا هەڵدەدا، شەهیدە نەمرەکانی دەژمارد... ئەو هیچی لە سەر چۆنێتی کوشتنی شەهید ئەرسەلان نەدەزانی. من کە لەو دەمەدا تووشی پەتای ئەوە بووبووم دووبارە بە سەر هەموو ڕابوردوودا بچمەوە، تووشی ئەو دەردە بووبووم کە بە مێژوودا بچمەوە و ببینم چۆن دەکرا شتەکان بەو چەشنە نەڕۆن، لە کویادا دەبوو شتەکان پێچەوانە بکرێنەوە، لە کویادا دەبوو من وەک ئینسان شتێک بکەم کە دەرچوون بێت لەو تێکستە نوسراو و لەو ڕۆڵە سەپێنراوەی بە درێژایی ژیانم وەک کۆیلە چووبوومە ناوی، لە ژێر ئەو گوشارە نادیارەدا چووم و هەموو ئەو چیرۆکە کۆنەم لە بنەوەڕا بۆ خانمی مەستوورە ڕاستکردەوە. مەستورە خان پێیوابوو فاشییەکان مێردەکەیان گرتووە و لە زیندان لە سێدارەیان داوە، بەڵام شتێکی لە سەر شێوە و هۆی گرتنەکە نەبیستبوو... من شەوێک چووم بۆ لای و هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە. باسی ئەوەم بۆ کرد چۆن هەڤاڵ «کشاوەرز»، کە ئێستا قسەکەری ڕەسمی حکومەتە، ناوی شەهید ئەرسەلانی لە ڕێگای پیاوێکی تایبەتی خۆیەوە دزە پێکردوە، چۆن لە کاتی گواستنەوەی کۆمەڵێک چەکدا بۆ شۆڕش بە گرتیانداوە، چۆن لە زیندان زانیاریان

ناردوە بۆ جەلادەکان تا وەرەی بڕوخێت و توانای بەرگری نەمێنێت، چۆن پلانی کوشتنی سەرەتا لە ناو شۆڕشەوە داڕێژراوە. من هەموو شتێکم پێگووت، چونکە ساڵەهای ساڵ بوو لە درۆیەکی گەورەدا دەژیا، من دەبوو «درۆ گەورەکان ڕاستبکەمەوە». ساڵانە وەک ژنە شەهیدێکی نمونەیی، ئەندامانی بیرۆی سیاسی سەردانی ماڵیان دەکرد، دەیانهێنایە بەر کامێرا، دڵپاکی و ناوبانگی جوانی ئەویان بەکاردەهێنا تا ستایشی حیزبی پێبکەن. کاتێک ڕاستییەکانم بۆ گێڕایەوە، هەفتەیەک بەردەوام دەگریا... باوەڕی نەدەکرد، بەڵام من شتەکانم وەها ڕوون و ڕاست خستە بەردەست، جێگای دوودڵی نەبێت. لەوە شەرمەزار بوو کە چەندین ساڵە ستایشی بکوژانی مێردەکەی کردوە. من تکامکرد خۆی ئاشکرا نەکات، چونکە ئەو زانیاریانە تازە نرخێکی ئەوتۆیان نییە. حیزب لەوە بەهێزترە ئەو قسانە بتوانن موویەکی باریکیشی لێبپسێنن، جگە لەوەی خۆی و منداڵی تووشی دەردەسەری زیاتر دەبن سوودێکی نییە، لەوانەیە گرفتی واشیان بۆ دروستبکەن کە دەر و دەربازی نەبێت. ئێستا حیزب بووبوو بە مەکینەیەکی گەورەی قیمەکردن، مەکینەیەکی زەبەلاح کە جگە لە هاڕین، حەزی بە هیچی تر نەبوو. من تکام لە مەستوورە خان کرد، خۆی بپارێزێت، بەڵام لە هەمان ساتدا تکای ئەوەشم کرد لە ژێر زەمینەکەی خۆیدا کە جێگایەکی چەپەک و جێباوەڕە، بوارم بداتێ قاسەی یاداشتەکانم دابنێم و نهێنی ژیانم دوور لە هەر مەترسییەک لەوێدا بپارێزم. خانمی مەستوورە کە چیرۆکەکەی من پەرێشانی کردبوو، وەک ژنێکی دڵسۆز کە حەزی بە خزمەتی هەموو بێدەرەتانێکە، ژێر زەمینەکەی بۆ کردمەوە و کلیلەکانی دایە دەستم.

ئەو ڕۆژە کە زانیم، دەفتەری یاداشتەکەم لە دەزگا دزراوە، کەوتمە فیکری ئەوەی لای خانمی مەستوورەش سۆراغی شتەکانی دیکەم بکەم، نەموێرا لە ژمارە ناسراوەکانمەوە زەنگ لێبدەم، لە سیم کارتێکی

نهێنییەوە چەندجارێک زەنگم لێدا، بەڵام سوودی نەبوو، کەس تەلەفونی هەڵنەگرت. بێچارە و ترساو گەڕامەوە بۆ ماڵێ... لە ماڵ کچە ئیشکەرە ئەتیوپییەکەم «ئەزمێرا» خواردنی ئامادەکردبوو. سفرەیەک لەو جۆرە سفرە تایبەتیانەی کە دە ساڵ بوو هەموو ڕۆژێک دەچوومەسەری و وەک کەسێک کە هەرگیز تێرنابێت دەمخوارد و دەمخواردەوە، بە زۆر برنجم لە هەناوی خۆم دەخزاند، تا ئەندازەی ڕشانەوە، بۆشایی ناو ڕۆح و ژیانم بە گۆشتی هەموو جۆرە باڵندە و جانەوەرێک پڕدەکردەوە. ئەزمێرا کچێکی هێمن و دڵساف بوو، من بێئەندازە ڕێزم دەگرت، بە دڵسۆزییەوە خزمەتیدەکردم و منیش بە سەخاوەتەوە پارەم پێدەدا و کۆمەکی خۆی و خێزانەکەیم دەکرد، هەر میوانێکم بێحورمەتی بەرامبەر بکردایە، نیگای پیسی تێبگرتبایە، بێشەرمانە لە دەرگای دەرەوە دەمکردە دەرێ. سەرەتا کەسمان زمانی یەکترمان نەدەزانی، بەڵام مامۆستایەکی کوردیم بۆ گرت و خۆشی بە خێرایی فێری شتە سادەکان بوو... گەر زمانیش لە نێوانماندا نەبایە ئەو دەیزانی من چیم دەوێت و منیش دەمزانی چ بەدبەختییەک ئەم کچە بەستەزمانەی لە دۆزەخی ئەتیوپیاوە هێناوە بۆ ئێرە، لەو ساڵەی دواییدا، هەستمدەکرد خودا لە ئەزمێرا دا کچێکی دڵسۆزی پێبەخشیووم و منیش دەبێت ڕێزی ئەو دیارییە ئاسمانییە بگرم. هەندێجار وەک کچە بچکۆلەی خۆم دەستمدەکردە ملی و دەمگووت «گەر بهاتبایە و ژنم بهێنایە، ئێستا کچەکەم لە تەمەنی تۆدا دەبوو... لە تەمەنی تۆدا... خودا لە تۆدا ئەو هەقەی بۆ سەندوومەوە». ئەو ڕۆژە خانمە ئەسمەرەکەم، لە سەر نانخواردنەکە زەرفێکی چکۆلانەی داخراوی دامێ... کەسێکی نەناسراو سەعاتێک بەر لە گەڕانەوەی من لە دەرگاوە دابوویە دەست ئەو. زەرفێکی شینی چکۆلانە، کە سیدییەکی ڕەشی تێدابوو. پێشتر سیدیم زۆر دیبوو، بەڵام سیدیی وەها ڕەشم پێشچاو نەکەوتبوو، بە پەلە لە سەر خوانەکە هەستام و ڕامکردە بەر

لاپتۆپەکە و دامگیرساند و سیدییەکەم لەنێونا، تا سیدییەکە کرایەوە دڵم لێیدەدا، کە کرایەوە، تاکە فیلمێکی بە فۆرماتی ویندۆس میدیا پلەیەر لە سەریبوو... یەکەم شت دوای کرتەی سەر بابەتە ئەلیکترۆنییەکە بینیم، دەفتەری یاداشتەکانی خۆم بوو، پتر لە دوو سەد دەفتەر بە قەوارەی جیاواز جیاواز لە سەر مێزێک دانرابوون و دوو دەموچاوی دەمامکدار یەکەیەکە بەرزیاندەکردەوە. دیمەنی دوای ئەو مەستورە خان بوو، مەستورە خانی ژنی شەهید ئەرسەلان بە چاوی گریاوەوە بە ڕوومەتی بریندار و ڕندراوەوە، دیمەنی دواتریش هەر مەستورە بوو بە ڕووتی... لە سەر جێگایەکی سپی، دواتر دیمەنی پیاوە دەمامکدارەکانی یەکەم بوون بە زۆر، بە وەحشییەتێکی بێوێنەوە لاقەی ئەو ژنە سەلار و سەنگینەیان دەکرد. فیلمی سەر سیدییەکە زۆر کورت بوو، پێکڕا یەک دەقیقە بوو، بەڵام بەشی ئەوەی دەکرد من چاوانم پڕ ببێت لە ئاو. بۆ ئێستێک هەستم بە گێژیی و ئیفلیجییەکی گەورە کرد. ئیتر هیچ شتێک نەبوو گومانی لێبکەم... بە دەستێکی لەرزۆک و دڵێکی پڕ و هەناسەیەکی تاساوەوە چوومە سەر تەلەفونەکە و ژمارەکەی خانمی ماردینیم بادا، زەنگەکە چەندین جار لێیدا و کەس هەڵی نەگرت، ژمارەی لیڤیتانتم لێدا و کەس هەڵی نەگرت، ژمارەی بیرۆکەی دکتۆر شێرخانم لێدا «کە ئێستا بە ناو بەرپرسی مەکتەبی کاروباری گشتی بوو» و ئەویش هەڵی نەگرت، تەلەفونم بۆ «شاوەلی» کرد، بەرپرسی کاروباری بیرۆی سیاسی، ئیشکەرە لوبنانییەکەی هەڵیگرت و گوتی شاوەلی لێرە نییە، بەڵام بە دەنگیدا زانیم درۆ دەکات. تەلەفونم بۆ «حاجی بایز» بەرپرسی ڕێکخراوەکانی حیزب کرد و ئیشکەرە فیلیپینییەکەی هەڵیگرت و گوتی «هاشی پەییز» لەوێ نییە. چەند جارێک لە سەر یەک ژمارەکەیماڵی مەستورەم لێدا و کەس نەچووە سەری. دڵنیابووم لەو ساتەوە تەواو گۆشەگیر خراوم و لە هەموو وەزیفە حیزبی و

دەوڵەتییەکان دوور خراومەتەوە. بە هێمنی ئەزمیرام بانگکرد و دەفتەرێک دۆلارم دایە و تێمگەیاند ئەو پارەیە بۆ خۆیەتی و دەبێت لە جێگایەکی تایبەتیدا قایمیبکات، چونکە ئەگەرێکی زۆر هەیە من بگیرێم و لەوانەیە دواتر کەس نەبێت کۆمەکیبکات. ئەزمیرا خۆی کچێکی عاقڵ بوو، لە وڵاتێکی ترسناکی وەک مەملەکەتی خۆشمانەوە هاتبوو، لە بەرئەوە لە هەموو شتێک تێگەیشت و بە چاوی گریاناوییەوە پارەکەی هەڵگرت و گووتی شەو دەیبەم بۆ ماڵی هاوڕێیەکم. من لەو خەیاڵانەدا بووم کە ئاخۆ دەمگرن یان تەنیا دەمخەنە ژێر چاوەدێرییەکی توندەوە، کە شۆفێرەکەم لە دەرگای ئەمنییەت لە دەرگای دا و نامەیەکی داخراوی بۆ هێنام... نامەکە ئیمزای پرۆفیسۆر شالیار، بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ئەمنییەتی پێوەبوو، تێیدا هاتبوو بە هۆی هەندێ کاری ڕادۆزییەوە، من بۆ دوو مانگ مۆڵەتێکی کراوەم پێبەخشراوە، بەڵام هەمیشە دەبێت ئامادەباشی ئەوەم تێدا بێت کە لەگەڵ هەر بانهگێشتێکدا لەدەزگا ئامادەبم. پرۆفیسۆر هاوڕێی نزیکی سەرۆک و کەسێکی بە سەروسەوادی ناو حیزب بوو کە سەردەمانێک ڕێکخراوەکانی حیزبی لە ئەوروپا و ئەمریکای باکوور بەڕێوەبردبوو، سەردەمێک دۆستی هەندێک دیکتاتۆری ترسناکی وەک قەزافی بوو و دواتریش وەک دەیانگووت ئەندامی هاریکاری و پەیوەندی نێوان ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و سی ئای ئەی بووە. هەم ئینگلیزییەکی باش و عەرەبییەکی ڕەوان و تورکییەکی پێرفێکت و فارسییەکی بێگرێ قسەیدەکرد. کەسێکی زۆر لووت بەرز و داخراو بوو، دوو مانگ بوو بووبوو بە بەرپرسی گشتی دەزگای ئەمنییەت، گەرچی لە بەردەم میدیا عەرەبی و جیهانییەکاندا خۆی وەک مۆدێرنترین پیاوی خۆرهەڵات نیشاندەدا و بەبێ هیچ کێشەیەک قاچی دەنایە سەر قاچی و باسی ئەزموونی دیموکراسی لە هەرێمدا دەکرد، بەڵام لەگەڵ هاتنی ئەودا بۆ سەر دەزگای ئەمنییەت، سیاسەتی نەرمی و هێمنی

لەگەڵ نەیاران و ڕۆژنامەنوسان و ڕەخنەگرانی سیاسیدا، تادەهات بەرەو کۆتایی دەچوو. بەردەوام چاویلکەیەکی پزیشکی گەورەی لە چاودا بوو، مەکرێکی گەورە لە خەندەکانیدا و ڕۆحێکی ئەرستۆکراتی لە شێوەی قسەکردنیدا بوو. من خۆم نزیکایەتییەکم لەگەڵیدا نەبوو، لە حیزبدا لە ڕیزی ئەو مشەخۆرە پیسانە سەیرماندەکرد کە دوای ناز و نیعمەتێکی زۆر لە ئەوروپاوە گەڕاوەتەوە و پۆستێکی بردووە کە شایستەی نییە. ئەو سیاسییانەی کە لە ئەوروپاوە دەگەڕانەوە بە گشتی لووتبەرز و نەفام بوون، لە سیاسییە ناوخۆییەکانیش دڵڕەقتربوون، بەردەوام بچوکییەکی بێوێنەشیان بۆ سەرۆک پیشاندەدا... مۆراڵی غولامیان دەنواند و بە سوژدەوە دەچوونە بەردەمی.

من چوومە قاتی سەرێ بۆ ژوورەکەم و کەوتمە بیرکردنەوە لەوەی چیبکەم. تاکە کەسێک بمتوانیبایە متمانەی پێبکەم هەڤاڵ «سەلاح زەیلان» بوو لە بیرۆی سیاسی، کە ماوەیەک بوو، دژ بە سیاسەتەکانی حیزب ئاشکرا دەنگی بەرزدەکردەوە، بەڵام دەمزانی ئەو یەکەم: هیچی بە دەست نییە، دووەم: من وەک کلکێکی قوڕاوی و قورسی هەندێک لە سیاسییە بەرزەکان تەماشادەکات و هەرچییەکی بۆ باسبکەم، بە درۆی مەکربازێکی مونافیق و چەقەڵێک لە چەقەڵەکانی دەزگای ئەمنییەتی دەزانێت. تاکە شتێک بە خەیاڵمدا هات ئەوە بوو نامەیەک بنوسم و بیدەمە ئەزمێرا بۆ ئەوەی گەر دیار نەمام بیبات بۆ ڕۆژنامەی «عەزیزم وەتەن» و گۆڤاری «بوهاران» کە هەردووکیان ئەگەرچی دوو بڵاوکراوەی تا خودا حەزبکات بێفەڕبوون، بەڵام مەیلێکی ئۆپۆزسیۆنیان هەبوو. دانیشتم و نامەیەکم نوسی و باسی ئەوەم کرد کە هەستدەکەم ژیانم لە مەترسیدایە و لە لایەن حیزبەوە شتەکانم زەوتکراون، نوسینی نامەکە وەختێکی برد و دوای دووبارە و سێبارە خوێندنەوەی، چاپمکرد، ئیمزا و پەنجە مۆری خۆم لێدا و ژمارەی تەلەفونەکەی شەفیق هرروری،

سەرنوسەری «عەزیزم وەتەن» و ئەنوەر پۆخان سەرنوسەری «بوهاران»ـم لە سەر زەرفەکان بۆ ئەزمیرا نوسی.

بە درێژایی ئەو ڕۆژە بە نیازی گرتن لە ماڵەوە دانیشتم، یەقینێکی ناوەکیم هەبوو کە دەمگرن، گەر نەشمگرن لەوە بەدتر دەمکوژن. مێژووی دوورودرێژم لە حیزبدا پێیدەگوتم کە حیزب لەمجۆرە حاڵەتانەدا کەمێک سەبردەکات، گەر بگاتە سەر دۆخی ترسناکیش دەست لەوە ناپارێزێت بە سیناریۆی مردنێکی کتوپڕ بمکوژێت، سەدان شێواز و ڕێگای تایبەتیان بۆ دروستکردنی ئەو مردنە کتوپڕانە هەبوو، لە ساڵانی ڕابوردوودا هەڤاڵ «دیلان جەواد» و «بەهزادی پەخە» یان بەوجۆرە کوشت، لە دەزگا ئەو جۆرە کوشتنەیان ناونابوو «ئیغتیال بە دەستی ئیلاهی». واتە هەموو شتەکان وارێکدەخران وەک باری تەعالا لە بری حیزب ناوبراوی کوشتبێت. من دڵنیابووم حیزب تا ئێستا بە تەواوی نهێنی منی نەدۆزیوەتەوە. زۆر شت هەیە دەیانەوێت بیزانن، هەموو ئەم گەمەیەش کە لە دوێنێوە، لە دوای سەردانەکەمەوە بۆ لای خانمی ماردینی دەستی پێکردوە جۆرێکە لە ترساندن و پەشۆکاندنی بەرنامەڕێژکراوە. بەتایبەت کەم و زۆر دەزانن من گەر بکەومە ژێر گوشاری حیزبەوە، لەوانەیە بەرگە نەگرم و بە ئەژنۆی شل و چاوی گریاوەوە ڕابکەمە بەردەمی سەرۆک و داوای لێبوردنبکەم.

بەڵام دڵنیابووم ئەمجارە لە هیچ تێناگەن، ناشتوانم بۆیان ڕوونبکەمەوە... ناشتوانم پێیان بڵێم هاوڕێیان چ چیرۆکێکی سەیر، چ پەتایەکی کوشندە لە گۆڕێیە.

من بڕیارمدا هەر چۆنێک بووە دان بە خۆمدا بگرم و لە ڕێگای سیمکارتە نهێنییەکەشمەوە پەیوەندی بە واعیزی پیرەوە نەکەم، چونکە دەمزانی لە دەزگا ئامێریان هەیە دەتوانن گوێ لە هەموو قسەیەک بگرن کە لە ناو ماڵەکەدا دەکرێت. بەڵام سەعات دوازدەی شەو، خەریک

بوو چاوم دەچووە خەو، زەنگی تەلەفونەکە لێیدا، واعیز خۆی لەو سەری خەتەوە بە دەنگە پیر و نوساوەکەی پێیگووتم «جەنابی لیوا، چیرۆکنوس سەعید یۆنانیان کوشتوە، بەر لە ئێوارە ڕفاندویانە و دوو سەعات لە مەوبەر مەیتەکەیان لە نزیک بینای بەلەدییەی کۆنەوە فڕێداوە... کوڕەکەی تەلەفونی بۆ کردم و دەگریا و دەیویست بزانێت کێ باوکی کوشتووە».

وشەکانی واعیزی پیر لە سەرمدا وەک دەنگی تەقینەوەیەک لە بن گومەزێکی بەرز و خاڵیدا، دەنگیاندایەوە.

من بێئەوەی هیچ بڵێم، حەپەساو تەلەفونەکەم دانایەوە و لە تاریکییدا دەستمکرد بە گریان. ئاگاداربووم بە دەم فرمێسکەوە گووتم: «ئاخر سەعید یۆنان بۆ؟. بۆ سەعید یۆنان؟ بۆ؟... بۆ ئەو؟».

# هۆشەنگی بولبولیار مەهدائیلی فریشتە دەبینێتەوە

هۆشەنگی بولبولیار لە خۆی پرسی «بۆ دەبێت مرۆڤ فریشتە ببینێت؟ بینینی فریشتە چ مانایەکی هەیە؟ ئەگەر فریشتە هەیە، بۆ هەمووان نایبینن؟».

لەوانەیە شتێکی سەیر بێت گەر بڵێم، بینینی فریشتە تەواو پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە، نەوەک بە فریشتەکانەوە. هەڵبەت وەک گووتم بۆ کەسێکی سۆسیالیست و مارکسیستی وەک بولبولیار، لە سەردەمی شکۆفە و گەشەی فیکری مەتریالیستیدا لە وڵاتی ئێمە «ناوەڕاستی حەفتاکان» زەحمەت بوو باوەڕ بە بوونی فریشتە بهێنێت. بولبولیار ئەو کات بە ڕاستی لە جۆرە شتی وەها بە گومان بوو. بەڵام دواتر گەیشتە ئەو بڕوایەی کە چۆن دەشێت بوونی کۆتر، پەپولە، ئەمیبای

بچوک، زیندەوەرانی نەبینراو، پەیوەندیان بە خوداوە نەبێت، دەشێت بوونی فریشتەش پەیوەندی بە خوداوە نەبێت.

ئەوشەوە کە بولبولیار گەڕایەوە بۆ ماڵێ، دڵنیابوو ئەو «مەهدائیلی فریشتە» و باڵە گەورە و زەبەلاحەکانی بینیوە، دڵنیابوو... تا هێندە دوودڵ و وەسواس نییە باوەڕ بە چاوانی خۆشی نەکات. بە خۆی گووت «هەژاریی فێریکردوم دیوە نامادییەکەی ژیان ڕۆشنتر ببینم». لەوەشدا لە سەر هەق بوو، چاوی هۆشەنگ، چاوی پیاوێکی هەژاری هوشیار بوو... لە سەر زەویش، هیچ کەس لە پیاوێکی هەژاری وریا و چاوتیژتر نییە. بەڵام دەبێت بڵێم نمونەی «هەژاری بەهۆش و وریا» توخمێکی زۆرباو نییە و گەلێکیش دەگمەنە. هەژارێک بتوانێت بە ڕوونی هەموو جیهان ببینێت، بوونەوەرێکە لە ئاستی فەیلەسوفە گەورەکاندا. چونکە لە جەوهەردا هەژاریی هەمیشە هاوڕێی کوێرێتی و نەبینین و زۆرجاریش تورەیی و بوغزە. بەڵام بۆ هۆشەنگی بولبولیار، هەژاریی ئەزموونێکی ڕۆحی و دەرونی بوو... ئەو کێشەی بوون و نەبوون، بوغزی دارا و نەداری نەهێنابووە ناو ڕۆحی خۆیەوە و دونیای تەنیا بەوجۆرە دەبینی کە هەژاریی خستوێتییە بەردەستی. لە هەر شتێکیش گرنگتر ئەوەیە، وەبیرتانبهێنمەوە کە بولبولیار لەوە گورزەشتبوو بیەوێت هەژاریی خۆی جێبهێڵێت، لەو کەسانە بوو دەست بەو گەنجینە بەتاڵەوە دەگرن و وەک کانییەکی زێڕین و سەرچاوەیەکی ناکۆتای ئیلهام سەیریدەکەن.

بولبولیار چەند بیریکردەوە، بەهانەیەکی نەدۆزییەوە کە چیرۆکی بینینی مەهدائیلی فریشتە بۆ هەڤاڵە حیزبییەکانی لە شانە سەرەتاییەکانی شۆڕشدا بگێڕێتەوە. دڵنیابوو ئەوانیش وەک خۆی باوەڕ ناکەن. بەڵام بۆ شەوی دواتر، دووبارە گەڕایەوە بۆ هەمان شوێنی پێشوو، هەمان ئەو جێگایەی پێشتر مەهدائیلی تێدا بینیبوو. بۆ هەفتەیەک هەموو شەوێک دەچووە هەمان جێگا، بێئەوەی هیچ ببینێت. بە شێوەیەک کەوتە سەر

ئەو خەیاڵەی چیتر ئەوەندە کاتی خۆی بە هەدەر نەدات و دەست لەم گەشتە بێسوودانەی شەو هەڵگرێت. بەڵام بۆ دەبێت مرۆڤ تەنیا لە شەودا بۆ فریشتەکان بگەڕێت، فریشتە گەر فریشتەیەکی شەرمن و ترسنۆک نەبێت، لە ڕۆژیشدا دەردەکەوێت. مەهدائیلی فریشتەش لەو فریشتانە بوو کە دەیتوانی هەموو ئان و زەمانێک دەربکەوێت. وەهابوو لە حەوتەمین ڕۆژدا، لە کاتێکدا بولبولیار لە بازاڕی کۆنەفرۆشان، لە دوکانێکی پێڵاوی کۆندا، سەرگەرمی سەیرکردن و هەڵسەنگاندنی باش و خراپی جووتێک پێڵاوی کۆن بوو، لە ناکاو دووبارە خۆی لە بەردەم مەهدائیلدا بینییەوە کە ئەویش وەک ئەو، بە تەواوی قەد و قەڵافەتییەوە لە سەر کورسییەک دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشا و پووتێکی چەرمی ئیتالی زۆر درێژی تاقیدەکردەوە. دوا جێگا لە دونیادا بۆ بینینی مەهدائیل لە خەیاڵیدا بووبێت، دوکانی پێڵاوفرۆشێک بوو بووت و چەکمەی کۆنە بفرۆشێت. مەهدائیل کە بە دۆزینەوەی بووتە درێژەکان زۆر خۆشحاڵ بوو، وەک منداڵ هەڵدەستا و دەیکوتا بەزەوییەکەدا و پێوەی دەڕۆیشت و دەهاتەوە، ئاشکرا بۆ زستانی داهاتوو خۆی تەیاردەکرد. بە سەرسامییەوە سەیری هۆشەنگی بولبولیاری کرد و گووتی «کاکە هۆشەنگ ئەمە تۆیت... وای لەو ڕێکەوتە خۆشە. دووبارە خۆتیت. دیارە من شانسێکی باشم هەیە، ئەوە چ شانسێکی بەهارەیە... وای وای... عەجەب بەختێکم هەیە. ئەوە بۆ فریشتەیەکی وەک من هەموو هەفتەیەک ڕوونادات کە کەسێک دووجار ببینم». بولبولیار سەرسامبوو، دیسانەوە لە خۆی پرسی ئەمە چی لە فریشتە دەچێت؟. ئەم پیاوە ڕیشهاتووە زیاتر لە دیلێکی جەنگ، لە شۆفێرێکی نەخەوتووی پاسە درێژەکان، لە ئاسنگەرێکی ماندوو دەچێت، شتێکی تێدا نییە مرۆڤ بباتەوە سەر نیگاری فریشتە. سینەیەکی پیاوانەی پان و قژێکی کورت و ئەسمەرییەکی عارەقداری هەبوو، لە چەشنی ئەو پیاوە بازوودار و لەشتورتانەبوو، کە ماسولکەی خۆیان بە

کاری قورس، نەوەک لەوەرزشەوە پەیدادەکەن. بولبولیار لە دڵی خۆیدا گوتی «من چ گەمژەم... چ گەمژەم... ئەم پیاوە بە دڵنیاییەوە گاڵتەی بە عەقڵم کردوە. ببێت و نەبێت ئەم بەشەرە ساختەکار و دەستبڕە لە دارتاشێک، ئاسنگەرێک، وەستایەکی بیناکاری زیاتر هیچی تر نییە، کە هەندێک فێڵ دەزانێت و دەتوانێت کەسانی گەمژەی وەک من دەستخەڕۆ بکات». لە ناخی دڵدا بۆ کەمێک هێمنی ئەبەدیی خۆی لە دەستدا و دەستیکرد بە پێکەنینێکی درێژ. لە دڵی خۆیدا گوتی «وای من چ گەمژەم... چ گەمژەم». لە بەر پێکەنین دەستیگرت بە سکییەوە «فریشتەیەک لای کۆنەفرۆشێکی داماو، بۆ پێڵاوی دەستی دوو بگەڕێت... بۆ پووتی کۆن... وای باوکە ڕۆ» لە بەر پێکەنین کەوت. مەهدائیل بە سەرسامییەوە سەیریکرد و بێئەوەی بزانێت بەچی پێدەکەنێت، گوتی «ها بە ڕاستی بینینی فریشتەیەک، ئەوەندە بۆنەیەکی خۆشە تۆی وەها کامەران کردوە؟»». هۆشەنگی بولبولیار لە سەر ئەژنۆ دەستی گرتبوو بە زگییەوە و لە دڵی خۆیدا گوتی «وای بابەڕۆ... فریشتەیەک پووتی کۆن لای «عونیلی حاجی» بکڕێت».

پاش نۆبەتێکی درێژی پێکەنین کە هەر زوو زوو دووبارە دەتەقییەوە، گوتی «بەسە... توخودا بەسە. هەرچییەک دەکەیت، باسی چیرۆکی قۆڕی ئەو فریشتەیەم بۆ مەکە... ها، ئافەرین... باوەڕت پێدەکەم. بە ڕاستی ئافەرین... دەزانیت ئەو شەوە، گوێبگرە، بە ڕاستیمە ئەو شەوە باوەڕمکرد تۆ فریشتەیت». مەهدائیلی بە غەمگینییەوە لە بەردەم بولبولیاردا وەستا بوو، بە باڵا زۆر لە هۆشەنگ بەرزتر و کەتەتر بوو. هۆشەنگ بەدەم قاقالێدانی بەردەوامەوە گوتی «دەزانی تۆ لە دێوێک دەچیت خوا غەزەبی لێگرتبێت، نەوەک لە فریشتە... وەی بابەڕۆ خنکام... خنکام... کوڕی ئاسمان بەسە». مەهدائیل بە دەنگێکی زویر و حەسرەتاوییەوە گوتی «من بە ڕاستی فریشتەم... مامی مامی من بە

ڕاستی فریشتەم، پێویست ناکات گومانی واخراپم لێبکەیت ». بولبولیار کە بە زەحمەت دەیتوانی ئەژنۆی لە زەوی بەرزبکاتەوە، گووتی « باوکە گیان پچڕام... هەناسەم بۆ نادرێت... قەت لە ژیانمدا کەس وا نەیخستوومەتە چاڵەوە». «چاڵی چی کاک هۆشەنگ. چاڵی چی؟ من هیچ کەسم نەخستۆتە چاڵەوە... دەستتم بەرێ. بە ڕاستیمە، ئەوەم زۆر پێناخۆشە. ئەوەی تۆ دەیڵێیت، خراپترین شتە ئینسان بە فریشتەیەکی بڵێت». بولبولیار کەمێک چاوی سڕی و گووتی «بەس نەبوو هاتم بۆ پێڵاو کڕین. باوەڕدەکەیت، هەفتەیەکە هەموو شەوێک دەچمە دەرێ بۆ ئەوەی مەهدائیلی فریشتە ببینم. بەسە کوڕی ئاسمان، تازە تەواو... تۆم گرت... بە ڕاستی تۆم گرت. گەر لێرە نەمدیبایتایە گومانێکم دەما... بەڵام... باوکەڕۆ... قسەم بۆ ناکرێت... بەسە... بە ڕاستیمە بەسە، وابڕوات دەخنکێم... تۆ خۆت بڵێ. پێشتر فریشتەت بینیوە لای عونیلی حاجی پێڵاو بکڕێت؟ لای ئەو پووت تاقیبکاتەوە؟»».

مەهدائیلی فریشتە دەستی هۆشەنگی گرت و گووتی «پێویست ناکات گومان لە من بکەیت. من فریشتەم. دڵنیاتدەکەمەوە کە درۆم لەگەڵ نەکردویت». «نا تو خوا دەست پێمەکەرەوە... ئەمڕۆ لەو ڕۆژانە نییە بەختت هەبێت. لەو ڕۆژانە نییە... ئێستا سوێندت دەدەم کە ناوی ڕاستەقینەت چییە و چ کارەیت... بوەستە با من هەڵیبهێنم... یان وەستای بینایت... یاخود بوەستە، نا... لە کەسێک دەچیت کە کارێکی قورستر دەکات». مەهدائیل بە غەمگینی و سەرسامییەوە گووتی « کارێکی قورس، هەڵبەت من کارێکی قورس دەکەم... چ شتێک لەوە سەختترە مرۆڤ فریشتەبێت».

هۆشەنگ پرسی «تا ناوی خۆتم پێدەڵێیت، هەر بە مەهدائیل بانگتدەکەم. کاک مەهدائیل، ئەگەر پووتەکەت بە دڵە بیکرە و بابڕۆین». دەستیکردەوە بە پێکەنین و گووتی «ئەگەر تۆ فریشتەیت، لە کوێ

پارە وەردەگریت... ها... موچەکەت چەندە؟». لەگەڵیدا جارێکی دی قاقاکانی بەرزبوونەوە. مەهدائیل کە بەردەوام حەپەساو و ناڕازیتر دەردەکەوت، گووتی «هەڵبەت پارەیەکی کەمم هەیە کە لە کەسانی وەک تۆی وەردەگرم. لەوانەی بە ڕاستی باوەڕیان بە کۆمەککردنی فریشتەکان هەیە. پێویستیم بە پارەیەکی زۆر نییە. دڵنیاتدەکەمەوە کە پێویستیم بە پارەیەکی زۆر نییە، بەڵام خەڵکێک هەیە دەتوانێت پارەی جووتێک پووتی کۆنم بداتێ».

مەهدائیلی بێئەوەی پووتەکان بکڕێت، پێکەوە لەگەڵ بولبولیار لە دوکانی عونیل هاتنەدەرێ.

کە چەند هەنگاوێک لە پێڵاوفرۆشەکە دوورکەوتنەوە، بولبولیار جارێکی تر بە دەم خەندە و قاقاوە، گووتی «ئەگەر تۆ بە ڕاستی فریشتەیت... بەراستی بە ڕاستی... جارێکی تر باڵەکانتم پیشانبدە». هۆشەنگ دڵنیابوو کە مەهدائیل لەو ناوەڕاستی بازاڕەدا ناتوانێت کاری وەها بکات، چونکە ئەوەی کە لە شەودا پێی ڕێکخراوە، ئەو گەمەیەی کە لەوێدا بۆ گەمژەی وەک ئەمی ڕێکخستووە، لێرەدا دووبارەناکرێتەوە. چونکە ئەوەتا لە ڕۆژی ڕووناکدا دەبینێت مەهدائیل چ پەڕوباڵێکی پێوە نییە. مەهدائیل وەک شتێک لە ناخەوە برینداریکردبێت، گووتی «عادەتم نییە لە ناوەڕاستی بازاڕدا ئەو کارەبکەم، ئەگەرچی باڵەکانی من شتێک نین هەموو کەس بیانبینێت... بەڵام دڵنیام تۆ دەیانبینیت... دڵنیام». بولبولیار ئەمجارە بە جیدییەتێکەوە گووتی «ئاه بەسە، بەسە ئەوەتا دەبینم کە تۆ باڵت نییە». ئەو هێشتا «نییە» کەی لە زار نەترازا بوو کە مەهدائیل جووتێک باڵی زۆر گەورەی کردەوە، جووتێک باڵی سپی و هەوایی کە دەگەیشتنە بنمیچی بازاڕی کۆنەفرۆشان... دوو باڵی سپی و تەنک... دوو باڵ کە نە لە مەتریال بوون و نە لە خەون. دوو تەنی درێژکراوە و ئەفسانەیی و تەمئاسا کە ئاشکرا جگە لە بولبولیار هیچ کەسێکی تر نەیدەبینی.

ئەمجارەیان بولبولیار بە ڕاستی حەپەسا. مەهدائیل بۆ ئەوەی گومانی لە دڵدا نەهێڵێت، چەند جارێک باڵەکانی کردەوە و دایخستنەوە، کردنییەوە و دایخستنەوە.

ئێستا بولبولیار جگە لە واقبوون و سەرسامی چاری دیکەی نەبوو. سەرسامی تاکە شتێکە لە ئازاری نەزانین دەمانپارێزێت، گەر سەرسامی بوونی نەبایە، نەزانین دەیکوشتین. سەرسامی ئەو خودە ئاسنینەی عەقڵمانە کە لە ساتی تێنەگەیشتن و بێتەفسیریدا دەیکەینە سەرمان تا مەدۆشی نەزانین نەمانکوژێت. هیچ شتێک وەک نەزانینێکی قووڵ، نەزانینێک ئینسان توانای بە سەر سنووریدا ناشکێت، کوشندە نییە. سەرسامی ئەو شەرابە ئارامبەخشەیە کە کەمێک ئەو ژانە سووکتر دەکات. لە ڕێگای سەرسامییەوە مرۆڤ بەخۆی دەڵێت «یارۆ لێگەڕێ ئەمە کاری عەقڵ نییە». لەو ساتەشدا کە بولبولیار شتێکی دەبینی جیاواز لە هەموو ئەو سنوورانەی کە زانیارییەکانی ئەو دەربارەی ژیان دەیگاتێت، شتێکی دەبینی جیاواز لە هەموو ئەو بڕوایانەی ئیمانی ئەویان دارشتووە، سەرسامی تەنیا فریادرەسی بوو.

بولبولیار هێمنی و ساردیی پێشووی بۆ گەڕایەوە و بە غەمگینییەکی قووڵەوە پرسی «بەڵام پێمبڵێ چۆن ئەوە دەکەیت، چۆن ئەوانی تر باڵەکانت نابینن؟». مەهدائیلی فریشتە گوتی « نازانم، بینین و نەبینینی من وەک فریشتە پەیوەندی بە وانی ترەوە هەیە، ڕەنگە من فریشتەیەکی ڕاستەقینە نەبم، ڕەنگە ناتەواو بم، ئەوەی ئەوانی تر دەتوانن وەک مرۆڤ بمبینن، شتێکی تایبەتە... زۆر تایبەتە، ئەوە وادەکات بتوانم ئاسان کاری ئەوانی تر جێبەجێبکەم». بولبولیار بە سەرسامییەوە گوتی «دەتوانین بڕۆینە جێگایەک دابنیشین». دەنگی ئێستا ئەو ئاوازی لاقرتی و پێکەنینەی تێدا نەمابوو کە بەر لە تۆزێک هەیبوو،

بەپێچەوانەوە هەتا تاسە و شەیدابییەکی کتوپڕیشی هەڵگرتبوو. مەهدائیل گووتی «هەڵبەت دەتوانین بڕۆین و لە جێگایەک دابنیشین». دوای تۆزێک لە دۆندرمە خانەیەکی چەپەکدا جێگایەکیان دۆزییەوە، مەهدائیل جگە لە ئاو هیچی دیکەی نەویست. دوای هەندێک قسەی گشتی، بولبولیار لەگەڵ سەرداخستنێکی شەرمن و درێژدا، بە شتێک لە حەسرەتەوە پرسی «بەڵام بۆ من دەتبینم کە فریشتەیت و ئەوانی تر ناتبینن... بۆ من باڵەکانت دەبینم و ئەوانی تر نایبینن؟». مەهدائیل کەمێک سەری خوراند و گووتی «ئاساییە، ئەوە پەیوەندی بە تۆوە هەیە... مرۆڤ دەبێت خۆی فریشتەیەکی بەهێز و دڵسۆزی هەبێت ئەوسا دەتوانێت فریشتەکان ببینێت. بەدڵنیاییەوە تۆ یەکێکی لە مەلەکبینەکان». بولبولیار دەستی مەهدائیلی گرت و سوێندی خوارد «مەلەکبین، وای مەلەکبینی چی... من پێشتر کەسی وەک تۆم نەبینیوە، تۆ یەکەم کەسێکی باڵداریت دەتبینم». مەهدائیل گووتی «نازانم، تەفسیری ترم نییە... ئەوانەی دەتوانن فریشتەکان ببینن ئەوانەن خۆیان فریشتەیەکی باشیان لە ناخدایە». «بەڵام تۆ بۆ لە ئاسمان نیت، تێناگەم بۆ لە ئاسمان نیت؟». مەهدائیل سەیریکرد و گووتی «بمبورە، بەس پێمبڵێ، لە ئاسمان چی بکەم. پێمگووتی هیچ کات لە ئاسمان نەبووم، هیچ کات... تێناگەم بۆ ئەوەندە پرسیاری ئاسمانم لێدەکەیت؟». «تێناگەم... تۆ چۆن فریشتەیەکی گەر هیچ خەبەرت لە ئاسمان نەبێت، خودات نەبینیبێت، هیچت نەبینیبێت... دەرکەوتنت بۆ مرۆڤ چ سوودێکی هەیە». مەهدائیل کەمێک نارەحەت قامەتە بەرزەکەی بردە دواوە و گووتی «من خودا لە کوێ ببینم، منیش وەک تۆ وەهام، چ خەبەرێکی یەقینم لە بوون و نەبوونی نییە. منیش وەک تۆ وەهام... کە غەمم زۆر دەبێت کە ئەرکەکانم زۆر دەبن دەپاڕێمەوە، دەڵێم خودایە دەرگای ئاسمانتم بۆ بکەرەوە، خودایە هەڵمکێشە، خودایە بمبە، خودایە ئێمە گوناهمان

چییە بەم باڵە گەورانەوە ئیفلیج لە سەر زەوی کەوتووین... هەڵمانکێشە خودایە، هەڵمانکێشە، ئێمە لێرە لە سەر ئەم زەوییە لە غەریبین. بەڵام تۆ چەندە دەنگی خودا دەبیستیت منیش ئەوەندە، خودا چەندە وەڵامی تۆ دەداتەوە، هەر ئەوەندەش وەڵامی من دەداتەوە». بولبولیار بێئەوەی تێبگات، گووتی «ئەوە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ هیچ لە سەر فریشتە نازانێت... قسەکانی تۆ بەس ئەو مانایەیان هەیە». مەهدائیل بە نیگایەکی پڕ پرسیارەوە سەیریکرد و گووتی « هۆشەنگی هاوڕێم... مرۆڤ لە چی تێدەگات تا لە فریشتە تێبگات؟». مەهدائیل کە ناوی مرۆڤی هێنا، قورگی جۆرە تووڕەییەکی تێدابوو. بولبولیار حەزیکرد بزانێت ئەم فریشتە زەبەلاح و باڵابەرزە بۆ لە مرۆڤ وا داخ لە دڵە، بەڵام ئەو گووتی «ناتوانم تێت بگەێنم، دەبێت خۆت بیدۆزیتەوە، هەندێک هەقیقەت هەن نابیسترێن، ناگووترێن، تەنیا دەگیرێن و دەستیان لێدەدرێت». بولبولیار پرسی «بەڵام چۆن بتوانم لێیان نزیک ببمەوە، چۆن دەکرێت بیانگرم و دەستیان لێبدەم؟». مەهدائیل ئەمجارە پێکەنی و گووتی «مامی مامی، تۆ دەڵێیت چی. تۆ بەختت هەیە، کێ لە تەمەنی تۆدا نگینی وای دەستدەکەوێت فریشتە ببینێت، کێ؟». سەری هێنایە پێشەوە و چرپانی بە گوێیدا «مامی مامی، ئەو ڕاستییەی کە تێبگەیت و بزانیت فریشتە لە دونیادا هەیە، کەم نییە.... تێدەگەیت، کەم نییە... ئەو ڕاستییە لەزۆر شت دەتپارێزێت، گرنگ ئەوەیە بزانیت فریشتە لە دنیادا هەیە. بەدبەختە ئەو مرۆڤەی باوەڕی بەبوونی فریشتە نەبێت، تێدەگەیت بەدبەختترین کەس ئەو بەشەرە گێژانەن کە باوەڕیان بە بوونی فریشتە نییە. بە ڕاستی شانس و نگینت هەیە... ئەوەم بە گاڵتە نییە». ئینجا دەنگی سووککردەوە و بە جیدییەتێکەوە کە بولبولیاری ترساند گووتی «لەوانەیە وابێت بتوانیت فریشتەی تریش ببینیت. گرنگ ئەوەیە بزانیت ئەو زانیارییە چۆن دەخەیتە کارەوە... لەوەدا هیچ کەس یارمەتیت نادات،

هیچ کەس... بەڵام هەر بزانیت لە دونیادا فریشتە هەیە، ئەوە شتێکە بە پارەی دونیا ناکڕدرێ، لەوەش گرنگتر ئەوەیە ئەو زانینەت بەکاربهێنیت، ببیت بە مەلەکبینێکی باش». بولبولیار بە چاوە گەورەکانییەوە چاوی پیاوێک کە هەمیشە جێگایەکی دوورتر لە جێگا نزیکەکانی دەوروبەری سەیردەکات، سەیری ئەو جێگا نادیارە هەمیشەییەی کردەوە و گووتی «بەڵام بە ڕاستی نازانم، زانیاری وەها چۆن بەکاربهێنم... بەتایبەت وابڕیارە من باوەڕم بە بوونی فریشتە نەبێت، گەر کەسانی نزیکم بزانن من باوەڕم بە بوونی فریشتە هێناوە، بە ئیماندارم حیسابدەکەن و دەبن بە دوژمنم». مەهدائیل لە سەرەخۆ قومێکی لە ئاوەکەی بەردەمیدا و گووتی «ڕاستییەکەی منیش زۆر باوەڕم بە غەیبیات نییە... بەڵام ئەوەی لە یەکەم ساتەوە خۆم بۆ ئاشکراکردیت، باڵەکانی خۆمم لە بەردەم تۆدا کردەوە و بینیت، ئەوە کاری بە ئیمان و غەیبیاتەوە نییە. ئێمەی فریشتە جنسێکی لاوازین، پێویستییەکی زۆرمان بە کۆمەک و یارمەتی هەیە... من بۆ کۆمەک دەگەڕێم». ئینجا سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد و جارێکی تریش دەنگی تەواو نزمکردەوە و گووتی «دەمەوێت نهێنییەکت پێبڵێم... نهێنییەکی گەورە». «پێمبڵێ، تکایە، پێمبڵێ» دەنگی هۆشەنگ تۆنی پاڕانەوەیەکی قووڵی تێدا بوو. «من هەست بە نەخۆشییەکی کوشندە دەکەم. هەست بە هاتنی تاعوون دەکەم، درمێکی خەتەرناک، فریشتەکان نەخۆشن. من لە داهاتوودا، نازانم کەی، نزیک و دوور، پێویستیم بە یارمەتی دەبێت ، زۆر پێویستیم بە تۆ دەبێت». دەنگی مەهدائیل لە دەنگی کەسێکی ترساو و هەڵهاتوو دەچوو. «من هەستی پێدەکەم، پێشتر نەبووە فریشتەکان بەوجۆرە بیماربن. بەڵام چەند حاڵەتێک دەبینم. دۆعابکە وانەبێت، لە خودا بپاڕێرەوە وانەبێت... چونکە نازانم گوێی لێمانە یان نا... نازانم دەمانبیستێت یان نا... نازانم ئاگای لێمانە یان نا... بەس دەپاڕێمەوە خودا بەزەیی بە فریشتەکاندا

بێتەوە، خودا کە وەک تۆ یەقینێکم نییە ئاخۆ دەمانبیستێت یان نا، ئاخۆ دەزانێت ئێمە هەین یان نا».

بولبولیار... سەرسامبوو... سەرسامی تەنیا شتێکیش بوو دەیتوانی ئارامیبکاتەوە.

# شۆڕشگێڕێك لە سەرەتاكانی ڕۆژگاری خوێن و کینەدا

سەرەتای شۆڕشی نوێم لە هەلومەرجێکی زۆر سەختدا بردەڕێوە، کاتێک لەگەڵ هەڤاڵ شێرخاندا یەکەم مارش و گەشتی شۆڕشگێڕانەم بەرەو خۆرئاوا، بەرەو جێگایەکی سەخت لە سێ گۆشەی سنووری عێراق - سوریا - تورکیا دەستپێکرد، ئەوەندەی قورسایی چەک و کۆڵەپشتەکەم لە سەر شانم بوون، قورسایی یەکەمین کوشتن لە سەر ویژدانم نەبوو. دڵنیابووم لە شەودا شتێکی گەورەی وەک بومەلەرزە لە ناخمدا ڕوویداوە. شتێک نە بومەلەرزەی لەش بوو، نە ئازاری ویژدان، بەڵکو هەستێکی نادیاربوو، وەک خزانی شتێکی گەورە لە ناختدا، وەک ئەوەی ڕۆحم شاخێکی ڕەق بێت و لە ناکاو گاشەبەردێکی گەورەی ترازابێت، یان وەک دەرگایەکی گەورەبێت و کلیلێکی زۆر گەورەی تێدابێت، ئەو کلیلە قەت قەت پێچی نەخواردبێت و ئێستا لە ناکاو پێچێکی بچوکی دابێت و وەستابێت. پێچێک کە تۆ گوێت لە کرتەکەی دەبێت، بەڵام دڵنیانیت ئاخۆ وایە یان نا... دروستە یاخود تەنیا هەستێکی ئاڵۆز و خەیاڵییە و ساتێکی تایبەتی گومان دروستیکردوە.

لە دونیای شۆڕشگێڕاندا، کێشەی سەرەکی کوشتن ئەوەیە کە لەساتی خۆیدا هیچ شتێکی ئەوتۆ گرنگ دروست ناکات. جیاوازی شۆڕشگێڕ

لەگەڵ پیاوکوژی ئاساییدا ئەوەیە کە پیاوکوژی ئاسایی لەوانەیە دەم و دەست هەست بە پەشیمانیبکات، لەوانەیە ڕاستەوخۆ ژانێکی قووڵ بچێتە ویژدانییەوە، بگری و پەشیمانببێتەوە. بەڵام شۆڕشگێڕ نا... لە ناو هەموو جۆرەکانی پیاوکوژدا شۆڕشگێڕان لە هەمووان ئاسوودەترن، لە هەمووان ویژدانێکی ئارامتریان هەیە، لەوانەیە بۆ هەتاهەتاشە هەروا بمێننەوە، چونکە بە بڕوای شۆڕشگێڕ ئەو هەرگیز مرۆڤی نەکوشتووە، بەڵکو زەوی بۆ بەهەشتێکی گەورە خۆشکردوە و ڕێگای بۆ ئامانجێکی گەورە پاککردۆتەوە. لە بەرئەوە زۆرجار دەمرن بێئەوەی بە ڕاستی هەستیان بەوە کردبێت کە کەسێکیان کوشتووە. لای شۆڕشگێڕان دوژمن مرۆڤ نییە، بەڵکو بەردێکە لە ڕێگای بەختیاری مرۆڤەکاندا و دەبێت لاببرێت. شۆڕشگێڕ هێندە بە نیەتێکی پاک و باشەوە خەڵک دەکوژێت، بە نیازی خراپ و ڕۆحی تۆڵەوە ناکەوێتە کار، دواتر یان وادەزانێت خێر و چاکەیەکی گەورەی بۆ هەموومان ئەنجامداوە یاخود تەواو لە یادی دەچێتەوە و شتەکان وەک بەشێک لە سەردەمێکی دیاریکراو سەیردەکات کە ئەستەم بوو بێ خوێن بڕواتە ڕێوە.

بەپێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی منەوە، سەرەتای شۆڕش پڕنەبوو لە جەنگی خوێناوی لەگەڵ بەعسییەکاندا، بەڵکو لە یەکەم ڕۆژەوە و لە یەکەم گەشتمانەوە، کاتێک دەمانویست لە ناوچەی هەریر و باتاسەوە بە ئاراستەی باکووری خۆرئاوا سەربکەوین و هێزەکانمان بە ڕێگایەکی پێچاوپێچ و بەپێی نەخشەیەکی ئاڵۆز ڕووە و کەناری خاپوور بجوڵێنین. هەڤاڵ شێرخان کۆبوونەوەی پێکردین و گوتی «کە چووینە سنووری بادینان و هێندەی گوێتان لە خەڵکانێک بوو بادینی دەدوێن، ئیتر دەبێت چاوێک بکەن بە هەزار چاو، چونکە لێرە بە دواوە خەتەری سەرەکی سەر ئێمە هێزەکانی بەعس و جاسوسە پەرەتەوازەکانی ئەوان نین،

بەڵکو بەرزانییەکانن کە لەم دەڤەرەدا پلانی لێدانی هێزەکانی ئێمەیان دارشتووە و دەیانەوێت ئەم شۆڕشەش بە دەردی ئەوی پێشوو ببەن... هەر کەسێکمان بکەوێتە دەست بەرزانییەکان وای لێدەکەن تف لە دایک و بابی خۆی بکات کە بۆ ڕۆژی وا ڕەش هێناویانەتە دونیاوە... گەر کەوتنە گەمارۆی بەعسییەکانەوە خۆتان بدەن بە دەستەوە، لەوێدا شانسێکی بچوکی ژیان هەیە و لەوانەیە گەر خودا ڕەحمی هەبێت، بەر لێبوردنێک یان شتێک بکەون، بەڵام گەر کەوتینە گەمارۆی بەرزانییەکان، وەعدم بدەنێ کە دوا فیشەک هەڵبگرن بۆ خۆتان. لەگەڵ ئەواندا لێبوردن و دیلی و شتی وا بوونیان نییە... لە بەرئەوە دوای کڵاوی بابردوو مەکەون، دەمودەست دەستتان بچێتە گیانی خۆتان و ڕۆحتان لە ئازاری زیاد قوتاربکەن، ئەوەیان ئازاری سووکترە».

قسەکانی هەڤاڵ لەوە ڕۆشنتر بوو کەس تێینەگات. بەڵام شەڕی ئێمە تەنیا لەگەڵ بارزانییەکان نەبوو، بەڵکو لەو دەمەدا چەندین گروپی چکۆلانەی دیکەش لە مەیداندا بوون، چەندین حیزب و حیزبۆچکە هاتبوونە دونیاوە، کە هەندێکیان وەک کولەبنەی ناو حیکایەتی پیرێژنان تا ئەمڕۆ هەر بەو قەد و قەوارە بچوکەوە ماونەوە کە پێوەی لەدایکبوویبوون. یەکەمین قوربانیانی گەشتەکەمان سەربازەکانی سوپای عێراق نەبوون، بەڵکو دوو پێشمەرگەی بەرزانییەکان بوون کە لە سەر کانییەک ئاویان دەخواردەوە و پشوویان دەدا. هەڤاڵ شێرخان کە ئەوانی بینی ئەمری دانێ بە بێخشپە لێیان نزیک ببینەوە و هەر کات ئەو بە دەست ئاماژەیکرد هەمووومان پێکەوە تەقەبکەین. پێشمەرگەکان دوو کوڕی منداڵکاری گەنج بوون، تاقم و تفەنگیان کردبووەوە و بەتەمابوون لە توێشووەکەی پشتیاندا هەندێک نان دەربهێنن و شتێک بخۆن و بکەونەوە ڕێ، هێشتا تەواو کۆڵی پشتیان دانەنا بوو کە ئێمە لە بیست کڵاشینکۆفەوە بێژامانن. هەڤاڵ شێرخان بەهانەی کوشتنەکەی ئەوەبوو

کە بارزانییەکان هەفتەیەک لەوەوبەر کۆمەڵێک هەڤاڵی ئێمەیان بەوجۆرە شەهیدکردوە، بێڕەحمانە بێژاویانن، زمانیان بڕیون، نافەکیان بڕیون، دواتریش لاشەکانیان سووتاندون. کە چووینە سەر لاشەی کوژراوەکان و لە نزیکەوە سەیرمکردن، هەمان بێباکی قووڵم تێدابوو کە شۆڕش پێویستی پێی بوو. هەڤاڵ لە سەر تەرمەکان بە عادەتی هەمیشەیی خۆی، بە نوکی پێڵاوەکانی تۆزێک چەناگەی کوژراوەکانی جوڵاند و گووتی «ئەوەی لێمان شەهیدبکات، لێیخۆش نابین. هەر چاوێک بە دوو چاو و هەر دانێک بە دوو دان». دکتۆر لە سەر لاشەی هەموو دوژمنێک وای دەگووت. هەڤاڵ شێرخان بەردەوام پێیوابوو تۆڵەدەکاتەوە، بە بڕوای ئەو، ئێمە جگە لەوەی هەقی خوێنی شەهیدەکانی خۆمان دەستێنین هیچی تر ناکەین. لای ئەو ئێمە هەرگیز دەستپێشخەر نین، بەڵکو دوژمن بەردەوام دەست پێشخەرە. لە ڕاستیدا من نەمدەویست بیر لەوە بکەمەوە کێ دەست پێشخەرە. من وەک سەرەتا بیرم لای ئەوە بوو کە شۆڕش لە بەرئەوەی نوێیە هەم پێویستی بە شەهید و هەم پێویستی بە سەرکەوتن هەیە. دەبوو کارێکبکەین هەم شەهیدمان هەبێت و هەم سەرکەوتن تۆماربکەین. هیچ شتێک وەک مردن و سەرکەوتن هێزێکی سیاسی گەورە ناکات. مردن وەک ئەو شیرینییەیە کە حیزب دایدەنێت بۆ ئەوەی هەموو مێشەکانی دونیای پێوە بنیشن. چەند شەوێک لەو ڕووەوە گفتوگۆی درێژم لەگەڵ هەڤاڵ شێرخاندا کرد، کە هێدی هێدی زیرەکی و وریایی من سەرنجی ڕادەکێشا. بیرۆکەکانی من لە سەر دروستکردنی شەهید و گەورەکردنی حیکایەتەکانی سەرکەوتن، دەبوو بە جێگای ڕامانی ئەو. لە گەشتیشماندا بۆ باکوور تا دەهات بە جێگای سەختتردا دەڕۆیشتین. من هێدی هێدی زیاتر لەوانی دی لە دکتۆر نزیک دەبوومەوە... بە جۆرێک هەر لە هەفتەی یەکەمەوە گەڕامەوە سەر پیشە دێرینەکەی خۆم، بە وردی چاودێری چواردەورم بکەم و

هەموو شتێک تۆماربکەم. من بە وردی سەرنجی رەفتار و هەڵسوکەوتی هەموو پێشمەرگەکانم دەدا و یەک بە یەک دەمخوێندنەوە. دە رۆژ نەبوو لەگەڵ مەفرەزەکەدا بووم کە یەکەم راپۆرتی گرنگم بۆ هەڤاڵ شێرخان بەرزکردەوە، بە وردی ئەوەم نوسیبوو کە من گومانێکی خراپم لە دووان لە پێشمەرگەکانمان هەیە. هەڵبەت من هەمیشە گومانەکانم لە سەر توانایەکی بێوێنەی فیراسەت و خوێندنەوەیەکی دروستی جوڵەی دەست و شان و نیگا بونیاد دەنا. هەڵبەت وەک هەموو گومانێک، مەودایەک بۆ هەڵە و نەپێکان دەمایەوە. من گەرچی باوەڕم بە وردکاریی خۆم هەبوو، گەرچی یەقینم هەبوو کە توانام لە سەر بۆنکردنی ناوەوەی ئینسان وەک توانای سەگێکی ئەزموونداروایە، کاتێک دەوەنخاک و پێدەشتێکی پڕ لە گیای کێوی بۆ هەڵاتووان دەگەڕێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە زەحمەت و ناڕەحەتی دەگەیشتمە یەقین، ئەوەی منی لەو سەگە بۆنتیژانە جیادەکردەوە، گومان بوو. سەگ هەرگیز گومان لەو هەقیقەتە ناکات کە غەریزە پێیدەبەخشێت، بەڵام من زۆرجار گومانم لە عەقڵ و لە غەریزەشم هەبوو، ئەوەش ئازارێکی نادیاری دەدامێ، سەعاتێکی ناوەکی سەیری لە ناخمدا دەخستە کار کە نەمدەزانی بۆچی و لەبەرچی هەمیشە دەچرکێنێ و دەچرکێنێ. گەرچی من پیاوێکی ڕەسەنی ئاسایش و سیخوڕێکی ئەزەلی بووم، گەرچی توانای بۆنکردن و سەرنجدانم وەها گەورە بوون کە جێگایەکی زۆری بۆ دوودڵی جێ نەدەهێشت، بەڵام شتێک لە دەروونمدا دەمایەوە کە نەمدەزانی ناوی بنێم. شتێکی سەیربوو، هەستێکی تاریک بوو، وەک یەکێک بە زۆر سەرنجم بۆ کۆمەڵێک شتی دی ڕابکێشێت و پێمبڵێ عەزیزم بۆ بەو دیودا ناڕوانیت، بۆ لە بەهانە و بەڵگەکانتدا تەنیا ئەم مانا یاخود ئەوی دیکەیان دەبینیت و ناپرسیت کە دەشێت ڕێگای تر و بیرکردنەوەی تر و تەفسیری دیکەش هەبێت کە گەلێک لە دەرەنجامەکانی تۆ دوورن. بەڵێ هەمیشە شتێکی نادیار و

بێناو لە دەروندا دەمایەوە، ئەوەشی لە دەروندا کوشندەیە، ئەو شتەیە کە دەمێنێتەوە و ناتوانین ناوی بنێین.

مەفرەزەکەمان لە نزیک سنوور بوو بە دوو بەشەوە. بەشێکمان «کە من هاوڕێیان بووم» لەگەڵ دکتۆر بەرەو سەر ئەو خاڵە جوڵاین کە تێیدا هەر سێ سنووری سوریا و تورکیا و عێراق لە یەکدەدەن. سەیرم لێهات کە ئەو خاڵە گرنگە لای هیچ یەک لەو سێ دەوڵەتەوە بە باشی پاس ناکرێت. وادەزانم هۆکەی ئەوە بوو، لە جەوهەردا ئەو جۆرە خاڵانە، تاکە بستی ڕاستەقینەی سەر زەوین کە بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی ڕاستەقینە یان ڕەمزی هیچ هێزێکدا نین. خاڵێکی مەجازییە کە هەموو دەوڵەتێک وا هەستدەکات لەوێدا دەسەڵاتی گەیشتۆتە کۆتایی... خاڵێکە ئەوە بیر دەسەڵات دەخاتەوە کە دیاردەیەکی جوگرافی و دونیاییە، نەوەک هێزێکی ڕەها و ئەبەدیی، لە بەرئەوە هەمیشە حەسرەتێکی نادیار لە دڵی دەسەڵاتداراندا دروستدەکات، خەفەتێکی نهێنی. بەوەدا ئێمەی کورد هیچ کات دەوڵەتمان نەبووە، هیچ کاتیش هەستمان بە مانای ڕاستەقینەی سنوور نەکردوە، بەو جۆرەی دەسەڵاتدارێکی ڕاستەقینە هەستی پێدەکات. سنوور لە دڵی دەسەڵاتداری ڕاستەقینەدا هیچ نییە جگە لە وەبیرهێنانەوەیەکی بەدی ئەو ڕاستییەی کە ئەو خودا نییە. پادشا و سەرۆکە گەورەکان تەنیا لەو کاتەدا بیریاندەکەوێتەوە کە خودا نین و هێزی ڕەهای ئەویان نییە کە چاویان بەو هێڵە خواروخێچانەی سنوور دەکەوێت... لە بەرئەوە هەموو پادشا و حاکمەکان بە درێژایی مێژوو دوژمنی سنوور بوون، باوەڕنەکردن بە سنوور ئەوە جەوهەری دەسەڵاتە. لەو شوێنەدا کە دکتۆر بە دەنگی بەرز پێیگوتین ئەمە ئەو پنتە مەلعونەیە کە کوردستانی کردوە بە سێ بەشەوە، نەمدەزانی خۆشحاڵ بم یان غەمگین. بە هەڤاڵ شێرخانم گووت «هەڤاڵ بە ڕاستی

نازانم لێرەدا دڵخۆش یان دڵتەنگ بم». قسەکە بە تۆنێکی منداڵانە لە زارم هاتەدەرێ، کە تا ئەمڕۆش لە گوێمدا وەک خۆی دەزرنگێتەوە. ئەو گووتی «گەر بەرزانییەکان نەبوونایە، لەوانەبوو ئەم خاڵە ئێستا لە جێگایەکدا بێت زۆر لە خوارتر، لەوانە بوو سنووری باکووری دەوڵەتی کوردستانی لەگەڵ دەوڵەتی تورکاندا دروستکردبایە». دکتۆر لەوێدا وتارێکی سیاسی درێژی بۆدایـن کە ماناکەی ئەوەبوو، گەر بە ڕۆحی فیداکاریی و لە خۆبوردن کاربکەین و گوێ لە سەرۆکەکانمان بگرین و باوەڕ بە دڵسۆزیان بهێنین، لە داهاتووی نزیکدا ئەم سنووره بەوجۆره نامێنێت و ئەم خاڵە دەکەوێتە دەست هێزی پێشمەرگەی کوردستان و لێرەوە خێر و پارە و خۆشی ڕوودەکەنە خەڵکی کورد و خەڵکانی هەژار دەبوژێنەوە، مەزراکانمان سەوزدەبن و خاکی جوانمان ئاوەدان دەبێت و زەویمان پڕدەبێت لە بەرهەم و شارمان پڕدەبێت لە کارگە.

ئەو شەوە من و دکتۆر و دوو هەڤاڵی تر دزەمانکردە تورکیا و لە جێگایەکی تایبەتیدا خۆمان حەشاردا و دوو شەو ماینەوە، شەوی سێهەم هەڤاڵانمان لە سورپاوە بارێکی گەورە و قاچاغیان بۆ هێنایـنە ئەم دیو سنوور، پتر لە پێنج سەد پارچە چەکی سووک و بڕێکی زۆری تەقەمەنی کە گەلێک سەخت ئاودیوکرابوون و گەلێک سەختیش ئێمە ئاودیوی ناوچەکانی خۆمان کرد... بە درێژایی ڕێگا هەموو هەستی خۆم خستبووە سەر ئەو مۆسیقا تایبەتییەی کە سمی هێسترەکان لەکاتی پێکدادانـدا لەگەڵ ڕەقەنی زەوییەکەدا دروستیاندەکرد، زۆرجار لە شۆڕشدا کە ناچار دەبیت زۆر زۆر بڕۆیت، کاتێک هەر دەڕۆیت و ڕێگا تەواو نابێت، هەر دەڕۆیت و ناگەیت، تەواوی هەستت دەخەیتە سەر ئەو دەنگە سەیرانەی ڕۆیشتن و ماندوویێتی دەیانخولقێنێت، دەنگگەلێک مرۆڤ تەنیا لە کاتی ڕۆیشتندا دەیبیستێت، بەشێکی دەنگی سروشتە کە سەیری تۆ دەکات، بەشێکیشی دەنگی ناوخۆی جەستەتە کە تا زۆر ماندوو نەبیت نایبیستیت. من زۆر

چێژم لە ماندووبوون دەبینی، چونکە تەنیا لە کاتی ماندووبووندا هەستم بە لەشی خۆم دەکرد، لەش مۆسیقایەکی ناوەکی هەیە کە تەنیا لە کاتی ماندووبووندا بەرزدەبێتەوە. جۆرە ئاوازێکە من ناویدەنێم ئۆرکسترای هیلاکی، ئاوازێکە هەموو ئەندام و بەشە نهێنییەکانی ناو جەستەم لە سەری سەمادەکەن، سەمایەکی دڵڕەقانە، درندە، هۆشبەر، من لە کاتی هیلاکیدا تەواو هەستم بە سەمای هەموو ئۆرگانەکانی خۆم دەکرد. لە گەشتی گەڕانەوەماندا، فەراسەتی شۆڕشگێڕانەم تا دەهات دڕتر دەبوو... بە چاوێکی گوماناویترەوە سەیری شتەکانم دەکرد. یەکێک لەوانەی بە غەریزە گومانم خستبووە سەر پێشمەرگەیەکی ریشن و بچکۆلانە بوو، کە دەموچاوێکی سەیری هەبوو، لەوانەی پێدەچێت خودا لە ئامێرێکی شڵەقانی توندا ڕایوەشاندبن و لووت و لچ و چەنەیانی بەلادا بردبێت، گەنجێکی شانخوار، بە دووکیسەی گەورەوە لە بەر چاویدا، بە پێڵوانی بێبرژانگ و جووتێک برۆی کورت و تەنکەوە. ئێستاش نازانم گومانم دەرهەق بەم گەنجە، بە هۆی ئەو ڕوخسارە شێواوەیەوە بوو، یاخود بەرهەمی غەریزەیەکی سیاسی و شەڕانگێزانەی ناخم بوو. لەبەر هەر شتێک بێت، من لە ساتێکدا هەستمکرد، ئەم گەنجە ناپاکییەک لە ناخیدایەتی. بە «شاسەی یاسەمین» بانگیاندەکرد، تاقانەی دایک و باوکێکی کوێر بوو. ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا، ئەوە بوو ئەویش زۆر شتی دەنوسی، بە بڕوای من هەر کەسێک لە شۆڕشدا شتی زۆر بنوسیبایە، جێگای گومان بوو. گەرچی منیش شتم زۆر دەنوسی، بەڵام نوسینی من پێکڕا دەچووە خانەی خزمەتی ئەمنییەتی شۆڕشەوە. بێهۆیەکی دیاریکراو ئەو خەیاڵە بەدە چووە سەرمەوە کە شاسەی یاسەمین زانیاری بۆ دەوڵەت کۆدەکاتەوە. گەنجێکی بێدەنگ بوو، من لە شۆڕشی دێرینەوە دەمزانی کە شۆڕشگێڕانی هێمن و بێدەنگ سەرنجێکی خراپ جێدەهێڵن. زۆربەی پێشمەرگەکان خەویان قورس بوو، هۆکەشی دەگەڕایەوە بۆ ئەو

شەکەتییە زۆرەی لە ڕێگادا دەیانکێشا. من نەبێت کە خودا توانایەکی گەورەی دابوومێ بتوانم بە خەوێکی کەم ئەرکێکی قورس جێبەجێبکەم. شەوێک نۆبەتە ئێشکم بوو، شاسە هەمیشە لە سەر دەم دەخەوت، وەک زۆربەی ئەوانەی خەیاڵی نوسینیان هەیە، خەوی کەم بەڵام قورس بوو... ئەو شەوە من کۆڵەپشتەکەیم کردەوە و دەفتەرەکانیم دەرهێنا. نوسینەکانی جۆرێک بوون لە یاداشت، شتێک لە جۆری یاداشتەکانی من، بەڵام بێڕەحمتر و ڕەخنەگرانەتر. ئەو گەلێک داغ لە دڵ لە سەر دکتۆر شێرخان شتی نوسیبوو، نوسیبووی کە دکتۆر لەبری سروشتی شۆڕشگێڕ، «تەبعی جەلادی» هەیە، ناڕەحەتییەکی زۆری لەدەست کوشتنەکانی دکتۆر نیشاندابوو، لە دێڕێکدا تۆماریکردبوو کە ئەوانەی دکتۆر دەیکات تاوانی ڕووتن و پەیوەندیان بە قازانجی شۆڕشەوە نییە، کوشتنی دوو بەرزانییەکەی بە بێئابڕویی و بێشەرەفی و بێشەرمی دانابوو. گەرچی ئەوەی نوسیبووی، پێکڕا شتێکی ترسناکی تێدانەبوو، بەڵام من بە هۆشی ئەو سەردەمە کەسێکی دوودیو و ترسناکم تێدا بینی کە تۆوی دوودڵی و توڕەیی لە شۆڕشدا دەچێنێت و لەوانەیە گەر لەم ئان و ساتەشدا خیانەتکار نەبێت، بۆ سبەی نەمامی خیانەتکارێک لە دڵیدا سەوز بێت. بۆ ڕۆژی دوایی هەموو شتەکانم بۆ دکتۆر گێڕایەوە. دکتۆر پیاوی گاڵتە نەبوو، لەوانە نەبوو لێگەڕێ خەڵکانی ناڕازیی، ئەوانەی دڵیان لەو کرمێیە لەگەڵیدا بن. ئەو دروشمی سەرەکی ئەوەبوو «هەر شۆڕشگێڕێک گومان لە هاوڕێکەی نەکات کەر کوڕی کەرە». دەمزانی لەوانەیە کە باوەڕ بە هیچ مەخلوقێک ناکات. بەردەوام لە کاتی خەویشدا دەستی لە سەر دەسکی دەمانچەکەی بوو، سەرنجمدەدا شەوان خۆی دەکات بە نوستوو، گەر وەسواسێکی هەبایە دەیتوانی خۆی ونبکات و دوور لە مەفرەزەکە جێگایەکی نهێنی بۆ پشوو بدۆزێتەوە، لەکاتی ڕۆیشتندا هەردەم لە ناوەڕاستی ڕیزەکەدا جێگای دەگرت، لە شەڕدا وادەوەستا

پشتی لە کەس نەبێت. دەموچاوی بەردەوام حاڵەتی کەسێکی هەبوو، بیەوێت فەرمانێکی گرنگ دەربکات... هەتا فەرمانە ئاساییەکانیشی کە پەیوەندیان بە ئێشکی شەو و دابەشکردنی کاری خواردن دروستکردنەوە هەبوو، بە مۆنییەکی وەهاوە دەردەکرد، پێشمەرگەکان نەیاندەوێرا نوزە لە گەرویان بێت. من لەو باوەڕەدا نەبووم کە توڕەیی لە شاسەی یاسەمین بگاتە ئەو ئاستەی کە دواتر بینیم. دوو شەو دوای ئەوە کاتێک شاسە خەوتبوو، من لە سەر داوای دکتۆر، دەفتەری یاداشتەکانی شاسەم دەرهێنا و دامە دەست ئەو. هەر ئەو شەوە لە بەر مۆمێکی سپیدا بە وردی هەمووی خوێندەوە و بێئەوەی هیچ بڵێت دەفتەرەکەی دامەوە، دڵنیابووم بڕواشی بە من نییە.

دوای چەند ڕۆژێک، ئێوارەیەکی درەنگ شاسەی بانگکرد، ئیدی هەر ئەو بانگکردنە بوو، دوای ئەوە شاسە ئازادی بە چاوی خۆی نەبینییەوە. پاش دە دەقیقە لە دانیشتنەکە، کە لە ئەشکەوتێکی چکۆلەی قەندیلدا بوو، شاسەیان بە دەم بەستراوی و پەل بەستراوی هێنایەدەرێ. شێرخان بە نەڕەیەک هەموو هەڤاڵانی کۆکردەوە، دەفتەری یاداشتەکەی شاسەی بە دەستەوە بوو، ئەو دەفتەرەی من بۆ دکتۆرم ئاشکرا کرد. دکتۆر بە دەنگە گڕ و نیگا هەمیشە گرژەکەی خۆی گوتی، بەپێی کۆمەڵێک زانیاری سەلمێنراو کە لە هەڤاڵانمانەوە پێمان گەیشتبوو، دەمانزانی چاوێکی دەوڵەت و سیخوڕێکی ترسناکی «موخابەراتی عەسکەری» لەگەڵ مەفرەزەکەدایە. من چەند وەختە بە وریاییەکی زۆرەوە چاو و گوێم هەڵخستووە، تادواجار لە ڕێگای سەرچاوەکەمانەوە و بە کۆمەکی هەندێک هەڤاڵی خۆمان، ناوی ئەو خۆفرۆشە، نەفسنزمەمان دەستکەوت «شاسەی یاسەمین». ناوی شاسە لای هەموو هەڤاڵان شۆکێکی گەورەی دروستکرد. دکتۆر بۆ ئەوەی هیچ گومانێک لە قسەکانیدا نەمێنێت

دەفتەرەکەی بەرزکردەوە و گووتی ئەوەش شاهیدی قسەکانمە. ئەوەش شاهیدێتی، لەم دەفتەرەدا زانیاری تەواو لە سەر کارە بەدەکانی ئەم خۆفرۆشە هەیە، کە دەرونی نزم و ڕەوشتی بەدی ڕێگایان داوە زانیاری لە سەر مەفرەزەکە و ناوی ئەندامەکانی کۆبکاتەوە، تا دواتر رادەستی دەوڵەتی بکات و تۆڵە لە کەسوکارمان بکەنەوە. بەوەدا شاسە لە ڕاستیدا کەسێکی هێمن و پێشمەرگەیەکی چالاک بوو، هەموو هەڤاڵانی بە جۆرێکی سەیر پەشۆکان... من دوور بە دوور وەستابووم و بێباک گوێمدەگرت. ئەوکات گومان لەوە نەبوو کە دکتۆر هەر چییەک بڵێت لە سەر هەقە. دڵنیابووم کە جگە لەو دەفتەرە هیچ بەڵگەیەکی تری نییە، بەڵام گەر وانەبێت پیاوانی بۆڵەچی و خۆ بە هەق زان، شۆڕش دەخۆن. شۆڕش تاکە جێگای دونیایە کە مرۆڤ تێیدا ناتوانێت ئازاد بێت، شۆڕشگێڕیش هەر کات گومانی هەبوو، دەبێت زۆر بیرنەکاتەوە. دکتۆر دەیزانی ئێمە لەو هەرد و چیایە کاتمان نییە، کەرەستەی دڵنیاییمان نییە، ڕێگای پشکنینمان نییە... لە بەرئەوە کە گومانت هەبوو، بەر لەوەی دوودڵی بتخوات، بەرلەوەی بپرسیت دروستە یاخود نا، دەبێت دەستی خۆت بوەشێنیت. جارێک بە منی گووت «هەڤاڵێکی خۆت بە هەڵە بکوژیت، باشترە لەوەی هەموو هەڤاڵەکانت بە هۆی هەڵەیەکی تۆوە بکوژرێن». دڵڕەقی، دڵڕەقی ئێمە نەبوو، دڵڕەقی دونیا و مێژوو و خەبات بوو. منیش تاسەر ئێسقان باوەڕم بەو بۆچوونەی ئەو بوو، شاسە بەردێک بوو کە دەبێت لاببرێت. دوو شەو دوای ئەوە لە گوندێکی نێو چیایان لاماندا و بۆ شەو بە سەر ماڵاندا دابەشبووین... نیوەشەو لە ژێر بەتانی خەوەوە لە مزگەوتی دێ، گوێم لە چەند دەستڕێژێک بوو، بەپەلە هەستام و خۆم بەست، وەک زۆربەی پێشمەرگەکان لە ماڵ دەرپەڕیم... لە کاتێکدا خەریکی خۆ تەیارکردن بووین بۆ شەڕ، دکتۆرمان بینی لەگەڵ کەسێکی نزیکی خۆیدا لە دەرەوەی گوند دەگەڕانەوە. بە

هێمنی بە هەموومانی گووت «شاسەی یاسەمین» هەوڵی ڕاکردنی داوە و ئەمانیش پێیانزانیوە و دوای کەوتوون و لە چەمی بەر دێدا کوشتوویانە. هەر ئەو شەوە بە دوو گەنجی لادێیی گۆڕمان بۆ شاسە هەڵکەند و لە گۆڕستانی چکۆلانە و چەپەکی گوندەکەدا لە گۆڕێکی ون و بێناودا شاردمانەوە... شاسە دواهەمین کەس نەبوو من دەمی لێبدەم و لەبەر چەمی دێدا بیکوژن. بەڵام ئەو شەوە کە گەڕامەوە بۆ ژێر جێگاکەم لە ماڵی خودا، تفەنگەکەم دانا و تاقم و نیتاقەکەم کردەوە، هەستم بە چرکەیەکی دیکەی ئەو کلیلە گەورەیەی ڕۆحم کرد... چرک... وەک ئەوەی دوگمەی قفڵێکی نهێنی سوورێکی تر بخوات... بەڵام ئەو کات نەمدەزانی لەشی من دەرگای وەهای تێدایە و هەڵگری شەبەقی لەو چەشنەیە.

# سەرەتای ڕێگا درێژ و ترسناکەکانی بێباکی

نەغەدە ماردینی دوای تەواوبوونی کۆڕە شیعرییەکەی زانکۆ، گەڕایەوە ماڵێ و بێئەوەی کاتی هەبێت قەسیدەی پەترۆسی شارڵ بۆدلێر بخوێنێتەوە، خۆی گۆڕی و چوو بۆ بینینی نزار ئیدریس. سوپاس بۆ دکتۆری مێردی کە ژیانی ئەم کوڕەی ڕزگارکرد... ڕۆژی پێشتر ئێوارەکەی دکتۆر مستەفا شوکاک بۆ ئەوەی کەس گومانی لێ نەکات، لەگەڵ نەغەدەدا سوار ماشێنەکەی بوو، پێکەوە چوون بۆ ماڵی دکتۆر جەلال ماردینی و کەمێک دانیشتن، لەوێوە چوون بۆ ماڵی پورە گەلاوێژی دکتۆر کە دەمێ ساڵ بوو بە تەنیا دەژیا، لەوێوە چوون بۆ ماڵی ئامۆزایەکی نەغەدە و دواجار بە ڕێگایەکی پێچاوپێچادا گەڕانەوە بۆ ماڵی بابی دکتۆر شوکاک بۆ تیمارکردنی نزار ئیدریس. هەموو ئەو دەراودەر و

پێچەڕێیە بۆ ئەوەبوو، گەر لیڤیتانت چاوێکی خستبێتنە دوا، بە هەڵەدا بڕوات و نەگاتە هیچ. نزار تا ئەوکاتە پەرێشان و لاواز بوو، دکتۆر بە وردەکاری پزیشکێکی دڵسۆزەوە کە دەست و پەنجەی بە جۆرێک لە سەر برینەکان دەجوڵێنێت ژانێک دروست نەکات، یەک سەیری جێ برینەکانی کرد و گووتی «لە پاککردنەوە زیاتر هیچیان ناوێت... هەروادەبێت». نزار کە خۆی ژنبازێکی ئەزەلی بوو، لەو ساتەوە کە نەغەدە ماردینی بینی، بەو زەردەخەنە تایبەتەوە کە دەیزانی دەتوانێت ئەژنۆی خانمان بشکێنێت، لە ناو پاشماوەی ئازار و گەرمی نەرمە تایەکدا سەیری ماردینی کرد. ئەو تەمە تەنکەی لاوازیی و کەمخوێنی کە بە سەر چاویدا کشابوو، ڕێگر نەبوو لەوەی هەست بە تایبەتمەندێتی خانم بکات. لەوجۆرە ژنانە بوو کە نزار تائەوکات بەدەگمەن ڕێی کەوتبووە سەریان. نزار پێشتر لە ژنی چەقاوەسووی ناو کۆڵانەکانەوە بیگرە تا دەگاتە سەر کچی زۆر شەرمن و بێئەزموون خستبوونییە بن تەپکەی خۆی، بەڵام تۆڕ و تەڵەی پێشتر خانمی وەهای پێوە نەبوو بوو. بەدەم هەناسەیەکی لاوازەوە بە خۆی گووت «نا، کوڕی مەلا ئیدریس، تا ئێستا ماسی وەها گەورەت نەگرتووە» ژنەکە لەوانەیە کە لە یەکەم نیگاوە دەزانیت شکۆیەکی تایبەتی و لە خۆباییبوونێکی گەورەی تێدایە. بەڵام کێ دەزانێت لەوانەیە ئەمجۆرە لە هەموو جۆرێک ئاسانتر بن، بەتایبەت لەو ژنە ترسنۆکانەی لە دڵەوە دەسووتێن و لە بەر ترس و دوودڵی هیچیان لەگەڵ ناکرێت. لەو کاتەدا دکتۆر، بە سەر برینەکانی ئەودا نوشتابووەوە، هەر یەک لە خانمی ماردینی و نزار ئیدریس بە قووڵی سەیری چاوی یەکیان کرد. چاوانی نزار پتر لەوەی ماردینی چاوەڕوانیدەکرد ئەو هاوارە درەی تێدا بوو کە بۆی دەگەڕا... چاوی پیاوێک ڕابوردوویەکی نادیاری هەیە، ئێستایەکی نادیار، چارەنوسێکی نادیار... لەو گەنجە ئاڵۆزانەیە کە هەمیشە وەک مەتەڵ وان، لەو کاتەدا

هیچ شتێک لای نەغەدە وەک پیاوێکی ئاڵۆز سەرنج ڕاکێشتر و جوانتر نەبوو. دکتۆر بە هەستە پاک و منداڵانەکەی خۆی، نەغەدەی بانگکرد «گیانی من، وەرە سەیربکە چۆن ئەو برینە دەرماندەکەم... ئاسانە، هەر دەرمانەکە بنێرە سەر ئەم قوماشە و بە ئەسپایی بە سەر برینەکاندا بیهێنە، زۆر بە ئەسپایی... گیانی من دەزانی وەک ژنی دکتۆرێک باشترە بتخەمە بەر فێربوونی هەندێک شت، عەزیزم زۆر باشترە... دەزانی دەبوو زووتر بیرم لەوە بکردایەتەوە، چونکە دوور نییە کاتێک بێت، زۆر پێویستیم بە یارمەتی تۆ بێت». دکتۆر مستەفا شووشەیەک دەرمانی لە گیرفانی دەرهێنا و بە خەندەیەکی سافەوە بە نزاری گووت «جانتاکەم نەهێنا، نەبا گومان دروستبکات. هەر دکتۆرێک بە جانتاوە خۆی کرد بە ماڵدا، ئەوە دەبێ بۆ تیماری یەکێک بچێت، خەڵک وا لە دکتۆر دەڕوانن... دەرمانەکان لە نیوەڕۆ وە لە گیرفانمدان». نەغەدە تا نزاری لە نزیکترەوە بدیبایە شەیداتر دەردەکەوت. گەرچی هەموو ژیانی ڕقی لە بۆنی دەرمانە، بەتایبەت ئەو دەرمانە سوورەی پزیشکەکان برینی پێ پاکژدەکەن، بەڵام ئێستا دەیزانی بۆ ئەوەی دەستێک لە نزار بدات، دەبێت شوشەکە بگرێت بە دەستییەوە و بە بایەخەوە گوێ لە مستەفا شوکاک بگرێت و نیوەی خەیاڵیشی لای نیگای چاوی ئەو بێت. لە دڵی خۆیدا گووتی « هیچ شتێک وەک بۆنی پڵنگی بریندار... دڵی مەستانەی من مەست ناکات». ئەوە دێڕێکی ئەو شیعرە بوو کە لە زانکۆ خوێندبوویەوە، دەیویست پێیبڵێت کە لە ڕیواقی بیمارستانی گشتیدا ئەوی بە برینداری بینیوە و لە هۆڵی نەشتەرکارییەکە لەگەڵیاندا بووە و بە ڕووتی سەیریکردوە و بۆنی خوێنەکەی چووە بە سەریدا، بەڵام هۆیەک و بەهانەیەکی نەدۆزییەوە شتی وەها بڵێت. هەستیکرد دەیەوێت بە خێراییەکی نائاسایی ئەم کوڕە بناسێت، پەلەی بوو بچێتە ئامێزی. لە دوو ساڵی پێشووتری زانکۆدا برادەری کوڕی زۆربوو، بەڵام

پەیوەندییەکانیان وەک هەمیشە ڕوکەش و پڕ ڕێز و ترساو بوو. ئەوەندە ڕقی لە تەنهایی و دووبارەبوونەوە و وەڕزیی ماڵ بوو، پێشنیازەکەی ئەردەلانی هاوڕێی دەمودەست قەبووڵ بوو کە لەگەڵیدا بچێتە شانەیەکی شۆڕشگێڕانەوە و هەوڵبدات کچانی تر بۆ شۆڕش بخاتە ئیشەوە. بەڵام ڕێکخراوەکە بە جۆرێک سارد و بێئیش و مردووە، لەزەتێکی وەهای پێنادات خواستە کێوی و یاخییەکانی تێربکات. لە دڵی خۆیدا گووتی «ئاخ زانکۆ... لە زانکۆ چی دەکرێت، چی؟ بە ڕووت و قووتی بە قەیسەریی گەورەدا پیاسەبکەیت، بە قەد ئەوە ئابڕووت ناچێت گەر لە زانکۆ ژن بیت و پەیوەندی ترت هەبێت». کە شوشەی دەرمانەکەی گرت بە دەستییەوە هەستیکرد بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا دەستی دەلەرزێت. دەست لەرزینەکەی بە هۆی شەرم و ترسەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی تووڕەییەوە بوو، ئەوەی بیرکەوتەوە کە ژنی «دکتۆر موستەفا شوکاکە»... وای بە خەیاڵدا هات چی بکات بۆ ئەوەی ئەم ناوەی لە کۆڵبێتەوە «ژنی دکتۆر مستەفا شوکاک». دەیزانی ناتوانێت تا هەتاهەتایە ژنی ئەم پیاوە بێت. بە هێمنییەکەوە کە پتر دەست لەرزین و نائارامییە ناوەکییەکەی ئاشکرادەکرد دەرمانەکەی نایە سەر ئەو تیمارپێچە سپییە و بە ئەسپایی هێنای بە برینێکی سەر کەلەکەی نزاردا. بە ئەنقەست وای کرد سەری پەنجەی بەر پێستی بکەوێت و هەست بە یەکەم مەلمەسی لەشی بکات. دکتۆر دەستی گرت و گووتی «ئاگاداربە بە هێمنی، نابێت تەقەڵەکان بجوڵێن... زۆر لە سەرخۆ، بۆ ئەوەیە برینەکە هەو نەکات و میکرۆب نەیگرێت... دەبینیت. گیانی من دەبوو تۆ دکتۆر بوویتایە». نزار بەردەوام سەیری خانمی ماردینی دەکرد، ئەو جارە کەمانەی کە هۆشی دەچووەوە لای دکتۆر بۆ ئەوە بوو گوێی لێبێت چی بە ژنەکەی دەڵێت. ڕاستە نەغەدە دەموچاوێکی شکۆدار و لەخۆبایی هەبوو، بەڵام نزار بە جوڵەی پەنجە و ئەو هەستە نهێنییەی ناو چاویدا هەستیکرد

لەو ژنانەیە کە لەم عاسی نابن. دکتۆر بەدەم سەیرکردن و دەرمانکردنی برینەکانییەوە گوتی «عەفوومکە کاک نزار، بەڵام حەزمدەکرد بزانم بۆ وەها بریندار بوویت. ئەوەی لێیداویت بەقینەوە چەقۆکەی کێشاوە، زۆر بەقینەوە». «دەکرا بمردمایە... دەکرا بمردمایە، وانییە؟ مردن لە موو نزیکتر بوو لێم... لە موو نزیکتر. من زۆر جار وەها لە مردن نزیک بوومەتەوە، هەواکەیم بەرکەوتووە. هەوای مردن، هەوایەکی قایم و ساردە» هەستیکرد ناتوانێت زۆر قسەبکات، بەڵام نەغەدە گوتی «هەستت بە چی کرد، کە مردن وا لێت نزیکبوو... یەعنی ترسایت». دەنگی خۆی ترس و لەرینەوەیەکی وەها سەیری تێدا بوو، وەک ئەوەی یەکەمجاربێت لەگەڵ پیاوێکدا قسەبکات. نزار هەستی بە فێنکی سەر پەنجەکانی کرد و بە هێمنییەکەوە کە پتر بە کاریگەری لاوازیی بوو، گوتی «نا کاتی ئەوەم نەبوو بترسم. گەر مرۆڤ لە تورەییدا بیکوژن، هەست بە مردن ناکات... بە جۆرێک تورە بووم، درەنگ هەستم بە خۆم کرد، کە هەستیشم پێکرد دەمودەست بێهۆش بووم». دکتۆر شوکاک دوا پەڕۆی پزیشکی بۆ گۆڕی و گوتی «برینەکانت گەورەن، تا سبەی مەجوڵێ... دەبێت یەکێک کۆمەکتبکات هەستیتە سەر پێ. دایکم و بابم هێشتا بە جۆرێک پیر نەبوون نەتوانن کۆمەکتبکەن، ئەوان لێرەن، کەم بخۆ بۆ ئەوەی زۆر پێویستت بە تەوالێت نەبێت و فشار نەچێتە سەر برینەکانت. گەر سبەی نەهاتم، بە نەغەدەدا هەندێک دەرمانی ترت بۆ دەنێرم...».

کە نەغەدە لەگەڵ دکتۆری مێردیدا ژوورەکەی بەجێهێشت، خەیاڵی تەنیا لای نزار ئیدریس بوو، ئەو پیاوەی بۆنی دنیایەکی تری لێدەهات، یاخود وەک لە شیعرەکەیدا نوسیبووی «بۆنی دارستانێک کە تەنیا درەختی ڕاستەقینەی تیا سەوزدەبێت». دکتۆر بێئەوەی سەرنجی هیچ شتێکی نائاسایی بدات، بە دەم ڕۆیشتنەوە گوتی «بەستەزمانە خراپ پێکاویانە، گەر زوو نەگەیشتبایەتە خەستەخانە دەمرد... بەڵام مردنی

تێپەڕاندووە، تا سبەی زیاتر تینی تێدەگەڕێت، هەندێ دەرمانی مقەوییم هەیە، سبەی تۆ بۆی بهێنە... خوێنێکی زۆری لەبەر ڕۆیوە، گەر لە خەستەخانە بایە، دەمگووت یەک دوو بوتڵ خوێنی تری بدەنێ. ئێستا دەبێت خواردنی باش بخوات و ئەو دەرمانانە وەربگرێت». دکتۆر هەر بەو تۆنەی کە لەگەڵ کەسوکاری نەخۆشاندا دەدوێت، قسەشی بۆ نەغەدەی ژنی کرد. نەغەدە دڵنیابوو دکتۆری مێردی خووی بەو جۆرە قسانەوە گرتووە. لەو ساتەدا کە ئەو وەک پزیشکێک ڕێنمایی بدات قسەیدەکرد، نەغەدە خەیاڵی لەگەڵ ئەو دەردە ترسناکەی خۆیدا قاڵ بوو، دەردی بەراوردکردنی پیاوان. دکتۆری مێردی خۆی وەک پیاوێک هاتە بەرچاو کە ژیانی لە سەر نەخشەیەکی ڕوون و ڕێک دەڕوات، هەمیشە دەزانێت لە کوێیە و چی دەکات و چی دەڵێت، بەڵام نزار لەو جۆرە کەسانەیە کە هیچ کات نازانیت لە کوێن و چی دەکەن و چارەنوسیان چییە. هەر ژنێکی تر بێت، مستەفای لەو چەشنە سەرەڕۆ و سالوکە پێباشترە، بەڵام ئەم ئارەزوویەکی دڕندە کە لە ناوەوە دەیخوات بەرەو ئەو چەشنەی دووەم دەیبات. هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و لە دڵی خۆیدا گووتی «پیاوی کێوی نەوەک هێمن و لە سەرەخۆ». بە درێژایی کاتی دانیشتنەکەی دکتۆری مێردی باسی شتە ڕۆژانەکانی خەستەخانەی دەکرد، چیرۆکی ئەو تیمارپێچانەی دەگێڕایەوە کە دەرمان لە خەزێنەی خەستەخانە دەدزن، بەڵام نەغەدە تەنیا نزار ئیدریسی لە بەرچاو بوو. پەلەی بوو سبەینێ بێت و بیبینێت.

شەو کە لەگەڵ دکتۆری مێردیدا چوونە جێگاوە و سێکسیانکرد، چەند هەوڵیدا وەک جاران جەستەی لە هەستی جیابکاتەوە، بێئەوەی هیچی پێوە دەربکەوێت بگاتە ئۆرگازم، بەڵام نەیتوانی. لە دواجاردا بۆ ئەوەی سەرنجی دکتۆر ڕانەکێشێت خۆی واپیشاندا کە تەواو بووە. بەڵام درۆیدەکرد. چەند شەو بوو خۆی لە دکتۆر دەدزییەوە، کەچی

ئەمشەو نەیتوانی... دکتۆر لە سەعاتێک بەر لە خەوتنەوە ماچیکرد و پێیگووت «ئەمشەو نامێڵم چۆلەکەکەی خۆم بفڕێت». هەر شەوێک وای بگوتبایە دەبوو لەگەڵیدا بخەوێت. ویستی هەموو شتێک خێرا تێپەڕێت، سەعاتەکان خێرا بسوڕێنەوە، خێرا بخەوێت، خێرا بێهۆش بێت، خێرا مانگ بە سەر زەویدا گوزەربکات، خێرا خۆر لەودیوەوەڕا سەردەربهێنێت، خێرا زەوی بجوڵێتەوە، لە هەموو دەنگێک و ڕەنگێک داببڕێت تا بەیانی دێت و دەچێت بۆ لای نزار ئیدریس. سەیری لێهات کە دکتۆری مێردی وەها دڵپاک و سادە و ناحاڵییە ئەم بەتەنها دەنێرێت بۆ لای ئەو. لە دڵی خۆیدا گووتی نیوەی ژنانی دونیا دەبێت سوپاسی مێردەکانیان بکەن کە خۆشەویستییەکی تریان دەست دەکەوێت، ئیدی من بۆ لەو نیوەیە نەبم. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار چاوی لێکنا و ئەو پرسیارەی لە خۆی کرد «ئایا دەتوانم لە یەک کاتدا لەگەڵ دوو پیاودا بم؟»... بێئەوەی جورئەتی ئەوەی هەبێت بیر لەوەڵامەکەی بکاتەوە، چاوی لێکنا و خەیاڵی خۆی سافکرد و ویستی بخەوێت، بەراستی ویستی بخەوێت، لە بەر هیچ نا، بۆ ئەوەی سبەی بە دەموچاوێکی ماندووەوە نەچێت بۆ لای نزار ئیدریس کە ئەو کات تەنیا ناوی یەکەمی دەزانی.

لەڕۆژی دواتردا کە بەدەرمانەکانەوە گەیشتە لای نزار، هەستێکی ئاڵۆزی هەبوو. لە بەردەرگاکەدا گووتی «خودایە یارمەتیم بە». ئەوە لەو ساتانەیە کە مرۆڤ نازانێت چی ڕوودەدات، نازانێت چی دەکات و بەچی دەرەنجامێکەوە دێتەدەرێ. کە چووە ژوورێ یەکەم شت بەریکەوت ئەو دەنگە گاڵتەکار و سەیرەی نزار بوو کە گووتی «ژنی دکتۆر مستەفا شوکاک... هێی ژنی دکتۆری بەڕێز، ئەزێتتان کێشا، ڕاستییەکەی گەر بمناسیت لە نزیکەوە دەزانی شایەنی ئەو ئەزێتە نیم». نەغەدە سەرەتا تەنیا سەیریکرد، بێدەنگییەکەی تەنیا هی ئەوە بوو کە نەیدەزانی چی بڵێت، بەڵام نزار لە گەنجییەوە شارەزاییەکی قووڵی لەمجۆرە بێدەنگیانەدا

هەیـە، جـۆرە بێدەنگییەکـە پیاوانـی تـر ناتوانـن بیخوێننـەوە، بـەڵام ئـەو دەتوانێـت... بێدەنگییەکـە وەک زۆر لـە پیـاوان تێیدەگـەن ترسـناک نییـە، بەپێچەوانـەوە جۆرێکـە لـە زەمینەسـازی تـا پیـاوەکان ڕۆڵـی ئەبـەدی خۆیـان بگێـڕن، بـەڵام بـەوەدا زۆربـەی پیـاوان لـەوە ترسـنۆکترن ئـەو ڕۆڵـە بگێـڕن، شـتەکان زۆرجـار چـەوت و نابەجـێ دەڕۆن. نـزار دەیزانـی کـە خانمـی ماردینـی گەرچـی ژنـی دکتـۆرە، گەرچـی خوێنـدکاری زانکۆیـە، بـەڵام هێشـتا منداڵێکـە دەترسـێت و پێویسـتی بـە کۆمەکـی ئـەو هەیـە تـا زیاتـر نزیـک ببێتـەوە. ئەمـڕۆ خـۆی بەهێزتـر و کراوەتـر دەبینـی. گەرچـی ژوورەکـەی تاریـک و بێتیشـک بـوو، بـەڵام هەسـتیکرد هاتنـی نەغـەدە هەمـوو شـتەکانی گۆڕیـوە. بـەر لـەوەی نەغـەدە بگاتـە پێشـەوە و دەرمانـەکان دابنێـت، گـووتـی «دڵنیـام جوانـی سـەر بـە خێڵـی کۆمۆنیسـتەکان نییـە... نـا باوەڕناکـەم قـەت جوانـی ئەندامـی حیزبـی شـیوعی بووبێـت». نەغـەدە هێشـتا لەوپـەڕی تـرس و دوودڵـی و شـەرمی خۆیـدا بـوو، هێشـتا لـە هەوڵـی ئـەوەدا بـوو کـە قسـەیکرد ئـەو ترسـە ناوەکییـەی بـە دەنـگ و ڕوخسـارییەوە دەرنەکەوێـت. بێئـەوەی بزانێـت نـزار مەبەسـتی چییـە، بـە شـەرمەوە پرسـی «ببـورە گووتـت چـی؟ تێنەگەیشـتم». بـە زەردەخەنـە ئەهریمەنانەکـەی خۆیـەوە وەڵامیدایـەوە «گووتـم کـە جوانـی بـە عەدالـەت لـە دونیـادا دابـەش نەکـراوە، ڕۆژێکیـش نایـەت جوانـی تێیـدا بـە عەدالـەت دابـەش بێـت... لـە بەرئـەوە جوانـی ناتوانێـت هـەواداری کۆمۆنیسـتەکان بێـت... ناتوانێـت... شـیوعییەکان موڵکداریـی تایبەتـی قەبـووڵ ناکـەن، وانییـە خانـم، شـیوعییەکان شـتی وەهایـان قەبـووڵ نییـە، بـەڵام جوانـی تـا دونیـا دونیایـە وەک موڵکییەتـی خسوسـی دەمێنێتـەوە. مـن کـە دوێنـێ تـۆم بینـی وام بەخەیاڵـدا هـات کـە تـۆ هەرگیـز لـە حیزبـی شـیوعی وەرناگیرێیـت، چونکە لەو موڵکییەتە خسوسـییەدا زۆر زۆرت بـۆ خـۆت بـردوە، تـۆ لـە جوانیـدا سـەرمایەداری، کەپیتالیسـتێکی مەلعونـی. هـا لـە بەرئـەوە باوەڕناکـەم شیوعییەکان تـۆ لە حیزبدا وەربگرن».

نەغـەدە کەمێـک وەسـتا و زەردەخەنەیەکـی گـرت و ئـەو تەنیـا وەڵامـەی دایەوە کە لـەو ساتەدا بەخەیاڵیدا هات «خۆ تۆ شیوعی نییت؟ وا نییە؟ شیوعی نییت؟. بەشی ئەوە وەرمدەگریت دەرمانەکانت بۆ دانێم». نـزار دەیزانی ئـەو وەڵامـە مانـای چـی، هەستیکرد ئێستا هیـچ ئـازار و لاوازییەکـی وەهـای نییـە ڕێگربێـت لـەوەی لەگـەڵ ئـەم ژنـە جوانـەدا غەزەلبازیبـکات، گوتـی «ئەگـەر شـیوعیش بوومایـە ئێسـتا وازمهێنـا بـوو... هـەر ئەمـڕۆ جیابوونـەوەی خـۆم لـە حیـزب دەنوسـی، نامەیەکـم پێدەدان و دەمگووت هـەر ئێسـتا چوومەتـە بـەرەی سـەرمایەدارانەوە». نەغـەدە هەسـتیکرد هەمـوو شتەکان سـووکتر و خێراتـر و خۆشـتر دەڕۆن لـەوەی ئـەو چاوەڕوانیدەکـرد، ئەوەشـی دەگێڕایـەوە بـۆ فەزیلەتـی ئازایەتـی لای ئـەم «پڵنگـە برینـدارە». هەسـتیکرد دەبێـت ئەویـش بەڕسـتەیەکی نـەرم وەڵامبداتـەوە، ڕسـتەیەک نـە ئـەم زۆر ئاشـکرابکات و نـە ئـەو زۆر دووربخاتـەوە. گووتـی «بـۆ وازت لـە حیـزب دەهێنـا. دەبێـت ئەندامێکـی زۆر بـێ عەقیـدە بووبیـت، وا ئاسـان جیادەبوویتـەوە». «ڕاسـتییەکەی مـن قـەت خـاوەن عەقیـدە نەبـووم». نەغـەدە لـەو کاتـەوەی ئـەوی بـە زامـداری بینیبـوو لـە دڵـەوە هەسـتی بـە خۆشـی نەکردبوو، ئێسـتا بـۆ یەکەمجـار بـە دەنگـی بـەرز پێکەنـی، شـێوەی ئەرستۆکراتیانەی جوانییەکـەی لـە کاتـی پێکەنینـدا زیاتـر دەردەکـەوت. کـە نەغـەدە لێـی نزیـک بـووەوە تـا دەرمانەکانـی بـۆ دانێـت، گووتـی «ژنـی دکتـۆر ببـورە، مـن بـە فیتـرەت کەسێکی خراپـم، لـەو ڕۆژەوەی لەدایکبـووم پیاوێکـی بێئەدەبـم... ڕێـزم بـۆ هیـچ شـتێک نییـە لـە خـۆم زیاتـر. شـتێکی ئەوتـۆ نادۆزمـەوە ڕێـزی بگـرم. خـۆم تاکـە شـتێکم کـە دەتوانم ڕێـزی بگـرم. هیـوادارم ڕەفتـاری خراپـم نەتترسێنێت، دواجار لـە بەردەمی ژنی جوانـدا بێئەدەبییەکەم لـە بـری ئـەوەی کەمبـکات، زۆرتـر دەبێـت. چەنـد هەوڵـدەدەم کەسێکی بـە خولـق و تەربییـەت دەربکـەوم، بـۆم ناکرێـت. نازانـم تـۆ وەک ژنـی دکتـۆر هیـچ چارەیەکت لایـە بـۆ مـن؟». نەغـەدە نەیزانـی چـی وەڵامبداتـەوە، دەرمانەکانـی

دانا و کورسییەکی ڕاکێشا و بە زەردەخەنەوە گووتی «کێ دەڵێت، من دەمەوێت پیاوی بێئەدەب چاکبکەمەوە... ها... کێ گووتوێتی». «نا ژنی دکتۆر ببورە... زۆر لە نزیکمەوە دامەنیشە، من گووتم، من کەسێکم ئەمانم نییە گەر ئێستا بریندار نەبوومایە بەس خوا دەیزانی چ بێعەقڵییەکم دەنواند». نەغەدە ئێستا بەشی ئەوە ئازایەتی تێدا بوو بڵێت «من تۆم لە بیمارستان بینی، لە یەکەم جارەوە، لەو کاتەوەی لە سەر عەرەبانەکە بوویت، خوێن وەک فوارە لەبەرت دەڕۆی». کەمێک وەستا و دوای کەمێک بیرکردنەوە گووتی «دواییش لە ساڵۆنی عەمەلیاتەکەدا هەر تۆم بینی، لەوێ تۆم تەواو بە ڕووتی بینی، ڕووت و قووت». دڵنیابوو جورئەتێکی بێوێنەی نواندوە، ئازایەتییەکی کردوە شایستەی خۆیەتی، کچێکی شاعیر و شێت کە دەیەوێت ژیان بە هەموو تاڵی و شیرینییە گەورەکانییەوە تاقیبکاتەوە. نزار دەستیگرت بە چاوییەوە و گووتی «ژنی جەنابی دکتۆر... وای ژنی جەنابی دکتۆر... دەڵێیت چی، من ئێستا نازانم چی بکەم، شەرمبکەم یان شتێکی تر...». نەغەدە لە دڵی خۆیدا پێکەنی و هەر لە نیهاندا گووتی «وای چ ئەکتەرێکی بێشەرەفیت». بێئەوەی گوێبداتە ئەو بەردەوام بوو «تۆ خوێنێکی زۆرت لەبەر دەڕۆیشت. ئەوە یەکەمجار بوو کەسێک ببینم خوێنی لە بەر دەڕوات. من یازدە مانگە ژنی دکتۆر مستەفام... ژنی ئەو پیاوەم، هەتا یەکجاریش نەچووم بۆ خەستەخانە، نا چەند پێیگووتووم وەرە بۆ بیمارستان، وەرە سەرم لێبدە، وەرە سەیری قاوشەکان بکە، وەرە سەیری ژووری ئەشییعەکە بکە، وەرە سەیری نازانم چی بکە... بەڵام من نەچووم... ئەو ڕۆژە ڕۆیشتم و تۆم بینی... ئەوەی منی سەرسامکرد بۆنی خوێنەکەت بوو». نزار تا ئەو کاتە دەستی گرتبوو بە چاوییەوە و گووتی «ژنی دکتۆر... ژنی دکتۆر وامەڵێ، وەک قەدەر منی بە تۆ ناساندبێت... وامەڵێ. قەدەر لە شتی خراپ زیاتر هیچ نانێرێت، بە ڕاستیمە گەر قەدەر تۆی ناردوە، کەواتە دەبێت بترسم و بڵێم

دەرمانەکانت هەڵگرە و بڕۆ». نەغەدە دیسانەوە بێئەوەی گوێبگرێت، وەک تێکستێک لە بەر بڵێتەوە، گووتی «ئەوەی سەیر بوو بۆنی خوێنەکەت بوو، کە بۆنی ئەم دنیایەی لێ نەدەهات، من لە سالۆنی عەمەلیاتەکەدا مامەوە و ماوەیەک وەک لە ژێر سیحردا بم، هەر بۆنی خوێنەکەتم کرد.. تۆ یەکەم کەسی بەوجۆرە خوێنی ببینم. ئەو بۆنە منی والێکرد بیر لە هەندێ شت بکەمەوە کە پێشتر بیرم لێ نەدەکردنەوە». نزار بە برینداری ویستی بجوڵێت و گووتی «ژنی دکتۆر گەر خوێنم بۆنی هەبێت. بۆنی جانەوەری لێدێت، بە ڕاستمە. من ئەوەندەم توانا هەیە پێتبڵێم بۆنی جانەوەری لێدێت». ئینجا بەو پێکەنینە شەیتانییەی خۆی پێکەنی و گووتی «مەگەر تۆ حەزت لە جانەوەرە؟». نەغەدە دەرمانەکانی دەرهێنا و گووتی « ئینجا دەبێت پێتبڵێم کە تۆ ئیلهامی شیعرێکیشت بە من بەخشی. من کە تۆم وا بەزامداری بینی شیعرێکم نوسی، بە ناوی بۆنی پڵنگی برینداروە... تکایە ئەوەندەم پێمەڵێ ژنی دکتۆر، من ناوم نەغەدەیە». کە دەرمانەکانی دانا دەبوو زۆر نزیک بێتەوە، لەو ساتەدا نزار دەستی گرت و بەو خەندەیەوە کە زۆر ژنانی لە خشتەدەبرد پرسی «ئەگەر دکتۆرە بەستەزمانەکەی مێردت بزانێت کە من غەزەلبازیت لەگەڵ دەکەم دەڵێت چی؟». نەغەدە بە هێمنی دەستی کێشایەوە و گووتی «دکتۆرە بەستەزمانەکەی مێردم قەت نازانێت کە تۆ غەزەلبازیم لەگەڵ دەکەیت، گەر خۆم پێی نەڵێم». «ئەی ئەگەر من زۆر غەزەلبازی بکەم... بەدکتۆری مێردت دەڵێیت؟». نەغەدە دەیویست شتەکان کەمێک خاوتر بڕۆن، ئێستا ئەو ڕاستە و ڕاست پرسیارێک دەکات، ئاشکرایە وەڵامەکەی لە کوێدا تەواو دەبێت، ژنە شاعیرەکەی ناوی کە پەلەی بوو ژیان بە هەموو گەرمی خۆی بژی، دەیویست یەکسەر بڵێت نا قەت پێی ناڵێم و بچێتە باوەشی ئەم کوڕە شێتە جوانەوە کە بۆنی هیچ لە بۆنی عەتراوی دکتۆری مێردی ناچێت. بەڵام کچە شەرمنەکەی ناخی، نەغەدەی کچی

دکتۆر جەلال، خانمی حەسەب و نەسەب، کە سەعدییە خانی دایکی زۆر لەگەڵیدا ماندووبووە تا فێری ڕەفتاری جوانی بکات، ئەوە پێیگووت، چ شەرمێکە یەکسەر بچیتە باوەشی پیاوێک یەکەمجارە تەواو لە نزیکەوە قسەی لەگەڵدا دەکەیت و دەیبینیت، لە کوێش، لە جێگایەکدا کە خەسووت یەک ژوورە لەو دیوەوە دانیشتوە و دەرگایەکتان لە نێواندایە. بە هێمنی تۆزێک خۆی دوورخستەوە و گووتی «پرسیاری وا مەکە». نزار دڵنیابوو ئەم ژنی دکتۆرە لە هیچ ژنێکی دیکە ناچێت... خۆگۆڕین و قسەکردن و وەڵامدانەوەی جۆرێکی ترە. دڵنیابوو ژنی دکتۆر لە شتێک زۆر وەڕزە، شتێک خۆشی نازانێت چییە. هەموو ئەو ژنانەی بە وردی ناتوانن بزانن لە چی وەڕزن، زووتر لە هەر ژنێکی تر کەویدەبن و دەکەونە داوی کەسانی دییەوە. نەغەدەش لەو ساتانەدا هەستیکرد ئەوەی بیستوویێتی و گووتوویێتی بۆ ئەمڕۆ بەسە... نا، هەرچییەک بێت... چەند شێت بێت... چەند حەزی لە بۆنی دڕندەی ئەم پڵنگە هار و برینداره بێت کە لە سەر ئەم قەرەوێڵە ئاسنە ڕاکشاوە، ناتوانێت لەوە زیاتر بڕوات. حەزیکرد بەر لەوەی بڕوات ماچیبکات، دەست لە سنگە سپییەکەی بدات، بەڵام کەمێک بیریکردەوە و گووتی «نا... نابێت». ئەوە یەکەمجاری بوو لە دڵەوە هەستبکات حەزدەکات پیاوێک ماچبکات، سەیری لێوە گەورەکانی نزاری کرد، بیستبووی ئەو نێرانەی لێویان ئەستوورە دەتوانن باشتر ماچبکەن... بۆ ساتێک خەریک بوو وەرگەڕێت و گەر ماچێکی زۆر بچوکیش بووە ماچیبکات، بەڵام نەیتوانی. هۆیەکی تایبەتی نەبوو ڕێگای لێبگرێت، بەڵام لە دڵی خۆیدا وەک بە یەکێکی تر بڵێت گووتی «ئەمڕۆ نا... ئەمڕۆ نا».

کە لای نزار ئیدریس هاتە دەرەوە، هەستیکرد بەختەوەرترین ژنی دنیایە. یەکەمجار بوو دەیزانی مانای چی لە یەککاتدا هەم شاعیر و هەم ئازا و هەم عاشق بێت.

# من و باڵە گەورەکانم

گەر چیرۆکی باڵەکانی من لە ناو شۆڕشدا بڵاوببوایەتەوە، دەبوو بە بەڵا و کارەساتێکی گەورە بۆم. «هەڤاڵ جەنگیز باڵی هەیە». دڵنیابووم ڕستەیەکی وەها وەک ئاگر بە هەموو تیپ و هێز و بەتالیۆن و لقەکاندا بڵاودەبووەوە و دەبووە مایەی نوکتە و گاڵتەی هەموو دونیا. من خۆشبەختبووم کە کەس باڵەکانی نەدەبینیم. بەڵام ژیان لە تەک جووتێک باڵی نەبینراویشدا هێشتا هەر ئاسان نییە، ڕاستە ئەو باڵانە لە جوڵە و هەستان و دانیشتنندا ڕێگایان لێ نەدەگرتم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا خودی ئەو هەستەی کە دوو باڵ بە پشتمەوەیە، دوو باڵی گەورە کە دەبێت ئاگاداریانبم، ئازاریدەدام. من سەرەتا شەو کە دەخەوتم هەستم بە بوونی شتێک لە ژێر پشتمدا نەدەکرد، باڵەکانم خەونیان تێک نەدەدام. نا، شتی وەهام هەست پێ نەدەکرد، بەڵام دڵنیابووم شتێکی نەبینراو و هەست پێ نەکراو لە پشتمدا هەیە. لەو کاتەوەی هەستم بەدەرکەوتنی ئەو دوو باڵە کردبوو، ئیدی بۆ هەر جێگایەک بچوومایە بەردەوام ئاوێنەیەکم لەگەڵ خۆم دەبرد، ماوە دوای ماوە هەستمدەکرد باڵەکانم بچوک یان گەورە دەبن، هەندێجار تەواو وندەبوون. سەرەتا گووتم ئەو باڵانە باڵی فریشتەیەکی نەبینراون کە بەردەوام لە پشتمەوە دەوەستێت، بەڵام ئاوێنەکان دڵنیایان کردمەوە کە ئەو باڵانە باڵی خۆمن. لەگەڵ ئەو هەستەشدا هەستمکرد کە شتێک ئازار لە پشتمدا دروستدەبێت. ئازارێکی کەم لەو دوو جێگایەدا کە دەشیا باڵەکان لێوەی هاتبێتنە دەرێ، لە هەندێ لە هەڤاڵانم دەپرسی سەیری پشتم بکەن و بزانن هیچ شتێکی سەیر دەبینن، هەندێجار

دوو پەڵـەی سـووریان لـە شـوێن بنجـی باڵەکانـدا دەبینـی و هەندێجاریـش دەیانگـووت شـتێکی نائاسـایی بـەدی ناکـەن، ئـەوەی منـی سەرسـامکردبوو گەورەبـوون و بچوکبوونـەوەی بەردەوامـی ئـەوان بـوو. مـن هەسـتم نەدەکرد کـە ئـەو باڵانـە پەیوەندیـان بـە هیـچ شـتێکەوە هەبێـت، بـەڵام پرسـیار لـە ئەسـڵ و فەسـڵیان وایدەکـرد، بـە دوای هـۆ و هۆکاریانـدا بکەومـە سـۆراغ. دەچوومـە هـەر گوندێـک، دەبوومـە میوانـی مـەلای گونـد و پرسـیاری ئـەوەم دەکـرد ئاخـۆ پێشـتر چیرۆکـی کەسـێکی بیسـتووە بـە سـەری زیندوێتـی باڵـی لێڕوابێـت. هەمـوو مـەلاکان سـووربوون لـە سـەر ئـەوەی شـتی وا ناجایـزە و وێنـەی وا جگـە لـە بەرهەمـی خەیاڵێکـی نەخـۆش زیاتـر، هیچـی تـر نییـە. چونکـە خـودا نگینـی وای هەتـا بـە موحەمەدولموسـتەفاش نەبەخشـیوە، دەمێکیـش ویسـتوێتی ببیـات بـۆ سـەردانی مەلەکـوت، ئـەو کارەی بـە ئەسـپی باڵـدار سـپاردوە، لـە کاتێکـدا بـۆ بـاری تەعـالا ئاسـانتر بـوو، جووتێـک بـاڵ بـە پێغەمبـەری گەورەمـان ببەخشـێت، یـان بـە هێـزی ئیلاهـی ڕاسـتە و ڕاسـت هەڵیکێشـێت بـۆ مەلەکـوت. بـەڵام بـۆ ئـەو کارەی بـە ئەسـپێکی بەسـتەزمان سـپاردوە، ئـەوە حیکمەتـی ئیلاهییـە و تەفسـیری لای ئێمـەی بەنیئادەمانـی کەمفـام نییـە.

بـە گشـتی باڵەکانـم جگـە لـە مەراقێکـی دەرونـی قـووڵ، جگـە لـە دوو دڵییەکـی ناوەکـی گـەورە، کێشـەیەکی ئەوتـۆ گرنگیـان بـۆ دروسـت نەکردبـووم. بەتایبـەت مـن هیـچ دەسـەڵاتێکم بـە سـەریاندا نەبـوو، نەدەمتوانی بیانجوڵێنـم، نەدەمتوانـی هەسـت بـە قورسـاییان بکـەم، نـە دەکـرا دەریانبخەم و نەدەکـرا بیانشـارمەوە.

ڕۆژێـک نیـازم بـوو لەگـەڵ هێزێکـی گـەورەی پێشـمەرگەدا بـەرەو شـار بکەومـە ڕێ، مـن تەنیـا وەک هـاوڕێ لـە تەکیانـدا دەڕۆیشـتم، مـن چـاوە نهێنـی و گەڕۆکەکـەی شـۆڕش بـووم، کـەس بـە دروسـتی نەیدەزانـی چیـم و چ کارەم، لـە بیـرۆی سیاسـی ناویـان نابـووم «موفەتیشـی بـاڵا». ئـەو ڕۆژە

نیازم بوو لە جێگایەکی گونجاودا لە هێزەکە جیاببمەوە و بە ڕێگایەکی نهێنی و تایبەتدا ڕووبکەمە شار. دوو شەو بوو لەگەڵ هێزێکی گەورەی پێشمەرگەدا بەڕێگاوەبووم، وەک هەمیشە دەفتەری تێبینییەکانم بە دەستمەوە بوو و ئەو شتانەم تۆماردەکرد کە دەکەوتنە پێشچاوم. شەوان دوای ماندووبوونێکی زۆر لە کونجی مزگەوتی دێیەکدا خەوم لێدەکەوت، دونیا سارد و ڕوو لە بەفر بوو، لەو جۆرە کاتانەدا بەر سۆبای مزگەوتێکی گەرم لە هەر جێگایەکی دیکەی دونیا خۆشترە، گەرما لەو ساتانەدا ژیان و ئەمانە. من هەمیشە شەوانی بەفر، لە نزیک سۆبای گەرمەوە زۆر قووڵ خەوم لێدەکەوت، لەو جۆرە شەوانەدا پتر دڵنیادەبووم کە بایۆلۆژیای مرۆڤ هێشتا چەندەها گرێ و بەندی بە سروشتی گەورەوە ماوە و هیچ گەشەیەک ناتوانێت ئەو پەیوەستە بە تەواوی بپچڕێنێت. لە بەرئەوە خەوی گەرمی شەوانی سارد سیحرێکی بێوێنەیان لە سەرم هەبوو. خەوم وەها قووڵ بوو، تا ڕۆژی دواتر و نزیکی خۆرهەڵات بە ئاگا نەدەهاتمەوە... بەیانیان کە بەئاگادەهاتم، یەکەم شت سەیری ئاسمانم دەکرد، وەک هەمیشە دەچوومە دەرێ و سەرم بەرەو بەرزایی گەردون بڵنددەکردەوە و دەمڕوانی، ئەو نیگایە ڕوانینی هەمیشەییم بوو لە پوچی دونیا. دواتریش دەگەڕامەوە و دەستم بۆ دەفتەرەکەم دەبرد. ئەو ڕۆژە کە بەڕێگاوە بووم بۆ شار، دەفتەرم دەرهێنا تا دووبارە سەیری ئەو شتانە بکەمەوە کە دوێنێ شەو نوسیبووم، پەڕەیەکی نامۆ کەوتە بەردەستم، یەکێک لە سەر کاغەزێکی سپی و بە خەتێکی گەورە و پان، کە هەر لە دەفتەرەکەی منی کردبووەوە نوسیبووی: «باڵەکانت دەبینم». ئەوە تووشی ڕاچلەکانێکی قووڵی کردم. ئەوانەی لە تەنیشتمەوە خەوتبوون هیچیان ئەوەیان پێوەدیار نەبوو لە چیرۆکی وەها ئاگاداربن. بەڵام من لە هەموویان بە گومان بووم. چیرۆکی باڵەکانم تا ئەو ساتە نهێنیتر و تایبەتیترین چیرۆکی من بوو، لە ماوەی زیاد لە ساڵێکدا

هیچ مەخلوقێک باڵەکانی منی نەبینیبوو، وایان لێهاتبوو وەک تەنێکی بێسوود و بێمانا سەیرمدەکردن، ئێستا لە ناکاو یەکێک لە ڕیزی ئەم پێشمەرگانەدا دێت و دەیانبینێت. چەند جارێک سەیری کاغەزەکەم کردەوە، دڵنیابووم ڕستەیەکی سادە و ڕێکەوت نییە. ئێستا دڵنیابووم کەسانێک هەن باڵەکانم دەبینن. بەڵام کێن... کێن؟. ئەوە پرسیارێک بوو وەڵامدانەوەی لەو کاتەدا ئەستەم بوو.

دواتریش نەمزانی کێ ئەو دوو وشەیەی بۆ نوسیوم... ئەوە سەرەتای هەموو سەرەتاکان بوو، ڕۆژی یەکەمی بەریەککەوتنی من و ئەو کەسانە بوو کە دەیانتوانی باڵەکانمان ببینن.

# پەیوەندییەکی نهێنی... بە ئاشکرا

دوای ئەوەی نزار ئیدریس لە بیمارستان هەڵهات، لیڤیتانت بە پێچەوانەی چاوەڕوانی هەمووانەوە، ڕاستە و ڕاست دەستی بۆ کاری تۆڵە نەبرد. دەبێت بڵێم، ئەو هەر لە سەرەتاوە بە عەقڵی یاریکەرێکی دووربین ئیشیدەکرد. دڵنیابوو شارەکە لەو شارانە نییە بە تەنیا بە دەست یەک هێزەوە بێت. شار هەیە بە جۆرێک هێمن و مردووە، هەر هێزێک هات دەچێتە ژێر سایەی و هەر دەستێک باڵابوو دەچێتە ژێر سێبەری. بەڵام ئەم شارە نا، ئەم شارە شتێکی دیکەیە، هیچ دەسەڵاتێک تێیدا پشوو نادات، بۆ هەموو هێزێک دژێک و بۆ هەموو پادشایەک نەیارێکی هەیە. لە سەرەتادا کە بەعسییەکان هێزیان دایە، هیچ خولیایەکی ڕاستەقینە لە سەریدا نەبوو ئەوە نەبێت بیسەلمێنێت دەتوانێت چەند بەهێزبێت. لە هەموو گەڕەکەکاندا لەو گەنجە بێدەروەستانەی دەیانەویست وەک ئەو بەهێز و دیار بن هێزی بچوکی دروستکرد. هەندێجار بە جلی سەربازیی

و هەندێجاریش بە بەرگی مەدەنییەوە لە ناوەڕاستی شاردا دەردەکەوت، لە سەر سوچەکاندا دەوەستا، بەردەوام چاویلکەیەکی ڕەشی لە چاودا بوو، جگەرەیەکی بە دەستەوە بوو، بێ هیچ وادەیەکی پێشوەخت لە چێشتخانە جیاوازەکان و لە بەر جگەرچییەکان و لە گوزەری زەڕەنگەران و لە ناو کۆنەفرۆشەکاندا دەوەستا، مەفرەزە تایبەتییەکەی خۆی لە نزیکەوە بڵاودەکردەوە و تەماشایدەکرد. زۆرجار ماوەی درێژ لە یەک جێگادا دەمایەوە و هیچی نەدەکرد، جگەرەی دەکێشا و تەنیا کاری تەماشای ڕێبواران بوو، جارجار لە ناکاو بێ هیچ هۆیەکی تایبەتی، نێچیرێکی هەڵدەبژارد و فەرمانیدەدا لێیبدەن و سوار پیکابەکەی بکەن و بیبەن، ئەگەر وانەبایە کەس هەستی بە مەترسی ئەو نەدەکرد. لەو ماوەیەدا دۆستایەتی تایبەتی لەگەڵ هەندێ سەرتاش و کەبابچی و بەرگدرووداو پەیداکردبوو، نەماندەزانی ئەوانەی بەوجۆرە دۆستایەتیدەکەن، بە ڕاستی بوونەتە هەڤاڵی یاخود لە ڕووی ناچاری و ترسەوە دەرگای بۆ دەخەنە سەر پشت. بەتایبەت هەموو دەیانزانی کە کەسێک نییە شوێنی متمانەبێت و کار بۆ دۆستی خۆی بکات. تا کۆتایی پاییزی ساڵی حەفتاوشەشیش نەماندەزانی کە جگە لەوەی کار بۆ دەوڵەت دەکات، وەک کرێگرتەیەکیش دەتوانیت بە پارەی زۆر بۆ خۆتی بەکرێ بگریت. وردە وردە دەرکەوت کە لیڤیتانت کەسێکە بۆ کرین... کەسێکە دەتوانیت مامەڵە و سەودای لەگەڵ بکەیت و کارت بۆ بکات. من وا هەستدەکەم لەو سەردەمەدا لیڤیتانت هێدی هێدی گرنگی ئیشەکەی خۆی بۆ دەرکەوتووە، دەسەڵاتیش چەکێکە مرۆڤ ماوەیەکی دەوێت تا دەتوانێت تێبگات چ توانا و ئەگەر و ئاسۆیەکی لە خۆگرتووە. لیڤیتانت وەک منداڵێک تادەهات زیاتر ئەو خۆشی و گەمانەی دەدۆزییەوە کە دەسەڵات پێیدەبەخشی، بەڵام هەمیشە گەورەترین خۆشی ئازاردانی ئەوانی دی بوو. تەنیا لەو ساتانەدا هەستی بە بوونی خۆی دەکرد کە ئەوانی دی بە لاوازیی دەبینی، لەزەتی لەوە نەدەبینی ئەوان ئازار

دەچێژن، بەڵکو لەزەتی لەوە دەبینی کە دەشێت ئەم بیانبەزێنێت، وایان لێبکات وەک ئەوەی ئازادی و مردنیان بە دەست ئەم بێت. خۆشییەکی نهێنی و تایبەتی لەوەدا هەست پێدەکرد ئازادی و مردنی ئەوانی دی بخاتە بندەستی خۆی. لەو کەسە دەگمەنانە بوو کە بەردەوام لە خولیای تاقیکردنەوەی هێزی خۆیاندان، لەو پیاوانەی پرسیارێکی ترسناک لە دڵیاندا سەرهەڵدەدات «من چی دەتوانم؟»، باوەڕیشیان بە هیچ هێزێک نییە گەر بە ڕاستی نەگاتە سەر گۆشت و خوێنی خەڵکی تر. بەڵام دەشیزانی لە شارێکی وەهادا کە گەلێک هێزی ترسناک لە هەناویدا خەوتووە، گەلێک جانەوەری سڕ لە ژێرزەمینەکانیدایە، مەخلوقاتی دیکەی ترسناکی وەک ئەم لە کوچە و شەقامەکاندا بەڕێوەن. لە شاری وەهادا کە ژمارەی تارماییەکان لە ژمارەی ئادەمیزاد زۆرترن، هێشتا هیچ کەس ژێرزەمین و کوچە تاریک و نیوە نەبینراوەکەی بە تەواویی ناناسێت و نەیپشکنیوە... لە شارێکدا هەم مەغروورە و هەم بریندار... لە شاری وەهادا کەس ناتوانێت بەراستی هێزی خۆی تاقیبکاتەوە. ڕۆژانێکی زۆر کە بە چاویلکە ڕەش و جلە بەڵەک و باڵا بەرزەکەیەوە دەوەستا و سەیری خەڵکی دەکرد، سەیری هێزە بچوکەکەی خۆی دەکرد، خەیاڵی لای یەک شت بوو، چۆن هەمیشە بەهێز بێت؟ چۆن ئاڵوگۆڕی دونیا لە دەسەڵات و ترس و توانای کەم نەکەنەوە. ڕۆژێک جگەرچییەک پێیگووت «کوڕم، گەر خەڵک زۆر وەترسێنی، ڕۆژێ دێ لێو ناترسن. ترس وەکی خوێ وایە، ئەبێ کەم کەم ویکەیتە خواردنۆ، گەر زۆرت تێکر ئیتر وەکەڵک نامێنێ و وە کەس ناخورێ». ئەو ڕۆژە کە زانی نزار ئیدریس لە بیمارستان ڕایکردوە، بە پێچەوانەی چاوەڕوانی هەموانەوە، شتێکی ئەوتۆی نەکرد. چووە بیمارستان بۆ لای دکتۆر جەلال و لە ناوەڕاستی بیرۆکەیدا وەستا و سڵاوێکی بەڕێزانەی کرد و بە هێمنی تەوقەیەکی لەگەڵ دکتۆردا کرد و گووتی «ببورە جەنابی دکتۆر بەمجۆرە لە کاتیشت دەگرم، هاتووم یەک

شتت پێبڵێم، من دڵنیام نزار ئیدریس بە دەستی هەندێک کەسی ئێوە لە خەستەخانە هەڵهاتووە، ئەمە دووەم جارێتی لە من هەڵدێت، بەڵام نامەوێت ڕێز و حورمەتی دکتۆرەکان و خەستەخانەکە بشکێت، لە بەرئەوە بڕیارمدا ئیجرائات نەکەم. هیچ شتێک نەڵێم و نەکەم مایەی نیگەرانی ئێوەبێت. بزانە ئەوە ئەمری حیزبیش نییە، بەڵکو بڕیاری خۆمە». چۆن بە تەنیا و بە هێمنی هاتبووە ژووری، بە هەمان شێوە، هاوڕێ لەگەڵ دەنگی تەقەی پۆستاڵەکانیدا لە بیمارستان چووە دەرێ. جگەرچییە پیرەکەی هاوڕێی پێیگووتبوو «بۆ ئەوەی بیبەیتۆ، دەبێ وەزانی دەسەڵات هەر تێکوتە و تێورە نییە، هەر قۆڵوایان نییە، ئەوێ عالەمەکە تێوەگا لەوەی دەروخستووە زۆرترت ها پێ.. هەر کات چی و هەس وەکاروهێنا، جا برا دوای ئەوە بە دەردی هیچ ناخۆی... حیکمەتی حاکم هالەوا، بە تۆوی کەم دەغڵی زۆر بدرووێتۆ».

لە بیرکردنەوە دووروودرێژ و لە توڕەبوونە بەردەوام و لە دڵتەنگییە قووڵەکەی خۆیدا، زوو گەیشتە ئەو جێگایەی بروابکات دەسەڵات دەکرێت ئامێرێکی فرەکار و فرە بەرهەم بێت... دەسەڵات ئەوەیە تۆ خۆت لەزەت وەربگریت و ئەوانی دی ئازار بکێشن، بەڵام نە بە جۆرێک لە لەزەتدا نوقمبیت بخنکێیت، نە کۆیلەکەی ژێر قاچیشت بە جۆرێک ئازار بدەیت، بمرێت یاخود ڕاپەڕێت.

شەوان کە دەگەڕایەوە بۆ لای خوشکەکەی، دەچووە ژوورە ڕەشەکەی خۆی، دەستێک جلی خەوی لە بەردەکرد و بە هێمنی، وەک منداڵێکی نەخۆش خۆی لە سەر قەرەوێڵەکەی گرمۆڵە دەکرد. خوشکی هەموو شەوێک بە هێمنی دەهات و بە پۆپەشمینێکی ڕەش دایدەپۆشی. لەگەڵ هەموو مۆنی و بێدەنگی و خراپیدا.. لەگەڵ هەموو نۆبەتە بەردەوام و ترسناکەکانی توڕەییدا، لەگەڵ شت شکاندنە بەردەوامەکانیدا، لەگەڵ بێزاری بەردەوامیدا، لەگەڵ ئەوەی منداڵە بچوکەکانی ئەوی لە دنیایەکی

ترسناکەوە ئالاَندبوو، بەلاَم ئەو هێشتا وەک خوشکێکی دلسۆز و بێدەنگ خزمەتیدەکرد. دونیا بچکۆلە و سنوردارەکەی لەو ژوورە بچوکەی ماڵی خوشکیدا جودا بوو لە دونیای ڕاستەقینەی خۆی لە دەرەوە، دونیای کەسێک بەدوای دەسەلاَتێکی گەورەدا دەگەڕێت. لەو ژوورەدا، لەو گەڕەکە بچوک و کۆلاَنە سادە و تەسکەدا هەستی بە دوورکەوتنەوەیەکی گەورە لە خۆی دەکرد، ئەم دنیا ناچیز و هەژار و بێشکۆیە ئیتر دونیای ئەو نەبوو. من دەمناسی لیڤیتانت لەو کەسانە نەبوو بتوانێت لە خۆی دووربکەوێتەوە. من لە زیندانی پسمامانەوە ئەو هەستەم لادروستبوو، کەسێکە بۆ شکۆیەکی گەورە دەگەڕێت. ئەو دەم زۆر گەنج بوو، توانای لە سەر هاتنە دەرەوە لە دیوارەکانی خودی خۆی گەورەتر بوو، بەلاَم دوای گەڕانەوەی بۆ شار، دوای بوونی بە ئەندام لە حیزبی فاشیستەکاندا، توانای دوورکەوتنەوەی لە خۆی تا دەهات بچوک و بچوکتر دەبووەوە. خواستێکی گەورەی هەبوو هەمیشە دیاربێت، هەمیشە لە ڕیزی هەرە بەهێزەکاندا بێت. کە لە جێگایەکدا دەشکا، بە پێچەوانەی هەر مرۆڤێکی دیکەوە پاشەکشەی نەدەکرد بۆ دواوە، بەڵکو بە جۆرێکی زیرەکانە، بە مەکرێکی بێوێنە و بە توانایەکی تەکنیکی بەرچاوەوە لە یاریکردندا هەنگاوێک دەچووە پێشێ... هەمیشە دەیویست ئەوە بێت کە خۆی دەیەوێت و ئاواتی پێدەخوازێت. جارێکیان لە سەر گەمەیەکی دامە قسەم لەگەڵدا کرد «کە من دوای ڕاپەڕین زۆر خەیاڵم نابووە سەر». بێباکانە پێیگووتم «یارییەکی بێمانایە... چونکە داشەکان ناتوانن ڕەنگی خۆیان بگۆڕن». باوەڕی وابوو تاکە یاریی ڕاستەقینە لە دونیادا سیاسەتە، چونکە بەس لە سیاسەتدا مرۆڤ دەتوانێت لە یەککاتدا لە دوو تیپی دوژمندا یاریبکات. بەلاَم ئەو دەم ژوورە بچوکەکەی ماڵی خوشکی ئازاری دەدا، هەستیدەکرد دونیای خۆی لەوە گەورەترە لەم ژوورە بچوکەی مەهتابدا جێگای ببێتەوە، هەڵبەت شوێنی دیکەی لە خەیاڵ بوو، بەلاَم بەر لە هەر شت بیری

لە ئەمان و دڵنیایی دەکردەوە. دەیتوانی لە «فەرع» یان لە ئوتێلێک بخەوێت، بەڵام ئەوانەش لەگەڵ خەونەکانیدا نەدەگونجان. دروست نازانم کەی، بەڵام ساتێک لە ساتەکان بڕیاریدابوو چێژ لە دەسەڵات ببینێت. لە سەردەمی پسماماندا گەورەترین چێژی ئەوە بوو، هەستبکات لەشی یەکەیەکەی زیندانییەکان موڵکی ئەون، ئەوانەی دەبوونە دیلی ئەو وەک شتێکی تایبەتی خۆی سەیریدەکردن، ئێستا زۆر شتی دیکەشی وەک موڵکی تایبەتی خۆی سەیردەکرد. ڕۆژانێک کە بە خۆی و مەفرەزەکەیەوە بە کۆڵانەکاندا دەڕۆیشت، وایدەزانی ئەو شەقام و کۆڵانانە موڵکدارێکیان نییە ئەو نەبێت. کێ موڵکداری ڕاستەقینەیانە؟ سوپا و ئەفسەرەکانی کە وەک حوشتری گێژ لە پایگاکانی خۆیاندا خەوتوون؟ شارەوانی؟ کە بەڕێوەبەرەکەی لە بەردەم هەر پۆلیسێکی عەرەبدا میزدەکات بە خۆیدا. پارێزگار؟ کە هەرگیز جارێکیش ئەم کوچە و گەڕەکانەی نەبینیوە. بۆ ئەوەی دڵنیابێت کە ئەم شارە موڵکی خۆیەتی، ئەم کوچانە جگە لەو خاوەندارێکی دییان نییە، هەندێجار مەفرەزەکەی خۆی لە ئوتومبێلەکە دادەگرت و بەپێ بە خۆی و چەکدارەکانییەوە بە کۆڵاناندا دەگەڕا. هەندێجار ڕێکەوتیدەکرد لە دەرگایماڵی خەڵکی دەدا و بە ئەدەبەوە داوای ئاوی بۆ خۆی و هاوڕێکانی دەکرد، ڕقێکی تایبەتی لەو گەنجانەبوو کە بۆ کچبازی دەسوڕانەوە. مەبەستێکی نەبوو ئەخلاقی کەس بپارێزێت، بەڵام نەدەبوو کەس بوونی لیڤیتانت لەبیربکات. ئەو کات هێشتا خاوەنی زیندانی خۆی نەبوو، بەعسییەکان بواریان نەدەدا بچێتە ژوورەکانی تەحقیق و ژێرزەمینە تاریکەکانی دەزگای ئاسایش، دەیزانی لەم سەرجادانە زیاتر جێگایەکی نییە تێیدا هێزی خۆی تاقیبکاتەوە. وەک هەر دڵێکی پڕ فریو و مەکرباز، لەو نێچیرانەوە دەستی پێکرد کە هەمووان بە نەفرەتیاندەکەن «مێبازەکان»، دواتریش «سەرخۆش و کحولییەکان». کە مەفرەزەکەی دەسوڕانەوە بەردەوام دەیگووت دەیەوێت ئەو پیاو و گەنجانە بترسێنێت

کە شەرەفی خەڵکی شارەکە بە هەند وەرناگرن. هەندێجار کە گەنجانی دەپشکنی، پتر بۆ نامەی دڵداری دەگەڕا نەوەک بۆ کتێبی سیاسی. ساڵانێک دواتر لە ئەلبومێکی گەورەدا هەموو ئەو نامە دڵداریانەی پیشاندام کە لەو سەردەمەدا لە گەنجانی سەندبوو. ئەو ئەلبومەی بە یەکێک لە شتە گرنگەکانی ژیانی خۆی دەزانی. دیارە مەفرەزەکەی خۆی پڕبوو لە گەنجی چاوباز و بەدەردی ژن ئالودە، بەڵام تا لەگەڵ ئەودا بوونایە دەبوو هەموو ڕێورەسمێکی عورف و ئەخلاق ڕەچاوبکەن. گەرچی خەڵک ڕقیان لە جلە سەربازییەکانیان بوو، بەڵام ئەوەی لیڤیتانت ژنبازەکانی دەردەکرد و سەرخۆشەکانی سزا دەدا، جێگای ستایشی ئەو پیاوانە بوو کە دین و ئابڕوویان لا موقەدەس بوو. شەرەفپەرستان و ئابڕووپارێزان و پیاوانی سوننەتی ستایشیاندەکرد. جوانی خۆشی هۆیەک بوو هەندێک ژن سەرسەختانە بەرگری لێبکەن. هەتا هەندێک پێیانوابوو ئەوەی لیڤیتانت دەیکات و لەگەڵ بەعسییەکان کاردەکات، تەنیا ڕێگا و باشترین ڕێگایە میللەتەکە سەرلەبەر نەفەوتێت و بەرەو باشوور ڕانەگوێزرێت. دواجار لیڤیتانت کەسێک بوو دەیتوانی لە نێوان وێنەی «بەهێزێکی بەڕێز» و «بەهێزێکی دڕندە و ترسناک» دا جۆلانێبکات.

لە چەند مانگی دوای هەرەسی ساڵی حەفتاوپێنجدا، سەرەتاکانی ئەو کینە قووڵەی بەرامبەر مارکسییەکان و کتێبەکانیان تیادەرکەوت... ئەو سەردەمێکیش کە زۆر گەنج بوو، کاتێک چووە ناو ڕیزەکانی پارتی دیموکراتەوە تا خۆی وەک سەربازێکی بارزانی تۆماربکات، ڕقی گەورەی لە شیوعییەکان بوو. ژیانی سیاسی خۆی لەو جێگایەوە دەست پێکردبوو، بچێتە لاوانی حیزبەوە و ئێواران بە گروپ دەرچن بۆ ڕاونان و لێدانی ئەم شیوعییە خائینانە. ئێستا کە بیر لەو ڕۆژگارانە دەکاتەوە، گاڵتەی بە وشەی خیانەت دێت، بەڵام هەر وەک جاران ڕقی لە شیوعییەکانە. لە سەرەتای حەفتاکانەوە کە وەک پێشمەرگە چووە

شاخ، بەو ڕقەوە چوو کە ئەم لینینیستانە گەورەترین دوژمنی ئەون. نا لیڤیتانت دوژمنانی خەڵک و مرۆڤایەتی لا گرنگ نەبوو، تەنیا دوژمنی تایبەتی خۆی دەناسی. هەموو شتێک و هەموو کەسێک دەبوو سەرەتا ببنە دوژمنی شەخسی خۆی تا بتوانێت وەک دوژمن سەیریانبکات. شیوعییەکان هەمیشە دوژمنی تایبەتی ئەو بوون. لەدوای بەهاری غەمگینی حەفتاوپێنج کە هەموو شتێک ڕوو لە کۆتایی دیاربوو، ئەو مەترسی مارکسییەکانی لە دوورەوە بۆندەکرد. لەگەڵ ڕەفیقەکانیدا لە حیزبدا کە کۆدەبووەوە، تەنیا چاوی لە سەر شیوعییەکان بوو. لەو سەردەمەشەوە ڕقێکی تایبەتی لە کتێب و نوسەران هەستا و تا ئەمڕۆش ئەو ڕقە لە دڵیدا زیندووە و وەکو خۆی دەژی... ڕقی لیڤیتانت لە شیوعییەکان وایکرد مەفرەزە تایبەتییەکانی فێری گەڕان بەدوای کتێبدا بکات، سەرەتا بەر لەوەی مارکسییەکان ببنە پێشەنگی شەڕکەران دژی دەوڵەت، دەچووە هەر ماڵێک گەر کتێبی مارکسییان هەبایە بە ڕێزێکی زۆرەوە لە کتێبخانەکە دەریدەهێنان و دەیبردن و دواتر دەیسووتاندن. سەرەتا نەمانبیستبوو کە خەڵک لە سەر کتێب ئازاربدات، بەڵام سالانی دواتر، ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر ڕقی لە کتێب دەبوو. پتر ئازاری ئەوانەی دەدا کە کتێبی پێدەگرتن. هەر ئەو ڕقەشی گەیاندی بە یەکێک لە ئاواتە گەورەکانی کە دۆزینەوەی نزار بوو. ئەو ڕقەی وایدەکرد لە هەر شتێک زیاتر ڕقی لە کتێبفرۆشان بێت. لای لیڤیتانت کتێبفرۆشان بوونەوەرێکی ترسناک بوون، مرۆڤ بەدروستی نازانێت سەر بە چ دونیایەکن، ئایا سەر بە دونیای بازاڕن یاخود سەر بە دونیای کتێبخوێن و ڕۆشنفیکرانن، کاسبێکن وەک هەر کاسبێکی دیکە یان خەڵکی زانستبازن و بەشێکن لە پلانێکی گەردونی بۆ سەرخستنی زانستپەروەران بە سەر کەسانی وەک ئەودا، ئاخۆ نوێنەری پارەن لە دونیای وشەدا، یان نوێنەری وشەن لە دونیای پارەدا؟. لیڤیتانت نەیدەتوانی وەڵامی تەواوی ئەو پرسیارانە

بداتـەوە، بەڵام گومانـی لـە هەموویـان هەبـوو. گومانـی لـەو نیگایانەیـان بـوو کـە لـە ژێـر چاویلکـەوە لێیاندەگـرت، بینینـی دەسـت و ڕەفتـار و جوڵەیـان کاتێـک نزیـک ڕەفـەکان بـۆ کتێبێـک دەگـەڕان نیگەرانیاندەکـرد. دەیزانـی کتێبفرۆشـان خۆشـیان کەسـانێکن باوەڕیـان بـە خوێنـەر، بـە نوسـەر، بـە کتێبفرۆشـانی تـر نییـە، هەمیشـەش لـە شـەڕێکی نهێنیـدان لەگـەڵ هەموویانـدا. لـەو زەمەنـەوە هەسـتیکرد بۆنـی کتێـب نەفریـن و تووڕەییەکـی تایبەتـی تیـا دروسـتدەکات، ترسـی شـتێک کـە ناگیرێـت، کۆنتـرۆڵ ناکرێـت، ناخرێتـە ژێـر دەسـەڵاتی ئـەوەوە. کتێـب وەک شـتێک گـەر بشسـووتێت نامرێـت. هەندێجـار کـە لـە سـەر سوچەکاندا دەوەسـتا فەنتازیاکانـی بـەرەو ئەوەیـان دەبـرد، بیـر لـە هاوپەیمانییەکـی گـەورە بکاتـەوە، لـە دامەزراندنـی تۆڕێـک لـە سەرتاسـەری زەویـدا لـە دوژمنانـی کتێـب، کەسـانێکی نـازا کـە هەمـوو چاپخانەکانـی دونیـا بسـووتێنن و خەڵـک لـەم تاعوونـە ترسـناکە ڕزگاربکـەن کـە نـاوی کتێبـە. لـە کۆتایـی پاییـزی سـاڵی حەفتاوپێنجـدا ئێوارەیەکـی زۆر سـارد، بـۆ یەکەمجـار چـووە چایخانـەی «میکـۆ»، ئـەو چایخانـە بچوکـەی دەگووتـرا نوسـەرانی تێـدا کۆدەبنـەوە. بـە قیافەیەکـی سـەربازیی تـەواوەوە لـەوێ دانیشـت. چـا لـە سـەر چـا داوایدەکـرد و هیـچ شـتێکی نەدەکـرد، دەیزانـی هەمـوو بەتـرس و گومانـەوە سـەیریدەکەن، دەیزانـی یـەک یـەک هەڵدەسـتن و دەڕۆن. هەسـتیکرد دەتوانێـت بـە بـۆن ئـەو کەسـانە بناسـێتەوە کـە سـەروکاریان لەگـەڵ کتێبـدا هەیـە. بـە پێچەوانـەی هـەر مرۆڤێکـی دیکـەوە کـە کتێبێـک دەگـرن بـە دەسـتیانەوە و یەکەمجـار سـەیری بەرگەکـەی و ناونیشـانەکەی و فەهرەسـتەکەی دەکـەن، ئـەو هـەر کتێبێکـی دەگـرت بـە دەسـتییەوە یەکەمجـار بۆنیدەکـرد. تەنیـا بۆنـی کتێـب سـەرنجی ڕادەکێشـا... بۆنـی دونیایەکـی لێدەهـات کـە دونیـای ئـەو نییـە، سـەرزەمینێکی دوور، ئادەمیزادانێـک بـە هێـزی ئـەو ڕاوناکرێـن. یەکەم نوسـەر لـە ژیانیـدا بیگرێـت، لـە بـەردەم چایخانـەی میکـۆدا بـوو، لـە بەرئـەوە نەیگرت

کە شتێکی تایبەتی کردبێت، بەڵکو لە بەرئەوەی بۆنی کتێبی لێدەهات. ئەوکات هەر کەسێکی بگرتبایە دەبوو تەسلیمی ئاسایشە عەرەبەکانی مودیرییەتی بکات، ئەوانەی بێهۆیەکی دیاریکراو دەیگرتن و نەیدەویست بیانداتە دەست ئاسایش، تەنیا چەند سەعاتێک لە ژوورەکەی خۆی لە بنکەی سەرەکی فەرع گلیدەدانەوە. ئەو ڕۆژە بە هەموو هێزی خۆی لەو نوسەرە گەنجەی دا، لەشێکی باریک و بچوکی پێوەبوو، لەوجۆرە جەستە شل و لاوازانەی زوو دەپلیشێنەوە، تەنیا ویستی بزانێت ئەم نوسەرانە چ جۆرە مەخلوقاتێکن، هەستیکرد بوونەوەری هەڵوەشاون، لەشیان لاواز، توانایان کەم، هێزیان لە نزمترین ئاستدایە. بە خۆی گووت لەشیان هیچ نییە، دەتوانیت بە ئاسانی بیانگریت، نەوەک بەهێزنین بەڵکو ترساو، گرینۆک، بەرگەنەگرن. لەگەڵ کینەیدا بەرامبەر نوسەران، هەستی بە جۆرێک سۆز و بەزەیی سەرەتایی لەگەڵ ئەم گەنجە بچوک و تێکشکاوەدا کرد کە هێشتا نەیدەزانی بۆ گیراوە. هەر یەکەمجار کە ئەو گەنجەی بینی تێگەیشت نوسەران قفڵێکیان هەیە بە چەکوش ناشکێت، قفڵێکی گەورە و تایبەتییە، تەنیا بە کلیل دەکرێتەوە، کلیلی زۆر تایبەت. کە نوسەرەکەی بەردا، هەستیکرد تا کتێب زیاتر بڵاوبێتەوە، ئەو زیاتر دەکەوێتە جیهانێکی نەناسراو و غەریبەوە. وایدەزانی کتێب تەنیا شتێکە گەر نەشبێت، ژیان وەکو خۆی دەڕوات. بەڵام بێهۆیەکی دیاریکراو ئەوەندەی ڕقی لە کتێبفرۆشان بوو، ڕقی لە نوسەران نەبوو.

ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر بۆمان دەرکەوت کە کەسێکە دەشێت بکڕدرێت. دەشێت پارە وەربگرێت و هەر شتێکت بوێت ئەنجامی بدات. یەکەم کەس لیڤیتانتی کڕی، مێردێکی نائومێدی گوندەکی بوو کە دەیزانی ژنەکەی ژێر بە ژێر لەگەڵ گەنجێکدا پەیوەندی هەیە، کابرا نەیدەیست ژنەکەی لە دەست بچێت و دەشیویست هەتیوەکەی لە کۆڵبێتەوە. ڕۆژێکیان بیستی

لیڤیتانت دوژمنی ئافرەتبازان و کتێبفرۆشانە، چووە بەردەمی و گووتی «جەنابی مولازم، ئەو گەڕەکەی ئێمە بە دەست هەتیمە دەم ڕووتێکەوە داد و بێدادێتی... فیڕنەگولەیەکە، عەیب نەبێ هەر بە قەد بنە مۆمێک دەبێت و نابێت، ژنی ئەم دەگرێت سواری دەبێت، ژنی ئەو دەگرێت سواری دەبێت، تۆ عیلاجێکمان نەکەیت، مەحفبووینۆ». دوای سەعاتێک قسە و سەودا، لیڤیتانت تێیگەیاند گەر کارێکی وەها بکات، بەرابەری شتی دەوێت. دەبێت بڵێم یەکەم بڕە پارە کە لیڤیتانت وەریگرت، لە پشت تاکسییەکی نوک درێژی ئەو زەمانەوە بوو، لە گەراجە کۆنێکدا، لە ناو بۆنی بەنزینی ڕژاو و ڕەنگی گریسی خەستدا. پارەکە هەشتا دینار بوو، کە بۆ ئەو دەم بە کەم حیساب نەدەکرا. لە هۆی ئەوەدا لیڤیتانت ئەو گەنجەی گرت و بە تۆمەتی دزیکردن رادەستی پۆلیسی کرد و تێشیگەیاند گەر بگەڕێتەوە بۆ کاری وەها، بە کەتەرێک هەم جووتە گوونی و هەم دوو گوێی دەبڕێت و دەیخاتە زەرفێکی نایلۆن و بۆ یاری حەواڵە دەکات.

بەڵام ئەوە سەرەتای کەڵەکەبوونی سامانەکانی لیڤیتانت بوو، سەرەتای سەرەتا بوو.

## هۆشەنگی بولبولیار و گەڕانی بە دوای مانای فریشتەدا

هۆشەنگی بولبولیار چ شتێک لە چیرۆکی مەهدائیل تێنەگەیشت. بۆ ڕۆژی دوایی کە چوو بۆ زانکۆ، بە شەرمێکەوە کە شەرمی کەسێکە خیانەت لە بیروباوەڕەکانی خۆی بکات، بە دەفتەر و کتێبی وانەکانییەوە، چوو بۆ لای «دکتۆر نەزمی» مامۆستای ئەدەبیات. پیرێک کە دەمێ ساڵە سەرقاڵی ئەدەبیاتی دونیایە، پیاوێکی زانا کە تەواوی زانستەکەی لە وانەکانیدا دەخاتەکار، هەم سیحرێک لە شێوازی قسە و هەم قووڵییەک

لە زانستیدا هەیە کە هەمیشە مایەی سەرسامی خوێندکارەکانی بووە. دکتۆر ڕیشێکی سپی هەبوو، کلێتەیەکی سپی گەورەشی دەکردە سەر، بە خۆی و لەشە گەورە و نوشتانەوە و چاویلکە زۆر گەورەکانییەوە لە پادشایەک دەچوو ڕێگای عەرشی لێتێکچووبێت و بە هەڵە خۆی کردبێت بە جێگایەکی گشتیدا. کاتێک بولبولیار چووە ژووری بە گومانێکەوە سەیریکرد، دکتۆر لەوانە نەبوو کەیفی بە کۆمۆنیستەکان بێت، بولبولیاریش لە دەرسدا هەر کات قسەی بکردایە، وەک ئەو کۆمۆنیستانە پرسیار و گفتوگۆی دەکرد کە دکتۆر لە دڵەوە حەزی بە چارەیان نەبوو. جارێک لە وانەدا پێیگووت «ئەدەبیات ڕۆحی فەردەکان و مرۆڤەکانی تێدایە، نەوەک ڕۆحی چینێک یان نەتەوەیەک، ڕۆحی مرۆڤ بە تەنیا لە هەموو ئەوانە گەورەترە». کە بولبولیار دەرکەوت زانی هاتنی پەیوەند بە وانەکانەوە نییە، هەر کات خوێندکارێک شتێکی تایبەتی بیووایە بە چاویدا دەیزانی. لەوەوبەر بولبولیار دوو جاری دی چووبووە تەک دکتۆر و پرسیاری هەندێک کتێب و تێکستی لێکردبوو. دکتۆر نەزمی بێئەوەی لە جێگای خۆی بجوڵێت پێیگووت «ها هۆشەنگ، خزمەتێک هەیە بە من بکرێت». بولبولیار بێ هیچ پێشەکییەک گووتی «دکتۆر من پرسیارێکم هەیە، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ئەدەبیاتەوە نییە، بەڵام لەوانەیە تۆ بتوانیت یارمەتیم بدەیت». دکتۆر بەدەم کۆکردنەوەی هەندێک کتێب و کاغەزی سەر مێزەکەوە، بێئەوەی سەر بەرزبکاتەوە، گووتی «بێژە... بێژە بزانم چی دەپرسیت؟». بولبولیار تفێکی بچوکی قووتدا و وەک ئەوەی دڵنیابێت کە پرسیارەکەی زۆر گەمژانەیە، سەری دانەواند و گووتی «دکتۆر دەمەوێت بزانم... فریشتە چۆن دێن بۆ سەر زەوی؟». دکتۆر کەمێک سەری خوراند و هەستایە سەرپێ، باڵایەکی سەیر بەرزی هەبوو، کە لە هەر شوێنێکدا دەوەستا بەرلەوەی بە کاریزمای زانست و بە سێبەری مەعریفەتی جێگاکە پڕبکات، بەو قیافەتە گەورەیەی شوێنەکەی

داگیردەکرد، لەگەڵ ئەو زلی و گەورەییەدا، گەر بیویستایە دڵی زۆر نەرم و خەندەی گەلێک پڕ میهر بوو. دوو دەستی زۆر زلی هەبوو، هەر کتێبێک چەند گەورەبایە کە دەکەوتە دەستی بچوک دەینواند، لە زستاناندا کە خۆی لە پاڵتۆیەکی توکنی سپیدا دەشاردەوە، بە خۆی و چەترێکەوە خۆی دەکرد بە زانکۆدا، لەو پیاوانە دەچوو کە بینەر لە فیلمەکاندا لەگەڵ گالیسکەی سەگکێشدا لە زەمهەریری بەفر و گێژەڵووکەی قایمدا دەیانبینێت. هاوینانیش کراسەکانی هەمیشە سپی بوون، تووکێکی چڕی سپی لە سەر سنگی دەهاتەدەرێ، کە هیچ کەسێک نەیدەتوانی پاکی و خسوسییەتی نەبینێت، لەبری کلێتە گەورەکەی کاسکێتێکی سپی لە سەر دەکرد، کە دەم و دەست ڕوخساری خانەدانێکی ئەورووپی دەدایە کە بەڕێوەیە بۆ مەیدانێکی گۆڵف. ئەو ڕۆژە کە بولبولیار پرسیاری لێکرد ڕاستە و ڕاست گووتی «ها، کەسێکی ماددی وەک تۆ، کە لەقسەتدا پێدەچێت باوەڕت بە غەیبیات نەبێت، بۆ لە جەوابی وەها دەگەڕێیت؟». بولبولیار بێئەوەی ئەمسەرە و سەر بکات گووتی «ئاخر یەکێکیانم بینیوە، دکتۆر بە ڕاستیمە، من فریشتەیەکم بینیوە». بە کەمێک نیگەرانییەوە سەیریکرد «ئەی بۆ نەتپرسی لە کوێوە هاتوویت؟ بۆ هاتوویت کاتی من دەگریت. ئەوەندە کاتم هەیە؟. عەجایەب، تۆ جەنابی فریشتە لە بەردەمتدا بووە و نەتپرسیوە، ئێستا من چیت بۆ بکەم». بولبولیار گووتی «نا دەمەوێت دڵنیابم، پیاوێکی لە تۆ زیرەکتر ناناسم. دەمەوێت بزانم تۆ دەڵێیت فریشتە هەیە یاخود نا؟». دکتۆر گەڕایەوە سەر جێگاکەی خۆی و گووتی «سەیرکە هۆشەنگ کوڕی خۆم، بەشەر... ها... بەشەر... لە یەکەم ساتەوە کە حیکایەتی دروستکردوە تا ئێستا باس لە فریشتە دەکات، ئەوەتەی مرۆڤ هەیە هەر باس لە فریشتە دەکات، نیگاریان دەکێشێت، فیلمیان لێدروستدەکات، ناوی جیاوازیان لێدەنێت، ڕەش و سپیان لێدەتاشێت. بەڵام هەموویان چیرۆکن...

کەس نەبووە تا ئێستا بیانبینێت. تۆ پێدەچێت شەو باش نەخەوتبیت، پێم بڵێ تۆ کوڕە مەلاو شت نیت؟ تۆ چ دەردتە، ئەمڕۆ لە پۆلدا هەر وەک ڕۆژان دانیشتبوویت، عەیبت نەبوو». «دکتۆر بە راستمە دەمەوێت بزانم تۆ باوەڕت بە فریشتە هەیە یان نا». دکتۆر لە پڕێکدا دەنگی نزمکردەوە و گووتی «بۆ وادەزانیت، من دەتوانم وەڵامی پرسیاری وا بزانم... منت قەت بە یاوەریی فریشتان بینیوە. منت بینیوە لەگەڵ فریشتەیەکدا پیاسەبکەم». «نا دکتۆر، تۆ کتێبخوێنێکی شارەزایت، تۆ دونیا ناسیت. خۆت هەموو جارێک ناڵێیت، مامۆستا شتێکە و دونیاناس شتێکی ترە؟ ناڵێیت مامۆستا پلەیەکی بچوک بچوکی ناو دونیای ماریفەت و زانینە. هەموو جارێ لە پۆلدا واناڵێیت؟ لەبەر ئەوە جەنابی دکتۆر تۆ خۆت شتێک لە مامۆستا زیاتریت، لە ئەدەبیاتدا شارەزایت، دونیادیدەیت، لە بەرئەوە». دکتۆر دەستە گەورەکانی بە ئەسپایی ڕاوەشاند و بەشتێک لە نیگەرانییەوە، گووتی «باشە... باشە... باش تێگەیشتم. گوێبگرە هۆشەنگ. من نازانم تۆ چەند ڕاستدەکەیت یان درۆ. نازانم، بەڵام هەرچییەک بێت ئەو پرسیارە لە هیچ مامۆستایەکی تری ئەم زانکۆیە مەکە، لە هیچ مامۆستایەکی تر». «دڵنیابە دکتۆر ناتوانم بیگێڕمەوە». ئینجا بە ئەسپایی، بەڵام نارەحەت و شپرزە گووتی «وەرە دەرێ... عەزیزم... وەرە دەرێ، بزانم چیرۆکەکەت چییە». دکتۆر نەزمی هەر کات بیویستبایە بە یەکێک بڵێ زانیارییەکم پێبڵێ، شتێکم بۆ ئاشکرابکە، دەیگووت «وەرە دەرێ، دەی وەرە دەرێ».

بولبولیار چیرۆکی هەر دوو یەکتر بینینەکەی خۆی لەگەڵ مەهدائیلی فریشتەدا لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە، بێئەوەی هیچ وردەکارییەک و تێبینییەک و سەرنجێکی خۆشی فەرامۆشبکات. کە تەواوبوو، پێدەچوو دکتۆر تەواو ماندووبووبێت، وەها دیاربوو کە گوێگرتن عارەقەیەکی

ڕەشی پێدەردابێت، بە جۆرێک ماندوو دەرکەوت پێشتر بولبولیار بەو چەشنە نەیدیبوو. چیرۆکەکە تایەکی گەرمی لە دکتۆر نەزمی هێنابوو، کە ئێستا زوو زوو بە دەستەسڕێکی قوماش عارەقەی نێوان پەنجە و سەر لەپی دەستی دەسڕی. دوایی کە بولبولیار تەواو بوو، گووتی «بولبولیار، ئەوەی دەیگێڕیتەوە چیرۆکێکی سەیرە» بە زەردەخەنەیەکی تاڵەوە پاڵیدایەوە و وەک یەکێک بیەوێت لە سەرەمەرگدا نهێنییەکی گەورە بدرکێنێت گووتی «من بە درێژایی ژیانم باوەڕم بە خوا نەبووە، باوەڕم بە شەیتان نەبووە، بەڵام باوەڕم بە فریشتە هەبووە». هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گووتی «لەوانەیە خودا چۆن دەستبەرداری ئێمە بووە، دەستبەرداری ئەوانیش بووبێت... یان... ڕەنگە تەواوی ژیان، تەواوی شتەکان بە پێی ڕێسا و یاسایەک بڕۆن کە ئێمە نایانزانین. بەڵام پێمبڵێ، بەراستی مەهدائیلی فریشتە باسی نەخۆشی فریشتەکانی کرد، بە ڕاستی؟»». «بە ڕاستی دکتۆر». «بولبولیار، منیش وەک تۆ لە هیچ تێناگەم. سەدان چیرۆکم لە سەر فریشتەکان بیستووە، ئینسان تا ئێستا فریشتەی وەک باڵدارێکی خودایی و ئاسمانی بینیوە... هەموو چیرۆکەکان وەک پۆستەچی خودا لە مەلەک دەڕوانن. مەسەلەکە ئەوە نییە ئەوان لە چ شێوە و هەیئەتێکدا دەردەکەون، هەڵبەت هەموو مەخلوقاتە غەیبییەکان، هەموو ئەوانەی فەنتازیای مرۆڤ دروستیکردون، دەتوانن بە هەر ڕوخسارێک دەربکەون کە دەیانەوێت، هەتا شەیتانیش دەتوانێت بە چ ڕوخسارێک دەربکەوێت کە خۆی دەیەوێت. میتامۆرفۆس، ئەوە لەگەڵ لەدایکبوونی فەنتازیادا لە دایکبووە... میتامۆرفۆس... ئەوە بخەرە ئەولاوە، گرنگ نییە کە مەهدائیل لە پیاوی بازاڕ یان ئاسنگەر یان هەلاج دەچێت، گرنگ ئەوەیە کە بێئاگایە لە خودا. کە بەستراوە بە زەوییەوە، کە پەیوەندی بە ئاسمانەوە نەماوە. ئەوە زۆر من سەرسامدەکات. بوەستە، بوەستە ئینسان زۆرجار باسی لە خۆی وەک

فریشتەیەکی کەوتوو کردوە، وەک فریشتەیەک کە بە مەبەست خۆی لە ڕەزیلەتدا نوقمدەکات. بەڵام کێ خۆی بە فریشتە نازانێت؟... کێ خۆی بە فریشتە نازانێت؟... هەتا بەدترین ئینسانیش ساتی هەبووە لە دڵەوە باوەڕي وابووە کە فریشتەیە. بە جۆرێک لە جۆرەکان هەموو فریشتەین، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە ئەم مەهدائیلەی تۆ بە دوای چیدا دەگەڕێت، بۆ خۆی پیشانی تۆ دەدات. تۆ کێیت؟ هۆشەنگی بولبولیار تۆ کێیت؟».
بولبولیار گووتی «نازانم وەڵامتبدەمەوە. مەهدائیل ئەوەندەش باوەڕی بە من نییە، لە ڕاستیدا باوەڕی بە کەس نییە. وەک ئەوەی بترسێت».
دکتۆر بە سەرسامییەوە سەیریکردەوە و هەستا و بە دەست ئاماژەشی بۆ بولبویارکرد کە هەستێت گووتی «بولبولیار باوەڕت پێدەکەم. بەڵام کێ چوزانێت، ڕەنگە ئەوە نەخۆشییە گەورەکەی بێت، دوور نییە وابێت، دوور نییە ئەوە دەردەکەی بێت کە لە من و تۆ دەترسێت، لە ئینسان سڵدەکاتەوە. گوێبگرە ئەمە لێرە باس ناکرێت. ئێرە زانکۆیە، شوێنی ئەمجۆرە خورافاتانە نییە، سبەی شەو وەرە بۆماڵەوە بۆ لام... سبەی شەو».

لەگەڵ بولبولیاردا تا بەردەرگای ژوورەکە ڕۆی. پێشتر کاری وەهای لەگەڵ هیچ کەسدا نەکردبوو. دکتۆر گەرچی لای خوێندکارەکان خۆشەویست بوو، بەڵام هەر کات یەکێکیان دەهاتنە بەردەمی ئەوەی بیرنەدەچوو کە ئەم مامۆستایە، کە سنوورێک و دیوارێک هەیە خوێندکار نابێت بیبڕێت. پێشتر لە هەر زانکۆیەک بووبێت، هەرجارێک دیوارەکانی هەڵگرتبێت، قوتابی کێشەیەکیان بۆ سازاندوە، ئێستە لە مێژە وازی لەوە هێناوە. بەڵام چیرۆکەکەی بولبولیار، دکتۆر نەرمی لە ناخەوە تێکدا. بۆ شەوی دوایی وەک دەرگا لە درزێک بکاتەوە خۆی دەرگای لە بولبولیار کردەوە. ماڵەکەی دکتۆر تا ئەو کات خۆشترین کۆشکێک بوو هەژارێکی وەک ئەو رووی تێبکات، دکتۆر هەموو ئەو شتە زۆر و زەبەندانەی هەبوو کە هەموو

دڵێـک، جگـە لـە دڵـی ئـەو حەزیـان لێبـکات، ژووری گـەورە، کتێبخانـەی گـەورە، توحەفیاتـی هەمەڕەنـگ، پەیکـەری هەمـە چەشـنەی عـاج، فەرشـی بێوێنـەی کاشـان، کورسـی شـاهانە، مێـزی گـەورە لـە دەسـتی سـەنعەتکارانی عەجـەم. بولبولیـار «فەقیرتریـن پیـاوی سـەر زەوی» هـەم بـە ماڵـی دکتـۆر سەرسـام و هـەم سەرسـامیش نەبـوو. سەرسـام بـوو بـەوەی دکتـۆر چـۆن لـە ژیانیـدا ئـەم شـتانەی کۆکردۆتـەوە، چـۆن ڕێکیخسـتون، چەنـد کاتـی پێبەخشـیون. سەرسامیش نەبـوو، چونکـە ئارەزووی نەبـوو هیـچ یـەک لـەو شـتانەی هەبێـت... کـە دکتـۆر دەرگای لـەم کـوڕە هـەژارە کـردەوە، بـۆ ئـەوە بـوو شـتێکی سـەیری پیشـانبدات. لـە ژووری کـار و خوێندنـەوەی خۆیـدا، لـە بـەر مێزێکـی گـەورەدا بولبولیـاری دانـا، لـەو مێزانـەی لەوسـەردەمەدا هەمیشـە گۆیەکـی شـینی زەوییـان وەک نیشـانەی دەسـەڵات بـە سـەر دونیـادا لـە سـەر بـوو. دکتـۆر گووتـی «کـوڕم بانگمکردیـت بـۆ ئـەوەی شـتێکت پیشـانبدەم، شـتێکی سـەیر... شـتێک کـە دەمـێ سـاڵە مەراقمـە و ئـەو چیرۆکـەی تـۆ تـەواو خسـتییەوە یـادم». دکتـۆر لـە جلـی ماڵـەوەدا زلتـر دەردەکـەوت. بـە هێمنـی بەرامبـەر بولبولیـار دانیشـت و گووتـی «ئـاە بەشـەر... ئـاە بەشـەر. مـرۆڤ هەیـە دەتوانێـت هەندێـک شـت ببینێـت کـە ئەوانـی تـر نایبینـن، بـە درێژایـی دونیـا وابـووە، مانـگ نەبێـت شـتێکی تـر شـک نابـەم، ئینسـانەکان هەمـوو پێکـەوە دیبێتیـان، مانـگ تەنیـا شـتە هەمـوو کەسـێک چـاوی هەبێـت و بـە سـەر زەویـدا ڕۆیشـتبێت، لـە دێـر زەمانـەوە تـا ئـەمڕۆ بینیوێتـی... تەنیـا مانـگ... مرۆڤـە کۆنـەکان وەک ئێمـە بینیویانـە و دوای خۆشـمان بـۆ ئەوانـی تـری جێیدەهێڵیـن. لـەوە دەرچێـت هـەر مرۆڤـە و شـتێک دەبینێـت. مانگـی لێدەرکـە، عەزیـزم مانگـی لێدەرکـە... ئـاە کـوڕم، بەبـێ مانـگ... ئەویـش لـە بەرئـەوەی بینینـی ئاسـانە، هەرکـەس لـە هەمـوو عومریـدا جارێـک لەشـەودا بۆیبگەڕێـت دەیبینێـت. مـرۆڤ بوونەوەرێکـی تەمەڵـە. زۆرجـار شـتی سـەیر لـە نزیکـی خۆیـەوە هەیـە و نایبینێـت. پێمبڵـێ مـرۆڤ لـە تەمەنیـدا

چەند جار پشتی خۆی دەبینێت، هەندێ بەشەر هەن دەمرن و نایبینن، کوڕی خۆم، بەشەر بوونەوەرێکی بێتاقەتە. ئەوەی کە شت نابینێت، تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ناتوانێت ئیش بە هەستەکانی بکات. بەڵام تۆ پێدەچێت بتوانیت ئیش بە هەستەوەرەکانت بکەیت. بۆ؟ نازانم... تۆ لە چیرۆکی فریشتەکەی خۆت بگوزەرێ. گەر مرۆڤ بە دوای چیرۆکی فریشتەدا بگەڕێت بێزار دەبێت، زۆربەی خەڵک لەو باوەڕەدان کە جارێک لە جارەکان فریشتەیان بینیوە، یان شتێکیان دیوە لە فریشتە چووە، یان کەسێکیان ناسیوە فریشتە بووە. ئەوەی لای من سەیرە ئەوەیە هیچ کەس فریشتەیەکی دونیایی وەک تۆی نەبینیوە. من دەزانم تۆ گەنجێکی ماددیت، ها... ئێوەی مارکسییەکان وا بە خۆتان ناڵێن، بە خۆتان ناڵێن مەتریالیست. گەر من شتێک لە ژیانی خۆمدا نەبایە تەواوی قسەکانتم بە وڕێنەی کەسێک حیسابدەکرد، دەیەوێت لە ڕێگای وڕێنە ماددییەکانییەوە، فریشتە لە نیشتیمانە ئاسمانییەکەی دابڕێت. بەڵام تۆ چاوتکردمەوە. دەبینیت هەتا خوێندکارێکی وەک تۆ دەتوانێت لە هەندێ شتدا چاوی پیرێکی وەک من بکاتەوە. وەک وتم من باوەڕم بە گەورە و بچوکی نییە، هەر کەسە و شتێک دەبینێت. هەر کەسە و شتێک دەبینێت کە بەتەنها هی خۆیەتی... لە بەرئەوە تاقیکردنەوە و ئەزموونی کەسێک بۆ ئەویتر نابێت... هەمووی درۆیە، ئەم کولتوورە کۆنانە سەرتاپایان درۆیە، ئاه. دەزانی بۆ پیرێکی وەک من کە تاقەتی فێربوونم نەماوە کاری وا چەند قورسە، بەڵام برواکانی مرۆڤ پێویستیان بە دەستکاری بەردەوام هەیە، پێدەچێت من و تۆش لە بەردەم شتێکی وەهادا بین».

بولبولیار بە چاوە گەورە و کراوەکانییەوە سەیری دکتۆری کرد و گووتی «دکتۆر، نازانم تۆ چۆن دەزانیت کە من مارکسییم، ڕەنگە قسەکانم لە کاتی وانەکاندا ئەو هەستەی تیا دروستکردبیت. من تا ئەو جێگایە مارکسیم، کە ئیش بۆ ئازاری مرۆڤ بکەم... باوەڕم بە ڕزگاربوونی

مرۆڤایەتـی بێت لـە ئـازار. ئینسـان سـێ ڕێـگای لـە بەردەمدایـە یـان ئیش بۆ ڕزگاربوونـی خۆی بـکات بـە تەنیـا، یـان ئیش بۆ ڕزگاربوونـی بەشـەرییەت، یـان هیچیـان. بەشـی هـەرە زۆری خەڵـک ڕێـگای سـێیەم هەڵدەبژێـرن، کەمینەیەکیش ڕێگای یەکـەم و کەمینەیەکی بچوکتریش ڕێگای دووەم. مـن ڕێـگای دووەمـم هەڵبـژاردوە.. بـەڵام ڕاسـتیت دەوێـت دکتـۆر نازانـم چـۆن. نازانم چـۆن ئینسـان دەتوانێـت ئیش بـۆ ڕزگاربوونـی مـرۆڤ بـکات، ئەوەیـان نازانـم». سـێ سـاڵ بـوو دکتـۆر وانـەی مێـژووی ئەدەبیاتـی پێدەگووتـەوە، ماوەیەکـی درێـژ بـوو ئـەم کـوڕە هەمـان جلـی لـە بەردابـوو، هەمـان هێمنـی هەبوو، هەمـان چـاوی گـەش و ڕیشـی تەنـک و خەنـدەی تەمـاوی. دکتـۆر گووتـی «تـۆ خۆشـبەختیت، مـن ڕۆژێکیـش بـاوەڕم بـەوە نەبـووە بتوانـم بەشـەرییەت ڕزگاربکـەم. جـار جـار لـە هەندێـک حیـزب و تاقمدا دەسـتبەکار بـووم. بـەڵام هەمـووی بـۆ مـاوەی کـورت. لێگـەڕێ، واز لـەو قسـانە بهێنـە. هۆشـەنگ دەمەوێـت شـتێکی گرنگـت پیشـانبدەم، نهێنییـەک لەوانەیـە تـۆ سـوودی لێببینیـت... دونیـا بـەو جۆرەیـە... دونیـا بـەو جۆرەیـە. هەنـدێ پرسیار هەیـە کـە دەبێـت پیـرەکان بـۆ گەنجەکانـی بەجێبهێڵن، لـە بەرنەوەی پێیـان وەڵام نەدراوەتـەوە. نـەوەی ئێمـە، نەوەیەکـی هیـچ بـوو، زانسـتێکی ئەوتۆمـان بـۆ ئێـوە بەجـێ نەهێشـتووە، تەنیـا هەنـدێ حیـزب و حیزبۆچکـە و سـەرۆکی خێلوخوارمـان بـۆ جێهێشـتوون، هیـوادارم نەبێـت بـە بـار بـە سـەرتانەوە. لـەوە بترازێـت، مـن خـۆم شـەرمەزارم لـەوەی سـەر بـە نەوەیەکـم کـە پیردەبیـن و شـتێکی وەهامـان نەکـردوە. بـەڵام وامەزانـە کـە هەمـوو برادەرە پیرەکانـم وەک منـن، بەشـەر خەیاڵـی واپـوچ نەچێتـە سـەرتەوە. ئـاە واز لەوانـە هەمـووی بهێنـە. مـن دوێنـێ کـە چیرۆکـی ئـەو مەهدائیـل نـاوەت بـۆ گێڕامـەوە، کـە تائێسـتاش بـە تـەواوی نازانـم، بـە ڕاسـتی فریشـتەیە یـان هـەر هوقەبـاز و سـاختەچییەکی تـری ئـەم شـارەیە، یەکسـەر ئـەوەم بـە خەیاڵـدا هـات کـە دەبێـت منیـش ئـەم نهێنییـەی خـۆم بـۆ تـۆ ئاشـکرابکەم».

بە هەوای پیرێکەوە بیەوێت چیرۆکێکی گرنگ بگێڕێتەوە، پاڵیدایەوە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی. نا هەناسەکەی لە هەناسەی ئاخ هەڵکێشان نەدەچوو، بەڵکو لە هەناسەی مەلەوانێک دەچوو پێش ئەوەی خۆی فڕێبداتە ناو حەوزێکی قووڵەوە. بولبولیار کە سەیری نێوشان و ڕیشە سپی و ویقارە فەلسەفییەکەی کرد، نەیدەزانی گەر ئەم پیاوە دکتۆری زانکۆ نەبایە دەبوو چ کارێکی دی بکات و لە کوێی دیکەی ژیاندا جێگای ببێتەوە، لەو پیرە جوانانە بوو کە لە سەد گەنج زیاتر ئافرەت شیفتەیان دەبێت. دکتۆر نەزمی هێشتا چاوی نوقاندبوو، دەستی بەرزکردەوە و بە جۆرێکی سەیر لەرزاندی، وەک یەکێک گوێی لە مۆسیقایەکی کتوپڕبووبێت، بە دەم دەست لەرزانەوە گووتی «دەزانیت... خوێندکار وادەزانێت مامۆستاکەی لە خوێندنگا یان لە زانکۆ یان لە هۆڵی وانەدادانندا لەدایکبووە... من هەزار قوتابیم بینیوە وابیریان کردۆتەوە. نازانن مامۆستاکەیان بەشەرە، مامۆستای گەمژەش هەیە وابیردەکەنەوە، پێیان وایە خوێندکارەکانیان وەک مریشکی سەر دانوودانی مامرگە لە پۆلدا دەژین و گەورەبوون. مامۆستا هەیە وابیردەکاتەوە کە قوتابییەکانی دەبێت لە سەر هێلکەی مەعریفەت کڕبکەون تا هەڵیدەهێنن. بەڵام واز لەوە بهێنە. چیرۆکەکەی من، بولبولیار، ڕاستییەکەی چیرۆکی من نییە، بەڵکو چیرۆکی برا گەورەکەم سەید فەیزییە. فەیزی برا گەورەم بوو. پیاوێک بوو چاوەڕێی ئەوەمان لێدەکرد ببێت بە پرۆفیسۆر، وەک من خولیای ئەدەبیاتی نەبوو، زیاتر بەلای زانستدا ڕۆیشت... کیمیا، فیزیا، ماتماتیک، بایۆلۆژیا... خولیای ئەو شتانەی هەبوو. لە ئەدەبیاتدا ئێمە دوای دیوە نامادییەکەی ژیان دەکەوین، ئەوان لە زانستدا دوای دیوە مادییەکەی دەکەون. ئێمە خەریکی کیمیای ڕۆحین ئەوان خەریکی کیمیای مەتریاڵن، کیمیای شتە بێڕۆحەکان. بە کورتی دوو مەخلوقی جیاوازین. من و ئەویش دوو کەسی جیاوازبووین، بەڵام خۆشەویستی من

بۆ فەیزی لە خۆشەویستی برا بۆ برا زیاتر بوو. چیت پێبڵێم، من نە ئیماندارێکی بەهێزم، نە بێئیمانێکی ئەوتۆشم باسیبکەم. من هیچیان نیم، ڕاستت دەوێت هیچیان نیم. یەکێ لەو پرسیارانەی مرۆڤی عاقڵ لە خۆی ناکات ئەوەیە: ئاخۆ خودا هەیە یان نا. نە لە بەرئەوەی دەشێت پرسیارەکە وەڵامی نەبێت، بەڵکو لە بەرئەوەی وەڵامەکەی هەمیشە ترسناکە. من لەوەڵامی هیچ پرسیارێک ناترسم وەک وەڵامی پرسیار لە بوون و نەبوونی خودا. هەر کەس وەڵامی ئەو پرسیارە بزانێت، بوونەوەرێکی ترسناکە، زۆریش ترسناکە، زۆر زۆر، ترسناکترین مەخلوقە. سەید فەیزی کە خولیای خۆی خستە سەر زانست بەدوای ئەو وەڵامەدا دەگەڕا. پیاوێکی زیرەک بوو، بەخێرایی لە زۆربەی زانستەکاندا قووڵ بووەوە. لە سەردەمی پادشایەتیدا دەوڵەت ڕێزی ئەو بەهرانەی لەلابوو. عەفوومکە دەزانم تۆ وەک هەوادارێکی کۆمۆنیستەکان حەتمەن پێتخۆش نییە، ستایشی ئینگلیزە ئیمپریالیستەکان بکەم... تێدەگەم. بەڵام زیرەکی سەی فەیزی بە جۆرێک بوو، ڕاوێژکارە ئینگلیزەکانی ئەو سەردەمەی حکومەت ناردیان بۆ بەریتانیا. لەوێ دەستیکرد بە خوێندنی فەلەکیات و ئەسترۆنۆمی و ئەو شتانە. پرسیار لە بوون و نەبوونی خودا، پرسیاری هەرە گەورەی ژیانی سەیدی برام بوو، وەک چۆن فەلەکییەک لە ئاسماندا بە دوای ئەستێرەیەکدا دەگەڕێت، ئەویش هەمان شێوە بە دوای خودادا دەگەڕا... وەک ئەستێرەیەکی ون کە دەشێت بە تەلسکۆبێکی گەورە لە ئاسماندا ببینین. من گەرچی برا بچوک بووم، زۆر لەگەڵیدا خەریکبووم واز لەو پرسیار و خولیایانە بهێنێت، مرۆڤ بیەوێت لە مەسەلەیەکی وائاڵۆزدا بگاتە یەقین، ئەوە سەرتاپای ژیانی تێکدەدات. هەندێ جار مرۆڤ چەندە بلیمەت بێت، تووشی دەبێت بە تووشی پرسیارێکەوە، لە فەیلەسوفەوە دایدەگرێت و نزمیدەکاتەوە و دەیکاتەوە بە گەمژە. فەیزی بە ڕەحمەت بێت لە بەریتانیا بە هیمەتێکی بێوێنەوە کەوتە سەر

خوێندن، بەڵام تا لە فەلەکیات و گەردونناسیدا زیاتر دەچووە پێشێ، ئیمانی زیاتر لەق دەبوو، زیاتر دەگەیشتە ئەو یەقینەی ئەم گەردونە بەتاڵە، هیچ نییە جگە لە کۆمەڵێک بەردی گەورەی بەرەڵا کە بێسوود و بۆ ئەبەد بە جۆرێکی بێمانا دەسوڕێنەوە... خودی ئەو هەموو ڕووبەرە بۆش و ئەستێرە بەتاڵانەی کە لە گەردوندا هەیە، دەیخەنە سەر ئەو بڕوایەی جیهان جگە لە بۆشاییەکی پوچ و بێحیکمەت بەولاوە، هیچی تری نییە. تۆز، تاریکی، بەرد... ئەوە گەردونە و هیچی تر. ئیشێکی زەبەلاحی بێمانا... ئەو بڕوایە بەرەو نائومێدییەکی گەورەی برد».

بولبولیار سەرنجیدا دەنگی دکتۆر لە ئێستادا تەواو جیاوازە لە دەنگی لە زانکۆ و لە هۆڵی وانەداداندا. دەنگی پڕبوو لە سۆز و پرسیار، لە پاشماوەی شتگەلێک کە بە ژیانیدا ڕۆیشتوون و ئازارێکیان جێهێشتووە، لە گەرمییەک کە لە کاتی هیچ وانەدادانێکدا ناکەوێتە گەروی هیچ ئوستادێکەوە. دکتۆر سەیری چاوی بولبولیاری کرد و گووتی «کوڕم چوار جۆر نائومێدی لە دونیادا هەیە، یەکەمیان ئیفلیجت دەکات، دووهەمیان تووشی غەمۆکیت دەکات، سێهەمیان دەتکات بە بلیمەت، چوارەمیان دەتکات بە پیاوکوژ. نەدۆزینەوەی خودا بۆ سەی فەیزی، دەرەنجامی کوشندەی هەبوو. دۆزینەوەی بێمانایی گەردون ترسناکترە لە دۆزینەوەی بێمانایی ژیان. ئەوەی بزانیت هەموو گەردون لە کۆمەڵێک تەپوتۆز و بوخاری بێمانا زیاتر هیچ نییە، لەوە سەختترە بپرسیت بۆ ژیانم مانای نییە. بەشەر وایە، گەر هەستبکەیت ژیانت مانای نییە، دەڵێیت ئەوە منم، ئەم شتە هیچ و لاوازەم کە ژیانم مانای نییە، ئەوە گوناهی پڕوپوچی خۆمە بوونم مانای نییە، بەڵام لەو دەقیقەیەدا کە تێدەگەیت هەموو ئەم گەردونە گەورەیە مانای نییە، ئیتر شتەکان لە دەستی تۆ دەترازێن، هەموو شتێک وەک هەمانەی بۆش لات بەتاڵ دەبێتەوە. دۆزینەوەی بێمانایی گەردون سەی فەیزی

گۆڕیی بۆ مرۆڤێکی تر، مرۆڤێکی ترسناک یان ترسناکترین کەسێک من لە ژیانمدا دیبێتم. کە لە ئینگلتەرا گەڕایەوە، پیاوێکی هوقەباز و بەشەڕێکی پڕ ڕەزیلەتی لێدەرچووبوو. بە زنجیرەیەک فێڵ و بە کۆمەڵێک تەڵەکەی نامەردانە تەواوی سەروەت و سامانی خێزانەکەمانی لە چنگی من و خوشکەکانم دەرهێنا، لە ماوەیەکی کورتدا دوو ژنی بۆ پارە و سامانەکانیان گواستەوە و تەڵاقیدان، لە بازاڕدا بووە شەڕیکی دز و درۆزنترین بازرگانەکان، کارگەیەکی پسکیتی دانا کە تێیدا کرێکارەکانی بە جۆرێکی دڕندانە دەچەوساندەوە. لە زانکۆ وەک گورگێکی هار ئازاری قوتابیانی دەدا و یاری بە چارەنوسیان دەکرد. بەڵام من وەک برایەکی بچوک، هەمیشە لەگەڵیدا بووم. گوێم نەدایە زوڵم و زۆری، لە نزیکەوە دەمپاراست، ئامۆژگاریمدەکرد، بەڵام تا دەهات بەدتر دەبوو... پزیسکی خراپەشی تادەهات زیاتر دەگەیشتە من. بەڵام من دەمزانی لە ناخدا کەسێکی باشە، مەعدەنی شتێک لە چاکەی تێدایە کە گەرد ناگرێت. ساڵێک بەر لە مردنی، سەفەرێکی کورتی بۆ زۆنگاوەکانی باشوور کرد، لەوێ چەندەها وێنەی گرتبوو. بوەستە بولبولیار، بوەستە... هەر ئێستا دەگەڕێمەوە، دەبێت وێنەکان ببینیت... ئاه بەشەر... وێنەکان نەبینیت هیچ شتێک تێناگەیت، ئەوەڵا نەیبینیت قسەکانم هەر مانایان نییە».

دکتۆر نەزمی لە ژوورەکە چووەدەرێ و بۆ زیاتر لە دە دەقیقە بولبولیاری بەجێهێشت کە هەمیشە ئەو جۆرە کاتانەی بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی سەیری کتێبەکان بکات، بەڵام تا ئەوکاتە نەیدەزانی دکتۆر بۆ بانگیکردوە. کە دکتۆر گەڕایەوە، ئەلبومێکی وێنەی گەورە و کۆنی بە دەستەوە بوو. لە تەنیشت بولبولیارەوە وەستا و پێیگووت «وەرە بڕوانە، ئەوەی دەمەوێت ببینیت لەم ئەلبومەدایە». ئەلبومێکی کۆن بوو، بەرگێکی چەرمی هەبوو، پڕبوو لە وێنەی ڕەش و سپی دێرین...

پیـاوان و ژنانێـک لـە جـل و بەرگـی سـاڵانی پەنجـادا، لـەو شیکپۆشـییە دێرینـەدا کـە جارێکـی دی وڵاتەکـە بـە خۆیـەوە نابینێتـەوە. دکتـۆر چەنـد لاپەڕەیەکـی هەڵدایـەوە و لـە ژێـر وێنەیەکـەوە دوو وێنـەی شـاردراوەی دەرهێنـا و خستییە بەردەمـی بولبولیـار و گووتـی «کـوڕم بیبینـە. سـەیرکە، بزانـم چـی دەبینیـت». بولبولیـار بـە سەرسامییەوە گووتـی «وای مەلەکـی مەلـەکان... ئەمـە چییـە؟». بولبولیـار وەهـا حەپەسـابوو نەیدەزانـی بڵێـت چـی. لـە هـەردوو وێنەکـەدا سـەی فەیـزی لـە نـاو کۆمەڵێـک فەرمانبـەر و کارمەنـدی دەوڵەتـدا بـە چاکـەت و پانتۆڵـە ئینگلیزییەکەیـەوە وەسـتاوە و لـە هـەر دوو وێنەکەشدا تارمایـی دوو باڵـی گـەورە لـە پشتییەوە بـە ڕوونـی دیـارن، دوو باڵــی بڵنــد و بــەرز و سـپی. دکتــۆر گووتــی «دەبینیــت... دەبینیـت... ئـەوە سـەی فەیـزی برامـە... ئـەوە سـەی فەیزییـە، بـەڵام دەزانی پێش تـۆ هیـچ کەسێک ئـەو باڵانـەی نەبینیـوە، هیـچ کـەس. مـن تاکـە کـەس بـووم کـە دەمتوانـی ئـەو باڵانـە ببینـم، تاکـە وێنەیەکـی سـەی فەیزیش کـە ئـەو باڵانـەی لـە سـەرە ئـەم دوو وێنەیەیـە. هەتـا سـەی فەیـزی خۆشـی ئـەو باڵانـەی نەدەبینـی، سـەی فەیـزی خۆشـی نەیدەبینیـن. نزیکـی سـاڵێک سـەی فەیـزی بـەو باڵانـەوە ژیـا، نزیکـی سـاڵێک، لـە نـاکاو نەخۆشـییەکی گـرت و ماوەیـەک لـە جێـگادا کـەوت، نەخۆشـییەکی قـورس نەبـوو. بـەڵام سـەی فەیـزی ئـەو ماوەیـە هەمـووی لـە خەڵوەتـدا مایـەوە، زۆربـەی کات بـە تەنهـا بـوو. مـن بـەردەوام خـواردن و دەرمانـم بـۆ دەبـردە ژوورێ، شـتێکی ئـەو تـۆی نەبـوو، بـەڵام مـن دەمبینـی کـە باڵەکانـی تـا بێـت گەورەتـر دەبـن، هەندێجـار کـە پێمدەگـووت مـن دوو باڵـی گـەورە لـە پشـتتەوە دەبینـم، دەیدایـە قاقـای پێکەنیـن، جنێـوی پێـدەدام، سـووکایەتی پێدەکـردم. لـە نـاکاو بەیانییـەک هەسـتام و دکتـۆر فەیزیـم بینـی لـە باغەکـەی ماڵـەوەدا پیاسـەدەکات، نەباڵـی مابـوو نـە هیـچ... لـە نـاکاو سـەی فەیـزی باڵەکانـی خـۆی لـە دەسـتدا... لـە نـاکاو... بەڵـێ لـە نـاکاو سـەی فەیـزی باڵەکانـی

نـە... مـا... ن»٠ دکتـۆر بـە غەمگینییـەوە سـەیرێکی بولبولیـاری کـرد و بـەردەوام بـوو «دوای شـەش مانـگ لـەوە سـەی فەیـزی لـە ڕووداوێکـی نادیـاردا کـوژرا، شـەریکە ئیشـەکانی کوشـتیان. ئـەو بـە یەکێـک لـە فێـڵ و هوقەبازییـە زۆرەکانـی دەسـتی گرتبـوو بـە سـەر سـەروەت و سامانی هەمـوو هاوڕێکانیـدا. شـەوێک دەسـتێکی نەنـاس لـە سـەر کۆرنیشـی ئەعزەمییـە لـە بەغـداد دایـە بـەر گوللـە و کوشـتی، دەسـتبەجێ لەویـادا ڕۆحـی دەرچـوو. مـن چوومـە سـەر تاتەشـۆرەکەی و لەگـەڵ مـردوو شـۆرێکی پیـردا پێکـەوە شـتمان. لـە سـەر مەیتەکـەی ئاسـەواری هیـچ باڵێکم نەبینـی، هیـچ شـتێک... ئەوەنـدە دەزانـم کـە ئـەو باڵانـە باڵـی فریشـتەبوون، بـەڵام فەیزیـی بـرام خـۆی هێـدی هێـدی دەبـوو بـە شـەیتانێکی ڕاسـتەقینە. مـن بۆیـە ئـەم چیرۆکـە بـۆ تـۆ دەگێڕمـەوە، چونکـە ئـەو مەتەڵـەم پـێ هەڵنەهـات... مـن سـەی فەیزیـم زۆر خۆشویسـت، زۆر. بولبولیـار ئێسـتا نزیکـی بیسـت سـاڵ بـە سـەر کوشـتنی سـەی فەیزیـدا تێپەڕیـوە، بـەڵام بـەردەوام دیمەنـی ئـەو باڵانـە لـە خەیاڵمـدان. هـەزار جـار لـە خـۆم پرسـیوە، ئاخـۆ ئەوانـە باڵـی ڕاسـتەقینە بـوون یـان جرنـی و فرنیاتـی خەیاڵـی نەخۆشـی مـن. دوای ئـەوە نـە خـۆم باڵـی هیـچ کەسـێکم بینـی و نـە بیستیشـم هیـچ کـەس مەخلوقێکـی باڵـداری دیبێـت، تـا دوێنـێ... تـا دوێنـێ کـە تـۆ بـە خـۆت و ئـەم چیرۆکـە عەجباتییـەوە دەرکەوتـی و وەک ئـەوەی موگناتیسـێک لـە خەیاڵـی منـدا ڕاتبکێشـێت، بـە سـەرهاتی ئـەو مەهدائیلـە مەلعونـەت بـۆ هێنـام. تـکات لێدەکـەم هـەر ڕۆژێـک شـتێکت دەربـارەی ئـەم مەسـەلەیە زانـی، ئێـرە ماڵـی منـە. لـە دەرگا بـدە، هـەر کاتێـک بێـت گرنـگ نییـە، بـە شـەو بێـت، بـە ڕۆژ بێـت... گـەر مردبوومـم وەرە سـەر گۆڕەکـەم و بـۆم بگێـڕەوە. بولبولیـار تـۆ شـتێکت بینیـوە کـە کـەس نایبینێـت... مەهدائیلـی فریشـتە لـەوەدا لـە سـەر هـەق بـووە... بەشـەر... مەهدائیـل لـەوەدا لـە سـەر هـەق بـووە. تـۆ شـتێکت بینیـوە کـەس نایبینێـت»٠

# سەرەتاکانی شۆڕش

لە ماوەی ساڵێکدا شۆڕش بە جۆرێکی سەیر گەشەیکرد. لە هەموو هەرێمەکاندا تیپ و کەرتمان دروستکرد. من ڕۆژ دوای ڕۆژ بڕوای هەڤاڵ شێرخان و بڕوای ئەندامانی تری ئەنجومەنی باڵام بە دەستدەهێنا. هەم جەنگاوەرێکی سەرسەخت و هەم وەفادارێکی فانەتیکی شۆڕش بووم. لە ماوەی ئەو ساڵەدا چەند هێڵێکی جاسوسیم لە شۆڕشدا ئاشکراکرد. زیاتر بە سەلیقە و بۆن و سیمادۆزیی کارمدەکرد، کۆکردنەوەی تێبینی ورد و ڕێکخستنی زانیاریی و گرێدانەوەیان پێکەوە کاری سەرەکیم بوون. لە ساڵی یەکەمدا چەند سیخوڕێکم گرت کە دەوڵەت بۆ کاری تێکدان و کوشتن و ژەهرخواردکردن ناردبوونی. دووانیان بۆ کوشتنی هەڤاڵ شێرخان و دەرمانخواردکردنی پێشمەرگەکانی تیپی خۆمان هاتبوون. سیخوڕەکانی دەوڵەت کەسیان خەڵکی تایبەت و مەشق پێکراو نەبوون، بەڵکو پتر لەو خۆفرۆشانەبوون کە دەوڵەت بە پارەیەکی کەم کاری سەختی پێدەسپاردن. لە بەرئەوە لە سەرەتاوە کە دەهاتن بە ترسێکەوە لە چاویان و بە شەرمێکەوە لە ڕۆحیاندا ڕەفتاریاندەکرد، ئەوە وایدەکرد ناسینەوەیان ئاسان بێت. تا ئەو دوو سیخوڕەمان نەگرت، هەڤاڵ شێرخان باوەڕی بە تواناکانی من نەدەکرد. هەردوو سیخوڕەکە لە بەردەم خۆیدا و بێ هیچ زۆرکاری و ئەشکەنجەیەک لە ژێر بارانی فرمێسکدا دانیان بە نیازی خۆیاندا نا و ئەو ژەهر و کەرەستە و پیلانە نهێنیانەیان ئاشکراکرد کە دەبوو لە کوشتنی هەڤاڵ شێرخان و ئەزیەتدانی پێشمەرگەکاندا بەکاریبهێنن. ئەوە منی زۆر لە دکتۆر نزیککردەوە، دوای ئەوە لە مندا وێنەی کەسێکی دەبینی کە دەکرێت لە دارشتنی هەر خەونێکدا بۆ داهاتوو بەکارمبهێنێت،

من بەردەوام ئەوەم لە پێشدەمدا دووبارەدەکردەوە کە «من بە خۆشحاڵی و شادییەوە ئامادەم شۆڕش وەک ئامێری خۆی سەیرمبکات». بەردەوام لە دەوری ئاگری شەوانی پێشمەرگەیاتی، بە هەڤاڵانی خۆم دەگووت «ئێمە کەرەستەی میللەتین و نابێت ئەو هەستە لە بیربکەین کە کەرەستەین». هەڤاڵ شێرخان تا ئەو کات ڕاشکاوانە بڕوای بە کەس نەبوو، هیچ پێشمەرگەیەکی بە دڵسۆزی خۆی نەدەزانی. بەڵام لە ساتێکدا بینی کە من چ سیمادۆز و ئادەمناسێکی وردەکارم و چ بۆنێکی شەیتانیم هەیە، بە چ ئارەزوو و خولیایەکی خزمەتکارانەوە دەمەوێت خزمەتبکەم و لە سەرکردە گەورەکانی شۆڕش نزیکبم. هەڤاڵ شێرخان سەرەتا بڕوایەکی وەهای پێکردم لە بڕوای منداڵێک بە سیحربازێک دەچوو... هەندێجار وام هەستدەکرد خەریکە وەک مونەجیمی شۆڕش سەیرمدەکات، وایدەزانی من توانای بینینی پاشەڕۆژ و خوێندنەوەی فەلەک و تێگەیشتنم لە جوڵەی ئەستێرەکان هەیە. وایدەزانی من بە فنجانێکی قاوەدا دەڕوانم و چارەنوسی سەرکردەکان دەبینم. بۆ ئەوەی نەگاتە دۆخێکی وەها سەرپەڕ کە هەر بە ڕاستی وەک فاڵچی و بەختگرەوەی حیزب ناومبنێن، بەردەوام دوای هەموو کارێکی زیرەکانە و دوای هەڵوەشاندنەوەی هەر پیلانێکی کوشندە، ڕاپۆرتێکم ئامادەدەکرد و هەموو ئەو هۆیانەم بە شیکارێکی ورد دەخستە بەردەمی بیرۆی باڵا، کە مایەی گومان و سەرەتای یەقینی من بوون دەرهەق بە خیانەتکاران. بەڵام مرۆڤ لە شۆڕشدا بزانێت و نەزانێت چەندەها دوژمنی ئاشکرا و نادیاری هەیە، ئەنجومەنی باڵای ئێمەش لە سەرەتاوە پڕبوو لە کینە و دوژمنکاری نهێنی. هەر دوو هەڤاڵ عەلی ئێڵچی و کامیاری موهەندیس کە لە لیژنەی سیاسیدا بوون، تەواو دژایەتی دکتۆر شێرخانیان دەکرد کە بە جۆرێکی ورد هەوڵی دەدا هەر لە سەرەتاوە لە ڕێکخراوەکانی خوارەوەدا خەتی تایبەت دروستبکات و ڕێکخراوەکانی شار بە خۆیەوە ببەستێت. دیارە شێرخان منی خۆش نەدەویست، بەڵام

پێمبڵێن چ چارێکی تری هەبوو، جگە لەوەی من بخاتە کار. من هەر زوو وەک بەهێزترین و وریاترین کەسی نزیک لە هەڤاڵ شێرخانەوە ئەو ئەرکەم پێسپێردارا بڕۆمە خوارێ و خەتەکان بە هەڤاڵەوە گرێبدەمەوە. لە ئەنجومەنی باڵا کەسانی وەک موهەندیس و ئێلچی نەیاندەویست ڕاستەوخۆ لەگەڵ شێرخاندا تێوەبگلێن کە تادەهات ترسناکتر و بەهێزتر و توندتر دەردەکەوت، ڕۆژ دوای ڕۆژ سیفاتی پیاوی شارستانی تێدا نەدەما، زیاتر ڕەنگی بەرد و شێوەی تاوێرەکانی دەگرت. کە یەکەم بنکەمان دانا، دوای هەفتەیەک سەرنجی خوویەکی سەیری دکتۆرم دا. شەوان درەنگ دکتۆر لە بنکە دەچووە دەرێ و وندەبوو، دوو خزمی نزیکی هێنابوو بۆ ناو پێشمەرگە و بەردەوام بە دوایەوە بوون، بەڵام تێبینیمکرد هەرکات بەشەو دەردەچوو دەستێک قاتی ڕەشی قەترانی لە بەردەکرد و بەردەماغێکی ڕەشیشی دەپۆشی، بە جۆرێک بینین و ناسینەوەی لە تاریکیدا سەخت بوو... من چەندین شەو ویستم دوای بکەوم، بەڵام نەمتوانی. دڵنیابووم گەر دوا بە دوای ئەو دەرچم پاسەوانەکانی دەزانن و دواتر لێم نابورێت. نا شێرخان پیاوی لێبوردن نەبوو، هەموو جارێک دەیگووت «مرۆڤ لە شۆڕشدا یەکجار هەڵەدەکات». بەڵام من مەراقێکی کوشندەم تێدابوو بزانم چی دەکات، ئێوارەیەکیان بە ناوی کڕینی هەندێک کەلوپەل و سەردانی خزمێکەوە، گووتم دەچمە گوندێکی دیکەی نزیکمان. هەڤاڵ دەیزانی من لەوێ سووکە ناسیاوییەکی کۆنی خێزانیم لەگەڵ حاجییەکدا هەیە. بە ڕۆژ چوومە دیدەنی حاجی و شەوەکەی لەو دەمانەدا کە دکتۆر بەرەو ناو دێ دەردەچوو گەڕامەوە بۆ نزیکی بنکە و لە جێگایەکی تایبەتدا خۆم حەشاردا... دکتۆر وەک شەوانی تر هاتەدەرێ و من دوورا و دوور و بە خفییەتێکی زۆرەوە دوای کەوتم. بینیم لەوسەری دێدا خۆی کرد بە ماڵی جووتیارێکدا، ماڵی ژن و پیاوێکی گەنج، کە ژنەکەی «مەرزان» لەو دەڤەرەدا بە جوانی ناسرابوو، هەتا دەگووترا کە گۆرانیبێژێکی گەڕۆک

حەزی لێکردوە و گۆرانی تایبەتی بە سەردا هەڵداوە. من بەردەماغێکی توندم بەستبوو و زۆر بە پارێز و لەلاوە لە ماڵی جووتیارەکە نزیکبوومەوە. کوڕە جووتیارەکەم بینی هاتەدەرێ، لە بەردەم هەیوانی ماڵەکەدا وەستا، وەک هاوارێکی نهێنی بیستبێت بەرەو ئەو ئاڕاستەیە هات کە من خۆم تێدا حەشاردابوو، بەڵام تاریکی زۆر چڕبوو. من خۆم توند بە دیوارەکەوە نوساند بۆ ئەوەی نەمبینێ، لەبەر پەرژینی ماڵەکەی خۆیدا وەستا. کە بە هەندێ چیلکە و گەڵای وشک هەڵیچنیبوو، لە تاریکییەکەدا جگەرەیەکی داگیرساند، کوڕێکی گەنجی جوان بوو. کە ڕوناکی ئاگری شخارتەکە بەر ڕوخساری کەوت بینیم دەگری، فرمێسکەکان لە چاویدا دەبریسکانەوە... لە پاڵ دیوارەکەدا گوێم لە هاوارەکانی هەڤاڵ شێرخان بوو لەگەڵ ژنی جووتیارەکەدا دەخەوت... گوێم لە ناڵەی لەزەتی بوو، گوێم لە خیزەی سنگی بوو وەک گیانەوەرێکی ماندوو مشەی دەهات، نرکەی سەر تەکاندانی بە نرکەی کەسێک دەچوو بارێکی سەختی هەڵگرتبێت، چاویشم لە فرمێسکی ئەو مێردە گەنجە بوو کە جگە لە گریان لە تاریکیدا، چاری تری نەبوو. هەڤاڵ چەند جارێک لە سەریەک ئەو هاوار و نرکە و هەژانە شێت و جانەوەرئاسایەی خۆی دووبارەکردەوە، هەموو جارێک کە دەگەیشتە کۆتایی، وەک یەکێک لە جەنگدا دوایی تێکئاڵانێکی درێژ، چەقۆکەی بە نەعرەتەوە لە دڵی دوژمندا بنێژێت، دەینەڕاند.

دوای سەعاتێک، هەڤاڵ چۆن هاتبوو بە هەمان ڕێگادا گەڕایەوە. لە ڕۆیشتندا وەک هێسترێکی ماندوو، ملی بە جۆرێکی سەیر دانەواندبوو، شانی وەک جانەوەرێکی بریندار هاتبووە پێشێ... هیچی لەگەڵ مێردی ژنە جووتیارەکەدا نەگووت، وەک هەست بە بوونی نەکات بەلایدا تێپەڕی و ئاوڕی لێ نەدایەوە. من لە تاریکیدا دانیشتم و بیرم لەو نهێنییە دەکردەوە. سەرم خستە ناو کۆشمەوە و پاش نۆبەتێکی کورتی تێڕامان، باوەڕم بە خۆم هێناو لە نیهانمدا گووتم «شۆڕشگێڕەکان گەر نەتوانن

لەشی خۆیان تێربکەن، ناتوانن بیربکەنەوە. هەڵبەت تەندروستی هەڤاڵ شێرخان بۆ شۆڕش لە نێولنگی ئەم ژنە جووتیارە گرنگترە. ئەمە چییە... ها... لە ناوگەڵی ژنە جووتیارێک بەولاوە چی ترە، دڵنیام ئەگەر هەڤاڵ شێرخانیش سواری نەبێت یەکێکی تر هەر سواری دەبێت».
ئەو شەوە دوای ئەوەی نهێنی هەڤاڵم ئاشکراکرد، کەوتمە گەڕان بە دۆڵ و چیاکاندا و لە بن گاشە بەردێکی گەورەدا لێیخەوتم. ئەوکات لەشێکی وەهام هەبوو دەمتوانی بە هەفتە لە ژێرباراندا بخەوم. بۆ ڕۆژی دوایی گەڕامەوە بنکە و خۆم نادیدە گرت و هیچم بۆ کەس ئاشکرا نەکرد، بەڵام هەموو شتێکم لە یاداشتەکانمدا نوسی و لەوەش تێگەیشتم کە ئیتر دەبێت بە هەموو جۆرێک یاداشتەکانم بپارێزم و نەهێڵم بگاتە دەستی کەس. ئەوەی لای من سەیربوو، دکتۆر سەروسیمای پیاوی ژنبازی نەبوو. پیاوانی کەمدوو و مۆن کەمیان دەتوانن ژنبازی باش بن، بەڵام پێدەچوو ئەو لەو توخمە کەمە بێت. لەبەر هەر هۆیەکیش بێت ئاسان دەستی دەگەیشتە ئەو ژنانەی دەستنیشانیدەکردن. تا شۆڕش تەمەنی زۆرترباییە، دکتۆر توندتر و عەسکەریتر و داخراوتر دەردەکەوت. ژنبازیی و خەباتی شەوانەی هێدی هێدی لە هەندێ جێگاوە دەبیسترانەوە، بەڵام دواتر لە ناو ئەو چیا و دۆڵە تاریکانەدا دکتۆر خوویەکی سەیرتری لێدەرکەوت کە بە ڕاستی ترساندمی. هەڤاڵ هەندێ ئێوارە کە بێزار دەبوو، کلاشینکۆفەکەی هەڵدەگرت و لەگەڵ دوو پاسەوانەکەی خزمیدا دەچوو بۆ پشیلە کوشتن. ئەو کارەی بە لەزەتێکی زۆرەوە ئەنجامدەدا. بەڵام لە کوشتنی پشیلەکان سەیرتر ئەوەبوو، سەری پشیلە کوژراوەکانی لێدەکردەوە، دەیخستنە ناو ئاوێکی گەرم گەرم و چەندین سەعات لە مەنجەڵێکی تایبەتدا دەیکوڵاندن، دواتر چاوەکانی دەخواردن و گۆشت و پێستەکەی فڕێدەدان و کەللە سەرە سافەکەیانی لە سندوقێکدا هەڵدەگرتن.

کە پشیلە لە دەورمان هاتە کزی، زۆر ڕۆژ تفەنگی هەڵدەگرت و دەچوو بۆ گوندەکانی دەوروبەر. هەر کات یەکێک دەربارەی ئەو خووە لێیبپرسیایە، وەڵامی نەدەدایەوە... هەندێک لەوانەی ئەو ڕەفتارەی دکتۆر سەرسامیکردبوون، نامەی نهێنییان بۆ سەرۆک «خودا لە گوناهەکانی خۆش بێت و بەهەشت مەنزڵگەی بێت» نوسی و داوایانکرد جەنابی دەست لەم کارە وەردا و شێرخان لە کاری پشیلە کوژی ڕاگرێت. بەڵام سەرۆک ڕێزێکی بێوێنەی لە شێرخان دەگرت و قسەی وەهای بە گوێدا نەدەچوو. وەکو تر سەرنجی ئەوەمدا کە لە دابەزین و گەڕانەکانماندا، دەچینە هەر گوندێک، دوای ماوەیەکی کەم، دکتۆر ژنێکی وەک مەرزان دەدۆزێتەوە، مێردەکەی دەخەسێنێت و شەوان دەبێتە هاونوێنی. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو ئافرەتانەی نێو ژیانیشیدا، پیاوێکی دڵخۆش نەبوو، هەمیشە گرژییەکی کوشندە ڕۆحی نابووە بن مستی. سەرکردەیەکی ئەهریمەنناسا و دڵڕەق بوو، تابڵێی لە جەنگدا بەهێز بوو، بەڵام کەسێکی خۆشەویست نەبوو. دڵنیام زانیویتی ئەو ژنانەی داگیریاندەکات، کەسیان عاشقی نین. شتێکی تر دەیانجوڵێنێت کە پەیوەندی بە ئەڤینەوە نییە، شتێکی وەک ترس، چاوچنۆکی، خۆپاراستن، تەماح... یان هەر شتێکی تر.

لەگەڵ ئەوەی من دڵسۆزی یەکەمی بووم، بەڵام نەیدەتوانی دیوارە دەرونییەکانی ناخی لەگەڵمدا بشکێنێت. پەیوەندیمان هەمیشە شتێکی زۆر لە ڕەسمییەت و ڕێزی عەسکەریانەی تێدا بوو. دوای چەندین ساڵ، کە ئەو بووبوو بە وەزیرێکی داکەوتوو و دواتریش بە بەرپرسی کاروباری گشتی، جارێک لێم پرسی «دکتۆر، بۆ ئەو دەمە من و تۆ نەمانتوانی ببین بە هاوڕێی ڕاستەقینە». بەو چاوە مۆنانەیەوە، چاوی کەسێک کە جگە لە خۆی هیچ شتێکی دونیای خۆشناوێت، گووتی «پیاوی سیاسی، تەنیا لە ناو خەڵکدایە. بەڵام هاوڕێ؟... پیاوی سیاسی کوا

هاوڕێی هەیە؟». کە دواتر بیرم لە قسەکەیکردوە هەستمکرد ڕاستییەکی زۆر تاڵی تێدایە، ئێمە هەموومان، هەموو ئەو نەوەیەی شۆڕشمانکرد و بەردەوام پێکەوەبووین، بەڵام کەسمان هاوڕێی یەک نەبووین... کەسمان، تەنیا پێکەوەبووین، وەک پێکەوەبوونی کۆمەڵێک بەرد، پێکەوەبوونی ڕیزێک درەخت.

ڕۆژێک بیستمان کە هەڤال شێرخان واز لە ڕابەری هێزەکەمان دەهێنێت و وەک ئەندامێکی ئەنجومەنی باڵا، ڕوودەکاتە بنکە قایم و جێگیرەکانی شۆڕش لە نابەینی چیا و ئەشکەوتە هەرە عاسییەکانی کوردستاندا. سەرەتا هەواڵەکەم بە یەکێک لە دەنگۆ و درۆبازییە زۆر و زەبەندەکان حیسابکرد. بەڵام دوای چەند سەعاتێک، هەواڵەکە بووە ڕاست و هەموو بە دڵنیاییەوە قسەیان لێدەکرد. هەر ئەو ڕۆژە بۆ شەو، شێرخان بانگیکردم و هەواڵی پێدام کە ئەنجومەنی باڵا جگە لە گواستنەوەی ئەو بۆ «دۆڵی قارەمانان» و بنکەکانی سەرکردایەتی، ڕەزامەندیان بە پێشنیارێکی گرنگی ئەو داوە، تا من هەڵاوێردن و وەک «ئەندامی پەیوەست» لە نێوان شاخ و شاردا کاربکەم. پێیگووتم «ئەم کارەی تۆ گرنگترین کارە لە شۆڕشدا، ترسناکترین کاریشە. ئەوەی بەم کارە هەستێت زۆربەی نهێنییە گەورەکانی شۆڕش دەکەونە بندەستی. زۆر شت لە سەر شۆڕش و شۆڕشگێڕان دەزانێت کە جگە لەو کەسی تر نایانزانێت، دەبێت بە خەزنەی نهێنی و گەنجینەی ڕاستییەکان. ئەوە ئیشێکە کەسێکی وریا، چەند چاو، تیژبۆنی وەک تۆی دەوێت، بەڵام لەوانە گرنگتر دەزانیت چییە؟... بێدەنگییە. لەمڕۆوە تۆ وەک تەتەرێکی نهێنیت لێدێت، وەک کەسێک کە هیچ کەس نازانێت چی دەکەیت، بۆ هەر مەبەستێک کەوتیتە ڕێ، وا خۆت نیشاندەدەیت کە بۆ کارێکی تر بەڕێوەیت. گەر ڕۆیشتی بەرەو خۆرهەڵات وا خۆت دەردەخەیت کە کارت

لە خۆرئاوا هەیە. نابێت هیچ کەسێک بزانێت دەچێت بۆ کوێ و لەبەرچی بەڕێگاوەیت. گەر زانیت ناناسرێیت ناوی خۆشت ئاشکراناکەیت. گەر زانیت دەناسرێیت، هەمیشە قسەی ئامادە و پلانی داڕێژراوت دەبێت. جگە لە چاو و گوێچکە و بۆنت، هیچ شتێکی ترت نییە بڕوای تەواوی بخەیتە سەر. هەموو کەسێک بە چاوێکی ورد دەخوێنیتەوە و ئەوە تۆمار دەکەیت کە خۆت هەستی پێدەکەیت، کە خۆت دەیدۆزیتەوە. جگە لە ئیشەکەت، جگە لە واجیبەکەت عاتیفەت نادەیت بە کەس. لەم ئیشەی تۆدا ئەو نهێنییە شەخسیانەی دەیزانیت، نرخی نهێنی سیاسی و حیزبیان هەیە. هەر نهێنییەکی لە تۆوە بڕواتە دەرێ، لە پلەی خیانەتدایە لە حیزب و نیشتیمان. حیزب لە بری ئاشکرابوونی هەر نهێنییەکی بۆی هەیە بتکوژێ. خیانەت لای ئێمە جگە لە کوشتن پاداشتی نییە. لەمڕۆ بەدواوە جگە لە من و ڕەئوف تاوس و میرزای بیرۆ و مەلا وەلید، فەرمان لە کەس وەرناگریت، کاری کەسێکی تر جێبەجێ ناکەیت. تۆ لەمڕۆوە لەم چوار کەسە زیاتر سەرۆک و سەردارت نییە. ئێمە فەرماندار و خاوەنی تۆین، دوای ئەو ڕێگایە دەکەویت کە ئێمە دەیکێشین، هەر زیرەکییەکت هەبێت، لەوەدا دەیخەیتە کار فەرمانی ئێمە وەکو خۆی جێبەجێبکەیت، نەوەک خەیاڵت بتبات و دوای عەقڵی خۆت بکەویت. لە ئێستاوە هیچ شتێکی تۆ موڵکی خۆت نییە، هەموو شتەکانت ساحێبیان هەیە. هەڤاڵی سەرۆک و جێگرەکەی ئاگادارن، ئێمە هەموو شتێک بەوان دەگەێنین. هەر ڕاپۆرتێک بە گرنگی بزانین و دڵنیابین ئێمە ناتوانین بڕیاری لێبدەین، دەیخەینە بەر دەستی ئەوان... بە وردی بۆ وەڵامی پرسیارەکانمان دەگەڕێیت، بە وردی زانیاری بۆ کۆدەکەیتەوە. ناپرسیت بۆ و نابێژیت نا».

من دەمزانی کە ئیشەکەم یەکێک دەبێت لە هەرە ترسناکترین ئیشەکان، بەڵام هێدی هێدی ئارەزوویەکی سەیر و تاریکم تێدا دروستدەبوو، خۆم

لە هێزی چەکدار دووربخەمەوە و وەک شۆڕشگێڕێکی بێپەیوەست و گەڕۆک بژیم. ئەو ساڵەی لەگەڵ مەفرەزەکاندا بردمە سەر، ساڵێکی زۆر خوێناوی بوو، چەند شەڕێکی گەورەمان لەگەڵ سوپای دەوڵەتدا کرد، بەڵام چەندین شەڕی قورسیشمان لەگەڵ هێزە سیاسییەکانی تردا هەبوو کە بە شۆڕشی چەواشە ناوماندەنان. تا دەهات دەستم زیاتر بە خوێندا دەچوو، کەم هەفتە هەبوو، هەستبکەم پاک دەرچووم. بەڵام تادەهات ئومێدم بە شۆڕش گەورەتر دەبوو... بڕوام بە سەرکردەکانم قایمتر دەبوو، چەندە لە ڕۆحی شۆڕش و دەزگا باڵاکانیشییەوە نزیک بکەوتمایەتەوە، ئەوەندە لە پێشمەرگە بچوکەکان دووردەکەوتمەوە. هەندێجار هەستمدەکرد گۆشەگیر خراوم و هەمووان بە مەبەست خۆیانم لێ بەدووردەگرن. دڵسۆزی زۆر بۆ شۆڕش کردبوومی بە پیاوێکی بەدگومان، بە کەسێک خەڵک وادەزانن تەنیا شتی پیس بۆندەکات. دەمبیستەوە ناویان نابووم «تانجی حیزب» «هەمیشە خەفەر» «هەڤاڵ بۆنحیز» « دکتۆر دۆگ» « جەنگیز بۆند» و دەیان ناویتر. بەڵام هەمووش دەیانزانی کە دەتوانم ژیانیان لێبکەم بە دۆزەخ... چەندانیان بینیبوو کە گومانی من ژیانی وێرانکردون. لە ڕوودا هەموو بەڕێز و لێوبەخەندە بوون، هەموو حورمەتیان لێدەباری، بەڵام لە دڵدا شتێکی دیم دەدی. من لە دوا ڕۆژەکانی ژیانمدا وەک پێشمەرگەی ناو بنکە و مەفرەزە گەڕۆکەکان، بە ڕاستی هەستم بە گەورەبوونی کینەکان دەکرد. هەر کەس تێکەڵ بە هێزەکەمان دەبوو، من ماوەیەکی درێژ وەک نەشتەرکارێکی نەخۆش کە لە ژێر ئامێرێکی نادیاردا لەشێکی زیندوو هەڵدڕێ و لە ناخی بڕوانێت، دەمخستە ژێر تیشکئامێرەکەی خۆم و دەمپشکنی. ئەو ماوەیە من بە جۆرێک گومانی خۆم دەخستە دوای، دواتر کە پاکی و دڵسۆزی دەردەکەوت، دڵی لە گومانی سەختی من هەر زویر و ناخی لە کینەی قووڵی من پاک نەدەبووەوە. ئیدی وایلێهات لە گیانی خۆم بترسم و لەبەر ترسی ژیانم خەوی ئاسوودەم

نەمێنێت. چونکە دەمزانی لە شوێنی تێکهەڵپڕژان و لە ساتی شەڕ لەگەڵ دوژمندا، دەتوانن «فرسەتی نامەردان» بهێنن و بمکوژن. ئاشکرابوو دکتۆر شێرخان ئاگاداری ئەو هەموو بێزارییەیە کە بۆنکردنی بەردەوامی من بە ڕۆحی ئەوانی دییەوە دروستیکردوە. بەڵام ئەو بوونی منی بە گرنگ دەزانی. هەڵبەت لەو جۆرە نەبوو گەر بکوژرێم، تۆڵەم بۆ بکاتەوە، یاخود هەردا و هەرد و شارە و شار دوای بکوژانم بکەوێت. نا، بەڵکو گەر بکوژرامایە دەیزانی شۆڕش چاوێکی وردبینی خۆی و پیاوێکی وەفاداری گەورەی لە دەستداوە... بەڵام ئەوەی بێئاگایی خۆم بەوجۆرە پاداشتی دابوومەوە و منی وەک کادرێکی گەڕۆک بۆ ئیشە هەرە گرنگەکانی شۆڕش هەڵبژاردبوو، ئەودەمە مایەی سوپاسی من بوو، گەرچی ساڵانێکی درەنگتر زانیم کە هەمیشە داخ لە دڵ و دژ بە من کینەبار بووە.

کە دوای ئەو دابڕانە درێژە گەڕامەوە بۆ شار، بە بینینی چراخانە کز و ڕاکشانە غەمگینەکەی خۆشییەک نەکەوتە دڵم و فرمێسکێک نەزایە چاوم. شتێکی نوێم لەو شارە نەبینی، لە ڕاستیدا دەمەوێت درۆتان لەگەڵ نەکەم، من ئەوکات عاشقی هیچ شوێنێک نەبووم، جێگاکان لای من جێگابوون و تەواو... مرۆڤ لای من کوڕی ئەو جێگایەیە کە ئەو ساتە لە سەری وەستاوە، تەنیا موڵکیشی لە سەر زەوی ئەو شوێنەیە کە لەو چرکەیەدا قاچی ناوەتە سەر. موڵکەکانی تر هیچی هی ئەو نین... ئەو شارەی تۆی لێ نیت، هی تۆ نییە، ئەو کوچەیەی تۆی لێ نیت هی تۆ نییە، ئەوماڵەی لە سەر کاغەز بەناوی تۆوەیە و تۆی تیانیت، هی تۆ نییە. تەنیا ئەو بستە خاکە هی تۆیە کە ئێستا لە سەری وەستاویت. لە بەرئەوە لە ژیانمدا هەستی ئەوەم نەبووە بیری جێگاکان بکەم... ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت من گەڕۆکێکی هەمیشەیی

بووم. کە گەڕامەوە ئەوەم لە خەیاڵدا نەبوو، چاوم پڕبێت لە ئاو و سۆزم کەفبکات و هەناسەم تەنگ بێت. نا... ئێرەش لای من هیچ نەبوو جگە لە شارێک... شارێک وەک ملیۆنەها شاری تر. ناشیرینترین شار نییە، جوانتریش نییە، بێبایەخترین شار نییە، گرنگتریش نییە، بەڵکو شارێکە و هیچی دی... بێ هیچ شتێکی گرنگ... تێیدەچیت بۆ ئەوەی ئیشێک ئەنجامبدەیت و تەواو. شارێک لە بەربەست و دیوارگەلێک دروستبووە کە ئەوانی تر دروستیانکردوە بۆ ئەوەی بڵێن ئێرە شوێنی تۆ نییە، لە ماڵ و دەرگا و بەربەستانێک کە ئەوانی تر دوستیانکردوە تا بڵێن ئێرە ماڵی تۆ نییە، لەو شەقامانەی کە بۆت نییە لە هیچ جێگایەکیدا بەدڵی خۆت بوەستیت، چونکە شەقامی تۆ نییە... شارێک هەموو شتێکی ئەوەت یاددەخاتەوە کە هی تۆ نییە. دوکانەکانی، ئوتێلەکانی، چێشتخانەکانی. هەموو جێگاکانی بە جۆرێک لە جۆرەکان هی تۆ نین. بەڵام بەردەوام مەحکومیشی بەوەی بڵێیت «شارەکەم... شارەکەی من... شارە خۆشەویستەکەم». نا من نەمدەویست درۆی وابکەم. من هەرگیز شارم نەبووە و نامبێت، هەتا ئەو کاتانەش کە بووم بە بەرپرسێکی گەورەی دەزگای ئەمنییەت و شار لە بەردەممدا کراوە بوو، هەتا ئەو کاتانەش هەستم نەکردوە کە شارم هەیە.

لە شار دەبوو بچمە ماڵێک کە حیزب بۆی دیاریکردبووم، ماڵی خزمێکی مەلا وەلید، بێوەژنێکی بە تەمەن و کوردپەروەر کە مێردەکەی لە باشوور بە دەستی عەرەبەکان کوژرابوو. دوو کوڕ و کچێکی هەبوو، خۆیان تازە لە باشوورەوە گەڕابوونەوە بۆ باکوور، من وەک برای شوعلە خان و خاڵی منداڵەکان خۆم دەناساند و کەس گومانی لێ نەکردم. کوڕ و کچێکی قوتابی زانکۆ بوون و کوڕێکی دیکەشی لە ئامادەیی بوو. لەوێ ژوورێکی بچوکیان بۆ جیاکردمەوە، ئەوێ هەم بوو بە ماڵ و هەم بوو بە شاری من. مرۆڤ دوای ماوەیەکی درێژ لە ژیانی بنکە و گەڕۆکی

پێشمەرگایەتی کە دەبێت بە خاوەنی ژوورێکی خۆی، هەتا ئەگەر بۆ یەک شەویش بێت، هەستدەکات بۆتە پادشاهی سەر زەمین. بۆ پیاوێکی وەک من کە تووشی نەخۆشی چاوەدێری و بۆنکردن بە ڕۆحی خەڵکەوە بووبووم، هیچ جێگایەک لە ژوورێکی خاڵی خۆشتر نەبوو... ئاە... ژوورێکی خاڵی کە بەتەنها هی خۆت بێت. هیچ شتێک نەبێت لە دونیادا خەیاڵی بخەیتەسەر، جگە لە بنمیچێکی ڕووت، هیچ نەبێت سەیریبکەیت جگە لە دیواری ڕووت. هیچ نەبێت بۆنیبکەیت، گومانی لێبکەیت، تۆیکاریی بۆ بکەیت. ئەوە لە هەموو ئازارەکانت ڕزگارتدەکات، لە هەموو ئەو خولیایانەی غەریزەکانت دەخرۆشێنن و بەرەو خۆیان کێشتدەکەن. من پێمگووترابوو گەلێک بەوریایی بجوڵێمەوە، بەڵام بۆنی خۆم و سەلیقەی خۆم گەورەترین قەڵغانم بوون، مرۆڤ لە شۆڕشێکی وەک ئەوەی ئێمەدا کە بەدەیان جۆری دوژمن گەمارۆدرابووین، دەبوو هەموو هەستە سەرەتایی و گیاندارئاساکانی خۆی لە خەو بێداربکاتەوە، ئەو هەستانەی کە لە مرۆڤی ئاسایی و لە ژیانی ئاساییدا دەمرن، ئەو هەستە تیژانەی وات لێدەکەن خەتەر بەر لە نزیکبوونەوە و دوژمن بەر لە پێوەدانی هەست پێبکەیت. من لەو ساڵەدا لە چیا کە بەردەوام لە بەردەم مەترسی مردن و پەلاماری دوژمنێکی نادیاردا بووین، وەک حەیوانێکم لێهاتبوو کە لە دارستانێکی تاریکدا دەڕوات و تەنیا بە هەستە شاردراوەکانی ڕێگا بۆ خۆی دەکاتەوە. تەواوی دونیا لە بەرچاوم بووبوو بە جەنگەڵێکی ترسناک کە دەبوو هەموو هەستە دێرینەکانمی بۆ زیندووبکەمەوە، هەموو چاوە نهێنییەکانی ناو سەرمی بۆ دابگیرسێنم، هەموو گوێ شاردراوەکانی ناو خۆمی بۆ بدۆزمەوە... هەر هەستێک کە باپیرە دێرینەکانمان لە دارستان و کێوەکاندا کاریان پێکردوە بیخەمەوە کار. لە شاریشدا غەریزە و هەستە تیژەکانم هەر زیندووبوون... بەڵام بە جۆرێک کارمدەکرد، کەس ئەو هەستە زیندوو و پەنهانانەم نەبینێت.

یەکەم کەس کە لە ڕێکخراوەکانی ناو شاردا پەیوەندیم پێوەکرد، ئەردەڵان هیرانی بوو، یەکەم شتیش سەرنجمدا ئەوەبوو کە شانەکان و تەواوی ڕیزی ڕێکخستن ناڕێک و پچڕاو و بێسەروبەرەیە. چەندەها شانەی بچوک هەن کە پەیوەندیان بە ڕێکخستنی سەرەکییەوە نەماوە، نە جێگایەکی بڕیار و نەسەرێکی دیاریکراوی بەرپرس هەیە. هەڵبەت لە سەرەتای ساڵدا سەرانی یەکەمی ڕێکخستنی شار کەوتبوونە دەستی دەوڵەت و لە زینداندابوون، لە بەرئەوە ڕێکخراوەکان تەواو هەڵوەشاو و پەیوەندییەکان زۆریان پچڕابوون. ئەوەی سەرنجی منی ڕادەکێشا ئەو خەتەبوو کە لە زانکۆدا بەدەر لە ڕێکخراویی گشتی، سەربەخۆ گەشەیکردبوو. بەرپرسی ڕێکخستنەکانی زانکۆ ئەردەڵان بوو، ئەو بۆ خۆی ڕابەرایەتی چەند شانەیەکی بچوکی دەکرد کە زۆربەیان لە ژێر ناوی حیزبدا چالاک بوون و کۆبووبوونەوە. ئەردەڵان گەرچی هیچ کەسێکی باڵاتری نەبوو، خۆی کەناڵێکی لێدابوو و سەربەخۆ ڕێکخستنێکی بۆ حیزب دروستکردبوو، بەڵام لەو شۆڕشگێڕە دڵسۆز و فانەتیکانە بوو کە خەیاڵی شۆڕش بە جۆرێکی هیستیریی دەچێتە سەریانەوە. لە پاڵ ئەوەدا و بە هانی هیرانی و بە کۆمەکی ئەو، هۆشەنگی بولبولیار خەتێکی تری سازاندبوو کە پتر لەو خوێندکارە مارکسیانەبوون کە بە دروستی نەیاندەزانی بە ڕاستی لە حیزبدان یان نا... حیزب ئەوەیە کە ئەوان دەیانەوێت یان شتێکی ترە؟. لە ڕێگای نزار ئیدریسیشەوە کە هەر بە جۆرێک لە جۆرەکانی لە سەر ڕێکخستنەکانی هیرانی حیساب بوو، هێڵێکی تر لە ناو قەساب و دوکانداران و گەنجانی بێئیشدا دروستبووبوو کە ئەوانیش هێندەی بیرۆکەی شۆڕش دەیخرۆشاندن، شتێکیان لە سەر سیاسەت نەدەزانی. هەڵبەت دەبوو لە هەمانکاتدا پەیوەندی بە هەندێ کەسانی تر و هێڵی پچڕاو و شانەی ترازاوی دیکەشەوە بکەم. سەرەتای

ئیشکردنم ئەوەبوو کە حیزب دەبێت بیسەلمێنێت لێرەیە، خەڵکی و دوژمن بزانن شۆڕشگێران بە قورسی گەڕاونەتەوە. ئامۆژگارییەکان ئەوە بوون کە دووان لە پیاوە هەرە دیارەکانی دەوڵەت بکوژین. لە کۆبوونەوەکەی غەمپاشادا بولبولیار گوتی کە خۆی و شانەکەی لە ئێستادا ناتوانن لە کاری کوشتندا بەشداربن و واتێدەگات کە ئیشی شۆڕش سەرەتا پەروەردەکردنی مرۆڤەکانە... بەوەدا تا ئێستاش بە وردی نازانن ماهییەتی سیاسی شۆڕش چییە، ئاخۆ تەنیا بزوتنەوەیەکی ناسیونالی تازەیە، یاخود هێزێکی پرۆلیتارییە، یان جەوهەرێکی دیموکراسی هەیە، ناتوانن بەشداری هیچ چالاکییەکی سەربازی بکەن. بەڵام لە غەمپاشا هەر یەک لە ئەردەڵان و نزار و نەغەدە ماردینی لە سەر کوشتنی عادیل مامە و لیڤیتانت هومەر بۆتانی ڕێکەوتن.

لە بەیانی ڕۆژێکی هەتاودا، لە بەیانییەکی ساف و شین و بەهەشتیدا، عادیل مامەمان لە بەردەمماڵی خۆیدا کوشت. من ساتی کوشتنەکەی لە بەردەم نانەواخانەیەکدا لە سەرەی نان کڕیندا وەستابووم و لەدوورەوە سەیرمدەکرد.

## نەغەدە ماردینی و نزار

نەغەدە دووبارە کە جارێکی دیش گەڕایەوە بۆ ماڵ، دیسان کاتی نەبوو شیعری پەترۆس بخوێنێتەوە... دوو جار دەستی بۆ برد هەڵیبگرێت و دەستی گێڕایەوە، دواتر کە تەواوی سەرمێزەکەی کۆکردەوە بە خەیاڵەوە خستییە ناو کتێبێک و تا چەندین ساڵ دواتر ئەو شیعرەی نەدۆزییەوە. لەو کاتەدا نەغەدە ماردینی جگە لە نزار، هیچی دی لە خەیاڵدا نەبوو.

کە ئەو ڕۆژە لای نزار ئیدریس گەڕایەوە، هەستیکرد وەختە لە چوار دیواریماڵی خۆیدا دەخنکێت. کەستان واتان لێهاتووە ڕقتان لە هەموو شتێکی ماڵی خۆتان بێت، لە دەرگاکان، لە پەنجەرە، لە مێز، لە کورسی، لە مەنجەڵ، لە گوڵ، لە ئاوێنە، لە هەموو شتێک، هەموو شتێک، چونکە پێکڕا ژیانێکت بیردەخەنەوە کە تۆ ناتەوێت. دەبوو شتێکی گەورە لە ژیانیدا روویدات، شتێکی گەورەش لە ژیاندا جگە لە خۆشەویستییەکی گەورە هیچی تر نییە. بەڵام هەستیکرد گەر بەراستی یەکێکی خۆشبوێت، دەبێت بەرامبەر ئەوە ڕقی لە زۆر کەس و زۆر شتی تر بێت. لە دڵی خۆیدا گووتی «من لەو شاعیرانە نیم کە یەکێکیان خۆشویست، ئیتر بە هۆی ئەو عەشقەوە هەموو گەردونیان خۆشدەوێت. نا من لەوانە نیم باوەڕم بەوە بێت ژنان هەمیشە دەبێت ناسک بن، شیعر دەبێت ناسک بێت، ژنی شاعیر دەبێت ڕۆمانسییەک بێت کە لە عەشقی دار و بەرددا دەتوێتەوە... نا من لەوانە نیم». لە ناخی دڵەوە هەستی بە رقێکی شاردراوە و قووڵ کرد دژی هەموو شتەکان. ساتێک بوو لەو ساتانەی مرۆڤ ناتوانێت هەستی خۆی وەسفبکات، تێیبگات، ئاڕاستەیبکات. لە یەک شت دڵنیابوو، دونیا لێرەدا و لەم ژوورەدا کۆتایی نایەت. ئێرە تەنیا ژوورێکە، دکتۆر مستەفا شوکاک تەنیا پیاوێکە، ماڵەکەی تەنیا جێگایەکە. واتە لە دەرەوەی ئەم ژیانە هەزار ژیانی تر هەیە، هەزار جێگای تر هەیە تێیدا بژی. دیسانەوە لە دڵی خۆیدا گووتی « گەر هەموو ژیانم، تەنیا بەوە ڕازیبم کە خودا داوێتی، هیچم لێدەرناچێت. شتێکی کەم بە دەستی خۆت دروستیبکەیت، باشترە لە شتێکی زۆر کە خودا بیبەخشێت».

نزار ئێستا ئەو ژیانەی ترە، ئەو جێگایەی ترە، کە ئەم بۆی دەگەڕێت... هەستی نەکرد لەبەر شتێکی تایبەتی نزاری خۆشدەوێت، بەڵکو ئەو تەنیا سەرەتای کیشوەرێکی ونە، دەرگایە بۆ سەر زەمینێکی خەیاڵی و دوور. دڵنیابوو کیشوەرێکی ون هەیە و دەبێت ئەم بەرەو

ئەوێ سەفەربکات، ئەو کیشوەرەش هیچ نییە لە ژیانی ئەوانی تر. لە ناخەوە دەیویست لە بری ژیانی خۆی، ژیانی یەکێکی تر بژی. ژیانی خۆی ئەوەیە کە لێرەدا دەیبینێت، ئەوە چەندین مانگە دەیچێژێت، گەر چەندین ساڵی دیکەش دانیشێت، هەر دووبارەبوونەوەی دوێنێ و پێرێ و مانگێک لەوەوبەرە. چاوی لێکنا و گووتی «ژیانی ئەوانی تر... ژیانی ئەوانی تر». لەو کاتەدا بە وردی نەیدەزانی «ژیانی ئەوانی تر» چییە. ژیانی ئەوانی تر یەک مانای هەبوو، لە ژیانی خۆت هەڵبێیت... ژیانی خۆت نەژیت. تەنیا شتێک شاعیرەکان دەتوانن تاقیبکەنەوە، ئەوەیە ژیانی ئەوانی تر تاقیبکەنەوە. وەک چۆن یەکێک جل تاقیدەکاتەوە، مرۆڤ بە هەمانجۆر دەتوانێت ژیان تاقیبکاتەوە. جۆرەکانی، ساتەکانی، ڕۆژەکانی، شوێنەکانی... هەموویان ژیانن. لەوێدا دانراون بۆ ئەوەی مرۆڤ تاقیانبکاتەوە.

بۆ ڕۆژی دوایی گەڕایەوە لای نزار، ئەو هەر لە سەرەتاوە بەوە دەستی پێکرد وەک ژنی دکتۆر بانگیبکات. لە ناکاو نەغەدە دەستی خستە سەر دەستی و پێیگووت «تکایە جارێکی تر بە ژنی دکتۆر بانگم مەکە، چونکە دەمەوێت ژیانێکی تر بژیم». نزار ئیدریس سەرسامانە سەیریکرد و گووتی «ژیانێکی تر. وای ژنی دکتۆر، گەر بۆ گورگ دەگەڕێیت بتخوات، من گورگم. پێمبڵێ دەتەوێت گۆشتی خۆت بخەیتە بەردەمی گورگ یان نا، دەتەوێت یان نا». یەکسەر دەستی گرت بە ناوچاوانی خۆیەوە و گووتی « وەک شاعیرێک حەزدەکەم دەمی گورگیش تاقیبکەمەوە، بۆ نا، ژیان لەگەڵ گورگدا، ئەویش جۆرە ژیانێکە کە دانراوە، لەوێدا هەیە، مرۆڤ دەتوانێت تاقیبکاتەوە. بەڵێ دەمەوێت گۆشتی خۆم بخەمە بەر دەمی گورگیش، هیچ نەبێت شتێکی ترە جیاواز لەم ژیانە پڕوپوچە ناخۆشەی من». نزار گووتی «ها دەتەوێت گۆشتی خۆت بخەیتە بەر دەمی کەسێک کە هێندە دڕندە بێت، بیخوات، گازی وەحشیانەی لێبگرێت،

بیجوێت». لە تەنیشتییەوە دانیشت و گوتی «نزار بۆم باسبکە، تۆ چ جۆرە ژیانێک دەژیت». «ژیان؟ من ئەو ژیانە دەژیم کە دوو شتی تێدا نییە، ئەخلاق و بەزەیی. کە لەدایکبووم، هەردووکیانم لەگەڵ پەڕۆوپاتاڵە پیسەکانی منداڵیدا فرێدا. من ئەو ژیانە دەژیم. وادەزانی من بۆ لێرەم. لە بەرئەوەی هیچ شتێک ناموەستێنێت. بە ڕای تۆ چی هێزێک مرۆڤ دەوەستێنێت، ها ژنی دکتۆر، چی شتێک؟. ڕێز مرۆڤ دەوەستێنێت؟ هەڵبەت کە خەڵکی تر هەموو دەیانەوێت بەڕێز بن، هەموو دەیانەوێت بڵێن، من پیاوێکم حورمەتی خۆمم هەیە. ئەوەی وا لە یەکێک دەکات خەڵکی ناوی بنێن پیاو چییە؟ پیاوی ناو پیاوان، ها پیاوی ناو پیاوان کێیە؟. تۆش دەزانیت کێیە، دڵنیام تۆش دەزانی پیاوێکی بەڕێزە کە دڵی پڕە لە بەزەیی و ڕەحم. ها ژنی دکتۆر موستەفا شوکاک، خەڵکی ڕێزیان دەوێت، حورمەتیان پێویستە، داوای بەزەیم لێدەکەن، منیش نیمە... یەعنی ئەگەر ژنێکی وەک تۆ حەز لە من بکات، چاوەڕوانی چی دەکات. چاوەڕوانی ڕۆمانسییەت، خۆشەویستی ئەبەدیی، عەشق کە جەرگ و دڵ دەسووتێنێت، بەڵام من نیمە... هیچیانم نییە. گەر چاوەڕوانی ئەوە بکەی، بڵێم ئۆی عەزیزم تۆ مانگی منیت، تۆ ڕێحانەی منیت، تۆ شەربەتی زیندەگی منیت... نا من میزدەکەم بەو شتانەدا. من بیر لەوە دەکەمەوە، شتێکی خۆشە چەورەیەکی وەک من، چەقۆکێشێکی وەک من، کە بۆنی قەسابخانەکانم لێدێت، لەگەڵ ژنی گەنجی دکتۆرێکدا بخەوم، ڕووتیبکەمەوە، لەگەڵ ژنێکی مێرددداردا. هەر تەنیا ئەوەی کە پەیوەندیم لەگەڵ ژنێکی گەنجی وەهادا هەبێت، خەیاڵمدەکاتەوە. تەنیا خەیاڵم لای ئەوە دەبێت لە ناو جێگادا چیت لێدەکەم، لەوە زیاتر شتێکی تر بە مێشکمدا ناڕوات. ئەوە ڕاستیەکەیەتی، سەری من لە شتی پیس و چەپەڵ و خەیاڵاتی خراپ بەولاوە هیچی تری تێدا نییە... من پیاوێکی بێشەرەفم، دەزانی ئێستا کە چاوم دەنوقێنم بیر لە چی دەکەمەوە...

دەزانیت، بیر لەوە دەکەمەوە تۆ بە رووتی چۆنیت و لە چی دەچیت».

نەغەدە بە سەرسامییەوە سەیریکرد و باوەڕی بە گوێی خۆی نەدەکرد. هەستیدەکرد یەکەمجارە پیاوێکی ڕاستەقینە دەبینێت، کەسێک کە خۆی مەکیاژ ناکات، کەسێکە کێوی و دڕ، هەتا لەوانەیە بتوانێت دڕندەش بێت. پیاوێک کە لە پیاوە دەستکردەکانی تر ناچێت، پیاوی دەستکردی ناو فیلمە میسرییەکان، پیاوی دروستکراوی ناو کتێبەکان، پیاوە بەڕێزەکانی وەک باوکی کە هیچ شتێکیان تێدا دەرناکەوێت، مرۆڤ بزانێت ئەم هەموو منداڵەیان چۆن دروستکردوە. پیاوانی وەک دکتۆر مستەفای مێردی کە کەس نازانێت لە ژێر ئەو بەروانکە سپییەوە، چی هەوا و ویستێکیان شاردۆتەوە... مرۆڤ چییە؟ تۆپەڵێک درۆ، تۆپەڵێک درۆی بەیەکەوە نراو. بۆ دەبێت پێی ناخۆش بێت گەر کەسێکی ڕاستەقینە بناسێت، کەسێک کە راستییە ناشیرینەکەی خۆی دەڵێت. ئەوە بە خەیاڵیدا تێپەڕی کە خۆی لە دوو ڕۆژی ڕابوردووەدا بیری لەوە نەکردۆتەوە، بیری لە خەوتن لەگەڵ نزاردا نەکردۆتەوە، بەس بیری لای ژیانێکی تر بووە. هەڵبەت ژیانێکی تر، ئەوەشی تێدایە لەگەڵ پیاوانی تردا بچیتە جێگاوە. ئاە... بە خۆی گووت «بەڵام تۆ ترسنۆکتری لەوەی یەکسەر بیر لەوە بکەیتەوە». بە خۆی گووت « ئەوەی زۆر حەزم لە سێکس نییە، ڕەنگە هۆکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆر حەزم لە شوکاکی مێردم نییە».

لەو ساتەدا وادەرکەوت وەک ئەوەی قسەکانی نزار جگە لە خەندەیەکی بچوک، هیچ شتێکیان تێدا دروست نەکردبێت. نزار دەیزانی کە ئەو قسانە دەکات، ژنان هەمیشە خۆیان وادەردەخەن وەک ئەوەی تووشی شۆک بووبن، باوەڕ بە گوێی خۆیان نەکەن، زۆربەیان هاواردەکەن «بێشەرەفی بێتەربێت». هەندێکیان بە تووڕەیی و بە تۆنێکی هیستیرییەوە وادەڵێن و وەک خۆیان لە شەیتانێکی گڵاو دووربخەنەوە، دووردەکەونەوە. هەندێکیان پێدەکەنن و دووردەکەونەوە... هەندێکیان مۆن دەبن و دووردەکەونەوە.

بەڵام نەغەدە، لە بری ئەوەی دووریکەوێتەوە، کەمێک زیاتر نزیکبووەوە و گووتی «دەترسم گەر بمبینیت ئەو شتە نەبم کە چاوەڕوانی دەکەیت... واز لەو قسانە بهێنە، من شیعرێکم نوسیوە، دەبێت بیبینیت».

لەو ساتەوە بە دواوە، پەیوەندی نزار و خانمی نەغەدە ماردینی شێوەیەکی تری وەرگرت. نەغەدە هەستیکرد ئەم پیاوە تا زیاتر ترسناک بێت، بێباک بێت، بێحورمەت و کێوی بێت، لە دونیای هاوبەشی دکتۆر جەلال ماردینی و مستەفا شوکاکی مێردی زیاتر دووریدەخاتەوە. جگە لەم بێڕەوشتییە جوانە، جگە لەم خۆلادانە قەشەنگە لە ئەخلاق، هێزێکی ڕاکێشانی گەورەتری لەم کوڕەدا دەبینی، کە نزار باسی ئەوەی بۆ کرد زۆر دەخوێنێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت باشتر درۆ لەگەڵ ژیاندا بکات، زیاتر خەڵک فریوبدات، وەک درۆزنێک و فریوبازێک گەورەتر دەربکەوێت، زۆرتر پێی سەرسام بوو. گەنجێکی بێسەواد نەبوو، بەڵام بۆ ئەوە دەیخوێندەوە تا دواتر گاڵتە بە کتێب و دونیا بکات. کە شیعرەکەی نەغەدەی خوێندەوە، گووتی «بنوسە، خانم بنوسە.. نوسین وادەکات ئەو شتەی بە قسە و کردەوە دەرەقەتی نایەیت بە نوسین بیکەیت. نا من قەت پێویستم بەوە نابێت بنوسم، جانەوەرێکی ئازاد و بەرەڵای وەک من چ پێویستی بە نوسین هەیە؟ نوسین بۆ یەکێک باشە جانەوەرەکەی خۆی لغاو کردبێت».

نەغەدە لە دڵی خۆیدا، گووتی «ئەو گیانەوەرە وەحشییەی تۆ لە منیشدا هەیە». لەگەڵ ئەوەی دەیزانی توانای زمانەوانی ئەم لە توانای نزار کەمتر نییە، بەڵام نەیدەتوانی بە ئاشکرا باس لە جانەوەرە دانتیژ و چڕنوکدارەکەی ناو خۆی بکات. بۆ ئەوەی بە سەر ئەو شەرمە مەلعونە، دێرینە، ڕەقەدا سەربکەوێت، دەبوو بە هێواشی بڕوات. بەڵام ئەم کوڕە لەوەدەچێت بیەوێت بێچووە ئاسکێکی یەک سەعاتە، کە هێشتا ناتوانێت ئەژنۆ شلەکانی توند ڕابگرێت، وەک ئاهووی بە ئەزموونی ناو بێشە

رابکات و قەڵەمبازان بدات... لە دڵی خۆیدا گووتی «وەهایە، خێراکان پاداشتی خۆیان وەردەگرن. ئەوان پاداشتی خۆیان هەیە». بۆ ئەوەی تۆزێک ئارام بێتەوە، بۆ ئەوەی ون نەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بە سەر شەرمە مەلعونە، دێرینە، سەختەکەی خۆیدا زاڵ بێت بە پێکەنینەوە پرسی «نزار، جگە لە بێشەرەفی و قەسابی تۆ چ شتێکی تر باش دەزانی؟». نزار دایە قاقای پێکەنین، هیچ ژنێک تا ئەوکات شتی وای لێ نەپرسیبوو، ژنان وەک کۆمەڵە مەکینەیەک وان بەرهەمی یەک کارخانە بن، یەکسەر پرسیاری ئەوە دەکەن «ژنت هێناوە، منداڵت هەیە، بۆ نەتهێناوە، ئەی چی دەکەیت، ئەی بۆ نایهێنیت». بەڵام ژنێک لێیبپرسێت لە بێشەرەفی و قەسابی، بەولاوە چیتر باشتر دەزانی، شتی وەها نەبووە. تۆزێک وەستا و گووتی «باشترین شتێک کە دەیزانم گۆرانی گووتنە... ئەوە لە بێشەرەفی و قەسابی باشتر دەزانم». نەغەدە بە سەرسامییەوە گووتی «دەتوانی گۆرانییەکم بۆ بڵێیت، بەڵام بە سووکی خەسووم گوێی لێ نەبێت». نزار سەیریکرد و هەستیکرد ئەم ژنە لەوانی تر ناچێت، نەغەدەش لە دڵی خۆیدا گووتی «ئاە چاوی چەند جوانە، چەند جوانە». نزار یەکێک لە گۆرانییە باوەکانی ئەو سەردەمەی بە دەنگێکی هێمن بۆ گووت، لە کاتی گۆرانی گووتندا، پێدەچوو جانەوەرەکەی ناویشی بێدەنگ بێت و گوێبگرێت. پێشتر نەغەدە هەستی وەهای نەبوو کە پیاوێک بتوانێت بە دەنگی کێشیبکات، دەیزانی کچانی تر دەنگی پیاو سەرسامیاندەکات، لە هۆش خۆیان دەچن، بەڵام ئەو ئەمە یەکەمجارە هەستبکات دەنگێک هەیە مەستیبکات، حەزێکی گەورەی هەبوو لە کاتی گۆرانی گووتندا خۆی فرێبداتە باوەشییەوە و ماچیبکات. لە دڵی خۆیدا گووتی «بۆ ئێرە ماڵی خەسوومە، بۆ ماڵی خەسوومە؟ چ بێمانایە، ئەگەر ئەوێ نەبایە ئێستا ماچمدەکرد». نزار دەیزانی دوای گۆرانی گووتن، ژنان لەگەڵیدا پتر دیوە ژنانەکەی خۆیان ئاشکرادەکەن، پتر دەبن بە ژن، گەر تا

ئەوکاتە ئارەزوویان نەبوویێت بچنە باوەشی دوای ئەوە دەمرن بۆی. بەڵام وەک ڕەفتاری هەمیشەیی خۆی، وەک کەسێک حەزی لەوەیە نەهێڵێت بەرامبەرەکەی لە جێگایەکی نزیک لەو لەنگەر بگرێت، کەسێک قسە لە ناشیرینی خۆی دەکات تا لەلایەکی دیکەوە سیفەتی ڕاستگۆ و سیحری کەسی ناوازە وەدەستبخات، دەکەوێتە زێدەڕەوی لە خۆگوناهبارکردندا تا لە ژنانی نزیک خۆیدا، هەم ئەو گوناهبارە لە خەو هەستێنێت، هەم وێنەی پیاوێک بەخۆی ببەخشێت کە پێشتر نەیانبینیوە، مەخلوقێک کە ترسی نییە لەوەی هەقیقەتی خۆی بخاتە بەر دەستیان و دەمامکیان بۆ لادات، تا ئەوانیدی بهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کەسێکی وا ڕوون، کەسێک کە پێچەوانەی هەموانە و بێدەمامک دەژی ناکرێت دوای هێز و ئەفسونی نەکەویت. گووتی « ژنەکەی مستەفا شوکاک... دەزانیت یەکێک لەو گاڵتانەی خودا بە مرۆڤی دەکات چییە، دەزانیت چییە؟ زۆر جار خۆشترین دەنگ دەبەخشێت بەو کەسانەی خۆیان عاتیفە و هەستیان نییە. وەک من... وەک من... کاتێک گۆرانی دەڵێم تۆ وادەزانی ئەو سۆزەی لە دەنگمدایە ئاوێنەی دڵمە، بەڵام خاسە ژنی دکتۆر، وانییە... ئەوە درۆیە. من وەک شریتێکی بێگیان وەهام خودا پەنجەی پیابنێت. چەند عاتیفە لە کاسێتێکی ڕەق و ساردا هەیە، ئەوەندەش لە مندا هەیە. من دەزانم وشەکان بە سۆزەوە بڵێم، بەڵام سۆز... سۆز خۆی چییە؟ نازانم».

تا ئەو زیاتر دەمامکی لابردایە، نەغەدە پتر دەکەوتە داوی. ویستی پێیبڵێت «پێویستیم بە دەنگتە، بە لەشتە، بە نیگاتە، بە بۆنتە... وەک ڕێگایەک بە ناو دارستانێکدا. ڕێگایەک پڕە لە مەترسی، بەڵام من حەزم لە بۆنی گیاکانێتی، حەزم لە دەنگی باڵندەکانێتی، حەزم لە سێبەری ترسناکی درختەکانێتی. بەلامەوە گرنگ نییە دەگاتە لانەی چ ئەژدیهایەک، بەڵکو دەبێت بەو ڕێگایەدا بڕۆم، چونکە سیحری ڕێگاکە لە ئازاری مردنەکە گەورەترە».



لە ڕۆژانی داهاتوودا نەغەدە ماردینی و نزار دەگەنە جێگای ترسناک لە پەیوەندییەکەیاندا. شتەکان دەگەنە ئەوەی دواجار خانمی ماردینی، سەرخەوێکی خەسووی بەفرسەت بزانێ و بچێتە باوەشی ئەم بریندارەوە کە تا برینەکانی زیاتر سارێژدەبن، زیاتر وەک پڵنگێکی لێدێت بە تەواوی هێزی خۆیەوە شێتانە بازدەداتەوە ناو ژیان.

ئەوەی ئێستا من دەیزانم ئەوەیە لەو دەمەدا هەموو دەبیستن کە شۆڕش هێدی هێدی و بە جۆرێکی بچوک دەستی پێکردۆتەوە، دەنگوباسی بینینی مەفرەزە چەکدارەکان لە هەموو جێگایەک بڵاودەبێتەوە. نزار کە لەوە دەترسێت لیڤیتانت وازی لێ نەهێنێت و لە هەر جێگایەک خۆی قایمبکات بیدۆزێتەوە، بیر لەوەدەکاتەوە لیڤیتانت بکوژێت. نزار کە لە ماڵی بابی دکتۆر شوکاک دەچێتە دەرێ، بە کۆمەکی قزڵباش لە قەراغ شار لای هاوڕێیەکی کۆنی گەنجێتی کە کاری وەستایی و تەختەبەستنە هەم جێگا بۆ خەو و هەم بۆ کار دەدۆزێتەوە. لەو دەمەدا نەغەدە هەموو فێڵێک دەکات بۆ ئەوەی لە شەوانێکدا دکتۆر لە ماڵ نییە بیخاتە جێگاکەی ئەوەوە، گەر دەمێکیش بێت هەواڵی ببڕێت وەک شێتی لێدێت، هەمیشە بە چاویلکە و لەچک و جلی وەهاوە کە کەس گومانی لێ نەکات، دەچێتە ژوورە ناچیزەکەی نزار، وەک شێت ماچیدەکات، وەک شێت دەچێتە باوەشی، وەک شێت داوای لێدەکات لەگەڵیدا بخەوێت، وەک شێت شیعری بۆ دەنوسێت... لای ئەو نزار پردە بەرەو سەر زەمینێکی تر... نازانێت ئەو سەر زەمینە چییە و لە کوێدا دوایی دێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە سەر زەمینێکی ترە، خاکێکی دیکەیە، لەوێوە دەنگێک بانگهێشتیدەکات و دەبێت بەرەو ئەوێ بڕوات.

## سەعید یۆنان

ئەمڕۆ گەلێک نەخۆش بوو. بەڵام جارێ لێم مەپرسن ئەو کێیە، ئەو چییە، چ دەردێکی هەبووە. بەڵام بزانن نەخۆش بوو، چیتر ئەو هێز و گوڕەی نەبوو وەک جاران لەگەڵمدا بگەڕێت. خۆی پێیگووتم بە دوای یەکێکی نوێدا بگەڕێم چیرۆکی ژیانی نوێی پێبێت... لەو دەمەدا من سەعید یۆنانم دووبارە دۆزییەوە و ئەمجارە لە نزیکترەوە ناسیم. من و سەعید لە پسمامان شتێکی ئەوتۆمان لە نێواندا نەبوو، بەڵام دوای زیاد لە سێ ساڵ، کاتێک دووبارە بینیمەوە، کەسێکی دی بوو، هیچی لەو ڕۆشنبیرە لاوازە نەدەچوو کە لە پسمامان بینیبووم، بوو بوو بە چیرۆکنوسێکی غەمگین، لەوانەی حیکایەتەکانی خۆیان دەیانکوژن... زەمەن گۆڕیبووی بۆ مرۆڤێکی تر.

یەکەم پرسیاری ئەوەبوو «تۆ چیرۆکی جوانت بۆچییە؟ چ کارێکت داوە لە چیرۆکی جوان؟ کەی ئەوە دونیای تۆیە؟». دەمزانی وەکو زۆربەی خەڵکی شار، وەک زۆربەی ئەوانەی لەم دەسەڵاتەی ئێمە توڕەن، منی خۆش ناوێت. من گووتم « لە بەرئەوەی ژیانی ڕاستەقینە، ئەو ژیانەی کە دەبوو بژیابامایە تەنیا لە چیرۆکدا هەیە، بەڵام ژیانی خۆم ژیانە ڕاستەقینەکەم، ئەوەی هەموو عومرە بەدوای خۆمدا ڕایدەکێشم درۆیەکی گەورەیە، جەنابی چیرۆکنوس، چیرۆکی جوان تەنیا شتە بتوانێت ئەوە ڕاستبکاتەوە کە من بە هەموو ژیانم تێکمداوە. دەمەوێت هەموو ئەو چیرۆکە سەیرانەی من کۆیاندەکەمەوە تۆ و چیرۆکنوسەکانی هاوڕێت یارمەتیمانبدەن، بینوسینەوە، بە جۆرێک وەها کاریگەربن مردووەکان زیندووبکەنەوە... من بە ناوی جەمعییەتێکی

زۆر نهێنییەوە لێرەم، جەمعییەتەکەمان ناوی جەمعییەتی ژیانە ونەکانە. جەمعییەتێکی زۆر گەورە نییە، ژمارەمان کەمە. لە ڕاستیدا شتێکی زۆر تایبەتی کۆیکردوینەتەوە کە ئێستا ناتوانم بۆتی باسبکەم... یان لەوانەیە هەرگیز نەتوانم باسیبکەم. من دەمەوێت ژیانی خۆم و ژیانی هەموو وڵاتەکە بپشکنم، ژیانی هاوڕێکانم، هاوپیشەکانم، بزانم لە کوێدا دەکرا شتەکان بە جۆرێکی تر بن. دەمەوێت بزانم کامەیە ئەو ژیانەی کە دەکرا ئێمە بژین و لە دەستمانچوو. ئێمە کتێب نانوسین، بەڵکو هەندێک خەڵکی نەخۆش و بیمارمان هەیە تەنیا بەوە دەژین کە پارچە پارچە ئەو ژیانە ونە بدۆزینەوە و بینێینەوە بە یەکەوە. دۆزینەوەی ژیانێک کە نەژیاویت کارێکی ئەستەمە، سەفەرێکی خەیاڵییە، سەفەرێکی ترسناکیشە بە هەموو ڕابوردووی خۆت و ئەوانەی لە خۆتەوە نزیکن. مرۆڤ ئەستەمە بتوانێت وەک چۆن بە شەقامێکی ڕێکدا هاتووە، بە هەمان شێوە و بەهەمان شەقامدا بگەڕێتەوە، نا ژیانی ون هیچ نییە جگە لە کۆمەڵێک ساتی پارچە پارچە، لە کەوتن و بەربوونەوەی کتوپڕ بۆ ناو ئەو ساتە تاریکانەی کە دەکرا بەوجۆرە تاریک نەبن. جەنابی چیرۆکنوس، ئەوەی من بۆی دەگەڕێم ئەوەیە، هەموو ساتە گەورەکانی درۆ لە ژیانی ڕاستەقینەمدا بدۆزمەوە. دەبێت چیرۆکی جوانی ژیانێکی تر دروستبکەین، کە دیوی ئەو دیوی ژیانی خۆمان بێت، وەک فەرشێک ئێمە لە سەرەتاوە لە سەر دیوە کاڵ و بێنەخشەکەی ڕامانخستبێت، ئێستا بمانەوێت هەڵیبگێڕینەوە و بیخەینە سەر ڕەنگە ڕاستەقینەکەی».

سەعید یۆنان ئێستا پیاوێکی سەرو سمێڵ سپی و چوارشانە بوو، بە خەیاڵیش من وێنە کۆنەکەی پسمامانم تێدا نەدەدۆزییەوە، لام سەیربوو چۆن مرۆڤ دەشێت هێندە بگۆڕێت، یان دەمپرسی : ئاخۆ ئەوە چاوانی من نییە لە سەرەتاوە دونیای بە جۆرێکی دی بینیوە. ئەو ساڵانە هەندێک چیرۆکی جوانی نوسیبوو، لەشی وەرزشەوانێکی تۆکمە و نیگای

ئەفسەرێکی توندی هەبوو، بە ڕوخسارێدا لە عەقیدێکی خانەنشین، لە دەرهێنەرێکی بێڕەحمی شانۆ، لە مەشقکارێکی تۆپی پێ دەچوو کە بەردەوام خەریکی کۆنترۆڵی جەنگێک یان یارییەکی ئاڵۆز بێت. نەمبینیبوو پێبکەنێت، ڕۆیشتنێکی بە هەیبەت و دەنگێکی هەبوو کە دەتوانێت بێماناترین ڕستە بە چەشنێک بخوێنێتەوە پڕیبکات لە سێبەری هێزێکی نادیار. گووتی «جەناب. تۆ باسی چ ژیانێکی لە دەستچوو دەکەیت... تۆ؟... تۆ؟ .. کەی کەسانی وەک تۆ ژیانی لە دەستچوویان هەیە. تۆ و هەڤاڵەکانت لە سەر عەرشی وڵاتەکەن. ئەگەر ژیانێکی لەدەستچوو هەبێت ژیانی ئێمەیە». من دەمزانی ئاسان نییە پیاوێکی سەربەخۆ و خەیاڵداری وەک ئەو بخەمە سەر ڕێگا. من بە جەنابی سەعید یۆنانم گووت «وامەڵێ مامۆستا. دەزانم خەڵک منیان خۆشناوێت، بەڵام تۆ وامەڵێ. ژیانی منیش پڕە لە ژیانی لە دەستچوو. هەموو ژیانێک سەدان ژیانی لەدەستچووی لە ناودایە، کە مرۆڤ خۆی لە دەست خۆی دەدات. چیرۆک تەنیا هەقیقەتێکە لە درۆی واقیع دەرماندەهێت، هەرچییەک تا ئەمڕۆ ژیاوم درۆیەکی گەورەبووە، ئێستا دەمەوێت تۆ یارمەتیم بدەیت و بە چیرۆکێک شتەکان ڕاستبکەمەوە. جەنابی چیرۆکنوس گەر بمەوێت ژیانی ڕاستەقینەم بنوسمەوە، بۆ ئەوە نییە کە دەمەوێت خەڵک هەقیقەت ببینن، بەڵکو بۆ ئەوەیە بزانن خودی ژیان چ درۆیەکی گەورە بووە، ژیانی من هیچ کات ژیانی من نەبووە، هەمیشە ژیانی کەسێکی تر بووە، ژیانێک بووە ئەوانی تر ویستویانە. یارمەتیمبدە ژیانێکی تر بۆ خۆم دروستدەکەم، لە منداڵییەوە، لەو کاتەوەی کە لە سەر مێزەکانی پۆلی یەک بووم، ژیانێک تێیدا ئەو نیگارانە دەکێشم کە نەمکێشاون، ئەو گۆرانیانە دەبیستم کە نەمبیستوون، ئەو یاریانە دەکەم کە نەمکردون، ژیانێکی تر... ژیانێک لە ڕاستیدا ڕاست ناکرێتەوە، تەنیا لە چیرۆکدا دەتوانین بە ڕێگایەکی تردا بیبەین. چیرۆکێکم بدەرێ چیرۆکی من

بێت، من پاڵەوانەکەی بم، کە خوێندمەوە دڵنیابم کە دەکرا من ئەم ژیانە بژیم... دەکرا من نەبم بە لیوا جەنگیز، دەکرا هەر کەسێکی تر بم. دەزانم ئەو چیرۆکە ئەستەمە، ئەفسانەیە، هەرگیز نانوسرێت، بەڵام دەمەوێت تێبگەم کە لەم جەنگە دووردرێژەدا چیم لەدەستچووە. چیرۆک تەنیا شتێکە پێمدەڵێت چیم دۆڕاندوە، دەمەوێت تێبگەم چ چەشنە ژیانێکم ونکردوە، ئەوەش تەنیا بە تۆ دەکرێت، بەوانە دەکرێت کە ناتوانن وەک ئێمە واقعی بن، ئەوانەی لە سەرەتاوە دەتوانن لە ڕوخسارێکی تر و لە جێگایەکی تر و لە کاتێکی تردا دروستمانبکەوە. من دەمەوێت ڕۆژانە چەند سەعاتێک ئەو چیرۆکە بخوێنمەوە و لەم مۆتەکە ترسناکەی خۆم دەربازبم کە ناوی هەقیقەتە. ژیانێک ئەوەم لە بیردەباتەوە کە من چیم، وەک پەردە دەیدەم بە سەر ئەم ژیانەی خۆمدا، ژیانێک وەها تێکەڵاوی دەبم، بە جۆرێک دەچمە ناو وردەکارییەکانییەوە، بە چەشنێک لە داڵان و ژوور و ڕێگاکانیدا وندەبم، خراپتر لە ونبوونی بیناسازێک لە باڵەخانەیەکی خەیاڵی ناو خەونی خۆیدا... من بۆ ئەو ژیانە دەگەڕێم کە ئەگەر لە بنەڕەتدا بە جۆرێکی تر بڕۆشتبایە، لە جێگایەکدا ڕاستمبکردبایەتەوە... ».

سەعید یۆنان وەک بیەوێت سنوورێک بۆ زۆربڵێیەکانم دابنێت، گووتی «هیچ کەس ناتوانێت ژیان ڕاستبکاتەوە، ژیان هەمیشە دارێکی خوارە. گەر لە جێگایەکەوە ڕاستیدەکەیتەوە لە شوێنێکی ترەوە خوار دەبێت... عەفوومبکە من چیرۆکنوسم، تۆ بە هەڵە هاتوویتە لام، من نەدارتاشی ژیان و نە ئاسنگەری ئەوم... پیشەی وەهاشم نەبیستووە». من گووتم «ڕاستە. بەڵام واتێمەگە من هاتووم ئەو دارە خوارەم بۆ ڕاستبکەیتەوە. تۆ چیرۆکنوسیت و تێدەگەیت کە دەکرا من کەسێکی تر بم، تەواو کەسێکی جیاوازتربم. دەکرێت بڵێیت تازە تەواو، تازە زەمان تێپەڕی و تۆ چیتر ئەو کەسە نیت، تۆ لیوا جەنگیزی ئاسایشیت و بڕایەوە.

دەزانم... من قسەم لە سەر ئەوە نییە بتوانم بە گژ هەقیقەتدا بچمەوە، قسەم لە سەر ئەوە نییە. بەڵام ئەوەی کە فەرتاوە، ئەوەی ئەم هەقیقەتە ناشیرینە کوشتویێتی... ئەوە چی؟ ها... ئەوە چی؟. لێیگەڕێین بڕوات، لێیگەڕێین وەک ئەوەی هەرگیز نەگەری وەها لە سەر زەوی نەبوویێت... ڕێگای وەها لە ژیانماندا نەبوویێت؟. ئەوەی لەگەڵ حوکمدارانـدا دەمبینیت شتێکە، ئەوە شتێکی جیاوازە، بەڵام من بەشێکی ونم هەیە، نیوەیەکم هەیە کە دەبوو لە ناومدا بێت، بژی، جار جار دەربکەوێت، بەڵام من ونمکردوە. زۆر کەسی دیش ونیانکردوە... من زانیاری تەواوم هەیە، زانیاری تەواوم هەیە دۆخەکە لەوە ترسناکترە بتوانین بێدەنگ بین. تەنیا شتێک دەکرێت ئەوەیە بۆ ئەو شتە بێناوە بگەڕێین کە ونمانکردوە، چیرۆکنوسەکان تەنیا مەخلوقاتی دونیان دەتوانن یارمەتیمان بدەن، ئەو بەشە لە ژیان بدۆزینەوە کە هەرگیز تیا نەژیاوین و تیا ناژین. دەزانیت هەمووی بە چی دەچێت، وەک بڕۆینە سینەمایەکی گەورەوە کە دوو فیلم تێیدا ئیشدەکەن، ئێمە بۆمان هەبێت یەک فیلم ببینین، بەڵام لە هەڵبژاردنی سالۆنی فیلمەکەدا هەڵەبکەین، لە ناوەڕاستی فیلمەکەدا تێدەگەین ئێمە لە شوێنێکی هەڵەداین، دەبێت چی بکەین؟ هەوڵدەدەین بچینە سالۆنەکەی دی، بەڵام ئەوەی کە لە فیلمەکەی تر لە کیسمان چووە، دەبێت خۆمان دروستیبکەینەوە، بە جۆرێکیش دروستیبکەینەوە، وەها کۆنکرێت و ئامادەبێت هەموو ئاسەواری ئەو فیلمە هەڵەیەمان لە خەیاڵدا بسڕێتەوە. بمبورە ڕەنگە شتەکەم تەواو نەبێت، وێنەسازییەکەم دروست نەبێت، مەبەستم باش نەپێکابێت، بەڵام تۆ تێمدەگەیت. دەزانیت جگە لە ناو چیرۆکێکی دەستکرد، هیچ جێگایەکی ترمان نییە لە ناویدا بۆ هەقیقەتی خۆمان بگەڕێین. ئەو هەقیقەتەی ئەوانی تر نایانەوێت. من پرسیارێکت لێدەکەم برای چیرۆکنوسم، تۆ ڕقت لە خۆت بووە، ڕۆژێک بووە زۆر ڕقت لە خۆت بێت؟».

سەعید بە وردی گوێیگرت و بە سەرسامییەوە پرسی «بۆ ئەو پرسیارە لە من دەکەیت؟ شتێکی وەها ترسناکم کردوە، شایستەی پرسیاری لەو جۆرەبم؟ من نازانم، تۆ بەسیفەتی دۆست یان وەک بەرپرسێکی گەورەی دەزگای ئاسایش قسەم لەگەڵدا دەکەیت؟». « نا من وەک کەسێک کە تکایەکی هەیە، زۆرجار کە هەموو شتێک ناشیرین دەبێت، کە هەموو چیرۆکەکانی ژیان پڕدەبن لە درێوی، ڕزگارکردنی دونیا، هەموو دونیا، دەکەوێتە سەر شانی چیرۆکنوسان. ڕاستە چیرۆکنوسان بەردەوام ئەوە دەگێڕنەوە کە ڕووی نەداوە، بەڵام کێ دەڵێت هەقیقەت، هەموو هەقیقەت لە ناو ئەوەدا نییە کە ڕووی نەداوە. من هەموو ژیانم وەک شۆڕشگێڕ سەیری خۆم کردوە، شۆڕشیش شتێکە وەک چیرۆک، ناچارکردنی دونیایە بە قەبووڵکرنی حیکایەتێکی جیاواز لەم حیکایەتەی ئێستا ڕۆژانە ڕوودەدات. ناچارکردنی ئەو ڕووداوانەیە کە ڕوویان نەداوە ڕووبدەن، شۆڕشیش هەوڵە بۆ ئەوەی مێژوو وەک ئەو منداڵەی لێببێت کە بە ئاسایی لێینابێت، شتێکە دژی هەقیقەت. هەقیقەت گەر ئەوە بێت کە هەیە، ئەوا شۆڕش هەمیشە شتێک بووە دژی هەقیقەت، بۆ هێنانە مەیدانی ئەوەی ڕووی نەداوە و نەبووە، وانییە جەنابی چیرۆکنوس؟... وانییە؟ لە چیرۆک و لە شۆڕشدا مرۆڤ بۆ ئەو دونیایە دەگەڕێت کە ونیکردوە، کە دەیەوێت تیا بژی و نایدۆزێتەوە. بەڵێ جەنابی چیرۆکنوس، مەترسی ئیشەکەی خۆت بە کەم مەگرە، ئیشەکەی تۆش بەشی خۆی ترسناکە. هەموو ئەوانی تر، زاناکان، فەیلەسوفان، سیاسییەکان، باسی ئەو ژیانە دەکەن کە ئێمە دەبێت تیا بژین، باسی داهاتوو دەکەن، باسی ئەو شتانەدەکەن کە دەبێت بێت. بەڵام ئەی ئەو شتانەی کە دەبایە هەبێت و نەبووە؟... ها.. ئەی ئەوانە. بەوانە بڵێین ماڵاوا... بڵێین تەواو. نا... کاک سەعید... ناکرێت. چونکە ئەو ژیانە ونە وازمان لێناهێنێت. چیرۆکنوسان تەنیا کەسن کە دەتوانن ڕابوردوو بە جۆرێکی

تر دروستبکەنەوە، ئەوەی کە بووە لە بیرمانبەرنەوە و شتێکی نوێ بخەنە جێگای. تاکە بوونەوەرێکن دەتوانن ئەوەی لە ئێمە ونبووە بیدۆزنەوە، ئێوە تەنیا چەشنی ئادەمیین کاری وەهاتان پێدەکرێت. من خۆم پتر لە سی ساڵە یاداشتەکانی خۆم دەنوسم. هەموو شتەکان لە دونیادا چیرۆکن، ئەوانەی سیاسییەکان دەیکەن، ئەوانەی پادشاکان بونیادی دەنێن، ئەوەی جەنگ بونیادی دەنێت، هەمووی چیرۆکە. هەموو ئەم ئەستێرەیەش کە ئێمە لە سەری دەژین کتێبخانەیەکی گەورەی چیرۆکە، بە هەزاران دۆلاب و ریواق و ڕەفەوە... ئەوانەی دەمرن چیرۆکەکانیان دەچێتە ژێر زەمینێکی تاریکەوە، ژێر زەمینێک لەوێ هێدی هێدی تاریکی، حەرف و رەنگ و وێنەی سەر کتێبەکان ڕەشدەکاتەوە. جەنابی چیرۆکنوس... زەوی هیچ نییە جگە لە کتێبخانەیەکی گەورە کە کەسێکی تر بە جۆرە پیت و مەرەکەبێکی تر دەینوسێت. هەر یەکێک لە ئێمە کتێبێکی چیرۆکین، ئەوەش کە تۆ دەینوسیت کتێبێکە لە ناو کتێبێکدا. ئەوەشی کە ئێمە پێیدەڵێین ڕاستی هەر تەنیا چیرۆکێکە، چیرۆکێک مرۆڤ بە ژیانی خۆی و بە خوێنی خۆی دەینوسێت... هەموو ئەم ئەستێرەیە لە کتێبێک زیاتر هیچی تر نییە کە پڕە لە چیرۆک، ئەستێرەکانی تریش کتێبن کە هیچیان لە سەر نەنوسراوە. زەوی تەنیا ئەستێرەیە کە یەکێک هاتووە و شتی لە سەر نوسیوە، نیگاری لە سەر کێشاوە. هەموومان چیرۆکین، لە بەرئەوە نرخی چیرۆک بە کەم مەگرە، بە کەمی مەگرە. بەڵام لە ناو هەموو چیرۆکەکانی دونیادا، شەیتان و فریشتە هەیە. لە ناو هەموو مرۆڤەکانی سەر زەمیندا شەیتان و فریشتە هەیە. بەڵام ڕوودەدات لە ژیاندا ئەم دوو رەنگییە وندەبێت. لە ناکاو هێزێک دێتە ناو مێژووەوە و هەموو چیرۆکەکە دەداتە دەست شەیتان و وادەکات هەموو فریشتەکان بخەون، لە بیربچنەوە، نەخۆشبن، پەژموردەبن و بمرن. لەویادا تاکە کەسێک کە دەتوانێت دونیا رزگاربکات چیرۆکنوسانی وەک تۆن، ئەوانەن

کە فەسڵە ونبوو و نادیارەکانی ناو چیرۆکەکە دووبارە دەدۆزنەوە. ئەو چیرۆکە دەدۆزنەوە کە فریشتەکان جێگایەکیان هەیە لە ناویدا، ژیانی ون ئەو چیرۆکانەیە. ئەو چیرۆکانەیە کە ئێوەی چیرۆکنوسان دەینوسن و فریشتەکان تێیدا نەمردون... من باس لە ئازاری ویژدان ناکەم، نا برای عەزیزم، باس لەو جێگا خاڵییە دەکەم کە لەناکاو خەوتنی فریشتەیەک لە سەر نەخشەکە جێیدەهێڵێت. کاتێک فریشتەکانمان خەوتوون ژیان چۆنە، کاتێک فریشتەکانمان بە ئاگان ژیان چۆنە؟... جیاکردنەوەی ئەو دوو سەرزەمینە کارێکە نە پێغەمبەران، نەسیاسییەکان، نە مەلاکان ناتوانن پێی هەستن، بەڵکو ئەوە ئیشێکە تەنیا لە توانای چیرۆکنوساندایە». لەویادا سەعید یۆنان دەموچاوێکی جیدیتری وەرگرت و دوای بیرکردنەوەیەکی کورت گووتی «جەنابی لیوا... ئەم ژیانەی ئێستامان هیچی ئێمە دروستمان نەکردوە، بەڵام ژیانێکی دی چۆن دەبێتە ژیانێکی جیاواز ئەگەر ئەویش کەسێکی دی بۆمان دروستبکات. جەنابی کاک جەنگیز بمبورە، من خۆشحاڵ نیم بە ناسینی تۆ، ناشمەوێت بتناسم، دەزانی بۆ؟ چونکە تۆ بەردەوام ئەو ژیانە ژیاویت کە ئەوانی تر دەیانەوێت، ئەو ژیانەی حیزبەکەت دەیەوێت، وەزیفەکەت دەیەوێت، ژنەکەت دەیەوێت، ئاسایشەکانی دەوروبەرت دەیانەوێت، پارەکانت دەیانەوێت... ئێستاش دەتەوێت ژیانێکی تر بۆ خۆت بسازێنیت، بەوجۆرەی من دەمەوێت... نا کاری وا بە من مەکە». من بە شەرمێکەوە سەرم داخست و گووتم «نا من ژنم نەهێناوە». زیاتر سەیری چاویکردم و گووتی «کە دەڵێم خۆشحاڵ نیم بە ناسینی تۆ لێم مەگرە. چونکە تۆ نابینم تا بتناسم. تۆ نیت تا بتبینم و بڵێم کەسی کەسم وەرە با پێکەوە دابنیشین و یەک بناسین. نا مەبەستم خراپ نییە. لەم شارە حیزەدا کەس کەس ناناسێت، من ئەوانیدی ناناسم و ئەوانیدی من ناناسن، تۆ ئەوانیدی ناناسیت و ئەوانیدی تۆ ناناسن، هیچ کەس ئەوانیدی ناناسێت و ئەوانیدی

هیچ کەس ناناسن، دواجاریش هیچ کەس هیچ کەس ناناسێت، ڕۆژ بە ڕۆژیش خراپتر دەبێت. ژن مێردەکەی ناناسێت، کچ باوکی ناناسێت، دایک کوڕی خۆی ناناسێت، پیاو منداڵەکانی خۆی ناناسێت. لەم شارەدا من نیم تا تۆ بمناسیت، تۆش نیت تا من بتناسم، بەڵکو تەنیا ئەوان هەن، ئەوان بە دەموچاوە تێکەڵ و نادیار و ترسناکەکەیانەوە، ئەوانیدی و بەس. من کە تۆ دەبینم وەک نوێنەری ئەوانیتر دەتبینم... ئەوان، ئەوان کە بە دوامانەوەن، لە ناوماندان».

قسەکانی لە بەندی دڵی منی دەدا.

«هەڤاڵ جەنگیز... تۆ هیچ شتێکت هی خۆت نییە، هەتا ناوەکەشت ئەوە نییە کە دایک و باوکت داویەنە پێت، ناوەکەشت هی ئەوانە. لەم چەند ساڵەدا هەموو شتێکیان داویتێ، هێز، دەسەڵات، پارە، چاوی زیاد، گوێی زیاد، دەستی زیاد، قاچی زیاد. کە دەڕۆیت ئەوە تۆ نیت کە دەڕۆیت، بەڵکو لەگەڵتدا هەزار قاچی تر دەڕوات کە قاچی هەموو ئاسایشەکانی وڵاتەکەیە، کە گوێدەگریت بە گوێی ئەوانی تر دەبیستیت، کە دەبینیت هیچ شتێک بە چاوی خۆت نابینیت، تۆ چاوت نییە تا ببینیت، تەنیا ئەو شتە دەبینیت کە ئەوان دەیانەوێت بیبینیت. ئەو شتە بۆندەکەیت کە ئەوان دەیانەوێت بۆنیبکەیت. من تۆ چۆن بناسم، هەڤاڵ جەنگیز، تۆ نیت تا بتناسم».

وەک بریندارێک لە هاوڕێکەی بپاڕێتەوە جێی نەهێڵێت، گوتم « کاک سەعید. تۆ ڕێک دەستدەخەیتە سەر برینی من... ڕێک پەنجە لە شتێک دەدەیت کە ژانی هەیە، ئەی من چیت پێبڵێم، ئەی کە باسی ئەو چیرۆکە ونبووەت بۆ دەکەم، کە باسی ئەو دەردەت بۆدەکەم، کە باسی ئەوەت بۆ دەکەم من بۆ نیم؟ مەبەستم چییە... تۆ پێمبڵێ چۆن بتوانم وانەبم».

«لیوا جەنگیز غەم مەخۆ. هەموومان بەوجۆرەین... تێدەگەیت...

منیش وام، منیش ئەبوو ئەوە بم کە ئەوانی تر دەیانەوێت. هیچ چارێکمان نییە جگە لەوەی ئەوەبین کە ئەوانی تر دەیانەوێت. دەبوو ئەوەبم کە ژنەکەم و منداڵەکانم و بەڕێوەبەری مەکتەبەکەم و مامۆستاکانی هاوڕێم دەیانەویست. ڕۆژێک بریارمدا ئەوە نەبم. تێدەگەیت، ڕۆژێک وتم بەسە، تا ئێرە و ئیتر بەسە. بەڵام دەزانی کە دەڵێیت بەسە چیت لێدەکەن... دەزانیت؟. دەتهاڕن، هەموویان پێکەوە دەبن بە یەک دەستاڕی گەورە و بە سەرتدا دەڕۆن و وەک مشکێکی جیقن پانوپڵچت دەکەنەوە، دوایی ئێسکەکانیشت دەهاڕن، بە هەموویان دەتگرن و دەتخەنە ناو مەکینەیەکی گەورەوە و وردتدەکەن. تێدەگەیت؟ بێنەوەی بەخۆت بزانیت هیچ کەسێکت لەدەور نامێنێت. نە ژن، نە منداڵ، نە هاوڕێ. بەر لە هەر کەس منداڵەکانی خۆت دەتگرن و سەرتدەخەنە ناو مەکینەکەوە. سەیرکە هەڤاڵ جەنگیز، ئەوانە دەبینیت، دەیانبینیت، ئەو خەڵکانەی کە بە ڕێگادا دەڕۆن، دەیانبینیت... ئەوانە هەموو بەشێکی مەکینەکەن. مەکینەکە لە یەک کەس و دوو کەس و هەزار کەس دروست نەبووە، هەموویانن، هەموو ئەم شارەیە، تێدەگەیت؟... هاوڕێکانی خۆتن، کەسانی نزیکی خۆتن، ژنەکەتە. بیهێنە بەرچاوی خۆت کە هەموو ئەم شارە، بە دیوار و بەرد و شەقام و مرۆڤەکانییەوە ببێت بە دەستاڕێکی گەورە و بە سەرتدا بڕوات... ببێت بە دەستاڕێکی گەورە و یەکجار بە هەموو کێشی خۆیەوە، بە تەواوی گوژمییەوە بە سەرتدا بڕوات».

لە ناخەوە هەستم بە ترسێکی گەورە کرد. وەک یەکێک دڕندەیەکی گەورە بەرەو ڕووی بێت و بترسێت، هاوارمکرد «هاوار، ئەی چی بکەین».

«هەڤاڵ جەنگیز. من وازم لە وەزیفەکەم هێنا، وازم لە براکانم هێنا، وازم لە هەموو سەروەتەکەی باوکم هێنا، وازم لە ژنەکەم هێنا، وازم لە هاوڕێتی هێنا، لە دیانەت، لە سیاسەت، لە هەموو شتێک، لە هەموو ئەو درۆ گەورانەی ئەم ژیانەیان چنیوە. وامدەزانی کە وامکرد وازم

لێدەهێنن. وامدەزانی ئیتر بۆ هەتاهەتایە هەموو شتێکیان بۆ چۆڵدەکەم و دەیدەمەوە دەست خۆیان و ئیتر تەواو. پێیاندەڵێم ئێوە ویستتان هەموو ئەو شتانەم هەبێت، ویستتان بخوێنم، وەزیفەم هەبێت، پارەپەیدابکەم، ژنم هەبێت، منداڵ بەخێوبکەم... باشە... هەموویم کرد... هەموویم کرد و ئیتر هیچیانم ناوێت، هەمووی تاقیکردنەوەیەکی زۆرکاری بوو دەبوو پیابڕۆم. سوننەتی بێشەرەفی ژیانێکی بێشەرەف بوو کە ئێوە داتان نابوو... هەموویم جێبەجێکرد، ئێستا لێمگەڕێن بڕۆم. ئێستا هەموو شتەکانتان دەدەمەوە و دەمەوێت بڕۆم و ژیانێکی تر بژیم و بە جۆرێکی تر دەست پێبکەمەوە. دەمەوێت بزانم، بزانم گەر ئەوە نەبم کە ئێوە دەتانەوێت، من چیم. گەر ئەوە نەبم کە ئێوە دیاریتانکردوە، من کێم؟. بەڵام تۆ وادەزانیت وازت لێدەهێنن. نا، هەتاهەتایە بەدواتەوەن، ئەو کاتەی کە دەتەوێت وازبهێنیت دەبیت بە مەخلوقێکی ترسناکتر. هەموو یارییەکە وارێکخراوە کەس نەتوانێت لێیڕابکات... دەرگاکان و پەنجەرەکان بۆ ئەوە دانراون بەس تەنها لووتیان پێوەبنێین و هەوا هەڵمژین، بۆ ئەوە نەکراون بتوانین لێیانەوە ڕابکەین».

من هاتبووم بۆ لای سەعید یۆنان تا یارمەتیم بدات، بەڵام ئەو بە نائومێدی دەیکوشتم. من گووتم «برای چیرۆکنوسم پێمبڵێ، چی بکەین؟».

«دەزانیت چیت لێدەکەن؟. دەتکەن بە پوشێک، وادەکەن نزیکترین کەس کە منداڵەکەتە بتوانێت بتکوژێت. بەڵێ هەڤاڵ جەنگیز، گەر بۆ ژیانی ڕاستەقینەی خۆت دەگەڕێیت. ئەو ژیانەی کە دەبایە بژیت و بەڵام لە ناکاو، لە ساتێکدا، لە جێگایەکدا کە خۆشت ئێستا نازانیت کەی و کوێیە، لە خەت دەرچووە و بۆت نەگیراوەتەوە. ئەوا بۆی مەگەڕێ... چونکە لەو ساتەدا کە دەیدۆزیتەوە دەتکوژن. بەڵام گەر هەر سووریت بە دوایدا بگەڕێیت، بزانە هەر شتێک بکەیت، دەبێت سزاکەی

قەبووڵبکەیت، وەک من نرخە گرانەکەی بدەیت».

من گوتم «نا دەزانم کەی هەموو شتێک لە خەت دەرچوو، دەزانم... ئەو ڕۆژە کە لە پسمامان ئەسپە نەخۆشەکانم کوشت... من و لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی بووین، ئەو گوتی دەبێت بڕۆین ئەسپەکان بکوژین. گەر ئەسپەکانم نەکوشتبایە، لەوانەیە هەموو شتێک بە جۆرێکی تر و بەڕێگایەکی دیدا بڕۆشتبایە».

«هەڤاڵ هەمیشە شتێک هەیە کە ئەوانی تر پێتیدەکەن... هەمیشە. تا ڕۆژێک دێت ئیتر تەنیا ئەو شتانە دەکەیت کە ئەوانی تر دەیانەوێت. ڕۆژێک دێت ئیتر نازانیت تۆ چیت ویستوە، چونکە تۆ نەماویت، ئەوانی تر چوونەتە ناو ڕۆحتەوە و دانیشتوون. من کە هەموو شتێکم بۆ بەجێهێشتن، دواتر نەمدەزانی من چیم و کێم و چیم دەوێت. من نەمابووم، شتێک نەمابوو ناوی من بێت. سەعید یۆنان جگە لە ناوێک و تۆپەڵێک گۆشت کە ئەوانی تر ئیشیان پێکردوە هیچی تر نەبووە، قەت هیچی تر نەبووە. بەڵام لە ناکاو کە ئەو هەستە پەیدا دەکەیتەوە کە خەریکە دەکەویتەوە دەستخۆت، خەریکە دەتەوێت شتێکی تر لە خۆت دروستبکەیت، دەزانیت چەند ئیفلیجیانکردویت... چەند گەمارۆیان داویت. چۆن یەکەیەکە ئێسکەکانیان هاڕیویت. دەزانی من چیم کرد؟ نوسیم. ئەوەی کە تۆ دەتەوێت پێیبگەیت لەم ژیانەدا جێگای نابێتەوە. مرۆڤ لێرە دەتوانێت بۆ یەک جێگا ڕابکات، تەنیا بۆ یەک جێگا، ئەویش بۆ سەر کاغەز، لەوە دەرچێت هیچ شوێنێکی تر نییە ڕابکەین بۆی، لە تاراوگەی سەر کاغەز بەولاوە، زەوییەکی تر نییە بۆی هەڵبێین... زەوییان هەمووی گرتووە لەمسەر بۆ ئەوسەر، تاقیبکەرەوە بڕۆ بۆ وڵاتێکی دی، بچۆ بۆ دوورگەیەکی دوور، لەوێ لە هەر جێگایەک ڕوونتر و ڕۆشنتر دەبینی کە جگە لە تاراوگەی سەر کاغەز، لە پەناگای سەر کاغەز، لە هەڵهاتن بۆ وڵاتی سەر کاغەز، ژیانی سەر کاغەز، ئومێدی

سەر کاغەز، هیچ بستێکی تر لە سەر زەوی نەماوە بۆی بڕۆین».

«برای چیرۆکنوس... من دەمەوێت بەشێک لەو ژیانەی تر، ئەو ژیانە ونەی من، ئەو ژیانەی کە دەبوو هەمبێت بیدۆزمەوە. پێویستیم پێیەتی. من بەوە نابمەوە بە خۆم، بەڵام دەبێت بزانم گەر من ئەم مرۆڤە نەبوومایە، ئەم ئاسایشە نەبوومایە کە شەو و ڕۆژ وەک چاوێکی قورمیشکراو بەدوای ژیانی خەڵکەوەم. گەر ئەم ئامێرە نەبوومایە، دەکرا چ جۆرە ژیانێکی ترم هەبێت. دەکرا لەگەڵ فریشتەکەی ناومدا چۆن بژیم. من پێویستیم پێیەتی. مەسەلەکە بۆ من مەسەلەی ژیان و مەرگە. مەسەلەی مان و نەمانە، دەبێت ژیانێکی دووهەمم هەبێت، تێدەگەیت، مەسەلەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە، بە فریشتەکەی ناو ناخمەوە هەیە. فریشتەکەی ناو ناخم. ئەوەی کە هەرگیز لە سەر سەحنەی ژیانم دەرنەکەوتووە، دەبێت لە سەر سەحنەی خەیاڵم، لە سەر شانۆیەکی تردا دەربکەوێت، بۆ ئەوەی نەمرێت».

کەمێک بە تووڕەییەوە گووتی: «بەڵام تۆ بۆ... عەقید جەنگیز تۆ بۆ. تۆ چ دەردێک خستیتییە سەر ئەم هەوایەی کە دەشێت ژیانێکی دیکەت هەبێت. من ئەو نوسەرە بێشەرەفانەی پێش خۆم ئەو دەردەیان لە سەردا سەوزکردم... ژیانێکی تر. مرۆڤ تا خەیاڵی ژیانێکی تر ناپەڕێتە سەری ڕازییە، بەڵام کە ئەو بیرۆکە مەلعونە دەچێتە سەری، ئیتر وەک کرمێکی هار لە ناوەوە دەیخوات. تا ئەوە نەپەڕیوەتە سەرت زۆر هەست بە قەفەزەکە ناکەیت... ها هەرچییەکە قەبووڵتە و تەواو. قەفەزە و هەیە و بڕایەوە، دەڵێیت، منیش وەک ئەوانی تر. بەڵام کە ئەو کرمە چووە سەرتەوە نایەتەدەرێ. ئیتر بەوجۆرەیە... بەوجۆرەیە. هەمیشە دەبێت دوو ژیانت هەبێت. ژیانی یەکەمت هەمووی ئەوان دەیبەن، ژیانە ڕاستەقینەکە هەمیشە هی ئەوانە، ئێستا تۆ لێرە دەڕۆیتە دەرێ، دەچیتەوە بۆ

ئاسایش، چی دەبینیت؟. هاوڕێکانت، هاوڕێ بەختەوەرەکانت، ئەوانەی لە ئۆفیس خۆیان بە پادشای دونیا دەزانن، قاچ دەنێنە سەر قاچ، قوونیان خستۆتە سەر مێزەکانیان و بە مۆبایلەکانیان دڵداریدەکەن... خۆشحاڵن کە حاکمی دونیان، کامەرانن کە جگە لەوان ئەم شارە حاکمی تری نییە. تۆ ئەوان دەپشکنی و ئەوان تۆ دەپشکنن. تۆ لە ناختدا ڕقت لەوانە و ئەوانیش لە ناخدا ڕقیان لە تۆیە. بەڵام مرۆڤ تا لە ناو یارییەکەدایە، هەموو شتێک باشە، هەموو شتێک ئاساییە، دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی ئەوانیدی ناوبنێت، بیانپشکنێت، بە خواستی خۆی حەزی بە چ حوکمێکە بیدات بە سەریاندا... هەتا بیانکوژێت، چاڵیان بۆ هەڵکەنێت، چ شتێک بەدە بیخاتە پاڵیان. بەڵێ... جەنابی لیوا. ئێستا کە دەڕۆی دەکەویتە ناو ئەوانەوە، ئەوانەی یەک ژیانیان هەیە. ئەو ژیانەی کە موڵکی خۆیان نییە، موڵکی وەزیفەکەیانە، موڵکی حیزبەکەیانە، موڵکی ژنەکان یان مێردەکانیانە، موڵکی دایک و باوک و منداڵەکانیانە... بەوەش دەڵێن «هاوکاری ئینسانی»، ناویدەنێن «ڕۆحی کۆمەڵایەتی»، ناویدەنێن «سوننەتی ژیان» «ڕێز لە گەورەکان» «ڕێز لە بچوکەکان» «ڕێز لە خودا» و هەزار ناوی تر. بەڵام جەنابی لیوا، هەر هەمووی درۆیەکی گەورەیە، هەر هەمووی درۆیەکی گەورەیە. ئەوەی گرنگە ئەوەیە تۆ تەنها ئەوە بیت کە ئەوان دەیانەوێت، ئەوە بیت کە ڕۆڵەکەت لەم نمایشە ناخۆشەدا باش وازیبکەیت، ئەوەبیت کە دەرهێنەرە کوشندەکە پێویستی پێیەتی، ئەوە بیت کە وەزیفەکەت دەیەوێت... هەرکات بیرت لەوە کردەوە ئەوە نەبیت کە داوایدەکەن، ئیتر تۆ دوژمنی کۆمەڵیت، خۆپەرستیت. ئیتر دەتهاڕن. جەنابی لیوا نەکەویتە ئەو هەڵەیەوە وابزانیت پۆستەکەت لە ئاسایش، خزمەتی دووردرێژت بۆ حیزب، هاوڕێیەتیت لەگەڵ سەرۆکدا ڕزگارتدەکات. هەر کە ویستت شتێکی تر بیت، هەر کە ویستت ئەوە نەبیت کە ئەوان چاوەڕوانیدەکەن

دەتهاڕن... هەموو مێژووی ژیانت دەسڕنەوە، هەموو تاوانەکانی ئەم سێ ساڵەت بە سەردا دەسوون، هەموو ئەوانەش کە تۆ وادەزانیت هاوڕێتن، پێش ئەوانی تر قاچ بە سەرتدا دەنێن... من وەک برایەک پێتدەڵێم، وامەزانە ئەو قسانەی بۆ منی دەکەیت شتی بێزیان و سادەن... نا کاک جەنگیز... تۆ چیلکە دەکەیت بە شاری زەردەواڵەیەکدا کە چزووی هەر یەکێکیان بە قەد کەڵبەی دە ئەژدیها ژەهری پێوەیە».

***

کە چوومەوە سەر مەیتەکەی، هەموو قسەکانی یەکەمجاریم بەیادا هاتەوە، چاوە ڕەش و نیگا تیژ و برژانگە درێژەکانی. شەو لاشەکەیان لە مزگەوت شتبوو، کفنیان پۆشیبوو، لە دارەمەیتیان نابوو. چوار فیشەکی پێوەبوو، دوو فیشەک لە سەری و دوو فیشەک لە دڵیدا بوو. ئەو تاکە چیرۆکنوسێکی باشی جەمعیەتەکەمان بوو، پێماندەگووت «ئەندازیاری ژیانی ون». لە دەفتەری یاداشتەکانی مندا ناوی سەعید یۆنان هاتبوو. دڵنیابووم کوشتنی پەیوەندییەکی گەورەی بە دزینی یادەوەرییەکانی منەوە هەیە. من لە یاداشتەکانمدا بێترس قسەم لە بارەوە کردبوو، ئەو بە بڕوای من کە کارێکی نەدەکرد ترسناک بێت، ئەو جگە لەوەی چیرۆکنوسی ژیانێک بوو کە نەژیابووین، چیرۆکنوسی ئەو شتە پاکانە بوو کە نەماندیبوون، دروستکەری ئەو ساتانەبوو کە ئێمە خۆمان لێدزیبووەوە، گوناهێکی تری نەبوو. بەڵام ئەوانەی لە دەزگا کاردەکەن، ئەو شتانە نازانن. زۆربەیان یان سیاسی پیر و گەمژەن یاخود گەنجی نەخوێندەوار و بە تەماحن. دڵنیابووم حیزب دۆسییەی ئەم مەسەلەیەی منیان داوەتە دەست عەقید ئەردەوان یاخود عەقید سەفین، هەر ئەوانیش خانمی مەستورەیان لاقەکردوە و فیدیۆیان لێگرتووە، هەر ئەوانیش سەعید یۆنانیان کوشتووە.

حیـزب ژمارەیەکـی زۆر ئەنـدام و لایەنگـر و هـەواداری خـۆی ناردبـووە نـاو پرسـەکە، هـەم بـۆ ئـەوەی تاوانەکـە لـە خـۆی دووربخاتـەوە، هـەم بـۆ ئـەوەی چاوەدێـری ناشـتنی تەرمەکەبکـەن و هەمـوو پەرچەکردارەکان بنوسـن و هەمـوو قسـەیەک تۆماربکـەن، زۆربەیـان گەنجـی مەدەنـی قـات لەبـەر و چاویلکـەدار بـوون کـە بـە گومانـەوە گوێیـان دەگـرت و بـە گومانـەوە سـەیری هەموومانیـان دەکرد. مـن یەکەیەکـە دەمناسـین، زۆریـان خـۆم لـە سـەر کار دامەزراندبـوون، بـەڵام بـۆ پێکەنینـی زەمـان و گاڵتـەی قـەدەر، ئێسـتا چاوەدێـری منیـان دەکـرد. مـن دڵنیابـووم، لـە بەیانییـەوە بـە دوامـەوەن. وشـەی نەگوتـراوی سـەر لێویشـیان، ئەوەبـوو دەتهاڕێـن.... دەتهاڕێـن... دەتهاڕێـن... دەتهاڕێـن. ئـەوە هەمـان ئـەو وشـەیەی سـەعید یۆنـان بـوو، کـە پێشـتر هەزارجـار لـە حیزبـدا بیسـتبووم و بیـرم لـە ترسـناکی و ناشـیرینییەکەی نەکردبـووەوە، وشـەیەک بـوو بـەردەوام لـە حیزبدا بەکاریاندەهێنـا، لـە ئەندامانـی بیـرۆی بـاڵاوە تا ئاسایشـە بچوکەکانی نـاو دەزگا و ئەندامـە سـادەکانی سـەر بـە ڕێکخـراوە مەدەنییەکانـی حیـزب، ڕۆژانـە بەکاریاندەهێنـا، وشـەی هـەرە سیحراوی ژیـان و فەرهەنگمـان بـوو. «خەمـت نەبێـت، حیـزب وەک گوێـز لـە جیقڵدانـەی قەلـدا بـۆت دەهاڕێـت» «قوونـدەری وا کـەس نییـە بیهاڕێـت» «خوشـک و دایکیـت وەکـو بـاراش بـۆ دەهـاڕم» «وەڵا سـەرۆک بیەوێـت هـەر بـە نوکـی پەنجـە توتـەی دەیهاڕێـت». ئـەوە ئـەو ڕسـتانە بـوون کـە ڕۆژانـە لـە ڕیواقەکانـی دەزگای ئەمنییەتـدا دەمبیسـتن. ئـەو ڕۆژە پیاوانـی دەزگا و بیـرۆی بـاڵا پێکـڕا خێسـە و مۆنییەکـی تایبەتـی لـە چاویانـدا بـوو، ئێسـتا تـەواو دڵنیابـووم کـە پرۆسـەی دوورخسـتنەوە و پەراوێزخسـتن و کوشـتنیشم دەسـتی پێکـردوە. هەندێکیـان زیـاد لـە سـی سـاڵ بـوو هاوڕێـم بـوون، لـە هەمـوو جوڵەیـەک و لەرەیەکـی دەنـگ و نیگایەکیـان تێدەگەیشـتم. دەمزانـی کـە دەڵێـن «کاکـە چۆنـی... باشـیت؟»». چ کینەیـەک و چ سـووکایەتییەک و چ

سزایەک لە پشت وشەکانیانەوە وەستاوە. هەواڵی لە کارخستن و دوور خستنەوەم لە ئاسایش وەک ئاگر بڵاوبووبووەوە. دڵنیابووم هەموویان خۆیان ئامادەکردوە تا بکەوم و پێ بە سەر سەرمدا بنێن. لە ناشتنی تەرم و پرسەکەدا ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی جەمعیەتی ژیانی دووەمم بینییەوە. کە بەجیا و دوور بە دوور هاتبوون، هەموو شتێک لە سەرسامیان پێوەدیاربوو، بەڵام دڵنیابووم واعیزی پیر هەموویانی ئاگادارکردۆتەوە، چونکە هیچ کەسیان نە سەیری منی کرد و نە لێم نزیک بووەوە.

لە دوای بە خاکسپاردنی سەعید یۆنان، گەڕامەوە بۆ ماڵێ، بەڵام لە ڕێگا لامدا و بە ناوی نانخواردنەوە چوومە چێشتخانەیەک، بەرلەوەی بهێڵم ئەو چاوانەی بە دوامەوەن بمگەنێ لە تەوالێتی چێشتخانەکەوە بە سیمکارتە نهێنییەکەم تەلەفونێکم بۆ واعیزی پیر کرد و پێمگووت «حیزب بەدوامانەوەیە. هەر ئەوان سەعید یۆنانیان کوشتوە. دەبێت هەموو چیرۆکنوسەکانی جەمعییەت ئاگاداربکەیتەوە کە خۆیان بشارنەوە... بە زوترین کات». واعیز نەیدەزانی بە دروستی چی بووە. من بۆم ڕوونکردنەوە کە «حیزب ترسێکی گەورەی لێنیشتووە... حیزب لەم چیرۆکانە زۆر دەترسێت، خەڵکانێک هەن نایانەوێت هیچ قسەیەک لە ڕابوردوو بکرێت. تێدەگەیت، وەختی ئەو قسانە نییە، ناتوانم لە تەلەفوندا هەموو شتێکت پێ بڵێم، بەڵام زۆر گرنگە هەر یەکێک لە ئێوە چیرۆکی ژیانی خۆی باش بشارێتەوە، چەند جارێک کۆپیبکەن، لە شوێنی جیاوازدا هەڵیگرن، گەر من کوژرام یان گیرام یان شتێکم لێهات بە نهێنی بەردەوامبن، گرنگە ئەوان بژین. گرنگە». دوا قسەم ئەوەبوو تکامکرد و ڕامسپارد خزمێکی دووری، ناسیاوێکی، کەسێک کە جێگای هیچ گومانێک نەبێت، بینێرێت و سیم کارتێکی نوێم بۆ بکڕێت، چونکە

دڵنیام پیاوانی دەزگا هەوڵدەدەن هەموو ژمارەکانی من بزانن و لە چەند ڕۆژی داهاتوودا ناتوانم بەم ژمارەیەش کاربکەم. زۆر بیرم لەوە کردەوە کە لەبری تەلەفون ئیمەیلەکەم بەکاربهێنم، بەڵام برادەرانم زۆربەیان ئیمەیلیان نەبوو، زۆربەیان لە تەمەندا بوون و نەشیاندەزانی کۆمپیوتەر چۆن دادەگیرسێت.

من بە تەلەفون قسەیەکی زۆرم لەگەڵ بولبولیاریشدا کرد و تێمگەیاند من لە مەترسییەکی گەورەدام و گەر دەنگم نەبوو، خۆی بە بێدەنگی سۆراغی هەموو شتێک بکات، و هەر کارێک پێوستە ڕاپەڕێنێت، بە دەنگی کەسێکی تێکشکاوەوە گووتم گەر گیرام ئەوا دەبێت بڕوات و لە قاتی سەرەوەی ماڵ و لە ژووره نهێنییەکەی مندا بە کاری خۆی هەستێت.

دوای ئەو دوو تەلەفونە بێئەوەی نان بخۆم، چێشتخانەکەم بەجێهێشت و گەڕامەوە بۆ ماڵ، دڵنیابووم ئەو دەیان چاوەی ئێستا چاوەدێریمدەکەن دەزانن، منیش دوا یاری خۆم دەکەم. هەموو دەیانزانی من دامەزرێنەر و دروستکەر و بونیادنەری بنەڕەتی دەزگای ئاسایشم، من یەکەم ئەفسەری هەواڵگر و یەکەم تەکنیکسازی دەزگا و یەکەم عەقڵی پشت وازییە گەورەکان بووم... بەڵام دەشمزانی حیزب دەزگایەکی وەها شەیتانییە جێگری بۆ هەموو مرۆڤێک هەیە. نا، من هەرگیز نەکەوتبوومە ئەو هەڵە سامناکەوە وابزانم حیزب ناتوانێت دەستبەرداری من بێت. حیزب هیچ نییە جگە لە ئامێرێکی بێڕۆح، لە مەکینەیەکی گەورەی جەڕاندن و پلیشاندنەوەی ئینسان، بە جۆرێک سەرۆکی لێدەربکەیت ئەلتەرناتیڤی بۆ هەموو کەسێکی تر هەیە. لە ڕاستیدا من گەیشتبوومە ئەو بڕوایەی حیزب جگە لە وەفا و ملکەچی هیچ سیفەتێکی تری مرۆڤی بۆ گرنگ نییە، گەر وەفادار و ملکەچ بوویت، هەموو شتەکان بە باشی

دەڕۆن. وەفا نەوەک توانا، ئەوە بڕوای هەرە گەورەی سەرۆک بوو، کە بەردەوام بە پێکەنینەکەی خۆیەوە لە کۆبوونەوەی هەڤاڵە حیزبییەکاندا دووبارەیدەکردەوە.. وەفا نەوەک توانا... هی هی هی... وەفا نەوەک توانا... هەڤالان... هەڤالانی تێکۆشەر ئەوەتان لە بیرنەچێت.

کە گەڕامەوە بۆ ماڵێ، ئەزمیرا لە هۆڵەکەدا سەیری کەناڵێکی ئەفریقایی دەکرد، لە ئەزمیراوە وردە وردە عەشقێکی زۆری ئەفریقا چووبووە دڵمەوە، زۆرجار بە گاڵتەوە دەمگووت لەوانەیە ڕۆژێک بێت، من لەگەڵتدا بێم بۆ ئەفریقا، لەوێ دەبم بە خزمەتکار و تۆش بەوجۆرە دڵنەرم بە لەگەڵمدا. ئەزمیرا فریشتەیەک بوو بۆ خۆی، بە دەنگی بەرز پێدەکەنی و دەیگووت دەتکەم بە باوکی خۆم، بە باوکە کەچەڵە سەرزلەکەی خۆم. دوای ئەوەی لە ساڵۆنە گەورەکەدا پشوویەکم دا و کاکاوێکم خواردەوە کە ئەزمیرا داپوویەکی ئەفریقایی تێدەکرد و بۆن و بەرامەیەکی تایبەتی دەدایە، چوومە قاتی سەرەوە و دەرگای گرنگترین ژووری ژیانم کردەوە... ئەو لەوێ بوو، لە سەر تەختە سپییەکەی خۆی لە ناو نوێنەکانیدا خەوتبوو، هەمیشە لە سەر پشت دەخەوت. بەزەحمەت هەناسەی دەدا، پەنجەرەکانم کردەوە و پەردەکانم تەواو لادا و تیشکێکی کەم هاتە ژوورەوە، من بە عەشقێکی زۆرەوە لە نزیکییەوە وەستام، سەیری پێستە سپی و برژانگەکانیم کرد، سەیری سەرە ڕووتاوەکەیم کرد، وەک بۆنی عەترێکی بەهەشتی هەڵمژم بۆنمکرد... خۆشترین بۆنێک بوو تائەوکاتە هەڵممژیبێت، بە ئەسپایی دەستم لە ڕوومەتیدا و گووتم «بنوو عەزیزم... بنوو... بنوو... بنوو و بیر لە من مەکەرەوە».

# دووباره لیڤیتانت دەبینینەوە

کە گوللەکانمان نا بە عادیل مامەوە، بۆڕەیەکی زۆر نائاسایی لێبەرزبووەوە. گەنجێکی زلی ماسولکەدار و قژ درێژبوو، دوو جار بەدەم بۆڕەوە سووری خوارد و کەوت. ئێستاش کە دەنگی ئەو بۆڕە گەورەیەم دێتەوە گوێ، دەترسم. وەک دەنگی گیاندارێک هاتە بەرگوێم زمانی نەبێت و هەموو عومری لە گەرووییەکی توکن و تاریکەوە بۆڕاندبێتی. ئێمە کە لەدوورەوە سەیرماندەکرد، هەستمان بە بۆنی پیساییەکەی کرد کە بای زگی و هێزی گوللەکان پێکەوە پێیانکرد. کوشتنی عادیل مامە یەکەم کاری شۆڕشگێڕانەی ڕاستەقینە بوو، کە سەرەتای سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی لە ناو شاردا ڕاگەیاند، خاڵی دووەممان دەبوو لیڤیتانت بێت. من بەحوکمی ئەوەی لیڤیتانتنم دەناسی و ئاگاداری چیرۆکەکەی بووم لەگەڵ نزاردا، کەمێک لە تێوەگلان لە کاری وەهاوە دەترسام، بەتایبەت لیڤیتانت چەکدار و هێزی پەرێزی زۆربوو. دەترسام گەر کارەکە سەرنەگرێت، ئەوەی دروستمانکردوە تیابچێت و هەندێ هەڤاڵیش لە دەستبدەین کە بوونیان لەم قۆناغەدا گرنگ بوو. بەڵام ئەنجومەنی باڵا بە منیان گووت کوشتنی لیڤیتانت کارێکی گرنگە، هێزی شۆڕش پیشاندەدا و ورەی خەڵکانێکی ڕوخاو هەڵدەسێنێتەوە. لە سەرەتاوە دیاربوو کە نزار ئیدریس خۆی دەیەوێت پلانی کوشتنی لیڤیتانت دارێژێت و بشیباتەڕێوە، ڕوو بە ڕوو و بێهیچ دوودڵییەک بە منی گووت «ئەو لە پێناوی کوشتنی لیڤیتانتدا پەیوەندی بە شۆڕشەوە کردوە» و ئەوەی لە بیرناچێت کە لیڤیتانت ڕفاندوێتی و ئەتکیکردوە و وەک مەیمون بە گوندەکانی باکوردا گێڕاوێتی، کە وایگووت قووڵ سەیری چاوی منی

کرد و وەها بوو بیەوێت منیش بنێتە ژێر باری ئازارێکی ویژدان. نزار گەرچی گەنجێکی بێویژدان و شەڕانی بوو، خاڵیش نەبوو لە سیفەتی زۆر شەیتانی، بەڵام بێئەزموون بوو، بە سەرێک بە گرنگم دەزانی لە ڕێکخراوەکاندا بمێنێتەوە، بە سەرێکی دیش لەم کارە دەترسام، چونکە تەقەکردن لە پیاوێکی مەکرباز و بەهێزی وەک لیڤیتانت کاری منداڵان نییە و ئەزموونی دەوێت. نزار ڕاشکاوانە گووتی لیڤیتانت لە ترسنۆکێک زیاتر هیچ نییە، کە تاکە ئارەزووی ئەوەیە کاغەزی دڵداری کچ و کوڕی قوتابخانە دەربهێنێت و بیانخوێنێتەوە و کۆیانبکاتەوە، هیچ نییە جگە لە داهۆڵێکی پەڕۆ کە ئەو دەتوانێت بەسزای میللەتی بگەیێنێت «هەر کاتێک گوزارەی سزای میللەتی بەکاردەهێنا، لە گەرویدا ئەو نەغمە گاڵتەجاڕەم دەبیست، کە بە درێژایی ژیانی هاوشانی ئەو وتانە بوو کە بە ناچاریی و دوور لە ویست و حەزی خۆی بەکاریدەهێنان». ئەوەی وایکرد بۆ من جێگای بڕوا بێت و سەرنجڕاکێشیش دەرکەوێت، ئەو بڕوا بەخۆبوونە گەورەیەی بوو. ئەوکات زوو زوو لە ڕەنگی جلەکان و شێوەی خۆگۆڕین و جۆری قژداهێنانی خۆی دەگۆڕی، هەندێجار وادەردەکەوت بێباک بێت و هەندێجاریش زۆر لە پەنهاندا هاتوچۆیدەکرد. پەیوەندییە جەستەییەکانیشی لەگەڵ خانمی ماردینیدا تادەهات ڕوونتر و ڕوونتر بۆ ئێمە ئاشکرادەبوو. گەرچی ئاشکرا ناوی نەغەدەی نەدەبرد، بەڵام لە مەجلیسی خواردنەوەکاندا کە مەست دەبوو، ئاشکرا باسی ئەو ژنە دکتۆرەی دەکرد کە بەستەزمانە تا ئەم لەگەڵیدا نەخەوتووە نەیزانیوە پیاو تامی چۆنە. من هەندێ کەسم ڕاسپارد تا بە وردی چۆنێتی ژیان و پەیوەندیکردن و یەکتربینین و سەرجێکردنی هەر دووکیانم بۆ ئاشکرابکەن و زانیاری تەواوم بۆ کۆبکەنەوە. بۆ هەموو سەرکردایەتی حیزب نەغەدە وەک تەلیسم وەهابوو. مانای چی شاعیرێکی وەها جوان، کچی دکتۆرێکی ناودار، ژنی دکتۆرێکی گەنج، لەگەڵ چەقۆکێش و بەدمەست و زماندرێژێکی

وەک نزاردا ببێتە دۆست؟. هەڵبەت هەموو دەمانزانی نزار چەند کوڕێکی قۆزە، چەند لە فریودانەدا لێزانە. گەر پیاوانی تر بە ڕێز و حورمەت و ویقار ژن ڕادەکێشن، ئەم بە بێشەرمی و نیازی یەکسەرە و بێحەیایی بێسنوور ژنانی تووشی ڕاچڵەکاندن و خرۆشان دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەرۆکانی سەروو من، سووربوون من بکەومە سۆراغی ئەم چیرۆکە، نەبا کلکێکی دەزگای ئەمنییەتی دەوڵەت لە کارەکەدا بێت. لەوێ لە بیرۆی سەرەکی و ئەنجومەن باوەڕیان بەوە نەدەکرد ئەم نزار ناوە، ئەم دەستبڕە ناودار و دەمشڕە، وەها هونەرمەند بێت ژنی گەنجی دکتۆرێک بەو چەشنە داگیربکات. هەمووان هەم بە خودی نەغەدە و هەم بە چیرۆکەکەی لەگەڵ نزاردا سەرسامبوون. هەڤاڵ شێرخان لە نامەیەکدا بۆی نوسیبووم، کە دەبێت زۆر ورد بچمە بنج و بناوانی ئەم سەربوردە، چونکە «خۆ ئەم حیز و دەیووسە کازانۆڤا نییە، بتوانێت ئافرەتێکی وا خانەدان و گەنج لە خشتە بەرێت». لەوێ هەڤاڵان باوەڕیان نەدەکرد ژنە دکتۆرەکان کاری وەها بکەن... بۆ؟ ئەو بڕوایە لە چییەوە سەرچاوەی گرتبوو؟ نازانم. من پشکینینەکانی خۆم سەبارەت بە پەیوەندی نزار و نەغەدە گەیاندە جێگای ورد و هەتا زانیاری تەواوم لە سەر شێوەکانی پێکەوە خەوتنیان کۆکردەوە. ژنی هاوڕێ تەختەبەستەکەی خۆشحاڵانە قسە و هەناسە و هاواری هەردووکیانی بۆ یەکێک لە ژنانی ڕاسپاردەی حیزب گواستەوە کە هەڤاڵان لە شانەیەکی ترەوە ناردبوویان و تەواوی زانیارییەکانیان ڕادەستکردم. لێرەدا دەبێت بڵێم کە ئەزموونی درێژم لە ئاسایشدا ئەو مافەم دەداتێ لە نێوان دوو جۆر زانیاریدا جیاوازیبکەم. جۆرە زانیارییەک هەیە پێویستە و دەبێت بیزانیت، واتە حوکمی سیاسەت و پێداویستییەکانی ئەمنییەت وادەکات هەموو شتێک بکەیت بۆ ئەوەی بگەیتە ئەو زانیارییە زێڕین و گرنگانەی کە دەتەوێت، ئەوە بەشێکی گرنگی وەزیفەکە و مەبەستی سەرەکی هەموو ژن و پیاوێکی ئەمنیەتکارە.

بۆ نمونە کاتێک دەزانیت دەوڵەت سیخوڕێکی ناردوە تا ئەندامانی بیرۆی باڵا ژەهرخوارد بکات، دەبێت هەموو هێزی خۆت و شاخە هەستیارەکانت بخەیتەکار، هەموو هەستەوەرەکانت لە بۆن و بینین و بیستن وریابکەیتەوە، پێکڕا وەک ئامێری وردی پێوانەکردن و خوێندنەوەیان لێبکەیت تا نەهێڵیت کارەساتی وابقەومێت. بەڵام جۆرە زانیارییەکی تر هەیە، زانیاری سیاسی نین، بەڵکو پەیوەندی بە شەهوەتی زانین و بینینەوە هەیە، ڕیشەکەی لە ناو غەریزەی ئەو کەسانەدایە کە دەزگا دەبەنەڕێوە. لە هەندێ جێگادا خواستی دەزگای ئاسایش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ خواستی ئەو کەسانەدا نییە کە سەیری فیلمێکی ڕووت دەکەن. لەزۆربەی وێستگەکاندا تۆ زانیاری کۆناکەیتەوە لە بەرئەوەی پێویستت بە زانیارییە، نا، بەڵکو زانیاری کۆدەکەیتەوە لە بەرئەوەی حەزت لە زانیارییە، لەزەت لەوە دەبینی لە کونێکی بچوکەوە سەیری ژیانی ئەوانی تر بکەیت و بزانیت چی دەکەن. بزانیت کێ لەگەڵ کێدا دەخەوێت، کێ خیانەت لە کێ دەکات، کێ نهێنی کێی لایە، ژنی کێ دڵی بۆ پیاوی کێ لێدەدات و بە پێچەوانەوە. کەسانی سەر بە دەزگا زۆربەیان هێندەی دزەبین و خەبەرلوشن کە زۆرجار تەنیا بۆ خۆشی خۆیان تەماشای دونیا دەکەن، وڵاتپارێزێک نیین ڕێگری لە دوژمنان بیانجوڵێنێت. من هەر لە سەرەتای کارکردنمەوە شەهوەتی کۆکردنەوەی هەموو زانیارییەکم تێدابوو، وردترین و بێسوودترین زانیاریم بە گرنگ دەزانی. شەهوەتێکی قووڵ دەیجوڵاندم دەزگایەک دروستبکەم وەک چاوێکی گەڕۆک و نهێنی بێت، بتوانێت بچێتە هەموو جێگایەکەوە، ئەو هێزەم بداتێ، بزانم ژنان و پیاوان لە ژوورەکانی خەوتندا چی دەکەن، چۆن یەک ماچ دەکەن، چۆن یەک ڕووتدەکەنەوە، نهێنییە تایبەتییەکانیان چییە، چەندە ئامادەی خیانەتن. بە کورتی زۆرجار لە ئیشکردنمدا ئەوەندەی غەریزەی بینین و زانین دەیجوڵاندم، حەسرەتی سیاسەت ڕابەرم نەبوو... هەر ئەو غەریزەیەش وایکرد لە

سەرەتاوە بۆ نهێنییە تایبەتییەكانی شۆخێكی وەك نەغەدە بگەڕێم.
ڕاپۆرتەكەی من لە سەر پەیوەندی نەغەدە ماردینی و نزار بە وردی لەلایەن ئەندامانی ئەنجومەنی باڵاوە خوێندرایەوە، نامەیەك بوو لە وەسفی ورد و سەلیقەی دارشتندا، گەلێك هونەرمەندانە نوسرابوو. لە وەسفەكانمدا هەتا ڕەنگی لیباسەكانی خانم و ڕۆژ و ساتی بینویژییەكانیشیم تۆماركردبوو، گفتوگۆی نێوان جووتە دڵدارەكەشم نوسیبوو، دەمێك وەك شێت لە باوەشی یەكدا یاریدەكەن و قسە و گوفتی چەپەڵ و شەهوەتاوی دەگۆڕنەوە. ڕاپۆرتەكەم لە بری ئەوەی وەك ڕاپۆرتی وردەكاری كەسێكی دڵسۆز بۆ نیشتیمان سەیربكرێت، وەك پارچەیەك لە ئەدەبیاتی ئیرۆتیكی خوێندرابووەوە و دەستا و دەستی كردبوو، هەتا دەڵێن هەندێك لە ئەندامانی ئەنجومەن لە كاتی خوێندنەوەی نامەكەدا بە دەست كاری خۆیان كردوە و بە خەیاڵ خۆیان گەیاندۆتە سوكنایی. هەر بە هۆی ئەوەوە و لە داوایەكی بێمانا و سەیردا «كە هیچ لەگەڵ بنەماكانی كاری ئەمنییەتی شۆڕشدا نەدەگونجا» هەڤاڵێك داوایكرد هەندێك وێنەی نەغەدە ماردینی بۆ ئەندامانی ئەنجومەن بنێرم تا تەماشاییكەن و ببینن ئەم خانمە شاعیرە هەر بە ڕاستی بوونی هەیە و وەك لە وەسفی مندا هاتووە لە ڕیزی شۆخەژنانە. دیارە سەرەتا زۆر تورەبووم، لە ژوورەكەی ماڵی شوعلە خاندا دیوارەكەم دایە بەر شەق و گووتم «من شۆڕشگێرم و گەواد نیم». بەڵام دواتر هێوربوومەوە و گووتم، دیارە بۆ شۆڕش وەها چاكە كە هەڤاڵان، ئەندامانی ئەنجومەن وێنەكەی نەغەدە ببینن و بزانن من درۆناكەم. لە بەرئەوە هەر زوو وێنەی خانمم گرت و لە جوانترین دانیشتن و ڕوونترین خەندەیدا ناردم بۆ هەڤاڵ شێرخان، كە لە وەڵامدا بۆی نوسیبووم «عەیار خان بە چاویدا دیارە شتی زۆر لە باردایە».
ئەوجۆرە كۆمێنتارە نێرینانە هەردەم مایەی شەرم و قێز و ڕشانەوەم بوون، بەڵام بەوەدا بەشی هەرە زۆری پیاوانی نزیكم بەوجۆرە ئافرەتیان

دەبینی، وەفام بۆ جنسی خۆم و تێگەیشتنم لە هەناسەساردیان لەوە گەورەتربوو ئەو قسانە لە دڵبگرم و هەڵوێستیان بەرابەر بنوێنم. هەڵبەت بۆ پیاوانێکی دوورە شار، کە کێو لە عیشوە و عەتری خانمانی شار دووری خستبوونەوە، بە حوکمی ئەو نیگارەی ڕاپۆرتەکەی من بۆ خانمی کێشابووی، ئەو بەستەزمانە وەک سەمبولی لەزەتێکی دوور و ئەفسانەیی لێهاتبوو، نیگاری ژنێک نێرە برسییەکان خەونی پێوە ببینن و ئارەزووی دڕ و ڕامنەکراویان بجولێنێت. ژنێک دەکرا گەر زوڵمی جوگرافیا و هێزی دووریی نەبایە، ئەوانیش وەک ڕابەر و سەرکردە دەستیان بە جەستەی بگات و زیاتر لەم مەلازادە بێشەرمە، بیگرنە ئامێز و لەزەتی لێببینن. ئێستا بە روونی دەبینم کە ڕاپۆرتەکانی من، وێنەی ژنێکی وەها پڕ ئاڵۆشیان بۆ خانمی ماردینی کێشابوو، کە هەم دروست نەبوو، هەم کاریگەرییەکی خراپیشی لە سەر تەواوی ژیانی ئەو دانا.

لەو دەمەدا کە نزار ئیدریس پەیوەندی بە خانمی ماردینییەوە هەبوو، دڕتر و لە خۆباییتر دەردەکەوت. وەک ئەمیرێک خۆی دەبینی کە قەدەر فڕێیداوەتە بنی کۆمەڵگاوە، ژنەکەی دکتۆر ئەو هەستەی تیا دروستکردبوو کە ئەو پیاوێکی ناوازەیە، نوێنەری جۆرە ژیانێکە جیاواز، لە ژیانی درۆزن و زەلیلی پیاوانی شار کە خۆیان بە درۆی ناموس و شەرەف خەساندوە. نزار لەگەڵ دەرچوونی لە خەستەخانەدا دەزانێت لیڤیتانت بەدوایەوەیەتی. بیرۆکەی کوشتنی لیڤیتانت گەرچی لە خەیاڵی هەموومانـدا بوو، بەڵام لە کۆبوونەوەکەی غەمپاشادا، نزار ئیدریس بە ڕۆشنی ناویهێنا و خستییە بەرنامەوە. من پێم باش نەبوو جێبەجێکردنی پلانەکە بدەمە دەست ئەو. بەڵام پێداگرتنی زۆری وایکرد نەتوانم فەرامۆشیبکەم و نەیخەمە تیپی کارەکەوە. لە ڕاستیدا نەمدەویست کوشتنی لیڤیتانت وەک کارێکی شۆڕشگێڕانە دەرنەکەوێت

و کەسانێک بێن و بیخەنە قاڵبی کێشەی تایبەتییەوە، چونکە من هەر کارێکم دەکرد خەیاڵم لای ئەوەبوو ئاخۆ لە داهاتوودا، لە دیدی مێژووەوە ئەو کارە چۆن دەبینرێت. وەک زۆربەی ڕۆشنبیرانی ناوەڕاستی حەفتا و سەرەتای هەشتاکان تووشی دەردی مێژوو بووبووم، هەرچییەکم دەکرد خەیاڵم لای ئەوە بوو مێژوو چۆن حوکمی بە سەردا دەدات. ئەو ڕۆژەی کەتەقەمان لە لیڤیتانت کرد، ڕۆژێکی زۆر خۆشبوو، لە ڕۆژی هەتاودا کوشتنی کەسانی وەها گرنگ ئاسان نییە، ڕۆژی هەتاو شەقامەکان جەنجاڵ و سەرشۆستەکان پڕ لە جوڵەن، هەتاو مرۆڤ گێژدەکات و زۆرجاریش برستی لێدەبڕێت. لیڤیتانتیش کەسێک نەبوو جێگایەکی دیاریکراوی هەبێت، دەبوو لەو کاتانەدا زەفەری لێبهێنین کە دادەبەزێت و کەمێک فاسیلە لە مەفرەزەکەی وەردەگرێت. بەڵام کەی دەهات و کەی دادەبەزی؟ ئەوەیان چاوەڕوانی، هێمنی و خۆگریی دەویست. بۆ ئێمەیەک کە لە سەرەتای کاردا بووین، ڕێکخستنی هەموو ئەو شتانە ئاسان نەبوو، من بە دەستەیەکی پێنج کەسی کارمدەکرد، خۆم سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی دەستەکە بووم. سێ ڕۆژ بۆی دانیشتین و هەر نەهات، بەڵام دیسانەوە هەمیشە هەتاو بوو... نازانم بۆ وام هەستدەکرد ناتوانین لە ڕۆژێکی هەتاودا لیڤیتانت بکوژین. ڕۆژی چوارەم، ڕۆژی سێشەممە بوو، بینیمان لە بەردەم پەنیرفرۆشەکانەوە سەرکەوت، دەمانزانی دوای کوشتنی عادیل مامە هەموو پیاوانی دەسەڵات دەترسن. سێی نیوەڕۆ بوو، هەتاو خەریکبوو هێدی هێدی بەرەو ئەمبەری جادە دەپەڕییەوە. نزار ئیدریس جلی کۆڵهەڵگرێکی لە بەرکردبوو، گەرچی من فەرمانم پێدابوو کە تەقە نەکات، بەڵام دەیویست خۆی بیکوژێت، ئەوە خەونی هەرە گەورەی بوو. نزار هەرگیز سووکایەتییەکانی لیڤیتانتی لە بیر نەچووبوو، لە بەردەم نەغەدەدا گوتبووی «تا نەیکوژم ناچمەوە شاخ». تا گەیشتە نزیکی بینای کۆنی پەروەردە بە چاو بەدوایەوە بووین، گەر

بە ئاڕاستەی مزگەوتەکە بپەڕابایەتەوە فەرمانی تەقەکردنم دەدا، بەڵام نەپەڕییەوە، لە سوچی وێنەگرەکان تێپەڕی و بە ئاڕاستەی کوچەی چێشتخانە گەورەکان ڕۆیشت. لە چاوتروکانێکدا نزار بە جلی حەماڵی و بە روخساری کەسێکەوە هەموو گیانی لە ئارددا سپی بووبێت، بە ناو یاوەرەکانی لیڤیتانتدا ڕۆیشت... لەوکاتەدا ئەوان سەیری پۆلێک کچی قوتابخانەیان دەکرد و قاقا پێدەکەنین. ئەوان لە گەرمەی پێکەنیندا بوون کە نزار بێئەوەی چاوەڕوانی فەرمانی من بکات لە دواوە تەقەی لە لیڤیتانت کرد. ئێمە بینیمان کە لیڤیتانت بە برینداری وەرگەڕا و ویستی دەست بۆ دەمانچەکەی بەرێ، کە نزار دوو گوللەی تریشی پێوەنا... ئەوانەی نزیکی لیڤیتانت بوون دەڵێن لە وەرگەڕاندا سەیری نزاری کردوە و گووتوێتی «کوڕی قەحبە نامرم». بەڵام ئێمە دوور بە دوور بینیمان نزار لە ناو هاوار و قیژە و تەقەی پیاوانی پەرێزی لیڤیتانتدا ڕادەکات. بینیمان یاوەرانی لیڤیتانت، لە بێچارەیی و دەست لەرزین و شڵەژاندا، تفەنگەکانیان دادەگرن و چۆن بشێت تەقەدەکەن.

من هەرگیز باوەڕم بە هێزی پەرێز نەبووە، گەمژەترین سیاسی ئەوانەن کە هێزێکی زۆری چەکدار دەخەنە دوای خۆیان و وادەزانن بەوە ژیانی خۆیان دەپارێزن. تا ئێستا نەبووە تەقەکەرێکی زیرەک نەتوانێت ئەو دیوارە درۆ و بەربەستە کاغەزینە ببڕێت. هێزی پەرێز هەمیشە کۆمەڵێک گەنجی غافڵ و زۆربڵێ و چاوبازن بە دەگمەن خەیاڵیان لای ئەو کەسەیە کە دەبێت بیپارێزن، لەو ساتەدا کە ڕووداوێک دێتەپێشێ ئەوان هەمیشە خەیاڵیان لە جێگایەکی دیکەیە، بۆیە ئەوەی پلانێکی کوشتنی ڕاست و مەحکەمی هەبێت، دەتوانێت بە ئاسانی ئەو جۆرە گەنجە کاڵفامانە بخەڵەتێنێت، کە زۆرجار تەنیا لە بەر پارەوویەک نان ئەو کارەدەکەن و لە ناخی دڵدا زیاتر لە بکوژەکان خواستی کوشتنی ئەو کەسانەیان هەیە کە دەیپارێزن.

ئێوارە زانیمان کە لیڤیتانت نەمردوە، هیچ یەکێک لە چوار فیشەکەکەی نزار جێگای کوشندەی نەگرتبوو، شەو پیاوانی لیڤیتانت و هەندێک لە هەوادارانی لە بەردەم بیمارستاندا کردبوویان بە هەڵپەڕکێ... بەڵام ئێمە هەمووما‌ن غەمگین بووین... لە دڵەوە غەمگین بووین.

# ئەردەلان هیرانی و ڕزگارکردنی شۆڕش لە مەرگ

ئارەزووی نەغەدە ماردینی بۆ سەرکێشی، دەرچوون لە سنوورە تەسکەکانی ژیانی ڕۆژانە، تاقیکردنەوەی هەموو ئەزموونە ترسناکەکان و ژیان لەگەڵ هەموو هەستە حەرامەکاندا بێسنووربوو. کاتێک ئەردەلان هیرانی خزمیان، کە هاوڕێیەکی منداڵی نەغەدە و نەوای خوشکی بوو، یەکێک لە شانە سەرەتاییەکانی شۆڕشی دروستکردەوە، بە جۆرێک لە جۆرەکان نەغەدەی لە خەیاڵدا بوو، ئەردەلان کوڕێکی قەشەنگ و شۆڕشگێڕێکی بێپەروابوو، گەرچی کوڕی خێزانێکی زۆر دارابوو، بەڵام بە جۆرێکی سۆفیانە هاتە ناو شۆڕشەوە. لە ڕاستیدا خەونی گۆڕینی دونیا، خەونی چینێکی دیاریکراو نییە، مرۆڤ ناتوانێت بڵێت ئەمجۆرە خەونە لای کەسانی گروپێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراو سەرهەڵدەدات و لای تاقمێکی دی بوونی نییە. وەک چۆن مەرج نییە منداڵی هەژار، ڕۆحی باوک و دایکە هەژارەکەی خۆیان هەڵگرتبێت، مەرج نییە منداڵی دەوڵەمەندەکانیش هەڵگری ڕۆحی باوانیان بن. ئەردەلانی هیرانی لە ژێر کاریگەری خوێندنەوەی کتێب یاخود بە هۆی هەستێکی دیاریکراوەوە بە زۆرداریی بیری لە شۆڕش نە دەکردەوە، بە پێچەوانەوە، ئەو لە ژیانیدا لە ژێر باری ستەمێکی گەورەدا نەیناڵاندبوو، شۆڕش لای ئەو هەستێک بوو، وەک حەزکردنی کەسێک لە جۆرە یارییەکی دیاریکراو.

وەک پەڕینەوە بە سەر پەتێکی باریکدا، وەک سەماکردن بەپێی پەتی لە سەر فەرشێکی پشکۆ. جۆرێک بوو لە نائارامی ڕۆحی کە دەیگوازتەوە بۆ دەرەوەی خۆی، هەمیشە لە خواستی ئەوەدابوو لە دونیای کرداره گەورە و پڕ مەترسییەکاندا بژی، دەیویست بەردەوام لەگەڵ یاساگەلی لە خۆی گەورەتردا یاریبکات، ئەرکێکی ترسناک هەبێت گرەوی لە سەر بکات. دەشیویست تا دەتوانێت زۆرترین خەڵک بخاتە ناو ئەو گەمەیەوە، گەمەی ڕاکردن بە ناو پێچاوپێچی سامناکی زەمینێکی لۆدار و بەریندا. ئەو یەکەمین کەس بوو ژمارەیەک ژن و کچی هێنایە ڕیزی شۆڕشەوە... کاتێک خولیای دروستکردنی ڕێکخستنێکی سیاسی چووە سەری، یەکەم خانم کەوتە خەیاڵی نەغەدە ماردینی بوو. لە منداڵییەوە ئاشنای نەغەدە بوو، لە هەر کەسیش زیاتر دەیزانی چ دەرونێکی کچانەی شێت و ڕام نەکراوی هەیە، چ ئارەزوویەکی بەدی بۆ سەرسەختی تێدایە، چەند بیرۆکەی توند دەیخرۆشێنێت و خەیاڵاتی ڕیزپەڕ دەیجوڵێنن. لە منداڵییەوە هەردوو خێزانەکەیان دۆستی نزیکی یەکدی بوون، دایکیان هاوڕێی نزیک و باوکیان هەڤاڵ و خۆشەویستی یەک بوون. ئەردەڵان و ئالانی برای، هەردوو لەگەڵ نەغەدە و نەوادا پێکەوە گەورەبووبوون، بە جۆرێک لە منداڵییەوە دایک و باوکەکان شتێک لە خواستی شەرمن و ئارەزووی نهێنیان تێدابوو کە منداڵەکان دواتر دۆستی یەک بن و ببنە هاوسەر و دڵدار. دکتۆر جەلال ماردینی بە سەعات لەگەڵ ئیبراهیم میرانیدا یاری کاغەز و شەترەنج و دۆمینەی دەکرد، ژیانیان یاری بەردەوام و گرەوی بەردەوام و داوەتی بەردەوام بوو. لە سەر سفرەکان هەمیشە هەردووکیان بە روونی قسەیان لە سیاسەت دەکرد و بە ئاشکرا لایەنگری خۆیان بۆ بارزانی بەرامبەر دوژمنەکانی نیشاندەدا. کە خەتی تەلەفون بڵاوبووەوە، ئەوان لە پێشی پێشەوەی ئەو ماڵانەدابوون کە تەلەفونیان ڕاکێشا، ژنەکانیشیان «کە دوو خانمی سفوربوون» بە پلەیەک دۆست

بوون، گەر ڕۆژێک یەکتریان نەبینایە شەو چەندین سەعات تەلەفونیان بۆ یەکدی دەکرد. نزیکی هەردوو خێزانەکە و تێکەڵییان بە جۆرێک بوو، کچ و کوڕانیان بێئەوەی هەستێکی حەرام و ئارەزوویەکی نهێنی پەروەردەبکەن، جۆرە نزیکییەکی خوشک و برایانەیان دامەزراند. کە ئالان هیرانی لە تەمەنی شازدە ساڵیدا حەزی لە کچێکی پۆلەکەی ئەوا کرد، کچەکان لە بری ئەوەی هەست بە ئیرەییبکەن، بە خۆشییەکی بێوێنەوە چیرۆکەکەیان دەگێڕایەوە، دەتریقانەوە، پێدەکەنین و داویان بۆ دەنایەوە و بەزمیان پێدەگێڕا. هەستی خوشک و برایی لە نێوان منداڵەکاندا وەها بەهێزبوو، لە سەردەمێکدا کە دەنگۆیەک کەوتەوە گوایە هوشیاری ساڵحی هەلاج، بە دەوری ئەوا ماردینیدا دێت و لە هەوڵی دۆستایەتی ئەودایە، هەر یەک لە ئالان و ئەردەڵان بڕیاریاندا یەکجار و بە ڕوونی و بۆ هەمیشە پێیبڵێن ئەوا خواردنی ئەو نییە و خولیای وا پڕوپوچ لە سەری خۆیدا پەروەردەنەکات. تا کار نەگەیشتە ئەوەی ئەوا لە ژێر بارانی فرمێسکدا دانی بەوەدا نا کە هوشیار لە دونیا بێخەبەرە، کوڕێکی گێژی بەستەزمانە و تەواوی چیرۆکەکە خۆی دروستیکردوە، تا لە ناو کچاندا وادەرنەکەوێت کە کەس نایەوێت و کوڕێک نییە خاتری بوێت.

ئەردەڵان هیرانی لە منداڵییەوە بەوە ناسرابوو کە داهێنەری یاری ترسناکە. ڕەنگە ئەو یەکەم گەنجی شارەکەمان بووبێت کە بە سەر پەتێکی باریکدا و لە بەرزایی زیاد لە ٥ مەترەوە پەڕیبێتەوە. شاری ئێمە لەو ڕووەوە یەکێکە لە شارە هەرە ترسنۆکەکانی دونیا، پێشتر لە هەموو مێژووی خۆیدا بەهرەیەکی ئەکرۆپاتیکی تێدا پەروەردە نەبووە، گەنجێکی تێدا هەڵنەکەوتووە کاری وەها یان هەر یارییەکی ترسناکی دی بکات، هۆی سەرەکیش ئەو ترسە بێمانایەیە کە دایک و باوک لە دڵی منداڵەکانیاندا دروستیدەکەن، بەوەدا دایک و باوکی ئێمە جگە لە منداڵەکانیان هیچ شتێکی تر لە ژیانیاندا نییە، بە شەبەنگێکی ترس

گەمارۆیـان دەدەن، تـەواوی جیهانیشـیان وەک جێگایەکـی ترسـناک بـۆ وێنادەکـەن تـا نەوێرن بیر لـە جێهێشـتنی مـاڵ و دوورکەوتنـەوە لـە ئامێـزی بـاوان بکـەن. بـەڵام ئیبراهیـم هیرانـی لـەو باوکانـە نەبـوو، کابـرا گەرچـی حاکم بـوو، بـەڵام لـە توخمێکـی سـەرکێش بـوو. ئـەردەڵان تەمەنـی شـەش سـاڵ بـوو کـە یەکەمجـار بـە پێـوە لـە سـەر قەراغـی سـتارەی سـەربانی ماڵـەوە دەرکـەوت، لـە جێگایـەک گـەر بەربـوایەتـەوە، مردنـی مسـۆگەربوو. ئـەو کات حاکم ئیبراهیـم لـە چیمەنەکـەدا گوڵـی ئـاودەدا و لـە قریشـکەی ژنانـی دراوسـێ بـە ئاگاهاتـەوە. کاتێـک سـەری بەرزکـردەوە و ئەردەڵانـی لەویادا بینـی، بێئـەوەی بقیژێنێـت بـە زمانێکـی هێمن پێیگـووت «مەترسـە، بـە هێمنـی پێدابنـێ و تـا ئەوسـەری سـتارەکە بـڕۆ». ئـەوە سـەرەتای هەمـوو ئـەو ئەزمـوون و یارییـە ترسـناکانەی تـر بـوو کـە ئەردەڵانـی لـە پلـەی پاڵـەوان نزیککـردەوە... ڕۆیشـتن بـە سـەر پەتـی باریکـدا، بـازدان بـە نـاو بازنـەی ئاگردا، ڕاکـردن بـە سـەر تەختـی بزماڕڕێـژدا، هەڵـدان و گرتنـەوەی چەندیـن چەقـۆ لەیـەک کاتـدا، قوتدانـی تـۆپ و هێنانـە دەرەوەی، ڕاگرتنـی نێـزەی تیـژ لـە سـەر پێڵـووی، گواسـتنەوەی پشـکۆ بـە زمـان و چەندیـن یـاری ترسـناکی تـر، کـە بەرلـەوەی گەمـەی سـیحربن، گەمـەی ئـازار و ئازایەتـی بـوون. دەبێـت بڵێـم کـە ئـەو دڵـە نەترسـەی ئـەردەڵان، مایـەی سەرسـامی نەغـەدە بـووە، بـەڵام نەغـەدە چەنـدە بـە یارییـە خەتەرناکەکانـی ئـەو سەرسـامبوو، ئەردەڵانیـش هێنـدە بـە خولیـای نەغـەدە بـۆ کتێـب و خوێندنـەوە و شیعر سەرسامبوو. لـە زستانی ساڵی ٧٣ دا ئـەردەڵان هـەژدە سـاڵ بـوو، لەبـری ئـەوەی خوێنـدن تەواوبـکات و بچێتـە زانکـۆ، لەگـەڵ سێرکێکی میسرییەکاندا هەڵهات و دوو سـاڵ شـارە و شـار بـە خۆرهەڵاتـدا گـەڕا، لەگـەڵ ئەوانـدا «بـازدان لـە جۆلانێـی هەوایـی» و «سـەرخسـتنی ماتـۆڕ بەدیـواری مەرگـدا» فێربـوو، بڕۆیشـتبایە بـۆ هـەر شـارێک لەوێـوە دوو کاغـەزی دەنـارد یەکێـک بـۆ باوکـی و یەکێکی دیش بـۆ نەغـەدە. نامەکانـی

بۆ نەغەدە هەمیشە وا دەستی پێدەکرد «خوشکی ئازیزم، نەغەدە... دوێنێ گەیشتینە شاری «...»، دەمودەست چووم بۆ کتێبخانەکان، بۆ ئەوەی هەندێک کتێبت بۆ بکڕم». نەغەدە بە کۆمەکی کتێبەکانی ئەردەڵان، لەبری ئەوەی وەک کچانی تەمەنی خۆی تەنیا سوعاد حوسنی و هند ڕۆستەم و لوبنا عەبدولعەزیز بناسێت، کەوتە دونیای شاعیرانی وەک سەلاح عەبدولسەبور و ماغوت و بەیاتی و ئونسی لحاجەوە، هەر لە ڕێگای ئەو دیوانانەوە کە ئەو لە بەیروت و تەرابلس و عەممان و شامەوە دەیناردنەوە، شاعیرانی وەک کافافی و ڕیتسۆس و نیرۆدا و ئەزراپاوەندی ناسی. دوای دوو ساڵ لە گەڕان بە سەر زەوی و تەقلەلێدانی بەردەوام لە هەوادا، کاتێک شۆڕشی کورد هەرەسیهێنا و بەرزانی چوو بۆ ئەمریکا، ئەردەڵان وەک تاکە کوردێکی گروپی سێرکەکە، بە جۆرێک کەوتە بەر تەشەر و لاقرتی ئەو عەرەبە تەقلەبازانە، شەوێک لە شاری فەیومی میسر بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و شۆڕشی شکستخواردووی کورد بگەێنێتە کۆتایی. بەڕێوەبەری سێرکەکە کە پیاوێکی سەرڕووتاوە و سمێڵ زل و دڵنەرم بوو، ناوی «حاج جمیل الابریشي» بوو، نیگەران لەو بڕیارە کتوپڕەی ئەردەڵان، بانگیکرد و پێیگووت «ئیبنی، ئەوەی تۆ بڕیارتداوە شتێکی گاڵتە نییە، جیاوازی نێوان شۆڕش و سێرک زۆر گەورەیە، لە سێرکدا مرۆڤ بە تەنیا خۆی تەقلەلێدەدا، بەڵام لە شۆڕشدا دەبێت تەقلە بە هەموو دونیا لێبدەیت... لە بەرئەوە جیاوازییەکانت لە بەرچاو بێت و زۆر پەلەی تێدا مەکە. تۆ منداڵی سێرکیت، بۆ ئەم ئیشە خولقاویت نەوەک بۆ شۆڕش».

بەڵام ئەردەڵان بێئەوەی گوێبداتە قسەکانی حاجی جەمیل، دوای دوو ساڵ ئاوارەیی بەنیازی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش، نیوەشەوێک لە کۆتایی نیسانی حەفتاوپێنجدا لە دەرگای ماڵەوەی دا و ئیتر جارێکی دی نەگەڕایەوە بۆ سێرک. ئەردەڵان بە لەشێکی پتەوەوە هاتەوە، ڕۆحی

وەرزشەوانێکی هەبوو کە دەتوانێت ترسناکترین یاری بباتەوە، جانتاکەی پڕبوو لە کتێبی لە چەشنی «حرب العصابات في الادغال» « الفلاحين و الثورة» «الهيكل التنظيمي للحزب الثوري» «هيا الى الثورة». هەموو هیواشی ئەوەبوو بە زووترین کات دەستبکاتەوە بە شۆڕش. لە ڕۆژی دوای گەڕانەوەیەوە، کەوتە خوێندنەوەی کتێبەکان و بیرکردنەوە لە چۆنێتی زیندووکردنەوەی خەڵکی ورە ڕوخاو. دوای دوو ساڵ دووری، کە بۆ یەکەمجار نەغەدە ماردینی و نەوای بینی، هەردووکیان بووبوون بە دوو کیژی گەورە، نەغەدە هەموو ئەو دیوانە شیعریانەی ئەو بۆی ناردبوو، چەندین جار و لە بەرگەوە بۆ بەرگ خوێندبووەوە، ئێستا هەم کیژێکی زۆر جوان و هەم ڕۆحێکی یاخی بوو. دواي گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانی لەگەڵ ئەو سێرکە میسرییەدا، دوای ئەوەی باسی چەندەها شاری ناوازە و وڵاتی نەبینراوی بۆ کردن، گووتی «هاتوومەتەوە بۆ ئەوەی شۆڕش دەست پێبکەمەوە، ئێمە هیچمان لە فێتنامییەکان کەمتر نییە، وڵاتەکەمان بۆ شۆڕش گونجاوترە، دوژمنەکانمان دواکەوتووتر و گەمژەترن، خۆشمان میللەتێکی فیداکارمان هەیە». نەغەدە هەمان ڕۆحی سەرکەشی منداڵی لە چاویدا بینییەوە، هەمان ئاگری داگیرساوی ناو دەرونی، هەمان جۆش و خرۆش کە لە ناکاو بۆ شتێک دادەگیرسێت و ناکوژێتەوە. لەو دەمەدا سەرەتای ڕۆحێکی شاعیرانەی هار لە نەغەدەدا دەرکەوتبوو. بە پێچەوانەی نەواوە کە پێیوابوو باشترە مرۆڤ ئارامبێت و دان بە خۆیدا بگرێت تا سەرۆکە زاڵمەکان خۆیان بە سروشتی دەمرن، نەغەدە هەڵپەیەکی شۆڕشگێڕانە و منداڵانەشی تێدابوو. نەوا لەگەڵ سەبری دووروودرێژدا بوو، ڕای وابوو ئەو جۆرە سەبرە سەرکەوتنی لە شۆڕش مسۆگەرترە، نەغەدە بۆچوونی وابوو، کە چاوەڕوانی بۆ مردنی دیکتاتۆر لەوانەیە ژیانی نەوەیەک بەتەواوەتی بەهەدەر بدات و دواجاریش دیکتاتۆر ژنەکەی یان منداڵەکەی لە جێگای خۆی دابنێت. نەوا بە

لەنجە و نەغمە کچانەکەی خۆیەوە دەیگووت شۆڕش لەوانەیە دەیان هەزار قوربانی بوێت، بێئەوەی بتوانێت سەرکەوتن زامنبکات، بەڵام سەبر کەمێک ماوەی زۆرتری دەوێت، بەڵام دەرەنجامەکانی مسۆگەرترن. دڵی بەجۆشی نەغەدە لەمەدا لە خەیاڵی گڕگرتووی ئەردەلانەوە نزیکتر بوو، کە ڕای وابوو ژیان بە هەر ڕێگایەکدا بڕوات دواجار خاڵی نییە لە ئەگەری ترسناک، مرۆڤ بخوازێت یان نەخوازێت هەمیشە بە سەر دەمی چەقۆیەکی تیژ و کوشندەدا دەڕوات. بە ئیمانی گەنجێکەوە کە بووە بە خاوەن فەلسەفەیەکی تایبەتی ژیان، گووتی ئەو دەمانەی لەگەڵ یاریزانە تەقلەبازەکانی سیرکدا بە ئاسمانەوە دەستی لە جۆلانێ هەواییەکان بەرداوە، بێئەوەی هیچ تۆڕێک لە خوارەوە دانرابێت، لە دەمێکدا بچوکترین هەڵە مانای مردن بووە، هەر بە ئەندازەی ئێستا و وەک دانیشتنی ئارامی لە نێوان ئەم دوو خوشکە جوانەدا ئەگەری مردن لێی نزیک بووە، چونکە لەو دەمەدا کە ئەو بە سەلامەت لە هەوادا تەقلەی مردنی لێداوە، لە هەمان ساتدا هەزاران کەس لە سەر زەوی، لە باوەشی ماڵ و منداڵدا، لە سەر شەقامە پانەکان، لە کونجی قەڵا قایم و ئەمینەکانیاندا مردون. ئەو کەسانەی زۆر بیر لە مردن دەکەنەوە، هەر بە ئەندازەی ئەوانە ژیانیان لە مەترسیدایە کە ناوێرن خۆیان بدەنە بەر هیچ بایەک و ناتوانن لە هیچ چاڵێکی بچوک و لە هیچ لەمپەرێک نزیک ببنەوە. ئەو ڕۆژە نەغەدە ماردینی پێیگووت هەرکات دەستت بە شۆڕش کرد، هەر کات حیزبێکی نوێت دامەزراند، من وەک یەکەم ئەندامی شۆڕشەکەت قەبووڵبکە و سوێندت بۆ دەخۆم کە هەرگیز ترسم لەوە نابێت دڵسۆزانە لەگەڵتدا بە ناو هەموو مەترسییەکدا بڕۆم.

قسەکانی نەغەدە نەوای ترساند، دواتر وەک کەسێک کارێکی شێتانەی کردبێت، بە خوشکە بچوکەکەیدا هەڵشاخا و گووتی «تۆ دیارە لە هەموو دنیا شێتتریت، لە هەموو دونیا ئەگینا دوای خەیاڵی شێتێکی

وەک ئەردەڵان ناکەویت کە تا دەمرێت هەر دەیەوێت لە هەوادا تەقلە لێبدات و ناتوانێت بۆ ڕۆژێکیش، وەک بەشەرێکی ئاسایی بژی. گوێبگرە، ئەردەڵان لە فشەکەرێک بەولاوە هیچی تر نییە، کە بە تەقلەبازییەکانی نەیتوانی کچێکی دەستبکەوێت و دەستی ژنێک ببڕێت. ئێستا هاتووە بە ناوی ئەوەی گوایە شۆڕشم بۆ دروستدەکاتەوە، دەیەوێت خۆی لە بەردەم تۆدا فشبکاتەوە... درۆزن و فشەکەری وا ». نەغەدە لە هۆی ئەو ڕقە کتوپڕ و سەیرەی ئەوا تێنەگەیی، کە لە ساڵانی پێشوودا هەمیشە ئیرەیی بە نەغەدە بردبوو کە بەردەوام ئەردەڵان لە شارە دوور و شوێنە سەیرەکانەوە نامەی بۆ دەنێرێت و کتێبی بۆ پۆستدەکات، کەچی بۆ سڵاوێکی کورتیش ئەوای بیر ناکەوێتەوە. دەیزانی هەموو ئەو دوو ساڵە ئەوا چاوەڕوانی ئەوەی کردوە ئەردەڵان نامەیەکی بۆ بنێرێت، بەڵام هەتا جارێکیش ئەوی بەیادا نەهاتبوو. نەغەدە دەیزانی خوشکەکەی چ ئازارێکی هەیە و چ ڕقێک لە ناوەوە دەیسووتێنێت، گووتی «هێی بوەستە. ئەردەڵان درۆزن و فشەکەرە؟... ئەردەڵان... دوو ساڵ لەمەوبەر کە ڕۆیشت تۆ دەتگووت باشترین کوڕی دونیایە، برای دڵسۆزمانە، هاوڕێی منداڵیمانە... وانییە خانم خاس، ئێستا بۆ بوو بە درۆزن و فشەکەر. چونکە لەم دوو ساڵەدا تۆی لەبیر نەبوو؟ هەر لەبەر ئەوە... تەنیا لە بەر ئەوە؟... ئا خانم خاس، دوای ئەوە باوکم ناڵێت شۆڕش هەر دەست پێدەکاتەوە. هەموو کەس واناڵێت؟. خۆ هەر ئەردەڵانی قوڕ بە سەر وای نەگووتووە. تۆ بۆ وا لێی بەقینیت». هەڵبەت ئەوا ئەوکات خەیاڵي بۆ ئەوە نەدەچوو کە نەغەدە ئەو قسانەی بەڕاست بێت، ڕاستە کچەکە کتێبی دەخوێندەوە، ڕاستە دیوانی هەندێک شاعیری لەبەربوو، ڕاستە زۆر شەیدای دیوانی خودا و شارە بچکۆلەکەمانی لەتیف هەڵمەت و من تینوێتیم بەگڕ دەشکێی شێرکۆ بێکەس بوو، بەڵام بە گشتی لەوە منداڵترە هیچ شتێک بە جیدی وەربگرێت و لە مانای قسەکانی

خۆی تێبگات. ئەوا بە قاقاوە، وەک یەکێک گاڵتەی بە قسە و گفتی منداڵانەی نەغەدە بێت گوتی «شۆڕش؟! ئەوە بەرزانی نەیتوانی هیچ بکات، ئێستا گوێبەخواکەرێکی وەک ئەردەڵان دەتوانێت؟ ها من قەت باوەڕم بە خەڵکی گوێبەخواکەر نییە». نەغەدە هاواریکرد «پێیمەڵێ گوێبەخواکەر، وای پێمەڵێ». ئەوا گوتی «ووی دایە، بۆ وانەڵێم؟ حەزت لێکردوە؟». نەغەدە هاواریکرد «مەڵێ حەزت لێکردوە؟ تێدەگەیت مەڵێ حەزت لێکردوە؟ جارێکی تر شتی وانەڵێیت... نەڵێیێ حەزت لێکردوە». ئەوا لە ژوورەکە چووەدەرێ و گوتی «ووی دایە، وەڵا دەڵێی حەزی لێکردوە، ووی.. یان هەر عەقڵی بە تەواوی تێکچووە... ئەوە شیعر عەقڵی خەڵک وا تێکدەدات؟ ووی دایە». بەڵام نەغەدە پێیوابوو کە عەقڵی تێک نەچووە، کچێکی گەورەیە، عەقڵێکی کامڵی هەیە، حەزیشی لە شیعر خواستێکی قووڵێتی و پەیوەندی بە شێتییەوە نییە.

گەر هەڤاڵانی سیاسەتمەدار لە دەرەوەی وڵاتەوە پلانی دروستکردنەوەی شۆڕشیان نەکێشابا، ئەگەر ئەردەڵان هیرانی تەنیا کەسێک بایە کە بیری لە شۆڕش بکردایەتەوە، ئەوسا نەغەدە ماردینی بە یەکەمین ئەندامی شۆڕشی نوێ ئەژماردەکرا. بەڵام شۆڕش شتێک نییە لە یەک جێگاوە دەست پێبکات، شۆڕش لە هەموو لایەکەوە دێت، نیازێکە دروستدەبێت و لە یەک ساتدا لە زیاد لە پنت و جێگایەکەوە دەجوڵێت. شۆڕش گەر تەنیا زادەی خەون و پرۆژەی یەک مرۆڤ بێت ناگاتە هیچ، شۆڕش تەنیا کاتێک گەورەدەبێت و دەبێتە شۆڕش کە بکەری جیاواز جیاواز لە شوێنی جیاواز جیاوازەوە، بێئەوەی کەسیان ئاگاداری ئەوی دیکەیان بن، تۆڕێکی نادیار دروستبکەن، تۆڕێکی خەیاڵی، کە دواتر نەساجێکی دیکە دێت، هەموویان پێکەوە گرێدەدات، ئەوەی لە هەمووان خێراتریش دەست بۆ چەک و توندوتیژی بەرێت، لە هەمووان خێراتر دەبێتە باوەگەورەی شۆڕش.

ئەو دەمەی مەفرەزە بچوکەکانی چەکدارانی شاخ دەستیان بە گەڕان کردەوە، ئەردەڵان هیرانی ڕێکخراوێکی بچوکی بۆ خۆی دروستکردبوو،ساڵی یەکەمی خۆی لە زانکۆ تەواو بۆ ئەوە تەرخانکرد، ڕێکخراوەکەی بونیادبنێت و گەنجانی بە دەستی تێدا ڕێکبخات، نەغەدە هێشتا قوتابی شەشی ئامادەیی بوو کە لە یەکەم چالاکیدا بەشداریکرد، ئەویش بڵاوکردنەوەی بەیاننامەیەکی بچوکی نیو لاپەڕەیی بوو، کە مژدەی سەرهەڵدانەوەی شۆڕشی ڕادەگەیاند. نەغەدە بەیاننامەکەی لە قوتابخانەکەی خۆی بڵاوکردەوە، نەک هەر ئەوە بەڵکو بە ئازایەتییەکی بێوێنەوە لە زۆر دوکان و کۆگای ناو بازاڕیشدا پەخشیکرد، بە جۆرێک گەیشتە دەستی زۆر کەس و هێزە ئەمنییەکانیشی بە توندی ترساند. بەڵام دەبێت بڵێم کە کۆی شتەکە لای نەغەدە جۆرێک بوون لە یاری. شتێک بوو وایدەکرد ڕۆژەکانی لە یەکتر نەچێت. زۆر بەلایەوە گرنگ بوو شتێک بکات، دوایی بتوانێت بڵێت «من بووم». خواستێک هیچ کات نەوای خوشکی لەخۆیدا هەستی پێنەکردبوو.

ئیدی ڕۆژ دوای ڕۆژ، ئەو یارییەی سەرەتا دەبوو بە ڕاست.

نەغەدە کاتێک چووە زانکۆ و شووی بە دکتۆر کرد، ئەوەندەی خولیای شیعری خەیاڵی پڕکردبوو، شۆڕش وەها لە کەللەی نەدابوو... ڕۆژێک ئەردەڵان هیرانی لە زانکۆ گرتی و پێیگووت «نەغەدە شۆڕشی چەکدار دەستی پێکردۆتەوە، ئێستا لە هەوڵی ئەوەداین ڕێکخراوەکەمان بە شاخەوە گرێبدەین، لەمجۆرە دۆخانەدا گرنگ ئەوەیە شۆڕش بە ڕاستی دەست پێبکاتەوە، بۆ ئەوەش نامەوێت میللەت کەرتبکەم و ڕێزی شۆڕشگێڕانی تر نەگرم. لای من گرنگ ئەوەیە شۆڕش دەست پێبکاتەوە، پارچەپارچەبوون بزوتنەوەکەمان لاوازدەکات». نەغەدە سەری لەوجۆرە قسانە دەرنەدەکرد... لە سەرەتاوە لە دونیای دکتۆر مستەفا شوکاک

بێزار بوو، ئێستا گەر شۆڕش کۆمەکیبکات شتێکی تر بژی، هەست بە بەختەوەری دەکات. بەوەدا کچی دکتۆر بوو، ژنی مێرداربوو، جوان و ئەرستۆکرات و نازدار دەینواند، کەس خەیاڵی بۆ ئەوە نەدەچوو بووبێت بە ئەندامی شانەیەکی شۆڕشگێڕانە، لە بەرئەوە بە ئاسانی دەچووە هەموو جێگایەک، لە ژووری مامۆستاکان و لە ناو فەرمانبەران و لە کتێبخانەی زانکۆ بەیاننامەکانی بڵاودەکردەوە. لە قسەی کیژە شۆڕشگێڕەکانی هاوڕێی و لە ئەردەڵانەوە تێگەیشت کە تۆمەتبارە بەوەی کچی خێزانێکی بۆرژوایە. ئەوکات خوێندنەوەی سیاسی وەهای نەبوو بزانێت تۆمەتی کچە بۆرژوا چ واتایەکی خراپی هەیە، بەڵام دڵنیابوو واتایەکی خۆشی نییە و بۆنی تانەوتەشەری لێدێت. کە شوویکرد ئەردەڵان هیرانی پێیگووت «ئەگەر دەیەوێت ئەندامێتی خۆی لە شانە شۆڕشگێڕەکاندا بۆ مێردەکەی باسبکات، باشترە لە ئێستاوە دەست لە کاربکێشێتەوە، چونکە دوور نییە مستەفا شوکاک پیاوێکی ترسنۆک بێت، بۆ ڕزگارکردنی کەوڵی خۆی و ژنەکەی، بیەوێت شۆڕشگێڕان لە دەمبدات و بیانداتە گرت». بەڵام نەغەدە سوێندی خوار کە دکتۆری مێردی تامردن هیچ شتێک دەربارەی ئەندامێتی ئەو نازانێت و ئەو تەنیا مێردێتی، مێرد و هیچی تر و ناتوانێت هیچ نهێنییەکی تایبەتی و ڕۆحی ئەو بپشکنێت و ژیانی هەموو شۆڕشگێڕان و کچانی شانەکە لای ئەو پارێزراوە. ئەردەڵان گووتی، دەزانم تۆ هەمیشە خوشکێک و هاوڕێیەکی یەکەمی منیت و هەروا دەمێنیتەوە. شەوێک کە تازە شوویکردبوو، بە تەلەفون لە ئەردەڵان پاڕایەوە بۆی ڕوونبکاتەوە، بۆ ئەو کچێکی بۆرژوایە، بۆ دەیخەنە بەر تانەی وەها، گەرچی ئەو یەکەمین ژنە چووبێتە ناو شۆڕش، ئەو لە هەمووان زیاتر ئیشدەکات، لە هەمووان زیاتر لە غەمی سەلامەتی هەڤاڵاندایە. کە ئەردەڵان پێیگووت باوکت لە دەوڵەمەندەکانە، مێردەکەت دکتۆرە، ئێوە سەر بە چینێکی دەوڵەمەندترن لە خەڵکی

سادە، نەیزانی چی بڵێت... دەبوو باوکی چی بکات؟ ها... واز لە دکتۆری بهێنێت یاخود چی؟ دەبێت چی بکات و چی شتێک ڕووبدات بۆ ئەوەی ئەو بۆرژوازی نەبێت؟. بەڵام هەرچییەک بێت، ئەو قسانە هۆکارێکی تربوو ڕقی لە هەموو ئەم دونیا دەستکردەبێت، ڕقی لەو بولبولە شوشانەی دکتۆری مێردی بێت، کە بەردەوام کۆیاندەکاتەوە، ڕقی لەم کانتۆرە فۆرمیکا و مێز و کورسییە گرانانە بێت کە ماڵەکەی ڕازاندۆتەوە، ڕقی لەم ئینجانە بێڕۆحانە و گوڵدانە ڕەنگین و پیاڵە زەڕلیانە بێت کە دکتۆر شوکاک بە خولیای پیاوێکەوە کە زۆر ئالودەی ئاسوودەیی ماڵە دەیانکڕێت. کە لە ناوەڕاستی هەموو ئەو شتانەدا دەوەستا، کە هەستی بە بێدەنگییە قورسەکەیان دەکرد، کە دەیزانی پێکڕا جوانی بۆرژوازیانەن، هێندەی تر دڵی تەنگ دەبوو... لە ژێر لێوییەوە دەیگووت «ستیل لایف... ستیل لایفێکی بۆرژوازی»... گوزارەیەک بوو ئێستا بێهۆیەکی تایبەتی لەبەرامبەر هەموو جوانییەکی بێڕۆح و بێدەنگدا بەکاریدەهێنا. تا ئەو ڕۆژەی لە باوەشی نزار ئیدریسدا نەخەوت، هەستی نەکرد کە شۆڕشگێڕێکی ڕاستەقینەیە... هەستی نەکرد لە گەمارۆی ئەو ژیانە بێدەنگەی دکتۆر شوکاک ڕزگاریبووە. لە باوەشی نزار و لە ژێر فشاری لێوە ئەستوورەکانیدا، هەستیکرد بۆ یەکەمجار لە هەموو ئەو دونیایە دەچێتە دەرەوە کە لە مێژە دەیەوێت لێیدەرچێت. بەبڕوای نزار «کە بێشەرمانە ڕقی نەغەدەی لە بۆرژواکان بۆ خۆی بەکاردەهێنا» مرۆڤ بۆ ئەوەی بۆرژوا نەبێت، ناچارە لە هەموو ئەو ویقارە درۆزنە پاکببێتەوە، دەبێت لە هەموو ئەو ئەتەکێت و شێوەی خۆدەرخستن و حیشمەتە درۆیە «کە دەرەنجامی پەروەردەیەکی بۆرژوازییە» خۆی دووربخاتەوە... بەڵام ئەوە نەبێت نزار ئیدریس ڕێزی هەژارانی لابێت کە بە بوونەوەری گێژ و بێبەهرەی دەزانین و دەیگووت شایستەی چارەنوسی خۆیانن. نزار کە نەغەدەی دەخستە سەر کۆشی، بە گاڵتەوە دەیگووت

«ئا لێرەدا پەروەردەی بۆرژواکان و هەژارەکان یەکشتە. تۆ ئەگەرچی کچێکی بۆرژوایت، بەڵام عەقڵییەتی دکتۆری مێردت و بیرکردنەوەی باوکە پرۆفیسۆرەکەت، لە عەقڵی جووتیارێکی گوندەکی دوورنەکەوتوونەتەوە... لە بەرئەوە ئەوانیش گەر ئێستا و بە ڕووتی لە باوەشمدا بتگرن، دەتکوژن. شەرەف وا دەکات خەڵکان هەموو لە یەکبچن، بۆیە بێزم لەو وشەیە دێتەوە... ئینجا بزانە بۆ من یەک شت گرنگە... یەک شت... ئەویش ئەوەیە لە نێوانماندا شتێک نەبێت ناوی شەرەف بێت». وای دەگووت و بە قاقا پیسەکانی خۆی، بە بێباکی کەسێکەوە کە دەزانێت وشە دوور لە ئەدەبەکانی ژنان مەستدەکەن، باوەشی بە نەغەدەدا دەکرد و ماچی درێژی دەکرد. تاکە شتێک کە دەیتوانی زۆر تێیدا ڕومانسی بێت ماچکردن و شێوەی جوڵاندنی لێو و زمانی بوو. ساڵانێک دواتر لە بۆنەیەکی تایبەتیدا یەکمان بینییەوە، هەردووکمان مەستبووین و کەوتینە باسی ڕابوردوو، من پێمگووت ئەودەم هەتا نهێنی ماچەکانی تۆ و خانمی ماردینیشم دەزانی، هەواڵی ورد و درشتی هەموو شتێکتان دەگەیی بە من. ئەو بە هەمان پێکەنینی چەپەڵی خۆیەوە، لەدەستێک قاتی ڕەشدا وەستابوو، بە منی گووت «هەڤاڵ مەرج نییە زانیارییەکانی تۆ هەمووی ڕاست بن، ئێوەی پیاوانی ئاسایش تەنیا دەتوانن بزانن کە ژن و پیاوێک یەکتر ماچدەکەن، بەڵام چۆنێتی ماچەکە و تامی ماچەکە، نا جەنابی لیوا ئەوە سەر بە بواری ئێوە نییە. هەرگیز پیاوانی ئاسایش ناگەنە نهێنی تامی ماچەکە، ئەو نهێنییە تا قیامەت بەس لە سەر لێوی مندا دەمێنێتەوە». ئەو شەوە گوتی هەموو ئەو ئافرەتانەی ئەو لە ژیانیدا ماچیکردون لە ماچدا لەو هونەرمەندتربوون. بە دەنگی بەرز، دەنگی مەستێک کە شەرم لە هیچ قسەیەک ناکات گوتی «لە ماچ و جاسوسیدا ژنان لە پیاو بلیمەتترن، تۆ چۆن پیاوێکی ئاسایشیت کە ئەوە نازانیت».

ئەوەی لەو سەردەمەدا بۆ نەغەدە ماردینی گرنگ بوو ئەوەبوو، هەستی نەدەکرد کە خەوتنی لەگەڵ نزار ئیدریسدا هەڵە بێت، دەتوانم بڵێم یەکەمجار بوو ژنێتی ڕاستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە. تێبگات کە لەشی ژنانەی دەکرێت چ مەکینەیەکی ترسناکی لەزەت بێت، تەنیا کەم پیاو دەتوانن ئەو مەکینەیە لە لەشی ژندا بخەنەکار، بەڵام نزار لەوانەبوو کە دەمودەست لە نێوان خۆی و ئافرەتدا شەرمی هەڵدەگرت. خودی هەڵگرتنی ئەو شەرمە وایدەکرد هەموو بە هەقیقەتی خۆیانەوە لەگەڵیدا بخەون. نەغەدە بە جۆرێک ئازادی خۆی لەگەڵ نزاردا دەژیا بۆ ساتێکیش ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات کە ئەگەر تەواوی پەیوەندییەکەیان بکەوێتە بەرچاو چی ڕوودەدات. بە پێچەوانەوە لەو کاتەوەی لەگەڵ نزاردا بوو ئاسانتر و بێگرێتر و ئازادتر لەگەڵ دکتۆر مستەفا شوکاکی مێردیشیدا دەخەوت، خێراتر شیعری دەنوسی، بە خەیاڵێکی سافتر و دڵنیاترەوە سەری دەخستە سەر سەرین، لە جاران باشتریش کارەکانی شانە شۆڕشگێڕییەکەی جێبەجێدەکرد. کاتێک پێکەوە لەگەڵ نزاردا لە ناوجێگادا دەبوون، نزار دەستی لە لەشی دەدا و دەیگووت «دەبینیت عەشیقێکی نۆرزانی وەک من وادەکات مێردەکەشت سوود ببینێت. ئەگەر ئەو دکتۆر شوکاکە کەسێکی عاقڵ بێت و دەرمانی دەردی ژنەکەی خۆی بوێت، دەبێت بەختەوەر بێت کە تۆ دێیتە باوەشی من». نەغەدە زۆر پێدەکەنی، لێوی دەخستە سەر لێوی ئەو سالوکە گەورەیە و دەیگووت «تۆ بێشەرەفێکی ڕۆحسوکیت، ئەگینا چۆن ژنی پیاوێک ڕووتدەکەیتەوە کە ژیانی ڕزگارکردویت... ژنە بەستەزمانەکەی کە هەر یەکەمجار ئەم دەعبا خەوتووە بچکۆلەیەتی بینی حەزی لێکرد».

من هەموو ئەو قسە بازاڕیی و بێنابڕووانەم پێدەگەیشتەوە و دەمکردن بە ڕاپۆرت و دەمناردن بۆ هەڤاڵ شێرخان.

نزار ئیدریس یەکەمجار لە ڕێگای نەغەدە ماردینییەوە ئەردەڵان هیرانی

ناسی. وەک خۆی بە نەغەدەی گووت، دوو هۆ هەبوون بەرەو شۆڕش پاڵیان پێوەدەنا، یەکەم: کوشتنی لیڤیتانت بۆتانی. دووەم: لە شۆڕشدا دەتوانێت هەموو ئەو یاسا ئەخلاقیانە بشکێنێت کە دەیەوێت. شۆڕش هیچ نییە جگە لە گۆڕستانێکی گەورەی ئەخلاق، وەک ئەو ناویدەنا.

ئەردەلان هیرانی دەیزانی بۆ ئەوەی بتوانێت شۆڕش بگەێنێتە کۆتایی خۆی، تەنیا پێویستی بە بولبولیار و هاوڕێ خوێندەوارەکانی نابێت، بەڵکو پێویستی بەوانەش دەبێت کە دەتوانن تەقەبکەن و خەڵک بکوژن و مرۆڤ سەرببڕن. ئەوکات نزار بە چاوقایمی خۆی گەڕابووەوە بۆ قەسابخانە، دوای ئەوەی هەندێک لە خزمانی قزڵباش لای بەڕێوەبەری ئاسایش زامنیان بۆ سەندبوو کە لیڤیتانت چیدی کاری بە سەریەوە نەبێت. ئەوەی نزار توانی بووی لە پشتی ئەوەوە، لای ڕەفیقە بە دەسەڵاتەکانی حیزب زامن پەیدابکات، لیڤیتانتی تووڕەترکرد، نزار هەردەم دەیزانی کە لیڤیتانت چاوەڕوانی هەلێکە دووبارە دەربکەوێت و تۆڵەی لێبکاتەوە، بەڵام بێباک و بێمنەت خۆی دەردەخست و وای لێهات وەک جاران دەگەڕا و خۆی بێترس پیشاندەدا. نزار لە منداڵییەوە تۆڕێکی گەورەی لە ناو گەنجانی نائومێد و چەقۆکێشی سەرسوچەکان و خەڵکانی چەقاوەسووی بازاڕدا هەبوو کە پێکڕا خۆشیاندەویست و بە نموونەی سیحراوی ئەو پیاوەیان دەزانی کە بێشەرمییەکەی سەرنجکێشە و ئەوانی دی سەرسامدەکات، لە بەرئەوە هەرکات دەیویست ئاسان و خێرا دزەیدەکردەوە ئەو جێگایانە. نزار لەگەڵ هەموو بەرەڵایی خۆیدا، سەرەتاکانی ئیشکردنی خۆی لە ڕێکخراوە بێناوەکەی هیرانیدا بەباشی بردبەڕێوە.

ئەردەلان لە ماوەیەکی کەمدا چوار شانەی گەورەی هەبوو، کە یەکەمیان شانەیەک بوو لە خوێندکارانی کوردپەروەر دروستبووبوون و خۆی سەرپەرشتیدەکردن، شانەی دووەم شانەیەکی کچانی شۆڕشگێڕبوو

کە نەغـەدە سەرپەرشـتیدەکردن، شـانەیەک لـە ڕۆشـنبیرانی شۆڕشـگێڕ کـە ئەندامـی پەیوەندیـان لەگـەڵ هیرانیـدا هۆشـەنگی بولبولیـار بـوو، لەگـەڵ شـانەیەکی نوێـدا کـە نـزار لـە نـاو پیاوانـی بـازاڕ و گەنجانـی بێشـوناس و پرۆلیتاریـای لومپنـدا ڕێکیخسـتبوون. کـە مـن لـە شـاخەوە دابەزیـم، یەکـەم کارم ئەوەبـوو کەمێـک ئـەردەڵان هیرانـی بخەمـە لاوە و شـانەکان بـە خۆمـەوە گرێبـدەم. ئـەردەڵان لەوانەبـوو کـە تەنیـا بیـری لـە قازانجـی شـۆڕش دەکـردەوە، مـن لـە سـەفەرێکی کورتـدا بـردم بـۆ شـاخ و لـەوێ چـاوی بـە سـەرۆک و ئەندامانـی ئەنجومەنـی بـاڵا کـەوت. گەرچـی مـن جگـە لـە دڵسـۆزی هیچـی دیـم لـە هیرانـی نەبینیبـوو، کەچـی شـێرخان لـە نامەیەکـدا بـۆی نوسـیم «ئـاگاداری هیرانـی بـم، چونکـە کەسـێکە لـە هـەرە ترسـناکەکان». وادەزانـم توانـا و دڵسـۆزی و هێـزی ڕێکخسـتنی هیرانـی کـەم تـا زۆر ئەندامانـی ئەنجومەنـی بـاڵای تۆقاندبـوو، چونکـە هیـچ یـەک لـەو شـانانەی دی کـە کاری ڕێکخسـتنیان گرتبـووە ئەسـتۆ، وەهـا چـالاک و نهێنـی و داخـراو نەمابوونـەوە.



لـە هەمـان دەمـدا، بولبولیـار و هاوڕێکانـی یەکـەم بازنـەی خوێندنـەوە و تێگەیشـتنیان لـە کتێبـە مارکسـییەکان دامەزراندبـوو، بولبولیـار لـەوەوە دەسـتی پێکـرد بـە دوای هەمـوو ئـەو بیرمەندانـەدا بگەڕێـت کـە سـتایشـی هەژاریـی دەکـەن. مارکـس تاکـە فەیلەسـوفێکی مێـژووە، مـرۆڤ بەپێـی «هەبوونـی و نەبوونـی» سـامان پۆلێنـدەکات. ئـەو ڕسـتەیەی کـە دەڵێـت «تـا زۆرتـرت هەبێـت لـە مرۆڤبوونـت کەمدەکاتـەوە» بـوو بـە دروشـمی بولبولیـار، لـە سـەر دەفتەرەکانـی دەینوسـی، لـە سـەر دیـوارەکان، لـە سـەر تەختـە ڕەشـەکانی زانکـۆ. تـەواوی تێگەیشـتنی لـە سـەر ئـەو بنەمایـە داڕشـتبوو گـەر مـرۆڤ دوای شـتەکان کـەوت، خـۆی دەوڵەمەنـد و مرۆڤەکـەی

ناخـی هـەژار دەبێـت، گـەر دواشـیان نەکەوێـت خـۆی هـەژار و مرۆڤەکـەی ناخـی دەوڵەمەنـد دەبێـت. لێـرەوە هەژاریـی لای ئـەو هاوشـانی دوو شـت بـوو، مرۆڤبـوون و نائومێدبـوون... مرۆڤـی هـەژار هەمیشـە مرۆڤێکـی نائومێـدە چونکـە هیـچ شـتێک لەگـەڵ ڕۆحـی شارسـتانییەت و مرۆڤـی تـازەدا کۆیناکاتـەوە کـە هیـچ نییـە جگـە لـە حەیوانێکـی چاوبرسـی کـە تەنیا شـت کەڵەکـەدەکات و کاڵا کۆدەکاتـەوە. شـۆڕش لای بولبولیـار بـۆ ئـەوە نەبـوو کۆمەڵـگا ڕزگاربـکات، بەڵکـو بـۆ ئەوەبـوو بەوانـی دی بڵێـت مـن لەگـەڵ ئـەم لۆژیکـەی ئێـوە نیـم. هاوڕێکانـی ناویـان نابـوو، نیـوە مارکسـی، لەوەشـدا لـە سـەر هـەق بـوون، بولبولیاریـش دەیگـووت مارکـس تەنیـا نیـوەی بەکەڵـک دێـت، نیوەکـەی تـری هیـچ نییـە جگـە لـە تەواوکـەری سـەرمایەدارەکان، لـە خۆشـبینێکی کاڵفام، لـە کەسـێکی بونیادنـەر بـۆ جـۆرە کۆمەڵگایەکـی تـری بەتەمـاح. لـە قسـەکانی نـاو بازنەکـەدا، هاوڕێکانـی هەمـوو لـەو مارکسیسـتە فانەتیکانەبـوون کـە باوەڕیـان بـە دیکتاتۆرییەتـی پرۆلیتاریـا، دابەشـکردنی یەکسـانی سـامان، نەهێشـتنی موڵکـداری بـوو. بولبولیـار تاکـە کـەس بـوو کـە دەیگـووت، موڵکـداری یەکسـانە بـە دڕندەیـی، بـەڵام هیـچ هێزێـک نییـە بتوانێـت موڵکـداری لـە سـەر زەوی لاببـات، یـان تەماحـی موڵکـداری لـە مرۆڤـدا بکوژێنێتـەوە. کـە هاوڕێکانـی پێیـان لـە سـەر ئـەوە دادەگـرت کـە لـە سۆسـیالیزمدا دەوڵـەت و حوکمـی کرێـکاری دەسـت بـە سـەر سـامانی گشـتیدا دەگـرن و بەیەکسـانی بـە سـەر کۆمەڵگادا دابەشـیدەکەنەوە، بـە جۆرێک کەس لـەوی دی زۆرتـری بەرنەکەوێـت. بولبولیـار پێدەکەنـی و دەیگـووت «ڕاسـت نییـە بـرادەران ڕاسـت نییـە، تێناگـەم چـۆن مـرۆڤ دەتوانێـت ئەوەنـدە گەمژە بێـت... پێمبڵێـن دەوڵـەت کێیـە، دەوڵـەت لـە مرۆڤـی وەک مـن و تـۆ دروسـت نەبـووە؟ دەوڵـەت لـە ژمارەیەکـی گـەورە لـەو پیـاو و ژنـە چاوچنۆکانـە دروسـت نەبـووە کـە ئامێرێکـی زەبەلاحیـان دەکەوێتـە دەسـت، دەوڵـەت خـۆی گەورەتریـن موڵـک نییـە. مارکـس خـۆی بـە نەزانییەکـی گـەورە، گەورەتریـن

هێز، گەورەترین موڵک، لە پاڵیشیدا هەموو سامانی کۆمەڵایەتی دەداتە دەست تاقمێکی بچوک، بە ئومێدی ئەوەی ببن بە مرۆڤ... بە ئومێدی ئەوەی لە بیریان بێت ڕۆژێک پرۆلیتاریا بوون، بەڵکو خوایە تەماحیان نەبێت و سامانی کۆمەڵایەتی بە یەکسانی دابەشبکەن. هیچ فەیلەسوفێک نییە لە مێژوودا بە ئەندازەی ئەم مارکسە لە مرۆڤ تێنەگەیشتبێت. هەندێک کارخانە لەدەستی هەندێک سەرمایەدار دەردەهێنێت و پێکڕا لەگەڵ تەواوی سامانی کۆمەڵایەتی و لەگەڵ چارەنوسی هەموو مرۆڤەکاندا، دەیانخاتە دەستی تاقمێکی بچوکتر لە مشەخۆران کە ناوی خۆیان ناوە سەرانی بزووتنەوەی کرێکاری. سوێنددەخۆم کە هەموو مێژوو بگەڕێیت، خەیاڵپلاوێکی وا سادە و بێمانا نادۆزیتەوە... تێناگەم چۆن بەم بۆچوونە کاڵفامە توانیوێتی کڵاوبکاتە سەری نیوەی بەشەرییەت... تێناگەم».

ئەوە هاوڕێکانی تورەدەکرد، مارکس لەو دەمەدا تاکە پێغەمبەر بوو کە دەیانتوانی ئومێدی پێببەستن. هەموو هاوڕێکانی شۆڕشگێڕی ئومێد بوون، شۆڕش لەلایەن هیچ نەبوو جگە لە جۆرێک لە گێڕانەوەی هیوا بۆ ژیان، بولبولیار تاکە کەس بوو ئەو ڕاستییە تاڵەی دەبینی، شۆڕش جگە لە دەرکەوتن و تەجەلابوونی نائومێدی لە توندترین شێوەیدا هیچی تر نییە. بولبولیار هیچ کات ئەوەی نەدەشاردەوە کە ئەگەر شۆڕش لای ئەو مانای هەبێت، نە بۆ ئەوەیە کورد ڕزگاربکات، نە بۆ ئەوەیە هەژاریی نەهێڵێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە بیسەلمێنێت کە مرۆڤ ناتەبایەکی ئەبەدییە. مرۆڤ گەر شۆڕشگێڕ نەبێت، وەک ئەوە وایە کۆیلەیەتی قەبوولکردبێت، بەڵام گەر شۆڕشیش تەواو ببێت و سەربکەوێت، واتە قەبوولێتی خۆی بچێتە شوێنی ستەمکاران. زۆرجار بە هێمنییەکەی خۆی، ئەو هێمنییەی کە هەمووانی دەترساند، بەو چاوە دووربینانەی کە وایدەکرد هەمووان ڕێزی بگرن، بەو نیگا قووڵانەی کە هەموو دەیانزانی دیوێکی تری شتەکان دەبینێت، لە شوێنی خۆیەوە بە ئارامی پاڵیدەدایەوە و بە

هێمنــی دەیگــووت « هەڤــاڵان ڕەنگــە ئێــوە گاڵتەتــان بــە تێڕوانینــی مــن بێــت، بــەڵام مــن چیرۆکەکــە بەمجــۆرە تێدەگــەم، ســتەم وەک مەکینەیەکــی گــەورە وایــە، مەکینەیــەک مرۆڤــەکان دەهاڕێــت، خەڵکانێــک هــەن لــە ســەر ئــەم مەکینــە گەورەیــە ئیشــدەکەن. هــەر دەبێــت وا بێــت... وانییــە؟ هیــچ مەکینەیــەک نییــە کەســانێکی نەوێــت خزمەتیبکــەن، ئــەوان مرۆڤەکانــی دی دەگــرن و دەیانکــەن بــە لوولــەی ئــەو ئامێــرەدا و لــە ژێــر ددانەکانیــدا دەیانهــاڕن. خەڵکانێکــن خزمەتــکاری مەکینەکــەن، پاکیدەکەنــەوە، دەیپارێزن، پارچــەی دەگــۆڕن، گــەر شــکا چاکیدەکــەن. تــا ڕۆژێــک دێــت خەڵــک تێدەگــەن کــە ئــەم مەکینــە ترســناکە دەبێــت بوەســتێت. دەزانــن جگــە لــەوەی پــەلاماری ئــەو قــەڵا گەورەیــە بــدەن، کــە شــوێنی مەکینــە و خزمەتکارەکانێتــی، هیــچ چارێکــی دیــان نییــە. دەبێــت هەوڵبــدەن بیخەنە بندەســتی خۆیان و بیشــکێنن و پەکیبخــەن... ئا لەمجۆرە ســاتانەدا میللەتــان هەڵدەســتن، هەڵمەتدەبــەن و پەلامــاردەدەن... جەنگــی خوێنــاوی ڕوودەدات، خوێــن دەڕژێــت، دەســت دەپەڕێــت و ســەر لــە جەســتە جیادەبێتــەوە، تــا دواجــار تاقمێــک بنکــەی ســتەم دەڕوخێنــن، دیــواری تــرس دەشــکێت و شــووراکانی زوڵــم هــەرەس دێنێــت و شۆڕشــگێڕان دەگەنــە ســەر ئــەو مەکینــە گەورەیــە. بــەڵام هەڤــاڵان ئــەو مەکینەیــە ئەفســوونی خــۆی هەیــە... هەڤــاڵان ئێــوە دەڵێــن چــی. ئــەو مەکینەیــە ســیحری لــە ســیحری هەمــوو بــڕوا و عەقیدەیــەک بەهێزتــرە، هێنــدەی شۆڕشــگێڕان دەگەنــە ســەر ئــەو مەکینەیــە، یەکەمیــن کاریــان ئەوەیــە کــە هەندێــک لــە ســتەمکارە کۆنــەکان دەکــەن بــە مەکینەکــەدا، تــا تووڕەیــی دڵــی میللــەت دابمرکێتــەوە، دووەم کاریــان ئەوەیــە خۆیــان دەچنــە ســەر مەکینەکــە و لــە ســەر لێــوار و لەبــەر بڵندگــۆی ســەرکەوتندا مــژدە بەخەڵــک دەدەن کــە ئیتــر مەکینەکــە موڵکــی میللەتــە، چەنــد هەفتــە و مانگــی یەکــەم ئیشــی مەکینەکــە ئەوەیــە ئێســک و پروســکی هەنــدێ لــە ســەرباز و فەرمانبــەر و خزمەتکارانــی سیســتمی دێریــن بهاڕێــت، ســەرۆکە

تازەکان دەڵێن گەر مەکینەکەمان لە ژێر دەستدا نەبێت، ئەوا ستەمکارە کۆنەکان دەگەڕێنەوە، لە بەرئەوە هێشتا کاتی تێکشکاندنی مەکینەکە نەهاتووە، وردە وردە و ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکانی سادە و بێخەتا و دڵگەرمیش دەکەونە بەر گرتن و دەهێنرێن و بەناوی دژایەتی شۆڕشەوە لە ناو مەکینەکەدا دەهاڕدرێن... تا ڕۆژێک لە خەو هەڵدەستن و دەبینن کە مەکینەکە وەک جاران ئیشدەکات، بە هەموو وزەی جارانییەوە مرۆڤ دەخوات، خەڵک دەهاڕێت... هاوڕێیان لە شۆڕشی فەرەنسیدا وەهابوو، لە شۆڕشی بەلشەفییەکاندا هەر وەهابوو، لە شۆڕشی چیندا وەهابووە. من بۆیە ئێستا لە ئێوە دەترسم، ئێوە واقسەدەکەن وەک ئەوەی گەر مەکینەکە بکەوێتە دەست ئێوە تەواوی مرۆڤی سەر ئەم ئەستێرەیە ئازاددەکەن، ئەوەش عەقڵی هەموو ئەوانەیە کە دواتر مەکینەکە پاکدەکەنەوە و بۆیەیدەکەنەوە و دروشمی خۆیانی دەخەنەسەر. هەڤاڵان ئێوە واقسەدەکەن وەک ئەوەی گەر بەعسییەکان بڕۆن ئیتر هەموو شتێک تەواو ببێت، وەک ئەم ئەحمەد حەسەن بەکرە گێلە بڕوخێت مرۆڤایەتی ئازاد بووە. ها، بەڵام هەموو شۆڕشێک لە جێگایەکدا شۆڕشگێڕەکانی دەبن بە جانەوەر، دەبن بە ئەژدیهای ژەهراوی، بە دەعجانی چل دەم و چل دەست... ئینجا دەبێت دەیان ساڵ خەریکی ئەوە بین ئەو نەسلەی تر لە ناوبەرین کە شۆڕش دروستیکردوە... ئەوە بازنەیەکی ئەبەدییە. وادەزانن کە شۆڕشگێڕەکان پەپولەن؟ وادەزانن ئەم وشەیە موقەدەسە؟ مرۆڤ هەر لە جێگای وەهاوە دەستی پێکرد لە قیامەتدا، لە قەسابخانە و خوێنڕێژیدا کۆتاییدێت... شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە کەسێک نییە بۆ وەرزێک یان دژ بە ستەمێک بووبێت بە شۆڕشگێڕ، بە پێچەوانەوە، تەواو بە پێچەوانەوە هاوڕێیان شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە تا کۆتایی لە شوێنی کۆیلەوە، لە سەنگەری ئەوەوە شەڕدەکات... شەڕەکەشی ئەبەدییە... هەر کات شۆڕش گەیشتە کۆتایی، ئالەویادا شۆڕشگێڕەکان

دەبن بە جانەوەر... لەوێوە ئیتر سوڕی گەڕانەوەی حەیوانە ستەمکار و چاوچنۆکەکە دەست پێدەکاتەوە. هیچ کەسێک نییە بتوانێت بڵێت من دەچمەسەر کورسی دەسەڵات و هەر بە شۆڕشگێڕیش دەمێنمەوە. مرۆڤ لە یەککاتدا دەتوانێت نەبێت بە کۆیلەیەکی ملهوڕ یان نەبێتەوە بە ستەمکار کە بۆ ئەبەد، تا هەتاهەتایە شۆڕشگێڕێکی نائومێد بێت و بەس، لە نێوان کۆیلە و ستەمکاردا، یەک ڕێگای تر هەیە پێیدا هەڵبێین ئەویش ئەوەیە تا مردن نائومێدانە شۆڕشی خۆمان بەرپا بکەین... شۆڕشە بچوکە نائومێدەکانمان».

ئەم بۆچوونەی بولبولیار لە هەوای ئەو زەمانەدا گوێگر و کڕیاری نەبوو. هاوڕێکانی ئەوەندەی لە بیری دروستکردنی ڕێکخستنێکی کرێکاریدا بوون لە خەیاڵی ئەوەدا نەبوون دواتر چی ڕوودەدات. لە کۆبوونەوەکانی بازنەکەدا بولبولیار زۆربەی کات گوێیدەگرت، هەستم نەدەکرد شتێکی قووڵ لەگەڵ ئەم گەنجانەی دیدا کۆیدەکاتەوە، هاوڕێکانی بەردەوام لە قسەوباسی گەرمدا بوون، بۆ دامەزراندنی ڕێکخستنێکی پرۆلیتاری سەرتاسەریی. من ئەو دەم پەیتا پەیتا ڕاپورتەکانم دەناردەوە بۆ شێرخان و ئەویش پێیدەگوتم کە لە نزیکەوە چاوەدێری ئەو شانەیە بکەم، چونکە بەڕای ئەو هیچ شانەیەکی شۆڕش وەک ئەمە غوباری ژەهراوی لێهەڵناسێت.

ئەو ماوە کەمەی لە شاربووم هەموو شانەکانم واڕێکخست کە هیچ کەس لە بونیادنەرانی ڕێکخستنی شار دەسەڵاتی بە سەر تەواوی شانەکاندا نەشکێت، هیچ بەرپرسی شانەیەک، ئەندامەکان وەک موڵکی خۆی و هێزی تایبەتی خۆی تەماشانەکات، تاکە کێشەیەکی ڕاستەقینە تووشم هات، لەگەڵ ئەو خوێندەوارە سەرسەختانەی شانەکەی بولبولیاردا بوو کە بەردەوام دەربارەی ماهییەتی شۆڕش و هێڵە سیاسییەکەی پرسیاریان ئاڕاستەی ئەنجومەنی باڵا دەکرد. بەبڕوای ئەوان، شۆڕش لە

سەرەتاوە هێڵێکی ڕوونی نییە و گەر تەواو ئاراستەی شۆڕش نەزانن و ئاشکرا هێڵە سیاسییەکەی نەبینن، ئامادەنین بێنە ناو ڕێکخستنەکانەوە و لە دەرەوەی ئێمە هێزی ڕێکخراوەیی خۆیان دروستدەکەن. سەفین خۆشناو کە لە هەموو ئەوانی تر، زیرەکتر، کۆنکرێتتر، هێمنتر بوو، بە ئارامییەوە پێیگوتم «هەڤاڵ جەنگیز، مەرج نییە کە هەموومان لە یەک ڕێکخراودا کاربکەین... شۆڕش منداڵێکە پارچە پارچە لەدایکدەبێت، پێکەوەنانی هەم ئاسان نییە و هەم کاتی دەوێت». ئەو بیرۆکە سەیرەی سەفین کە شۆڕشی بە لەشی منداڵێک دەشوبهاند کە هەرجارەی پارچەیەکی لە دایکدەبێت، دەشێت ئەم پارچانەش هەر یەکەیان لە سکی دایکێکەوە بێنەدەرێ، منی ترساند. ئەوە چۆن مەخلوقێکە کە هەر پارچەیەی لە دەستکردی یەکێک بێت، دواتریش ئەو هەموو پارچە جیاوازانە چۆن پێکەوە دەنرێن؟ چۆن منداڵێک دەردەچێت گەر دەستی لە زگی ژنێک و قاچی لەدەستی دایکێکی تر و سەری زادەی خانمێکی دی بێت؟. هەڵبەت هیچ هێزێک نییە لە دونیادا لەم مەخلوقە شتێکی تەندروست و جوان دروستبکات. من کە لە عاشقانی شۆڕش بووم، جەستەی شۆڕشم وەک جەستەیەکی کامڵتر و پێکەوەنوساوتر دەبینی، جەستەی شۆڕش تەواوکاری هەموو جەستە بچوک و نوقستان و لێکترازاوەکانی ئێمەبوو. بۆ ئەوەی بەرپەرچی ئەو قسەیە بدەمەوە، گووتم «هەڤاڵ، شۆڕش یەک دایکی هەیە و بە کامڵی لە گونگوڵی یەک ژنی موبارەکدا دەڕەخسێت، کە میللەتە، کە ئەم نیشتیمانە پاکەیە». سەیربوو من ئەو زەمانە باوەڕێکی شاعیرانەم بە هەموو ئەو قسانە هەبوو، کە ئەمڕۆ پێکەنینم پێیاندێت... نیشتیمانی دایک، گونگوڵی وەتەن، سەرزەمینی شێران، خاکی موبارەک... پتر لە سیوپێنج ساڵ ئیشکردن بۆ شۆڕش، تەنیا یەک شتی فێرکردم، چۆن گاڵتەم بەم وشانە بێت، ئەم گوزارە بۆش و بێمانایانەی سیحرێکی گەورەیان لە سەر گەمژە و کاڵفامەکان هەیە،

هەڵبەت هەموو هەڤاڵەکانی تریش ئەمڕۆ گاڵتەیان بەم قسانە دێت، دەخەنێن و دەتریقێنەوە کە دەیبیستن، بەڵام هۆی بێزاری من لەم وشانە شتێکی ترە، شتێکی تەواو جیاواز.

سەفین ئەو رۆژە گووتی «نا... شۆڕش لەوانەیە زیاد لە دایکێکی هەبێت، بەڵام بەبێ بیری پرۆلیتاری ئەم منداڵە هەر چییەک بێت و لە هەناوی هەر کەس بێتەخوار، کەسێکی دۆڕاوە... لەوڵاتانی دواکەوتووی وەک ئێمەدا کە پرۆلیتاریایەکی پیشەسازی ڕاستەقینەمان نییە، کە تەبەقەی کرێکار خۆی ڕێک نەخستووە، هەموو هەرچی و پەرچییەک، دەتوانێت شتێک لە جۆری شۆڕش ڕابگەیێنێت». «شتێک لە جۆری شۆڕش» ئەوەش گوزارەیەکی تربوو کە نەمدەتوانی وا ئاسان بە سەریدا تێبپەڕم. «شتێک لە جۆری شۆڕش. کەواتە هەڤاڵی نازیز، ئەو خەباتەی پێشمەرگەکانی ئێمە دەیکەن و ئەو عارەقەی دەیڕێژن، شۆڕش نییە، بەڵکو شتێکە لە جۆری شۆڕش؟». لەویادا «غەنی مامەند» هەڵیدایە و گووتی «نا بوەستە، هەڤاڵ جەنگیز بوەستە... یاری بە وشەکان مەکە، ئێمە شانەیەکی وریاین، ئەوە پێشمەرگەکان نین کە ماهییەتی شۆڕش دیاریدەکەن... ئەنجومەنی باڵا ئەوە دیاریدەکات، هەڵبەت پێشمەرگەکان بە نیازی شۆڕش خەبات دەکەن، بەڵام گەر ئێوە لە دەفتەری سیاسی کۆمەڵێک ناسیونالیستی چەپەڵ بن، کۆمەڵێک هەلپەرست بن کە بتانەوێت دواتر بە ڕێکەوتن لەگەڵ بەعسییەکاندا پلەوپایەیەک بە دەستبخەن، ئەوکات ئەمەی ئێستا شۆڕش نییە... شۆڕش مانای وەرگێڕان و گۆڕینی سیستمی موڵکداری و هەلومەرجی بەرهەمهێنان، مانای هەڵوێستێکی ئاشکرا و ڕوون دەرهەق بە دەوڵەمەندان و دوژمنی تەبەقیمان. پێمبڵێ بەرنامەی ئێوە دژ بە بۆرژواکان چییە... ها بەرنامەتان چییە؟ چونکە ئەوە سەرەتا و خاڵی دەستپێکی هەموو شۆڕشێکی کارگەرییە». من بە تووڕەییەوە گووتم «شۆڕش ئەوەیە

بەعسییەکان لە وڵاتەکە دەربکەین، نەهێڵین عەرەبەکان لەوە زیاتر سوار ژنەکانمان بن، شەرەفی خاک و نەتەوەکە بپارێزین. ئیشمان ئەوەیە پیاوانی دەوڵەت بکوژین، سیخورەکانی ئەمن، بەعسییەکان... ئەوانە... هەڤاڵ ئەوانە». دەمێک بوو واتوڕەنەبووبووم دەنگم بلەرزێت و دەستم عارەق دەربدات و هەناسەم سواربێت. دوای کەمێک سووربوونەوە و توڕەیی، وەک لەوە بترسم بخنکێم و دڵم لە کار بوەستێت، بە خێرایی یەکێکەوە لە جێگای شەڕێکی نابەرابەر و دوڕاو هەڵبێت ئەو جێگایەم بەجێهێشت. دڵنیابووم کە شانەکەی بولبولیار دەبێتە یەکەمین هەڕەشەی گەورە کە شۆڕش لە شاردا ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

لە ڕاپۆرتەکانمدا بە وردی باسم لەوە کرد کە ئەگەری ئەوە هەیە، مارکسیستەکانی ناو شانەکەی بولبولیار، گروهێکی سیاسی تر دروستبکەن. خۆنەخەنە ژێر باڵی ڕێکخراوە مەزن و گەورەکەی شۆڕشەوە، ڕیزەکان لەتبکەن و بەدروشمی توندڕەوانە خوێندکارانی زانکۆ بەرەو لای خۆیان ڕابکێشن. سەرۆک و ئەنجومەنی ڕابەرانی شۆڕش قسەکانی منیان زۆر بە هەند وەرگرت. بەلایانەوە گرنگ بوو کە لە نزیکەوە لە مەترسییەکانی ئەو گروپە بنوارم و زوو زوو دەربارەیان هەواڵ بنێرم و گەر کرا خەڵکانێک لە خەتەکانی دییەوە بخەمە ڕیزەوە تا لە کار و نیازیان تێبگەم. من لەو بەینەدا بە دڵسۆزییەکی زۆرەوە هەموو کاروکردارێکی گروپەکەم دەپشکنی، جگە لەوەش چاوەکانی حیزبم بە هەموو لایەکدا بڵاوکردەوە، هیچ ڕێکخراوێکم لێبێبەش نەکرد. شانەیەکی تایبەتم لە سیخورانی وریا پێکهێنا، کە تەنیا ئیشیان ئەوەبوو بڕۆنە ناو هێزە سیاسییەکانی تر و لەوێوە هەواڵی وردم بۆ بگرن... ئەوانە هێزی تایبەتی من بوون و ڕاستەوخۆ پەیوەندی نهێنیان تەنیا بە منەوە هەبوو، هیچ کەس نەیدەناسین و لەژێر هەلومەرجی زۆر تایبەتی و بە نهێنییەکی لە ئەندازەبەدەر پەیوەندیمان بەڕێوەدەچوو. لە سەر ڕۆشنایی

ڕاپۆرتــی هەواڵگرەکانــی خۆمــدا جوڵــە و نهێنــی زۆربــەی ڕێکخــراوەکان و ئەندامــە بەرزەکانیانــم دەزانــی، هەستمدەکرد ئــەو قسانەی ســەفین خۆشــناو ســەبارەت بــە شۆڕشــێکی پارچــە پارچــە کــە هــەر بەشــەی لە سکی دایکێکەوە دێتــە دەرێ، وەختــە دەبێتــە ڕاســت. مــن دەلەرزیــم و غەمــی ئــەو ڕۆژەم بــوو کــە چاودەکەینــەوە و دەبینیــن هێــزی ئێمــە هیــچ دەســەڵاتێکی بــە ســەر شــاردا نییــە، زۆربــەی ئەندامانــی ئەنجومەنــی بــاڵاش هــاوڕام بــوون، زۆربەیــان هەمــان ترســیان هەبــوو، دڵنیابــووم کــە دەبێــت شــتێک بکەیــن گەشــەی ڕێکخــراوە نەیــارەکان بوەســتێنین و دەســەڵاتی سیاســی حیــزب لــە ســەر شــارەکان زامنبکەیــن. کاری واش ئاســان نەبــوو، بــەڵام مــن لــە یەکێــک لــە دانیشــتنە نهێنییەکانمــدا لەگــەڵ بەرپرســە باڵاکانــی ئەنجومەنــدا، پێشــنیاری ڕێگایەکــی شــەیتانیم کــرد... ڕێگایــەک کــە دەکــرا هــەر وەک تێزێکــی تیــۆری و خەیاڵێکــی نابەجــێ بمێنێتــەوە، گــەر ئــەو یەکبینینــەوە ســەیر و دڵهەژێنــەی نێــوان مــن و لیڤیتانــت بۆتانــی نەبایــە.

## سەرەتای زیندان

لــە ســەعات حەوتــی ئێوارەدا گرتیانــم، ئــەوە یەکەمجارم بــوو لــە ژیانمــدا بگیرێــم. مــولازم کارزان و دوو پیکابــی پــڕ لــە ئاســایش هاتــن و منیــان بــرد. مــولازم کوڕێکــی شــەرمن بــوو، گووتــی «دەمبووریــت گــەورەم، زۆر تکامکــرد کــە ئــەم کارە بــە مــن نەســپێرن، بــەڵام خــۆت دەزانیــت واجیــب چەنــد شــتێکی نابەجێیــە، ئێمــە عەبــدی وەزیفەکانمانیــن، عەبدیــش دەبێــت هەمــوو ئەمرێــک جێبەجێبــکات. جەنابــی لیــوا، ئێمــە قوتابــی تۆیــن و هیــوادارم دڵــت لێــم نەڕەنجێــت». نەمدەزانــی قسەکانی مــولازم لــە دڵەوەیــە یاخــود فێریانکــردوە. مــن هیچــم نەگــووت و بــە هێمنــی لەگەڵیــدا ســەرکەوتم.

هێنـدەم گـووت «تکایـە چـاوم مەبەسـتەوە، تـۆ دەزانیـت مـن خـۆم هەمـوو شـوێنەکان شـارەزام، دەشـزانم دەمبەیـت بـۆ کـوێ». مـولازم بـە هێمنییـەوە گووتـی «دەتبـەم بـۆ بورجەکـە، دڵنیابـە چـاوت نابەسـتمەوە، جگـە لـەوە فەرمانـم پێدراوە بـە جوانـی لەگەڵتـدا مامەڵەبکـەم. گـەر فەرمانیـش نەبایـە هـەروام دەکـرد، جەنابتـان جگـە لـە ڕێـز، شایسـتەی هیچـی تـر نیـن». کێشـەی پیاوانـی دەزگای ئاسـایش ئەوەیـە کـە هیـچ کـەس نازانێـت کـەی ڕاسـتدەکەن و کـەی درۆ... هەتـا خۆشـیان ناتوانـن ئـەوە بزانـن، درۆ بـە جۆرێـک دەبێـت بـە بەشـێک لـە ژیانمـان، ئیتـر لـە هیـچ سـات و وتـە و گفتێکمـان جیانابێتـەوە. مـن بڕیارمـدا هیـچ نەڵێـم و هیـچ نەپرسـم، چونکـە دڵنیابـووم فەرمانـی گرتنـم لەلایـەن سـەرانی بـاڵای حیزبـەوە دەرچـووە، دڵنیابـووم هەتـا وەزیـری ناوخـۆش بێگەڕانـەوە بـۆ خـودی سـەرۆک و بـێ فەرمانـی تایبەتـی ئـەو جورئەتـی کاری وا نـاکات. لـە بەرئـەوە کارەکـە لـە دەسـتی مولازمـی بەسـتەزماندا نەبـوو، کـە دڵنیـام گـەر سـەرپێچی بکردبایـە، بەدەردێکـی خراپیـان دەبـرد.

کاتێـک مـولازم گووتـی دەتبەیـن بـۆ بـورج، دڵـم خورپەیەکـی کـرد، دەمزانـی بـورج زیندانێکـی زۆر تایبەتـی و نهێنـی تێدایـە، بـەڵام لـە دەرەوە کـەس شـتێکی ئەوتـۆی لـە سـەر ئـەو زیندانـە نەدەزانـی. بـورج جێگایەکی زۆر زۆر گەورەیـە، بـەڵام بەشـی هـەرە زۆری نهۆمەکانـی تەرخانـن بـۆ کاری نهێنـی، کەسێک نییـە خـۆی لـە بـورج نەبێـت و بزانێـت لـە چ نهۆمێکدا چ باسـە. مـن بیسـتبووم کـە ئێسـتا کۆبوونـەوە و دانیشـتنە گەورەکانـی حیزبیـش زۆربەیـان لـە بـورج دەکرێـن، بردنـم بـۆ بـورج نیشـانەیەکی خـراپ بـوو، بەڵگەیەکـی گـەورە بـوو کـە ڕزگاربیـم سـەخت و دەرچوونـم کاری ئەسـتەمە.

بـەر لـەوەی بـاس لـەو پێشـهاتانە بکـەم کـە دواتـر هاتنـە سـەر ڕێگـام و بـە سـەرمدا هاتـن، باشـترە کەمێـک باسـی بورجتـان بـۆ بکـەم، کـە تـا ئێسـتا هیچـی ئەوتـۆی دەربـارە نازانـن.

لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی، دامەزرێنەر و دانەری بەردی بناغەی بورجە، لە ساڵی ٧٥ دا کە بە کۆمەکی پارێزگا و بە ڕەزامەندی بەڕێوەبەری ئاسایش پارچەیەک زەوی گەورەی وەرگرت، نیازی وابوو خانوویەکی گەورە لە ناوەڕاستیدا دروستبکات و چواردەوری بکات بە باغ و ژێرەکەشی بکات بە زیندانێکی تایبەت. لیڤیتانت ساڵێکی تەواو سەرقاڵی دروستکردنی خانووەکەی بوو، ئەندازیاری لێزانی لە بەغداد و موسڵەوە هێنا تا بناغەیەکی وای بۆ دروستبکەن بشێت لە داهاتوودا سەدان نهۆم ڕابگرێت. هەندێک ناوی بورجیش دەگێڕنەوە بۆ خودی لیڤیتانت، بەڵام تا ئەو شوێنەی من دەزانم ناوی بورج درەنگ لە ساڵانی دوو هەزاردا لەلایەن شۆفێرەکانەوە کەوتە سەر زمان کە ڕۆژانە بۆ کاری هەمەجۆر کرێکاریان لە سەنتەری شارەوە دەگواستەوە بۆئەوێ. لە ساڵانی حەفتادا بورج تەنیا باڵەخانەیەکی بچوک بوو کە لیڤیتانت ژێر زەمینەکەی وەک زیندان بەکاردەهێنا، لە دوای ڕاپەرینەوە وردە وردە نهۆمەکانی بورج زیادیانکرد، سەرەتا ساڵ بە ساڵ کەمەکێک باڵای دەگرت و نهۆمی نوێی دەچووە سەر، لەگەڵ کەوتنی خۆری سەدەی نوێ و کۆتایی سەدام حوسەینیشدا، بورج بەخێراییەکی ئەفسانەیی گەشەیکرد، هەفتانە نهۆمی نوێی دەچووە سەر، بە جەشنێک ئیدی لە جێگایەکدا توانای ژماردنمان نەما و بۆ بینینی دەبوو وەک چۆن سەر بۆ بینینی فڕۆکەیەکی بچوکی دوور بەرزدەکەینەوە، بەرەو باڵا بڕوانین. ئێستا بڕێکی زۆر لە خەڵکی شار و دەرەوەی شاریش لە بورج ئیشدەکەن، بەردەوام سەدان کرێکار شەو و ڕۆژ لە نهۆمە گەورەکانیدا خەریکی کارکردنن، دەیان قاتی داخراو و تایبەت لە بورجدا هەیە کە جگە لە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵا کەس نازانێت چین و چیان تێدایە و چ جۆرە کارێکیان تێدا دەکرێت... هەندێک دەڵێن کە هەتا خودی دەڵەت و نەخشەسازانی بەڕێوەبردنی وڵات لە بورج دادەنیشن و وەزارەتەکان بنکەی ڕاستەقینە و نیشتەجێی بنەڕەتیان

ناو بورجە، تەواوی ئەو باڵەخانانەی دیش کە لە شارەکاندا هەیانە، دیکۆری دەرەکین و تەنیا بۆ خۆدەرخستن دانراون و کاری تریان نییە.

ئەو ڕۆژە کە منیان برد بۆ بورج، لە بەردەم دەرگای سەرەکییدا، مولازم کارزان ماڵاوایی لێکردم و گووتی «خۆت دەزانیت، من لێرەوە ناتوانم لەگەڵتدا بێم، ئەمە دوا سنووری منە و لەم هێڵە بەدواوە بۆم نییە پێبخەمە ئەو دیو». لەوێدا تەسلیمی چەند چەکدارێکی تری کردم کە بە جۆرە کوردییەکی تایبەت قسەیاندەکرد، لە دیالێکتی خەڵکی شار نەدەچوو، جۆرە زمانێکی تایبەتی بوو... هەم کوردی بوو، هەم کوردیش نەبوو... هەم تێیدەگەیشتم و هەم تێشی نەدەگەیشتم... تا ئەوکات زمانی لەو جۆرەم نەبیستبوو، وەک هیچ دیالێکتێکی ناسراوی کوردی نەبوو، جۆرە کوردییەکی تربوو کە پێدەچوو لەو چەند ساڵەدا کەسێک بە نهێنی بۆ حیزبی دروستکردبێت و من نەمبیستبێت، زمانێکی نهێنی بێت بۆ پاسەوانە زۆر تایبەتییەکانی بورج دروستکرابێت. سەرەوەختێ بوو دەمبیست کە هەندێ لە دانیشتوانی بورج لە ناو خۆیاندا، جۆرە زمانێکی تر قسەدەکەن کە زمانی خەڵکی شار نییە، بەڵام ئەوەم بە دەنگۆ و هەڵبەستی ڕۆژنامەنوسەکانی ڕۆژنامەی «عەزیزم وەتەن» و گۆڤاری «بوهاران» دەزانی. بێئەوەی گوێبدەنە خواستەکەم، لە بەردەم باڵابەرە کارەباییەکەدا چاویان بەستمەوە. دوای ماوەیەک سەرکەوتین و یەکێک گووتی ئەسانسێرەکە ئیش ناکات، من دڵنیابووم درۆدەکەن. بەچاوی بەستراوەوە دابەزین و چەند قاتێک بەپێ سەرکەوتین، کە یاوەرەکانم ماندووبوون دووبارە سوار باڵابەرەکە بووینەوە و چەند نهۆمێکی دی چووینەوە خوارێ، دوایی چەند نهۆمێکی تر چووینەوە سەرێ، دواتر دابەزینەوە، چوار قات سەر کەوتینەوە، سەرلەنوێ سوار باڵابەرەکە بووینەوە، زۆر قووڵ دابەزینەوە و ئینجا بە یەکجار سەرکەوتینەوە... هەموو ئەو گەمەیە بۆ ئەوەبوو من نەزانم دەچین بۆ نهۆمی چەندەم.

هەڵبەت دەبێت بڵێم کە بورج هەر لە سەرەتاوە شوێنێکی جیاوازبوو، دەزگای ئاسایشی تایبەت و هێزی پارێزگاری تایبەت و ئیدارەی تایبەت و بودجەی تایبەتی هەبوو، بورج سەر بە هیچ جێگایەکی وڵاتەکە نەبوو، سەر بە هیچ وەزارەتێک یان ئیدارەیەک یان شارەوانییەک نەبوو. بورج بە تەنها وەک وڵاتێک، ئیمارەتێک، جێگایەکی سەربەخۆ لەوێدا بوو، هەمووش دەبایە ئیشی بۆ بکەن. تەنیا ژمارەیەکی کەم لە بەرپرسان و پاسەوانان و تەکنیککارانی ناو بورج بۆیان هەبوو باڵابەرەکان بەکاربهێنن، فەرمانبەران و کرێکاران و خەڵکانی سادە دەبوو بە پلیکانەکاندا سەربکەون، لە بەردەم زۆربەی قاتەکاندا خاڵی پشکنین و لێپرسینەوە و پەنجەمۆرگرتن و هەتا وێنەگرتنیش هەبوو. بورج تاکە جێگایەکی تەواو کۆنترۆڵکراوی وڵاتەکە بوو، تا پێش داگیرکردنی ئەمریکییەکان بۆ عێراق. من لە رێگای دەزگای خۆمانەوە دەمتوانی چەند شتێک لە سەر بورج بزانم، هەندێک هەواڵم پێدەگەیشت، بەڵام دواتر کە وردە وردە بورج زۆر زۆر گەورەبوو، فەرمانێکی زۆر توندمان بۆ هات ئەوەمان لێقەدەغەکرا دوای هەواڵی ئەوێ و نیشتەجێکانی بکەوین و باسیبکەین و بیخەینە بەر قسەوباس. هەتا رۆژنامەنوسە هەرە ئازاکانی ناو عەزیزم وەتەن و گۆڤاری بوهاران، زۆر بەترسەوە ناوی بورجیان دەهێنا. من تەنیا لە رێگای هاورێیەکی ئەندازیاری کارەباوە دەمزانی کە کارەبای بورج، ئاوی بورج، زەخیرەی بورج هیچی پەیوەندیان بە کارەبا و ئاو و زەخیرەی دونیای ئێمەوە نییە و لە جێگای تایبەتی وەریدەگرن و بە ئامێری کۆنترۆڵکراو بۆیان دەچێت، لەوێ هەتا باڵابەرەکانیش بە جۆرێکی روون جیاکراونەتەوە، ئەسانسێری ئەندازیاران و فەرمانبەران لەگەڵ ئەسانسێری بەرپرسەکاندا جیایە، ئەسانسێری ژنی بەرپرسانیش لەگەڵ ئەسانسێری عەوامی خەڵکدا جیاکراوەتەوە.

که گەیشتینتە نهۆمی دیاریکراو، چاویان نەکردمەوە، دڵم بە خێرایی

لێیـدەدا، زۆر پەلەمبـوو تێبگـەم کـێ مـن دەبینێـت و لەگـەڵ کێدا دادەنیشـم. لـە ژوورێکـی بچوکـدا چاویانکردمـەوە، ژوورێکـی ئاسـایی، بـەڵام داخراوتـر و کپتـر و دوورتـر لـە دنیـا، هـەر چـاوم کـردەوە ڕاسـتە و ڕاسـت خـۆم بەرامبـەر پرۆفیسـۆر شـالیار، جەمیـل قەیسـەر «وەزیـری ناوخـۆ»، هەڤـاڵ مـەلا گوزیـد «بەرپرسـی پاراسـتنی نهێنییەکانـی سـەرۆک» بینییـەوە، بـە سـێ ڕوخسـاری مۆنـەوە سـەیریاندەکردم. لـە سـەرەتای شۆڕشـەوە مـەلا گوزیـدم دەناسـی، پێدەچـوو لەبەر ئـەو ناسینە کۆنـە و بە پێی جۆرێک لـە هونـەری دیپلۆماتـی، ئەویـان دانابێـت سـەری قسـەم لەگەڵـدا دابمەزرێنێـت. بـە درێژایـی ئـەو هەمـوو سـاڵە، مـن و مـەلا گوزیـد نـە دۆسـتبووین و نەدوژمـن، هەسـتێکی نهێنـی و ناوەکیـم هەبـوو کـە منـی خۆشـناوێت، بـەڵام زۆر مەراقـم لـێ نەدەخـوارد، چونکـە لـە شۆڕشـدا کـەس کەسـی خـۆش نەدەویسـت، تەنیـا کەسـانی خۆشەویسـت لـە شۆڕشـدا شـەهیدەکان بـوون کـە هەمـوو پیایانـدا هەڵـدەدان و لاوازییـە ئینسـانییەکانیان دەشـاردنەوە و ئەفسـانەیان لێدروسـتدەکردن. مـن لـەدوای هاتنـی ئەمریکییەکانـەوە مـەلا گوزیـدم زۆر کـەم بینیبـوو، دەمزانـی خـۆی و خێزانـی نیشـتەجێی بورجـن، بـەڵام بـە حوکمـی سـەرقاڵی بەردەوامـی لەگـەڵ سـەرۆکدا زۆر کـەم لـە ژیانـی سیاسـی شـار و لـە میدیاکانـدا دەردەکـەوت، بـەڵام کەسـیش نەبـوو نەیناسـێت و نەزانێـت چ کەسـێکی بەتوانـا و گرنگـی نێـو حیزبـە.

هـەر سـێکیان قاتیـان لەبەردابـوو، یەکـەم شـت کـە سـەرنجی ڕاکێشـام ڕەنگـی قاتەکـەی پرۆفیسـۆر شـالیار بـوو، کـە پێشـتر ڕەنگـی وا جـوان و چەشـنی وا ڕەونەقـدارم لـە نێـو قاتـی بەرپرسـاندا نەدیبـوو. پرۆفیسـۆر هەمیشـە شـتێکی لەبەردەکرد لـە شـتی کەسـی تـر نەچێـت، باڵا و قامەتیشـی لـەوەدا کۆمەکیـان دەکـرد و وەک نـاوازەی نێـو نـاوازان خـۆی پیشـاندەدا. جەمیـل قەیسـەر «وەزیـری ناوخـۆ» وەک هەمیشـە لومپـن و ناڕێـک و ڕشـکن دیاربـوو، بەجـل و ڕوخسـار و دانیشـتنیدا لـە مامۆسـتایەکی سـەرەتایی

دەچوو، خۆی بۆ سزای قوتابییەکی بچوک نابێتەوە، بە جوڵە و شێوەی سەیرکردنەکانیشیدا وادەردەکەوت ئیشێکی تری هەبێت و بە هەڵە خۆی کردبێت بەم ژوورەدا. مەلا گوزیدیش یەکپارچە جوڵە و بزۆکی و وریایی بوو. بەوەدا ئەم سێ پیاوە گەورەیە بەرپرسی دۆسییەکەم بوون و خۆیان ڕادۆزییان دەکرد، دڵنیابووم هیوایەکم نییە و بە سووکی لێرە دەرناچم، دڵنیاشبووم پێکرا لەلایەن سەرۆک و ئەنجومەنی باڵای ئاسایشی هەرێمەوە ڕاسپێردراون. مەلا گوزید بە ئەدەبێکی دەستکردەوە کە دڵنیابووم زۆر لە خۆی دەکات تا تورەیی ناخی دەرنەکەوێت گووتی «هەڤاڵ جەنگیز، بەخێربێیت بۆ بورج و بمانبوورە کە بەوجۆرە سەغڵەتمانکردیت، بەڵام باوەڕت بێت کەسمان حەزمان لەم دانیشتنە نییە. کەسمان نەمانویست بەوجۆرە بێت، بەڵام خۆت دەزانیت ئەمنییەتی حیزب لە سەروو هەموو شتێکەوەیە، خوانەخواستە حیزب و سەرۆک شتێکیان لێبێت، کورد دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش کۆماری مەهاباد... وانییە برادەران... ئەمجارە کورد شتێک ناکات بە شتێک، حیسابمان دەفەوتێت. گەر مەسەلەکە نەیهێنابایە خۆمان وا سەغڵەت نەدەکرد، ناوی حیزب بۆ من وەک شەرەفی شەخسی وەهایە. من لە ئەمریکییەکانەوە نزیکم، بەخوا ئەو ڕێز و حورمەتەی بۆ ئێمەی دادەنێن، بەتایبەت بۆ سەرۆکەکانمان بۆ کەسی تری دانانێن... نەبەخوا. خۆتان دەزانن من حیزبییەکی چەند تۆخم. بەڵام بە سەری هێژای کورم، بە سەری هەر چوار ئەولادم کە دەبینم ئەمریکییەکان ڕێز لە سەرۆکە کوردەکانی تریش دەگرن، یەک تۆز نیگەران نیم. دەڵێم بۆ نا... بۆ نا... ئەوانیش کوردن... بەس نییە ڕێزی کوردیان لایە. بەس نییە ئیحتیرامی میللەتەکەی من دەگرن. نیشتیمانپەروەری ئەوەیە دڵت بە هەموو تولفێکی وەتەنەکەی خۆت بسووتێت. وانییە هەڤاڵ جەنگیز؟؟». بە هێمنی سەیرمکرد، دەیانزانی عارەقێکی ساردم دەرداوە کە پتر لەوەی عارەقەی ترس بێت، عارەقەی

بێزارییە. من بە جۆرێک لە جۆرەکان دەمزانی حیسابم پاکە و چوونە دەرەوەم بۆ نییە، لە بەرئەوە بڕیارمدا تا دەکرێت ترسنۆکی نەنوێنم، گوتم «عەزیزم مەلا گوزید، باوەڕناکەم منت بۆ ئەوە قۆڵبەست کردبێت تا لە بەردەممدا بۆ منداڵانی وەتەن بگریت، گەر نیازی وەهات هەیە هەقە بچیتە سەر کەناڵی نەکەرۆز، یان هەر کەناڵێکی تر و لەوێ قسەی خۆت بکەیت، چونکە ئەمڕۆ کوردپەروەران هەموو لەبەر کامێراکانی ئەو کەناڵانەدا بۆ زارۆک و بەچەی بێنازی کورد دەگرین... ئەوێ باشترین شوێنە بۆ ئەوەی مرۆڤ بە ئاشکرا تیا بگری و فرمێسکەکانی پارەی باش بکەن». مەلا گوزید کە تورەدەبوو لە پێشدا سەری لووتی سووردەبووەوە، دوایی لێوی، دوایی دەوروبەری چاوی، دوایی گوێچکەی... سەرەتا خۆی کەمێک گرت و دوایی گوتی «من عەزیزم. من... نا، تۆم بۆ ئەوە بانگ نەکردوە لە بەردەمتدا بۆ منداڵانی وەتەن بگریم. تۆم بۆ شتی تر بانگکردوە».

پرۆفیسۆر شالیار بەویقارە ئیمپریالیستییەکەی خۆیەوە، ئەو ویقارەی گەنجانی حیزبی شێتدەکرد و وایدەکرد هەموو بە بلیمەتێکی گەردونی لە قەڵەمبدەن، هاتەقسە. منیش لە سەرەتادا لەوانەبووم کە ویقار و زمانزانی و ڕستەسازی ئەو سەرسامیدەکردم، دەمگووت گەنجانی حیزب هەقیانە وێنەکانی ئەو لەگەڵ کۆلن پاول و تۆنی بلێر و خافیێر سۆلانا و کۆندۆلیزا رایس و سیاسەتمەدارە گەورەکانی دونیا کۆدەکەنەوە و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە دەڵێن «ببینن، کوردێک، کوردێک ئەوەندە بلیمەت بێت بگاتە ئەوانە. ئاخر چۆن مرۆڤ شانازی بە پیاوی وارەناکات». پرۆفیسۆر شالیار ئەوەتەی بووبوو بە بەرپرسی گشتی ئاسایشی وڵات، لە بەرچاوی جیهانی دەرەوە، هێمنتر و بەویقارتر و سەنگینتر دەردەکەوت، گەر پێشتر سەد حیسابی بۆ هەموو وشەیەکی خۆی کردبێت، ئێستا هەزار حیساب دەکات، بەڵام مرۆڤ بۆ ئەوەی دەموچاوی ڕاستەقینەی ئەوانە

ببینێت، دەبێت لە ژوورە داخراوەکاندا چاوەدێریانبکات، لەو جێگایانەدا کە کامێرای لێ نییە، کە ئەندامە سەرسام و مەدهۆشەکانی حیزبیان لە دەور نییە، کە چاوی کچان یان ژنانیان نایانبینێت، کە بۆنی ڕۆژنامەنوسێک یان نوسەرێک لەو نزیکانە ناکەن. لەوێدا دەموچاوە ڕاستەقینەکەیان دەردەکەوێت. پرۆفیسۆر شالیاریش لەوانە بوو، ئەو ڕۆژە زوو قسەی لە دەمی مەلا گوزید وەرگرت و سەیری کۆمەڵێک کاغەزی بەردەمی کرد و گووتی «تۆ فەرمانبەرێکی دائیرەکەی منیت». دەمودەست قسەم پێبڕی و گووتم «من لیوا جەنگیزم.. لیوا جەنگیز. بەڕێوەبەرێکی پێشووی ئەو دەزگایەم کە تۆ ئێستا سەرۆکیتی، لەڕاستیدا من دامەزرێنەر و دروستکەر و گەورەکەری ئەو دەزگایەم، لە بەرئەوە من فەرمانبەر نیم، من دروستکەری ئەو کورسییەم کە تۆ ئێستا لە سەری دانیشتوویت». پێکەنینێکی هەبوو، کە بە ڕاستی دەتوانم بڵێم لە پێکەنینی سیاسییە لێزانەکان دەچوو، لە پێکەنینی ئەوانەی دەتوانن بە خەندەیەک خۆیان لە ئاڵۆزترین داو ئازادبکەن. کە وام گووت سەری بەرزکردەوە و خەندەکەی خۆی گرت، ئەو خەندەیەی بەردەوام لە سەر بەرگی دەیان گۆڤار و لە سەر شاشەی زۆربەی تەلەفزیۆنەکان ئامادە بوو. لە دوای سەرۆک و سەرۆک وەزیران سێهەمین کەس بوو کە میدیاکانی بایەخیان بە خەندەکەی دەدا، هەتا دەتوانم بڵێم زەردەخەنەکەی لە خەندەی خانمی «شینۆنەی»یش بەناوبانگتربوو، ئەو کچە کوردە گۆرانیبێژەی کلیپەکانی ڕەواجیان لە ئاسمان بوو. قسەکانی من کەمێک رایانچڵەکاند، هەموو وەک کورە نازدارەکەی حیزب سەیریاندەکرد، جگە لەوەی دڵی رابگیرێت و تورەییەکانی بە هەند وەربگیرێت و قسەکانی بکرێن بە مانشێت بە هیچی دی ڕانەهاتبوو. لە پشت ئەو زەردەخەنەیەوە کاراکتەری دڵڕەق خۆی حەشاردابوو. پار لە ناوەراستی شاردا و لە بەردەم سەدان خەڵکدا کاتێک شەفیق هروری، سەرنوسەری ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەنیان دایە بەر

شەق، هەموو دەیانگووت دەستی پرۆفیسۆری لە پشتە، کە ویستوێتی بەو شەقانە تەواوی ڕۆژنامەگەری ئەهلی چاوترسێنبکات. بیستبووم کە هەتا ئامۆژگاری ڕاوێژکارە ئەمریکییەکانیش سوودیان نەبووە و سووربووە لە سەر تەمێکردنی «منداڵانی بێتەربێت» ـی نیشتیمان. ئەو لە زۆر چاوپێکەوتنیدا سەرکەوتنی خۆی نەدەگێڕایەوە بۆ پەیوەندییە دێرینەکانی خێزانەکەیان بە خێزانی سەرۆکەوە، بەڵکو دەیگێڕایەوە بۆ ئەو «پەروردە جوانە» ـی باوکی کە هەر لە منداڵییەوە فێری ڕەوشتی بەرز و ڕێزی شتە گەورەکانی کردوە. لە هەندێک بەرنامەی زارۆکاندا پرۆفیسۆریان وەها پیشانی منداڵان دەدا، وەک کەسێک دەبێت هەموو لاساییبکەینەوە و هەوڵبدەین بگەینە شوێن و مەقامی ئەو، خۆشی تەنیا خۆی وەک بەرپرسی ئاسایش نیشان نەدەدا، بەڵکو وەک پاسەوانی ڕەوشتی جوان و بەرپرسێکی دڵسۆز و ئیشکەرێکی لە خۆبوردووی میللەت خۆی دەردەخست. ڕۆژانە دەمانبینی لەگەڵ سەفیر و قونسڵ و ئەندامانی کۆنگرێس و شاندە بێگانەکاندا دادەنیشت و «بارودۆخی کوردستان و ناوچەکەی تاوتوێدەکرد»... لە بەرئەوەی حکومەتی هەرێممان وەزیری دەرەوەی نەبوو، کێ ئینگلیزییەکی باشی بزانیبایە دەیتوانی ڕۆڵی وەزیری دەرەوە ببینێت... ئەوکات هەڤاڵ شێرخان «کە سەردەمێک هەر بە ناو کردبوویانە بەرپرسی کاروباری دەرەوە» تا دەهات پیرتر دەبوو، تا دەهاتیش زیاتر لە ناو ئەو خولیا سەیرەی کۆکردنەوەی کەللە سەری پشیلە و گیاندارانی بچوکی تردا نوقمدەبوو، ڕۆژ دوای ڕۆژ پۆستەکەی دەبووە پۆستێکی تەشریفاتی و لەبری ئەو پرۆفیسۆر کاری پەیوەندییەکانی دەرەوەشی رادەپەڕاند.

کەوام بە پرۆفیسۆر گووت بە سەرسامییەوە سەیرێکی برادەرانی کرد و گوتی «ئەها، ئەوەم نەزانیوە... شتێکی سەیرە، ئاگادارن هەڤاڵان، کورسییەکەی من هەڤاڵ جەنگیز دروستیکردوە». مەلا گوزید بۆ ئەوەی

قسەکان لە ڕیتم دەرنەچن گووتی «گوێبگرە لیوا جەنگیز. تۆ بۆ ئێمە خەباتگێڕێک و حیزبییەکی بێوێنە بوویت، کەسمان قسەمان لە سەر ڕابووردوو و خزمەتی تۆ نییە. تۆ وەک هاوڵاتییەکی دڵسۆز خزمەتی نیشتیمانی خۆت کردوە، لە وەفاداریدا بۆ حیزب لە پێشی پێشەوە بوویت، لەوەدا لە سەر هەقیت کە ئەمنییەتی شۆڕش قەرزداری تۆیە. گەر واش نەبایە، لە بەردەم ماڵەکەی خۆتدا وەک سەعید یۆنان دەمانکردیت بە قوربانی فیشەکێک. بەڵام تۆ کەسێکی تریت، تۆ عەزیزی لای هەموومان. دەمانەوێت تێبگەین بۆ وادەکەیت، چی پاڵی پێوە نایت، دوای ئەو هەموو خەباتە دوور و درێژە لەگەڵ هەڤاڵانی حیزبدا ڕێکخراوێکی نهێنی دروستبکەیت... چی وای لێکردیت». جەمیل قەیسەر بۆ یەکەمجار لە جێگای خۆی جوڵاو گووتی «زانیاری تەواومان لایە. منیش لە سەرەتاوە باوەڕم نەکرد، گووتم: پیاوی وا کاری وای لێ ناوەشێتەوە... من دوو برای ڕۆژنامەنوس لەوانەی لە ئۆرگانی مەرکەزی ئیشدەکەن شتەکەیان پێگووتم... گووتیان: عەجایەب تۆ چۆن وەزیرێکیت ئاگاداری پیاوی وا ترسناک نیت. گووتیان دووانی تری وەها و ئیتر حیزب حیسابی پاکە و دەبێتە جەوەندەی دڕاو. من هەر حاشام لێکرد، بەڵام کە برادەرانی خۆمانم ڕاسپارد سۆراغی قسە و هاتوچۆ و پەیوەندییەکانت بکەن، شتی عەجایەبم بۆ دەرکەوت. بەس بە شەرەفم ئێستاش نازانم تۆ خەریکی چیت. هەموو دەزانین کە تۆ مونەزەمەیەکی نهێنیت هەیە...».

پرۆفیسۆر شالیار، پاڵیدایەوە و گووتی «نا وامەڵێ جەنابی وەزیر، ئێمە لە دەزگا زۆر شتمان لە بەردەستدایە، خەڵکانێکی زۆر بێئاگا و بەستەزمانی لە خشتە بردوە... پێرێ شەو لە ژێر زەمینەکەی ماڵی شەهید ئەرسەلان زیاد لە دووسەد دەفتەری ئەم هەڤاڵەمان گرت کە تەواوی نهێنییەکانی شۆڕشی تێدایە لە ساڵی حەفتاوچوارەوە بۆ ئەمڕۆ... نهێنی تایبەتی، ژیانی دەیان هەڤاڵی سەرکردە، چیرۆکە تایبەتییەکانیان،

شتی وەهای تێدایە گەر دێڕێکی بڵاوبێتەوە ئابڕووی هەموو شۆڕشگێڕانی وڵاتەکە دەڕوات. عەفوومکە، وەک ئەوەی کابرا لەلایەن دەزگایەکی جاسوسی بێگانەوە کڕدرابێت... وەک ئەوەی ئەم پیاوە پۆستەکەی بۆ ئەوە بەکارهێنابێت جاسوسی بە سەر هەڤاڵەکانی خۆیەوە بکات».

مەلا گوزید کە دیاربوو دەیویست لە دووانەکەی دیکە خۆی نەرمتر دەربخات گووتی «لیوا جەنگیز. ئێمە قسەناکەین، خۆت چیرۆکی ئەم ڕێکخراوەمان بۆ بگێڕەوە کە دروستتکردوە. دوایی مەڵێ هەڤاڵانم حورمەتی ماندووبوون و خەباتەیان نەگرتم... ئێمە قسەناکەین تۆ خۆت هەموو شتێک بگێڕەوە». من لە ناوەوە ترسێکی قووڵ دایگرتبووم، دەترسام کە بگەمە جێگایەک ناوی هەموو ئەندامانی ڕێکخراوەکە بڵێم، هۆی ڕاستەقینەی پشت ئەم چیرۆکە ئاشکرابکەم. من دەبوو هەموو هەوڵێک بدەم کە بە گێڕانەوەی نیوەی ڕاستییەکان دەربازبم. دەمزانی هەر ڕستەیەک ئێستا لە زاری من دێتە دەرەوە، بۆ من و هەموو ئەوانی دی چارەنوسسازە. دوو ڕۆژ بوو بەردەوام بیرم لەم ساتە دەکردەوە، لە خەیاڵی خۆمدا ڕستەکانم دەهێنا و دەبرد... ئەو شێوازەم هەڵدەبژارد کە دەمزانی کاریگەریی باشتر جێدەهێڵێت. ئێستا ساتی ئەوە بوو قسەبکەم. من بە درێژایی ژیانم، زیاتر وەک بینەر و گوێگر و نوسەر کارمکردبوو، قسەکردن بەشێکی گرنگی کاری من نەبوو. بەڵام زۆرجار ئەوەی بڕیار لە سەر مان و نەمانی مرۆڤ دەدات، قسەکردنە، نەوەک بینین و بیستن و نوسین. بە هێمنی پاڵمدایەوە و گووتم «ئەوەی ئێوە ناویدەنێن ڕێکخراوێکی نهێنی، هیچ نییە جگە لە کۆبوونەوەی من و هەندێ هاوڕێ لە یارییەکی تایبەتی و گەورەدا کە تەنیا پەیوەندی بە ژیانی خۆمانەوە هەیە و پەیوەندی بە هیچ کەسێکەوە نییە و دەتوانم بڵێم پەیوەندییەکی کەمیشی لەگەڵ کاری سیاسیدا هەیە». هەر سێکیان بە وردی گوێیاندەگرت، بەڵام ئەو زەردەخەنە ناشیرین و شەیتانییەی

پرۆفیسۆر کەمێک خەیاڵی پەرتدەکردم، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و گووتم «ئەوەی هەیە و نییە، ئەوەیە کە ئێمە ڕێکخراوێکمان هەیە بە ناوی ژیانێکی دییەوە. چەند کەسێکین، زۆربەمان لە سەروو پەنجا ساڵەوەین، دەمانەوێت بیر لەوە بکەینەوە کە ئایا دەکرا ژیانمان بچووبایەتە سەر ڕێگایەکی تر... هەموو هەستدەکەین کە ژیانێکی ونمان هەیە، ژیانێک کە نەژیاوین. بیر لەوە دەکەینەوە ئەم ژیانەی تا ئەمرۆ هێناومانە ئایا چەندی ژیانی خۆمانە، چەندیشی ژیانێکە ئەوانی تر سەپاندوویانە بە سەرماندا. هەنگاو بە هەنگاو بیر لە ژیانی خۆمان دەکەینەوە، لە هەر جێگایەکدا بزانین کە دەبوو بە جۆرێکی تر بێت، کە دەبایە کارێکی دی بکەین، ڕێگایەکی تر هەڵبژێرین، دەینوسین... ئەوە کاری ئێمەیە. لەو جێگایەدا کە دەمانەوێت وەک ژیانی ئێستامان بێت، هەستدەکەین عەیبمان نییە، دیسانەوە تۆماریدەکەین. بۆ نمونە گەر من لە سەرەتاوە دەست پێبکەمەوە ئاخۆ لە وێستگەیەکدا ژنم نەدەهێنا، ئاخۆ هەر وەک شۆڕشگێڕێکی ڕووتەڵ بە ژیاندا تێدەپەڕیم یان تۆ جەنابی پرۆفیسۆر گەر تۆ ورد بیر لە ژیانی خۆت بکەیتەوە، ئاخۆ دەتویست ببیتە پرۆفیسۆر، دەتویست ببیت بە کادیرێکی حیزب، بۆ نمونە نەتدەویست بەم ئینگلیزییە جوانەتەوە ببیت بە ئەکتەرێک لە هۆلیۆد، نەتدەویست لە جیاتی خێزانی ئێستات کە حورمەتی بێپایانم بۆی هەیە، کچێکی قژ زەرد و چاوشینی ئینگلیز ژنت بێت. ئاخۆ مەلا گوزید من و تۆ هەر خۆمان بووینایە، هەر شۆڕشگێڕەکەی شاخ بووینایە، قەبووڵماندەکرد خزمەتکاری ئەتیوپی و سریلانکیمان هەبێت... هەڤاڵان ئێمە ڕێکخراوێکی ترسناک نین، هەڕەشەمان لە سەر کەس نییە، ئەوەی هەیە و نییە یارییەکی بچوک و بێزیان و تایبەتییە، بیر لەوە دەکەینەوە کە لەدەستمان چووە... بۆ ئەوە دەگەڕێین و دەپرسین ئەگەر بەوجۆرەمان نەکردبایە دەکرا چ ڕێگایەکی تر بگرینەبەر، چ ژیانێکی تر

بژین. هەڵبەت هەموو هەوڵیشمان بۆ ئەوەیە کە ژیانی دووەممان جوانتر بێت، باشتر بێت، جێگای ئەو فریشتەیەی ناو ناخمانی تێدا ببێتەوە».

پرۆفیسۆر پێکەنی و گووتی «بەڵام بۆ باس لەوە ناکەیت کە دەتانەوێت چیرۆکی هەر دوو ژیانەکە، ژیانی ڕاستیتان و ژیانەکەی دی بنوسنەوە و بیکەن بە کتێب، بە خەڵک بڵێن، تەماشابکەن شۆڕش چۆن کردینی بە جانەوەر... تەماشابکەن و ببینن دەسەڵات بە چ دەردێکی بردین... دەتانەوێت بڵێن گەر پیاوە جانەوەرەکانی ناو حیزب نەبانایە ئێمە ئەم ژیانەی دووەممان دەبوو، پاکتر و بێگریتر دەژیاین. ئەمە ئێمەین نەوەک ئەوەی ئێستا هەین... ها... بۆ ناڵێیت دەتانەوێت بە هەر نرخێک بووە ناوی شۆڕش بزڕێنن و تاوانەکانی خۆتان لە گەورە و بچوک بخەنە ملی شۆڕش».

من بێئەوەی سەیری پرۆفیسۆر بکەم، گووتم «مرۆڤ نابێت لە گێڕانەوەی ژیانی خۆیدا درۆبکات، یان نابێت بیگێڕێتەوە یاخود کە گێڕایەوە دەبێت بەوجۆرە بیگێڕێتەوە کە بینیوێتی و تێیگەیشتووە. من لە ساڵی ١٩٧٤ دا یەکەم ڕۆژ کە بووم بە شۆڕشگێڕ، یەکەمین بەرپرسم لیڤیتانت هۆمەر بۆتانی بوو، ئەو بەرپرسی یەکەمم بوو، هەر یەکەم ڕۆژ بردمی بۆ کوشتنی کۆمەڵێک ئەسپی نەخۆش. جەنابی پرۆفیسۆر کاتێک من ژیانی خۆم دەگێڕمەوە دەبێت باسی ئەو ڕۆژە بکەم، دەبێت باسی ئەسپە کوژراوەکان بکەم، چونکە ئەسپە کوژراوەکان بەشێکی گرنگی ژیانی منن. گەر بە من بێت دەگەڕێمەوە بۆ ئەو ڕۆژە و ئەسپەکان ناکوژم... گەر یەکەم ڕۆژ ئەسپەکانم نەکوشتبایە، ژیانم ڕێگایەکی تری دەگرت، من وەک مرۆڤ هەقمە خەیاڵی ژیانێکی تر بکەم. وادەزانم مافی هەموو مرۆڤێکە بزانێت ئاخۆ دەکرا بەو ڕێگایەدا نەڕوات، دەکرا ژیانێکی تری هەبێت، دەکرا هەندێک شت نەکات کە کردونی، دەکرا هەندێک شت بکات کە دەبوو بیانکات... جەنابی پرۆفیسۆر، ئەوە جگە

لە خەیاڵێکی ڕەوا هیچی تر نییە».

« لیوا گیان» مەلا گوزید بە دەنگە گوندەکییەکەی خۆی گوتی « ئێمە پێکەوە شۆڕشمانکردوە، کوردمان ڕزگارکردوە، خوا نەیبڕێت تاسەر ئەم ناز و نیعمەتەمان هێناوە، میللەتەکە دڵی خۆشە، ئەوەتا دایمە لە سەیران و گۆشت برژاندنە، لە خوا بەزیابێت عەرەبی عێراق و کوردی پارچەکانی تر بەخیلیمان پێدەبەن... شتێکی خراپمان بۆ شار و وڵاتی خۆمان نەکردوە. من نازانم تۆ و بەعزێ برادەر لە چی نیگەرانن؟».

پرۆفیسۆر کەمێک خۆی جوڵاند و شێوەی قاچدانانی خۆی گۆڕی و گوتی «شتەکە لە هەموو شتێک ترسناکترە. ئێمە چەند ساڵە لە بەر هێرشی ئەو ڕۆژنامەنوس و نوسەرە دەمهەراشانەدا دەژین کە ژیانیان لە حیزب تاڵکردوە، بەهەق و ناهەق تۆمەتتاشی بۆ هەڤاڵان دەکەن، بەڵام باپێتبڵێم ئێمە حیزبێکی دیموکرات بووین... بە ئیفتیخاری هەموو لایەک ئێمە دیموکراسیترین هێزی ناوچەکەین. وانییە هەڤاڵان وانییە؟... من لەگەڵ برادەرانی ئەنجومەنی سیاسی بە درێژیی لە سەر ئەم مەسەلەیە قسەمکردوە، تۆ گەر ڕەخنەکانت لە حیزب یان دەوڵەت بێت سەرسەر و سەرچاو، دەتەوێت حیزبێکی تر دروستبکەیت و ململانێی سیاسیمان لەگەڵ بکەیت، هەر سەرسەر و سەرچاو... بەڵام بەناوی ڕاستکردنەوەی ژیانی خۆتەوە، سات بە سات و ڕۆژ بە ڕۆژ ژیانی خۆت و سەرکردەکان و هەڤاڵانیان و خێزانەکانیان پەڕە پەڕە هەڵبدەیتەوە، هەموو شتێکیش لە فۆرمێکی ئەدەبی بەرزدا دارێژیت تا باشتر بخوێنرێتەوە و جوانتر کاریگەریی بێت، نوسەرێکی داخ لە دڵ و هەناوڕەشی وەک سەعید یۆنانیش بۆ کاری واهەڵبژێریت. کە هەموو دەزانین خوا لێیخۆشبێت چەند ڕقی لە حیزب بوو، چەند کەسێکی تاکرەو بوو... نە بەخودا، ئەوە نییەتێکی باشی لە پشت نییە. بەڵام برادەرانی ئەنجومەنی باڵا دەیانەوێت بزانن بۆ؟ تۆ لەو ساتەدا کە بیردەکەیتەوە ژیانێکی تر بۆ خۆت دروستبکەیت...

ژیانی شەخسی هەموومان دەخەیتە ژێر پرسیارەوە. بەڵام مەسەلەکە هەر ئەوە نییە، مەسەلەکە ئەو ئەرشیفە گەورەیەشە کە دەتانەوێت لەگەڵ چیرۆکنوسانی وڵاتەکەدا کاری لە سەر بکەن. مەبەستم «ئەرشیفی ئەرخەوانییە». پێناچێت ئێوە بتانەوێت دەست لە هیچ بپارێزن... گەر دەستتان نەبردایە بۆ ناوی هەڤاڵانی ئەنجومەن... گەر هەوڵی ئەوەتان نەدایە لە بچوکترین نهێنییەوە تا گەورەترین نهێنی شەخسییەکانیان ئاشکرابکەن، ئێمە کارمان بە جەنابتەوە چی بوو. گەر مەسەلە تەنیا ئەوە بێت بۆ خۆت خەونی جرنی و فرنی لە سەر ژیانی خۆت بنوسیت، کورە سەدجار بە جەهەنەم کاری بە سەر کەسەوە نییە، بەڵام تۆ بتەوێت یەکە یەکە ژیانی هەموومان بگەڕێیت بۆ ئەوەی لە پشتییەوە بۆ خەیاڵاتێکی خۆت بگەڕێیت، نا بەخوا ئەوا شتێکی ترە. مەسەلەکە ئێستا زۆر گەورەیە، شەرەفی شەخسی کۆمەڵێک ئەندامی دڵسۆزی حیزب لە مەسەلەکەدایە. گەر مەسەلەکە ناوی ئەندامانی تێ نەکەوتبایە، ئێمە هەقمان چی بوو؟. بەڵام ئێستا، ئیشەکە گەیشتۆتە شوێنێکی باریک... گەر لێگەڕێین تۆ ناموسی حیزب بەریت، دوژمنان وەک مێرولە لێمان دەئاڵێن. ژیانە ونەکەی تۆ جۆرێکە لە کۆدێتا، کۆدێتای رەش بە سەر هەموومانـدا. وەک ئەوەی بتەوێت بڵێیت هەمووتان دەکرا ژیانێکی تر بژین... هەمووتان دەکرا بەرێگایەکی تردا بڕۆن... تۆ ناتەوێت ژیانی تاک و تەنهای خۆت راستبکەیتەوە، چونکە تۆ قەت ژیانی تاک و تەنهای خۆتت نەبووە. تۆ هەمیشە بەشێک بوویت لە حیزب، هەر شتێک باسبکەیت، باسی حیزب دەکەیت. هەر چیرۆکێک بگێڕیتەوە چیرۆکی هەموومان دەگێڕیتەوە، نهێنی تایبەتی هەموومان باسدەکەیت. تۆ هەتا یەک سەعاتیش بۆ خۆت نەژیاویت، هەمیشە بەشێک بوویت لە حیزب. گەر تۆ ژیانی خۆتت هەبایە، بەجەهەنەم... حیزب کاری بە سەر ژیانی خۆتەوە نەبوو. بە من چی تۆ چ دەردێک بە سەر ژیانی خۆتدا دەهێنیت.

برۆ چی لەو ژیانە گووەی خۆت دەکەیت بیکە، هەزارجار بەجەهەنەم. بەڵام تۆ تاکە کەسێکی ناو حیزبیت کە ژیانی خۆتت نەبووە. ئەوەی بینیوتە موڵکی حیزب بووە، ئەوەی کردوتە موڵکی حیزب بووە، ئەوەی نوسیوتە موڵکی حیزب بووە، ئیتر باسی ژیانی تایبەتی مەکە. تۆ هەتا یەک سەعاتی ژیانیشت موڵکی خۆت نییە. هەموو ژیانت موڵکی ئێمەیە. تۆ ناتوانیت نە هیچ شتێک ئاشکرابکەیت و نە هیچ شتێک بگۆڕیت و نە هیچ شتێک بگێڕیتەوە. ئەوە ڕای بەشی هەرە زۆری ئەندامانی دەفتەری سیاسییە. تۆ بەوەشەوە نەوەستاویت، هەوڵتداوە هەندێک ئەندامی باڵای تر، کادێری پێشکەوتوو، بەرپرسانی هەواڵداری، بخەیتە سەر ئەو بڕوایەی کە ژیانی خۆیان بنوسنەوە و بە جۆرێکی دیش بیری لێبکەنەوە، هەمووشی بەناوی ژیانی ونبووەوە، ژیانێکی تر کە گوایە دەکرا تیا بژین... هیچ ژیانێکی تر نییە، مرۆڤ هەر ئەو ژیانەی هەیە کە پیایدا هاتووە، دوائەوە تۆ کەسێکی زۆر سەیریت، هەندێ لە برادەران باس لەوە دەکەن بتنێرن بۆ دەرەوەی وڵات تا چارەسەری دەرونیت بۆ بکرێت. هەموو سیاسییەک لە دونیادا دەیەوێت پاشەڕۆژ بگۆڕێت، تۆ دەتەوێت ڕابوردوو بگۆڕیت... هەموو سیاسییەک خەیاڵی لای ئەوەیە پاشەڕۆژ چی دەبێت، تۆ خەیاڵت لای ئەوەیە لە ڕابوردوودا دەشیا چی ببێت. هەوڵتداوە هەموو ئەو خواستانەش لە تێکستێکی ئەدەبیدا بنوسیتەوە، ئەوە دەریدەخات کە تۆ نیازی بڵاوکردنەوەی یاداشت و نوسراوەکانی خۆتت هەبووە، یان هیچ نەبێت دەتەوێت بۆ سبەینێ چیرۆکێک هەڵگریت دڵی مێژوونوسان لە ئێمە ڕەشبکەیت... ئێمە دەزانین پەیوەندی تۆ و سەعید یۆنانی چیرۆکنوس بۆ ئەوە بوو کە نهێنییەکانی شۆڕش لە شێوەی چیرۆکێکی ڕاستەقینەدا دابڕێژن... هەموو دەزانین تۆ لە سەر کانی زانیارییەکان بوویت، لە سەر ئەو نهێنییە گەورانەی کە یەکێکی وەک منیش نایانزانێت. بڵاوبوونەوەی ئەو نهێنیانە، نوسینەوەیان حیزب و

دەوڵەت لە یەک هەڵدەوەشێنێت. شتەکە وا ئاسان نییە، تۆ ترسناکترین کەسێکی تا ئێستا لە حیزب هەڵگەڕابێتەوە».

قسەکانی سیوپێنج ساڵ لەمەوبەری خۆمم هاتەوەیاد کاتێک لەسێئاسکێ گوتم «من ژیانی خۆم بە ڕەهەن لای شۆڕش دادەنێم». ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە، دوای تێپەڕینی نزیکی بیست ساڵ بە سەر سەرکەوتنی شۆڕشدا، نەمدەتوانی ئەوەی بەبارمتە دامناوە وەریبگرمەوە. مرۆڤ یەکجار ڕۆحی خۆی دەبەخشێتە شۆڕش و ئیتر ناتوانێت جارێکی دی وەریبگرێتەوە. بەڵام من بڕیارمدابوو ژیانی خۆم وەربگرمەوە.

جەمیل قەیسەر سەیرێکی جەنابی پرۆفیسۆری کرد و گوتی «جەنابی پرۆفیسۆر قسەکانی خۆت تەواوکرد». لەو کاتەدا من بۆ یەکەمجار سەیری ژوورەکەم کرد. ژوورەکە پەنجەرەی تێدا نەبوو، بەڵکو دوو دەلاقەی بچوکی لە سەر بوو کە پێدەچوو بە دوو ئامێری هەواکێش هەوای بۆ بهێنن و ببەن... ژوورێکی خاڵی، ئەوان لە سەر سێ تاک قەنەفەی بچوک دانیشتبوون، من لە سەر کورسییەکی بچوک لە پشتی مێزێکی بچوکەوە ئارامم گرتبوو، مێزەکە بۆیەیەکی شینی کاڵ کرابوو، مەیلەو شیریی دەینواند، تەنیا شتێک لە ژوورەکەدا سەرنجی منی ڕادەکێشا ڕەنگی قاتەکەی پرۆفیسۆر بوو... ژوورەکە هیچ شتێکی تێدانەبوو لە ڕەنگی قاتەکەی ئەو سەرنج ڕاکێشتر. جەنابی وەزیر گوتی «کاک پرۆڤیسۆر گەر قسەکانت تەواوکردبێت، وەڵا منیش چەند تێبینییەکم هەیە... ئێمە لەوەزارەت ئیش لە سەر ئەمنییەتی خەڵک دەکەین. بەشێک لە مەسەلەی ئەمنییەتیش ئەوەیە نەهێڵین هاوڵاتیان خودکوژبیکەن. ئەوەی هەڤاڵ جەنگیز دەیکات دەچێتە ڕیزی خودکوژییەوە. جۆرێکە لە خۆتەقاندنەوە. عەزیزم خۆتەقاندنەوە هەر ئەوە نییە پشتێنێک تیئێنتی لە خۆت ببەستیت و خۆت بتەقێنیتەوە. من هەموو جارێک کە کچەکەم لێم دەپرسێت بابە وەزیفەی دەزگای دژە

تیرۆر چییە، دەڵێم کچم وەزیفەیان چییە، ئەوەیە نەهێڵن ئینسانەکان خۆیان بتەقێننەوە... نەهێڵن کەس خۆی بە کەسی تردا بتەقێنێتەوە. دیارە لە وەزارەت یەک دوو کوڕمان هەیە، پسپۆڕی باشن... پەح تابلێی شارەزان... جارێکیان یەکێکیان گوتی دوو جۆر خۆتەقاندنەوە هەیە، خۆتەقاندنەوە بە کردار و خۆتەقاندنەوە بە نوسین یان قسە. ئەو کوڕە کە تابڵێی کوڕێکی باشە گوتی نوسین لە دینامێت خراپترە، لە هەرچی تەقەمەنی دنیایە بەهێزترە. شتەکان وەها لە ڕیشە هەڵدەکەنێت ئیتر ناچنەوە جێگای خۆیان. بە سەری خۆم برا، ئەم نوسینەی تۆش وایە تۆ بەو هەوڵەت هەموو ئەو ژێرخانە لێک هەڵدەوەشێنیت کە هاوڕێتی و خەبات و حیزبایەتی چەند ساڵەمان لە سەری وەستاوە. ژیانی چی عەزیزم... ژیانی ونبووت بۆچییە. هەموومان ئیفتیخار بە ژیانی خۆمانەوە دەکەین لە حیزبدا، ئەی حیزبت لە کیس بچێت و هەڤاڵانی چەند ساڵەت ونبکەیت چی؟ ها... ئەی ئەوەش بۆ خۆی شتێکە یان نا؟ دوائەوە هەر چییەک بووبێت بووە، ئەوەتا خۆت دەزانی ئێمە چەند ساڵ لە شەڕی ناوخۆدا بووین، ئێستا هەموو دەستمانکردۆتەوە ملی یەک و بووین بە برا».

لەوساتەدا بیرم لەوە دەکردەوە، گەر ئەو سەربوردە سەیرەم نەبایە، گەر ڕۆژێک ئەو باڵانەم نەدیبایە، گەر هۆشەنگی بولبولیارم نەناسیبایە، گەر ئەو مەخلوقە عاجباتییە منی جێنەهێشتبایە، گەر کوێربوومایە و نەمزانیبایە چیم لەدەستداوە... ئێستا یەکێک بووم لەوان، ئێستا لە ڕیزی ئەو سێ پیاوەدا دانیشتبووم و بەغروری پیاوانی دەسەڵاتدارەوە، پرسیارم لە بەدبەختێکی دیکەی وەک خۆم دەکرد. بێگومان نەمدەتوانی هەموو ژیانی خۆمیان بۆ ئاشکرابکەم، بەڵام گووتم «من هەموو ژیانی خۆمم بەخشیوە بە حیزب، ئێستا مافێکی سروشتی خۆمە لە خەیاڵدا بیر لەوە بکەمەوە گەر حیزب نەبایە من چ جۆرە مرۆڤێکی تر

دەبووم. منیش دەزانم توانای گۆڕینی رابوردووم نییە، لەو ڕابوردووەشدا شتێک هەیە کە هەمیشە دەمێنێتەوە. پرسیارێک کە مرۆڤ دەبێت بۆ وەڵامەکەی بگەڕێت ئەوەیە: گەر تۆ ئەمە نەبوویتایە کێ دەبوویت؟. لەوانەیە جەنابی پرۆفیسۆر تۆ پێویستت بەو پرسیارە نەبێت، یان جەنابی وەزیر تۆ، بەڵام من پێویستیم بەو پرسیارە بوو، مرۆڤ هەیە بۆ ئەوەی بتوانن بەردەوامبن و بژین پێویستیان بەو پرسیارەیە، ئێوە پێویستیتان پێی نییە، بەڵام من لەو بەدبەختانەم کە ناتوانم ئەو پرسیارە نەکەم. ڕابوردوو ناگۆڕدرێت، بەڵام ئەم پرسیارەش لە ناخی مندا نامرێت. جەنابی جەمیل قەیسەر، من مێژووی خەباتم لە حیزبدا سێ جار لە مێژووی خەباتی تۆ درێژترە، بەڵام ئەمڕۆ تۆ وەزیریت. هەڵبەت وەزیر نیت لە بەرئەوەی پیاوێکی بلیمەتیت، خۆت لە من باشتر دەزانیت کە تۆ بلیمەت نیت و قەتیش نابیت بە بلیمەت. لەبەر شتی تر ... تۆ لەبەر شتی تر وەزیریت، لەبەر شتی ترماڵەکەت و منداڵەکانت گەیشتوونەتە ناو ئەم بورجە. هەقە تۆش لە خۆت بپرسیت: من چۆن گەیشتمە ناو بورج و گەر ئەمە نەبوومایە چی دەبووم؟. هەقە بیرێک لە ژیانی خۆت بکەیتەوە، چرکە چرکە و ڕۆژ بە ڕۆژ. ڕابوردوو هەڵەی تەنها یەک کەس نییە، هەڵەی هەموومانە. بەڵام مرۆڤ بە گشتی لەوە ترسنۆکترە پرسیاری وەها لە خۆی بکات: چۆن گەیشتمە ئێرە؟ دەبوو چیبکەم بۆ ئەوەی بگەم؟ یان دەبوو چی بکەم بۆ ئەوەی نەگەم؟. چیم کردوە تا گەیشتوومەتە ئێرە؟ ها هەموو ئەوانەی لە سایەی سەری حیزبدا گەورەبوون دەبوو پرسیاری وابکەن. من ناتوانم ڕابوردوو بگۆڕم، من بەرهەمی ڕابوردووم، تۆش جەنابی پرۆفیسۆر، تۆش جەنابی وەزیر، هەر یەکێک لە ئێمە بەرهەمی ڕابوردووین. ڕابوردوو تەنیا یەک بەرهەمی هەیە، ئەویش ئێمەین. ئەم مرۆڤانەیە کە ئێستا دەژین. لێرەوە تاکە پرسیارێک دەبێت وەڵامیبدەینەوە ئەوەیە، لە چ ساتێکی ژیانماندا دەکرا

شتێک بکەین، ئەم مرۆڤەی ئەمرۆمان لێدەرنەچێت، لە چ ساتێکدا دەکرا من نەبم بە لیوا جەنگیز. من دەزانم ئێوە هەمووتان کێشە و گرفتێکتان لەگەڵ خۆتاندا نییە، خەڵکانێک هەن فریشتەکەی ناویان دەتوانێت بەرگەی هەموو شتێک بگرێت، فریشتەکەی ناویان دەتوانێت لەگەڵیاندا ببێتە پیاوکوژ... ببێتە جەلاد و ئەشکەنجەدەر. بەڵام مرۆڤەکان وەکو یەک نین، ئێوە لەوەدا لە من بەختەوەرترن، من جۆرە مرۆڤێکی ترم، من دەبێت بە سەر هەموو چیرۆکی ژیانمدا بچمەوە، بە سەر هەموو رۆژەکانیدا، لە هەموو ساتە گرنگەکانیدا بۆ ئەوەی بزانم گەر هەوڵمبدایە گوێ بۆ ڕۆحی خۆم شلبکەم، چیم دەبیست. مرۆڤ ناتوانێت ڕابوردوو بگۆڕێت، بەڵام کۆمەڵێک شت لەو ڕابوردووەدا هەن کە نەیبینیوون، کۆمەڵێک دەنگ هەبووە نەیبیستوون... پرۆفیسۆر شالیار، گەڕان بۆ ئەو دەنگانە، بۆ ئەو شتانە کۆدێتا نییە بە سەر هیچدا... ئەگەر کۆدێتاش بێت، کۆدێتایە بە سەر کوێرێتی و کەڕێتی مرۆڤ خۆیدا... ناهەڤالانی تێکۆشەر نا... من ڕابوردووم بۆ ناگۆڕێت بەڵام بەوەدا زیندووم، بەوەدا یەکێم لەوانەی ئەو ڕابوردووە بە قووڵی ژیاون و ئێستا ماونەتەوە، دەبێت هەوڵبدەم وەڵامی پرسیارەکانی بدەمەوە».

پرۆفیسۆر شالیار خۆی وادەبینی کە هەرگیز بە قسە ناگیرێت... لە چاوپێکەوتنە تەلەفزیۆنییەکانیدا بە خێرایی نەیارەکانی دەکردە کونەوە، هەمیشە لیستێک ژمارەی پێبوو کە نیشانی دەدا، لە سەردەمی حومکڕانی حیزبدا چ بەهەشتێک لە سەر زەوی پیادەبووە، بە هونەرێکی زۆرەوە لەشی ڕێک بەرامبەر زوومی کامێراکان ڕادەگرت و ویقاری پیاوێکی لێزانی دەدایە خۆی و وەک حوکمڕانێکی حەکیم دەینواڕی و بە هێمنی قسەیدەکرد. هەستمکرد بەرامبەر قسەکانی من شتێکی ئەوتۆی نییە بیڵێت، هەر کاتیش شتێکی نەبایە بیڵێت دڕتر و تووڕەتر دەبوو. زۆر بەتوندی دەستی کێشا بە کاغەزەکانی سەر کۆشیدا و گووتی «تۆ ڕێکخراوێکی نهێنیت

دروستکردوە. حاشا لە چی دەکەیت، لە ناو حیزبدایت و خەریکی دروستکردنی حیزبێکی تریت، خیانەت هەیە لەمە گەورەتر، ئای وەڵا دنیا عەجایەبی لێهاتووە، هێی خەریکی دەتەوێت بمانخەڵەتێنیت، وەک پیاو هەقیقەتی شتەکە بڵێ، ئێستا ئێمە لێرە ساحێبماڵین نەوەک تۆ. سەرۆکیش سەری لەم کارە نابەجێیە سوڕماوە، کە پێمگووت بەستەزمانە هەر سەری بادەدا و دەیگووت راست نییە... ڕاست نییە، جەنگیز شتی وای لێ ناوەشێتەوە. بەستەزمانە بەو پیرییە باوەڕناکات ئەو هەموو خائین و ناکەس بەچەپەی لەدەوربوون. دەتوانیت حاشا لەوە بکەیت کە تۆ ڕێکخراوێک نهێنیت دروستکردوە؟... دەتوانیت حاشا لەوە بکەیت... وەڵا خوێنی سەعید یۆنانیش لە ملی تۆیە، ئەگینا ئێمە چیرۆکنوسی وا قەڵتاغ بۆ دەکوژین؟. بەس وەی وەی، سەعید دانیشێت بەو زمانە شیرینەی یاداشتەکانی تۆ بنوسێتەوە و نهێنی دەرهێنێت و بە خەڵک بڵێت قەوم و قیلە وەرن سەیرکەن ئەمە سەرۆکەکانتانن، بەوەش نیوەی منداڵەورتکەی شارەکەمان بەبەردەوە بکاتەسەر... ها ماڵی سەرۆکم ئاواکرد، ماڵی سەرۆکم ئاواکرد، ئەگینا بەخوا دەبوو زووتر بەردێ بخەینە سەر ئەم حیکایەتە، پیاوی وا دەست و دڵ باش مەگەر لە ئەفلام کارتۆندا مابێت».

لەوساتەدا ڕێک ئەو پرسیارە بە خەیاڵمدا هات، ئایا هەڤاڵی پرۆفیسۆر هەر بەم زمانە قسەی لەگەڵ کۆندۆلیزا رایس و برایمەر و رۆبن کوک و جاک سترۆدا کردوە، نازانم، باوەڕناکەم، دەشێت، بۆ نا؟. بەڵام دڵنیابووم، بەوجۆرە قسەکردنەی دەیویست بە من بڵێت «گوێبگرە، تۆ لای من زندانییەکیت وەک هەر یەکێک لە زیندانیەکانی تر. تەمای ئەوەت نەبێت، بە هۆی ڕابوردووتەوە ڕەحمت پێبکەم».

کە قسەمدەکرد دەنگم لەرەیەکی ترسی تێدابوو، هەستمدەکرد زۆر دەستم دەلەرزێت، بەڵام خۆم کۆکردەوە و گووتم «بەڵێ دەتوانم حاشابکەم،

جەمعییەتەکەی ئێمە جەمعییەتێکی سیاسی نییە. نەدەمانەوێت تۆ لە سەر کورسییەکەت لابدەین و نە بورجیش داگیربکەین. هەر کەسێک دێتە جەمعییەتەکەی ئێمەوە دەبێت دوو تێکست بنوسێت، ژیانی یەکەمی خۆی بنوسێتەوە، ئەو ژیانەی کە تێیدا ژیاوە، لەگەڵ ژیانی دووەمی، واتە ئەو ژیانەی دەکرا یان دەبوو تیا ژیابا، ژیانە ونبووەکەی خۆی، ژیانە لەدەستچووەکەی. ئەو کارەش بۆ ئەوەیە مرۆڤ بەشێک لە خودی ونبووی خۆی بدۆزێتەوە».

مەلا گوزید هەڵیدایە و گووتی «ئەوەی بە دەست ئێمە گەیشتووە ئەوەیە کە تۆ جەمعییەتێکت خولقاندوە، دەتەوێت پەڕە پەڕە ژیانی ئەو خەڵکە هەڵبدەیتەوە، لەگەڵ چیرۆکنوسەکانی مەملەکەتدا ڕێککەوتوویت نەهێڵیت ئەو ڕابوردووە بمرێت. سەرۆک نیگەرانە، برادەران نیگەرانن، ئێمە شۆڕشمان بۆ کورد کردوە، لێرە و لەوێ هەڵەی بچوکیش هەر دەبێت، بەس خوا عەلیمە گەر سەیری ئەم شۆڕشەی ئێمە بکەیت، لەگەڵ شۆڕشی خەڵکی تردا بەراوردییکەیت. دەبینیت ئەوەی خۆمان بەسەد ئاو شۆراوەتەوە». من بە نیگەرانییەوە گووتم «مەلا گوزید، من دەمەوێت پەڕە پەڕە ژیانی خۆمان هەڵبدەمەوە... ژیانی تایبەتی خۆمان... ژیانی ئەوانەی دەبن بە ئەندامی جەمعییەت». لەویادا پرۆفیسۆر بە دەنگی بەرز هاواریکرد «ئەوە مەسەلەکەیە. پێمگووتی تۆ ژیانی تایبەتی خۆتت نییە، هەر نهێنییەک بنوسیتەوە، نهێنییەکی سەرکردەکانی لە ژێردایە... جەمعییەتەکەی تۆ لەوەدا دوایدێت کە مێژووی سی و پێنج ساڵ خەبات وەک مێژوویەکی تاریک پیشانبدات، ئاخر کوڕە ویژدانت بێت، هەی بێئینساف، خۆ تۆ لە گەورە و بچوکی شتەکاندا بوویت... هیچ خەباتگێڕ و سەرکردە و کەسێک نامێنێت، لە دەست تۆ و جەمعییەتەکەت سەلامەت بن، چونکە ژیان هەمووی یەک زنجیرەی گرێدراوە. شتێک نییە ناوی ژیانی تایبەتی بێت، لەعنەتی خودات لێبێت، لەعنەتی خودا لە

ژیانی خۆت و لە ژیانی ونیشت. تۆ چۆن ئاسایشێکی... چۆن پیاوێکی ئەمنییەتیت... لەعنەتی پێغەمبەر لە سەد ئاسایشی وا».

سی و پێنج ساڵ بوو لە شۆڕشدا بووم کەس وای پێنەگوتبووم، بە هێمنییەوە سەیرمکرد و گووتم «نازانم بۆ وا تووڕەن. تێناگەم. ئێمە ژیانی خۆمان بۆ خۆمان دەگێڕینەوە، ژیانی خۆمان بۆ خۆمان و بۆ کەسی تر نا.. نایکەین بە کتێب، چاپی ناکەین، لە ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەندا بڵاوی ناکەینەوە، لە هیچ کەناڵێکەوە پەخشی ناکەین... بۆ حەرامە مرۆڤ هەوڵبدات ژیانی خۆی کە بە بارمتە بەخشیوێتی وەریبگرێتەوە».

جەمیل قەیسەریش هەستیکرد کە دەبێت ئەویش تۆزێک توند بێت، بۆینباخە خوارەکەی چاککرد و گووتی «بەڵام دەمانەوێت بزانین ئەندامانی مونەزەمەکە کێن و چەند کەسن و چۆن دابەشبوون... زانینی ئەو زانیاریانە گرنگە بۆ ئەوەی لە نییەتی تۆش تێبگەین... ».

من بە پێکەنینەوە وەڵامدایەوە «ببورە جەنابی وەزیر، هاوڕێکانم کارێکی خراپیان دژ بە کەس ئەنجام نەداوە. جەمعییەتەکەمان تەنیا لە بەر هەندێک هۆی زۆر تایبەت کە باسکردنی لێرەدا ئەستەمە، نهێنییە... گەر باسیش بکرێت، جگە لە گاڵتەو پێکەنین لە نێو ئێوەدا هیچ دروست ناکات، بەڵام تا ئەو شوێنەی جەمعییەتی ئێمە کارێکی نەشیاوی نەکردوە، من ناوی هیچ کەسێک نادرکێنم. گەر منتان هێناوە بۆ ئەوەی ئەشکەنجەمبدەن و ناوم لێدەربهێنن، کارێکی باش ناکەن».

دوای ئەوە هەر سێکیان زۆر قسەیانکرد، هەرسێکیان دڵنیابوون جەمعییەتەکە ڕێکخراوێکی نایاسایی ترسناکە و هیچ جارێکیان نییە جگە لەوەی کار بۆ تێکەیشتن و هەڵوەشاندنەوەی بکەن، پرۆفیسۆر شالیار سووربوو لە سەر ئەوەی ڕێکخراوەکەمان جاسوسییە و کار بۆ هێزێکی بێگانە دەکەین، یان پلانێکی گەورەترمان لە پشتە. مەلا گوزیدیش بە مەحەبەتەوە پێی لە سەر ئەوە دادەگرت کە گەر جەمعییەتەکە

هەڵبوەشێنینەوە و واز لە کاری تۆمارکردن و ئاشکراکردن و پێداچوونەوەی ڕابوردوو بهێنین، سەرۆک بە میهرەبانی هەمیشەیی خۆی لێمدەبووریێت.

من ئەو ڕۆژە پێمگووتن کە جگە لەو شتانەی گووتوومە، هیچی ترم نییە بیڵێم. لە کۆتایی شەودا بەر لەوەی بمبەن بۆ ژوورێک لە زیندانی بورج، پرۆفیسۆر هەڕەشەی ئەوەی لێکردم کە ناچار دەبن هەموو یادەوەریم بسڕنەوە. من دەمزانی ئاسان ڕزگارم نابێت... ئێستا تاکە هیوام ئەوە بوو ئەزمێرا نامەکە ببات بۆ ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن و گۆڤاری بوهاران، بۆ ئەوەی دونیا لە دەرەوە ئاگاداربێت کە گیراوم. گەر ئەوە نەبێت، هیچ هێزێکی دی لەدەست پرۆفیسۆر ڕزگارم ناکات، کە بەقسە و سەیرکردنەکانیدا دیاربوو چەند ڕقی لێمە.

# لیڤیتانت دەبێتەوە بە شۆڕشگێڕ

لەساڵی ١٩٧٨ دا گروپەکەی سەفین خۆشناو و غەنی مامەند و ئازاد بەهجەت تا دەهات گەورەتردەبوو، لەگەڵ گەورەبوونیشیدا هەڵوێستێکی توندیان بەرابەر شۆڕش وەردەگرت، لە زۆر شوێنی شاردا بەیاننامەیان بڵاوکردەوە و پارتی ئێمەیان وەک تاقمێک بۆرژوای بچوک ناودەنا کە شۆڕش بە هەڵدێردا دەبەین و سیستمێکی حوکمڕانی کەپیتالیستی بونیاددەنێین و خیانەت لە هەژاران و ڕەنجدەران دەکەین. ئەنجومەنی باڵا کێشەی گروپە توندڕەوە بچوکەکانیان خستە دەست هەڤاڵ شێرخان و مەلا وەلید، کە هەردووکیان دوو نەیاری سەرسەختی کۆمۆنیزم بوون. هەڤاڵ شێرخان بۆ منی نوسی کە هیچ چارەیەکمان نییە جگە لەوەی هەموو ئەو ڕێکخراوە بچوکانە، ئەو هێزە توندڕەوانە کە شۆڕش پارچەپارچەدەکەن لە ناو بەرین... لەو نێوەندەدا ئەوان دەستیان دابوویە چالاکییەکی بەرفراوان

بۆ هەڵوەشاندنەوەی شانەکانی ئێمە و پەشیمانکردنەوەی ئەندامانمان، توانیان هەندێ ڕێکخستنی گەورەی ئێمە لە زانکۆ و پەیمانگاکان بۆ خۆیان ڕابکێشن. ئەوە هەڤاڵ شێرخانی شێتکرد و بڕیاری ڕاگەیاندنی شەڕێکی کراوەی دژ بەو ڕێکخراوە بچوکەکان ڕاگەیاند. دەبێت بڵێم کە حیزبی ئێمە لە مێژووی خۆیدا ڕێکخراوی بچوک و گەورەی نەزانیوە، هەر هێزێک هاتبێتە بەردەممان وەک بلدۆزەرێکی گەورە کە شۆفێرێکی کوێری هەیە ڕامانداوە. بەوەدا من عاتیفەیەکی نهێنی و برایانەم بۆ هۆشەنگی بولبولیار هەبوو، ڕۆژێک بانگمکرد و هەموو مەترسییەکانم تێگەیاند. بولبولیار هیچی ئەوتۆی بە دەست نەبوو، ئەو تەنیا بۆ جێگایەک دەگەڕا شۆڕشی خۆی تێدا بکات، شۆڕشێکی خەیاڵی کە تەنیا لە سەری خۆیدا ئەنجامدەدرا، بێ خوێن، بێ توندوتیژی، بێ قوربانی، بێ جەلاد. ئەو لەو شۆڕشگێڕانەبوو کە لە هیچ بەرەیەکدا جێگایان نابێتەوە، من دەمزانی هاوڕێکانی بۆچوونەکانی بە هەند وەرناگرن. بەڵام بانگمکرد و دڵنیابووم قسەکانم بە وردی بۆ هەڤاڵانی خۆی دەگێڕێتەوە. ئەو لەو پیاوە سادە و خۆشباوەڕانەبوو کە بڕوای وابوو شۆڕشگێڕان هەموویان بەرامبەر جیهان لە سەنگەرێکی هاوبەشدان، هیچ کەسیشیان دواجار ناتوانێت ئەو ئازادییە بە دەستبهێنێت کە بۆی دەگەڕێت.

ئەوەی دواجار کێشەکانی ئێمە و کۆمۆنیستەکانی چارەسەرکرد لیڤیتانت بوو.

لیڤیتانت دوای برینداربوونی، دوو ڕۆژ لە خەستەخانە مایەوە و دواتر ناردیان بۆ بیمارستانێکی بەغداد. دەوڵەت زۆر مەبەستی بوو، خۆی وانیشانبدات کە دەست لە کەسانی دڵسۆزی خۆی بەرنادات، لەوێ لە باشترین خەستەخانە و لە ژێر چاوەدێری باشترین پزیشکەکاندا چارەسەریانکرد. لەوێ بۆنی بیمارستان، هەوای گەرمی باشوور ، بۆی

عەتری سیستەرەکان، ئامێزیان بۆ کردەوە، ئەم دونیایە لای لیڤیتانت دونیایەکی تازە و گەورە و نائاشنابوو، چەند سەرسامیدەکرد دوو هێندە دەیترساند. لەوێ چەندیکرد نەیتوانی نزار ئیدریس و گینگڵی ناوەکی خۆی لەبیربەرێتەوە. ئەوکات کە لە فێنکی شەوانی بەغدادا دەستی لە جێ برینەکانی خۆی دەدا، یەک پرسیار ئازاری دەدا «نزار ئیدریس بۆ کێ ئیشدەکات؟». لیڤیتانت دەیزانی گەر نزار بە فەرمانی شۆڕش تەقەی لێکردبێت، ئەوا گرتن و کوشتنی سوودێکی نییە... ئەو خۆی کۆنە شۆڕشگێڕ بوو، دەیزانی ئەوانەی دەزگا گرنگەکانی شۆڕش بەڕێوەدەبەن چۆن بیردەکەنەوە. گەر نزار تەنیا بۆ خۆی و سەربەخۆ ئەو کارەی کردبێت، دەبێت ئەم هەموو ژیانی دوای بکەوێت و تۆڵەی ڕەشی لێبکاتەوە.

ئێوارەیەک دوای هەستانەوەی لە زامداری، دوای گەڕانەوەی لە بەغداد، بە شەکەتی برینداریکەوە کە دەزانێت هەر دوودڵییەک لە ناوەوە مرۆڤ بخوات ئازاری لە ئازاری برین ساردتر و کوشندەترە، هات و خۆی گەیاندە ژووری من. دەستێک جلی کوردی لەبەرکردبوو، نزیک بە ڕەنگی ئەو جلانەی لە پسمامان دەیپۆشی. دەرکەوتنی زۆر لە ناکاو بوو، دڵنیابووم پێشوەخت پلانێکی وردی بۆ دارشتووە. کە هات بێتەوەی من هەواڵێکم هەبێت، یەکسەر گەیشتە ژوورەکەم و بەردەم جێگاکەم. نەبواری جوڵەم هەبوو، نەدەمتوانی هەستم و بیر لە راکردن بکەمەوە. گەر نیازی گرتنی هەبایە، ئاسان کەوتبوومە داوی. بەڵام بە ناڵەی کەسێکەوە تووشی نائومێدی بووبێت، گوتی «تۆ هەڤاڵ وەفا، تۆ؟... بۆ دەتەوێت بمکوژیت... بۆ؟». ئەوە یەکەم ڕستەی بوو. من هەستام و دەستەپاچە و داماو تەماشامکرد و نەمزانی چی پەرچەکردارێک نیشانبدەم. وەک ژنێک با لە ناوەڕاستی بازاڕدا تەنورەکەی هەڵبداتەوە، دەمویست هەرچۆنێک بووە خۆم کۆبکەمەوە و ساتی شڵەژان و دوودڵی تێپەڕێنم.

سەرەتا تەنیا دەمڕوانی، زمانم گۆی نەدەکرد و هیچم بۆ نەدەگوترا. بە ئەدەبی میوانێکەوە ناوەخت چووبێتە سەر خوانێکی کەم، مۆڵەتی خواست دابنیشێت و لەگەڵمدا قسەبکات. من لە ڕازیبوون بەولاوە چارەی ترم نەبوو، من لەو ساتەدا کەسێکی دوو لەتبووم، لیڤیتانت وەک مرۆڤ هاوڕێم بوو، وەک سیاسەتیش دوژمن. من لە ژوورەکەی ماڵی شوعلەخاندا قەرەوێڵەیەک و مێز و کورسییەکم هەبوو، بێئەوەی هیچ بڵێم لە سەر لێواری کورسییەکە دانیشت و گوتی «هەڤاڵ وەفا بەرلەوەی هیچ بڵێین، من دەزانم تۆ بەرپرسی ئەوانە بوویت کە تەقەیان لێکردم. ئا بەر لەوەی هیچ بڵێین. من هەموو شتێک دەزانم». بە ترسێکەوە دانیشتم و بەڕەنگێکی بزرکاو و مەیلە و زەردەوە گوتم «دەتەوێت بمگریت؟». سەیرێکیکردم، ئاشکرا برینداربوون و ماندوویێتی ڕەنگیان گۆڕیبوو، کەمێک وەستا و گوتی «نازانم... نازانم ئایا دەمەوێت بتگرم یان نا؟ هێشتا نازانم». بە هێمنییەوە گوتی «تۆ لە من شۆڕشگێڕتربوویت، هەر یەکەم ڕۆژ تۆم لە پسمامان بینی زانیم لە من شۆڕشگێڕتریت». کەمێک وەستا و وەک قسەیەکی بێمانای کردبێت کەمێک ڕاما و گوتی « پێمبڵێ هەڤاڵ وەفا، پێتوایە کوشتنی من کارێکی گرنگ بێت؟». کەمێک دەستم دەلەرزی، عارەقێکی ساردم دەردا بوو، دەنگم هێمن و ئاسایی نەبوو، نەمدەزانی چی وەڵامی لیڤیتانت بدەمەوە، نەمدەزانی بە چ نیازێک هاتووە، دەمگرێت یان نا؟. گوتم «نازانم... نازانم، جەنابی لیڤیتانت هاتنی ئێوە وەها کوتوپڕە، من ناتوانم بە ڕوونی بیربکەمەوە. دانیشە جەنابی لیڤیتانت دانیشە... بڵێم چی؟». بە هێمنییەوە گوتی « مەشڵەژێ و دەستت نەلەرزێ. لە یەکەم ڕۆژی پسمامانەوە دەزانم کە من و تۆ وەک یەکین، چەند بمانەوێت ناتوانین بێباکی و دڵرقیمان بشارینەوە. ئەو شەوەی پێکەوە نزار ئیدریسمان ڕفاند، من و تۆ وەکو یەک بووین. تۆ گۆڕەکە هەڵدەکەنیت و من لاشەکەی دەخەمە ناو... ئیشەکەمان زۆر لە

یەک دوور نییە. من دەستم بەکاردەهێنم، ماسولکەکانم بەکاردەهێنم، تۆ زیاتر خەیاڵ و قەڵەمەکەت بەکاردەهێنیت. بیرتە هەڤاڵ ئەو شەوەت لە بیرە، بەڵام لەو کاتەوە تا ئێستا دونیا زۆر گۆڕدراوە، ئێستا تۆ دەبیتە بەرپرسی نزار و دێیت بۆ کوشتنی من. نەدەبوو وابکەیت. من و تۆ شتێکی گەورەتر لە شۆڕش و خیانەت کۆماندەکاتەوە، ئەویش دڵڕەقییە». لەو کەسانە نەبوو کە لە کاتی قسەکردندا پێبکەنن یان زەردەخەنە بگرن، بە پێچەوانەی نزار ئیدریسەوە کە هەمیشە بەقسەکانی خۆی سەرسامبوو، ئەم بەردەوام سارد و هێمن بوو، هەندێجار بە بوغز و هەندێجار بەغەمبارییەوە دەدوا، بەڵام بەردەوام جۆرە تورەبوونێکی نادیار لە چاویدا بوو، جۆرە هەڵچوونێک کە دەشیا لە هەر ساتێکدا دەربکەوێت و بتەقێتەوە. سەرم داخست و گووتم «لیڤیتانت ئەم یەکتر بینینەمان لەوی پسمامان ناچێت». «دونیا گۆڕاوە... دونیا زۆر گۆڕاوە». من گووتم «هەر کاتێکیش دونیا دەگۆڕێت، ئێمەش دەگۆڕێین. مرۆڤ ناچارە ڕەنگی دونیا بگرێت». ئینجا بە دەنگێکی کەمێک بەرز و گڕتر لە دەنگی سروشتی خۆی گووتی «سەرسامم پێت. ئەوەی بتەوێت بەوجۆرە بمکوژیت، کارێکی ئازایانە بوو. هەر کە یەکەمجار هاتیت بۆ پسمامان و ئەسپەکانت کوشت، هەستێکم هەبوو ڕۆژێک دێت هەوڵبدەیت منیش بکوژیت... دڵخۆشم ئەو کەسە دڵڕەقەت لێدەرچوو کە هەر لە یەکەمجارەوە ناسیمیت، گرنگ نییە بەرامبەر چی و بەرامبەر کێ دڵڕەقیت... هەمووی یارییە... ئەوەی لای من گرنگە ژیان وەک دڵڕەقی بەردەوام وەربگریت. کوشتن بەشێکە لە ئیشەکەمان، تۆ من بکوژیت یاخود من تۆ، گرنگ ئەوەیە خۆمان فریونەدەین. من و تۆ نە شۆڕشگێڕین و نە خیانەتکار، هەردووکمان لەو توخم و چیزەیەین دەمانەوێت تەسلیمی لاوازیی خۆمان نەبین. ڕێزم بۆ کەسی وەک تۆ هەیە، بەڵام ئێستا نۆبەتی منە، وەک هەموو یارییەکی تر تۆ زاری

خۆت هەڵدا، یاری خۆتت کرد، ئێستا نۆبە زاری منە... کاتی منە بتکوژم». لیڤیتانت لەوەدا لە سەر هەق بوو، من زاری خۆم هەڵدابوو بێئەوەی بگەمە جێگای مەبەست و ئێستا نۆبەتی ئەو بوو مۆرەی خۆی هەڵبدات. بە دەنگێکی وشک و نیوە خنکاوەوە گووتم «دڵنیایت کە من ویستوومە بتکوژم؟». بە مۆنییەوە سەیریکردم و گووتی «خۆت دەزانیت ئەمە یارییەکی قورسە، دەشزانیت چ هەڵەیەکی گەورەیە، لە ناسینی دوژمنەکەتدا تێبکەویت. خۆت ئەوە دەزانیت». من دەستم خستە سەر مێزەکەی بەردەمم و گووتم «تۆ پیاوێکی وریایت، دەزانیت بە کوشتن یان گرتنی من شتەکان تەواو نابن. من وەک هەڤاڵێکی کۆن پێتدەڵێم، دەبێت لەوە وریاتربیت بە کوشتنی من دەست پێبکەیت، چونکە دواتر شۆڕش لێتنابورێت. خۆت دەزانی هەموو شۆڕشێک لە سەرەتادا دڵڕەقە، تا دڵیشی نەرمدەبێت کاتێکی زۆری دەوێت». بە سەیرکردنێکەوە کە پڕبوو لە کینەی شاردراوە، گووتی «دەزانم». بە زەحمەت تفێکم قووتدا و گووتم «جەنابی لیڤیتانت، شۆڕش لە سەرەتادایە، لە سەرەتای شۆرشدا پاشەڕۆژی هەمووان نادیارە، لە سەرەتای شۆڕشدا هیچ کەس چارەنوسی خۆی نازانێت. منیش لە هەوڵی ئەوەدا نیم ببمە شەهید... پێمبڵێ چۆن بیرت لێکردۆتەوە، دڵنیام جگە لە گرتنی من شتێکی دیکە لە خەیاڵتدایە». هەستمکرد لیڤیتانت ناتوانێت ئەو کینەیە بشارێتەوە کە دڵۆپ دڵۆپ وەک عارەقی ڕەش لە نێوچاوانی دەهاتە خوارێ. بە ئەسپایی، بە دەنگی کەسێک باو بۆران و تاریکی جڵەوی ڕۆحی دەکەن، وەک کاپتنی کەشتییەک بزانێت ئاسمان و دەریا پێکەوە هەڕەشەی لێدەکەن و بە قینێکی بێسنوورەوە ناچارە یاری بە هەموو چارۆکەکان و سەوڵەکان و تەنافەکانی خۆی بکات، بە پەژموردەیی گووتی «نامەوێت دوژمنایەتی شۆڕش بکەم و شۆڕش دوژمنایەتیم بکات، دەمەوێت لەگەڵ شۆڕشدا بم، بەڵام خۆت دەزانیت، ئێستا ناتوانم چەکی دەوڵەت دابنێم

و بێمە ڕیزەوە. بۆ شۆڕشیش کارێکی ئاسان نییە من قەبووڵبکات، دڵنیام ئاسان بڕوام پێناکەن. ئەگەر شۆڕشیش بڕوام پێبکات خەڵک بڕوام پێناکەن. دەزانم لەوێ دەمکەنەوە بە پێشمەرگەیەکی ئاسایی، تفەنگێکم دەدەنێ و دەمخەنە مەفرەزەیەکەوە، هەوڵدەدەن زوو بە زوو لە شەڕێکدا بکوژرێم تا لە بیربچمەوە... شۆڕش و دەوڵەت دوو بەرداشن ژیانی من و تۆ بۆ ئەوان نرخی نییە. تۆش وامەبینە گەر بکوژرێیت، کەس بە ڕاستی بۆت بگری. هەڤاڵ وەفا، دەمەوێت تۆ یارمەتیمبدەیت، نە لە بەرئەوەی من و تۆ کۆنە دۆستین، بەڵکو لە بەرئەوەی من و تۆ لەیەکدەچین، بۆ ئەوەی هەردووکمان لە نێوان ئەم دوو بەرداشەدا بژین، هەم تۆ پێویستیت بە منە و هەم منیش پێویستیم بە تۆیە... دەتپارێزم و تۆش بمپارێزە. دەتکەم بە قەڵغان و بمکە بە قەڵغان، ئەو شتەت بۆ دەکەم کە شۆڕش دەیەوێت و تۆش ئەو شتەم بۆ بکە کە من دەمەوێت. لە بیرت نەچێت، من و تۆ دوو کەسی تەنیاین. خۆتت لێ نەگۆڕێت... من چەند وەختە لەم یارییەدام و دەزانم کوژران و لە ناوچوون زۆر ئاسانە. من ئەوە لە بیردەکەم کە ویستووتە بمکوژیت، وەک حەیوانێک سەیرم مەکە کە ناتوانم لەکەس ببورم، وانییە. گەر بزانم لێبوردن قازانجی زۆرترە، دەبوورم. تۆ خێڵ و عەشرەتت نییە و منیش نیمە، تۆ لای شۆڕش و من لای دەوڵەتم، هەردووکمان دوو سەر ڕووت و دوو دەم ڕووتین و هیچی تر». ئێستا دەنگی لە بری ڕق جۆرێک لە ترسی تێدابوو. چاوانی بە چاوانی گورگێکی دیل دەچوو، لەو نزیکانە سێبەری ترسێکی گەورەی بینیبێت. بە دڵگەرمییەوە گوتی «گەر یەکتر نەپارێزین دەمانهاڕن... شۆڕش و دەوڵەت دوو دەستاڕی گەورەن، بۆیە هاتووم بۆلات تا یەکتر بپارێزین. گرنگ ئەوەیە نەکەوینە ئەو جێگایەوە کە دوو بەردی دەستاڕەکە پێکەوە دەنیشنە سەر یەک و ئێسکی کەسانی وەک من و تۆ دەهاڕن... یارمەتیمبدە... شۆڕشیش خەڵکێکی هەیە کە

جێگای تۆ دەگرنەوە و دەوڵەتیش دەتوانێت کەسانی وەک من پەیدابکات. هەمووی یارییە، بەڵام یارییەکی ناخۆش و ترسناک. هێندەی هەڵەیەکی گەورەت کرد، ئیتر وەک یاری نامێنێتەوە، هەمووی دەبێت بەڕاست. گەر دەتەوێت بیکەینە ڕاست، دەبێت یەکێکمان لە پێشدا بمرێن و ئەوی تریشمان کەمێک دواتر. گەر تۆ بمکوژیت ئەوانەی دوای من دەتکوژن، گەر من تۆ بکوژم ئەوانەی دوای تۆ دەمکوژن. من نامەوێت بیکەمە ڕاست، دەمەوێت بژیم، بژیم و بەهێزبم».

ترسێکی گەورە لە سەر ڕوخساری هەردووکمان بوو.

ئەوە بوو لیڤیتانت... ئێستا بە ڕوونی دەمبینی. خۆپارێز، فێڵزان، جێگۆڕ، دەمامکچی، خێرا، دڵڕەق، خۆگونجێن، مۆن، بێخەندە، تاکتیکدار. وەک ئاژەڵێک بیەوێت نەزۆر جوان بێت، لە بەر جوانی بیگرن و کەوڵیبکەن، نە زۆر زیانبەخش بێت و لەبەر سامناکی ڕاوچیان بچنە دوای. لەو گیانەوەرانە بوو هەمەجۆر چزوویان هەیە، بۆ هەر مرۆڤە و جۆرە ژەهرێک بەکاردەهێنن، لە ژەهری کوشندەوە تا ژەهری مەستکەر، بۆ هەر سەردەمە و جۆرە چزوویەک بەکاردەهێنن لە چزووی کینەوە تا چزووی دڵنەوایی، لە چزووی شێتییەوە تا چزووی عەقڵ. لەوساتەدا ڕوونتر لە هەر کات دەمبینی، لەو ساتەدا دەیویست ڕوونتر لە هەر کات بیبینم، پێی شەرم نەبوو ڕووتی و لاوازی خۆی دەربخات، بەمەرجێک بەرامبەرەکەشی تێبگات ئەو دەتوانێت ڕووتی و لاوازی ئەو ببینێت. بۆ ئەوەی خۆی دەربخات و بیبینم، پێیگوتم کە ئەو ڕووتە و دەمبینێت. منیش پێمگووت کە من ڕووتم و دەیبینم.

لیڤیتانت دوای قسەکانی ئێستێک بێدەنگ بوو، تەواو گوێی شلکردبوو، وەک هاوارێکی کردبێت و بیەوێت دەنگدانەوەکەی ببیستێت.

«لیڤیتانت، من سەرسامم بە تۆ، نە لە بەرئەوەی لە یەکدەچین... تۆ دەڵێیت ئێمە لەیەک دەچین، لەوەدا من قسەیەکم نییە». نازانم بۆ

دەنگم نوسا و هەناسەم باش بۆ دەرنەهات، ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت هێشتا نەمدەزانی تەواو من چیم و چیم دەوێت، یان شتێکی تایبەت هەبوو لە ناوەوەڕا گەرووی دەگرتم و نەیدەهێشت بدوێم... شتێکی توند کە نەیدەویست شتگەلێک بڵێم کە نەدەبوو بیانڵێم. لیڤیتانت هەستیکرد من بە دەنگێکی نوساو و نیوە خنکاوەوە قسەدەکەم، دەیزانی دەنگی وەها لە قووڵایی دڵەوە نایەت و جێگای متمانە نییە. چەند جارێک گەروم پاککردەوە، کۆکیم، هەناسەم سافکرد و گووتم «لیڤیتانت، من سەرسامم بە تۆ لە بەرئەوەی هەمیشە شتێک دەکەیت کەس چاوەڕوانی ناکات. یاریکەری باش هەمیشە شتێک دەکات کە کەس چاوەڕوانی نییە. تۆ وەک هیچ کەسێکی تر هەڵوێست وەرناگریت، دڵنیام هەمیشە شتێک دەکەیت کە دۆست و دوژمنانت حیسابیان بۆ نەکردوە. ها، ئەوە شتێکی عەجایەبە لە تۆدا. نازانم بەڕاست هەمووی یارییە یان نا... بەڵام دەزانم بەشێکی زۆری یارییە، لە یاریدا مرۆڤ زۆر زۆرتر دەمرێت وەک لە ژیانی ڕاستەقینەدا... دەخۆیت و دەخورێیت... ئەمەم بخۆ ، ئەوەت دەخۆم... دەبێت تا سەر سنووری ژیان و مردن خۆت بڕەنجێنیت بۆ ئەوەی بیبەیتەوە. گوێبگرە لیڤیتانت.. گوێ .. بگگگ». لەویادا دووبارە دەنگم نوسایەوە، شتێکی قورس نیشتە سەر هەناسەم، وامهەستکرد تووشی هەناسەتوندییەکی ناکاو بووم، بەڵام خۆم کشاند و پەنجەرەکەم کردەوە و تێر هەوام هەڵمژی... لیڤیتانت بە وردی، بە چاوە تووڕە و مۆنەکانی، وەک سەیری مردوویەک بکات، تەماشایدەکردم. من قووڵ تا دوورترین جێگای سینەم هەوام ڕاکێشا و گووتم «ببورە لیڤیتانت وادیارە شەو سەرمامبووە» . هیچی نەگووت، بەو نیگا بێبزە و ئاڵۆزانەوە، بێدەنگ وەک گورگێک دەیڕوانی. «من هەموو ئەوەم قەبووڵە کە تۆ گووتت، بەڵام من شۆڕش نیم، من نازانم چۆن تۆ بپارێزم، نامەوێت درۆت لەگەڵدا بکەم. گەر دەتەوێت بمگریت، بمگرە... بۆ نا؟. دڵم بەرامبەرت ڕەش نابێت،

لەوانەیە چۆلەکەیەکی نێو دەست لە سەدی سەر دار چاکتر بێت. بمگرە لیڤیتانت... بمگرە. نێچیرێکی مسۆگەر لە هیچ باشترە ». بە کینەیەکی قووڵەوە گووتی «نامەوێت بتگرم... دەمەوێت پەیامەکەم بگەێنیت بە شۆڕش. دڵنیام تۆ دەزانیت دەڵێم چی و بە وردی ئیشی بۆ دەکەیت».
سەیرمکرد و بە هەمان گەرووی نوساوەوە گووتم « لیڤیتانت گەر ئەوە دوا نیازتە، من دەیگەێنم، دڵنیابە دەیگەێنم، بەڵام نازانم شۆڕش چی دەڵێت... نازانم؟ تۆ دواجار پیاوێکی گەورەی ناو دەوڵەتیت. ئاخۆ شۆڕش شتی وا قەبووڵدەکات نازانم». چاوی لیڤیتانت بریسکەیەکی قووڵ و نائاسایی تێدابوو، وەک دڵنیابێت لەوەی گووتوێتی، یەکە یەکە بە ئارامییەوە، بە سەبری پیاوێکەوە دەیەوێت تا ئەوسەری ئەوسەر هەموو ڕێگاکەی پێش دەمی بڕوات، بە هێمنی دانی بە پیتەکان و وشەکان و ڕستەکاندا دەنا، نەیدەویست جوان بدوێت، بەڵکو دەیویست جوان تێبگەم و جوان تێبگات. «من دەزانم شۆڕش چی دەڵێت. شۆڕش چ سوودێک لە مردنی من دەبینێت؟. گەر بمکوژن، دوای هەفتەیەک هەموو دونیا منی بیردەچێتەوە، هەموو دونیا... چی دەبم جگە لە خیانەتکارێکی کوژراو؟ چی دەبم جگە لە قالۆنچەیەک کە یەکێکی دی پێی پێداناوە؟ نە من ئاسەوارێکم دەمێنێت و نە ئەوان بەرهەمێکیان دەبێت. هیچ کەس منی یاد نامێنێت تا ئەوەیان یاد بێت چ قارەمانێک منی کوشتووە. بەڵام بەزیندوویی، لەناو ئەو ئەمنە عەرەبانەدا سوودم هەیە... شۆڕش دەبێت مێشکی هەبێت... دەبێت مێشکی هەبێت». هەستمکرد چاوانی خەریکن لە پەستیدا سووردەبن. من نەمدەزانی ئایا شۆڕش مێشکی هەیە یان نا، گەر هەشیبێت ئاخۆ دەتوانێت بەکاریبهێنێت و بیری پێبکاتەوە؟.

ئەو ڕۆژە کە هەستا، بێئەوەی خودا حافیزیبکات، گووتی «دە ڕۆژی تر دێمەوە. دەزانم پێویستیان بە من دەبێت. من لە ناخمدا نە نیشتیمانپەروەرم و نە خائین... هیچیان نیم، دەمەوێت بژیم».

من لەبەر دەرگاکە وەستاندم و گووتم «لیڤیتانت، کێ بە تۆی گووت کە ویستوومە تۆ بکوژم... کێ؟ چۆنت زانی؟»، نێوچاوانی گرژکرد و گووتی «ئەوانەی لە سەرەوە تۆیان خۆشناوێت، ئەوانەی دەیانەوێت کۆنترۆڵی ڕێکخراوەکانی شار لە دەستی تۆ و دۆستەکانت دەربهێنن... شۆڕشگێڕەکانی هاوڕێت، ئەوانەی گەر ئاگات لە خۆت نەبێت، بە تووکەوە دەرخواردی ئەمنە عەرەبەکانت دەدەن».

لەو ساتەدا لە جێگای خۆم وەستام و خەریکبوو بگریم... یەکێک... یەکێک لە ئەنجومەنی باڵا ویستبووی من بداتە گرت، ویستبووی دەرخواردی دەوڵەتم بدات. موچڕکێکی سارد لە تەوقی سەرمەوە تا بەری پێم تێپەڕی... لەو ساتەوە لە ڕاستییەکی ترسناک تێگەیشتم، ڕاستییەک هەموو ژیانم لە بەرچاوم دەبێت: شۆڕشگێڕەکان هەر چییەک بن، هەر چۆنێک بن، مەحکومن بەوەی بەردەوام یەکتر بخۆن.

# دەرکەوتنەوەی مەهدائیلی فریشتە

ئەو ساڵەی مەهدائیلی تێدا دەرکەوتەوە، لە ساڵ و سەردەمە هەرە دژوارەکانی ژیانی بولبولیار بوو. ئەوکات شەڕی عێراق ـ ئێران لە ترۆپکی ساڵانی خوێناوی خۆیدا بوو. مەهدائیل ماوەیەکی درێژبوو ونبووبوو، بە جۆرێک بولبولیاری دۆستمان دەستی لەوە شتبوو جارێکی تر ئەم مەخلوقە سەیرە ببینێتەوە کە تەواو ڕوون نەبوو ئاخۆ سەر بە زەمین یان سەر بە ئاسمانە. لە ساڵانی جەنگدا بولبولیار «کە چەند ساڵێک بوو زانکۆی جێهێشتبوو»، وەک سەربازێکی هەڵهاتوو، وەک شۆڕشگێڕێکی تاقانە، وەک یاخییەک کە لە شار و لادێ عاسییە «وەک کەسێک کە نە لای گرووپە چەپەکان، نە لای دەوڵەت، نە لای شۆڕش

پشت و پەنای نییە» لە ژێر ناوی جیاواز، بە شوناسی جیاواز، لە شوێنی جیاوازدا دەژیا. سەرسام مەبن گەر پێتانبڵێم، بولبولیار چۆن و لە کوێ مەهدائیلی فریشتەی بینییەوە کە دەمێ ساڵ بوو، نیشانە و شوێنەواری نەبوو. ئێوارەیەکی فێنکی هاوین بوو بولبولیار بە کار و ڕاسپاردەیەکی بچوک لە دووی دکتۆر مستەفا شوکاک بوو، دەبوو بگەڕێت و بیدۆزێتەوە. ئەو کات شوکاک کرابووەوە سەرباز و لە خەستەخانەی نێو پایگای شار دکتۆری سوپا بوو، هەڵبەت دوای ئەوەی چەند وەرزێکی درێژ و دۆزەخینی لە بەرەکانی باشووری خۆرهەڵاتدا بینیبوو. بولبولیار ئەو ئێوارەیە خۆی کرد بە یانەی پزیشکاندا و لەوێ دوای ئەو هەموو ساڵە مەهدائیلی فریشتەی لە سەر مێزەکەی دکتۆر موستەفا شوکاک بینییەوە، هەر دووکیان مەستبوون و بە دەنگێکی غەمگین و گریاو قسەیان بۆ یەک دەکرد. دەبێت بڵێم ئەم یانەی پزیشکانە لە هەموو سەردەمەکاندا جێگایەکی سەیرە، لە شوێنێک دەچێت پەیوەندی بە سەر زەوییەوە نەبێت، پەیوەندی بە دونیای دەورووبەرییەوە نەبێت، هەر کە دەچیتە ناوی و پزیشکەکان دەبینیت، سەرقاڵی خواردنەوە و یاریکردنن، وا هەستدەکەیت پێتخستۆتە سەر سەرزەمینێکی تر. ئەو ڕۆژە هێندەی بولبولیار لە مێزەکەیان نزیکبووەوە گوێی لێبوو مستەفا شوکاک بە مەستی لە مەهدائیلی دەپرسی «پێمبڵێ، جەنابی مەهدائیلی فریشتە، پێمبڵێ... بۆ شمشاڵژەنەکان لە تیپی مۆسیقای ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغداد هەموو کوێرن؟». مەهدائیل، کە ئاشکرا ئەویش مەستبوو، گووتی «لەبەر ئەوەی شمشاڵژەنین پێویستی بە چاو نییە». بولبولیار بە هێمنی لە سەر کورسی سێهەمی دەوری مێزە خرەکە دانیشت و بێئەوەی سڵاوبکات، یان هەستبکات ئەوان دەیبینن یاخود بایەخێکی تایبەتی بە بوونی دەدەن، لە قسە بەردەوامبوون. «ئۆکێی. مستەر مەهدائیل، مۆسیقار پێویستی بەچاو نییە، پێویستی بە گوێ، بە دەست

و پەنجە و لێو و ئەو شتانەی تر هەیە، لەوەدا تەباین. لە سەر ئەوە شەڕناکەین. بەڵام مەڵێ کە مۆسیقار پێویستی بە بینینیش نییە. ئەگەر تۆ لەگەڵمدا بیت، بینین و چاو دوو شتی وەک یەک نین». مەهدائیل کە لە هەر دوو جارەکەی تر سپیتر و ڕوونتر دەینواند، گووتی «بینین و چاو دوو شتی وەک یەک نین، گرنگترین شتەکان ئەوانەن کە بەچاو نابینرێن. زۆربەی شتە گرنگەکان بە هاوکاری هەموو هەستەکان و عەقڵ دەبینرێن، لەوانەیە غەریزەش ڕۆڵێکی هەبێت. بەڵام بە گشتی چاو دوژمنی ئەو جۆرە بینینانەیە، چاو زاڵمترین هەستەوەرە، زاڵمترینە، چونکە لە هەموو هەستەکانی تر پتر مرۆڤ دەخاتە هەڵەوە».

«ئاه مەهدائیلی فریشتە، ڕاستییەکەی، هەندێجار واهەستدەکەم تۆ کۆن قەشە، یان مەلا یان حاخام یان شتێکی لەوجۆرە بوویت. پیاوانی مەزهەبی لەوەدا بەشدارن گومان لە چاو دەکەن. هۆکەشی ئەوەیە کە خودا بە چاو نابینرێت... خودا بە چاو نابینرێت... گەر خودا بەچاو ببینرایە، ئینسان پێویستی بە هیچ هەستێکی دیکەی نەدەبوو» مستەفا شوکاک وایگووت و وەک کەسێکی تێکشکاو، وەک پیاوێک لەو چەند ساڵەی ڕابوردوودا ژیان وەک «وەک دەنکێک گەنم » هارپیوێتی، پاڵیدایەوە و لە شێوەی پیاوێکدا کە هەم لە ئازار و هەم لە شەراب تێربووە سەیری پەرداخە خاڵییەکەی بەردەمی کرد و بە هێمنی ئەودیوە و دیوی کرد.

«باشە دکتۆر». مەهدائیل خەندەیەکی مەستانەی گرت و جگەرەیەکی داگیرسان و سەیری دکتۆری کرد «بەڵام ئێوەش مەعشەری زانستخوازان، ئەهلی زانست، زیاد لە پێویست باوەڕتان بە چاوە. ئێمە خەڵکی سەر زەوی بێ هەقیقەت ناژین، من دەبێت بزانم کە ئەمە کورسییە، ئەمە مێزە، ئەمە شەرابە، تۆ دکتۆر مستەفا شوکاکی... ئەمە و چەندەها شتی تر. بەڵام کەسی نابینا هیچ یەک لەم شتانە نابینێت، هیچ یەک،

بەڵام دەتوانێت وەک من بزانێت و دەرکیان پێبکات. وەک چۆن گوێ بۆ ئەوە دروست نەبووە هەموو شتێک ببیستێت، چاویش بۆ ئەوە نەخولقاوە هەموو شتێک ببینێت. ئەوە تەنیا خودا نییە کە بەچاو نابینرێت، مرۆڤ زۆر جار نزیکترین شتی خۆشی بە چاو نابینێت. شمشاڵژەنەکانی تیپی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی بەغداد بۆیە نابینان، چونکە لە ڕۆحدا جۆرە چاوێکی پەنهانیان هەیە. شمشاڵژەنی ڕاستەقینە، عاریفی ڕاستەقینە، شاعیری ڕاستەقینە، پێویستیان بە چاو نییە. مرۆڤ بە زۆر شتی دی و بەزۆر شێوەی دی دەتوانێت ببینێت. بۆ نمونە، هەموو ئەوانەی تەنیا بەچاو دەبینن، ناتوانن و لە هێزیاندا نییە باڵەکانی من ببینن... باڵەکانی من و باڵی هەر کەسێکی باڵداری دیش».

مستەفا شوکاک، وەک سەیری ئەستێرەیەکی دوور بکات گووتی «لەوەدا لە سەر هەقی، چاو بەشێکی بچوکی دونیا دەبینێت. ئێمەی دکتۆر تەنیا برین و گۆشتی زیاد و هەوکردنەکان دەبینین، بەڵام ئازار... ئازار کە جەوهەری نەخۆشییە ئەوە نابینین. هیچ پزیشکێک ئازار نابینێت. خودی ئازار چییە؟ پزیشکان تەفسیری خۆیان هەیە، بەڵام ئەو تەفسیرە بە من ناڵێت ئازار چییە. ئەوەی بڵێیت ئازار ئاماژەیەکە لە جێگایەکی بریندارەوە بەرەو مێشک دەڕوات و دەگەڕێتەوە... ئەوە بە من ناڵێت ئازار چییە، چونکە توندترین و ترسناکترین ئازارەکان ئەوانەن کە نازانین لە کوێوە دێن. نە برین و نەجێگا و نەسەرچاوەی نییە. هیچ پزیشیکێ ئەوە هەست پێ ناکات کە نەخۆشەکان هەستی پێدەکەن... لەوەدا لە سەر هەقی، وەک چۆن مۆسیقارەکان ئاواز نابینن، ئێمەش ئازار نابینین. من کاتی خۆی گومانم لە تۆ هەبوو، گومانی گەورەم لە تۆو هەموو فریشتەکان هەبوو. بەڵام شەوێک بە خۆمم گووت : دکتۆر مستەفا شوکاکی لە خۆبایی، پیاوی مەغروور و هیچنەزان... وادەزانیت کە فێربوویت هەندێک دەرمان بنوسیت و هەندێک ئازار سووکبکەیت و هەندێ

پارچە لە لەشی مرۆڤ ببڕیت، ئیتر لە نهێنی مرۆڤ تێگەیشتوویت... ها، ئەی پیاوی بێمێشک، هەی عەقڵی بەدبەخت و دەردەدار. بۆ باوەڕ بە خۆشەویستی دەکەیت لە خۆتدا، خۆ تۆ خۆشەویستی بەچاو نابینیت، بۆ باوەڕ بە ئازار دەکەیت، کە ژنەکەت خیانەتی لێکردی ئەو ئازارە دوورودرێژ و گەورەیەت هەبوو، ئەوکات هیچ ئۆرگانێکت نەخۆش نەبوو، هیچ پارچەیەک لە جگەرت هەوی نەکردبوو، برینێک لە سەر لەشت نەبوو، بەڵام ئازارێک دەیهەژاندی بڕانەوەی نەبوو... ئیدی بۆ دەبێت فریشتەیەکی نەبینراویش لە ناوتدا نەبێت... بۆ دەبێت نەبێت... وەک چۆن ئازار هەیە، وەک چۆن مۆسیقا هەیە... بۆ دەیان و دەیان شتی نادیاری دیش بوونیان نەبێت؟».

لەو کاتەدا هەردووکیان پێکەوە سەرنجی بولبولیاریاندا کە بە سەرسامی گوێی دەگرت. لەو کاتەوە دانیشتبوو و ئەوان نەیاندەبینی.

مەهدائیلی فریشتە وەک هاوڕێیەکی دێرینی ببینێت بە جۆشێکی بێهاوتاوە هەستا و لە خۆشیدا هاواریکرد «ئۆوو، ئاغای عەزیز... ئۆووو. چ بەختێکی باشم هەیە ئەمشەو... مامی مامی لە مێژە تۆم نەبینیوە... خالق، چەندین ساڵە، زیاد لە چەندین ساڵە. سوێنددەخۆم ناوەکەتم بیرچۆتەوە. عەفوومکە ئەم چەند ساڵە ساڵی ئاسایی نەبوون، شەڕ، برا کوژی، کاولکاریی... وەک یەکێک بەرپرسم لە کاروباری فریشتەکان، کارێکی زۆرم بووە، زۆر... وای تۆ لە کوێ بوویت، لە کوێ؟»

مەهدائیل باوەشێکی گەرمی بە بولبولیاردا کرد و بۆ ئێستێک لە ئامێزی گرت. کە دانیشتنەوە وەک شەرم لەو هەموو یەکتر نەبینینە درێژە بکات گووتی «ببورە، من لە هەموو ژەنراڵەکانی سوپا و سەرکردەکانی شۆڕش کارم زۆرتر بووە. دەزانم چونکە ئێستاش بە مەستی لەم سەر مێزە دەمبینیت، دەڵێیت دووبارە درۆی گەورەم بۆ

دەکات، دووبـارە دەکەویتـە دوودڵییـەوە لـەوەی ئاخـۆ مـن فریشـتـەم یـان نـا. گـەر بڕواش بهێنیـت دەڵێیـت چ فریشـتـەیەکی فاسـید و درۆزن و خـوو خراپیـت، خەریکـی مەسـتی و کاری پڕوپوچیـت، دڵنیـام وادەڵێیـت... بـەڵام خۆشـحاڵم، بەگـم تابڵێـی خۆشـحاڵم... نـا مەپرسـە، مەپرسـە کـە دوای ئـەو هەمـوو سـاڵە دەتبینـم چ کامەرانـم». مەهدائیـل وەک دۆسـتێکی زۆر خۆشەویسـت و ونبـووی دۆزیبێتـەوە پەیتاپەیتـا باوەشـی پیادەکـرد و قسـەیدەکرد. بولبولیـار دەسـتی درێژکـرد و تەوقەیەکی هێمنـی لەگـەڵ دکتـۆر مسـتەفا شـوکاکدا کـرد و گووتـی «مـن هۆشـەنگی بولبولیـارم... ئەگـەر یـادت بێـت و ناوەکەمـت یـاد مابێـت، ماوەیـەک لەوەوبـەر یەکەمجـار ئێـوەم بینـی، کاتێـک دیوانەکـەی خانمـی ماردینیـم بـۆ هێنـان. ئـەوە مـن بـووم، کـە دیوانەکـەی ئـەوم بـۆ هێنـان، ئێسـتاش بـە ئیشـێکی تایبەتـی لـە دووی ئێـوە دەگەڕێـم». مەهدائیلـی دەسـتێکی کێشـا بەپشـتیدا و گووتـی «دروسـتە، خۆیەتـی... بولبولیـار... تێناگـەم چـۆن نـاوی وەهـام یاددەچێتـەوە، بـەڵام بـاوەڕت بێـت ئـەم چەنـد سـاڵە بـە جۆرێـک کارم زۆربـووە، زۆرجـار نـاوی خۆشـم بیرچۆتـەوە. پێمبڵـێ چـی شـتێک بـەم شـەوە تـۆی هێنـاوە بـۆ یانـەی پزیشـکان، چـی شـتێک؟؟».

بولبولیـار وەک ئیشـێکی گرنگـی هەبووبێـت، ویسـتبێتی دەمودەسـت جێبەجێیبـکات و بـڕوات، بـەڵام دیمەنێکـی نـاوازە و دەرەخەیـاڵ ڕایگرتبێـت، کەمێـک دامـا و گووتـی «هاتـووم دکتـۆر مسـتەفا شـوکاک ببینـم، بـە کارێکـی تایبـەت.. زۆر تایبـەت. بـەڵام مەهدائیلـی فریشـتە، تـۆ چـی دەکەیـت لێـرە، چـۆن ئێـوە یـەک دەناسـن؟». مەهدائیـل چاوێکـی لـە دکتـۆر داگـرت و بـە جیدییەتێکـەوە کـە لەگـەڵ ڕوخسـاری پێشـوویدا نەدەگونجـا گووتـی «مـن و دکتـۆر بـە یەکـەوە ئیشـدەکەین. دکتـۆر یاریـدەدەری منـە، ئەویـش وەک تـۆ دەتوانێـت فریشـتەکان ببینێـت». بولبولیـار کەمێـک سـەرسـامبوو، بـەڵام کـە سـەیری ڕوخسـاری جـوان و منداڵانـەی دکتـۆری کـرد، پێـی سـەیرنەبوو لـە

توخمی فریشتان بێت، بولبولیار زۆر ماندوو بوو، دەمێ ساڵ بوو بۆ مەهدائیل دەگەڕا، ئێستا لە ناکاو ئەوی لێرەدا دەبینییەوە، بە جۆرێک شتەکان ئازاریاندەدا خۆی نەگرت و گووتی «دکتۆر کەواتە من و تۆ دەبێت یەکتر ببینین، دەبێت قسەبکەین... من تێناگەم، من ئازارم زۆرە، من خەڵکانێکی زۆر دەبینم باڵیان هەیە، فریشتەن و خۆیان پێی نازانن، زۆربەیان باڵەکانی خۆیان نابینن. من ئازارم زۆرە... ئازارم زۆر زۆرە. مەهدائیلی فریشتە، بەڕێز مەهدائیلی فریشتە... من زۆر لە مێژە بۆ تۆ دەگەڕێم، چەندین ساڵە، لە چواردەوری خۆم کەسانێک دەبینم کە باڵیان هەیە، بەڵام لە هیچ تێناگەم، وەک شێتێکم لێهاتووە کە هەموو شتەکان بە وڕێنە و خەیاڵ دەزانم، گومانم لە سەلامەتی عەقڵی خۆم و لە توانای بینینم هەیە. بینینی ئەو مرۆڤە باڵدارانە ژیانی کردوم بە دۆزەخ. ئەمشەو چاوەڕێ نەبووم تۆ ببینم... نا بەڕێز مەهدائیلی فریشتە چاوەڕێ نەبووم تۆ ببینم. بەڵام هەستدەکەم بەختەوەرم، هەستدەکەم خۆشبەختم». بولبولیار دۆخێکی دەرونی سەیر دایگرتبوو، وەک یەکێک دوای ڕۆیشتنێکی درێژ بە تونێلێکی تاریکدا، دووبارە تیشکێکی لێدەرکەوتبێت، ڕۆحی بە گەرمییەکی لە ناکاو و ڕوخساری بە شادییەکی کتوپڕ داگیرسابوو. مەهدائیل دەستی خستە سەر ڕوومەتی و گووتی «عەزیزم بولبولیار، تۆ زۆر گەرمیت، تۆ داغان بوویت. ئەوەی وەها ئازارێکی زۆرت چەشتووە، پەیوەندی بە دڵتەوە هەیە. من وادەزانم دکتۆر شوکاکیش هەمان ئازاری هەبووە، هەمان ئازاری درێژ خایەن، وانییە دکتۆر؟».

دکتۆر شوکاک هەموو دوو دەقیقەیەک پێکێک عارەقی تێدەکرد و لەگەڵ ئاوێکی کەمدا هەڵیدەدا، هەموو جارێک بەرلەوەی عارەقەکە بگاتە سەر لێوی چاوی دەنوقاند و تا دوا تنۆکیشی نەگەیشتبایەتە ئەودیو

گەرووی چاوی نەدەکردەوە. دکتۆر گووتی «ئا... برا گیان، وایە. لە سەرەتاوە دیمەنی ئەو باڵانە مرۆڤ شێتدەکات. گەر مەهدائیلی فریشتە نەبایە، من شێتدەبووم. تێدەگەم. مەڵێ تۆ دکتۆریت و لە من زیرەکتریت، لە مەسەلەی غەیبیاتدا ئێمەش وەک بێسەوادەکان واین، لە بێسەوادەکان بەدترین. بێسەوادەکان دەتوانن تەفسیری ئەفسانەیی و خورافاتی بۆ بکەن، بەڵام بۆ من... باوەڕهێنان بە هەموو تەفسیرێکی خورافی، تەفسیرێک کە زانست قەبووڵی نەکات سەخت بوو. دواجار من دکتۆر بووم، مرۆڤ لای من پارچەیەک گۆشتە، شتێکە وەک هەر مەکینەیەکی تر کە بە یاسای زانستی ئیشدەکات. مەکینەیەک لە سەر کۆمەڵێک یاسای مادیی دەجوڵێتەوە. مەکینەیەک سەدان جار لە بەردەستمدا لە کارکەوتووە و خستوومەتەوە ئیش. بەڵام کاتێک نەغەدە ڕۆیشت، تۆ نەغەدە دەناسیت؟ وازبهێنە... گرنگ نییە بیناسیت یاخود نا. کاتێک ئەو ڕۆیشت، لە ناخمدا شتێک گۆڕا... کە نەغەدە ڕۆیشت زانیم لە ناو ئەو مەکینە مەلعونەدا کە ناوی مرۆڤە، جێگا و سوچ و شوێنی وا تاریک هەیە بە من نادۆزرێنەوە. ئینسان مەکینەیەکی زۆر گەورەیە، مەکینەیەکی مەلعون و ئاڵۆزی گەورەیە... ڕقم لەوەیە کە دروستیکردوە».

کەمێک وەستا، غەمێکی زۆر گەورە لە چاویدا بوو، وەک بیەوێت بگری و دواتر بە سەر هەستەکانیدا زاڵ بێت بە شتێک لە تووڕەییەوە گووتی «ئەوەی دروستیکردوە ویستوویێتی شتێکی موعجیزەئاسا دروستبکات، گووتوویێتی: هێی بابزانم شتێکم بۆ دروستدەکرێت جیاواز لە سەگ، لە حوشتر، لە ماسی؟ هەموو هونەری خۆی خستۆتەکار، بەڵام چی کردوە، چی؟ هیچ... باوەڕت بێت هیچ. مرۆڤ کاڵای کارخانەیەکی بەدە... هاهاها... هاها»

پێکەنینەکەی زۆر غەمگین بوو.

«هاها... لەشی چاکدەکەیت عەقڵی تێکدەچێت، عەقڵی چاکدەکەیت

دەرونی خراپ دەبێت، دەرونی هێوردەکەیتەوە ڕۆحی دەژاکێت، ڕۆحی تیماردەکەیت، ئازار لە جێگایەکی ترەوە سەر هەڵدەدات. ئەوەی ئینسانی دروستکردوە ویستویێتی شتێک دروستبکات لە بوونەوەرەکانی تر گرنگتر، بەڵام نەیتوانیوە. ئینسان نیشانەی ئەو سنوورەیە کە خودا دەیگاتێت، نیشانەی ئەوەیە کە قودرەتی ئیلاهی ڕەها نییە، کە قودرەتی ئیلاهی دەشێت بچێتە ئیشێکەوە و نەتوانێت تەواویبکات، ئینسان ئیشێکە لە ئیشە هەرە خراپ و ناتەواوەکانی خودا. گوڵێکی ئەم باغە لە هەموومان تەواوتر و دڵنیاتر و پێرفێکتترە. بەڵام ئینسان ئەم مەخلوقە حیزە ترسنۆکە ناوێرێت سەر بەرزبکاتەوە بڵێت: خودایە من هەڵەیەکم لە هەڵەکانی تۆ. ئەم مەخلوقە حیزە ترسنۆکە بێغیرەتە مەلعونە کە من بەردەوام دەستم لە خوێن و گۆشت و پیسییەکەیدایە، ناوێرێت بڵێت: هێی مەقاماتی باڵا ئێوە درەختێکتان لە من باشتر دروستکردوە، کوللەیەکتان لە من باشتر دروستکردوە، ئیتر چاوەڕێی چیین. ئاه گەر جەنابی داروین بگرم... ئاه ئەگەر بیگرم و شەقێک لەو قوونە حیزەی هەڵبدەم و پێیبڵێم: هەموو شتەکان پێچەوانەی ئەوەن کە تۆ بینیووتە. ئینسان... ئەم بوونەوەرە حیزە مەلعونە، یەکەمین ئیشی خودایە... سەیری لاوازی بکە، سەیری هیچی بکە، سەیری بێئەخلاقی بکە. دوای ئینسان خودا هیچ مەخلوقێکی بێئەخلاقی تری دروست نەکردۆتەوە. ئەمە یەکەم ئەزموونی مەقامی باڵایە... ڕاست نییە ئەم بوونەوەرە بەدڕەوشتە، دوا بەرهەمی خودا یان سروشت یان نازانم چی بێت... ڕاست نییە. سوێند دەخۆم هەمووی پێچەوانەیە، مرۆڤ یەکەم شتە، دوا شتیش و پێرفێکترین شتی خوداش، ئەو ئەمیبا میکرۆسکۆبییە بچوکانەن کە پێرفێکتن... کە ژیانن لە سافترین شێوەدا، ژیانن بێ هیچ بارێک، ژیانی ڕووتن و جگە لە ژیان ناوی تر و ئیشی تریان نییە. ئینسان تاکە حەیوانێکی زیندووە کە ناژی، هەزاران وەزیفە و ئیشی کەوتۆتە ئەستۆ کە هیچیان ژیان نین...

وەک مێروولە کە نازین، وەک هەنگ کە تەنیا ئیشدەکەن، ئیشدەکەن و هیچی تر. گوێبگرە برادەر گیان، ژیانی راستەقینە ئەوەیە کە لە ژیان زیاتر وەزیفەی ترمان نەبێت. بەڵام ئینسان ئەم مەخلوقێکی هەڵوەشاوە، سووک و سادە مەخلوقێکی هەڵەیە... وەک ئەوەی من ئەم شوشەیە دروستبکەم و هەزار کونی تێدا بێت و بمەوێت پڕیبکەم لە ئاو و نیازم بێت لە تینوێتیدا بیخۆمەوە. ئینسان ئەو شوشە حیزە کون کونەیە. ئەوەی دروستیکردوە دەسەڵاتی بە سەر پێکهاتەیدا نەماوە، وەک چۆن لە لابۆرێکدا تۆ کۆمەڵێک شت تێکەڵدەکەیت و دوایی کارلێکی مادەکانت بۆ ناگیرێتەوە، تا دەگاتە شوێنێک ئەو کارلێکانە خۆیان سەربەخۆ ئیشدەکەن. ئا عەزیزم، من و تۆ لە لابۆرێکی بێفەڕەوە دەرچووین. ئەوەی ئینسانی دروستکردوە زانایەکی بلیمەت نەبووە... ئەوە بلیمەتی نییە مەخلوقێکی لاواز و بچوک و بێهێز دروستبکەیت و بە تۆپەڵ خەون و وشە و خەیاڵات و نیازی بئاخنیتە ناو، ئەوە بلیمەتی نییە. ئەوە گاڵتەجاڕییە بە بوون، ئینسان یان لە دەستکردی هێزێکی نەزانە یان لە دەستکردی هێزێکی گاڵتەجاڕە کە گاڵتەی بە هەموو ئەم گەردونە دێت و لاقرتی خۆی لە ئینساندا کۆکردۆتەوە... ئاە... ئینسان؟... عەزیزم مەڵێ شەڕ و زرمەی تۆپخانەکانی ئێران مێشکی دکتۆریان پوچکردوە، مەڵێ داخی ژنە حیزەکەی عەقڵی لەدەستداوە... گەر واشبێت... هەتا گەر واش بێت، ئەوە هیچ لەوە ناگۆڕێت کە مرۆڤ نوکتەیەکی ناخۆشە ئەم دونیایە بۆ خۆی دەگێڕێتەوە».

چاوانی گێژبووبوون، بەو چاوە وڕ و پڕ خەیاڵەوە، ڕوویکردە مەهدائیل و گووتی «ها مەهدائیلی فریشتە دەتەوێت چی بۆ مۆشەنگی بولبولیار باسبکەم، ئازارەکانم... ئازارەکانی دکتۆرێکی ژن حیز... گوێبگرە ئەوەی ئینسانی دروستکردوە دەتوانێت دۆزەخیش دروستبکات، بەڵام ئەوەی

ئینسانی دروستکردوە ناتوانێت بەهەشت دروستبکات، ئینسان لەدەستکردی هێزێکی شەڕانییە، ئەوەی ئینسانی دروستکردوە تەنیا دەتوانێت ئازار دروستبکات. بەهەشت خەونی ئێمە نییە، تێدەگەیت بە هەشت خەونی ئەوە، ئەو شتەیە کە ویستوویێتی دروستیبکات و بۆی نەکراوە. دوایی گووتوویێتی : زۆرچاکە، من خەونی ئەم بەهەشتە نامومکینە دەبەخشم بەم مەخلوقە بێمێشکە، بزانم چی لێدەکات. بەهەشت لەو هێڵە بەناوبانگە دەچێت کە دکتۆرێک لە شێتخانەیەکدا، لە سەر زەوییەکی کۆنکرێت بۆ شێتەکانی دەکێشێت و پێیاندەڵێت: ئەوەی بە ژێر ئەو هێڵەدا بڕوات، ئازادیدەکەم. ئێمە هەموومان ئەو شێتەین کە بە هەموو هێزی خۆمان سەر دەکێشین بە کۆنکرێتەکەدا بۆ ئەوەی بچینە ژێر ئەو هێڵەوە و ئازاد بین. هەموومان لەو شێتخانەیەداین... چەندە شێتەکان دەتوانن بە ژێر ئەو هێڵەدا بڕۆن، ئێمەش ئەوەندە دەتوانین، ئەوەندە و زیاتر نا. ئێمە هەر ئەوەندە لە ژێر ئەو هێڵەی خوداوە دەگەینە بەهەشت. ئەم ئەستێرەی من و تۆ... ئەم ئەستێرە لەرزۆکەی من و تۆ کە ملیارێک ساڵە هێشتا خاکەکەشی خۆی باش نەگرتووە، دوا هونەری ئەو هێزەیە... دوا توانایەتی. ئەوەی ئەم زەمینە و ئەم دونیایەی دروستکردوە هێزێکی گەورەی لە بەردەستدا بووە، نەیتوانیوە ڕێکیبخات... مێشوولەی دروستکردوە تەنیا چەند کورتەساتێک دەژی و کیسەڵی دروستکردوە گێژ لە قاوغێکی ڕەقدا، سێ سەد ساڵ لە بێدەنگی و بۆشاییەکی پوچدا دەمێنێتەوە. تەنیا هێزێکی شەڕانی دەتوانێت وابکات... تەنیا هێزێکی شەڕانی کاری وای لە دەستدێت، منداڵی ساوا تووشی شێرپەنجەی خوێن دەکات و کیسەڵێکی بەستەزمانیش سێ سەد ساڵ لە قاوغەی بێدەنگییەکی ئەبەدیدا دەبەستێتەوە... تەنیا هێزێکی زۆر شەڕانی».

دکتۆر بە جۆرێکی سەیر تێکچووبوو، دەنگی سەرنجی هەندێک لە مەیگێڕەکانی ڕاکێشا، بە خاوی دەستی کێشا بە مێزەکەدا و وەک یەکێک

مەستی خەریک بێت پەکیبخات بەردەوام بوو «تۆ وادەزانی ئێمە لە کوێ دەژین... باپێت بڵێم ئەم ئەستێرەیە بەهەشتە، ئەمە ئەوپەڕی ئەوپەڕی جوانییە کە بشێت لە دەستی ئەو هێزە بەربێتەوە. ئا مەهدائیلی فریشتە... من و تۆ لە بەهەشتداین... ئەم دۆزەخە داغانەی من و تۆ، بەهەشتە.. نە لەمدیوی گەردون و نە لەودیوییەوە لێرە باشتری تێدا نییە. ئەو هێزەی ئینسانی بەم هەموو ئازارەوە دروستکردوە بەهەشتی لەمە باشتری بۆ دروست ناکرێت. سەیرمکە، چەند ساڵ لە مەوبەر من ئەم پیاوە نەبووم، ئەم مەلعونە نەبووم. بەس ئێستا دکتۆرێکی بەدبەختی ژن حیزم کە نازانم تۆ کێیت، مەهدائیل کێیە، ئەم دکتۆرانەی دەوروبەرم کێن... وادەزانی ئێمە عاقڵین. هۆشەنگ، من و تۆ کە ئەم فریشتانە دەبینین، شێتین... بابزانیت شێتین... تەنیا هەندێ شێت کە فەنتازیایان لە سەروو فەنتازیای شێتەکانی ترەوەیە دەتوانن ئەم مەهدائیلە ببینین... وانییە مەهدائیل، تۆ لە دروستکراوی خەیاڵی من نیت؟... پێمبڵێ وانییە. سڵاو برای شێتم... سڵاو لە تۆ، ناوت چی بوو... بولبولیار... سڵاو لە تۆش برای شێتم... سڵاو لە تۆش».

دکتۆر بەرەو مەستی تەواو دەڕۆیشت، قسەکانی هێدی هێدی دەچوونە مەودای وڕێنەوە. مەهدائیلی فریشتە دەستی خستە سەرشانی و گووتی: «ئاه دکتۆر خۆت هێمنبکەرەوە، خۆت ئارامبکەرەوە... هیچ نەبووە، ئێستا هیچ نەبووە». بە بولبولیاری گووت « هەمیشە وایە. کاریگەری عارەقەکە جۆرە وڕێنەیەکی وەهای لا دروستدەکات. شەوان درەنگ کە دەگاتە بنی قاپەکە دۆخی بە تەواوی دەگۆڕێت، چی شکستێکی هەیە دێنەوە دەرێ، هەموو ئەو ئازارانەی بە ڕۆژ لە بیمارستان و لەگەڵ خەڵکدا دەیانشارێتەوە، دێنەوە سەرێ، حاڵی دەچێتەوە سەر حاڵی ئینسانە ئاساییەکان، سەرخۆشە بێسەوادەکان، ڕایوایە فەیلەسوفێک و ئینسانێکی بێسەواد لە ناخدا یەک کیمیا دەیانبات بەرێوە... لەم ساتانەدا منیش

بە وڕێنە دەزانێت. پێیوایە من، مەهدائیلی فریشتە جۆرە وڕێنەیەکی دەستەجەمعیم کە تاقمێک بەشەر پێکەوە دەمبینن... من لای ئەو خەوێکم کۆمەڵێک خەڵک لەیەککاتدا دەیبینن. وانییە دکتۆر... تۆ وانازانیت کە من خەونم... وانازانیت».

دکتۆر شوکاک تادەهات چاوانی گێژتر و دەنگی خاوتر دەبووەوە. گوتی «بولبولیار... ئەم مەهدائیلی فریشتەیە، خەونی من و تۆیە... وڕێنەی دۆڕاوە حیزەکانی وەک من و تۆیە. ئەوانەی تەواو هەستدەکەن هیچیان نییە. ئەوانەی شتێکی گەورە دەدۆڕێنن... ها... گەر خاوەنی هیچ نەبوویت... گەر هەستتکرد هەموو شتێکت دۆڕاندوە، گەر وەک من هەموو خۆشی ژیانت لە قەحبەیەکدا سەرفکردبێت و ئەویش سووک و سادە جێیهێشتبیت... ئەو کات مەهدائیلی فریشتەت بۆ دەردەکەوێت... هاها ئەم مەهدائیلەی برادەری خۆمان... مەهدائیلی فریشتە ئەو شروبی خەوەیە کە من و تۆ خواردومانە تا نەزانین هیچ نین... هیچ نین لە سەر ئەم زەوییە... کە هەستتکرد تەواو... تەواو تۆ وەک سڵقی ڕووت تەنهایت، ئا لەو دەقیقەیەدا مەهدائیل دەبینیت... بە کۆڵانێکدا دەڕۆیت و ئەم برادەرەمان بە عەرەبانەیەکی گەورەی قورسەوە لەوسەری چاوەڕوانتدەکات... هاااهاااهااااا... بەڵام من پێش بینینی ئەویش تووشی ئەم نەخۆشییە بووم، تاعوونی ڕەشی مەلەکبینین».

ئێستا هیستریانە پێدەکەنی. مەهدائیل ڕوومەتەکانی سووربووبوونەوە «خەون؟ من خەون نیم. شروبی خەو؟ شروبی خەوی چی؟... من هیچم لە شروبی خەو ناچێت. خۆت باش دەزانیت من وا نیم. ڕاستە ئینسان دەبێت پێویستی بە بینینی من بێت ئەوسا دەمبینێت، بەڵام ئەو پێویستییە چییە نازانم. هێی دکتۆر.. هەمیشە دوا پێکت، پێکێکی ژەهراوییە، ئیتر لە ئسوولدا نامێنیت... بە قسەی من ناکەیت، پێویست ناکات، هەمو شەوێک قاپەکە تا دوا دڵۆپی بخۆیتەوە... قاپەکە تا دوا

تنۆکی... هەموو جارێک دەڵێم، بەر لەوەی بگەیتە دوا پێک شوشە و پەرداخەکەت لێدەدزمەوە، بەڵام بەردەوام فێڵێکم لێدەکەیت، بەردەوام لەو کاتەدا بابەتێک دادەمەزرێنیت کە ناتوانم گوێ نەگرم. وەک ئەمشەو، وەک ئەمشەو عەزیزم بولبولیار... کە باسی داروین و ئەو شەقانەی دامەزراند کە دەبێت تێیهەڵبدرێن، تۆ خۆت بڵێت گەر یەکێک بابەتی وا عەجایەب باسبکات خۆت لە بیر دەمێنێت... هەمووشی فێڵێکە بۆ ئەوەی من دوا پێک و دوا تنۆکی عارەقەکەی لێ نەدزمەوە... هەمووی بۆ ئەوەیە».

بولبولیار سەرسام بوو، بۆ ساتێک هەستیکرد دکتۆر شوکاک لە سەر هەقە... هەر سێ جارەکەی کە مەهدائیلی بینیبوو لە خەون دەچوو، بەڵام دڵنیابوو خەون نییە، ئەگەر خەونیش بێت خەونی ئەو نییە، خەونی کەسێکی دییە یان خەونی ئەو جێگایەیە کە تێیدا وەستاوە یاخود خەونی تەواوی شارەکەیە و ئەم بە نەزانی دەکەوێتە ناوی. بەڵام ئەگەر مەهدائیل خەونە، خۆ ئەوانەی تر کە بە باڵەوە دەیانبینێت خەون نیین. هەستیکرد تەواوی یانەی پزیشکان لە جێگایەکی تەلیسماوی و داخراو و ئاڵۆز دەچێت، وەک ئەوەی مەیگێڕەکان نهێنییەکیان لابێت. وەک ئەوەی پزیشکە سەرزلەکان کە لە سەر مێزەکانی دییەوە سەیردەکەن، ئاگاداری هەموو شتێک بن. دەستی مەهدائیلی گرت و گووتی «جەنابی مەهدائیل مەڕۆ تا پێمدەڵێیت، تۆ کێیت. مەڕۆ تا تێمدەگەیەنیت تۆ کێیت... ئەو شتانەی دەیانبینم مانایان چییە؟ من ماوەیەکی زۆرە ئازار دەکێشم. ماوەیەکی زۆرە».

مەهدائیل گووتی «بەمشەوە... بەمشەوە کە دەبێت دکتۆر مستەفا شوکاک بگەیێنمەوە ماڵەوە. گەر وا وازی لێبهێنم، مەیگێڕەکان بەمجۆرە تا بەیانی لە سەر مێزەکە جێیدەهێڵن... دەڕشێتەوە، عەفوومکە، هەندێجاریش

خۆی پیسدەکات... شایەنی ئەوە نییە، باوەڕم پێبکە دکتۆر لە ناخدا کەسێکی باشە. پیاوێکی تێکشکاوە ڕاستە... تابڵێی تێکشکاوە، بەڵام مرۆڤێکی سەر ڕاستە. حەزم لێ نییە کەس سووکایەتی پێبکات». سەری لە گوێی بولبولیار نزیککردەوە و گووتی «ئەو دکتۆرانە دەبینیت... ئەو دکتۆرانە دەبینیت... گەر لەو حاڵەدا بەجێیبهێڵین سبەی دەیکەن بە بابەتی نوکتە و گاڵتەجاڕییەکانی بیمارستان، هەزار نوکتەی لە سەر دروستدەکەن، ئەوەی تا ئێستا بەرامبەری کراوە کەم نییە. وەک ئەو ساڵەی کە ژنەکەی بەجێیهێشت... وێرانیانکرد... تێدەگەیت. هاڕییان... دەزانیت یەعنی چی... هاڕییان. نابینیت چی بە سەر هاتووە. هەستە سەرەتا دەبێت پێکەوە دکتۆر بگەێنینە ماڵەوە. من دەزانم کلیلەکان لە کوێدا دادەنێت... هەستە جارێ با دکتۆر شوکاک بەرینەوە بۆ ماڵێ و دواتر قسەدەکەین».

# من و لیڤیتانت دەبینەوە بە یەك

دوای ئەوەی من داواکارییەکەی لیڤیتانتم بەرزکردەوە، ئەنجومەنی باڵای حیزب بە خێرایی وەڵامی منیان دایەوە. وامدەزانی پێمدەڵێن چۆن خائینی وەها وەردەگرین، چۆن بیرۆکەی وا وەردەگریت و خەیاڵی وا بە سەرتدا تێدەپەڕێت. کەچی نا بە خۆشحاڵییەکی بێوێنەوە پێشنیارەکەی ئەویان قەبووڵ بوو. ڕێنماییەکانی حیزب بۆ ئەو شتێکی سەیربوون، بەپێی ئەو فەرمانانە دەبوو لیڤیتانت خۆی وەک پیاوێکی دڵسۆزی دەوڵەت دەربخات، هەموو شتێک بکات تا متمانەی خۆی لای حاکمان نەدۆڕێنێت، لە خزمەتی دەوڵەتدا دەستی نەلەرزێت و خۆی نەخاتە بەر گومان، چونکە ئەو کارانەی لە داهاتوودا بۆ شۆڕشیان ئەنجامدەدات،

نرخیان لە نرخی ژیانی ئەوانە بەرزتر دەبێت کە ئێستا بۆ پەچەپۆشی و مانەوە دەشێت ئازاریان بدات. بەپێی ئەو پرۆتۆکۆلە نهێنییە وەزیفەی لیڤیتانت دەبووە ئەوەی لە ڕێگای دەوڵەتەوە نەیارانمان لەناوبەرێت، هەرکات حیزب نەتوانێت یان نەیەوێت ڕاستەوخۆ لە گێچەڵی لەناوبردنی کەسێک یان هێزێکەوە بئاڵێت، لیڤیتانت ئەو کارە دەگرێتە ئەستۆ. ئیشی ئەو نابێتە دژایەتی دەوڵەت، بەڵکو لەناوبردنی ئەوانەی هەم دوژمنی ئێمە و هەم دوژمنی دەوڵەتن لە هێز و پارتەکانی تر، بەوەش لەیەککاتدا هەم وەک دڵسۆزی دەوڵەت و هەم وەک وەفاداری شۆڕشیش دەردەکەوێت. هەوڵیشدەدا هەندێجار لە نێوان حیزب و زیندانییەکانی ژێردەستی ئاسایشدا جۆرە پەیوەندییەک دروستبکات، تا حیزب لەوە نەپچڕێت لە تاریکی زیندانەکانیشدا ئەندامانی خۆی ئاڕاستەبکات. بەپێی پرۆتۆکۆلەکە و بۆ پاراستنی نهێنی گەورەمان، جگە لە من هیچ مرۆڤێکی دیکە نابێتە پردی پەیوەندی نێوان ئەو و سەرکردەکان، من ئەو کەسەم کە دەبێت بمپارێزێت، گوێم لێبگرێت، فەرمانم لێوەرگرێت و چی دەوێت ئاگادارمبکاتەوە.

لیڤیتانت هەر لە ناو ژوورەکەی مندا، بە وریایەکی زۆرەوە چەندین جار نامەی ڕێنماییەکانی شۆڕشی خوێندەوە و گوتی «هەڤاڵ وەفا، من هەموو فەرمانێکی شۆڕش جێبەجێدەکەم، بەڵام بەرامبەر بەوە دوو شتم دەوێت، یەکەم: نزار لە ناو ببەن. دووەم: گەر ڕۆژێکیش ئاشکرابووم و ڕوومکردە ڕیزی شۆڕش، ڕێزی شۆڕشگێڕێکم لێبگرن و سەرۆک خۆی پێشوازیم لێبکات و نەهێڵن لکەی خیانەتم بەربکەوێت».

لەو باوەڕەدابووم شۆڕش بە ئاسانی هەردوو کارەکە بۆ لیڤیتانت جێبەجێدەکات. دوای چەند نامەیەک، من بە ناوی شۆڕشەوە ڕێکەوتنێکی نهێنیم لەگەڵ ئەودا مۆرکرد، سێ کۆپیشمان لە ژێر کاربۆندا ڕاکێشا، یەکێکیان بۆ لیڤیتانت، یەکێکیان بۆ من، یەکێکیان بۆ فایلی نوسراوە

نهێنییەکانی ئەنجومەن. بەپێی ئەو ڕێکەوتنە دەبوو لیڤیتانت نیوەی ڕۆحی بفرۆشێت بە شۆڕش و نیوەکەی دیکەشی بە دەوڵەت. وەک من لە سەرەتاوە دەمزانی و دواتریش لە دۆسییە نهێنییەکانی ئاسایش ئاشکرابوو، لیڤیتانت هەمان شێوە چەند پەیمانێکی نهێنیشی لەگەڵ هەندێ لە ئەفسەرە عەرەبەکاندا مۆرکردبوو تا بەرامبەر بە زانیاری، بە جێبەجێکردنی داواکانی، بە کرانەوەی دەستی، بە زیادبوونی سەروەت و سامانی، ژیانیان لای شۆڕش بپارێزێت. هەر لەو نێوەندەدا من نامەی تایبەتی بەعسییەکان و حیزبییە باڵاکانم لە لیڤیتانت وەردەگرت و دەمگەیاندە سەرانی ئەنجومەنی شۆڕش، بۆ ئەوەی تەواوی ئەم جەنگە، تەواوی ئەم یارییە لە دەرەوەی هەر مەترسییەک بۆ سەر ژیانی ئەوان بەڕێوەبچێت. من و لیڤیتانت پێکەوە ئەو پردەبووین کە ئەندامانی باڵای حیزب بە هۆیەوە ژیانی خۆیان لای بەعسییەکان زامندەکرد، بەعسییەکانیش کە هێدی هێدی لە گورزە گەورە و لەناکاو و کوشندەکانی شۆڕش دەترسان، ژیانی خۆیان لە تورەیی شۆڕشگێڕان دەپاراست. من هەموو ئەو ئیشەم بە زامنی شۆڕش و بەکارێکی شۆڕشگێڕانەی پلە یەک لەقەڵەمدەدا، چۆن موسڵمانێکی ئیمانداریش فەرمانی خودا جێبەجێدەکات، بەوجۆرە فەرمانی خوداکانی خۆمم لە حیزبدا جێبەجێدەکرد.

لە ساتێکدا تێگەیشتم ئیدی من بە ئاگاداریی هەندێک لە بەعسییە بەرزەکان لە شاردام، ئەوان دەمپارێزن تا پردی نێوان ئەوان و شۆڕش بم، وەک چۆن بە ئاگاداری هەندێک لە سەرانی شۆڕش لەوێم تا لە نزیکەوە مەترسییەکان بۆنبکەم و هەموو نەخشە و پلانێک بناسمەوە کە دژ بەوان دادەنرێت. دوای ڕێککەوتنم لەگەڵ لیڤیتانتدا بە جۆرێک لە جۆرەکان دەستم کراوەتر و هاتوچۆکردنم لە جاران ئاسانتر بوو. ئەوەی کە لەو نێوەدا زامن نەدەکرا، ئەوە بوو دەزگا هەواڵگرییەکانی دەوڵەت

تادەهات زۆرتر دەبوون و یەک جودا لەوی دی چالاکیاندەکرد. دەزگای هەواڵگری عەسکەری تا دەهات سەربەخۆتر و دڕتر دەهاتە مەیدان، لیڤیتانتیش دەستی بە هیچ زانیارییەکی تایبەتی ئەواندا نەدەگەیشت. ژمارەی ئەو کوردانەش کە دەچوونە کاری سیخوڕیکردنەوە بۆ دەوڵەت و دەیانەویست هەمان یاری لیڤیتانت بکەن، ڕۆژ دوای ڕۆژ زۆرتر دەبوون و پەنهانتریش کاریاندەکرد. ئەوان کە هەواڵیان هەبوو، لیڤیتانت چ جۆرە یارییەکی ئاڵۆز و چەپەڵ دەکات، هەوڵیاندەدا لە بەغداوە، لە جێگا بەرزەکانی ترەوە پشتوپەنا پەیدابکەن و لە پشتەوەڕا لە لیڤیتانت بدەن... ئەو جۆرە مەترسیانە هەرگیز سەد دەر سەد خەفەنەدەبوون و هەمیشە شتێک لە هەوای سەرکێشی و بۆنی مردن لە هەنگاو و جوڵەی هەموومانـدا هەبوو.

بەڵام ڕێکەوتنەکەی نێوان من و لیڤیتانت دەستی ئەویشی تەواو کردەوە... ڕۆژانی دوای مۆرکردنی ڕێکەوتنەکەمان دەستیدایە بیناکردنی نهۆمە سەرەتاییەکانی ئەو بورجە گەورەیەی ئێستا لووتی لە نزیک لووتی فەلەکە. هەتا لەو دەمەدا ئێوارەیەک منی سوار ماشێنی خۆی کرد و لەنزیکەوە ئەو ڕووبەرە بەرین و بناغە سەیر و قووڵ و کۆنکرێتییەی نیشاندام کە هێدی هێدی نەوەی یەکەم لە کرێکاران کاریان لە سەر دەکرد. ئەوکات تەواوی بیناکە تەنیا پرۆژەی خەونێکی لیڤیتانت بوو کە نەیدەیویست تەنیا جێگایەکی باشتری لەو ژوورە ڕەشەی نێو ماڵی خوشکی هەبێت، بەڵکو نیازی گەورەتر و خەیاڵیتری بەم پارچە عەردە هەبوو. من پێمگووت «هەڤاڵ هۆمەر، گەر بە پارەی بەعسییەکان ئەم سەر زەمینە ئاوەداندەکەیتەوە، کاری وامەکە، چونکە گەر ڕۆژێک ئەوان ڕۆیشتن میللەت هەم زەوی و هەم ماڵەکەشت لێدەستێنێتەوە». وەک هەمیشە ئەسمەر و خوێنگەرم و بەشکۆ بوو، گووتی «نا هەڤاڵ وەفا وامەڵێ... گەر ئێستا بناغەی شتەکان دانەڕێژم، گەر ئێستا نهۆم نهۆم

بەرزی نەکەمەوە، کە ئەوان ڕۆیشتن ناتوانم هیچ بکەم. ئەوەی لە خەیاڵی مندایە دواتر بناغەی داناڕێژرێت، دەبێت ئەم ئەندازیارە عەرەبانە، ئەوانەی شارەزای بناغەی بورجی گەورەن، ئەوان یارمەتیمانبدەن... ئەوان بورجی بابلیان دروستکردوە نەوەک ئێمە، ئەمەش باغچە هەڵواسراوەکانی من دەبێت. گەر ئێستا نەیانهێنم ڕەنگە دواتر هەرگیز نەیەن و نەیانگەمێ». لیڤیتانت پیاوێکی بە سەواد و زیرەک نەبوو، بەڵام من لە ژیانی خۆمدا سەرنجمداوە، هەموو ئەوانەی لە شتێکدا سەرپەڕن، جا لە توندوتیژیدا بێت یاخود لە عیشقدا، لە ملکەچیدا بێت یاخود لە یاخیبووندا، گەر خوێندەواربن یان بێسەواد، فەلسەفەیەکی تایبەتی ژیان و زیندەگییان هەیە کۆمەکیاندەکات خێراتر پێشبکەون. زۆرجار بڕوای ئەوان بەو فەلسەفەیە لە بڕوای فەیلەسوفە گەورەکان بە تێز و تیوریی خۆیان گەورەترە. لیڤیتانتیش پیاوێکی دڵڕەق و بێسەواد بوو، بەڵام بە فەلسەفەیەکی تایبەتی خۆیەوە، دڵڕەقی و ئیمان دووشتن گەر پێکەوە کۆببنەوە هەموو خواستێکی دەگەیێنن بە دوا ئامانج. لیڤیتانت ئەو ڕۆژە بە خەندەیەکی نهێنییەوە، کە بە ئەستەم لە سەر لێوی دەبینرا گوتی «ئەم باڵەخانەیە شەقی گەورەی منە لەم شارە. ئەگەر دواجار ئەو باڵەخانە بەرزە دروستبکەم، تا ئەو جێگایەش بەرزیبکەمەوە کە دەمەوێت... ئیتر گرنگ نییە کێ لەم شارەدا حاکمە، چونکە ئەوەی دێت تەنیا لەوێوە، لە نهۆمە بەرزەکانی منەوە دەتوانێت حوکمی دونیا بکات». ساڵانێک دواتر کە بورج بوو بەو جێگا گرنگە، دەمبیست لە نهۆمە هەرە بەرزەکانییەوە، بەردەوام دەیان پاسەوان بە دووربینی گەورەوە چاوەدێری کوچە و کۆڵانەکانی شار دەکەن... لە ڕاستیدا بۆ شتێکی تایبەتی نەدەگەڕان، بەڵام گرنگ بوو خەڵک بزانن لە بورجەوە بەردەوام کەسێک چاودێریاندەکات. من وەک کادیرێکی ئاسایش کە لە سەر عەردی یان و لە تەختانیدا کارمدەکرد دەرفەتی وەهام نەبوو، بۆیە

خەڵک هێندەی لە پیاوانی بورج دەترسان لە ئاسایشی وەک من سڵیان نەدەکردەوە. لەوێوە من لە یاسایەکی گرنگی ئەمنییەت تێگەیشتم: ترسناکترین ئەشکەنجە ئەوە نییە بێڕەحمانە ئازارتبدەن، بەڵکو ئەوەیە بەردەوام سەیرتبکەن. لیڤیتانتیش لەو سەردەمەوە خۆی بۆ ئەوجۆرە ئەشکەنجەیە ئامادەدەکرد.

لە دوای ڕێکەوتنییەوە لەگەڵ شۆڕشدا، لیڤیتانت بە دەستێکی کراوەترەوە ئازاری کتێبفرۆش و خاوەن چاپخانە و نوسەرەکانی شاری دەدا، هەر بە بۆن خوێنەرێکی کتێبی لە نابەین سەد کەسی ئاساییدا جیادەکردەوە. بەجەورێکی زۆرەوە لە سەر کۆکردنەوە و زەوتکردنی نامەی دڵداری گەنجان بەردەوامبوو. زۆر شەو دەمەوبەیان، کاتێک دونیا بێدەنگ دەبوو، کاتێک دەنگ و ڕەنگ و بینین چیدی لە باریاندا نەبوو هەموو هۆشی مرۆڤ بگرن... ئەو بە کوچەکاندا دەگەڕا و بۆنی بەماڵانەوە دەکرد، گەر ماڵێک کتێبخانەی گەورەی هەبایە، بۆن ئەوی وەک سەگ تا بەر کتێبەکان ڕادەکێشا. لە سەردەمی ئەودا زۆربەی ئەو ماڵانەی کتێبیان هەبوو، لە حەوشی ماڵەکانیاندا چاڵی قووڵ قووڵیان هەڵدەکەند و لە ژێر چەندین مەترەوە کتێبەکانیان دەناشت. دەمێک هاتە پێشێ وەختبوو لەبەر شەڕانگێزی لیڤیتانت زۆربەی کتێبفرۆشەکان دوکانەکانیان دابخەن. ئەوەی ئیشی کتێبفرۆشتنی لە شارەکەدا لە فەوتان ڕزگارکرد، سەردانی کورتی وەزیری ڕۆشنبیریی فاشیستییەکان بوو، کە کتێبی بە کەرەستەیەکی گرنگی بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی دەزانی، ڕاشی وابوو هەر کوردێک بتوانێت عەرەبی بخوێنێتەوە، ناکەوێتە داوی ئەو چەتانەوە کە نەفامی و پیسوچەپەڵی و نەخوێندەواری کردونی بە دوژمنی وڵات. ڕێنمایی ئەو وەزیرە فاشیستییە کە هاوڕێ لەگەڵ شاندێک لە نوسەرانی عەرەبدا هاتبوو، ئەوەبوو لێگەڕێن کورد بە زمانی پێغەمبەران، زمانی جوانی عەرەبی بخوێنێتەوە... ماڵەکانیان بە ئەدەبیاتی بەرزی ئەم میللەتە

ناوازەیە بڕازێننەوە. وەزیر کە «عوسیانی باکوورییەکانی» دەگێڕایەوە بۆ بێسەوادیی، نالەباری سروشت، کاریگەریی خراپی مێشوولەی مەلاریا لە سەر عەقڵی خەڵک، باوەڕیی وابوو فێرکردنی عەرەبی و ڕشتنی بەردەوامی دەرمانی مێشووله لە ماوەیەکی کورتدا شۆڕشی کورد لەنێودەبات. بە دەستی خۆی لە هەندێ خوێندنگادا کتێبی عەرەبی دابەشکرد و فەرمانیدا کتێبفرشییەکی گەورەی عەرەبیش بکرێتەوە و کۆمەکی کتێبفرۆشەکانیش بکرێت تا ببنە پردی گەیاندنی زمانی پیرۆزی عەرەبی بۆ ئەم میللەتە کێوی و بەدبەختە. بە بڕوای وەزیر، گەر کورد زمانی عەرەبیان بزانیبایە و بەدڵ گوێیان لە سەرۆک و مەڤاڵی جێگر بگرتبایە، بۆ حیزب و سەرۆک لە خەڵکی باشوور دڵگەرمتر دەبوون. ئەو بۆچوونانەی وەزیر وایکرد لە ئاسایشەوە لیڤیتانت ئاگاداربکەنەوە کە دەست لە یەخەی کتێبفرۆشان بەردات، کە لەمێژبوو بە کۆمەڵ شکایەتێکی درێژیان بۆ بەڕێوەبەر و پارێزگار بەرزکردبووەوە.

ڕقی لیڤیتانت لە خوێندەوار و کتێبچییەکان، کەوتە سەردەمێکەوە تێیدا چەپەکان دژایەتییەکی گەورەی شۆڕشیان دەست پێکردبوو. لەو نێوەندەدا غەنی مامەند و هاوڕێکانی، ڕێکخراوێکی سەربەخۆیان ڕاگەیاند بە ناوی «کۆمەڵەی کرێکارانی کۆمۆنیست ـ K.K.K». گەرچی کورتکراوەی ناوەکە وەک کورتکراوەی ناوی ڕێکخراوی فاشیستی ئەمریکایی کۆ کلۆکس کلان بوو، بەڵام هەڵسوڕاوانی ڕێکخراوەکە باوەڕیان وابوو، لە داهاتوودا بە جۆرێک خۆرهەڵات هەڵدەگێڕنەوە و دۆزەخی گەرم بۆ بۆرژواکان دادەگیرسێنن کە سێ کافەکەی ئەمان سێ کافی ئەو فاشیستییە ئەمریکاییە ڕەگەزپەرستانە دەخاتە پەراوێزەوە و لە بیر مرۆڤایەتی دەباتەوە. هەر لە ڕاگەیاندراوی یەکەمەوە ئاشکرایانکرد بۆ دامەزراندنی جۆرە ڕێکخراوێکی ئینتەرناسیونالیستی چەکدار تێدەکۆشن کە کرێکارانی خۆرهەڵات لە حیزبێکی سەرتاسەریدا ڕێکبخات و بۆ

دامەزراندنی دەوڵەتێکی سوسیالیستی خاڵی لە هەر تەماح و نیازێکی نەتەوەیی ئامادەیانبکات. ئەو دەم دروشمە توندڕەوەکانی ئەوان گەنجانی مەستدەکرد و هەستی هەمووانی ختوکە دەدا. هەڤالان لە بیرۆی باڵا لە کۆبوونەوەیەکی داخراودا بڕیاریاندا کە چەپگەراکان چ لە دەرەوەی شۆڕش و چ لە ریزی رێکخراوە ناوخۆییەکاندا پاکبکەنەوە، هەڤاڵ شێرخان لە نامەیەکدا بە منی گووت «سەردەمی تەختکردنی ئەم چەپانە هاتووە. ئیتر کاتێتی بیانهاڕین وەک باراش».. ئەوە یەکەمجار بوو وشەی هاڕین بەوجۆرە توند و ترسناکە لە ئەدەبیاتی نوسراوی حیزبدا ببینم، ئەو وشە ترسناکەی تا ئەمڕۆ تەنیا وشەیە لە هەوا و ئاوی وڵاتەکەدا بە ئازادی دەگەڕێت، بە جۆرێک زۆرجار هەستدەکەم لە ناو هەموو ئینسانێکدا ئارەزوویەکی ترسناک بۆ هاڕینی ئەوانی تر دروستبووە، وەک ئەوەی لەم شارانە خەڵکی تەنیا ئیشیان ئەوە بێت یەکدی بگرن و سەری یەک لە ژێر بەرداشان بنێن و دەستاڕان بخەنە کار و ئێسکی یەک بهاڕن... «هاڕینی چەپەکان وەک باراش»... نەغمەیەکی زۆر ترسناکی هەبوو، سڕینەوەیان، پلیشاندنەوەیان تا ئەو ئەندازەیەی ئاسەواریان نەمێنێت. فەرمانەکانی ئەنجومەنی سیاسی ئەوە بوو، کە لیستی دەستبەکارانیkkk ئامادەبکەم و بێنەوەی حیزب دەستی خۆی بخاتە کارەکەوە، لیڤیتانت بە بەڵگەوە بیانگرێت و وابکەین بەعسییەکان بیانخەنە بن دەستاڕی خۆیان و لە سەر نەخشەی سیاسی بیانسڕنەوە. لیڤیتانت دەرهەق بە مارکسیستەکان وەک تادار و نەخۆش وەهابوو، کینەی بەرامبەریان هەر سنوورێکی تێپەڕاندبوو... ئەو شەوەی لیستی ناوەکانم بۆ لیڤیتانت ئامادەکرد، دۆخێکی ڕۆحی سەیرم هەبوو، بە درێژایی شەوی پێشووتر خەونم بە ئەسپەکانەوە بینیبوو، هەستێکی سارد و سەنگینم هەبوو، وەک ئەوەی لە هەوایەکی نسرم و لە بۆشیدا مەلەبکەم. کە یەک یەک ناو و ناونیشانەکانم دەخستە سەر لیستەکە، وەک ئەوەبوو یەک یەک گوللە

بنێم بە سەریانەوە. چەند جارێک بیرم لەوە کردەوە کە ناونیشانەکان بە هەڵە بنوسم، یاخود کارێکبکەم بەرلەوەی بیانگرن ئاگاداریانبکەمەوە، بەڵام هەموو جارێک هەستێکی سارد، بڕوایەک بەوەی بەزەیی لە بنەوەڕا شۆڕش وێراندەکات، دایدەگرتم. دەنگێک لە ناخمدا دەیگووت «چ شۆڕشگێڕێکی لاوازییت، گەر بگەیتە ئەوەی دوژمنانی حیزب بپارێزیت».

کە ناوەکانم تۆماردەکرد، شتێک بەر گەرومی دەگرت، دەستێک دەیخستمە کۆکە، کە دەشمویست نەینوسم جۆرە ڕقێک لە خۆم دایدەگرتم. تا ئەوکات کەسم بەوجۆرە نەکوشتبوو، بەوەی یەکێک دەرخواردی دڕندەیەک بدەیت و خۆت سەیربکەیت. کوشتنەکانی پێشووترم، گەر لە گۆڕینەوەی دەستڕێژ و هاڵاوی پەلاماردا نەبایە، ئەوا خۆم تفەنگەکەم دەنایە سەر پشتملی قوربانییەکەم و بەساردییەوە سەیری لوولەی تفەنگەکەم دەکرد و بێئەوەی بیربکەمەوە پەنجەم بە پەلەپیتکەکەدا دەنا. دواتریش، کاتێک شریخەی تفەنگەکە ڕایدەچڵەکاندم، جگە لە تێپەڕینی هەوایەکی سارد، جگە لە هەڵکردنی بایەکی شێدار و نسرم لە دڵمدا هەستم بە هیچی تر نەدەکرد. تاکە شتێک کە زۆر توند هەستم پێدەکرد خاڵیبوونەوەی ناخم بوو لە شتێک، لە ناکاو هەستم بە برسێتییەکی کتوپڕ و زۆر دەکرد، وەک ئەوەی کوژراوەکە لەگەڵ خوێنی خۆیدا ناخی منی لە شتێک خاڵیکردبێتەوە. هەستێکی زۆر سەیربوو، وەک ئەوەی لە ناکاو هەستبکەیت دڵت کەوتۆتە سەر بەردێکی تەزیو، کەسێک ئاسنێکی ساردی لە هەناوتدا دانابێت و هەموو ئۆرگانەکانت هەست بەو سەرمایە بکەن کە کەم کەم لەو ئاسنەوە دەچێتە ناو خوێنت و لەوێشەوە بە تەواوی لەشتدا بڵاودەبێتەوە. وەک لە گەرماوێکی داغەوە دابەزمە ناو حەوزێک ئاوی تەزیو. بەڵام ئەمجۆرە کوشتنە، وەک ئەوجۆرە کوشتنەی زەمانی زوو دەهاتە بەرچاوم کە پادشاکان کۆیلەکانی خۆیان دەرخواردی پڵنگ و شێرە برسییەکان دەدا و خۆیان تەماشایاندەکرد و پێدەکەنین.

کە لیستەکەم دایە دەست لیڤیتانت، بەمۆنییەوە سەیرێکی ناوەکانی کرد، وەک نەخشەی گەنجینەیەکی پڕ زێڕ هەڵبگرێت، لە سەرەخۆ و بە وریاییەوە وەرەقەکەی قەدکرد و خستییە گیرفانی کراسەکەی. گوتی «دڵنیام ڕەفیق سوبحی بەم لیستە دڵی خۆش دەبێت. ئاگادارن لە شاردا هەرایەکی گەورە هەیە، ڕەفیق دەڵێت ئەو مارکسییە سەگانە کەوتوونەتەوە ئیش، بەڵام سەرەداوێکی ڕاستەقینەیان دەست ناکەوێت، ئێستا ئێمە لیستێکی حازریان دەخەینە بەر دەست». لیڤیتانت وەک هەمیشە مات و لە خۆدا بوو، گوتی «مارکسییەکان دوژمنی هەموو لایەکمانن، من غەمیان بۆ ناخۆم». لە دروستکردنی لیستەکەدا چەندین جار ویستم، ناوی بولبولیار دەربهێنم، هەستێکی ناوەکی سەیرم هەبوو ئەم پیاوە ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی مندا دەبینێت، دوائەوە دڵنیابووم ئەو لە مارکسیستە سەرسەختەکان نییە، درەنگ یان زوو هاوڕێکانی لە خۆیانی دوور دەخەنەوە. بەڵام گەر ناوی لە لیستەکەدا نەبایە چارەنوسێکی لە گرتن بەدتر چاوەڕوانیدەکرد، پێکڕا وەک خائینێک سەیریاندەکرد، تۆمەتی ئەوەیان دەخستە پاڵ کە هاوڕێکانی فرۆشتووە، دوورنەبوو بشیکوژن. لە ڕیز بەندی لیستەکەدا ناوەکەیم خستە خوارەوە، تکاشم لە لیڤیتانت کرد گەر خۆی لە گرتنەکاندا بەشداربوو، لەگەڵ ئەم کوڕەدا سەرسەختی نەنوێنێت و گەر توانی بیبەخشێتەوە بە من. لیڤیتانت سەیریکردم و گوتی «ئەگەر کەوتە دەستی من، دەیبەخشمەوە بە تۆ... بەڵام ئەگەر نەکەوتە دەستی من، ئەوەیان شتێکی دیکەیە». شەوی گرتنی کۆمۆنیستەکان لە شەوە ترسناک و سەیرەکانی ژیانی من و ژیانی شارەکەش بوو، لیڤیتانت ڕۆژێک پێش ئەوە ئاگاداریکردمەوە بەپێی نەخشەیەک کە ئەو و دەیان چەکداری دی تێیدا بەشداردەبن، مارکسیستەکان لە یەک کاتدا و بەیەکەوە کۆدەکرێنەوە. ئەو زانیارییە کۆمەکی پێکردم، ئەو شەوە هەڤاڵێک ڕابسپێرم بولبولیار بباتە لای خۆی.

شەوی کۆکردنەوەی کۆمۆنیستەکان ویستم لە زووەوە بخەوم، بەڵام ئەو ساردییە قووڵ و تاریک و شێدارەی ناو ناخم هەڵیدەستانم و گەروومی دەگوشی و تووشی زگ ئێشەی دەکردم. هەستم بە ترس یان بە پەشیمانی یان بە ئازاری ویژدان نەدەکرد. نا شتێک نەبوو لەو جۆرە هەستانە، بەڵکو هەستێک بوو وەک ئەوەی لە شەوێکی سارددا سەفەربکەیت، وەک ئەوەی لە گەراجێکی خاڵی و سارددا بۆ ماشێنێک وەستابیت کە هەرگیز نایەت، وەک لە ژێر بارانێکی خوڕدا تەنیا کراسێکی تەنکت لەبەردا بێت و بەردەوام باران لێتبدات و نەتوانیت بە هیچ لایەکدا بجولێیت. شتێک لە ناخمدا دەلەرزی، وەک ئەوەی چەند دڵێکی تر چووبێتنە سینەمەوە و هەموو پێکڕا لێبدەن. لە ڕاستیدا ئەو هەستە ترسناکە کە لە ناکاو هەستدەکەیت، شتێک خێرا لە ناختدا دەفرێت، بێئەوەی بزانیت ئەو شتە چییە، ئەوەی وادەزانی مەخلوقێکی بچوک و نهێنی بە دوو قاچی سارد بە سەر دڵتدا ڕادەکات لەو شەوەدا هەستێکی وەهام هەبوو. لەو شەوەدا جگە لە بولبولیار و دووانی دی کە بە ڕێکەوت لە ماڵ نەبوون، هەموو کۆمۆنیستەکان گیران. لە ماڵی زۆربەیاندا کتێب و بەیاننامە دۆزرانەوە، لای دووانیان کەرەستەی سەرەتایی چاپ و لای یەکێکیشیان دەمانچەیەک گیرا، کە پێدەچێت تاکە دەمانچەیەکی گروپەکە بووبێت کە ویستبوویان تەواوی بۆرژوازییەتی خۆرهەڵاتی پێبڕوخێنن. لیڤیتانت بۆ یەکەمجار لە ئەشکەنجەکاندا بەشداریکرد، ئەوەی نهێنییەکی وا گەورە و ترسناکی ئاشکراکردبوو، وایکرد بەعسییەکان پتر متمانەی پێبکەن و بۆ یەکەمجار ڕێگای بدەن بچێتە قاتەکانی خوارەوە و لە ژێر زەمینەکاندا ئەو ئارەزووە کۆنەی خۆی تێربکات «ئەشکەنجەدان» . هیچ یەک لە کۆمۆنیستەکان بەرگەی ئەو لێدان و ئازارە زۆر و بەردەوامەی نەگرت و پێکڕا دانیان بە هەموو کاروباری ڕێکخراوەکەیاندا نا. دوای مانگێک لەوە غەنی مامەند و ئازاد بەهجەت و سەفین خۆشناو و چواری دیکەیان بە

مەرگ مەحکومدران و ئەوانی دیکەیان بە حوکمی هەتاهەتایی. دوای سێ مانگ و دوازدە ڕۆژ لە گیرانیان، غەنی مامەند و هاوڕێکانی لە سێدارەدران و حیزبی ئێمە وەک شەهیدانی گەورەی گەل کەوتە ستایشکردنیان.

لەو کاتەشەوە هەڵهاتنی بەردەوامی هۆشەنگی بولبولیار دەستی پێکرد، شۆڕشگێڕێکی خەیاڵی کە لە ژێر هیچ ناوێک و لە هیچ بەرەیەکدا جێگای نابێتەوە.

# کەشتیی فریشتەکان

بە جووتە دکتور مستەفا شوکاکی مەستیان خستە سەر قەرەوێڵەکەی. مەهدائیل گووتی «زۆربەی شەوانی پێنجشەممە ئەمە حاڵێتی. هیچ شتێک بەهانە نییە مرۆڤ وا لە خۆی بکات. هەر بزانێت بەیانی دەوامی خەستەخانەی نییە خۆی لە شەرابدا دەخنکێنێت. عەجایەب ئەم پیاوە تێناگات کە ئەو ژنە ئەمی ناوێت... لە بەرئەوەی دکتۆرێکی حیزیت، مەرج نییە ژنی دونیا هەموویان بۆت بمرن. ژنە تۆی ناوێت، ئیتر بۆ وا لە خۆت دەکەیت... تێناگەم».

بولبولیار لە سەر مێزێکی بچوک دیوانی «جەلادی فریشتەکان»ی نەغەدە ماردینی بینی. کتێبەکەی هەڵگرت و تەماشایەکی کرد و گووتی «نا پێناچێت ئاسان لەبیری بچێتەوە. دکتۆر ناهەقی دەرهەق بە خۆی دەکات. بەڵام جەنابی مەهدائیل هەر وابووە، عەشق ناهەقییەکی بەردەوامە، مرۆڤ دەرهەق بە خۆی دەیکات. ئەم پیاوە ناتوانێت ئەو ژنە لە بیربکات... دکتۆر مرۆڤێکی باش دیارە، من نایناسم، بەڵام دوای ئەو هەموو ساڵە وەک دەبینم هێشتا بە دەست ئەو ئازارەوە دەتلێتەوە... نازانم ئەوە ناوبنێم چی، گەمژەیی یاخود وەفا یاخود چی... نازانم؟».

مەهدائیل بەتانییەکی بە دکتۆردا دا و سەرینەکەی ژێر سەری ڕاستکردەوە و گووتی «دوو مرۆڤ کە لەگەڵ یەکدا نەگونجان ناگونجێن... ئەوە گوناهی هیچ کەسێکی تێدا نییە، هەتا گوناهی خۆشیانی تێدا نییە، ئینسان وادروستبووە، ئەمە پەیوەندی بەجوانی و ناشیرینی، بەهێزی و بێهێزی، گەنجی و پیرییەوە نییە، کیمیاییەک هەیە کارلێک ناکا و تەواو... ئەوە موسیبەتی بەشەرە، سەرەتا یەک هەڵدەبژێرن، یەکیان خۆشدەوێت، بێئەوەی لێک تێگەیشتبێتن... دوایش دەکەونە بەردەبارانی یەک، ئەوە ئینسانە».

پێکەوە لە ژوورەکە هاتنەدەرەوە و گڵۆپی ژوورەکەی دکتۆریان خامۆشکرد و لە ساڵۆنەکەدا دانیشتن. پێدەچوو پێشتر مەهدائیل چەندین جار هاتبێتە ئەم ماڵە، وەک کەسێکی شارەزا ڕەفتاریدەکرد. مەهدائیل لەبەرچاوی بولبولیار، کەمێک پیربووبوو. بولبولیار گووتی «من لەم چەند ساڵەدا ژیانێکی ناخۆشم بووە، زۆربەی کات بە نهێنی کەمجار گەڕەکی غەمپاشا جێدەهێڵم، لەوێ هەندێ هاوڕێ شوێن و ڕێیەکیان بۆ کاتی پێویست خستۆتە بەردەستم. ژیان بە نهێنی لە ماڵی خەڵکی تردا ئازاری زۆرە. مەهدائیل، من کەسێکی لاوازم... زۆر لاواز. خاوەنی شتێکی تایبەتی نیم، جگە لە هەژاریی هیچی دیم نییە، بۆیە لە خۆم تێناگەم، بۆ دەبێت من تۆ ببینم، بۆ دەبێت هەندێ خەڵکی باڵدار ببینم. خۆم دەگۆڕم و بە شاردا دەگەڕێم و کەم کەم تووشی خەڵکانێک دەبم کە باڵیان هەیە. زۆربەی خەڵک ئاگادارنین، خۆیان باڵەکانی خۆیان نابینن، کاتێک من دەربارەی باڵەکانی خۆیان قسەیان لەگەڵدا دەکەم، بە گومانێکەوە سەیرمدەکەن و دەڕۆن، وەک لە شێتێک بڕوانن نیگامدەکەن و دوور دەکەونەوە. مەهدائیل کەمن... ئیجگار کەمن ئەوانەی دەتوانن ئەو باڵانە ببینن. ئەوانەشی دەیبینن نازانن چییە. من هیچ شتێک تێناگەم... هیچ شتێک، لەو باوەڕەدام دکتۆر شوکاک لە سەر هەقە، لەمڕووەوە لە سەر هەقە».

مەهدائیل تۆزێک لووتی پاککردەوە و گووتی «ئەها... دکتۆر شوکاک لە سەر هەقە؟ لە چیدا لە سەر هەقە؟ دەتوانم بزانم لە چیدا لە سەر هەقە؟».

«لەوەدا کە دەڵێت تۆ خەونێکی ئێمەیت. مەهدائیل مەرج نییە مرۆڤ بخەوێت بۆ ئەوەی بەشێکی ژیانی بۆ هەتاهەتایە بکەوێتە خەونەوە. فریشتە هیچ نییە جگە لە بەشێک لە خەون، دەمانەوێت فریشتە بوونی هەبێت و دەیبینین، وەک هەموو شتەکانی تر، هەموو ئەو شتانەی تر کە سەرەتا ئینسان لە خەون و خەیاڵدا دروستیاندەکات و دەیانکات بە ڕاست. وەک شەڕ، تۆڵە، بەهەشت، جەهەنەم... من وا لە تۆ تێدەگەم».

مەهدائیلی فریشتە لەتێک شووتی گەورەی لەسەلاجەکەی دکتۆر دەرهێنا و بە هێمنی دەستیکرد بە خواردنی و کە تەواوبوو بە شتێک لە ئارامییەوە کە خاڵی نەبوو لە نائومێدیی گووتی «کەواتە من خەونم، من بوونم نییە، من سێبەرێکی داماوم لە خەونی ئەم و ئەودا دەردەکەوم، لە شەودا دەمبینن، بە سەرخۆشی دەمبینن، لە ساتی زیندەخەودا دەچمە پێشچاویان. بەڵام خۆم بوونم نییە... جوانە، زۆر جوانە. تەنیا تا ئەو جێگایە هەم کە یەکێک دەیەوێت بمبینێت، ئیتر بە هەست بێت یان بە نەست، بە ویستی خۆی بێت یان بێویستی خۆی، لەوە دەرچێت من نیم. فریشتە تەنیا ئەو کاتە هەیە کە جەنابی ئینسان دەیەوێت، تا ئەو شوێنە هەیە کە ئێوە دەتانەوێت، کە نەتانویست نامێنم، دەچمە ژێرەوە، دەبم بە ژێر هەموو شتەکانی ترەوە، لە بنی بنەوە دەخنکێم و تەواو... وانییە، تۆ واناڵێیت؟ تۆ واناڵێیت؟؟».

بولبولیاریش بە نیگەرانییەوە گووتی «من نازانم بۆ تۆ دەبینم، نازانم بۆ ئەو ژن و پیاوە باڵدارانە دەبینم. زۆر نین، بەڵام لە ناکاو هەستدەکەم یەکێک کە تا دوێنێ باڵی نەبووە، ئەمڕۆ باڵی هەیە... لەوە تێناگەم... هەندێ باڵەکانی خۆیان لەدەستدەدەن و هەندێک نا ،

نازانم... من باوەڕم پێتان نییە و کەچی دەشتان بینم... ئێوە کێن».

«زۆر باشە. ئێستا دەتەوێت من چی بکەم؟ دەتەوێت هەموو شتێکت بۆ ڕوونبکەمەوە. ئێستا دەتەوێت بڵێیت، ئەوە من و تۆ سێ جارە یەک دەبینین و کاتی ئەوە هاتووە، بزانیت من چیم. باشە.. باشە مستەر بولبولیار. من پێتدەڵێم، هەرچییەک تۆ دەیڵێیت ڕاستە... ئەوەی من دەبینیت خەوە... ها باوابێت، با خەون بێت. بەڵام گوێم لێبگرە: فریشتە هیچ نییە جگە لە مەخلوقێکی تر کە لە ناو خۆتدایە... هەموو ئینسانێک فریشتەیەکە، هەموو کەسێک فریشتەیەکی بچوکی تێدایە، وەک چۆن چاوی هەیە، بۆنی هەیە، بەزەیی هەیە، دڵڕەقیشی هەیە، لە ناخیدا فریشتەیەکیش هەیە. ئەو فریشتەیە پەیوەندی بە خوداوە نییە، پەیوەندی بە ئاسمانەوە نییە. ئەگەر خودا زەوی و ئاسمان و ئەستێرەکان و مرۆڤ و ورچ و مێرولەی دروستکردبێت، ئەوا لەوانەیە ئەویشی دروستکردبێت، گەر نا ئەو فریشتەیە شتێکە وەک هەر شتێکی دی، بەشێکە لە مرۆڤ، لەگەڵ ئەودا لەدایکدەبێت، لەگەڵ ئەودا دەمرێت، لە منداڵییەوە لەگەڵیدایە، وەک دەستی، وەک قاچی، وەک عەقڵی. بەڵام ئەوەت بیرنەچێت کە خەڵکێک هەن فریشتەکانیان بچوکە، هەستی پێناکەن، دێن و دەژین و دەمرن و هەست ناکەن شتێکیان هەیە ناوی فریشتەیە، وادەزانن فریشتە کۆمەڵێک مەخلوقاتی فڕۆکن وەک کۆتر و قاز و قەل.... ملیۆنەها مرۆڤ دێن و دەڕۆن و دەمرن هەر وا حیسابی فریشتە دەکەن، وەک جنۆکە، دێو، دەعبای ناو حیکایەت. دێن و دەمرن و فریشتە تەنیا وەک جۆرە شتێک دەبینن کە خودا ناردویێتی بۆ سەر زەوی تا لە شەڕی دووردرێژی مەلەکوتدا دژی ئیبلیس کۆمەک بە ئینسان بکات... مامی مامی ئەوە بە حیسابی ئەوان کۆنترین و درێژترین و نەبڕاوەترین شەڕی گەردونە».

لە دەرەوە بێدەنگییەکی کوشندە باڵی بە سەر دونیادا کێشابوو،

مەهدائیل گڵۆپی گەورەی ژوورەکەی خامۆشکرد و لەلاوە چرا گچکەیەکی سەر مێزیی داگیرساند. ئێستا ژوورەکە نیمچە تاریک بوو، مەهدائیل لەو ڕۆشنایییە کزەدا زلتر دەردەکەوت، بلوسێکی سووری پانی لە بەردابوو، کە پێدەچوو بۆ کەسێکی لە خۆی گەورەتر دروستکرابێت. سێبەری لە سەر پەردە و دیوارەکە وەها زل و تاریک بوو ژوورەکەی بچوکتر دەکردەوە، وەک خۆی ئاگای لە جوڵەی سەیر و نارێکی سێبەرەکەی نەبێت، کەوتە هاتوچۆ بە ناو ژوورەکەدا. هەندێجار بەرامبەر بولبولیار دادەنیشت و هەندێجاریش وەک یەکێک چاوەڕوانی هەواڵی منداڵبوونی ژنەکەی بێت بە ژوورەکەدا دەسوڕایەوە و قسەیدەکرد. بۆ بولبولیار تاریکی ژوورەکە تابلێی لە باربوو، لەجۆرە تیشکێکی وا هێمندا، دەیتوانی هەم ببینێت و هەم بیربکاتەوە و هەم لەزەت لەتەماشای مەهدائیل وەربگرێت، کە لەمجۆرە ڕۆشنایییەدا فریشتە ڕوونتر دیاربوو. مەهدائیل گووتی «بەوجۆرەیە فریشتەی تۆ لەگەڵ خۆتدا لەدایکدەبێت و گەورەدەبێت و دەژی، لەگەڵ تۆدا. سەیرکە، بولبولیار، باشترین شت بۆ ئەوەی لە من تێبگەیت ئەوەیە، وێنەی خۆت بۆ مرۆڤ بگۆڕیت. هەموو ئینسانێک دەشێت شتێکی تر بێت، تۆ دەتوانیت تۆ نەبیت. دەزانم ئێستا تۆ دەڵێیت من ئەم شارە دروستیکردوم، ئەم کۆمەڵە، ئەم گەڕەکە، ئەم زمانە... ئەم نازانم چییە... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەشدا تۆ دەتوانیت کەسێکی تر بیت. فریشتە ئەو مەخلوقەیە کە ئەگەر هەستی پێبکەیت لە ناختدا و فەرامۆشی نەکەیت، بەزۆر نەیخنکێنیت، پرسیارت لێدەکات. فریشتە وەک تۆ بە وردی نازانێت باشترین شت چییە، نوێنەری خودا نییە لە ناوتدا، بەڵکو نوێنەری ئەو ڕێگایانەیە کە تاقیت نەکردونەتەوە، نوێنەری ئەو پرسیارانەیە کە لە خۆتی ناکەیت. مرۆڤ تا لە خۆبایتر بێت، تا دڵڕەقتر بێت، کەمتر گوماندەکات. فریشتە ئەو بوونەوەرەیە کە دەتوانێت هەموو کارتی یارییەکە جارێکی

تـر تێکەڵبکاتـەوە و بیداتـەوە دەستت و بلێـت جارێکـی دی و بـە جۆرێکـی دی دووبـارە گەمـەی خـۆت بکـە، ئـەوە ئیشـی فریشـتەیە... بـۆ ئـەوەی بـەردەوام بتوانیـت لـە سـەرەتاوە دەسـت پێبکەیتـەوە، بتوانیـت دەسـتێکی دی ئـەم قومـارە دووبارەبکەیتـەوە... فریشـتە ئـەو بوونـەوەرەی ناوتـە کـە پێتدەڵێـت ئایا ئـەم یارییـە دەدۆڕێنیت یـان نـا، ئایا لـەم قومـارەدا خـۆت دەدۆڕێنیـت یـان نـا. بـە مەرجـێ بهێڵیـت لەگەڵتـدا بێـت، نەیخنکێنیـت، وەک خـۆت کوێـری نەکەیـت». مەهدائیلـی فریشـتە ئەمجـارە ڕوونتـر لـە جاران قسـەیدەکرد، نەفەسـی کەمێک گیرابوو، کـە قسـەیدەکرد جۆشـێک و گەرمییـەک لەدەنگیـدا بـوو، کـە جـۆش و گـەرمـی باوکێکـی دڵسـۆزی بیـری بولبولیـار هێنایـەوە کاتێـک ئامۆژگاری فەرزەنـدی بـکات، دەموچاوێکـی پـان و ڕوویەکـی کەمێـک سـوورهەڵگەڕاوی هەبـوو، بولبولیـار لەگـەڵ گوێگرتـن لـە قسـەکانیدا، دەبـوو فریـای تەماشـاکردنی هەمـوو هەسـتان و جوڵەیەکـی بکەوێـت، هەوڵبـدات نەغمـەی ئـەو دیـو وشـەکان و ئـاوازی پشـت ڕسـتەکان بخوێنێتـەوە. زۆریـەی کاتەکـە ئەگـەر هاتوچـۆی نەکردبایـە لـە قەنەفەیەکـی یـەک تاکـی چەرمـدا نوقـم دەبـوو و بەبـێ هیـچ جوڵەیەکـی تایبەتـی دەدوا، خواسـتێکی تێدابـوو شـتەکان لـە بولبولیـار تێبگەیێنێـت. دوای کەمێـک بێدەنگـی، لێـوی سـپی و بەردەوامبـوو« ئـاوا سـەیرم مەکـە... مـن خۆشـم بـە ڕوونـی نازانـم چیـم، زۆربـەی فریشـتەکانی دی لـە مـن لاوازتـرن، بـەڵام مـن شـتێکم تێدایـە حـەز بـە نزیکـی بکـەم لە ئینسـانەوە، ئـارەزووی دۆسـتایەتیان بکـەم. ئـاوا سـەیرممکە. ئیشـی مـن ئەوەیـە فریشـتەکان ڕزگاربکـەم، فریشـتە بیمـار و نەخۆشـەکان. ناتوانـم زانیـاری زیاتـرت پێبـدەم، منیـش وەک تـۆ لـە مـرۆڤ کەوتوومەتـەوە، نـە هێـزی گـەورەم هەیـە و نـە یـادەوەری پـۆڵا و نـە توانـای سـیحراوی، هێنـدە هەیـە فریشـتەم و تـەواو، لـە بەرئـەوەی دوو باڵـم هەیـە و دەتوانـم فریشـتەکانی تـر ببینـم، بـە خـۆم دەڵێـم فریشـتە... مامـی مامـی ئـاوا سـەیرممەکە. لـەم شـارەدا تەنیـا مـن هـەم کار بـۆ ئـەوە

دەکەم فریشتەکان ڕزگاربکەین». لەویادا دەنگی هێمنتر و ترساوتر و غەمگینتر بوو «فریشتەکان لە مەترسیدان، هەموویان لە مەترسیدان، خەبەرم لە فریشتەی هیچ جێگایەکی تر نییە، بەڵام فریشتەکان لێرە لە مەترسیدان». بولبولیار بە دەنگێکی لەرزۆک، وەک یەکێک ناخی بە کاریگەریی شتێکی نادیار بلەرێتەوە گووتی «فریشتەکان چییانە؟ لە چی ڕزگاریاندەکەیت؟». مەهدائیل هەستایە سەرپێ و گووتی «هەڵبەت لە مردن، لە لەناوچوونی تەواوەتی». کەمێک بێدەنگ بوو و ئینجا بە سەرسامییەوە سەیری بولبولیاری کرد و گووتی «هیچ کات وەها ترسناک نەبووە، هیچ کات. ماوەیەکە بەرەو خراپی دەڕوات. شتەکان باش نایەنە پێشچاوم، پێدەچێت ڕۆژگارێکی خراپ بەرێوەبێت». بولبولیار بە هەمان دەنگی ترساو و نائارامەوە، گووتی «ڕۆژگاری خراپی چی؟». «ڕۆژگاری خراپ واتە سەردەمێک کە ئینسان پێویستی بە فریشتەکەی ناو ناخی خۆی نامێنێت، فریشتە وەک هەر شتێکی تر بە مرۆڤەوە بەندە، دیارە ئەوە لە کەسێکەوە تا کەسێکی دی دەگۆڕێت. لە هەندێک مرۆڤدا کە لە ژیاندا هیچ ناکەن، بەس دەژین، دێن و دەڕۆن و دەخەون و منداڵ دروستدەکەن و دەمرن. فریشتەکان ئیشیان نییە، لەگەڵ مرۆڤدا دەبن، وەک ئەوان خاو و بێئیرادەن. بولبولیار، ژیانی بەشی هەرە زۆری خەڵک خاڵییە لە هەموو شتێک، پوچە... زۆر پوچە. نابوەستە، من پێموانییە ژیان هەمووی پوچ بێت، یاخود ژیانی هەموو کەسەکان وەکو یەک پوچ بێت، پوچیش شتێکە بە یەکسانی دابەش نەکراوە... ژیان شتێک نییە جەوهەرەکەی لای هەموو کەس یەک شت بێت. گەر لە بیرت بێت ئەمشەو دکتۆر گووتی «ئینسان مەخلوقێکی هەڵەیە»... گەر بیرت بێت شتێکی وای گووت... بەڵام نا، ئینسان بوونەوەرێکی هەڵە نییە، نەوەکو هەڵە نییە، بەڵکو ئەگەر هەڵەش بێت هێزێک لە ناخیدایە دەتوانێت ڕاستیبکاتەوە. من قەت لەم تورەبوونە بێمانایەی دکتۆر لەخودا

تێناگەم. تۆ دەتوانیت بە کیسەڵێک بە بۆقێک، بە قالۆنچەیەک بڵێیت هەڵەیە، بەڵام ناتوانیت بە مرۆڤ بڵێیت هەڵەیە، چونکە مرۆڤ بە پێچەوانەی هەموو بوونەوەرەکانی تر، تاکە شتی گەردونە کە دەبێت خۆی خۆی تەواو بکات. تێمدەگەیت بولبولیار .. تێمدەگەیت، خودا ئەو توانایەی پێبەخشیویت کە خۆت خۆت تەواوبکەیت... جەهەنەم شوێنی ئەو کەسانە نییە کە سێکسی حەرام دەکەن یان نوێژناکەن یان ناچن بۆ حەج، ئەوانە هەمووی قسەی پڕوپوچن. جەهەنەم شوێنی ئەوانەیە کە ئەو توانا گەورەیەی ناو خۆیان ناخەنە کار... ئەو توانایەی نەتوانن خۆیان تەواوبکەن... هیوادارم تێمبگەیت». بولبولیار بە ڕاشکاوانە گووتی «نا جەنابی مەهدائیل تێناگەم». «باشە... باشە... تۆ هەمیشە توانای ئەوەت هەیە شتێک بگۆڕیت، هەموو ئینسانێک مەحکومە بەوەی خۆی خۆی تەواوبکات، ئینسان بوونەوەرێکی ناتەواوە، بەڵام هەڵە نییە... ئیشی من وەک فریشتە ئەوەیە یارمەتیت بدەم تۆ بتوانیت خۆت خۆت تەواوبکەیت. هەمو ئەو هێزانەی مرۆڤیان ئابڵۆقەداوە، پێیدەڵێن: تۆ ئەمەیت، تۆ ئەوەیت یان دەبێت ئەوە بیت یان ئەمە. بەڵام ئێمەی فریشتە لێیدەپرسین: بۆ؟ دەڵێین نا، دەڵێین دەشێت تۆ شتێکی تریش بیت، دەشێت بە ڕێگایەکی تریشدا بڕۆیت، دەشێت چیرۆکێکی ترت هەبێت. فریشتە جەوهەرە بێگەردەکەتە بەر لەوەی ئەوانی تر بێنە ناوتەوە و شتێکی ترت لێدروستبکەن... فریشتە خۆتی بەر لەوەی دونیا لە هەموو لایەکەوە داگیرتبکات، بەرلەوەی تەواو تەسلیمی ئەوانی تر بێت». بولبولیار گووتی «ئەی فریشتەی من کوا... فریشتەی من لە کوێیە؟ بۆ ئێمە دەژین و هەستی پێناکەین». «بەشی هەرە زۆری مرۆڤ لە بەشی هەرە زۆری ژیانیاندا هەست بە بوون و نەبوونی فریشتە ناکەن، چونکە فریشتە مەخلوقێکی بێدەنگە، ناهێڵێت ببینیت و هەستی پێبکەیت، وەک چۆن بەردەوام هەست بە جەریانی خوێن و تەزووی

خەیاڵی خۆت ناکەیت، هەست بە بوونی ئەویش ناکەیت... بەلام کە فریشتەکان نەخۆشدەکەون، کە هەستدەکەن تەواو خنکاون، تەواو لەبیرچوونەتەوە، کەدەزانن مرۆڤ هەموو شتێک پێچەوانەی ئەوە دەکات کە لە ناخیدا دەیەوێت، کە دەبینێت هێزێکی تر لە دەرەوە، ئینسانی لە سەر شتێکی بەد کۆککردوە، کە دەبینێت ئینسان بە بڕوایەکی ئەستوور و کوشندەوە درۆ لەگەڵ خۆیدا دەکات، لەویادا فریشتەکەی ناخی نەخۆش دەکەوێت».

مەهدائیل لەویادا وەستا و سەیری بولبولیاری کرد. وەک ئەوەی قسەکان ئەم گەنجە ڕیشن و باریکەیان تەواو ترساندبێت، بە سامێکەوە پرسی «ئەی کە فریشتەکان نەخۆشکەوتن دواتر چی دەبێت؟». «گوێبگرە هۆشەنگی عەزیزم، بەشی هەرە زۆری فریشتەکان لە ناخی مرۆڤدا دەمرن و کەس هەستیان پێناکات، بەلام هەندێجار کە مرۆڤەکان تەواو پیسدەبن، تەواو لە هەموو شتێکی درێو و ترسناکەوە دەنالێن، ئەوکات هەندێ لە فریشتەکان هەوڵدەدەن ڕابکەن، هەوڵدەدەن بێنە دەرێ. وەک چۆن کەسێک دەیەوێت لە گەمارۆی ئاگرێکی گەورە هەڵبێت، فریشتەکان دەیانەوێت هەڵبێن، تێدەگەیت دەیانەوێت لەو جوغزی مردنە دەرچن و بیشکێنن... باڵەکانیان درێژدەکەن و هێدی هێدی هەوڵدەدەن بترازێن».

بولبولیار بە ترسەوە گوتی «کەوا بێت ئەو مەخلوقە باڵدارانەی من دەیانبینم، چیین... کێن؟». «جیابوونەوەی فریشتە لە ئینسان ئاسان نییە، ماوەیەکی درێژی دەوێت تا فریشتەیەک دەتوانێت لە خاوەنەکەی ڕابکات، فریشتەکان کە زانیان بوون بە مەخلوقاتی بێسوود، بوون بە بەشێکی زیادە، بە شتێکی فڕێدراو و فەرامۆشکراوی ناو ئینسان، ئیدی دەڕۆن. ئەو کەسانەی تۆ دەیانبینیت، تەواو فریشتەکانی ناو خۆیان

فەرامۆشکردوە... ئەو مرۆڤە باڵدارانەی تۆ دەیانبینیت، فریشتە نین، بەڵکو ئەوانەن کە فریشتەکان لە ناخەوەڕا باڵەکانیان بۆ جیابوونەوە و هاتنەدەرەوە درێژکردوە... گوێبگرە بولبولیار، بەشی هەرە زۆری فریشتەکان کە دێنەدەرێ دەمرن، بەشی هەرە زۆریان دەمودەست یان پاشماوەیەکی کورت دەمرن، گەر نەمرن لە بەرئەوەیە هێشتا شتێک بە ناخی مرۆڤەوە گرێیاندەدات. فریشتەکان کە دێنە دەرەوە، لە جێگایەکدا دادەنیشن و دەمرن، لە ژێر درەختێکدا، لە کەلاوەیەکدا، لە گوێ ئاوێک، بە ماندوویی خۆیان کێشدەکەن و بەبێدەنگی و بە ئازارێکی زۆرەوە ماڵاواییدەکەن، بەڵام زۆر کەم کەس دەیانبینێت. تۆ یەکێکی لەوانە، یەکێکی لەو مرۆڤە کەمانەی دەتوانیت فریشتەکان یان هەندێکیان ببینیت، وەک دکتۆر شوکاک... وەک ئەو. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت ئێوە لە ناختاندا فریشتەکەی ناو مرۆڤتان خۆشدەوێت... یان... نازانم؟... ڕەنگە هۆکەی ئەوەبێت فریشتەکەی ناو ڕۆحی خۆتان ئازار نەداوە، یان ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت لە دروستکردنی ئەم دنیایەدا بەشداریتان نەکردوە... من نازانم... نازانم بۆ تۆ یان دکتۆر شوکاک من و باڵەکانم دەبینن و کەسێکی تر نایانبینێت؟. دوور نییە قسەکانی دکتۆریش دروست بێت، بە دووری مەزانە من مەخلوقی ناو خەوی هەر دووکتان بم. من مەهدائیلی فریشتە هیچ نەبم جگە لە خەونێک کە تۆ و دکتۆر شوکاک و کەسانێکی تر لە یەککاتدا دەیبینن... خەونی بەکۆمەڵی هەندێک مرۆڤی کەم بم کە لەم شارەدا پێویستیان بە منە، پێویستیان بەوەیە باوەڕیان بە فریشتەیەک هەبێت. عەقڵتان، زانستتان، حیکمەتتان پێتاندەڵێت: شتێک نییە ناوی فریشتە بێت، پێتاندەڵێت، مرۆڤ جگە لە هاودەمی گورگ هیچی تر نییە، بەڵام بێئاگای خۆتان، لەگەڵ ئەوەی هەموو پیسی و دڵڕەقی ئینسان دەبینن ناتانەوێت باوەڕبکەن، لە جێگا هەرە تاریکەکانی بیرکردنەوە و خەیاڵتاندا حەزتان لەوەیە باوەڕبکەن کە

مرۆڤ لە ناخدا گورگ نییە و فریشتەیە... حەزتان لەوەیە باوەڕەکەن کە هاوڕێکانتان یان خۆشەویستەکانتان دڵڕەقن، وەک دکتۆر شوکاک کە نایەوێت باوەڕبکات کە ژنەکەی فریشتە نییە. دوور نییە من خەوێک بم کە لە یەک کاتدا لە ناو کۆمەڵێک سەری جیاوازدا دەسوڕێمەوە، تارماییەک بم کە دەتوانم لە یەک ساتدا لەناو دەیان خەیاڵدا بێم و بڕۆم... دوور نییە، وڕێنەی ئەوانە بم کە دەزانن شتەکان بەرەو خراپتر دەڕۆن. نازانم، منیش نازانم چییم، بەڵام دەزانم گەر بەرهەمی خەونەکانی ئێوەبم، یاخود لە دەستکردی وڕێنەکانی ئێوەبم، هیچ لەوە ناگۆڕێت کە من هەم و هەست بە خۆم دەکەم، هەست بە باڵەکانم دەکەن، هەست بە بوونی فریشتەکانی تر دەکەم، دەزانم ئیشێکم هەیە دەبێت جێبەجێیبکەم. من هەرچییەک بم ئێستا لێرەم، لەم ژوورەدا لەگەڵتدام، هەردووکمان لێرەین، یەک دەبینین، قسەدەکەین، دەزانین دکتۆر شوکاک، لەو دیو خەوتووە، لەوانەیە ئەویش ئێستا خەو بە منەوە ببینێت. دوور نییە هەموو ئێوارەکە بە ورد و درشتییەوە بە دەستکردی شەراب بزانێت و وەک وڕێنەی مەستان بێتە پێشچاوی، بڵێت هەموو ژیانم لەگەڵ مەهدائیلدا هیچ نییە جگە لە نیشانەی تێکچوونی پەیوەندی من بە دونیاوە، دوای ئەوەی نەغەدە ماردینی هەموو ئەو کۆشکە هەواییانەی لە سەرمدا ڕوخاند کە دروستمکردبوون. بەڵام هەرچییەک بێت، ئێستا دکتۆر دەمبینێت و تۆش دەمبینیت، وەک چۆن دووجاری تریش منت بینیوە، وەک چۆن پێشتر مرۆڤە باڵدارەکانت بینیوە... نا من ناتوانم پێتبڵێم ئاخۆ تۆ نەخۆشی یان ساغ.. ئایا من هەم یاخود تۆ منت دروستکردوە... من هەم یان تۆ نەخۆشیت و ئەو چاوە قووڵ و دووربین و غەمگینانەت منیان دروستکردوە».

بە دەگمەن ڕێدەکەوت هۆشەنگی بولبولیار وەها تەماشابکات و بلەرزێت، کەمجار بەو جۆرە هێمنی خۆی لەدەستدەدا، ئێستا لە نێو

ئەو گەرما شەوانەیەی هاویندا، تەزوویەکی سارد بە لەشیدا تێدەپەڕی. توند هەردوو قۆڵی خۆی دەگرت و کەمێک چاوی لێکدەنا، وەک یەکێک هەر ئێستا لە گۆمێکی سارد هاتبێتە دەرێ دەلەرزی و بە ئەسپایی دەیگووت «مەهدائیل من نەخۆشم... نەخۆشم».

مەهدائیل بێئەوەی غەمخۆرییەک دەرخات، گووتی «دوور نییە نەخۆش بیت... بە هیچ جۆرێک دوور نییە. قەت خۆتت پیشانی دکتۆر داوە؟». «نا مەهدائیل، خۆم پیشانی دکتۆر بدەم بڵێم چی؟ بڵێم مرۆڤی باڵدار دەبینم؟ بڵێم فریشتە دەبینم قسەدەکات... چیرۆک دەگێڕێتەوە؟. چۆن دەتوانم وابڵێم، هیچ کەسێک باوەڕم پێناکات، دەمخەنە شێتخانەوە». مەهدائیل بە غەمگینییەوە لە سەر شوێنی جارانی خۆی دانیشتەوە و گووتی «ڕاستدەکەیت لەوەدا لە سەر هەقی، باشترە ئینسان نهێنییەکە لای خۆی هەڵگرێت. بەڵام تۆ خۆت باوەڕت پێمە... وانییە؟ باوەڕت پێمە؟». «یان دەبێت باوەڕ بە تۆبکەم یان بە عەقڵی خۆم. بەڵام مەهدائیل، من ماوەیەکی زۆرە باوەڕم بە عەقڵی خۆم نەماوە، ماوەیەکە هەستدەکەم نەخۆشکەوتووم و بەرەو شێتی دەچم، بەڵام هێشتا توانام هەیە ئەو شێتییە بشارمەوە، بەوەی بەردەوام سەیری دووردەکەم، بەردەوام خۆم واپیشاندەدەم کە لە جێگایەکی ترم و خەیاڵم لە شوێنێکی ترە، لە ڕاستیدا من جۆرە بەشەرێکم کە هەمیشە سەیری شوێنی تر و شتی تر و سەردەمی تر دەکەم کە لە منەوە دیارنین... بەوەش شێتێتییەکە دەکەم بە ژێرەوە. مەهدائیل من زۆر نەخۆشم. بەڵام پێمبڵێ ئەو هەمووساڵەی من تێیاندا تۆم نەبینی: لە کوێ بوویت... بۆ تۆم نەدەبینی؟». مەهدائیل بۆ یەکەمجار بە دەنگی بەرز پێکەنی، زۆر بەرز کە بولبولیار لەو باوەڕەدا بوو دکتۆر مستەفا شوکاک بە ئاگادەهێنێتەوە. لە پێکەنیندا مەهدائیل حەسرەت و نیگەرانی پێوە دیارنەما، وەک کەسێکی دڵنیا لە هەموو شتێک قاچی خستە سەر

قاچی و تەماشای بولبولیاری کرد و گووتی «عەزیزم من ناوەکەشتم بیر نەمابوو، خۆ خۆت بینیت، خۆت بە چاوی خۆت بینیت، من ناوەکەشتم بیرچووبووەوە. هەرکاتێک من ناوی تۆم بیرچووەوە، ئەوە نیشانەیە بۆ ئەوەی تۆش منت بیرچۆتەوە. مرۆڤ وایە جگە لە عەقڵ باوەڕی بە هیچ هێزێکی تری ناو خۆی نەماوە. من ڕێزم بۆ عەقڵ هەیە، لە بەردەمیدا دەنوشتێمەوە، بەڵام مرۆڤ نابێت هێند ترسنۆک بێت، هەر شتێک عەقڵ نەیتوانی تەفسیریبکات دەمودەست فڕێیبداتە ئەولاوە... بەداخەوە مرۆڤ وادەکات، ئەوەتا تۆش منت بیرچۆتەوە». بولبولیار وەک سەری زۆر بئێشێت، دەستی گرت بە سەرییەوە و گووتی «نا مەهدائیل، تۆم بیر نەچۆتەوە، بەڵام باوەڕم پێت نەبوو... دەبوو باوەڕم پێت نەبێت... من لە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشەوە هاوڕێکانم زۆربەیان لە سێدارەدران. من لەو سەردەمەوە خۆم دەشارمەوە. لەو ساتەوە وەک کەسێک دەژیم بوونی نەبێت، هەوڵدەدەم کەس بیرم لێ نەکاتەوە، دەمەوێت لە بیر شۆڕش بچمەوە، لە بیر دەوڵەت بچمەوە، لە بیر هاوڕێ دێرینەکانم بچمەوە... دەمەوێت نەمێنم، ببم بە هەڵم یان تارمایی یان هەر شتێک کە لە هەوادا بڵاودەبێتەوە و وندەبێت... لەو ساڵانەدا تەنیا یەک شت منی لە سەر زەوی ڕاگرتووە... یەک شت و هیچی تر، ئەویش شیعرە، حەزی من لە شیعر. حەزی بێمانای من لە شتێک کە هیچ لە دونیا ناگۆڕێت. لەو ماوەیەدا بینینی مەخلوقاتە باڵدارەکانم دەگێڕایەوە بۆ نەخۆشییەکی دەرونی. دەبوو زۆر ئیشبکەم بۆ ئەوەی شێت نەبم، لە بەرئەوە هەرکاتێک تۆ دەهاتیتەوە یادم، دەمودەست دەرمدەکردیت. زۆر توند دەرمدەکردیت، زۆر پێویستیم بە عەقڵم بوو، زۆر زۆر... بە جۆرێک ئەو پێویستییە ئازاری دەدام... دەبوو هەموو شتێک بەعەقڵ حیساببکەم، لە عەقڵیشمدا فریشتەکان بوونیان نییە... تۆ بوونت نییە... تەنیا کاتێک دەتوانم تۆ ببینم کە لە مرۆڤدا

شتێک ببینم عەقڵ نایبینێت. بەڵام لە من گەڕێ، لە بە سەرهاتی من بگەڕێ. بۆم تەواوبکە، حیکایەتەکەی خۆتم بۆ تەواو بکە، فریشتەیەک کە دێتەدەرێ دەچێت بۆ کوێ؟ چی دەکات؟ دەمرێت و تەواو. لە چنگ ئێمە هەڵدێت و دەمرێت... دەبێت ئەوە هەموو شتێک بێت... هەموو شتێک بێت؟».

«نا بەراستمە بولبولیار، پێشتر نەبووە، یاخود من نەمبیستووە لە هیچ سەردەم و جێگایەکدا فریشتەکەی ناخی مرۆڤ بەم جۆرە لە دەستی هەڵبێت، پێدەچێت ئەمە نەخۆشییەک بێت لە نێو فریشتەکانی ئەم شارەدا بڵاوبووبێتەوە. یەکەمجارە فریشتەکان بەوجۆرە مرۆڤ بەجێدەهێڵن... یەکەمجارە. بولبولیار خۆت دەزانیت چوونە دەرەوە بە شەو ئاسان نییە، بەڵام گەر دەتەوێت ئەمشەو دوو جێگای گرنگت پیشاندەدەم، دوو جێگای زۆر گرنگ. بەو مەرجەی گفتم بدەیتێ کە یارمەتیم دەدەیت. ئێمە جنسێکی نەخۆش و لێقەوماوین... ئەوەی بمانبینێت دەبێت کۆمەکمانبکات».

مەهدائیل دەنگی لەرزێک و غەمێکی قووڵی تێدابوو. بولبولیار لە جێگای خۆی هەستا و گوتی «مەهدائیلی فریشتە، بۆ ئەوەی تێبگەم تا بنی جەهەنەمیش لەگەڵتدا دێم... دەتەوێت چیم نیشانبدەیت، نیشانمبدە. لەوە زۆرتر بەرگەی گومان ناگرم... شتێکم پیشانبدە یەقینم بداتێ... شتێک یەقینم بداتێ، یەقین». مەهدائیل لە جێگای خۆی هەستا و بە ئەسپایی گوتی «یەقین؟. یەقین لە هیچ شتێکدا نییە، بەتایبەت من ئێستا گومانم لەوە هەیە من هەم یان نیم، ئاخۆ خەونێکم ئێوە دەمبینن یان گەر ئێوەش نەبن من هەم. تۆش نازانیت ئاخۆ من خەوێکم تۆ دەمبینیت یان چیم... لە بەرئەوە باسی یەقین مەکە، عەزیزم باسی یەقین مەکە... تەنیا شتێک من بڕوام پێیەتی و دەیبینم

و دەستی لێدەدەم، ئەوەیە فریشتەکان دەمرن. لەوە زیاتر یەقینی دیکەم نییە».

مەهدائیل و بولبولیار پێکەوە لە ماڵی مستەفا شوکاک هاتنەدەرێ، بێدەنگییەکی سەنگین هەم لە سەر زەوی و هەم لە ئاسمان بوو، مانگەشەوێکی ڕۆشنبوو، بەڵام پێدەچوو تریفەش بە جۆرێک ئالودەی هێمنی و خەوتن و بێدەنگی بووبێت، لەگەڵ تیشکی خۆیدا کێشی ئەو سەنگینییە هەڵگرێت. شەقامەکان ترسناک و پڕ لە چاوەڕوانی دەیاننواند، گەڕۆکی شەویش وەک هەمیشە لە هەرجێگایەکەوە دەربکەوتایە و بە هەر کوچەیەکدا بڕۆشتبایە ژیانی لە مەترسیدا بوو. گەر ئێستا یەکێک لەو تاریکییەدا بیبینینایە، وایدەزانی هەردووکیان فریشتەن، بە دوو هەنگاوی خێرا دەڕۆیشتن، گەرچی جلوبەرگ و ڕوخسار و شێوەی ڕۆیشتنیان بەیەک نەدەچوو، بەڵام ئیقاع و خێراییان وەکو یەک بوو، پێدەچوو هەردووکیشیان لە یەک باری ڕۆحیدا بن، کەمێک گورج، کەمێک پەلە، کەمێک وێڵ دیاربوون. دوای ئەوەی کۆمەڵێک گوزەریان جێهێشت و لە هەندێ شەقام پەڕینەوە، بولبولیار پرسی «بەڕێز مەهدائیلی فریشتە، دەمەوێت ئەوە بزانم، گەر فریشتەکان بڕۆن چی بە سەر مرۆڤدا دێت، دڵڕەقتر دەبێت یاخود چی؟». بەو پرسیارە مەهدائیل جۆشی ماڵەوەی تێکەڕایەوە و دەستیکردەوە بە قسەکردن و گوتی «ئینسان لە مێژووی دووروودرێژی خۆیدا و ساڵ دوای ساڵ و جەنگ دوای جەنگ و نەهامەتی دوای نەهامەتی ئەوەی بیرچۆتەوە کە فریشتەیەکی هەیە، مەرج نییە ئەوەشی فریشتەیەک لە ناوەوە ڕوناکیدەکاتەوە، ئاگاداربێت کە فریشتەیەک لە ناوەوە ڕوناکیدەکاتەوە... مامی مامی لەناو ئینساندا هێزی جیاواز قسەدەکەن، دەیان ئارەزوو و ویستی نهێنی پێکەوە دەنگ بەرزدەکەنەوە، دەنگ کە هیچ شتێک پێکەوە کۆیان ناکاتەوە، هەریەکەی پەلی مرۆڤ بۆ شتێک و بەرەو شوێنێک و ڕووەو مەبەستێک ڕادەکێشن.

دەنگی فریشتە زۆرجار نوزەیەکە، زۆرجاریش تەنیا نیگاکردنێکی غەمگینە لە هەموو شتەکان و کردەوەکان، زۆرجار ئەو فریشتەیە ساڵەهای ساڵ دەبێت بە ژێر ئەو دەنگانەوە. فریشتە لاوازە، کارێکی وەها گەورەمان لە ئینسان بۆ ناکرێت، تەنیا هاوارمان هەیە، ئەو هاوارەش بەتێپەڕینی زەمان و سەرقاڵی مرۆڤ بە دونیاوە، بۆتە نوزەیەکی بچوک کە کەم کەس دەیبیستێت. تا ئینسان کەمتر بگەڕێتەوە بۆ ناخی خۆی و کەمتر پرسیاربکات، کەمتر گومان بکات، فریشتەکەی زیاتر و زیاتر دەکەوێتە سەردابێکی تاریکەوە. بەشی هەرە زۆری فریشتەکان لەو سەردابەدا دەمرن، یان بێهۆش دەمێننەوە یاخود خەوتنێکی دووروودرێژ دەخەون... ئەوەی من فریشتە بناسم و لێی تێگەیشتبم، ئیشمان ئەوەبووە خەیاڵاتی ژیانی جیاواز دروستبکەین و بیخەینە بەر دەستی ئینسان. ئەوە ئیشی ئێمە بووە، بەڵام ئینسان ساڵ دوای ساڵ و سەدە لە دوای سەدە لەو دەردەوە ئاڵاوە کە یەک ڕێگا بگرێت و تا دەگاتە سەر جەهەنەمی خۆی پیابڕوات. ئەوە کارێکی کردوە ئێمە ببین بە مەخلوقاتی بێئیش کە تەنیا کارمان خەوتن و تەنیایی و مردن بێت. خەوێک کە زۆر کەم لێی بە ئاگادێن. بەوجۆرە ئێمە ساڵ دوای ساڵ لە سەردابێکی تاریکدا دیلدەبین، بێئەوەی هیچ کەس ئاگادارمانبێت یان بتوانین دەنگی خۆمان بگەێنینە مرۆڤ. هەندێجار و لە هەندێک مرۆڤدا فریشتەکان بەهێزن، ئاسان نامرن، لە ساتێکدا کە تەواو لە ئینسان بێهیوا دەبن بڕیاردەدەن زیندان بشکێنن و لەو بێدەنگییەدا نەمرن و بێنەدەرێ و بڕۆن و مرۆڤ بەجێبهێڵن. هەر فریشتەیەک کە لە سەر زەوی دەیبینی لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە، بەڵکو لە ڕۆحی مرۆڤێکی ماندوو هەڵهاتووە کە پەیوەندیی بە ناخی خۆیەوە، بەو فریشتەیەوە نەماوە کە لە ناویدا ژیاوە. ئا بولبولیار ئەو کەسەی فریشتەکەی ڕادەکات و لەدەستی هەڵدێت، چیدی لەوە دڵڕەقتر نابێت کە هەیە، هەر کات فریشتەکان هەڵهاتن واتە ئینسان دوا سنووری

خۆی بڕیوە. زۆربەی خەڵک فریشتەکانی خۆیان نابینن، کە باڵەکانیان درێژدەکەن، کە دەیانەوێت بترازێن و لە ئینسان دەرچن و لە تاریکیدا نەمرن. نایانبینن، چونکە هیچ کات نەیانناسیون، هیچ کات هەستیان پێ نەکردون، هیچ کات گوێیان لەدەنگیان نەبووە، بەڵام هەندێک مرۆڤی تر نا... هەندێک مرۆڤی تر نا... هەندێکیان باڵەکانی خۆیان دەبینن، ڕۆژێک لە بەر ئاوێنەیەکدا دوەستن و باڵەکانی ئەو فریشتەیە دەبینن کە دەیەوێت لێیان دەربچێت، ئەو بوونەوەرەی بە هەموو هێزی خۆی دەیەوێت لە مرۆڤ بترازێت. ئێمە مەعشەری فریشتەکان وەهای ناودەنێین «ترازان»... ترازان ساتێکی گرنگی بوونی ئێمەیە، ئەو ساتەیە کە بە هەموو توانای خۆمان باڵمان بەرەو دەرەوەی ئینسان درێژدەکەین... تراک... بە هەموو توانای خۆمان یەک جار، چی هێزمانە کۆیدەکەینەوە و باڵەکانمان بەرەو دەرەوە دەکێشین. ئەوانەی فریشتەکانی خۆیان دەبینن لە لەشیان دێتەدەرێ و بە ماندوویێتی، وەک مەخلوقێکی تێکشکاو و شکست، نەخۆش و ترساو دێتەدەرێ، تێناگەن... تەواوی ئەو ساتە بە خەونێکی ناخۆش دەزانن، بە مۆتەکەیەکی ترسناک... فریشتەکان کە دێنەدەرێ غەریبن، توانای قسەکردنیان نییە، توانای ڕۆیشتنیان کزە، توانای فڕینیان نییە، زۆربەیان نەخۆشن. زۆربەیان لە کاتی هاتنەدەرەوەدا دەمرن. ئەوان بەپلەی یەک لە ناو ئینساندا دەتوانن بژین، وەک بوونەوەری سەربەخۆ هەڵناکەن، بۆیە پێویستیان بە یارمەتی هەیە، پێویستیان بە پزیشک هەیە، پێویستیان بەوە هەیە خاوەنەکەیان بیانبینێت و لە باوەشیانبگرێت بۆ ئەوەی بتوانن بژین... گەر بەپێی ئەزموونی ئەم چەند ساڵەی خۆم قسەبکەم فریشتەکان زۆربەیان کە دێنەدەرێ تاریکی و بێدەنگی و فەرامۆشی دوورودرێژ کوشتوونی، بەدەگمەن فریشتەیەک دەبینیتەوە وەک مەهدائیلی هاوڕێت تەندروستی باش بێت، بەدەگمەن. بولبولیار، بزانە من هەموو شتێک دەربارەی

فریشتەکان نازانم، بەڵام لەو ساڵانەدا کە خۆم وەک فریشتەیەکی تەنها هەست پێکرد، فریشتەیەکی بێخاوەن و بێساحێب، کە کەسێک منی بۆ کارێکی نەزانراو لە سەر زەوی جێهێشتووە، نە شتێکی تەواوم لە سەر مێژووی ئینسان دەزانی و نە شتێکی ئەوتۆش لە سەر مێژووی فریشتەکان. دەبێت بڵێم ئەوسا فریشتە هەڵهاتووەکان زۆر کەم بووین، زۆر کەم بووین... هێندە کەم هیچ ئینسانێک هەستی بە بوونمان نەدەکرد، لەم شارە گەورەیەدا چەند دانەیەک بووین... لەو دەمەدا شەوێک فریشتەیەکی پیرم لە نزیک مزگەوتی مەلا لەقلەقەوە بینی، لەو سەرسوچەدا کەدەچێتەوە سەر ئامادەیی سەفینی کچان، فریشتەیەکی ریش سپی و ماندوو، گەرچی جووتێک باڵی زۆر گەورەی پێوەبوو، بەڵام بە ئەستەم دەیتوانی بیانجوڵێنێت. فریشتەش هەرکاتێک نەیتوانی باڵەکانی خۆی بجوڵێنێت و بەرزیانبکاتەوە و یاریان پێبکات، دەریانبخات و بیانشارێتەوە، ئیدی نزیکی مردنە. عەرەبانەیەکی زۆر گەورەی پێبوو... ئەو عەرەبانەیەی کە تۆ یەکەمجار بینیت. یەکەمجار لە رێگای ئەوەوە زانیم کە ئیشی من ئەوەیە فریشتە مردووەکان کۆبکەمەوە، بەم شار و دەڤەرانەی دەوروبەردا بگەڕێم و لە هەر جێگایەکدا تەرمی فریشتەیەکی مردووم بینی بیخەمە سەر ئەو عەرەبانەیە و بیبەم بۆ گۆڕستانی فریشتەکان... خوالێیخۆشبێت ناوی ئەلیائیل بوو، دۆست و برادەری لەناو ئادەمیزاداندا زۆربوو، من و تۆ ئێستا دەچین بۆ کەشتیی فریشتەکان. بەڵێ عەزیزم دەبێت ئێستا بچین بۆ کەشتیی فریشتەکان، سەرەتا بۆ گۆڕستانی فریشتان و دواتریش بۆ بیمارستانەکە».

هەر رستەیەک لە زاری مەهدائیل دەترازا بۆ بولبولیار وەک تیر و کوتەک بوو. مەهدائیل دوای ئەوە بێدەنگ بوو، سەری داخست و وەک بیر لە شتێکی دی بکاتەوە، ماوەیەک بە هێمنی رێیکرد. بولبولیار لە ناوەوە

شڵەژا بوو. وەک کەسێک درەنگ گەیشتبێتە وێستگەی شەمەندەفەرێک و جگە لە چۆڵەوانی و تاریکی، هیچی دی نەمابێت لەگەڵیدا سەفەربکات، پەشۆکاو و بزر دیاربوو، وەک ناچاربێت لە دوا ساتدا پلانی سەفەرێکی گرنگ و دووروودرێژ بگۆڕێت، سەیری مەهدائیلی کرد و گووتی «ها... چۆن... بەرەو کوێ، بەرەو کوێ؟». مەهدائیل بێئەوەی وەڵامبداتەوە، دەستی خستە گیرفانی و سەری داخست.

بولبولیار هەستیکرد لە جێگایەکدان نزیک لە گەڕەکی غەمپاشاوە، بەڵام کوچەیەک و ڕێگایەکە پێشتر نەیبینیوە، بە تەنیشت ڕیزێک باڵەخانەی کۆن و بێدەنگدا تێپەڕین کە پێدەچوو پێکڕا چۆڵبن و کەس لە ناویاندا نەژی. دوای کەمێک ڕۆیشتن، گەیشتنە بەر دیوارێکی گەورە، شورایەکی کۆن و ئەستوور، ئەو هەستەی دەدایە مرۆڤ وەک لە بەردی قەڵا دێرینەکان دروستبووبێت. بە ڕاستەی دیوارەکەدا ماوەیەکی کەم ڕۆیشتن و گەیشتنە بەر دەرگایەکی ئاسنینی بچوک، وەک هەر یەکێک لەو دەرگا نەخشدارانەی ئاسنگەرە دەستڕەنگینەکانی شار دروستیدەکەن. مەهدائیل بە کلیلێک دەرگاکەی کردەوە و گووتی «ئێرە لە شارەوانی وەک موڵکی حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین تۆمارکراوە، یەکێک لە مەللاک و زەویدارە بەناوبانگەکانی شار، کە پێدەچێت یەکێک بێت لەو یەکەمین کەسانەی فریشتەیان بینیوە و لەگەڵ عەلیائیلی فریشتەدا دۆست و برادەربووە. وەک بیستوومە ناوی مەلەکبین لەوەوە هاتووە کە توانیوێتی مەلەک ببینێت و خەڵکی بە هۆی ئەوەوە، جا بۆ گاڵتە بێت یان بۆ حورمەت ناوی مەلەکبینیان لێناوە. خۆی لەو خانووەدا ژیاوە». بە دەستی ئاماژەی بۆ خانوویەکی گەورەکرد کە دەکەوتە لای چەپی بێستانێکی بچوکەوە. «بەڵێ ئەمە هەمووی موڵکی حاجی ئیسماعیل بووە، ئێستا ئێمە هەموو موڵکەکە بە کەشتیی فریشتەکان ناودەبەین، سەرچاوەی ناوەکە دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندییەکی دێرینی حاجی

ئیسماعیلی مەلەكبین لەگەڵ یەكێك لە ڕۆشنفیكرانی سەردەمی خۆیدا كە جێگایەكی هەبووە ناوی كەشتی نوح بووە. لە كەشتی نوحدا قسە لە ڕزگاركردنی هەموو توخمەكانی گیانەوەر كراوە بەڵام قسەوباسێك لە سەر فریشتە نەكراوە، دەڵێن ئەو زاتە دوای ئەوەی هەموو ئەم چیرۆكەی لە دەمی حاجی ئیسماعیلەوە بیستووە، پێشنیاری ئەوەی داوەتێ كە جێگاكە ناوبنێت كەشتی فریشتەكان، وەك شوێنێك كە فریشتە خنكاوەكانی ناو ئینسان لە تۆفانی داهاتوو ڕزگاردەكات. حاجیش لە بیرۆكەكەدا هەم واتایەكی دینی و هەم مەجازێكی قەشەنگ دەدۆزێتەوە و جێگاكە ناو دەنێت كەشتیی فریشتەكان. ئیتر بەشی هەرە زۆری موڵكەكەی خۆی لە پشتەوە تەرخاندەكات بۆ ئەوەی بكرێتە گۆڕستانێكی گەورە بۆ فریشتە مردووەكان، هەر لە سەر نەفەقەی خۆشی ئەو بینا گەورەیەی دروستكردوە و داینـاوە ببێتە بیمارستان و پشووخانەیەك بۆ فریشتان». بە دەستی ئامـاژەی بۆ بینایەكی گەورە كرد لە ناو تاریكیدا، بینایەكی كەمێك دوور كە بە پێچەوانەی ماڵ و درەخت و شتەكانی دییەوە، تاریكتر دەینواند. .دوای ڕۆیشتنێكی كورت بە ناو باغ و بێستانێكی چڕدا، مەهدائیل دەستی بولبولیاری گرت و گووتی « ئێرە خۆیەتی، ئێرە خۆیەتی... ئێرە كەشتیی فریشتەكانە... كەشتیی گەورەی فریشتەكانی شارە. من كلیلەكانی ئەم جێگایەم لە عەلیائیلی فریشتە وەرگرت». گۆڕستانێك بوو بچوك، لەوانەبوو تەنیا چەند گۆڕێكی تێدابێت. گۆڕەكان زۆربەیان تەخت و كێڵەكان هەندێكیان بێناوبوون. وەك مانگ بە ئەنقەست ڕۆشنایی خۆی بگرێتە ئەو سوچەی زەمین، گۆڕستانەكە تیشكێكی تایبەت و زەرد و ترساو ڕوناكیكردبووەوە. بولبولیار سەیری لە پان و بەرینی ئەو موڵكە هات، جێگاكە بەدەمییەوە بوو گەرەكێكی بچوكی تێدا دروستبكرێت، بەڵام یەكێك چواردەوری كردبوو بە باغ و ناوەڕاستی موڵكەكەشی بۆ ئەم گۆڕستانە جێهێشتبوو. مەهدائیل

وەک یەکێک سەر لە نوێ و لە جێگایەکی دیکەوە حیکایەتێک بگێڕێتەوە، گوتی «بەو جۆرەیە، ئەم کەشتییە لە سەر موڵکی حاجی ئیسماعیلە کە چەند ساڵێک لەمەوبەر کۆچی دواییکرد، ئێستا مامۆستا ڕێزانی کچی، کە مامۆستایە لە قوتابخانەی سەرەتایی پەرۆش، ئەویش فریشتەبینێکی بێوێنەیە، موڵکەکانی حاجی دەباتبەڕێوە. ئەو بینایەش کە پیشانمدایت... کە دەکەوێتە پشت ئەم بەشەی بێستانەکەوە، بیمارستانی فریشتە نەخۆشەکانە، ڕێزان خان چەند ساڵێکە بەتەواوەتی گواستوێتییەوە بۆ ئەوێ. چەند ساڵێکە ژوورەکانی پێشەوەی وەک ماڵ بۆ خۆی بەکاردەهێنێت، خانووە کۆنەکەی حاجی ئیسماعیلیش، شوێنی پشووی من و هەندێک لە فریشتەکانی ترە، کە لێرە بەناوی باغەوانەوە کاردەکەین». بولبولیار سەیری گۆڕستانە زەردەکەی کرد و نەیزانی چی بڵێت، هەندێک لە کێلەکان ساڵی ناشتن و شوێنی دۆزینەوەی تەرمەکانیان لە سەربوو، نوسراوی سەر هەندێک لە کێلەکانی خوێندەوە «یەزدانئیلی فریشتە، لە ئەیلولی ١٩٧٨ دا لاشەکەی لە شەقامی وەفایی دۆزرایەوە»، «دارایلی فریشتە، شوباتی ١٩٧٩ لاشەکەی لە پشت ماڵی مام ڕەفعەتەوە کەوتبوو» «فریشتەیەکی بێناو، نیسانی ١٩٨٣، لاشەکەی لە بەردەم چاپخانەی سەلامدا بوو» «سەلمائیلی فریشتە، ئەیلولی ١٩٨٠، لاشەکەی لە دەرەوەی شار لە ژێر سنەوبەرێکدا دۆزرایەوە» «فریشتەیەکی بێناو، کانونی دووەمی ١٩٧٠ لە بەردەم حەمامی مومتازدا سەرما کوشتبووی» «فریشتەیەکی بێناو، بەهاری ساڵی ١٩٧٧لە کۆڵانێکی ئەودیوی ماڵی حوسنی خانی کەوادرووو مردوە». کۆنترین گۆڕی گۆڕستانەکە دەگەڕایەوە بۆ ناوەڕاستی چلەکان. پێدەچوو عەلیائیلی فریشتە، دامەزرێنەر و دروستکەری گۆڕستانی فریشتەکان بێت. مەهدائیل گوتی «بەپێی ئەو چیرۆکانەی من بیستوومن، حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین، لەگەڵ فریشتە تایبەتییەکەی خۆیدا کە بەناوی «حاجیئیل»وە ناسراوە، عەلیائیلی

فریشتەیان دۆزیوەتەوە «دیارە حاجی ئیسماعیل بە ڕەحمەت بێت ئەوی هەر بە ئەلیائیل بانگدەکرد»، وەک دەڵێن بە نەخۆشی هەڵیانگرتۆتەوە و خزمەتیانکردوە و لە مردن ڕزگاریانکردوە، هەتا قسەیەک هەیە کە دەڵێن دوور نییە ئەلیائیل هەر فریشتەی شەخسی دووەمی حاجی بێت، کە بینیویێتی و هەڵیگرتۆتەوە. بەڵام ئەوە جێگای باوەڕ نییە، چونکە من تائەمڕۆ زانیارییەکی وەهام نییە بیسەلمێنێت کە مرۆڤێک دەشێت دوو فریشتەی هەبێت و هەردووکیشیان بتوانن لەدەستی هەڵبێن. دیارە حاجی خۆی پیاوێکی دڵڕەق بوو، سەرەتا نازناوی حاجی ئیسماعیلی قژانپەرست بوو، ئێستاش بەشی هەرە زۆری خەڵک هەر بە قڕانپەرست ناویدێنن. گووتوویانە حاجی لە هەر جێگایەک قڕانێکی بینیبێت لە سەر چۆک بۆی چووە، بەڵام دوای مردنی حاجیئیل و دەرکەوتنی ئەلیائیل ژیانی بە تەواوی گۆڕاوە. زۆر مرۆڤ کە دەزانن فریشتەکانیان مردوە، دەبنە مرۆڤی چاکەکار و گەورە. دواجار چاکە و خراپە گرێدراوی هوشیارییە. کە دڵنیابوویت ژیانێکی بەد ژیاویت و ڕۆحت بە جۆرێک بە دەرد و پیسی ئالودە کردوە فریشتەکەت ژەهراویبێت و بمرێت، ئیتر هەندێک هۆشیان دەگەڕێتەوە بەر خۆیان و خۆیان دەبنەوە فریشتە. من لەو سەردەمەدا لێرە نەبووم، شتێکی تەواو لە سەر ڕاست و دروستی ئەم چیرۆکانە نازانم، بەڵام بە گشتی ئەلیائیلی فریشتە، کەسێکی ناوازەبووە. کە من بینیم تەواو پیربووبوو، بەڵام دیاربوو لە گەنجیدا چ هێز و ئیرادە و توانایەکی گەورەی هەبووە، ئەو منی لەوە ئاگادارکردەوە کە هێدی هێدی ژمارەی فریشتە مردووەکان بەرەو زیادبوون دەڕۆن. گووتی کە ڕۆژگارێکی خراپمان لە پێشە. ئەو بە حاجی ئیسماعیل و ڕێزانی کچی ناساندم کە لەو دەمەدا تازە لە شێتخانە گەڕابووەوە. ڕێزان سەرەتا کچێکی ماخۆلان و تورەبوو کە بینینی فریشتەکان ناڕەحەت و نادڵنیایان دەکرد. چەند ساڵێک لە بەغدا سەریان لە کارەبا دابوو،

کە هاتەوە عەلیائیل کردبووی بەدۆست و هاوڕێی خۆی و تەواو بە جیهانی فریشتەکان ئاشنایکردبوو، دەڵێن هەندێ شەو سێ قۆڵی لەگەڵ حاجی ئیسماعیلدا چوون بۆ هەڵگرتنەوەی تەرمی فریشتەکان. کە من عەرەبانەکەم وەرگرت، گۆڕستانەکە لە چەند گۆڕێک زیاتری تێدا نەبوو، عەلیائیل وردەکاریی ئیشە نوێکەمی بە وردی بۆ وەسفکردم. لە هەر شت گرنگتر چۆنێتی ڕەفتارکردن بوو لەگەڵ فریشتە نەخۆشەکاندا. بەڵام دەبێت پێتبڵێم کە عەلیائیل ئەودەم نەیدەزانی لە سەردەمەکانی تردا و لە شوێنەکانی تر پەیوەندی نێوان ئینسان و فریشتە چۆن بووە. ڕۆژێکیان بە منی گووت کە ئەو زۆر لەو چیرۆکانەی خوێندۆتەوە کە مرۆڤ لە سەر فریشتە نوسیویانن و تووشی نائومێدییەکی گەورە بووە. هەندێ ڕۆژ بەیانی تا ئێوارێ لە کتێبخانەی گشتی خەریکی خوێندنەوەی ئەو کتێبانەبوو کە مرۆڤەکان لە سەر فریشتە نوسیویانن. باوەڕی وابوو ئینسان فریشتە ناناسێت، بە درێژایی مێژوو یان وەک بوونەوەرێکی فەنتازی سەیریکردوە یان وەک پەیامنێرێکی خودایی. بە درێژایی مێژووی ئەدەب، مرۆڤ وەک بابەتێکی تایبەت بۆ کەیف و سەفا، وەک کاراکتەرێکی خۆش بۆ چیرۆک، وەک بوونەوەرێک کە خەیاڵ ختوکە دەدات، نەوەک بەشێکی ماندوو لە ڕۆحی خۆی فریشتەی بینیوە. بەبڕوای عەلیائیل، ئینسان لە ڕێگای ئەدەبیات و چیرۆکەوە هەمیشە فریشتەی لە خۆی دوورخستۆتەوە، ئەوی خستۆتە بەرێکی دونیا و خۆشی خستۆتە بەرێکی دیکە، تا بتوانێت ئەو ڕستە ترسناکەی خۆی دروستبکات «من فریشتە نیم». بەبڕوای عەلیائیلی مامۆستام، ئەوە ترسناکترین ڕستەیەکە ئینسان لە مێژووی خۆیدا دروستیکردبێت. «من فریشتە نیم... من فریشتە نیم... من فریشتە نیم». مرۆڤ بەردەوام ئەو ڕستە بێمانایە دووبارە دەکاتەوە، بۆ ئەوەی ڕێگا بە خۆی بدات تاوانەکان ئەنجامبدات. ئینسان نایەوێت باوەڕ بەوە بهێنێت کە فریشتە بەشێکە لە خۆی، بەردەوام وەک

غەریبەیەک، وەک خەیاڵێک، وەک خورافەتێک سەیری فریشتەکەی ناو ناخی خۆی دەکات. مامی مامی... گەر بەقسەی عەلیائیلی فریشتە بێت، مێژووی ئینسان مێژووی هەڵهاتنێتی لە فریشتەکەی ناخی خۆی.. ئەو ڕایوابوو کە ئەوە ئینسانە، لە فریشتە دەترازێت نەوەک بە پێچەوانەوە.. بەڵێ عەلیائیل وایدەبینی فریشتەکان دەردەکرێن، وەک چۆن میوانێک لە ماڵ دەکرێتە دەرەوە، فریشتەکان بەو شێوە دەردەکرێن. مرۆڤ هەموو شتێک دەکات و هەموو هەوڵێک دەدات بۆ ئەوەی فریشتەکەی ناو ناخی خۆی بیربچێتەوە، لە بەرئەوەی لە بنەڕەتدا ناتوانێت گوێی لێبگرێت ناشزانێت چی دەوێت... ئیشی فریشتەکان ئەوە نییە مرۆڤ لە ئاسمان نزیکبکەنەوە، بەڵکو ئیشیان ئەوەیە وابکەن مرۆڤ خۆی لە نزیکترەوە ببینێت... بۆیە نهێنییەکی گەورەت پێدەڵێم کە دەبێت بیزانیت، زۆر لەو فریشتانەی من بینیومن، مولحیدن، لە مرۆڤ بەولاوە باوەڕیان بە خودایەکی تر نییە لە سەر زەوی».

هەندێک بە ناو گۆڕستانی فریشتەکاندا گەڕان، دواتر مەهدائیل گووتی «باشترە بیمارستانی فریشتەکانیش ببینیت، ئێرە هەمووی پێکڕا پێیدەگووترێت کەشتیی فریشتەکان... هەمووی پێکڕا. بەڵام لە بیمارستان دەتوانیت بۆ یەکەمجار لە نزیکەوە دەست لە فریشتەیەکی ڕاستەقینە و نەخۆش بدەیت... ئێستا چەند نەخۆشێکمان هەیە کە ژیانی هەموویان لە مەترسیدایە، مەسەلەی مردنیان تەنیا مەسەلەی کاتە».

هەر دووکیان بە ناو بێستانەکەدا ڕووەو ئەو بینا هێمن و بێدەنگەی ناو تاریکی ڕۆیشتن. مەهدائیل بەردەوام لە ناو پێچاوپێچی درەختەکاندا ڕێگای نیشانی بولبولیار دەدا، بەدەم ڕۆیشتنەوە گووتی «لەدوای مردنی حاجی ئیسماعیلی مەلەکبینەوە، ڕێزانی کچی کاروباری بیمارستانەکەی بەجوانی گرتۆتەدەست، تاکە دکتۆرێک کە دەتوانێت فریشتەکان ببینێت مستەفا شوکاکە، ئەوە تەنیا پزیشکی ئێمەیە. لەو ساڵانەدا ڕێزانی

مەلەکبین، زۆر ڕێگای بەبایەخی لە زیندوو ڕاگرتنی فریشتە نەخۆشەکاندا دۆزیوەتەوە، موخابن ئێستا خەوتووە، بەڵام دەتوانیت بەیانی ببینیت، ئەو لەخەیاڵی دامەزراندنی جەمعییەتێکی نهێنیدایە بۆ ئەوانەی فریشتەکان دەبینن، بینینی تۆ خۆشحاڵیدەکات، بەدڵنیاییەوە گەر بزانێت گەنجێکی وەک تۆ توانای بینینی فریشتەکانی هەیە، بەختەوەردەبێت».

پێکەوە بەرەو بینای بیمارستانەکە هەنگاویان نا، بێدەنگییەکی قورس لە سەر هەموو جێگاکە نیشتبوو، تارمایی هەردووکیان لە بەر دەرکی بیمارستانەکەدا بە تارمایی دوو نەیاری دەکرد، بیانەوێت لە تاریکیدا پلانێکی کوشندە ببەنبەڕێوە. وەک شەو لەوێدا بووبێتە قەڵغان و بەراورد بە شوێنەکانی دی چڕتر و بڕینی سەختتر بێت، کەمێک هەنگاوەکانیان خاوبووەوە، بولبولیار لە نزیکەوە قەوارەی بیناکەی گەورەتر و بەشکۆتر بینی وەک ئەوەی لە دوورەوە دیاربوو، ئێستا دەیبینی کە تەواوی بیناکە شێوەی کەشتییەکی گەورەی هەیە، بەڵام تاریکی نەیدەهێشت هەموو هێڵ و ستوون و کشان و شکانەوەکانی بە ڕوونی دەربکەوێت. موچڕکێکی سامی پێداهات و ئاشکرا هەیبەت و شکۆی شوێنەکە ترساندی، جێگاکە وەها بوو وەک ئەوەی بینای ئەمیرێکی تەلیسماوی دێرین بێت و لە مێژە چۆڵ بێت و بە خورافەت گەمارۆ درابێت. مانگەشەوەکە لەوێدا بەر بەربەستێکی نهێنی دەکەوت و جۆرە شەبەنگێکی بەرزی بەدەوری ئاسمانی شوێنەکەدا دەکێشا، ڕێگای بەردەم بیمارستانەکە بەردڕێژ بوو، بولبولیار بۆ یەکەمجار بە ڕوونی گوێی لە دەنگی پێی خۆی و مەهدائیل بوو، مەهدائیل بە هێمنی پێش بولبولیار کەوت و گوتی «من کلیلەکانم پێیە، پێشدەکەوم». دەنگی لەوێدا سەدایەکی مەلەکوتی تایبەتی هەبوو، ئەوە یەکەمجار بوو بولبولیار بە ڕاستی ئەو هەستەی لادروست ببێت کە مەهدائیل فریشتەیە، موچڕکێکی ساردی دیکە بە لەشیدا تێپەڕی و سەیرێکی دیکەی هەیبەتی شوێنەکەی کرد، هەموو شتێک لەوە

دەچوو بەراستی لە خەودا بێت، بەڵام چەند هەنگاوێکی بۆ پێشەوە نا، هەنگاوەکانی وەهابوون وەک ئەوەی لە سەردەمێکەوە پێبنێتە ناو سەردەمێکی تر، لە جیهانێکەوە بکەوێتە ناو جیهانێکی دی. مەهدائیل کە دەرگای بیمارستانەکەی کردەوە، جیڕەیەکی سامناک لە دەرگاکەوە هەستا... بولبولیار ئاوڕیدایەوە و گوێی لە دەیان باڵندەبوو لە سەر درەختەکان ترسان و هەڵفڕین، لەو باوەڕەدا نەبوو ئەو هەموو باڵندە خەوتووە لە سەر درەختەکان بووبن... بەر لەوەی پێبخاتە ناو دەرگای کەشتییەکەوە گوێی لە مەهدائیل بوو، بە دەنگێکی تایبەت، دەنگی بە هەیبەتی فریشتەیەک، گووتی «بەخێربێیت هۆشەنگی بولبولیار بۆ ماڵی فریشتەکان... بەخێربێیت بۆ ناوازەترین شوێنی دونیا.. بەخێربێیت»

# گرتنی دکتۆر مستەفا شوکاك

لیڤیتانت لە یەککاتدا بە دڵسۆزییەکی بێوێنەوە هەم بۆ ئێمە و هەم بۆ بەعسییەکان ئیشیدەکرد، بێئەوەی هەستێکی ناکۆک و ویژدانێکی ناڕەحەتی بۆ دروستببێت. لە ماوەی کارکردنیدا بۆ ئێمە، زیندانێکی بچوکی بۆ ویستی خۆشی دروستکرد، بۆ ماوەی کەم خەڵکی دەگرت و بە سەرانە ئازادیدەکردن. ئەو کەسانەی دەیبردنە ئەوێ لەوانەبوون کە کێشەی سیاسیان نییە، بەشی هەرە زۆریان لە سۆنگەی جەنگ و جەدەلی ناو خێزان و عەشرەتەوە تووشی گرفت دەبوون و دەکەوتنە داوی لیڤیتانتەوە، هەمیشە یەکێک پارەی دەدایە لیڤیتانت تا ناسیاوێکی بۆ بگرێت و ئازاری بدات. لیڤیتانت بەوە هەم ئارەزووی خۆی تێردەکرد و هەم پارەیەکی مفت و زۆری کۆدەکردەوە کە پێدەچێت هەندێک لە سەرانی گەورەی بەعس چ لە ڕێکخراوەکانی حیزب و چ لە مودیرییەتی

ئاسایش لەگەڵیدا خاوەن بەش بووبن. شکایەتێکی زۆر لە خەڵکەوە دژ بە لیڤیتانت دەهات بۆ شۆڕش، بەڵام لە ڕاستیدا شکایەتەکان هەمیشە بە زەردەخەنەوە وەردەگیران و بە زەردەخەنەوە لە بیردەبرانەوە. ئەو کەسێک نەبوو بکرێت ئاسان گورزی لێبدرێت. تاکە شتێک لیڤیتانت زۆر سووربوو لە سەری دواکەوتن و گرتنی نزار ئیدریس بوو. گرتنی نزار بۆ حیزب دەکرا ئەنجامی خراپی هەبێت و ڕیز دوای ڕیز ڕێکخراوەکان ئاشکرابکات، لە بەرئەوە هەڤاڵ شێرخان بە نامەیەک لیڤیتانتی ئاگادارکردەوە کە شۆڕش خواستەکەی ئەو جێبەجێدەکات، بەڵام بە شێوازێکی تر و بە چەشنێک هێزی حیزب لە شاردا نەخاتە مەترسییەوە، گەر کەمێکیش سەبربکات خۆی هەموو شتێک دەبینێت. لیڤیتانت لەو ڕووەوە زۆر بنکۆڵ و دڵبز بوو، خواستێکی سەیر لە ناخیدا بوو هەموو شتێک دەربارەی نزار بزانێت، ئەو وەسواسی ژیانی بوو، شتێک وای لێدەکرد بەدوای ئەو گەنجەوە بێت، وەک ئەوەی ئەو کوڕە سەمبولی شتە ئەستەم و عاسی و بێلغاوەکان بێت. هەڵبەت دوای گەڕانەوەی لیڤیتانت لە بیمارستان، گەڕانی پیاوانی ئەمن بە دوای نزاردا بە وردی دەستی پێکرد، ئەو زامنەی خزمانی قزڵباش بۆیان دابینکردبوو، چیتر کاریگەری نەما. بەڵام ئێمە نزارمان لە جێگایەکدا شاردەوە کە دەوڵەت نەیدۆزێتەوە. بەڵام کەسێکی وەک لیڤیتانت، ئاسان دانەدەسەکنا و ئارام نەدەبوو، هەر خۆی لە ڕێگای پیاوەکان و چاوەکانییەوە کەوت بە سەر چیرۆکی پەیوەندی نێوان نەغەدە ماردینی و نزار ئیدریسدا. ئێستا دەتوانم ئەوساتە بهێنمە بەر دیدەی خۆم کە تێیدا لیڤیتانت بەو چیرۆکەی زانیوە، کە تێگەیشتووە نەیارە گەورەکەی، دوژمنەکەی کە ئەو هەردەم وەک دوپشکێکی عاسی و زیرەک تەماشایکردوە، لەوە بەتواناتر و وریاترە کە ئەو تێگەیشتووە و حیسابی بۆ کردوە. ژنی دکتۆرێک ببێتە عەشیقی مانای دەتوانێت لە هەموو کونێک و دەرگایەکەوە دەربازبێت، ئەوەی زانیارییەکانی بۆ ئەو

بردبوو، کەسێک بوو سەر بە دونیای شاعیرانی شارەکە، کە وەک هەموو دونیاکانی تر پڕ لە کینە و ملشکاندن بوو. ئەوەی هەواڵەکەی بۆ هێنا ئەوەی بۆ ئاشکراکرد کە نەغەدە ماردینی جگە لەوەی کچی دکتۆرە و ژنی دکتۆرە، شاعیرێکی پڕ بەهرەشە، حەزیشی لە نزار ئیدریس شێتانە و بێسنوورە.

ئەو کەسەی ئەو هەواڵەی بۆ برد، بێئاگای خۆی کاریگەرییەکی قووڵی لە سەر ژیانی لیڤیتانت بەجێهێشت، وامەستدەکەم بۆ ساتێک بیریکردۆتەوە و پرسیویێتی دەبێت ئەو ژنە کێ بێت کە نزار وەها بەهێزە بتوانێت داگیربیکات، بۆ ئەو دەتوانێت وا مەکربازبێت و ئەم ناتوانێت. ڕەنگە بۆ ساتێک هەموو یارییەکەی لە خەیاڵی خۆیدا پێچەوانەکردبێتەوە، گووتبێتی «ئاخۆ گەر من دیلبامایە و ئەو زیندانەوانم بایە، بەوجۆرە ئەشکەنجەی بدامایە؟ ئاخۆ گەر من دیلبامایە دەمتوانی لە دەستی هەڵبێم؟ دەمتوانی کەسانێک بدۆزمەوە بەوجۆرە ببنە پشت و پەنام؟ ئاخۆ دواتر بەوجۆرەی من کەوتمە دوای، دەکەوتە دوام؟ ئەی من دەموێرا تەقەی لێبکەم؟ دەمتوانی لە هیچ شتێک نەترسم و لە ناوەڕاستی شاردا بیدەمە بەر گووللە؟ دەمتوانی ژنی دکتۆرێک بکەمە عەشیقەی خۆم و وابکەم خۆشیبوێم، ژنێک هەم سەر بە چینە باڵاکان بێت و هەم لە توخمی ئەو شاعیرانەش بێت کە من خۆشم ناوێن؟». لیڤیتانت عادەتی بوو بەرلەوەی بە نێچیرەکەیەوە بدات بە وردی سەیربیکات، هەتا لە پسمامانیش وەها بوو، دەیانگووت بەر لەوەی بکەوێتە ئەشکەنجەدان، بەرلەوەی چنگ و ددان و کەڵبەکانی لە زیندانییەکان گیربکات، بە وردی و هێمنی تەماشایاندەکات... وەک ئەوەی بیەوێت تێیانبگات و نهێنییەکیان بخوێنێتەوە هێمنیاندەکاتەوە، سەیری چاویان دەکات، سەیری بەری دەستیاندەکات، سەیری ناو دەمیان دەکات، دەست لە قژیان دەدات. لیڤیتانت لە سەر هەمان ڕێتم ویستی بەر لەوەی بیر لە گرتنی نەغەدە

ماردینی بکاتەوە، بیبینێت، بزانێت ئەم ژنە کێیە کە وائاسان خیانەت لە دکتۆرەکەی مێردی دەکات و لەگەڵ جادووبازێکی وەک نزاردا سەروکاری هەیە.

بەیانییەک کە خانمی ماردینی دەچوو بۆ زانکۆ، ماشێنەکەی لە نزیک ماڵیانەوە وەستان و لە ناویدا بە هێمنی دانیشت تا خانم لە دەرگای ماڵ هاتەدەر. بەیانییەک بوو خانمی ماردینی لە جوانترین ڕوخساریدا بوو، قژێکی قەفقەف و درێژی بەردابووەوە، جووتێک چاوی خومار، لێوێکی سووراوکراوی تەڕ، باڵایەک وەک سەروو... لەجلەکانی زانکۆدا، بەبۆنی کتێبەکانی دەستیدا، بە جۆری ڕۆیشتنیدا دڵی دادەخورپاند. ئاخۆ لیڤیتانت لەساتی یەکەمەوە حەزی لێکردوە؟ نازانم. من لیڤیتانت بناسم لەو پیاوانە نەبوو لە نیگای یەکەمەوە حەز لە ئافرەت بکات، بەڵام لە نیگای یەکەمەوە شتێکی لە نەغەدەدا بینیوە کە نەیتوانیوە لە بیریبکات... ئەوە وەک گووتم سیحری هەرە گەورەی خانم بوو. لەو ساتەوە ئیتر لیڤیتانت نەیتوانی نەغەدە ماردینی لەبیربکات، وەک کەسێک داڕوویەکی کاریگەر و بێهۆشکەری خواردبێت ماوەیەک لە ماشێنەکەدا دانیشت و تەنیا سەیری ئاسمانی کرد... هەستی بەلاوازییەک کرد قووڵتر لەلاوازی هەر مەخلوقێکی تر لە سەر زەوی. لاوازییەک بەوە لەنێوناچێت نزار ئیدریس بکوژێت، نەغەدە ماردینی بگرێت، بەڵکو جۆرە لاوازییەکی قووڵتر و کاریگەرتر. گەورەترین لاوازی دونیا، لاوازی پیاوێک کە دڵنیانییە ئاخۆ دەتوانێت دڵی ژنێک داگیربکات یان نا؟. لیڤیتانت ساڵەهای ساڵ ئەو ساتەی لە یادنەکرد کە تێیدا نەغەدە ماردینی بینی، چونکە لەو ساتەدا نزار ئیدریسی زۆر لە خۆی بەهێزتر هاتە بەرچاو، تێگەیشت تەنیا ڕێگایەک بۆ ئەوەی نزار ئیدریس ببەزێنێت، ئەوەیە ئەم ژنەی هەبێت، تاکە ڕێگایەک بۆ ئەوەی هەستبکات نزاری بەزاندووە، ئەوەیە ئەم خاتوونەی لێبستێنێت و ببیات بۆ خۆی و وابکات هی ئەم بێت.

لەم ساتەدا گرتنی ئەم ژنەی وەک گرتن و بەستنەوەی هێزی نزار سەیردەکرد، ئەوەی ئەم ژنەی هەبێت مانای هێزی نزاری هەیە، مانای توانیوێتی لە بەرزترین و ئەستەمترین دەستکەوتیدا بیبەزێنێت، مانای هەمان ئەو شتە بگرێت کە دەتوانێت ئەو بیگرێت....

ئەو بەیانییە لیڤیتانت بە تورەیی و مۆنییەکی نائاساییەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆشکەکەی، تایەکی لێهاتبوو لەوانەی تاریکیاندەکرد و ڕەش دایاندەگەڕاند. ئەو بەردەوام هەستێکی قووڵی بە بردنەوە و دۆڕان هەبوو، ژیانی لە سەر لۆژیکی ئەو گەمەیە دارشتبوو، ئاخۆ براوەم یان دۆڕاو... کێ لە من بەهێزترە؟ بۆ بەهێزترە؟. پێوەرەکانیشی بۆ ئەو گەمەیە، قورس و ئاڵۆز بوون. لەو ساتەدا کە لە بەغداد لە بیمارستان کەوتبوو، ئەو هەستەی لا دروستبووبوو کە بوونی بەردەوامی ئەم لە ڕیزی لایەنە بەهێزەکەدا نەیکردووە بە کەسێکی بەهێز، بەڵکو هەمیشە لە بەردەم نزاردا یاریکەرە دۆڕاوەکەیە، ئەمڕۆش کە نەغەدەی دەبینی پتر هەستی بەو دۆڕانە دەکرد... تورە و نەخۆش دەگەڕایەوە بۆ سەر قەرەوێڵەی خوشکەکەی لە ژوورە ڕەشەکەیدا و دەرگای لە سەر خۆی دادەخست، تای لێدەهات و عارەقەی ڕەشی دەردەدا. لە ناو جێگەکەی خۆیەوە بە نەخۆشی فەرمانی بە پاسەوانەکان دا ئێستا واز لە نزار ئیدریس بهێنن و چیتر بەدوایدا نەگەڕێن، چونکە گرتن و کوشتنی هیچ ئازایەتییەکی تێدا نەماوە، ئەوەی ئێستا نزار بکوژرێت ئەو هەستەی لابەجێدەهێڵێت کە تا هەتاهەتایە ئەم شەڕەی بەرامبەر ئەو دۆڕاندوە. بردنەوە ئەوەیە لە دڵدا دوژمنەکەت بپێکیت، لەو جێگایەدا بیبەزێنیت کە مەیدانی ڕاستەقینەی جەنگە، وەک خۆی دەیگووت «ئیفتیخاری بشکێنیت».
لە سەر قەرەوێڵەی بیمارییەکەی بیری لەوە دەکردەوە کە تەقەکردنی نزار ئیدریس لەو لە ناوەڕاستی شاردا، لە ناوەڕاستی چەکدارەکانیدا، لە ڕۆژی ڕووناکدا کردەیەکی ئازایانە بووە، کردەوەیەک کە تەنیا لە

پیاوێکی دڵڕەقتر و ترسناکتر و بەهێزتر لەم دەوەشێتەوە. وەک ئەوەی پێیبڵێت، هەموو دەوڵەتەکانی دونیا لە پشتت بن، من لە تۆ بەهێزترم. وەک ئەوەی بڵێت هێزی ڕاستەقینە ئەوە نییە کە ئەوانی تر بۆت دروستدەکەن، بەڵکو ئەوەیە کە لە ناو خۆتەوە دێتەدەرێ... ئێستاش کە ئەو خاتوونە سیحراوییەی دەبینی زۆر قووڵتر و گەورەتر هەستی بە پەرتی و هەڵوەشان و لاوازی دەکرد، لە ژێر بەتانییە ڕەشەکەی خۆیەوە، بیریکردەوە کە مێردی ئەم ژنە شایستەی مردنە، شایستەی ئەوەیە مرۆڤ ئازاری بدات، ئەو لە هەموو بوونەوەرێک ناچیزتر و لاوازترە، ئەو دکتۆرە لە مەخلوقە هەرە بچوک و بێنرخ و لاوازەکانە کە بەوجۆرە ژنەکەی خۆی پێشکەش بەم چەقۆکێش و دەستبڕ و دەمدرێژە کردوە. ئێستا لیڤیتانت هەموو شتێکی دەزانی، دەیزانی ئەم عەشقە کەی و لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە، لە دڵی خۆیدا دەیگووت «کەواتە ئەم دکتۆرە هیچە، ئەم قالۆنچەیە کاتی خۆی نزاری لە خەستەخانە دەربازکردوە و ژنەکەی خۆشی پێبەخشیوە... تف... تف». ئێستا هەستیدەکرد دەبێت ئەو قالۆنچەیە بپلیشێنێتەوە، دەبێت ئەوە سەرەتای هەر نزیکبوونەوەیەکی ڕاستەقینەی ئەو بێت لەم خاتوونە، دەبێت مێردەکەی وەک کرمی سەر قولاپی ماسی بخاتە گۆمەکەوە، وەک جرج زەنگوڵەیەک بە کلکییەوە ببەستێت، بۆ ئەوەی تاهەتاهەتایە زرینگەی بێت. شەو بەو نەخۆشییە هەستا، بەو تا گەرمەوە خۆی لە ژێر بەتانییەکەوە کێشکردە دەرێ، چاوانی سوور و ئاگرین و توڕەبوون، جلکە سەربازییەکانی پۆشی و بە شۆفێرەکەی گووت بمگەێنە ژوورەکەی خۆم لە دائیرە. لە ناو ماشێنەکەدا بە ئەستەم دەیتوانی هەناسەبدات، هەوای بە سەختی هەڵدەمژی و سەر سینەی قورس بوو. شۆفێرەکەی چەند جارێک وەستا بۆ ئەوەی دڵنیابێت ئاخۆ حاڵی لیڤیتانت باشە یان پێویستدەکات بچنە بیمارستان. لیڤیتانت دواجار بە توڕەییەوە گووتی «پێمگووتی لێخورە

بۆ دائیرە... گەر بە مردوویی گەیشتووم، بمگەێنە دائیرە و جارێکی تر مەپرسە». کە لە ماشێنەکە دابەزی وەها ڕەش داگەڕابوو لە شەو سیاتر دەینواند، وەک بوونەوەرێک لە دەست سوپاکانی مردن رایکردبێت، خۆی کرد بە حەوشی دائیرەدا، پاسەوانەکان پێشتر وەها توڕە و نەخۆش و تاریک نەیانبینیبوو، بەردەوام دەکۆکی و خیزەی سنگی دەهات. کە گەیشتە ژوورەکەی خۆی و لە سەر کورسییەکەی دانیشت داوای کەمێک ئاوی لە یاوەرەکەی کرد و گووتی «عەلیشم بۆ بانگبکە، گچکە نا... عەلە لووتن». عەلە لووتن بەرپرسی یەکەمی چەکدارەکانی ئەو بوو، گەنجێکی کونج، لووتدرێژ، چاو بچکۆلە، دڵڕەق. عەلە ئادەمییەکی هەمەچیز بوو، هەتیوباز، ژنباز، قەحبەباز، قومارچی، دز، پیاوکوژ، بەدمەست... هیچ شتێک نەبوو لەوانەی خودا حەرامیکردوە ئەو نەیکات. هاتنی عەلە تەنیا چەند ساتێکی کورتی برد، لیڤیتانت گەرچی لە غەم و هەستی شکستدا هەناسەی باش بۆ نەدەدرا، بەڵام هەرچۆنێک بووە پێیگووت «عەلی، گوێبگرە، ئیشێکی زۆر گرنگم هەیە کە دەبێت هەر ئێستا جێبەجێیبکەیت... هەر ئێستا. دەڕۆیت و لەگەڕەکی مەلئاوا، لە پشت بەنزینخانەکەوە، دکتۆر موستەفا شوکاکم بە شەق بۆدەهێنیت... تێدەگەیت... دکتۆر موستەفا شوکاک خۆی، دەست بۆ ژنەکەی نابەیت، تێدەگەیت، پەنجە لە ژنەکەیەوە نادەیت، ئەگینا هەر بیست پەنجەکەت دەقرتێنم و دەیخەمە قوونتەوە، تێدەگەیت، بۆیە وادەڵێم، چونکە دەزانم ژنەکەی ببینیت خۆت ناگریت، بەڵام ئەوە پێمگووتی، قەسەم بە خوا پەنجە بۆ ژنەکەی بەریت، لە ناوەڕاستی شاردا دەرپێکەت دادەکەنم و بە گۆچانێکەوە لە پاشەڵتدا گەڕەکاو گەڕەک دەتگێڕم، بەڵام مستەفا شوکاکم تا ئێرە بە شەق بۆ دەهێنیت، گەر لە ماڵ نەبوو دەچیت بۆ خەستەخانە، عاقڵانە و بە هێمنی دەچیتە ژووری، لە هەر کوێ بوو دەیدۆزیتەوە، بە حورمەتەوە دەیهێنیتە دەرەوە و دەیگریت، کە سوار

ماشێنەکەت کرد و چاوی کەست لێدیار نەما، تا دەیگەێنیتە بەردەمم دەم و لەوسی دەکوتیتەوە». عەلە بە پێکەنینەوە گوتی «جەنابی لیڤیتانت، دڵنیابە، ئەمرت بەجێیە و خاترجەم بە وا دەکەم. هەر ئێستا دەڕۆم». بەر لەوەی بڕوات لیڤیتانت پێیگوتەوە «کەدەیهێنیت دەبێت هەموو گیانی خوێن بێت، تێدەگەیت... هەموو گیانی». عەلی لە نێو دەرگاکەوە گوتی «گەورەم خەمت نەبێت... خەمت نەبێت».

ئەو شەوە دکتۆر مستەفا شوکاکیان لە ماڵەوە دەرهێنا. سەرەتا وەک خووی ئەودەمی کە هێشتا دکتۆرێکی بێغەم و دونیانەناس بوو هەر پێدەکەنی. بەڵام کە عەلە لووتن و چەکدارەکانی لە بەردەرگاکەدا بە ڕاستی کەوتنە لێدانی، دەستیکرد بە گریان... هەموو گەڕەک بینیان کە بە دەست چەکدارەکانەوە دەگری، نەغەدەی ژنی لە باڵکۆنی ماڵەکەوە بەساردی وەک یەکێک لە شەڕی نێوان دوو کەسی نامۆ و نەناس بڕوانێت، لە سەرەوەڕا گریانی دکتۆری بینی، دکتۆر سەری بۆ بەرزکردەوە و بەچاوە گریاو و ترساو و شەیداکانییەوە دوا نیگای کرد، ئەو کراسێکی شیفۆنی سووری خەوی لەبەردابوو، بێ ڕۆح، بێ هیچ هەستێک، بێ هیچ بەزەییەک، بێ ئەوەی هەست بە شتێکی تایبەتی بکات، سەیری چاوانی دکتۆری کرد، کەسیان لەو ساتەدا نەیاندەزانی کە ئیتر تا چەندین ساڵی دی یەکتر نابیننەوە.



کە دکتۆر موستەفا شوکاک گەیشتە دائیرە، نیوەمردو بوو، لاشەیەکی نیوەڕۆح و بێهۆش کە نەنوزەی تێدابوو، نەدەیتوانی زاریبکاتەوە، نە بە تەواوی پێڵو و برژانگە خوێناوی و پشتچاوە تەقیوەکەی هەڵبهێنێت. لیڤیتانت نەیویستبوو بەوجۆرە لە حەرامی بگێڕن، بەڵام کاتێک بەو چەشنە بینی هیچی نەگووت، فەرمانیدا بە کورسییەکەوە بیبەستنەوە

و بەجێیبهێڵـن... لیڤیتانـت بـە درێژایـی شـەو قسـەی بـۆ دکتـۆر مسـتەفا شـوکاک کـرد، خـۆی بەتانییەکـی تەنکـی لـە خۆیـەوە پێچـا، چیـن چیـن عارەقـی دەردەدا و بێنـەوەی چاوەڕوانـی وەڵام بێـت، قسـەی بۆ دکتۆر دەکرد. دکتـۆر تەنیـا دەیتوانـی گوێبگرێـت، نـە هێـز و نـە دەرفەتـی وەڵامدانـەوەی نەبـوو. هیـچ ئازارێـک لـەوە سـەختتر نییـە مـرۆڤ ناچاربێـت گوێبگرێـت و نەتوانێـت بـە وشـەیەکیش وەڵام بداتـەوە، بـەڵام دکتـۆر بـە جۆرێـک ئـازاری هەبـوو، بـە جۆرێـک دەم و لێـوی تەقیبـوون، ددانەکانـی وەهـا ئەزییەتیـان پێگەیشـتبوو، نەیتوانـی لێـوی هەڵبهێنێـت و تەنیـا بـە ئەسـتەم لـە ژێـر پـەردەی بریـن و خوێنـەوە تارمایـی لیڤیتانتـی دەبینـی.

ئـەو پێیگـووت «بەشـی ئـەوە هۆشـت هەیـە تێمبگەیـت. دەزانـم گوێـت لێمـە و دەزانـی دەڵێـم چـی. بۆیـە بەوجـۆرە ئـازارم دایـت، چونکـە شایسـتەی ئـازاری. لـەم شـەوەوە تـا ماویـت ئـازار دەسـتت لێبەرنـادات... کەسـێکی دەهێنیـت ئـازاری زۆر بچێژیـت. ئەشـکەنجە هـەم کار و هـەم ئـارەزووی منـە ، حـەزم لەوەیـە ئینسـان لـە حاڵـەتی زەعیفیـدا ببینـم، زەعیفـی تەواوەتـی، بـەڵام دکتـۆر زەعیفـی چییـە؟.. تـۆ دکتـۆری و لـە مـن زیرەکتـری، زەعیفـی چییـە؟. چەنـدە مەراقمـە لـە هێـز تێبگـەم، ئەوەنـدەش مەراقمـە لـە لاوازیـی تێبگـەم».

لیڤیتانـت هـەرکات تووشـی ئـەم دۆخـە دەروونییـە دژوارە دەهـات، بـە سـەختی وشـەکان لـە دەمـی دەهاتنـە دەرێ. ئـەو شـەوە ئارەزوویەکـی قووڵـی هەبـوو لـە بـەردەم ئـەم نیوەمـردووەدا هەمـوو شـتێک بڵێـت، هەسـتیدەکرد هەردووکیـان لاوازن، هەردووکیـان قوربانـی نزار ئیدریسـن، ئارەزوویەکی نهێنی دەیجوڵانـد خـۆی لـە بـەردەم ئـەم دکتـۆرە تێکشـکاوەدا بکاتـەوە کـە هێـزی نییـە لێوانـی خۆشـی بجوڵێنێـت. کەمێـک کۆکـی و گووتـی «دکتـۆر زەعیفـی چییـە؟ کـە نەخۆشـێک دێتـە بەردەمـی تـۆ و لـە سـەر تەختـی نەشتەرگەری دەخەوێـت، زەعیفـە؟ ئاخـۆ مـرۆڤ دەتوانێـت بـە لاواز نـاوی ببـات؟ لەوانەیـە

لە ڕاستیدا خۆی پادشا بێت، بەڵام لە بەردەستی تۆدا وەک مردوویەک وەهایە، تۆ ئەوەی لێدەکەیت کە دەتەوێت، لەبەر ئەوە نازانم لاوازیی چییە؟ نازانم؟. گەر وا بیربکەمەوە ئێستا تۆ لە بەردەم مندا زەعیف نیت... منیش ئیشم ئەوەیە جەلاد بم، ئیشم ئەوەیە، وەک تۆ چۆن لەشی ئەوانی دی دەکەیتەوە بۆ ئەوەی پارچەیەکی زیادی لێدەربهێنیت، بۆ ئەوەی شتێکی تێدا ببڕیت، گۆشتێکی ڕزیو و نەخۆشی لێبکەیتەوە، منیش وادەکەم، منیش خۆم پیاوکوژ نیم، ناڵێم کەسم نەکوشتووە، خەڵکم کوشتووە، بەڵام پیاوکوژنیم. خەڵکانێک هەن کەس ناکوژن و پیاوکوژیشن، لە هەرە پیاوکوژە گەورەکان پیاوکوژترن... ئەوەش هەیە. پیاوکوشتن ئەوەیە ئارەزوویەکت هەبێت یەکێک لە سەر زەوی نەهێڵیت، تەواو بیسڕیتەوە، وەها لە نێوی بەریت ببێتە تۆز، تۆزێکی ورد ورد کە نەنرێتەوە بەیەکەوە. من ئارەزووی وەهام نییە... حەزم لەوەیە لەگەڵ قوربانی و ژێردەستەکانمدا هەتاهەتایە لەم شارەدا پێکەوەبین، پێکەوە قسەبکەین، جار جار دانیشین، گەر پێویست بوو ڕێزم بگرن و ڕێزیان بگرم، بەس من کەی ویستم ببمەوە بە حاکم و ئەو ببێتەوە بە بەردەست، مرۆڤی بەهێز پێویستی بە کڕنوشە. مردوەکانیش ناتوانن کڕنوش بەرن... ئەوە تەنیا شتە حەزم لێیەتی. ئینسانی مردوو شتێک نییە من بتوانم هیچی لەگەڵدا سازبکەم. حەزم لە یەک شتە دکتۆر، گەر بۆم بکرێت قەڵایەکی بەرز دروستبکەم، قەڵایەکی قایم، قەڵای من بێت. وەک قەڵای ئەمیرە کۆنەکان، خاوەن ئەمارەتەکان، لەویادا هەر کارێک دڵم بیەوێت بیکەم، بە مەرجێ ئەو هەستە دام نەگرێت کە لاوازم، ئەوە تەنیا شتە کە دەمکوژێت... ئیشی من ئەوە نییە، بە دەستی خۆم کەس بکوژم، هەمیشە خەڵکێکی تر هەیە ئەوە دەکەن... تۆش گەر بکوژرێیت یەکێکی تر دەتکوژێت... یەکێکی تر».

کەمێک وەستا و قووڵ هەوای وەرگرت و قۆپچەی سەرەوەی

کراسەکەی ترازاند و بەردەوام بوو «خۆشی ئیشەکەی تۆش لەوەدایە هەستدەکەیت ژیان و مردنی نەخۆشەکان لە ژێر دەستی تۆدان، دکتۆر ئەوەی بیستوومە پزیشکان لە هەموو دەورووزەمانێکدا ئیشێکی گرنگیان بووە، دکتۆر لە هەموو شوێنێک کەسێکی بەبایەخە، من پێشمەرگە بووم و دەزانم، ئێوە لە هەموو شوێنێک ڕێزی خۆتان هەیە، لە بەرئەوەی دەسەڵاتتان وەک دەسەڵاتی خودا وەهایە، حاکمن بە سەر ژیان و مردندا». لەویادا کۆکەیەکی توندی کرد و وەستا و سەیرێکی بنمیچەکەی کرد «وەک من دکتۆر. ئیشی کەسانی وەک منیش، ئیشی جەلاد، پیاوانی دەوڵەت، ئەفسەرانی بەرزی سوپا، هەر لە ئیشی خودا دەچێت، هەمووومان دەسەڵاتێکمان بە سەر ژیانی ئەوانی تردا هەیە. جیاوازی من و تۆ لەوەدایە، ئێوەی دکتۆر بە درێژایی مێژوو دەتانەوێت ئەو دەسەڵاتە بشارنەوە، دەرینەخەن، بڵێن ژیان و مردن بە دەست خودایە... بەڵام من نا... من جۆرە کەسێکی ترم، من حەزم لەوەیە دیلەکانی ژێر دەستم، ئەوانەی من دەبینن، ئەوانەی لە سەر جادەکان بە جلی سەربازییەوە لێم نزیکدەکەونەوە بزانن کە ژیانیان بە دەست منە، بزانن بە دەست منە بهێڵم بەو شەقامانەدا بڕۆن یان نا، بە دەست منە بهێڵم بگەنەوە ماڵ یاخود نا. ئەوە شتێک نییە هەر بە فیترەت لە مندا بووبێت، من ئەوە لە سیاسەتەوە فێربووم. سیاسەت ئەوەیە مرۆڤە زەعیفەکان، عەوامی خەڵک، ئەوانەی دەشێت ڕۆژێک لە ڕۆژەکان ببن بە میوانی من لە بەندیخانەیەک، پێکڕا بزانن شتە گرنگەکان بە دەست منن. سیاسەت ئەوەیە، ئەوانی تر، خەڵکی ڕەشۆک تێبگەن مان و نەمانیان بە دەستی ئێمەیە، لەوە زیاتر هیچی تر نییە. گەر یەکێک هات و قسەیەکی تری لە سەر سیاسەت کرد، درۆدەکات. نا دکتۆر، من گەرچی ئەمڕۆ زۆر نەخۆشم، گەرچی تام لێدێت، لە بەیانیەوە تا ئێستا شتێکی ئەوتۆم نەخواردوە، بەڵام بەشی ئەوە هۆشم هەیە بتوانم بڵێم من خۆم بە

کەسێکی دیموکرات دەزانم، چەندین ساڵ لە پارتی دیموکراتدا بووم، واش تێگەیشتووم لە دیموکراتیدا ژێر دەستانت دەزانن تۆ حاکمیت و تۆ خۆشت دەبێت بزانیت کە حاکمیت. بەڵام کوشتن غایەت نییە، هێز غایەتە، دیموکراتییەتێک نییە جەلاد و پۆلیس و شەقوەشێنی نەبێت، گەر هەڵەم جەنابی دکتۆر بۆم ڕاستبکەوە، گەر هەڵەم بڵێ لیڤیتانت تۆ هەڵەیت، بەڵام وایە، من پیاوێکی دیموکراتم، باوەڕم زۆر بە کوشتن نییە، بەڵام باوەرم بە سەرکەوتن هەیە، بە جەبەروت، بە قایمی، ئەوەی من بزانم دیموکراتییەتیش هەر ئەوەیە. من زۆر بیرم لێکردۆتەوە، وەک چۆن هیچ شارێک ناتوانێت هەموو دکتۆرەکانی خۆی بکاتە دەرەوە، هیچ سیاسەتێکیش نییە بتوانێت واز لە جەلاد بهێنێت، وەزیفەکەی منیش وەک وەزیفەکەی تۆ ئەبەدییە، حیزبەکان دێن و دەرۆن، سەردەمەکان دێن و دەڕۆن، سەرۆکەکان دێن و دەڕۆن، بەڵام ئیشی جەلاد لە جێگای خۆیەتی، ئیشی من لە جێگای خۆیەتی، تەنیا پێویستیم بەوەیە کەمێک وریابم و باش یاریبکەم و نەهێڵم جەلادێکی باشتر شوێنەکەم داگیربکات. لە تۆ وایە خەڵک شۆڕش دەکەن بۆ ئەوەی ئازادبن... ئەوە گەورەترین درۆی ئەم شارەیە... گەورەترین درۆیە کە بەردەوام لە سەری ئەم شارەدا دێت و دەچێت، خەڵک شۆڕش دەکەن تا فریابکەون زووتر لەوانی تر، بەرلەوەی کەسێکی تر شوێنی جەلاد داگیربکات، ئەوان ئەو جێگایە بگرن... جەلاد هەر ئەوە نییە وەک من بە مست لە دەمودانی خەڵک بدەیت، ئەوەشە پێیان بڵێیت کە ژیانیان، شەرەفیان، تیکەنانەکەیان، ئابڕویان لە بندەستی تۆدایە... هەموومان ئیش بۆ ئەوە دەکەین... دیموکراتەکان، کۆمۆنیستەکان، دیکتاتۆرەکان، هەموومان ئیش بۆ ئەوە دەکەین، من ئیش بۆ ئەوە دەکەم، ئەوانی شاخ ئیش بۆ ئەوە دەکەن، مودیری ئەمن ئیش بۆ ئەوە دەکات، شەیتانیش هەر ئیش بۆ ئەوە دەکات. لێرە لەم شارە مەلعونەدا هەموومان ئیش بۆ ئەوە دەکەین

لە خودا بچین... بەڵام بە تەواوی بۆمان ناکرێت، چونکە هەستدەکەم هەموومان لاوازین... تۆش لاوازیت و منیش... دکتۆر چیبکەین بۆ ئەوەی ئاوا لاواز نەبین؟».

لە بەرئەوەی دکتۆر نەیدەتوانی هیچ بڵێت، لیڤیتانت خواستێکی تاریک و سەیری لە خۆیدا هەست پێدەکرد بۆ قسەکردن.

«دکتۆر من تا چەند مانگێک بەر لە هەرەسی شۆڕش لە حیزبدا بووم، بە هەموو حسابێک کوردێکی دڵسۆزبووم، بەڵام یەک شت بزانە، سیاسەت لە وڵاتی ئێمەدا هەمیشە دێتەوە لای من، هەمیشە دێتەوە لای جەلاد... بەڵام ئیشی دووروودرێژم لە زیندانەکانی حیزبدا یەک شتی فێرکردم، ئەوەیە هەموومان ناتوانین پێکەوە ئازادبین، وەک چۆن هەموو ئینسانەکان ناتوانن پێکەوە ساغ بن، هەمووش ناتوانین پێکەوە و بە قەد یەک ئازادبن. جەنابت دکتۆریت و دەزانیت مرۆڤ جنسێکی لاوازە، هەموومان ناتوانین پێکەوە و لە یەککاتدا ساغ و سەلیم بین، دونیا هەمیشە پێویستی بە بیمارستانەکەی تۆ و بە دەرمانەکانت هەیە، نەخۆش و ساغ، بەهێز و لاواز، سەردەست و ژێردەست، کۆیلە و پاشا شتێکی هەتاهەتایین. دوا ئەوە دڵنیابە، دە مرۆڤ لە جێگایەکدا پێکەوە بژین، پێویستیان بە پزیشکێک و جەلادێک دەبێت».

هەستیکرد هەوایەکی سارد لە ژوورەکەدایە، سەیرێکی پەنجەرە و دەرگاکەی کردەوە، بینی هەموویان داخراون. بەتانییەکەی لە خۆی توندتر کرد، چاوی لێکنا و بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، دڵنیابوو دکتۆر مستەفا شوکاک گوێی لێدەگرێت، هەندێجاریش دەیەوێت شتێک بڵێت، بەڵام لێوی بۆ ناکرێتەوە، بینی لە برینێکی سەرچاوی و لە درزێکی ژێر لێوییەوە خوێن زۆر دێتەدەرێ، ئێستا لەبەر خوێن دەموچاوی دکتۆری نەدەبینی، لەشیشی لە ژێر ئەو پەتە ئەستورانەوە کە تەواو جەڕاندبوویان دەلەرزی، دەستی و لێویشی زۆر بە توندی دەلەرزین. لیڤیتانت بانگی

یەکێک لە یاوەرەکانی کرد و گووتی «دەموچاوی دکتۆر پاکبکەرەوە، ئەو لووتنە بێمێشکە لە هیچ تێناگات، زۆر ئازاریداوە... ببورە دکتۆر... دەموچاوی بۆ بسرە و برۆ دەرێ، گەر خوێنپژانی نەوەستا بانگتدەکەمەوە». یاوەرەکە چەند جارێک دەموچاوی دکتۆری بە خاولییەکی تەڕ سڕی و گووتی «خوێنەکەی بەرەو کەمی دەڕوات، هەرکات پێویستیکرد بانگمبکە، دەموچاوی بۆ دەسڕم». لیڤیتانت ئێستا ڕوونتر دەموچاوی دکتۆری دەبینی... دکتۆر ڕوخسارێکی منداڵانەی جوانی هەبوو، هێندەی پاسەوانەکە چووە دەرێ لیڤیتانت دەستی پێکردەوە «بەڵێ دکتۆر من و تۆ هەردووکمان بێهێزین... تۆ زۆر لە من بێهێزتریت، تۆ پیاوێکی بێئاگای لەماڵی خۆت، ئەوە زۆر جێگای گلەیی نییە، تەنیا ئەو پیاوانە تەواو ئاگاداری ماڵی خۆیانن کە هەموو ژیانیان وەک سەگ لە پاسکردنی ژنەکانیاندا دەبەنەسەر... لەم دوو ساڵەی دواییدا من زۆر شارەزای ژیانی شاربووم، زۆر شت لە جاران ڕۆشنتر دەبینم، دەبینم خەڵکێکی زۆر ئیشوکاریان بۆتە ئەوەی بەس پاسی ژنەکانیان بکەن. ژیانی ئێمە لەم شارەدا وەهایە، باشترین تەکنیکێک کە پیاوە ترسنۆکەکان دەیگرنە بەر ئەوەیە منداڵێکی زۆر بە ژنەکانیان دروستدەکەن و دادەنیشن، باشترین ڕێگایەک هەواو هەوەسی ئافرەتێکی پێبکوژێت ئەوەیە یەک لە سەر یەک منداڵی پێدروستبکەیت، بیکە بە مەکینەیەکی دروستکردنی منداڵ، با هەموو هەستەکانی، هۆشی، ئارەزووەکانی لە ناو بۆنی پەڕۆبەگوو و قیژە و هاواری منداڵاندا بخنکێت، دایکایەتی ژن دەکوژێت. نا من پیاوێکی عاقڵ نیم، بەڵام گەر تۆ هەر زوو منداڵێک یان دووان یان زیاترت بە ژنەکەت دروستبکردایە، ئێستا لەگەڵ ناکەسێکی وەک نزاردا خیانەتی لێ نەدەکردی... تا زیاتر منداڵیان پێدروستبکەیت باشترە... ئیتر کاتێکیان نامێنێتەوە بیر لە کەسی تر بکەنەوە». هەستیکرد دکتۆر لەودیو کۆت و پێوەندەکانییەوە دەلەرزێت، زیاتر لە جاران دەلەرزێت،

وشـەی خیانـەت و نـاوی نـزار ڕایدەچڵەکێنـن و لەرزێکـی توندتـر دەخەنـە گیانـی. لیڤیتانت بە هەمان مۆنییەوە، وەک یەکێک نا کە بە موسیبەتی دکتۆر دڵخۆش بێت، بەڵکو وەک یەکێک کە خەفەت لە بێخەیاڵی و کاڵفامی و بێهۆشی کەسێکی نزیکی خۆی دەخوات کەوتەوە قسە «تۆ شایستەی ئەوەیت هەموو کەسێک بەزەیی پێتدا بێتەوە، هەر کەسێکیش شایستەی بەزەیی بوو، بەبڕوای من شایەنی ژیان نییە. بەڵێ دکتۆر من وایدەبینم، بەوجۆرە دەیبینم. ماوەیەکی درێژە، زۆر درێژە ژنەکەت لەگەڵ نزار ئیدریسدا پەیوەندییەکی نزیکی هەیە، لەو کاتەوەی تۆ لە بیمارستان لەدەستی من دەرتهێنا و ڕزگارتکرد، ئەوان لە پشتی جەنابتەوە یەک دەبینن... دکتۆر، ڕزگارکردنی کەسێکی ناکەسبەچە ئیشێکی باش نییە، خۆ تۆ حەیوان نیت، دەبووایە بزانیت ڕزگارکردنی کەسی ناکەس بەچە باش نییە. دەبوو ئەوەندە بێمێشک نەبیت و ئەوە بزانیت. وەک دکتۆرێک ژیان و وەزیفەکەی خۆت دەخەیتە مەترسییەوە بۆ ئەوەی شۆڕشگێڕێک ڕزگاربکەیت و ئەویش سوار ژنەکەت دەبێت، من پیاوێکی دڵڕەقم، بێبەزەیم، بەڵام گەر کەسێک لە مردن ڕزگارمبکات پاداشتەکەی ئەوە نابێت سوار ژنەکەی ببم.. ماوەیەکی درێژە نەغەدە ماردینی بە تەنیا ژنی تۆ نییە، بەڵکو زیاتر لە باوەشی نزار ئیدریسدایە» . دکتۆر تادەهات زیاتر دەلەرزی، دەیویست شتێک بڵێت، هاوارێکبکات، بەڵام جگە لە نرکەیەکی خنکاو لە گەرویدا نەیدەتوانی نە لێو و نە زمانی بجوڵێنێت. «من و تۆ دوو کەسی بێهێزین، زۆر بێهێزین... گەرچی دوو وەزیفەی گرنگمان هەیە، گەرچی هەموو شارەکانی ئەم دونیایە پێویستیان بە ئیشی من و تۆ دەبێت. بەڵام دکتۆر، هەمیشە شتێک هەیە دەکەوێتە دەرەوەی دەسەڵاتی ئێمەوە، تۆ وەک دکتۆرێکی گەنج بە جۆرێک لە خۆت ڕازیبوویت، ئەوەت بیرچووبووەوە کە شتێکت هەیە ناوی زەعیفییە، ئەوەت بیرچووبووەوە کە من و تۆش دەکرێت بێهێزبین، ئەوانی تریش

هەندێجار دەتوانن ئەوەمان لێبستێنن کە دەیانەوێت... دکتۆر موستەفا شوکاک.. ناوێکی جوانە، هەر ژنێک شەیدادەکات. بەڵام هیچ حیسابێکت بۆ لاوازی خۆت نەکرد، بۆ ئەوەی یەکێک هەیە دێت و ئاسان عەزیزترین و جوانترین شتی ژیانت زەوتدەکات... خانمی نەغەدە جەلال، ژنە عەزیزەکەت، کچەکەی دکتۆر جەلال ماردینی».

هیچ لەرە و زرینگەیەکی گاڵتەپێکردن لە دەنگیدا نەبوو، بەڵام ئاوازێک لە بێزێزیی و جیدییەت لە گەروویدا بوو هەر کەس بیبیستایە لەرزی لێدەهات. «هەموو شتەکان یارییـن، کێ باشتر یاریبکات ئەوە بەهێزترە. گرنگ نییە تۆ چییت، هەتا گەر پادشابیت، ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەت بە ئیرس بۆ بمێنێتەوە، گەر نەزانیت باش یاری بکەیت، گەر پێشوەخت پەلامارنەدەیت، گەر وابزانیت دەتوانیت فریشتە بیت، دەگەیتە ئەم شوێنەی ئێستا. تۆ بە تۆمەتی یارمەتیدانی دوژمنانی دەوڵەت گیراویت، سبەی من ڕادەستی ئەمنە عەرەبەکانت دەکەم، ئەوان زۆر ئەشکەنجەت دەدەن، ئەوەی لێرە چەشتووتە هیچ نییە... هیچ نییە. دکتۆر لەوێ زۆر ئازارت دەدەن، بەڵام تۆ هیچ نازانیت. لە بەرئەوە جگە لەوەی بەرگەی ئازارەکان بگریت یاخود بمریت چارەی ترت نییە. تۆ کەس ناناسیت بیدەیت بە دەستەوە. گەر بمریت ئازاری زۆرت لە کۆڵ دەبێتەوە، لە پێش هەموو شتێکەوە ئازاری ئابرووچوون. ئەوەی بەمجۆرە بێهێزیت وادەکات هەمووان حەزبکەن پتر پێ بە سەرتدا بنێن، من حیکایەتی ژنەکەت و پەیوەندی لەگەڵ نزار ئیدریسدا ناخەمە ناو هۆکانی گرتنتەوە... نایخەمە ناو هۆکانی گرتنتەوە، بەڵام شار هەمووی دەیزانێت، ئەوە بە جۆرێک ئابرووت دەبات تامردن لە کۆڵت نابێتەوە. ئەمە جگە لەوەی حەزم لەو ساتانەیە کە مرۆڤ خۆی لە بەردەم خۆیدا دەشکێت... من لەزەت لەوە دەبینم کە دەبینم ئینسانێک لە بەردەم خۆیدا دەشکێت. سەیرکە گەر وەک جەلاد، وەک نوێنەری دەوڵەت

یەکێکت ناردە بەر پەتی سێدارە و هێشتا شانازیی و ئیفتیخاری بەخۆیەوە هەبوو، بزانە کارەکانت پوچ و بێئەنجامن، ئیشی جەلاد ئەوە نییە مرۆڤ بکوژێت، ئیشی ئەوەیە ئیفتیخاریان بکوژێت، غروریان بڕوخێنێت. واهەستدەکەم دکتۆر لە حیکایەتی تۆدا هەموو شتەکان ئامادەن. لەمڕۆ بەدواوە تۆ وەک ئینسانێکی سەرشۆڕ لەم شارەدا دەژیت، دکتۆر موستەفا شوکاکی ژنحیز، دکتۆرێکی ژنحیز و هیچی تر... ئەوە عەقڵی منە و عەقڵی هەموو شارەکەشە، ژیانی هەزاران مرۆڤ لەم شارەدا ڕزگاربکەیت، ژیانی هەزاران منداڵ لە دەستی مردن وەربگریتەوە، ئەو لکەیە لە سەر ناوچاوانت ناسڕێتەوە. بۆ هەر کوێ بڕۆیت بەدواتەوە دەبێت... هەموومان لە سەر ئەوە کۆکین کە ئیفتیخاری تۆ بکوژین. تۆ ئیفتیخارت بۆچییە؟ من، ژنەکەت، دەوڵەت، نزار ئیدریس، شۆڕش هەموومان لە سەر ئەوە ڕێکین پێکەوە ئیفتیخارت بکوژین. من دوژمنی گەورەی ئیفتیخاری ئینسانم، ڕقم لە کەسێکە غروری ڕێگای بدات و وابزانێت کەس نییە ئیرادەی بشکێنێت. هەر بۆیە زۆر ڕقم لە نزار ئیدریسیشە... جگە لەوەی ئیفتیخاری ئەو جۆرە مرۆڤانە بکوژم ئیشم بە هیچی تر نییە. ئیشم بە هیچی تر نییە»

ئێجگار تورەبوو، دەیویست زۆر دەنگی بەرزبکاتەوە، بەڵام نەیدەتوانی. کەمێک ئاوی خواردەوە و لە جێگای خۆی هەستا و بە زۆریش کەمێک ئاوی کرد بە دەمی دکتۆر مستەفادا، پاش بێدەنگییەکی کورت گوتی «من دەبوو نەغەدەی ژنت بگرم، دەبوو ئەو بگرم. تۆ هیچ نیت... بەڵام لە بەرئەوەی هیچ نیت، لە بەرئەوەی لاوازیت، لە بەرئەوەی بێهۆش و کەمفامیت، تۆم گرت، چونکە من ڕقم لە کەسانی بێهێزە، ئەوەتەی لەدایکبووم ڕقم لە کەسانی بێهێزە. ئەمڕۆ ڕقیشم لە خۆمە، بەڵام ناتوانم خۆم ئەشکەنجەبدەم، من لە ئازار دەترسم، دکتۆر زۆر لە ئازار دەترسم، لە بەرئەوە تۆ ئەشکەنجەدەدەم، تۆ دەدەمە دەست

عەرەبەکان، تۆ دەگرم. لەو بەینەدا یان ژنەکەت دێت بۆ لای من تا سۆراغی تۆ بکات و لەو ڕێگایەوە من داگیریدەکەم، یان هیچ حیسابێک بۆ من و تۆ ناکات و لەگەڵ دۆستەکەیدا هەڵدێت و یارییەکەمان درێژ دەبێتەوە... ها تۆ ژنی خۆت بناسیت چی دەکات؟».

لیڤیتانت نەیدەزانی بەو قسانەی چۆن ئەم کوڕە گەنجە لە ناوەوە بریندار دەکات، چۆن بۆ هەتاهەتایە دەیشکێنێت، چۆن شتێکی تیا دەڕوخێنێت کە ئیتر دروست ناکرێتەوە.



دوای گرتنی دکتۆر مستەفا شوکاک، نەغەدە هەستی بە شتێکی تایبەتی نەکرد، ئەوەی لە ناخیدا دروستبوو تەنیا کۆمەڵێک پرسیاری نوێ بوون و هیچی تر. بە سەرێک دەیویست بەهەر ڕێگایەک بووە دکتۆری مێردی لە کۆڵ ببێتەوە، گەرچی دکتۆر پیاوێکی خراپ نەبوو، گەرچی نەغەدە کینەیەکی وەها ڕەشی بەرامبەری نەبوو، حەزبکات بمرێت. بەڵام گەر بهاتبایە بەعسییەکان بیانکوشتبایە، یان نەناسێک لە ڕێگا بە چەقۆیەک بیپێکایە و بمردایە، یاخود لە ڕوداوێکی ماشێندا ژیانی لەدەستبدایە، ژانێکی تایبەتی و گەورەی لە دڵدا بەجێ نەدەهێشت. سووک و سادە دەتوانم بڵێم بەرامبەری بێباک بوو، کەسێک بوو لەویادا، لە ژیانیدا، لە ناو نوێنی خەوتنەکەیدا، لە سەر مێزی نانخواردنەکەی، بەڵام لە دڵیدا یاخود لە هۆشیدا نا... جگە لە ساردی هیچ هەستێکی دیکەی گەورەی بەرامبەری نەبوو. بەڵام بە سەرێکی دیش نەیدەزانی ئاخۆ لە ڕاستیدا چەکدارەکانی دەوڵەت بۆ ئەم دەگەڕێن یاخود بۆ دکتۆری مێردی. نەیدەزانی دکتۆر دەبێت بە چ تاوانێک گیرابێت، بۆشی گرنگ نەبوو بزانێت. دوای بردنی دکتۆر، کەمێک بیریکردەوە و گووتی کەسێک شایستەی گرتن بێت منم، من

ئەندامی شانە شۆڕشگێڕەکانم نەوەک دکتۆر. لە دڵی خۆیدا گووتی «بەر لەوەی دکتۆر بەربدەن دەبێت لێرە بڕۆم، نامەوێت بکەومە دەست عەرەبەکان». بۆ بەهانەیەکی گەورە دەگەڕا، ئەم ژیانەی ئێستای خۆی لەبەریەک هەڵبوەشێنێتەوە. دەشێت گرتنی دکتۆریش ئەو بەهانە زێڕینە بێت کە لەم قەفەزی بێزارییە دەرییهێنێت. هەفتەیەک لەمەوبەر وەک هەست بە هەموو شتێک بکات شیعرێکی نوسی «ژنێک وەکو پشکۆ»... تێیدا هاتبوو «سووتاندنی دنیا لە سووتاندنی خۆتەوە دەست پێدەکات. دەست پێبکە، لە سووتانی خۆتەوە دەست پێبکە... دەبینیت کە ئاگر لە خۆت بەردەدەیت، تۆ ناسووتێیت... هەموو ئەوانەش دەسووتێن کە تۆ دەتویست بیانسووتێنیت». شەو تادرەنگ دانیشت و هەواڵی گرتنی دکتۆری بە هیچ کەس نەدا، هەتا تەلەفونی بۆ باوکیشی نەکرد، بەڵکو لە ژووری دانیشتەکەدا مایەوە و وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، هەندێک بەشی لە ڕۆمانی دۆزەخی هێنری باربۆس خوێندەوە، لەبەر هۆیەکی نادیار رقی لە پاڵەوانی ڕۆمانەکە بوو، وەک کەسێکی مردوو و بێکردار و بێتین هاتە بەرچاوی. بەڵام لەو ساتەدا خۆشی کەسێک بوو لەوجۆرە. چەند جارێک کتێبەکەی دانا و بێباکی و کەمتەرخەمی و ساردی خۆی ترساندی، لە جێگایەکدا دەستیگرت بە نێوچاوانییەوە و بە خۆی گووت «خوای گەورە بۆ وا بێغەمم، چ شتێک وا دڵڕەقی کردوم». ویستی شتێک لە ناخی خۆیدا دروستبکات و بیگۆڕێت بۆ بەهانەی هەستان و غەمخواردنێک بۆ موستەفا شوکاک، بەڵام لە ناوەوە جگە لە بێباکی هەستی بە هیچ نەدەکرد، گەر نزار تەلەفونی هەبایە، زەنگی بۆ لێدەدا بێت و ئێستا لەگەڵیدا بخەوێت. ئەوەی لەو ساتەدا دەیتوانی هەستی بجولێنێت و ڕایوەشێنێت سێکسێکی درێژبوو لەگەڵ نزار ئیدریسدا، ڕەنگە ئەوە تاکە شتێک بێت بتوانێت هەستەکانی بە جۆرێک ڕاوەشێنێت بێتەوە جێگای خۆی. پێشتر چەند جارێک وەهایان کردبوو، هەر کات

دڵنیابووایە دکتۆر شەو ناگەڕێتەوە، لەگەڵ نزاردا لە ژووری خەوتنەکەی خۆیان و لە پێخەفەکەی دکتۆردا پێکەوە دەخەوتن. لە کۆتایی ئەو شەوانەدا نزار دەمەوبەیان دەبایە زوو بڕوات، تا بەر لە گەڕانەوەی شوکاک ئەو دەوروبەرە چۆڵبکات و نەغەدەش کاتی هەبێت هەوای ژوور بگۆڕێت و سەر سیستەمەکە والێبکات دکتۆر گومانی لە دڵ نەگەڕێت و بۆنی پاشماوەکانی نزار لە ژوورەکەدا پاکبکاتەوە. جۆری گرتنەکەی دکتۆر و لێدانی لە بەر دەرگاوە نیشانەیەک بوو وایدەکرد دڵنیابێت دکتۆر بە ئاسانی لە چنگی گورگەکانی لیڤیتانت ئازاد نابێت، دڵنیابوو نزار دەتوانێت بەبێ ترس تا نیوەڕۆ لە جێگاکەدا بخەوێت و ئەم بەرچایی بۆ ئامادەبکات و بۆ یەکجار پێکەوە نانی بەیانی لێرە بخۆن. بەڵام خەیاڵەکەی بە دژوار هاتە پێشچاو و لەوە ترسا کە هەموو ئیشەکە تەڵەیەکی دانراوی لیڤیتانت بێت، تا دەزگیرانەکەی لە حەشاری خۆی دەربهێنێت. تا نیوەشەو ئەو هەستی بێباکییە بەری نەدا، نیوەشەو وەک یەکێک لە ناکاو شتێکی بیرکەوتبێتەوە، کتێبەکەی دانا و تەلەفونی بۆ دکتۆر جەلال ماردینی باوکی کرد و بە دەنگێکی سارد و کز کە شتێکی تایبەتی تێدا نەبوو، بە سەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە. دەنگی بە جۆرێک سارد و بێلایەن و بێعاتیفە بوو، باوکی لە دڵەوە ترسا. بەڵام هەموو ئەو شتانەی دەگێڕایەوە بۆ منداڵی نەغەدە، کە ئەگەرچی بە باڵا ژنێکی کامڵە، بەڵام هێشتا ڕۆحی پڕە لە ساردی و سەرسەختی منداڵی. بەیانی نەغەدە لە ماڵ چووە دەرێ و هەریەک لە ئەردەڵان میرانی و هۆشەنگی بولبولیاری لە گرتنی دکتۆر ئاگادارکردەوە. من نزیکی سەعات سێ هەواڵەکەم بیست و دەمودەست فەرمانمدا کە نەغەدە ماردینی و نزار ئیدریس بگوازرێنەوە بۆ جێگایەکی ئەمین تا کاروباری گواستنەوەیان بۆ چیا ڕێکدەخەم. ماوەیەک بوو بەردەوام داوام لە نزار ئیدریس دەکرد پەیوەندی بە مەفرەزەکانی چیاوە بکات و بڕواتە شاخ، چونکە ژیانی

بەراستی لە مەترسیدا بوو، لیڤیتانت دوای برینداربوونی بە سەبر و سەرسەختییەوە بۆی دەگەڕا. هەموو لەوە دەترساین نزار بکەوێتە دەست لیڤیتانت و لەوێشەوە لە زیندانەکانی مودیرییەتدا بگیرسێتەوە و لە ژێر ئەشکەنجەدا نهێنی هەموومان بدرکێنێت، بەوەش جڵەوی کاروباری حیزب لە شاردا لە دەست دەرچێت... دەشمزانی کە شۆڕش لیڤیتانتی لە نزار ئیدریس بەلاوە گرنگترە. دڵنیابووم لە ئەنجومەنی باڵا هەموو شتێک دەکەن تا لیڤیتانت لە جێگای خۆیدا بمێنێتەوە. وام هەستدەکرد نزار لە ناخدا بۆنی شتێک دەکات، بەڵام دڵنیا نییە... چەند پێشنیارێکی بۆ شۆڕش کرد کە پلانی نوێ بۆ کوشتنی لیڤیتانت دابنێین و بواری پێبدرێت خۆی بە تەنها کارەکان بباتەڕێوە، بەڵام هەموو بە توندی پلانەکانمان ڕەتکردەوە. من جارێک ڕووبەڕوو پێمگووت کە دەستبردن بۆ لیڤیتانت دژی قازانجەکانی شۆڕشە و هەر کەس کاری سەربەخۆ بکات دژەشۆڕشە و وەک نەیاری حیزب سەیردەکرێت. نزار دەیزانی من چ نرخێکی گەورە لە سەر دیسپلین دادەنێم، هەستیشیدەکرد خۆی لە دۆخێکی وەها بەهێزدا نییە بتوانێت لە بڕیاری من خۆی ئازادبکات. گەرچی وەک هەمیشە دەمدرێژ و نەسرەوت بوو، بەڵام دوای نوشستهێنانی هەوڵی کوشتنی لیڤیتانت و ئاشکرابوونی ئەو، دەبوو لە جێگای باشدا بیپارێزین. تا ماوەیەکی کەم هەر وەک بەرپرسی شانەکەی خۆی مایەوە، کە زۆربەی ئەندامەکانی گەنجانی سەرەڕۆ و مەست و شەڕانیبوون، بەپێچەوانەی شانەکانی ترمانەوە کە زۆربەیان لە فەرمانبەران و خەڵکانی خوێندەوار و کاسبانی دڵسۆز پێکهاتبوون. نزار لە شانەکەی خۆیدا ڕاشکاوانە چیرۆکی سەرجێکردنەکانی خۆی لەگەڵ ژنی دکتۆردا بۆ ئەندامانی تر دەگێڕایەوە. لە کاتی کۆبوونەوەکانیاندا عارەقیان دەخواردەوە و مەستدەبوون. حیزب لەلایان پتر بەهانەیەک بوو بۆ مەستبوون و یەکدی بینین و گاڵتەکردن بە دونیا. ئەو بە دەنگی بەرز، بێ شەرم و سڵەمینەوە، باسی هەموو

وردەکارییەکانی لەشی نەغەدە و هەناسەکانی و قسەکانی و جوڵاندنەوەکانی ناو جێگای دەکرد، لەزەتێکی زۆری لەوە دەبینی لە هەموو جێگایەکدا بڵێت ئەو عاشقی ئەم ژنە نییە، بەڵام خانمەکە شتێکی تێدایە هیچ پیاوێک ناتوانێت ئاسان دەستبەرداری بێت، دەیگووت ئەم کوشتەی جوانییەکەی نییە، کوشتەی ئەو لەشە سفت و نەرمەی نییە، بەڵام گیرۆدەی ئەو خەیاڵی شەهوەتەیە کە لە ناکاو دەپەڕێتە نێو چاوی. هەندێجار خۆشی وادەردەخست وەک ئەوەی ئەو قوربانی گەمەیەکی تەلیسماوی و داوێکی شەیتانی نەغەدە بێت کە بۆی چنیوە تا بکەوێتە ناوی و لێیدەرنەچێت. کە سەرخۆش دەبوو بە دەنگی بەرز دەیگووت «ژنی ئەو دکتۆرە، بە جۆرێک حەزی لێمە، تا تلْپی تەڕم تێدابێت بەرم نادات». چیرۆکەکانی وردە وردە بەناو هەموو شانەکاندا بڵاوبوونەوە و کەوتنەوە دەم ئەردەڵان هیرانی کە قسەکانی نزاری وەک وڕێنەی کەسێکی بێئابڕوو وەرگرت کە ئەگەر بیگرێت، وانەیەکی پێدەدات، جارێکی دی قسەی وەها دووبارەناکاتەوە. لە ڕاستیدا ئەردەڵان هیرانی تەنیا کەسێک بوو باوەڕی بە چیرۆکەکانی نزار نەدەکرد، تاکە کەسێک بوو هەمووانی وەک فریشتە دەبینی. بەڵام من دەبوو هەموو شتێک بە ڕاست و درۆوە بکەمە ڕاپۆرت و بینێرم بۆ بەرپرسانی باڵا. لە دوای گرتنی دکتۆرەوە، ئەو دەرفەتە بۆ بەرپرسانی سەرەوە ڕەخسا، داوای هاتنەدەرەوەی بێوەستانی نەغەدە ماردینی و نزار ئیدریس بکەن. ناوی نەغەدە و شەوە ڕەنگاوڕەنگەکانی، ناوبانگی وەک ژنێکی بەئاڵۆش، وەک شاعیرەیەکی هەوەسدار کە پشکۆیەکی گەورە لە لەشیدا دەسووتێت لە ناو هەندێک ئەندامانی ئەنجومەنی باڵادا وەها بڵاوبوو، هەموو پێیان لە سەر ئەوە دادەگرت، ژنی دکتۆر بێوەستان بێتە چیا و پەیوەندی بکات بە شاخەوە. ئەوەی سەیربوو نزار بەردەوام و ئاشکرا بە خانمی دەگووت کە ئەو سۆزێکی نییە و جگە لە پێکەوەخەوتن ناتوانێت هیچی تری بۆ

بکات، بەڵام نەغەدە بێباک دەیگووت «تۆ بێئەوەی بزانیت یان بتەوێت زۆر شتت کردوە... منت لە ژوورەکانی دکتۆر مستەفا شوکاکەوە بەرەو دونیایەکی تر دەرهێنا... ئەوە تەنیا ئیشێک بوو تۆ بتوانیت بیکەیت و ئازایانە کردت».

لە دوای تەقەکردن لە لیڤیتانت، ناوی نزار ئیدریس لای بەعسییەکان و کارمەندانی مودیرییەتی ئاسایش ناسراوبوو، هەتا دۆسییەکی تایبەتی دیکەشیان بۆ کردەوە. من خۆم جێگایەکی تایبەت و نهێنیم لە ماڵی یەکێک لە هەڤاڵەکانی خۆماندا بۆ دابینکرد و فەرمانمدایە بە وریاییەکی زۆرەوە هاتوچۆبکات. بەڵام گرتنی دکتۆر شوکاک لەلایەن لیڤیتانتەوە شتەکانی خستە بەر گێژاوێکی نوێوە. تێگەیشتن لە لیڤیتانت کە هەمیشە ڕێگای باریک و فێڵی ئاڵۆزی دەگرتەبەر ئاسان نەبوو، ئەو هەم بۆ خۆی و هەم بۆ دەوڵەت و هەم بۆ ئێمە و هەم بۆ کەسانی دیکەی نەناسراویش کاریدەکرد، لەوێوە زەحمەت بوو بزانیت لە چ ساتێکدا و بۆ کێ ئیشدەکات. من دڵنیابووم لیڤیتانت دەزانێت کە دکتۆر شوکاک سەر بە ڕێکخراوەکانی حیزب نییە، بەڵام بیستبووشم ئاگادارە ژنی دکتۆر و نزار لە عەشقێکی گەرمدا دەژین. دڵنیابووم شتی وەها ئاسان لە لیڤیتانت ون نەدەبوو، بەڵام بۆ لەبری نەغەدە ماردینی دکتۆر شوکاکی گرتووە؟ ئەوکات نەمدەزانی... خەیاڵم بۆ ئەوە نەچوو کە لیڤیتانت لە مەودای دووردا ئیش بۆ ئەوە دەکات، هەمان ئەو ژنە داگیربکات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان نزار داگیریکردبوو. من گرتنی دکتۆرم وەک ئاماژەیەک خوێندەوە بۆ نزیکبوونەوەی دەوڵەت لە ڕێکخراوەکانمان. گەرچی من لە هەندێک شتدا متمانەم بە لیڤیتانت هەبوو، بەڵام متمانەی بەردەوام بەو کاری نەکردە بوو... وەک لیڤیتانت بڵێت من زیاتر لەوە دەزانم کە ئێوە حیسابتانکردوە و گەر لەگەڵم ڕاست نەبن، کاری خراپ دەکەم. دڵنیابووم هەنگاوی داهاتوو دەگاتە سەر نەغەدە ماردینی یاخود

نزار. چەند شەوێک دواتر بەتایبەت چووم بۆ لای نزار ئیدریس لە خەڵوەتەکەی خۆیدا و تێمگەیاند کە هەموو دونیا بە پەیوەندی ئەو و نەغەدە دەزانێت و ئێمە لە حیزبدا سەر تا خوار ئاگاداری چیرۆکی ئەو و خانمی ماردینی هەین. نزار وەک هەمیشە بێباک بوو، قسەکانی خۆی دووبارەکردەوە سەبارەت بەوەی کە ئەو بۆیە شۆڕشدەکات تا حەرامێک لە دونیادا نەهێڵێت، گووتی گەر سەری شۆڕشگێڕەکانیش وەک سەری مەلاکان پڕبێت لە حەرام و حەلاڵ مرۆڤ بۆچی شۆڕش دەکات؟ ئەو لە کوێدا بتوانێت هەست بە ئازادی بکات شۆڕش لەو جێگایەیە... بە قاقایەکی نامەردانەوە، بەو پێکەنینەوە کە دەستەپاچەیدەکردم، گووتی «خەوتنەکانم لەگەڵ ژنەکەی دکتۆر مستەفا شوکاکدا بەشێکی گرنگی شۆڕشە .. ئەوە شۆڕشی منە، من جۆرە شۆڕشێکی تر نازانم».

بۆ شۆڕشگێڕ و کوردپەروەرێکی فانەتیکی وەک من، قسەکانی بەشی ئەوەبوون مرۆڤ بیکوژێت و لاشەکەی بسووتێنێت و خۆڵەمێشەکەشی بداتە بەر چەمێکی خوڕ. ئەو بۆچوونانەی منی بێئەندازە تورەدەکرد، بەڵام هەرچۆنێک بوو ئارامیم پاراست و تێمگەیاند کە چیتر ناتوانێت لە شاردا بمێنێتەوە، شۆڕش نیازێکی نییە دەستبەرداری ئەو بێت، بەڵام ئیدی کاتی ئەوە هاتووە لەبەر ئاسایش و مانەوەی خۆی لێرە نەمێنێت.

پێم ڕاگەیاند کە لە ئەنجومەنی باڵاوە فەرمانم پێگەیوە کە ئەو لەگەڵ نەغەدە ماردینیدا بنێرمە چیا، ئەوە فەرمانێکە شکاندنی بۆ نییە. کە ئەو فەرمانەم بە ڕوونی بە نزاری قەساب گووت، دڵنیابووم ژیانێکی سەخت چاوەڕوانی ئەم دووانە دەکات، دەمزانی شۆڕشی نوێ لە شۆڕشی پێشوو پیاوی ترسناکتر و دڵڕەقتری تێدایە، کەسانێک توانای سەیرکردن و گوێگرتنیان لە ڕۆحلەبەری وەک نزار نییە، ئەمجارە هیچ کەسێکیش نییە نزار لە دیوەخانی خۆیدا بپارێزێت، شۆڕشیش بەر لە هەر شتێک هەیبەتی ئاغاکان و میرەکانی شکاندوە. دەبێت بڵێم من لەو کاتەوەی

دەمناسی، بوغزێکی بێوێنەم بەرابەر نزار هەبوو، سەرسامیم بە خۆی و بە جوانی و قسەکانی ئەوەی لە دڵدا نەدەکوشتم وەک کەسێکی ترسناک و شایەن بە کوشتن ببینم. دڵنیابووم ئەمجارە نزار ئیدریس بە ساغی لە چیاکان دانابەزێت، لە دڵیشدا بەختەوەر دەبووم گەر هەواڵی مردنی ببیستم... ئەو تێڕوانینەی کە دەتوانێت شۆڕش بۆ ئازادکردنی خۆی بەکاربهێنێت، جۆرێک بوو لەلادان و بازدان بە سەر هەموو پرەنسیپە سەرەکییەکانی مندا. شۆڕش لای نزار یارییەک بوو دەیویست خۆی یاساکانی دابنێت، شۆڕشێک بوو دژی هەمووان. ئەوەی ئەوکات لە نزاردا زۆر دەیترساندم سەیرکردنی بوو بۆ ژیان، ئەو دەیتوانی ژیانی خۆی بخاتە چنگی خۆی و بەوجۆرە نیگاری بکێشێت کە دەیەوێت، ژیانێک ئەوانی تر بە زەحمەت دەیانتوانی شتێکی تێدا دیاریبکەن یان بگۆڕن، بە پێچەوانەی ژیانی منەوە کە دەبوو ئەوانی تر بۆم دیاریبکەن لە کوێم و چی دەکەم و چۆن دەژیم، بەردەوام وەک کەرەستەیەکی سارد و بێڕۆحی شۆڕش ئەو فەرمانانەم جێبەجێدەکرد کە لە کەسانی ترەوە دەردەچوون... بەڵام نزار دژی هەر کەسێک و هەر شتێک بوو، ڕێگربایە لە بەردەم ئەودا بەو شێوەیە بژی کە دەیەوێت. دڵنیابووم لەوە وریاترە نەزانێت شۆڕش چ جۆرە ئامێرێکی ترسناکە، چ مەکینەیەکی تایبەتییە... چەند جارێک بە گومانەوە پرسیاریکرد بۆ دەبێت نەغەدە ماردینیش بێتەدەرێ، هەستمکرد دەیەوێت چوونە دەرەوەی هاوشانی ئەم ژنە نەبێت کە خۆی بێباکانە چیرۆکی دڵدارییەکانی لە هەموو جێگایەک پەخشدەکردەوە. من تێمگەیاند ژیانی ماردینی لە مەترسیدایە، بەڵام شتێک لە ناوەوە پێیدەگووت کە پیاوانی ئەنجومەنی باڵا، ئەندامانی سەرەوە، لەوە بێباکترن بایەخ بە ژیانی ماردینی بدەن.

بەپێچەوانەی نزارەوە کە دەیزانی کەی گومان دەکات و کەی دڵنیادەبێت، نەغەدە ماردینی دەیویست لە شار دەرچێت، لەم جیهانە

دەرچێت و ڕووبکاتە جەنگەڵە ڕاستەقینەکان. کە جارێکی دی لەگەڵ نەغەدەدا دانیشتم و ڕووبەڕوو لێیوردبوومەوە، تێگەیشتم لەو خانمانەیە کە عومرێکی درێژ چیرۆکی تێکەڵ بە چیرۆکی هەموومان دەبێت. ئەو چەند جارێک بێباک باسی ئەوەی کرد کە دەیەوێت ڕووبکاتە «جەنگەڵە ڕاستەقینەکان». سەرەتا وەک ژنێکی گەنجی ڕۆمانسی هاتەبەرچاوم کە تێناگات بەراستی چی دەگوزەرێت و نازانێت چ مەترسییەکی گەورە لە ڕێگایدایە، ئەوکات لە ریزی ڕێکخستنەکاندا ڕێکەوتی ئەو ژنانەم دەکرد کە بەوجۆرە ڕۆمانسییە بیریان لە شۆڕش دەکردەوە، تەواوی شۆڕشگێڕانیان وەک کۆمەڵێک فریشتەی خودایی دەبینی کە لە ئاسمانەوە بۆ جوانکردنی زەمین هاتوون، لە بەردەم ناوی شۆڕشگێڕەکاندا شلدەبوون و دەتوانەوە. بەڵام کە زیاتر لە خانمی ماردینی نزیکبوومەوە، تێگەیشتم ئەو لەم تەرزە خانمە ڕۆمانسیانە نییە، پێموایە بە هوشیارییەکی گەورەوە دەیزانی دەچێت بۆ کوێ و چی دەوێت، شتێکی تێدابوو بەرەو دونیا ئاڵۆز و ترسناک و دڵڕەقەکان دەیبرد، لەو خانمە ئەکرۆپاتانە دەچوو کە سوور دەزانن ژێریان ئاگرە کەچی بێترس دەچنە سەر پەتێکی باریک و دەیانەوێت تا ئەوسەر پیا بپەڕنەوە. جەنگەڵە ڕاستەقینەکان لای ئەو جێگای هەموو نەگەرێک بوون، لە چاویدا ئەوەم دەخوێندەوە کە ئامادەیە بۆ هەموو مەترسییەک، ئەوەم دەخوێندەوە کە دەشێت هەموو شەڕێک بکات... هەرکات جۆرە کەسێکی وام بدیبایە، دەمودەست خەیاڵم بۆ ئەوە دەچوو ڕۆحێکی لە ژیان ماندووبێت و بیەوێت لە ڕێگای شۆڕشەوە کۆتایی بە هەموو شتێک بهێنێت. من لە ریزی شۆڕشدا خەڵکانێکم بینیبوو کە بۆ خۆکوشتن هاتبوون، چۆن هەندێک بەزەهر یاخود بە گوللە یان بە خۆهەڵواسین کۆتایی بە ژیانی خۆیان دەهێنن، هەندێکی دیش بە شۆڕش خۆیان دەکوژن. خانمی ماردینی لەوانە نەبوو، گەرچی بێباک و نەترس دەردەکەوت، بەڵام توانایەکی سەیری ژیان لە

خوێنیدابوو، لەو کەسانە بوو کە ڕوو دەکەنە ناو دارستانێک و دەزانن پڕێتی لە پڵنگ و ئەژدیها و جانەوەری برسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێباکانە ملدەنێن و فریوی دارستانەکە لەلایان لە هەر مەترسییەک گەورەترە... ئەو بەلایەوە گرنگ بوو هەموو شتێک بژی، لەش و ڕۆحی خۆی لە سەر ئەوە کۆککردبوو هەموو شتێک تائەوپەڕی ئەزموونبکات، دەیویست بە هەموو شێوەیەک هەستەکانی بخاتەکار، لەشی بخاتە ژێر هەر ئەزموونێکەوە کە دەشێت بێتە ڕێگای، لەمس و بینین و چێژی خۆی تادەتوانێت شەکەتبکات. خۆشحاڵ بوو کە بەرەو جەنگەڵە ڕاستەقینەکان دەڕوات... زۆر خۆشحاڵ.

## لەگەڵ فریشتەکاندا

کە هۆشەنگی بولبولیار پێی خستە ئەودیو دەرگای کەشتیی هەستیکرد ئیتر گەڕانەوەی بۆ نییە، ئێستا و بۆ هەتاهەتایە چۆتە دونیایەکەوە کە ناتوانێت لێیدەرچێت. لە ڕاستیدا کەشتیی فریشتەکان هیچ نەبوو جگە لە بینایەکی سێ نهۆمی کەمێک گەورە، خوارەوەی نیشتەجێی خانمی ڕێزانی مەلەکبین و بەشەکانی دی، شوێنی فریشتە نەخۆشەکان بوو. کەشتییەکە لە ناوەوە تاریک و بێدەنگ بوو، زوڵمەتێکی قووڵ و کپییەکی ترسناک گرتبووی... بە هێمنی دوای مەهدائیل کەوت کە وەک کەسێک لەناو موڵکی خۆیدا بسوڕێتەوە بەرەو جێگایەکی نادیار پێشیکەوت. بە پلەکەیەکی باریکدا سەرکەوتن و مەهدائیل لە سەرەوە دەستی برد و لە سویچێکی ڕەشەوە گڵۆپێکی زەرد و کزۆڵکی داگیرساند. مەهدائیل کەمێک وەستا و گووتی «ئێرە بیمارستانی فریشتەکانە، نابێت زۆر ڕووناک بێت. مامی مامی تیشکی زۆر دەیانترسێنێت... تیشکی زۆر

دەیانترسێنێت، لە بەرئەوە تا ڕوناکی کزتر بێت بۆ ئەوان باشترە. ئێمەی فریشتە لەو کاتەوەی لە مرۆڤ جیادەبینەوە و دێینەدەرێ، خۆمان بەرەو جێگایەکی نهێنی و کپ دەکێشین، مانەوەی زۆرمان لە کپی و تاریکی و بێئیشیدا چاومانی کزکردوە، هەر بەر تیشک بکەوین ئازارمان هەیە. ئێمە مەخلوقێک نین بتوانین لە ڕوناکی زۆردا کاربکەین، نشینگەی ئێمە ناوەوەی ئینسانە، لە شوێنە نهێنییەکاندا دەژین، لەو جێگایانەدا کە زۆر لە بەرچاو نین، فریشتە تەنیا کاتێک فریشتەی ڕاستەقینەیە کە نەبینرێت و بێدەنگ لە تاریکیدا کاربکات».

بێدەنگی کەشتییەکە بۆنی شکۆی کۆشکێکی دێرینی لێدەهات، بولبولیار سەرەتا هەستیکرد زەوییەکەی ژێر پێی کاشی ڕەش بێت، وەلێ لەگەڵ ڕۆشنبوونی گڵۆپەکەدا، بینی کاشییەکان بە زەخرەفەیەکی قەشەنگ لە چەند ڕەنگی جیاواز ڕێکخراون. هەردووکیان حەزیان لە دەنگی تەقەی پێڵاوەکانیان بوو لە ناو ئەو ڕیواقە درێژ و بێدەنگەدا، لای هۆشەنگ هیچ شتێک لەو دەنگدانەوەیە خۆشتر نەبوو، تەقەی پێڵاوی کەسێک کە بە ڕیواقێکی درێژدا دەڕوات، ئەو دەنگەی وەک سەمبولی گەشتی درێژی مرۆڤ بە ڕاڕەوە ناکۆتاکەی زیندەگیدا دەهاتە گوێ. مەهدائیل بە هێمنی دەرگای یەکەم ژووری کردەوە، ژوورێک بوو وەک هەر ژوورێکی ئاسایی نوستن، دۆڵابێکی جل و دوو کورسی و مێزێک لە سوچێکی ژوورەکەدا بوون، پەردەیەکی چەند چین و ئەستوور پەنجەرەکەیان پۆشیبوو، دیاربوو یەکێک سوراحییەک ئاوی لە سەر مێزەکە داناوە و بەر لە جێهێشتنی ژوورەکە چەند دڵۆپە ئاوێکی ڕژاندووە. لە پێخەفێکی گەورەدا، لە ناوەراستی سیستمێکی دوو کەسی بەریندا، لەناو کۆمەڵێک چەرچەفی ڕەنگاو ڕەنگ و ڕازاوەدا بە ڕەنگی سپی و سەوز، بولبولیار مەخلوقێکی گەورەی بینی، ژنێکی قەشەنگ، کە هەموو شتێکی لە مرۆڤێکی سادە و ئاسایی دەچوو، ئەوە نەبێت کە ڕەنگی زیاد لە پێویست

سپی هەڵگەڕابوو، بە جۆرێک مرۆڤ لەدوورەوە وایدەزانی بۆدرەیەکی سپی لە تەواوی لەش و ڕوخساری درابێت. مەهدائیل بە هێمنی چووە سەری و بە دەنگێکی نزم گووتی «سەیریبکە... سەیریبکە». بە هێمنی چەرچەفە ڕەنگینەکەی لادا و بولبولیار لە دیسداشێکی شینی ژنانەی درێژدا، قامەتی بڵندی فریشتەکەی بینی، هەردوو باڵە گەورەکانی بینی کە تەواوی سیسەمەکەی داگیرکردبوو، دەست و قاچەکانی وەک دەست و قاچی خانمێکی خنکاو لە ئاودا سپی و نەرمبوون. مەهدائیل گووتی «ناوی لەیلائیلە، هەندێک لە فریشتەکان خۆیان ناوی خۆیان دەزانن، هەندێکیان نا... ئێمە لێرە ناویان دەنێین، هەموو فریشتەیەک دەبێت ناوی هەبێت. من سەرەتا دژی ئەوەبووم کە هەموو فریشتەیەک ناوی هەبێت، بەڵام خانمی ڕێزانی مەلەکبین کە بەڕێوەبەری ڕاستەقینەی کەشتییەکەیە، ئەو سوورە لە سەر ئەوەی فریشتەکان ناویان هەبێت و ناوی هەموو فریشتەیەکیش بە پاشگری «ئیل» تەواو بێت، گەرچی پێش منیش ئەلیائیل ئەوەی بۆ ڕوونکردۆتەوە کە لە زەمانی کۆنەوە تا ئەمڕۆ، لە زۆر سەرچاوەی مێژوویی گرنگدا بەر ناوی چەندەها فریشتەی مەلەکوتی گرنگ دەکەوین کە ناوەکانیان بە پاشگری ئیل دوایی نایەت، بەڵام عەزیزم خانم گوێی لێ نییە و گوێی لێ نییە. ئەمە جگە لەوەی ئەم پاشگری ئیلە لە ڕاستیدا زرینگەیەکی زۆر دینی هەیە، ڕاستەوخۆ ئێمە وەک خزمەتکاری مەلەکوت نیشاندەداتەوە، بەڵام بەڕای خانم گەر ئەو ئیلەمان لێبێتەوە، ئیتر هیچمان لە فریشتە ناچێت، هیچ شتێک. بە بڕوای خانم ئەم باڵە زلانەمان لە باڵی مریشکی سپی ناو مامرگاکان بێسوودترە، بەڵێ کاک هۆشەنگ ئەو دەڵێت، هەموو منداڵێک بە دوو دینار دەتوانێت باڵێکی وەها بێسوود بۆ خۆی دروستبکات. بیکاتەوە و دایبخات، بیکاتەوە و دایبخات، هەتا جارێک فیلمێکی پیشاندام کە پڕبوو لەو جۆرە باڵە بێسوودانە، جگە لەوە خانم دەیەوێت هەموو فریشتەیەک

دۆسییەی خۆی هەبێت، چیرۆکەکەی تۆمار بکرێت... شتێک من لە بەر زۆر هۆ سەرەتا دژی بووم، بەڵام لێرە قسەی یەکەم بۆ خانمی مەلەکبینە، بۆ ئەوە». بولبولیار بە ئەسپایی دەستی لە باڵەکانی فریشتە خەوتووەکە دا، وەک باڵی بوونەوەرێکی ئەفسانەیی گەورە هاتە بەرچاوی، مەلمەسی باڵەکان لە مەلمەسی باڵی باڵندەیەکی ئاسایی نەدەچوون ، بولبولیار وای هەستکرد ئەم باڵانە لە تۆز و غوبار دروستبوون، سەیری سەری پەنجەکانی خۆی کرد سپی بوون. مەهدائیل بە دەنگێک هەیبەتێکی شاردراوەی تێدابوو گووتی «ئەوە باڵەکانی ئینسانن، باڵە شاردراوەکانی مرۆڤن... کە کەم کەس تا ئێستا لە دونیادا بینیوێتی و توانیوێتی دەستیان لێبدات». «وەک ئەوەی لە تۆزبن، لە غوباربن؟». مەهدائیل دەستێکی هێمنی بەقژی لەیلائیلی فریشتەدا هێنا و گووتی «فریشتەکان تا ماندووتربن و لە مردن نزیکتربن، باڵیان زیاتر دەبێتە تۆز، تۆزێکی سپی نەرم کە دوای مردن لێرەدا، لە جێگاکەدا جێدەمێنێت. لەیلائیل سێ ساڵە لێرەیە، هەموو فریشتەیەک ماوەی وەها درێژ نامێنێتەوە، هەر فریشتەیەک خاوەنەکەی زیاتر بۆی بگەڕێت، زیاتر دەژی... هەمیشە تا ساتی مردن جۆرە پەیوەندییەکی ڕۆحی لە نێوان خاوەن فریشتە و فریشتەکاندا دەمێنێتەوە... لە ڕاستیدا کەس نازانێت کێ خاوەنی لەیلائیلی فریشتەیە، سێ ساڵ لە مەوبەر من لە سەر شەقامی مەولانا دۆزیمەوە. ژمارەیەک زۆر کرێکار و ئامێر لەو ناوە ئیشیاندەکرد، گەر بجوڵابایە لەوانەبوو ببێت بە ژێر دەمی بلدۆزەر و تایەی تراکتۆر و ڕۆڵەی گەورەی ماشێنەکانەوە، چونکە کەس نەیدەبینی. کە هەڵمگرتەوە تەواو زمانی شکابوو، خستمە سەر عەرەبانەکەم و شتێکم پێدا دا و بە هەموو شەقامەکاندا هێنام بۆ ئێرە، زۆر ماندووبوو، چەند ڕۆژێک قسەی نەکرد، دواتر ڕێزانی مەلەکبین هەوڵی زۆری لەگەڵدا دا. هێدی هێدی بەرەو باشبوون ڕۆی، چەند مانگێک لەوەوبەر دۆخی زۆر باش بوو،

دەیتوانی هەستێت و پیاسەبکات، من و ئەو پێکەوە چەندجارێک بە ناو بێستانەکەی حاجی ئیسماعیلیشدا سوڕاوینەتەوە. کە فریشتەکان باش دەبن دوو هۆی هەیە: یەکەم ئەوانەی لێرە سەرپەرشتی تەندروستیان دەکەن، غەمخۆرانە کار بۆ مانەوەیان دەکەن، ئەوە دەکەن کە پێویستە بیکەن، چونکە بیرت نەچێت، فریشتەیەکی نەخۆش هیچ نییە جگە لە سێبەر و درێژکراوەی مرۆڤێکی نەخۆش. دووەمیش خاوەنەکانیان گەر لە هوشیاریشدا نەبێت و لەخەونەدا بێت، بە جۆرێک لە جۆرەکان بیریان لێدەکەنەوە و بەدوایاندا دەگەڕێن، تا خاوەن فریشتەکان ئاگاداری فریشتە نەخۆشەکەیان بن زیاتر دەتوانن بیانپارێزن. بولبولیاری هاوڕێم، من دەڵێم دڵی فریشتەیەک هەمیشە بە دڵی خاوەنەکەی لێدەدات، تا ئەو زیاتر فریشتەکەی ناخی لە بیربکات ئەو زیاتر لێرەوە دەمرێت. ڕەنگە واش نەبێت... ڕەنگە واش نەبێت، کێ چوزانێت. هۆشەنگی بولبولیار هەرگیز نابێت ئەوەت بیربچێت، من سەدجاری تر بۆت دووبارەدەکەمەوە، زۆربەی مرۆڤەکان هەست بە مردن و جیابوونەوەی فریشتەکانیان ناکەن. ئینسان بوونەوەرێکی وەها لە خۆبایی و مەغرورە، نیوەی ڕۆحی وشکدەبێتەوە و دەمرێت بەڵام نەهەستی پێدەکات، نەدەیبینێت، نەپێیدەزانێت. هۆی ئەوە هیچ نییە جگە لە بێباکی مرۆڤ و غروری، وەک جانەوەرێکی بێباک کە تەنیا بۆ ساتەوەختێکی کورت دەژی و بیردەکاتەوە، هەموو شتەکان لەو ساتەدا کورتدەکاتەوە کە تێیدا دەژی. ئینسان لەم دەمانەی ئێستادا بە جۆرێک دوای هێز و فریوی شتەکانی تر کەوتووە، ئەوەی بیرچۆتەوە کە هێزێک لە ناو خۆیدا هەیە دەتوانێت ڕێگای تری پیشانبدات. ئینسان بێبیرکردنەوە وەک بوونەوەرێکی گەمژە، دەکەوێتە بەر فریوی شتەکانی دونیا، تەنیا شتێک کە ئیتر نایجوڵێنێت و نایبینێت و هەستی پێ ناکات، دەنگەکانی ناخی خۆیەتی... بەڵام هەندێک هەن لە ناکاو هەست بە دەلاقەیەکی گەورە لە ڕۆح و ژیانیاندا دەکەن، هەستدەکەن شتێکیان

هەبووە لەدەستیانداوە، ئەو هەستکردنە وادەکات گەر لە خەویشدا بووە، گەر لەساتەکانی بێئاگایشدا بووە، بیر لەوە بکەنەوە کە دەبوو ژیانێکی تر بژین، کە دەبوو ڕێگایەکی تر بگرن، کە دەشێت شتێکی تریان بکردبایە. ئەوە هێزێکی گەورە دەبەخشێت بەم بوونەوەرە نەخۆش و بێهێز و بەستەزمانانە». بولبولیار دەستێکی لە قژی لەیلائیل دا، قژێکی جوان و نەرمبوو، مەهدائیل گووتی «بولبولیار فریشتەکان بە روخسار لە خاوەنەکانیان دەچن، لەیلائیل فریشتەی خانمێکی باڵابەرز و جوان بووە، خۆی ئەوەی بیرمابوو کە خاوەنەکەی ناوی لەیلا بووە، وەک بۆ منی باسکرد، ژنی پیاوێکی بازرگان بووە... ژنێک کە بێلەمپەر لە دونیای کەلوپەل و مەکیاژ و مۆدە و عەتردا ونبووە، ئیتر هیچ شتێکی دی لە ژیاندا بیرنەماوە. زەوی بە درێژیی و پانی گەڕاوە، بەدوای زێڕ و خشڵ و جەواهیردا وێڵ بووە. جگە لە گەڕان بەدوای یاقووت و ئەڵماسدا ئامانجێکی تری لەم ژیانە جوان و فراوانەدا نەبووە، بە جۆرێک فریشتەکەی خۆی بیرچۆتەوە، بێباک و کەمتەرخەم بەرامبەر ئینسان و زیندەوەرەکانی تر ڕەفتاریکردوە، ئیدی ساڵ دوای ساڵ ئەمی خنکاندوە، ساڵ دوای ساڵ ئەمی کردوە بە ژێر چینێکی ئەستوور و ترسناک لە ئارەزووی دیکەوە. تا ڕۆژێک لەیلائیل بڕیاریداوە هەڵبێت، بڕیاریداوە کە ئیتر لەو زیندانە تاریکە ڕابکات. دوای ساڵێک لە هەوڵدان، دوای ئەوەی ماوەیەکی درێژ باڵەکانی کێشدەکاتە دەرەوە، ڕۆژێک دەترازێت... ڕۆژێک دوای ئەوەی خانمی لەیلا لە دوکانی زەڕەنگەرێک دێتە دەرێ و پارە و پوڵێکی زۆر دەداتە ئەو خەڕەکە شکاوانە، ئیتر هێندەی خانم دەگەڕێتەوە ماڵێ، ئەم توانای خۆی کۆدەکاتەوە و بە گوڕمێکی گەورە دەترازێت و لە ناخی دێتەدەرێ، دواتریش لە ماڵی خاتوون هەڵدێت و ڕوودەکاتە ناو شار. وەک بوونەوەرێکی نەخۆش کە بەئەستەم دەتوانێت خۆی بە پێوە بگرێت، بە بازاڕدا خۆی کێشدەکات، تیشک چاوانی

دەبەستێت و هەڵاو هاواری ئینسانەکان ماندوویدەکەن، دەنگی ئەو هەموو مرۆڤەی کە خۆیانیان لە یادکردوە هێندەی تر نەخۆشی دەخەن، بە ماندوویی دەکشێت و لە دەم گوزەرێکی شەقامی مەولانادا دەنگی ئەو هەموو ئامێرە شێتە بڕستی لێدەبڕن و دەکەوێت... من نیوە مردوو لەوێدا هەڵمگرتەوە».

مەهدائیل دەستێکی خستە سەرچاوی و گووتی «بمبورە، ماوەیەکە دۆخی زۆر بەرەو خراپی دەڕوات. گەر بمانتوانیبایە خاوەنەکەی بدۆزینەوە و باوەڕی پێبهێنین کە ئەمە فریشتەی خۆیەتی، لەوانەبوو زیاتر بژی، بەڵام ئەوە ئاسان نییە، ناتوانین ئەم نهێنییە بۆ هەموو کەس ئاشکرابکەین. گەر نهێنییەکە زۆر بڵاوبێتەوە نازانم چی ڕوودەدات، بە ڕاستی نازانم. من زۆر هەوڵمدا ئەو لەیلاخانە بدۆزمەوە، بەڵام پێناچێت لەم شارەدا مابێت، تا مرۆڤ پتر هەست بە پوچی ژیانی خۆی بکات، تا زیاتر بیر لەوە بکاتەوە کە چیتر توانای درێژەدانی بەو جۆرە ژیانە نەماوە، تا پتر خەیاڵ بخاتە سەر دەنگەکانی ناخی، تا زیاتر بیر لەوانی تر بکاتەوە، فریشتەکەی لە هەر کوێ بێت، هەر زیندوو بێت و نەمردبێت لەوەوە وزە و تینێک وەردەگرێت... بەڵام کە مرۆڤ تەسلیمی یەکجۆر لە ژیان بوو، ئیتر تەواو، هێدی هێدی فریشتەکەی دەمرێت... گەر مرۆڤ ڕازیبوو بە ژیانێکی بێباک و دلڕەقانە، ئیتر فریشتە وەزیفەیەکی نامێنێت». بولبولیار بە ترسەوە پرسی «بەڵام کە فریشتەکەمان بە تەواوەتی دەمرێت... چی ڕوودەدات، چیمان بە سەر دێت؟». «هیچ ڕوونادات، فریشتە کە دەترازێت لە بەرئەوەیە هیچ کارێکی نییە، دەنگی بە گوێی خاوەنیدا ناگات، هەست بە بوون و نەبوونی ناکرێت. لە بەرئەوە کە دەڕوات هیچ شتێکی ئەوتۆ روونادات. فریشتە تەنیا مەخلوقە کە دەتوانێت یارمەتی مرۆڤ بدات، بە جۆرێکی تر بژی. بەڵام لە بەرئەوەی زۆربەی هەرە

زۆری مرۆڤەکان نایانەوێت، ناوێرن، هێزی ئەوەیان نییە، حەزیان پێ نییە بە جۆرێکی تر بژین، نایانکرێت گوێ لەو دەنگە نهێنییە کزەی ناو ناخیان بگرن... بەڵام مرۆڤ تا وای لێ نەیەت تەواوی ژیانەکانی تر و دونیاکانی تر و مرۆڤەکانی تر لە بیربکات، فریشتەکەی نامرێت، لەو جێگایەدا کە مرۆڤ مرۆڤی خۆشدەوێت، کە ژیان خاڵییە لە دڵڕەقی، سەرشار و لێوان لێوە لە هەستی برایەتی و ئەڤین، فریشتە فشارێک لە مرۆڤ ناکات. ئاسوودە و وەک ئەندامێکی دیکەی سروشتیی لە ناو مرۆڤدا دەژی. فریشتە کاتێک لە مرۆڤ دەترسێت و دەیەوێت لێیڕابکات کە لە ساردی و دڵڕەقی و پوچی ژیاندا نوقمبوو. فریشتە دواجار دەلیلی مرۆڤە بۆ لای ئەوانی تر، بۆ دونیاکانی تر، بۆ ژیانەکانی تر... کە مرۆڤ خۆی فریشتە بوو، ئەو کات فریشتە لە دڵدا لە سەر تەختی شاهانەیە، پێویستی بە بێزاری نییە، چونکە مرۆڤ لە سەر دەنگی ئەو و بە ڕێنمایی ئەو دەڕوات. بەڵام کاتێک مرۆڤ لە خواستە بچوکەکانی خۆیدا خنکا، ئیتر فریشتەکان دەبێت بڕۆن... بەڵام خۆشبەختانە کەمجار بووە لە مێژوودا، ئینسانەکان بە کۆمەڵ واز لەوانی تر و لە خەونی ژیانێکی تر بهێنن... کەمجار بووە».

لەیلائیل زۆر لاواز دیاربوو، بولبولیار بە هێمنی دەستێکی بە قژیدا هێنا، قژێکی ئاسایی هەبوو، وەک قژی هەر ژنێکی دیکەی دونیا. مەهدائیلی فریشتە بە ئەسپایی دایپۆشییەوە و گوتی «پێدەچێت خاوەنەکەی لەوە کەوتبێت بیر لە پوچی ژیانی خۆی بکاتەوە... تەسلیمی جۆرێک لە ژیان بووبێت کە ئەم فریشتەیە ناتوانێت تێیبگات. ژیانی بێباکی، بایەخ نەدان بە کەسانی تر، سوڕاندنەوە لە جوغزی بەختەوەرییە بچوکەکاندا. دیارە تەواو کاری بەمەوە نەماوە، چیتر بیری لێ ناکاتەوە، ئەوەش بە مردنی ئەم تەواو دەبێت... هێدی هێدی ڕەنگی سپی دەبێت، دواتر سپی تر، کەمە کەمە باڵەکانی دەبن بە تۆز، توانای قسەکردن لەدەستدەدات،

توانـای بینیـن، دواجـار توانـای بیسـتنیش... بەیانییـەک هەڵدەسـتین لاشـەیەکی بێگیانـە و دەبێـت هەڵیبگریـن و بیبەیـن بـۆ گۆڕسـتان و بینێژیـن. لـەوە زیاترمـان بـۆ ناکرێـت. گـەر مـرۆڤ بەراسـتی بیەوێـت فریشـتەکەی خـۆی بکوژێـت، هیـچ کـەس ناتوانێـت ڕێـگای لێبگرێـت».

لـە ژوورەکانـی تـردا مەهدائیـل چەندەهـا فریشـتەی خەوتـووی نیشـانی بولبولیـاردا، زۆربـەی ژوورەکان تەنیـا یـەک فریشـتەیان تێدابـوو، مەهدائیـل ڕوونیکـردەوە کـە تەنیـا ئـەو فریشـتانەی بـاری تەندروسـتیان باشـە، ترسـی مردنیـان لـە سـەر نییـە دەتوانـن پێکەوەبـن و دابنیشـن و قسـەبکەن، وەکو تر فریشـتە نەخۆشـەکان پێویسـتیان بـە هێمنـی هەیـە، ناتوانـن زۆر قسـەبکەن و سـەیربکەن، توانـای بیسـتن و بینینیـان زۆر کزدەبێـت، باڵەکانیـان زۆر لاوازدەبێـت و بـە زەحمـەت دەتوانـن بیانجوڵێنـن. بیمارسـتانەکە پتـر لـە بیسـت فریشـتەی نەخۆشـی تێدابـوو، هەموویـان بەیـەک شـێوە لـە سـەر پشـت پاڵکەوتبـوون و بـە قووڵـی خەوتبـوون، باڵەکانیـان وایکردبـوو کەمێـک بەرزببنـەوە، زۆربەیـان نیـگای بوونەوەرێکـی ئازارکێش لـە سـەر ڕوخسـاریان بـوو، بەشـی هـەرە زۆریـان ڕەنگیـان تـەواو سـپی بـوو، هەندێکیشـیان بـە پێچەوانـەوە، مـرۆڤ بـە ئەسـتەم دەیتوانـی بـە شـێوەی بـاڵا و ڕوخسـاردا لـە مرۆڤـی ئاسـایی جیایـان بکاتـەوە. هـەوای ژوورەکان پێکـرا بۆنێکـی تایبەتـی خۆشـیان هەبـوو، بۆنێـک لـە هیـچ جێگایەکـی دیکـەی سـەر زەمینـدا بوونـی نییـە، بۆنـی ئـەو فریشـتانەی کـە خەوندەبینـن. مەهدائیـل چیرۆکـی زۆربەیانی بـۆ بولبولیـار گێڕایـەوە، زۆربەیـان فریشـتەی کەسـانی بەدەسـەڵات و سـاماندار بـوون، ئـەو گووتـی بەڕێکـەوت هەڵدەکەوێت فریشـتەی هەژارەکان لە دەسـتیان هەڵبێـن، چونکـە کەمجـار هـەژارەکان لـە ئـازاری ئەوانـی دی و لـە خەونـی ژیانێکـی باشـتر دووردەکەونـەوە و لـە جوغـزی ئەمڕۆیانـدا گیردەخـۆن، مـرۆڤ تـا خەونـی جوانـی هەبێـت فریشـتەکەی نـاوی ئاسـوودەتر و چالاکتردەبێـت.

مەهدائیل ڕایوابوو فریشتەکان کاراکتەری خۆیان هەیە، هەندێک فریشتە هەستەوەرتر و ناسکترن و بچوکترین ئازار و لادان دەیانکوژێت، بەڵام هەندێک فریشتەی دی تەمەڵ و خەواڵوو و بێخەونن و بێ هیچ بەرگرییەک بێهۆش دەبن و دەخەون و دەمرن. دواجار فریشتەیەکی گەنجی نیشاندا، کوڕێکی لاو بە ناوی «سامیئیل»ـەوە، گووتی ئەمە دێرینترین نەخۆشی بیمارستانەکەیە شەش ساڵە بەرگەی گرتووە، یەکێکە لەو فریشتە کەمانەی کە خاوەنەکەی لە ساتی ترازانیدا بینیویێتی، چەند ساڵێکە دێت بۆ لای، فریشتەی کوڕە دەوڵەمەندێکی بێڕەحمە کە زۆربەی ژیانی لە مەستی و خۆبادان و فریودانی ئەوانی دیکەدا بردۆتەسەر، فریشتەکەی هەر بە گەنجی لەدەستی هەڵهاتووە، بەڕێکەوت ئەو کوڕە کە ناوی «سامی باهیر»ـە، ناسیاوی ڕێزانی مەلەکبینە، ئەو هەردووکیانی ڕزگارکردوە... ئێستا سامی باهیر و سامیئیلی فریشتە هەفتانە چەند جارێک یەک دەبینن، پێکەوە قسەدەکەن، ئەو رابوردووەی هەیانە بە جۆرێکی دیکە دەینوسنەوە، دوو هاوڕێی نزیکی یەکترن. لێرەوە سامیئیل باشترین و تەندروستترین فریشتەی بیمارستانەکەشە، زۆرجار غەمۆکی دایدەگرێت، بەڵام بە کۆمەکی ڕێزانی مەلەکبین و خاوەنەکەی زوو دێتەوە سەر خۆی، لە ماوەی ڕابوردوودا سامی باهیر و فریشتەکەی زۆرجار پێکەوە گەراون، سەفەریانکردوە، سامیئیل یەکێکە لەو فریشتە زیرەک و دەگمەنانەی گەر وابڕوات، دوورنییە بتوانێت تەمەنێکی درێژ بژی.

تا نزیکی بەربەیان بە بیمارستانی فریشتەکاندا سوڕانەوە، دەمەوبەیان هەردووکیان شەکەت بوون، بولبولیار پێیوابوو لە خەوێکی قووڵ و ناکۆتادا ونبووە، هەوا و دیمەنی ژوورەکان سەرسامیاندەکرد، لە نزیکەوە دەستی لە هەموو فریشتەکان دەدا، سەیریدەکردن، بۆنیدەکردن... کەدەرگای دوا ژووریان داخست مەهدائیل گووتی «ئەوە هەموو فریشتە خەوتووەکانی من بوون... هەموو فریشتە خەوتووەکانم». بەهێمنی دوای بولبولیار کەوت

و گووتی «لەقاتی خوارەوە ژوورێکی تایبەتی لێیە، لەوێ دەتوانیت تا نیوەڕۆ بخەویت، هیوادارم دکتۆر شوکاک کە بەیانی لە خەو هەڵدەستێت ئێمەی لە بیرمابێت، زۆرجار شەو وەها مەستدەبێت بەیانیان هەموو شتێکی بیردەچێتەوە، لەعنەتی خوام لەو عارەقەی یانەی پزیشکان دا، پێکێکی ئینسان مەستدەکات، گوێبگرە ئێستا باش بخەوە، تۆ بەیانی دەبێت رێزانی مەلەک بین ببینیت، تا تۆ لە خەو هەڵدەستیت ئەو لە دەوامی قوتابخانە دەگەڕێتەوە، سبەی ئێوارەش دکتۆر شوکاک دێت بۆ بینینی فریشتەکان، چی پرسیارێکت هەیە دەتوانی لەوانی بکەیت».

پێکەوە بە پلەکاندا چوونەخوارێ. هۆشەنگی بولبولیار لە دۆخی کەسێکدا بوو کە لە هەموو شتێک تێدەگات و لە هیچیش تێناگات، ئەوەش دژوارترین دۆخێکە عەقڵ پێیدا بڕوات. دۆخێکە هەموو شتەکان لە روکەشدا ئاسایی دەنوێنن، بەڵام لە ڕاستیشدا هیچ شتێک ئاسایی نییە. وەک ئەوەی مرۆڤ لە سەر ئەستێرەیەکی دیکە بێت، وە بشزانێت کە لە سەر ئەستێرەیەکی دیکەیە، بەڵام سەیری دەوروبەری خۆی دەکات و هیچ شتێک نابینێت بۆی بسەلمێنێت کە لە سەر ئەستێرەیەکی دیکەیە. هەستی بە شەکەتییەکی گەورە کرد، تا ئەوکاتە لە ژیانیدا شەوی وەها جەنجاڵ نەژیابوو، هەڵبەت کە شەوی زۆر تایبەتی بینیبوو، بەڵام ئەمشەو لەو شەوانەیە کە وادەکات مرۆڤ بیروبۆچوونی خۆی لە سەر هەموو ژیان بگۆڕێت. ئەوکات دەیان پرسیار لە خەیاڵیدا بوو، بەڵام مەهدائیل ماندووبوو... کە چووە ناو جێگاکەی گومانێکی قووڵی لە هەموو ئەم شوێنە و ئەم دونیایە هەبوو کە مەهدائیل هێناویێتی، بەڵام هێندەی سەری خستە سەر بالیفەکە، بێئەوەی فریای بیرکردنەوە بکەوێت، خەوی لێکەوت.

***

ڕێزانی مەلەکبین، خانمێکی بچوکی کەمێک گۆشتن بوو، قژێکی درێژی هەبوو، نیوەی لە سەر سەری وەک تۆپێکی مەیلەو زەرد تۆپەڵدەکرد و نیوەشی بۆ خوارەوە بەردەدایە، زۆربەی کات تەنوورەیەکی شینی گوڵداری درێژ و بلوسێکی سووری جەرگی لەبەردابوو، وەک مەهدائیل و دکتۆر دەیانگووت بەس خودا خۆی دەزانێت چەند دانەی لەو جۆرە تەنورە و بلوسە هەیە، لە پێنج ساڵی ڕابوردوودا کەمجار بە جۆرە ڕێکخستن و ڕوخسارێکی ترەوە بینرابوو، جووتێک پێڵاوی پاژنەبەرزی نوک باریک، سنگێکی پڕ کە بە جۆرێک نائاسایی بۆ پێشەوە دەرپەڕیبوو، چاویلکەیەکی لێوار بریسکەداری پزیشکیش... هەمیشە بەو جۆرە دەبینرا. بە شێوە و ڕوخساریدا لە سکرتێرەی یەکێک لەو تازە دەوڵەمەندانە دەچوو، کە ئەوردەم هێدی هێدی دەستیانکردبوو بە کردنەوەی بیرۆی بچوک و تایبەت بە خۆیان، یاخود وەک بەڕێوەبەری توند و پڕدیسپلینی قوتابخانەیەکی کچان دەردەکەوت، شێوەی ڕۆیشتن و سەیرکردن و قسەکردنی جیلوەی هێز و ویقارێکی ناوازەیان پێدەبەخشی. لە قوتابخانەی پەرۆش وانەی ماتماتیکی بە پۆلی چوار و پێنج و شەشەکان دەگووتەوە. لەو کاتەوەی سەرپەرشتی کەشتیی فریشتەکانی گرتبووە دەست، بۆ ئەوەی سەرنجی هیچ کەس لە دونیای دەرەوەدا ڕانەکێشێت، بە ماشێنێکی نەسری چکۆلانەی سەوز بەیانیان دەچوو بۆ قوتابخانە و نیوەڕۆ دەهاتەوە، ڕێگای بە هیچ کەسێک نەدەدا ئاسان بێتە ناو موڵکەکەی، بۆ ئەوەی هەموو شتەکانیش لە چاوی غەریبان بپارێزێت، لە دەرەوە خۆی وەک کچێکی تاکباڵ نیشاندەدا کە ئەرکی بەڕێوەبردنی زەوی و باغاتێکی زۆری لە سەرە. هەموو دەیانزانی لەو موڵکە گەورەیەدا بە تەنیا دەژی، جگە لە مام شەهابی باغەوان و کوڕەکانی کە لە دێر زەمانەوە باغەوانی حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین بوون، جگە لە فریشتە و هەندێک لە مەلەکبینان کەسی تر هاتوچۆی

موڵکەکەی حاجی ئیسماعیلی نەدەکرد. دەرگای سەرەکی موڵکەکە لە سەر شەقامێکی لاچەپ و مردو بوو، بەدەگمەن یەکێک لەو شەقامەوە بهاتبایە و بڕۆشتبایە، موڵکەکە دراوسێی وەها نزیکی نەبوو، تەواویشی بە دار گوێز و قەیسی و توو و هەنار و هەنجیر تەنرابوو. گەر کەسێک لە پشتیشەوە دزەی بکردایەتە ناوی، دەبوو ماوەیەکی درێژ بە ناو درەختەکاندا بڕوات، تا لە سیاجی کەشتییەکە نزیک ببێتەوە... کە دیسانەوە بە دیوارێکی تایبەتی لە تەواوی بێستانەکە جیاکرابووەوە.

لە ڕاستیدا تا ئەودەم جگە لە مەلەکبینەکان کەس قاتی سەرەوەی بیمارستانی فریشتەکانی نەبینیبوو، قاتی خوارەوەش وەک ماڵێکی ئاسایی، وەک نیشتەجێی خانمێک ڕێکخرابوو کە حەزی لە ژیانی نوێ و مۆبێلی جوان و فەرشی گرانبەهایە. ناوبانگی ڕێزانی مەلەکبین وەک ژنێکی ئاڵۆز و داخراو کە کەم لەگەڵ خەڵکدا قسەدەکات، کەم تێکەڵ بە مامۆستاکانی هاوڕێی دەبێت، لەگەڵ قوتابییە منداڵەکاندا خۆشزمان نییە، لە خۆشەویستی زیاد و ڕووخۆشی درۆزنانەی خەڵک دەیپاراست. ساڵ دوای ساڵیش تادەهات زیاتر ڕوخساری قەیرە کچێکی گرێداری وەردەگرت کە خوازبێنیکەرێکی باش لە دەرگای نەداوە، ناوبانگی وەک ژنێک کە هەڵگری فریوێکی جنسی نییە، لەش و لاری بەشی ئەوەی پێوە نییە پیاوێک بجوڵێنێت، وایکردبوو بایەخ و سەرنجی خەڵکی تەواو بدۆڕێنێت. مامۆستاکانی هاوڕێی وەک نیوەشێت و ئاڵۆز و دەرون نەخۆش دەیانبینی کە تووشی دەردەپاکی و بیماریی زۆر ڕێکخستن بووە، ئافرەتێک لە گۆشەگیرییەکی گەورەدا دەژی، بایەخێکی نائاسایی بە پاکوتەمیزی دەدات، هەمیشە یەک جل دەپۆشێت، پێیوایە هەر پیاوێک لێینزیکببێتەوە بۆ داگیرکردنی موڵکەکەیەتی، لێرەوە بە درێژایی ساڵان هیچ خانمە مامۆستایەکی قوتابخانە نەبۆتە هاوڕێی ڕاستەقینەی، کەسیش دوور و نزیک باسی شووکردنی لەگەڵدا نەکردەوە... دیارە بە سەرێک ئەوە بۆ

ڕێزان مایەی نیگەرانی گەورەبوو کە هەموو ژیانی وەک قەیرە کچێک بمێنێتەوە، بەڵام بە سەرێکی تر، وایکردبوو بتوانێت تەواوی کاتی خۆی بۆ فریشتەکان تەرخانبکات. ئەو چەند جارە کەمەی ڕێکەوتی کردبوو غەریبەیەک گۆڕستانەکە ببینێت و نوسراوی سەر کێلەکان بخوێنێتەوە. ڕێزان گووتبووی گۆڕەکان جێ گۆڕستانێکی دێرینی بنەماڵەکەیەتی کە لە سەدان ساڵەوە لە ناو موڵکی تایبەتی خێزانەکەدا نێژراون، گۆڕەکان تەمەنیان چەندین سەدەیە، هێند هەیە ئەو بۆ دەرکردنی وەڕزی و بەگەڕخستنی فەنتازیا و خەیاڵ ناوی تایبەتیان لێدەنێت، کێلەکانیان نوێدەکاتەوە، بۆ هەر مردووە و ژیاننامەی تایبەتی دەنوسێت و فەنتازیای نوێ دەخاتە گەڕ.

دەبێت بڵێم کە ڕێزانی مەلەکبین لە چوارچێوەی موڵکەکەی خۆیدا، لەو شوێنەدا کە خۆی بە گاڵتە ناویدەنا کۆماری فریشتەکان، سروشتێکی جیاوازی هەبوو، نە خانمێکی وەها دوودڵ و داخراوبوو، نە بۆ قسەی خۆشیش دادەما و نە لە زمانی شیرینیش کەمی هەبوو. لە ڕاستیدا خانمی مەلەکبین لە دەرەوەی دیواری موڵکەکەی خۆی کەسێک بوو، کە بە خۆی و ئوتومبیلە سەوزە بچوکەکەشییەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵ و کاروباری کەشتییەکەی دەگرتەوە دەست، دەبوو بە کەسێکی دیکە.

ئەو شەوەی بولبولیار لە ژوورە تایبەتییەکەی ماڵی ڕێزانی مەلەکبیندا خەوت، هەستیکرد قووڵتر و قورستر و درێژتر لە هەموو شەوەکانی پێشووی ژیانی خەوتووە، نوستنێک وەک خاڵی بووبێت لە هەر خەونێک، وەک بێهۆشییەکی قووڵ، ڕۆچوونێکی ناکۆتا بە تاریکییەکی بێسنووردا، وەک ئەوەی لە شوێنێکی زیندەگییەوە داگەڕابێتەوە ناو ئاستێکی دیکەی زیندەگی. لای نیوەڕۆ مەهدائیلی فریشتە بە دەنگە گەورە و گڕ و نێرانەکەی لە خەوی هەستان، کە هەستا تاماوەیەک ئاسەواری

ئەو خەوتنە دووورودرێژە هێشتا لە سەر ڕوخسار و دەنگی بوو. وەک یەکێک هەموو شتێکی سەبارەت بە شوێن و کات یادکردبێت، پرسی «ئێمە هەر لە کەشتیی فریشتەکانین؟». مەهدائیل دەستی گرت و کۆمەکیکرد لە جێگاکە بێتەدەرێ و گووتی «بەڵێ هۆشەنگی بولبولیار، هەر لەوێین. مامی مامی هیچ کەس نەهاتووە، بە تەختی خەوتن و ژوورەکەوە هەڵتبگرێت و بتبات بۆ شوێنێکی تر». بولبولیار شەو بە تەواوی جلەکانییەوە خەوتبوو، جگە لە پێڵاوە کۆنەکانی کە لە بەر تەختی خەوەکەدا هەڵیگرتەوە، پێویست نەبوو هیچی دی بکات. بولبولیار بەرەو بەردەمی دەستشۆرێک شوێن مەهدائیل کەوت، لە بەر دەستشۆرەکەدا مەهدائیل پێیگووت «جوان دەموچاوت بشۆ، هەوڵبدە تەواو بێیتەوە سەرخۆ و هەموو شتەکان بێنەوە خەیاڵت، تۆزێکی تر دەبێت خانمی ڕێزانی مەلەکبین ببینین. من بەیانی زوو بەر لەوەی بڕوات بۆ دەوام هاتنی تۆم بۆ باسکرد، لە ڕاستیدا بە جۆرێک پێویستمان بە کۆمەکە، بە جۆرێک ئیحتیاجمان بە یارمەرتییە، خانم هەواڵی دۆزینەوەی تۆی بە خۆشحاڵییەوە وەرگرت، ڕێزانی مەلەکبین لە ناو ئێمەدا وەک دایکی فریشتەکان ناسراوە. دۆزینەوەی کەسێکی مەلەکبین کە وەک تۆ لە مانای بینینی فریشتەکان بپرسێت دەگمەنە... گەر مرۆڤێکیش هەبێت توانای بینینی فریشتەکانی هەبێت، بە زەحمەت باوەڕ بە چاوی خۆی دەکات، زۆرجار کەسانی مەلەکبین ئەو توانایەی خۆیان بە دیوی ئێماندا دەشکێننەوە و دەڵێن خودا فریشتەمان پیشاندەدات تا باوەڕ بهێنین، گەر واش نەبێت هەر بە دەگمەن باوەڕ بە چیرۆکی ئێمە دەکەن... لە بەرئەوە هیوادارم تۆ، من و خانمی مەلەکبین نائومێد نەکەیت».

بولبولیار چەند جارێک لە سەریەک دەموچاوی شت، جارێک بە ئاوی گەرم و چەند جارێک بە ئاوی سارد، هەستیکرد ئاوە ساردەکە ڕایدەچڵەکێنێت و تەواو وریایدەکاتەوە. بە خاولییەکی سپی گەورە

دەموچاوی سڕی و بە تووڕەییەوە ڕیشی وشککردەوە. دەمێک هەستیکرد ڕیشی تەواو وشکبۆتەوە، بە سەرسامییەوە بیری لە دوا ڕستەی مەهدائیل کردەوە و پرسی «بەڵام خانمی مەلەکبین چاوەڕوانی چی لە من دەکات... دەبێت چیبکەم؟». مەهدائیل خاولییەکەی لێوەرگرت و لە جێگایەکی تایبەتیدا هەڵیواسی و گووتی «چاوەڕوانی چی بکات؟ چاوەڕوانی ئەوەی لە خزمەتی فریشتەکاندا کۆمەک و هاوکاری بکەیت. خانمی مەلەکبین بەرپرسی ئێرەیە، ماوەیەکی درێژە ئەو لێرە کارەکان دابەشدەکات... سەیردەکەین بزانین داوای چی دەکات، باوەڕناکەم کاری سەختت پێبسپێرێت، واهەستدەکەم لەمڕۆدا باشترە هێدی هێدی بە دونیای فریشتەکان ئاشنابیت، وەک بەشێکی دوور و جیاواز و خەیاڵی سەیری نەکەیت، تووشی ئەو گەمژەییە نەبیت کە ئینسان لە سەردەمی ئادەم و حەواوە تێیکەوتووە، ئەوەی وابزانیت دونیای فریشتەکان شتێکی جیاوازە لە دونیای مرۆڤ».

تەواوی ڕاڕەو و ژوورەکان بە فەرشی گرانبەها داخرابوون، دیکۆرێکی سادە، بەڵام جوان لە هەموو جێگایەک بوو، بولبولیار لە سەر دیوارەکان وێنەی چەندەها فریشتەی بینی، وێنەکان هەموو پێکدەچوون، وێنەی گەورە و ڕەش و سپی فریشتەی نەخۆش، هەموو لە سەر بەستێکی سپی دانیشتبوون و لە پشتیانەوە نیگاری چەند درەختێکی ڕەش هەبوو. وێنەکان بە جۆرێک بوون مرۆڤ نەیدەزانی ئاخۆ فۆتۆگرافی تەواون یاخود یارییان لە سەر کراوە و تابلۆی دەستکردن، یان تێکەڵەیەکی ئەفسوناویین لە هەر دووکیان... بەڵام بولبولیار بێئەوەی زۆر بیربکاتەوە، یان خەیاڵی بخاتە ژێر زەبر و زۆرەوە، زانی وێنەکان بە کۆ نیگاری ئەو فریشتانەن کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لێرەدا بوون، وێنەکان زۆربەیان کاڵ و کەمێک تەرزەدار و ناڕۆشن بوون. مەهدائیل گووتی «ئەوانەی دەیبینی وێنەی

ئەو فریشتانەن کە لێرە ژیاون و مردون، زۆربەی وێنەکان دەگەڕێنەوە بۆ دوا ڕۆژانی ژیانی فریشتەکان، هەموو بە کامێرایەکی ڕوسی خانم گیراون. هەر فریشتەیەک هاتبێتە ئێرە و لێرە ژیابێت و مردبێت، وێنەی گیراوە، هەڵبەت ڕێدەکەوێت کە فریشتەشمان هەبێت نەیەوێت لێرە بژی و بڕوات و خۆی جێگایەکی دیکە بۆ ژیان و مردنی خۆی هەڵبژێرێت... لەو ڕووەوە ئێمە یاسا و ڕێسامان نییە. نا کاک هۆشەنگ، ئێمە بە سروشتی دەوڵەت کارناکەین، فریشتەمان هەبووە ساڵ ڕۆیشتووە و گەڕاوە و لەوسەرەوە بە نەخۆشی گەڕاوەتەوە و قەبووڵمان بووە. بەڵام فریشتەکان بەشی هەرە زۆریان لێرە ئاسوودەن، ئەو شێوازەی کە دکتۆر شوکاک و خانمی مەلەکبین گرتوویانەتە بەر، وادەکات تەمەنی مەلەکە نەخۆشەکان ئێستا لە چاو ساڵانی پێشوودا درێژتر بێت. گرنگ ئەوەیە ئەم وێنانە کە لە هەموو جێگایەکی ئەم ماڵەدا دەیانبینی نەتترسێنن ، خانم ڕێزان خۆی عاشقی وێنەی فریشتەکانە، جگە لەوەی بەمجۆرە گەورەیان دەکات و لە چوارچێوەیان دەگرێت، ئەلبومی تایبەتیشیان بۆ دەکاتەوە و وەک دەزانم لە جێگایەکی نهێنیشدا خەزێنەیەکی تایبەتی هەیە کە هەموو جل و بەرگ و یادگاری فریشتەکانی پاراستووە. خانم گەرچی ئەوە ئاشکرا دەرناخات، بەڵام بەڕاستی عاشقی فریشتەکانە... هەندێجار واهەستدەکەم چۆن هەڵدەکەوێت کەسانێک عاشقی کۆتر یان کەڵەشێر یان کەو دەبن، خانمیش بەو دەردە چووە، حەزی لەم باڵندە زەبەلاح و بێسوودانە کردوە کە ناویان فریشتەیە».

وێنەکان گەلێک سەیربوون، بولبولیار لەوەدا تیامابوو، ئاخۆ فۆتۆی ئاسایی کامێرایەکی دێرینن یاخود نیگارگەلێکن بەژێر دەستی وێنەگرێکی لێزاندا تێپەڕیوون کە بە مەبەست تۆزی زەمان و هەوای کۆنی جارانی خستوونە سەر. هیچ یەک لە وێنەکان ئەو ڕوونی و ڕۆشنییەیان نەبوو کە لە فۆتۆی کامێرا تازەکانی ئەو دەمی هەشتاکاندا هەبوو، زیاتر بەو وێنە

کاڵ و ناڕوونانـە دەچـوون کـە کۆتاییەکانـی سـەدەی نـۆزدە وسـەرەتاکانی سـەدەی بیسـت گەڕاڵـە ئەورووپییـەکان لـەم دەڤەرانـەدا گرتوویانـن، یاخـود دروستتر بڵێـم لـە وێنـەی نـاو ئـەو فیلمـە دۆکۆمینتاریانـە دەچـوون کـە لـە جەنگی جیهانـی یەکـەم جێمابوون، وەختـە بڵێـم بەدتریش، هەندێکیـان لـە کاڵـی و تەمگیریـدا وەک ئـەو وێنـە هـەرە کۆنانـە بـوون کـە دەگەڕێنـەوە بـۆ سـەردەمی شـەڕی ناوخـۆی ئەمریکـی. کۆمەڵێـک وێنـەی گەورەکـراو کـە هـەر کـەس دەیبینیـن وایدەزانـی زنجیـرە نیگارێکـی دروسـتکراوی دەسـتی یـەک هونەرمەنـدن کـە فەنتازیاکانـی خسـتۆتە کار و توانیوێتـی فیگەرەکانـی بـە باڵـی خەیاڵـی برازێنێتـەوە و ڕوخسـاری مەخلوقاتـی کـۆن و بـە سـەرچووی سـەردەمێکی تریـان بـۆ زیادبـکات. مەهدائیـل گوتـی «باشـی وێنـەکان لەوەدایـە مـرۆڤ دەتوانێـت وەک وێنـە بیانبینێـت. مەودایـەک لـە نێـوان وێنـە و ژیانـی ڕاسـتەقینەدا هەیـە هێشـتا لـەم فۆتۆیانـەدا مـاوە. بـاوەڕت بێـت، مـن وەک فریشـتەیەک کـە خەریکـە دووبـارە بـە جۆرێکـی بێمانـا لـە کاروبـاری ئادەمیـزادەوە دەئاڵێمـەوە، بـە هیـچ جۆرێـک لەگـەڵ ئـەو بـەرەو پێشچوونەی کامێـرادا نیـم، ئەهـا. ئێسـتا دەسـت بـە دوگمەیەکـدا دەنێیـت و دوای چرکەیـەک وێنەیەکـی ڕەنگاوڕەنگـت لـە ژێـری کامێراکـەوە بـۆ دێتـە دەرێ، عەزیـزم ئـەوە کوشـتنی فاسـیلەی نێـوان ژیـان و وێنەیـە... لـەم وێنـە کۆنانـەدا ئـەو فاسـیلەیە پارێـزراوە، ئـەوەش وادەکات جوانیـی خۆیـان هەبێـت کـە ئـەم وێنـە تازانـە نییانـە. لـەم کامێـرا نوێیانـەدا نیـگاری مـرۆڤ زۆر لـە مـرۆڤ خـۆی دەچێـت. جوانـی وێنـە لەوەدایـە هەمیشـە شـتێک لـە مرۆڤـدا بسـڕێتەوە و ونیبـکات تـا لـەدوی بگەڕێیـن و دوایبکەویـن. مـرۆڤ کـە وێنەیـەک دەبینێـت، دەبێـت بزانێـت ئـەوەی دەیبینێـت کەسـەکە نییـە بەڵکـو وێنەیەکـە و هیچـی تـر، بـە ڕاسـتی خۆشـم بـەو فۆتـۆ تازانـە نایـەت کـە زەق و زۆپ مـرۆڤ بـە هەمـوو چرچەکانییـەوە دەردەخـەن... لـە وێنـەدا نابێـت شـتەکان بـە ڕۆشـنی هەقیقـەت خـۆی ببینیـن، ئـەوە هـەم لـە جوانـی وێنـە و هـەم

لە جوانی هەقیقەت دەکوژێت. وێنە تەنیا کاتێک قەشەنگە عەزیزم کە بزانین هەموو شتێکی بۆ ئاشکرانەکردوین. من زۆر خۆشم لەمجۆرە وێنەیە دێت کە خانمی نازدارمان ڕێزانی مەلەکبین دەیگرێت. مرۆڤ وا دەزانێت ئەم وێنەیەی بەردەمی نیگاری سەردەمێکی ترە، عەکسی ڕۆژگارێکە بە سەرچووە. زۆر گرنگە لە فۆتۆدا هەست بە جوانی ڕابوردوو بکەین، زەمەن لە ساتی کاڵبوونەوە و بەباچوونیدا ببینین. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت، من خۆمان، مەبەستم خودی فریشتەکانە وەک وێنەیەکی تێپەڕ و بە سەرچوو و کۆنی ئینسان سەیردەکەم... وا خۆمان دەبینم. مامی مامی».

مەهدائیل چیرۆکی هەندێک لەوێنەکانی بۆ بولبولیار باسکرد و دواجار لە بەردەم وێنەی فریشتەیەکی قژ درێژی ڕیش سپیدا وەستا، گووتی «ئەمە دوا وێنەی ئەلیائیلی فریشتەیە، کلیلەکانی ئەم جێگایەم لەوەوە وەرگرت». لە شەوێوە مەهدائیل چەندین جار ئەوەی دووبارەکردبووەوە، ئاشکرا وەرگرتنی کلیلەکان ڕووداوێکی گەورە و گرنگی ژیانی ئەو بوو. ئەلیائیل دەموچاوێکی سپی پان و جووتێک چاوی چکۆلانە و قامەتێکی بڵندی هەبوو، ڕیشی درێژ و سپی و لوول بوو. وێنەکەی ئەو بەراورد بەوانی دی زیاتر لە پێشەوە گیرابوو، وەک ئەوەی فۆتۆگرافەکە بەو نزیکییە گوزارشت لە پەیوەندی نێوان خۆی و فریشتەکە بکات، کە لە وێنەکەدا لاواز و نزیکە مەرگ دەنوێنێت. مەهدائیل گووتی «لە ڕۆژەکانی کۆتاییدا زۆر لە فریشتە دەچوو، فریشتە بەو مانا دێرینەی لە خەیاڵی ئێوەی مرۆڤدایە، بەو مانایەی کە هەستدەکەیت بوونەوەرێکە لە ئاسمانەوە هاتووە».

کە گەیشتنە بەردەمی ژوورەکەی خانم، مەهدائیل کەمێک جلەکانی بولبولیاری چاککرد و گووتی «خانم بایەخێکی گرنگ بە شێوە و

جلوبەرگی خەڵک دەدات، هەموو جۆرە کەمتەرخەمییەکی ئەنقەست لەو ڕووەوە نارەحەتیدەکات».

مەهدائیل بە ئەسپایی لەدەرگای ژوورەکەی خاتوو مەلەکبینی دا و کەمێک وەستا، کە دەنگ نەبوو کەمێک بڵندتر لە دەرگاکەی دایەوە، کە هەر دەنگ نەبوو، لە سەرەخۆ دەسکی دەرگاکەی بادا و بە خاوییەکی بێوێنەوە کردییەوە، بە ئەسپاییش بە بولبولیاری گووت «ئسوڵی چوونە ژوورەوە بۆ لای خانم بەمجۆرەیە... هەرگیز پێت نالێن وەرە ژوورێ، ناشبێت وەک ڕەشەبا خۆت بکەیت بە ژووردا».

هێدی هێدی و بێدەنگ چوونە ژوورێ، خانم لە پشت مێزێکی گەورەی نوسینەوە، کە کتێبخانەیەکی گەورەی لە پشت بوو دانیشتبوو، سەری بە سەر کتێبێکی گەورەدا شۆڕکردبووەوە... کتێبێک پتر بە «دائیرەتولمعاریفێکی» کۆن دەچوو، دیواری بیرۆکەی سەرتاپا تەختەیەکی ئەسپەرتۆکراو بوو، کتێبخانەکە بەشێکی دیوارەکانی داگیرکردبوو، بەشێکی دیکەشی وێنەیەکی زۆر گەورەی خانمی مەلەکبین و پیاوێکی بە تەمەن بوو لەدەستێک جلی کوردی ئوتوکراوی قەد داردا، کابرا جامانەیەکی جوان پێچراوەی لە سەردابوو، فەقیانەیەکی سپی لە سەر دەستەکانییەوە ئالاندبوو، سمێڵێکی باریک و جووتێک برۆی ئەستوور و چاوێکی کەمێک خەواڵووی هەبوو، دیاربوو ئەو پیاوە جگە لە حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین بەولاوە کەسی دی نییە. لە وێنەکەدا خانم ڕێزان کچێکی هێشتا منداڵکارە، جلێکی لەبەردایە بە ڕوونی دیار نییە ئاخۆ جلی قوتابخانەیە یاخود چەشنە پۆشاکێکی سەردەمی منداڵییەتی. هێند هەیە شتێکی نۆیەداری لە ملدایە کە پتر لەوجۆرە ملوانە سەیرانە دەچێت کە ئەودەم کیژانی خوێندکار وەک تەوق دەبوو لە ملیبکەن. لەوە بترازێت ژوورەکە ویقارێکی تایبەتی دەبەخشی و حورمەتێکی نەرمی

بە سەر هەموو میوانێکدا دەسەپاند. گڵۆپێکی گەورەی سەر مێز، بە سەرچرایەکی مەیلەو زەردەوە لە سەر مێزەکە بوو، جگە لەوە فانۆسێکی بچوک و هەندێک مۆمیش کە ئاشکرا نیوەیی بووبوون هەر لەوێ بوون. پێدەچوو خانم شەوان پتر لەوەی گڵۆپی سەقفەکە بەکاربهێنێت، بۆ کەمکردنەوەی ڕوناکی لە هەموو بیمارستانەکەدا، ئەم مۆمانە بسووتێنێت. کە ئەوانی بینی بە هێمنی سەری بەرزکردەوە و گووتی «ئەها لێرەن. باشتانکرد، وەختێکە چاوەڕوانتانم. کاک هۆشەنگی بولبولیار... بەخێربێیت، بۆ کەشتییە بەدبەخت و دوور لە دەریاکەمان. عەجەب مارکسییەکی وەک تۆ فریشتەکان دەبینێت، من ئەم بەیانییە خەڵکێکم ڕاسپارد بزانن تۆ کێیت، ئەوەی دەستمکەوت بەمجۆرەیە». مەهدائیل بیریچوو بە بولبولیار بڵێت کە خانم لەو ژنانەیە دەمودەست و بێ پێشەکییەکی ئەوتۆ دەچێتە ناو بابەتەکانەوە و بۆ ئەوەی لێشی تێبگەیت باشترە قسەی پێنەبڕیت. بولبولیار بە سەر سڵاوی خانمی سەندەوە و گووتی «خانم دەتوانم بە وردی باسی مارکسیبوونی خۆمت بۆ بکەم... مەسەلەکە بەمجۆرەیە...». خانم دەستی بەرزکردەوە و گووتی «ئەها برای عەزیزم، غرور بخەرە ئەولاوە، غرور بخەرە ئەولاوە.. کە ژنێک قسەیکرد ئسوڵ وەهایە وازی لێبهێنیت تا کۆتایی قسەکانی تەواوبکات، وانییە؟ ئسوڵ وەها نییە؟». بولبولیار شەرمن و دەستەپاچە سەیری مەهدائیلی کرد و بێدەنگ بوو. «بەڵێ ئەوەی دەستمکەوت بەوجۆرەیە، تۆ مارکسییەکی لە ڕیزی توندڕەوەکان، بە جۆرێک گومانت لەوە هەیە ڕێکخراوە مارکسییەکانی تر لە سەر هەق بن، لە دوای دەستپێکردنەوەی شۆڕش، لە شانەیەکی شۆڕشگێڕانەدا کارتکردوە کە هەموو ئەندامەکانی جگە لە تۆ گیراون و زۆریان لەسێدارەدراون... دەتوانم عەزیزم بزانم تۆ بۆچی ماویت؟ هەندێجار مرۆڤ کە هاوڕێکانی بەوجۆرە کوژران، شەرم و شوورەییە ئەویش ئاوها زەق و زۆپ زیندوو بێت، بەڵێ کاک هۆشەنگ،

ئەوەی لە کۆتایی حەفتاکاندا ژمارەیەک هاوڕێی نزیکت لە سێدارەدراون و تۆ تا ئەمڕۆ وەها بە ئاسوودە دەژیت جێگای پرسیارە، وانییە... هەقمە بپرسم، ئێمە لێرە ئیشێکدەکەین وریایی دەوێت، وریایی زۆریش... وانییە مەهدائیلی خۆشەویستم، ئۆۆۆۆ فریشتە بەدبەختە ماندووەکەی خۆم، ئەم بەیانییە پێ ناچێت بەرچاییت کردبێت، هەر سەیری دەموچاوتبکەم دەزانم نانی تەواوت خواردوە یان نا، تۆ ئەوەت باشە گەر نانی تەواو نەخۆیت پێتەوە دیارە، پێمبڵێ عەزیزم شەهیەتت هەر وەکو خۆیەتی یان نا. گەر هەر وەک هەفتەی پێشوو شتت بۆ ناخورێت، بەو دکتۆرە سەرخۆشەی هاوڕێمان بڵێ شتێکت بۆ بنوسێت... ئاه ئەگەر دکتۆرێکی باشترم دەستبکەوتایە، کەسێکی لەم موستەفا شوکاکە باشترم دەستبکەوتایە فریشتان ببینێت، بەڵام لە کوێ... لە کوێ... قەسەم بە خوا بەشی هەرە زۆری پزیشکەکانی ئێرە نەوەک باوەڕیان بە بوونی فریشتەی نەخۆش نییە، باوەڕیان بە بوونی مرۆڤی نەخۆشیش نییە. ئەو دکتۆر ئومێدە هەر جارێک بۆ ئازاری پشتم دەچم، پێمدەڵێت بڕۆ بابە هیچت نییە، وەرزش بکە و تەواو، بە من دەڵێت خۆت لاواز بکە... مەهدائیل باوەڕت بێت وایە... بە بەدبەختێکی وەک من دەڵێت وەرزش بکە و تەواو... باوەڕت بێت وام پێدەڵێت».

مەهدائیل گوتی «خانم ڕێزان، لە ڕاستیدا خواردنم هێشتا باش نییە، نا وەک جاران نیم، ئومێدەوارم ئەم کەمی شەهییەتەم نیشانەیەکی خراپ نەبێت، نا... بەر لەوەی ئێوە بڵێن، خۆم پیشانی دکتۆر شوکاک دا، ئەو دەڵێت هیچ دکتۆرێکی عاقڵ لە ڕێگای عەقڵ و خەزێنەی زانستی خۆیەوە تێناگات کە فریشتەیەکی مەلعون بۆ لە ناکاو شەهییەتی نامێنێت، بۆ ناتوانێت ئیتر قسەبکات، بۆ کوێردەبێت و هیچ نابیستێت. ئەو ڕایوایە کەمبوونەوەی شەهییەتی من پەیوەندی بەوەوە هەیە کە هەستدەکەم سەردەمێکی قورسم لە پێشە، ترسم لەو پێشهاتانە هەیە

کە دەشێت بێنە ڕێم. بەڵام هەرچییەک بێت، ئێستا کەمێک باشترم».

«گرنگ ئەوەیە بخۆیت.. خۆشەویستم، گرنگ ئەوەیە بخۆیت. لە ئێستادا کاروبارم بەرگەی ئەوە ناگرێت تۆش بمریت. ناڵێم بەبێ تۆ ئیشەکان ناڕۆن، نا بەبێ من و بەبێ تۆش ئیشەکان دەبێت بڕۆن. ئاه بەڕاست بیرم کەوتەوە، من بە ڕاستی لە خولیای ئەوەدام منداڵێک بگرمە خۆم و بەخێوبیکەم و دوای مردنی من ئەم جێگایەی بۆ بەجێبهێڵم. عەدیلە خانی محامی ئەو ڕۆژە بە تەلەفون پێیگووتم، گەر من بەیانی بمرم، موڵکەکەم واریسی نییە، خۆت دەزانی حاجی ئیسماعیلی باوکم نە خوشک و نەبرای نەبووە، هەڵبەت هەیبووە... ئەوە قسەی بێمانایە، بەڵام هەموو بەر لەوەی ژنبهێنن و شووبکەن و وەچە بخەنەوە مردون... وای خوای گەورە، گەر بەیانی بمرم، شارەوانی دەست بەسەر تەواوی موڵکەکەدا دەگرێت. هەمووی دەکەوێتە ژێر دەستی پیاوێکی وەک قەزوانچی، بەڕێوەبەری شارەوانی. دەزانیت ناوی تەواوەتی چییە «خالید قەزوانچی قەبردۆست». من ژنێکی زۆر بەحورمەتم کە ئاوا بە قەزوانچی بانگیدەکەم، خەڵک هەر بە قەبردۆست ناویدەبەن، دەزانی بۆ پێیدەڵێن قەبردۆست، لە بەرئەوەی یەکەم کەس بوو، یەکەم بەڕێوەبەری شارەوانی بوو پارچەیەک عەردی گەورەی لە سەرقەبران بۆ خۆی و هەموو خێزانەکەی جیاکردەوە، عەردێک بە نیوەی ئەم موڵکە گەورەیەی حاجی ئیسماعیل دەبێت. زیاد لە سەد قەبری خاڵی تیا ئامادەکردوە، بە کێل و هەموو شتێکەوە... بە کێل و ناو و چەتر و دیکۆر و هەموو شتێکەوە، بۆ ئەوەی خۆی و تایەفەکەی لەو دنیا هەر پێکەوەبن و لەیەک وننەبن. پەنجا گۆڕی فراوان و خۆشی هەڵکەندووە، بەچەشنێکە دەڵێن گۆڕەکان لە ناوەوە وا بەرین و فەرەحن، مردووەکان دەتوانن بە ئارەزووی دڵی خۆیان سەرمەوقولاتی تێدا بدەن، دەڵێن گۆڕەکان لە ژێرەوە هەموو بە تۆڕێکی نهێنی و گەورە پێکەوە بەستراون، بە جۆرێک

هەر کامێکیان بیانەوێت دەتوانن سەردانی ئەوانی تر بکەن. ئەو کابرایە نیوەی سەرقەبرانەکەی بەوجۆرە بۆ خۆی و خزمەکانی داگیرکردوە... گەندەڵ... گەندەڵ... گەندەڵ، بە جۆرێک خەڵک ئێستا جێگایان نەماوە بمرن... نابینیت مەهدائیل، نابینیت خەڵک چەند کەم دەمرن؟».

مەهدائیل و بولبولیار هەر دووکیان پێکەنین.

خانم ڕێزان لەناکاو وەک بیری کەوتبێتەوە، ڕوویکردە بولبولیار و گوتی «پێمبڵێ کاک هۆشەنگ، تۆ لێرە وات لێهاتووە سەیری دووربکەیت و چاوت جۆرە شتێکی وادووربینی تێدا بێت کە من نازانم چی ناوبنێم، یان خۆت هەر وایت؟». بەرلەوەی بولبولیار وەڵامبداتەوە، مەهدائیل هەنگاوێک چووە پێشێ و وەک خزمەتچییەکی دڵسۆز، بیەوێت کاراکتەرێکی ناوازە و گرنگ بە خانمی خۆی بناسێنێت، گوتی « نا خانمی عەزیزم، بولبولیار هەر وایە. قەسەم بە موقەدەسات کە یەکەمجار لە باکووری کوچەی غەمپاشا بینیم، هەر بەو جۆرە بوو. بەردەوام وادەزانیت سەیری شتێکی دوور دەکات، ئەگەر هیچ شتێکی دووریش لە گۆڕێ نەبێت، لە بەردەم دیوارێکیشدا بیبەستەوە، ئەم ئەو جۆرە سەیرکردنەی لێنابڕێت... وانییە جەنابی بولبولیار». بولبولیار وەک پرسیارەکە ترساندبێتی، ڕاچڵەکی و گوتی «نازانم، نازانم، ناتوانم هیچ بڵێم». «هۆو مەهدائیل دەبینیت... دەبینیت کوڕە بەستەزمانەکەت ترساند، ئێستا وادەزانێت کەوتۆتە جێگایەکەوە شەیتان بەڕێوەیدەبات، نا کوڕی شیرینم، مەبەستی خراپم نییە، خودا شاهیدە من هیچ نیازێکی خراپم لەو ڕووەوە نییە. ئەوەندە هەیە کە دەتبینم بەوجۆرە سەیری دوور دەکەیت، دەترسم، ئاه دڵم شتێکی تێدا دەگەڕێت نازانم ناوی بنێم، خەڵکی دووربین هەمیشە ئاڵۆز و پڕنهێنین... وایە یان وانییە... ها... وایە یان وانییە؟ وەکو ئێمەی بەشەرە ئاساییەکان سەیری بەردەمی خۆت بکە باشترە».

مەهدائیل دووبارە قسەیکردەوە و گوتی «تا ئێستا سێ جار من و

ئەو یەکترمان بینیوە، وەک خۆی دەڵێت بەردەوام مەخلوقاتی باڵداری تر دەبینێت. جگە لەوە پڕە لە پرسیاری باش، خانم تۆ خۆت ناڵێیت: مرۆڤی باش، واتە پرسیاری باش... خۆت بەردەوام واناڵێیت؟»

خانم کتێبە گەورەکەی داخست و تۆزێک چاویلکەکەی داگرت و خستییەوە چاوی و گووتی «هەرواشە، گەر مرۆڤ پرسیارەکانی گەمژانەبوون، خۆشی گەمژەیە. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کێ دەزانێت چ پرسیارێک گەمژانەیە یان نا؟ دوو سەد ساڵ لەمەوبەر گەر یەکێک بیپرسیبایە ئاخۆ ئێمە لە حەزرەتی ئادەمەوە کەوتووینەوە یان لە حەزرەتی مەیمونەوە؟ هەموو خەڵک پرسیارەکەیان پێ گەمژانە بوو... بەڵام ئەمڕۆ وانییە، ئەوە پرسیارێکی گرنگە، مرۆڤ دەبێت وەڵامیبداتەوە».

مەهدائیل وەک گوێ نەداتە قسەکانی خانم، لە سەر وەسفی بولبولیار بەردەوامبوو «بەڵێ خانم، لەو باوەڕەدام کە فریشتەکانی خۆشدەوێت، من شەوێ بە بیمارستانەکەدا گێڕام، تاقەتاقە فریشتەکان دەبینێت، هیچ فریشتەیەک نییە جەنابی هۆشەنگی بولبولیار نەیبینێت و خۆشی نەوێت... بەدەگمەن کەس هەیە بەو ڕۆشنییە هەموو فریشتەیەک ببینێت. من سەرنجمدا هەتا فریشتەیەکی زۆر تەنک و نەبینرا و کەم جورمی وەک ئەسمائیلیشی بینی... خۆت دەزانی خانمی ئەسمائیل ڕۆژگەلی وەهای هەیە بە جۆرێک تەنک و غوباریی دەبێت، منیش زەحمەتم لە بینینیدا دەبێت». خانم ڕوویکردە هۆشەنگ و بە دەنگی بەرز گووتی «ئەوەی لە ژیاننامەکەی تۆدا بە دڵمە، ئەو خاڵەیە کە پەیوەستە بە هەژارییەوە. وەک دەڵێن تۆ لە هەژارتین هەژارترین کەسانی شاریت. ئەو کەسەی خەبەری تەواوی تۆی بۆ هێنام گووتی، کەس نییە لە شارەکەدا لە تۆ فەقیرتر بێت... کەس نییە. تۆ جگە لە جلەکانی بەرت، خاوەنی هیچی تر نیت... فەقیرترین فەقیری دونیایت. ئەوەم زۆر بەدڵە... نازانم ئەوە ڕاستە یاخود نا؟». بولبولیار، وەک یەکێک بە سەر تاوانێکەوە گیرابێت،

کەمێک سوور هەڵگەڕا، بە دەنگێکەوە شەرمی لێدەباری گووتی «ڕاستە، خاوەنی هیچ نیم، پێشتریش خاوەنی هیچ نەبووم». خانم بە سۆزێکی زۆرەوە گووتی «ئەوە هۆیەکی باشە تێبگەم بۆ دەتوانیت فریشتەکان ببینیت. چونکە من کە مەلەکبینێک دەبینم، دەپرسم ئەم کەسە خودا چ بەڵایەکی بە سەرهێناوە وا دەتوانێت مەلەک ببینێت. هەمیشە موسیبەتێک هەیە، گەر موسیبەتێکی گەورە نەبێت، ئەوا موسیبەتێکی بچوک هەر هەیە. ئینسان لە خۆیەوە نابێتە مەلەکبین، دەبێت دەردێکت هەبێت لە دەردی بەشەری ئاسایی نەچێت. ئەی چۆن بەساقەوبم... ئەوەی ڕۆحێکت هەیە وەک من موڵکداری و بیرکردنەوە لە ماڵ و سامان تێکی نەداوە، سافێتییەکی وەهات دەداتێ فریشتەکان ببینیت. مرۆڤ بۆ ئەوەی فریشتەکان ببینێت، دەبێت یان زۆر عاشق بێت وەک ئەو موستەفا شوکاکە گەمژەیە یاخود لایەنیکەم وەک من مادیات نەیخنکاندبێت. بۆ هەژارێکی وەک تۆ کە لەم دنیایەدا چاوت لە سەر هیچ نییە، بۆ تۆ کە خۆت دەڵێیت لە جلەکانی بەرت بەولاوە خاوەنی هیچی تر نیت، کارێکی عاجباتی نییە، شەو و ڕۆژ فریشتە لە بەردەمتدا سەمابکەن. ئێستا دەزانم لە من دەپرسیت: ئەی من چۆن فریشتەکان دەبینم؟ من کچە موڵکدارێکی بچکۆلە، قامەت نیوگەزیی، کە خەڵکی هەموو وەک پیرەکچێکی چقەداری بستۆلکەی لووتبەرزی کوپەلۆکە دەمبینین، چۆن فریشتەکان دەبینم؟. هەڵبەت هۆکەی ئاشکرایە، ئەوەیە شێتم. هۆیەکی قووڵتریشی هەیە، من لە منداڵییەوە، لە منداڵییەکی زووەوە گوێ لە ئازاری مرۆڤ دەگرم. من نازانم ئەم مەهدائیلی خۆشەویستەم چۆن وەسفی فریشتەی بۆ کردویت، ئاوها زل مەیبینە، من و ئەو هەمیشە لە پێناسەکردنی فریشتەدا دەبێت بە شەڕمان، هەڵبەت خاڵی هاوبەشمان هەیە، بەڵام کاتێک وەک هێسترێکی چەموش قاچ لە سەر شتێک دادەگرێت، من هەموو شتێکم بیردەچێتەوە. قەسەم بە قەبری

حاجی، ئەوەشم بیردەچێتەوە کە فریشتەیە و چی لەبەردەستمدا بێت تێیدەگرم... وانییە مەهدائیل... وانییە، بیرتە من چەند جار کتێب و سوراحی و مۆم و تەپڵەکم تێگرتوویت، هەمووشی لەبەرچی... لە بەرئەوەی من و تۆ لە سەر پێناسەیەکی وردی فریشتە ڕێکناکەوین... وانییە... وانییە بەقوربان».

مەهدائیل گووتی «بەڵام من و تۆ قەت جیاوازی گەورەمان نەبووە».

خانم ڕێزان بە گلەییەوە گووتی «ئێستا پێمدەڵێیت کە جیاوازی گەورەمان نەبووە... ئێستا. سەیرکە کاک هۆشەنگ، من وا تێدەگەم فریشتە بوونەوەرێکە وامان لێدەکات گوێ لە ئازاری ئەوانی تر بگرین. ئازاری مرۆڤ شتێکە لە منداڵییەوە بانگماندەکات. هەندێک کە فریشتەکانیان مردوە نایبیستن، ئەوانەشی دەیبیستن، فریشتەکانیان یارمەتیان دەدات. ئازاری مرۆڤ لە هەموو کونجێکەوە دێت، من لە منداڵییەوە لەگەڵیدا دەژیم... لە منداڵییەوە گوێ شلدەکەم و دەیبیستم، وەک هاوارێکە، قریشکەیەکە کە لە هەموو شوێنێکەوە هەڵدەقوڵێت. گوێبگرە کاک هۆشەنگ، ئەو دەنگانە لە منداڵییەوە زۆر ئازارمدەدەن، دەمەوێت نەیبیستم، بەڵام دەزانی چی نامێڵێت لە بیرمبچێتەوە، چی ئەو ئازارەم پێدەچێژێت، ئەو فریشتە مەلعونەی ناوەوەم، ئەو فریشتە مەلعونە. هەروەختێ مرۆڤ دەرهەق بە ئازار بێباک بوو، فریشتەکەی مردوە. ئاە گەر ڕاستت دەوێت... گەر زۆر لە دڵی ناگریت، ئەوانە بەختەوەرن کە فریشتەکەیان مردوە».

مەهدائیل سەری دانەواند و بەڕێزێکی گەورەوە گووتی «خانم ڕێزان من ڕۆژێک لە ڕۆژان دژی تۆ نەبووم، منیش باوەڕم وایە فریشتەکان ئیشیان ئەوەیە مرۆڤ لە ئازاری ئەوانی تر ئاگاداربکەنەوە. بەڵام خانم تۆ هەموو ئەم وەزیفەیەی ئێمە وەک کارێکی خراپ سەیردەکەیت، هەندێجار بەوە تاوانبارماندەکەیت کە ئێمە جگە لەوەی ئازار لە سەر زەوی زۆرتر

دەکەین هیچی تر ناکەین. بەوە زوڵمێکی گەورەمان لێدەکەیت».

خانم ڕێزان دەستەپاچە و بە سۆزێکی شاردراوەوە، وەک کەسێک ژیان ناچاریکردبێت بڕیاری سەخت بدات، گووتی «چیتان لێبکەم، بەقوربان، چیتان لێبکەم. هەڵبەت کە وایە. من خۆم کچی پیاوێکی موڵکداربووم، دونیا موڵکی ئێمە بوو، لە هیچم کەم نەبوو، لە هەموو شتێکم زیادبوو، بەڵام لە پڕێکدا ئەو فریشتەیەی ناوم پێیگووتم سەیری ئازاری ئەوانی تر بکە، گوێ لە ئازاری خەڵکی تر بگرە، هەست بە ئازاری ئەوانی تر بکە، ڕێ بە ئازاری ئەوانی تر مەدە... ئازاری ئەوانی تر، ئازاری ئەوانی تر، ئازاری ئەوانی تر. شەو و ڕۆژ ئەم ڕستە قورسەی دەدا بە گوێمدا، نیوەشەو لەخەوی هەڵدەستانم و دەیگووت: چیت بۆ ئازاری ئەوانی تر کردوە. کە دەچووم بۆ دارولموعەلیمات، لە پۆلدا دەیچپاند بە گوێمدا و دەیگووت، عەجایەب تۆ لەم پۆلە سارد و سڕەدا بەدیار ئەم مامۆستا کێلەوە بۆ دانیشتوویت، بۆ هەڵناستیت کۆمەک بە کەسێکی بەدبەخت بکەیت. من پێمدەگووت تۆ وادەزانیت مرۆڤ جانەوەرێکی وەها سادەیە، هەر تۆ پێتگووت ئەوە خۆشەویستی من، ئەوە یارمەتی من، ئەو ئامێز دەکاتەوە و ئاسان موحیبەت وەردەگرێت. ئەها بزانە ئەوە گەمژەییەکە کە من لە فریشتەکانی نابوورم. ئەو گەمژانە هێشتا لەوە تێنەگەیشتوون، ئینسان هەم بە زەحمەت دەتوانێت کۆمەکبکات و هەم بە زەحمەتیش دەتوانێت کۆمەک وەربگرێت. بەساقە ئەگەر وا ئاسانبایە ئینسان کۆمەکی بکردایە، ئەگەر ئینسان تۆزێک لەم لووت بەرزییەی دابەزیبایە و غرووری بخستبایەتە ئەولاوە، بە ڕوونی لە کاتی پێویستدا بیگووتبایە پێویستیم بە کۆمەکە، شەرمی نەکردبایە و ئەم عیزەتە بەدبەختەی نەفسی وەها گەورە و سەخت نەگرتبایە، هەموو شت ئاسان دەبوو. بەڵام من لە گەنجیمەوە ئەو دەنگە خەوم لێحەرامدەکات. هەر ئەوەندەش وەسواسێکی وەها لە دڵتدا ڕوا، هەر ئەوەندە شتێکی وەها

لە دڵتدا پەیدابوو، ئیتر پاش تۆزێک تۆش کە ئازارت نییە لەو ژانەوە دەناڵێیت، بۆیە من هەمیشە دەڵێم، فریشتەکەی ناو ئینسان وایکردوە ژانی مرۆڤ وەک پەتا و درمی لێبێت، هێندەی مرۆڤێک ئازاری هەبوو پاش کەمێک کۆمەڵێک خەڵکی دیش هەمان ئازاریان بۆ دروستدەبێت، ئازار ئازار ڕادەکێشێت، ئەوەشی ئەم ڤایرۆسە دەگوازێتەوە کێیە؟ فریشتە مەلعونەکەی ناخمانە. من وابووم، کچی پیاوێکی دەوڵەمەند بووم، ڕاستە دایکم زوو کۆچیکرد، بەڵام لە هیچم کەم نەبوو، هەتا خەڵکێک هەبوون ئیشیان ئەوەبوو بەتایبەت خزمەتمبکەن و دڵم ڕابگرن. دایەنی خۆم هەبوو، خزمەتکاری خۆم هەبوو، مامۆستای فارسی خۆم هەبوو، هەتا باوکم ویستی مامۆستایەکی تارم لە شیرازەوە بۆ بهێنێت، ناوی ئوستاد بیهبودی بوو، نازانم ئێستا بیرم چۆتەوە، ناوەکەی شتێک بوو لەو جۆرە، بەڵام مەلایەکی هاوڕێی حاجی ئیسماعیل نەیهێشت و گوتی با قورئان خەتمبکات. بەڵێ بەساقە، من لەو ناز و نیعمەتەوە وام لێهات لە هەموو کونج و گۆشەیەکدا هاواری خەڵکم دەبیست، فەقیری، نەداری، نەخۆشی، تەنهایی، ژان، بێکەسی و نازانم چی... هەزار دەرد و مەینەتی... هەر بەدبەختییەکم دەبینی دەگریام و لە بەدبەختەکان خۆیان غەمگینتر دەبووم، تا کار گەیشتە ئەوەی ساڵێک لە شێتخانە بگیرسێمەوە. مەپرسە لە شێتخانە بە چ دەردێکیان بردم. بەڵام وەرە و تا ئەمڕۆ سەیری ژیانم بکە، بزانە بە چ دەردێک چووم. وەرە و ببینە: ئێستا ئەو فریشتە مەلعونەی دڵم لە سەر عەرشی خۆی دانیشتووە و شەو و ڕۆژ ئازارم بۆ دێنێت، خزمەتم پێدەکات... ئیتر بڵێم چی بەقوربان... بڵێم چی؟ گەر بەخراپی کارمکردوە شتێک بڵێ؟ من دڵسۆزتان نیم؟ دڵسۆزتان نیم؟ لە من بەولاوە دڵسۆزێکتان هەیە... ئاه فریشتە بێسەفەتە مەلعونەکان؟».

مەهدائیل گوتی «نا ڕێزان خانی عەزیز، تۆ خاتوونی فریشتەکانی

ئەم شارەیت... بەڵام ئەوەی کە پێماندەڵێیت ئێمە ڤایرۆسی ئازار لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوازینەوە، گەرچی قسەیەکی ڕاستە، بەڵام هەستمان بریندارەدەکات... ئێمە ناوی نانێین ڤایرۆس، من زۆرجاری تر لە سەر ئەمە لەگەڵ تۆدا بە شەڕ هاتووم، ئێمە ناویدەنێین وەزیفەی پیرۆزی ئاگادارکردنەوەی ئینسان لەوانی تر. هەر کاتێکیش مرۆڤ هەستی بەوانی دی نەما، کە واتێگەیشت خۆی تەنیا نیشتەجێی سەر زەوییە، ئەو کات ئەو کارەساتە دروستدەبێت کە دەیبینین، فریشتەکان دەخنکێن، دەمرن، لە ناوەوەی مرۆڤدا دەبن بە ژێرەوە و وەک ژێردەریاییەکی شکاو نوقمدەبن. بۆ ئەوەی بە ڕاستی مرۆڤ بیت دەبێت ئازارت هەبێت، چارەی ترت نییە، مرۆڤبوون لە ئازار جیانابێتەوە، بەڵام ئەو ئازارەی ئێمە دەیهێنین وەک ئازارێک نییە کە جەلادێک دەیهێنێت، کە نەشتەری دکتۆرێک دروستیدەکات، کە نەخۆشییەکی خراپ دەیهێنێت، بەڵکو ئازارێکی شیرینە و وەک ئازاری خۆشەویستی وەهایە، مرۆڤ لە ڕێگایەوە دەرگایەکی تری بۆ دەکرێتەوە و دەتوانێت ژیان بە جۆرێکی تر ببینێت. ئێمە لێرەین بۆ ئەوەی بڵێین: وریا بە ئەی ئینسان. ئینسان لە ژێر هەر ناونیشانێکدا ئەو وریاییەی دۆڕاند دەدۆڕێت. خانم وەک خۆت دەڵێیت غرور بخەرە ئەولاوە، بەڵام گەر سبەی تۆش وەک مرۆڤ وریایی خۆت دۆڕاند، دەدۆڕێیت، کە هەستت بە ئازار نەما، دەکەویت. کێشەی ئەم سەردەمە ئەوەیە کە ئینسان ئەو وریایەی دۆڕاندوە... فریشتەکەی ناخی ئێوە چەند هاواربکات، وریابە ئەی ئینسان، مرۆڤ نەوەک گوێ ناگرێت، بەڵکو هەر نایبیستێت. لە مەهدائیلی خۆت زویر مەبە، بەڵام ئەوە ڕاستییەکەیەتی، مرۆڤ هەزار بیانوو و بەهانەی دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی وریا نەبێت. جارێک بە ناوی خودا و جارێک بە ناوی پێشکەوتن و جارێک بە ناوی نەتەوە و جارێک بە ناوی ئازادی شەخسییەوە ئەو وریاییەی دۆڕاندوە. ئێمە بەوە دەژین کە بزانین مرۆڤ وریایە. مرۆڤ

دەبێت بزانێت کە دەرەنجامی ئیشەکانی خۆی چییە، هەمیشەش یەک پێوەر هەیە، یەک پێوەر و هیچی تر، مرۆ چەند مرۆ ئازاردەدات و مرۆ چەند بەتەنگ ئازارەوە دەچێت... لەوە زیاتر پێوەری تر نییە».

بولبولیار سەرسامانە گوێی لە هەردووکیان دەگرت. خانم ڕێزان لە ناکاو گووتی «ئاە مەهدائیل، دەزانی من چەندە ماندووم لەم قسانەی تۆ. دەزانیت چەندە ماندووم. ئینسان بۆتە بوونەوەرێک هیچ شتێک نایوەستێنێت، نا بەساقە بە ڕاستیمە، من پێشبینی ڕۆژانی زۆر خراپ دەکەم. جاران باشتر بوو، دوێنێ شەو لە تەلەفزیوندا دیمەنی تۆپخانەکانت نەبینی؟ ئەم شەڕە مەلعونەی نێوان عێراق و ئێران، هەرچی شەیتانی سەر ئەرزە ڕوویان کردۆتە ئەم دوو مەملەکەتە داماوە و من و تۆش دانیشتووین باسی فریشتە و شتی وا دەکەین. نا مەڵێ نەتبینیوە؟ نا توخودا مەڵێ دیسانەوە لەگەڵ دکتۆر مستەفا شوکاکدا چوویتەوە بۆ یانەی دکتۆرەکان. مەهدائیل تۆ بە ڕاستی فریشتەیت، بەرگەی ئەو هەموو ورێنەیە دەگریت کە دکتۆر وەک تەرسی هێستر بە چواردەوری خۆیدا بڵاویدەکاتەوە. بەس عەزیزم با ڕێزانی خۆت پێتبڵێت، ئاگاداری خۆت بە وابڕوات تۆش فێری ئەم زەحلەیە دەبیت، زەحلەی پێدەڵێن؟ نازانم... زەحلەی پێناڵێن؟ ئەو عارەقە پیسەی دەیخۆنەوە. ئاە بە جەهەنەم چی پێدەڵێن. بەس دەبوو دوێنێ شەو ئەو نیگارانەت بدیبایە کە تەلەفزیۆن لە گۆڕەپانی جەنگەوە دەریخستن. بینیوتە، لە شەڕدا کە مرۆ تۆپ دەتەقێنێت چی دەکات؟ گوێی خۆی دەگرێت. ئینسان مەخلوقێکی وەها نالەبارە، خەیاڵی لای ئەوەیە دەنگی تۆپەکە ئازاری گوێی نەدات، بەڵام خەیاڵی لای ئەوە نییە تەقینەوەی ئەم گوللەیە چ بەدبەختییەک دروستدەکات، چۆن لەشی چەندەها مرۆی برای، کە هەر وەک ئەو وەهان هەلاهەلادەکات. نا ئینسان تەواو، تەواو عەزیزم. ماوەیەکی تر ئەوەندەمان ئیشدەبێت نەتوانین سەرمان بخورێنین...

بوەستە بەقوربان... بوەستە، جارێ لە کوێمانە».

لە ناکاو وەستا و ئاوڕێکی لە بولبولیار دایەوە و گووتی «ئەها کاک هۆشەنگ، بمبورە، من کچە موڵکدارم، من لە پێناسەی مارکسییەکی وەک تۆدا سەر بە چینی فیوداڵەکانم، کچە ئاغام... بەڵام دەتوانم وەک تۆ فریشتەکان ببینم، خێزانی مەلەکبینمان پێدەڵێن. بەڵام بەقوربان، بابگەڕێینەوە سەر چیرۆکی تۆ. تێمبگەینە چۆن مارکسیستێکی وەک تۆ، مەتریالیستێکی ساف و خالیس، دەتوانێت باوەڕ بە بوونەوەرێکی غەیبی وەک فریشتە بهێنێت؟ چۆن نەتگووت ئەمە چ قسەیەکی پڕ و پوچە ئینسان فریشتەی هەبێت؟ چۆن نەتگووت ئەمە چ قسەیەکە ئەم فریشتە ببینرێت، لەویش بەدتر بتوانێت لە مرۆڤ بترازێت، لەویش بەدتر وەک بیمارێک و بێکەسێک لە ئینسان جیاببێتەوە و لە سەر زەوی سەرگەردان بێت و وەک ئاوارەیەک بمرێت؟ من دڵنیام هەموو ئینسانە ماددییەکان بە شتی وا دەڵێن هەلوەسەی ئایدیالیستیانە، وەک چۆن دیندارەکان پێماندەڵێن کافری گەورە... بێنەوەی لەوە بڕوانن کە ئەگەر ئینسان فریشتەی نەبایە نەیدەتوانی عاشق بێت، ببێتە ئاشتیخواز، ببێتە مرۆڤدۆست... وای ئینسان خۆ بە خۆ قاوغێکی پوچە، ئێستا گەر فریشتەکەی بمرێت هیچ خودایەک ڕزگاری ناکات... هیچ خودایەک ».

بولبولیار هێشتا بە سەرسامی سەیری ژوور و کتێبخانە و فەرش و چەرمی قەنەفەکانی دەکرد، ڕاچڵەکی، سێبەری شەرمێک و سوور هەڵگەڕانێکی کەم کەوتەوە روخساری و گووتی «خانم سوپاس... ئم... ئەوەی لە ئێوەی دەبیستم سەیرە، لە قووڵاییدا سەیربکەیت، من بە درێژایی ژیانم ویستومە تەنیا بەرگری لە ئینسان بکەم، مەبەستم ئەوەیە بەرگری لەوە بکەم ئازار نەچێژێت. شۆڕشی من خانم، هیچ نییە جگە لە شۆڕشێک دژی ئازار. من نازانم ئەوە بە چ فەلسەفەیەک ناوبنێم... بەڵام تەنیا شۆڕشی ڕاستەقینە لە دونیادا ئەو شۆڕشەیە ئینسان دژی

ئازار دەیکات. ئەوە شۆڕشێکە کۆتایی بۆ نییە. بەڵام چۆن خانم؟ چۆن ئینسان دەتوانێت دژی ئازار شۆڕش بکات، بێئەوەی ئازاری تر دروستبکات؟ ئەوە نازانم، منیش وەک هەر کەسێکی تر بۆی دەگەڕێم. من بە ناسینی ئێوە بەختەوەرم، نازانم ئێوە لە کێتان پرسیوە و چ جۆرە زانیارییەکتان دەربارەی من دەستکەوتووە، بەڵام بەردەوام گووتوومە من تەنیا نیوەم مارکسییە، نیوەم مارکسییە و هیچی تر. مارکسییەکان دوژمنی ئەو ئازارانەن کە کەسانی هەژاری وەک من دەیچێژن، ئەوە وادەکات لێیان نزیکبم، لەوەدا تەبام کە ئینسان دەبێت شۆڕشگێڕێکی ئەبەدی بێت دژی هەژاریی و ئازار، بەڵام ئەوانیش وەک هەموو مرۆڤەکانی تر، کاتێک دژ بە ئازار دەجەنگن، لە جێگایەکدا دەبنەوە بە مەکینەیەکی ترسناک بۆ بەرهەمهێنانەوەی ژان و زام و بەدبەختی. من ئەو مافە نادەمە هیچ کەسێک بە ناوی ئازادییەوە بەدبەختی تر دروستبکات. من بیر لە لەدایکبوونی مرۆڤێک دەکەمەوە بتوانێت ئازار دروست نەکات، لە سەروو هەموو ئازارێکیشەوە خۆی ئازار نەدات. ئەوە ئەفسانەیە، وانییە ئەفسانەیە؟ بەڵام خانم من هیچ نیم جگە لە پیاوێکی شۆڕشگێڕ کە باوەڕم بە ئەفسانەیەک هەیە».

خانم بە بایەخێکی تایبەتەوە گوێی لە قسەکانی گرت، شێوەی دانیشتن و پاڵدانەوەی لە سەر کورسییەکە، سروشتی بەرز ڕاگرتنی سنگی و نیگا تیژەکانی پشت چاویلکەکەی، ڕوخساری ژنێکیان دەدایە، هەر ئێستا نا، تۆزێکی تر حوکمێکی گرنگ دەربکات. کە بولبولیار وەستا، پەنجەیەکی خستە سەر لێوی و بە هێمنی و سۆزێکی دایکانەی کتوپڕەوە، گووتی «وای بەساقە، من لێرە بەخەیاڵمدا نایەت خەڵکی چۆن بیردەکەنەوە، گەر مارکسی بیت یان مەزهەبی، کاری بە کاری منەوە نییە. بەڵام بە ڕاستی لێرە خەڵکمان دەوێت کۆمەکمانبکات. دەزانی لە خەیاڵی چیدام، دەزانی چەند ڕۆژە لە خەیاڵی چیدام. ئەوە

لەگەڵ دکتۆر موستەفاشدا باسمکردوە، ڕێکخراوێک دروستبکەین بۆ ئەوانەی فریشتەکان دەبینن، کۆمەڵەیەک بۆ مەلەکبینەکان، کە حەتمەن دەبێت نهێنیترین کۆمەڵەی دونیا بێت، نا لە بەرئەوەی بەقوربان ئیشی خراپ دەکەین و شتی وا، بەڵکو لە بەرئەوەی وەک ئەوە وایە شێتەکان ڕێکخراوێک بۆ خۆیان دروستبکەن، چی دەردەچێت؟ بە ڕاستیمە بەساقە... بە ڕاستیمە... بیهێنە بەرچاوت شێتەکان نەقابەیەکیان هەبێت، بڵێین چی: بڵێین ئێمە فریشتەی نەخۆش چاکدەکەینەوە، کێ باوەڕ بە شتی وەها دەکات؟ کێ دەچێتە ژێر باری ئیمانی وەهاوە. مرۆڤ خۆی لەبیریچۆتەوە کە فریشتەیەک لە ناخیدا بووە... ئێستا ئەوە تەواو، ئەوە بڕاوەتەوە و قسەی لە سەر نییە، لە یادیکردوە کردوێتی. وەک ئەوەی شەیتان شەربەتێکی بۆ جنسی ئادەمی گرتبێتەوە و یەک یەک دەرخواردی هەموو خەڵکی دابێت تا فریشتەکانیان لە بیربکەن، بەڵام چەند کەسێکی بەدبەختی وەک ئێمەی بیرچووبێت، بۆ ئێمەی پەڕاندوە نازانم؟. مەلعونی کوڕی مەلعون شەیتان، گەر لەو شەرابەی ئەوم دەستبکەوتایە بە سوراحی دەمخواردەوە... هەندێ ڕۆژ کە وام لێدێت بە دەست ئەم مەهدائیلەوە بگریم، دەڵێم تۆ لە کوێی شەیتانی عەزیزم، تۆ لە کوێیت؟ لەو شەربەتەی خۆتم بدەیتێ و چاو لێکبنێم و وەک هەموو ئەو بەشەرە بێباکانەی تر، ئەم دونیا سەیر و سەخت و پڕ ئازارەم بیربەیتەوە. دەزانیت ئەوەتەی ئەم ماڵی فریشتانە دەبەمەڕێوە دەزانم چ بەدبەختێکم... مرۆڤ کە زانی فریشتەیەک لە ناو ئینساندایە و هەموو ئەوانی تر فریشتەکەی خۆیان دەخنکێنن و دەیکوژن، سەیرکردنی بۆ ژیان دەگۆڕێت. من بۆ شووم نەکرد عەزیزم... بەقوربان... بۆ شووم نەکرد؟ وا شوومکرد بە پیاوێک و باوەڕی بە فریشتەکان نەهێنا؟؟ ئەوکات چۆن لەگەڵیدا بژیم. یەک پیاو بۆ من باش بوو، یەک پیاو، ئەم دکتۆر موستەفا شوکاکە، بەس حەوت شەیتان بە کرێ بگرە و

لە سەریدا بیانخەرە کار ناتوانن ژنە کۆنەکەی لە یاد ببەنەوە... ها بەقوربان لەمەدا من فریشتە و شتی وا ناناسم، ڕقم لە پیاوی وەهایە، ڕقم لێیەتی و تەواو».

مەهدائیل ئەوەتەی هاتبووە ژووری، ویقارێکی دەستکردی بەخۆی بەخشیبوو. لە بەردەم خانمدا دەیویست تا دەتوانێت بەڕێز دەربکەوێت. بە هێمنی گوتی «خانم ژمارەی ئەوانەی کە فریشتە دەبینن، لە زۆربووندان، شتێکی باشە عەزیزم مەلەکبینەکان یەکتر بناسن، بۆ نا... لە داهاتوودا کاری پێکەوەیمان زۆر دەبێت».

لە ناکاو خانم ڕێزان وەک شتێکی بەیاداهاتبێتەوە، لە پشت کورسییەکەیەوە هەستا و گوتی «ئاە، مەهدائیل، تۆزێک بەجێمانبهێڵە. تۆ فریشتەیەکی زۆر باشی، بەس یەک عەیبت هەیە کە زۆر حەزت لەناو مەعشەری ئادەمیزادە، وەک فریشتەیەک کە ڕۆژێک لە ڕۆژان مرۆڤ ئازاریداویت و لە ئینسان هەڵهاتوویت، دەبوو وانەبیت. هەندێجار کە ئەو حەز و کونجکۆڵیتە دەبینم بۆ مەعشەری بەشەر، وەختە گلەییت لێبکەم، وەختە بڵێم دواجار وابڕوات کەرامەت و ناموسی فریشتەکان دەبەیت. بەقوربان ئەوەندە خۆت لە مرۆڤ هەڵمەسوو، ئەوەندە خۆت لە مرۆڤ هەڵمەسوو، گەر شتێکی باش بووینایە ئێستا ئەو هەموو فریشتە نەخۆشەمان نەدەبوو. ئیشەکانی خۆت بکەیت باشترە لەوەی بەردەوام گوێ لە من بگریت، بەردەوام گوێ قوڵاغی پیرە کچێکی بەدبەختی وەک من بیت، عەجایەب، نازانم چی دڵێکت بە قەیرەکچێکی بێچارەی وەک مندا چووە. گەر تۆ ئەوەندە خۆت لەمن نزیک نەکردبایەتەوە، منیش کاتێکی زۆرترم بە دەستەوە دەما بۆ کوڕێکی باش بگەڕێم و خێزانێک دروستبکەم و منداڵێکم هەبێت و هەموو موڵکەکانم نەچێت بۆ ئەو کابرا گەندەڵە... بە ڕاستی دەبوو وانەبیت، بەڵام بەساقە ئێستا بەجێمانبهێڵە،

تۆزێک من و ئەم کوڕە قۆزە بەجێبهێڵە، دەبێت من و ئەو دوو قۆڵی قسەیەکی زۆر بکەین. نا شتێکی نهێنی نییە، هەر هێندە هەیە ئێمەی مەعشەری بەشەر حەزمان لە قسەی دوو بە دووە. نابین بە برادەری یەک و بڕوا بەیەک ناکەین گەر نەگەینە ئەوەی دوو بە دوو بەرامبەر یەک دابنیشین و ڕازی دڵ بۆ یەک هەڵڕێژین. ئەو نەخۆشییەشمان هەیە، تەنیا دوو بە دوو باوەڕ بەیەک دەکەین، کە بووین بە سێ هەمیشە هەوای دەوروبەرمان پڕدەبێت لە تۆوی فیتنە و دوو بەرەیی، لە بەرئەوە مەهدائیلی عەزیز بەجێمانبهێڵە. ئاه کاک هۆشەنگی بولبولیار یاخودا بەخێربێیت بۆ کەشتیی خۆت... ئێرە وەک ماڵی خۆت سەیربکە».

مەهدائیلی فریشتە نابەدڵ هەستا و بە هێمنی ژوورەکەی بەجێهێشت، لە شێوەی ڕۆیشتن و ملدانانیدا نیگەرانی و غەمبارییەکی ئاشکرا دیاربوو. کە چووە دەرێ، ڕێزان هەستا و دەرگاکەی داخست و گووتی «هەمیشە ئاوهایە، وازی لێبهێنم شەو و ڕۆژ لە سەر ئەو کورسییە بەدیارمەوە دادەنیشێت. هەندێجار تەحەمولکرنی لە تەحەمولکردنی شەیتان سەختترە... عەجایەب... کەوتووینەتە چ دنیایەکەوە. من لەگەڵ فریشتەکەی ناخی خۆمدا گیروگرفتم نییە، نە پەڕم دەرداوە و نە باڵم دەرکردوە، کەچی لە بەدبەختیمدا ئەم هەموو فریشتە هەڵهاتووەی خەڵک بوون بە ڕیشمەوە. پیرە کچێکی داماو کەی لە وێزەی ئەو هەموو کارە قورسە دێم. ئاه، کاک هۆشەنگ، کەواتە ڕاستە، تۆش فریشتەکان دەبینیت. بەس کوڕی خۆم، بەساقە، ئیشەکەمان لێرە ئاسان نییە. بە هەموو ڕوویەکدا قورسە. تۆ نازانیت، من ئەم ساڵانە چەند پیربووم، چەند ئازارم چەشتووە. ئەم شوێنەی تۆ دەیبینیت، شوێنی ئەوانە... کە یەکێکیان دەمرێت، کە دەیانبینم وردە وردە شەهییەتیان نامێنێت، کە دەیانبینم ناتوانن ببینن و قسەبکەن، باڵەکانیان دەبێتە تۆز و وەک گەڵای سیسس هەڵدەوەرێن،

چەنـدە دڵـم پێیـان دەسـووتێت. هیـچ شـتێک لـەوە ناخۆشـتر نییـە کـە مردنـی تەواوەتـی فریشـتەیەک بـە چاوی خـۆت ببینیـت».

بـاڵای لـەوە بچوکتریـش بـوو کـە لـە پشـتی مێزەکـەوە دەردەکـەوت، بـەڵام ژنێـک بـوو، توانـا و کاراکتەرێکـی تایبەتـی دەدرەوشـایەوە. بـە ئەسپایی گووتـی «گـەر فریشـتەکانمان بمـرن، ئیتـر ئینسـان ناتوانێـت بـە هیـچ پردێکـی ئەخلاقـی بەوانـی تـرەوە ببەسـترێتەوە. مـن ئـەم فریشـتانە فێـری دوو شـتیانکردم. دوو شـتی گـەورە، مـرۆڤ بـۆ ئـەوەی گـوێ بـە ئازاری ئەوانـی تـر بـدات، نـە پێویسـتی بـە خودایـە، نـە بـە هیـچ جـۆرە بیروبۆچوونێکـی سـەر زەمینـی. بەقوربـان. غـرور بخـەرە ئـەولاوە، بـەڵام مـن گـەر لـە پێنـاوی خـودادا گوێـم بـۆ ئـازاری کەسـێکی تـر گـرت، ئـەی مـن خـۆم چیـم. گرنـگ ئەوەیـە کـە مـن گوێـم لـە هـاواری مرۆڤێکـی بەدبەخـت دەبێـت، ئـەوە لـە ژێـر کاریگـەری هیـچ خودایـەک و مەزهەبێـک و نازانـم چییەکـدا نەبێـت، مـرۆڤ بـەدەر لـە هـەر بیـروڕا و ئاییـن و عەقیدەیـەک دەبێـت مرۆڤـی خۆشـبوێت. بـەوەدا فریشـتەیەک لـە ناخـی مرۆڤدایـە، ئیتـر ئینسـان پێویسـتی بـە هیـچ عەقیدەیـەک نییـە، خـۆی دەتوانێـت خـۆی بپارێزێـت. بـەڵام بـە قوربـان، مـرۆڤ کـە لـە فریشـتەکەی ناخـی دادەبڕێـت، ئینجـا دەکەوێتـە سـەر خولیـای دۆزینـەوەی چاکـەی خـۆی لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەم مەزهـەب یـان ئەویتـردا... مـن بۆیـە دەترسـم، گـەر فریشـتەکان بمـرن، مـرۆڤ ئیتـر پێویسـتییەکی گـەورەی بـە خـودا دەبێـت، پێویسـتییەکی زۆری بـەم مارکسـەی تـۆ یـان هـەر پیاوێکـی تـر دەبێـت کـە پێیبڵێـت گـوێ لـە ئازاری ئینسـان بگـرە. پاراسـتنی فریشـتەکان... ئەرکێکـی قورسـە. بـەوەدا فریشـتەیەک لـە ناخماندایـە، ئەرکمـان زۆر زۆر قورسـە. هەمـوو شـتێک لـە ئەسـتۆی خۆمانـە، گـەر فریشـتە نەبووایـە گوێمـان لـە خـوداکان دەگـرت، لـە عەقڵـە گـەورەکان، لـە کتێبـە ئەسـتوورەکان، ئـەوکات هـەر چییەکمـان دەکـرد ئێمـە بـەر پـرس نەدەبوویـن، خـودا بەرپـرس دەبـوو، فەلسـەفەکان بەرپـرس

دەبوون، کتێبەکان بەرپرس دەبوون. بۆیە هەر کات ئینسان لە سەر ڕێنمایی دین یان فەیلەسوفەکان بەرێگادا ڕۆیشت، خێرا دەبێتە پیاوکوژ، خێرا فریشتەکەی دەخنکێت، چونکە هەرگیز خۆی بەبەرپرس نازانێت. بەساقە، من ژنێکی هەروا شێتم، هەر واشێتم... بەوجۆرەیە، گەر مرۆڤ خۆی بەرپرسی ڕاستەوخۆ نەبێت لە هەموو شتێک، شتێک نابێت ناوی ئەخلاق بێت. ئەی چۆن عەزیزم خۆ ئەخلاق ئەوە نییە کە پیاوی ئەم شارە شیفتەی بوون، ناو لنگی ئافرەت... ئا.. من دڵنیاتدەکەمەوە ئەوە ئەخلاق نییە... ئەخلاق ئەوەیە گوێت لە هاواری ئینسان بێت و بچیت بە دەنگییەوە».

بولبولیار تۆزێک خۆی ڕاستکردەوە، هەستیکرد دەنگی خانم کاریگەرییەکی گەورەی لە سەری هەیە، زۆر خێراتر و ڕۆشنتر دەتوانێت دوای ڕستەکانی بکەوێت، هەتا وای هەستکرد ئەم لە مەهدائیل زیاتر روخسار و ڕەنگی فریشتەی هەڵگرتووە. کەمێک گەروی پاککردەوە و گووتی «خانم بەڵام ئێوە بەراستی چی بۆ فریشتە نەخۆشەکان دەکەن؟».

بە ئەسپایی گەڕایەوە پشتی مێزەکەی خۆی، زەردەخەنەیەکی ڕوونی گرت «بولبولیار با بۆت بگێڕمەوە چۆن باوکم، حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین، یەکەمجار فریشتەی بینی. بەقوربان، من گەر ئەم دەنگە ناخۆشەم بهێڵێت حیکایەت خۆش دەگێڕمەوە. خۆ بێزارت ناکەم، هەر کاتێک بێزاربوویت، سووک و باریک بڵێ قەیرەکچی دەمشڕ بێزاربووم و ئەوەندە مەڵێ، من زویرنابم، چونکە خۆم لە تۆ باشتر دەزانم چ ژنێکی زۆربڵێم. خودایە بەراستی نازانم کەی و لە کێوە تووشی ئەم دەردی زۆربڵێییە بووم. من منداڵبووم کە هەستمکرد حاجی ئیسماعیل دوو باڵی زۆر گەورەی لە پشتە. ڕۆژێک لەو باغەدا پیاسەیدەکرد و من لە دوورەوە تەماشامدەکرد و باڵەکانیم بینی. حاجیش لەوانەبوو کە خۆیان باڵی

خۆیان دەبینن. حاجی هیچ لە هۆکار و بەهانەی دەرکەوتنی ئەو دوو باڵە تێنەدەگەیشت... عەزیزم هەرواشە، کەس یەکەمجار لە شتی وەها تێناگات. یەکەمجار کە مرۆڤ ئەو باڵانە دەبینێت وادەزانێت بووە بە فریشتە و خودا بۆ کارێکی غەیبی گەورە ئامادەیدەکات، ڕەنگە تۆزێک غروریش بیگرێت و خۆی لە بەنیئایەمییەکانی تر بە باشتر بزانێت. کوڕی خۆم، لەو سەردەمەدا من جگە لە حاجی باوکم، بوونەوەرێکی ترم نەدیبوو باڵی هەبێت... کە پرسیاری ئەو باڵانەم لە حاجی دەکرد، بە مەراق و غەمێکەوە هەڵیدەگرتم و دەیخستمە سەر کۆشی و چەناگەی دەخوراند و دەیگووت ئەویش لێیان تێناگات، دەیگووت ڕۆژێک لەبەر ئاوێنەی خەیاتێکدا سەیری خۆی کردوە و ئەو باڵانەی بینیوە و لەوە زیاتر هیچ نازانێت. باڵەکانی نە سەنگیان بوو، نە خەویان لێ حەرام دەکرد، نە جێگایان لێدەگرت... بەساقە بەوجۆرە بوو، باڵەکان کاتێک دەردەکەون هیچ نین، نە کێشیان هەیە، نە شوێن دەگرن، نە هیچ... بەڵام باشترە لە ئێستاوە بزانیت کە باوکم هەموو سەروەت و سامانی خۆی بە دڵڕەقی پێکەوەنابوو، هەر کەسێک لەبەر دەستکورتی و لێقەومان و نەداری موڵکی خۆی بخستایەتە مەزادەوە، باوکم بە پارەی کەم دەیکڕی، هەندێجار مەرجی قورسیشی بۆ کڕینەکە دادەنا. کڕیارە داماوەکانی والێدەکرد بە نرخی زۆر کەم دەستبەردای موڵکە گرنگ و بەنرخەکانیان بن... بەقوربان لەوەدا تۆ لە سەر هەقی، من کچە فیودالێکی خراپم. باوکم مەلاک بوو نەوەک مەلاک... تادەهات سنووری موڵکەکانیشی گەورەدەکرد، ئەودەم تازە تاپۆ لەو شێوە کۆنەی زەمانی عوسمانییەوە دەچووە سەر شێوەی تازە. بابم ساڵانێک دواتر کە منی بووم، ئیدی هەر موڵکێکی کڕیبا، هەمووی لە تاپۆی نوێدا بەناوی من و خۆیەوە تۆماردەکرد، موڵکەکە هەر موستەنەد و پسوڵەیەکی کۆنی سەردەمی عوسمانی هەبایە لە ناویدەبرد، نەبا ڕۆژێک خاوەنەکەی

ڕێکەوتنەکە هەڵوەشێنێتەوە و بڵێ بەیعی نەهاتووە. بەوجۆرە حاجی باوکم تۆزە تۆزە بووە گەورەترین موڵکداری شار. ئیتر لە پێچێکدا فریشتەکەی ناخی بەرگەی ئەمجۆرە ژیان و پوڵپەرستییەی نەگرت و هاتە سەر ئەو قەرارەی لە خانەی حاجی بترازێت و حاشای لێبکات، بەوجۆرە باڵەکانی خۆی کێشکردە دەرەوە و ئەو ئامارە گەورەیەی دا کە دەیەوێت بڕوات و وازبهێنێت. بەڵام وەک گوتم، نە من و نە حاجی ئەو دەم هیچمان دەربارەی چیرۆکی هەڵهاتن و ترازانی فریشتەکان نەدەزانی. لە هیچ کتێبێک و لە هیچ جێگایەکدا حیکایەتی وا نەبیسترابوو. دین و دونیا پڕبوون لە چیرۆکی مەلەک، بەڵام هیچیان بەو جۆرە نەبوون. باوکم پێنج ساڵ بەو باڵانەوە ژیا... ئەو باڵە گەورانەی کە جگە لە من و ئەو، هیچ کەسی تر نەیدەبینین... پێنج ساڵ. لەو پێنج ساڵەدا باوکم دوو جار چوو بۆ حەج، باوەڕی وابوو، ئەو ساتەی لە بەردەم گۆڕی پێغەمبەردا دەوەستێت و دەست لە دیواری کەعبە دەدات، خودا بە موعجیزەیەک لە موعجیزەکانی خۆی نهێنی باڵەکانی بۆ ئاشکرادەکات. هەر دوو جارەکە باوکم نائومێد و بە خەیاڵێکی ئاڵۆز و عەقڵێکی نیمچە شێتەوە گەڕایەوە. بەڵام باڵەکانی هەر لە جێگای خۆیان بوون. دوای پێنج ساڵ لە دەرکەوتنی باڵەکان، ڕۆژێک لە ناکاو نەخۆش کەوت، بیمارییەکی زۆر زۆر سەختی گرت. لەو ماڵەی یەکەمدا کە ئێستا مەهدائیل تیادەژی، لە قاتی سەرەوەدا خۆی دیلی ژوورێک کرد و ماوەیەکی درێژ نەهاتەدەرێ. ئەوسا، بە ڕەحمەت بێت شێخ ڕەشیدی پەڵپینە چێشتکەری باوکم بوو، ئەو نەبێت ڕۆژی یەکجار دەچووە لای، هیچ کەسی دیکە بۆی نەبوو بچێتە ژوورەکەی. نزیکی مانگێک خۆی تەواو لە منیش دابڕی... من هەموو ڕۆژێک بە گریانەوە دەچوومە بەر ژوورەکەی، دەرگاکەیم دەکوتا، دەگریام، دەپاڕامەوە، بەڵام دایەنەکەم و خزمەتکارەکان هەڵیاندەگرتم و دەیانبردمەوە خوارێ و دەیانگووت باوکت

نەخۆشە و دکتۆرەکان گووتوویانە نابێت کەس بیبینێت. باوکم مانگێک بێدەنگ و بێخەبەر بوو... دوای مانگێک، بەیانییەک لە خەو هەستام و لە پەنجەرەکەمەوە سەیری بێستانەکەم کرد، حاجی ئیسماعیل و فریشتەکەیم لە باغەکەدا بینی. فریشتەیەکی بچوک، بە بالآ هەر بەقەد حاجی خۆی دەبوو، بەڵام دوو باڵی زۆر گەورەی پێوە بوو. فریشتەکەی باوکمان ناونا حاجیئیل... ئەوە یەکەم فریشتەی ژیانم بوو، یەکەم فریشتەی ڕاستەقینەی من بوو، فریشتە نەخۆشەکەی باوکم. ئەو هەموو شتێکی دەربارەی خۆی بۆ باسکردین. منی دەخستە باوەشی خۆی و بە وردی هۆکانی هەڵهاتنی خۆی بۆ حاجی ڕووندەکردەوە. حاجیئیل یەکەم فریشتە بوو ئەوەی بۆ ڕوونکردینەوە کە فریشتەیەک چۆن دەتوانێت ماوەیەکی درێژ بژی. گەرچی حاجیئیل چەندەهاجار باوکمی ئاگادارکردەوە و تکای لێکرد کە نهێنی دەرکەوتنی ئەو بپارێزێت، بەڵام باوکم چیرۆکی ئەم فریشتەیەی بردەدەرێ و خستییە دەمی مەلا و دیندارەکان، کە بە گاڵتە و لاقرتییەوە وەریانگرت و ئەویان ناونا حاجی ئیسماعیلی مەلەکبین کە دواتر بووە نازناوێکی ئیفتیخاریی و باوکم شانازی پێوەدەکرد. بەڵام غرور بخەرە ئەولاوە، بەقوربان غرور بخەرە ئەولاوە... باوکم هەتا دوای هەڵهاتنی فریشتەکەی ناخیشی، نەیتوانی تەواو ژیانی خۆی بگۆڕێت، منیش سەرەتا هیچ کەیفم بەو فریشتەیە نەدەهات کە هەر باوکم خۆی بوو بەڵام بە ڕوویەکی باشتردا... بەقوربان باوکم پیاوێکی ئاسان نەبوو، نە بەخودا، خۆشی هەندێجار لە دەست تەماعی خۆی بێزاردەبوو. ئەو وەک خۆی دەیگووت و بە عەرەبی دانی پیادەنا مەلالاک بوو، کڕین و فرۆشتنی زەوی هەموو ژیانی بوو، ئەوکات شتێکی ئەوتۆشمان لە هونەری پاراستنی فریشتە نەخۆشەکان نەدەزانی، لە بەرئەوە لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا تەندروستی حاجیئیل بەرەو خراپی ڕۆیشت. حاجیئیل لەو ماوەیەدا تەنیا یەک پرسیاری هەبوو، بۆ یەک خولیا دەژیا:

ئاخۆ فریشتەیەکی تر هەیە، وەک ئەو لە مرۆڤ هەڵهاتبێت؟. ئایا هەموو مرۆڤێک فریشتەی هەیە؟ گەر هەیەتی لە کوێن؟ گەر شەو خۆی بیتوانیبایە بە تەنها دەچووە دەرێ و بۆ فریشتەیەکی تری وەک خۆی دەگەڕا، گەر نەیتوانیبایە حاجی باوکم لەگەڵیدا دەچوو. سێ ساڵ پێکەوە بۆ فریشتەیەکی دی گەڕان و هیچیان دەست نەکەوت، دواجار شەوێکی درەنگی هاوین گەڕانەوە و دووەم فریشتەی دونیایان لەگەڵدا بوو، ئەلیائیلی فریشتە... من تا ئەلیائیلم نەبینی تەواو لە چیرۆکەکانی حاجیئیل دڵنیانەبووم، ئەلیائیل لە حاجیئیل بە تەمەنتر، حەکیمتر، بە ئەزموونتر بوو... هاتنی، ژیانی هەموومانی لە بنەوە گۆڕی... ئەو یەکەم فریشتەبوو بیرۆکەی دروستکردنی گۆڕستان و بیمارستانێکی بۆ فریشتەکانی شار خستە خەیاڵی باوکمەوە. من پەیوەندییەکی خۆشم لەگەڵ هەردوو فریشتەکەدا دروستکرد، دەمتوانی لەگەڵیان دابنیشم، قسەیان بۆ بکەم و قسەم بۆ بکەن. لەو کاتانەدا ئەو نیشانانەشم لادەرکەوت کە بووە مایەی ئەوەی بمنێرن بۆ شێتخانە... بەڵام ئەوەیان چیرۆکێکی ترە... بەساقە ئەوەیان چیرۆکێکی ترە».

بولبولیار بە ترسێکەوە دووپاتیکردەوە «بەڵام خانم ئێوە چیدەکەن بۆ ئەوەی فریشتەکان نەمرن... چیدەکەن؟»‌. خانم ڕێزان، کەمێک تەنورەکەی چاککرد و گوتی «هیچ شتێک ناکەین. فریشتەکان بەرگەی هەقیقەتی مرۆڤ ناگرن، بەرگەی ئەوە ناگرن ببینن دیوە تاریک و ناشیرینەکەی مرۆڤ بووە بە حاکمی سەر زەوی. وەک چۆن مرۆڤ، دەمانێک بیەوێت لە ناخۆشی ژیانی خۆی هەڵبێت، دەچێتە سینەما، کتێب دەخوێنێتەوە، خۆی بە بینینی ژیانی دیکەوە سەرگەرمدەکات، فریشتەش وەهان. ئێمە لێرە بۆ چارەسەر فریشتەکان جگە لە چارەسەریی پزیشکی کە ماوەیەکە دکتۆر مستەفا شوکاک دەیگرێتە بەر، جگە لەوەی یارمەتیانبدەین زیاتر

بە هەوای سەر زەوی ڕابێن، لە جێگای پاکدابن، ماندوویێتی و هەتاو و گەرما و سەرمای دەرەوە زوو نەیانکوژێت، شتێکی گرنگتر کە دەیکەین ئەوەیە چیرۆکی جوان دروستبکەین... چیرۆکی زۆر جوان، دەمێک هەقیقەت ناشیرین بێت، چیرۆک تەنیا جێگایە جوانی تیا بشارینەوە. لەو چیرۆکانەدا هەندێجار قارەمانی سەرەکی فریشتە نەخۆشەکانن، لەو چیرۆکانەدا فریشتەکان دەبەینە ژیانێکی ترەوە، چیرۆکەکان وا دادەڕێژین کاریگەرییان لە سەر فریشتەکان هەبێت و بزانن کە وەزیفەیەکیان لە سەر زەوی هەیە و دەتوانن کار لە مرۆڤەکان بکەن. فریشتەکان تەنیا لەو کاتەدا دەتوانن هەستبکەن کە دەژین کە بزانن وەزیفە و کاریگەرییان هەیە. ئەوەشی دەتوانێت ئەو هەستەیان تێدا دروستبکات، چیرۆکێکی باشە. بەقوربان وایە... گەر منیش فریشتەبوومایە هەروا دەبووم، بۆ ئەوەی بژیابامایە دەبوو هەست بە نرخی خۆم بکەم. بە کورتی ئەوەی وادەکات فریشتەکان تۆزێک زۆرتر بژین، چیرۆکنوسێکی باشە کە ئەو هەستەیان تێدا دروستدەکات مانایەک بۆ مانەوە و ژیانیان لە سەر زەوی هەیە».

بولبولیار پرسی «بەڵام خانم ڕێزان، هەق بڵێم تا ئێستا لە هیچ تێناگەم، چیرۆکنوسەکان دەبێت چی بکەن».

ڕێزان خانم بۆ یەکەمجار شتێک لە جیدییەتی زۆر کەوتە سەر ڕوخساری و دەنگیشی بە جۆرێک هێمن و خاوکردەوە، وەک خۆی بۆ گوتنی شتێکی لە ئەندازەبەدەر ترسناک ئامادەبکات، کەمێک بە ئەسپایی گوتی «ئەگەر من دەرک بە نرخی تۆ بکەم، ئەوە وادەکات تۆش دەرک بەنرخی خۆت بکەیت. فریشتە لە مرۆڤە و ئەخلاقیشی وەک ئەخلاقی مرۆڤ وایە. ئێمەی مرۆڤ لە سەر ئەوە دەژین، هیچ شتێک وەک ئەوە بریندارمان ناکات و نامانکوژێت ببینین کەسی بەرامبەر هەست بە نرخ

و بەهامان ناکات، سەنگێک بۆ قسەمان دانانێت، گوێ ناگرێت، ڕوودەکات بەودیودا. گەر کەسێک گوێی لە کەسێکی تر نەگرت، سەیری نەکرد، هەستی بە بوونی نەکرد، واتە ئەو کەسە بوونی نییە... کوژراوە... کوژراوە و نێژراوە و بیرچۆتەوە. هەر کەسێک لە ئێمە بیگرە دەیەوێت ئەوانی دی هەستی پێبکەن، نرخی لەلایان هەبێت، ئەوە پیشانبدەن کە چەند بە نرخە... بیرت نەچێت عەزیزم فریشتە ئەو بەشەی ئێمەیە کە چوون بە دەنگ ئەوانی ترەوە دەیجوڵێنێت. با نمونەیەک بۆ کوڕی خۆم بهێنمەوە... وادابنێ تۆ حەزت لە ژنێکە، زۆر شەیدای ئەویت، گەر ببێتە هاوسەرت، دەتوانیت بەهەشتێکی بۆ دروستبکەیت، ژیانی بۆ برازێنیتەوە. بەڵام ئەو کەسەی خۆشتدەوێت، گوێی لە دەنگی تۆ نییە، هەست بە هیچ هەستێکت ناکات، دەڕوات و فەرامۆشتدەکات، ئا بەساقە، دوای ئەوە چی دەبێت؟ غرور بخەرە ئەولاوە، تۆ لە تەنیایی و تاریکی خۆتدا نوقمدەبیت، ئەوە دەتخنکێنێت کە دەبینی ئەو کەسەی خۆشتدەوێت نرخی دەنگی تۆی نەزانی، فەرامۆشیکردیت. بەڵام ئەو خۆشەویستە دەڕوات و پاشماوەیەکی درێژ دەگەڕێتەوە، هەستدەکات ژیانی شتێکی گرنگی کەمە، هەستدەکات بە هەڵەدا ڕۆیشتووە، هەستدەکات دەبێت بە جۆرێک لە جۆرەکان لە جێگایەکدا هەڵەیەکی کوشندەی کردبێت، کە بۆ دواوە دەگەڕێتەوە، دەگاتەوە بەردەمی تۆ. تۆ کەسێکی نەخۆش و تێکشکاوی، ئەو کەسەش تۆی تێکشکاندوە ئێستا لە بەردەمتدایە... بەڵام زەمەن ناگەڕێتەوە، ئەوەی ڕۆیشت دووبارە دروست ناکرێتەوە... ئەوەی ڕۆیشت کۆتایی هات، تۆ تێکشکاوی و ئەوی دیش بە جۆرێک لەجۆرەکان تێکشکاوە. نە تۆ دەتوانیت ڕابوردوو بگۆریت، نە ئەو. بەڵام یەک چارەی بچوک هەیە... یەک ڕێگا هەیە کە دەشێت دڵنەوایی تۆ بداتەوە، وات لێبکات هەست بە نرخ و مانای خۆت بکەیت وەک مرۆڤ، ئەویش ئەوەیە گەر ئەو خانمە لە بەردەمتدا دانی پیادا نا، ئەگەر

لەگەڵ تۆ بایە، شتەکان هەمووی جۆرێکی تر دەبوون. ئەو «ئەگەرە» بە ڕوکەش شتێکی بچوک دیارە، بەڵام لە جەوهەردا دانپیانانێکی گەورەیە بە تۆدا... دانپیانانە بەو شتەدا کە لە سەرەتاوە تۆی خستۆتە سەر ئەم دەردە. ئەوە ژیانی تۆ ناگێڕێتەوە، بەڵام حورمەتی بوونی تۆ دەگێڕێتەوە. هیچ شتێک لە حورمەتی بوون گرنگتر نییە. ئێمەش لێرە ئەو کارەدەکەین، بیمارستانی فریشتەکان، یەک کاری هەیە، فریشتە نەخۆشەکان هەست بە حورمەتی بوونی خۆیان بکەن، ئیشی ئێمە ئەوەیە هەمیشە لە ڕێگای چیرۆکی جیاواز جیاوازەوە بە فریشتەکان بڵێین «ئەگەر تۆمان لەگەڵدا بایە، بەوجۆرە نەدەبوو»، «ئەگەر تۆمان لەگەڵدا بایە، ئەمە ڕووی نەدەدا» «ئەگەر تۆمان لەگەڵدا بایە، ئێستا چەشنێکی تر بوو». ئەوە دڵی فریشتە بەدبەختەکەی ناومان زۆر خۆشدەکات. ئەو قسەیە لە ناخەوە دەیانگەشێنێتەوە، توانایان دەداتێ بەردەوامبن، تەمەنیان درێژدەکات. بەساقە ئەوە کاری ئێمەیە... درێژکردنەوەی ژیان. بەوجۆرەیە عەزیزم، فریشتەکان فەرمانبەری خودا نین، کۆمەڵێک مەخلوقاتی سەیرن نەخشەیەکیان پێیە کە لە ڕاستیدا مرۆڤ ئارەزوویەکی نییە تەماشاییکات... بەقوربان وایە، ئینسان خۆشبەختە بە تەمەڵی خۆی، لەم خوشکە بەدبەختە پیرەی خۆتی وەربگرە، ئینسان بوونەوەرێکی بێکەڵکی تەمەڵە، گەر لێیگەڕێت لە ژێر بەتانییەکەی نایەتەدەرێ، بەڵام سەردەمێک هەبووە کە خەونی بینیوە، ئێستا ئەو سەردەمە دەڕوات و لەگەڵیشیدا دەبێت ئەم فریشتانە بمرن، ئینسان گەیشتۆتە جێگایەک ڕازییە بەم سەر زەمینە و ڕازییە بەم ژیانە و بەختەوەرە بەوەی هەیەتی، دەرەنجامەکەشی ئەوەیە فریشتەکەی نێومان دەبێت بخنکێت... بەساقە ئیشی ئێمەش ئەوەیە فریشتەکان وا لێبکەین هەستبکەن هێشتا کارێکیان هەیە، هێشتا کەسانێک هەن پێویستیان پێیانە، وەک چۆن گیانەوەرێک لە بەیندەچێت و خەڵکانێک

دەکەونە جەنگەڵ و کێو و دارستان بۆ ئەوەی توخمەکەیان لە فەوتان ڕزگاربکەن، ئێمەش وادەکەین... وادەکەین. بەڵام هۆشەنگ ئەم قسانە بخەرە ئەولاوە، من هەستدەکەم تۆم لەوەوپێش بینیوە، دیارە دەزانم لە ڕاستیدا نەمبینیوی، بەڵام زۆرجار ئینسان لە خەودا یەک دەبینێت، بە ڕاستیمە. هەستدەکەم جارێک تۆم لە خەودا بینیوە، بەڵام کەی و چۆن نازانم».

بولبولیار بە دەنگێکی جیدی و ترساوەوە گوتی «بەڵام خانم ڕێزان، من چیبکەم، من دەتوانم چیتان بۆ بکەم؟»

« هۆشەنگ تۆم لە جێگایەک دیوە... بە هەرحاڵ، بە هەرحاڵ... تۆ لە دوێنێ شەوەوە شتی عەجایەب دەبینیت و قسەی عەجایەب وەک دەرزی دەکرێت بە سەرتدا، دەبێت پشوویدەیت.. ئێستا هیچ مەکە، ئێستا بڕۆ و بیر لە هەموو ئەو شتانە بکەرەوە کە بینیوتە و بیستووتە. بەڵێ عەزیزم، کەم کەس دەزانێت لەم شارە ناشیرینەدا کەشتییەک و بیمارستانێک بۆ فریشتەکان هەیە، کە لە ڕاستیدا هەر بە ناو بیمارستانە، چونکە فریشتەکانمان هەموو دەمرن. بڕۆ بەساقە... بڕۆ بەقوربان... دەتەوێت دوای ئەم هەموو میلاکییە چیبکەیت. ئەوەی من بە سی ساڵ بینیومە، تۆ لە شەوێکدا بەشی هەرە زۆریت بینی... زۆرە... لە تەحەمولی مرۆڤ بەدەرە. لە بەرئەوە هیچ مەکە، هەستە و بڕۆ. هەستە و بە خێرایی دووربکەوە، گەر ویستت شتێک بکەیت، کاتێکی تر بگەڕێوە... خوداحافیز کوڕم... خوداحافیز... من دەزانم دوای شەوێکی وا مەلعون پێویستت بە پشووە، ئەوەش هەمووی دەرەنجامی کارە بێسەرەوبەرەکانی مەهدائیلی فریشتەیە، کە بڕوابکە ئەگەر فریشتە نەبووایە یەک سەعات تەحەمولی سیفەتە خراپەکانیم نەدەکرد... وای چەندە فریشتەی خراپ لە دونیادا هەیە خوایە».

هێشتا هۆشەنگ لە جێگای خۆی نەجولابوو کە خوداحافیزی لێکرد. ئەو بە نابەدڵی، بە دەیان پرسیاری گەورەوە هەستا و ژوورەکەی بەجێهێشت، لەبەردەرگا وەستا و ئاوڕێکی بچوکی دایەوە و پرسی «خانم ڕێزان، لەو باوەڕەدایت، فریشتەکەی من هەڵبێت.. لەو باوەڕەدایت». خانم ڕێزان لە پشت مێزەکەیەوە چاویلکەکانی کردە چاوی و گوتی «ئەگەر فریشتەیەکی بێمێشک بێت، حەتمەن... گەر بێعەقڵ بێت، بۆ نا... ئاە بەساقە، لە ڕەوتی ئەم عومرە بەدبەختەی خۆمدا فریشتەی گەمژەشم بینیوە. فریشتەشم بینیوە کە هەر لە خۆیەوە و بێهۆیەکی گونجاو ڕایکردوە، چیت پێبڵێم، فریشتەکانیشمان وەک خۆمان وەهان، هەندێکیان زۆر بە هەواو مەیل و ئارەزوو ئیشدەکەن. بەڵام وازم لێبهێنە، من ئێستا هیچ لە سەر فریشتکەی تۆ نازانم.. ئەوەیان بەس خودا دەیزانێت، خوداش نە قسەدەکات و نە دەست لە هیچ وەردەدات و نە هەقی بە سەر هیچەوە هەیە... وای کە هیلاکم... وای خودایە کە هیلاکم».

# بورج

بورج مێژوویەکی درێژی هەیە، گەورەبوون و بڵندبوونەوەی بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێپەڕیوە، بەڵام هەر لە سەرەتاوە لیڤیتانت کە بناغەکەی دارشت بۆ ئەوەبوو بینایەکی بڵند و نهۆمبەندییەکی ئاسمانشکێنی لێبسازێنێت. دیارە ماناکانی وشەی «بڵند» یش بە پێی گەشە و گۆڕانی شارەکە گۆڕانی گەورەی بە سەردا هاتووە، سەردەمانێک باڵەخانەیەکی چوار قات ئامازەبوو بۆ بڵندیی، بەڵام ئێستا باڵەخانەیەک بۆ ئەوەی بڵندبێت پێویستی بە نهۆمی زۆر زۆرتر هەیە. لیڤیتانت سەرەتا جێگایەکی دەویست سەمبولی خۆی بێت، ئامازەیەکی ئەبەدی بێت بۆ

بوون و بەرزی ئەو. شوێنێک کاتێک خەڵکی شار ئێوارانی هاوین لە سەریان وەستان، لەدوورەوە ببیننن و بڵێن «ئەها، ئەوە ماڵی لیڤیتانت بۆتانییە»... بورجێک ئەوانەی دێن بۆ شارەکە لە دوورەوە ببینن، بخوازن گەشتێکی بە ناودابکەن، نەتوانن خۆیانی لێلادەن. جێگایەک بێت ناوی ئەو بهێنێتە ناو ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە، بە شکۆ و هێزەوە گرێبدات. سێ قاتی سەرەتای نهۆمبەندییەکە لە ساڵانی حەفتاکاندا تەواو بوو، دیارە ئەودەم بەمجۆرە پان و فراوانەی ئێستا نەبوو، بەڵام لە خودی نەخشە بنەڕەتییەکاندا ئەوە ڕەچاوکراوە کە دەشێت و دەبێت لە داهاتوودا بەبێ تێکدانێکی ئەوتۆ، بیناکە فراوانبکرێت. سەرەتا ژێر زەمینەکەی شوێنێکی بچوک بوو، لیڤیتانت وەک زیندانێکی کاتی بەکاریدەهێنا و ئەو کەسانەی تیا گلدەدایەوە کە بۆ سەرانە و پارە دەیگرتن. دەبێت بڵێم بورج بە نیازی ئەوە دروستنەکراوە ژێر زەمینی گەورە و گرنگ و تاریکی هەبێت. وەک لیڤیتانت جارێک بۆی ڕوونکردمەوە «دەسەڵاتی ڕاستەقینە، نهێنی خۆی ناباتە ژێر ئەرزەوە» مەبەستی بوو بڵێت دەسەڵاتی ڕاستەقینە پێویستی بە نهێنییەک نییە، نهێنی وەک ئەو دەیگووت لە دەستکردی ترسنۆکەکانە، ئەوەی هێزی هەبێت دەبێت هەم نیاز و هەم کاری ئاشکرابن. وادەزانم لەم ساڵانەی دواییدا لە تەنیشتەوە نهۆمێکی ژێرزەمینی نوێیان بۆ شوێن پارکی ئۆتومبێلی فەرمانبەران و بەرپرسەکان دروستکردوە، بەڵام بە گشتی بورج لە سەر بەرزیی و ڕۆشنیی کاردەکات. لە سەرەتاوە بۆیە بناغەی دانراوە تا هەموو ببینن، شتێکە بۆ خۆدەرخستن، نەوەک بۆ شاردنەوە. بەڵام بورج وەک هەر نهۆمدارێکی دیکەی دونیا، چەند خۆی دەربخات و بینراو بێت، ناوەوەی هەر تاریک و پڕ نهێنییەوە. خودی خۆی بەو ئاڵۆزیی و گەورەیی و نەگیرانەیەوە، چەندە لەدوورەوە ڕوناک بێت، هەر ئەو هەستە لە ناخی مرۆڤدا دروستدەکات، کە قەوارەیەکی تاریک و پڕ نهێنییە، چەند

نزیک بێت هەر دوور دەنوێنێت. من دەمانێک وام لێهات مێژووی شتە نهێنییەکانم لە شاردا دابەشدەکردە سەر دوو سەردەم، سەردەمی «نهێنی ناو سەرداب» و سەردەمی «نهێنی ناو باڵەخانەی شوشە» لە سەردەمی «نهێنی سەرداب» دا نهێنی دەخوازێت نهێنی بێت و کەس دەرک بەبوونی نەکات، واتە نهێنییەک هەیە کە حاشا لە خۆی دەکات، دان بەبوونی خۆیدا نانێت و لە سەر خۆشاردنەوە و خۆونکردن دەژی. بەڵام لە ڕۆژگاری بورجە شوشە و نهۆمدارە تەلیسماوییەکاندا، لە سەردەمی دوای بنج بەستبوونی حکومەتی نیمچە ئازادی هەرێمە نیمچە ئازادەکەماندا، نهێنی خۆی ئاشکرادەکات، بێئەوەی بهێڵێت کەس بیدرکێنێت. هەموو دەزانین نهێنی گەورە هەیە، دەزانین نهێنییەکە چییە، دەزانین قارەمانی نهێنییەکە کێیە، بەڵام ناوێرین بیدرکێنین. دەزانین باڵەخانە و بورجەکان بۆ ئەوە دروستبوون تا بەرەو ئەو نهێنییە بانگمانبکەن، بەڵام دەشزانین کە خۆنزیککردنەوە لەو نهێنییە چەند ترسناک و کوشندەیە. من لەم چەند ساڵەی دواییدا هەر کات بورجم بدیبایە، سەرۆکم وەیادا دەهاتەوە «خوا لێیخۆش بێت و غەرقی ڕەحمەت بێت»، پیاوێک هەمیشە سەیری چاوی هەموومان دەکرد و بە پێکەنینەوە دەیگووت، من نهێنییەکم هەیە تۆ ناتوانیت بیدۆزیتەوە، گەر بشیدۆزیتەوە ناتوانیت بیدرکێنیت، گەر بشیدرکێنیت ناتوانیت بژیت.

بورج لە هەشتاکاندا و بەر لە بەهاری هەشتاوهەشت، هەر بە سەرپەرشتی لیڤیتانت خۆی، گەیشتە نۆ نهۆم. ئەو کات بەرزترین بینای شارەکەبوو، جگە لە دوا قاتی کە لیڤیتانت بۆ خۆیی دانابوو، نهۆمەکانی تری چۆڵ بوون. لە ساڵی هەشتاوهەشت بەودیودا، دەوڵەت بە تەواوی دەستی بە سەر بورجدا گرت و هەموو ئیشکردنێکیان تێدا وەستاند. ئەو چەند ساڵە بورج هێدی هێدی وەک کەلاوەیەکی فەرامۆشکراوی لێهات و جگە لەوەی مەفرەزە چەکدارەکانی هێزی تایبەت لە سەر دوا نهۆمییەوە

گوللەهاوێژ و بیکەیسی و تەیارەشکێنیان دادەمەزراند، بۆ هیچی دیکەی ئەوتۆ بەکار نەدەهات. دوای ڕاپەڕین و لە ساڵی نەوەدوچواردا، دووبارە دەستکرایەوە بە ئیش لە بورجدا، بەڵام تا ساڵی نەوەدونۆ ئەو کارانە گوڕی تەواوی خۆیان وەرنەگرت. ئیدی لەو ساڵە بەولاوە کەس نازانێت بورج هی کێیە. لەم ساڵانەی دواییدا کە بورج بەردەوام بەرزدەبێتەوە و بەرزدەبێتەوە و بەرزدەبێتەوە، قسە لە سەر ئەوەیە لیڤیتانت بە بڕە پارەیەکی خەیاڵی بورجی فرۆشتووە بە حیزب. بەرابەر بەوەی چەند نهۆمێکی هەمیشە بۆ خۆی بێت و ناوی هەر بە ناوی ئەوەوە و خۆشی کاروباری ئەمنییەت و گەشەپێدانی لە دەستدا بمێنێتەوە. دیارە لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری سەدەی بیستویەکدا، بورج بووە جێگایەکی زۆر گەورە و گەلێک ئاڵۆز، جێگایەک فەرمانڕەوایان هەموو ئۆرگانە گرنگ و شتە بایەخدارەکانی خۆیان خستۆتە ناو. ئێستا بورج هەم نیشتەجێی هەمیشەیی کادێرە باڵاکانی حیزب و خێزانەکانیانە، هەم بیرۆی کۆمپانیا گەورەکانی لەخۆگرتووە، هەم قوتابخانەی تایبەتی منداڵەکانیان، زیندانە گشتی و شەخسییەکانیان، بیرۆی نوێنەرایەتی دەوڵەتە بێگانەکان، بنکەی ڕۆژنامە وماڵی ڕۆژنامەنوسە ناسراوەکانمان، سەنتەری پەخشی تەلەفزیۆنییان، هۆڵی کۆبوونەوەکان، مەلەوانگەی تایبەتییان، چێشتخانە هەرە سەیر و ناوازە و گەورەکانیان، نوسینگەی وەزارەتەکانیان، ماڵی پاسەوانەکانیان، شوێنی گۆرانیبێژ و مۆسیقارەکانیان، ئەکتەرە دڵسۆزەکانیان، ئاوازدانەرەکانیان، شاعیرەکانیان، چاپخانە گەورەکانیان، مزگەوتیان، ماڵی عەشیقەکانیان، دکتۆرەکانیان، بیمارستانەکانیان... ئێستا هەموویان پێکڕا لە بورجن، من دواتر زانیم کە بورج دوو گۆڕستانی تایبەت بە خۆشی هەیە کە هەر لە ناو بورجدان. بە جۆرێک دەتوانم بڵێم کە بورج هەموو شتێکی تێدایە، مرۆڤ دەتوانێت لەوێ لەدایک بێت، لەوێ بچێت بۆ قوتابخانە، لەوێ بخوێنێت، لەوێ ببێتەوە

بە فەرمانبەر، لەوێ پیر ببێت و لەوێش بمرێت.

هەر لە سەرەتاوە حیزب خۆی بە سەر دوو دونیادا دابەشکرد، ئەوانەی کە بۆیان هەبوو بچنە ناو بورج و ئەوانەی بۆیان نەبوو، حیزبی ناو بورج و حیزبی دەرەوەی بورج، حیزبی ناو بورج هەموو دەسەڵاتێکی لە دەستدا بوو، حیزبی دەرەوەی بورجیش هیچ نەبوو جگە لە خۆڵ و خاشاکی وەک ئێمە. من لە سەرەتاوە بەر ڕیزی ئەو کادێرانە کەوتم کە دەبوو لە خوارەوە لە ناو شاردا، لە کوچە و کۆڵانە باریک و سادە و ئاساییەکاندا کاربکەم. گەرچی من ئەو کات نزیکی بیست و هەشتساڵ بوو وەک سەگ خزمەتم بە حیزب دەکرد، کەچی لە بەر هەر هۆیەک بێت نەخرامە ڕیزی حیزبی ناو بورجەوە. حیزبی ناو بورج، بە پێوەری سەردەمێکی تر و بەپێی یاسای ئەو دونیا تازەیە ئیشیدەکرد، پیاوەکانی بە ڕۆحی بازرگان و دیپلۆمات و سەراف و تەکنیککار ئیشیاندەکرد، بەڵام حیزبی دەرەوەی بورج، هەردەبوو بە ڕۆحی پێشمەرگە کاربکات. حیزبی ناو بورج حیزبی عاقڵ و فرەزان و بیژییەکان بوو، حیزبی کەسانی وەک پرۆفیسۆر شالیار، حیزبی دەرەوەی بورجیش حیزبی گەمژە و کەرەستە و مەقاشەکان بوو، حیزبی گەمژەکانی وەک من. دەوڵەمەندە گەورەکانی حیزب، ئەفسەرە بەرزەکانی، ئەندازیار و ئابووریناسەکانی هەموو لە بورج بوون، ئێمە لە خوارەوە هێدی هێدی وەک کلکی کاروانێکی ترازاومان لێدەهات کە بەربووبێت و ئاو بیبات و نەگیرێتەوە، من ساڵ دوای ساڵ هەستمدەکرد لە نێوان حیزبی ناو بورج و دەرەوەدا، پەیوەندییەکی ئاڵۆز و ناکۆک و شەڕانی دروستدەبێت، بە جۆرێک دواجار پێکەوە ژیان و بەردەوامی لەگەڵ یەکدا گەیشتبووە دۆخێکی نەکردە و نەستەم.

ئەو شەوەی دوای ئەوەی لێپرسینەوەم لە لایەن لیژنە سێ کەسییەکەوە تەواوبوو، چاویان بەستەمەوە و لە باڵابەرەکەدا دەیان نهۆم سەریان خستم و چەندین جار دایانگرتمەوە، بەپێ بردیانم و بەپێ

گێڕایانمەوە. دواجاریش، دوای شەکەتکردنێکی زۆر لە زیندانی یەکەمی بورجدا گیرسامەوە.

لە بورج پاسەوانەکان کەس ناناسن، وا پەروەردەکراون کەس نەناسن، گیراوەکان هەموو دەبێت بە یەک چاوی خراپ سەیربکرێن. پرەنسیپی سەرەکی زیندانی بورج، کە هەندێک بە زیندانی حیزب و هەندێکیش بە زیندانی نهۆمی ٣٣ ناویدەبەن، ئەوەیە ئەشکەنجەی تێدا نییە، واتە لە سەر بنەمایەک دروستبووە کە زیندانەوان زۆر کەم پەنادەباتە بەر لێدان و ئازاردانی جەستەیی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدەگمەن مرۆڤێک هەبێت بە ساغی لەو زیندانە بێتەدەرێ. زیندانەکە گەرچی ناوی زیندانی نهۆمی ٣٣ یە، بەڵام لە نهۆمی ٣٣ نییە. هیچ کەس نازانێت لە چ نهۆمێکە، ئەندازەشی وەک ئەندازەی هیچ زیندانێکی تر نییە، وەک دواتر بیستم، لیڤیاتانت بە کۆمەکی هەندێک پسپۆڕی ئەڵمانی نەخشەکەی داڕشتووە، زیندانەکە لە چوار بازنەی گەورە دروستبووە، دواهەمین بازنەیان شوێنێ ئەو کەسانەیە کە بە نوسراوی شەخسی سەرۆک دەخرێنە ئەوێ و هەر بە نوسراوی ئەویش دێنەدەرێ، دۆسییەکانیان لای ئیدارەی زیندان نییە، کەس لەوێ شتێکی تایبەتی لە سەر تۆمەتەکانیان نازانێت، جێگاکە لە زیندانی بچوک بچوکی زۆر تاریک دروستبووە، لە نهۆمی سی و سێ بەو بازنەیە دەڵێن مەخزەن... وەک چۆن هەر یەکێک لە ماڵدا مەخزەنێکی بۆ شتی شکاو و فەرامۆشکراو هەیە، کە لە بەر هەر هۆیەک بێت نایەوێت فرێیانبدات، مەخزەنی ئێرەش جێگای ئەو پاشماوە بەشەرییانەیە کە دەخرێنە بازنەی چوارەمەوە و ئیتر هیچ کەس لێیان ناپرسێتەوە، بازنەی چوارەم نە تیشک و نە روناکی نایگاتێت، شوێنێکە وەک شوێنی لە یادچوونەوەی تەواوەتی، وەک خەزێنەی شتە چەپێنراوەکان، ماڵی شتە بێسوود و لەیادکراوەکان. ئەوەی خرایە مەخزەنەوە، ئیتر مانای حیزب دەیەوێت بۆ هەتاهەتایە فەرامۆشیبکات، جێگایەکە مرۆڤ تێیدا لە نێوان

مان و نەمانێکی هەمیشەییدا دەوەستێت، تێیدا نەمردویت و نەزیندویت...
یاخود بە پێچەوانەوە، ئەوێ دروستکردنی دۆخی ڕاستەقینەی دۆزەخە،
دۆخێکە تێیدا هەم مردویت و هەم زیندویت. ئەڵقەی سێهەم ئەڵقەیەکی
کەمێک روناکترە، زوڵمەت بەوجۆرە چڕ نییە، بەڵام لێرە بێدەنگییەکی
وەحشەتناک زاڵە، ئەم بەشەی زیندان ناوی «قفڵ»ـە. ئەوانەی لێرەن
پێیاندەگووترێت قفڵکراوەکان، ئەوەی حیزب قفڵیکرد ئیتر بۆی نییە
قسەبکات، بۆی نییە بە هیچ جۆرێک دەمیبکاتەوە، کە یەکێک قفڵکرا،
ڕاستەوخۆ دەیبەن بۆ بازنەی سێهەم، لەوێ ژوورەکان گەورەترن،
زیندانییەکان چەندانێکیان پێکەوە دەژین، بەڵام سزایان ئەوەیە هەرگیز
بۆیان نییە لەگەڵ یەکدا یەک وشەش بگۆڕنەوە، لە هەموو جێگایەکی
بازنەی سێهەم مایکرۆفۆنی نهێنی و ورد دانراوە، بۆ ئەوەی هەموو
جۆرە دەنگێک تۆماربکات، ئەوانەشی کە چەندجارێک سەرپێچیبکەن
مەترسی ئەوەیان هەیە بە فەرمانێک فرێیانبدەنە مەخزەنەوە، لە بەرئەوە
بەدەگمەن کەسێک هەیە بوێرێت دەست بۆ قفڵەکەی دەمی ببات و
بیشکێنێت، زۆربەی دیلەکانی قفڵستان، چەند ساڵێکە قسەیان نەکردوە،
هیچ کەس بەدروستی نازانێت ئاخۆ قسەیان بیرماوە یان نا، وەک دواتر
زانیم بڕێکی زۆری ئەوانەی کە پاش مانەوەیەکی درێژ لە قفڵستان
دەمێننەوە، توانای قسەکردن و دروستکردنی ڕستە و بیرکردنەوەیان
بە جۆرێکی ترسناک لاوازدەبێت، بە جۆرێک لە هەندێک حاڵەتدا
دەگاتە ئەوەی دیلەکان دواتر دەبێت لە سەرەتاوە فێری زمان ببنەوە.
خۆشبەختانە من ئەم بازنەیەم نەبینی، بەختەوەر بووم و خودا لە پشتم
بوو، گەر وابایە دەکرا بەجۆرێ زمان لە یادبکەم، هەموو ئەم کتێبەم
بۆ نەنوسرێت. بازنەی دووهەم، پێیدەڵێن ئوتێل. هەڵبەت ئەم ناوە بۆ
ئەوە دانراوە تا تەواو پێچەوانەکەی بگەێنێت، ئەوانەی دەچنە ئوتێلەوە
بۆیان نییە بخەون، لە ئوتێلدا تاکە شتێک کە قەدەغەیە خەوتنە،

هـەر کەسێک خـەوت پاسـەوانە تایبەتـەکان کـە شـەو و ڕۆژ چاوەدێـری زیندانییـەکان دەکـەن، بـە ئـاوی زۆر زۆر سـارد، یـان زۆر زۆر گـەرم بـە ئاگایـان دەهێننـەوە، دەبێـت بڵێـم کـە زۆر لـە زیندانییـەکان لـە بازنـەی دووەمـدا دەمـرن، لـە بەرئـەوەی ترسـناکترین بازنەیـە، زۆربەیـان تووشـی پەککەوتنـی تـەواوی ئۆرگانـەکان و وەسـتانی مێشـک و سڕینەوەی تـەواوی یـادەوەری و زمانشـکان دێـن. لێـرەدا بـە پێچەوانـەی زیندانەکانـی تـرەوە، خـواردن کراوەیـە، بەڵکـو دەتوانـم بڵێـم بـەزۆرە، دیـل هەمـوو شـتێکی بـۆ هەیـە، هەتـا بـۆی هەیـە جنێـو بـە سـەرۆکەکانیش بـدات، بێئـەوەی سزایەکی ئەوتـۆ وەربگرێـت، تەنیـا شـتێک کـە بـۆی نییـە خەوتنـە... گەورەتریـن ژمـارەی مـردوەکان لـە ئوتێلـدان، بەدەگمـەن ڕێدەکەوێـت زیندانییـەک لـە ئوتێلـەوە ببرێـت بـۆ بەشـەکانی تـر، زۆربـەی ئەوانـەی دەچنـە ئوتێـل یـان لەوێـدا دەمـرن، یـان حیـزب هەرچییەکـی بوێـت بـۆی ئەنجامـدەدەن و ئازاددەکرێـن. بـەڵام بازنـەی یەکـەم لـە بازنەکانـی دی گەورەتـرە، لـە سێ بـەش پێکدێـت، لـە پێشـوازی، لـە بەشـی گفتوگـۆ و لـە کتێبخانـە. ئـەو زیندانانـەی کـە لـە پێشـوازی دەمێننـەوە، زیندانـی زۆر ئاسـایین، ئەوانـەن کـە سـەرپێچییەکی بچوکیـان کـردوە، بـۆ وانەدادانێکـی کـورت دەیانهێنـن، هەندێـک ئامۆژگاریاندەکـەن و فێـری دیسـپلین و ڕێـز و پابەندبوونـی زیاتریـان دەکـەن و ئیـدی دوائـەوە ئـازاد دەبـن... ئیشـی ئـەم زیندانیانـە ئەوەیـە لـە دەرەوە چیرۆکێکـی جـوان بگێڕنـەوە و نیگارێکـی جـوان بـۆ زیندانـی بـورج بکێشـن. بەشـی پێشـوازی زیندانێکـی تـەواو مۆدێرنـە کـە تێیـدا ڕەچـاوی هەمـوو مافەکانـی زیندانیـان دەکرێـت و هـەر کاتێکیش لیژنەکانـی پشـکنینی مافـی مـرۆڤ بێنـە بـورج، تەنیـا ئـەم بەشـە دەبینـن، چونکـە زیندانەکـە بـە جۆرێـک دروسـتکراوە، بەرپرسـانی نـاو زینـدان و فەسـیلی پاسـەوانان نەبێـت، هیـچ کەسـی تـر بەبوونـی بەشـەکانی تـر و دەرگاکانیـان و ڕاڕەوەکانـی نێوانیـان نازانێـت. لـە بەشـی گفتوگـۆدا، ئـەو ڕێ و ڕەسـمانە دەگیرێنـە بـەر

کە ئێمەش لە زیندانە ئاساییەکانی ئاسایشدا دەمانگرتە بەر، بەڵام ئێمە زۆرجار لێدان و هەڵواسین و ئەشکەنجەمان بەکاردەهێنا، ئەمان کاری واش ناکەن... لێرەدا کۆمەڵێک ڕادۆز بەردەوام و بێوچان دەتخەنە ژێر پرسیار و وەڵامەوە، دیلەکان نانێکی کەم، ئاوێکی کەم، پشوویەکی کەمیان بۆ هەیە و هەموو کاتەکە لەبندەست ئەم ئەفسەرەوە دەچنە بندەستی ئەو ئەفسەری تر، هەندێجار ئەو دۆخە چەند مانگێک دەخایەنێت کە تێیدا شەو و ڕۆژ دیل بێوچان پرسیاری لێدەکرێت، هەندێ پرسیار سەدان جار دووبارەدەکرێنەوە، هەموو وەڵام نەدانەوەیەک بەوە دواییدێت ژەمە خواردنی زیندانییەکە ببڕێت، پشووی داهاتووی لێبگیرێتەوە. لە هۆڵی دیالۆگدا دیلەکان زوو زوو دەکەون و دەبوورێنەوە... هەمیشە ڕادۆزەکان بە جۆرێک گفتوگۆ دەبەنبەڕێوە کە خزمەتی گەیشتن بە دەرنجامێک و ئاشکراکردنی نهێنییەک بکات، سیاسەتی سەرەکیان سەبر و هێمنی و دووبارەکردنەوە و پێداچوونەوە و ڕاگرتن و وردکردنەوەی زیاتر و زیاترە، بە جۆرێک دیل هیچ شتێکی بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی جار دوای جار و ڕۆژ دوای ڕۆژ و خاڵ دوای خاڵ زیاتر خۆی ڕۆشنبکاتەوە. بەڵام هەڵبەت ئەمجۆرە تەکنیکە لەگەڵ هەموو زیندانییەکاندا ناگونجێت، زیندانییەکی زۆر هەیە لە موحەقیقەکان سەرسەختتر و بەرگەگرتر و شەیتانترن، لە بەرئەوە ناچارن بیانگوازنەوە بۆ بەشەکانی تر، بەتایبەت بۆ ئوتێل تا بە تەکنیکی تری ڕادۆزیی نهێنییەکانیان لێدەربهێنن. بەشی دووەمی بازنەی یەکەم، لە بەشی دیالۆگ بچوکترە و بە ناوی کتێبخانەوەیە. هەر دیلێک لە بەشی کتێبخانە بگیرسێتەوە، لە ڕۆژی یەکەمەوە چەند کتێبێکی سپی دەدەنێ، پێیدەڵێن دەبێت خۆت بنوسیتەوە، ئەم تەکنیکە لەگەڵ نوسەران و خوێندەواران و ڕۆژنامەنوسە گیراوەکاندا زیاتر دەگیرێتە بەر. هەموو دیلێک فەزایەکی تایبەتی و گەمارۆدراوی بە کتێبی سپی بۆ دەخولقێنن و دەبێت ڕۆژانە پتر لە دوو هەزار وشە بنوسێت و ئێواریێ

دوایی تەواوبوون لەگەڵ ئەفسەری بەرپرسدا بیخوێنێتەوە و پیشانیبدات کە چی نوسیوە. لێرەدا دیلەکان هەر بە ناونیشانی کتێب یان بە ناوی نوسەر و کاراکتەرە گەورەکانەوە بانگدەکرێن، دیل هەیە ناوی کارامازۆفە، ناوی تولستۆیە، ناوی زۆربایە... بەڵام پێکڕا ئیشیان ئەوەیە نهێنییەکانیان تۆماربکەن، بۆیان نییە لەو میتۆد و بابەتانەی نوسین لابدەن کە ئەفسەرەکان بۆیان دیاریدەکەن، هەموو لادانێک ناچاریاندەکات دوای تەواوبوونی کاتی نوسین، سەر لەنوێ دەست پێبکەنەوە، بەوەدا زۆربەی دیلەکان نایانەوێت ئەوە بنوسن کە ڕادۆزەکان دەیانەوێت، لە بەرئەوە تووشی نوسینی بەردەوام و پشوو نەدان و شەو نەخەوتنی زۆر دەبن. دەبێت بڵێم کە بەشی کتێبخانە لە چاو بەشەکانی تردا نەرمترین جۆری ئەشکەنجە دیارە، بەڵام لە ناوەوەڕا ئازارەکەی شتێکی لە ئازاریی بەشەکانی دیکە کەمتر نییە، کاتێکیش منیان بردە زیندانی بورج و لە بەشی پێشوازی ناونوسیانکردم، دەمودەست ناردیانم بۆ بەشی کتێبخانە، بێئەوەی بمنێنە بەر گفتوگۆ، چونکە ڕایان وابوو مێژووی درێژی من لەگەڵ دەزگای ئەمنییەتدا ئەزموونێکی وەهای پێداوم بمکرێت خۆم لە داو و فاقەی ئەو ڕادۆزانە بدزمەوە، بۆیە بۆ وەدەستخستنی کات و بە دەستخستنی هەرچی خێراتری زانیاری، دەبوو من زوو بە قۆناغە پێویستەکاندا تێپەڕم.

سەرەتا لە بەشی پێشوازی یەکێک لەو گەنجە ماسولکەدارە چاویلکەڕەشانە پێشوازیکردم، کە قژی بەجێلێکی تایبەتی داهێنابوو، کە بە بۆن و بریسکەی سەرنجیان ڕادەکێشا. لەو گەنجە لە خۆڕازییە زۆرانەبوو کە لە بورجدا ئیشیاندەکرد، دونیاکەیان تەنیا دونیای ناو ئەم کۆشکە شوشەییە بوو، ئەوەی کە لێرەن، کارمەندی جێگایەکی وەها گرنگن، شتێک لە ئیفتیخاری دەستکرد و درۆزنی تیاچاندبوون کردبوونی بە بوونەوەرگەلێک مرۆڤ نەیدەزانی چیدەکەن و دەبێت

چۆن ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێت. من لە پێنج ساڵی ڕابوردوودا سەرنجی لەدایکبوونی لەشکرێک لەم جۆرە گەنجانەم دابوو، کە هەموویان قاتی ڕەش و کراسی سپییان لەبەردایە و چاویلکەیەکی ڕەشی ئەستوور دەکەنە چاویان و بە ئایفۆنە بریقەدارەکانیانەوە لە هەموو جێگایەکدا دەردەکەون، جۆرێکی تازەن لە کارمەندی ئاسایش کە زۆر لە ڕیواقی دەزگاکانی ئەمنییەت و لە هۆڵی فڕۆکەخانەکان و لە نزیک کۆمپانیاکانی تەلەفون و لەگەڵ هەندێ بەرپرسی تایبەتیدا دەمبینین. من بە نەوەی سێهەم لە پیاوانی ئەمنییەت ناوم دەنان، نەوەی یەکەم ئەو نەوە پیرەبوو کە من خۆم سەردار و ڕێکخەر و نمونەیان بووم، نەوەیەک بووین کاری حیزبی و کاری پێشمەرگایەتی و وەزیفەی ئەمنییەتمان لە زەلاتەیەکی بێوێنەدا تێکەڵکردبوو، دەرەنجامیش ژەهرێکی وەها بۆندار و کەسکونمان لێدەرچووبوو، خواردنەوەمان دێوی دەکوشت و ئەژدیهای دەدا بە زەویدا. نەوەی دووەمیش ئەو کادیرانەی ئەمنییەت بوون کە لە سەردەمی دامەزراندنی ئیداراتی نوێدا دوای ڕاپەڕین دامەزرابوون، هەندێکیان تەنیا فەرمانبەربوون، بەشێکیان فەقیری ڕۆژانی گەمارۆی ئابووری و شەڕی ناوخۆ کردبوونی بە ئاسایش، نەوەیەک بوون وەک ئێمە دەست خوێناوی و ترسناک نەبوون، هەندێکیان بە ڕاستی شتێک لە ڕێز و حورمەتیان تێدابوو. من ئەگەر ڕۆشناییەکی ئینسانیم لە دەزگادا بدیبایە لەوانەدا دەمبینی، کە نە حیزبی تەواو بوون، نە ئاسایشی تەواو، نەفەرمانبەری تەواویش. بەڵام ئەم نەوەی سێهەمە ، سارد، بێرەحم، خودپەسەند، کەسنەناس بوو... لە مەخلوقاتی ناو فیلمێکی ترسناک دەچوون نەوەک لە ئادەمیزادی ئاسایی. ئەمانە بە پێچەوانەی نەوەی دووەمەوە بە هۆی دەستکورتی و هەژارییەوە نەهاتبوونە ناو دەزگاوە، بە پێچەوانەوە بەرهەمی ڕۆژگاری تەقینەوەی ئابووری و گەشەی بازرگانی و پارەپژان بوون. کاری ئەمنییەت لەلایەن جۆرێک بوو لە نمایشکردنی دەسەڵات...

شێوەیەکی تری خۆدەرخستن بوو، ئیشێک بوو وەک خانووە گرانەکان، وەک ماشێنە تازەکان، وەک ژنە جوانەکان، وەک ئایفۆن و لاپتۆپەکان، بۆ خۆدەرخستن و شانازی و ئازاردانی ئەوانی دی دەیانکرد. کاری دەزگا لای ئەمانە جۆرێک بوو لە ئارەزوو، ئەو هەستەی پێدەبەخشین کە سەر بە شتێکی بەهێزن، لە جێگایەکدان نزیک لە سەرچاوەکانی توانا و پارەوە، لە بەرئەوە کە بەم سەرە کەچەڵەی خۆمەوە تەماشامدەکردن، لە ساردی و یەک ڕەنگی و میکانیکییەتی جوڵاندنەوەکانیان دەترسام. نەوەیەک بوون نەدەژیان، بەڵکو نمایشی ژیانیان دەکرد، ئەوەش وایدەکرد زۆر زۆر ترسناک بن. لە بەدبەختی مندا ئەوەی لە بەشی پێشوازی لە زیندانی بورج منی ناونوسکرد یەکێک بوو لەو چاویلکە ڕەش و کراس سپییانە، هەموو شتێکی بە ڕیتمێکی خاودەکرد تا نیشانیبدات چەندە بە سەر کات و شوێن و ئادەمیزادەکانی دیدا زاڵە. کە لە بەردەرگا ناونوسیانکردم، دوو پاسەوانی نوێ بە ڕاڕەوێکی باریکدا منیان برد بۆ لای مولازم شاناز، کچێکی گەنجی قژ ڕەشبوو، بیرۆکەی بە مۆکێتێکی خۆڵەمێشی کاڵ و ڕیزێک دۆڵابی سپی و چەند ئینجانەیەکی گەورە ڕازابووەوە، دۆسییەکەی منی لە پاسەوانەکان وەرگرت و بەڕێزێکی زۆرەوە فەرمووی دانیشتنی لێکردم، من زۆر ماندووبووم، شەکەتی خەریکبوو دەیکوشتم. لە پەنجەرەی بیرۆکەی ئەوەوە شار بە جوانی دیاربوو، گڵۆپەکان لە هەندێ جێگادا جیلوەیان دەهات و دەبریسکانەوە، بەو درەنگ وەختەش لە هەندێ شەقامدا جوڵەیەکی کزی هاتوچۆی ئۆتومبیلەکان دەبینرا. ئەوە یەکەمجارم بوو لە جێگای وا بەرزەوە سەیری شار بکەم، چەند ساڵ بوو پلەوپایەم لە حیزبدا کۆمەکی ئەوەی پێنەکردبووم بتوانم ئەم بەشانەی بورج ببینم، بەرزترین جێگایەک بە ئاشکرا پێم تێخستبوو ڕیستۆرانتی «هەوای کۆساران» بوو لە نهۆمی چواردە، هەڵبەت لە نهۆمی بیست و یەکیش ڕیستۆرانتێکی کراوە هەبوو، کە تورکەکان دەیانبرد بەڕێوە

بە ناوی «قاوەڵتی سوڵتان» وە. بەس من قەت نەچووبووم، هەر جێگایەک تورکان بیانبردایەتە ڕێوە خۆمم لێدەپاراست، چونکە لە ڕێگای کاروباری ئاسایشەوە دەمزانی میت بە ڕەزامەندی سەرۆکانی خۆمان لووتی خستۆتە ناو هەموو قاپ و قازانێکی شارەکەوە. بەڵام بینینی شار بەم جوانییە و لەم بەرزییەوە و بەم شەوەدا، هەستێکی تایبەتی تیادروستکردم حەزبکەم بگریم. گەرچی من ڕقم لە شار بوو، گەرچی بۆی نەمردبووم، بەڵام لەو ساتەدا گوژمێکی عاتیفە گرتمی و خەریکبوو دەستبکەمە گریان. شار لەم دیو شوشەکانی بورجەوە پاکتر و جوانتر دیاربوو لەوەی کە لە ڕاستیدا هەیە، زۆر لە مێژبوو ئارەزوویەکی وا قووڵم بۆ گریان لە خۆمدا هەست پێنەکردبوو، هەندێجار لەگەڵ «ئەو» دا دەگریام، بەڵام دڵم هەمیشە ساردییەک و بێڕەحمییەکی بنج بەستووی تێدابوو نەیدەهێشت لە بینینی جۆرە دیمەنی وەهادا عاتیفە بمگرێت، بەڵام ئێستا کە لە بەردەم ئەم ژنە مولازمە گەنجەدا وەستابووم، دەمزانی هەموو شتێک لە ڕابوردووی مندا کۆتاییهات، هەستمدەکرد بایەکی تر و فێنکییەکی نوێ و هەوایەکی تازە لە ناخمدا هەڵدەکات. ژنە مولازمەکە کە خەریکی تەماشاکردنی دۆسییەکەم بوو، کە وردە وردە دەیزانی کێم، جار جار لەگەڵ خوێندنەوەی دۆسییەکەمدا سەرێکی بەرزدەکردەوە و قژی لادەدا و نیگایەکی دەکردم. هەستیکرد بە جۆرێکی عاتیفیانە لە دیمەنی شار دەڕوانم، بەڵام بێئەوەی بایەخێکی ئەوتۆ بەوە بدات، دووبارە کەوتەوە خوێندنەوەی دۆسییەکەم. هەر لە سەرەتاوە، لە بەردەرگای بورجەوە جیاوازییەکی گرنگم لە نێوان کارمەندەکانی ئێرە و کارمەندە ئاساییەکانی شاردا هەست پێکرد. کارمەندە ئاساییەکانی شار، هەتا ئەوانەش کە لە بیرۆی وەزارەتەکان و لە سکرتارییەتی حیزبەکان و لە پلەی بەرزیی دەزگاکانی هەواڵگریدا ئیشدەکەن، ئەو هەستەت پێدەبەخشن کە ئیشەکەیان شتێکی گرنگ نییە، بەشێکی ڕۆتینی

ژیانیانە، وەزیفەیەکە و بۆ موچە دەیبینن. بەڵام جیدییەتی کارمەندانی بورج شتێکی تری پێدەگووتم، وەک ئەوەی ئیش هەموو ژیانیان بێت، ئیشەکەیان گرنگترین شت بێت، یارییەکی گەورەبێت کە هەڵە قەبووڵ ناکات. مولازم شانان، بە هێمنییەوە گووتی «مەڤاڵ جەنگیز... بەرێزتان کارمەندی ئاسایشی گشتی بوون و ماوەیەکیش بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوون، کەچی ئەمڕۆ لێرە زیندانن». من لە بەرئەوەی بەردەوام سەیری شەقامەکانم دەکرد، جیلوەی گڵۆپەکانی شار سەرسامیکردبووم، حەزمدەکرد بچمە بەر پەنجەرەکە و بە هێمنی سەر بنێم بە جامە شوشە ئەستوورەکانەوە و سەیری دونیا بکەم، توانای وەڵامدانەوەی تەواوم نەبوو، کەمێک خەیاڵاوی و پەشۆکاو گووتم «بەڵێ، بەڵێ... ماوەیەک بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بووم». جارێکی تر قژی لە سەر دەموچاوی لابرد و گووتی «ئێستا تا ماوەیەکی نادیار لێرە دەستبە سەرن تا ناوی هەموو ئەندامانی ڕێکخراوەکەی خۆتان ئاشکرادەکەن، تا هەموو دۆسییە نهێنییەکان ڕادەستدەکەن». بێئەوەی بزانم دەڵێم چی، گووتم «بەڵێ بەڵێ، تا ماوەیەکی نادیار لێرە دەستبە سەر دەبم». کچەکە دۆسییەکەی داخست و گووتی «داوای لێبووردن دەکەم، تۆ ناتوانیت لە بەشی پێشوازی بمێنیتەوە، لە سەر دۆسییەکەت نوسراوە کە دەبێت بچیتە کتێبخانە. ڕەنگە بەڕێزتان نەزانن بەشی کتێبخانە چییە، بەڵام من بۆیە لێرەم تا هەموو سیستمی زیندانی بورجت بۆ ڕوونبکەمەوە، هەڵبەت ئێمە لێرە دیلمان نییە، بەڵکو میوانمان هەیە، ئەوە فەرمانی سەرۆکە کە لێرە هیچ کەس بە دیل یان زیندانی یان حەپس ناونابەین، بەکارهێنانی ئەوجۆرە وشانە لێرە تەواو قەدەغەیە... ئێوە هەموو میوانی ئێمەن، ڕاستە هەلومەرجی میوانییەکە تۆزێک لە هەلومەرجی میوانی ئاسایی جیاوازە، بەڵام هەر چییەک بێت ئێوە دیل نین، هەتا ئەگەر بۆ هەتاهەتایە لێرەش بمێننەوە ئێوە هەر میوانی

حیزین. لە ڕاستیدا تـەواوی ئـەم میوانخانـە گەورەیـە، کـە لـە دەرەوەی بـە زیندانـی نهۆمـی سـی و سـێ ناسـراوە و ئێمـە لێرە بـە میوانخانـەی نهۆمـی سـی و سـێ ناویدەبەیـن، لـە چـوار بازنـەی گـەورە پێکدێـت... بازنـەی یەکـەم کە ئێستا مـن و تـۆ لـە ناویدا وەستاوین.... بازنەیـە کـە.. کـە لـە راسـتی... ی...ی...د...ا..ا».

لـەو سـاتەوە هێـدی هێـدی دەنگـی کزتـر و کپتـر دەهاتـە گوێـم، هەستمکرد گێژدەخـۆم، ماندوێتییەکـی کتوپـڕ دامدەگرێـت. بێئـەوەی بزانـم چییـە، ئـاگام لـە خـۆم نەدەمـا... وەک بـە تونێلێکـی سـپی و بلوریـن و پێچاوپێچـدا ڕۆبچـم، وەک یەکێـک بـە هێمنـی بـە لولپێچێکـی کریسـتاڵ و پـڕ بریقـەدا بـەرەو جێگایەکـی دوور دامبگرێـت، بـەرەو خـوار خـزام... کـە چاومکـردەوە لـە جێگایەکـی دی بـووم، لـە ژوورێکـدا پـڕ ڕەفـی کتێـب، مـن لـەوێ لـە بازنـەی یەکەمـدا لـە کتێبخانـە، لـە نـاو جێگایەکـی هێمـن و پـاک و تەمیـزدا بێهـۆش کەوتبـووم.

# نەغەدە ماردینی و نزار ئیدریس لە شاخ

مـن هـەر یـەک لـە خانمـی ماردینـی و نـزار ئیدریسـم لەگـەڵ خۆمـدا هێنـا بـۆ چیـاکان، دوو ڕۆژ بـە ڕێگاوەبوویـن. نەغـەدە جلێکـی کـوردی ڕەشـی، وەک پۆشـاکی ژنـە گوندییـەکان پۆشـیبوو، بـەڵام ڕەنگـی، شـێوەی دانانـی لەچکەکـەی، شـێوەی قـژ داهێنانـی، لـە هـەر شـتێکیش گرنگتـر چاویلکەکـەی، نیشـانەبوون بـۆ ئـەوەی یەکەمجـارە دونیـای دەرەوەی شـار دەبینێـت و پێدەنێتـە نـاو سروشـت و سـەر خاکـی غەمگینـی گوندەکـان. بـە درێژایـی ڕێـگا، مـن لـەوە دەترسـام خاڵەکانـی پشـکنین گێچەڵمـان پێبکـەن، بـەڵام بـە پێچەوانـەوە بوونـی ژنێکـی جـوان لـە ماشـێنێکدا بـۆ هەمـووان مایـەی

بەختەوەرییە. لە زۆربەی خاڵەکانی پشکنیندا سەربازەکان سەرێکیان دەهێنایە ناو ماشێنەکەوە و نیگایەکیان لە خانم دەکرد و بە هێمنی ماشێنەکەیان بەڕێدەکردین. پێدەچوو بە هەستێکی غەریزی دەرکیان بە بوونی ئەو خوێنە ئەرستۆکراتییە کردبێت کە لە دەمارەکانی ماردینیدا دەسوڕایەوە، وەک ئەوەی ئەو ترسە دێرین و غەریزییەی پیاو لە ئافرەتی جوان پاسپۆرتی ئێمەبێت، ئاسان هەموو بەربەستەکانی سوپامان بڕی. کە لە دوا ماشێن دابەزین، ڕۆژێکی درێژ بە سوار سێ هێستری پیرەوە بووین، دوای سەرکەوتن و دابەزینێکی زۆری نێو چیاکان، ئێوارەیەکی درەنگ وەک سێ ڕۆحی شەکەت بەدەوری جەهەنەمدا سوڕابێتنەوە و گەڕابێتنەوە، لە دەربەندی «دەمبۆران»، گەیشتینە بنکەکانی سەرکردایەتی و بیرۆی باڵا کە لەدامێنی چیابەردینێکی ڕەش و لە ناو گەروی جەنگەڵێک و لە لێوار چەمێکی چڕدا بوون. من شەش مانگ بوو ئەو بنکانەم نەدیبوو، ئێستا لە گەورەبوون و فراوانبوونیان سەرسامبووم، پێشمەرگەکان دەیان خانوویان لە گەروی ئەو دارستان و لە بەر نزاری ئەو کێوە سەختەدا دروستکردبوو، شوێنێک بوو بە ئەستەم باشترین باڵەفڕ و کۆپتەری دونیا بیانتوانیبایە سەلامەت لە نێوان ڕێگا هەوایی و ڕارەوە ئاسمانییە تەنگەکەیدا دەرچن. کە گەیشتینە بەرەوە دەمودەست ڕوومان لە بنکەی هەڤاڵ شێرخان کرد. هەر کە هەڤاڵم بینی هەستمکرد لە مێژە چاوەڕوانماندەکات. کە گەیشتینە بەرەوە، دونیا خەریک بوو تاریک دادەهات. ناو تاق و سەر ڕەفەکانی ژوورەکەی پڕبوون لە کەللە سەری پشیلە. من بە درێژایی ڕێگا تەنیا سەرنجی خانمی ماردینیم دەدا، بیری زاراوەی جەنگەڵە ڕاستەقینەکانم دەکەوتەوە کە ئەو بەکاریدەهێنا. دەمویست بزانم شەکەتە یاخود ترساوە یان پەشیمان، بەڵام ئەستەم بوو مرۆڤ بە ڕوونی هەستەکانی بخوێنێتەوە، وەک ئەوە بوو لە خەیاڵیدا بەردەوام بیر لە شیعر بکاتەوە، یاخود وام هەستدەکرد بەردوام بیر لە

شیعر دەکاتەوە. نازانم بۆ ئێمە خەڵکانی ناشاعیر هەرکات شاعیرێکمان بینی خەیاڵی ڕۆیشتووە وادەزانین بیر لە شیعر دەکاتەوە، کە دەشێت بیر لە هەر شتێکی تریش بکاتەوە جیا لە شیعر، وەک سێکس، منداڵی، هەنار خواردن... یان هەر شتێکی تر. ئەو کات کە گەیشتە چیا، خەریکبوو ناوبانگی وەک شاعیر چرۆیدەکرد، تا ئەو کات دیوانی خۆی نەبوو، بەڵام بەردەوام شیعری لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا بڵاودەبوونەوە، شێوازی نوسینی وەها کێوی و تایبەتی بوو، بە جۆرێک بۆنی دارستان و بەرد و خوێن و دڵڕەقی لێدەهات، هەر کەس جارێک شیعرێکی بدیبایە شێوازی دەناسییەوە. گەرچی هەڤال شێرخان کەیفی بە شیعر و شاعیران نەدەهات، بەڵام پێشوازی شاعیرێکی شۆڕشگێڕی لە نەغەدەکرد، سەرانی شۆڕش لەوەدا توانایەکی سەرسامکەریان هەبوو، بیانویستبایە لە چ بەرگێکدا دەربکەون، دەیانتوانی خێرا لەو کاڵایەوە بئاڵێن. بیانویستبایە لە وێنەی پسپۆڕی جەنگدا دەربکەون دەیانتوانی خۆیان وا دەربخەن کە لە زانستی جەنگدا لە ناپلیۆن لێزانترن، بیانویستبایە وەکو ئەدەبدۆست و نوسەرناس ڕەفتاربکەن، دەکەوتنە بۆردومانی بەرامبەر بە هەندێ لەتە بەیتی مەولانا و حافز و شەمسی تەبریزی. لەوەدا من لیڤیتانتم زیاتر بە دڵ بوو، ئەوەی شاعیران بەدڕندانەترین شێوە ئەشکەنجە بدەیت چاکترە لەوەی بەدرۆ ڕێزیان نیشانبدەیت. شێرخان لە یەکەم نیگایەوە دیاربوو چ سەرسامییەکی بەجوانی ماردینی هەیە کە هەم بە شێوە و هەم بە نیگا و هەم بە بۆن ژنێکی جیاوازتربوو لە خانمە گوندەکییەکان. هاتنی ئەو بۆ نێو ئەو دارستان و چیایە ڕووداوێکی ناوازەبوو، دۆڵەکە بە گشتی خاڵی بوو لە ئافرەت، هەڵبەت ڕێدەکەوت جار جار دایکی پێشمەرگەیەک یان خوشکێکی بە میوانی بگەنە ئێرە، بەڵام بە گشتی کەم ئافرەتی گەنج ڕێگای بکەوتایەتە نێو ئەم دۆڵە، شوێنەکە مەملەکەتێکی نێرانەی داخراو و ترسناک بوو... نەغەدە لە ساتی دابەزینییەوە بۆ ناو دۆڵ، هەستیکرد

چاوانی برسی ئەو هەموو پیاوە مەحرومەی لە نێوان ئەو دوو چیایەدا گیریانخواردوە هەمیشە بەدوایەوەن، بەڵام هەستمکرد باکێکی بە نیگای برسی پیاوانی دۆڵەکە نەبێت، جارێک گوتی «لە کوێی دونیادا هەیە پیاوان برسیان نەبێت، پیاوان لە هەر کوێ بن و لە هەر تەمەنێکدا بن هەمیشە هەر برسیانە». واهەستدەکەم ئەوە قسەی دڵی بوو. دەتوانم بڵێم لە سەرەتادا حەزی لەو نیگا برسیانە بوو، بەبەشێکی سروشتی دونیایەکی سروشتی دەزانی، کێشەی لەگەڵ ئەوەدا نەبوو هەموو نێری برسی دونیا بەدوای لەشییەوە وەک سەگ لیک بڕێژن، بەڵام حەزی لەوە نەبوو هەمووان بیخۆن. وەک هەموو ئافرەتانی تر قێزی لە هەندێک پیاو دەهاتەوە، ترسی لە هەندێکی تریان هەبوو، هەندێکی تری وەک گەمژە سەیردەکرد، بەڵام ئەگەری ئەوەشی تێدابوو لە ناکاو شەیدای یەکێک بێت. کاتێک بیری لەوە دەکردەوە کەسێک بێویستی خۆی دەستی بۆ بەرێت، موچڕکێکی سارد و بڕۆک بە هەناویدا دەڕۆیشت. کە یەکەمجار لە ناو ئەو سروشتە ڕووت و دارستانە کێوی و خاکە ڕەقەنەدا دابەزی، هێشتا نەیدەزانی چەند بێدیفاعە، نەیدەزانی چی بەتەواوەتی هێناویێتی بۆ ئێرە، بەڵام دەیزانی پەتێکی ترسناکی پچڕاندوە، زنجیرێکی لەدەست و پێی خۆی داماڵیوە کە کەم کەس دەتوانن دایماڵن... دەیزانی کەمێک لە ژنان دەوێرن کاری وەها بکەن. بەڵام ئەو دەم خانم لەوانەبوو کە دەیەویست ئازادی لە ڕووە ترسناکەکەیدا تاقیبکاتەوە، لەوەشدا تاقانە و تاک و تەنیا نەبوو، بەڵکو ڕۆحی سەردەمەکەی نیشاندەدایەوە، ئەو کات هەموو عەودالی ئەوەبووین، ئازادی بە دیوە دڕ و پەتپسێنەکەیدا بژین، لەو ڕووەدا کە دەشێت دڵی ئازاترین جوامێرانیش بترسێنێت. ئازادیی چ سوودێکی هەیە گەر تێکەڵ بە بۆن و ئەگەری مردن نەبێت، چ سوودێکی هەیە گەر مرۆڤ تەنیا لە نێوان دیوارەکانی ماڵی خۆیدا ئەزموونیبکات و تەنیا لە سەر سفرەی ئارام لە میوەی بچێژێت. دەیزانی هیچ خانمێکی

گەنج ئەو جورئەتەی نییە بەوجۆرە لە هەموو پۆشاکە چینایەتی و خانەوادەییەکانی داماڵێت و بە چاو بەستراوەیی خۆی فڕێبداتە سەر زەمینێکی دییەوە کە سەرلەبەری نادیار و تاریکییە.

لەو ساتەوەی لە شار هاتینەدەرێ، من هەستمکرد نزار بە جۆرێک لە جۆرەکان خۆی بە دوور دەگرێت. هەستیشمکرد خانم نزاری زۆر لا گرنگ نەماوە، ئەو بۆ پەرداخێک دەگەڕا ئەو شەرابەی تێبکات کە خۆی دەیەوێت، نزار ئەو پەرداخە بوو، یەکەمین پیاوی ژیانی بوو، لەگەڵیدا بە ڕاستی هەستی بە لەشی خۆی کرد، لەگەڵیدا توانای خۆی لە سەر یاخیبوون، بێباکی، دەرچوون لە یاساکان تاقیکردەوە... هەستیکرد نزار لە درۆیەکی گەورە ڕزگاریکردوە، درۆی ژیان لە باوەشی شوویەکی هێمندا. بەڵام هەر لە ساتی یەکەمەوە دەیزانی نزار پیاوێک نییە بۆ هەموو ژیان، لە ناخی دڵیشدا ڕقی لە هەر پیاوێک بوو بیویستبایە بیەوێت «پیاوێک بێت بۆ هەموو ژیان». نزار بۆنی جەنگەڵ و جانەوەری دڕ و گیای نادەستەمۆی لێدەهات، وەک لە شیعرەکانیدا دەیگووت «وەحشییەکی جوان» بوو، بەڵام وەحشی جوان هەمیشە بەوجۆرە نامێنێتەوە، وەحشییەت شتێک نەبوو زۆر لەگەڵ جوانیدا بژی، دواجار دەبێت یەکێکیان زاڵ بێت، یان وەحشییەت یاخود جوانی. نەغەدە ئەودەم ئارەزوویەکی نەبوو هەموو ژیانی لە قەفەزی شوویەکی هێمندا بباتە سەر. ئاە... شوویەکی هێمن تەنیا کاتێک مانای هەیە کە بکرێت لە دەرەوەی ماڵ، مرۆڤ هەموو شێتێتی خۆی بژی، ئەو هەموو شتەکانی لە زاری کچانی شانە شۆڕشگێڕییەکەوە دەبیستەوە، دەیزانی نزار بە چ شانازییەکەوە باس لە قارەمانێتییەکانی خۆی لە پێخەفی ئەودا دەکات، بەڵام بۆ نەیکات... ئەوە کەم و زۆر تووڕەی نەدەکرد، نزار دواجار هەندێک سیفەتی سەرنجڕاکێشی تێدابوو، ئەویش ڕام نەبوون و بێباکی بوو، لەو دڕندانە بوو کە چوویتە بەردەستی دەبێت حیسابی

ئەوە بکەیت دەشێت هەلاهەلاتبکات، نەغەدەش لە دڵەوە شتێکی تاریک، غەریزەیەکی شەیتانی، کونجێکی ناڕۆشنی ناو ناخ کە پەروەردەی دایک و باوک دەستیان پیاڕانەگەیشتووە، بەرەو ئەمجۆرە پیاوانە کێشیاندەکرد. شتێکی گەورە لە ناخیدا بوو پاڵی پێوەبنێت ترسی لە هیچ شتێکی خەڵک نەبێت، لە منداڵییەوە دەزانێت دێوێکی زۆر زل لە ژیانی خۆی و خێزانەکەیدا هەیە، ناوی خەڵکە، دێوێکی نەبینراو، بەڵام درندە و بخۆر و داندار. دێوێکی زۆر گەورە کە شەو و ڕۆژ بە هەموو کوچە و کۆڵان و شەقامەکاندا دەڕوات، هیچ ناکات، تەنیا بە چاوێکی نەبینراو سەیردەکات، تۆ نایبینیت بەڵام دەزانیت لەوێیە، ناتوانیت دەستی لێبدەیت، بەڵام بە قەوارە و هەناسە و قورسایی خۆی هەوای هەموو جێگاکانی بارکردوە. دێوێکە هیچ کەس نییە بتوانێت لێی نەترسێت، چونکە یەک سەر یان یەک دەموچاوی نییە، یەک لۆژیکی نییە، بەڵکو بە زیاد لە زمانێک، بەزیاد لە بەڵگەیەک، بە زیاد لە سەرێک ئیشدەکات، هێندەی سەرێک لە سەرەکانیت پەڕاند، چەند سەرێکی تر، بە جۆرێکی تر دێنەوە. هەمیشە لەوێیە، یەک شت دەتوانێت بیکوژێت، ئەوەی وابجوڵێیتەوە وەک ئەوەی لەوێ نەبێت، سەیری نەکەیت، گوێی لێ نەگریت. ئەوە تووشی دوودڵی دەکات، تووڕەیدەکات، لەوانەیە زۆر ترسناک شاڵاو بهێنێت، بەڵام دەبێت هەمیشە وابکەیت کە نایبینیت، کە نییە، کە ناتوانیت هەستی پێبکەیت، ڕەنگە ئەوە کردارەکانت بگەێنێتە ئاستی شێتی، بەڵام گرنگ نییە، شێتبوون باشترە لەوەی تادەمریت لە ژێر ڕەحمەتی ئەو دێوەدا بژیت. نەغەدە بڕیاریدابوو لە ژێر دەستی ئەو دێوە بێتەدەرێ و پێیوابوو سەفەری بۆناو ئەم جەنگەڵە هەنگاوی یەکەمێتی بۆ بەزاندن و شکاندنی ئەو دێوە، هەر لە سەرەتاوە ئەو وشانە دەیانترساند «مێرد»، «عەشیقی ئەبەدیی»، «خۆشەویستی نەمر». هەندێجار زۆر دوور دەڕۆیشت و پێیوابوو کە پەیوەندی ژن و

پیاو دەبێت لە جۆری شیعر نوسین بێت، هەمیشە لە سەرەتاوە دەست پێبکاتەوە. وک چۆن لە شیعرێکەوە بۆ شیعرێک شاعیر هەمیشە لە سەرەتاوە تێهەڵدەچێتەوە، لە پەیوەندی ژن و پیاویشدا دەبێت هەمیشە سەرەتا و کۆتاییەک هەبێت، وەک چۆن تێکستێک نییە کۆتایی نەیەت، پەیوەندییەکیش نییە کۆتایی نەیەت، وەک چۆن شیعرێکی ئەبەدی نییە بتوانێت رێگا لە هەموو شیعرەکانی تر بگرێت، پەیوەندییەکی ئەبەدیش نییە رێگا لە هەموو پەیوەندییەکانی تر بگرێت. بەڵام زۆرجار رادەچڵەکی و دیوە کوشندە و ترسناک و بێسۆزەکەی ئەم تێڕوانینەی خۆی دەبینی و بێئەوەی بزانێت چۆن لێیدەرچێت سەرسام و ترساو لە خۆی دەڕوانی و هیچی نەدەگووت.

نەغەدە زۆرجار هەستی بەو ئازایەتی و جورئەت و سەرپەڕییەی بۆچوونەکانی خۆی دەکرد، بەڵام بە دروستی چی دەویست، نەیدەزانی؟ پیاوانی ڕاگوزەر؟ ئەوانەی دێن و دەڕۆن؟... نەیدەزانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە. بەڵام لە قووڵایی ناخیدا ئەو هەستە کچانە تایبەتەشی هەبوو بزانێت کە هیچ شتێک لە بۆنی پیاوانی زۆر لە ژیانی ئافرەتێکدا ئازاربەخشتر نییە، کە پیاوانی جیاجیا بۆن عارەقەی خۆیان بە عومری ئافرەتێکدا ڕاکێشا، بۆنیان دەبێتە جۆرە هاڵاوێکی کوشندە و ژەهراوی کە ژیان دەتەنن و دەیخنکێنن. بەس چی دەوێت؟ هەستیکرد ڕۆحێکی تاریکی دەوێت، پیاوێکی دەوێت وەک شەوەزەنگ، پیاوێک لە یەککاتدا لە زۆر پیاو بچێت، پیاوێک هەم دڕندەبێت و هەم یاخی، هەم دەسەڵاتداربێت و هەم شۆڕشگێڕ، هەم بۆ ئەم بەڕەحم بێت و هەم تا دوائەندازەش بەهێز، هەم دڵسۆزبێت و هەم خیانەتکار، هەم تاریک بێت و هەم پڕبێت لە تیشکی نهێنی، هەم جەنگەڵی بێت و هەم شاریی، هەم سیحری جوانی تێدابێت و هەم فریوی ناشیرینی، هەم لاوازبێت و هەم بەهێز، هەم بترسێت و هەم ترسناک بێت، هەم نەخوێندەوار بێت

و هەم فەیلەسوف، هەم ڕووکەشکار و هەم قووڵ، هەم شاعیربێت و هەم بەربەری، هەم عاشق و هەم دوژمن.... پیاوێکی دەگمەن، یان وەک خۆی دەیگووت پیاوێکی ئەستەم، پڕ لە ناکۆکی گەورە گەورە، کە ڕەنگە لە سەر ئەم ئەستێرەیە نەبێت.

دەبێت بڵێم ئەو ڕۆژەی نەغەدە ماردینی لە دەربەندی دەمبۆران و لە ناو ئەو گەروو سیحراوییەی سروشتدا دابەزی، هێندەی خەیاڵی لای ئەوە بوو خۆی بداتە دەست ژیانی ئەم جەنگەڵە ڕاستەقینە، خەیاڵی لای هیچی تر نەبوو. لە منداڵییەوە بە دوای جەنگەڵێکی ترسناک و دڕدا گەڕابوو، ئێستا ئەو جەنگەڵە بە هەموو هەیبەت و دڕی و کوشندەیی خۆی دەرگا گەورەکانی خۆی بۆ کردبووەوە. هەڵبەت لە فەنتازیاکانیدا «دەربارەی ئەو جەنگەڵە شێت و ڕام نەکراوە» حیسابی ئەو هەموو پیاوە برسییەی نەکردبوو، حیسابی ئەم شۆڕشگێڕە گۆشەگیرانەی نەکردبوو کە وەک کۆمەڵێک نێری گۆشەگیر، تینووی هەموو سێبەرێکی ئافرەت بوون. سەیربوو لەلای کە پیاوان پتر بەرگەی ئەوە دەگرن لە گروپی نێرانەی داخراودا بۆ ماوەی درێژ بژین، وای بە خەیاڵدا هات، ژنان کەمتر دەتوانن بەرگەی دنیای ژنانەی خۆیان بگرن، بەتایبەت گەر تەواو خاڵی بێت لە ڕەنگ و بۆن و دەنگ و هەناسەی پیاو.

لە ڕۆژی یەکەمدا، زۆربەی پیاوە برسییەکانی نێو دۆڵەکە، زۆربەی ئەو پێشمەرگە بەستەزمان و دابڕاوانەی لە مێژبوو ئافرەتێکی ئازاد و جوانیان نەبینیبوو، هەریەک بەهانەیەکیان دەدۆزییەوە و دەهاتن بۆ سەیری خانمی ماردینی.

ئێوارەی ڕۆژی دووهەم، هەڤاڵ « عومەرە سوور»، کە پیاوێکی تابڵێی باش و تێکۆشەرێکی تابڵێی دڵسۆز بوو، دۆستێکی دێرینی سەرۆک و ئەندامێکی لە خۆبوردووی ئەنجومەنی باڵا بوو، بە هێمنی و وەک برادەرێک بانگیکردمە لاوەو گووتی «کوڕی خۆم جەنگیز ئەمە

چ کارێکە کردووتە، بۆ خاتری خودا و خاتری هەر چل و چوار هەزار پێغەمبەرەکە ئەمە چ جۆرە ڕەفتارێکە، ئەم کچە بەدبەختەت هێناوەتە نێو ئەم هەموو گەنج و کوڕ و کاڵە هیچ نەدیوەوە. ئەوە هەم غەدرە لەو ژنە و هەم غەدرە لەم گەنجانە... بەتایبەت سەلامەت بیت، دوای ئەو کاغەزانەی خۆت، دوای ئەو ڕاپۆرتانەی لە سەر ئەم کچە بەدبەختە و هەتیوەکەی دۆستی هەناردەی حیزبت کرد. ماڵ خراپ، کاغەزەکان کەس نییە نەیخوێندبێتنەوە، تۆ وەها وسفی وردەکاری ئیشی ئەم دوو بەدبەختەت کردوە، سەلامەت بیت، بۆ ئەم هیچ نەدیوانە باعیسی پەرێشانییە، ئێستاش هەر دووکیانت هێناوە بۆ ئێرە، خودا ڕەحمبکات، ئەگینا بڵێم چی... لێرە ساغ ناگەڕێنەوە».

بە چرپەوە بە هەڤاڵ عومەرە سوورم گووت «هەڤاڵ گیان، بڵێم چی... نامەی زۆریان کردە سەرم. دەیانویست هەردووکیان بهێنمە شاخ. حاڵیشیان لە شار ڕوو لە خراپی بوو، گەر نزار بگیرابایە مردنی مسۆگەر بوو. چارم ناچاربوو هەڤاڵ... وەڵا چارم ناچار بوو».

عومەرەسوور لەو شۆڕشگێڕە مرۆڤدۆستانە بوو کە زوو شەهیدکرا. هەموو کەسە ڕاستگۆکانی شۆڕش، ئەوانەی بە ڕاستی کاریان بۆ پاراستنی حورمەتی مرۆڤ دەکرد، ئەوانەی هیچ نەبوون جگە لە خۆبوردەیی و گیانفیدایی و ماندوێتی، زوو شەهیدبوون، دواتر تەنیا ئەوانە مانەوە کە بەس بە کەڵکی دائیرەی پۆلیس و ئاسایش دەهاتن، ڕەنگە ئەوە هۆیەکی گەورەبێت بۆ ئەوەی مرۆڤ تێبگات، دوای سەرکەوتنی ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١بۆ شۆڕش بەو دەردەچوو. هەڤاڵ لە سەر هەق بوو، من هەر گەیشتمە دۆڵی دەمبۆران زانیم کە شتەکان بۆیەکی خراپتر و بوخارێکی ڕەشتریان لەوە لێهەڵدەستێ کە من چاوەڕوانمدەکرد. من ڕۆژی دواتر لەگەڵ هەڤاڵ شێرخان کۆبوونەوەی دوو قۆڵیمان هەبوو، بڕیارمدا دۆخی خانمی ماردینی لەگەڵدا باسبکەم و پێشنیاربکەم خانم لێرە نەمێنێتەوە. هەڤاڵ

شێرخان لەگەڵ بە سەرچوونی هەر وەرزێکدا بێڕەحمتر و ئاڵۆزتر دەبوو، مۆنتر و خیشنتر چەناگەی دادەکەوت و قەپۆزی درێژدەبوو، ئەو گەشت و مەفرەزە و چالاکیانەشی دەیکرد تا دەهات خوێناویتر تەواو دەبوون. ناوبانگی بێڕەحمییەکەی خەریکبوو زۆر پێش ناوبانگی ئازایەتییەکەی دەکەوت، لە هەندێ جێگادا بێهۆ خوێنێکی بێمانای دەڕشت و توندییەکی زیاد لە پێویستی بە کاردەهێنا. کە بۆ گەشت دادەبەزی، حیکایەتی پەیوەندییە ناشەرعییەکانی لەگەڵ ژنە جووتیارە هەژارەکاندا هەم لە نێو خەڵکانی گوندەکی و هەم لە ڕیزی شۆڕشگێڕاندا دەماودەمیدەکرد، تا وای لێدەهات پێشمەرگەکان بە غەمگینی و بە گاڵتەوە ناوی گوندەکانیشیان بە ناوی عەشیقەکانی ژەنەراڵ شێرخانەوە ناودەنا... بەڵام لەدوای هەموو گەشتێک و دوای هەموو چالاکییەک بێباکتر و بێمنەتتر دەردەکەوت. کە لە گەشت و دابەزینە درێژەکانییەوە دەگەرایەوە بۆ دەربەندی دەمبۆران، هەمیشە پڕ تورەکەیەک سەری سافی پشیلەی پێبوو کە لە سندوقی تایبەتدا هەڵیدەگرتن و تا دەهاتیش سندوقەکانی زۆرتر و زۆرتر دەبوون. کە بینیمەوە هەمیشە وەکو خۆی مۆن بوو، بەڵام لە سەردەمانی تر پاکوتەمیزتر و پشوودارتر دیاربوو، وەک جاران ئاسەواری ماندووبوونی زۆر، کاریگەریی خۆری سووتێنەر یان سەرمای جوانیکوژی زستان لە سەر پێستی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ جۆرە ئاسوودەییەک نەیدەتوانی ئەو چرچانەی مۆنی لە سەر ڕوخساری لاببات. هەڤاڵ شێرخان بە خۆشییەکەوە کە کەمجار هەستی پێدەکرا سوپاسی منی کرد و گووتی « هەڤاڵ جەنگیز، لە ئەنجومەنی باڵا لە تۆ زۆر ڕەزامەندن. بەس هەم وەک هەڤاڵێک و هەم وەک بەرپرس لە ئیشوکاری تۆ ئاگادارتدەکەمەوە کە دەست لە کاروباری ئەم دوو میوانە تازەیە وەرمەدە، لە ئێستاوە لە بیریانبکە، کاری تۆ لێرەوە تەواو، ئەوەی دەمێنێتەوە ئێمە لە ئەستۆی دەگرین». لە ڕاستیدا من نەمزانی مەبەستی چییە، بەڵام

لە پشت وشەکانییەوە بۆنی شتی باشم نەکرد. پرسیم «دەتوانم بزانم چۆن بیرتان لە پاشەڕۆژیان کردۆتەوە». بە بێباکییەوە گوتی «نەغەدە لەگەڵ مندا دەمێنێتەوە. دەبێت لەگەڵ مندا بمێنێتەوە من لە مێژە چاوەڕوانیدەکەم. نزار دەگوازرێتەوە بۆ خوارێ... بۆ گەرمیان، بۆ ناو مەفرەزە گەڕۆکەکان». مەفرەزە گەڕۆکەکانی باشوور خەتەرناکتر کاریان هەبوو، زۆرترین شەهیدیان دەدا و تێکەڵاوی سەختترین و ئاڵۆزترین جۆرەکانی جەنگی پارتیزانی دەبوون لەگەڵ فاشیستەکان. ناردنی نزار بۆئەوێ لە خۆرا نەبوو، دەیانویست سەرەتا بۆ هەتاهەتایە لە نەغەدەی داببڕن و دواتر لە ڕووداوێکدا بیکوژن. من لە هەڤاڵ شێرخانم پرسی «دکتۆر دەتانەوێت داواکەی لیڤیتانت جێبەجێبکەن و لە ناوی بەرن». بە هێمنی پرسی «پێتوایە هیچ کەس لە قازانجەکانی شۆڕش گرنگتر بێت؟ ». «نا هەڤاڵ، کەسمان لە قازانجی شۆڕش گرنگتر نین». «تۆ گەر شۆڕش داوات لێبکات بمرێت، نامریت... شۆڕشگێڕ یان پێشمەرگە واتە یەکێک ئامادەبێت بۆ مردن. هەموو ئیشەکەی ئێمە لە سەر ئامادەیی بۆ مردن دروستبووە، هەر کەسێک ئامادەنەبێت بۆ مردن و کوشتن لای من پێشمەرگە نییە. لە بەرئەوە چی شتێکی سەیری تێدایە گەر کوشتنی نزار پێویست بێت بۆ شۆڕش. چی شتێکی سەیری تێدایە؟». کوشتن و مردن کەسمانی سەرسام نەدەکرد، هەر دووکمان ماوەیەکی درێژ پێکەوە مێژوویەکی هاوبەشمان هەبوو، کە قسەیدەکرد دەمزانی هێدی هێدی ڕقێکی گەورە لە ناخیدا بەرامبەر من و هەموو دونیاش کۆدەبێتەوە، هەستمدەکرد ئەو هێزەی هەیەتی وای لێدەکات حەزبکات بڕشێتەوە، قێزی لە هەموو کەس و لە هەموو دونیا بێتەوە. دەموچاویشی کەم کەم و بەردەوام شێوەی پیاوێکی وەردەگرت، هەر ئێستا خواردنێکی زۆر ناخۆشی خواردبێت. هەڤاڵ کەمێک بیریکردەوە و گوتی «هەڤاڵ وامەزانە شۆڕش پێویستی بە هەموو کەسێک هەیە،

یاخود دەتوانێت پارێزگاری لە هەمووان بکات یان پێویستە پارێزگاری لە هەمووان بکات. شۆڕش وەک هەر ئیشێکی تر شتی زیاد و پاشەڕۆ و خۆڵ و خاشاکی خۆی هەیە، کە نەدەیەوێت و نە پێویستی پێیانە. جگە لە کادێرە گەورەکان، ئەوانەی هێزی مەعنەوی گەورەن بۆ شۆڕش، ئەوانی تر هەموو دەشێت بێن و بڕۆن... هەندێ مرۆڤ لە دەرەوەی شۆڕش چەندە گرنگبن، لە ناو شۆڕشدا هیچ نین، شۆڕش دەتوانێت وەک پاشەڕۆی خۆی سەیریانبکات، وەک تڵپە چایەکی کۆن و گوشراو... بە ڕاستی پێمبڵێ هەڤاڵ جەنگیز، تۆ پێتوانییە ئێمە هەموومان بە جۆرێک لە جۆرەکان کەرەستەی شۆڕشین؟».

من لەو ڕووەوە کێشەیەکم لەگەڵ تێگەیشتنی هەڤاڵ شێرخاندا نەبوو، گووتم «بێگومان هەڤاڵ، ئێمە خۆمان ناتوانین سەربەخۆ لە دەرەوەی قازانجی شۆڕش بیر لە هیچ بکەینەوە. هەموومان کەرەستەین، کەرەستەمان هەیە گرنگترە لە کەرەستەی تر، کەرەستەمان هەیە بچوکە و زوو دەشکێت و فرێدەدرێت، کەرەستەشمان هەیە دەبێت زۆر بمێنێتەوە، چونکە لە ئیشەکە بێئەو بەڕێوەناچێت، من لەوە تێدەگەم».

هەڤاڵ شێرخان زۆر سووربوو لە هەموو سات و جێگا و هەڵوێستکدا هەیبەتی سەرکردەیەکی دڵڕەق و ئامادە و دەستبەکار دەربخات، گووتی «من وا چەندین ساڵە لەگەڵ بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی ناوچەکەدا سەروکارم هەیە، ژمارەیەک زۆر لە ئێرانییە ئینقیلابییەکان و شۆڕش گێڕانی عەرەب هاوڕێمن، بەڵام شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە دەبێت باوەڕی بەوە بێت کە کەرەستەی هێزێکی لە خۆی گەورەترە. کەرەستەش قابیلی شکان و فرێدان و لە کارکەوتنە... درەنگ یان زوو... درەنگ یان زوو... هەموو شۆڕشگێڕێک لە کار دەکەوێت. هەڤاڵ وادەزانم کاتی ئەوە هاتووە، شۆڕشگێڕێک ئەو مردنە کتوپڕ و لە ناکاوەی خۆی قەبووڵبکات، شۆڕشی چەکدار و درێژخایەن مەکینەیەکی گەورەی قیمەکردنە، ئەوەی لێینزیک

ببێتـەوە دەبێـت بزانێـت لەوانەیـە ڕۆژێـک لـە ڕۆژەکان مەکینەکـە پێویستی بـە گۆشـتی ئەویـش دەبێـت، شۆڕشـگێڕی ڕاسـتەقینە لـەوە ناترسـێت، بیرناکاتـەوە، دوودڵـی داینـاگرێـت... مـن و تـۆ ئێسـتا لـە جێگایەکداین کـە دەتوانیـن مەکینەکـە وا بابدەیـن خۆمـان نەبیـن بـە ژێـر ددانەکانییـەوە، گـەر ڕۆژێـک لێـت تێکبچێـت لەوانەیـە تـۆش ببیـت بـە ژێـر ددانەکانییـەوە، گرنـگ ئەوەیـە هەمیشـە لـە جێگایەکدا بیـت هێزێکـی وەهـات بـە سـەر مەکینەکـەدا بشـکێت هـەر کات وەرچەرخـا، بـە جۆرێکـی تـر سـوڕایەوە، تـۆ نەبیـت بـە ژێر ددانەکانییـەوە». لەوەوبـەر وا بەجیـدی قسـەی لەگەڵـدا نەکردبـووم، دەنگـی هـەم بێزاریـی، هـەم گاڵتەکـردن، هـەم توڕەیـی تێدابـوو، لـە دێڕێکـەوە بـۆ دێڕێـک تۆنـی دەگـۆڕا، بـەڵام هەمیشـەش پڕبـوو لـە قێـز... وام هەسـتدەکرد وەک لـە خـۆی توڕەبێـت یاخـود لـە شـتێکی دیکـەی نزیکـی کـە مـن نایبینـم، وەک ئـەوەی بزانێـت مـن دەتوانـم خەیاڵەکانـی بخوێنمـەوە، یـان بترسـێت لـەوەی مـن بتوانـم خەیاڵەکانـی بخوێنمـەوە، بـە توڕەییـەوە سـەیری چـاوی منـی دەکـرد، سـەیری سـەرمی دەکـرد، وەک ئـەوەی بیەوێـت لـە ژێـر مووەکانـەوە ڕوونتـر پێسـتەکەم ببینێـت، وەک سـەیرکردنەکانم بێزاربیکـەن. بـەڵام هـەر کات نـاوی نەغـەدە ماردینیـم لا دەهێنـا، لـە چاوانیـدا ئەو بریسـکە و شـەوق و ئـارەزووە نهێنییـە دەدرەوشـانەوە کـە لێیدەترسـام، بێئـەوەی هیـچ بڵێـت لـە نیگایـدا هەمـوو شـتێک دیاربـوو. هەفـاڵ شـێرخان لـەو ماوەیـەدا بـەوە ناوبانگـی دەرکردبـوو کـە شـەرم لـە ئارەزووە جنسـییەکانی خـۆی ناکات و وەک بەشـێکی سروشـتی ژیانـی خـۆی دەیبینێـت، بـەڵام ئـەو چیرۆکانـەی لـە سـەری بڵاودەبوونـەوە و ئـەو حیکایەتانـەی دەمانبیسـت، زۆر نزیکبـوون لـە بـە سـەرهاتی ئـەو شـەوەی خـۆم کاتێـک لـە ماڵـی ئـەو کـوڕە جوتیـارە هـەژارەدا بینیـم، مـن ئـەوکات بـە شـتێکی ڕەوام دەزانـی، بـۆ ئـەوەی ئـەم پیـاوە برسیانە تەنیایـی و بـێ ژنـی لـەو چیایانـە تووشـی کوێـری و بوغـز و نەخۆشـیان نـەکات، بـەردەوام دۆسـتی ئافرەتیـان هەبێـت... مـن لـە قووڵایـی

دڵەوە باوەڕم وابوو، ئەخلاق دەست و پێی شۆڕشگێڕان دەبەستێتەوە. شۆڕشگێڕ دواجار ئادەمییەک بوو لام هەموو ژیانی خۆی بەخشیبوو، بۆ ئەوەش دەبوو شتێک وەربگرێتەوە کە بەرتەقای ماندووبوونی بێت، بەڵام ئەو شتە چی بوو کە دەبوو وەریبگرێتەوە و دوا سنوورێک کە شت وەرگرتنەوەی شۆڕشگێڕ دەبوو بیگاتێت کوێ بوو، من نەمدەزانی.

لە ڕۆژانی دواتردا شتەکان ڕوونتر بوونەوە، بە فەرمانێکی شێرخان و ئەنجومەن، نزار نێردرا بۆ مەفرەزەکانی خوارەوە، ئەو چەند ڕۆژەی نزار لە دەربەندی دەمبۆران بوو وەک هەمیشە ئازاد، زۆربڵێ، بێباک خۆی دەردەخست، بەڵام هەستمدەکرد لە ناخیدا ترسێکی قووڵ هەیە و دەتوانێت هەر بە بۆن هەست بەوە بکات شتەکان لێرە لەوە سەیرتر و ئاڵۆزتر و کوشندەتر بوون کە ئەو بیری لێکردۆتەوە... ئەو هێشتا لە خەیاڵی شۆڕشی پێشوودا بوو، بەڵام ئێستا کەوتبووە ناو دونیایەکی ترەوە، کەوتبووە سەرزەمینێکەوە زۆر پێچاوپێچتر. لە شۆڕشی پێشوودا شتەکان وەهابوون وەک مرۆڤ لە سەر ڕاستە شەقامێکی درێژ و پان و ڕێک لە ڕۆژێکی ڕۆشندا بڕوات، ئەو مەترسیانەی کە دەهاتنە ڕێگای دەیبینین یاخود خۆی بەرەو ڕوویان دەچوو، مەترسیبوون ئاشکرا، شەڕبوون ڕووبەڕوو، دوژمنەکانیش لە سەر ئەو ڕاستە شەقامە، دوژمنی ناسراو و بینراو بوون، دەمامکیان لە سەردا نەبوو، خۆیان لە بەرگی جۆراوجۆردا نەدەگۆڕی. ئەو دەم شۆڕش هێشتا بۆنی شەڕی ڕوونی نێوان خێڵەکان و عەشرەتەکان و بنەماڵەکانی لێدەهات... مەترسی لە جێگای مەترسی و هێمنی لە شوێنی هێمنیدا بوو. بەڵام لەم دارستانەی دەمبۆراندا، لە ناو ئەم دەربەندە تاریک و بنکە پەرتەوازە و هێزە بچوکانەی شۆڕشدا، کە دەیان هێز و بکەری نادیار تێکەڵ بووبوون، یاسایەکی تر زاڵ و جیهانێکی تر لە دروستبووندا بوو، لێرەدا هەموو کەس دەشیا ترسناک و هەموو چوونە دەرەوەیەک دەشیا بۆ مردن و

هەموو قسەیەک دەشیا کوشندە بێت. نزار هەر زوو هەستیکرد کە ئەو جیهانەی ئێرە، شتێکی ئاڵۆزتر و پڕ نهێنیترە لەوەی ئەو حیسابیکردوە، ئێرە شوێنێک نییە وا بەلاوازی و ڕووتی و بێقەڵغانی خۆتی تێفڕێبدەیت، لە پاڵەوە دووجار تکای لە من کرد هەرچییەکم کردوە بیگێڕمەوە بۆ شار، چونکە لێرە بۆنی «شێیەکی خوێناوی» دەکات. «شێیەکی خوێناوی»، دواتر زانیم ئەوە وشەی ناو شیعرێکی خانمی ماردینییە و نزار دەیڵێتەوە. من پێمگووت کە ناتوانم هیچی بۆبکەم، دەسەڵاتەکان لێرە داخراوتر و مۆنترن لەوەی ئەو بیریان لێدەکاتەوە، ئەو شتانەی لە سەرەوە داوادەکرێن دەبێت جێبەجێبن، هەڵوەشاندنەوەی بڕیارێکی وەها تەنیا لەدەست هەڤاڵانی ئەنجومەنی باڵادایە. نزار هەوڵێکی زۆریدا لە ڕێگای نمایش و خۆدەرخستنەوە، لە هەندێ کەسانی باڵا نزیک ببێتەوە، دەیویست هەموو کارێکبکات لەدەست ئەو هەستی ڕووتی و بێدیفاعییە دەربازی بێت کە تێیکەوتبوو، دەیویست ئەو بڕیاری ڕەوانەکردنەی بۆ باشوور هەڵبوەشێنێتەوە، چونکە دەیزانی ئەوە بڕیاری ناردنێتی بۆ مردن. مرۆڤ کە دەهاتە شۆڕشەوە هەمیشە پاش ماوەیەک ئەو هەستەی لادروستدەبوو، ئاخۆ شۆڕش پێویستی پێیەتی یاخود نا، ئاخۆ ئەو تەنیا خۆراکی شۆڕشە یان دەتوانێت بەرزببێتەوە و ببێتە فەرمانبەر و لە پاشەڕۆژدا شوێنێکی گرنگی لە ڕیزەکانی پێشەوەدا هەبێت. بەڵام نزار تەنیا زمانە هارەکەی و غەریزەکانی باش ئیشیان نەدەکرد، بەڵکو بۆنیشی هێدی هێدی بە جۆرێکی سەیر تیژدەبوو، ئێستا بە تەواوی مەترسییە گەورەکانی سەر ژیانی خۆی بۆندەکرد و نەشیدەویست ئاسان خۆی بۆ مردن شلبکات. بە ڕوونی دەیبینی ئەو جۆرە ڕەفتار و ڕادەربڕینانەی کە هەمیشە ئازادانە و بێترس نیشانیداون، لەم جەنگەڵەدا کە پڕە لە پیاوانی ترسناک، پڕە لە جەنگی نهێنی، پڕە لە کەسانی دەمامکدار، سوودێکی ڕاستەقینەیان نییە. لێرە خەڵکانێکی وەها فرەڕووی

دەبینی، هەستیدەکرد چەند دەمامک هەڵگرێت، چەند بەردەماغ لادات ئەستەمە بگاتە سەر ڕووە ڕاستەقینەکەیان. لێرەدا قسەکردنی زۆر، خۆدەرخستن، رادەربڕینی ئازاد دەشیا زۆر ترسناک بن. من بێباکانە بە نزارم گووت «هەڤاڵ هەم دنیا گۆڕاوە و هەم یارییەکان... واهەستدەکەم لێرە بەدواوە دونیا زۆر زوو زوو دەگۆڕێت و یارییەکانیش زۆر زوو زوو دەگۆڕێن، واپێویستدەکات ئێمەش زوو زوو بگۆڕێین، هەڤاڵ گیان چارێکت نییە جگە لەوەی کە بڕۆیت و پەیوەندیبکەیت بە مەفرەزەکانی باشوورەوە و لەوێ بیر لە چارەیەک بکەیتەوە». قسەکانم هەم گاڵتەپێکردن و هەم پێخۆشبوونێکی شاردراوەی تێدابوو، من نزارم هەردەم لە دۆخی لە خۆڕازیبوون و غروردا بینیبوو، هەتا کە بەگیراویش هێنامانەوە بۆ پسمامان هەر ئەو شکۆ و هەیبەت و ڕۆح بڵندییەی تێدابوو. ئێستا لە دەربەندی دەمبۆران، زۆربەی کادێر و سەرکردە و بەرپرسەکان هەمان خودپەسەندی و بەرزبینی ئەویان هەبوو، هەریەکەیان خۆیان بە ئەفسانەیەک لە ئەفسانە گەورەکانی شۆڕشگێڕیی دەبینی، لە بەرئەوە نزار گوێگر و ڕێزگرێکی تایبەتی دەست نەدەکەوت، بەوەشدا دۆست و هاوجێی ئەم ژنە شارییە شۆخە بوو، ئێرەییەکی نهێنی، بوغزێکی قووڵ بەرامبەری لە هەموو سینە و زگێکدا مەڵاس بوو. بەڵام نزار دەیزانی ئیدی هەموو شتێک لە نێوان ئەو و ژنی دکتۆردا کۆتایی هاتووە، کەچی لە «دەمبۆران» لەوە نەکەوت خۆی وەک خۆشەویستی نەغەدە پیشانبدات، لەوە نەکەوت داوا لە دوای داوا بۆ سەرۆکەکانی بنوسێت تا لە خۆشەویستەکەی جیانەکەنەوە، لە نامەکانیدا خۆشەویستی خۆی شاعیریانە، بەڵام بە زمانێکی پڕ لە زیادەڕەوی و هەستی دەستکرد و وشەی لوسکراو وەسفکردبوو، هەوڵیدابوو داوابکات شۆڕش باوەشێکی گەرمی بۆ خۆشەویستی هەبێت و لێی نەترسێت. بەڵام باوەڕناکەم نامەکانی گوێگر و خوێنەری ئەوتۆیان لە ئەنجومەن دۆزیبێتەوە. بۆچوونە

دژە دین و نەیار بە خودا و بە ئەخلاقەکانی بۆ ئەو شۆڕشگێڕانەی دەربەند شتێکی نوێ نەبوون، نەیدەتوانی هەمان سیحر و کاریگەریان هەبێت، وەک لەوەبەر لە دیوەخانەکانی مەنسوور ئاغادا هەیانبوو، لە هەر شت گرنگتریش پێدەچوو نەغەدە تەواو بێئاگا بێت لەو نەخشانەی لە ژوورەکانی دەمبۆراندا بۆ نزار چنرابوون. وام هەستکرد لە ساتێ لە ساتەکاندا خانمی ماردینی گەیشتبووە ئەو بڕوایەی بوونی نزار لێرەدا جگە لەوەی ڕێگای سەفەری ڕاستەقینەی ناو ئەم جەنگەڵەی لێدەگرێت، شتێکی ئەوتۆ ناکات. نەغەدە هەر لە سەرەتاوە بە جۆرێکی تایبەتی مامەڵەکرا، ژوورێکی بچوک و تایبەتیان دایە لە خانوویەکی گوندەکی گڵین و سادەدا کە بۆ میوانە ژنەکانی دەربەند دروستکرابوو، بۆ ئەو ژن و دایک و خوشکانەی لە شارەوە بەدزییەوە بۆ سەردانی کەسی خۆیان دەهاتن. ماڵەکە زۆر لە بنکەی هەڤاڵ شێرخانەوە دوور نەبوو. بەوەدا من خواستی چاوەدێریم لە حوکمی خەو بەهێزتربوو، هەر لە سەرەتاوە بڕیارمدا تا لە دەربەند بم بە وردی چاوەدێری دەوروبەری ماڵی خانم بکەم. هەر لە سەرەتاوە سەیرم لێهات کە ژنی دکتۆر ئاسان دەتوانێت بەرگەی ئەم دنیا دڵڕەق و ژوورە خنکاو و ژیانە سەختەی دەمبۆران بگرێت. بۆ ئەوەی لە کێشەی چێشت لێنان ڕزگاریبکەن، هەر لە نیشتەجێی سەرۆکەوە بڕیاردرابوو ڕۆژانە پێشمەرگەیەک لە خواردنی پێشمەرگەکان نان بۆ خانمیش ببات... من لەو ماوەیەدا و لە دەرەنجامی چاودێرییە بەردەوامەکانی خۆمدا تێبینی ئەوەم کرد کە تەنیا هەڤاڵ شێرخان و هەڤاڵ جافەرانی زۆر هاتوچۆی نەغەدە دەکەن، زۆر لە ژوورەکەیدا دەمێننەوە. بەڵام هەستمکرد لە نێوان هەڤاڵ شێرخان و شێخ جافەرانیدا کە ئەویش کوڕێکی گەنجی بە قیافەت و قۆزبوو، جۆرە شەڕێکی نهێنی گەورە دروستبووە، شێخ جافەرانی لەو ماوەیەدا وەک سەرکردەیەکی سەربازی ئازا کە ژمارەیەک چالاکی گەورەی بۆ شۆڕش

ئەنجامدابوو، ناوبانگێکی بێوێنەی بۆ خۆی دروستکردبوو، لە سەرەتای گەیشتنی ژنی دکتۆرەوە بەدەربەند پێوەی دیار بوو کە مەیلێکی داغانی بۆ ئەم خاتوونە هەیە، بەڵام نەمبیستبوو شێخ وەک هەڤاڵ شێرخان ژنبازێکی فرەمەیل بێت، لە هەموو جێگا و شوێنێکدا بەر لەوەی مشووری خواردن و سەلامەتی بخوات، مشووری ژن بخوات. وەک بیستبووم، دکتۆر پێشتریش ویستبووی لە هەموو جێگایەک ناوی جافەرانی پیسبکات و کەسانی خۆی هاندابوو، چیرۆکی خراپی لە سەر دروستبکەن و گومان بخەنە سەر ڕابوردووی و ئازایەتیشی بێنرخ و بچوک بکەنەوە، شتێک کە جافەرانی بەردەوام دەیبیستەوە و لێینیگەران بوو. لە ڕاستیدا ناوبانگ و خۆشەویستی هەڤاڵ جافەرانی لە ناو پێشمەرگە و لای خەڵک بە جۆرێک پەرەیسەندبوو، هەتا ئەندامانی کۆمیتەی باڵای سەر بە بیرۆ سڵیان لێدەکردەوە، بەتایبەت هەڤاڵ جافەرانی خۆی هەستێکی ڕاستەقینەی بە هێزی خۆی هەبوو و لەوەش نەدەترسا لەگەڵ هیچ کەسێکدا بچێتە ململانێوە. ئەوەی من سەرنجمدا ئەوەبوو، کە هەر دووکیان بەردەوام ڕۆژانە سەردانی خانمیان دەکرد و هەندێجاریش بە ئاشکرا لە بەردەم ژوورەکەی ژنی دکتۆردا لەگەڵیدا دەردەکەوتن. بەڵام لە ناوەوە و لە ژوورەکەی ماردینیدا بە تەواوی چی دەگوزەرا، کەس نەیدەزانی. لەو ماوەیەدا خانم چەند جارێک منی بانگکرد و هەموو جارێکیش قەسیدەیەکی نوێی خۆی دەدامێ و داوای لێدەکردم لە گەڕانەوەمدا بۆ شار بیدەم بە هۆشەنگی بولبولیار، کە لەراستیدا یەکێک بوو لەوانەی سەرسامییەکی قووڵی بە بەهرەی شیعری نەغەدە خان هەبوو، بەڵام دوای لەسێدارەدانی هەڤاڵان، بووبوو بە دوژمنێکی ئاشکرای شۆڕش و بە ناوێکی خوازراوەوە لەگەڵ هەندێ کەسی تردا گۆڤارێکی بچوک و نهێنیان بڵاودەکردەوە و بە توندی پەلاماری پرەنسیپەکانی شۆڕشی نوێیان دەدا. من ئەودەم لە حیزبەوە زۆر داوام لێدەکرا شوێن و نیشتەجێ و نهێنی بولبولیار بدۆزمەوە

و بە جۆرێک لە جۆرەکان کار بۆ لە ناوبردنی بکەم، بەڵام ئەوە تاکە فەرمانێکی حیزب بوو بۆم جێبەجێ نەدەکرا... هەر کات دەمویست شتێکی بەد بەرامبەر ئەم گەنجە بکەم، هێزێکی نهێنی لە ناخمدا دەستی دەگرتم، زەنگێکی سامناک لە هەموو گیانمدا لێیدەدا. لەو ماوەیەدا چی کارێکی کوشتن و بەگرتدان و ڕفاندنم ڕێکخستبوو کەم تا زۆر سارد و بێکاریگەر و ئاسان بە سەر دەرون و خەیاڵمدا ڕابوردبوون، کەچی هەر بمویستبایە دژی بولبولیار شتێک بکەم ئەو زەنگە گەورەیە لە سەرمدا لێیدەدا، جۆرە لەرزێکی نهێنی دەیگرتم، هەستێکی خراپی دڵ تێکەڵبوون و هێڵنج و سکچوونم توشدەبوو، بێئەوەی بزانم بۆ. سەیربوو بەلامەوە کە ژنی دکتۆریش لەناو هەموو هاوڕێ و هەڤاڵە کچ و کەسە نزیکەکانی خێزانەکەیدا بولبولیاری هەڵبژاردبوو. من کە دەچووم بۆ لای خانم، هەوڵمدەدا بزانم کە بارودۆخی چۆنە و لە دیمەن و قسەیدا ئەو شتانە بدۆزمەوە کە هەموو پیاوێکی ڕاستەقینەی ئاسایش بەدوایدا دەگەڕێت. هەر جارێکیش دەچووم و دەگەڕامەوە، خانمی ماردینیم وەک کەسێکی بێباک دەبینی کە بەشێکی لە خەیاڵاتی شیعر و بەشێکی لە خواستی ئەزموونکردنی دڕندانەی ژیان و بەشێکیشی لەساردییەکی بێمانا و بەستەڵەک ئاسادا ونبووە. من لە دەربەندی دەمبۆران بە تەواوی ئەو ساردییە ترسناکەم هەست پێکرد کە لە ڕۆحی خانمدایە، ساردییەک هاوشێوەی ئەو ساردییە بوو کە لە دڵی خۆمدا هەبوو.

نەغەدە لە قسەکانیدا بێزارییەکی ئەوتۆی لە دەربەند دەرنەدەبڕی، بە پێچەوانەوە هەستمکرد بەدیوێکدا تەواوی جێگاکە وەک مەملەکەتێکی شاعیری و خەیاڵی دەبینێت، ئەوەی هەموو پیاوانی دەمبۆران تەماحیان لە لەشێتی کێشەیەکی وەهای بۆ دروست نەدەکرد، بەڵام کاتێک ناوی دکتۆر شێرخانی دەهێنا نەغمەیەکی گاڵتەجاڕ و بێباک و کەم بەها لە دەنگیدا بوو. جارێک ڕاستەوخۆ لێمپرسی «خانم هەستدەکەم دکتۆر

شەیدات بووە، پێدەچێت تەواو کەوتبێتە عەشقی تۆوە... واهەست ناکەم تۆ هەمان هەستت هەبێت». بۆ یەکەمجار بە دەنگی ڕۆشن و سەدای ژنێکەوە بە ڕوونی بزانێت چی دەوێت، بێئەوەی ڕووبەڕوو سەیری ناو چاوم بکات گووتی «دکتۆر لەو کەسانە نییە، بمەوێت شتێکم لەگەڵیدا ببێت». وشەکانی وەک کریستاڵ ڕوون و ڕۆشن و ڕەق بوون، بە جۆرێکیش بەهێزبوون وام هەستکرد لە هەموو دەربەنددا دەنگدەداتەوە. من لەو ماوەیەدا کە لە دەربەند مامەوە، هێدی هێدی تێکچوونی باری دەرونی دکتۆر شێرخانیشم بینی، هەموو بە ڕۆشنی هەستمان بەوە کرد کە «ژنی دکتۆر» ئارەزوو و مەیلێکی زۆرتری بەلای شێخ جافەرانیدا هەیە. من سەرنجمدا هەر یەکێک لەو دووانە چاوی تایبەتی و پاسەوانی نهێنی خۆیان هەیە کە سات دوای سات هەموو زانیارییەکیان بۆ دەگوێزنەوە، لە شوێنێکدا ئیتر ڕۆشنبوو کە دکتۆر شەڕی بە دەستهێنانی نەغەدە ماردینی دۆڕاندوە. من هەستم نەدەکرد کەسیان نەغەدە ماردینیان خۆشبوێت، ئەو شتێک بوو کە گرتن و رامکردن و دەستەمۆکردنی لای هەر یەکێکیان مانایەکی ڕەمزی هەبوو، من لە یەکێک لە شیعرەکانی خانمدا دێڕێکی سەرنج ڕاکێشم بینی کە نیشانەی ئاگاداری خۆی بوو، دێڕێک کە پێدەچێت گرنگترین دێڕی ژیانی بووبێت، هەستێک لەوانەیە هەمیشە و هەمیشە و تائەمڕۆش لەگەڵیدا بێت، ئەو لە شیعرێکیدا نوسیبووی «من بۆ خۆشەویستی نیم، بۆ ئەوەم هەمیشە داگیربکرێم، داگیربکەم، لە گەمارۆیەکی ئەبەدیدا بم». من لە دوورەوە سەرنجمدەدا و دەمبینی کە شکست هەڤاڵ شێرخانی تورە و شەرانگێزتر کردوە، کار گەیشتە ئەوەی بە هەفتەیەک بەر لە گەڕانەوەی من بەرەو شار، ژنی دکتۆر داوایەک پێشکەش بە سەرۆک بکات و داوابکات لە شێرخان بیپارێزێت. هەموو پێشمەرگە و دانیشتوانی دەمبۆرانیش دوو جەنگ و جەدەل و پیاهەڵشاخانی گەورەی نێوان هەڤاڵ جافەران و دکتۆریان

بینی کە وەختەبوو کاریگاتە بەرزکردنەوەی چەک و هێنانەوەی میل و تەقەکردن، گەر دەمودەست هەڤالانی ئەنجومەنی بالا نەکەوتبانایەتە نێوانەوە و شتەکانیان سارد نەکردبایەتەوە. لە ڕاستیدا گەر لە سەرەتاوە ئەو دوو پڵنگە ڕەشەی ناو دەربەند نەبوونایە بە داواکار و دەستخواستی خانم، دەشیا بوونی ئەو لەو دەربەندەدا، کێشەی گەورەتر بنێتەوە. بوونی دکتۆر و جافەران لە بازنەی یەکەمی گەماڕۆدەرانی خانمدا وایکرد ئەوانی دی بترسن و نائومێدبن و پاشەکشەبکەن، هەردووکیان لە دڕترین سەرکردە سەربازییەکانی شۆڕش بوون، ناویان بە جۆرێکی بەردەوام دەهات و لە سەرەوەی لیستی ئەو داواکراوانەدا بوون کە بەغدا بۆ سەریان دەگەڕا، هەردووکیشیان بە ڕۆحێکی شۆڕشگێڕانەوە لەگەڵ سوپای فاشیستەکان و دوژمنانی حیزبدا شەڕیاندەکرد، چەندەها جەنگی گەورەیان دیبوو، دووان بوون کەس گومانی لە کوردپەروەرییان نەدەکرد، دەرگیربوونی ئێستایان لە سەر نەغەدە ماردینی، نیشانەیەکی تر بوو بۆ جەنگی تایبەتی نێوانیان، جەنگی دوو کەس کە هەمیشە یەکێکیان دەیەوێت هەنگاوێک لە پێش ئەوی دییەوە بێت. من دڵنیابووم شێرخان لەوانە نییە ئاسان بگەڕێتە دواوە، ژنی دکتۆر لای ئەو، تەنیا ئافرەتێک نەبوو بیەوێت لەگەڵیدا بخەوێت، بەڵکو شوێنێک بوو دەبێت داگیربکات، ترۆپکێک بوو، بنکەیەکی گرنگی سوپابوو، خاڵێکی گرنگی ناو جوگرافیا خەیاڵییەکەی خۆی بوو، کە دەبوو دەستی پیابگات. دەبێت بڵێم کە هەردووکیان چ هەڤاڵ جافەران و چ دکتۆریش، لەشی ئەویان وەک پنتێکی گرنگ لە شەڕێکی ستراتیژیدا سەیردەکرد. بەر لەوەی من بگەڕێمەوە بۆ شار، سەرۆک بۆ ئەوەی شەڕ لە دەمبۆران دووربخاتەوە، فەرمانیدا شێخ جافەران هاوڕێ لەگەڵ هەموو هێزەکەی و خانمی ماردینیشدا بگوێزنەوە بۆ هەرێمێک دەکەوتە دووری پەنجا کیلۆمەترەوە لە بنکەکانی دەمبۆران. ئەو بڕیارە بۆ دکتۆر وەک شکستی کۆتایی و تەواوەتی وەهابوو،

هەنگاوێـک بـوو هەمـوو ئومێدێکـی لـەو دەسـەندەوە و خانمیشـی لـە سـەر سـینییەکی زێـڕ پێشـکەش بـە جافەرانـی دەکـرد، کـە بەشـتێک لـە شـانازی و کەمێکیـش شـەرمەوە ڕۆڵـی عەشـیق و دۆسـتی خانمـی لـەو نێـو چیـا و سـەختەزەمینەدا وەرگرتبـوو. ماردینـی بێئـەوەی خوداحافیـزی ڕاسـتەوخۆ و ڕووبـەڕوو لـە مـن بـکات، نامەیەکـی ماڵئاوایـی بـۆ ناردم و بـە تـکاوە نوسیبووی کـە لەگـەڵ گەڕانەوەمـدا بـۆ شار شیعرەکانی ڕادەستی بولبولیار بکـەم و گـەر شـتێکی کەمیـش لـە ڕێـزم بـۆ ئـەو هەیـە ئاگاداری ئـەو بـم. ئەوە یەکەمجار بـوو هەستبکەم خانـم هەستێکی تایبەتی بەرامبـەر بولبولیار هەیـە، بـەڵام نامەکـە و شیعرەکان هیـچ شتێکیان دەربـارەی چۆنێتـی ئـەو هەسـتە تێدانەبـوو، ئایـا هەسـتی هاوڕێیەکـە بەرامبـەر هاوڕێیـەک، هەسـتی ژنێکـە بـۆ کوڕێکـی گەنـج، هەسـتی خانمێکـی زەنگیـن و بێکێشـەیە بەرامبـەر هەژارتریـن کـوڕی دونیـا، هەسـتی ژنـە شـاعیرێکە بـۆ خوێنەرێکـی قـووڵ و ڕاسـتەقینەی خـۆی... یـان چـی؟.

کـە بـەرەو شـار گەڕامـەوە، تەنیـا شـتێک پێمبـوو شـیعرەکانی ژنـی دکتـۆر و دەفتـەری پڕیـی یاداشـتەکانی خـۆم بـوو، کـە لـەو ماوەیـەدا بـە وردەکارییەکـی شـەیتانی و بـە شـێوازێکی میکرۆسـکۆبی دوای هەمـوو قسـەوباس و چیرۆکێکـی نـاو دەمبـۆران کەوتبـووم، ڕۆژانـەی پەرەسـەندن و گـۆڕان و پێکدادانـی نێـو پەیوەنـدی سـێ کوچکـەی خانـم و جافەرانـی و شـێرخانم تۆمارکردبـوو... کـە گەیشـتمەوە شـار و لـە دوورەوە خانـووە کۆنکرێـت و شـەقامە بێڕۆحەکانـم بینـی، کـە دووبـارە کڵاو و پۆسـتاڵی سـەربازە عەرەبەکانـم لێدەرکەوتـەوە، هەسـتمکرد بـۆ ماوەیەکـی درێـژ پێویسـتیم بـە پشـووە... گەڕامـەوە بـۆ ژوورەکـەی خـۆم و خەوتـم و بـۆ یەکەمجـار لـە خەومـدا بینیـم نـزار ئیدریسـیان کوشـتووە.

# باڵەکان

هێدی هێدی باڵەکانم ناڕەحەتیاندەکردم... دوو تەنی گەورەبوون کە کێشێکی ماددیی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام کێشێکی دەرونی قورسیان دەخستە سەر شانم. لە ڕێگای یەکێک لەو هونەرمەندە شێوەکارانەوە کە ئەوکات لە دەزگای ڕاگەیاندنی حیزب ئیشیدەکرد، ویستم هەندێک وێنەی فریشتە و ئەهریمەنم دەستبکەوێت و بەپێی ئەو نیگارانە، باڵەکانی خۆم هەڵسەنگێنم و بزانم لە چ چەشنە باڵێکن، من گومانێکی قووڵم هەبوو بووبێتمە فریشتە، بەڵام بۆ دۆزینەوەی هاودەردێک، جگە لە خەیاڵی نیگارکێشان، جێگایەکی دیکەم بەبیردا نەهات تیا بگەڕێم. لەو باوەڕەدا نەبووم کە پێش من ئادەمیزادێک تووشی دەردی وا بووبێت و جووتێک باڵی نەبینراو، بێکێش، بێسوود بەو چەشنە لە پشتی روابن. زۆر حەسرەتم لەوە دەخوارد کە تووشی دەردێک بووم تەنیا پاڵەوانی ناو ئەفسانەکان و فیگەری ناو تابلۆکان تووشی دێن، دەمگووت، خودایە من بێکەسەیەکی ناچیز، بۆ دەردێکی وا خورافیم دەدەیتێ. نیگارکێشەکەی هاوڕێم بە خۆی و هەندێک دۆستی نزیکی کە لە شار دەژیان و ڕاسپاردەی ئەویان بە هەند وەردەگرت، وێنەی ژمارەیەکی زۆر فریشتەو شەیتانی باڵداریان بۆ پەیداکردم، کە پێکڕا بە جۆرێک تێکەڵ و پێکەڵبوون سوودم لێ نەبینین، لە ڕاستیدا زۆربەی ئەهریمەنەکان باڵیان وەک باڵی شەمشەمە کوێرە وابوو، بەس باڵی من وانەبوو، باڵی من لە باڵی قازێکی سپی دەچوو، قازێک لە سنووری گەشەی خۆی ترازابێت و زۆر گەورە بووبێت. هەندێ کات بەراستی ترسی ئەوەم لێدەنیشت، ئەوەی ئێستا دەیبینم و دەگوزەرێت، سەرەتای

گۆڕانکارییەکی ترسناکی سەرتاپای جەستەم بێت و دواجار لە بری فریشتە، ببم بە قازێکی زەبەلاح، بەڵام زوو خۆمم هێوردەکردەوە و خودی باڵەکانیشم بە ورێنەی خەیاڵی نەخۆشی ئەم ماوەیە و بەکاری دەردی دێرینی گومان لە خۆکردنم دەزانی. بە گشتی هەرچەند دەمڕوانی نەدەکرا من بووبێتمە فریشتە، لەو ماوەیەدا کە باڵەکانم دەرکەوتن من وەها لە دڵڕەقی و بێباکیدا نوقمبووبووم، بێمێشکییەکی گەورەدەبوو گەر پاداشتێکی وەها لە خودا چاوەڕوانبکەم. ئەودەمە دەیان کاری کوشتن و ڕفاندن و گرتن و بەگرتدانم بۆ حیزب جێبەجێکردبوو، ئەوانەشی کە بووبوون بە قوربانی داو و تەپکە کوشندەکانی من هەموویان گوناهباری ترسناک نەبوون، ئەو ساڵانە حیزب جگە لە دڵێکی ڕەق هیچی تری لە من نەدەویست، منیش بێئەوەی بیر لە هیچ بکەمەوە ئەو دڵە ڕەقەم پێشکەش بە هەڤاڵ و سەرۆکەکانم دەکرد. گەرچی باڵەکانم قورساییان نەبوو، بەڵام هێدی هێدی هەستمدەکرد، کێشێکی دەرونی وەها سەختیان هەیە، خەریکە بۆم هەڵنەگیرێن... لە ڕۆیشتندا نەمدەتوانی وەک جاران گورج بم، هەندێجار خۆم وەک باڵندەیەکی نەخۆش دەهاتە بەرچاو کە باڵەکانی وەها شۆڕ و قورس دەبن چیتر جوڵەی بۆ ناکرێت، لە زۆر دانیشتندا بە مەبەست چیرۆکی خەیاڵیم دروستدەکرد و دەمگووت ناسیاوێکم هەیە دەڵێت هەندێ مرۆڤی باڵداری بینیوە و وا ئیدیعادەکات مرۆڤگەلێک هەن وەک فریشتە باڵی نەبینراویان هەیە. کە ئەو قسانەم دەکرد دەوەستام تا بزانم کاریگەری قسەکانم چیدەبێت، بەڵام هیچ چیرۆکێکم دەنگدانەوەی تەواوی نەبوو، هیچ کەس شتەکانی بە بایەخەوە نەدەبیست و بە هەندی نەدەزانی. بەڵام من دڵنیابووم کەمینەیەکی نهێنی هەیە باڵەکانم دەبینن، دڵنیابووم. ئێستا بە دڵنیاییەوە هەمووتان ئەو شەوە سەیر و عاجباتییەتان لە بیرە کە هۆشەنگی بولبولیار دوای هەڵکەندنی گۆڕی خۆی ئامازەی بە مندا و گووتی، هەڤاڵ جەنگیز، ئەو

شتانە دەبینم کە بە پشتی تۆوەن. ئەوە بۆ من وەک کرانەوەی دەرگای ئاسنینی قەڵایەکی ئەفسانەیی بوو، وەک ئەوەبوو بولبولیار ویردێکی سیحراوی بخوێنێت و سەری تەلیسمێکم بۆ هەڵبداتەوە. ئەو شەوە دوای تیربارانکردنی حەسیب، من خۆم گەیاندە بولبولیار لە زیندانەکەیدا، دەمودەست پێمگووت «ئەو باڵانەی من تۆی ڕزگارکرد، گەر ئەو باڵانەی من نەبایە ئێستا مردبوویت، ئێستا تۆ لەو دونیا بوویت، پێمبڵێ چی دەبینیت و چۆن دەیبینیت؟». بولبولیار هەمیشە هێمن بوو، هەمیشە ئاسەواری هێمنییەکی کۆنتر لە ئێستاش لە سەر دەموچاوی بوو. گەرچی کوشتنی حەسیب تەواو گرژیکردبوو، بەڵام لەو پیاوانە بوو کە نایانەوێت لە بەردەم هیچ شتێکدا ترساو و سڵۆک دەربکەون. بێئەوەی ڕوو بە ڕوو سەیرمبکات گووتی «باڵەکانت لەوە گەورەترن کەس نەیانبینێت».
من بە بێزارییەوە سەیرمکرد و گووتم «بولبولیار، من ماوەیەکە ئەم باڵە مەلعونانە ڕادەکێشم، تا ئێستا هیچ کەس نەیبینیون تۆ نەبێت، بەوەدا دەتوانی باڵەکانم ببینیت، دەشتوانیت پێمبڵێی چیین. من لێتی ناشارمەوە، کە ژیانم بە هۆی ئەوانەوە بووە بە ترس و گومانێکی سەخت. بولبولیار، من چیم... پێمبڵێ، من فریشتەم یان شەیتان؟».
ئەمجارە بە وردی سەیریکردم و بە نیگاشیدا دیاربوو لە گەورەیی و هەیبەتی باڵەکانم ڕادەمێنێت، کەمێک وەستا و گووتی «گەر تۆ خۆت نەزانیت چیت... فریشتەیت یان شەیتان من چووزانم؟». دەبێت بڵێم ئەوسا بولبولیار هێشتا نەچووبووە کەشتیی فریشتەکان، هێشتا پێی نەخستبووە ناو دونیا داخراو و سەیرەکەی ڕێزانی مەلەکبینەوە. بەڵام بە هەمان ساردییەوە، گووتی «من لەم چەندساڵەدا ژمارەیەک مرۆڤی باڵداری وەک تۆم بینیوە، بەڵام زۆربەی ئەوانەی دەیانبینم خۆیان لە توانایاندا نییە باڵەکانی خۆیان ببینن، سەیرە کە تۆ دەتوانیت. منیش وەک تۆ وەهام، شتێکی ئەوتۆ نازانم، بەڵام چەند ساڵێک لەمەوبەر

دووجار فریشتەیەکی ڕاستەقینەم بینی، باڵەکانی تەواو وەک باڵی تۆ وەهابوون، ناوی مەهدائیل بوو، مەهدائیلی فریشتە». ئەوە یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا ناوی مەهدائیلی فریشتە ببیستم. وەک بیەوێت من دێوانەبکات، بەساردییەوە گووتی «مەهدائیل تاکە کەسێکە دەتوانێت پێمان بڵێت ئەم باڵانە چیین... بە مەرجێک بتوانین بیدۆزینەوە، ڕەنگە منیش تەنیا کەسێم بتوانم مەهدائیل بدۆزمەوە... بەڵام من لە یەک شت دڵنیام، ئەویش ئەوەیە کە تۆ فریشتە نیت، هیچ یەکێک لە ئێوە فریشتە نییە، شۆڕشەکەتان جگە لەوەی بووە بە کارخانەی شەیتان هیچی تر نییە، تۆ ئەمشەو کەسێکی بێگوناهت کوشت. ئێوە بەرامبەر هەر فاشییەک کە دەیکوژن کەسێکی بێگوناهیش دەکوژن». گەرچی منیش دڵنیابووم فریشتەنیم، بەڵام قسەکەی کەمێک برینداریکردم. بێئەوەی گوێبدەم ئازار و تووڕەبوونی ئەو لە سەر غەمی خۆم ڕۆیشتم و پرسیم «بەڵام چۆن بتوانین ئەو کەسە بدۆزینەوە کە باسیدەکەیت».
«نازانم، جگە لەوەی چاوەڕوانیبکەین هیچ ڕێگایەکی ترمان نییە... ئەو دەتوانێت پێمان بڵێت ئێوە چیین. تۆ یەکێک نیت لە سەرانی دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش برۆ و بیدۆزەرەوە». دوای ئەو قسانە، تووڕەبوونێکی سەیر بولبولیاری داگرت، سەرانی شۆڕشی وەک تاقمێکی چەتە ناوزەدکرد کە جگە لە زیادکردنی ئازار و دروستکردنی شەڕی بێسوود و گوێنەدان بە ئینسان، کاری تریان نییە. بە تووڕەییەوە سەیریکردم و گووتی شۆڕش لای ئێوە ئەوەیە شەیتان دەربکەن و خۆتان بچنە جێگاکەی، گرفتەکان ئەوەیە نەگەیشتوونەتە پلەوپایەی شەیتان، ئەوانەی بە ناوی ئازادییەوە دەبن بە پیاوکوژ و دیکتاتۆر هەزارجار لەوانە بەدترن کە خۆیان وەک دیکتاتۆر لە دایکدەبن... بەعسییەکان چەندە نرخ لە سەر ژیانی مرۆڤ و کەرامەت و ئازادی دادەنێن، ئێوەش هەر ئەوەندە دایدەنێن، بەهەمان بێباکی مرۆڤ دەکوژن، بەهەمان بێباکی ئازاردەدەن، بەهەمان بێباکی

بە نێو ژیان دەکەون و جگە لە دەسەڵاتی خۆتان، هیچ شتێک نابینن. بولبولیار بە جۆرێک تورەبوو کە پێشتر بەوجۆرە نەمدیبوو، دواتریش زۆر کەم لە دۆخی وەهادا کەوتە بەرچاوم، بەڵام هەتا لەوپەڕی تورەییدا، هێمنی ڕوخساریی و ئارامی نیگاکانی لەدەست نەدەدا. دەمزانی ئەمشەو چ ئازارێکی قووڵمان تێدا چاندووە، دەمزانی کاری کوشتنی حەسیب لە ناخیدا شەپۆلان دەدات.

بولبولیار، دوای هەڵوەشانی ئەو شانە دێرینەی غەمپاشا و لە سێدارەدانی هاوڕێکانی، لەگەڵ نزیکی دە گەنجی دیکەدا لە ڕێکخراوێکی نهێنی بچوکدا کاریکردبوو کە باوەڕیان بە شۆڕشی چەکدار و ئازاری مرۆڤ و کوشتن نەبوو. وەک دواتر بە تەواوی تێگەیشتم، شۆڕش لە تێگەیشتنی ئەواندا لە دوو بەش پێکدێت، مانگرتنێکی گشتی و گەورەی هەموو کۆمەڵگا لە دەسەڵات، دووەم دروستکردنی کۆمەڵگایەک خاڵی لە ترس وە خاڵی لە هەموو جۆرە ئازاردانێکی مرۆڤ بۆ مرۆڤ. کۆمەڵێک خەڵکی یۆتۆپیست بوون کە هەرگیز نەیاندەتوانی ڕێگایەکی ڕۆشن بۆ جێبەجێکردنی خەیاڵاتە سیاسییەکانیان بدۆزنەوە، من ئەوکات بۆچوونەکانیانم بە ترسناک و لادەر و کوشندە دەزانی، باوەڕم وابوو مرۆڤ دەتوانێت دژی جۆرێک لە ترس و لە ئازار شەڕبکات، بەڵام خۆی گەر نەتوانێت ترسناک بێت، نەتوانێت ئازاری دوژمنەکانی بدات، چۆن دەتوانێت دونیا بگۆڕێت. باوەڕێکی قووڵم بەوەبوو مرۆڤ تەنیا دەتوانێت خۆی و هاوڕێکانی لە ترس و ئازار بپارێزێت... ئەرکی شۆڕشگێڕ، هەموو شۆڕشگێڕێک ئەوەیە کە پەرژینێک بەدەوری خۆی و هاوخەباتەکانیدا دروستبکات، هیچ کەس ناتوانێت ببێت بە پاسەوانی هەموو مرۆڤەکان، چونکە یاسای گەورەی خۆپاراستن ئەوە نییە لە ماڵی خۆتدا دانیشیت و چاوەڕوانی هاتن یان نەهاتنی دوژمن بکەیت، بە پێچەوانەوە ئەوەیە بێیتە دەرێ و بەرلەوەی پەلامارتبدەن پەلاماربدەیت، بەرلەوەی بتکوژن بکوژیت،

بەرلەوەی ئەو لە تۆ بەهێزتربێت، خۆت ئامادەبکەیت، بەر لەوەی زنجیر بکەنە دەست و پێت، زنجیر بکەیتە دەست و پێیان، بەرلەوەی بتکەن بە کۆیلە بیانکەیتە کۆیلە، بەر لەوەی پێبنێن بە پشتملتدا تۆ پێبنێیت بە پشتملیاندا... ئەوە یاسای ئەبەدیی پێکەوەژیانی مرۆڤەکان بووە و هەرواش دەمێنێتەوە. بولبولیار ڕۆمانسییەک یان یۆتۆپیستێکی خەیاڵاوی بوو، کە لە قووڵایی بیروڕاکانیدا باوەڕی وەها بوو مرۆڤ فریشتەیەک لە ناخیایەتی، ئەو فریشتەیە زیاتر لە هەموو یاساکانی سیاسەت و ئایین و ئابووری و ئەخلاق دەتوانێت یارمەتی مرۆڤ بدات بۆ باشکردنی ژیان، دواتر لە وتارێکی ناو گۆڤارەکەیاندا «کڵپەکان» پەرەگرافێکی درێژم لە نوسینی ئەو خوێندەوە کە گەر تەواو یادم بێت، ماناکەی بەوجۆرە لێرەدا دووبارە تۆماردەکەمەوە «شۆڕشگێڕ ئیشی ئەوەیە ئەو مرۆڤەی ئێستا ئازار دەکێشێت، لە ئازار دووربخاتەوە. ئەو کەسێکە لە نێوان جەلاد و قوربانیدا دەوەستێت، ناهێڵێت شمشێری جەلاد بگاتە گەردنی ئەوانەی بڕیارە بکوژرێن... ئیشی ئەوەیە لە نێوان بکوژ و کوژراودا بوەستێت، لەیەکیان جیابکاتەوە، نەهێڵێت بەریەکبکەون، تا دەگەینە ئەو ساتەی تێیدا جەلاد دەگاتە ئەو ڕاستییەی کە ئیتر پێویست ناکات کەس بکوژێت، جەلاد دڵنیادەبێت و ترسەکانی دەرەوێتەوە، جەلاد ئەو سامەی دەشکێت گەر وابزانێت نەبووە جەلاد دەبێت ببێتە قوربانی. جەلاد ئەوکات دەبێتە جەلادی ئەبەدیی کە دڵنیابوو گەر نەبووە جەلاد ئەویتر لە جێگای ئەو شمشێر هەڵدەگرێت و دەبێتە جەلاد... هەرکات دڵنیابوو کە ئەویتر نایەوێت ببێتە جەلاد لەوەدەکەوێت جەلاد بێت. شۆڕشگێڕ جەلادی جەلادەکان نییە، بەڵکو کەسێکە کاری ئەوەیە جەلاد ئارامبکاتەوە، هێمنیبکاتەوە، ترسی بشکێنێت، بڕوای بە خۆی و بە ئینسان بەهێزبکات، لە تەنهایی خۆی دەریبهێنێت، پێیبڵێت گەر شمشێرەکەی دابنێت و ببێت بە یەکێک لە ئێمە خۆشماندەوێت».

بۆچوونەکانی بۆ من کاریگەربوون، بەڵام خەیاڵی و ئەستەم، من تەواو پێچەوانەی ئەو دونیام دەبینی، شۆڕشگێڕ لای من ئەو کەسەبوو کە شمشێرێک دەداتە دەست قوربانییەکان و پێیاندەڵێت بەر لەوەی جەلادەکان سەرتان بپەڕێنن سەریان بپەڕێنن. هیچ شۆڕشێک بێسەرپەڕاندن نییە، گەر سەر نەتلێتەوە، گەر خوێن وەک تۆفان هەڵنەستێت، گەر خائینەکان تیرباران نەکرێن، هیچ لەم دونیایە ناگۆڕێت. شۆڕشگێڕ شمشێرێک دەداتە دەست قوربانی و دەڵێت سەری هەموو ئەوانەش بپەڕێنە کە لەوانەیە سبەی ببن بە مەترسی بۆ تۆ، پێیدەڵێت گەر نەبیت بە جەلاد هیچ ڕێگایەکت لە بەردەمدا نییە، ئەوە نەبێت کە ببیتە قوربانی. من و ئەو سەر بە دوو دونیای جیاواز بووین، من دەمتوانی وەک دوژمن و نەیار بێباک پێبنێم بە سەر هەر سەرێکدا و بڕۆم، پێبنێم بە سەری ئەو و هەر ئادەمیزادێکی تردا و چاولێکنێم و تێپەڕم، بەڵام لە سەرەتاوە هەستمدەکرد جگە لەم دوژمنایەتییە، شتێکی تر لە نێوانماندایە... ئەو شەوە لە توتنباغی چیرۆکی ئەو فریشتە ونە لە نێوانماندا سەریهەڵدا، ئێستا دڵنیابووم بەبێ بولبولیار ئەستەمە بگەمە هەقیقەتی خۆم. ئەستەمە بزانم من چیم، من کێم، ئەم باڵانەی پشتم چ مانایەکیان هەیە؟ بە جۆرێک لە جۆرەکان وەڵامی هەموو پرسیارە گرنگ و گەورەکانی ژیانم کەوتبووە دەستی ئەم کوڕە ڕیشن و هێمنە، کە لەم ساتەوە دەبوو ئاگاداربیم.

ئەو ڕۆژە کە هێرشێکی وا توندی کردە سەر شۆڕش، من ئارەزوویەکم نەبوو وەڵامیبدەمەوە، ئەوەی لە ڕووی سیاسییەوە ڕۆمانسییەکی بێکەڵک بوو، شتێکی لەو ڕاستییە نەدەگۆڕی کە من پێویستم پێیەتی. ئەوکات کە گیرابوو، بەمەبەستی ئەوە هاتبووەدەرێ، هاوڕێکانی لە ڕێکخراوەکەدا پەشیمانبکاتەوە، کە پێکڕا بڕیاریاندابوو واز لە خەونەکانیان بهێنن و لە ڕێگای ئێرانەوە بەرەو ئەورووپا بەڕێبکەون، تاکە دوو کەسێک ئەو

بیرۆکەیەیان قەبووڵ نەبوو، حەسیب و بولبولیار بوون، دواجاریش نەیتوانیبوو هەڤاڵە نائومێدەکانی پەشیمانبکاتەوە و تەنیا و تەنیا مابوونەوە، لەو ساتەدا کە حەسیب کوژرا، تەواوی ئەندامانی دیکەی ڕێکخراوەکە لە قەرەنتینەکەی ئۆردوگای پەناهەندانی کەرەجدا، نزیک تاران، چاوەڕوانی ئەوە بوون ئاغای شەهیدیی بەرپرسی ئەمنی ئۆردوگا، گفت و قسەیان لێوەربگرێت. دوای کوشتنی حەسیب و وەستانی گۆڤاری کڵپەکان و هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوە بچوکەکەیان، کە ئەمجارە بەتەمابوون بۆ خوێنڕشتن ژیان و مێژوو بگۆڕن. بولبولیار جارێکی تر نەگەڕایەوە بۆ ناو چوارچێوەی کاری گروهی... لەوە بەدواش زۆر تەنها بوو. من دوای دوو شەو مانەوەی دیکە لە زیندانی توتنباغی ئازادمکرد، ئازادکردنی ئاسان نەبوو، ماوەیەکی درێژبوو حیزب بەدوایەوە بوو. هەڤاڵ شێرخان گەرچی هیچ کات ڕووبەڕوو نەیدیبوو، بەڵام سڵێکی گەورەی لە ناوی دەکردەوە، ئەوەی حیزب ماوەیەکی درێژە لە دوای دەگەڕێت و بۆی ناگیرێت، ئەوەی توانیویەتی لە ناو شاردا بە نهێنی بژی، ئەوەی جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان شۆڕشگێڕەکانی حیزب و فاشییەکانی دەسەڵاتدا ناکات و ڕاشکاوانەش دەینوسێت، ئەوەی پێیوایە شۆڕش لە خوێنڕێژییەکی بێسوود و هیستیری و نەخۆشانەدا نوقمبووە، کردبووی بە نوێنەری جۆرێک لە ئادەمیزاد گەر تەشەنەبکەن و لەداهاتوودا ژمارەیان زۆربێت، بە ئەخلاقی پاسیڤ و لاوازپەرستی خۆیان شۆڕشگێڕان تووشی شۆکی ویژدان و هەرەسی ئیرادە دەکەن. بەڵام لای هەندێک لە سەرانی شۆڕش، بولبولیار هەر تەنها مەترسییەکی ڕەمزی نەبوو، بەڵکو نیشانەی زیرەکییەک و وردەکارییەکی خەتەرناکیش بوو. من ڕاپۆرتێکی زۆر نهێنی و تایبەتم بۆ سەرۆک نوسی و ئەو هۆیانەم ڕوونکردەوە کە وایانکردوە بولبولیار ئازادبکەم. دەمزانی گەر سەرۆک لە مەدا پشتم نەگرێت، لەگەڵ هەندێ لە بەرپرسەکانی تردا تووشی

دەردەسەرییەکی گەورەدەبم. بەوەدا دڵنیابووم سەرۆک نرخێکی گەورە لە سەر رازیکردنی دڵی عەشایەرەکان دادەنێت، درۆیەکم تاشی و کوشتنی هۆشەنگم وەها شوبهاند کە مەترسی ئەوەی لێدەکرێت حیزب لە شەڕی گەورەوە بئاڵێنێت. هەڵبەت نزیکی دایکی بولبولیارم لە بنەی گەورەی یەکێک لە عەشرەتەکانەوە بە هەلزانی و ئەو چیرۆکەم لێدروستکرد، کە کوشتنی بولبولیار خێڵەکانمان لێهاندەدات و تووشی دەردەسەریی گەورەمان دەکات. سەرۆک زۆر لەوەدەترسا دڵی عەشایەرانمان لێبڕەنجێت، شتی وەها لەرزی لێدەهێنا و خەو و خۆراکی لێحەرامدەکرد. من لە نامەکەمدا بۆ جەنابیان ئەوەشم باسکرد کە بولبولیار چیتر کەسێکی بێوەیە و ڕێکخراوەکەیان سەرلەبەر لێکترازاوە و بوون و نەبوونی بۆ ئێمە وەکو یەکە. نامەکەم بە شێوازێکی وەها وردەکار و ڕەوانبێژانە نوسی، کاریگەرییەکی خێرای لە سەرۆک کرد و بێئەوەی شتێکی ئەوتۆ ببیستمەوە، کێشەی ئازادکردنی بولبولیار بە هێمنی تێپەڕیی. هەرچەند لە ساڵانی دواتردا زۆرجار کە هەندێ لە کادێرانی زویر لە حیزب هەڵدەهاتن، کە دەکەوتنە هەڵدانەوەی پەڕە تاریک و ترسناکەکانی مێژووی حیزب، لە کۆڕ و مەجلیسی خۆیاندا، لە یاداشتەکانیاندا، کوشتنی حەسیبیشیان دەنایە ئەستۆی من و وا چیرۆکەکەیان دەگێڕایەوە کە من لەو شەوە ترسناکەی توتنباغیدا بولبولیارم ڕزگارکردوە و حەسیبم کوشتووە، ئەوان منیان وەک عەلی کیمیایی شۆڕش وێنادەکرد و هەندێکیان زۆربەی تاوانەکانی ئەو ساڵانەیان بە منەوە دەنوساند. من ئەوە ناشارمەوە کە ڕزگارکردنی بولبولیار لای من هۆیەکی زۆر نهێنی و پاڵنەرێکی زۆر تاریکی هەبوو، هەمیشە دەستێکی نادیار وایدەکرد خۆم لە ئازاردانی ئەو بپارێزم. بەر لە ئازادکردنی لەگەڵیدا ڕێکەوتم و پەیمانم لێوەرگرت هەرکات شتێکی زانی و بوونەوەرێکی باڵداری بینی، ئاگادارمبکاتەوە... هەستمکرد ئەوەی ژیانیم ڕزگارکردوە، دووبارە تەمەنم بۆ نوسیوەتەوە، کاریگەرێکی بەهێزی

نییە و دوای ئەو شەوە ڕەنگە پتر قێزی لە من بێت و خۆی لە سێبەرم لابدات، دڵنیابووم بە شتێک لە نەفرەتەوە لێمدەڕوانێت و وەک یەکێک دەمبینێت کە دونیام پڕ لە ئازار کردوە. بەڵام لە پاڵ ئەو نەفرەتە قووڵەدا لە کەسی خۆم، هەستمکرد زۆر بۆی گرنگە لە باڵەکانم تێبگات.

من لەو شەوەوە دەبوو بولبولیار لە هەموو بەڵایەک بپارێزم، چونکە ئیتر چەندە باڵەکانم گەورەبانایە، چەندە بینراوتر و سپیتر و ڕۆشنتر دەربکەوتبانایە، من ترسم زۆرتر و نائارامیم قووڵتر دەبووەوە. لەو دەمەدا هەر کارێکی گرنگم بۆ شۆڕش ئەنجامبدایە، هەمیشە چرکەیەکی نهێنی لە ناخمەوە دەهات، چرکەی ترازانی ددانی قفڵێکی گەورە کاتێک یەکێک ژمارەیەکی ڕاست لێدەدات و هێدی هێدی کرانەوەی دەرگایەکی گەورە و ئەستوور و نەباز زامندەکات.

# چۆن دکتۆر موستەفا شوکاك یەکەمجار فریشتەی بینی؟

لە زیندانی ئەمن، دکتۆر مستەفا شوکاکیان بە جۆرێکی دڕندانە ئەشکەنجەدا، بەوەدا دکتۆر شتێکی نەدەزانی ددانی پێدابنێت و نهێنییەکی نەدەزانی بیدرکێنێت، ماوەی ئەشکەنجەدانی درێژتر و درێژتر دەبووەوە، لەو ماوەیەدا لیڤیتانت هەندێجار لەگەڵ جەلادە عەرەبەکاندا بەشداری ئاهەنگەکانی ئەشکەنجەدانی دەکرد. لیڤیتانت هەر لەوانەوە فێربوو چۆن نینۆک دەربهێنێت، چۆن ئاو دەرخواردی زیندانەکان بدات و توند زەکەریان ببەستێت تا دەگاتە ئەوەی میزەڵدانیان بتەقێت، چۆن مرۆڤ ئوتودەکات، چۆن وەک جلی پیس هەڵیدەخات، چۆن وەک پشتێن دەیچەرێنێت، چۆن وەک گۆرەویی دەیگووشێت، چۆن وەک پێڵاو

بزمارڕێژیدەکات. لیڤیتانت تادەهات لە سەردەستی عەرەبەکانەوە وانەی ئەشکەنجەدانی زیاتر دەخوێند. زۆرجار دوای ئەشکەنجەدان، دەچووە ژوورەکەی دکتۆر و ئەو هەواڵانەی پێدەگەیاند کە لە سەر ژنەکەی دەیزانێت، لە سەر ڕاکردنی، لە سەر نیشتەجێبوونی لە دەمبۆران، لە سەر شەڕی هەڤاڵ شێرخان و شێخ جافەرانی لە سەری. هەموو جارێکیش پێیدەگووت «ئەو ژنە ئیتر موڵکی تۆ نییە، گەر ڕۆژێک لەدەست ئەو دەستەوتاقمە ترازا، دەکەوێتە دەستی من، لە بەرئەوە ژنەکەت لە بیربکە». دکتۆر تا لە زیندان نەهاتەدەرێ بڕوای نەکرد و نەیزانی هەموو قسەکانی لیڤیتانت و هەموو حەرفێکی کە دەربارەی نەغەدەی ژنی گووتوێتی دروستبوون. دوای شەش مانگ ئەشکەنجەی بەردەوام، بەعسییەکان لە سەر ڕۆشنایی ڕاپۆرتی پیاوانی خۆیاندا لە ناو شۆڕشەوە، گەیشتنە ئەو بڕوایەی دکتۆر هیچ نازانێت و خۆی پەیوەندییەکی بە ڕێکخراوەکەوە نییە و کاری ئەو و کاری ژنی دوو شتی جیاوازن. کە دکتۆر هاتەدەرێ تارماییەکی بێڕۆح بوو، ئەو شەش مانگە هەموو هێز و جوڵە و تواناییەکیان تێدا کوشتبوو، لە هەر شتیش کوشندەتر ئەو چیرۆکانە بوو کە ناسیاوەکانی دەربارەی نەغەدە بۆیان دەگێڕایەوە. لەو شەش مانگەدا توانیبووی یەک شت بکات، دۆخی ڕۆحی خۆی لە ناوەوە هێندە قایمبکات بتوانێت جارێکی تر بەرگەی ژیانی سەر زەوی بگرێتەوە. کە بە زامداری و وەک نیوە مردوویەکی هەڵهاتوو لە دۆزەخ گەیشتەوە ماڵێ، دەرگای ساڵۆنەکەی شکاند و چووە ژوورێ. هەر بە یەکەم نیگای لە ساڵۆنە دێرین و ئارامەکەی جاران، تێگەیشت کە نەغەدەی چەند خۆشدەوێت، چەند بیریدەکات، چەند ئارەزوویدەکرد ئێستا لە ئامێزیدا بێت. یەکەم تەلەفۆنی لەگەڵ دکتۆر جەلال ماردینیدا کرد، لەو زیاتر هیچ کەسێکی لە دونیادا شک نەدەبرد هەواڵی ژنەکەی خۆی لێبپرسێت، دەنگی دکتۆر جەلال تێکشکانێکی قووڵ و حەسرەتێکی

گەورەی تێدابوو، ئەویش لەو ماوەیەدا لە پیاوێکی بە ویقارەوە بووبوو بە کەسێکی بێهەیبەت و تێکشکاو، باوکێکی شەرمەزار کە شۆڕشگێڕێتی و شاعیرێتی کچەکەی لە لای بەرتەقای ئەو بەدناوییە نەبوو کە ئێستا لە هەموو جێگایەک بەدوایەوە بوو، بە غەمێکی زۆرەوە چیرۆکی ڕۆیشتنی نەغەدەی لەگەڵ نزار ئیدریسدا بۆ گێڕایەوە و بە دەنگێکی پیر و نوساو کە هیچی لە دەنگی ئەو دکتۆر جەلالەی جاران نەدەچوو، گوتی «نەغەدە لەبیربکە. کوری خۆم نەغەدە لە بیربکە، ئەوەی لە نێوان ئێمە و تۆدا هەبوو تەواو». ڕۆژانی دواتر دکتۆر شوکاک ڕۆشن و ڕوونتر ڕاستی هەموو قسەکانی لیڤیتانتی بۆ دەرکەوت. ئێستا دەچووە هەر جێگایەک چاوانی خەڵک بەدوایەوە بوون، چرپەچرپیانی دەبیست، شێوەی سەیرکردنیان پڕبوو لە گومان و بەزەیی و سووکایەتی. تا نەگەڕایەوە بۆ خەستەخانە بە تەواوی نەیزانی کەوتۆتە چ جەهەنەمێکەوە و چۆن بۆ ئەبەد پایەکانی ژیانی ڕووخاون و بووە بە کەسێک ناتوانێت جارێکی دی وەک جاران قایم و دڵنیا لە سەرپێی خۆی بوەستێت.

ژیانی بیمارستان بۆ دکتۆر جەهەنەمی تەواو بوو، نەیزانی ئەو هەموو هەفتە و مانگە ترسناکانەی چۆن بردە سەر. مستەفا شوکاک، پێیان دەگووت مێردی ژنە هەڵگیراوەکە، دکتۆرە ریسواکەی بیمارستان، ئەو پیاوەی نەخۆش و یاوەری نەخۆش هەموو سەیریدەکەن و کە دەیبینن دەکەونە چرپەچرپ، کوڕە ناسک و جوانەکەی جاران کە ئێستا جگە لە نیگایەکی تێکشکا و دڵێکی تێکشکاو خاوەنی هیچ نییە. بەڵام نازانم بڵێم لە بەدبەختی ئەو بوو یاخود لە خۆشبەختیدا کە ئاگری ترسناکی جەنگ بڵێسەی سەند، ئیدی دەبوو وەک دکتۆرێکی سەرباز پەیوەندی بە بەرەکانی شەڕەوە بکات. لەو ماوەیەدا کە لە بیمارستان بوو، ڕۆژێک نەوا ماردینی خوشکی نەغەدە هات بۆ لای، لە ڕاستیدا

نـەوا نەیدەزانـی بۆچـی چـووە بـۆ لای ئـەم پیـاوە، چ کارێکـی پێیەتـی، دەیەوێت چی پێبڵێـت، بـەڵام ئارەزوویەکـی قووڵـی هەبـوو دوای ئـەو زیندانـە دووروودرێـژە دکتـۆر شـوکاک ببینێـت، شـتێکی نهێنـی دەیجوڵانـد بزانێـت، دوای ئـەو ئـازارە ترسـناکانەی بینیویێتـی، دکتـۆر چـی بـە سـەرهاتووە، دەموچـاوە منداڵانەکـەی مـاوە، پێکەنینـە پاکەکـەی مـاوە، بـاڵا باریکەکـەی وەک خۆیەتـی؟ لـە دڵـی خۆیـدا دەیویسـت یەکجـار ماچیبـکات و پێیبڵێـت گـەر منـت بخواسـتایە هەرگیـز ژیانـت بەوجـۆرە نەدەبـوو، بـەڵام دڵنیابـوو نەدەتوانێـت ماچیبـکات، نەدەتوانێـت ئـەو قسـە بێمانایەشـی پێبڵێـت. لـە بەرئـەوە تەنیـا دەچـوو بـۆ ئـەوەی بیبینێـت، بـۆ ئـەوەی ئـەو فزوڵـە کچانـە کوشـندە و خنکێنـەرەی خـۆی بمرێنێـت، بـۆ ئـەوەی ناچاریبـکات هەسـتبکات ئـەم نەغـەدەی خوشـکی نییـە، ئـەم کەسـێکی تـرە، کچێکـی تـرە، دڵێکـی تـری هەیـە، قووڵیـش وەک هـەر کەسـێک لـە نزیکـەوە ئـاگاداری هەمـوو شـتێ بێـت هاوسـۆزی دەردێتـی... سـەرەتا زۆر دەترسـا دکتـۆر دەریبـکات، دڵنیابـوو لـە ناخـی دڵـی خۆیـدا نەفـرەت لـە هەمـوو ماردینییـەکان دەکات. بـەڵام دکتـۆر کوڕێکـی بەڕێـز و هێمـن بـوو، توانـای ئـەوەی نەبـوو لەگـەڵ کەسـدا وەهـا ڕەق و لێخـوڕ بێـت، شـەرمنی و هێمنییەکـەی ڕێـگای ئەوەیان لێدەگـرت ڕووبـەڕوو کـەس بشـکێنێت و ئـازاری هیـچ بوونەوەرێـک بـدات. ڕاسـتە دانیشـتنەکەیان سـارد بـوو، نـە نـەوا ویسـتی قسـە بـە خوشـکەکەی بڵـێ لەبـەر دڵـی دکتـۆر و نـە دکتۆریـش ویسـتی قسـە بـە ژنەکـەی بڵـێ، لەبـەر دڵـی نـەوا. هەردووکیـان هەنـدێ شـتی گشـتیان گۆڕییـەوە و نـەوا گووتـی کـە ڕۆژانـی زینـدان زۆر غەمـی ئـەوی خـواردوە و بـە دڵنیاییـەوە سـەلامەتی ئـەوی وەک سـەلامەتی خوشـکەکەی لاگرنـگ بـووە و هەرچییـەک بووبێـت و هـەر چییـەک ببێـت ئـەوا جێـگای ئـەو لای ئـەم تایبەتییـە. دکتـۆر هەمـوو قسـەکانی وەک میهرەبانـی خانمێکـی ناسـک و دڵگـەورە وەرگـرت کـە بـە ڕاسـتی لـە میحنەتـی تێـدەگات و بـە سوپاسـێکی زۆرەوە سـەردانەکەی

نەوای خێرا کۆتایی پێهێنا و وەهاش ماڵاوایی لێکرد وەک ئەوەی ئەوە دوا یەکتر بینینیان بێت. لە ڕاستیدا دکتۆر لە حاڵێکدا نەبوو بتوانێت بیر لە ئافرەتێکی تر یان هەر بە گشتی بیر لە ئافرەت بکاتەوە، نەخوازا بیر لە خوشکی ئەو ژنە بکاتەوە کە ئەو هەموو بەدبەختی و شەرمەزارییەی بە سەردا هێناوە. چەند هەفتەیەک دوای ئەو سەردانەی نەوا، دکتۆر لە پاسێکی درێژدا بە ڕێگاوە بوو بۆ یەکەم بیمارستانی مەیدانی لە گۆڕەپانە خوێناوییەکانی جەنگدا. ساڵانێک دواتر کە ئەزموونی ئەو چەند ساڵەی جەنگی بۆ گێڕامەوە، گەرچی من خۆم منداڵی ناو خوێن و کوشتن و برین بووم، بەڵام گەورەیی کارەساتەکە و سامناکی دیمەنەکان، منیشیان لە ناخەوە هەژاند و بە بیستنی چیرۆکەکانی، چاوانم پڕبوون لە فرمێسک، شتێک دواتر دەمگێڕایەوە بۆ بەلاغەتی غەمگینی دکتۆر، نەوەک بۆ ناسکی و پڕ سۆزی دڵی خۆم. دکتۆر وەک دەیگووت لە بیمارستانەکانی جەنگدا دەموچاوی ڕاستەقینەی ژیانی بینیبوو، لەو بیمارستانانەدا سەدان دەست و قاچی پەڕیوی بینیبوو، لەوێ ئیشی بەیەکەوە نوساندنەوەی مرۆڤی هەلاهەلا بووە، بەڵام ئەوەی لە جەنگدا تەواو دکتۆری هەژاند، بینینی فریشتەکان بوو. یەکەمین فریشتەی لەخەستەخانەی عەسکەری کوت بینی. شەوێکیان سێ ژەنراڵی بریندای سوپایان هێنا، دکتۆر لە سەر تەختی ژووری نەشتەرگەرییەکە یەکێکیانی بینی و بۆ ساتێک وڕی و گێژییەکی لەناکاو دایگرت، سەرەتا وایدەزانی چاوانی تێکەڵوپێکەڵ و ڕێشکەوپێشکە دەکەن، ژەنراڵەکە دوو باڵی زۆر گەورەی هەبوو، زۆر، بەڵام دکتۆر شوکاک سەرنجیدا کە جگە لەو هیچ کەسێکی تر لە تیمی پزیشکییەکە ئەو باڵانە نابینن. دوای نەشتەرکارییەکی درێژ، ژەنراڵەکە نیوەشەو لە پێخەفی خوێناوی خۆیدا مرد... کە دکتۆر چووە سەر لاشەکەی تادوا ڕاپۆرتی خۆی بنوسێت، باڵەکان نەمابوون. دکتۆر لە هیچ شتێک تێنەگەیشت، لە هیچ شتێک.

کـۆی دیمەنەکانـی بـە دەرەنجامـی ماندووبوونێکـی قـووڵ و بـە سـەرەتای لەدەسـتدانێکی سروشـتی و چاوەڕوانکراوی عەقڵـی خـۆی لەقەڵەمـدا، بـەڵام دواتـر کـە دابەزییـە نـاو سـاڵۆنی گـەورەی بیمارسـتانەکەوە سەراسیمەبوونی دەیانجار گەورەتـر بـوو، لـە سـاڵۆنەکەدا مەخلوقێکـی ماندوو و سـپی و زامدار و باڵـداری گـەورەی بینییـەوە، فریشـتەیەک کتومـت بـە ژەنـراڵ دەچـوو، هەمـان دەموچـاوی هەبـوو، وەک ئـەوەی ژەنـراڵ لـە قاوشـەکەدا مردبێت و لـە سـاڵۆنەکەدا بەوێنـەی فریشـتەیەکی نـوێ زیندووبووبێتـەوە. دکتـۆر سـەرەتا وای بەخەیاڵـدا هـات ئـەو دیمەنەی ئەو بەرابەری سەراسیمە وەسـتاوە، سـاتی وەرگەڕانـی مەخلوقێکـە لـە ئادەمیـزادەوە بـۆ فریشـتە. بـەڵام فریشـتەکە لـە بوونەوەرێکـی خودایـی پـاک و نـوێ نەدەچـوو، بەپێچەوانـەوە لـە سـوچێکی سـاڵۆنەکەدا وەک هـەر نەخۆشـێکی دیکـەی نـاو ئـەم بیمارسـتانە مەلعونـە مانـدوو کەوتبـوو. وەک نەتوانێـت بجوڵێـت، وەک ئەویـش دوا سـات و دوا چرکەکانـی ژیانـی خـۆی بـژی... دکتـۆر کۆمەکیکـرد و چـووە ژێرباڵـی و بێئـەوەی کـەس ببینێـت خستییە ڕەدهەیەکـی چۆڵـەوە و داپۆشـی و لـە ئەجزاخانـەی خەسـتەخانە هەنـدێ دەرمـان و گیـراوەی هێزبەخشـی هێنـا و بـە هێمنـی دەرخـواردی دا... فریشـتەکە هەمـان دەموچـاوی ژەنراڵـی هەبـوو، بـەڵام هێمنتـر و نەرمتـر دەردەکـەوت، ژەنـراڵ تـا سـاتی مردنـی ڕوخسـارێکی عەسـکەری ڕەق و بێگیانـی بـوو، لـە سـاتی مردنیشـدا هێشـتا هـەروا دیاربـوو وەک لـە مەیدانـی جەنگدا ڕاسـت و چـەپ فەرمانـی هێـرش دەربـکات، بـەڵام فریشـتەکە لـە کەسـێکی نائومێـد و غەمگیـن و پەژمـووردە دەچـوو.

فریشـتەکەی ژەنـراڵ، یەکەمیـن فریشـتەی ژیانـی دکتـۆر بـوو، شـەو دکتـۆر بـە هـۆی ماندووبوونـی ڕۆژەوە خـەوت و تـا نزیکـی خـۆر کەوتـن بـە ئاگا نەهاتـەوە. کـە بـە ئـاگا هاتـەوە ڕاسـتەوخۆ چـووە ڕەدهـە چۆڵەکـەوە و فریشـتەکەی بینـی.. فریشـتە مانـدوو زامدارەکـەی شـەو، فریشـتەی ژەنـەراڵ،

وەک ئەو چۆن بەجێیهێشتبوو، چۆن دایپۆشی بوو، مردبوو.

فریشتەکەی ژەنراڵ مرد بێئەوەی هیچ نهێنییەک بۆ دکتۆر موستەفا شوکاک ئاشکرابکات. بەڵام ئەوە سەرەتای دەرکەوتنی تواناکانی دکتۆر بوون بۆ بینینی سەربازە باڵدارەکان و فریشتەکانیان. لەو ڕۆژە بەدواوە لە بەرەکاندا، لە ناو بیمارەکاندا، لە ناو ئۆردوگا و شوێنی کۆبوونەوەکانی سوپادا، مەخلوقی باڵداری دەبینی، بێئەوەی تێیانبگات و یاخود بزانێت چی لەم دونیا سەیرەدا دەگوزەرێت. دواجار بەر لە گواستنەوەی بۆ بیمارستانی سەربازی شاری خۆمان بە مانگێک، دکتۆر ئەو تەنیا فریشتەیەی بینی کە لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە بۆ شار. فریشتەیەکی گەنج بوو ناویان نا ئەبدائیل، فریشتەی مولازمێک بوو، بە تەنیا لە بیمارستان بەجێمابوو، دکتۆر لە ڕیواقە گەرمەکانی هاویندا چەندین جار بە پەشۆکاوی بینیبووی، بێئەوەی بوێرێت خۆی لێنزیکبکاتەوە. بەڵام شەوێکیان، دوای ڕۆژێکی پڕ لە ئیش و عارەقە و جەنجاڵی، گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی لە بیمارستان، دەرگاکەیکردەوە، گڵۆپی ژوورەکەی هەڵکرد، بینی ئەو فریشتەیە خەستە و نیوەگیان لە سەر جێگاکەی ئەم خەوتووە. دکتۆر بەبینینی ئەم فریشتەیە لە پێخەفی خۆیدا، هێندەی تر بێچارە و دەستەپاچە بوو، نەیدەزانی چی بڵێت و چی بکات، ئایا هەڵیبستێنێت یان لێیگەڕێ بخەوێت؟... ئەو شەوە دکتۆر بۆ خۆی جێگایەکی لە سەر زەوییەکە ڕاخست و لە ئەبدائیل گەڕا تا بەیانی هێمن و ئاسوودە بخەوێت. بەیانی بۆ یەکەمجار دڵنیابوو ئەم فریشتەیە زمانی هەیە و دەتوانێت قسەبکات. فریشتەکە هەقیقەتی خۆی بۆ ئاشکراکرد و چیرۆکی خۆی بۆ گێڕایەوە، یەک یەک هۆکانی هەڵهاتنی خۆی بۆ بەیانکرد. دیارە دکتۆر هەر وایدەزانی لە خەودایە، وایدەزانی جەنگ کاری لە عەقڵی کردوە و تووشی دۆخێکی شیزۆفرینی بووە. تا ماوەیەکیش ئەبدائیلی تەنیا بە دەستکردی فەنتازیا نەخۆشەکانی خۆی

و حوکمە هەڵەکانی خەیاڵ دەزانی، پێیوابوو ئەم فریشتەیە دەستکردی ئەندازیارێکی ناوەوەی خۆیەتی تا هاوسەنگییەکی خەیاڵی لە نێوان چاکە و خراپەی مرۆڤدا بۆ ڕابگرێت.

ئەزموونی ساڵانی ڕابوردووی دکتۆر بە کێشانی نیگارێکی تاڵ و ترسناک بۆ مرۆڤ دوایی هاتبوون، خیانەت، زیندان، ئەشکەنجە، جەنگ، هەلاهەلابوونی ئینسان، تەنیایی، پوچی... دکتۆری بەستەزمان لەوە زیاتر چی لە ژیان و لە دۆستان بینیبوو. دکتۆر تووشی جۆرە نائومێدی و ڕەشبینییەکی وەها ترسناک بووبوو، جگە لە ئارەزووی مردن، ئارەزوویەکی تری نەبوو. چەندجارێک هاتبووە سەر بڕوای خۆکوشتن، بەڵام ترسنۆکییەکی نهێنی و بێهێزییەکی قووڵ و هەست بە پوچییەکی کوشندەتر لە پوچی ژیان دەستیان دەگرت و نەیاندەهێشت خۆی بکوژێت. بەڵام ئەو ڕێگا جەهەنەمییەی دکتۆر پێیدا هاتبوو، ئەو هەموو ئازار و سووکایەتییەی پێیکرابوو، ئەو سەرپێدانان و ڕیسواکردنەی تاسەر ئێسقان چەشتبووی، گەیاندبوویانە ئەو بڕوایەی مرۆڤ بوونەوەرێکی نارێک و ژیان دەڤەرێکی کوشندەیە. ئێستا دەرکەوتنی ئەم فریشتەیەی بە سەرەتای شێتبوونێکی پێویست و ناچار دەزانی تا بتوانێت بژی. دکتۆر لەو ماوەیەدا بەردەوام دەستی لە سەری خۆی دەدا و دەیگووت «شێتبووم، زۆر باشە کە شێتبووم، باشترین شتە کە شێتبووم». زۆرجار دکتۆر و تیمارپێچ و نەخۆشەکان دەیانبینی سەری داخستووە و دەڕوات و لەبەر خۆیەوە دەڵێت «شێتبووم». لەیەکەم ساتەوە دونیای فریشتەکانی وەک دونیایەکی ناوەکی و تایبەتی خۆی سەیرکرد، وەک بەشێک لە شێتییەک کە دەتوانێت لە ژێر ددانی ئەو مەکینە گەورەیە دەریبهێنێت کە ناوی عەقڵە. چیرۆکەکانی «مولازم ئەبدائیل» «کە بەردەوام وای ناودەنا»، لای دکتۆر جێگای باوەڕ نەبوون، پێی زەحمەت بوو باوەڕ بەبونی فریشتەیەک بکات لە ئینساندا، بەڵام ئەبدائیل هێنایە

سەر ئەو بڕوایەی گەر فریشتەیەک لە ناخی ئەویشدا نەبێت، چۆن دوای ئەو چارەنوسە ڕەشە، دوای ئەو هەموو ئازارە ناهەقە، دوای ئەو هەموو خەنجەرە کوشندەیەی سەر دڵ، دەتوانێت ژیان ڕزگاربکات و ڕێگا لە ئازاری ئەوانی تر بگرێت. تاکە تەفسیرێکی دکتۆر ئەوبوو کە ئەم ساڵ دوای ساڵ شێتتر دەبێت، ئەو شێتییەشی کۆمەکیدەکات نەرمو نیانی خۆی نەدۆڕێنێت. ئەو تاکە دکتۆرێکی بیمارستان بوو بە هەموو هێز و کەرەستەیەک هەوڵیدەدا ئەوانی تر ئازاریان نەبێت، گەرچی خۆی باوەڕی بە مرۆڤ و ژیان نەمابوو، بەڵام بەردەوام بەخۆی و بیستۆکە پزیشکی و بەروانکە سپییەکەیەوە لە ڕاکردندابوو بۆ ئەوەی ئازاری ئەوانی تر کەمبکاتەوە و هانیانبدات بژین و بڕوای خۆیان وەک ئەو بە مرۆڤ لە دەست نەدەن. هەموو دەیانبینی هەفتە دوای هەفتە بارودۆخی دەرونی دکتۆر بەرەو خراپی دەڕوات، دکتۆر زۆر لە شێتی نزیکدەبووەوە. بەوەدا بەڕێوەبەری خەستەخانە هاوسۆزی بوو، گەلێک دڵی بە چیرۆکە غەمگینەکەی دەسووتا، زۆر هەوڵی بۆدا بیگوازێتەوە بۆ شارەکەی خۆی و لەوێ سوچێکی هێمنی لە خەستەخانەی سەربازی بدەنێ. دوای چەند هەوڵێک، ڕۆژێک عەقید نەجەفی فەرمانی گواستنەوەکەی دایە دەست، لەوێ پێویستیان بە دکتورێک بوو کوردی و عەرەبی باش بزانێت، دکتۆریش کەسێکی گونجاو بوو بۆ ئەو پۆستە. ئەو فەرمانە بۆ چەند سەعاتێک دڵی دکتۆری زۆر خۆشکرد، بە خۆشبەختییەکەوە کە لە مێژبوو نەیدیبوو باوەشی بە مولازم ئەبدائیلدا کرد « هەڵبەت نازناوی مولازم ئەبدائیل درەنگتر پەیدابوو» پێیگووت «عەبد، خۆشبەختانە دەگەڕێینەوە بۆ باکوور». گەرچی دکتۆر دەیزانی لەوێ هەموو دووبارە وەک کەسێکی بێکەرامەت تەماشایدەکەن، وەک پیاوێکی سووک و بێجورم، وەک یەکێک کە حیکایەتی ژنەکەی بەسە تا هەتاهەتایە بیشکێننەوە و سووکایەتی پێبکەن، وەک ژنحیزێکی ئەبەدی. بەڵام هەرچۆنێک بێت

ئەو زەلیلییەی لەم دونیا زۆر خوێناوییەی خەستەخانەی عەسکەری کوت لاچاکترە، لە ناو ئەم هەموو دەست و سەر و قاچە پەڕپوانەدا چیتر نەیدەتوانی بژی. گەر بگەڕێتەوە شار، هەندێک شەو دەتوانێت پشوویدات، خۆی مەستبکات، لە جێگایەکدا بنوێت و خوێنی سەرباز و ئەفسەرە زامدارەکان هەوای ژوورەکەی بە بۆی مردن پڕنەکەن... لە هەموو شتێکیش گرنگتر لەوانەیە شتگەلێکی نوێ دەربارەی نەغەدە بزانێت کە دەیەوێت بیزانێت.

هەرچی پەیوەندی بە نەغەدە ماردینییەوە هەیە، دکتۆر دۆخێکی دەرونی ناکۆکی هەبوو، ئەو سەدەها شەو بیری لە هەموو چرکە و ساتەوەختەکانی ژیانی خۆی لەگەڵ ماردینیدا کردبووەوە، سات بە سات بە سەر هەموو شتێکدا چووبووەوە، لە ساتی مارەکردنەوە تا ئەو دەقیقەیەی ئەم بە دەستی پیاوەکانی لیڤیتانتەوە لە بەردەرگای مالی خۆیان گریا. گەیشتبووە ئەو بڕوایەی نەغەدە لە هیچ چرکەیەکدا لەگەڵ ئەودا نەبووە، بە درێژایی ماوەی ژن و مێردایەتیان دیوارێکی گەورە لە ناخی نەغەدەدا بووە، هەمیشە ئەمی لە پشت بەربەستێکی شوشەیی ئەستوورەوە بینیوە کە نەدەنگی و نە ڕەنگی نایگاتێت. دکتۆر لە قوولایی ناخیدا هێشتا نەغەدەی خۆشدەویست، بەڵام بەردەوام لە خۆشی دەپرسی چۆن دەتوانێت دوای ئەو هەموو شتە، کەسێکی وەهای خۆشبوێت. وەک هەموو ئەو پیاوانەی کە میهرەبانیان دەیانکوژێت، وەڵامێکی نەبوو. هەموو جارێک دەیگووت «ئاخ لە دەست ئەو مرۆڤانەی میهرەبانی خۆیان دەیانکوژێت.. ئاخ». خۆشەویستییەکەی بەوجۆرە نەبوو، وەک ئەوەی جارێکی تر بتوانێت لەگەڵ نەغەدەدا بژی یان هەوڵی نزیکبوونەوە بدات، نا.. خۆشەویستییەکەی جۆرە هەستێکی تاریک بوو، وەک ئەوەی لە سەرەتاوە ئەم هەموو هەڵە گەورەکانی کردبێت، وەک سەرزەنشتێکی

ڕۆحی بۆ تاوانێک کە نەیکردوە، تاوانێک پێویستە بەردەوام لە بەردەم خۆیدا دانی پێدابنێت، وەک هەوڵێکی گەورە بۆ پاککردنەوەی نەغەدە لە هەر گوناهێک. دواجار بەردەوام ئەو خواستەش لە سەریدابوو کە لە سەری هەموو عاشقێکی نائومێد و تێکشکاودایە... بمرێت بۆ ئەوەی هەموو شتێکی لەبیربچێتەوە، بمرێت بۆ ئەوەی لە ڕێگای مردنی خۆیەوە ئەو ساتانەش بسڕێتەوە کە لە نێوانیاندا بووە، ئەو ساتانەی لای ئەم نەبێت لای هیچ کەسی تر نرخیان نییە، بمرێت بۆ ئەوەی لە داهاتوودا نەیبینێتەوە، بمرێت بۆ ئەوەی لەگەڵیدا هەموو ئەو شوێن و شەقام و کوچانە بمرن کە ئەوی بەیادا دەهێننەوە، بمرێت بۆ ئەوەی لەگەڵ مردنیدا ئەوانی تریش نەغەدە لە یادبکەن... دەیزانی تا ئەم بمێنێت، بە هەر کوچەیەکدا بڕوات، لە هەر بیمارستانێک ئیشبکات، هەر کەسێکی تری خۆشبوێت، هەموو دەمودەست نەغەدەیان بیردەکەوێتەوە. هەموو وەک پیاوێک سەیریدەکەن ژنەکەی لەدەستی هەڵهاتووە، کەس وەک ڕۆحێکی بێگوناهی تێکشکاو نایبینێت، بەڵکو وەک پیاوێکی شەرەفشکاو، وەک مێردێکی خەڵەتاو، وەک بودەڵەیەکی بێسەنگ. چەندەها شەو شفرەی تیژی نەشتەرگەرییەکەی لە شادەماری خۆی نزیکدەکردەوە و توانای ئەوەی نەبوو خۆی بکوژێت، چاوی لێک دەنا و هەموو ئیرادەی خۆی کۆدەکردەوە و دەیویست ئەو شادەمارە ببڕێت کە دەبوو بیبڕێت و نەیدەتوانی. دکتۆر لەو مەخلوقاتانە بوو کە نەیدەتوانی ئازاری کەس بدات، هەتا ئازاری خۆشی... دەیزانی ئەم لاوازییەی، ئەم نەرمییەی، ئەم سەروڕوخسارە منداڵانەیەی کە پێناچێت هەرگیز شێوەی پیاوێکی کامڵ وەربگرێت، بە کۆ و پێکڕا وایانکردوە نەبێتە ئەو پیاوەی خەیاڵی ژنانەی نەغەدە بۆی گەڕاوە. پیاوێکی هار، بەهێز، دڕ. ئەو بە درێژایی ژیانی جگە لە قوتابییەکی زیرەک، دکتۆرێکی باش، مێردێکی شەرمن کە بەدوای ژیانێکی هارمۆنی و هێمندا گەڕاوە هیچی تر نەبووە. هەمیشە

عەودالّی ژیانی ئاسوودەی دکتۆرێک بووە کە دەزانێت پیشەکەی نرخی زێڕی هەیە، پیشەکەی سیحرێکی دەداتێ کە پیاوانی دی نیانە. «دکتۆۆر» کێ هەیە لە بەردەم ئەم وشەیەدا خۆی بگرێت، چ ژنێک هەیە ئەژنۆکانی خاونەبنەوە. لەو شەوانەدا کە دەیویست شادەماری خۆی ببڕێت، دەیویست لە سەر ئەو وەهمە گەورە سزای خۆی بدات کە واتێگەیشتبوو هەموو ژنانی دونیا بەختەوەرن، گەر ببنە ژنی دکتۆر، ئیتر بیری لە هیچی تر نەکردبووەوە. بەڵام دەبوو چی بکات؟ هەڵەکە بەتەواوەتی لە کوێدایە؟ نەیدەزانی. هەندێجار، دوای دەیەها نەشتەرگەری قورس، بەبۆنی دەرمان و خوێن و عارەق و باروتەوە دەگەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، بەروانکە سپییەکەی فڕێدەدا، دەرگاکەی دادەخست، بە ئەسپایی سەریدەخستە سەر بالیفەکە و دەکەوتە سەیرکردنی بنمیچی ژوورەکە، ئەو کات تەنیا یەک پرسیار لە خەیاڵیدا دەسوڕایەوە «ئاخۆ دەیتوانی ببێت بە نزار ئیدریس... دەیتوانی ببێت بەو کوڕە چەقۆکێشەی ژنەکەی حەزی لێکردوە؟»». دڵنیابوو ناتوانێت، ئەو لە سەرەتاوە سروشت و خودا و خێزان بەوجۆرە دروستیانکردبوو کە ببێت بەم دکتۆرە بریندارە، بەم پیاوە کە ئەگەرچی لە سەردەمێکدا خۆی بە پادشای ئەو سەردەمە تازانە دەزانی کە هێدی هێدی لەدایکدەبن، خۆی بە پێشەنگی سەرهەڵدانی جیهانێکی نوێ دەبینی. جیهانی پیاو و ژنە پاکوتەمیزەکان، لە بەروانکە سپییەکانیاندا، لە قاتەکانیاندا، لە قیافەتی قەڵەمی و خۆگۆڕینی ڕێکپۆشیاندا، دونیای دکتۆر و ئەندازیارەکان، دونیای خۆبادان بە بڕوانامەکانی زانکۆوە. بەڵام نا دکتۆر شوکاک هێشتا زووە، چەشنە پیاوێکی تر هەن کە سەرنجڕاکێشترن، شەهییەت بزوێنترن، دڵ خرۆشێنترن، ئەو پیاوانەی بۆنی شاخ و بەرد و گیایان لێدێت، لە چاویاندا نیگایەکی سارد هەیە کە دەتوانێت وەک چەقۆ تیژ بێت، بە سەرپەنجەکانیان جارێک گەرمایەکی وەک پشکۆ بە لەشی ئافرەت

دەبەخشن، جارێکیش سەرمایەکی وەک ساردی بەفر. ئێستا دڵنیابوو ئەم و نەغەدە بۆ یەک دروست نەکراون، ئەم پیاوێکی نەرم و لاواز، ئەو ژنێکی گەڕۆک بەدوای شیعر و بۆنی دارستان و عارەقەی پیاوانی دڵڕەقدا... هیچ شتێکیش لەوە کارەسات تر نییە پیاوێکی لاواز بێت و ژنێکی وەها بێباک و توندپەرستت خۆشبوێت.

دکتۆر لە گەرانەوەیدا ئەبدائیلی فریشتەی لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە. لە دوو ساڵ لەمەوبەرەوە کە چوویوو بۆ سەربازی دەرگای ماڵەکەی نەکرابووەوە، کە ڕۆیشت بە دایک و بابی گووت نەچن بەلای ماڵەکەیدا، چۆن جێیهێشتووە بەو جۆرە جێیبهێڵن و دەست لە هیچ شتێک نەدەن. نەیدەویست ئەو نەخشەیە تێکبدات کە ڕۆژێک لە ڕۆژان نەغەدە کێشابووی، دەیویست هەمیشە و هەمیشە شتەکان لە جێگای خۆیاندابن، ئەو جێگایەی لە سەرەتاوە نەغەدە کورسی و مێز و تەلەفزیۆن و کتێبخانە و تابلۆکانی تیا داناوە وەک خۆیان بمێننەوە. هیچ ئازارێک لەوە قووڵتر نییە ئینسانێک دەستت لێبەربدات کە تۆ لە ناخی دڵەوە خۆشتویستوە، بێ هیچ هۆیەک، بێ هیچ بەهانەیەک. گەر خراپ بیت و خۆشیان نەوێیت تێدەگەیت، هەموو گوناهەکە دەگریتە ئەستۆی خۆت، دەڵێیت بە جەهەنەم ئەوە سزای بەدیی و ناجۆری خۆمە، بەڵام ئەی گەر مرۆڤێکی باش بوویت، ئەی گەر بە ڕاستی ئەو کەسەت خۆشویستبێت؟ ئەو کات چی؟. ئەو کات ئازارەکە سەختترە، چونکە هەستدەکەیت لە ڕیشەوە، لە بنەوەڕا تۆ کەسێکی دەرکراو و قەبووڵ نەکراویت. هەستدەکەیت ئەوی بەرامبەرت بەر لەوەی بە شایستەی هەڵسەنگاندنت بزانێت لە ژیانی خۆی دەریکردویت، ئەوە برینەکەت هەزارجار قووڵتر دەکاتەوە. دکتۆر دەیویست بە جۆرێک لە جۆرەکان لەو جیهانە بزربووەدا بژی، دەیویست هەمیشە ئەو هەستەی هەبێت کە لە ناو جوغزێکی نەگۆڕی زەماندا وەستاوە، لە شوێنێکدا شتەکان هەردەم ئەو هەستەی تیادەچێنن کە ئادەمییەکی دیلی

ناو زەمانێکی دیکە و ڕۆژگارێکی مردووە، کەدەرگاکەی کردەوە، تەواوی ماڵەکە نوقمی تۆزێکی ئەستوور بوو، هەموو دەرگا و پەنجەرەکان وەک دوو ساڵ لە مەوبەر مەحکەم داخرابوون، هەموو شتەکان وەک خۆیان بوون، هیچ شتێکی زیندوو لە ماڵەکەدا نەبوو تامردبێت، تەواوی ماڵەکە تەنیا مەتریاڵی بێڕۆح بوو، دکتۆر سەیری لێهات کە شتە بێڕۆحەکانیش دەتوانن بەو شێوەیە کاریگەریی تێپەڕینی زەمانیان لە سەر دەربکەوێت، شتە بێڕۆحەکانیش دەتوانن مردوتر دەربکەون لە جاران. هەستیکرد هەموو ئەو مەتریالە بێڕۆحانەی ماڵەکە بە جۆرێک لە جۆرەکان هەستیان بە نەبوونی ئینسان کردوە، هەستیان بەو بێدەنگییە کردوە کە قووڵترە لە بێدەنگی خۆیان. دکتۆر تا چەند ڕۆژێک ئەو تۆزە زۆرەی نەسڕی، تۆزێک بوو نەیدەزانی لە کوێوە هاتۆتە ژووری، لە چ دەلاقەیەکەوە گەیشتووە، هەستیکرد ژیانی خۆشی وەک ئەم ماڵە دەلاقەیەکی نەبینراوی تێدابووە، لەو دەلاقەیەوە بەردەوام تۆزێکی کوشندە دزەیکردوە و ئەم نەیبینیوە، بەڵام دەلاقەیەکی نهێنییە، دەلاقەیەکە نادۆزرێتەوە، کە لە سەر سیستمە تۆزاوییەکەی، لە ناو متیلە تۆزاوییەکاندا پاڵکەوت، لەو بڕوایەدا بوو کە ژیانی هەموو مرۆڤێک درزێکی نەبینراوی تێدایە، درزێکی قووڵ کە چەند بگەڕێت ئاسان بۆی نادۆزرێتەوە... لەو درزەوە دەشێت هەموو بایەک هەڵبکات، لەو درزەوە دەشێت هەموو دەردێک بێتە ژووری، لەو درزەوە دەشێت هەر ئافاتێک بێتە میوان. زۆربەی خەڵک لەوە دڵنیا و لە خۆ ڕازیترن ئەو دەلاقەیە لە ژیانی خۆیاندا ببینن، بەڵام دکتۆر لەو باوەڕەدابوو هەموو ژیانێک دەلاقەیەکی وەهای هەیە و هیچ هێزێک نییە بتوانێت ئەو دەلاقەیە دابخات.

مولازم ئەبدال هەوای تۆزاویی ژوورەکانی زۆر پێ نەدەکەوت، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ تەندروستی باشتر و باشتر دەبوو، خۆی وەک پەیوەندییەکی نهێنی لەگەڵ خاوەنەکەیدا مابێت، زوو زوو باسی ئەو دۆخە ڕۆحییە

تازانەی دەکرد کە خاوەنەکەی تێیدا دەژی. دەبێت بڵێم ئەبدائیلی فریشتە سەرەتا زۆر کۆمەکی بە دکتۆر کرد تا یادەوەریی نەیکوژێت، لەبەر ئەبدائیل و پاراستنی پاش چەند ڕۆژێک سەرلەبەر هەموو ماڵەکەی سڕی، تۆزی ئەو دوو ساڵەی پاککردەوە، پێخەفێکی تایبەتی بۆ ئەبدائیل کڕی و زۆر جاریش پێکەوە دەچوونە دەرێ. گەرچی ئەبدائیلی فریشتە چەند جارێک بە وردی بۆی باسکرد کە مان و نەمانی ئەو بە دەست دکتۆر نییە، بەڵام دکتۆر ڕای وابوو کە ئەبدائیل جگە لەو دوو باڵەی هەموو شتێکی تری ئاساییە و لێرەوە لە ڕێگای خواردن و شروبی بەهێزکەر و دەرزی پەنسلین و پاکژکردنەوەی بەردەوامەوە، دەکرێت فریشتە ناسکەکەی لە نەخۆشی دووربخاتەوە. لەو ماوەیەدا هەستیکرد کە خزمەتە ئاساییەکانی پزیشکێکی دڵسۆز دەتوانێت کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆ لە سەر فریشتەکە جێبهێڵێت و لە نەخۆشی و لاوازی و مردنی زوو وەخت و نابەهۆ بیپارێزێت. ئەوەی کەمێک سەختبوو ئەوەبوو، ئەبدائیل بەرگەی خۆری زۆر و ڕوناکی بەردەوامی نەدەگرت، بۆ ئەوەی بیگێڕێت دەبوو زیاتر شەو بەکاربهێنێت و شەویش لەم وڵاتەدا وەختێکی ترسناک و کاتێکی نابەجێی پیاسەکردنە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەبدائیل شار ببینێت و هەست بە مردن نەکات، دکتۆر شوکاک لەگەڵ هەموو مەترسییەکیشدا هەندێک شەو ئەبدائیلی بۆ هەڵمژینی هەوای پاک و گەڕانی هێمن دەبردە دەرێ... لەو شەوانەدا بە پادشای فریشتە گەڕۆکەکانی شار «مەهدائیلی فریشتە» گەیشتن، کە سەرچاوەی پێکناساندنی ڕێزانی مەلەکبین و دکتۆر شوکاکیش بوو.

مەهدائیل چۆن شەوێک بولبولیاری بەرەو قەڵای فریشتەکان برد، پێشتر هەمانشێوە دکتۆر شوکاک و فریشتە یاوەرەکەی بەرەو ئەوێ بردبوو، هەمان پیاسەی پێکردبوون، گۆڕستانەکەی پیشاندابوون، لە بیمارستانیش دەرگای ژووری هەندێک لە فریشتە خەوتووەکانی

بۆ کردبوونەوە. بۆ ڕۆژی دوایی دکتۆر شوکاک لەگەڵ خاتوو ڕێزاندا باسی هەموو ئەو فریشتە بێکەس و بێجێگایانەی کرد کە لە قاوشی خەستەخانە دوورەکان و لە گۆڕەپانەکانی جەنگ و لە نزیک مەیتخانە سەربازییەکانی باشوور بینیویێتی، باوەڕی تەواوی خۆی بۆ دەربڕی ئەوەی کە دەیبینن جۆرە وڕێنەیەکی دەستەجەمعی و خەوێکی پێکڕایی هەندێک نەخۆشە کە بە تۆڕێکی تێلێپاتی بەرفراوان پێکەوە گرێدراون. بڕوایەکی تەواویشی هەبوو مەلەکبینەکان تووشی جۆرە شێتییەکی نوێ بوون، کە پەیوەندی بە نەمانی جوانییەوە لە شارستانییەتی هاوچەرخدا هەیە... ڕێزان خان نەوەک هەر گاڵتەی بە قسەکانی دەهات، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە دکتۆری وەک پیاوێکی بێمێشک و شیرین و شایەن بە خۆشەویستی هاتە بەرچاو، گووتی کە فریشتەکان لە مرۆڤی راستەقینە راستەقینترن و ئەوەی ئەم لە باوکییەوە بۆی ماوەتەوە، نەخۆشی نییە بەڵکو دونیایەکە دەبێت بیپارێزن و وابکەن فریشتەکان بێئازار و لە هەلومەرجێکی گونجاودا و «وەک بەشەر» بمرن. ڕێزان بڕوای وابوو چۆن تەنیا ژمارەیەکی دیاریکراو لە مرۆڤ لە فەلەک تێدەگەن و جوڵەی ئەستێرەکان و ماناکانیان دەبینن، چۆن تەنیا ژمارەیەکی دیاریکراو لە خەڵک دەتوانن لە ئاسەواری کۆن و ماناکان و سەمبولەکانی بزانن، دونیای فریشتەکانیش دونیای ناوەوەی مرۆڤە و ژمارەیەکی کەم دەتوانن بیبینن و لە ئاماژەکانی و چینەکانی و بەرهەمەکانی تێبگەن. چۆن لە کاتی بورکاندا شلەی زەمین دێتەدەرێ و نهێنی ناخە قووڵ و تاریکەکەی زەوی دەدرکێنێت، فریشتەکانیش وەک تەقینەوەی ئەو بورکانەی ناخی ئینسان وان کاتێک لە ژێر فشارێکی گەورەدا درزێک دەکەنە مرۆڤ و دەلاقەیەک دروستدەکەن و بەرەو باڵا بەرزدەبنەوە. دەبێت بڵێم دکتۆر مستەفا هیچ کات وازی لەو بڕوا زانستی و عەقڵانییەی خۆی نەهێنا، کە بینینی فریشتەکانی وەک جۆرە هەلوەسەیەکی ڕۆحی

لەقەڵەمدەدا. بە کەشتییەکەی ڕێزان خانی دەگووت «کەشتی فەنتازیا هەڵهاتووەکانمان»، چونکە پێیوابوو ئەو و ڕێزان خان و لەوانەیە ژمارەیەک خەڵکی تریش، ئەندامی یانەیەکی نهێنی بن، کە لەوێدا هەر کەسە و بوونەوەری فەنتازیی خۆی دروستدەکات و بەرەڵایدەکات و فریشتەکانیش بەشێکن لەو فەنتازیا تێکشکاوە هەڵهاتووانە، کە مرۆڤێک وازی لێدەهێنێت و یەکێکی تر دەیگرێتەوە. زۆرجار بەسەعات دەکەوتە وڕێنەیەکی بێبنەوە تا هەوڵبدات بە کۆمەکی هەندێک زانیاری پزیشکی و تیورەی جەستەناسی، تەفسیرێکی زانستی بۆ دەرکەوتنی فریشتەکان بکات، کاتێکیش لەو تەفسیرە عەجایەب و ناکامڵ و بێبنەمایانەدا دەگەیشتە بونبەست، بە جۆرێکی نائاسایی قسەکانی خۆی دەگۆڕی، دەرکەوتنی فریشتەکانی وەک نیشانەی تێکچوونێکی گەورە لە سروشتدا لەقەڵەمدەدا، کە لەوانەیە دواجار بە داگەڕانی مرۆڤ بەرەو جۆرە نەسلێکی تازە کۆتایی بێت، کە ئەو نەسلەش وەک هەموو ئەو مەخلوقاتە زیرەکانەی کە تازە دێنە سەر سەحنەی خەلیقەت، سەرەتا زۆر دڕندە و بێڕەحمە. دەیگووت «کە ئینسان فریشتەکەی لەدەستبدات، دەبێت بە مەخلوقێک تر و دەگەڕێتەوە باوەشی جۆرێک لە بەربەریەتی تازە، واتە جۆرە جنسێکی تر لەدایکدەبێت کە هیچی لە مرۆڤی دێرین ناچێت، بەڵکو بێڕەحمتر و خوێنڕێژتر دەبێت... ئێمەش لەم سەردەمەدا پێشەنگانی ئەو نەسلە تازەیەین». زۆرجار لە سەر ئەو بابەتانە لەگەڵ ڕێزان مەلەکبیندا دەبووە شەڕیان و ڕێزان دەگەیشتە پلەیەک لە توڕەیی، ئەمری پێبکات دەمودەست کەشتییەکە چۆڵبکات و نەیەتەوە بەم شوێنەدا و سەروفەساڵی خۆی بۆ ئەبەد لەو ناوە دەرنەخات. گەرچی هەمیشە دواتر لە ناخەوە دڵی دەلەرزا و دەترسا مستەفا شوکاک هەموو قسەکانی بەهەند وەربگرێت و ئیتر نەگەڕێتەوە. پەیوەندی ڕێزان و دکتۆر شوکاک هەم پەیوەندییەکی خۆش و زیندوو و

پڕ لە قسەوباس و ساتی شاعیرانەبوو، هەم پڕ شەڕ و شلۆغی و هەرا و دەنگەدەنگی بێبڕانەوە. لە یەکەم ڕۆژەوە «ڕێزان خانی مەلەکبین» «لە ڕاستیدا خۆی حەزیدەکرد بەو چەشنە بانگیبکەن» بە دکتۆری گووت «بیمارستانی فریشتەکانی من تاکە بیمارستانە دکتۆری تێدا نییە و بەس نەخۆشی تێدایە، شتێکی باش دەبوو گەر کەرەمتان بکردایە و ببوونایە بە تەنیا دکتۆر، چونکە لە ڕاستیدا تا ئێستا ڕێکەوتی دکتۆرێکی وەک تۆمان نەکردوە، چاوی وەها تیژ و بەهرەی وەها بەرین بێت، لە ڕۆژی نیوەڕۆدا فریشتەی باڵدار و بێباڵ بناسێتەوە. بەساقە، بەوجۆرەیە... دەمبوریت، دەمبوریت. خۆ من وام لێ نەکردویت، خودا بەساقەی بم ئەو دەردەی داوە بە کۆڵتدا». دکتۆر شوکاک دەترسا ئەم کەشتییە زیاتر بەرەو شێتی بەرێت، هەرگیز لەوە دڵنیانەبوو چ واهیمەیەک و دیوێکی شاردراوەی عەقڵ ئەم فریشتانەی خولقاندووە، بەڵام بەوەدا دوژمنێکی ئەبەدی ئازاربوو، لە هەرجێگایەک بوونەوەرێک هەبایە ئازاری هەبایە ئەو دژی بوو، بێئەوەی زۆر گوێبداتە واهیمە قووڵەکانی خۆی، قەبووڵیکرد ببێت بە تەنیا دکتۆری بیمارستانی فریشتەکان لەم شارەدا، لەوانەیە لە هەموو وڵاتەکەشدا، کێ چوزانێت لەوانەیە لە تەواوی سەر زەمینشدا. لەو کاتەشەوە دکتۆر شوکاک و مەهدائیل بوون بە دوو هاوڕێی نزیک... لەگەڵ خاتوو ڕێزانی مەلەکبیندا، بوون بە دوو گەورەترین شارەزای دونیای فریشتەکان. ماوەیەکی زۆریشی نەبرد مولازم ئەبدائیل لە کەشتی کۆچی دواییکرد، بەڵام دکتۆر پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کەشتیدا نەپچڕان. مستەفا شوکاک تا زیاتر لە جیهانی فریشتەکاندا نوقمبایە، زیاتر بەخۆی دەگووت کە شێتی شتێکی بێسنوورە، هەر ئەوەندەی جارێک قاچت خستە سەر زەمینە سەیر و ئەفسووناوییەکەی، ئیدی ئارەزووی هاتنە دەرەوەت نییە و هەرگیز ناتبێت.

# نەغەدە و پیاوە شۆڕشگێڕەکان

سروشت بۆ نەغەدە ماردینی ئەو جێگایە بوو کە هەموو ناکۆکییە کوشندەکانی لە خۆیدا کۆکردۆتەوە، هەم شوێنێ ئەو هێزە تاریک و نادیار و گەورانەیە کە مرۆڤ هیچ لە سەرچاوە و نیازیان نازانێت، هەم شوێنێ ئەو ناسکییە ورد و تایبەتییانەیە کە هورووژمێکی گەورە و بەرین دەکەنە سەر هەستە ناوەکی و باغە نهێنییەکانی خۆت. «لێرەدا ئەژدیها و پەپولە وەکو یەک پەلامارت دەدەن.. وەکو یەک کوشندەن.. وەکو یەک بریندارتدەکەن». لە شیعرێکی ئەو سەردەمەیدا وادەڵێت. لە دۆڵی دەمبۆران یەک خولیای هەبوو، ژنێتییەکەی ئازادی لێزەوت نەکات، ئێستا بێئەوەی بە تەواوی لە یاسا ناوەکی و شەریعەتە ترسناکەکانی دونیای پیاوان تێبگات، بێئەوەی بە ڕاستی و بە وردی لە دونیای ئاڵۆزی ئەم مەخلوقە تێگەیشتبێت، خۆی لە ناوەڕاستی جیهانە تاریک و نادیارەکەیدا دەبینییەوە. واتێگەیشتبوو کە ڕۆحی شۆڕش ڕۆحێکی ئازادە و جێگای هەموو خواست و ئارەزوویەکی تێدا دەبێتەوە، وەک کچی بەنازی دکتۆرێک و وەک خاتوونێکی نازداری شاری، لەو ڕاستییە تێنەگەیشتبوو کە شۆڕش هیچ نییە جگە لە تەعبیرێکی دەستەجەمعی پیاوان لە پیاوەتی خۆیان. لە دەمبۆران کەسی نەدۆزییەوە حەزی لە شیعر بێت، سەرەتا دەیویست ئێواران بە هێمنی پیاسەیەک بەدەربەندەکەدا بکات و لێگەڕێت شتەکان ئیلهامی بدەنێ و شیعری تیابچێنن، بەڵام لەوە سەرسامبوو کە هیچ کەس لە دەربەندی دەمبۆران شیعر ناخوێنێتەوە، دۆڵەکە خاڵییە لە شیعر، ئەو شاعیرانەی لە شارەوە دێن هەموو لەم دۆڵەدا دەمرن و دەبن بە شتی تر. لایەنیکەم سێ شاعیر لەوێ بوون کە لە دەمبۆران گۆڕانکارییەکی

قوولّیان بە سەردا هاتبوو، یەکێکیان بووبوو بە داربڕی شۆڕش، بەردەوام لە شاخەکان داری بۆ بنکەکانی سەرکردایەتی و هۆبەی پێشمەرگەکان دەبڕی. یەکێکی دیان بووبوو بە بێژەر لە ڕادیۆی شۆڕش، سێهەمیشیان بوو بو بە نانەوا و لە سەر تاقە تەنووری دۆڵەکە ئیشیدەکرد. لە سێ بۆنەی جیاوازدا ویستی لە هەر سێکیان نزیکببێتەوە و دەربارەی شیعر قسەیان لەگەڵدا بکات. هەرسێکیان وەک باسی تاوانێکی کۆنیان لەگەڵدا بکەیت، بە جۆرێکی بەرچاو خۆیان لە هەموو ناوهێنانێکی شیعر دزییەوە، وەها بوو وەک ئەوەی بترسن کەسێک باسی وەهایان لەگەڵدا بکاتەوە... سەرەتا نەغەدە هۆی ئەو ترسەی گێڕایەوە بۆ ترسی نابەجێ و لووتبەرزی ئەبەدی شاعیرانی پیاوی کورد کە هەمیشە شیعر و شەڕیان بە ئیشێکی خالیسی نێرانە دەزانی و نەیاندەویست لەگەڵ ژندا باسیبکەن. بەڵام دواتر تێگەیشت شیعر لە دەمبۆران وەک بەرهەمی پیاوانی لاواز تەماشادەکرێت، وەک چالاکییەکی بێسوود کە دوور نییە ڕۆحی شۆڕشگێرانە تووشی خەیاڵات و لادان و خولیای نابەجێبکات. لە ڕاستیدا نەغەدە لەوەدا لە سەر هەق بوو، من ئاگاداربووم کە لە بیرۆی باڵا، مەلا وەلید و میرزای بیرۆ، بەرپرسی سەرەکی داڕشتنی سیاسەتێکی ڕەسمی ڕاگەیاندن بوون، جارجار دەربارەی خواست و تێگەیشتن و عەقڵییەتی خەڵکی شار پرسیاریان بە من دەکرد. من لە پێشی ئەو دەنگانەوە بووم کە شاعیران و نوسەران نەڕژێنە شۆڕشەوە. لە ڕاستیدا من ڕام وابوو، شۆڕش پێویستی بە سێ ڕۆشنبیر هەیە، سێ دانە و هیچی تر. یەکێکیان بۆ ئەوەی شیعری شۆڕشگێڕانەمان بۆ بنوسێت، یەکێکیان بۆ ئێستگەکەمان تا وتاری سیاسی ئامادەبکات و شۆڕش وەک هەمانەیەکی بۆش دەرنەکەوێت، یەکێکیش بۆ ئەوەی بە سەر زمان و داڕشتنی بڵاوکراوە و نوسینەکانی ئەندامانی ئەنجومەنی باڵادا بچێتەوە کە کەسیان لە ڕووی ئەدەبییەوە بەهرەدار نەبوون. ئەو سێ ڕۆشنبیرەی

لێدەرچێت، هەموو ڕۆشنبیرانی تر لای من قەپۆزی زل و زمانی درێژ و چەنەی مەقەستی بوون و هیچی تر، کە شۆڕش سوودی سەرەسۆدەیەکی قوپاوی لێ نەدەبینین.

نەغەدە لە دۆڵەکەدا هەستێکی بەهێز و سەرەتایی شارنشینی لادروستبوو. ئەوەی دڵنیابوو لە یەککاتدا هەموو پیاوانی دۆڵەکە خواستی نزیکبوونەوەیان هەیە هێزێکی ناوەکی تایبەتی دەدایە، نەغەدە لە هاتنی بۆ دەمبۆران پەشیمان نەبوو، پێکڕای شتەکان ئەزموونێکی تازەی هەست و تێڕوانین و بۆن و بیستن بوون، هەموو شتێک بۆنەو نوێ بوو، لە بۆنی گەڵا و خاک و جۆگەوە تا دەنگە سەیرەکانی ناو دەربەند، تا ئەو مۆسیقا نهێنییەی لە تاوێر و جۆگە و دەنگی باڵندەکانەوە هەڵدەستا. دڵنیابوو لەم جیهانەوە دەکرێت دەرگای سەر زەمینی سەیرتری لێبکرێتەوە، دەبێت بڵێم سەرەتا بە سروشت خۆشحاڵ بوو، سروشت شتێکی جیاواز بوو بۆی، گەر نەرم بایە یان سەخت و دڵڕەق نەغەدە بە هەردوو ئاستدا لەزەتی لە ئامێزی ئەو دەربەندە دەبینی. تامی لەو هەموو بۆن و دەنگە تازانەی ژیان دەچەشت. بەڵام هەر لەو دۆڵەدا هەستیکرد هێزێکی گەورەی بێباکی و کەمتەرخەمیشی تێدایە، هەستیکرد لەو ژنانە نییە کە دەتوانن بڕوایەکی تایبەتیان هەبێت و شەڕی بۆ بکەن، بەڵکو کەسێکە زیاتر بۆ هەستەکانی دەژی، تا ئەندازەی دڵڕەقی و خۆپەسەندی بۆ هەستەکانی دەژی. لەو ژنانەیە کە دەتوانن هەم باوەش بە فریشتەشدا بکەن و هەم بە شەیتانیش، هەم لەزەت لە خەوتنێکی درێژ ببینن لەگەڵ فریشتەدا و هەم لەزەت لە خەوتنێکی درێژ ببەن لەگەڵ شەیتاندا. ئێستا ئەویش تەنیا هەستێک لێیدەترسا لاوازیی بوو، کە بە ناو دارستان و گوێ چەمی دەمبۆراندا دەگەڕا، هەستی بە بوونی هێزێکی ترسناک دەکرد لە خۆیدا، ئەو کارەی کردبووی گەورەبوو، ئەوەی بەو جۆرە خۆی لە کۆتی باوک و مێرد ڕزگارکردبوو، تەنیا لە ڕۆحی شۆڕشگێڕانەیەوە

نەهاتبوو، بەڵکو بەرهەمی دڵڕەقییەکی شاردراوەش بوو، کە دەیتوانی زۆر دوور بڕوات. هەموو ئەو جارانەی لەگەڵ نزاردا خەوتبوو، هەستی بە خۆشییەکی لە ڕادەبەر کردبوو، لەشی وەک بورکان بە لەزەتی گەورە و شێتانە تەقیبووەوە. بەڵام دڵنیابوو عاشق نییە، هەتا کە لە باوەشی نزاردا بوو، خۆشحاڵ بوو بەوەی دەتوانێت بەوجۆرە شێتانەیە لەگەڵ کەسێکدا بخەوێت کە عاشقی نییە، دڵنیابوو گەر عاشقی یەکتر بوونایە، پێکەوەخەوتنیان ساردتر و نەرمتر و ڕۆمانسیتر دەبوو، بەڵام ئەم حەزی لەو شێتی و بێشەرمی و پەلامارە گەورەیەیە کە لە ڕێگایەوە وزەیەکی ناکۆتای ژیان بهێنێتە دەرێ، وزەیەک کە دەشێت وێرانکاربێت، بێباک بێت، وەک گەرداو زوو بێت و وەک گەرداو زوو بڕوات. ئێستا هەستی نەدەکرد پێویستییەکی بە نزار بێت، هەندێ بەیانیان کە هەڵدەستا و جلە پیاوانەکانی لەبەردەکرد، جلی ژنێک خۆشبەختانە لەم دۆڵەدا دەتوانێت وەک پیاوان بپۆشێت، نزاری زۆر کاڵ دەهاتەوە یاد، بە هەموو توانای خۆشی دەیویست بیسڕێتەوە و بیکات بە بەشێک لە ڕابوردوو. دەیویست یارییەکی ترسناک بکات، یاری ئەوەی ببێت بە خاوەنی لەشی خۆی، دەیویست تا دەتوانێت لەگەڵ ئەو یارییەدا دوور بڕوات. ئەوەی لە دکتۆر مستەفا شوکاک بێزاربوو، تەنیا لەبەر ئەو هەستەبوو کە ناویدەنا هەستی «شووکردن»... ئەو هەستە ئازاریدەدا کە ژنێکی ئەبەدیی بێت. بوون بە ژنی کەسێک وادەکات بۆ هەتاهەتایە لەشت لەشی خۆت نەبێت، ڕەنگە دکتۆری لە جێگایەکی دیکەدا ببینیایە خۆشیبوویستایە، بەڵام ئەو لەساتی یەکەمەوە دکتۆری وەک مێرد ناسی. مێرددددد.. مێرددددد... لای هەندێک ژن، هیچ کەس لەو پیاوە ناشیرینتر نییە کە لە ڕۆژی یەکەمەوە، لە سەرەتاوە وەک مێرد دەیناسن. هەموو شتێک لەو وشەیەدا ئازاریدەدا، چونکە بەردەوام ئەوەی دەخستەوە یاد کە لەشی لەشی خۆی نییە، بەڵکو کەسێکی دیکە خاوەنێتی. دڵنیابوو گەر لە عەشقەوە

شوووبیکردایە، وشەکە زۆر جوان دەبوو لەلای. لە ناو سروشتدا ئەو دێڕە ئەبەدی و نەمرەی گۆرانی هاتەوە یاد «بەڵام تەبیعەت هەرگیزا و هەرگیز بێ ڕوناکییە بێ بزەی ئازیز». بۆ ئەوەی تەبیعەت هەتاهەتایە ڕوناک بێت، ئەو پێویستی بە ئازیز نەبوو، تەبیعەت ئەبەدییە، بەڵام ئازیز ئەبەدی نییە، نەغەدە لە دەمبۆران وابیریدەکردەوە. یەکەمجار بە ڕاشکاوانە بە هەڤاڵ شێرخانی گووت «شۆڕش بۆ ژن مانایەکی تری هەیە، شۆڕش لای ئێوە ئەوەیە ببن بە خاوەنی دونیا، بەڵام لای من ئەوەیە ببم بە خاوەنی لەشی خۆم». ئەو ڕستانە ڕەنگە شۆکێکی ترسناکی بۆ هەڤاڵ شێرخان دروستکردبێت، کە بەرلەوەی ئارەزووی لەوە بێت ببێت بە حاکم بە سەر وڵاتەوە، ئارەزووی لەوەبوو ببێت بە حاکم بە سەر لەشی ئەوەوە. دڵنیام لەوە ترساوە، گەر ژنان ببن بە حاکم بە سەر لەشی خۆیانەوە، چ دونیایەکی ترسناک بۆ ئەو و هەزاران پیاوی تر دروستدەبێت، کە لە ناخی دڵدا واهەستدەکەن ناتوانن بە سیحر و جوانی و بەهرەی خۆیان ژنان دەستەمۆبکەن و هەمیشە پێویستیان بە هێز و دەسەڵات و حاکمییەت هەیە تا وەک پیاوی دڵخواز دیاربن.

ئەوەی بیەوێت دەسەڵاتی بە سەر لەشی خۆیدا هەبێت، واتا لەشی خۆی دەبەخشێتە ئەو کەسەی خۆی دەیەوێت و لەو کاتەدا کە خۆی دەیەوێت، لەشی خۆی ناخاتە ژێر ڕەحمەتی هیچ یاسایەک و هیچ ویستێکی ترەوە، نەدەیبەستێتەوە و نە تەواویش ئازادیدەکات، بەڵکو هەڵدەبژێرێت و بڕیاردەدات. لەو ساتەدا شیعر، پیاوان، سروشت... هەموو شتێکی لە پێناوی پەڕینەوەدا بوو بەرەو ئەو جێگایەی خۆی خاوەنی خۆی بێت، هەستیکرد شیعر دەرگاکانی بە گەورەیی بۆ کردۆتەوە، ناوێکی بۆ دروستکردوە کە زۆرجار لە خۆی ناچێت. وشە ئەو هێزەی دەداتێ دەسەڵاتی بە سەر بەشێکی تاریکی ناخی خۆیدا بشکێت، کۆمەکیدەکات بتوانێت لە جەستەی خۆی نزیکببێتەوە. «ئەی لەش کەس ناتوانێت

بتگرێت، وشەکانم نەبێت/ ئەی وشە... هیچ پیاوێک هێزی تۆی نییە، کەس وەک تۆ پاکیزەیی من نابڕێت». لە شیعرەکانیدا بەوجۆرە باسی هێزی وشەی دەکرد. پیاوان بۆیە لێرەبوون تا ئەو بتوانێت هەڵیانبژێرێت، گەورەترین دەسەڵاتێک مرۆڤێک لە ژیاندا بیگاتێت ئەوەیە هێزی هەڵبژاردنی هەبێت، هێزی ئەوەی کەسانێ بکاتە دۆست و کەسانێکیش بۆ هەتاهەتایە بکاتە دەرەوەی زیندەگی خۆی. نەغەدە ماردینی لە یەکەم ڕۆژی ژیانییەوە لە دەمبۆران دڵی بە شێرخان نەکرایەوە، وەک پیاوێک هاتە بەرچاوی کە لەشی ئەوی دەوێت و ناشوەستێت ئەم بیربکاتەوە و بڕیاربدات، وەکو دکتۆری مێردی. نەغەدە کەمتر ئەو پیاوانە سەرنجیان ڕادەکێشا کە لە یەکەم ساتەوە لە چاویاندا برسێتی دەتکا و نەوسێکی ئاگرین دەهاتەدەرێ، نە لە بەرئەوەی ڕقی لە ئارەزووی پیاوبێت، بەڵکو وەک ئەوە بوو بەو نیگا برسیانەیان بڵێن، تۆ خاوەنی خۆت نیت. وەک باڵندەیەک خۆی دەبینی کە دەبێت لە قەفەزدا ئامادەی سەربڕین بێت. ئەو هەر لە سەرەتاشەوە هەتا بەر لەوەی لەشی خۆی بناسێت و تێبگات، هەر تەواو قێزی لە هەموو کارێکی خوازبێنی و شووکردن دەهاتەوە، چونکە وای هەستدەکرد، پیاوێک بێپرسی ئەم بڕیاریداوە جەستەی بۆئەو بێت.

هەڤاڵ شێرخان بە پێچەوانەی ئەوەوە، ڕای وابوو شۆڕش هێزی جوامێرانەی پیاوانی نیشتیمانە، پیاوانێک کە بۆ بەرگری لە هەموو خەڵک بە چیاوەن و دەبێت پاداشتی ماندووبوونی خۆیان لە ئامێزی ئافرەتەکاندا وەربگرنەوە. دەمێک کە ئاشکرابوو نەغەدە ماردینی لە پیاوانی دەمبۆراندا، هەڤاڵ جافەرانی لە هەمووان پەسەندترە، ئەوە شێرخانی گەیاندە پلەیەک لە نائومێدیی و تووڕەیی، کە تێیدا پیاوان شێتدەبن و تاوانی گەورە ئەنجامدەدەن. هەندێک پیاو هەن لەو ڕاستییە تێناگەن کە ناکرێت بەردەوام پەسەندترین و دڵخوازترین و بەهێزترین

بن، زۆرجار کە خانمێک قەبووڵیان ناکات، بە جۆرێک وێنەیان لەلای خۆیان دەشکێت و بە شێوەیەک هەست بە شکستدەکەن، لەگەڵیدا دەبن بە دڕندەیەکی ترسناک. ئەمانە دڕندەترین و ناشیرینترین جۆری پیاون. ئەوەی کە ئازاری شێرخانی زۆر سەختدەکرد ئەوەیە لە سەرەتاوە وارەفتاریدەکرد کە خانمی ماردینی موڵکی ئەوە، لەگەڵ هاتنی ئەودا بۆ دەمبۆران و لەگەڵ ئاشکرابوونی ئەو هەوەسە دەستەجەمعییەدا بۆ لەشی ئەو، شێرخان وەک لە سەرەتاوە بازنە بەدەوری موڵکێکی بەرچاودا بکێشێت، وەها رەفتاریکرد و بە جۆرێک گەمارۆی خانمی دا، هەموو بترسن و بکشێنە دواوە و خانم وەک نێچیری پیاوێک سەیربکەن کە تەنیا ڕاوچییە بتوانێت باڵندەی وابگرێت. نەغەدە لە سەرەتاوە هەستیکرد کە هەڤاڵ شێرخان وا ڕەفتاردەکات، وەک ئەوەی هەموو شتێکی گرنگ لەم دەربەندەدا هی ئەو بێت، ئەوە لە قووڵاییدا بەر ئەو خواستە قووڵەی خانم دەکەوت کە لە هەموو زنجیرێک دەرچێت، هەتا زنجیرەکانی بەزەییش. نەغەدە لە یەکەم بینینی شێرخانەوە، هەستیکرد ئەم پیاوە دەیەوێت ببیات بۆ خۆی، دەیەوێت بە جۆرێک گەمارۆیبدات و قفڵیبکات لە هەموو دونیای داببڕێت. گەرچی هەڤاڵ نێرێکی چالاک و بە قیافەت بوو، بەڵام شتێک لە شێوەی قسەکردن و سەیرکردن و وەستانیدا بوو، روخساری کەسێکی پێدەبەخشی کە هەرگیز لێی دڵنیا نەبیت، لە کەسێک دەچوو بە سەیرکردنەکانی پێتبڵێت ئەوەی دەمەوێت بمدەرێ، چونکە گەر خۆت نەیبەخشیت بە زۆر دەیبەم. ئەوە وایدەکرد هەر کات بەر کەسانی سەرسەخت و خۆپەسەندی تر بکەوتبایە، کێشەی گەورە بنێتەوە. خانمی ماردینیش ئەو دەم لە هەر شتێک دەترسا بیبەستێتەوە. چ سیاسەت، چ شیعر، چ سێکس، هەمووی بۆ ئەو لە پێناوی ئەوەدا بوو، پڕ بە دونیا هەر دوو باڵی وازکات و هەردوو دەستی بکاتەوە و هەوایەکی پاک هەڵمژێت و بڵێت من ئازادم، ئازادییەک کە

لە سنووری دروشم دەرچووە و بووە بە ژیان. دوور نارۆم گەر بڵێم لەو سەردەمەدا هیچ کەسێک وەک خانمی ماردینی نەیدەویست ئازادیی لە وشەیەکی موجەڕەدەوە بکات بە ڕاستییەکی گەورە و دەست لێدراو.

سەرکەوتنی هەڤاڵ جافەران لای نەغەدە بە سەر شێرخاندا، تەنیا نەدەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئەو تاکە پیاوی دەمبۆران بوو، جورئەتی ئەوەی هەبوو، ئەو پەرژینە بشکێنێت کە شێرخان بە دەوری خانمدا کێشابووی، بەڵکو بۆ جۆرێک لە حورمەتی نێرانە، لە ویقارێک پێشتر نەغەدە نە لای مستەفا شوکاکی مێردی بینیبووی کە گەنجێکی منداڵکار و ناسک و ڕووخۆش بوو، نە لای نزار کە تەواو پێچەوانەی مستەفا شوکاک، کەسێکی جوان، پڕ قسە، زبر، کێویی بوو. جافەران هەم پێشمەرگەیەکی ئازا، هەم شەیدایەکی حافزی شیرازیی، هەم نوکتەبازێکی بەویقار و هەم ڕۆحێکی ئازاد بوو، ئاسان دەیتوانی سەربوردەکانی ژیانی خۆی تێکەڵ بە شیعرەکانی حافز و ئەو نوکتانە بکات کە لە نێو خەڵکانی هەژار و جووتیاردا بیستبووی. ئەو لەگەڵ گەنجی و جوانیشیدا حیکمەتی کەسێکی تەمەنداری هەبوو، پیاوێک بوو نیوەی لە سەردەمە کۆنەکان و لەگەڵ هەوای شاعیرانی کلاسیکدا بوو، نیوەکەی دیکەشی کوڕی ئەم ڕۆژگاری جەنگ و شۆڕشە بوو، هەمیشە دەیگووت شاعیرێکی خەوتوو لە دڵیایەتی کە هەرگیز لە خەو هەڵنەستاوە. دەیتوانی بە قسەکانی هەم خانم سەرسامبکات و هەم بیخاتە پێکەنین، وەک شۆڕشگێڕێکیش کە ئازایەتی و ڕەحمی پێکەوە کۆکردبووەوە، نمونەی لە نێو سەرکردەکاندا کەم بوو. ناتوانم بڵێم کە عاشقی ماردینی بووبوو، بەڵام بە دڵنیاییەوە حورمەتێکی بێوێنەی بۆی هەبوو، هەر ئەو ڕێزەش بوو دواتر لە شێوەی ئارەزوویەکی جەستەیی قووڵدا دەرکەوتەوە. من وەک کەسێک کە ژیانم لە وردبوونەوە لە مرۆڤدا بەهەدەرداوە، دەتوانم بێترس ئەو دەرەنجامە سەیرە بدرکێنم کە لە نێوان ژن و پیاودا ئەوە

تەنیا خۆشەویستی نییە کە دەشێت شێوەیەکی جەستەیی وەربگرێت و لە پەیوەندییەکی جنسیدا تەواو بێت، بەڵکو ڕێزێکی قووڵیش دەشێت لە ناو نوێن و لە پێخەفی خەودا تەواو بێت. لەشی مرۆڤ بەنرخترین دیارییەکە بتوانێت پێشکەش بە کەسێکی دیکەی بکات، لێرەوە سەیر نییە ئەو مرۆڤانەی حورمەتی یەکیان لایە، یەک لەشی خۆیان بکەنە دیاری بۆ ئەویدی. ڕاستە هەڤاڵ جافەرانی و خانم پەیوەندییەکەی خۆیان وەک خۆشەویستی پیشانی دەرەوەدا، بەڵام ئەوەی دواتر زانیم بەڵگەی ئەوەبوو پەیوەندییەکەیان نزیکبوونەوەیەکی جەستەیی بووە کە پتر لە سەر ڕێز و نرخزانی و یەکدیناسی دامەزراوە. دوو کەسی جیاواز بوون، نەغەدە لە ناوخۆیدا بۆ ژنێکی ئازاد دەگەڕا، ئەویش بۆ قارەمانێکی ئەفسانەیی وەک قارەمانەکانی نێو شاهنامە، هەر دووکیان لە جێگایەکدا گەیشتبوونەوە بە یەک و بووبوون بە دوو کەسی نزیک. دەبێت ئەوەش بڵێم کە هەڤاڵ جافەرانی لە سەرەتاوە شێرخان و ژمارەیەکی گەورە لە سەرکردەکانی شۆڕشی بە پیاوی بێسەواد و ترسناک و دڵڕەق دەزانی کە شۆڕشیان پڕکردوە لە توندوتیژییەکی ناپێویست و بوون بە هێزێک هێندەی ترس و تۆقاندن دروستدەکەن، دڵنیایی و متمانە نابەخشن. لە سەر ئەو بۆچوونانەی لە ئەنجومەنی باڵا زۆر سڵیان لێدەکردەوە. دوایی زانیم کە خانمی ماردینی لەگەڵ جافەرانیدا دەربەندیان بەجێهێشتووە و لەگەڵ هێزێکی گەورەدا لە گوندی «ئاش وسو» نیشتەجێبوون، نەغەدە لەوێ خانوویەکی تایبەتی بۆ دروستکراوە و لای هەمووان وا گووتراوە کە چاوەڕوانی بەربوونی دکتۆری مێردی نەغەدە دەکەن تا تەڵاقی خۆی وەربگرێت و پێکەوە زەماوەندبکەن. گەرچی خانمی ماردینی تا ئەمڕۆ سووره لە سەر ئەوەی کە ئەوە خواست و ئارەزووی قووڵی هەردووکیان بووە، بەڵام من کە بە چیرۆکەکەدا دەڕوانم و سەیری هەردووکیان دەکەم، دەڵێم گەر بهاتبایە و زەماوەندیانبکردبایە، مانەوەیان لەگەڵ

یەکدا ئەستەم بوو، چونکە چ خواستی نەغەدە بۆ ئازادی بەردەوام و چ خواستی شێخی جافەرانی بۆ تۆمارکردنی ئەفسانەی نوێی جوامێریی و ئازایەتی تاسەر پێکەوە نەدەژیان... ڕاستە ئەوان ڕێزێکی گەورەیان بۆ یەک هەبوو، بەڵام لە ڕاستیدا زۆر زەحمەتە دوو خەونی زۆر دوور بۆ ئەبەد پێکەوەبژین.

هیچ شتێک لە پەیوەندی نێوان ڕێز و خۆشەویستی ئاڵۆزتر نییە، ڕێز هەندێجار بنەمای خۆشەویستییە و هەندێجاریش دەیکوژێت. هەندێک خۆشەویستی تەنیا لەگەڵ ڕێزدا دەژی، هەندێک خۆشەویستیش هەیە تەواو لە دەرەوەی ڕێز دەژی و گەورە دەبێت، هەندێ ڕێزیش هەیە زۆر لە خۆشەویستی گەورەترە، زۆرجار ڕێز کە دەفرێت و گەورەدەبێت دەبێت بە خۆشەویستی، بەڵام کەمجار خۆشەویستی کە دەڕوخێت دەبێتە ڕێز.

نەغەدە و جافەرانی ماوەیەکی کورت پێکەوەبوون، دوای پێنج مانگ نیشتەجێبوون، شێخ جافەرانی لە ڕووداوێکی سەیر و تا ئێستەش نادیاردا کوژرا، لە دووری پێنج کیلۆمیتری گوندی ئاشوسوەوە هەندێک چەکداری نەناسراو بۆسەیەکیان بۆ دانا و لەگەڵ سێ پێشمەرگەی دیکەدا شەهیدیانکرد و ماشێنەکەشیان پێوە سووتاند. هەر لە سەرەتاوە گومانەکان هەموو لە سەر کەسی هەڤاڵ شێرخان بوون، ئەو بە درێژایی ئەو ماوەیە وەک جانەوەرێکی بریندار گینگڵی دەدا، وەک هەوری ڕەش دەینرکاند و ناڵینی لە هەموو جێگایەک دەبیسترا. هەر پیاوێک دوای نوشوستی لە بەردەم ئافرەتدا بووە جانەوەر، بووە کەسێکی بە هاتوهاوار، بووە مرۆڤێکی دڵڕەش لەوە دەکەوێت عاشق بێت، بەڵکو دەبێتە ڕۆحێک کە لە سەرەتاوە بەدوای سەرکەوتنەوە بووە نەوەک بەدوای خۆشەویستییەوە. ئەو پیاوانەی لەلای ئافرەت بۆ سەرکەوتنە

گەورەکانی خۆیان دەگەڕێن، لە هەر چیزەیەک بن، سەر بە هەر نەتەوە و ئایدیا و توخمێک بن، جانەوەرێکی ترسناک لە ناخیاندایە کە هاتە دەرێ دەتوانێت زۆرشت وێرانبکات. وادەزانم ئەو قسانەم بۆ ئافرەتیش ڕاستە، من گەرچی هیچ کات ئادەمیزادێکی ڕۆمانسی نەبووم، بەڵام وێنەی عاشقی تێکشکاو هەمیشە لە ناخەوە جوڵاندومی، هەمیشەش وێنەی عاشقێکی دۆڕاوم لە وێنەی دوو عاشقی خۆشبەخت و بەختەوەر لا جوانتر بووە.

لەو ماوەیەی بەر لە شەهیدبوونیدا، کەسانێکی زۆر شێخ جافەرانیان لە مەترسی هەڤاڵ شێرخان ئاگادارکردەوە، بەڵام شێخ بە جۆرێک لە ئازایەتی خۆی دڵنیابوو، باوەڕی نەدەکرد بەو جۆرە زەفەری لێبهێنن. شێرخان ئەو کات لە هەموو جێگایەک هەڕەشەی ئاگرینی جێدەهێشت و هەر کات لە سەر ئەو بابەتە بهاتبایەتە قسە، وەک بروسکەی سەر سیحربازان چەخماخەی دەدا. کە شێخ جافەرانی کوژرا، ڕاستەوخۆ وابڵاوبووەوە کە دەستی شێرخان بووە، ڕوداوەکانی دواتریش ئەو گومانەیان تۆخترکردەوە. دوای تەواو بوونی پرسەکەی جافەرانی بە هەفتەیەک، هەڤاڵ شێرخان بە خۆی و هێزێکی گەورەوە خۆی کرد بە ئاشوسو دا و لەبەرچاوی هەموو خەڵکی گوند و لەبەر دیدەی ئەو فەرماندە تازەیەدا کە ئەنجومەنی باڵا لە جێگای شێخ دایناببوو، نەغەدەی ڕفاند. هاتوهاوار و قیژەقیژ و لەقەفرتێکانی خانم سوودێکیان نەبوو، شێرخان بە جۆرێک چاوانی سوور و لێوی ڕەش و نێو برۆیانی گرژ بوو کەس زاتی نەبوو بەری پێبگرێت. لەو ڕۆژەوە مێژووی خانمی ماردینیش بە جۆرێکی تر گۆڕدرا... ئەو جیهانە کێوی و دڕ و ڕام نەکراوەی ئەو بۆی دەگەڕا، ئەو جەنگەڵە تاریکەی ئێستا گەیشتبووە ناوەڕاستی کەم کەم دەستی دەخستە نێو ناخی و لە جەنگەڵێکی دڵڕەقی شاعیرانەوە دەبوو بە خاکی سامناکی جانەوەرە ڕاستەقینەکان. ئێستا ئەو دارستانە تاریک

و شوێنە ترسناک و سروشتە فراوانەی ئەو بەرەو ناخی هەڵهاتبوو، ڕووە هەرە ڕاستەقینەکەی خۆی پیشاندەدا، وەک جێگایەک ناتوانیت پیاسەی شاعیرانەی تیابکەیت، بەڵکو تەنیا دەتوانیت لە ناویدا قوربانی بیت یا ڕاوکەر. وەک جێگایەک ناتوانیت وەک شاعیر بچیتە ناوی و لەوسەریش وەک شاعیر بێیتەدەرێ.

ڕفاندنی خانم وەک ناڵەی بروسکەیەکی گەورە لە ناو شۆڕشدا دەنگیدایەوە، بەڵام شێرخان بێئەوی گوێبداتە ئاگادارییەکانی ئەندامانی دیکەی ئەنجومەنی باڵا، نەغەدە ماردینی لە شوێنێکی نهێنیدا شاردەوە، ئەوە سەرەتای وەرگەڕانی سەرکردەکانمان بوو بۆ یەزدانۆچکەی بچوک و سەربەخۆ، کە هیچ کەس ناتوانێت بەر بە خواست و ئارەزووەکانیان بگرێت. من ئەو دەم تەنیا دەمتوانی بە دوودڵی سەیربکەم و بە گومانبم ئاخۆ ئەم کردەیە لە قازانج یان زیانی شۆڕشدایە... ئەوکات هەموو شتێکم بەو پێوەرە دەپێوا و بەو چاوەوە سەیرمدەکرد. گەر لە قازانجی شۆڕشدا بایە کەسانی وەک نەغەدە ماردینی بە دەردی وەها بچن ئەوا بۆ نا؟ شۆڕش لە من و نەغەدە و هەموو کوردێکی دیش گەورەتر بوو. هەواڵی ڕفاندنەکە بە جۆرێکی بەربڵاو دەنگیدایەوە، بەڵام من دڵنیابووم لە بیرۆی باڵا شتێکی ئەوتۆیان بەرامبەر هەڤاڵ شێرخان بۆ ناکرێت، ئەو هێزێکی زۆر گەورەی لە بندەستدا بوو، بەشێکی زۆری ڕێکخراوەکانی ناو شار و شارۆچکەکان لای ئەوبوون، گەر هەڕەشەی یاخیبوونی بکردبایە زیانێکی کوشندەی دەگەیاند، بەتایبەت سەرۆک خوالێخۆش بێت، لەو جۆرە یاخیبوونانە زۆر دەترسا. وەک بیستم لە دوای دەنگەدەنگێکی زۆر لە دەفتەری سیاسی، جەنابیان گوتبووی « خۆ لە سەر ژنێک شۆڕشی مەزنی گەرەکەمان هەرناوەشێنینەوە» . هەڵبەت بۆ ئامانەتی مێژوویی دەبێت بڵێم، ئەو نەیگوتبوو «ژنێک»، بەڵکو وشەیەکی خراپتری بەکارهێنابوو، لێرەدا لەبەر حورمەتی گەورەم بۆ خانمی ماردینی ناینوسمەوە.

نەغەدە ماردینی بۆ زیاد لە ساڵێک تەواو ونبوو، جگە لەو تاقمە نزیکەی بە دەوری هەڤاڵ شێرخانەوە بوون هیچ کەس نەیدەزانی لە کوێیە. لەو ماوەیەدا بە جۆرێکی بەردەوام لەلایەن شێرخانەوە دەستدرێژی کرایەسەر، لە جێگایەکدا کە پڕ بوو لە کەللە سەری پشیلە، شێرخان ئەو ڕاستییە بە زۆر خستە سەری خانمی ماردینییەوە کە لەشی لەشی خۆی نییە، بەڵکو لەشی بەشێکە لە کەرەستە و ئەداتەکانی شۆڕش و دەبێت بیخاتە خزمەتی شۆڕشگێڕانی وەک ئەوەوە.

دوای مانگێک لە ڕفاندنی ماردینی، هەواڵەکە لە سەر زاری گەورەو بچوک بوو، ئێوارەیەکیان ئەردەڵان هیرانی هات بۆ لای من و چاوانی ئاگری لێدەباری. هیرانی بە جۆرێک لە ناوەوە سەرقاڵی ڕێکخستنەکان بوو، ئاگای لەو شتانە نەبوو کە لە چیا دەگوزەرێن، بەڵام بە چاوانیدا زانیم تورەیە، بە توندییەوە گووتی «کچێکی پاک و بێگەرد و شاعیرم دانەدەست، بزانە چیتان لێکرد، ئێوە جانەوەرن... مرۆڤن... چیین؟. ئێستا من نازانم چۆن سەیری باوکی بکەم، نازانم چۆن ئەم چیرۆکە بگێڕمەوە و بە برادەرە شۆڕشگێڕەکانم بڵێم چی؟». بەقسەکانیدا دیاربوو کە دڵی لە حیزب ڕەشبووە، بە درێژایی ئێوارەکە وەک چۆلەکەیەکی زامدار لە ژوورەکەمدا هات و هاواری بوو، من بەردەوام دەمگووت «شتەکان دەبێت بەوجۆرە بڕۆن کە خواستی شۆڕش دەخوازێت». ئەوە تاکە ڕستەیەک بوو کە قووڵ بڕوام پێبوو، بێئەوەی بە تەواویش بزانم خواستی شۆڕش چییە و چی دەخوازێت. دواجار بەر لە ماڵاوایی سەیری منی کرد و گووتی «شۆڕش یان مرۆڤ ڕزگاردەکات و دەیکات بە کەسێکی ئازاد، یان دەبێت بە قوتابخانەیەک بۆ دروستکردنی جانەوەر... هەڤاڵ جەنگیز پێمبڵێ ئەم شۆڕشەی تۆ کامیانە؟». من کاتێک وەڵامی تەواوەتی ئەو پرسیارەم زانی کە چیتر دەمم بە هیرانیدا نەدەگەیشت وەڵامیبدەمەوە. ئەو ڕۆژە کە منی بەجێهێشت، من بە خێرایی ڕاپۆرتێکم بۆ سەرۆکەکانم نوسی و

ترسی خۆم دەربەق بە هیرانی بەیانکرد، تەواوی قسەکانیم وەک خۆی بۆ برادەرانی ئەنجومەنی بالا گواستەوە، بەلام بەر لەوەی وەلامی ئەوانم پێبگاتەوە، هەڤال ئەردەلان هیرانی لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکدا و لە هەلومەرجێکی سەیر و ناوازە و ئالۆزدا گیرا و دوای سالێک زیندان و ئەشکەنجە کە قارەمانانە بەرگەی هەمووی گرت، فەرمانی سێدارەی بۆ دەرچوو. پاش دوو مانگ چاوەڕوانی لە ژووری سێدارەدا، لە لێبوردنێکدا حوکمەکەی بۆ بوو بە هەتاهەتایی و دوای چەندین سال زیندان، سالی ١٩٩٢ ئازاد بوو. کە هاتەدەرێ بووبوو بە پیاوێکی تێکشکاو، بێئەوەی چاوەڕوانی هیچ پاداشتێک لە شۆڕش بکات، شەوێک لەگەل کۆمەلێک نەفەری دیکەدا بەرەو یۆنان کەوتە ڕێ و ئێستا دەمێ سالە لە سوید دەژی، هەرگیزیش جارێکی دی نەگەڕایەوە بۆ کوردستان. لەمسالانەی دواییدا هەندێجار کە سەیری ئینتەرنێت دەکەم، بە سەرێکی سپی و دەموچاوێکی چرچ و نیگایەکی نائومێدەوە دەیبینیم لەم مالپەڕ یان ئەوی دیدا، جنێو بە حیزب دەدات و غەمی دێرین هەلدەڕێژێت، بێئەوەی هیچ جارێک ناوی من یاخود خانمی ماردینی بهێنێت.

# زیندانی بورج

لە بەشی کتێبخانە، لە ژوورێکی هێمن و پاکوتەمیز و بێدەنگدا بە ئاگاهاتمەوە.

گەر بەرپرسەکان لەوێ نەبوونایە، ژوورەکەم بە ڕەهایی بێدەنگ بوو، وادروستکرابوو هیچ دەنگێک لە دەرەوە نەیەتە ژوورێ، بێدەنگی موتلەق، بێدەنگییەک کە وردە وردە وەک سەنگێکی مەزن لە سەر ڕۆحت دەنیشێت و بچوکتدەکاتەوە و دەتخنکێنێت... من پێشتر هەرگیز نەمدەزانی بێدەنگی

مرۆڤ وەها ئەشکەنجەدەدات، نەمدەزانی بێدەنگیی وات لێدەکات، چۆن تینوویەک بۆ قومێک ئاو دەگەڕێت، تۆش بۆ بچوکترن دەنگ بگەڕێیت. بەڵێ، کتێبخانەکە بە ڕەهایی بێدەنگ بوو. من لەوێ دوو بەرپرسی تایبەتیم هەبوو کە هیچ جۆرە نیشانە و ڕوتبەیەکی سەربازییان پێوە نەبوو، یەکێکیان ناوی مولازم سەرهەنگ بوو، ئەویدیان کچێکی گەنج بوو بە ناوی مولازم گزنگ، کە بە روخسار و باڵا زۆر بە مولازم شانازی دەکرد، بە جۆرێک سەرەتا هەر وامدەزانی ئەوە. هەر دووکیان پێکەوە سەرپەرشتی فایلەکەی منیان دەکرد، جێگاکە جگە لە شوێنێکی نەرم و هێمنی خەوتن، مێزو کورسییەکی تێدا بوو بۆ نوسین، مێزو کورسییەکی دیکەش بۆ نانخواردن، دیوارەکانی ژوورەکە سەرلەبەر ڕەفەبوون، بەڵام پڕ لە کتێبی سپی، کتێبگەلێک هیچ شتێکیان تێدا نەنوسراوە، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی لەوێیە بیری بێت تەنیا شتێک دەتوانێت لێرە بیچێژێت بێدەنگییە، بۆ ئەوەی سپێتی کتێبەکانیش ببنەوە بە بێدەنگی، بۆ ئەوەی وردبوونەوەی درێژ لەو لاپەڕانە، قورسایی بێدەنگییەکان گەورەتربکەن، بۆ ئەوەی جگە لە دەنگی ناخی خۆت، دەنگێکی تر نەبیستیت. سەرەتا مولازم هەموو شتێکی ژوورەکەی بۆ روونکردمەوە و پێیگوتم کە دەبێت لەمڕۆوە دەست بە نوسینەوەی ئەو چیرۆکە بکەم کە وایکرد من ڕێکخراوێکی نهێنی دروستبکەم و بیر لە نوسینەوەی یاداشتەکانم بکەمەوە و بمەوێت ناوی حیزب و سەرۆک و پیاو و ژنە شۆڕشگێڕەکانی وڵاتەکەم لکەدار بکەم. بە دەنگێکی ئاسایی کە پڕبوو لە هێمنی و ئاوازی برایانە، گوتی «جەنابی کاک جەنگیز، نامەوێت بتنێرم بۆ ئوتێل یاخود مەخزەن یان قوفڵخانە. من بە برای خۆت حیساب بکە، وادەزانم پێکەوە دەتوانین شتەکان بە جۆرێک دابڕێژین تۆ لێرە سەلامەت ڕزگارتبێت، کارێکدەکەین شتەکە زوو ڕاییبکەین و بەخێرایی بچیتەوە سەر ئیشەکەی خۆت». گەرچی دەمزانی ئەو قسانە درۆیەکی

سـادە و منداڵانـە و ڕۆژانـەی هەمـوو پیاوێکـی ئاسایشـە، کەچـی وەختەبـوو باوەڕی پێبکـەم. مولازمەکانـی بـورج پێکـڕا بـە جۆرێـک پرۆفیشـناڵ و لێـزان بـوون منیـان سەرسـامدەکرد. ئاشـکرا لـە سـەر دەسـتی هەندێـک پسـپۆڕی بیانییـدا گەورەبووبـوون، هەمـوو شـتێکیان بـە حیسـاب بـوو، لـە سـەر جوڵاندنـەوەی دەسـت، تەعبیـری دەموچـاو، نمایشـی دەنـگ مەشـقی زۆریـان کردبـوو، گەلێـک ڕاسـتگۆ و سروشـتی دەردەکەوتـن، هـەر لـە سـاتی یەکەمەوە بـڕوا و متمانەیـان بـە دەسـت دەهێنایـت و دەکەوتیتـە ژێـر ئـەو کاریگـەرە موگناتیسـییەوە کـە لـە دەنـگ و نیگایانـدا بـوو. مـن دەبـوو خێـرا خـۆم ڕاوەشـێنم و لـە نیهـادی خۆمـدا بڵێـم «هێـی جەنگیـزی بێمێشـک چییتـە؟ دوای سـی و چـوار سـاڵ کاری ئاسـایش ئێسـتا گەنجێکـی گەمـژە خەریکـە بـە دوو بـەردان لـە خشـتەت دەبـات». مـولازم سـەرهەنگ قەڵەمێکـی ئێجگار جوانـی دامـێ، مـن خـۆم عاشـقی قەڵەمـی جـوان بـووم، وەک شـێت بەدوایدا دەگـەڕام، لـە دەفتەرفرۆشـی و کتێبخانـەکان ڕامدەسـپارد قەڵەمـی جوانـم بـۆ دابنێـن، بـەڵام تـا ئـەو کات شـتی وا ناسـکم نەدیبـوو، قەڵەمێـک بـوو حەزتدەکـرد چـی لـە ناخـی دڵتدایـە پێیبنوسـیت، چـی لـە ڕۆحتدایـە بـەو نوکـە باریکـەی بیدرکێنیـت. مـن قەڵەمەکـەم وەرگـرت و بـە سەرسـامییەوە سـەیرمکرد و گووتـم «قەڵەمێکـی قەشـەنگە، شـتی وام تـا ئەمـڕۆ نەبینیوە». مـولازم گزنـگ کچێکـی باریـک و بـە ویقـار و بەڕێـز دیاربـوو، گووتـی «ئێمـە هەوڵدەدەیـن شـوێنێکی بـاش بـۆ میوانەکانمـان دابینبکەیـن. میوانخانـەی ژمـارە سـی و سـێ، وەک زیندانەکانـی ئێـوە نییـە لـە خـوارەوە، لێـرەدا کـەس ناتوانێـت پەنجەیـەک چییـە بـۆ میوانەکانـی بەرێـت، ئازاردانـی جەسـتەیی ڕاسـتەوخۆ بـە هەمـوو جۆرێـک قەدەغەیـە، تەنیـا دەمانەوێـت بـە هێمنـی بگەینـە هەقیقـەت... ئـەوە فەرمانی جەنابی سـەرۆک و پرۆفیسـۆر شـالیارە». دوای دوو کاتژمێـر قسـەو ڕوونکردنـەوە، منیـان بـە تەنیـا بەرامبـەر مێزێـک و دەفتەرێکـی سـپی و قەڵەمێکـی ناسـک بەجێهێشـت. مـن بـە درێژایـی ژیانـم

شتم نوسیبوو، تاکە شتێک لێی نەدەترسام قەڵەم و دەفتەر بوو، بەڵام ئێستا بۆ یەکەمجار هەستم بە ترسێکی گەورە دەکرد. هەموو شتێکم دەبەخشی بەس لێگەڕێن لەم ژوورە بچمەدەرێ و لەم دەفتەرە سپییە دووربکەومەوە. کە ئەوان ڕۆیشتن قەڵەمەکەم هەڵگرت و چوومە بەر پەنجەرەی ژوورەکەم، ڕووبەرێکی گەورەی شار لە پەنجەرەکەوە دیاربوو، هەتا دەمتوانی بە مەزەندە بزانم ماڵی خۆمان دەکەوێتە کوێوە، کەوتمە خەیاڵی ئەوەی ئاخۆ ئەزمێرا توانیبێتی نامەکان ببات بۆ ڕۆژنامەی عەزیزم وەتەن، یان گۆڤاری بوهاران. ئاخۆ ڕۆژنامەکان جورئەتی ئەوە دەدەنە بەر خۆیان نامەکەم بڵاوبکەنەوە؟ ئایا گەر بڵاوبێتەوە لە قازانجی منە یان دەبێتە مایەی بەدبەختی تەواوەتیم؟.

دەبوو تا شەو شتێک لە دەفتەرەکەدا بنوسم، یاساکان لەو ڕووەوە زۆر توندڕەو بوون، هەر کەس سێ ئێوارە لە سەر یەک هیچی نەنوسیبایە، یان کەمی بنوسیبایە، یەکسەر لە بەشی کتێبخانەوە دەیانگواستەوە بۆ ئوتێل، ئوتێل جەهەنەمێکی ڕاستەقینە بوو. هەرچییەکم کردوە نەدەبوو زوو بکەومە ئەوێ، دەمزانی درەنگ و زوو هەر چارەنوسم ئەوێیە و گەر لەوێش ڕزگارم بێت، لەوانەیە بۆ هەتا هەتایە بمنێرن بۆ مەخزەن، شوێنی ئامێرە ستۆکەکان، گەنجینەی مەکینە شکاو و بێکەڵکەکانی حیزب. وەک مولازم گزنگ پێیگووتم، وەک سەرەتا باشترە لەوەوە دەست پێبکەم چۆن خەیاڵی ئەم ڕێکخراوە دەستی پێکرد؟ لە چییەوە سەریهەڵدا؟. من گەڕامەوە سەر دەفتەرە سپییەکەم و نوسیم «بەڕێزان... ئەی ئەوانەی ئەم چیرۆکەی منتان مەبەستە و حەزدەکەن هەموو ڕاستییەکان بزانن. ئایا ئێوە باوەڕتان بە بوونی فریشتە هەیە؟ ئاخۆ ڕۆژێک لە ڕۆژان بیرتان لە ماهییەتی فریشتەکان کردۆتەوە؟ چۆن سەیری پەیوەندی خۆتان و فریشتەکان دەکەن؟ فریشتە لای ئێوە چییە؟. گەر لەم سەرەتایەوە دەست پێ نەکەم، ئەستەمە دەست پێبکەم. هەموو شتێکی ئەم

چیرۆکەی من لە دەوری مرۆڤ و فریشتە دەسوڕێتەوە... گەر دەتانەوێت تێبگەن، دەبێت بزانن من وەک هەر ئادەمیزادێکی دیکەی دونیا جارێک لە جاران فریشتەیەکم هەبووە». ئەوە ئەو چەند ڕستەیەی سەرەتایە کە چەندین جار و بە چەندین شێوە دامرشتنەوە، تا دواهەمین شێوە و فۆرمی خۆیان وەرگرت. دواتر لەو جێگایەوە دەستم بە چیرۆکەکەم کرد کە یەکەمجار هەستم بە بوونی دوو باڵی گەورەکرد بە پشتمەوە. سەربوردی یەکەم ڕۆژی ئەو بینینە و یەکەم ساتەکانی ئەو هەستەم نوسی. ئێوارە، هەردووک مولازم پێکەوە گەڕانەوە و بە خۆشحاڵییەوە بەرامبەرم دانیشتن و داوای ئەو نوسینەیان کرد کە ئەمڕۆ نوسیبووم. سەرەتا مولازم سەرهەنگ بە وردییەکی بێوێنەوە نوسینەکەی خوێندەوە و بە هێمنی و نائومێدییەوە خستییە بەر دەست مولازم گزنگ، کە ئەویش هەمانجۆر خوێندییەوە و دوای تەواوبوونی هەناسەیەکی نائومێدی هەڵکێشا، هەردووکیان سەیرێکی یەکدیان کرد، ئاشکرابوو لەم سەرەتایەی من نەک هەر نائومێدن، بەڵکو تورە و نیگەرانیشن. مولازم سەرهەنگ لەگەڵ خانمی هاوڕێیدا، کە هەردووکیان کراسی سپی و پانتۆڵی ڕەشیان لە بەردابوو، بۆ ئێستێکی کورت چوونەدەرەوە و پاش چەند ساتێکی کورت پێکەوە گەڕانەوە. مولازم سەرهەنگ بە خەفەتێکەوە دانیشت و گوتی «جەنابی هەڤاڵ جەنگیز. تۆ لێرە لە شوێنێکی گرنگدایت، باوەڕت بێت نهۆمی سی و سێی بورج لە نهۆمە هەرە گرنگەکانە بۆ حیزب و دەوڵەت، سەرۆک خۆی چاوەدێریدەکات، پرۆفیسۆر شالیار بە شادەماری حکومەتی دەزانێت، ساڵانە سەرۆکی پەرلەمان ئەگەر جارێک سەردانمان نەکات، دووجار سەردانماندەکات. ئەم میوانخانەیە نیشانەی گەشە و پێشکەوتنی عەقڵی حیزبە لە بیست ساڵی ڕابوردوودا، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ئێمە میللەتێکی پێشکەوتووین. هەموو شتەکان لێرە بە عەقڵییەتێکی نوێی بەڕێوەبردن ڕێکخراون، هیچ شتێک نییە بە

ژێر دەستی کەسانی پسپۆڕدا نەڕوات، ئیشەکانی ئێرە وەک یاساکانی ماتماتیک هەڵە قەبووڵ ناکەن. تۆ خۆت ساڵانێک بەڕێوەبەری دەزگای ئاسایش بوویت، دەزانیت لە نێوان پرسکار و تاوانباردا دەبێت عەقڵ زاڵ بێت... ئەم بورجە گەورەیە کە ئێستا من و تۆ تیادەژین و بەرهەمی خوێنی هەزاران شەهیدە، بە عەقڵ دروستکراوە، لێرەوە هیچ شتێک لەوە ترسناکتر نییە، شتێک بهێنین کە لەگەڵ عەقڵدا نەگونجێت، شتێک بیەوێت لە عەقڵمان دووربخاتەوە... وانییە هەڤاڵ جەنگیز؟»

من دەمزانی دەیەوێت بگاتە کوێ، لە بەرئەوە خۆم متکرد و نقەم لە خۆم بڕی و هیچم نەگووت.

خانم قەڵەمەکەی منی هەڵگرت و گووتی «هەڤاڵ جەنگیز ئەم چیرۆکەی تۆ نوسیوتە، دەتەوێت بینێرین بۆ سەرۆک یاخود بۆ مندالانی باغچەی ساوایانی بورج لە نهۆمی بیست و شەش، دەتەوێت گاڵتە بە عەقڵمان بکەیت یاخود چی. ئێمە دەزانین بەڕێزتان بەڕێوەبەری ئاسایشی گشتی بوون، خەباتگێڕێکی دێرینی گەلەکەمانن، دەزانین دەتوانن لە خەڵکی تر زیاتر یارییبکەن و پێچ و پەنا بدۆزنەوە و تەپوتۆز لە دەوری تاوانەکەی خۆتان دروستبکەن، منیش و مولازم سەرهەنگیش لەوە تێگەیشتووین، وانییە مولازم؟» . مولازم سەرهەنگ بە سەر وەڵامی خانمی دایەوە، بەڵام بە چاوێکی بێزار و جیدی هەر سەیری منی دەکرد. دواتر خانم گووتی «دەزانم لە بەرئەوەی بەڕێزتان خەباتێکی دوور و درێژتان هەیە، کەسانی وەک ئێمە، نەوجەوانانی حیزب، کادیرە نوێیەکان بە هەند وەرناگرن، هەر لە بەرئەوەش ئەم چیرۆکەت نوسیوە، وەک سوکایەتی بە توانا و تێگەیشتنمان بکەیت. نا هەڤاڵ جەنگیز ئێمە لێرە بەسەبرین... تۆ دوو ڕۆژی تریشت هەیە، بۆ ئەوەی بەراستی دەست پێبکەیت. ئەوە ئاساییە، ئەم لاپەڕانە دەدڕێنین وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت. هەموو میوانەکانی ئێرە، زۆربەیان وەک تۆ وەهان، زۆربەیان

یەکەم ڕۆژ هەوڵدەدەن کە چیرۆکێکی خۆشی خەیاڵیمان بۆ دروستبکەن، ئەوە بەشێکە لە ئەزموونی ئێمە، بەڵام لەو باوەڕەدانەبووین تۆ وابکەیت. بەس لە هەموو شتێک دەرچێت، هەستدەکەم دەستێکی باشی چیرۆکنوسینت هەیە، بەڵام بەداخەوە لێرە تەنیا هەقیقەتمان دەوێت، هەقیقەتێک لەگەڵ عەقڵدا بگونجێت. هەڤاڵ گیان ئەمە دەدڕینین و لە سەرەتاوە دەست پێدەکەینەوە، وادادەنێین ئەمڕۆ هەر نەبووە».

من دەمزانی لە دۆخێکی دژواردام، بێئەوەی هیچی دی لە خەیاڵمدا بێت گووتم «ئەگەر ڕاستیتان دەوێت، ئەوا ڕاستی لەوێوە دەست پێدەکات، ڕاستی لەو جێگایەوە دەست پێدەکات کە نوسیومە، بەبێ ئەو سەرەتایە ناتوانم هیچ شتێکتان بۆ بگێڕمەوە، من ڕۆژێک لە ڕۆژان لە سەر چەمی سووریاوان سەیرمکرد و لە پشت خۆمەوە هەستم بە بوونی جووتێک باڵی گەورە کرد، دوو باڵی زۆر گەورە و ڕاستەقینە. ئەوە سەر لەبەر ژیانی گۆڕیم... لەو ڕۆژەوە بووم بە خاوەنی دوو باڵی گەورە و نەبینراو... گەر وەک سەرەتا باوەڕ بەوە نەکەن ، دواتر باوەڕ بە هیچ بەشێکی دیکەی چیرۆکەکە ناکەن، چونکە ئەوەی دواتر دێت لەوە سەیرتر و عاجباتی ترە». ئەوەم بە دەنگی کەسێک گووت، هەم هەقیقەتی تەواو بدرکێنێت، هەم لەوە زیاتریش چیرۆک و سەربوردی بۆ حیکایەت پێ نەبێت . مولازمەکانی ئێرە بۆیان نەبوو تووڕەببن، هەموو شتێک دەبوو سارد و هێمن و میکانیکی بێت، بەڵام هەستمکرد هەردووکیان خەریکە لە پێستی خۆیان دەردەچن. من بەساردییەکی بێوێنەوە، ساردییەک جاران لە شوێنی حوکمڕانەوە هەستم پێدەکرد و ئەمجارە لە شوێنی کەسێکی دیل و زیندانەوە، گووتم «سبەینێ و دوو سبەیی و تامردنیش لێرەدا دیلمبکەن، هەر ئەوە سەرەتای ڕاستەقینەی چیرۆکەکەیە، لە بەرئەوە چاکترە ئەوەی نوسیومە هەر ئێستا وەک هەقیقەت وەریبگرن، تا من بتوانم بەردەوامبم، چونکە دەبێت بزانن کە هەقیقەت هەزار ڕووی هەیە».

لە هەندێک ساتدا دوو جۆر تێگەیشتنی ڕاستی بە جۆرێکی توند بەریەکدەکەون، من لەو چەند ساڵەدا فێربووبووم کە مێژووی مرۆڤ لە مێژووی گومانەکانی دەرهەق بەوانیدی جیانابێتەوە، بۆیە هیوایەکم نەبوو ئەم دوو مولازمە گەنجە کە ڕاهاتبوون مرۆڤ وەک هەر مەتریالێکی دیکە، وەک تەنێک لە تەنەکان، شتێک وەک ئاسن و شوشە و تەختە تەماشابکەن لەم چیرۆکە تێبگەن. بۆ ئەوەی لە هەندێک ڕاستی تێبگەیت، پێویستت بەوەیە تێگەیشتنی خۆت سەر لەبەر دەربارەی ڕاستی بگۆڕیت، ڕاستی ئەو شتەیە کە هەمیشە نیوەی نابینرێت، ئەوەشی باوەڕی بەو نیوە نەبینراوەی ڕاستی نەکرد، هەرگیز ناتوانێت لە مانای نیوە بینراوەکەشی تێبگات. ئێمە هەموو ئەو پیاوان و ژنانەی لە دەزگاکانی ئاسایش کارماندەکرد لە سەرەتاوە ڕاهاتبووین تەنیا بەشێکی ڕاستی ببینین... بەشێکی بچوکی و هیچی تر، لەوەش ترسناکتر لە سەر ئەوە کۆککرابووین و خەیاڵمان ڕێکخرابوو کە ئەوە هەموو ڕاستییە. ترسناکترین مرۆڤیش ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە بوونی ئەو بەشە نەبینراوەی ڕاستی نییە، چونکە هەموو ژیانیان بۆ ئەوە تەرخاندەکەن، دژایەتی ئەوانە بکەن کە هەوڵدەدەن ئەو نیوە نەبینراوەی تریش ببینن، بە جۆرێک ئەم ئەستێرەیە دابەشدەکەنە سەر دوو نەتەوە و سەر دوو ڕەگەزی گەورە، ڕەگەزێکیان لە ناو ڕاستییە بینراوەکاندا نوقمدەبن و هیچ ئاسۆیەکی دیکە نابینن، ڕەگەزێکیش کە جارێک لە جارەکان و بە هۆی شتێکەوە سنوورە دوورەکانی هەقیقەت دەبینێت و بەرەو تخوبە بێکەرانەکانی دەکەوێتە ڕێگا... دوو ڕەگەز و دوو نەتەوە کە هیچ شتێک کۆیان ناکاتەوە، سیاسەتمداران و ئەکادیمیستەکان و پیاوانی دین و پیاوانی ئاسایش و میلیتاریستەکان و هەندێک لە زانایانیش لە ڕەگەزی یەکەمن، بەڵام ڕەگەزی دووەم شێتەکان و شاعیرەکان و سۆفییەکان و گەڕیدەکان و هونەرمەندان و هەندێک لە زاناکان دەگرێتەوە. ئەم

دوو ڕەگـەزە نـە لەبیرکردنـەوەی یەکتـری تێدەگـەن و نەدەشـتوانن یـەک زمانـی هاوبـەش بدۆزنـەوە. مـن و هـەر دوو مولازمـە عاقـڵ و ڕێکپـۆش و بەنەزاکەتەکەی بورجیش لـەو کێشـەیەدا بووین، هەردووکمـان بـە دوو زمانـی جیاواز قسـەماندەکرد ئـەوان وا فێرکراوبـوون تەنیـا باوەڕیـان بـە هەقیقەتـی بینـراو هەبێـت، هەقیقەتێـک فێرکـراون، خوێندویانـە، پێیـان وتـراوە، منیـش بـە ڕەوتێکـی دووروودرێـژی گۆڕانـکاری و بـە ڕێگایەکـی پـڕ بـەرز و نزمـی ترسـناکدا گەیشـتبوومە ئـەوەی لـە جـۆرە جنسـی یەکەمـەوە، لـە پیاوێکـی ئاسایشـەوە کـە لـە سـەر یەقیـن کاردەکات بـەرەو جنسـی دووەم، بـۆ توخمـی شـێت و دوودڵ و پڕگومانـەکان بگوازمـەوە.

دڵنیابـووم کـە ناتوانـم چیرۆکەکـە بـە جۆرێکـی تـر بگێڕمـەوە، ئـەوەی لـە سـەر چەمـی سـووورباوان لـە مـن ڕوویـدا سـەرەتای هەمـوو شـتەکان بـوو، مـن ڕۆژێـک هەسـتام و سـەیرمکرد بـووم بـە بوونەوەرێکـی باڵـدار، بـووم بـە باڵندەیەکـی زل و عەجایـەب... دوای ئـەو ڕاسـتییە کەوتـم و گەیشـتمە ئـەم بورجـە ترسـناکە.

هـەر دوو مـولازم لـەوە دوودڵ بـوون، ئاخـۆ مـن شـێتم یـان فێڵیـان لێدەکـەم. چیرۆکەکـەی مـن لای ئـەوان سـەرەتای تاکتیکێـک بـوو بـۆ دوورخسـتنەوەی ڕێـگاکان و پێچکردنـەوە بـەدەوری نیـازی ئەوانـدا. ئـەوی ڕۆژ چیرۆکەکەیـان لـە بەرچـاوم دڕانـد و لەگەڵمـدا ڕێکەوتـن سـبەینێ، چیرۆکێکـی تـەواو جیاوازیـان بـە سـەرەتایەکی جیـاوازەوە بـۆ بنوسـمەوە. منیـش دەبـوو هەمـان چیـرۆک لـە شـوێنێکی تـرەوە دەسـت پێبکەمـەوە، بـە ئومێـدی ئـەوەی کـە ڕادۆزان بێنـە سـەر ئـەو بڕوایـەی ئـەم چیرۆکـە لـە سـەرەتاوە تـا کۆتایـی چیرۆکـی فریشـتەکانی منـە و جگـە لـەو سـەربوردەش، مـن چیرۆکـی تـرم نییـە بیگێڕمـەوە. بەیانـی ڕۆژی دووهـەم، قەڵەمـە قەشـەنگ و ناسـکەکەم هەڵگـرت و کەوتمـە نوسـین «لـە سـاڵانی حەفتـادا و ماوەیـەک دوای هەرەسـی شـۆڕش، هاوڕێیەکـم کـە لێـرەدا تەنیـا بـە «ش» ناویدەنێـم، ئێوارەیەکـی

درەنگ بۆ پیاسەیەکی شەوانەی کورت لە ماڵی خۆیان لە گەڕەکی غەمپاشا چووە دەرێ. «ش» هەم کوڕێکی گەنج، هەم خوێندەوار، هەم لە مارکسیستە باوەڕدارەکانی ئەو سەردەمە بوو، ئەوەی چاوەڕوانی نەدەکرد و لە خەیاڵیدا نەبوو، ئەوە بوو لە شەوێکی وەهادا فریشتەیەک ببینێت. بەڵام لەو شەوەدا بۆ یەکەمجار، یەکەمین فریشتەی ڕاستەقینەی سەر زەمینی بینی... فریشتەیەک نە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا، نە لە تێکستە دینییە دێرینەکاندا و نە لەلای پەیامبەرانەوە ناوی نەهاتووە، فریشتەیەکی ئاسایی، مرۆڤێک بە دوو باڵی گەورەوە، ئەو کەسەی دەرگای دونیایەکی تری لە هەموومان کردەوە، مەهدائیل، مەهدائیلی فریشتە».

ئەو پێشەکییەم چەندین جار داڕشتەوە تا گەیشتە دوا فۆرمی خۆی.

بە هیوای ئەوەبووم کە مولازمە ڕادۆزەکان ئەمجارە ئەم سەرەتایەم لێقەبووڵبکەن، چونکە گەر ئەوەشیان ڕەتبکردایەتەوە نەمدەزانی بە ڕاستی چۆن و لە کوێوە هەوڵی گێڕانەوەی چیرۆکەکە بدەم. بەڵام ئەوجارە پەرچەکرداریان نائومێدانە و توڕەتر بوو. من تێنگەیشتم بۆ نایانەوێت چیرۆکەکەیان وەک خۆی بۆ بگێڕمەوە، هەستمکرد هەر کاتێک ناوی فریشتە و باڵەکانیان دەهێنم ئەوان بە درۆ حاڵی دەبن و دەمودەست وادەزانن لەگەڵیان وازی دز و قازی دەکەم. جاری سێهەم دواهەمین شانسم بوو، لە پێویستی ئینسانەوە بۆ فەنتازیای ژیانێکی تر دەستم پێکرد، بەدرێژی لە سەر ئەوە قسەمکرد کە لە ناو هەموو مرۆڤێکدا بەشێکی ناڕازیی هەیە، هیچ مرۆڤێک نییە لە ناخیدا دەنگێکی تر نەبێت، دەنگێکی توڕە، دەنگێک کە داوای جۆرە ژیانێکی تری لێدەکات. ئەو بەشە کەمێک هێورکەرەوەبوو، بەڵام مولازم گزنگ گوتی ئەوە بەس نییە، دەمانەوێت بێتەوەی کاتی زۆر بە هێنان و بردنەوە ببەیتەسەر، چیرۆکی ئەو ڕێکخراوە بگێڕیتەوە کە دروستتکردوە، سەرەتا ناوی ئەندامەکانی و دواتر وەزیفەکانیان و سێهەمین نیازتان لە پشت

دروستکردنییەوە. مانای شتەکان و تەفسیرە سەیرەکانیان هەڵگرە بۆ خۆت و ئێمە پێویستییەکمان پێ نییە. لەدوای ڕۆژی سێهەمەوە دوو ڕۆژی دی منیان لە کتێبخانە هێشتەوە، بەڵام من بڕیارمدا بوو هیچ نەنوسم، بەیانیان هەڵدەستام و قەڵەمەکەم دەگرت بە دەستەوە و بە خەتی خواروخێچ و بە زەربی گەورە دەکەوتمە ڕەشکردنەوەی کتێبە سپییەکان. بۆ ئەوەی خۆم لە جەبری ئەو بێدەنگییە سامناکە ڕزگاربکەم، کتێب کتێب و لاپەڕە لاپەڕە ڕەشمدەکردەوە، دیارە ڕەفتارەکەم مایەی سەرسامی و نیگەرانی هەر دوو مولازمی یاوەرم بوو. بەڵام من پێمگووتن کە ئەوان نایانەوێت گوێ لە چیرۆکە ڕاستەقینەکە بگرن و بە جۆرێک نوقمی ئەو سەیرکردنە مادییەی ژیان بوون، ئەوەیان بیرچۆتەوە کە هەم مرۆڤ و هەم شتەکان دیوێکی تریان هەیە بەو عەقڵە میکانیکییە ڕووتە تەفسیرناکرێن. بەڵام دوو ڕادۆزەکە هیچیان لەو قسانەم نەبیست و بە توڕەییەکی تێکەڵاو لەگەڵ حەسرەتدا منیان ڕەوانەی ترسناکترین جێگای زیندان کرد، «ئۆتێل»... شوێنێک خەڵکانێکی زۆری لە من گەنجتر و بەهێزتر لەوێ مردبوون.

# نەغەدە ماردینی لە جیهانێکی نوێدا

نەغەدە ماردینی لە زیندانەکەی هەڤاڵ شێرخاندا هەستیکرد چەند وەختە ئەو تەنیا بۆ دڵڕەقی دەگەڕێت. دڵڕەقی و هیچی تر، شاعیرییەت هیچ نەبوو لەلای جگە لە هەڵهاتن لە نەرمی و لاوازیی، لە ڕاکردن لە ژیانی ڕۆژانەوە بەرەو دارستان، لە گەڕانەوە بەرەو هەموو خواستە سەرەتاییەکان، بەرەو بە ئاگاهێنانەوەی جانەوەرە خەوتووەکانمان. لە دوو هەفتەی یەکەمی ڕفاندنیدا لەلایەن شێرخانەوە، هەموو شەوێک

شێرخان بە جۆرێکی دڕندانە و توند، وەک یەکێک لە ساتێکی دیاریکراودا برسێتییەکی جانەوەرانە بیگرێت، پەلاماری ماردینی دەدا، بە هەرچی توندیی و هێزێک لە گیانیدا هەیە لاقەیدەکرد. ماردینی لەگەڵ شێرخاندا قەت لەزەتی لە سێکسکردنە وەحشی و نەگەیو و زۆرکارەکەی نەدەبینی، بەڵام خۆشییەکی نهێنی و تایبەتی لەو توندی و دڵڕەقییە دەبینی، ئەویش بە هەمان توندی و دڵڕەقی بەرگری لە خۆی دەکرد، نەک وەک ژنێک بەرگری لە شەرەفی بکات، بەڵکو وەک ژنێک بیەوێت بە هەمان پلە دڕ، سەرەتایی، بێڕەحم بێت. ئەو ماوەیە یەکەم دابڕانی قووڵی خۆی لە شیعر ژیا، شێرخان هەموو شتێکی لێقەدەغەکرد. قەڵەم، کاغەز، ڕۆشنایی... بەڵام لە هەر شت سەیرتر لەلای نەغەدە ئەوەبوو، کە هەستی بە ئازار یان پەشیمانی نەدەکرد، بەڵکو هەستیدەکرد لەگەڵ هەموو نزیکبوونەوەیەکی شێرخاندا بێباکییەکانی گەورەتر دەبن، هەستیدەکرد لە منداڵییەوە توانایەکی ڕاستەقینەی لە سەر ئازار چەشتن و هەستکردن بە ئازاری ئەوانی تر نییە، دەتوانێت دەرهەق بە هەموو ژانێک بێباک بێت، ژانی خۆی و ژانی ئینسانەکانی تر، لەشی وادروستبووە دەتوانێت چێژ وەربگرێت و ئازار فەرامۆشبکات.

لە زیندانەکەیدا، لە شەوانی شەڕدا لەگەڵ پیاوێکی تەنگ ئەستوور و کەللەڕەق و دڕندەی وەک شێرخان، ئەوەندەی لەزەتی لەوە دەبینی کە شێرخان ناتوانێت ئازاریبدات، خەیاڵی لای شتێکی تر نەبوو، لەو سەردەمەدا نەغەدە هێزێکی ترسناکی دۆزییەوە، هێزێکی کوشندەتر و گەورەتر لە هێزی شیعر، لە هێزی سیاسەت، لە عەشق، لە جنس، ئەویش هێزی بێباکییە. هەستیدەکرد دەتوانێت تا ئەوپەری ئەوپەڕی دونیا بێباک بێت، هەموو کەسێک و هەموو شتێک فەرامۆشبکات. بە سەرسامییەوە سەیری ئەوەی دەکرد کە دەتوانێت چەند سارد و کەمتەرخەم بێت، دەتوانێت چەند دوور و بێمانا و بێهەست بیر لە موستەفا شوکاکی مێردی و نزار

ئیدریس و شێخ جافەرانی بکاتەوە. ئێستا هەر سێکیان سێ تارمایی مردووی بێڕۆح بوون، کۆمەڵێک سێبەری کاڵ کە جگە لە هەستێکی قووڵ بە ساردی و بێباکی هیچی تریان تێدا نەدەبزواند. دڵنیابوو جوانی شیعرەکانی دوور و نزیک پەیوەندی بە جوانی ڕۆحی خۆیەوە نییە، پەیوەندی بە قووڵی هەستەکانییەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەو شێتی و بێباکی و دڵڕەقییەوە هەیە کە لە ناخیدا هاواردەکەن. شیعرەکانی دەتوانن قەشەنگبن، لە بەرئەوەی دەتوانن بێباک بن، دەتوانن ستایشی ئەو دڕی و ساردی و مردنی بەزەییە بن کە لە گیانیایەتی. بەڵام نا... کە بیری لە قەسیدە دێرینەکانی دەکردەوە شتی کەی بەیادا دەهاتەوە. هەستیدەکرد ئەم بێباکییە نوێیە.. ئەم ئاوازە لە ساردی و بێرەحمی شتێکە لە ئەزەلەوە لەگەڵیدا نەبووە و ئێستا دروستبووە.

خۆشی نەیدەزانی بە تەواوی لە کوێیە، هەر کات شێرخان لە جێگایەکەوە بچوبایە بۆ جێگایەکی تر، بە دەست و چاوی بەستراوەوە ئەمیان پێشتر بۆ نزیک لە شوێنی نیشتەجێی ئەو دەگوازتەوە ، هەمیشە لە جێگای داخراو و پاسکراودا دایدەنا... سەرەتا ئومێدی بوو کە خێرا ئەم دەورانە تێبپەڕێ و شێرخان لە جەستەی بێزاربێت و لێیگەڕێت بڕوات، بەڵام تا زیاتر لە دڵڕەقی مرۆڤ ڕادەما زیاتر لە مان و نەمانی خۆشی دەترسا، دڵنیابوو شێرخان کەسێکە وەک خۆی بەڵام بە هێزی زۆرتر و وریایی زۆرترەوە، ئەو ناتوانێت وەک ئەم بێباک بێت، ناتوانێت نەترسێت، ناتوانێت بیر لە سڕینەوەی ئاسەواری گوناهەکانی خۆی نەکاتەوە. نەغەدە تا زیاتر لە ناخی خۆی دەڕوانی زیاتر لە شێرخانیش دەترسا، دەیزانی بێباکی تەنیا شتە کە دەتوانێت سنووری نەبێت. هەمیشەش لە خۆکوشتن یان کوشتنی ئەوانی دیدا تەواو دەبێت. لە ناخی دڵەوە بەختەوەربوو کە بێباکە، دەشیدەویست هەڵبێت بۆ ئەوەی ئەو بێباکییە بگەێنێتە ترۆپکی خۆی، دڵنیابوو شێرخان بە یەکجۆر

تێدەگات کە ئەم دڕتر و کێویتر و بەهێزترە، بەوەی لەدەستی هەڵبێت. دەبوو شێرخان تێبگات کە پەلاماردانی ژنێک و لاقەکردنی مانای ئەوە نییە، توانیویێتی بیکات بە موڵکی خۆی. مرۆڤی بێباک کەسێکە ناتوانێت هیچ ببەخشێت، چونکە بۆ ئەوەی بەخشندەبێت، پێوستە دەرهەق بە خۆی و دونیا بێباک نەبێت، بەخشندەیی ئەوپەڕی وابەستەگییە بەوانی ترەوە. لە بەرئەوە شێرخان قەت نەیتوانیبوو جەستەی بۆ خۆی بەرێت، لەشی بۆ هەتاهەتایە لەشی خۆی بوو، لەشی ئافرەت یان دەبەخشرێت یان هەرگیز پێی ناگەیت، ئەوەش ئەو موعجیزە گەورەیەیە کە ژن دەکات بە مەخلوقێکی ناوازەی نێو هەموو مەخلوقات. بەڵام بەوەدا نەغەدە ماردینی ئێستا دەرهەق بە تەواوی گەردون سارد و بێهەست و نەگیر بوو، گرتنی تا سنووری مەحاڵ سەخت بوو، شێرخان دەیتوانی تەنیا دەستی لێبدات، بەڵام گرتن یان وەرگرتن یان کرانەوەی خانمانە بۆ عەشق شتێک بوو لە جیهانی سارد و بێباک و بێبەخششی نەغەدەدا بوونی نەبوو. دڵنیابوو جەستەی بەوجۆرەی کە خۆی بە نزار یان شێخ جافەرانی بەخشیووە، شێرخان هیچ کات نایبینێت و نایگاتێت. تا ماوەیەکی زۆرتر بە سەر گرتن و دەستبەستیدا بڕۆشتبایە، شێرخان و پاسەوانەکانی وریایی و زیرەکی و هەست تیژی خۆیان زیاتر دەدۆڕاند. لە مێژووی هەموو دیلێک و خاوەن دیلێکدا ساتی فەرامۆشی هەیە کە دیل لە یادی دەچێتەوە دیلە و خاوەندیلیش ئەوە لە یاددەکات خاوەندیلە. هەر دیلێک بۆ ئازادی بگەڕێت ئەو ساتانە ئیدیالترین و باشترین ساتن بۆ هەڵهاتن. دەبێت بڵێم کە ماردینی ئازادی خۆی لە هەر شتێکی دونیا زیاتر خۆشدەویست، چونکە ئازادی لای ئەو هیچ نەبوو جگە لە مافی بێباکبوون دەرهەق بە هەموو دونیا، لەو ساتەوەی لە شار هاتبووە دەرێ و بۆ یەکەمجار بەراستی ئازادی خۆی دەستکەوتبوو، تێگەیشتبوو ئازادیش وەک دیلی چەندین دەموچاوی هەیە... ئەوەش

کێشە هەرە سەخت و بێچارەکەیەتی. کێشەی گەورەی مرۆڤ ئەوە نییە کە تەنیا کۆیلەیەتی ترسناک و غەمگین و نادادپەروەرە، بەڵکو ئازادیش هەمانشێوە، دەشێت شانۆی ترس و بێباکی و کارەسات بێت. نەغەدە دەیزانی مرۆڤی بێباک تاکە مرۆڤێکە دەتوانێت لە هەموو سەردەم و زەمینێکدا بژی، دەتوانێت فێڵ لە هەموو دونیاکان بکات، بەساردی و هێمنی و بێغەم دەمامکەکانی خۆی بگۆڕێت، بچێتە سەر هەموو سەحنەیەک و هەموو نمایشێک بکات.

شەوێکیان شێرخان زۆر ماندووبوو، پێدەچوو مەودای درێژی بڕیبێت و کاری سەختی بۆ شۆڕش ئەنجامدابێت، بەرگری بێپەروای نەغەدەش لە خۆی هێندەی تر ماندوویکرد. وەک شتێک بێهۆشیکردبێت، وەک دڵنیاییەکی کوشندە کە ناویدەنێم «دڵنیایی گەمژانەی پاسەوان» دەرهەق بە دیلەکەی خاویکردبێتەوە، لە تەنیشت نەغەدەوە بێترس خەوێکی قووڵی لێکەوت... نەغەدە بە هێمنی کلیلی قفڵی زیندانەکەی خۆی لە گیرفانی شێرخان دەرهێنا و قفڵەکەی کردەوە و لە درزی دەرگاکەوە سەیریکرد بزانێت هیچ کەس دیار نییە، دەیزانی کە شێرخان دێت، هەموو پاسەوانەکان دەنێرێت بۆ پشوو تا کەس گوێی لە نرکە و هاوار و جەنگ و جەدەلیان نەبێت، پاسەوانەکان تەنیا دوای ڕۆیشتنی خۆی و بە فەرمانی تایبەتی دەگەڕانەوە. قەت نەبوو وا بێئیحتیات بێت و بخەوێت، هەرکات دەهاتە ژووری، لە ناوەوە دەرگاکەی کلیلدەکرد و هەر کاتیش دەڕۆیشت لە دیوی دەرەوە توند بە قفڵ و کڵۆم و زنجیر دەیگرت. نەغەدە دڵنیابوو گەر پاسەوانەکان ببینن یان خۆی پێیبزانێت دەمودەست دەیکوژن، بەڵام شێرخان پێدەچوو بێباک بێت، پێدەچوو لە نەست و بێئاگاییدا شتێک بەرەو خەوتن و فەرامۆشی و ڕێسازی بۆ نەغەدە بیجوڵێنێت. ئەو شەوە نەغەدە، لەودیوەوە دەرگاکەی لە سەر شێرخانی بێهۆش قفڵکرد و هێمن بە ناو بێدەنگی شەودا کەوتە ڕێگا. هەستێکی ئەوتۆی نەبوو

کە هەڵدێت، بەڵکو پێیوابوو بە سەر زەمینێکی بێباک و جیهانێکی کەمتەرخەم و خەوتوودا دەڕوات... بێباکیش سەر زەمینێکی دوو دیوە، بە دیوێکدا ترسناک و کوشندەیە، بە دیوێکی تریشدا دەکرێت ڕێساز و ئازادکەر و ژینپارێزبێت. لە شەوی هەڵهاتنیدا جیهان سەرتاپا بێباک دەردەکەوت، ئەستێرەکان بێباک بوون، گیا بێباک بوو، درەختەکان فەرامۆشکار و هیچ نەدیو، باڵندەکان بێهەست. لەو شەوانەبوو کە زەوی و ئاسمان دەخەون بۆ ئەوەی یەکێک لە ناویاندا بە هێمنی بەرەو ئازادی خۆی تێپەڕێت. دوای چەند سەعات لە ڕۆیشتن، بێئەوەی جگە لە بێباکی دونیا هەست بە هیچی تر بکات لە جێبی پیرەشۆفێرێکدا خۆی گەیاندە شارۆچکەیەک و لەوێوە بە ئاسانی گەڕایەوە بۆ شار... وەک ئەوە بوو نە کەس بیبینێت، نە کەس هەستی پێبکات، نە کەس بایەخ بە هەڵهاتن یان هەڵنەهاتنی بدات. بێباکییەکی ڕەها لەلایەن جیهان و خەڵک و ڕێگاکانەوە. نەغەدە لەو ڕۆژەوە دڵنیابوو کە هەموو شتەکان لەوە ساردتر و کەمتەرخەم و بێخەیاڵترن کە ئەو تێیگەیشتووە... ئەوە تەنیا ئەو نییە کە بێباکە، بەڵکو هەموو سەردەم و بوون و شتەکانیش وەک ئەو وان، ئەو هیچ نییە جگە لە ژنێکی بێباک لە ناو دونیایەکی لە خۆی بێباکتردا.

یەکەمین جێگا لە خەیاڵیدا بوو، ماڵی کچێکی هاوڕێی منداڵی بوو کە دواجار لە شانە ژنانەکانی حیزبیشدا لەگەڵیدا بوو، دەبوو لەوێوە دەستی بگاتە هۆشەنگی بولبولیار، تاکە ئینسانێک کە دەتوانێت لە ناو ئەم هەموو بێباکییەدا بێباک نەبێت. تاکە کەسێک دەتوانێت بێدوودڵی کۆمەکی لێوەربگرێت. بۆ دوو شەو دوای ئەوە بولبولیاری بینی. ئەو پێیگووت «نەغەدە تۆ ئێستا شاعیرێکی لە جاران بەناوبانگتری». ئەو تەواوی شیعرەکانی بۆ گەیاندبووە ڕۆژنامەکان، وایکردبوو ناوی بەردەوام لە نێو شیعردۆستاندا ئامادەبێت. بولبولیار خۆی لە دۆخێکی باشدا

نەبوو، بەڵام کوڕێکی شوێنبڕوا و فرەهاوڕێ بوو. لە نوکەوە گوێی لە چیرۆکی نەغەدە ماردینی گرت کە بە نمایشێکی ساختەکار، وەک کەسێک بیەوێت ئەویدی تا ئەوپەڕ بنێتە ژێر کاریگەری چیرۆکی خۆی، تێکەڵاو بە هەندێک فرمێسک کە دەستکردی چاوبوون نەوەک ڕۆح، فرمێسک کە دەتوانێت بێت و نەیەت، فرمێسک کە نیشانەی ئازار نەبوون بەڵکو نیشانەی توانای خانمی ماردینی بوون لە سەر خۆدەرخستن و نمایشکردن، باوەڕی بە بولبولیار هێنا لە شاردا بیشارێتەوە.

دەبێت بڵێم ئەو نمایش و گریانەی ماردینی هەمووی درۆ نەبوو، هیچ مرۆڤێک لە جۆرە دۆخێکی وەهادا ناتوانێت نەکەوێتە ژێر زەبری هەندێک هەڵچوونی عاتیفییەوە... بەڵام ماردینی لەوە سەرسام بوو کە بولبولیار زۆر قووڵتر لە خۆی هەست بە هەموو شتێک دەکات، هەتا قووڵتر لەو هەست بە وشەی ناو شیعرەکانی دەکات، دووریش نییە خۆشی بوێت، بەڵام لەو پیاوانەیە کە بە جۆرێک لە سەبر و هێمنییەوە بەرگەی عەشق دەگرن، دەتوانن لە بەردەمیدا خۆیان بگرن، گەمارۆیبدەن و نەهێڵن پێیانەوە دیاربێت. هەر لە سەرەتای ناسینییەوە دەیزانی هۆشەنگ جۆرە کەسێکی ترە، لە زۆر شتدا لەو پیاوانە ناچێت کە بینیونی، نە لاوازە و نەدڕندە، شتێکی تایبەتە، هەندێکجار کە دەیبینێت و سەیری نیگا قووڵەکانی دەکات وادەزانێت تەنهایە، بەڵام تەنها نییە، کە گوێ لە شیعر دەگرێت هەستدەکات شاعیرە، بەڵام شاعیر نییە... کەسێکە قووڵ لە ناو ژیاندایە، بێئەوەی ئەو مەودایە ونبکات کە مرۆڤی قەشەنگ بۆ خۆی دەهێڵێتەوە. نەغەدە گەرچی توانای لە سەر جیاکردنەوەی مرۆڤی باش و خراپ لە نزمترین ئاستدا بوو، هیچ کات پیاوانی بە پێوەری باش و خراپ نەدەپێوا، گەر بیشکرابایە سیحری نێرە بەدەکان لە سەری لە ئەفسونی پیاوچاکان گەورەتر بوو. بەڵام بولبولیار کوڕێک بوو دەکرا لەودیو چاکە و خراپەوە سەیریبکەیت، نە چاک بوو بە

مانا ئاساییەکەی چاکە و نە خراپ بوو بەو مانایەی خەڵک پێناسەی خراپە دەکەن، شتێکی تر بوو، کەسێک بوو مرۆڤ دەیتوانی خۆی بداتە دەست، متمانەی ژیان و مردنی پێبکات. دڵنیابوو هۆشەنگ هیچی لەو نەدەویست، لە ڕاستیدا هیچی لە دونیاش نەدەویست... ئەو هیچ نەویستنە نەغەدەی دەترسان، وایدەکرد بە جۆرێکی کوشندە باوەڕی پێبکات، بەڵام لە قووڵاییدا نەیدەویست باوەڕ بە کەس بکات. باوەڕهێنان بەوانیدی، لەگەڵ ئەو ساردی و بێباکییە قووڵەدا نەدەگونجا کە لە ناخیدا دروست بووبوو. لە بەرئەوە بەردەوام لە بەردەم هۆشەنگدا بێدەنگییەکی گەورە دایدەگرت. لە ناخەوە دەیویست هۆشەنگیش هەمان ئەو وێنەیەی بۆ دووبارەبکاتەوە کە ئەو لە سەر دونیا هەیەتی، دونیای پیاوانی دڵڕەق و بەهێز، یان پیاوانی عاشق و لاوازی وەک مستەفا شوکاک، بەڵام ئەو سەر بە هیچ یەک لەو دوو وێنەیە نەبوو... بوونی هۆشەنگ سەری لە نەغەدە تێکدەدا، وایدەکرد بێباک نەبێت، بیری لێبکاتەوە، بپرسێت ئەمە چ جۆرە مەخلوقێکە. زۆربەی پیاوان هەر خێرا خۆیان دەکەنەوە و جەوهەری خۆیان ئاشکرادەکەن، هەر زوو شەهوەت و ئارەزووەکانیان لە چاویاندا دەبریسکێتەوە و لە ژێر پێستیانەوە دێتەسەرێ، ئەم گەنجە چاو گەشە ڕیشن و هەژارە نەبێت، کە شتێکی تێدایە وەک ئەوەی دەستێکی تر تاشیبێتی، دەستێک کە دەستی هەمان ئەو خالیقە نییە کە مرۆڤەکانی تری دروستکردوە، دەستێک کە دەتوانێت مرۆڤانێک دروستبکات هیچیان لە مرۆڤی ئاسایی سەر ئەم ئەستێرەیە نەچێت. هێشتا دوو ڕۆژ نەبوو پێکەوەبوون کە بێدەنگی و تێفکرین و هێمنی و قووڵی بولبولیار وای لێکرد بپرسێت هۆشەنگ چۆن لە خۆت تێدەگەیت، هەستدەکەیت تۆ کەسێکی وەک هەر کەسێکی دیکە، چۆنە هەندێک ئادەمیزاد بەو پلەیە جیاوازن کە ناکرێت ئاسان تێیانبگەین؟. بولبولیار لێیپرسی لە پشت پرسیارەکەوە دەیەوێت بکات بە چی؟. نەغەدە

دەترسا وەک کەسێک دەربکەوێت کە بایەخ و گرنگییەکی زۆر تایبەتی بە شتێک دەبەخشێت، لە ڕاستیدا جگە لە گرنگیدان بە بێباکی خۆی، ئەو بێباکییەی ئازاد و بەختەوەریی دەکرد کە هەستیدەکرد هێدی هێدی مانایەکی جیاوازتر لە هەموو ماناکانی دیکەی ئازادی پێدەبەخشێت، نەیدەویست شتێکی تر لە خۆیدا ئاشکرابکات. دوای ئەو شەوە تاریک و درێژ و پڕ مۆتەکانەی زیندانی شێرخان، دوای ئەوەی شێرخان تێیگەیاند ژیان خاڵییە لە هەر شتێکی گرنگ و گەورە، ئێستا خۆشی بە تەواوەتی نازانێت دڵی چی تێدایە، ئایا بە ڕاستی هیچی تێدایە جیاواز بێت لەو ئارەزووە سەیر و ترسناکانەی لە دڵی هەر مرۆڤێکی تردایە؟... ئاخۆ ئەو وشەی «نهێنی دڵ»ـە کارێکی هەیە جگە لە کاری داپۆشینی ئەو ڕاستیانەی هەموو دەیزانین، ئاخۆ دڵی ئەو جگە لە بێباکییە قووڵەکەی شتێکی تری تێدایە بۆی بگەڕێت؟. بە پێچەوانەی زۆر لە ڕاڤەکارانەوە ئێستا ڕای وابوو کە شیعر تەنها و تەنها کۆمەکیکردوە خۆی ونبکات، دەرگا نهێنییەکانی خۆی دابخات، هەموو شتێک بگۆڕێت بۆ تەلیسم، هەموو شتێک تەماویبکات، بیانشارێتەوە، ئاڵۆزیانبکات. لە دڵی خۆیدا گوتی شیعر خۆشاردنەوەیەکی بەردەوامی شاعیرە لە خۆی، شاردنەوەی دونیایە، شاردنەوەی زەمینە، شاردنەوەی دوورییە، شاردنەوەی مردنە. شیعر هیچ نییە جگە لە ونکردنی هەموو شتێک، داپۆشینی بە میتافۆری تر. ئێستا هەستیدەکرد بە جۆرێک خۆی ونکردوە، ئەستەمە خودی ڕاستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە. دەیویست بزانێت خۆی چییە: شاعیرە؟ عاشقە؟ سۆزانییە؟ ژنە؟ یاخییە؟ سیاسییە؟ ئەستەمخوازە؟ شۆڕشگێڕە؟... لە قووڵایشدا هیچ مانایەکی نەدەدۆزییەوە جگە لەوەی کە بێباکە.. بێباکە و هیچی تر. دەیزانی هێزی هەرە گەورەی ئەو، هێزی بێباکییە... بێباکی بەرامبەر هەموو شتێک. یەک شتی بەلاوە گرنگ بوو کەس نەبێت بە بەربەست لە نێوان خۆی و بێباکییەکەیدا. بۆیە ڕقی

لە شێرخان بوو، چونکە دونیای وا بۆ بچوکدەکردەوە نەتوانێت بێباکی خۆی بە گەورەیی بژی... بێباکی بێسنووری خۆی، فەرامۆشکردنی بۆ هەموو مانایەک، پێشێلکردنی بۆ هەموو نرخێک.

ئێستا تێنەدەگەیشت چۆن هۆشەنگ دەتوانێت وەها بایەخی پێبدات، لەو ڕۆژەوە کە لە زانکۆ بینی و ڕوو بە ڕوو و بە قووڵی سەیری یەکتریان کرد، شتێک لە نێوانیاندایە کە ناوی نییە، سەیرترین شتێکیش دوو مرۆڤ پێکەوە ببەستێتەوە ئەوەیە کە شتێک لە نێوانیاندا بێت ناوی نەبێت، نەخۆشەویستی بێت، نە کینە، نە نیاز، نە قازانج... بەڵکو تەنیا ئامادەگی پاسیڤانەی هەردووکیان بێت، لەیەک کات و لە یەک شوێندا پێکەوە. هەستیکرد ئەوە تاکە هۆیەکی ڕاستەقینەی پەیوەندی ئەو و بولبولیارە، ئەم هۆیە بۆ نەغەدە هیچ مانایەکی نەبوو، بەڵام بۆ بولبولیار هەموو شتێک بوو، ئەوەی لەگەڵ کۆمەڵێک مرۆڤدا لە یەک سەردەمدا دەژین، لای هۆشەنگ بایەخێکی گەورەی هەبوو، مرۆڤ بەرپرس نییە لەوانەی کە ڕوویانداوە، بەرپرس نییە لەوانەی کە ڕوودەدەن، بەڵام بەرپرسە لەوانەی کە ئەمڕۆ و لێرە لەگەڵیاندا دەژی. «ئەوە ڕێکەوتێکی زۆر گەورەیە کە ئێمە هەموو پێکەوە لەم ساتەدا لە سەر زەوی دەژین» بولبولیار زۆرجار وایدەگووت، لە پشت وشەکانیشییەوە هەستێکی قووڵی بە دەروەستی بۆ هەموو شتێکی زیندوو هەبوو. ئەوەی لەم ساتەدا لە سەر زەوی پێکەوەین، بەسە بۆ ئەوەی تا مردن و ماڵاوایی بەرپرسبین لە یەک.

ئێستا دوای ئەو هەموو ونبوونە، دوای ئەو سووڕە درێژە بە جەنگەڵی شۆڕشدا، دووبارە گەیشتەوە بەردەم بولبولیار، لە ژێر باری تەنهایی و بێباکی و شیعردا ونبووبوو، ڕەنگە هەر ئەوەش وایکردبێت بولبولیار بایەخی پێبدات، دەزانێت بۆتە کەسێک ونبووە، هەڵبەت دڵی سەرسامی

هۆشەنگ دەخوازێت بیدۆزێتەوە و بیگرێت و تێیبگات. بەڵام ئاخۆ دەزانێت چ دڵێکی ساردی هەڵگرتووە؟ دەزانێت بەو فەرامۆشی و کەمتەرخەمییەی، دەتوانێت چەند دڵڕەق و ترسناک بنوێنێت؟ بێگومان نا... کەمجار مرۆڤ هێندە زرینگ و وریادەبێت، بتوانێت لە شاعیرانیش بترسێت. بەڵام لە ڕاستیدا دەبێت لێیان بترسێت.

ئەو ڕۆژە کە دەرهەق بە جیاوازییەکانی مرۆڤ پرسیاری لە هۆشەنگ کرد، ئەو لە بەرامبەر پرسیارەکەیدا سەرسامبوو، لەو ساڵانەدا چەند جارێک ئەو پرسیارەی بە شێوەی جۆراوجۆر و لەلایەن کەسانی جۆراجۆرەوە هاتبووە بەردەم. هۆشەنگ لە پشت پرسیارەکەوە خەیاڵی بۆ ئەوە دەچوو کە لەم سەردەمەدا جیا لە کۆی دەورو زەمانەکانی تر، مرۆڤەکان زیاتر لێکچوون و جودایی خۆیان بۆ گرنگە. بولبولیار لە ناخیدا هەستیدەکرد لەدایکبوونی ئەو پرسیارە بەدبەختی زۆری لە دواوەیە، هەر کات مرۆڤەکان کەوتنە بەراوردی قووڵ لە نێوان خۆیان و ئەوانی دیدا لە دواجاردا دەگەنە جێگایەکی داخراو. لە سەردەمانی پێشوودا مرۆڤەکان یەک یەکدیان بێ بیرکردنەوە لە لێکچوون و جیاوازی قەبووڵدەکرد. بەڵام لەم سەردەمەدا مرۆڤ دوو خولیای ناکۆک و سامناکی تێدا خولقاوە کە بەردەوام پێکدادەن و ڕۆژانە مرۆڤ تووشی دەردەسەری دەکەن، یەکەم : مرۆڤ بەردەوام هەوڵدەدات خۆی هەمیشە شتێکی دی بێت، جیاواز و تایبەتتر لە هەموو مەخلوقات. دووەم: بەردەوام بۆ کەسانێکیش دەگەڕێت لە خۆی بچن. ئەم دوو خولیایە مرۆڤیان بەرەو کێشمەکێش و ململانێی گەورە ڕاکێشاوە. ئەو ڕۆژە بە خەندەیەکەوە بەدەگمەن لە سەر ڕوخساری دەردەکەوت، گووتی «نەغەدە خان، نازانم چیت وەڵامبدەمەوە. بۆ مرۆڤ هێندە لەیەک جیاوازە. هۆکەی ئەوەیە مرۆڤەکان هەموویان لەدەستکردی یەک دەست نین، پێدەچێت خودا مرۆڤی بە کۆیلەکانی ژێر دەستی دروستبکات... کۆیلەکان کێن؟ نازانم. فریشتەکانن، شەیتانەکانن؟ نازانم.

هێندە هەیە دڵنیام مرۆڤ بەرهەمی یەک دەست نییە... وەک ئەوەی مرۆڤ بەردەوام لە پێشبرکێیەکی گەردونیدا لەلایەن کۆمەڵێک هێزی لە خۆی گەورەترەوە دروستبکرێت. وەک ئەوەی هەزاران بەردەستی ئیلاهی لە کارخانەیەکی دووردا ئینسان دروستبکەن و تۆوەکەی و وێنەکەی بە کۆدێکی نهێنییەوە ڕەوانەی سەر زەوی بکەن. نەغەدە من چەند سەیری ئەم بەشەرە دەکەم، زیاتر بڕوا دەهێنم کە مرۆڤەکان لە سەرچاوەی جیاواز جیاوازەوە هاتوون. هەموویان لە ژێر پەنجەی یەک خالیقەوە نەهاتوون... ئەوەی خودا دایڕشتووە تەنیا وێنە گشتییەکەیە، قاڵبە سەرەتاییەکەیە.. لەوە بترازێت، پێناچێت ئەو دەستەی منی دروستکردوە هەمان ئەو دەستە بێت کە تۆی دروستکردوە. ئەگەر وابێت، ئەگەر هەموومان یەک دەست دروستیکردبین، ئەوا دەستێکە هیچ نمونەیەکی باڵای نییە، چاک و خراپی لا نییە، بەرز و نزم ناناسێت، دەستێکە تەنیا تاقیدەکاتەوە، بێئەوەی بۆی گرنگ بێت چی لەو تاقیکردنەوەیە دەردەچێت، دەیەوێت شتێک دروستبکات، بەدوای ئەوەدا ناگەڕێت کاری ئێستای لە کاری دوێنێی باشتر بێت، گەر وابووایە ئەو مرۆڤانەی ئەمڕۆ لەدایکدەبن لەوانی دوێنێ جوانتر و چاکتر دەبوون، ئەوانەی دوای ئێمە لە ئێمە جوانتر و چاکتر دەبوون، بەڵام شتی وەها نییە... خالیق بەدوای شتێکی باشتردا ناگەڕێت، بەڵکو تەنیا بەدوای شتێکی جیاوازتردا دەگەڕێت. دەستێکە تەنیا دەیەوێت بزانێت لە یەک قاڵبی گشتی چەند شێوە دروستدەبێت. دووری مرۆڤەکان لە یەکتر بە جۆرێکە، ناتوانین قسە لە لێکچوون بکەین.. وانییە هاوڕێم، وانییە نەغەدە خان؟»

ئەوە یەکەمجار بوو بە هاوڕێ بانگیبکات، تا ئەوکاتە ڕێزی بۆ نەغەدە لە سنووری ڕێزی عاشقێکی شیعر تێنەپەڕیبوو کە دەزانێت پێویستە شتێک بۆ داهێنەرێک بکات کە حەزی بە دونیاکەیەتی. ئەو یەکێک بوو لەو کەسە زۆر دەگمەن و کەمانەی کە دەپرسن ئاە ئەم

شاعیرە لە من نزیكە و بۆ لە دەردی نەپرسم؟ بۆ نەزانم وەک بەشەر چ ئازارێكی هەیە؟. ئەوانی تر مەسرەفكەری ئەدەبیات بوون، بەس بولبولیار مرۆڤ بوو، هەتا لای شاعیرانیش بۆ ئازاری مرۆڤەكەی ناویان دەگەڕا. هیچی لەو قەبیلە گەمژەیە نەدەچوو كە هەر ناوی شاعیر دەیانبزوێنێت یان هەر شیعری شاعیر نرخی هەیە لایان، لەوە بترازێت پڕن لە پێشداوەری گەمژانە، لە قسەی هەڵە و دەنگۆی درۆ و حوكمدانی بێڕامان. نا بولبولیار، لەو كەسە دەگمەنانە بوو كە دەیگووت : شاعیران، ژیانیان و ئازاریان وەک شیعر گرنگە. ئەوە زۆر سەرنجی نەغەدەی ڕادەكێشا، ئەو بوونەوەرێكی جیاواز بوو، خاڵی بوو لە بێباكی... ئەو مرۆڤ بوو نەک خوێنەر، خوێنەر تەنیا تێكستی بۆ گرنگە، مرۆڤ ئەو كەسەشی بۆ گرنگە كە لە پشت تێكستەكانەوە ئازار دەچێژێت.

بولبولیار لە چەند ڕۆژی یەكەمدا پەناگەیەكی بۆ نەغەدە لە ماڵی هاوڕێیەكی و ژنەكەی پەیداكرد. هەم هاوڕێكەی و هەم ژنەكەی خوێندەوارییەكی ئەوتۆیان نەبوو، بەڵام خۆشحاڵبوون شەرەفی ئەوەیان پێببڕێت ژنە شاعیرەیەک لە ماڵی خۆیاندا بشارنەوە، ماڵەكەیان دوو نهۆمییەكی گەورە بوو لە گەڕەكی «ئیبراهیم بەگ»، هاوڕێكەی كوتاڵفرۆشێكی جوملەچی بوو كە دەبوو زۆربەی كات بەڕێگاوە بێت و بەدوای توجارەتیدا شارانی باكوور و باشوور بگەڕێت، هەمیشە لە غەمی ئەوەدا بوو هاودەمێک بۆ ژنە بێمنداڵەكەی بدۆزێتەوە، كە تەنهایی و وەڕزیی لە ناوەوە دەیانخوارد... ئەوێ باشترین جێگابوو خانمێكی بێشوێن تێیدا بمێنێتەوە و نەبێتە بارێكی گەورە. ژنەكە خۆی خاتوونێكی ڕۆحسووكی دەم بە خەندە بوو، لەوانەی كە باری هەر میوانێكیان لە باری تەنهایی لا سووكترە، لێرەوە بە ئامێزی كراوەوە پێشوازی لە خانمی ماردینی كرد. بولبولیار پەیمانی ئەوەی پێدان كە نەغەدە خان، كچی خانەوادەیەكی دارایە و لەداهاتووی نزیكدا كەسوكاری

مەسرەفی هەموو ژیانی لە ئەستۆ دەگرن و کەم و زۆر نابێت بەبار و هەتا دەتوانێت بەرامبەر ژوورەکەشی کرێیەکی گونجاوبدات، بە مەرجێک مانەوەی لەوێ نهێنی بێت. بەوەدا ژنی هاوڕێ بازرگانەکەی بولبولیار، خەڵکی شارێکی دیکە بوو، خانم ناسیاوییەکی ئەوتۆ و دۆستایەتییەکی وەهای لەگەڵ کەس نەبوو، نەغەدە لێیبترسێت. وەهاش ڕێکەوتن کە بولبولیار هەرگیز بە تەنیا و بێ هاودەمی بازرگانی هاوڕێی نەچێتە ئەوماڵە و شتێک نەکات سەرنجی دراوسێکان ڕابکێشێت. بەوەشدا ئەو جوملەفرۆشە گەنجە خۆی زۆر لە سەفەر بوو، ماڵەکە خەتێکی تەلەفونی تایبەتی هەبوو، تا بتوانێت لە هەموو جێگایەکەوە هەواڵی ژنە تەنهاکەی بپرسێت. بوونی تەلەفون وایکرد بولبولیار و ماردینی ئاسانتر پەیوەندی ببەستن و لە هەواڵی یەک ئاگاداربن. بە جۆرێک بولبولیار بە دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ جارێک خۆی زەنگی لێدەدا و لە هەواڵی دۆستە شاعیرەکەی دەپرسی، ژمارەیەکی تەلەفونیشی بۆ کاتی دیکە و حاڵەتی پێویست لای ئەو جێهێشتبوو، تا گەر زۆر ناچاربوو پەیوەندی پێوەبکات و هەواڵی بۆ دابنێت و داوای کۆمەکبکات. بولبولیار بە دەستی خۆی نامەیەکی نەغەدەی برد بۆ دکتۆر جەلالی باوکی و تەواوی ئەو چیرۆکەی بۆ گێڕایەوە کە لە زاری نەغەدەوە بیستبووی، بە دکتۆری گووت «کچەکەتان شاعیرێکی بەهرەدارە، مەهێڵن ئەو دەنگۆ و قسە خراپانەی لێرەو لەوێ لە سەری بڵاودەبنەوە، باوکایەتیتان لکەداربکات».
دکتۆر جەلال ڕوخسار و تێڕامان و هێمنی ئەم گەنجە زۆر سەرنجی ڕاکێشا. بێئەوەی ئابڕووی باوکایەتی و شەرمی پیاوانە بیترسێنن، لە هۆشەنگی پرسی «پێمبڵێ، کچەکەم چی لەگەڵ تۆدا هەیە، تۆش دڵدارێکی تری ئەویت یان چییت و چ کارەیت و کچم چۆن لە ناو هەموو پیاوانی دونیادا و دوای ئەو هەموو نەگبەتییەی بە سەر من و مێردی و خۆیدا هێنای بڕوای بە تۆ کردوە؟». بولبولیار ویقارێکی وەها

نهێنی و دەنگێکی وەها ڕاستگۆی هەبوو، بەدەگمەن گومان و ترسی لای ئەوانی تر دروستبکردبایە. بە هێمنی بە دکتۆر جەلالی گووت «من دلّداری کچەکەی بەڕێزتان نیم... من خوێنەرێکی شیعرەکانی ئەوانم. گەر شتێکی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوبووبێتەوە، من ناردومە... من کەسێکم دەزانم کیژەکەتان بەهرەیەکی ڕاستەقینەی هەیە، دەمەوێت هەموو شتێک بکەم ئەو بەهرەیەی نەمرێت، هەوڵدەدەم خۆم بکەم بەو کەسەی کە نامێڵێت شاعیرە قووڵەکەی ناخی خانم بمرێت، نازانم ئاخۆ کاری وام بۆ دەکرێت یان نا... من گەر عاشقی نەغەدە بوومایە ئێستا زۆر دڵشکاو دەبووم، نەغەدە لەو کچانەیە کە بە کەڵکی عاشقی نایەت، بەڵام شتێکی گرنگی تێدایە دەبێت نەمرێت... شاعیرییەت لە ناخیدا لە سەرچاوەیەکی نهێنییەوە هەڵدەقوڵێت کە پێدەچێت خۆشی دوورییەکان و کانگاکانی نەزانێت، بەڵام کاک دکتۆر... شاعیرییەتێکی گەورە لە ناخیایەتی... من لە یەکەم ڕۆژەوە بینیومە، لە ناخیدا ئەو فریشتە گەورەیەی شیعرم بینیوە، فریشتەیەکی نهێنی و نەبینراوە، بەس من دەیبینم... دەتوانیت ناوم بنێیت پاسەوانی شاعیرەکەی ناو ناخی خاتوونی کیژتان... لەوە زیاتر نا. من مەبەستێکم لەوە نییە کە نەغەدە خان بپارێزم... بەڵام خانم پێویستی بە یارمەتی ئێمە هەیە، لە ئێستادا لە هەر کات زیاتر پێویستی بە یارمەتی و کۆمەکی ئێمە هەیە. تۆش دواجار باوکی ئەو کیژەیت، گەر باوکیشی نەبێت مرۆڤێکی دڵ گەورە دیاریت... بۆیە باوەڕم وایە کە پشتی تێناکەیت، من هەژارترین کەسی دونیام، هیچم نییە... خاوەنی ئەو شتە نیم کە مرۆڤەکان بە زیندوویی ڕادەگرێت، ماڵم نییە، پارەم نییە، لە بەرئەوە دەمەوێت بە جۆرێکی تر باش بم... دیارە چاکەی پیاوی هەژار و بێپارە لەوانەیە لای زۆر کەس نرخی نەبێت، بەڵام من لەو باوەڕەدام کە ئەو کۆمەکەی مرۆڤێکی هەژار دەیکات و دەتوانێت بیکات، زۆرجار لەو کۆمەکە گەورەترە کە خاوەن

پول و دراوان پێشکەشیدەکەن، هیواش دەکەم وابێت... دکتۆر جەلالم لە دڵەوە هیوا دەکەم وابێت».

قسەکانی هۆشەنگ، دکتۆری پڕکرد لە تێڕامان و دوودڵی. کەم کەسی بینیبوو وا ڕاستگۆ و ڕاستەوخۆ قسەبکات. دکتۆر جەلال، بۆ ئەوەی هیچ جێگایەک بۆ گومان و دوودڵی، نەهێڵێتەوە، داوایکرد نەغەدەی کچی ببینێت. بولبولیار گوتی کە هێندە دەتوانێت داواکەی بگەیێنێتە کچەکەی و لەگەڵیدا خەریک بێت بەڵکو ڕەزامەندیی نیشانبدات و باوکی ببینێت، بە سۆزی گەنجێکی دڵ گەرمیشەوە گوتی «ئەگەر ڕەزامەندی خۆی لە سەر بینینتان نیشان نەدا، ئەوە نیشانەی ئەوە نییە ڕێزی ئێوە ناگرێت و وەک باوک نرخی لاتان نییە، هێند هەیە خانمی کچتان لە ئێستادا پێویستی بە خۆشاردنەوەیەکی باش هەیە، چونکە هەم لە دەوڵەت هەڵهاتووە و هەم لە شاخ. منیش هەمان دۆخم هەیە، لە بەرئەوە تێیدەگەم، لەمجۆرە حاڵەتانەدا مرۆڤ هەستدەکات دەبێت لە جێگایەکدا بمێنێتەوە و نەجوڵێت، چونکە هەموو جوڵەیەک ترسی خۆی هەیە».

سەرەتا نەغەدە ماردینی نەیویست دکتۆر جەلال ببینێت، ڕەنگە هۆی ترسی لەو دیدارە ئەوەبووبێت کە هێشتا شتێک لە شەرمی کچانەی زووی تێدا مابێت، بەڵام دوای چەند ڕۆژێک دوودڵی، لە سەر ئەوە ڕازیبوو یەکجار چاوی بە دایک و باوکی بکەوێت، بەڵام لە جێگایەکی دوور لە شوێنی خۆشاردنەوەکەی. دەبێت بڵێم چاوپێکەوتنی خانمی ماردینی لەگەڵ باوانیدا، بە جۆرێک سارد و بێڕۆح بوو، پتر لە دیداری سێ مردوو دەچوو لەگەڵ یەکدا. خانم بە دەستێک جلی شینەوە هاتبوو بۆ دیدارەکە کە پێدەچوو دەستێک جلی خوازراوی ژنی خاوەن ماڵەکە بێت، بەڵام تابڵێی بێباک و سارد و بێعاتیفە بەرامبەر دایک و باوکی دانیشت، بێئەوەی ڕێگایان بدات باوەشی پێدابکەن. وەها دەردەکەوت نەغەدە

خۆی بۆ پەلامارێکی قورسی ئەوان ئامادەکردبێت، بەڵام ئەوان هێندەی هاتبوون بیبینن و دوای ئەو مەراق و ترس و دوودڵییە دووروودرێژە، دوای ئەو ئابڕوچوونە گەورەیە، باوەشێکی پێدابکەن، نیازێکی تریان نەبوو. نەغەدە جگە لەوەی کە داوایکرد لە بیریبکەن و تەنیا شتێک بۆی بکەن ئەوەیە کۆمەکێکی دارایی بدەنێ تا لە ئێستادا نەبێتە بار بە سەر کەسەوە، ئیدی هیچی دی نەگووت و نەویست. هەموو هەوڵەکانی دایکی بۆ دواندن و پرسیارکردن و غەمخۆری بەر دیواری دڵی سارد و نیگای بێڕەحمانەی نەغەدە کەوتن. لەوەوپێش بەوجۆرە سارد و بێباک کچەکەی خۆیان نەبینیبوو. کاتێک بێ هیچ وەعدێک بۆ یەکبینینی بەردەوام لەیەک جیابوونەوە، دایکی سەرسام و بێحاڵ تا سەرسنووری مردن گریا. دکتۆر جەلال بۆ چەند سەعاتێک وای بڕیاردا کە بچێتە سەر ئەو بڕوایەی کچەکەی مردوە و تەواو، بەڵام هەر زوو ئاگری باوکایەتی ئەو بڕیارانەی پێکۆڕی و گووتی کە چاوەڕوانی زەمەن دەکات کچە خۆشەویست و بچوکەکەی بهێنێتەوە ئامێزی. هۆشەنگی بولبولیاریش لەو دانیشتنەوە هەستی بەو دڵە ڕەقەی ناو سینەی نەغەدە ماردینی کرد، بەڵام دڵنیابوو کە دەبێت لە ناخیدا کەسێکی تر هەبێت، کەسێکی جیاواز کە ئەو شیعرە قەشەنگانەی پێدەنوسێت.

لەو دەمەدا خولیای گەڕان بەدوای خانمی ماردینیدا کەوتبووە بنسەری زۆر کەس. لە ڕاستیدا من نامەیەکی تایبەتیم لە یاوەرێکی سەرۆکەوە «خوا لێیخۆش بێت» بۆ هات، تێیدا هاتبوو زۆر خۆم بە گەڕانەوە بۆ خانمی ماردینی سەرقاڵ نەکەم و بایەخ بە ئیشوکارەکانی تری حیزب بدەم، چونکە هەموو دەیانزانی من دوای هەڵهاتنی خانم، کەوتوومە ژێر گووشارێکی زۆری دکتۆر شێرخانەوە تا بیدۆزمەوە. هەڵبەت ڕەفتارەکانی شێرخان گورزێکی خراپی لە ناو و شوهرەتی حیزب دابوو، بەڵام من

هەر وەکو تووتی دەمگووت و دەمگووتەوە کە ئاسوودەیی شۆڕشگێڕان بە قازانجی شۆڕشە. بەڵام پەیامەکەی سەرۆک فشاری شێرخانی کەمێک لە سەرم سووککرد و ئاگادارمکردەوە کە کەسی سەرۆک خۆی دەستی خستۆتە کێشەکەوە و فەرمانم هەیە کە لێگەڕێم نەغەدە ئازاد بێت، چونکە ئەوە بۆ حیزب باشترە. شێرخان دوای هەڵهاتنی نەغەدە بە جۆرێکی دڕندانە کەوتە وێرانکردنی هەر شتێک کە دەکەوتە بەردەستی... هێزەکانی دەخستە ناو شەڕی دۆڕاوەوە، شێتانە و بێهیچ بەرنامەیەک پەلاماری دوژمنی دەدات، ژمارەی شەهید لە هێزەکەیدا تا دەهات بەرەو باڵادەچوو، چەندەها گوند بە هۆی هێرشە شێتانە و بێئاکامەکانی ئەوەوە وێرانبوون. ڕۆژانە نەیدەتوانی بێ کوشتنی پشیلەیەک بخەوێت، دەمبیست کە لە هەندێ جێگا خۆی بە مەبەست ئاگر لە دارستانەکان بەردەدات، بە مەبەست هێزەکانی دوژمن دەجولێنێت تا بکەونە تۆپبارانی گوندەکان... ئیدی لە ڕێکخراوەکانی حیزبیشدا بە ئاشکرا باس لە مەترسییەکانی ئەو جۆرە لە شێتیتییە دەکرا، وادیاربوو وەک بۆ یەکەمجار دەموچاوی زۆر ترسناکی شۆڕشگێڕان بۆ دونیا ئاشکرابێت.

لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا و دوای ئارامگرتنی لە حەشارگە و خەڵوەتی چەندەها ساڵەی خۆیدا، هێدی هێدی نەغەدە گەڕایەوە بۆ شیعر نوسین، بولبولیار لە ڕێگای پەیوەندی و ناسیاوییەکانی خۆیەوە کەوتە غەمی ئەوەی یەکەم دیوانی بۆ چاپبکات، لە دوای ماوەیەک لەو هەولانە دیوانێکی خانمی ماردینی کەوتە بازاڕەوە بە ناونیشانی «جەلادی فریشتەکان». دیوانەکە لە دەزگا ڕەسمییەکان چاپ نەکرا، بەڵکو بە قاچاغ لای یەکێک لە چاپخانەکان هۆشەنگ چەند سەد نوسخەیەکی لێچاپکرد، ئەو و هەندێک لە هاوڕێ ئەدەبدۆستەکانی کتێبەکەیان بەناو شیعردۆستاندا دابەشکرد. نەغەدە خۆشی هەستیدەکرد زۆر پێویستی بەو دیوانەیە... گەرچی بەرامبەر هەموو شتێک بێباک بوو، بەڵام نەخۆشی

گەورەی شاعیران هەر لە خوێنیدا بوو، ئەو نەخۆشییەی کە ناوەکانیان لە خۆیان زیاتر بژی و ژیانێکی بەحورمەت و ڕێزدارتری لە خۆیان هەبێت. ئەوە نەخۆشییەکی دێرین و ترسناک و تاعوونی شاعیرانە کە ژیانی خۆیان دەکەن بە فیدای ناوەکانیان. بەڵام دەبێت بڵێم کە ئەو دەردە لای خانمی ماردینی هەر لە سەرەتاوە زۆر گەورەنەبوو، دڵنیابوو ناوەکەی لە خۆی ترازاوە و وەک مانگێک لە هەسارەیەکی گەورە بووبێتەوە، جیاواز لە سەر خولگەیەکی تر و لە هەوایەکی تردا دەسوڕێتەوە. بەڵام هەوڵیدەدا نەهێڵێت بکەوێتە ئەو خولگەیەوە کە ناوەکەی دەیبات، وەک ئەوە بوو ناوە شیعرییەکەی ناوی کەسێکی تر بێت کە دوورونزیک ئەوی مرۆڤ پەیوەندییەکی پێوەنەماوە. کە بولبولیار یەکەمین جار دیوانەکەی بۆ برد و هەڵیگرت و سەیریکرد، بۆ ساتێکی کورت زۆر دڵی خۆش بوو، بەڵام جیاواز لەو ساتەوەختەی کە یەکەمجار قەسیدەی یەکەمی بڵاوبووەوە، ئەمجارە هەستێکی نامۆبوونی گەورە دایگرت... تکای لە بولبولیار کرد، دکتۆر مستەفا شوکاک بدۆزێتەوە و دیوانێکی بۆ بەرێت، بۆ ئەو داوایەی کرد، خۆشی نەیدەزانی. هەستیکرد ئەو پەیوەندییەی جاران لە نێوان خۆی و شیعرەکانیدا هەبووە هێدی هێدی لاوازدەبێت و دەپچڕێت. وردە وردە لە نێوان ئەم کچە بێباک و دڵڕەق و ئەو شاعیرەی ناخیدا دیوارێکی ئەستوور بەرزدەبێتەوە و پردێک نامێنێت. کە دیوانەکەی وەرگرت، لەبری پێکەنین و شادی، پاش تۆزێک، ساردی و بێباکی و قێزێکی قووڵ کەوتە سەر دەموچاوی... وەک ئەوەی لە ناخەوە بەزەیی بە شاعیرە بەستەزمان و نەفامەکەی ناو ڕۆحی خۆیدا بێتەوە. گەر شیعرەکانی سەرەتا بکەینە مەحەک، نەغەدە ماردینی کچێکی گەنجی یاخی و تیژ خەیاڵ و پڕ خولیا و ئارەزووە، بەڵام نەغەدەی ڕاستەقینە، کەسە ناشاعیرەکەی نێوناخی بەرەو ئەوە دەگۆڕا واز لە خولیاکانی خۆی بهێنێت و بیەوێت ژیان بەبێ شیعر و ناسکی

بـژی. ئێسـتا تـەواو هەسـتیدەکرد ئـەو جیهانـە جیاوازانـەی لـە سـەرەتاوە پێیانـدا تێپەڕیـوە، دونیـای مێـرد، دونیـای عەشـق، دونیـای شـۆڕش... پێکڕا بـە تونێلیکدا بردویانـە و بـەرەو دەریایـەک هەڵیانگرتـووە، جگـە لـە دەریـای بێباکـی و بێغەمـی بەرامبـەر هەمـوو شـتێک هیچـی دی نییـە. نەغـەدە پێیوابـوو هەمـوو مرۆڤێـک لـە ساتێک لـە ساتەکاندا دەگاتـە ئـەو پلەیـە لـە بێباکـی، بـەڵام زۆربـەی مرۆڤـەکان لەگـەڵ تـووش بوونـی دەردێکـی گـەورەدا، دوای لـە دەسـتدانی ئازیزێـک، یـان دوای نوشوسـتێکی گـەورە، یاخـود لەگـەڵ هەسـتکردن بەجـەوری پیریـدا دەگەنـە ئـەو جێگایـە، بـەڵام ئـەم ئـەو بێباکییـەی وەک جەوهـەری ژیـان دەبینـی، ئـەوەی کەسـانی دی لـە نائومێـدی و لاوازی و نوشوسـتیدا پێیدەگەیشـتن، ئـەم بـە دۆزینـەوەیەکـی گـەورەی خـۆی دەزانـی و بـە هێـزی هـەرە مەزنـی خـۆی حیسـابیدەکرد. لـە دڵـەوە دڵنیابـوو، بێباکـی وای لێـدەکات بەهێـز بێـت، بەهێزییـەک چەندیـن جـار لـە هێـزی هـەر شـاعیرێکی زینـدووی ئـەم دونیایـە گـەورەتـر. مـرۆڤ تەنیـا بـە بێباکـی دەتوانێـت بـە نـاو هەمـوو بەهەشـت و دۆزەخەکانـدا بـڕوات و نەهێڵێـت هیـچ کەسـێک و هیـچ شـوێنێک و هیـچ جێگایـەک بـە تـەواوی ببیـەن بـۆ خۆیـان. وای هەسـتدەکرد بۆیـە دەژی و دەبێـت بێبـاک بێـت، چونکـە جگـە لـە بێباکـی قەڵغانێکـی ڕاسـتەقینەتری تـری نییـە. جارێـک بولبولیـار لێیپرسـی «پێتوایـە شـیعر و بێباکـی بتوانـن ماوەیەکـی درێـژ پێکـەوە بژیـن؟». پرسـیارەکە کەمێـک نەغـەدەی سەرسـامکرد، پێشـتر بـە جۆرێـک بێفیکـر و کەمتەرخـەم بـوو بیـری لـە پرسـیاری وەهـا نەکردبـووەوە، چەنـد شـەوێک ئـەو پرسـیارە هەمـوو توانایەکـی لـە سـەر کەمتەرخەمـی کوشـت، هەسـتیکرد بولبولیـار گـەر بـە ڕاسـتی نزیکـی بێـت، هەمـوو ئـەو ئاسـوودەگییە قووڵـەی بۆ دەشـێوێنێت. وەک شـێت گەڕایـەوە سـەر هەمـوو شـیعرەکانی خـۆی، کەوتـە خوێندنەوەیان، دڵنیابـوو لـە پشـت شـیعرەکانییەوە ڕۆحـی کەسـێکی تـر وەسـتاوە کـە ئـەو نییـە، کـە نەغـەدە ماردینـی نییـە... ئـەو ژنـە بێباکـە نییـە کـە هیـچ

شتێک نایبزوێنێت، ئەو دڵە نییە کە وردە وردە خەریکە دەبێتە بەرد. شیعرەکان ڕۆحێک نوسیوێتی دەیەوێت لە هەموو شتێک نزیک ببێتەوە، لە سیحری گوڵێکەوە تا نهێنی پشت هەموو وشەیەک، لە جوانی هەموو درەختێکەوە تا جوانی هەموو میتافۆرێک... جاران شیعری دەنوسی و فەرامۆشیدەکرد... بیری نایەت دوای نوسینی شیعر بە ڕاستی دانیشتبێت و خوێندبێتییەوە، هەمیشە هەستیکردوە وشەکان دەیبەن، هێزێکی نهێنی هەیە لە دەرەوەی ئیرادەی ئەو ڕستەکان ڕێکدەخات. ئێستا بە ڕوونی ئەو جیاوازییە قووڵە دەبینێت کە لە نێوان ئەو و شیعرەکانیدا هەیە. شیعرە کۆنەکانی هەموو شتێکیان تێدایە، هەڵگری هەموو ئاوازێکن، ئاوازی کەمتەرخەمی و بێباکی نەبێت... تا لەو هەموو خولیا و خواستەی پشت شیعرەکان ڕادەما، دەیبینی بەچ ڕۆحێکی یاخییەوە بەرەو پیری شتەکان چووە، دەیبینی چۆن وەک شێت باوەشی بە جیهاندا کردوە. ئەو شاعیرە دەروەستدار و پڕ مەیلەی ناو ناخی تورەیدەکرد، هەستیدەکرد لە ناوەوە کەسێکی یەک ڕوو نییە و کەرتبوونێکی قووڵ دەژی. دوای ئەو پرسیارەی بولبولیار، نەیدەتوانی بەرامبەر ئەو بوونەوەرە نادیار و غەمخۆرەی ناو ناخی خۆی بێباک بێت، هەستیدەکرد تارماییەک، خێوێکی ترسناک، خێوێکی نامۆ، سێبەری ڕۆحێکی وێڵگەرد کە ڕۆحی شاعیرە لە ماڵەکەیدایە، هەستیدەکرد ئەو تارماییە مەلعونە بێپرسی ئەو بە ڕیواق و ژوور و نێو دەرگای ژیانیدا دێت و دەچێت. وەک نەتوانێت لە خۆی هەڵبێت، نەیدەزانی چی بکات، نەدەیویست ئەو شاعیرەی ناو ناخی بکوژێت و نەدەشیویست دەستبەرداری بێباکی خۆی بێت، بەڵام دەبوو یەکێکیان هەڵبژێرێت.

لە حەشارگەکەی خۆیدا، لەو جێگایەدا کە جگە لە بێباکی، هیچ شتێکی دیکەی بۆ نەدەکرا، بۆ یەکەمجار نەغـەدە ماردینی بیری لە کوشتنی شاعیرەکەی ناو خۆی کردەوە.

# هۆشەنگی بولبولیار دەگەڕێتەوە بۆ کەشتیی فریشتەکان

کە هۆشەنگی بولبولیار، بۆ جاری دووهەم گەڕایەوە بۆ کەشتیی فریشتەکان، تەواوی شتەکانی بە چاوێکی دیکە بینی، وەک ئەوەی دیمەنەکان دیوە نائاسایی و تەلیسمینەکەی یەکەمجاریان ونکردبێت و بووبێتنە شتی ئاسایی. تەواوی باغەکانی خاتوونی مەلەکبین و ماڵەکەی و گۆڕستانەکە و بیمارستانەکەی وەک پارچە زەوییەکی ئاسایی هاتەبەرچاو. وەک جێگایەک لە سەر زەوی، وەک هەر بستە خاکێکی تری ئەو شارە. بولبولیار چەندی دەکرد نەیدەتوانی کەشتییەکە بە شتێکی غەیبی و بە خەیاڵێکی ئەو دونیاییەوە گرێبدات، شوێنەکە بە جۆرێکی ترسناک بۆنی سەرزەمینی لێدەهات و ئاماژەیەکی بۆ ئاسمان، بۆ دیوە غەیبییەکانی دونیا، تێدا نەبوو. ڕاستە مەهدائیلی فریشتە لە هەموو یەک بینینەکانیاندا ئەوەی بۆ دووپاتکردبووەوە کە فریشتەکان کارێکیان بە ئاسمان و ئەو دیوی دونیاوە نییە، بەڵام هۆشەنگی بولبولیار نەیدەتوانی وا ئاسان قەبووڵی فریشتەگەلێکی لەوجۆرە بکات. دیارە هەر یەکێکی دیش بووایە هەر هەمان بڕوای دەبوو، کاری وەهاش ئاسان نییە و زەحمەتە باوەڕبکەین فریشتەگەلێک هەن ئاسمانیان نەدیوە و گەر جێگایەکیان بێت، تەنیا ناو ژیانی ئێمە و جەستەی ئێمە و ڕۆحی ئێمەیە. بۆ کەسێکی مەتریالیست و نیوە مارکسی وەک بولبولیار، ئەوە هەم مایەی خۆشحاڵی و هەم مایەی دوودڵی بوو، بە سەرێک بەختەوەر بوو کە دەیزانی دەرکەوتنی فریشتەکان پەیوەندی بە جیهانێکی دیکەی ئەو دیو جیهانی ئێمەوە نییە، چونکە وەک مەتریالیستێک بوونی ئەو دونیایەی قەبووڵ

نەبوو، بە سەرێکی تریش ئەم بۆنی زەوییەی لەوان دێت، دوودڵییەکی گەورەی دەرهەق بە چارەنوسی ئینسان تیا سەوزدەکرد.

ئەو رۆژە کە ڕێزان خانی مەلەکبین، پێشوازی لێکرد و بەدەم ڕێگاوە بەرەو ژوورەکەی خۆی پێشیکەوت، تەواوی سەرنجەکانی خۆی لادرکاند. ڕێزان خان بە گاڵتەوە گووتی «هۆی ئەوەی کەشتییەکە لە شتێکی ئەفسانەیی ناچێت، دەگەڕێتەوە بۆ من... بەساقە... من لە هەر جێگایەک بم چی سیحر و جادووە بەتاڵ دەبێتەوە. ئەگەر بەدبەختی من نەبایە، ئێستا هەموو ئەم فریشتانەی تۆ دەیانبینیت و نەخۆش لەم کەشتییەدا لێیخەوتوون، باڵندەی دەوری عەرشی باڵا دەبوون و من لێرەوە هەر دۆعایەکم بکردبایە لەوێ حیسابم بۆ دەکرا و شتێکیان بۆ جێبەجێدەکردم، بەڵام هەر من بووم بە خاوەنی کۆمەڵێک فریشتەی نەخۆش شتەکان لە دونیادا گۆڕان و لە هەموو سیحرێک خاڵیبوونەوە. ئەوەتا نابینیت ئەو هەموو فریشتە دەردەدارەم هەیە، کەچی کەسێک نییە دۆعای ژنێکی بەدبەختی وەک من بۆ ئاسمان بەرێت... بەساقە ڕاست و ڕەوان ئەوە حیکایەتەکەیە».

بولبولیار بۆ ئەوە هاتبوو تا بزانێت دەتوانێت چی بۆ فریشتەکان بکات، بە چ جۆرێک کۆمەکبکات. ئەو شەوەی کە لەگەڵ مەهدائیلدا ژیابوو لە هەندێک شت تێگەیشتبوو، بەڵام تا دوو ڕۆژ هەمووی وەک خەوێک هاتبووە پێشچاو، قسەکەی دکتۆر مستەفا شوکاک بە جۆرێکی سەیر چووبووە خەیاڵییەوە. پێیوابوو لە ڕاستیدا هەموو ئەوانەی وەک ئەو و دکتۆر و ڕێزانی مەلەکبینن، خەونێکی دەستەجەمعی دەبینن، خەونێک دەرگای تێدایە بۆسەر خەونی یەکتر. بەیانی بەر لەوەی بۆ موڵکی مەلەکبینان بەڕێبکەوێت، بیریکردەوە کە هوشیاری مرۆڤ دەرگایەکی گەورەی تێدایە کە دەیباتە ناو دونیای خەونەوە، ئەوە نهێنی هەرە گەورەی ئەو ئامێرە گەورەیەیە کە ناوی دەنێین هوشیاریی بەشەریی. بە

خۆی گووت هێی بولبولیار، هوشیارییەک نییە دەیان دەرگا و پەنجەرە و کەلێنی تێدا نەبێت مرۆڤ ببەنەوە سەر خەون. ئاە ئەگەر هوشیاریمان ئەو کەلێنە گەورانەی تێدا نەبایە، ژیان چ دۆزەخێک دەبوو... بەرلەوەی بگاتە بیمارستانی فریشتەکان، لەبەر خۆیەوە گووتی «بۆیە حەزم لە شیعرەکانی نەغەدە ماردینییە، چونکە دەستێک دەیاننوسێت کە دەستی نەغەدەی مرۆڤ نین، دەستێکی ترە، دەستێکی ناهوشیارە... دەستی کەسێکی ترە لە ناخی ئەودا». پێش ئەوەی بگاتە بەردەم دەرگای موڵکی مەلەکبین، بولبولیار دیسانەوە بە خۆی گووت «گەر هوشیاریی هەزار دەرگای هەبێت و هەموویان بڕۆنەوە ناو خەون و خەیاڵ، بۆ نابێت خەون دەرگایەکی هەبێت بمانباتەوە بۆ ناو هوشیاریی».

بولبولیار تیا مابوو، دوودڵ بوو، دەیزانی هەم ئێستا و هەم ئەو شەوەیش کاتێک هاتە بیمارستان، بە تەواوی هوشیاری خۆیەوە لەوێ بوو، دەیزانی دونیا هەمان ئەو دونیا مەترِیالییە نەگۆڕەیە کە لە منداڵییەوە لە ناویدا دێت و دەچێت، دڵنیابوو نەخەوتووە و لە پێخەفی شەودا بێهۆش ڕانەکشاوە، دەیزانی شەقامەکان هەمان ئەو شەقامە هەتاهەتاییی و نەگۆڕانەن کە دەستی ئەندازیارانی نەزان و بێبەهرە بە سەر زەمینی ڕەقەنی ئەم ئەستێرەیەدا کێشاویانن... بەڵام هەمیشەش شتێک لە خەیاڵیدا دەمایەوە کە پێیدەگووت ئەو بە ناو خەوندا دەڕوات. دەیزانی هوشیارە، بەئاگایە، شتەکان هەموو وەک خۆیانن، دونیا بە ڕەهەندە مەترِیالی و سەنگین و نەگۆڕەکەی، وەک هەمیشە فشاری خستۆتە سەر ڕۆحی، کەچی شتێکی دی هەر پێیدەڵێت ئەو لە خەونێکی گەورەدا دەژی، وەک ئەوەی ئەو هەموو شتە واقیعی و ڕاستەقینانەی چوار دەوری، تەنیا فێڵێک بن بۆ ئەوەی ئەو ڕاستییەی بیرببەنەوە کە ئەو لە خەوندایە... خەونێک ئەو نایبینێت، بەڵکو مەخلوقێکی تر لە ناخیدا دەیبینێت، فریشتەکەی ناو ڕۆحی دەیبینێت.

لە ناکاو وەک تیشکێکی گەورە ناخی ڕووناکبکاتەوە، وەک شەوقێکی بەهێز هەموو ڕۆحی پڕبکات لە تیشک، تێدەگەیشت کە فریشتەکەی ناو ناخی ژیانێکی تر دەژی، ژیانێک ئەم دەتوانێت دوای بکەوێت و لەگەڵیدا هاوڕێ بێت و تێیدا بژی. بۆ ئێستێک چاوی لێکنا و لە تاریکییە هەرە قووڵەکانی نێو چاویدا، لەو جێگایەدا کە دوا هێزی تیشک ڕووبەڕووی لەشکرێکی گەورەی تاریکی دەبێتەوە. لەوێدا، تارمایی فریشتەیەکی گەورەی بینی، فریشتەکەی خۆی، فریشتەکەی هۆشەنگی بولبولیار بە ڕووتی، بە دوو باڵی گەورەوە، بە خەندەیەکی تەلیسماوییەوە، بە ڕوویەکی ڕۆشن و خۆشحاڵەوە... خۆی بوو، فریشتەکەی ناو ڕۆحی بوو.

کە چاویکردەوە، هەستیکرد ئەو لەیەککاتدا لە سەر دوو سەر زەمینە، لە ناو دوو دیوی جیاوازی یەک دونیادا دەژی، ڕۆشناییەکی قووڵی ئیشراق لە ناوەوە دایپۆشی و پێیگووت، تۆ لە یەککاتدا دەتوانیت لە دوو جیهانی جیاوازدا بیت، دوو جیهان کە بە جۆرێکی ترسناک ترنجاونەتە یەک، ئەوەی ئەم و مستەفا شوکاک و ڕێزانی مەلەکبین جیادەکاتەوە ئەوەیە، لەبری ئەوەی مرۆڤەکەی ناویان فریشتەکە بخنکێنێت، فریشتەکەیان ئەو مرۆڤە دونیاییە دەخاتە دوای خۆی، پێشی دەکەوێت، دەستی دەگرێت، دەسەڵاتی لێدەستێنێتەوە و دەیکاتە پاشکۆی خۆی. دڵنیابوو ئەوەی هاتە پێشچاوی و تێپەڕی، فریشتە تایبەتییەکەی خۆی بوو، ئەو فریشتەیەی هیچ کات باوەڕی بە بوونی نەکردوە. لە قووڵایی ڕۆحیدا هاواریکرد «وای ئەوەتا دەیبینم... هەیە... هەیە... هەموو ئینسانێک فریشتەیەکی هەیە». دڵنیابوو ئێستا بە چاوێکی تر سەیری جێگاکان دەکات، چاوێک هیچی لە چاوی پێشووی ناچێت، دڵنیابوو ئەو تیشکە نهێنییەی لە ناوەوە ڕۆشنیکردەوە وایکرد ئێستا شتەکان بە جۆرێکی تر ببینێت، هەستیکرد چاوانی بوون بە چاوی دوو فریشتە... هەستیکرد ئێستا بە نیگای بوونەوەرێکی تر شت دەبینێت کە نیگای بولبولیاری پێشوو نییە،

بەڵکو نیگای مەخلوقێکی نهێنییە کە هاتۆتە سەرێ و ئیتر دەڕوانێت و دەتوانێت دیوێکی تری دونیا پیشانی ئەو بدات. لە پڕێکدا ئەو هەستە قووڵە دایدەگرت کە ئەو فریشتەیە، فریشتەیە... فریشتەیەکە و جگە لە بەرگریکردن لە فریشتەکەی ناو ئینسان، پەیامێکی تری نییە.

وەک بیەوێت نهێنییەکی گەورە بۆ خانم ئاشکرابکات، پەلەی بوو بگاتە موڵکی مەلەکبین.

کە لەگەڵ ڕێزانی مەلەکبین گەیشتە ژوورەوە و بەرامبەری دانیشت، پێیگووت «ڕێزان خان، من ئەم بەیانییە تووشی دۆخێکی سەیر بووم. گەر ناو مرۆڤ فریشتەیەکی تێدا بێت و ئینسان بتوانێت بیکوژێت و بیخنکێنێت، ئەوا پێچەوانەکەشی لەوانەیە دروست بێت. بە ڕاستیمە ڕێزان خان، بە ڕاستیمە. منیش هەستدەکەم کە فریشتەکەی ناو ناخم تەواو ئەو ئینسانەی لە ناومدا کوشتووە کە دەبێت بژی و دڵڕەقیبکات و بگونجێت، منیش هەستدەکەم ئێمەمانان... کەسانی وەک من و تۆ و دکتۆر... بووین بە فریشتە. من هاتووم بە خۆشحاڵییەوە بڵێم، ئێمە فریشتەین، تۆ فریشتەیت، منیش فریشتەم. باوەڕم پێبکە ئەم بەیانییە بۆ ئێستێک فریشتەکەی خۆمم بینی».

دەنگی ئاوازێکی ئاهەنگئامێزی تێدا بوو، خۆشییەکی منداڵانە و کتوپڕ و نهێنی، وەک ئەوەی شتێکی گرنگی دۆزیبێتەوە و لە بۆنەیەکی تایبەتیدا بۆ خەڵکانێکی زۆری ئاشکرابکات. ڕێزان خانی مەلەکبین کەمێک بە بەزەییەوە سەیریکرد و گووتی «ویش بەقوربان، چەند دڵت پاکە، ئەوە چوویتەوە سەر کێ، دایکت وابووە یان باوکت؟... وەی هەزارجار بەقوربانت بم». بولبولیار تێنەگەیشت خانمی مەلەکبین بەو نیگا منداڵانەیەی خۆی و بەو ڕوانینە پڕ سۆزەی دەیەوێت بڵێت چی. بۆ ئەوەی خۆی زیاتر ڕوونبکاتەوە گووتی «ڕێزان خان بەڵگەم بۆ بۆچوونەکەم ئەوەیە کەسانی دەوروبەرمان ئێمە بە گرنگ وەرناگرن، هەتا

لەوانەیە هەندێکیان نەمانبینن، یان گەر بشمانبینن بۆ ئەوان شتێکی ئەوتۆمان تێدا نییە شایەنی بایەخدان و ئاوڕ بێت. بۆ کەسانێک کە لە ئینساندا تەنیا بۆ کەسە بازاڕی و سادە و بێدیوەکە دەگەڕێن، ئێمە مەخلوقاتی ئەوتۆ نین... بە شەریعەتی ئەوان ئێمە شتێکی سەرنج ڕاکێشمان نییە. فریشتە لە ناو خەڵکدا وەک نابینایەک، وەک کەم ئەندامێک وەهایە، هەم مایەی بەزەیی و هەم مایەی فەرامۆشی و هەم مایەی بێزیشە. ڕێزان خانی عەزیزم، با دوور نەڕۆین و دکتۆر موستەفا شوکاک وەربگرین، من ئەوەتەی خانمی ماردینی دەناسم، بەردەوام لە خۆم دەپرسم ئەم ژنە باشە، ئەم شاعیرە بەهرەدارە بۆ نەیتوانی لەگەڵ دکتۆر شوکاکدا بژی. ئێستا تێدەگەم، ئێستا دەزانم شتەکان چۆن دێن و دەڕۆن، ئەم دکتۆر شوکاکە خۆی فریشتەیە، قەسەم بە موقەدەسات فریشتەیە. خۆی مەلایکەتێکی ڕاستەقینەیە، ئەوەندەی فریشتەکەی ناو ناخی شتێکی ڕاستەقینە و دیارە، ئینسانەکەی ناوی هەر دیار نییە و نابینرێت، نا... ئینسانەکەی ناوی ئەوەندە دیار نییە بەشی ئەوەبکات ژنێکی وەک ماردینی حەزی لێبکات. ئینسانەکەی ناوی شتێکی ئەوتۆ نییە، کەسێکی سادەیە کە کەس ناتوانێت خۆشیبوێت... بۆ؟ چونکە ئەوەی لە دکتۆردا زاڵە فریشتەکەیەتی، مرۆڤ گەر ئەو فریشتەیە لە ڕۆحی دکتۆردا نەبینێت دواجار وەک زۆربەی خەڵک بە پیاوێکی بێکەڵکی دەزانێت. بەوەدا ئەم نەغەدە خانە، ئەسڵەن توانای بینینی مرۆڤەکانیشی نییە نەخوازا فریشتەکان، لەو بەستەزمانەدا هەر مێردێکی گەمژەی ڕووخۆشی بینیوەتەوە کە شایستەی ئەوەیە بە دەست و قاچ خیانەتی لێبکەیت. ڕێزان خان، لەوە تێپەڕێت من تەفسیرم نییە بۆ ڕاکردنی نەغەدەی کچی دکتۆر جەلال ماردینی. باپێتبڵێم مرۆڤی ئاسایی کە دونیا بە سادەیی وەردەگرێت، هەرچییەک بکات ناتوانێت عاشقی فریشتەیەک بێت، ناتوانێت بە جیدیی وەریبگرێت، هەموو دەڵێن

ئاه فلانە کەس، ئەوە پیاوێکی باشە یان ژنێکی چاکە، زیانی بۆ کەس نییە. بەڵێ ڕێزان خان من لەو قسانەم زۆر بیستووە. ئێستا تێدەگەم بۆ دونیا بەرامبەر ئێمە بێباکە، بەرامبەر بە من و بە تۆ و بە فریشتەکان... بەلاتەوە سەیر نییە کە کەس گومانمان لێ ناکات، چونکە ئەوانی تر تەنیا ئەو بەشەمان دەبینن کە هەژار و خاڵی و بێسوود و ڕووکەشە... ئاه خانم، بەراستی من لەو بروایەدام، بە راستی گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە من فریشتەکەی ناو ناخی خۆمم بینی. سەعاتێک لەمەوپێش بوو لە جادەی پشت مزگەوتی حەبیبوڵای کەتانەوە بەرەو لای ماڵی میرزا سەلیمی جەراح دەپەڕیمەوە، لەویادا چاوم لێکنا و بە ڕوونی بینیم، خۆم بووم بەڵام لە بەرگی فریشتەیەکدا. شتێکی سەیربوو، نە هەقیقەت بوو نە خەیاڵ... هەموو شتە گرنگەکانی دونیاش نە هەقیقەتن نە خەیاڵ... بەڵێ دواجار ئەوە بەشی خۆی مایەی نیگەرانیشە. وانییە، خانم وانییە... ئاخۆ بکرێت هەموو بەشەرەکان فریشتەکانی خۆیان ببینن، کاری وادەکرێت. هەڵبەت نا؟».

ڕێزان خان لە پشتی مێزەکەیەوە بە ویقاری ژنێکەوە کە بەجیدی گوێ لە کوڕێکی گەنج دەگرێت، دانیشت بوو، وەک هەمیشە بە جۆرێکی سەیر مەمکانی بەرەو پێش بڵندکردبووەوە، هەر دووتای قووت لە مەمکدانێکی تەسکدا بەرز قیتاندبوو، زوو زوو چاویلکەکەی دادەگرت و دەیخستەوە سەر چاوی. گەرچی دەیزانی ژنێکی بەتەمەن و پیر نییە، بەڵام وا ڕەفتاریدەکرد وەک ئەوەی بڵێت ئەها دەبینیت عەزیزم... دەبینیت من بە دایکی تۆ دەشێم، بۆیە وا ئارام لەم ژوورەدا لەگەڵتدا دانیشتووم و شەرمێکم لە خۆم نییە. ڕێزان خان گووتی «بەساقە، نازانم. لەوانەیە ئەوە وابێت، منیش لە زووەوە دیقەتم داوە، کەس وەک شتێکی ئەوتۆ گرنگ سەیری من ناکات، لە مەکتەبەکە هەر پێمدەڵێن ست ڕێزانی داماو. بەس نازانم هۆکەی ئەوەیە کە وەک تۆ دەڵێیت ئینسانەکەی ناوم

لە ژێر باری ئەم فریشتەیەی دڵمدا وەک کەڵەشێری بەزیوی لێهاتووە یان چی؟ یان هەر خۆم عەیبێکم هەیە، بۆیە پێمدەڵێن ست ڕێزانی داماو. بۆ تۆش... بۆ تۆش... ئەها لەوانەیە وابێت، ئەوەی تۆ مارکسی بوویت و هەموو هاوڕێکانت ئیعدام کراون تۆ نەبێت، ئەوە بۆ خۆی مەعنای خۆی هەیە. من پرسیارم لێکردویت... عەجایەبە، بۆ بەردەوام شتێک هەیە تۆ لە ژێر دەستی ئەم تاقم و ئەو هێزەوە دەردێنێت؟ دەبێت بەهانەیەک هەبێت؟ هۆیەکی هەقیقی یان غەیبی؟ کێ چوزانێت بەقوربان، تۆ خۆشت نازانیت. لە ڕاستیدا دەبێت تۆ هیچ نەبیت، وا کەس بە شایەنی ئەوەت نازانێت سەری خۆی پێتەوە بێشێنێت... یان لەوانەیە وابێت کە بوون و نەبوونی بەشەری وەک تۆ هەر لە بنەوەڕا مانای نەبێت. منیش ئەوەم پرسیوە. ها وامەزانە ماڵەکەی من هیچی بە سەر نەهاتووە، تا ئێستا دووجار ئەمن هاتوون بۆ ئێرە... هەموو ژوورەکان گەڕاون... هەتا یەک یەک ژوورەکانی سەرەوەیان پشکنیوە، بەڵام هیچیان نەبینیوە. من پێمگوتن، ئێرە وەک مۆزەخانەی خێزانی مەلەکبین وایە، ئەوانەی لە حەوشەکەدا نێژراون سەلەفی موبارەکی منن، ئەوە گۆڕستانی بنەماڵەی خۆمانە. هەرچییەکمان فەوتیکردوە لەوێدا نێژراون، بەوەدا ئێمە باوەڕمان وایە، باوباپیرانمان لەو دونیا دەبنە مەلەک، ناوی وەک مەلایکەتیان لێدەنێین. دەزانی جارێکیان بەڕێوەبەری ئەمن خۆی هات، زۆر بە چیرۆکەکە پێکەنی و گوتی وەڵا... ئەکراد کلکم مخابیل. وابزانم دوایی داوایکردبوو بینێرن بۆ شارێکی تر».

ڕێزان خان کەمێک خۆی ڕاستکردوە، نەدەبوو لە کاتی قسەدا قەت ڕێکی پشتی و قنجی گەردنی و قووتی مەمکانی بشێوێت. وەک خۆی دەیگووت «کورتەباڵاکان دەبێت خۆمان تۆزێک قیتبکەینەوە، ئەگینا خەڵکی درێژ و گەلحۆ دەمانخۆن». بەڵام هاوشان بەو قیتییە، چاوێکی وەها پڕ ڕەحمی هەبوو، غروری مەمکە بەرزەکانی دەشاردەوە.

بنێشتێکی لە چەکمەجەکەی دەرهێنا و گووتی «بخۆ، عەزیزم بنێشتێک بخۆ، ئەمرۆ خۆشحاڵم تا ئێستا مەهدائیلی خزممان سەرودڵی نەگرتووم. بەس پێتبڵێم. ئەوەی فریشتەکەمان بە چاوی ئێمە دەبینێت، ئەوەی ئەو دڵ و دەرونی گرتووین، هەواڵێکی باشە... ئیشی ئێمە کۆمەککردنە بەو مەخلوقاتە بەستەزمانانە. دەبێت وابێت، دەبێت کۆمەڵێک هەبن، فریشتەکەیان ڕانەکات، ئێ بەساقە گەر هەموو فریشتەکان ڕابکەن، زەوی دەبێت بە جێگایەکی بێتام، دەبێت لە هەندێ جێگادا فریشتەیەک بە ئینسان بڵێت کەمێ بڕۆ ئەولاوە با من هەندێ شت بۆ ئەم ژیانە زیاد بکەم. بەقوربان... من کە هەندێ شت دەبینم یەکسەر دەڵێم ئەوە شوێن دەستی مەلایکەتەکانی ناو ئینسانە... شوێن دەستی ئەوانە. گەر زەوی باش بگەڕێیت، گەر سەیری ئیشە باشەکانی مرۆڤ بکەیت تێدەگەیت کە فریشتەکەی ناومان قسەی خۆی هەبووە. وادەزانم لە هەموو سەردەمێکدا ئەوە ڕوویدابێت، لە ناکاو فریشتە و ئینسان دەست دەخەنە ناو دەستی یەک، باوەش بەیەکدا دەکەن. ئەو دەڵێت ئینسانی عەزیزم، ئەویش دەڵێت فریشتەی خۆشەویستم، ئەو دەڵێت تۆ لەوێیت ئینسانی برام، ئەویش دەپرسێت ئەی فریشتەی هاوڕێم تۆ لەوێیت، ئەو دەڵێت ئا قوربان، بەڵێ عەزیزم من لێرەم، ئەمیش دەڵێت بەقوربان منیش لێرەم. ئیتر وایە... بولبولیار شتەکان وایە. ئەوەی من بۆت دەگێڕمەوە خۆم بە خەو بینیومە. جارێک فریشتەکەی خۆم هاتە خەوم. باوەڕت بێت، گووتی، گوێبگرە من ڕێزائیلی فریشتەم، لەوەتەی تۆ لە دونیادایت من لەگەڵتدام، من یارمەتیم دایت هەموو فریشتەکان ببینیت، منیش باوەشم پیاکرد و گووتم بە قوربانی تۆ بم، ژنێکی داماوی بچکۆلەی وەک من، ژنێکی کورتەبنەی شانپانی وەک من گەر تۆ فریام نەکەوتیتایە، بە خودا ژیانم تامی نەدەبوو... فیدات بم، تۆ فریشتەی منیت. ئەویش باوەشی پیاکردم و گووتی عەزیزم ڕێزان خان بە ڕاستی شانازیت پێوەدەکەم، تۆ

نەبوویتایە ئەم فریشتە نەخۆشانە بۆ کوێ دەچوون. منیش گووتم ئەوە گرنگ نییە، ئەوە هیچ گرنگ نییە، ئەوە گرنگە وابکەین هەموو مرۆڤێک بچێتە خەڵوەتێکەوە و هاواربکات ئەی فریشتەی من تۆ لە کوێیت... لەوانەیە یەکەمجار هیچ وەڵامێک نەبیستێتەوە، لەوانەیە دووەمجار هیچ وەڵامێک نەبیستێتەوە، سێیەمجار هیچ وەڵامێک نەبیستێتەوە، لەوانەیە چەندین ساڵ هیچ وەڵامێک نەبیستێتەوە، بەڵام ڕۆژێک لە ڕۆژان دەبینێت ئەو فریشتەیە لە دڵیدا، لە ڕوانینیدا، لە هۆشیدا ئیشدەکات... ئاوەهایە عەزیزم... کوڕی خۆم... ئاوهایە. لەم ژنە پانە، کورتەبنە، کوپەڵەیەی بەردەمتی وەرگرە. دەزانی لە قوتابخانە منداڵان لاسایی ڕۆیشتنەکەم دەکەنەوە، لە بری ڕێزە خان ناویان ناوم قازە خان، گوایە من وەک قاز دەڕۆم. کە وادەڵێن، منیش زیاتر لە بەردەمیاندا وەک قاز دێم و دەچم... بەس وازبهێنە، نا هۆشەنگ گیان، ئینسان هەست بە فریشتە ناکات، فریشتەکەی ناخمان لە ناوماندا تواوەتەوە، وەک چۆن شەکر لە ئاودا دەتوێتەوە، وەک چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، وەک چۆن حەیوانەکەی ناومان لە ناوماندا تواوەتەوە. گەر فریشتەمان هەبێت و زیندووبێت هەستی پێناکەین، فریشتە ئاساییەکان، ئەوانەی دەبن بە بەشێک لە ئێمە بە جۆرێک لە ناوماندا دەتوێنەوە کە بوونی سەربەخۆی خۆیان نییە، بە ناوی مرۆڤەوە قسەدەکەن. فریشتەی ڕاستەقینە ئەو کاتەیان خۆشە کە لە بری ئەوان مرۆڤ لە سەر شانۆ دەردەکەوێت. نا شتەکە وەک کۆدێتایەک نییە فریشتەکان بە سەر ڕۆحی من و تۆدا کردبێتیان، ئێوە هەر وابیردەکەنەوە، مارکسییەکان، هەمووتان زۆر ئینقیلابین. حەزتان لەوەیە لە شەو و ڕۆژێکدا زوڵم و خراپە لە سەر زەوی نەمێنێت، بەڵام ئەوە هەر حەزە... منیش هەمە، خەڵکی تریش ئەو حەزە پڕوپوچەیان هەیە، بەس ئێوە زۆر حیسابی لە سەر دەکەن. ئاخ لە دەست ئێوە مارکسییەکان... ئاخ... ئینسان قەت تێناگات چیتان

پێدەکرێت. حەزمدەکرد جارێک بڕۆم بۆ یەکێتی سۆڤێت، بۆ چین، بۆ لای هەڤاڵ کاسترۆکەتان بزانم چیانکردوە، گەر بە دڵم بوو، پشتملی ئەم مەهدائیلی فریشتەیە دەگرم، خۆی و هەموو فریشتەکانی برادەری دەخەمە لۆرییەکەوە و لێخوڕە بۆ چین. دەڵێم فەرموو عەزیزم ژیانی ترتان دەوێت... بۆ ژیانی تر دەگەڕێن؟ ئەوە ژیانی تر. نا بەساقە شتی وا نییە، کۆدێتا و شتی وا لەگوڕێ نییە. قەت قسەی وا بۆ من مەکە، شتی وا مەخەرە دەمی ئەو دکتۆر شوکاکەوە، گەر بزانێت خۆی فریشتەیە، خولیای وا بچێتە سەری سوێند دەخۆم، دوو باڵی دەستکرد بۆ خۆی دروستدەکات و بەو باڵانەوە دەچێت بۆ ژووری عەمەلیات... نا شتی وا مەخەرە زاری... ئەوەی هەیە و نییە ئەوەیە کە ئینسان و فریشتە لە ئێمەدا باوەشیانکردوە بە یەکدا، یەکیان خۆشدەوێت... نازانم عەزیزم ئەوە نیشانەی بەدبەختییە یان چی... ها نازانم... تۆ دەڵێیت چی کوڕم... تۆ دەڵێیت چی؟... ها... بەس پێمبڵێ بەیانی بەرچاییتکردوە یان وەک خوشکە بەدبەختەکەی خۆت کاتی بەرچایشت نەبووە؟».

بولبولیار بێئەوەی حەز بە باسکردنی بەرچایی بکات، کەمێک بیریکردەوە و گووتی «ئاە ڕێزان خان قسەکانت دروستن. وایە من ناڵێم ئێمە دەبین بە مەخلوقی باڵدار، نا ئێمە هەمیشە هەر ئینسانین، بەڵام ئینسانێکین کە دوای خواستی فریشتەکان کەوتوین». ڕێزان خان دووبارە پرسیاری بەرچایی لێکردەوە، ئەوەی سەلماند کە بینینی فریشتەکان دەشێت پەیوەندی بە چاوی فریشتەکەی ناخمانەوە هەبێت، بەڵام گووتی «باوکی باوکم زۆر بیر لەم شتانە مەکەرەوە، ژیان پڕە لە تەلیسمی پڕوپوچ، گەر ئینسان مێشکی خۆی بە هەموو تەلیسمێکەوە خەریکبکات فریای بەرچایش ناکەوێت، کاتی بۆ دەوام نامێنێت، کاتی بۆ ئیش و کاری کەشتییەکەش نامێنێت، ئەم جیهانەی ئێمە ئەو بەشەی دونیایە کە

بۆ هەتاهەتایە بە پاکی دەمێنێتەوە، یان بەقوربان بڵێم چی خوابکات وابێت، بەخودا خراپە وا زۆربووە خەریکە باوەڕ بە فریشتەکانیش ناکەم... دەڵێم کێ دەڵێت ئەم مەلعونانە شەیتان نین و لە پێستی فریشتەدا. هەندێجار کە دەبینم خۆیان مرداردەکەنەوە دەڵێم ببێت و نەبێت بەخودا ئێوە فریشتە نین... وای ئینسان بیتوانیبایە جارێک خۆی بە تەواوی لە گومان پاکبکردایەتەوە، وای. یەکجار، بیگووتبایە هەر ئەوەیە، دنیا هەر ئەوەیە کە بەم چاوە زەق و زۆپە دەیبینم. هەموو شت باش دەبوو. بەس شتی وادەبێت؟ قەت نابێت. ئێستا تۆ دەڵێیت ئەم بەیانییە لە نزیک ماڵی میراز سەلیم فریشتەکەی خۆتت بینیوە. منیش دەڵێم وایە چاوی فریشتەکەت خۆشبێت، هەر ئەو ئەو دەردەی تووشکردیت و مەهدائیلت بینی، ئەگەر وەک من دەردت بە دەست ئەم مەهدائیلەوە دەکێشا دەتگووت عەجایەب مەلایکەت دەردی وا دەخەنە ڕێگای بەشەر؟ ئاه .. من تا ئەو کاتە ژیانم خۆش بوو کە ئەم مەهدائیل و دکتۆر شوکاکە نەهاتبوونە ژیانمەوە... وای چ بەزمێکم پێدەکەن... وای چەند هیلاکم بە دەستیانەوە، حەوت شەیتان لە ماڵمدا بووایە هەر ئەوەندە ماندوویاندەکردم».

وەک ئەوە بوو بولبولیار نەتوانێت زۆر گوێ لە مەلەکبین بگرێت، خۆی هەڵدایە نابەینی قسەکانی خانم و گووتی «من کە هاتم بۆ ئێرە بە ساتێکی ئیشراقدا تێپەڕیم، ساتێک بوو تێگەیشتم من فریشتەم. شتێکی باشە خانم کە تێدەگەم من فریشتەم... ئاه کە بەڕێگاوە بووم، بیرم لەوە دەکردەوە ناوی خۆم لادەم، خانمی بەڕێز وا هەستدەکەم هۆشەنگە کۆنەکەی ناخم کارێکی نەماوە، ئەو هۆشەنگەی سەردەمانێک پیاوێکی ئینقلابی بوو، ئاشتیخواز بوو، نازانم چی بوو. کە بیردەکەمەوە من لە ڕووەوە شتێکی تر دەمباتەڕێوە کە ناوی دەنێم بولبولیاری فریشتە... خانم دەزانی ئەوە چ ساتێکی ئیشراقە کە هەست بەوە دەکەیت

فریشتەیت. خۆزگە هەموو ئادەمیزادێک ئەو ساتی ئیشراقە بژیابایە، ساتێکە لە پڕێکدا فریشتەکەی ناخت دەبینیت، لە ناکاو وەک ڕۆشناییەک لێتبات ڕووناک دەبیتەوە و فریشتەکەت لە بنی بنەوە سەردەکەوێت و دەڵێت لێرەم، لەگەڵتدام، هەر دووکتان یەک یەک دەدۆزنەوە، وەک ئەوەی پێکەوە لە ناو جەهەنەمێکی گەورەدا لە نابەین ملیۆنێک دەرگا و داڵان و ژوور و ڕیواقدا ونبووبن و ئێستا موعجیزەیەک هاتبێت و یەکدیتان دۆزیبێتەوە. من ئەم بەیانییە ساتێکی وا ئیشراقم بوو... ساتێک فریشتە ڕاستەقینەکەی من خۆی بۆ دەرخستم... ئێستا دەتوانم پتر لە خۆم دڵنیابم، پتر بزانم کە دەتوانم سوودێکم هەبێت، دەتوانم تۆزێک لە سیاسەت دووربکەومەوە، بێئەوەی وەک ئینسان لە کەڵک بکەوم».

قسەکانی بولبولیار ئەمجارە بە جۆرێک بوون خانمیان تۆزێک لە مەراقی بەرچایی دوورخستەوە. گووتی «لەوەدا لە سەر هەقی، ئەم مەملەکەتە وای لێهاتووە، هەر ئینسان سیاسەتی نەکرد بە هەموو دەیانەوێت بیخەنە یەکەمین تەنەکەی زبڵەوە. جارێکیان لە ناو مامۆستاکانی مەکتەبدا بووە شەڕە قسە. ئەو شیوعییە، ئەم مەلاییە، ئەم خەتی پانە، ئەو کۆمەڵەیە... ئەم نازانم چییە. من خۆم بردە پێشێ و گووتم من حیزبی فریشتەم، حیزبی مەلایەکەتی نەخۆشم. ها دەزانیت چییان کرد؟ وادەزانی هەموو وەستان و گووتیان ڕێزان خان حیزبی مەلایکەت چییە؟ حیزبی وا کەی لە مەملەکەتدا هەیە، وادەزانی وایانکرد؟ قەسەم بە گۆڕی باوکم کەسیان هەر نەشیانپرسی ئەوە تۆ دەڵێیت چی؟... کەس منی هەر نەبیست... بۆ؟. لە بەرئەوەی هەموویان دەزانن من دەڵێم، حەزرەتی یوسف بهێنە، شەش مانگ سیاسەت بکات، ڕوخساری پاکی وەها ناشیرین دەبێت، هەموو بڵێین خۆزگە گورگ بیخواردایە. سیاسەت ئەوەیە، ئەو شتە پیسەیە، بەس نییە حەزرەتی یوسف شتی وای نەکردوە... ئێستاش تێناگەم تۆ چۆن سیاسییەک بوویت، هەر

یەکەمجار گوتیان سیاسەتیکردوە و مەلایکەتەکانیش دەبینێت، گوتم قەسەم بەخوا شتێک تەواو نییە، یان عەقڵی تەواو نییە، یان دواجار سیاسەتێک دروستبووە ئینسان دەتوانێت بیکات بێئەوەی کلکی سەگی لێبروێت... بەس تۆ پێمبڵێ، بە راستی هەست ناکەیت من و ئەم دکتۆر شوکاکە بۆ یەک زۆر باشین... تۆ دەڵێیت چی؟ ها تۆ دەڵێیت چی؟... بە راستی بۆچوونێکت لەو ڕووەوە هەیە؟ ».

بولبولیار زۆر بەو پرسیارە سادە و هەستە بێپوکەشانەی ڕێزان خان سەرسام بوو. بێئەوەی بتوانێت هیچ وەڵامیبداتەوە گوتی «خانم ڕاستییەکەی هاتووم بۆ ئەوەی لەگەڵ تۆ و فریشتەکاندا کاربکەم. ئێستا حەز و ئارەزوویەکم نییە ئەوە نەبێت. دەمەوێت بزانم فریشتە نەخۆشەکان چۆن دەتوانن زۆرتر بژین... دەتوانین چی بکەین؟».

ڕێزان خان هەناسەیەکی گەرمی هەڵکێشاو گوتی «وەرە عەزیزم، ڕاستدەکەیت، تۆ بۆ ئیش هاتوویت، غرور بخەرە ئەولاوە، ئەم خوشکە بەدبەختەی تۆ هەر زوو زوو هەموو شتێکی بیردەچێتەوە. هەقمە بە ڕاستی هەقمە. بابڕۆین، هەستە بابڕۆین... گەر وازم لێبهێنیت بە پرسیارەکانی خۆم جەرگت دەخۆم، نا بەقوربان، منیش هەموو ڕۆژێک کەسێکی عاقڵم دەست ناکەوێت گوێم لێبگرێت. چۆن بەساقە من کۆمەکی هەموو کەسێکم دەوێت، بەس خودا دەزانێت لە داهاتوودا شتەکان بە کوێ دەگەن. تەمەنادەکەم، فریشتەکان واز لەم راکردنە بهێنن بۆ ئەوەی من دەستبەرداری ئەم مەهدائیلی فریشتەیە ببم. گەر کەسێکی باشم هەبایە کارەکانی دکتۆر و ئەوی بۆ بکردبامایە، گەر کەسێکی ترم هەبووایە، بەڵام نییە. بەس تۆ... تۆ کوڕی خۆم، ئەوا پێمبڵێ، خوێندەوارییەکەت چۆنە... خوێندەوارییە ڕاستەقینەکەت... باسی شەهادە ناکەم، شەهادە خوێندەواری نییە. دەزانم زانکۆت تەواوکردوە، بەس قەسەم بە خوا، نیوەی ئەوانەی لە زانکۆ دەرچوون ناتوانن نامەیەکی باش بنوسن، نازانن

لاپەڕەیەک بێوەستان و هەڵە بخوێننەوە... وای کە تاڵە... وانییە؟».

بولبولیار سەرسام و قووڵ سەیریکرد و هیچی نەگووت، لە ڕاستیدا زۆرجار نەیدەزانی چی وەڵامی ئەم ژنە بداتەوە. ڕێزان گووتی «دەزانی چیم نوقسانە؟ کەسێکم دەوێت بتوانێت دەنگی خۆشبێت و بە نەغمەیەک شت بخوێنێتەوە بگاتە دڵی فریشتە نەخۆشەکان... دەزانی چی تریشم پێویستە چیرۆکنوسێک، چیرۆکنوسێکی ڕاستەقینە؟».

بولبولیار بە خانمی گووت «نازانم چی بڵێم، بەڵام دەتوانیت تاقیمبکەیتەوە، پێشتر چیرۆکم بە دەنگی بەرز نەخوێندۆتەوە». ڕێزان سەیرێکی کرد و گووتی «نا ترسی ئەوەم نییە، باوەڕناکەم دەنگت وەها ناساز بێت، تۆبڵێی فریشتەکانم لە مەراقی دەنگی ناخۆشتدا هەموو بمرن؟... بەڵام وەرە پێتبڵێم، وەرە پێتبڵێم چیم دەوێت، ئێستا لە شەرمین زیاتر کەسم نییە ئەو کارەم بۆ بکات... ئەویش لە سەر ئاگرە بڕوات و نەیەتەوە. هەموو کەسێک بەرگەی ژیانی ناو ئەم کەشتییە ناگرێت».

ڕێزان خان لە پشت مێز و کورسییەکەیەوە هاتەدەرێ و گووتی «دوامکەوە، دەبێت خۆت بیبینیت. باشترە خۆت لە نزیکەوە بیبینیت».

ڕێزان خان وەک بۆ کارێکی پەلە لە ژوورەکە بێتە دەرێ، بە خێراییەکی نائاساییەوە پێش بولبولیار کەوت. بولبولیار سەیری لە زیندوێتی و وریایی ئەم خانمە بچوک و کوپەڵەییە هات. شتێکی تێدابوو کە دەبوو زۆر ڕێزی بگریت و خۆشتبوێت. بە پلەکەکاندا سەرکەوت و بێدەنگ و گورجوگۆڵ بە ڕیواقی درێژی بیمارستانەکەدا کەوتە ڕەوت و لەوسەری ژوورەکان دەرگایەکی بە ئەسپاییکردەوە و بەر لەوەی تەواوی لەشی بباتە ژوورێ، بە دەنگێکی هێمن پرسی «شەرمین گیان بێمە ژوورێ؟». بولبولیار گوێی لە دەنگی شەرمین نەبوو، بەڵام کە خانمی مەلەکبین خۆی کرد بە ژووردا، ئەویش لەگەڵیدا چووە ژوورێ.

فریشتەیەکی گەنج، بەڵام ڕەنگ پەڕیو و ماندوو، لە پێخەفێکی سپیدا پاڵکەوتبوو. کوڕێکی وردیلانەی قژ درێژی خوێن شیرین بوو، خانم بە چرپەوە گووتی «ئەوە بەهائیلی فریشتەیە، فریشتەی کەسێکی خراپە، خاوەنەکەی ئێستا لە زینداندایە زۆر نەخۆشە، تا ئێستا چەند جارێک چۆتە سەرە مەرگ و شەرمین دەیگێڕێتەوە. ئەو ئەم ماوەیە بەردەوام لەگەڵیدایە، هەم چیرۆکی بۆ دەخوێنێتەوە، هەم چیرۆکی ژیانی خۆی لەگەڵدا دەنوسێتەوە. ئەمەش شەرمین، مەلەکبینێکی ترە کەساڵێکە لەگەڵمدا کاردەکات، چیرۆکخوێنێکی باشە، فریشتەکان حەز لە دەنگی دەکەن، بەساقە بە خودا کەس نازانێت ئەم فریشتانە حەز لە چی دەکەن».

شەرمین کچێکی زۆر بچوکی باریک و ڕەنگزەرد بوو، قژێکی زەرد و تەنک و کاڵی هەبوو کە بە چەند تەوقەیەک نوساندبووی بە سەرییەوە، چاوانی تیشکێکی نهێنی و زیرەکییەکی قووڵیان لە نێودا بوو، بولبولیار هەر لە یەکەم چرکەوە کە دەستی تەوقەی بۆ درێژکرد، هەستی بە شەرمێکی کچانە و موچڕکێکی ترس لە سەری پەنجەکانیدا کرد. چۆنێتی نیگاکردنی و شێوەی ڕاوەستانی، ترسێکی زۆریان پێوە بوو، وەک ئەوە بوو نادڵنیاییەکی قووڵی هەبێت، بیەوێت هەڵبێت، یان لە پەرێزی مەترسییەکی گەورەدا بێت کە دەشێت هەر ئێستا لە جێگایەکی نادیارەوە بێتەدەرێ. ڕێزان خان گووتی «گوێبگرە کاکە هۆشەنگ، جیاوازی نێوان ئینسان و فریشتە ئەوەیە، ئینسان ژیانیشی مانای نەمێنێت هەر دەژی، هەر وەک هێسترێکی چەموش باری خۆی دەدات بە کۆڵیدا و ڕایدەکێشێت. لەمڕووەوە بەقوربان ئینسان لە جروجانەوەر و حوشتر و ئەو شتانەوە نزیکە، بەڵام فریشتە بەستەزمانەکانمان شتێکی ترن، هەر کە هەستیانکرد مانایان نەماوە، هەستیانکرد ئەم ئینسانە مەلعونە نە باکی بە کەس هەیە و نەبیر لە شتێکی جیاواز دەکاتەوە،

دەمرن. بۆیە ئیشی ئەم خوشکە داماوەی تۆ ئەوەیە مانایان بداتێت، وەک جاری پێشوو پێمگوتن، دەبێت بتوانین چیرۆکێک دروستبکەین فریشتەکان هەستبکەن جێگایەکیان لەلای مرۆڤ ماوە. دەبێت تەواوی چیرۆکەکان لە سەر پەیوەندی نێوان فریشتە و خاوەنەکەی بێت. فریشتە مەخلوقێکە ناتوانێت واقیع و چیرۆک لەیەکتر جیابکاتەوە، لای ئەوان شتەکان بەپێچەوانەی ئێمەوەیە، لای من و تۆ لە پێشدا هەقیقەت گرنگە ئینجا چیرۆک، بەڵام ئەوان کاریان بە هەقیقەت نییە، هەقیقەتی چی بەساقە، هەقیقەت ئەم دونیا تاریک و تاڵەیە کە من و تۆی تیا دەژین. وانییە شەرمین گیان... وای بە دەموچاتدا دیارە چەند بۆ براکەت دڵ بەسوێی، کوێربم بۆت بەقوربان... کوێربم. جا وایە کوڕی شیرینم، وایە عەزیزم. گەر غرور بخەینە ئەولاوە، شتەکە بەوجۆرەیە. ئێمەش لێرە وادەکەین وەک لەگەڵیاندا ژیانێکی تر بژین، ژیانە راستەقینەکە. ئاە بە ساقە بە خوا من فریشتەکەم ڕابکات نازانم چۆن دڵی بهێنمەوە، ئێستا لە ژێرەوە هەر هاوارم لێدەکات بۆ شووناکەیت، بۆ ژیانێکی تر دروست ناکەیت، بۆ ماڵ و مێردێکی پاک و تەمیز بۆ خۆت نانێیت بەیەکەوە؟. بەقوربان لەوە زیاتر نییە... بە خودا کوڕی خۆم لێرە هیچ ناکەین، هەر خەوە ونبووەکان دەدۆزینەوە و هیچی تر. ئەوان بەوە دڵیان خۆشدەبێت ببینن ئینسان کاری باشی کردوە، ئازاری کەسی نەداوە، گوێی لە ئازار گرتووە، ئاە نازانم بۆ ئەوەندە حەزدەکەن گوێ لە نرکە و ناڵینی دونیا بگرین، بۆ ئەوەی نەمرن دەبێت وابکەین، بیانگرینە ئامێز بڵێین خاوەنەکەت، ئاە ئەو ئینسانەی تۆ لە دەستی راتکرد ژیانێکی تر دەژی... بە تەنگ ئازاری ئەوانی دییەوەیە، بووە بە یەکەم غەمخۆری مرۆڤ، بیر لە شتی جوان دەکاتەوە، بیر لە شتی پاک دەکاتەوە، عاشق بووە... وای هەرچی کابرای سەگباب لە ژیانیدا بیری لێ نەکردۆتەوە ئێمە لێرە لە بەر دڵی ئەم فریشتە نەخۆشانە

بیری لێدەکەینەوە، وای خالق... چی بکەین؟ بۆ هەموو ژیانێکی ون دەگەڕێین، هەموو جۆرە ژیانێکی ون، ئەوە ئیشمانە. ئێرە بەقوربان هەر بیمارستانی فریشتەکان نییە، بەڵکو کارخانەی هەموو ئەو ژیانانەشە کە مرۆڤ ونیکردون... لێرەدا لە جۆری چیرۆکدا دروستیدەکەینەوە. وای شەرمین گیان کچێکی چەند جوانی... دەموچاوت تۆزێک ترساوە، بەس شایستەی ژیانێکی باشتریت، ئەوە دەهێنێت لە جێگایەکی تر دانیشیت بۆ خۆت لە پشت کورسی و مێزەوە ڕۆمان بنوسیت و بیفرۆشیت و وەکو گوڵ پێیبژیت. خۆزگە وا بووایە، ئینجا ئەم ڕێزانە کوپەڵەیەی خوشکت بە لەنجەولار دەهات بە میوانیت و دوو چای جوانی لا دەخواردیتەوە. وای بەڵام ئەوەتا سات دوای سات و ڕۆژ دوای رۆژ تەنیا دڵی ئەم فریشتەیە خۆشدەکەیت. وا نییە شەرمین گیان، وانییە، ئاه بە دەموچاوتدا قەت دیار نییە کە چیرۆکنوسێکی چەند باشیت. ئێستا هۆشە گیان، تۆ هەموو شتێک دەزانیت. دەزانیت بۆیە ناویان دەنێین فریشتە چونکە لە خنکان لە پڕوپوچیدا دەرماندێنن. ئەمان ناتوانن لە ژیانی ڕاستەقینەدا بژین. وای ژیانی ڕاستەقینە، بەس مرۆڤ بەرگەی دەگرێت، بەس مرۆڤ. هەرچی جرۆجانەوەرە خۆیان لێدزیوەتەوە، بەوەی خۆیان تووشی موسیبەتی عەقڵ و نەخۆشی قسەکردن نەکردوە، باری تەعالاش خۆی چووە بۆ ئاسمان و دەردەکەی بۆ ئێمە جێهێشتووە. وای لە دەست ژیانی راستەقینە... وای. تێدەگەم ئەم فریشتانە بۆ حەزیان پێ نییە... تێدەگەم. سەیریکە بەقوربان، سەیری بەهائیلی خزمت بکە، بزانە ئەوە کەڵکی ژیانی ناو بازاڕی پێوەیە، بزانە دەتوانێت لە ناو بازرگان و قەساب و فیتەرەکاندا بژی؟ نا دەبێت ژیانێکی خەیاڵی بۆ دروستبکەین... فریشتەکان گوێگرێکی باشن... شێتی چیرۆکن... پێمگوتی. ئەوان چیرۆکنوسەکەی ناو ناخمانن». بە خەفەتەوە دەستێکی بە سەر سەری بەهائیلدا هێنا و گوتی «بەقوربان ئەی تۆ چۆنیت...

دەبینیت... دەبینیت... باش نییە، بەخودا باش نییە، هەناسە و شتی تەواو نییە». باوەشێکی بچوکی بە شەرمیندا کرد و گووتی «شاژنی حیکایەتەکانم ئەی براکەت چۆنە... ئاه بولبولیار بیرمچوو پێتبڵێم کە براکەی لە سەربان کەوتۆتە خوارێ، وابییش، دەبێت دڵی دایکت ئێستا چۆن بێت؟». باوەشێکی دووبارە و بچوکی کردەوە بە شەرمیندا، هێشتا ئەوی تەواو بەرنەدا بوو کە گووتی «بەوجۆرەیە کوڕی باوکم، هەر بۆیە هەندێجار دەبینیت ژنێک دەساڵ مێردەکەی هەر شەقی دەداتێ و بێ هیچ بگرە و بەردەیەک هەر دادەنیشێت، پیاو هەیە چل ساڵ زوخاوی ژنەکەی هەڵدەگرێت، چونکە فریشتەکانیان مردوە، ئەو کەسەیان مردوە کە لە ناوەوە چیرۆکی ژیانێکی تریان دەنێتە بەردەست و دەڵێ بەقوربان فەرموو ئەوە ژیانێکی تر، ئەوە ڕێگایەکی تر، ئەو ڕێورەسمێکی تر بۆ داهاتوو. مرۆڤ کە فریشتەکەی دەمرێت، کوێرانە تەنیا ملی ئەو ڕێگایە دەگرێت کە پیا هاتووە و هیچی تر... ئیتر گەر ژنە یان پیاو، گەر کچە یان کوڕ... هەموو ڕۆژێکی لێدەبێت بە کۆتایی دونیا... بەقیامەت. ئاخ لە ئینسان ئەگەر بیزانیبایە کە بەردەوام دەتوانێت لە سەرەتاوە دەست پێبکاتەوە ئەوەندە نە ئازاری خۆی دەدا و نە ئازاری کەس. وەرە بەساقە، ئەوە ئیشەکەی ئێمەیە، دانیشە و گوێگرە بزانە شەرمین چی بۆ ئەم نەخۆشە دەخوێنێتەوە. چیرۆکەکانی وەک چیرۆکی منداڵان وایە، بەس چیرۆکی منداڵانیش نییە، وەک چیرۆکی منداڵانە نەوەک چیرۆکی منداڵان بێت، ها تۆ لە جیاوازییەکە تێدەگەیت. بەقوربان چاوەکەم، غرور بخەرە ئەولاوە و وەرە گوێبگرە، وایش با من دانیشم، ماوەیەکە بە هەق و ناهەق هیلاک دەبم. دەست پێبکە شەرمین گیان، دەمەوێت کاکە هۆشەنگ گوێی لێتبێت. جاران پێش ئەوەی بەهائیل وا نەخۆش بێت، پێکەوە لە سەر هەموو شتێک گفتوگۆیان دەکرد، وانییە شەرمین؟. خۆی حیکمەتی ئیشەکە ئەوەیە تۆ چیرۆکێک دەنوسیت

و فریشتە نەخۆشەکەت بۆت دەستکاریدەکات، وانییە شەرمین گیان؟ ئیشی فریشتە ئەوەیە دەستکاری حیکایەتە خراپەکانی ئێمە بکات؟ گەر ڕێگای ئەوەیان پێنەدەین عەزیزم، نەخۆشتر دەکەون. بەقوربان ئاوا مەیبینە، دواجار ئەم فریشتەیەی تۆ دەیبینی هیچ نییە جگە لە ئینسانێکی فەرامۆشکراو... وای بەس خودا دەزانێت چەند ئینسانی فەرامۆشکراوی تر لە ناو ئینسانێکدا هەیە. بەقوربان هۆشەنگ تۆ هەر بە پێوە دەبیت... ئاە هەر بە پێوە دەبیت. باشە بەساقە، من دوو دەنک ترێم خواردوە ئینتەلای پێکردوم... عەیب نەبێت بەقوربان عەیب نەبێت... تۆش وەک برامیت. وایش، شەرمین دەمێکە گوێم لەو دەنگە خۆشەت نەبووە، دەمێکە. بە هەقی لائیلاهە ئیلەڵا بیری ئەو دەنگەت دەکەم. گوێی لێبگرە هۆشە گیان، ئینجا دەزانی باسی چی دەکەم... ئینجا تێدەگەیت بۆ مەلەک دەبینێت. شتێک بخوێنەوە گوڵم شتێک بخوێنەوە».

بەهائیلی فریشتە بە ڕاستی نەخۆش بوو. هەڵبەت نەخۆشی فریشتەکان چەند قۆناغێک بوو، بەهائیل ئێستا گەیشتبووە ئەوەی توانای قسەکردنی نەمێنێت، چاوانی بەرەو کزی دەچوون و پێدەچوو هێدی هێدی تەواو نابینا بێت، بەڵام چیرۆکەکانی شەرمین بە هیلاکی و ئەستەمێکی زۆر، ڕۆژەکانی ژیانی بەهائیلی فریشتەیان درێژدەکردەوە.

ئەو ڕۆژە ڕێزان خانی مەلەکبین بە تەنیا لە سەر کورسییەک و شەرمین لە لێواری چەپی پێخەفی فریشتەکەدا دانیشتن، هۆشەنگیش بە پێوە لە نزیک خانمی مەلەکبینەوە وەستا. هێدی هێدی شەرمین لە دەفتەرێکی گەورەوە بە دەنگێکی خۆش کەوتە خوێندنەوە:

«بەهادین لە نیوەڕۆی هەمان ڕۆژدا، دوای ئەوەی هەستیکرد درەختەکان لەو باغچەیەدا بێئاون، کە زانی تینی گەرما خەریکە چیمەن و باغی ناوچەکە دەسووتێنێت، ڕوویکردە ماڵی خاوەن تانکەرێکی

دۆستی... پێیگووت «کاک خەلیل، خۆت دەزانی بۆ حەڤدە ڕۆژ دەچێت باران نەباریوە، لەم وەرزەدا درەختەکان ئاویان زۆر پێویستە، کە خودا بارانی نەباران مانای ئەوەی کە ئێمە دەستبەکاربین... مرۆڤ ئیشی ئەوەیە هەر شتێک خودا و سروشت بە ئاسانی نەیانبەخشی خۆی دروستیبکات و بیسازێنێت». خاوەن تەنکەرەکە پیاوێکی تەمەڵ بوو، بە بێباکی گووتی «با درەختەکان بمرن، من لە ڕۆژی وا گەرمدا ناتوانم درەختەکان ئاوبدەم، شوێنی ئاو زۆر دوورە، سەرچاوەکان لە دەرەوەی شارن». لەو شارەدا درەختەکان هەموو ژیانیان لە مەترسیدا بوو، ئینجانەکان هەموو لە مەترسیدا بوون، گوڵە کێوییەکان خەریک بوو دەخنکان. خەڵکی کەسی بیری لە گوڵەکان نەدەکردەوە، کەس خەیاڵی لای درەخت نەبوو... خەڵک ئەوەندە ئاویان هەبوو کە دەیانخواردەوە. ئیتر هەرچییەکی تر بێئاو بمردایە کەس بە خەیاڵیدا نەدەهات. بەڵام بەهادین وانەبوو... ئەو ڕۆژە یەک یەک بە سەر ناسیاوەکانییەوە گەڕا، تا ئێوارەیەکی درەنگ وەخت کەسێکی دۆزییەوە».

شەرمین تا ماوەیەکی دیش لە سەر حیکایەتکردن بەردەوام بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو کە تێکەڵەیەکی سەیربوو لە دەنگی کچی بەناز و منداڵی بێگوناه، خۆی بیری لەو چیرۆکە سادانە دەکردەوە و لەگەڵ فریشتەکاندا دەستکاریدەکردن. کە لە چیرۆکەکەی بووەوە ڕێزان خانی مەلەکبین هەستا و گوتی «هۆشەنگ گیان بەوجۆرەیە... چیرۆکی فریشتەکان دەبێت جەمع و جۆر بێت، هەندێجار باشە سادەبێت، هەندێجار دەبێت سادەنەبێت، مرۆڤ تێیدا دەبێت هەمیشە باش بێت... ئەوە موسیبەتی چیرۆکێکە کە فریشتەکان بینوسن، ئینسان تێیدا دەبێت هەمیشە کەسێکی چاکەکار بێت. ئاە بەڵام بەساقە ئینسان وایە؟ بەساقە من بە تۆ دەڵێم، ئینسان وایە؟ تۆ وایت؟ من وام؟ مەلای مزگەوتەکە وایە؟ جەنابی قایمقام وایە؟ هەموو دایمە باشین؟. وای هیچ

شتێک لەوە قورستر نییە ئەم بەنی ئادەمە هەمیشە باش بێت، ڕۆژی سێ ژەم ڕۆن گەرچەکت بەنێ و کەس داوای وات لێ نەکات... بەساقە، ئەوەی فریشتەکەی ڕۆحمان دەیەوێت شتێکی قورسە، هەر بۆیە ڕاستت دەوێت ئینسان شەیتانی خۆشتر دەوێت. بە ڕاستی شەیتان بۆ ئینسان زۆر باشە، زۆر بە رەحمە، ئەرکی نییە. ئاخ من تێناگەم ئەو هەموو سەرسامییەم بە شەیتان هەیە چیدەکەم لێرەدا؟ ئەوەش حیکایەتێکی ترە، ئینسانە فەرامۆشکراوەکەی ناو ئینسان. ڕەنگە وابێت عەزیزم وەک تۆ دەڵێیت، منیش فریشتەیەک دەستی خستبێتە بینم و خودا دەزانێت شەیتانە بەستەزمانەکەم ئێستا بۆ کوێ هەڵهاتووە و من لێرەوە بیریدەکەم. وای وای، ئەگەر ئەویش ئەوەندە خراپ نەبووایە... گەر پەتی بۆ بەردەیت... گەر پەت بۆ ئەو شەیتانە مەلعونەش بەردەیت، بەخوا هەمووشتێک وێراندەکات. گەر ئینسان بیتوانیبایە خاڵێک بدۆزێتەوە، جێگایەک بە ئەندازەی یەک هەم لە فریشتەکەی ناخی و هەم لە شەیتانەکەی دووربایە، لەویادا بوەستابایە و بیگووتبایە هەردووکتان دەمتان داخەن نابینن وەک یەک لە هەردووکتانەوە دوورم. بەس ئینسان هیچ وەخت ئەو خاڵە مەلعونەی بۆ نادۆزرێتەوە... ئاه ئینسانی بەستەزمان. نا هۆشەنگ گیان تۆ لەوە ناچێت بەهرەی چیرۆکنوسینت هەبێت، بەس من بزانم لە گەڵ ئەهلی ئەدەبدا هامشۆت هەیە، ئاگام لە هەواڵتە، بەس گەر غرور بخەیتە ئەولاوە کارێکی باش دەکەیت. وەرە بابڕۆین. من قسەی ترم هەیە بۆت... شەرمین گیان عەفوومکە... ئێوە بۆ هەردووکتان واسەیرمدەکەن؟ گەر خۆتان قسەم پێ نەبڕن، من لە قەبرەکەشتدا دەمم ناوەستێت. ئاه شەرمین گیان دوای هەموو شتێکی بۆ باسبکە... خۆت ئەزموونی خۆت بۆ کاک هۆشەنگ بگێڕەوە. ناوی هۆشەنگی بولبولیارە، فەقیرترین پیاوی دونیایە، وای پێدەڵێن، دەڵێن پێڵاوەکانی سەر پێشی لەو پێڵاوانەیە کە خەڵک فڕێیدەدەن و ئەم

هەڵیدەگرێتەوە. وانییە بولبولیار؟ دڵنیام دڵگران نابیت، فەقیری عەیب نییە، بۆیە حەیا و ناموسیان دروستکردوە تا بڵێن فەقیری عەیب نییە، گەر شەرەف و ئابڕوویان دانەنابایە فەقیری دەبوو بە عەیبە، بەڵام ئێستا عەیب نییە، چونکە شتێکی تریان خستۆتە جێگا، خەڵک دەڵێن هەژاریی عەیب نییە، هەر حەیام نەچێت... ئەی چۆن بەساقە، ئینسان ئەوەندە گەمژەیە. بوەستە با پێتبڵێم، شەرمین دایکی مامۆستایە، باوکی خودا لێیخۆش بێت شۆفێری لۆری بوو، دەمێکە کۆچیکردوە... وانییە، شەرمین گیان وانییە؟ وایش بەو خوایە غەمی ئەو برایەت هەر لە سەر ڕوخسارتە، دەک کوێربم بۆت»

ڕێزان خانی مەلەکبین بەردەوام قسەیدەکرد، لێگەڕایتایە هەرگیز نەدەوەستا، هەموو ئەو بیرۆکە و خەیاڵ و خولیایانەی لای خەڵکانی دی نهێنین و بە بێدەنگی بە نێو سەری ئادەمیاندا تێدەپەڕن، لای خانمی مەلەکبین بە دەنگی بەرز و لە بەرچاوی میوان و نیشتەجێکانی مەلەکئاوا دەیدرکاند. ئەو ڕۆژە لە گەشتێکی تازەدا دووبارە بولبولیاری بە هەموو بیمارستاندا گێڕا. پێیگووت پێویستیان بە چیرۆکنوسێکە ژیان وەک شەرمین بەسادەیی و منداڵانە نەبینێت. گووتی «شەرمین... ئاه... شەرمین... فریشتەیە. خۆی فریشتەیە، سوێند بەخوا مەگەر لە باشیدا مەلەک لێیزویربن. بەس هێشتا منداڵە. من دەمرم بۆ چیرۆکەکانی، بەس ژیان لەم چیرۆکانە ئاڵۆزترە. من ئەزموونی ئەم هەموو ساڵە پێمدەڵێت، فریشتەکان تا کێشەی ئاڵۆزتریان بخەیتە بەردەست زیاتر دەکەونە مەراقەوە، زیاتر دەیانەوێت بژین بۆ ئەوەی یارمەتی مرۆڤ بدەن، گرنگ ئەوەیە مەتەڵێکیان بدەینێ بۆیان چارە نەکرێت، ئەوانیش زۆر بیربکەنەوە تا بزانن چاکە چییە و خراپە چییە. خوای گەورە هەموو بیریان دەچێتەوە کە ئەم فریشتە مەلعونە بەشە خنکاوەکەی خۆمانە، هەر بە ئەندازەی ئێمە لە ژیان و مردن دەزانێت، ئەویش

دەبێت بیربکاتەوە... بپرسێت... ئەی چۆن بەساقە. تۆ دەڵێیت ئەمڕۆ فریشتەکەی خۆمم بینیوە. باشە بینیوتە، پیرۆزت بێت... بەڵام چیی لە تۆدا گۆڕا؟ چ زانیارییەکی گرنگت بۆ زیادبوو؟. فریشتەیەکی مەلعونە و خۆی دەرخستووە و گووتوویێتی جەنابی بولبولیار، های... چۆنیت، ئەوەتا لێرەم... وانییە؟ وانییە؟ لەوە زیاتر هەیە. ئاه فریشتە بەستەزمانەکانم، فریشتە خەوتووەکانم، خۆ ئێوە مەکینە نین... مەکینەی چاکە... خۆزگە وابووایە، مەکینەیەک هەبایە شتەکانت بدایەتێ و ئەو لەو سەر بیگووتبایە چی باشە و چی خراپ. هەندێجار ئەسڵەن باوەڕم بەخودا هەر نامێنێت، چی دەبوو بۆ ئێمەی مرۆڤی بەستەزمان مەکینەیەکی لەوجۆرە دروستبکات، لە هەموو شارێکدا دوو مەکینەی لەوجۆرەمان بۆ دابنێت، دەچووین لێماندەپرسی چی باشە و چی خراپە، مەکینەکە پێیدەگووتین، کەی ئەوە کارێکی قورس بوو بۆ باری تەعالا، بەڵام ئێستا دەبێت بچین لە هەندێ پاشەڵی ڕشکن بپرسین و بڵێین چی چاکە و چی خراپە، کە خۆیان لە من و تۆ کەمتر دەزانن چی بەدە و چی باشە. هۆشەنگ گیان بەقوربان، تۆ پیاوێکی عاقڵی، مارکسییەکان ئەگەر خراپیش بن لە خەڵکی عەوام عاقڵترن، منیش خەڵکی عەوامم، سەیری ئەوە مەکە کە دائیرتولمعاریف و شت دەخوێنمەوە، من لە ئەسڵدا سەر بە عەوامم. تۆ دەزانیت ئینسان نە خراپە و نە باش، بەڵکو مەخلوقێکە گرفتێکی هەیە، ئینسان تاکە بوونەوەرە لە زەوی و ئاسمان کە موشکیلەی هەیە، نە خودا موشکیلەی هەیە نە چۆلەکەکان... بەس ئەوە بەشەری داماوە موشکیلەی هەیە. کە کۆترێک نەخۆش دەکەوێت، دەمرێت بێئەوەی نەخۆشییەکەی بووبێت بە موشکیلە بۆی، کە لە گەردووندا شتێک خوار دەڕوات، یەزدان تەماشایدەکات، بێئەوەی ئەوە بووبێت بە موشکیلە بۆی و بیەوێت چاکیبکات، بەس ئینسان... ئاخ لە دەست ئینسان، سەیری لووتی

خۆی دەکات و لێیدەبێت بە موشکیلە، سەیری قڵێشێکی سەر لێوی دەکات و لێیدەبێت بە مەراق، سەیری ڕەنگی خۆی دەکات و لێیدەبێت بە گەورەترین گرفتی دونیا... وای بە ساقە لە دەست ئینسان، وای، عەزیزم بڵێم چی. گرفت ئەوکاتە دروستدەبێت کە مرۆڤ بیری لە چارەسەر کردەوە، تا چارەسەر نەبێت گرفت نییە. گەر ڕاستت دەوێت ئەم فریشتە بەدبەختەی ناومان هۆی هەموو دەردی ئێمەیە. ئەو بەردەوام بیر لە چارەسەر دەکاتەوە... شەو و ڕۆژ خەوی لێحەرامکردوین... باشتر بە... باشتر بە... باشتر بە. وای چ دەردمانە، دەوازمان لێبهێنن وەک قالۆنچە بێ موشکیلە بژین. بڵێم چی هۆشەنگ گیان، فریشتە ئەوە نییە کە چاکەمان پێدەکات، ئەوەیە کە وامان لێدەکات بیر لە چاکە بکەینەوە، بەردەوام بیر لە باشتر و باشتر و باشتر بکەینەوە. بەڵام بەقوربان، بەساقە، نوری هەر دوو چاو، باشتر و باشتر و باشتر هەیە؟ بڵێم چی... من نازانم گەر زۆر گوێ لەم فریشتانەش بگرین بۆ کوێمان دەبەن. واتێدەگەم عەزیزم، ئینسان پێویستی بەم فریشتەیە و بە عەقڵی خۆشی هەیە، هەر دووکیان بەساقە... هەردووکیان... گەر هەمو فریشتەکانمان بمرن دەبین بە دڕندە، دەبین بەو حەیوانە چڵکنانەی کە بە ددان یەک هەلاهەلادەکەن. غرور بخەرە ئەولاوە، غرور بخەرە ئەولاوە، ئینسان بەبێ ئەم فریشتەیە دەبێت بە گورگ. بەس بەساقە، برای شیرینم، هۆشەنگ گیان... وای هەندێجار ئەوەندە قسەدەکەم کاکیلەم دێشێت، زگم ژاندەکات... بەس چیبکەم عەزیزم، ئەم فریشتە باوەحیزانە بە قسە دەژین، بەردەوام بە قسە دەژین، ئەوە تووشی ئەم نەخۆشییەی کردوم. ماوەیەکە هەستدەکەم ئەو داماوەش، ئەو مستەفا شوکاکە بەدبەختەش خەریکە وەک منی لێدێت. ویستم بڵێم چی؟ ئا بەساقە، ویستم بڵێم گەر عەقڵی خۆشمان بدەینە دەست ئەم فریشتەیە نازانم چی دەبێت، داوای باشتر و باشتر و باشتر بەرەو کوێمان دەبات. دەبێت

جێگایەک هەبێت، شێوەیەکی ژیان هەبێت بۆ ئینسان باش بێت و بوەستێت. بڵێت با لەوە زیاتر نەڕۆم. مەرج نییە هەموو کەسێک پێویستی بە ژیانێکی دووەم هەبێت، مەرج نییە هەموو ژیانە فەرامۆشکراوەکان لەدواجاردا لەم ژیانە باشتر بن... نازانم، وای نازانم. ئینسان بە دەست ئەم پرسیارانەوە گیانی دەردەچێت و دواتریش هیچی دەست ناکەوێت، قەسەم بەخودا هیچی دەست ناکەوێت. باوەڕت بێت دەرکەوتنی ئەم فریشتانە لە ژیانمدا نەخۆشی خستم... پێشتریش شێت و شتی وابووم، دەزانم ئەو مەهدائیلە گەمژەیە هەمووی بۆ باسکردویت، حیکایەتی شێتییەکەم و ئەوەی ساڵێک کارەبایان لە سەرم دا و هەموو شتەکانی تر. ئیتر بڵێم چی؟ زۆر گوێ لەم ژنە کوپەڵییەی بەردەمیشت مەگرە، زۆرجار شتەکان قورسدەکەم، منیش بەشەرم، شێتی موشکیلەم. خۆ ئەگەر وا ئاسان بایە... خۆ ئەگەر مرۆڤ بیزانیبایە چی دەکات... بیزانیبایە چی خراپە و چی باش. وای خوایە، هەندێجار بە دەست ئەم چیرۆکانەی شەرمینەوە دەمرم... ئەوەی مرۆڤێکی باش بۆ تەنکەرێکی ئاو دەگەڕێت گوڵەکانی شاری پێ ئاوبدات. دەمکوژێت، ئەم شەرمینە دواجار بەم ڕۆحە منداڵانە پاکەی دەمکوژێت. فریشتەکان پێویستیان بە پرسیاری قورستر هەیە. وای هۆشەنگ گیان، دواجار ئەم چیرۆکانەی شەرمین دەمکوژێت، ئەوەی وادەکات فریشتەکان گوێی لێبگرن دەنگییەتی، وەی خوایە گیان کە دەنگی خۆشە، هەتیو هۆشەنگ پێمبڵێ تۆ دەنگیت پێ خۆش بوو؟. بەساقە... بیرمچوو، فریشتەیەکی نەخۆشمان هەبوو ناوی سەمائیل بوو، ئێستا سێ مانگە مردوە. جارێ ئەم چیرۆکانە تورەیانکرد و هەستایە سەرپێ و گووتی وای ژیان لەمە ئاڵۆزترە، لەمە ئاڵۆزترە کە تۆ باسیدەکەیت، لەوە ئاڵۆزترە ئینسانە باشەکان تەنیا بەدوای پەیداکردنی پارەی شیرەوە بن بۆ منداڵێکی نەخۆش یان بۆ تەنکەرێک ئاو بگەڕێن بۆ گوڵەکانی شار. ئاخ، کوا

چاکە وا ئاسان بووایە. پێویستیم بە چیرۆکنوسێکە، پرسیاری چاکە و خراپە لەم سادەییە دەربهێنێت. گەر وا بڕوات ئەم چیرۆکانە هەموو فریشتەکانم دەکوژن... ئێستا تێدەگەیت من تۆم بۆ هێنا؟. تۆ خۆت لەوە ناچێت چیرۆکنوس بیت. چیرۆکنوسێکم دەوێت بە ڕاستی ژیان بنوسێتەوە، ژیان بە قورسییەکەی، بە بێمانایییەکەی، بەوەوە کە تێیدا سنوورەکانی باش و خراپ بە جۆرێک دەچن بە یەکدا بە مرۆڤ جیاناکرێتەوە. وەک دەکلافەی دەزووی ڕەنگاوڕەنگ، کە سەرێکیان بە دەست دە شەیتان و سەرەکانی تریان بە دەست دە فریشتەوە بێت، هەر بیستیان لە سەر شانۆیەک وەک ئاسکی ترساو ڕابکەن، سەعاتێک ڕابکەن، دوو سەعات ڕابکەن، بێوەستان تێکەڵبن و بێن و هەڵبەزنەوە و فڕکەیان بێت، هەر یەکەیان بەلایەکدا، بەقوربان، هەر یەکەیان بە ئاڕاستەیەک. دوای دوو سەعات گەر دەزووەکان لە فریشتە و شەیتانەکان بکەیتەوە و پێیان بڵێیت، عەزیزان فەرموون بڕۆن، فەرموون بۆ ماڵی خۆتان و زۆر سوپاس، ئیشی ئێوە تەواو، ئێوە لەم شانۆگەرییە مەلعونەدا ئیشی خۆتان کرد و ئێستا نۆرەی ئادەمیزادە بێت و بزانین ئەم مەخلوقە گومڕایە چی بۆ دەکرێت؟. ئینجا منی بەستەزمان بێنن، کە هەر بەراست خۆم سەر بە عەوام دەزانم، چاوم ببەستنەوە و ئەو تۆپەڵە ئاڵۆزکاوە بدەنە دەستم و بڵێن دەی جەنابی ئینسان وەرە و لەم کلافە ئاڵۆزکاوە بەشی فریشتە و بەشی شەیتانم بۆ جیابکەرەوە... دەتوانم چی بکەم؟ بەساقە چی تێدەگەم؟ لەو دەزووە ئاڵۆزکاوەدا، لەو کلافە نارێکەدا کە گەمەی دووروودرێژی شەیتان و فریشتە ئاڵۆزکاندویەتی، چۆن باش و خراپ جیابکەمەوە؟ ئەو دەزووانە وا لە یەک دەئاڵێن، من نەدەزانم سەری فریشتە لە کوێیە و بنی شەیتان لە کوێیە. دەزووەکان وەها گرێدەبن و دەئاڵۆزکێن، منی داماو بەشی فریشتە و بەشی شەیتانم بۆ جیاناکرێتەوە، هەمووی لای من جگە لە تۆپەڵێک دەزووی ئاڵۆزکاو

بەولاوە هیچی تر نابێت... هۆشەنگ گیان ژیان وایە، ژیان وایە. فریشتەکان وەک من و تۆن، ئینسانن، ناتوانن یەکسەر باش و خراپ جیابکەنەوە، بۆ ئەوەی بژین دەبێت ژیان لە ئاڵۆزیی خۆیدا ببینین، ئەوەی وادەکات من ئەم مەلایکەتانەم خۆشبوێت، ئەوەیە نازانن بە تەواوی چاکە چییە، بەڵام گەر بزانن مرۆڤ بۆی دەگەڕێت خۆشبەخت و ئاسوودە دەبن. ناتوانن هەمیشە وەڵامی هەموو پرسیارێک بدەنەوە، بەڵام ئاسوودە دەبن گەر لەگەڵماندا بیری لێبکەنەوە. مرۆڤ نابێت بە بوونەوەرێکی زۆرباش، هەرگیز نابێت، تەنیا دەتوانێت غەمخۆر بێت، دڕندەنەبێت، پرسیاربکات، بۆ چیرۆکێکی تر بگەڕێت. ئاه چیرۆکێکی تر... قورسترین شت بۆ هەموو مرۆڤێک ئەوەیە بیر لە چیرۆکێکی تر بکاتەوە بۆ ژیانی خۆی. بەس دەبێت ڕۆژێک لە دونیادا هەبێت تێیدا ئینسان بوەستێت و بیر لە چیرۆکێکی تر نەکاتەوە، بیر لە ژیانێکی باشتر نەکاتەوە و بڵێت تەواو... تەواو گەیشتم، گەر لەمە زیاتر بڕۆم ڕەنگە هەمووی خاپووربکەم. گەر مرۆڤ گەیشتە جێگایەکی وەها و فریشتەکان وازیان نەهێنا، ئا لەویادا فریشتەکان دەبن بە شەیتان، قەسەم بەخودا دەبن بە شەیتان... بەس عەزیزم ئێمە ئێستا چەند لەو ڕۆژەوە دوورین؟ نازانم. زۆر دوورین... وای هێشتا کە داماوین... وای هێشتا چەندە پێویستیمان بەم فریشتانە هەیە».

ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار ڕێزان خانی مەلەکبین، هۆشەنگی بولبولیاری ڕاسپارد چیرۆکنوسێکی بۆ بدۆزێتەوە. بەڵام چ چیرۆکنوسێک... کەمن ئەو چیرۆکنوسانەی دەتوانن فریشتەکان ببینن، یان هەر نین. بولبولیار دەیزانی پێویستی بە چیرۆکنوسێکە کە بەردەوام بتوانێت مەتەڵی ئەخلاقی گەورە گەورە دابهێنێت، بەڵام خودایە چیرۆکنوسی وەها لە سەر زەوی هەر هەیە و هەبووە؟.

# ژیانی هەموو بوونەوەران لە گۆڕانێکی هەمیشە و ترسناکدایە

ڕوداوەکان لە ژیانی نزار ئیدریسدا بە شێوەیەکی خێرا تێپەڕین. دوای گواستنەوەی بەرەو مەفرەزەکانی باشوور، خۆی لە دوو ڕیانی قەیرانێکی کوشندەدا بینییەوە، دڵنیابوو ناردویانە تا بکوژرێت یان بیکوژن. بەڵام هەم گەڕانەوەی بۆ شار ئەستەم و هەم هەڵهاتنی بەرەو سنوور کاری نەکردەبوو، کەوتبووە جێگایەک و جیهانێکی نوێوە. نزار لە ساتێک لە ساتەکاندا تێگەیشتبوو کە شۆڕش بێئەوەی ئاگادار بێت، تیورەکەی ئەو پراکتیزەدەکات. ئەو دەیویست شۆڕش بکاتە ئامێرێک بۆ پاککردنەوەی بەردەمی خۆی، ئازادی خۆی بخاتە پێش هەر ئازادییەک، بەڵام ئێستا دەیبینی ئەوانی دیش وادەکەن، دەیبینی ئەو تەنیا کەس نییە کە نە شۆڕش، نە شۆڕشگێڕیی بۆ گرنگ نییە، تەنیا کەس نییە کە تەنیا شۆڕش بۆ خۆی دەکات، تەنیا کەس نییە کە پێیوایە شۆڕشگێڕ ناتوانێت لەگەڵ ئەخلاقدا تەبابێت. بەڵکو هەموو ئەم مۆراڵانە بەشێکی گرنگی ئەو سەردەمە تازەیەن و هەزاران هەوادار و لایەنگریان هەیە. ئێستا گومانیدەکرد هێزی ئەو شەڕەی هەبێت. نەیدەزانی ڕەوانەکردنی بێ چەک و لە ژێر چاوەدێریدا بەرەو باشوور، بەرەو شوێنی ڕووبەڕووبوونەوە سەختەکان لەگەڵ جاش و سەربازانی دەوڵەتدا بە هۆی ئەوەوەیە کەسێک دەیەوێت لە ژیانی نەغەدە ماردینی دووربخاتەوە یاخود هۆکاری تر لە پشتێتی؟ گەر ئەوە بێت مردنێکی پوچ و بێهودە و بێکەڵک دەمرێت. هەرگیز نەیویستوە بۆ ئافرەتێک بمرێت، هەموو بە چاوی خۆیان بینیان کە چ ئاسان دەستبەرداری ژنی ئەو دکتۆرە بوو، کە دواجار بۆ ئەم

تەنیا ژنێکی تایبەتی و جوان و سەرەڕۆ بوو، کە پێویستی بە دەستێک بوو دەرگای دونیایەکی دیکەی لێبکاتەوە. لە ڕاستیدا هێندەی ژنی ئەو دکتۆرە پێویستی بەم بوو، ئەم پێویستی بەو نەبوو، باوەڕی وەهابوو کە کەی بیەوێت دەتوانێت ئەو خانمەی دەستبکەوێت کە بۆی دەگەڕێت، بەڵام یادی نییە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە خەیاڵیدا ژنێکی زۆر تایبەتی هەبووبێت، هەر کات ئافرەتێک لە نزیکییەوە بووبێت هەوڵی بۆداوە، بێئەوەی بزانێت ئاخۆ بەڕاست بە دڵێتی یاخود خۆشیدەوێت. وەها بوو وەک ئەوەی هەر ژنێک دەخاتە دڵییەوە، بێئەوەی ئەم ڕەنجێکی زۆری بۆ بدات، دێتە بەردەمی و خۆی بۆ ڕووتدەکاتەوە و دەڵێت ئەوە منم کە ئێستا بە خەیاڵتدا گوزەرمکرد... دڵنیابوو زۆربەی پیاوان ئارەزووی جۆرە ژیانێکی وادەکەن، ئەوە شێتیاندەکات خانمان عاشقیان بن، بەڵام ئەم شتێکی تێدابوو کە خۆشی نەیدەزانی چییە، ژنان بێهۆیەکی دیاریکراو عاشقی دەبوون. ئایا جوانییەکەی بوو، بێشەرمییەکەی بوو، دڵڕەقییەکەی بوو، قسە بێپەردەکانی بوو، ئەو ترسە تایبەتییەی بوو کە دوای خۆی جێیدەهێشت یان ئەو بێباکییەی بوو کە هەتا ژنانی زۆر بەڕێزی دەخستە سەر هەوای ئەوەی تێیبگەن؟ بۆ زۆرجار ڕوودەدات پیاوانی زۆر بەڕێز خولیای تێگەیشتن لە ژنی بێباک وایان لێدەکات سۆزانییەک بهێنن، سەماکەرێک بخوازن... بۆ هەمان ئارەزووی قووڵ و بێهۆ لە ناو خانمانیشدا نەبێت بۆ تێگەیشتن لە پیاوانی هەوایی و بێجڵەو؟. بەڵام ئێستا نەیدەویست بمرێت، دەشیزانی ئەوانەی کە باکیان بە هیچ نییە خۆیان نەبێت، دەیانەوێت ئەم بمرێت... ئەویش باکی بە هیچ نییە خۆی نەبێت، ئەوانیش باکیان بە هیچ نییە خۆیان نەبێت... بۆ ئێستێک وەستا و قووڵ بیریکردەوە و تێگەیشت کە پێی ناوەتە سەدەیەکەوە پڕە لە کەسانێک باکیان بە هیچ نییە خۆیان نەبێت. هەستیدەکرد ئەو لەخۆبوردنەی ئەو لە خەیاڵی خۆیدا بۆ شۆڕشگێڕانی

داناوە هەڵەبووە، شتێک نییە ناوی لەخۆبوردن بێت، هەموو بە جۆرێک لە جۆرەکان بە تەنیا بۆ خۆیان شەڕدەکەن. لە شەڕی وەهادا هەموو شتێک حەڵاڵە... هەستیدەکرد ئێستا کاتی ئەوە هاتووە شتێکی گەورەی تر بشکێنێت. مرۆڤ هەر هێندەیە فێری شکاندنی شتەکان بوو، ئیدی ناتوانێت ڕابوەستێت، ئیتر لەزەتی شکاندن لە زەبری پێویستی گەورەتر و گەورەتر دەبێت. کە لەگەڵ مەفرەزەکاندا هاتەخوارێ، هەستیکرد هەموو جۆرە قسەیەک و دەنگ بەرزکردنەوەیەک و نمایشێک دوژمنی زۆرتری بۆ دروستدەکات، هەموو جیهانی وەک شانۆیەک هاتەبەرچاو کە تێکستی نمایشەکەی گۆڕابێت. وەک ئەوە بوو ئەم تێکستێکی لەبەر بێت و لە پڕ کەوتبێتە ناو نمایشێکی دیکەوە، سەر سەحنەیەکی تر، کە تێیدا دیالۆگەکانی ئەم جگە لەوەی نمایشە گەورەکە تێکدەدات هیچی تر ناکات. خۆی دەناسی کە بەجەوهەر ناتوانێت پێشمەرگە بێت، بەڵام ئەوەی لە نێو ئەم کێوانەدا، لە نێو ئەم هەموو تاریکی و هەوراز و بەردەڵانەدا، لە بەینی ئەم چەمەنزار و دەربەند و نشێوەدا، لە ناو ئەو چۆم و گۆم و دەریاچە بچوکانەدا کە بە جۆرێکی بێمانا و بەردەوام دێنە سەر ڕێگایان ترسی مردنی هەبێت، بەردەوام ئاوڕ لە دوای خۆی بداتەوە، بەردەوام سەیری دەموچاوی پێشمەرگەکانی مەفرەزەکە بکات و بیر لەوە بکاتەوە کامیان ئەو کەسەن کە دوا گوللەی پێوەدەنێن، ئەوە هەراسانیاندەکرد. گەرچی ماوەیەکی درێژ بوو لە شاریش ئازاد نەبوو، جێگا و ڕێگای ئارامی نەبوو، بەڵام هەستی نەدەکرد بەوجۆرە بەستراوە و باڵشکاو بێت... هەر لە سەرەتاوە وەک دیلێک لەگەڵی ڕەفتاریاندەکرد، وەک کەسێک کە هەموو گومانی لێدەکەن، زۆربەی پێشمەرگەکان لێی نزیک نابنەوە، توانجی زۆر بەدی لێدەدەن... بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا تێدەگات، ئەمجارە لە قەسابخانەکەدا نۆرەی ئەوە سەری ببڕن. زۆربەی کات لە ژیانیدا بێباک بووە، بەڵام ئێستا دەزانێت هێزی بێباکی بەشی ئەوە

نییە بە سەر ترسەکانیدا زاڵ بێت. دەزانێت پێویستی بە موعجیزەیەک، شتێکی گەورە هەیە ڕزگاریبکات. دێ بە دێ لەگەڵ مەفرەزەکەدا دەڕوات، کە دەگەنە هەر گوندێک دەترسێت بەر لەوەی بتوانێت خۆی ڕزگاربکات، ئەوان بیکوژن... هیچ شتێک لە سەر پلانەکەی ئەوان نازانێت، هیچ شتێکیش لە سەر پلانەکەی خۆی نازانێت، بەڵام دڵنیایە وەک هەمیشە تەنیا شتێک ڕزگاریبکات ئەوەیە هیچ حەرامێک بۆ خۆی دانەنێت، لەم شەڕەدا حەرام نەماوە... ئەوەی ئەو دێتە دەرێ بۆ پێشمەرگایەتی و بەوجۆرە وەک بزن دەینێرن بۆ باشوور بە ڕیسوایی وەک خائینێک بمرێت، ترسناکە. بەڵام لە ناخیدا خۆشحاڵە کە هیچ حەرامێک نەماوە، ئەوەی هیچ حەرامێک نەماوە، ئەوەی شۆڕش ئەخلاقێکی نییە ڕێگای پێدەدات بەوجۆرە ئازاد بێت کە دەیەوێت. کە شۆڕش ئەخلاقی نەبوو، دەبێت هەر مرۆڤە و بە تەنها خۆی خۆی ڕزگاربکات، بەتەنها خۆی کەوڵی خۆی لە قەسابخانە هەڵگرێت و بیرفێنێت و بیباتەدەرەوە، خۆی ئەخلاقی خۆی دروستبکات و بینوسێتەوە و پیادەیبکات.

چەندە هەوڵیدەدا، لەگەڵ هەموو کرانەوەی خۆیدا، لەگەڵ وریایی و لێزانیشدا نەیدەتوانی لەگەڵ کەسانی مەفرەزەکەدا هیچ هاوڕێیەتییەک دروستبکات. ئەوان هێندەی وەک دیل پێش خۆیانیان دەدا، وەک جەنگاوەرێکی تازە سەیریان نەدەکرد، ئەوەی لە چاوی یەکە بە یەکەیاندا دەخوێندەوە، لە کاتی پەڕینەوە لە شوێنە ترسناکەکاندا دەیاندایە بەرەوە، تا گەر مەترسییەک هەبێت ئەو بەرکەوێت، کە لە ساتی پڕ مەترسی نزیکدەبوونەوە هەموو نیگای ئەویان دەکرد بزانن چی دەکات. تا بەرەو باشوور بهاتبانایە سەرۆکی مەفرەزەکە مۆنتر دەبوو، هەر کات هەستی بکردایە دەیەوێت دووربکەوێتەوە بە توندی لێیدەخوڕی و دەیخستەوە ناوەڕاستی ریزەکان. چەند جارێک هەوڵیدا دوو بە دوو قسەی لەگەڵدا بکات بەڵام بواری نەدا. جارێک لە ناوەڕاستی هەموو

پێشمەرگەکاندا بە دەنگی بەرز گووتی تێناگات ئایا ئەم دیلە یان پێشمەرگەیە، بەڵام هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە.

لە کۆتاییدا ئەوە روویدا کە دەبوو ڕوویدات... ئەوەی کە لەساڵانی شۆڕشدا و لە هەموو هەرێمەکان و دەڤەرەکان و لە ناو هەموو هێزەکاندا دەیانجار ڕوویدەدا و ڕوویدەدایەوە.

***

شەوێکە هێشتا پێشمەرگەکان تەواو دەستیان بە نۆبەتی پاسەوانی نەکردوە، هێشتا هەموو شتێک ئارامە، بەڵام پاش تۆزێکی دی زوڵمەتێکی قووڵ و بێتروسکە و بێتیشک هەموو زەمین دەگرێت، نزار دڵنیادەبێت کە ئەگەر نەجوڵێت چارەنوسێکی تاریک چاوەڕوانیدەکات، یەکێکی نەناس پێیدەڵێت کە شەو دەیانەوێت لە چەمدا بیکوژن، باوەڕ بەو چرپە خێراو ڕاگوزەرە دەکات، بەلایەوە گرنگ نییە کێیە ئەو نهێنییە گەورەیەی بۆ دەدرکێنێت، بەڵام بەلایەوە گرنگە بە زووترین کات لە مردن هەڵبێت. دڵنیاییە تا دێت کۆتایی نزیکتر و نزیکتر دەبێتەوە، دڵنیایە گەر دەرنەچێت و لە ناو کێو و بێشە و تاریکی ئەم ئێوارەیەدا خۆی وننەکات، هەلێکی دیکەی نابێت. بەر لەوەی پاسەوانەکانی شەو لە شوێنی خۆیان جێگیربن، دەستدەکات بە گۆرانی گووتن، چەکە سیحراوی و نهێنی و کاریگەرەکەی، بە دەنگی هەمووان کەمێک مەست و بێهۆش دەکات، لە ساتێکی قووڵی غافڵی و چاوەڕوانیدا، لە چرکەیەکدا کە نە ڕوناکی چیتر بڕوای بە خۆیەتی و نە تاریکی لە شوێنی خۆی دانیشتووە، ئەو یەکەم هەوڵی خۆی دەدات. بە خێراییەکی گەورە ڕوو لە چەمێکی چڕ و نێو بەردەلانێکی عاسی دەکات، دەیەوێت ئەو چەند ساتە کورتەی پێش تاریکی تەواو بەردەکان بکاتە پەرێز. دەزانێت کاریگەریی گۆرانییەکانی تا چەند خولەکێک هەمووان لە کاردەخات، دەیەوێت هەموو شتێک بێ

خوێنرشتن تەواو بێت، هەڵبێت و خۆی بداتە دەست نادیارێکی گەورەتر، سەرەتا بیری لای حیزبەکانی ترە، بەڵام گەڕان بە دوای حیزبەکانی تردا، بە سەفەرێکی درێژیی گوندا و گوندا دەبیات و مەترسی گرتنەوەی زۆر گەورەیە. لەو ساتەدا کە هەڵدێت حیسابی ئەوەی نەکردوە کە دەشێت پێشمەرگەیەکی بەدبەخت بێتە سەر ڕێگایی و تفەنگی لێبەرزبکاتەوە، ساتێکی سەراسیمە بوون و رامانە، جێگاکە شوێنێکی پڕ گاشەبەردە، نزار لە جێگایەکی بەرزدایە، پێشمەرگەکەی دی بە تفەنگێکەوە لە نزمیدا سەیریدکات و دڵنیا نییە ئایا نزار هەڵهاتوە یان نا، بەڵام شێوەی ڕاکردن و شپرزەبوونی وادەڵێن، هێندەی پرسیاردەکات نزار بەرەو کوێ دەچێت، ئەو پەلاماریدەدات، لە بکێشبکێشی ڕاپسکان و لەیەکداندا، نزار دەیەوێت چەکەکەی لێبستێنێت، بەڵام لە گەرمەی گرتن و بەرداندا، لە هەرای خۆکوتان و خۆڕاتەکاندا گوللەیەک دەردەچێت و بەر مەجید بێساران دەکەوێت و دەبێت بە دەنگی دواهەمین گوللە کە لە ژیانیدا گوێی لێدەبێت، دواهەمین گوللە کە بەر لە مردنی، بۆی باروتەکەی دەچێت بە هەناسەیدا... بەر لەوەی ڕۆحی بە تەواوی ماڵئاوایی لێبکات، نزار دەبینێت دەنوشتێتەوە و تفەنگەکەی هەڵدەگرێت و بە دوو چاوی سەرسامەوە سەیریدەکات، دوو چاوی خاڵی لە هیچ خۆشەویستییەک، یان ڕەحمێک یاخود کینەیەک... چاوانی کەسێکی نەناس کە تا قیامەت بۆ ئەو هەر بە نەناسی دەمێنێتەوە.



لە سەرەتای ساڵانی هەشتادا، بنەماکانی ئەو مۆراڵە سیاسییەی کە لە دواتردا زاڵدەبێت، شێوەی خۆی وەرگرت. من وەک بەرپرسێکی باڵای دەزگای ئەمنییەکان هەموو ئەو یاسا نهێنی و دەستووره نەنوسراوانەم لە نزیکەوە دەبینی کە لەو دەمەدا دروستدەبوون و جێگیردەبوون. لەو

دەمـەدا ئـەو یاسـا سـەرەکییەی ژیانـی سیاسـی ئێمـە سـەری هەڵـدا کـە شادروشمی ئەوەبوو «هەمـوو شـتێک حەڵاڵـە، گـەر لـە پێنـاوی منـدا بێت». لـەو دەمـەدا هیـچ شـەریعەت و یاسـایەک نەمـا هەمـوو یاخـود کەمینەیەکـی دیاریکراویـش تەبابـن لـە سـەری، تاکـە یاسـایەک کـە هەمـوو لـە سـەری دەڕۆیشـتن ئەوەبـوو «تـا دەتوانیـت بـە زیندوویـی بمێنـەوە»... گرنـگ نییـە چـۆن و لـە سـەر حیسـابی چـی؟ هەمـووان وەک یـەک مافـی کوشـتن و مافـی خۆپاراسـتنیان هەبـوو، لـەو دەمـەدا مۆراڵـی ڕاکـردن لـە نـاو هێزێکـەوە بـۆ هێزێکـی تـر ، لـە نـاو دەوڵەتـەوە بـۆ نـاو شـۆڕش و لـە نـاو شۆڕشـەوە بـۆ نـاو دەوڵـەت بـە جۆرێکـی ترسـناک بڵاوبـووەوە، هیـچ بنەمایەکـی عەقڵـی و ئەخلاقـی نەمـا کـە مـرۆڤ نیشـتیمانپەروەری و مرۆڤبوونـی خـۆی لـە سـەر بپێوێـت، ڕابـوردووی ئینسـانەکان کەوتـە پەراوێـزەوە، تاکـە شـتێک نـرخ و بەهـای وەرگـرت ئەوەبـوو «ئێسـتا و لـەم سـاتە وەختـەدا تـۆ چیـت». ئـەو یاسـا ترسـناکە ڕابـوردووی مرۆڤەکانـی گـۆڕی بـۆ شـتێکی بێنـرخ و بێبایـەخ، هـەر مرۆڤێکیـش ڕابـوردووی سـڕدرایەوە دەبێتـە ئەکتـەر. لەوێـوە سـەحنەی مێـژووی ئێمـە لـە بـری ئـەوەی پڕببێـت لـە مـرۆڤ و پاڵەوانـی ڕاستەقینە پڕبـوو لـە نمایشـکار، لـەو سـاتەوە دەرگاکانـی مێـژووی ئێمـە بـە گەورەیـی لـە سـەر ئەکتـەر و دەمامکبـاز و ماسـک لـە سـەر کرانـەوە... هەتـا مردووەکانیـش پێـش مردنیـان ئەکتـەر و دوای مردنیشـیان دەبوونـەوە بـە ئەکتـەر. تەنیـا شـتێک کـە گرنـگ بـوو ئەوەبـوو ئێسـتا چ نمایشـێک دەکەیـت، لـە کوێیـت و لـە چ بەرەیەکدایـت. هـەر لـەو سـەردەمەدا مرۆڤـەکان کەوتنـە بیرکردنـەوە لـەوەی، سـەر بـە چ هێزێـک بـن باشـتر و بەهێزتـر و پارێزراوتـر دەبـن؟ هـەر هێزێـک چەترێکـی باشـی ببەخشـیایە و قەڵغانـی ئەسـتوورتری بدایـە و دەسـتی وەشـاندنی زیاتـر بکردبایەتـەوە، خێراتـر دەبـووە زلهێـز. کاریگەریـی بیـروڕا و فەلسـەفەکان کـە لـە دوای هەرەسـی سـاڵی ۷۵ بـۆ ماوەیەکـی کـورت گەورەبـوو، پاشەکشـەیەکی گـەورەی کـرد و بیرکردنـەوە

سیحرێکی لە سەر مرۆڤ نەما، بەتایبەت دوای ئەوەی بیرکردنەوەکان نەیانتوانی شتێکی سەرنجڕاکێش بەرهەمبهێنن. لەو دەمەدا مرۆڤەکان فێربوون باشترین هونەر بۆ ژیان ئەوەیە عەقیدەیان بە هیچ شتێک نەبێت، عەقڵییەتی خزمەتکاری بێوەفا لە هەموو جێگایەکدا بڵاوبووەوە، مرۆڤەکان ئەوەیان تێدا سەوزبوو کە ببنە خزمەتکار، بەڵام خیانەتکردن لە هەموو ئاغایەکیش و هەڵهاتن بۆ ژێر خزمەتی ئاغایانی دیکە لەوە دەرچوو دۆخی ناوازەبێت، سیاسەت لە بری ئەوەی مرۆڤەکان فێربکات چۆن بیربکەنەوە، فێریکردن چۆن بێ بیرکردنەوە بژین. چەمکی دوژمن لەوە دەرچوو ئاماژەبێت بۆ پەیوەندی نێوان دەوڵەت و شۆڕشگێڕان و بووە ئامارە بۆ پەیوەندی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ.

لەو سەردەمەدا من هیچ یەک لەو شتانەم نەدەبینی، نارێکی شتەکانم دەگێڕایەوە بۆ نارێکییەکی خۆڕسک لە ئینساندا، بۆ لەدەستدەرچوونی ئینسانەکان، خودی شۆڕش کە یەکێک بوو لە هۆکانی خواربوونی ئەو مەخلوقە، لای من تەنیا هۆ و کەرەستەی ڕاستکردنەوە بوو. دڵسۆزیم بۆ شۆڕش وەک ئەرکێکی دینی تەماشادەکرد، وەک واجیبێک بۆ ڕاستکردنەوەی هەر خوارییەک لە قەوامی مرۆڤدا بێت.

نزار دوای کوشتنی ئەو پێشمەرگەیە، خۆی تەسلیمی هێزێکی سوپا کرد. ئەوە تاکە شانسی بوو بۆ ژیان و مانەوە، لەو چەند ساڵەدا شۆڕش زۆر کەسی بە جۆرێک لە جوغزی تەسکدا گیردابوو، جگە لە هەڵهاتن بۆ ناو دەوڵەت و بوون بە دوژمنی گەل، چارێکیان نەمابوو. ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە، دەتوانم بڵێم شۆڕش مەکینەیەکی دوو لوولەیە، لە سەرێکەوە خائینان دروستدەکات و لە سەرێکی تریش نیشتیمانپەروەران، بەڵام کاتێک مرۆڤەکان دەچنە ناو ئەو مەکینەیە، بێئەوەی بزانن ڕێگای چ یەکێک لەو دوو لولەیەیان گرتووە، بە هەناوی مەکینەکەدا گوزەر دەکەن، کاتێکیش دێنەدەرێ و دەزانن لە چ لوولەیەکەوە هاتوونەتەدەرێ، زۆرجار

تووشی دوودڵی و پەشۆکان دەبن، بەڵام مەکینەکە زۆرجار یەکسەر نایانهاڕێت، جارێکی دی شانسی ئەوەیان دەداتێ کە بڕۆنەوە ناوەوە و دووبارە بەختی خۆیان تاقیبکەنەوە.

نزار کە خۆی دایەوە دەست دەوڵەت، لە دەزگای هەواڵگری سەربازی بە دڵی بەعسییەکان قسەیکرد، گوتی تێگەیشتووە کە نابێت دژایەتی دەسەڵاتی مەرکەزی و سەرۆک بکات، بڕیاریداوە دژ بە تێکدەران و ئاژەوەچییان چەک هەڵبگرێت. ئامارەشی بەوەدا کە هەوڵی پێشووی بۆ کوشتنی لیڤیتانت بە هۆی ڕقی تایبەتییەوە بووە و ئەو بە دڵ ئارەزوویەکی نەبووە بەشداری لە یاخیبووندا دژ بە دەوڵەت بکات و تەنیا و تەنیا لیڤیتانت بە هۆی چیرۆکێکی دێرینەوە پاڵی پێوەناوە ڕوو لە چیا بکات. هەر لە سەرەتاوە نزار تێگەیشت کە بۆ خۆپاراستن لە شۆڕش و لیڤیتانت، جگە لە هێزەکانی دەوڵەت پەرێزێکی تری دەست ناکەوێت.

هەموو سەرمان لەوە سوڕما کە نزار بە خێراییەکی سەیر لەلایەن عەرەبەکانەوە قەبووڵکرا و دەمودەست دەرفەتیاندایە وەک لیڤیتانت مەفرەزەیەکی چەکداری هەبێت. وەک ئەوەبوو نزار لە ماوەیەکی خێرادا پێستی مرۆڤێکی داکەندبێت و کەوڵی جانەوەرێکی لەبەر کردبێت. گەڕانەوەی کتوپڕی نزار و تەسلیمبوونی بە دەوڵەت، هەموومانی خستە دۆخێکی دژوار، ئەو بەشێکی زۆری ڕێکخراوەکانی ناو شاری دەناسی، دەیزانی وەزیفەی من چییە، دەیتوانی گورزی جەرگبڕ لە هەڤاڵان بوەشێنێت. بەڵام هەستێکی ناوەکی سەیرم هەبوو کە واناکات. من بۆ یەکەمجار نامەیەکی توندم بۆ سەرکردایەتی نوسی و سەرزەنشتی ئەوانەم کرد کە نەیانتوانیوە نزار ڕابگرن. ماوەیەکی درێژ هەموو ڕێکخراوەکان، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندیان بە نزارەوە بوو لە دۆخی ئاگاداری و خۆشاردنەوەدا بوون.

لیڤیتانت چاوەڕوانی یاری وەها فێڵبازانەی لە نزار نەدەکرد، هەستیکرد کە پێدەچێت ئەم بە ڕاستی توانا و هێزی ئەوی نەبێت، هەموو شتەکان زۆر تورەیانکرد، لە ژوورەکەی خۆی کەوتە شت شکاندن، ڕۆژانێکی پەست و تورەیی بە سەربرد، بە ئاسەواری پەتایەکی ڕەشەوە لە خوێنیدا، بە شاردا دەگەڕا و خەڵکانی سادە و ڕێبوارانی بێئاگای نێو کوچە و سەر شەقامانی ئازار دەدا. یەکەمجار لە ڕیواقێکی بەڕێوەبەرایەتی ئەمندا یەکتریان بینی، نزار لەو کاتەدا لەگەڵ لیستێک لە ناوی چەکدارە نوێکانی خۆیدا لای بەڕێوەبەری ئاسایش دەهاتە دەرێ، لەگەڵ لیڤیتانتدا لەبەردەرگا نیگایان لەیەکدی گیربوو. نزار بێباک سەیریکرد و لیڤیتانت بە گرژییەکی گەورەوە لێیڕوانی. لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش لیڤیتانتیان ئاگادارکردەوە کە ڕابوردووی خۆی لەگەڵ نزار ئیدریسدا لەیادبکات. دەوڵەت بە ڕاستی پێویستی بەوە بوو کەسانی هەڵهاتوو و یاخی لە شۆڕش بگرێتەوە ئامێز، دەزگاکانی ئەمن ئیشیان لە سەر قووڵکردنەوەی هەر ناکۆکییەک دەکرد کە دوو کورد لە یەکدی بترازێنێت. نزار لە سەرەتاوە دەیزانی چۆتە چ یارییەکی گەورە و ترسناکەوە، بەوەشدا هەموو دەمانزانی چ یاخیبوونێکی بەد و چ خۆپەرستییەکی سەرپەڕیی تێدایە، بە تایبەت لێیدەترساین. لەگەڵ هەموو هەوڵەکانماندا نەمانتوانی بزانین لە کوێ دەخەوێت و چۆن دەژی، بەڵام دڵنیابووین لە ماوەی داهاتوودا، وەک لیڤیتانت بە خۆی و چەند چەکدارێکەوە لە سەر شەقام و کوچەکانی شار دەردەکەوێت، دەوڵەت مەبەستی بوو، هەر لە سەرەتاوە تاوانگەلێکی وەها بەو جۆرە کەسانە بکات دواتر نەتوانن لە خەڵک و شۆڕش نزیک ببنەوە.

ڕۆژێک لیڤیتانت هات بۆ لام، هەرکات ئاوها بێوادە و لە ناکاو دەربکەوتبایە، دەمزانی هۆیەکی تاریک و ترسناک دەیجوڵێنێت، وەک هەمیشە پیاوێکی جوان بوو، باریک و قژ ڕەش و ئەسمەر، بە نیگایەکی

نەسرەوت و ڕۆحێکەوە کە تێگەیشتنی ئاسان نییە، هەرجار کە دەهات، بەو ڕۆژە بەراوردمدەکردەوە کە یەکەمجار لە پسمامان بینیم، شتێکی ئەوتۆ لە ڕوخساریدا نەگۆڕابوو، بەڵام جار دوای جار زیاتر هەستمدەکرد، تینوێتییەکی قووڵ و تێرنەبووی بۆ شتێکی نەزانراو تێدایە... خواستێکە کە بەشێکی خواستی دەسەڵاتە، بەڵام سنووری دەسەڵاتی ئاسایی تێدەپەڕێنێت و دەبێتە ئارەزوویەک بۆ شکۆ، بۆ سەرکەوتنی ئەبەدی، بۆ لە خۆڕازیبوون، بۆ نەکەوتنە پەراوێزەوە. بە منی گووت دەیەوێت نزار ئیدریس لە ناوبەرێت، بە شوێن پێکانیدا بڕوات، نە لە بەرئەوەی تەنها شکستی گەورەی ژیانێتی، نە لە بەرئەوەی هەمیشە لە تەڵەو داوەکانی ئەم دەربازی دەبێت، بەڵکو لە بەرئەوەی هەندێک تۆڵە هەن دەچنە خوێنی ئینسانەوە، دەبن بە تاکە خواستی، بە نیازێک کە تا مردن گینگڵی پێدەدەن. گووتی «گەر نەتوانم نزار بکوژم، دونیا بۆ من تا مردن جێگایەکی ترسناک دەبێت». هەستمکرد لە خودی نزار ناترسێت، بەڵکو لەو خەیاڵە تاریکە دەترسێت کە شتێک هەیە، چەند دەیەوێت بیگرێت، هەڵدێت و سرکە و ترسناک. هەستیدەکرد، تا نزار زیندوو بێت دونیا بۆئەو شوێنێک دەبێت خاڵی لە دڵنیایی، جێگایەک کە تێیدا خۆی بۆ ناپارێزرێت، هەمیشە لاوازیی و شکستی خۆی بیردەکەوێتەوە. گووتی شەڕی ئەو لەگەڵ نزار ئیدریسدا، شەڕێکە لەگەڵ خۆیدا، لەگەڵ هەموو ئەو ترسە قووڵانەی لە ناخیدا مەڵاس بوون، لەگەڵ سامێکی هەمیشەییدا لە لاوازییەکی ئەبەدیی.

من لە شۆڕشدا پیاوانی جۆراوجۆرم بینی کە هەموو بە پلەی جیاواز حەزیان بە دەسەڵات و هێزبوو، بەڵام کەسم نەبینی وەک لیڤیتانت لە ترسێکی هەمیشەییدا لە لاوازیی بژی. بەڵام نزار ئیدریس لەو کەسانە بوو لە هەر کوێ دەردەکەوت، هەستێکی گەورەی بە لاوازیی لای ئەوانیدی دروستدەکرد... گەرچی کەسێکی تەنها بوو، بەڵام بە جۆرێک بڕوای بە

خۆی بوو، بە شێوەیەک فێڵە گەورەکانی ژیان فێربووبوو، بە لێزانییەک جوانی و دەنگی خۆی بەکاردەهێنا، دەیتوانی دەیان کەس فریو بدات لە ساتی بەدبەختی و تەنگانەدا کۆمەکیبکەن. ئەو کاریگەرییە قووڵەی سالانێک لە مەویەر لای مەنسوور ئاغای سێئاسکێ بەجێیهێشت، بە چەشنێ وەختەبوو شەڕی نێوان چەندین هێزی گەورەی لێبکەوێتەوە، ئێستا لە سەر «رەفیق سەباح غیدان» بەڕێوەبەری ئاسایش و «ڕەفیق فەیاز ناسر» بەرپرسی کاروباری حیزب لە باکوور جێیدەهێشت. من لە ڕێگای ڕاپۆرتی نهێنی هەواڵدارەکانمانەوە دەمزانی کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەموو ئەو پشت و پەنایەی بۆ خۆی زامنکردوە کە لەناو دەوڵەتدا پێویستی پێیەتی، دەمزانی سەرانی ئەمن لە دانیشتنە شەخسی و تایبەتییەکانی خۆیاندا بانگیدەکەن، لەوێ بە دەنگی بەرز باس لەوە دەکات، جگە لە دەوڵەت هیچ ئینسانێکی تر بۆی نییە ژیانی کەسێکی تر زەوتبکات. ڕاشکاوانە باس لەوە دەکات کە ژیانی سیاسی ئێمە پڕە لە خورافات و درۆی گەورە، نیشتیمانپەروەری هیچ نییە جگە لە قولاپێکی ژەهراوی کە مرۆڤ نابێت دەمی بۆبەرێت، چونکە هێندەی دەمی بۆ برد، نایکوژێت، بەڵام تا مردن بە دوای خۆیدا ڕایدەکێشێت. دەخواتەوە و بە مەستی هەڵدەستێت و قسە لە خواستی خۆی دەکات بۆ تێکشکاندنی ئەو حەرامانەی شۆڕش لە عەقڵی خەڵکدا دەیانچێنێت. لە سەر مێزی بەرپرسە حیزبییەکان دادەنیشێت و دەپرسێت «من گرنگترم یان نیشتیمان؟... هەڵبەت من گرنگترم. ڕەفیقی خۆشەویست من گرنگترم». بەعسییەکان کە لە سەر دروشمی قەبە و ڕۆحی فیداکاری فاشیستیانە پەروەردەبوون، لە ژێرەوە سەیری یەکدی دەکەن، قسەکانیان پێ دروست نییە، بەڵام دەزانن گەر کوردێک بەوجۆرە بیربکاتەوە لە خزمەت ئەواندایە، دەزانن تەنیا بەوجۆرە دەکرێت ببێتە نەیاری خاک و ئاوی خۆی. هەموو دەست دەخەنە سەر شانی و دەڵێن «ڕەفیقی ئاگات

لە خۆت بێت و مەهێڵە ئەو خائینانە زەفەرت پێبەرن. تۆ لە قسەی پڕوپوچی ئەو عەمیل و ئاژەوەگێڕانە زۆر گرنگتری، ئەی چۆن ڕەفیقی... حیزب و سەرۆک خۆشبن هیچ عێراقییەک بێ نیشتیمان نابێت».

لەو ڕۆژگاری ترس و دوودڵی و ڕامانەدا، من تادەهات ترسم لە ژیانی شار زیادیدەکرد، هەندێک لە بەعسی و بەرپرسەکان ئاگاداری من بوون، بەڵام زوو زوو فەرمانبەرەکان دەگۆڕان و هەندێجار ڕێدەکەوت کە توشمان دەبوو بە تووشی پیاوە سەرسەخت و یەکچاو و بێمێشکەکانی دەوڵەتەوە کە مەترسی گەورەیان لە سەر ژیانی ئێمە دروستدەکرد. جگە لەوەش هەندێک لە دەزگا گرنگەکانی دەوڵەت بە جۆرێکی زۆر نهێنی و داخراو ئیشیاندەکرد و چاوی وردەکاری خۆیان ناردبووە ناو هەندێک سوچ و کەلێنەوە کە دەیانتوانی نهێنی ورد ببینن. هەندێک لە هەڤاڵانمان لە ناکاو پێوەدەبوون و کە دەگیران دەرهێنانیان کاری نەکردە بوو. هێدی هێدی دەزگای ئەمنی دەوڵەت بە جۆرێکی ترسناک گەورەدەبوو، هەزاران کوردیش بووبوونە ئەندام و بۆ ئەو دەزگایانە کاریاندەکرد. ئیشکردن لەگەڵ دەوڵەتدا لە خیانەتەوە وەردەگەڕا و دەبووە جۆرێک لە هونەری ژیان، لە شێوازی زامنکردنی پاشەڕۆژ، لە بە دەستهێنانی دڵنیایی. ئەوەی هەندێک لە بەعسییەکان لە هێزی شۆڕش دەترسان، کۆمەکی بە من دەکرد پەیوەندییە نهێنییەکانم لەگەڵ هەندێک لە ئەفسەرەکاندا بهێڵمەوە، تا ئەوان لە سنوورێکدا شتێک لە پەرێزم بۆ دروستبکەن، زۆرجار هەستمدەکرد دەوڵەت و بەرپرسە هەرە باڵاکانی دەزگای هەواڵگری و ئەمنییەتی دەوڵەت ئاگایان لە منە. لەو ساڵانەدا و لە ناکاو، من ڕۆڵێکی سەیرم لە ناو هەموو یارییەکەدا وەرگرت، هەندێک لە کاروباری ڕێکخستنەکانی شاریان لە من وەرگرتەوە و وەک ئەڵقەی نهێنی پەیوەندی نێوان سەرۆکایەتی حیزب و دەوڵەتم لێهات. لەو دەمەدا بەردەوام چەندەها نامەی نهێنی هەندێک لە سەرانی دەوڵەتم دەنارد بۆ سەرۆک

و نامەی ئەوم دەگەیاندەوە بە بەعسییەکان. هەندێ جار چاوقایمیم دەکرد و نامەکانم دەکردەوە و دەمخوێندنەوە و بە جۆرێکی مەحکەم دامدەخستنەوە تا کەس گومان نەکات. نامەکان لە نامەی جێگری سەرۆک کۆمارەوە تا ئەمینداری گشتی حیزبی بەعس و تا نامەی هەندێک لە ژەنراڵەکانی سوپای تێدابوو. هەندێکیان نامەی شەخسی بوون و هەندێکیان نامەی ڕەسمی دەوڵەت، من هەرجارێک یەکێک لەو نامانەم دەگەیاند ئەو قفڵە نهێنی و گەورەیەی ناو ناخم کرتەیەکی دەکرد و باڵەکانی پشتم بە جۆرێکی سەیر بۆ دەرەوە دەکشان. من ڕۆژێک جورئەتمکرد و ترسناکترین هەنگاوی ژیانی خۆم نا... ئامێرێکی کۆپیم بە نهێنی لە دوکاندارێکی پیر کڕییەوە و لە ماڵێکی نهێنیدا شاردمەوە، شتێک لەوەسواسی شەیتانی وای لێدەکردم هەموو نامەکان بکەمەوە و کۆپیانبکەم. ئەوەی لە خوێندنەوەی نامەکان دەستمدەکەوت ئەوەبوو، جگە لەم جیهانی جەنگ و پێکدادانەی کە هەزاران سەرباز و پێشمەرگە لە چیاکان تیادەژیان، لە نێوان سیاسییەکان خۆیاندا جۆرە ژیانێکی تر هەیە کە دوور و نزیک پەیوەندییەکی بەو جەنگەوە نییە. سەیربوو لام کە دەمبینی لە نێوان سەرانی دوو هێزدا کە لە جەنگێکی خوێناویدان، کە دەیان سەربازی بەستەزمان و پێشمەرگەی گەنجی تێدا دەکوژرێت، نامە گۆڕینەوەیەک هەبێت پڕبێت لە مەحەبەت و ڕێز و یەکویستی. هەرجارە و بەرامبەر کارێک کە دەوڵەتییەکان دەیانخواست، سەرانی ئێمەش داوای شتێکیان دەکرد. هەندێجار من دەبووم بەو کەسەی کە دیارییەکانیش لە نێوان سەرۆکە دوژمنەکاندا دەگوازێتەوە، لە حاکمانی بەغداوە کارتۆنی شەراب و ویسکیم وەردەگرت و دەمنارد بۆ هەڤاڵانی ئەنجومەنی باڵا، لەوانیشەوە تەنەکە هەنگوینی کوردی و گوێزی کاکڵەم دەدایە دەست ئەفسەرانی هاوکارم لە هەواڵگریی دەوڵەت. زۆر لە ئەفسەران و پیاوانی بەرزی دەوڵەت کە لە توندوتیژیی سەدام حوسەین و کوڕەکانی دەترسان،

لە ڕێگای پەیوەندیی بە شۆڕشەوە دەیانویست دەرگایەکی هەڵهاتن بۆ خۆیان بکەنەوە و گەر ڕۆژێک زەمان وەرگەڕا، پەناگایەکیان لای ئێمە هەبێت... هەر نامەیەک خوێندبێتمەوە، جۆرێک لە خۆشەویستی نهێنی تێدا بووە، خۆشەویستی سیاسەتمەدارانێک بۆ یەکتر کە دوژمنایەتییەکی خوێناوی و گەورە ڕێگر نییە لە بەردەم ئەوەدا خۆیان بە هاوڕێی نزیکی بزانن. لەو دەمەدا دەستم خستە سەر ترسناکترین دۆزینەوەی ژیانی خۆم، تێگەیشتم سیاسەتمەداران و سەرۆکە گەورەکانی ئەم جیهانە لە بنەوەڕا هەموو دۆستن، ئەوەی دوژمنە پیاوە بچوک و نەفام و بێئاگاکانن، سەربازە بچوکەکانن، جەنگاوەرە ناحاڵییەکانن. بەڵام بۆ ئەو دەمی من ئەو شتانە هیچیان مانایەکیان نەبوو، تەواوی ئەو کارانەم وەک توانای بەرزی دیپلۆماتیانەی سەرۆکەکانم سەیردەکرد، کە بۆ ئەوەی نیشتیمان ڕزگاربکەن، دەبێت هەموو ڕێگایەک بگرنە بەر... بەڵام ئەوەی ترسناک بوو، ئەو باڵانەم بوو کە بە جۆرێکی سەیر تادەهات بەرزتر و بەرچاوتر دەبوون، وەک ئەوەی قوڵنگێکی زیادە زەبەلاح لە ناخمدا بێت و پێمبڵێت دەمەوێت بێمەدەرێ و بفڕم.

نزار دەیزانی کە دەتوانێت زیانی کوشندە لە ڕێکخراوەکانی ناو شار بدات، بەڵام لە بری ئەو کارە، شەوێکی درەنگ دەچێتە ماڵی کۆنە هەڤاڵێکی خۆی لە شانە سەرەتاییەکاندا و دوو نامەی دەداتێ، نامەیەکی کەمێک کورت کە ئاراستەی من کرابوو، لەگەڵ نامەیەکی درێژ کە ئاراستەی شەخسی سەرۆک «خودا لێیخۆش بێت» کرابوو. نزار لە نامەکەیدا بۆ من، زۆر تکایکردبوو ئەو چاکەیەی لەگەڵ بکەم و نامەکە بگەێنمە دەستی سەرۆک، بێئەوەی بە ژێر هیچ دەستێکی تردا بڕوات. لە نامەکەیدا بۆ سەرۆک شتێک لە پەشیمانی یان ترسی قووڵ هەست پێدەکرا، سوێندخواردنێکی منداڵانەی تێدابوو کە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئەو سروشتە لووتبەرز و دڵشکێنەی نزاردا نەدەگونجا،

ئەو سروشتەی کە بە مەبەست دەیویست جیهانی چواردەوەی خۆی بە شتی کتوپڕ و ترسناک تووشی سەرسامییکات. نامەکە ئەمڕۆ بۆ من بەڵگەی ئەو هەموو دەموچاو و کەوڵە جیاوازانەیە کە مرۆڤ لەو سەردەمەدا پێویستی پێیانبوو، نیشانەی توانای مرۆڤە لە دەرچوون لە کاراکتەری خۆی، بەڵگەیەکە کە من هێندەی لە نمایشێکی دەمامکداردا ژیاوم، لە ناو مێژوو یاخود شۆڕشدا نەژیاوم. پتر لە نامەی دیلێک دەکات کە لە زیندانێکی دوورەوە داوای بەزەیی و لێبوردن بکات، نەوەک لە نامەی پیاوێک لە شاردا خەریکی دروستکردنی هێزێکی چەکدارە بۆ دژایەتی شۆڕش. لە ساتێک لە ساتەکاندا هەستمکرد شۆڕش بۆ دوژمنە هەرە گەورەکانیشی، بۆ تاک تاکی خەڵکی وڵاتەکە، وەک باوکێکی نهێنی وەهایە کە دەبێت هەموو لە پێشدەمیدا دان بە تاوان و گوناهەکانیاندا بنێن. لە نامەکەدا باس لە پلانێکی کوشتنی نهێنی دەرهەق بەو دەکات کە هەندێک دوژمنی نەناسراو بۆ قازانجی کەسانێکی نادیار دایانڕشتووە. کۆی نامەکە بە زمانی یەکێک نوسرابوو وەک ئەوەی لە سەردەمە دێرینەکاندا ئیلتیماسیان بۆ عەفوو و مەغفەرەت ئاراستەی سوڵتان دەکرد. تا نامەکەم زیاتر دەخوێندەوە، لە پشتییەوە پتر کاراکتەری شەیتانی و عەقڵی زیرەکی نزارم دەبینی، دڵنیابووم ئەمجۆرە بانگەوازکردنە بۆ سەرۆک، ئەمجۆرە شوبهاندنە ژێرەوانکێیە بە پادشاهی کۆن و سوڵتانان کاری خۆی لە سەرۆک دەکات. گەرچی نزار رووبەڕوو سەرۆکی زۆر نەدیبوو، بەڵام وەهابوو وەک ئەوەی کۆی ئەو زانیاریانەی کە دەربارەی بیستوویێتی و کۆی ئەو چیرۆکانەی لە سەر جەنابیان زانیوێتی، بە جۆرێکی بلیمەتانە بەکارهێنابێت... من تادەهات زیاتر تێدەگەیشتم مرۆڤ لەم وڵاتەدا دەبێت تەواوی زیرەکییەکانی بخاتە خزمەتی غەریزەی مانەوەوە. نزار و لیڤیتانتیش، وەک من، وەک هەڤاڵ شێرخان کەسانێک بوون کە بە دروستی زیرەکی خۆیان دەنایە خزمەتی ئەو خواستە

تاریکەوە، خواستی ژیان لە ناو جەنگێکی ترسناکدا کە هەموو کەسێکی بێئاگای دەکرد بە ژێر ددانە تیژ و ترسناکەکانییەوە و دواتر ناویدەنان شەهید. لە نامەکەیدا بۆ سەرۆک هاتبوو کە ئەو داوای لێبوردنێکی قووڵ لە ماڵی شەهید مەجید دەکات، هەموو ڕووداوەکە لە ڕێکەوتێکی مەلعون زیاتر هیچی تر نەبووە، ئەو هیچ کات نەیویستوە خوێنی پێشمەرگەیەک بڕێژێت، بەڵام هەڵهاتنی هیچ نەبووە جگە لە بەرگرییەکی نائومێدانەی ڕۆحێکی بێجێگە و بێگوناه لە خۆی، نوسیبووی کە خۆشەویستەکەیان لێزەوتکردوە، ناموسیان ئەتککردوە و ئێستاش نازانێت ئەو خانمە لە کوێیە و بە چی گەیشتووە. لە ڕێگای زمانی نامەکەوە تێگەیشتم کە خوێندنەوەکانی نزار ئیدریس، زمانێکی کاریگەریان پێبەخشی بوو، بەڵام هەمیشە ئەو ڕستەیەشی لە خەیاڵمدا بوو کە دەیگووت، من تەنیا بۆ هۆنینەوەیەکی چاکتری درۆکانم کتێب دەخوێنمەوە. بەڵام وەک چۆن زۆرجار نیوەی هەقیقەت درۆیە، نیوەی درۆش هەقیقەتە. نزار لەوەدا لە سەر هەق بوو، کە کوشتنی بۆ پێشمەرگەیەک بەرگریکردنێکی نائومێدانە بوو لە ژیانی خۆی. دەیزانی گەر زوو کارێک نەکات ڕابوردووی خۆی بسڕێتەوە، شۆڕش بەدوایەوە دەبێت و دەیکوژێت، دەبوو یارییەکی گەورەتر و گرنگتر بکات، دڵنیابوو هەموو مرۆڤەکان لێرە زۆر ئاسان دەتوانن ڕابوردووی خۆیان بسڕنەوە... هیچ مرۆڤێک لە وڵاتەکەدا نییە لە ڕابوردووی خۆی ڕانەکات، ئینسانەکان بە دەستە و تاقمی گەورە، بە هەزارەها لە ڕابوردووی خۆیان هەڵدێن. ئێستاش ئەو دەیویست شتێک بکات، بە زووترین کات ئەو ڕابوردووە لە بیر خەڵک بەرێتەوە. باشترین شتێک بۆ ئەوەی خەڵک ڕابوردووت لە بیربەرنەوە، ئەوەیە بەردەوام چیرۆکی تازە لە سەر خۆت دروستبکەیت... خەڵک وەک منداڵ وان، گەر شتێکی نوێ هەبوو پێوەی سەرقاڵ بن، یارییە کۆنەکانیان لەبیردەکەن.

ئەو هێزەی نزار لە شاردا بۆ کۆمەکی دەوڵەت دروستیکرد، لەوەی

لیڤیتانت درێتربوو. ئیشی هەموو ئەو جۆرە هێزانە ئازاردانی خەڵکی سادە بوو، دەوڵەت لە ڕێگای ئەو هێزانەوە پتر دەیویست خەڵک هەستبکەن کە لێرەیە و ترسناکە و دەتوانێت هەمیشە ئامادەبێت. یەکەم جەنگ و پێکدادانی مەفرەزەکەی نزار لەگەڵ هێزێکی لیڤیتانتدا بوو، شەوێک لە سەر شەقامی مناران و لە نزیک پاریگای گەورەی شارەوە، هێزەکانی هەردووکیان یەکدی دەدەنە بەر گوللە، بەڵام هیچ زیانێکی گیانی لە تەقەکان ناکەوێتەوە. هەموو ئامارەکان بۆ ئەوە دەچن کە نزار بە مەبەست ئەو پێکدادانەی دروستکردبێت، تا پیاوانی ئەمن ناچاربکات، لە نێوان ئەو و لیڤیتانتدا ناوبژیبکەن. هەواڵەکانی کە بە من دەگەیشت، دەیانگووت هەر دووکیان زۆر لە یەکدی دەترسن و سڵدەکەنەوە، دواتر زانیم کە هەر یەک لە نزار و لیڤیتانت، پێکەوە توانایەکی نهێنی و ئەفسوناویان لە خۆیاندا گەشە پێداوە، هەر دووکیان دەیانتوانی چاو لێکبنێن و ببینن ئەویدیان لە کوێیە، لە چ کوچە و کۆڵانێکدا دەگەڕێت، بە چ شەقامێکدا دێتە خوارێ، هەردووکیان دەیانزانی ئەویدی ئاگای لێیانە، دەزانێت لە کوێن، ئەو توانایە کۆمەکی پێدەکردن خۆیان زۆر لە یەکتری بپارێزن. نزار بە جۆرێک لە جۆرەکان لەوانە نەبوو بەرگەی ترسی بەردەوام بگرێت، بە پێچەوانەی لیڤیتانتەوە کە هەمیشە شتێک لە سەبووری و عیناد و کۆڵنەدانم تێدا دەبینی. هەفتەیەک دوای تەقەکانی سەر شەقامی مناران، ڕەفیق سەباح غەیدان کۆبوونەوەیەکی داخراوی بە هەردووکیان کرد و بۆ یەکەمجار دوای زیندانەکەی پسمامان دوو دوژمنە گەورەکە ڕوو بە ڕووی یەک دانیشتن. ڕەفیق سەباح پێیگووتن ئەو جیاوازی و ناکۆکییەی نێوانتان دەگەڕێتەوە بۆ دەور و زەمانێک کە هەردووکتان لەگەڵ عوسات و عومەلا و موخەڕیبین بوون و فریوتان خواردبوو، ئێستا هەردووکتان دوو ڕۆڵەی نەبەردی عێراقن، وەک جگەرگۆشەی هەڤاڵی فەرماندە وان، ئینشاڵڵا دوو قارەمانی نەبەردتان

لێدەردەچێت، کێ چوزانێت لەوانەیە ڕۆژێک بەخت یارتان بێت و سەید الرەئیسیش ببینن. لە دانیشتنەکەدا نزار گەلێک نەرم خۆی نیشاندا و گووتی کە داوای لێبووردن لە جەنابی لیڤیتانت دەکات، هیوادارە وەک چۆن دڵی حیزب و شۆڕش و سەرۆکی فەرماندە فراوان بووە و لە هەڵەکەی ئەویان بووریوە، وەک چۆن ئەوان توانای عەفوو و مەغفەرەتیان هەیە، هەڤاڵ عومەر بۆتانیش، خاوەنی دڵێکی وا بێت و نزار بە ڕەفیقی ڕێگای خەباتی خۆی بزانێت.

ساڵانێک دواتر کە پێکەوە مەست بووین، نزار ئیدریس بە دەنگێکی قۆشمەباز و لاقرتی ئامێز، تەواوی ئەو قسانەی دووبارەکردەوە کە لەو ڕۆژەدا گووتبوونی، هەموو وشەکان و داڕشتنەکان و بەلاغەتی کە بەرهەمی خوێندەواری پیاوێکی خەتەرناک بوو، بۆ من هەم مایەی پێکەنین و هەم مایەی خەفەتێکی قووڵ بوون.

لیڤیتانت کینە هەڵگر بوو، کاتێکیش دەیزانی تۆڵەکردنەوەی تا دێت دوادەکەوێت، تووشی بارودۆخی دەرونی دژوار و ناهاوسەنگی و تورەیی شێتانە دەبوو. ئەو ڕۆژە لە بەردەم ڕەفیق سەباح غیداندا، جگە لەوەی دەستبکاتە ملی نزار، چاری تری نەبوو... جگە لەوەی باوەشی پێدابکات و پێیبڵێت ڕەفیق نزار، منیش حەزم لەوەیە لاپەڕەیەکی تازە هەڵبدەینەوە ڕێگایەکی تری لە بەردەمدا نەبوو. کە وای گووت وەک ئەوە بوو پەرداخێک ژەهری پاڵاوتە بخواتەوە. دڵنیابوو دەبێت تۆڵەی خۆی لە نزار بۆ سەردەمانێک و ڕۆژانێکی تر دوابخات.

دوای ئەوە شتێک لە ساردی و ماندوویی بە هەموو شتێکی لیڤیتانتەوە دیاربوو، وەک ئەوە بوو هەستبکات هەموو دونیا خیانەتیان لێکردوە. وەک من تێبینیم کرد بەشی زۆری کاتەکانی خۆی لە دروستکردنی بینا سەرەتاییەکانی بورجدا دەبردە سەر، کاتێکی زیادی لەگەڵ وەستا و

کرێکاراندا سەرفدەکرد، هەموو شتێکی هەڵدەسەنگاند و بەرد بە بەرد کەرەستەی بیناکەی دەپشکنی، لەگەڵ ئەندازیاراندا دەچووە گفتوگۆی درێژەوە و بەردەوام دەیگووت «شتێکی جوان و هونەریم ناوێت، بینایەکی بەهێزم دەوێت، بینایەکی وەها هەرکات غەریبەیەک هاتە ئەم شارە و بینی، بترسێت». لە پاڵ ئەو سەرقاڵییە بەردەوامەشیدا لەگەڵ بناغەکانی بورجدا، خولیایەکی سەیرم تێدا بینی بۆ دۆزینەوەی نەغەدە ماردینی. سەیربوو بە لامەوە کە زانیم لیڤیاتانت هەموو ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە کۆدەکاتەوە کە شیعری نەغەدەی تێدایە، بە دوای هەموو ئەو وێنانەدا دەگەڕێت کە نەغەدە لە ساڵانی کۆلێژدا گرتوونی، لە دوو کاتی جیاوازدا پەلاماری ماڵی دکتۆر جەلالی دابوو و هەموو ئەو وێنانەی بردبوو کە خانمی ماردینی لە منداڵییەوە گرتوونی. سەرەتا کە خانمی ماردینی لە زیندانی هەڤاڵ شێرخان ڕایکرد، چەندینجار هات بۆ لای من و داوای کۆمەکیکرد تا نەغەدەی بۆ بدۆزمەوە. هەموو جارێک کە دەهات بێزار و ماندوو دەردەکەوت، هەمیشە وام هەستدەکرد نەخۆش بێت، یان هەواوهەوەسێکی تاریک لە ناوەوە بیخوات. کەمجار لیڤیاتانتم بە ئاسایی و ئاسوودەگی دەبینی، بەردەوام شتێکی نهێنی ڕۆحی دەگوشی، هەستمدەکرد دەرهەق بە خۆشی، جۆرێک لە دڵڕەقی نادیاریی تێدایە، نەیدەتوانی بەختەوەر بێت... ڕاستییەکەی لەو مرۆڤانەبوو کە هەرگیز ناتوانێت بەختەوەر بێت، بەختەوەری بۆ گرنگ نەبوو، نەیدەزانی چییە، هەرگیز بیریشی لێ نەدەکردەوە.

هەر جارێک دەهات بۆ لام، پێمدەگووت «ئاغا... پێدەچێت عاشق بیت». سەری بادەدا و دەیگووت «نا». وابوو عاشق نەبوو، بەس شتێک پاڵی پێوەدەنا بیەوێت نەغەدە داگیربکات، ڕەنگە ڕقی بووبێت لە نزار، لە شۆڕش، لە شیعر... وام هەستدەکرد لە ڕێگای داگیرکردنی نەغەدەوە دەیەوێت هەموو ئەو شتانە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. وای

هەستدەکرد گەر لەشی نەغەدە بکات بە موڵکی خۆی، بەشێکی گەورەی ئەو دونیایانە کە بۆ ئەو نەگیر و داخراو بوون دەکەونە بندەستی ئەو. لەشی نەغەدە وەک لەشی دیلەکان، ئامارە بوو بۆ دەسەڵاتێک کە هیچ کات و هیچ ڕۆژێک لێی دڵنیا نەبوو... لیڤیتانت تا زیاتر دەسەڵاتی بایە، زیاتر گومانی لەوە دەکرد ئاخۆ بە ڕاست دەسەڵاتی هەیە. دەسەڵات تاکە شتێکە مرۆڤ ناتوانێت تەواو دڵنیابێت لەوەی کە هەیەتی یاخود نا، لە بەرئەوە لیڤیتانت بەردەوام بە دوای دەلیلی زیاتر و زیاتردا دەگەڕا، بیسەلمێنێت کە کەسێکی لاواز و کەم دەسەڵات نییە.

منیش ئەوکات نەمدەزانی نەغەدە ماردینی لە کوێیە، دوای هەڵهاتنی لە شاخ، ماوەیەک تەواو بێسەروشوێن بوو، من نەمدەویست هیچی دەربارە ببیستم، نەمدەویست هیچ کەسێکی دیش هیچی دەربارە ببیستێت، گەرچی لە بیری خۆم نەدەچووەوە، بەڵام هەوڵێکی گەورەم دەدا لە بیر دونیا بچێتەوە. بە جۆرێک لە جۆرەکان بە قازانجی هەمووانم دەزانی کە خانمی ماردینی ون ببێت، بچێت و لە کونجێکی دیکەی ئەم سەر زەمینەدا، دوور لە پیاوانی تینووی شۆڕش و جەنگ، درێژە بە ژیانی خۆی بدات. ئەوکات کە نەغەدە هەڵهات، نزار لە مێژبوو لە شاردا هەرای دەگێڕا، مستەفا شوکاکیش چوو بوو بۆ جەنگ، منیش زۆر سەرقاڵی ئەو دۆخە تازە و کارە نوێیانە بووم کە ڕۆژانە حیزب خۆی تێوەدەگلاند. بە سەرێکی دی ڕێکخراوەکانی ناو شار بەردەوام بەرەو گەورەیی دەڕۆیشتن... هێدی هێدی من دەبووم بە وەکیلی شۆڕش و ڕەوانەکراوی هەمیشەیی ئەو بۆ لای بەعسییەکان. لەو سەردەمەدا بۆ یەکەمجار کۆبوونەوەی ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕووم لەگەڵ ئەفسەرەکانی دەستگای هەواڵگری دەوڵەتدا دەست پێکرد، من بە ڕۆحێکی سارد و بێباکەوە، وەک بوکەڵێکی میکانیکی بۆ ئەرکێکی دیاریکراو قورمیشکرابێت، وەک ئادەمماشینێک دەچووم بۆ ئەو کۆبوونەوانە، شتێکی زۆر لە ڕق لە

ناخمدا بوو. بەعسییەکان تا دەهات دڕتردەبوون، هەڤاڵانمان کە دەگیران هەرگیز خۆریان نەدەبینییەوە. من کە دەچووم بۆ بینینی بەعسییەکان، هەمیشە پێشوازییەکی گەرمیان لێدەکردم، سات هەبوو دەست و پای خۆم وندەکرد و نەمدەزانی بەراستی بۆ کێ ئیشدەکەم... بۆ شۆڕش یاخود بۆ فاشیستەکان. ئەوەی وەک سەرە پردی پەیوەندی ناسرابووم، خستبوومیە جێگایەکی سەیرەوە، بەردەوام لە هاتوچۆدا بووم لە نێوان شاخ و شاردا. مانگانە چەند جارێک دەڕۆیشتم و دەهاتم، ڕۆژێک ئەفسەرێکی گەورەی هەواڵگری کە جار جار بۆ کاروباری تەدارەکی دانیشتنی ڕوو بە ڕوو و زەمینەسازی دیالۆگ یەکدیمان دەبینی، شوناسنامەیەکی ئەسڵی هەواڵگری بۆ هێنام، وێنەیەکی خۆمی پێوەبوو، نەمدەزانی چۆن و لە کوێ گیراوە. بۆ ئەوەبوو ئازاد بە هەموو وڵاتدا بسوڕێمەوە. کەسەیری شوناسنامەکەم کرد، ترسناک هاتە بەرچاوم. وەک ئەو ساتەی تەقەم لە ئەسپەکان کرد، ساردییەکی قووڵ لە ڕۆحمدا بوو، بەڵام ساردییەکی ئازاربەخش... خوای گەورە هەمان سات بوو، هەمان سات بوو، وەک ساتی کوشتنی ئەسپەکان، بەڵام بە شێوەیەکی دیکە و لە جێگایەکی تردا. ئەفسەرە عەرەبەکە پیاوێکی باریکی سەرسپی ددان زەرد بوو، هەر بە رائید عربان بانگیاندەکرد، کەمدوو و بێدەنگ و ئاڵۆز دیاربوو، بەردەوام جگەرەی دەکێشا و ئاخی هەڵدەکێشا، لە ژێر لێوییەوە زۆر جنێوی دەدا «گەوادیـد، ئەخوات الگەحبە، کیلاب» نەمدەزانی جنێو بە کێ دەدا، وام هەستدەکرد بێئەوەی کەسێکی دیاریکراو لە خەیاڵیدا بێت جنێو دەدا. زیاتر بۆ سووککردنی بارێکی ڕۆحی خۆی نەفرەتی بە سەر مەخلوقاتێکی نادیار و نەبینراودا دەباران، خۆیشی نەیدەزانی لە چی و بۆچی توڕەیە. من کە سەیرمدەکرد تێدەگەیشتم بۆ وا بێهۆ، بێبەهانە، بێ بابەت جنێو دەدا. من خۆم لە هەندێک سەردەمدا کە لەو ژوورە تەنهایەی خۆم لە ناو هێڵ و سەرەداو و کڵافەی ئاڵۆزکاوی درۆ و

هەقیقەتدا سەرم لێدەشێوا، بێویستی خۆم دەکەوتمە باراندنی نەفرەت بە سەر خۆم و دونیا و خودادا. واهەستدەکەم لەوسەردەمەوە، ئێمە خەڵکانی نێو ئەو جەنگە، ژن و پیاو، فێری ئەوەبووین بڕۆین و جنێو بە زەوی و ئاسمان بدەین... رائید عریبانیش بەدەر نەبوو لەو حاڵەتە. کە بە دەم ورتە ورتێکی نەرمەوە شوناسەکەی دامێ، ساردییەکی سەیر دایگرتم، بۆ ئێستێک دووبارە پسمامان هاتەوە پێشچاوم. بەڵام وەک هێزێکی تاریک و دڵێکی بێجورئەت لە ناخمدا هەموو شتێک دیاریبکات، بە هەمان ساردی و بێدەنگی و بەستەڵەکی ناخەوە شوناسەکەم هەڵگرت. لەو ساتەدا دڵنیابووم پیاوێکی ترسنۆک لە ناخمدایە و ئەو لە بری من بڕیاردەدات، دڵنیابووم بە درێژایی ژیانم ئەو زاتە نەوێر و کەم هەڵمەتە ڕێگای من دەکێشێت. نەمدەزانی ئەم شوناسە لە خزمەتی چیدایە، نەمدەزانی بۆ ئەوەیە ئازادبم یان تا ماوم لە بەردەم خۆمدا وەک خائین بوەستم... لە ماڵەوە زۆر گریام، ئاوێنەی ژوورەکەم شکاند، بوتڵە بەتاڵەکانی عارەقم کێشا بەزەویدا کە ناوناوە لە ژوورەکەمدا کۆدەبوونەوە، شەقم لە شتەکان هەڵدا، نەمدەزانی بۆ بەردەوام ئەو شتە دەکەم کە نامەوێت، چی وادەکات بە جۆرێک بێباک و ترسناک بم. لەودەمەدا ئەفسەرە عەرەبەکان بە جۆرێکی وەحشیانە دەستیان بە هەر گوندێکدا ڕابگەیشتایە کاولیاندەکرد، ئەفسەرەکانی ئەمن و هێزەکانی فریاکەوتنی فاشی بازاڕیان دەسووتان، ماڵیان تەختدەکرد، ئابڵۆقەی گەڕەکەکانیان دەدا، ژنیان دەڕفاند، گەنجانیان تیرباراندەکرد، دروست لەو ساتەدا من بە فەرمانی سەرۆک شوناسی ئەو فاشیستانەم دەخستە گیرفانم، بەهانەکەشم ئەوە بوو کە شۆڕش واپێویستدەکات. من لە عەقڵمدا باوەڕم بە بەهانەکە هەبوو، بەڵام لە ڕۆحمدا شتێک توند دەیکێشا بە سەرمدا کە نابێت باوەڕم پێی هەبێت.

لە شارەکاندا ژمارەی ئەو مەفرەزە و چەکدار و جاشانەی دەوڵەت پێکیدەهێنان، بە خێراییەکی شێتانە زیادیاندەکرد. تا دەوڵەت دڕندەتر بایە من لە سەرەوە فشارم لێدەکرا زیاتر نزیکببمەوە، هەمیشە هەوڵەکانی یەکتر بینین لای ئەنجومەنی باڵاوە زۆرتر دەبوو. بڕیاری ئەوجۆرە یەکتر بینینانە بەردەوام لە سەرەوە دەدرا، لە دانیشتنەکاندا زیاتر ئێمە کاری تەدارەکسازیمان دەکرد. چەندین جار، من کار ئاسانیم بۆ سەرۆکی دوو فەیلەق کرد تا بەدزییەوە بڕۆن و چاویان بە ئەندامانێک لە دەفتەری سیاسی بکەوێت، هێدی هێدی دۆسیەی نامەکان و ئاڵوگۆڕە نهێنییەکانی نێوان سەرکردەکانی ئێمە و دوژمن بە جۆرێک لە ژێر دەستمدا گەورەدەبوو کە ساڵێک لەوەوبەر چاوەڕوانی دۆسیەی وا ئەستوورم نەدەکرد.

لەو دەمەدا لیڤیتانت درێژەی بە عادەتە سەیرەکانی خۆی دەدا، نامەی دڵداری لە کچان و کوڕانی بەستەزمان بستێنێت و کۆیانبکاتەوە، کتێبخانەی هەندێک ماڵ بسووتێنێت، لە ناوەڕاستی بازاڕدا لە شاعیرەکان بدات... هەمیشەش کە دەهاتە لام، ڕەشداگەڕاو و غەمگین بوو. ئەویش وەک من سەری لێشێوا بوو، نەیدەزانی بۆ کێ کاردەکات، بۆ خۆی یان بۆ دەوڵەت یان بۆ شۆڕش. ئەو چیرۆکە و بەو چەشنە ساڵانێک بەردەوام بوو. ڕۆژێک لەدوای دەرچوونی دیوانەکەی نەغەدە ماردینی، بە جۆرێکی ئاسایی هات بۆ لام، بەڵام ئاسایی نەبوو... بێدەنگ لە ژوورەکەدا وەستاو گووتی «دەزانم نەغەدەی کچی دکتۆر جەلال لە کوێیە... شوێنەکەیم دۆزیوەتەوە». من سەرسام لە جێگای خۆم ڕەقبووم و ماوەیەک هیچم بۆ نەگووترا، دوای ئەوەی تفێکی گەورەم قووتدا، بە دەنگێکی خنکاو گووتم «ئێ... دەتەوێت چی بکەیت؟». بە غەمگینییەوە گووتی «نازانم». ئێستێکیکرد و بە بۆشناخی هەمیشەیی خۆیەوە سەیرێکی سەقفەکەی کرد و گووتی «سەرەتا دەمەوێت بیبینم». من تەنیا سەیرمکرد و هیچم نەگووت. بە غەمگینییەکی زۆرەوە کە لەگەڵ ناوبانگیدا وەک جەلادێک نەدەگونجا

دانیشت و گووتی «کاک وەفا، خۆشەویستی مانای نییە، وانییە، مرۆڤی زەعیف خۆشەویستی دەکات. بەلام من دەزانم... دەزانم من خولیای دوو شتم لە سەردایە. یەکەم هەست نەکەم لە نزار لاوازترم، دووەم دەمەوێت لە نهێنییەکی گەورە تێبگەم، دەمەوێت لە نهێنی ئەو ژنە تێبگەم».
نەخوێندەوار و دڕندەیەکی وەک لیڤیتانت چی لە ژنە شاعیرەیەکی وەک نەغەدە دەویست؟ نەمدەزانی. لە مێژوودا هەندێک سەردەم دێتە پێشێ، تێیدا خوێندەواران دەکەونە ناو لابورێکی گەورەوە کە نەخوێندەواران دروستیانکردوە. گەمژەکان دەبن بە ئوستادی داناکان و پیاوکوژان بە داوەرێ دادپەروەران، لە مێژە ولاتی ئێمەش پێیناوەتە ئەو سەردەمەوە.
ئەوسا بە لیڤیتانتم گووت «گەر خۆشت ناوێت و حەزت لێ نەکردوە، واز لەو ژنە بهێنە... دەستی دەستی زۆر پێکراوە، من دڵم بۆی دەسووتێت».
گووتی «دەزانم، بەلام کەی ئەوە گرنگە... کەی ئەوە گرنگە».

لیڤیتانت بۆ ئەوەی شوێنی نەغەدە ماردینی بدۆزێتەوە، چووبووە بنج و بناوانی کتێبەکەی، چۆن هاتۆتەدەرێ، کێ چاپیکردوە، لە کوێ چاپکراوە، چەند دانەی چاپکراوە. دوو شاعیر لەوانەی زۆر لە لیڤیتانت دەترسان و بە دەستی ئەشکەنجەیان دیبوو، ئەوان سۆراغی ورد و درشتیان بۆ کردبوو. هەر دووکیان دوو میوانی بەردەوامی «میکۆ» چایخانەی شاعیران بوون، کە زۆرجار لیڤیتانت هەر بۆ ترساندن و بێزارکردنی هەوادارانی شیعر دەچوو بۆ ئەوێ. هەر وەخت کە ئەو دەچووە ژوورێ، شاعیرەکان هەموو دەستیان بە پیاڵەی چاکەوە ڕەقدەبوو، دەنگیان دەگۆڕا و زمانیان لە دەمیاندا وشک دەبوو. زۆر ڕۆژ هیچی نەدەکرد، هەندێک ڕۆژیش یەکێکی هەڵدەبژارد و دەکەوتە ئازاردانی. بەوەدا شاعیران هەموو لێیدەترسان، خەڵکێکی زۆریان تێدابوو بیانەوێت ملهوڕی نیشانبدەن، بەتایبەت شاری ئێمە ئەو دەم بووبوو بە پایتەختی شاعیرانی ملهوڕ. ئەوان هەواڵی ئەوەیان پێگەیاند کە کەسێک بە ناوی هۆشەنگی بولبولیارەوە لە پشت

چاپکردنی دیوانەکەی خانمەوەیە. سەرەتا ناوەکە هیچ شتێکی تایبەتی بیر لیڤیتانت نەخستەوە، بەڵام دوای سۆراغ و پشکنین رایەڵی دێرینی نێوان من و بولبولیاری هاتەوە یاد.

لە ژوورەکەمدا بێدەنگ جگەرەی دەکێشا، قاچە زۆر درێژەکانی بۆ پێشەوە ڕاکێشابوو، لەشی هاڵاوێکی تایبەتی هەبوو، هەمیشە وەک کەسێک دەهاتە پێشچاوم لە نێو هاڵاوی دوای بارانەوە هاتبێت... کەسێک ماڵی ڕاستەقینەی لە ناو تەمدا بێت و بچێت بۆ هەر کوێیەک دواجار جگە لە تەم هیچی تر لەگەڵ خۆیدا نەبات. بە هێمنی گووتی «هۆشەنگی بولبولیار، دۆستەکەی تۆ، ئەو شاردوێتییەوە. چەندین ساڵە ئەو شاردوێتییەوە». کە ناوی بولبولیاری هێنا دڵی من ڕاچڵەکی. وەستام و لە دڵی خۆمدا گووتم چ دەردمە، هەر ناوی ئەم کەسە دەبیستم دڵم دادەچڵەکێت، چ دەردمە و بۆ وا ناخم دەلەرزێت، ئەم کوڕە چی هەیە کە واهەستدەکەم دەبێت بیپارێزم. بێویستی خۆم چوومە بەردەمی و پێمگووت «وەعدم بەرێ لیڤیتانت کە ئازاری بولبولیار نەدەیت. وەعدم بەرێ، چونکە کوڕێکی بێوەیە». دەمزانی من یەکێکم لەو کەسە زۆر کەمانەی لیڤیتانت ڕێزیان لێدەگرێت. گووتی «بە ڕاستی پێمبڵێ، بولبولیار چیتە؟». گووتم «هیچم نییە، بە ئەستەم دەیناسم، بەڵام لە بەر شتێکی تایبەتی خۆم سەلامەتی ئەوم بەلاوە گرنگە. بە ڕاستیمە لیڤیتانت... هەتا خەڵکانێک لە شۆڕشدا ویستیان بیکوژن، من نەمهێشت، شتێکی تایبەتی خۆمە». بەقسەکانمدا دیاربوو ئەو گەنجەم زۆر بۆ گرنگە. مژێکی قووڵی لە جگەرەکەی دا، لەگەڵ ئەوەی کە ترسناکترین پیاوی شاربوو، لە پشت دوکەڵی جگەرەکەوە لاواز و تێکشکاو دەردەکەوت. گووتی «وەفا تۆ برادەری منیت، پێیبڵێ ئەمجارە نەیشارێتەوە. چونکە دەیکوژم». من توند دەستیم گرت و گووتم «نا ناتوانم پێیبڵێم، چونکە نازانم بەقسەمدەکات یاخود نا. چەندە ڕقی

لە تۆیە، ئەوەندەش ڕقی لە منە، بەڵام نابێت بیکوژیت... بە هیچ بیانوویەک و بۆ هیچ هۆیەک نابێت بیکوژیت، گەر بیپارێزیت، بزانە ئەوە بۆ من دەکەیت، لەوانەیە بتوانم ڕۆژێک چاکەت بدەمەوە».

لیڤیتانت هیچ تێنەگەیشت، بەس دڵنیابووم تا بتوانێت بە قسەمدەکات. هەستمدەکرد لیڤیتانت هێدی هێدی وەک هاوڕێیەکی کۆنی خۆی سەیرمدەکات، وەک یەکێک کە لە کاتی تەنگانەدا دووجار بە ڕاستی کۆمەکم پێکردوە، لەوەش بترازێت، پیاوێکی تابڵێی تەنها بوو، دەیویست یەکێک هەبێت وەک هاوڕێ سەیریبکات.



ئێوارەیەک، وەک کەسێکی ئاسایی خۆی کرد بوو بەو ماڵەدا کە خانمی ماردینی خۆی تێدا دەشاردەوە. هەموو زانیارییەکی هەبوو، بێپرس چووبووە ئەو ژوورەی نەغەدە ماردینی تێیدا دەخەوت و دەیخوارد و دەیخوێندەوە... خانم پێشتر لیڤیتانتی لە نزیکەوە نەدیبوو، بەڵام ئەو بێباکییە قووڵەی ناوناخی وایکرد نەترسێت، هەتا بە شتێک لە هێمنییەوە کە لیڤیتانتی سەرسامکرد، داوەتی دانیشتنی کرد. بەڵام ئەو خۆی پێناساند و گووتی بەر لە هەڵهاتنی تۆ بۆ چیا، هێزێکی من موستەفا شوکاکی مێردی تۆی گرتووە، من فەرمانی ئەشکەنجەدانی ئەوم دەرکردوە، من تەسلیم بە ئەمنە عەرەبەکانم کردوە... هەمووش لە سزای ئەوەدا کە بە هۆی بێباکی ئەوەوە تۆ عاشقی کەسێکی جانەوەری وەک نزار بوویت.

نەغەدە سەرەتا کەمێک پەشۆکا بوو، بەڵام هەر زوو خۆی کۆکرد بووە و گەرا بووەوە دۆخی سروشتی خۆی.

ئەو وەک زۆربەی ژنان حەزی نەدەکرد گوێی لە ناوی ئەو پیاوانە بێت کە دەبن بە ڕابوردوو، دەکەونە پەراوێزەوە، بەدەگمەن نەبێت

دکتۆری بەخەیاڵدا نەدەهات، دەیزانی بەهۆی ئەمەوە ئەشکەنجەی زۆری بینیوە، خەڵک زۆر سوکایەتییان پێکردوە، ئێستاش لە جەنگ نیوە شێت گەڕاوەتەوە و هیچی لەو پیاوە ڕوخۆشەی جاران ناچێت. بەڵام بیری لێ نەدەکردەوە، بە گوناهی خۆیشی نەدەزانی، هەتا ئەگەر بە گوناهی خۆیشی بزانیبایە، هەستی نەدەکرد بتوانێت هیچ بکات، یان ئەرکێتی غەم بخوات. پێیوابوو ئەوەی پێیدەگووترێت گوناە بەشێکە لە ژیان خۆی، لە دەرەوەی ئیرادەی گوناهبارەوە هەڵدەقوڵێت، شتێکە وەک نەخۆشی، وەک پەتا کە کەسێک دەیگرێت و کەسێکی دیکە تووشی نابێت. گوناه شتێک نییە گوناهبار هەڵیبژێرێت، بەڵکو ئەو گوناهبار هەڵدەبژێرێت. هەموو گوناهێک بۆ خاوەنێک دەگەڕێت، وەک باڵندەیەک چۆن لە بەرزاییەکی دوورەوە دادەنەوێت و بە ڕێکەوت لە سەر درەختێک دەنیشێتەوە، گوناهیش وەهایە... دەتوانم بڵێم، نەغەدە بە جۆرێک لە جۆرەکان باوەڕی بە بوونی گوناهبار نەبوو، بەڵکو تەنیا باوەڕی بە بوونی ئەوانە هەبوو کە گوناە هەڵیاندەبژێرێت، بۆ ئەوەی هەڵیگرن و بیگرنە ئەستۆ.

لیڤیتانت یەکەمجار بۆ ئەوەی سەرنجی خانم ڕابکێشێت و تەنیا وەک نێرێکی زبر و ئێسک قورس دەرنەکەوێت، بە عەقڵی ئەو پیاوانە قسەی لەگەڵ کرد کە ئافرەت وەک قوربانییەکی ئەبەدی وێنادەکەن، پەلاماری ئەو پیاوانەی دا کە بە ژیانی نەغەدەدا ڕابوردوون، بە گەمژە و لاواز وەسفیکردن. نەغەدە بە بێباکی کەسێکەوە کە شتەکان وەک یەکن لای، گووتی « هەر پیاوە و بۆ ژنێکی تایبەتی باشە، هیچیان ئەو کەسە نەبوون بە کەڵکی من بێن. وادەزانم خودا ژن و پیاوی بە جۆرێک تێکەڵکردوە کە کەسمان ناتوانین ئەو کەسە بدۆزینەوە کە دەمانەوێت. ڕەنگە ئەو پیاوەی بۆ من دەبێت ئێستا لە جێگایەکی تر، لە دارستانەکانی ئەمەزۆن، یان لە قەراغ ئاوێک لە چین یان لە ژێر درەختێکدا لە ئەمریکا دانیشتبێت.. کێ چوزانێت؟». لیڤیتانت بێئەوەی پێبکەنێت، بە

مۆنی و گرژییەکەی خۆیەوە، گووتی «لەوانەشە من بم و ئێستا لە بەردەمتدا وەستابم». نەغەدە پاش کەمێک قسەکردن، گووتی «لیڤیتانت گەر دەتەوێت بمگریت، بمگرە، گەر ناشتەوێت بمگری برۆ و مەیەرەوە». بۆ یەکەمجار لیڤیتانت لە ژیانیدا وەک پیاوێکی جەنتڵ، وەک کەسێک کە هەوڵدەدات کولتوورێکی تر فێرببێت و خۆی لە هەندێک ڕەقی و دزێوی نێرانە پاکبکاتەوە، بە ئەسپایی سەرێکی بچوکی دانەواند و گووتی «نەغەدە خان، من ماوەیەکی زۆر درێژە بەدواتدا دەگەڕێم. یەک شتم مەبەستە، بتناسم. ئێستا تەنیا ئەوە نیازمە و هیچی ترم ناوێت». دەبێت بڵێم لەو چەند ساڵەدا کە من، دوور و نزیک چاوەدێری لیڤیتانتم دەکرد، زانیاریم لە سەر کۆدەکردەوە، شتێکم لە سەر نەبیستبوو پەیوەندی بە ئافرەتەوە هەبێت، وادەردەکەوت وەک ئەوەی ژنان بەشێک نەبن لە خولیاکانی، ئەو هەموو نامە دڵدارییەش کە زەوتیدەکرد و دەیخوێندنەوە، هیچ کات زۆر سوودی خراپی لێ نەدەبینین. هەندێک پیاو هەن بەرامبەر دونیا باشن، بەڵام بەرامبەر ژن بەدجنسترین مەخلوقن، هەندێکی دیش هەن بۆ دونیا درندەن، بەڵام بەرامبەر ژن بوونەوەری بەڕێز و ویقاردارن. لیڤیتانت لە جۆری دووەم بوو. کە بە خانمی ماردینی گووت دەمەوێت بتناسم، من باوەڕم پێکرد، دڵنیابووم دەیەوێت چۆن هەموو قوربانییە نێرەکانی خۆی بناسێت، هەمانشێوەش دەیەوێت لە ماردینی نزیک ببێتەوە... هەر لەیەکەم بینینەوە، جوانی تەلیسماوی خانم، خستییە دوودڵییەکی قووڵەوە، ئەو لەو ژنانەبوو کە حەزێکی نهێنی لە پیاودا دەڕوێنن تا بگەڕێن و ناخیان بپشکنن. ئەو ماوە زۆر درێژەش کە بەتەنها لەو ماڵەدا و لە تەک ئەو ژنە بێدەنگەدا دەژیا، هێندەی تر ئاڵۆز و تەماویی کردبوو، شتێک لە سێبەری ڕەش، کە سێبەری سەنگینی ژوورەکان بوو، سێبەری ژیان بوو کاتێک لە وێستگەیەکدا بە درێژیی دەوەستێت، سێبەری وجود بوو کاتێک تیشکی خۆی دەکشێنێتەوە، بە ڕوونی لە سەر سیمای بوو، ئەوە جۆرە

سیحرێکی پێبەخشیبوو، لە سیحری ماتی دەریا و لە ئەفسونی بێدەنگی ژێر ئاو دەچوو، ئەفسونێکی قووڵ کە هیچ کەس نازانێت بە دروستی لە کوێدا تەواودەبێت. لیڤیتانت هەستیکرد چاوانی ئەم ژنە، نهێنییەکیان تێدایە قووڵتر و نەگیراوتر لە هەموو ئەو نهێنییە بچوک و ناچیزانەی بە درێژایی ژیانی لە ناخی پیاوە دیلەکانی ئێرە دەریهێناوە، ئەو نهێنییە سادە و ڕوونشین و بێڕەگانەی هەندێجار چەند زللەیەک بەسە بۆ ئەوەی ئاشکرابن و خۆیان دەربخەن، بەس هیچ هێزێک نییە بتوانێت، نهێنی چاوی ئەم ژنە لە بنەوەڕا دەربهێنێت. لیڤیتانت کە لای خانم هاتەدەرێ، بیریکردەوە کە ئەو دەتوانێت نهێنی پیاوان بە لێدان و سزا و زۆر لە زار و دڵیان دەربهێنێت، بەڵام نهێنی ئافرەتان لە جێگایەکی قووڵتر و نادیارتردایە، نهێنی ئافرەتان لە شوێنێکی زۆر عاسیتردایە، لە جێگایەکدایە کە ئەو نازانێت کوێیە. هەستیکرد لە دەنگی نەغەدەدا، لەقسەیدا هەمیشە و هەمیشە شتێکی نەدرکاو دەمێنێتەوە کە بەو ناگیرێت. ئەو خۆی بە یەکەم ڕاوکەری نهێنییەکانی ناو دڵ و خەیاڵی ئینسان دەزانی، بەڵام ئەوە سەرسامیدەکرد کە مرۆڤەکان کەمجار نهێنی قووڵیان هەیە، کەمجار نهێنی زۆر گرنگیان هەیە... ئەو چەندین ساڵ بوو ئازاری خەڵکی دەدا، ئێستا گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە گەورەترین نهێنی ئینسان شتێکە هەمیشە لە خۆشی پەنهانە، زۆرجار لە کاتی لێداندا، ئینسانەکانی دەبینی شتێک لە ناخی خۆیاندا دەدۆزنەوە کە بەرهەمی ئەو ساتەیە، لە دۆزینەوەی ئەو چرکەیەیە، گوناهێکی نهێنییە کە نەیانکردوە، بەڵام قووڵ لە دەرونیاندا دەژی... ئێستا دڵنیابوو نەغەدەش نهێنییەکی تایبەتی هەیە، نهێنییەکی بێناو، نهێنییەک کە ڕەنگە شتێکی دیاریکراو نەبێت، بەڵکو وەک ماکی نەخۆشییەکی ترسناک وایە، کە لەوانەیە ببێتە دەرد و بیمارۆکییەکی قووڵ و لەوانەشە نەبێت... نهێنییەکە نە ئەم دەیزانێت و نە نەغەدە، بەڵام هەردووکیان دەزانن هەیە و لێرەیە و دەتوانێت بژین و ترسناک و کوشندەش

بێت. هەستیکرد بۆ ئەوەی بتوانێت لەم ژنە تێبگات دەبێت لە نزیکەوە لەگەڵیدا بژی و سەیریبکات. هەموو ژیان لەگەڵیدا بێت... رەنگە نهێنی هەرە گەورەی خودی ئەو رێگایە بێت کە پێیدا دەڕوات، ئەو ژیانە بێت کە تیا دەژی. نهێنی زۆرجار رازێک نییە کە لە دڵتدایە، بەڵکو تەواوی ئەو رێگایەیە کە لە نێوان لەدایکبوون و مردندا پیادەڕۆیت. لیڤیتانت ئەو رۆژە کە هات بۆ لام زۆر باسی مەرموزییەت و ئاڵۆزیی نەغەدە خانی کرد، من روو بە روو پێمگووت «جەنابی لیڤیتانت، هەندێک نهێنی بۆ ئەوەیە تەنیا تەماشایانبکەیت، هەندێک نهێنی نابنە موڵکی تۆ، نابنە موڵکی کەس. هەتاهەتایە موڵکی ئەو کەسە خۆیەتی کە لە ناویدا سەرهەڵدەدات، تۆ دەتوانیت ببینیت، بەڵام ناتوانیت تێیبگەیت، بیگریت، ناوی بنێیت و ئاشکرایبکەیت» . هەستمدەکرد خۆی ئەو راستییە لە من باشتر دەزانێت، بەڵام کە بەوجۆرە روونە لە زاری منەوە بیستی، رەنگی رەش داگەڕا و ژێر چەناگە و بەر گەرووی بە جۆرێکی سەیر شین بوونەوە... هەستمکرد تا ئەوساتە لیڤیتانت بەرامبەر هەر شتێک هەستی بە غوربەت کردبێت، بە هێز تێکیشکاندوە، بەڵام ئەمجارە ناتوانێت، دڵنیایە هیچ هێزێک لەو هێزانەی هەیەتی لە توانایدا نییە غوربەتی خۆی لەم خانمە بشکێنێت. ئیدی تێگەیشتم لیڤیتانت ناتوانێت لە کاریگەریی نهێنی ماردینی دەربازبێت. ماردینی بۆ ئەو هێزێکی نادیاربوو، کەسێک بوو وەک نزار هەستێکی گەورەی لاوازبوونی تێدا دەخولقاند، بەڵام وەک نزار نوێنەری لایەنە نێرینە و ترسناکەکەی جیهان نەبوو تا بیەوێت تێکی بشکێنێت، بەڵکو نوێنەری جۆرێکی تری نهێنییەکان بوو، کە تەنیا دەتوانێت لە نزیکییەوە بێت و لێیڕامبێنێت. دوکاندارەکەی هاوڕێی، ئەو پیرەی جارجار هەندێک حیکمەتی لێوەردەگرت، پێیگووتبوو هەندێک دوژمن هەیە، تەنیا بە خۆشەویستی دەتوانیت بیانبەزێنیت. لیڤیتانت لە بەردەم نەغەدە دا، بەر سنوورەکانی هێزی خۆی وەک جەلادێک کەوت. بەشی ئەوە زیرەک بوو بزانێت ئەو

سنوورانە سنووری ڕاستەقینەی هەر مرۆڤێکن بیەوێت لە ناسین و ڕۆچووندا دوور بۆ نێو ناخی ئەوانی دی بڕوات. کە دووەم جار چووەوە بۆ لای خانم ئارەزوویەکی ترسناکی هەبوو داگیریبکات، هەتا هەستیکرد کە ئارەزوویەکی نهێنی پاڵی پێوەدەنێت ئازاری بدات، بەڵام دڵنیابوو نهێنی ئەم ژنە شتێکە بە ئازاردان ئەستوورتر و داخراوتر دەردەکەوێت، قووڵتر دەچێتە بنەوە و بەدتر ڕوو لە تاریکی دەکات. بیریکردەوە کە لەوانەیە گەمژەیی شێرخان لەوەدا بووبێت کە ویستوێتی بە زۆر تەلیسمی بشکێنێت، ئەم خۆی گرت و بە هەمان ویقاری کۆنەوە، بەرامبەری دانیشت و گووتی کە ئەو دەتوانێت بیپارێزێت، چیتر پێویستی بەوە نییە خۆی بشارێتەوە، ئەو شتێکی تایبەتی لای دەوڵەتەوە لە سەر نییە. نەغەدە گەرچی دڵنیابوو لیڤیتانت هەموو شتێکی بە وردی لە سەر دەزانێت، پێیگووت کە ئەو بەتەنها خۆی لە دەوڵەت نەشاردۆتەوە، خۆی لە شۆڕشیش وندەکات و دەخوازێت کەس لەوانیش جێگای پێ نەزانن. گەر دەیەوێت چاکەیەکیشی لەگەڵ بکات، تەنیا داوای ئەوەیە ئاگاداری هۆشەنگی بولبولیار بێت و خراپەیەکی بەرامبەر نەکات، چونکە چەندین ساڵە ئەو پاراستوێتی و تاکە فریشتەیەکی ڕاستەقینەشە لە شارەکەدا. ئاخۆ بەڕاست خانم، گوزارەی تاکە فریشتەی بەکارهێناوە؟ نازانم. بەڵام من زۆر درەنگ هەندێک زانیاریم دەربارەی ئەو دانیشتن و گفتوگۆیانە وەرگرت و ئەو ڕستەیەش پەڕییەوە ناو قسەکانەوە، ئیدی چەندی ڕاستە و چەندی درۆ بەڵگەیەکی ڕاستەقینەم لەبەردەستدا نییە. هەستدەکەم هەر لە سەرەتاوە دەرکەوتنی ئەم جەلادە جوانە لە ژیانی نەغەدەدا مانایەکی تایبەتی هەبووە... هەست ناکەم خانم لە هیچ یەک لە ساتەوەختەکانی هاتن و ڕۆیشتنی لیڤیتانتدا هەستی بەترس یان ناڕەحەتی کردبێت، پێدەچێت بەرامبەر دەرکەوتن و ونبوونەکانی بێباک بووبێت. پێدەچێت جوانی لیڤیتانت ئەفسونی لێکردبێت، بەڵام ساڵانێک دواتر خانم خۆی پێیگوتم «سەرەتا تەنیا وەک تارماییەک دەهاتە بەرچاوم

کە خەیاڵ و خولیا و تەنهایی دروستیکردبێت». پیاوێک بوو لەو پیاوە جوان و ترسناک و بێڕەحمانەی تەنیا ژنانی شاعیر دەتوانن تێیانبگەن. پێدەچێت ماوەیەک وەها بووبێت، لیڤیتانت ڕۆژانە سەری خانمی دابێت، لەو ژوورە تاریکەدا چی لە نێوان لیڤیتانت و ماردینیدا ڕوویداوە؟ نازانم. ساڵانێکی درێژ هەوڵی ئەوەمدا تێبگەم کە دەبێت ئەو دوو بوونەوەرە سەیرە، ئەو پیاوە جەلادە و ئەو ژنە شاعیرە بێباکە باسی چییان کردبێت؟ بەڵام شتێکی ئەوتۆم دەست نەکەوت. خانمی ماردینی جارێک پێیگوتم «جەنگیز ئەوەندە دوای ئەو شتانە مەکەوە، شتێکی گرنگ ڕووی نەداوە لە نێوانماندا... تەنیا ئەو کارەمان دەکرد کە تەنیا ئیشی باشە ژن و پیاو بتوانن پێکەوە بیکەن، دواتر هەندێک قسەی گشتیمان دەکرد. بزانە ژن و پیاو دوو مەخلوقن هیچکات ناتوانن بە باشی پێکەوە قسەبکەن.. هیچکات». دوای ماوەیەک زانیم کە نەغەدە ماردینی سکی بە منداڵێکی لیڤیتانت پڕە.

# فریشتەیەکی تر

نەغەدە ماردینی و ئەو خانمەی کە لەگەڵیدا دەژیا، هەموو شتێکیان لە هۆشەنگی بولبولیار شاردەوە.

تا خانم سکی تەواو بەرزنەبووەوە، بە جۆرێک ئیدی نەدەکرا لە چاوی کەس بیشارنەوە، هۆشەنگی بەستەزمان و بێخەبەر هیچی نەبیست. چیرۆکەکە زۆر سەرسام و تووڕەیکرد. دەبێت بزانن بولبولیار لەگەڵ هەموو قووڵی و هێمنی خۆیدا، ساتی هەبوو بە چەشنێک مووی هەڵدەستا و دەماری ئەستووردەبوو کە مەپرسن، بەڵام ئەوجۆرە ساتانەی گەلێک ناوازە و دەگمەن بوون. ڕۆژێک نەغەدە بەرامبەری دانیشت و چیرۆکی

پەیوەندی نهێنی خۆی و لیڤیتانتی بۆ ئاشکراکرد. ئەو خۆی نەگرت و وەک کەسێک ئاگر لە ماڵی بەربووبێت، بێئۆقرە و بە هاوار گووتی کاری وا درۆیە و تۆ دەتەوێت فریوم بدەیت. بەڵام دواجار کاتێک دڵنیابوو هەموو شتێک ڕاستە و منداڵێکی ڕەشمارا «ئەوکات هێدی هێدی لە شاردا لیڤیتانتیان بەوجۆرە ناودەنا » لە سکی نەغەدە دایە، وەک لە بێمانایی ئەم دونیایە تێنەگات و هەموو شت لەدەوری ڕوخابن، پێیگووت «تۆ خانم ، پێمبڵێ چ شاعیرەیەکیت... بە هەر شتێک کە باوەڕت پێیەتی سوێندم بۆ بخۆ و تێمبگەێنە، چۆن شاعیرەیەکی وەک تۆ لەگەڵ جەلادێکی وەهادا دەخەویت، چۆن وەها بێباک منداڵێکی ئەو لە زگتدا هەڵدەگریت، چۆن ئادەمییەکی وەها دڕندە ماچدەکەیت و بێباکیش شیعر دەنوسیت... تێمبگەێنە؟».

نەغەدە هیچی نەگووت جگە لەوەی بە ساردییەوە بڵێت کە دەیەوێت شوو بە لیڤیتانت بکات و هیچ کەسێک جگە لەو بۆی نییە بڕیار لە چارەنوسی خۆی و منداڵەکەی بدات، تەنیا شتێکیش لەوی دەوێت، بڕوات و جارێکی تر دکتۆر شوکاک بدۆزێتەوە و تکای لێبکات بێت و بەڕەسمی تەلاقی بدات.

فیکرەی شووکردن، بیرۆکەیەکی شێتانەی لیڤیتانت خۆی بوو. ئێوارەیەک هاتە لای من و بە دەنگێکی جیدی و بە چاوێکەوە یەقینی لێدەباری، گووتی «دەمەوێت نەغەدە ماردینی بهێنم... گەر بڕیار بێت هەموو پیاوێک ژن بهێنێت. من دەمەوێت ئەو ژنم بێت». کە وای گووت دەمودەست خەیاڵ منی بردەوە پسمامان، بۆ ڕۆژێک من و ئەو پێکەوە چووین بۆ بینینی ژووری ئەشکەنجەدان، لە ڕێگا بە منی گووت «هەرکات دەستمان بە سەر جەستەی کەسێکدا گرت، درەنگ یان زوو دەتوانین دەست بە سەر ڕۆحیشیدا بگرین». من وەک بروسکەیەک لێمبدات خەریک بوو بکەوم، هەستمکرد هەمیشە سووڕی ساڵەکان لە

جێگایەکی نادیاردا یەکدەگرێتەوە و زەمەن ئێجگار بێ مەنتیق نییە وەک یەکەمجار دیارە و دەردەکەوێت. من دەمودەست ئەم پەیوەندییەی نەغەدەم لەگەڵ لیڤیتانتدا وەک شێتی هاتە بەرچاو. دڵنیابووم کەسیان ئەوی دی خۆش ناوێت، لە ڕاستیدا دوودڵ بووم لەوەی کە کەسیان هەر لە بنەڕەتدا توانای خۆشەویستی هەبێت... بەڵام بە سەرێکی دی بڕیاری هاوسەرگیرییەکەم بۆ ئەو یەقینە قووڵە گێڕایەوە کە هەردووکیان دەزانن تا مردن ناتوانن عاشق بن. من دەمزانی تەنیا ئەو ژن و مێردانە دەتوانن ژیانێکی هێمن و بێکێشە ببەنەسەر کە دەمێک پەیمانی هاوسەرگیری واژۆدەکەن، دڵنیان توانای خۆشەویستیان بۆ ئەبەد تێدا مردوە. خێزانە هێمن و بێسرکە و چرکەکان، ئەو خێزانانەن کە عاشقیان تێدا نییە. دەڵێن لە یەکێ لەجارەکاندا خانم بە لیڤیتانتی گوتووە «عومەر دەبێت بزانیت کە من خۆشم ناوێیت، تەنیا مەرجیشم بۆ ئەم هاوسەرگیرییە ئەوەیە، کە هیچ کات داوای خۆشەویستیم لێ نەکەیت... من نە زێڕم دەوێت، نە زەوی و نە ماڵ، نە هیچ شتێک، یەک شت کە دەبێت قەبووڵی بکەیت ئەوەیە کە هەرگیز لێم نەپرسی تۆم خۆشدەوێت یاخود نا». دەڵێن لیڤیتانت بێئەوەی ئەو مەرجە بە قورس وەربگرێت، دەستی خستۆتە سەر دەستی نەغەدە و گووتوویێتی «بۆ ئەوەی ژن و مێردێکی باش بین، پێویستیمان بە خۆشەویستی نییە، بەڵکو پێویستیمان بە دوو دڵی ڕەق هەیە». نەغەدە پێشتر لەگەڵ دکتۆردا ژیانی هاوسەرگیریی و ڕۆژە پڕ لە وەڕزییەکانی ژن و مێردایەتی تاقیکردبووەوە، ئەو هاوسەرگیرییەی کە دەبێت هەردوو تەرەف خۆیان عاشق دەربخەن، خۆیان وەک ژن و مێردێکی بەختیار نیشانبدەن، ئەو ژیانەی کە نمایشێکی بەردەوامە، ژن تێیدا ئەکتەرە و پیاو تێیدا ئەکتەرێکی بەدتر. لەگەڵ نزاریشدا ئەو پیاوانەی تاقیکردبووەوە کە تەنیا حەزدەکەن ئافرەت گەورەیی خۆیان و جوانی خۆیان بۆ دەربخاتەوە، نزار نمونەی ئەو کوڕانە بوو کە تەنیا

دەیانەوێت ئازایی و جوانی و ئازادی خۆیان بژین، ئەوانەی ژن تەنیا ئاوێنەیەکە لەلایان لەبەریدا دەوەستن و سەیری خۆیان دەکەن... بەڵام بۆ ئەم گرنگ نەبوو نزار چییە، دەستی نزار بۆ ئەو دەستی ئەو منداڵە نەسرەوتە بوو کە دەرگای قەفەز لە باڵندەیەکی دیلدەکاتەوە، هەڵبەت بۆ باڵندەکە گرنگ نییە، ئەو دەستە کێ بووە و بە چ نیازێک دەرگای قەفەزەکەی کردۆتەوە، گرنگ ئەوە بوو بفڕێت، هەتا گەر دونیای دەرەوەی قەفەزیش هەمووی داو و تەپکە و مردن بێت. لەگەڵ شێخ جافەرانیشدا ئەو پیاوانەی ناسیبوو کە بە جۆرێکی ڕۆمانسی عاشق دەبن، بەڵام هیچ خۆشەویستییەک ڕێگای ئەوەیان لێ ناگرێت دوای خەونی خۆیان بکەون، ژنیان خۆشدەوێت، بەڵام ژن ناتوانێت خواستی سوارچاکی و ویستی بەرەڵابوون و سەفەر و سەرکێشیان تێدا بکوژێت، عاشق دەبن، بەڵام هیچ کاتماڵی نابن، هەمیشەش چاوەڕوانن چەند بۆ دوور بڕۆن، مەعشوقەیان وەک شەیدایەکی ئەبەدی، وەک کۆپییەکی نوێی پێنۆلۆپە لە ماڵ چاوەڕوانیانبکات. لەگەڵ شێرخاندا ئەو پیاوە قێزەونە دڕندانەشی ناسیبوو کە جگە لە جانەوەرێکی بەئالۆش هیچی تر نین، ئەوانەی بە ددان و چڕنوک و قەپ بە ژنەوە دەنوسێن و بە هەر نرخێک بووە دەیانەوێت داگیریبکەن، هەندێجار دڵێکی نەخۆشن و هەندێجاریش ناوگەڵێکی سامناک و بۆندار و لەشبخۆر... ئەوانە چەشنە پیاوێکن کە لەشی ژن لەلایان شوێنی ئەتککردنی هەموو ژیانە.

ئێستا ویقاری لیڤیتانت، هەیئەتە سەربازییەکەی، توندییەکەی، ئەو یەقینە تاریکەی لە چاویدا بوو، لە سەرو هەموو شتێکیشەوە جوانییە ئەفسوناوییەکەی وایاندەکرد بیەوێت لەگەڵیدا بژی. شتێک لە بێباکی قووڵ دەیبرد بەرەو ئەو، هەستیدەکرد ئەویش بەرامبەر زۆر شت بێباکە. بەڵام ئاخۆ لە ڕاستیدا پیاوێکی تەواو بێباک لە سەر زەوی هەیە؟ نا زەوی ژنانی بێباکی زۆرترە، پیاوان هەمیشە ئامانج و نیازێکی تایبەتی و

دوورتریان هەیە. لیڤیتانت توانای بێباکی تێدا بوو، بەڵام توانای بێباکی ڕەها، تەنیا لە شاعیراندا هەیە... شاعیران کاتێک لە ناوەوە دەمرن.

لیڤیتانت پێیگووت «دەتهێنم، لە بەرئەوەی هیچ ڕێگایەکی ترم نییە». ئەو هەستیدەکرد بەوە تۆڵە لە هەموو دونیا دەکاتەوە، تۆڵە لە نزار دەکاتەوە، لە دکتۆر مستەفا شوکاک، لە شۆڕش، لە شیعر، لە تەنهایی. ئەو شەوەی هۆشەنگی بولبولیار چوو بۆ یانەی پزیشکان و لەوێوە گەشتی ئەو بەرەو کەشتیی فریشتەکان کەوتەڕێ، تکایەکی خانمی ماردینی پێبوو تا بە هێمنی تەڵاقیبدات و لەگەڵ لیڤیتانتدا خۆی تووشی چەرمەسەری تازە نەکات. بەڵام دەستی لیڤیتانت لەوە درێژتر بوو، بۆ کاری لەوجۆرە پێویستی بە ڕەزامەندی دکتۆر هەبێت. لیڤیتانت لە دادگا هەموو کاروباری تەڵاقدانی خانمی لە دکتۆر جێبەجێکرد، کە چەندین ساڵ بوو تا ئەو کات بە هەڵواسراوی مابووەوە. لیڤیتانت هەموو شتێکی بە ڕێگایەکی ناشەرعی، بە کۆمەکی حاکمە ترسنۆکەکانی دادگا، بەزەبری هەندێک زللە و بە کاری هەندێک هەڕەشە ڕێکخست. بەر لەوەی تەواو ببنە ژن و مێرد، نەغەدە وەرەقەیەکی سێ مەرجی خستە پاڵ عەقدە نوسراوەکە و بە لیڤیتانتی مۆرکرد. سێ مەرجی گرنگی لێداواکرد، یەکەم هەمیشە لە ماڵەکەدا ژوورێکی گەورە و تایبەتی خۆی هەبێت، کە هیچ کات لیڤیتانت بۆی نەبێت بچێتە ئەوێ. دووەم قەت ڕێگای نوسینی شیعر و کۆبوونەوەی لەگەڵ شاعیرانی دیدا لێ نەگرێت. سێیەم هەر وەختێک لیڤیتانت لەگەڵ هەر ژنێکی تردا خەوت پێی بڵێت. لیڤیتانت هەر سێ مەرجەکەی قەبووڵکرد.

من و زۆر کەسانی تر هۆی ئەو ڕێکەوتنەمان گێڕایەوە بۆ ماندوویێتی خانمی ماردینی کە چەند ساڵ بوو لەو ژوورەدا ژیانێکی بێمانا دەژیا. تا مرۆڤ چەندە خۆگر و بێباک بێت، دواجار گیران و گۆشەگیری درێژ وادەکەن بە هەر نرخێک بووە بەدوای ئازادیدا بگەڕێت. لیڤیتانتیش

بەر لە هەر شتێک ئازادیی پێشکەش بە خانم دەکرد... دەیتوانی بێتەوەدەرێ و بێترس بە شاردا بگەڕێت و ژیانێکی نوێ، لە خاڵێکی دییەوە دەست پێبکاتەوە.

بەڵام بولبولیار ئەوجۆرە ڕاڤەکاری و تەفسیرەی پێ قەبووڵ نەبوو. ئەو کەم و زۆر لە پەیوەندی پیاوێکی هێزدار و ئەشکەنجەبازی وەک لیڤیتانت بە ژنێکی شاعیری وەک خانمەوە، تێنەدەگەیشت. شەوێک بەر لە واژۆکردنی پەیمانەکە، بولبولیار شێتانە سوێندی بۆ نەغەدە خوارد کە دەتوانێت ڕزگاریبکات، دەتوانێت لە جێگای عاسیتردا بیشارێتەوە، بینێرێت بۆ ئێران، ئامادەیە هەموو شتێکی بۆبکات، چونکە نایەوێت شوو بە پیاوێکی وا دڵڕەق بکات... ئەو هەموو ئیشکەی بە بێمانا وەسفکرد، شتەکانی ژوورەکەی شکاند، بە جۆرێکی وەها توڕەبوو نەغەدە چەندین جار سەرسامانە لێیپرسی «هۆشەنگ... هێی... بوەستە، تۆ وا قسەدەکەیت وەک عاشقم بیت... تۆ حەزت لێم کردوە یان چی؟ گەر حەزت لێم کردوە بیڵێ». بولبولیار هەزار سوێندی بۆ خوارد کە عاشقی نییە، کە خوێنەرێکی شیعرەکانێتی، نایەوێت شاعیرەیەک هەروا ئاسان بڕوات و لەگەڵ کەسێکدا بژی کە هەر لە بنەوەڕا نازانێت شیعر چییە، دوژمنی شیعرە، ڕقی لە شاعیرانە، کتێب دەسووتێنێت، نامەی دڵداری داگیردەکات، بە پۆستاڵەوە دەچێتە سەر سەری خەڵک، فریشتەیەکی وەک مستەفا شوکاکی ئەشکەنجەداوە، بە پارە خەڵک دەگرێت و بە پارە ئازادیاندەکات. ئینجا گووتی «دەبێت لە هاوسەرگیریی تۆ و ئەودا چی منداڵێک لەدایک بێت، تەنیا بە عەقڵ بیری لێبکەرەوە، چۆن منداڵی دزێک و ئەشکەنجەچییەک و گوناهبارێک لە زگتدا هەڵدەگریت... چۆن؟ بە عەقڵ بیری لێبکەرەوە». وەڵامەکەی نەغەدە، ئەو وەڵامە ڕۆمانسییە قووڵە نەبوو کە دەشێت ژنێکی شاعیر بیداتەوە، ئەو گووتی «هۆشەنگ ئاغا، ئەوەی من شاعیرم مانای ئەوە نییە دەتوانم بەوجۆرە بم کە

خەڵکی لە شاعیرانیان دەوێت. من هەر لە بەرئەوە شووی پێدەکەم، چونکێ دەمەوێت لەگەڵ کەسێکدا بژیم لە خۆم نەچێت، من وەک ژن بوونەوەرێکم و وەک شاعیر بوونەوەرێکی تر، ناوەکەم وەک شاعیر ژیانی خۆی هەیە و منیش وەک مرۆڤ ژیانێکی تر... ئارەزوومە لەگەڵ مرۆڤێکدا بژیم هیچ لە خۆم نەچێت و تەواو. کەسێک لە هیچ کەس نەچێت، کەسێک کە تایبەتییە. من زۆر ئەوەم لا گرنگ نییە ڕەشمارا پیاوێکی شەڕانییە، خۆفرۆشە یاخود چییە، بەراستیمە هۆشەنگ، ئەو لەگەڵ مندا دەموچاوێکی دی هەیە، تۆ چی لە پیاو دەزانیت؟ ها چی لە پیاو دەزانیت؟... پیاوان ئێوە هەمووتان لە بەردەم دونیادا دەموچاوێکتان هەیە و لە بەردەم ئەو ژنانەشدا کە خۆشتاندەوێن دەموچاوێکی تر. بۆ ژنیش ئەو دەموچاوەی تر گرنگە... تەنیا ئەو دەموچاوەی تر و هیچی تر... ئاغا تووڕەم مەکە... تێدەگەیت، بێزارم مەکە لە خۆت... من لە نزیکی ئەوەوە دەتوانم بە ئارەزووی خۆم بێباک بم. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە تێبگەیت زۆرجار ژن بێ هیچ بەهانەیەک، بێ هیچ هۆیەک شوودەکات، بێئەوەی بیەوێت بزانێت بۆ؟ شوو هەتا خراپترینیشیان دەستکەوتێکە بۆ ژن، دەبێت تێمبگەیت. من قەت ئەو ژنە عاقڵەش نیم کە تۆ چاوەڕوانیدەکەیت، ئەو کچە بچوکە شەرمنە نیم کە دکتۆر جەلالی باوکم دەیوست، نازادارەکەی دایە و بابە، نا هەمیشە لە خێزان و خانەوادە بەقین بووم. هەر لە سەرەتاوە ناتوانم بە عەقڵ بیربکەمەوە... کەسێکیش نەیتوانی بە عەقڵ بیربکاتەوە، نەشیتوانی شێت بێت، دەبێت بە شاعیر. هیچ هۆیەک نییە بۆ شاعیرییەتی من ئەوە نەبێت کە نە عاقڵم و نە شێت. شاعیرییەت هەرێمێکە بۆ ئەوانە کراوە کە نەدەتوانن شێتبن و نەدەتوانن فامیدە و ژیر، من لەوێم، هۆشەنگ گیان. بۆیە ئەوەی تۆ لە منی داوادەکەیت لە مندا نییە... عەقڵ؟. من لیڤیتانتم بۆیە هەڵبژاردوە چونکە عەقڵ پێمدەڵێت هەڵی مەبژێرە، گەر عەقڵ

بیوتایە هەڵیبژێرە، یەکسەر بەر نەفرەتم دەدا. من ژنێکی عینادم لەگەڵ خۆمدا، ئافرەتێکم نامەوێت گوێ لە خۆم بگرم... من ژنێکی وەهام».

بولبولیار بەردەوام بە خانمی شاعیر بانگیدەکرد، پێیگووت « خانمی شاعیر، وامەڵێ، بەخودا تۆ شێتێکی تەواویت. تا نەکەوتبوویتە سەر خولیای شوو بە ڕەشمارای جەلاد نەمدەگووت شێتی، ئەسڵەن بیرم لەوە نەدەکردەوە بۆ لە دکتۆری مێردت هەڵهاتی، بۆ نزارت هەڵبژارد. هەموویان هیچ بوون بۆ من... سەدجار لە خۆمم پرسیوە بۆ خەڵکانی دی نرخێکی وەها گەورە دەخەنە سەر ئەم شتە تایبەتیانە، بە من چی... من دواجار چیم، خوێنەرێکی شیعرم. گەر زۆر بەرز بمنرخێنی دەڵێیت مرۆڤ دۆستێکم، کەسێکم باوەڕم بە توندوتیژی نییە. بە من چی؟... ها بە من چی ؟ تۆ هەرچییەک بکەیت. بەس ئەمەیان شێتییە. من پێتدەڵێم هەزار ڕێگای تر هەیە مرۆڤ شێتێتی خۆی تیا تاقیبکاتەوە. تۆ لە سەر هەقی چۆن شێتێتی خۆت دەژیت، بەڵام لە سەر هەق نیت ئەو شێتییە بتخاتە باوەشی پیاوێکی وەها دڕندەوە. ژنی پیاوێکی درندە، وردە وردە ئەویش دەبێتە دڕندە... خانمی شاعیر... لەوە دەترسم. دەبێت بزانیت، زۆرجار خوێنەرانی شیعر، پتر لە شاعیران خۆیان غەمی پاکی ئەو مەخلوقەیانە، دەزانم ئەوە گەمژەییە، دەزانم زوڵمە و بێمانایە، بەڵام وایە. مرۆڤ لە شێتێتیدا ئازادە... من بێنەوەی زۆر بیربکەمەوە، یان زۆر ڕابمێنم دەتوانم ئازادیی شێتێتی وەک شتێکی پیرۆز تەماشابکەم. هیچ شتێک لە ئازادیی شێتی لە سەر زەوی جوانتر نییە. خانمی شاعیرم، باوەڕت بێت ئازادیی هەرگیز ناگاتە کەماڵ گەر نەبێت بە هاودەمی شێتی. بەس تۆ بە ڕێگایەکی تردا دەڕۆیت. ئازادیی شێتی نابێت بگاتە ئەوەی تۆ بکات بە ژنی جەلادێک».

خانمی ماردینی بۆ یەکەمجار قاقا پێدەکەنی و دەیگووت «دەبینی، ئاغا گیان. ناسینی تۆ چ سوودێکی باشی بۆ من هەیە. ها خۆت

هەموو هەقێکت دایە من... ئازادیی شێتی، ئازادیی بێباکی، ئازادیی بێمانایی. ژیانی شاعیر لە چی پێکدێت؟ لەوجۆرە ئازادیانە. چەندە خۆشحاڵم بەوە دوورم دەخەیتەوە لە ئازادیی سیاسی، کە تۆ و هاوڕێکانت ساڵانێکە منتان پێخنکاندوە. هەقمە ئازادییەک هەڵبژێرم کە خۆم دەمەوێت. ئازادیی ئەوەی ئینسان بە جێگای وادا بڕوات کە عەقڵ دەستی بۆ نەبردوە، ئەم ڕەشمارا گەمژەیەش کە دەبێتە مێردم لەوانەیە. بابزانی، لە هەموو شت بێزارم، دەمەوێت ئەوەی لە عومرم ماوە لەگەڵ پیاوێکی ئەحمەقدا بیبەمەسەر، بەس ئەحمەقێکی وا نا خەڵک حورمەتی نەزانن. ئاه، خەڵوەتی ئەم ژوورە بۆ من زۆر باش بوو، خۆشبەختم کە عومەر تەنیا خەیاڵ و خولیا نییە، ئێستا هەستدەکەم گەیشتووم بەو شتەی کە بۆی دەگەڕێم... ئازادیی شێتی... بەپێی ئەو ئازادییە چ شتێک لەوە جوانترە بێباکی شاعیر و بێباکی جەلاد پێکەوە لە سەر سفرەیەک کۆببنەوە، پێکەوە نانبخۆن، ئەو باوەڕی بە هیچ نییە جگە لە ئازاردان و منیش باوەرم بە هیچ نییە جگە لە بێباکی... پێکەوە دونیا دروستدەکەین، ئەو سەیری من دەکات و لە دونیای خۆیدا دەبێت، منیش سەیریدەکەم و لە دونیای خۆمدا دەبم... پێکەوە، ئەو هێزێکی گەمژە و من زیرەکییەکی بێباک، ئەو دوو ڕەگەزە گەورەیەی ئەم میللەتە گێژەی ئێمەی ڕاگرتووە... هێزی گەمژەکان و زیرەکی بێباکەکان، ئەوە دوو تەنیا شتێکن دەتوانن بێفەم لە ناو ئەم میللەتەی من و تۆدا بژین. ئەو شتەکان دەشکێنێت و منیش بەساردی سەیریدەکەم، من و ئەو، گەمژەیی هێز و ساردوسڕی عەقڵ... هووشە گیان... دەمەوێت بیسەلمێنم کە هەموومان، کە تۆش، کە ئەوانی تریش، شۆڕشگێڕەکانی برادەرت، ئەوانیش بە ئاسانی دەتوانین لە نزیک جەلادەوە بخەوین و خەویشمان نەزڕێت، دانەچڵەکێین. وای ڕەشمارا وەهاش ترسناک نییە. سەردەمێک دێت هەموومان لە باوەشی جەلاد دا دەخەوین و ئاسوودەشین،

پێیاندەڵێین جەلادە جوانەکان توند لە باوەشمان بگرن. عەزیزم، من دکتۆر شوکاکم بینی، نزارم بینی، خەڵکانێکی تریشم بینی. بەڵام دڵنیاتدەکەمەوە عومەر مەخلوقێکی وەها تایبەتی نییە، گەر جەلادیش نەبێت خەڵک بە جۆرێکی تر ئازاری یەکتر دەدەن. جاری وا هەیە گەر تۆ حەزت لە کچێک بێت و ئەو بڵێ نا، نەخێر کاک هۆشەنگ گیان، من تۆم ناوێت، ژانی ئەو قسەیە لە ژانی زللەی سەد جەلاد ناخۆشترە. عومەریش هەر بەقەد من ترسناکە... نا تۆ ناڵێم... تۆ فریشتەیت. قەت پیاوی فریشتەئاسا بە کەڵکی من نایەن، من خۆم دەناسم. بەس نییە حەزت لێ نەکردوم، چونکە جگە لەوەی خۆت ئازارت دەبوو، هیچی دیت لە من چنگ نەدەکەوت، گەر حەزت لێم بووایە وەک حەیوانێکی دڕ ئازارم دەدایت، سوپاسی خوا بکە کە عاشقی کەسی وانیت. بولبولیار واز لەوە بهێنە شیعر پاک سەیربکەیت. من لەوانەم هەر لە لەدایکبوونمەوە باوەڕم بە چاکە و خراپە نییە. ئاه، مرۆڤی چاک؟ مرۆڤی چاک؟ کامەیە مرۆڤی چاک... لەوانەیە لە ڕابوردوودا سەردەمێک بووبێت مرۆڤی چاک هەبووبێت، بەڵام ئەم سەردەمە نییە. بەس من دڵنیاتدەکەمەوە عومەر لە نزار یان لە شێرخان یان لە هەر کەسی تر جانەوەرتر نییە، هێند هەیە ئاڵۆزترە، ونترە، زۆرجار گەمژەتر و بەستەزمانتریشە. ئەوانەی وەکو ئەو خۆیان دەکەن بە دوژمنی خەڵک، زۆربەی جار بەستەزمان و گەمژەن کە دونیایان ڕاست بۆ ناخوێنرێتەوە. ئەوەی من لە عومەردا حەزم لێیە، ئەوەیە کە جگە لەوەی بە غەریزەی خۆی شت دەشکێنێت و شت دروستدەکات هیچی تر نازانێت... باوەڕی بە هیچی گەورە نییە... کە لە یەکێک دەدات لە بەرئەوە نییە بە دوژمنی دەزانێت، بەڵکو لە بەرئەوەیە دڵنیا بێت خۆی بەهێزترە، خودایە کە گەمژەیەکی جوانە. تۆ ژن نایناسیت، هۆشە تۆ هیچ لە سەر ژن نازانیت... هەندێکمان حەزمان لەوەیە لەگەڵ گەمژەیەکی جواندا بژین... تۆ چی لە ڕۆحی ژن

دەزانیت؟ هیچ... هیچ. ئەو ئیش بۆ خۆی دەکات، ڕەشمارا نە ئیش بۆ شەیتان نە بۆ فریشتە ناکات... نە بۆ دەوڵەت و نە بۆ شۆڕش. واهەستدەکەم ئینسانی ڕاستەقینەش بەوجۆرەیە. ئیش بۆ هیچ دینێک و هیچ مەزهەبێک ناکات... تەنیا غایەتی هێزی خۆیەتی. هۆشەنگ گیان، کوڕی باش، عومەر پێشەنگی ئەو پیاوانەیە کە سبەینێ هەموو شتێک دەگرنە دەست، بۆ ژنێکی بێباکی وەک من کە دەمەوێت هەموو شتێ تاقیبکەمەوە و ناشمەوێت بە دەست ژیانەوە ماندووبم، ئەو لە هەر کەس چاکترە... دەمەوێت ژنێکی ئازاد بم کە مێردێکی بەهێزی گەمژەی هەیە، کە هەموو شتێکی بۆ ساز و تەیار دەکات، مێردێکی وات بۆ من هەیە؟ گەر هەتە بیهێنە بیبینم».

ئەو ڕۆژەی پەیمانی هاوسەرییان مۆرکرد، سکی نەغەدە چوار مانگ دەبوو. هەر ئەو ڕۆژە بێپرسی دکتۆر جەلال، بێ ئامادەبوونی هیچ کەس لە خێزانی نەغەدە، لەناو نەفرەت و تووڕەیی ئەوا ماردینیدا «کە پێی وابوو ئەم شووەی خوشکەکەی هێندەی تر شانسی ئەو بە لیتە و قوڕاوی بەدبەختیدا دەبات» بێ زەماوەندێکی بچوک یان گەورە «چونکی حاڵی سکی بوکێ ڕێگای بە ئاهەنگێکی وا نەدەدا»، نەغەدەیان گواستەوە بۆ ئەو کۆشکە تازەیەی ماڵی لیڤیتانت کە دواتر بوو بە جێ بناغەی ئەو بورجە گەورەیەی ئەمڕۆ.

ئەوەی گرنگە بۆ چیرۆکەکەی ئێمە ئەوەیە، هەفتەیەک بەر لە زەماوەندەکەی خانم، هۆشەنگی بولبولیار بە مەبەستی دوا هەوڵی پەشیمانکردنەوە، چووە دیداری خانم... بەڵام سەری لەو باڵە گەورە و عاجباتیانە سوڕما کە لە ناکاو لە پشتی خانمەوە دەرچووبوون... بینینی لە ناکاوی ئەو باڵە گەورانە بولبولیاری حەپەساند... بە جۆرێکی گەورە زاریکردەوە و هاواریکرد «نەغەدە دەیبینیت؟؟». خانم هیچ شتێکی نەدەبینی... خانم بێئاگا بوو لەوەی فریشتەکەی ناو ڕۆحی

خەریکە جێیدەهێڵێت. بێئاگابوو لە باڵەکانی خۆی، بێئاگابوو لەوەی لە پشتییەوە دوو باڵی سپی و زەبەلاح و بەفرین سەرکەوتوون و خەریکە دەگەنە نزیک سەقفی ژوورەکەی. وای چ ساتێکی سەیر و پڕ سەرسامی بوو بۆ بولبولیار، کە ئەو کات ماوەیەک بوو ڕۆژانە دەچوو بۆ کەشتیی فریشتەکان.

## دەمێك كە فریشتەیەك شێت دەبێت

ئەوانەی کە باڵەکانیان سەر شانیان قورس دەکات و ئازاریان دەدات، زۆر کەمن. کەمن ئەو ئادەمیزادانەی باڵەکانیان وەها قورس دەبێت، نەتوانن هەڵیبگرن، من یەکێک بووم لەوانە. هیچ شتێک لەوە بەدبەختانەتر نییە گەر مرۆڤ بزانێت بە جووتێک باڵی نەبینراو و قورسەوە بە سەر زەویدا دەڕوات. لەگەڵ دەرکەوتنی باڵەکانم، هێدی هێدی مووی سەریشم بەتوندی کەوتنە وەرین. ئەو کات بە جۆرێکی کوێرانە لە ژیانی حیزبییدا نوقمبووم، لەو تەختە دارە دەچووم کە شۆڕش چی بوییستایە لێی دروستدەکردم. شەو و ڕۆژ نوقمی کۆبوونەوەی سەیر و نهێنی بووم، هەندێ لە پیاوانی دەوڵەت پشی پشیان بۆ دەکردم، تا لە دەست شۆڕش بیانپارێزم و هەندێک لە پیاوانی شۆڕشیش هەمان شتیان دەکرد تا لە دەوڵەت بیانپارێزم. لە هەردوولاوە دڵم رادەگیرا و دیاریم پێدەدرا. دوای هەر کۆبوونەوەیەک، دوای هەر ڕفاندنێک، دوای هەر کوشتنێک... باڵەکانم قورستر دەبوون، سەرم پتر دەڕووتایەوە، چاوم مۆنییەکی قووڵتری لە سەر دەنیشت، ڕوومەتم چرچتر و کیفی پێش چاوم گەورەتر دەبوو. چیتر هیچم لەو گەنجە باریکە نەدەچوو کە لە ساڵی حەفتا و چواردا پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کرد، ئێستا وردە

وردە خـواردن و خواردنـەوەی زۆر ورگێکـی تایبەتیـان بـۆ دروسـتکردبووم کـە سـەرۆک «خوالێیخـۆش بێـت» نـاوی نابـوو «ورگـی شۆڕشـگێڕانە». قورسـایی باڵەکانـم، ڕۆیشـتنیان خـاو کردبوومـەوە، هەنـگاوم کورتتـر و لاکردنـەوەم تـا دەهـات سـەختتر دەبـوو. لـە نێـوان کۆمەڵێـک شـوێن و جیهانـی جیاوازدا لەتبووبووم. هەندێک هەفتـە، سـەرەتا لای سـەرۆک و لـە کـن ئەندامانـی دەفتـەری سیاسـی خۆمـان پشـوومدەدا و میـوان دەبـووم، بـەڵام کۆتاییەکـەی لەگـەڵ ئەفسـەرە عەرەبـەکان و بەرپرسـانی ڕێکخـراوی باکـووری بەعسـدا دەمخـواردەوە و مەسـتدەبووم. وای لێهـات بـە فەرمانـی سەرۆکەکانم، لـە سـەرۆک عەشرەتەکان نزیـک دەبوومـەوە و پێمدەگووتن کە حیـزب ڕێنماییانـدەکات لـە دەوڵـەت نزیـک ببنـەوە و پەیوەنـدی پێوەبکـەن و فەوجـی بـۆ دابمەزرێنـن. وەک نوێنـەری تایبەتـی جەنابـی سـەرۆک بـە قاتێکـی شـینباوەوە، دەچوومـە کـن سەرعەشـرەت و بـن عەشـرەتەکان و پێمدەگووتـن، جەنابـی سـەرۆک دەیەوێـت لـە ژێـر چاوەدێـری و ڕەحمەتـی ئـەودا بچنـە ڕیـزی دەوڵـەت و چەکـی لێوەربگـرن و پاسـەوانی بـۆ بکـەن، بـەس نەکەونـە دژایەتـی شـۆڕش و هـەر کاتێـک فەرمانـی دییـان لـە منـەوە بۆ چوو، جێبەجێیبکـەن. بـەڵام بـەردەوام ئامێری کۆپییەکەشم لـە ئیشـدا بـوو. وردە وردە تـەواو وازم لـە کاری ڕێکخراوەیـی دەهێنـا بـۆ ئـەوەی ببـم بـە ئەندازیـاری ئـەو تـۆڕە سـەیر و تێکـەڵ و ترسـناکەی کـە دەوڵـەت و شۆڕشـی بـە جۆرێـک لـە جـۆرەکان تێکەڵدەکـردەوە. تـا زیاتـر لەوکارانـەدا ونـدەبووم، باڵەکانـم قورسـتر و قورسـتر دەبـوون، دەمزانـی ئـەوەی هەسـتی پێدەکـەم تەنیـا سـەنگێکی دەروونییـە، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا حاشـای لـێ نەدەکرا و بـە کـەم نەدەگیـرا. وای لێهـات شـەو لـە بـەر قورسـی و گەورەیـی باڵەکانـم نەمدەتوانـی تـل بـدەم. ڕۆژێـک هۆشـەنگی بولبولیـارم بینـی، پێیگووتـم باڵەکانـت زۆر گـەورە بـوون... زۆر، گووتـی تـا ئێسـتا کەسـی نەدیـوە باڵـی وا زەبـەلاح و درێـژی هەبێـت. ئـەو پێیگووتـم کـە دواجـار

بە مەهدائیلی فریشتەم دەناسێنێت و لەوانەیە ئەو هەندێک ئامۆژگاری پێبێت. من هەواڵی دۆزینەوەی مەهدائیل و ئەوەی کەسێک بناسم یارمەتیم بدات لەم باڵە مەلعونانەی خۆم تێبگەم، خۆشحاڵیکردم. دەمزانی بولبولیار خۆشی ناوێم، بە ئارامی سەیریدەکردم، بەڵام لە چاوانمدا جگە لە نیگای پیاوکوژێک و شۆڕشگێڕێکی بێڕەحم هیچی تری نەدەبینی، کە شۆڕش لەلای هیچ نییە جگە لە یاریکردن و کوشتن و فێڵکردن و ترساندن. ئەوجارە کە بولبولیارم بینییەوە پێیگوتم کە دەتوانێت کۆمەکمبکات بەوەی بمناسێنێت بە مەهدائیلی فریشتە. من دڵنیابووم نهێنی زۆرتر دەزانێت، بەڵام نایەوێت بۆم بدرکێنێت... دەمزانی ئەو کلیلی نهێنییەکی لایە زۆر لەو نهێنییە بچوک و ناچیزانەی من گەورەترە. چییە مرۆڤ بزانێت کەسێک دڵسۆزە یان خائین؟ چییە بزانیت سەرۆکەکان چۆن لە بنەوەڕا لەگەڵ دەزگاکانی حکومەت و ئاژانسە نهێنییەکانی هەواڵگیریدا کاردەکەن... چییە؟ نرخی ئەو زانیاریانە چییە، بەرامبەر بەو زانیارییەی کۆمەک بە مرۆڤ دەکات، خۆی خۆی بناسێت.

شەوێک درەنگ وادەم دایە و لەگەڵ مەهدائیلدا هاتن بۆ لام. ئەوە یەکەمجار بوو مەخلوقی وەها ببینم. دەبێت بڵێم، بینینی فریشتەیەک... یەک فریشتە لە بەرگ و شێوەی ئاسمانی فریشتەدا، بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ تێڕوانینی لە سەر هەموو گەردون بگۆڕێت. بەڵام هاتن و دەرکەوتنی مەهدائیل بەو جۆرە نەبوو. ئەو پیاوێکی تەواو بوو، روخسارێکی ئەسمەری هەبوو کە پێدەچوو مانەوەی زۆر لە ژێر خۆر و گەرانی زۆر ڕەنگێکی تۆختریان لە ڕەنگی خۆی پێبەخشیبێت. قژێکی کەمێک کورت و لوولی هەبوو... زۆر بە هەیکەل و کەڵەگەت بوو، چاوانی پان و گەورە بوون، پێدەچوو ئاسەواری سەرسامییەکی کۆن هەمیشە لە

چاویدا بێت. ئاشکرابوو نەیدەویست زۆر نهێنی بدرکێنێت. شتێکی تێدا بوو کە باوەڕی پێبکەم فریشتەیە و شتێکیشی تێدابوو باوەڕ نەکەم... بۆ ئەوەی دڵنیامبکاتەوە کە فریشتەیە دوو جار باڵەکانی خۆی کردەوە و دایخستنەوە. بەڵام وەک ئەوەی باڵە گەورەکانی من سەرسامیکردبێت، وەک ئەوەی شتێکی ناوازەی تێدا بینیبێت، بەردەوام سەیریدەکرد. وەک چۆن نەخۆشێک دەپشکنن، بەو جۆرە منیان پشکنی، بە درێژایی ئەو ماوەیەی کە لای من بوو، جگەرەی دەکێشا، بە بولبولیاری گووت « ئەمجۆرە باڵانە زۆر دەگمەنن، باڵی فریشتەیەکی زۆر بەهێزە، فریشتەیەک کە زۆر دوودڵە، دەیەوێت بێتەدەرێ و نایەوێت. هەندێجار فریشتەکان باڵەکانیان کێشدەکەنە دەرەوە، بەڵام بۆ ئەوەی ساتی تەواوەتی ترازان بێتە دی، کاتێکی زۆریان دەوێت، هەمیشە ئومێدیان بەوەیە کە نەبێت، نەفرن و نەترازێن» . من ئەو کات هیچ لە قسەکانی تێنەدەگەیشتم، بەڵام نەخۆشێک چۆن بێدەنگ دەبێت تا دکتۆر ڕووی تێدەکات و شتەکانی بۆ سادەدەکاتەوە بێدەنگ بووم. مەهدائیل ماوەیەکی درێژ دەستی لە باڵەکانمدا، گووتی «زۆر باشە کە دەتوانیت هەڵیانگریت، باڵەکان سەرەتا تەنیا وەک وێنە، وەک سێبەر، وەک غوبارێکی بێکێش لە جەستەی ئینسان دێنەدەرێ، دواتر، تا کات زیاتر بڕوات، تا فریشتەکەت پتر بیر لە ڕاکردن بکاتەوە، قورستر دەبن... ئەو باڵانە کاک جەنگیز، باڵی فریشتەکەی ناوتن... عەزیزم تۆ شتگەلێکی خراپ دەکەیت کە فریشتەکەی ناخت لێیان ڕازی نییە. ڕەنگە هۆکەی ئەوە بێت لە نێوان عەقڵ و ویژدانتدا درزێک دروستبووە، عەقڵت گوێ لە ویژدانت ناگرێت، یاخود ویژدانت بە جۆرێکی لاواز هەموو حوکمێکی عەقڵت قەبووڵ دەکات. لە ڕۆحتدا دەنگێکی تر هەیە جێگای نابێتەوە. ئەوە ترسناکە... وانییە کاک هۆشەنگ... وانییە» .

هۆشەنگ سەیریکردم و دڵنیابوو من لە هیچ حاڵی نابم. من پرسیم «تێناگەم دەڵێیت چی، من واتێدەگەم ئەو باڵە سەرەتای وەرگەڕانی من بێت بۆ تەیرێک یان جۆرە ئاژەڵێکی باڵدار، بەیانیان لە خەو هەڵدەستم و دەترسم ئێوارە بوویم بە جانەوەرێک، بە قازێکی زەبەلاح... تاکە خۆشبەختیم ئەوەیە کەم کەس ئەو باڵانە دەبینن، ئەوە تاکە خۆشبەختیمە».

مەهدائیل گووتی «ئەوە ئاساییە کاک جەنگیز. شتێکی عەجایەب لەوەدا نییە، ئەوەی جووتێک چاوی فریشتەیی نەبێت، ناتوانێت ئەو باڵانەت ببینێت، دەبێت پلەو پایەی مەلایکەتەکەی ڕۆحت گەورە بێت، ئەوسا دەتوانیت ئەو باڵانە ببینیت. واتە پێویستی لە جنسی مەلەکبینان بیت، ئەگینا مامی مامی فریشتە چۆن دەبینیت. کە تۆ باوەر بە بوونی فریشتەیەک نەکەیت لە خۆتدا، ئەوکات هەر بە چاوی ئینسان، هەر بە نیگای ئەو مەخلوقە یەک دیوە شتەکان نیگادەکەیت. فریشتە سەر بە بەشێکی تۆیە کە ونتکردوە. سەر بەو ژیانەیە کە فەرامۆشتکردوە، ئەو باڵەش باڵی ئەو زیندەگییە جوانانەیە کە دەبوو تێیدا بژیت، باڵی ئەو مرۆڤەی تری ناختە کە نەتهێشتووە سەردەربهێنێت و بدوێت و بژی... ئەوە باڵی نیوە کوژراو و بریندارەکەی خۆتە؟ وانییە... هیچ بەشەرێک هەیە نیوەیەکی برینداری نەبێت، کە بە دەستی خۆی خنکاندوێتی، بۆ ئەوەی گوێی لە هاواری نەبێت؟. ئەی چی... مامی مامی گەورەترین تاوانی ئینسان ئەو تاوانەیە کە دەرهەق بە خۆی دەیکات، وەک لێبوکێک چەند ڕستەیەک، چەند جوڵەیەک لەبەردەکات و وەک مەکینەیەکی قورمیشکراو لە سەریان سووردەبێت. ئینسان... ئاه لە دەست ئەم حەیوانە بێمێشکە. ئەم مەکینە سکراب و ئیشنەکەرە. کاک جەنگیز لەوە تورە نەبیت، کە وادەڵێم، منیش هەر مرۆڤم، فریشتە هەر مرۆڤێکە لە مرۆڤبوونی خۆی بێزاربووە، هیچ دڵی بەو خیانەتە خۆش نییە کە

ئینسان لە خۆی دەیکات... ئەوەی لە بەشەردا من زۆر تورەدەکات، ئەو توانایییە زۆرەیەتی لە سەر دووبارەکردنەوە. هەمیشە هەمان شت دەخوات، هەمان ئیشدەکات تادەمرێت، هەمان جۆرە جل لەبەردەکات، بە جۆرە پیاوێکەوە یان جۆرە ژنێکەوە دەیگرێت، لە سەرەتاوە تا مردن لە سەر یەک ئیقاع و یەک میلۆدی سەمادەکات. ئاە ئەم مەکینە شکاوە چییە کەخودا دروستیکردوە و ناوی ناوە ئینسان، لەوەدا هەندێجار هەق دەدەم بە دکتۆری خۆمان، ئەگەرچی لە هەموو شتێکدا لەگەڵیدا نیم، بەڵام دروست لەو خاڵەدا کە تەمەڵی بەنیئادەمییان تورەیدەکات من لەگەڵیدام. ئەوە جەنابت نایناسیت، کاک هۆشەنگ دەیناسێت. ئینسان دەتوانێت بوکەشوشەیەکی قورمیش نەبێت، هەموو رۆژێک هەستێت هەمان ژیان و هەمان رێورەسمی دوێنێی بژی، هەمان ئەو قسانەی دوێنێی بە جۆرێکی دی دووبارەبکاتەوە، کاک جەنگیز گیان، ئینسان بە گشتی بووە بە مەکینەی قورمیش، نازانێت لەو رەفتارانە دەرچێت، هەمان شت دووپاتدەکاتەوە، فریشتەکەت ناتوانێت وا بژی، عەزیزم دەیەوێت ژیانێکی تریش تاقیبکەیتەوە... عەزیزم، ئەو باڵانە باڵی ئەون، باڵی ئەو نیوە نهێنییەی تۆن کە نەکەس لە تۆدا بینیویێتی و نەکەس دەیناسێت. ئەی چۆن؟ تۆ خۆشبەختی، ملیۆنەها هەن دەمرن و تێناگەن چۆن رۆژ بە رۆژ فریشتەکەی خۆیان کوشتووە... ئەوەی من ئێستا دەیبینم وەک جۆرە شۆرشێکە، جۆرە قیامێکە کە فریشتە دەیکات، ئیتر هەندێکمان دەمانەوێ هەر وابێدەنگ نەمرین. بەس هەمووی جۆرێکە لە گەمژەیی. باوەرم پێبکە کاک جەنگیز فریشتە بۆ ئینسان هیچی پێ ناکرێت، جگە لەوەی بە کەساسی بمرێت».

من هەر سەراسیمە سەیرمدەکرد. هەستم نەدەکرد تەواو تێدەگەم.
مەهدائیل وەک رێنمایی نەخۆشێک بکات، گووتی «دۆخی تۆ کاک

جەنگیـز زۆر تایبەتییـە. ئێمـە کەمجـار دەنگمـان دەگاتـە ئـەو کەسـانەی فریشـتەکانیان بەوجۆرە بـاڵ درێژدەکـەن و دەیانەوێت بترازێـن. ئـەو کەسـانە نابینرێـن، نادۆزرێنـەوە، شـتەکان زۆرجـار وا خێـرا و کتوپـڕ لەگەڵیانـدا دەگوزەرێت نـە خۆیـان کاتـی تەواویـان بۆ ڕامـان هەیە و نە ئێمـەش دەتوانین فریایانبکەویـن. ئێسـتا دەبێـت هەوڵێکـی گـەورە لەگـەڵ تـۆدا بدەیـن، کارێـک نەکەیـت فریشـتەکەت بترازێـت... کارێکـی زۆر ئاسـان نییـە، ئێسـتا جگـە لـە خـۆت هیـچ کەسـی تـر ناتوانێـت قەناعـەت بـەم فریشـتەیە بهێنێـت باڵەکانـی بباتـەوە نـاوەوە، تەنیـا تـۆ دەتوانیـت... بـەڵام ئـەوە ئیشـێکی ئەفسـانەیی و نەکـردە نییـە، فریشـتەکەت نایەوێـت ئاسـان بەجێتبهێڵێـت، بەوجـۆرە نییـە کـە تـۆ تێدەگەیـت، گـەر کۆمەکیبکەیـت ئەویـش کۆمەکتـدەکات».

ئـەو خەیاڵـەی کـە چەنـد وەختـە مەخلوقێکـی نهێنـی باڵـدار لـە ناومـدا بـووە و مـن نەمزانیـوە تووشـی ترسـێکی گـەورەی کـردم. هەسـتمکرد مـرۆڤ بوونەوەرێکـی خۆشـبەختە کـە هیـچ شـتێک لـە سـەر بوونـی فریشـتەکەی خـۆی نازانێـت. بـە پەلـە خـۆم کۆکـردەوە، جلەکانـم لـە بـەر کـرد و گووتـم «ئێـوە چـی دەڵێـن... چـی دەڵێـن. مـن دەزانـم دوو باڵـم هەیـە، بـەس جگـە لـە مـن، جگـە لـە جەنگیـز هیـچ شـتێکی تـر لـە ناومـدا نییـە». بـە جۆرێکـی نائاسـایی سـووربووبوومەوە، ڕەنگـم گـۆڕدرا. ئـەوەی بـاوەڕ بـە بوونـی مەخلوقێکـی تـر بکـەم لـە خۆمـدا، ئـەوەی بڵێـم مـن لـە ناخمـدا دوو کەسـم، بگەمـە ئـەو بڕوایـەی نیـوە خراپەکـەم خەریکـە فریشـتەکەی نـاوم دەخنکێنێـت بـۆ مـن مەحـاڵ بـوو. مـن چیـم کردبـوو؟ مـن شۆڕشـگێڕێکی گـەورەی گـەل بـووم... مـن چیـم کردبـوو؟ تـا فریشـتەکەم لێمهەڵبێـت... چـی؟.

مەهدائیـل بـە هێمنـی پزیشـکێکەوە قسـە لـە سـەر دەردێکـی کوشـندە و نائومێـد بـکات، گووتـی «تاکـە چـارەت ئەوەیـە ژیانـی خـۆت بگۆڕیـت...

ڕەنگە سەفەربکەیت باش بێت، بچیت بۆ جێگایەکی دوور، هەر ژیانێک لەم ژیانەی ئێستات نەچێت، زیندەگییەکی هێمنتر بدۆزیتەوە، کەمتر ئازاردانی خۆت و ئەوانی تری تێدا بێت. عەفوومکە، من زۆر شت لە سەر ژیانی تۆ نازانم، بەس گەر ژیانت نەگۆڕیت، ڕۆژ بە ڕۆژ باڵەکانی ئەو فریشتەیە لە سەر شانت قورستر دەبێت، زیاتر تەکان دەدات، زیاتر نەخۆشت دەخات. چونکە ئێستا ئەو وەک تەیرێکی زەبەلاح وایە لە قەفەزێکی بچوکدا گرتبێتت، تا بۆی بکرێت زیاتر ڕاتدەتەکێنێت، هەموو شتێک دەکات بۆ ئەوەی دەرچێت. دەبێت بڕۆیت بۆ جێگایەکی جیاواز لەم شوێنەی ئێستات. هەر شتێک کە ئێستا دەیکەیت بەجێیبهێڵە، هەتا خواردنەکەشت بگۆڕە، گەر کاروکاسبییەکت هەیە وازی لێبهێنە، ئەی چی، ئەگەر ئازاری خەڵکت داوە، داوای مەعزەرەتیان لێبکە. گەر بڕوایەکی دێرین و نەگۆڕت هەیە، هەولبدە عەزیزم بە سەریدا بچیتەوە. بەڵێ کاک جەنگیز، تەندروستی ڕۆح شتێکە وەک تەندروستی لەش پێویستی بە چارەسەریی و دەرمان هەیە... گەر دەتەوێت باڵەکانت نەمێنن، ڕەنگە ئەوە تەنیا هیوا بێت».

من هەڵچووم، پێمگووتن «ئێوە من ناناسن؟... ها... ئێوە من ناناسن؟ هۆشەنگ خۆ تۆ من دەناسیت. من شۆڕشگێڕێکم و هیچی تر، ئەوە دەکەم کە شۆڕش پێمدەڵێت. گەر خراپەشم هەبوو بێت هەر دەرهەق خەڵکی خراپ بووە. ئەی نابێت بەرگری لە ئەرز و ئاوی وەتەن بکەین... نابێت؟». هۆشەنگ تەنیا سەرسام سەیریکردم و هیچی نەگووت، ئەوە نەبێت گووتی «هەڤاڵ، هەندێجار شتەکان وا نین... وانین کە ئێمە دەیانبینین».

لەو ساتانەدا بۆ یەکەمجار هەستمکرد دەبێت من گومانبکەم. ئەو

ساتەی تێیدا دەگەیتە گومان ساتێکی سەختە، گومانکردن لە خود وەک گومانکردن لە دونیا شتێکی سروشتی ناو مرۆڤ نییە، مرۆڤ بە یەقینەوە دەربارەی خۆی و بە گومانەوە دەربارەی دونیا لەدایکدەبێت. گومانکردن لە خود شتێکە مرۆڤ بە سەختی فێری دەبێت. گومانکردن لە دونیا دۆخێکی غەریزییە، لە باپیرە کێوییەکانمانەوە بۆمان ماوەتەوە، ئەوانەی شەو و ڕۆژ دەبوو لە جانەوەرە دڕندەکانی ناو سروشت بترسن، لە هێزە نادیارەکانی ناو تاریکی و لە مێرووە ورد و کوشندەکانی نزیکیان. یەقینیش دەربارەی خۆت، دەربارەی ئەوەی هەمیشە تۆ لە سەر هەقیت، دۆخێکی غەریزییە. مرۆڤ بەبێ بڕوایەکی گەورە بە مافی خۆی، نەیدەتوانی بمێنێتەوە. ماف ئەوە ئەو وشە ترسناکەی مرۆڤە کە سەد دەر سەد لە داهێنانی خۆیەتی. نە خودا، نە سروشت ئەم وشەیەیان نەبەخشیوەتە مرۆڤ، بەڵکو خۆی دروستیکردوە، زۆرجاریش بۆ ئەوە دروستیکردوە دونیای پێ وێرانبکات و گومانیشی نەکەوێتە سەر. بە درێژایی مێژوو، مرۆڤایەتی جگە لە دوو چەشنە مرۆڤ هیچی دیکەی دروست نەکردوە، ئەوانەی کە مافیان هەیە گومانیان لێ نەکرێت، لەگەڵ ئەوانەدا کە دەبێت بخرێنە ژێر گومانەوە. ئەم دۆخە لای فەرمانبەرانی ناو دەزگا ئەمنییەکان و کاربە دەستانی ئاسایش زۆر تۆخ دەبێتەوە... کاربە دەستی ئاسایش کەسێکە بەردەوام بڕوای ڕەهای بە مافی خۆیەتی، دونیاش وەک شوێنێکی گومانلێکراو دەبینێت. هەستدەکات هێزێکی گەورە هەیە مافی ئەوەی پێبەخشیوە گومان لە هەموو شتێک بکات لە خۆی نەبێت. گەر سەیرمانبکەیت، سەیری وەستان و نیگاکردن و ڕۆیشتنمان بکەیت، دەبینیت ڕەفتارمان لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا چەند جیاوازە. هەمیشە هێزێکی شاردراوەمان تێدایە کە ئاشکرا پێمانەوە دیارە هێزی خۆمان نییە، هەموو گیانمان دڵنیایی لێدەبارێت چاومان نەبێت، چاومان هەمیشە ترسێک و پرسیارێک و گومانێکی گەورەی تێدایە، کە

بۆ هەر کوێ دەچین و لەگەڵ هەر کەس دەبین بۆمان ناشاردرێتەوە. وافێردەبین گومان لە هەموو کەس بکەین خۆمان نەبێت، من فێربووبووم کە هەرچییەک دەیکەم لە سەر هەقم... ئیشەکانی خۆمم بە شتێک دەزانی لە سەروو هەموو یاسایەکەوە، بەوەدا فەرمانم لە سەرکردە گەورەکان وەردەگرت، جێبەجێکردنی کارەکانی خۆمم وەک جێبەجێکردنی کۆمەڵێک یاسای سروشتی سەیردەکرد کە لادان لێیان هەڵەیە... دەمزانی لە سروشتدا باو باران دەشێت کەسانێک بکوژن، لافاو خەڵکانێک بخنکێنێت، بەڵام باران پێویستە و سروشت بێ ئاو دەبێتە کاولگایەکی مەزن. کارەکانی منیش وەک ئاو و هەوای شۆڕش بوون، لێرەوە گەر دوو هێزەکەی ژیان جارەجارە کەسێکیشیان بکوشتبایە، بۆ من ئەوە بەشێک بوو لە سروشتی شتەکان، لە جەوهەری ئەو مەتریالانەی ئەگەر یەکێک نەکوژن، ناتوانن وابکەن ملیۆنەها بژی. هیچ کارێک لەو کارانەی لەو ساڵانەدا کردبووم گەرچی دەشێت بۆ کەسانێک کە دوژمنی حیزبن، غەمهێن و ناخۆش بووبێت، بەڵام بۆ من غەمناک و ترسناک نەبوون... تا ئەو کاتە گومانم لە هەقانییەتی هیچ کارێکم نەدەکرد، سات هەبوو سڕ دەبووم و دەوەستام، بەڵام لە ناکاو بیرمدەکەوتەوە کە من هیچ نیم جگە لە نوێنەری شتێکی گەورەتر، هیچ نیم جگە لە کەرەستەی هێزێک کە ڕاست و ڕەوایی لە سەروو گومانەوەیە، کەرەستەی شۆڕش کە لە عەقڵی مندا لە هەرە موبارەکترین کار و لە هەرە موقەدەسترین فەرمانەکانی دونیا بوو.

لەو ساتەدا کە مەهدائیلی فریشتە قسەی بۆ کردم، تۆوی گومانێکی ڕەشی لە دڵدا چاندم. ئێمەی مرۆڤ لە پێغەمبەرانەوە بۆمان ماوەتەوە، ناتوانین ئاسان باوەڕ بە قسەی فریشتان نەکەین. گەرچی لە دڵدا هەموو قسەکانیم پێ ناڕەوا بوو. ئەوکات بەرگریم لە خۆم کرد و گوتم «چی بگۆڕم. من شۆڕش کۆمەڵێک فەرمانم پێدەدات، کە لەگەڵ هۆش

و ویژدانمدا دەگونجێن. من دەتوانم بەرگەی قورسایی باڵەکانم بگرم، بەڵام ناتوانم بەرگەی دوورکەوتنەوە لە فەرمان و ئەرکەکانی شۆڕش بگرم... تۆ دەڵێیت چی، خۆم بمرم یان ئەم باڵندە حیزە... ها خۆم بمرم یان ئەم تەیرە حیزە... کاممان... کاممان؟». بە جۆرێکی سەیر گەرووم وشک بووبوو، دەستم عارەقی دەردەکرد، حەرفەکان لە گەرووم دەگیران، وەها سوور هەڵگەڕابووم، خوێن خەریکبوو لە سەر گووپەکانمەوە دەردەپەڕی. هەستمدەکرد کە من تورەدەبم باڵەکانیش بێئیرادەی من دەجولێنەوە و بە توندی دەدەن بەیەکدا... ساتێکی سەیربوو، هەتا مەهدائیلی فریشتە و بولبولیار ترسان و حەپەسان. من هەستمکرد تەکانێکی گەورە دەخۆم، هەستمکرد باڵەکان وەختە لە سەر زەوی هەڵمدەگرن، بۆ ساتێک هەستم بە هێزی ئەو مەخلوقە سەیر و نادیارەی ناو ناخی خۆم کرد، هێزێکی گەورە لە ناوەوە ڕایتەکاندم و بە توندی بەرەو لای دیوارەکە لەتری پێدام. مەهدائیل بە دەنگێکی ترساو هاواریکرد «تەماشا... تەماشا... فریشتەکەت دەیەوێت بترازێت... دەیەوێت بترازێت». من توند دەستم بە دیوارەکەوە گرت و گوتم «وای... وای... تۆ دەڵێیت چی؟ دەیەوێت بترازێت؟». وشەکان وەها ترساو لە گەروم هاتنەدەرێ، چاویان پرکردم لە دوو فرمێسکی گەورە. ناخم وەک شتێک بیگوشێت و بەریدا... بیگوشێت و بەریدا، دەلەرزی و تەکانی دەدا، دڵم بە هەموو هێزی خۆی لێیدەدا، هەستمدەکرد دەستێک گەروم دەگرێت و توند دەمخنکێنێت. بە دەنگێکی خنکاو گوتم «بمگرن... بمگرن». بە ئاستەم دەمتوانی هەناسەبدەم، باڵەکان شێتانە منیان لەگەڵ جولەی خۆیاندا ڕادەتەکاند. مەهدائیل بە هێزێکی زۆر گەورە، وەک کەسێکی توانایەکی ئەفسوناوی هەبێت باڵەکانی گرت و توند بە ڕوودا منی نوساند بەدیوارەکەوە. من نرکاندم «برایان دەمرم... دەمرم». جولەی باڵەکان وەها بەهێزبوون، منیش و

مەهدائیلیشی پێکەوە تەکاندەدا. بەڵام مەهدائیل هاواری لێکردم «بێدەنگ بە... بێدەنگ بە. بەوە فریشتەکە توڕەتردەکەیت، بێدەنگ بە». بە هەردووکیان منیان توند گرت، ماوەیەک بەدیوارەکەوە چەسپ ڕایانگرتم، چەند دەقیقەیەکی درێژ باڵەکانیان وەها گرت ئارامبێتەوە و چیتر شێتانە تەکان نەخوات. من چین چین عارەقم دەردەدا، گەرووم گڕێکی پەنهان و ترسناکی تێدا کۆدەبووەوە، شتێک لە ناوەوە دەیسووتاندم. ئاڵۆشێکی گەورە لە لەشم دەئاڵا، تایەک وەک ئاگر، کە بەریان دەدام یەکسەر دەکەوتم... ئەژنۆکانم لاواز دەبوون... زۆر لاواز. بە هەردووکیان هەڵیاندەگرتم و دەیانخستمە سەر جێگاکەم. ئەوە سەرەتای سەرهەڵدانی نەخۆشییە درێژخایەن و بەردەوامەکانی من بوو. کە بەجێیانهێشتم ناخم هێشتا هەر دەسووتا. تاکە شتێکیش لە خەیاڵمدا بوو، ئەوە بوو چۆن ئەم باڵە گەورانە ببەمەوە ناوەوە و ئارامیانبکەمەوە.

لە ڕۆژی دواتردا. کاتێک بەیانی هەستام، عارەقە و کەف و لیکی شەو سەرینەکەمیان خوساندبوو، دەستم لە قژمدا و هەستمکرد ئەو قژە تەنکەی بە سەرمەوە ماوە زۆر تەڕبووە، وەک بە درێژایی شەو بارانێکی نهێنی بە سەرمدا باریبێت. لە بەر ئاوێنەکەدا وەستام و وێنەی کەسێکی دیم بینی، دوو نیگای مات و نەخۆش لە چاومدا بوو، ڕوخساری شێتێکی پەتادارم هەبوو، کەسێک کە گەییوە بۆ شێتخانە و کامڵە بۆ پرس و ڕای پزیشکان. پێستم پێستی کەسێک بوو شەو دیوەزمە و مۆتەکان لە سەری نیشتبن، گوێکانم سوور هەڵگەڕابوون و وەک بایەکی قایم کەمێک لە جێگای خۆی جوڵاندبنی وەهابوو. هەستمکرد باڵەکانم کەمتر دەجوڵێن و شتێک لە هاوسەنگی و هێمنیان وەرگرتووە. نەمدەزانی چی بکەم... دڵنیابووم ئەو نۆبەتەی لێمهات دەگەڕێتەوە. شتێک بوو وەک کەوتنی کەسی فێدار لە سەر زەوی، وەک کەفکردن و لوولبوونی پەرکەمداران. بەڵام هەرگیز بۆ ساتێکیش بیرم لەوە نەکردەوە واز لە شۆڕش بهێنم.

مـن لـە قووڵاییـدا شۆڕشـگێڕەکەی ناخمـم لـەم فریشـتە نەخۆشـە خۆشـتر دەویسـت کـە ئێسـتا وەک جانەوەرێکـی نەخـۆش، وەک ڕۆحێکـی شـەیتانی و بـەد تەماشـامدەکرد. مـرۆڤ لـە خاکێکـی داگیرکـراودا، لـە میللەتێکـی ژێردەسـتدا، لـە سـایەی دەوڵەتێکـی دڕنـدەی وەک بەعسـدا، چۆن دەتوانێـت گـوێ لـە فریشـتەکان بگرێـت؟.

# ئوتێل

بـە پێچەوانـەی کتێبخانـەوە، ئوتێـل لـە چەنـد قاوشـێکی گـەورە دروسـتبووبوو، گیـراوەکان لـە سـەر هەندێـک بەسـتی چیمەنتۆیـی شـوێنی دانیشـتن و پاڵکەوتنیـان بـۆ کرابـوو، جێگایەکـی ڕەق و ناجـۆر بـوو، بەڵام لـە کەسـانی مانـدوودا ئارەزوویەکـی گـەورەی خەوتنـی دەبزوانـد. هەمـوو قاوشـێک دوو دەرگای لـە سـەر بـوو، بەردەوامیـش کۆمەڵێـک گڵۆپـی زۆر گـەورە و ڕۆشـن داگیرسـابوون، کـە هـەم تیشـکێکی بەهێـز و هـەم گەرمییەکـی ناوازەیـان بـە قاوشـەکان دەبەخشـی. هاتنـە ئوتێـل دوو مانـای هەبـوو، یـان مـردن یـان ئاشـکراکردنی هـەر شـتێک کـە دەیزانیـت. مـن بڕیارمـدا لـە ئوتێلـدا بمـرم، چونکـە هیـچ چارەیەکـی دیکـە و ڕێگایەکـی تـرم لـە بەردەمـدا نەبـوو. زیندانـی ئوتێـل یەکێـک بـوو لـە کورتخایەنتریـن زیندانەکانـی دونیـا، ئەوانـەی دەچوونـە ئـەوێ، بەراورد بـە هـەر زیندانێکـی تـر، کـەم دەمانـەوە، چونکـە زۆربەیـان زوو دەڕوخـان و هەمـوو نهێنییەکیـان دەدرکانـد و دەگەڕانـەوە بـۆ بەشـی زیندانـە ئاساییەکان، یاخـود لەوێـوە ڕەوانـەی زیندانـە حیزبـی و حکومییـە تایبەتییەکانیـان دەکـردن. ئەوانەشـی زۆر دەمانـەوە، سـەعات بـە دوای سـەعات شانسـی ژیانیـان کەمتـر و کەمتـر دەبـووەوە. لـەو قاوشـەی منـی لێبـووم، ژمـارەی «میوانـەکان»

نزیکی دە کەسێک بووین، زۆربەمان نوێ بووین... قاوشەکە بە چەند کامێرایەکی بینراو و نەبینراو چاوەدێریدەکرا. پاسەوانەکان لە هەر لایەکەوە دەیانتوانی هەموو یەکێک لە ئێمە ببینن، ئەوان نەک هەر وەزیفەی چاوەدێرییەکەیان بە دڵسۆزییەکی بێوێنەوە جێبەجێدەکرد، بەڵکو زیادەڕەوییەکی بێوێنەیان لە وریاییدا دەنواند. هەموو ژەمێک خوانێکی باش بۆ میوانەکان دەڕازایەوە، هیچ کەس لە ئوتێل بۆی نەبوو وشەی دیل یان زیندانی بەکاربهێنێت، ئێمە هەموو میوان بووین... لە سەر هەموو دیوارەکانی ئوتێل نوسراوی سەیر هەڵواسرابوو «بەخێرهاتنی میوانە بەڕێزەکان دەکەین، بۆ ئوتێلی شەو بێداران» «یاخودا بەخێربێن» «ئێرەماڵی دووهەمی ئێوەیە» «میوان لە سەر چاوانمانە»، سەرەتا هەموو تەدارەکێکی ڕێزگرتنی میوان دەگیرایە بەر، تا ئەو کاتەی میوان خۆی دەکەوتە شکاندنی یاساکانی میوانداری. دوو یاسا سەرەکییەکەی میوانداری لە سەر هەموو دیوارەکان نوسراوبوون، یەکەم: خواردن، دووەم: نەخەوتن. هەرکەس ژەمێکی نەخواردبایە یان تەواوی نەکردبایە، ئیتر هەشت ژەمی دیکەی وەرنەدەگرت، گەر ئەوەی دووبارە بکردایەتەوە ژمارەی ژەمە حەرامکراوەکان دەبوو بە دوازدە و بەو جۆرە سێجار سێجار بەرزدەبووەوە. ژەمەکان پڕبوون لەو جۆرە خواردنە قورسانەی هەر ئادەمیزادێک حەزبکات دوای نۆشینیان پشوو بدات، دەبوو میوان هەموو یاساکانی زیافەت جێبەجێبکات و هیچ شتێک لە سەر سفرەکە نەهێڵێتەوە کە دڵی خاوەن ماڵ بشکێنێت. تەواوی سەقفی ئوتێلەکە وەک دەمی ئاوپرژێنێکی گەورە، وەک سەرقاپی کونداری ئامێرێکی دوشکردنی حەمام دروستبووبوو، واتە ئێمە لە هەر جێگایەکی نێو «سالۆنی زیافەت»دا باین، ئەوانەی لە ڕێگای چاوی خۆیان و کامێراکانەوە چاوەدێریاندەکردین، دەیانبینین و ئیشیان بەو تەنیا بەشانە دەکرد کە لە سەر سەری ئێمەن. گەر وەنەوزێکی بچوکمان بدایە،

سەرەتا چەند دڵۆپە ئاوێک و ڕێژنەیەکی بچوکیان تێدەگرتین، ئاوەکە هەمیشە بە جۆرێکی زۆر سەیر سارد یاخود بێئەندازە گەرم بوو... لەگەڵ مندا سەرەتا ئاوەکە هەمیشە سارد بوو، بە جۆرێک هەر دڵۆپێکی بەر سەرم بکەوتایە وەها تیژ دەیبڕیم و ڕایدەچڵەکاندم، وەک ئازاری دەرزییەک یەکێک لە ناکاو بیکات بە سەری پەنجەتدا و قووڵ بۆ ناوەوە ڕایدات. ئاخۆ ئاوەکە هیچ مەتریال و دەرمانێکی تایبەتی تێدابوو، نازانم. بەڵام هەر لە سەرەتاوە هەستمکرد ئەو ئاوە شتێکی زۆر ئازاربەخشی تێدایە، شتێک خوران و هەوکردنێکی دەرەکی دروستدەکات. لە دوای هەژدە سەعاتی یەکەم زۆربەی میوانەکان هەستدەکەن کە ئیتر پێویستیان بە خەوە. کەمجار ڕێدەکەوێت هەژدە سەعات بڕوات و میوان «یاساکانی زیافەت»ـی نەشکاندبێت، سەرەتا دوشەکە بە هێمنی دەکرێتەوە، تا پلەی خەوهاتنی میوان بەرزتربێتەوە، خێرایی و ساردی و هێزی ئاوەکەش دەگۆڕێت، بە جۆرێک لە هەندێک پلەدا ئاوەکە بە جۆرێک گوژمی تێدەگەڕێت، دەتوانێت هەڵتبدات و ئازاری گیانی تریشت بۆ پەیدابکات. کارمەندانی ئەوێ دەڵێن ئەو دوشە پێویستە بۆ ئەوەی میوان گیانی تێبگەڕێتەوە و سوڕی خوێنی چالاک بێت و بکرێت بەباشترین شێوە سوود لە کاتی زیافەتەکە وەربگرێت. جگە لە ناو قاوشەکانی ئوتێل پڕکراون لە بڵندگۆی گەورە گەورەی زۆر تایبەت کە گرمە و زرمە و ناڵەیەکی بێوێنەیان هەیە، زۆربەی سەعاتەکانی شەو، بەتایبەت ئەو کاتانەی کاتژمێرە بایۆلۆژییەکەی ناو مرۆڤ فشاردەهێنێت و داوای خەو دەکات، ئا لەو کاتانەدا دەنگی ترسناکی بڵندگۆکان لە نزیکی هەر میوانێکەوە بە مۆسیقایەکی خۆرئاوایی زۆر بەهێز دەکرێتەوە، بە جۆرێک بەردەوام واهەستدەکەیت ماشێنێکی ترسناک و گەورەی بەردهاڕین لە سەرتدا کەوتۆتە کار. دوای بیست و چوار سەعات نیشانە یەکەمییەکانی ماندووبوون لە میواندا تەواو دەردەکەوێت... کەم کەس هەیە لە بیست

و چوار سەعاتی یەکەمدا دوشێکی ساردی بۆ نەکرابێت. ساردی دوشەکە چەشنێکە کەمجار ڕێبکەوێت کەسێک نەخۆش نەکەوێت، دوای چلوهەشت سەعات پێویستی میوان بە خەو دەبێتە پێویستی سەرەکی، توانای لە سەر خواردن وردە وردە کزدەبێت و لە بری ئەوە پێویستی بە پشوو دەبێت، سات دوای سات حوکمی بێخەوی بە سەر هەموو خواستەکانی تردا سەردەکەوێت. وردە وردە ئەو میوانە بێفەم و بەهێزەی چەند سەعاتی یەکەم کە یەکەمین سێ ژەم بە شەهییەتێکی زۆرەوە دەخوات، لاوازدەبێت و دەکشێتەوە دواوە، هێدی هێدی ئاسەواری گێژیی و تووڕەیی و نەمانی ئارەزووی تێیدا دەردەکەوێت. بەڵام هێندەی خەریکە وەنەوز بدات و چاوی بچێتە خەو، بە خێرایی خەبەردەکرێتەوە.

من لە شەست سەعاتی یەکەمدا توانای ئەوەم هەبوو سەیری میوانەکانی تر بکەم، سەرنج لە لاوازبوون و پەککەوتن و ماندووبوونیان بدەم، تووڕەبوونیان، وڕێنەکردنیان، ڕقیان، پێکەنینە هیستریەکانیان، لە هۆشخۆچوونیان، دواتر تەسلیمبوونیان... هەموو ئەوانەی شتێک دەزانن لە ڕۆژی حەوتەم و هەشتەمدا هەرەسدەهێنن. تا ئەوکاتە مرۆڤ چەندین جار دەبوورێتەوە، لەش بەرگە ناگرێت و دەبێت شتێک بکات کە بە سەر ماندوێتیدا سەربکەوێت، لەبەر ئەوە بەردەوام تیپێکی شارەزا و پسپۆڕی پزیشکی ئامادەن هوشیارتبکەنەوە، بتخەنەوە سەر حاڵ و نیوە مردوو بتنێنەوە ژێر دوشەکان. بەڵام هەندێجار کە میوان هەر سەرسەختی بنوێنێت و خواستی خاوەن ئوتێلەکە جێبەجێ نەکات، بۆ ئەوەی نەمرێت، لە ڕۆژی دە یا خود یازدەهەمدا دەیبەن بۆ جێگایەکی دی و دەرفەتی ئەوەی دەدەنێ چەند سەعاتێک بخەوێت، بەڵام بێئەوەی بهێڵن تێرخەو بێت، پشوویەکی کورت دەدات بۆ ئەوەی لەش تین و تاوێکی تێکەڕێت و ئامادەبێتەوە بۆ «زیافەت»... درێژترین تۆمارێک تا ئێستا مرۆڤێک بێخەو تۆماری کردبێت یازدە ڕۆژە... بەڵام مرۆڤەکان هەموو

ئەو هێز و توانایەیان نییە، هەندێک لە ڕۆژی سێهەمدا تووشی وڕێنە و ڕێشکەو پێشکە دەبن و هەندێکیش لە ڕۆژی شەشەمدا ئۆرگانەکانیان لە کاردەکەوێت و مێشک چیتر کۆنترۆڵ لە دەستدەدات و توانای دەرکردنی فەرمانی نامێنێت و هێدی هێدی و بە جۆرێکی زۆر ئازاربەخش دەوەستێت. من لە پێنجەم ڕۆژدا وام لێهات تارمایی و سێبەری شتی سەیر سەیرم دەبینی، هەرچی ئەو جانەوەرانەیە کە لە خەودا دەژین و خەو تاکە دەرفەتیانە بۆ ژیان و دەرکەوتن، وەک ئەوەی ماڵیان ئاگری گرتبێت و دیواری شوراکانیان ڕوخابێت لە خەیاڵم دەهاتنەدەرێ و ڕایاندەکرد... لە رۆژی شەشەمدا چەند جارێک بوورامەوە، ئاگاداربووم کە دووان لە میوانەکان توانایان نەماو بە پاسەوانەکانیان گووت کە هەموو شتێک دەدرکێنن بەو مەرجەی لە ئوتێل بیانبەنە دەرێ. من دەمزانی ئەمجارە دەمرم و لەم زیافەتەی حیزب ناچمە دەرێ. لە ڕۆژی حەوتەمدا نیشانە ترسناکەکانم لێدەرکەوتن، هەموو گیانم لەرزێکی توند دەیهەژاند، خواردنم بۆ نەدەخورا، دەڕشامەوە. ئەو ڕۆژە هەستمکرد ئەوە دوا ڕۆژی ژیانمە، بەڵام مردن لەو ئاستەدا گەورەترین ڕزگارییە، لە بەرئەوە لێناگەڕێن بە ئاسانی بمریت. هەمان ڕۆژ بردیانم بۆ جێگایەکی تایبەت و نزیکی ٥ سەعات خەوتم، دوو دکتۆریش کە پێشتر نەمبینی بوون، خزمەتێکی زۆریان کردم، بەڵام هیچ شتێکیان پێ نەگووتم. دوای ئەو خەوە جارێکی تر منیان گێڕایەوە بۆ قاوشەکان، بە هۆی ئەو پشووەوە شتێک لە تین و هۆشم تێگەڕابووەوە، بەڵام ماندوویێتییەکی ترسناک هێشتا بە لەشمدا دەگەڕا و ئەندام بە ئەندام جەستەمی خستبووە سەر هەوای ژانێکی کوشندە. ئەوەی دڵنیابووم دەبێت بەردەوام بەو سوڕەدا بڕۆمەوە شێتیدەکردم، دەمویست شتێکم دەستبکەوێت بە خێرایی خودکوژیی بکەم و کۆتایی بەو ماندووبوونە بهێنم. بەڵام ئیش نەکردنی مێشک و خەیاڵ، لاوازبوونی ئیرادە وایاندەکرد شتێک بە مێشکمدا نەیەت. بەڵام

هەستمکرد لەگەڵ مندا جۆرە نەرمییەک هەیە کە کەمێک جیاوازە لەگەڵ زیندانەکانی تردا... من هەندێک ژەمم نەدەخوارد، هەندێک ژەمم بۆ تەواو نەدەکرا، بەڵام هەستمکرد یاسا کوشندەکانی زیافەت بەوجۆرە توندییەی کە هەن، بە سەر مندا ناسەپێنن. وەک یەکێک فەرمانی دابێت تا دەکرێت ئازارم خاوبکەنەوە، بمکوژن بەس نەهێڵن بمرم. گەرچی حیزب وەفا و شتی نەبوو، بەڵام ئەوەی لە زیندانی بورجدا لە ژێر ئەشکەنجەدا بمرم، کۆمەڵێک هەڤاڵی کۆن و خەڵکانی ناڕازیی ناو حیزبی دەورووژاند، دەمزانی هەر شتێک ڕووبدات ناگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی و باشی من، بەڵام خەڵکانێکی زۆر لە بۆسەدا بوون کە تاوانی لەمجۆرە ئاشکرابێت و تۆماری سیاسی حکومەت هەڵبدەنەوە و هێندەی تر لاپەڕەکانی ڕەشبکەن. بە گشتی من هەستمدەکرد مردنم لێرەدا، لەم بورجە گەورەیەی حیزبدا، لەم باڵە خانە سەد نهۆمییەی ئەودا، لە سەر دەستی ئەم پسپۆرە تازانەدا، کۆتاییەکی سروشتی ژیانی منە. لەو باوەڕەدابووم کە جگە لەم مردنە پڕ ژانە، شایستەی مردنێکی تر نیم. من دەبوو لێرەدا بمرم... ئێرە کۆتایی من بوو... دوا ماڵم بوو، دەمزانی هەڤاڵە کۆنەکانم کە هەمیشە بەرامبەرم پڕ کینەبوون، ئێستا هەموو بەڵگەیەکیان لە بەردەستدایە کە بمکوژن. جگە لە غەمی ئەو هیچ شتێکیشم نەبوو دوای خۆم جێیبهێڵم... جگە لە غەمی ئەو. هەستمکرد گەرچی تەمەنم زۆر زۆر نییە، بەڵام ئەو ژیانە جەنجاڵەی کە بینیومە، لە چڕی و پڕیدا ژیانی دەیان ئادەمیزادی تری تێدا دەبێت. بە شتێک لە ڕازی بوون و شتێک لە دوودڵییەوە بڕیارمدا بمرم... مردن لە ژێر ئازارێکی لەو چەشنەدا، باشترین و دادپەروەرانەترین مردنێک بوو من شایستەی بم.

# نەغەدە و فریشتەکەی

نزار ئیدریس لە پشت منیشەوە هەندێک هێڵی تایبەتی تری لەگەڵ هەندێک لە سەرانی شۆڕشدا دروستکرد. لەگەڵ ژمارەیەک سەر تیپ و کادێری سیاسی ناسراودا کە پلەی سیاسیان بەرزنەبوو، بەڵام لە مەیدانی ڕاستەقینەدا کارامەبوون، بووە دۆست. بەڵام ئەوەی سەیربوو، نزار گەرچی وەک سەر مەفرەزەیەکی دڕ بە خۆی و چەکدارەکانییەوە وەک لیڤیتانت بە شاردا دەسووڕایەوە، گەرچی خۆی لە کۆنە هەڤاڵانی دەپاراست، وازی لە دوو شت نەهێنا، خوێندنەوەی کتێب کە بەردەوام دەیگووت پێویستە هیچ سیاسییەکی درۆزن دەستبەرداری نەبێت، دووەم، پەیوەندییە زۆرەکانی لەگەڵ ژناندا. لە ماوەی دوو ساڵ و نیودا لە کارکردن، ژمارەی ئەو منداڵە ناشەرعییانەی نزار دروستیکردبوون، بە جۆرێکی بێمانا زۆربووبوون. وەک دەڵێن نزار لەو گەنجە شەڕانییە بێڕەحمانەبووە کە ژنان حەزدەکەن منداڵێکیان لێیانببێت. ڕۆژ دوای ڕۆژ ئەو سروشتە تایبەتییەی نزار زیاتر دەردەکەوت. کەسێک نەبوو وەک لیڤیتانت دەسەڵاتی بۆ دەسەڵات بوێت، بەڵکو تەنیا دەیویست خەڵک سەرسامبکات، ئەو یاسایانە بشکێنێت کە خەڵک زۆر بە پیرۆزیی دەزانن... دەسەڵات هیچ نەبوو لەلای جگە لە کەرەستەیەکی گەورەی تووڕەکردن و وروژاندنی ئەوانی تر، هۆیەک بۆ سووکایەتی بە هەموو موقەدەسێک. خۆی پتر وەک بتشکێن نیشاندەدا، وەک یەکێک دەیەوێت حەرامێک لە سەر زەوی نەمێنێت. هەموو هەستمانکرد زۆر زیادەڕەویدەکات، بە پێچەوانەی لیڤیتانتەوە کە دوژمنی کتێب بوو، نزار بە مزگەوت و نوێژکەران و شوێنە موبارەکەکانی شار و ژن و کچی خێزانە دیندارەکانەوە

گرتبووی. وادەبوو کە هەندێجار لە کاتی نوێژدا دەیدا بە سەر نوێژکەراندا، مەلاکانی لە کاتی وتار خوێندندا دەوەستان و تەوهینی پێدەکردن، بڵندگۆکانی دەشکاند، لە ناکاو خۆی و چەکدارەکانی هەموو ئادابخانەکانیان دەگرت و پێش دەستپێکردن بە جەماعەت نەیاندەهێشت نوێژکەران خۆیان لە باری نێوزگیان خاڵیبکەنەوە و فەرمانەکانی ئایین جێبەجێبکەن، حەوزی وسڵخانەکانیان دادەخست و پڕیاندەکردن لە پیسایی و پاشەڕۆ. هەر کارێک خودای بڕەنجاندایە نزار دەیکرد. بیزانیبایە ویقار و ڕێز لە کوێیە، ئەو دەچوو و مشتێک لە بێحورمەتی خۆی دەڕشت بە سەردا، لە یەکێک لە جارەکاندا بەڕێوەبەرێکی پیری ئامادەییەکی کوڕانی ڕووت و قووت دایە بەر خۆی و ناچاریکرد لە ژووری ئیدارەوە تا ژووری نوستنی خۆی بە پێخاوس و بێدەرپێ شەقامە و شەقام بڕوات. جارێکی دی دوو دوکانداری ناچارکرد بە درێژایی ڕۆژ تەنیا بە دەرپێیەکی کورتەوە لە سەر دەغیلەی دوکانەکانیان بوەستن. خۆی ماڵێکی نوێ و گەورەی گرتبوو، کە بەردەوام چەکداران بە ماشێنی دەوڵەتییەوە لە بەردەمیدا مۆڵدەبوون. ماڵەکەی حەوشێکی گەورەی هەبوو، شەوان خۆی و چەکدارەکانی هەندێک ئافرەتیان دەبرد و دادەنیشتن و پێکڕا لە تەلەفزیۆنێکی نوێوە، سەیری فیلمە ڕووتەکانیان دەکرد و دەنگی فیدیۆکانیان وەها بڵنددەکردەوە سەرتاپای گەڕەک گوێی لێبێت. دەڵێن وێنەی هەندێک کچ و ژنی خێزانی دیندار و لە خوداترسی بە ڕووتی گرتووە و خۆی بە تایبەت بردوێتی بۆ باوکیان، بۆ برایان، بۆ مێردیان. دەڵێن بە ویقارەوە لە بەردەمیاندا دانیشتووە، لە زەرفی تایبەتیدا وێنەکانی خستوونە بەردەم. تەماشایکردون بزانێت چۆن دەکشێنەوە ناو خۆیان، چۆن دەڕوخێن و دەشکێن، چۆن دەچنەوە یەک و تووشی خۆخواردنەوەی گەورە دەبن. ئازاری ئەوانی تری بەوە دەدا، هەموو شتە پیرۆز و گرنگەکانیان تێکبشکێنێت. هەرگیز عەشیقەکانی بە ناوی

خۆیانــەوە بانــگ نەدەکــرد، گرنــگ نەبــوو بەلایــەوە ئــەوان کێــن، خۆیــان چیین، ئافرەتـی جوانـن یـان ناشـیرین، زیرەکـن یاخـود گەمژە. تەنیا ئـەوەی بـۆ گرنـگ بـوو ژنــی کێــن، کچــی کێــن، خوشـکی کێــن. بــەردەوام بــەو ناوانەشــەوە بانگیدەکــردن، ژنــی مەلاکــە، خوشــکی زەڕەنگەرەکــە، کچــی بەقاڵەکـە، هاوسـەری خەیاتەکـە، ئامـۆزای ئوسـتاد، پـورزای کەبابچییەکـە، ژنخوشـکی مفەوەزەکـە. بــە دروسـتی نازانــم ئاخــۆ ژنــان هەمــوو حەزیــان لێدەکـرد یـان نـا؟ نەمدەزانـی چەندیـان بـە زۆر یـان لـە ترسـدا جەسـتەی خۆیــان ناوەتــە بەردەســت و چەندیشــیان بــە خۆشــی خــۆی؟ نازانرێــت. چەندیـان دوای ساتەوەختی لـەزەت سکی پڕبووە و چەندەیان لـە ژێـر بـاری فرمێسـک و شـەرم و ئابڕووچوونـدا تووشـی ئـەو دەردەبـوون؟ کـەس نازانێـت. بــەڵام گومــان لــەوەدا نییــە کــە ژنانێــک هــەن کــە تــا ســەر ئێسـقان پــڕ و بەداخــن لــە نــزار. لــەو دەمــەدا ســێ جــار هەوڵــی کوشــتنی درا، بکــەری یەکەمیـان مێـردی دڵشـکاوی ژنێکـی جـوان بـوو، کـە نـزار وێنـەی ژنەکـەی بـە ڕووتـی و لـە باوەشـی خۆیـدا نیشـاندابوو، ئەویدیـان کچێکـی ئیمانـدار بـوو کــە دەڵێــن نــزار لــە بەرچــاوی هەمــوو دونیــا ڕفاندویێتــی و ئەتکیکــردوە، سێهەمیشـیان بـرای خانمێکـی گەنـج بـوو کـە دوای ئـەوەی نـزار سـکی پڕکردبـوو، کچەکـە بێدەنـگ بەربەیانێـک خـۆی سـووتاند بـوو. هـەر سـێ هەوڵەکـە بـێ ئەنجـام بـوون. ئـەو هەوڵـە ناکامانـە ناوبانگـی نـزاری بەرزتـر کـردەوە، پیاوانــی دەوڵــەت ئەوەیــان وەک نیشــانەی وەفــاداری بــۆ حیــزب و ســەرۆک بــۆ حیســابکرد. بــەڵام هەمــوو دەمانزانــی نــزار لــە ناخــدا ڕقــی لــە عەرەبەکانــە، وەک گەمەچییەکــی لێزانیــش نەیدەویســت خــۆی بــکات بــە دوژمنــی شــۆڕش. کارە بەدەکانــی وەهــا بــوون وەک ئــەوەی زیانێــک بــە ئێمــەی شۆڕشـگێڕ نەگەێنێـت، بـە پێچەوانـەوە، نـزار هـەر لـەو دەمـەدا کـە کاری شـەیتانیانەی دژ بـە خەڵـک دەکـرد، ڕوویەکـی تریشـی هەبـوو، کـە چەندیـن کاری گـەورەی بـۆ شۆڕشـگێڕان ئەنجامـدا، ئـەوە وایکـرد هەڤاڵانـی

ئەنجومەنی باڵا ڕای خۆیان لە سەر ئەو بگۆڕن و چاو لە هەڵە ترسناکەکانی بپۆشن و پێشمەرگە شەهیدەکەشمان لەبیربکەن. لە دەفتەری سیاسی وەحشیگەریی ئەویان وەک نمایشێکی پێویست و دەمامکێکی شەیتانی گرنگ بۆ پێداویستییەکانی شۆڕش تەماشادەکرد، ئەو چەند جارێک شۆڕشگێڕان و پێشمەرگەی لە مردن ڕزگارکرد. دوو پێشمەرگەی ناوشار «کە بە چەکەوە گیران» وەک ئەندامی نوێی مەفرەزەکەی خۆی لە قەڵەمیدان و هەر زوو ئازادیکردن، ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە ئازادکردنی خێزانی یەکێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵادا کە دەوڵەت دەیویست ڕەوانەی باشووری بکات، زۆر پەیامی نهێنیشی بۆ گیراوەکانی نێو زیندان دەگوازتەوە. نزار دەیزانی گەر وا نەکات ناتوانێت لە هیچ بەرەیەکدا بژی. ئەو نمونەی ئەو پیاوە ئەکرۆپاتانە بوو کە بە لیاقەتی گەمەزانێکی لێهاتووی سێرکەوە لە سەر نوکی پێ، خۆیان لە پەتێکەوە هەڵدەداو و لە سەر پەتێکی دیکە دەگیرسانەوە. سیاسەت لەو سەردەمەدا هیچ نەبوو جگە لە جۆرێک لە ئەکرۆپات، لە بالییە، لە لەشسوکی بێئەندازە، لە توانای خۆهەڵدان و بازدان و خۆهەڵواسین و خۆ هەڵگێڕانەوە. نزار زۆربەی ئەو هونەرانەی بەباشی دەزانی، بێئەوەی لە کاتی یارییەکاندا، دەستبەرداری شوناسی خۆی بێت، وەک سەرسەرییەک، وەک کەسێک کە لەزەتی لەوە دەبینی بێئاپڕوو دەربکەوێت. زۆر گرنگ بوو بەلایەوە لە ناکاو ئەو شتە بکات کە نابێت بکرێت... ئەو ڕەفتارە سەیرانەی وایانکرد، ناوی وەک شێتێکی ترسناک بە ناو خەڵکدا بڕوات. شەوانیش دەیخواردەوە و دەیخوێندەوە، بەپێچەوانەی لیڤیتانتەوە کە دژی شاعیران و کتێبفرۆشان بوو، بە ئەنقەست دەچووە لای ئەوان و ڕێز و حورمەتێکی تایبەتی نیشاندەدان، سەری بۆ دادەنەواندن، لە ئەکتێکی زۆر نمایشکارانەدا دادەنەوی و دەستی هەندێک شاعیری گەنجی ماچدەکرد تا بەوجۆرە ڕێز و حورمەتی خۆی بۆ ئەهلی ئەدەبیات نیشانبدات. هەموو کات بە ئاشکرا

دەیگووت «ئەهلی کتێب وەک من حورمەتی هیچ یاسایەکیان لا نییە، بۆیە خۆشمدەوێن چونکە وەک خۆم بێحورمەتن». لە قووڵاییدا باوەڕی وابوو کە ئەویش شاعیرە، بەڵام بە جۆرێکی تایبەت، شاعیرێک بێ هیچ قەسیدەیەکی نوسراو، بێ هیچ دیوانێک. گەر ئیشی شاعیران تێکشکاندنی وێنەی دونیا و دروستکردنەوەی بێت، ئەویش هەمان کاردەکات. دەیگووت «میزکردن بە موقەدەسدا ئەوە خواستی من و ڕۆشنفکیرانی گەورەیە... ئەوان بەدەم دەیکەن و من بە کردەوە». هەر جارێک بمبینیایە بێباک بەرامبەرم دادەنیشت و سووربوو لە سەر ئەوەی وەک شۆڕشگێڕێک سەیربیکەم، سووربوو وەک جیڤارا چروت بکێشێت، قاچی دەنایە سەر قاچ و دەیگووت «جەنگیز، من یەکەمین و دوا شۆڕشگێڕی راستەقینەم». هەستمدەکرد زۆر بریندار دەبێت و بە ڕیسواکردنێکی بەرچاوی دەزانێت گەر وەک شۆڕشگێڕ نەیبینم. دەیگووت «تۆ پیاوێکی بەدبەختیت، تێبگە، شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە سیاسەت دروستی ناکات، ئەخلاق دروستیدەکات... میز بکە بە ئەخلاقدا جیهان بۆ خۆی دەگۆڕێت، ئەوە تاکە کیمیای ڕاستەقینەی شۆڕشە». گەرچی دەیزانی هەموو ناوی جاشی لێدەنێین، بەڵام شێوەی وەستان و خۆ گۆڕین و خۆ دەرخستنی شتێکی تایبەتی تێدابوو وایدەکرد لە خائین یان خۆفرۆش نەچێت. جوانییەکەی پتر شۆڕشگێڕە ئەفسانەییەکانی بەیادا دەهێنایەوە، نەوەک سیمای خۆفرۆشە دزێوەکان. ئەوەندەی خزمەتکاری شێتییەکەی خۆی بوو، خزمەتکاری دەوڵەت یان هێزێکی دیاریکراو نەبوو. هەموو دەمانزانی لە هەر جێگایەک بێت، وادەکات شتەکان بە هەوای ئەو بسورێنەوە، بێئەوەی سەمای خۆی لە سەر ئاوازی کەس کۆکبکات. ئەو لەو شۆڕشگێڕە شێت و شەیتانییانە بوو کە لەگەڵ یاخیبوونی خۆیاندا تا سەر سنووری مەرگ دەڕۆن، بەڵام بێئەوەی جورئەتی ئەوە بکەن قاچ بخەنە ئەو دیو سنوورەوە دەگەڕێنەوە. نزار لە ناخیدا هیچ نەبوو جگە لە کەسێک کە دژی هەر شتێک بوو

ڕۆحی دەستەجەمعی ڕێزی بگرتبایە، بەڵام کە یارییەکە دەگەیشتە شوێنی مردن، دەیتوانی ڕووی بە جۆرێک وەرگێڕێت و بە چەشنێک خۆی بگونجێنێت هەموو شتێک لە یادبکات. هەڵبەت وەک هەموو ئادەمیزادێکی دیکە، لەوانەی کە ڕێسا شکێنیدەکەن، دەبوو هەندێک ڕێسای تر ڕەچاوبکات... بەڵام من هەرگیز نە پێش ئەو و نەدوای ئەو دوژمنێکی وەها گەورەی یاساکانم نەبینیوە... گاڵتەی تەنیا بە دین نەدەهات، بەڵکو گاڵتەی بە شەرەف، بە نیشتیمان، بە ڕێز، بە ویقار دەهات. جارێک ڕستەیەکی ترسناکی پێگووتم کە هەرگیز لە یادم دەرناچێت، گووتی «ئەسپکوژ، تۆ کابرایەکی سەیریت، شۆڕشگێڕەکانی براشت هەر خەڵکانی سەیرن. شۆڕش لە کوشتنی سەربازێک یان پۆلیسێکەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو لە کوشتنی خوداوە دەست پێدەکات». من گەرچی بێدین بووم، موچڕکێکی گەورەی سام لە بەری پێمەوە تا تەوقی سەرم تێپەڕی.

ئەو هیچ بەهانەیەکی جێنەدەهێشت، بە هۆیەوە خراپی و بەدبوونی خۆی دەربخات. کە لیڤیتانت نەغەدە ماردینی هێنا، نزار بۆ چەند ڕۆژێک بەردەوام لە چایخانەی شاعیران بە دەنگی بەرز دەیگووت «ژنی لیڤیتانت کۆنە یاری خۆم بووە، سێکسی تا بڵێی جوانە، وای کە سێکسێکی خۆشی هەیە». هەڵبەت هەموو قسەکان دەگەیشتنەوە لیڤیتانت، بەڵام هەستمدەکرد کە لیڤیتانت دەزانێت لە ئێستادا ناتوانێت هیچ بەرامبەر نزار بکات، هێند هەیە هەم من و هەم بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشی ڕاسپارد، دەمی نزار کەمێک دابخەین و کارێکبکەین باسی ژنەکەی نەکات. کە پێموابوو هەوڵی من و هەوڵی بەڕێوەبەری گشتی ئاسایشیش لەگەڵ کەسی وەک نزاردا تەنیا لە سنورێکی بچوکدا سوودی هەبوو.

***

هۆشەنگ زۆر هەوڵیدا نەغەدە بتوانێت باڵەکانی خۆی ببینێت، بەڵام سوودی نەبوو. بەدبەختن ئەو مرۆڤانەی کە فریشتەکانیان هەڵدێت و نایبینن. خانمی ماردینیش فریشتەکەی هەڵدەهات و نەیدەبینی. نەغەدە چیرۆکی باڵەکانی بە ورێنەیەکی شاعیریانەی بولبولیار لەقەڵەمدا. پێیگووت خوێندنەوەی بەردەوامی شیعر وایکردوە شتی بێمانا ببینێت، خەیاڵاتی پوچ بپەرنەسەری. بەڵام هەر چییەک بێت، بولبولیار دڵنیابوو کە گۆڕانکارییەکی گەورە لە ناخی نەغەدەدا ڕوویداوە. بینینی ئەو باڵانە هۆیەکی گرنگ بوو وابکات بولبولیار بەتەواوەتی لە خانمی ماردینی دوورنەکەوێتەوە. ئەو دوای بڕیاری شووکردنەکەی بە لیڤیتانت، بولبولیار پێیگووت کە لە ڕۆژی زەماوەندییەوە لەگەڵ لیڤیتانت ئیدی تا مردن نایەوێت بیبینێتەوە. هەڵبەت ئەم بڕیارە گەر دەمودەست جێبەجێ ببوایە بۆ نەغەدە سەخت بوو، ئەو گەلەک دڵی بە هۆشەنگ خۆشبوو، هەمیشە بە پشت و پەنایەکی ڕاستەقینەی دەزانی، بەڵام هەستیدەکرد لە ناخدا، لە قووڵایی دڵیدا توانای خۆشەویستی نییە، خۆشەویستی دەردێکە مرۆڤە جیدییەکان تووشی دەبن، کەسانی بێباک بەرگەی قورسایی عەشق ناگرن... عەشق کە وەک هەڵگرتنی شاخێک لە سەر دوو پەنجە، سەخت و دژوارە. گەر توانای خۆشەویستی هەبایە، هیچ کوڕێک وەک ئەم بولبولیارە هێمن و چاو جوانە، کە بەردەوام جۆرە گۆشەگیرییەکی نهێنی دەدرەوشێتەوە شایستەی عەشق نییە. بەڵام ئەوەی لە ساتی یەکەمەوە شتێک بەرەو ئەم هاوتەمەنەی خۆی کێشیدەکرد، هەستێکی ڕۆشنبوو، هەندێجار ناوی دەنا ڕاهاتن و هەندێجاری دیش خەیاڵی خۆی ماندوودەکرد و تەنیا بە وشەی «ئولفەت» ـی عەرەبییەوە دەگەڕایەوە. ئەوەی بەرامبەر هۆشەنگ هەستی پێدەکرد، عەشق نەبوو، بەڵکو ئولفەت بوو. خواستێکی بوو هەمیشە بیبینێت و لێی دوور نەبێت، دەیویست پردێکی نەبەدی کە بکرێت هەرگیز نەپچڕێت لە نێوانیاندا بێت، بێئەوەی

کەسیان بزانن ئەم پردە بۆ هەیە و بە دەردی چی دەخوات. بینینی باڵەکان وایکرد هۆشەنگ بزانێت کە نابێت زۆر لە خانم دووربکەوێتەوە. دڵنیابوو کە شووکردنەکەی هیچ لەوە ناگۆڕێت، کە خانم بە جۆرێک لە جۆرەکان و بێئاگای خۆی لە قەیرانێکی گەورەدایە.

دەبێت بڵێم لیڤیتانت، گەلێک بە ژنهێنانەکەی خۆشحاڵ بوو، ئەوکات خانووەکەشی تادەهات گەورەتر دەبوو، چەند ساڵ بوو، جودا لەو کۆشکە بچوکەی بۆ ژیان تەواوی کردبوو، ئەندازیاران و کرێکارانی تایبەت بەردەوام لە بناغەکەیدا ئیشیاندەکرد. هەندێجار کە پێکەوە پیاسەمان بکردایە، زۆر لە سەر خەونی خۆی دەربارەی ئەو خانووە دەدوا. ئەو یەکەمین کەس بوو کە هەڵگری ئەو خەونە سەیر و گەورانە بوو، خەونی دروستکردنی نهۆمبەندی بەرز، باڵاخانەی خورافی، گۆڕینی هەزاران فەدان زەوی بۆ هەزاران کۆشکی ئەفسانەیی، ڕای وابوو هیچ شتێک وەک باڵەخانەیەکی گەورە، شتێک بە چیمەنتۆ و شیش و بەرد دروستکرابێت، بەرگەی زەمان ناگرێت. بۆچوونی لیڤیتانت بۆ جاویدان، بۆ شتێک بمێنێتەوە، وەک بۆچوونی من یان بۆچوونی ڕۆشنفیکران نەبوو. ئەو ڕای وابوو شتی نەمر دەبێت لە هەموو جێگایەکەوە دیاربێت، هەیبەتی هەبێت، هەستی لاوازیی برەوێنێتەوە. هەستمدەکرد عەشقێکی سەیری بۆ شێلمان و دیواری درێژ و پایەی ئەستوور هەیە. کە لەگەڵیدا دەچوومە سەیری ئەو کرێکارانەی لە بناغەی کۆشکدا کاریاندەکرد، دەمبینی چ سەرسام سەیری شیشبەست و شێلمانچییەکان دەکات. زۆر جار وەک دەست لە لەشی ژنێک بدات، حەیران لە کۆڵەکە ئەستوورەکانی دەڕوانی و دەستی لێدەدان. ژنهێنانەکەشی لەگەڵ نەغەدەدا ئەو هەستەی بە بەهێزی پێدەبەخشی، ئەو چەند جارەی پێکەوە بینیمن، گەلێک ڕۆشن و سەرحاڵ دیاربوو، پێنەدەکەنی، دڵخۆش دەرنەدەکەوت، بەڵام پێشتر تەمێکی تاریک لە سەر ڕوخساری بوو ئێستا هێدی هێدی دەڕەوییەوە. کە دەمبینین هەمیشە لەگەڵ

نەغەدەدا قۆڵیان لە قۆڵی یەکدا بوو، هەر دووکیان باڵا بەرز، سارد، بێبزە بە ڕێکییەکی بێوێنە، وەک یەکێک هێڵێکی ڕاستی بۆ کێشابن دەڕۆیشتن. نەغەدە لەو دەمەدا هەمیشە کراسێکی مۆری لەبەردەکرد، کە بە ئەستەم تا ئەژنۆی دادەپۆشی. هەموو گەورەبوونی لە ناکاوی سکەکەیمان دەبینی. گەرچی بەردەوام قۆڵی لە قۆڵی لیڤیتانتدا بوو، بەڵام گەلێک دوور دەردەکەوت و هەمیشە پێدەچوو لە خەیاڵاتی خۆیدا نوقم بێت. من ئەو جارانەی لە نزیکەوە بینیبووم و سەرنجمدابوو، هەستێکم لا دروست بووبوو کە نەغەدە دوور و نزیک ئەو پیاوانەی بۆ گرنگ نییە کە لەگەڵیدان، وەک ئەوەی تەنها بیەوێت جۆرێک لە ژیان ئەزموونبکات و ئەوەشی بێ کۆمەکی ئەوان بۆ نەکرێت... نا لەو ژنانە نەبوو کە بڵێم پیاو تاقیدەکاتەوە یان ئەزموونی سێکسی کۆدەکاتەوە... ژنێک بوو دەیویست وادەرنەکەوێت وەک کەسێک کە خواستێکی هەیە، یان شتێک دەیبەستێتەوە، بە پێچەوانەوە هەمیشە وادەردەکەوت کە ئەو قۆڵەی بە دەستی لیڤیتانتەوەیە بەشە فەرامۆشکراو و بێئاگاکەیەتی. وەک بیەوێت پێمانبڵێت لە بێئاگایی و بێباکی و بێدەروەستییەوە قۆڵی بە قۆڵی ئەم پیاوەدا کردوە. من ساڵانێک دواتریش کە تێرامانم بۆ ئەو خانمە کردەوە، هەر هەمان هەستم هەبوو. هیچ هێزێک، هیچ پیاوێک، هیچ کێشەیەک نەیدەتوانی بۆ هەتاهەتایە داگیربکات. دەبوو هەمیشە پیاوێکی لەگەڵدا بایە بۆ ئەوەی هەستبکات بە هیچ شتێکەوە وابەستە نییە، ئەو هەر شتێکی کردبێت بۆ ئەوە بووە بیسەلمێنێت، ئاسان دەتوانێت دەستبەرداری ببێت.

یەکەمجار کە لیڤیتانت منی داوەتکرد و لەگەڵ خانمدا پێکەوە لە سەر سفرەیەک کۆبووینەوە، هەستمکرد خانمیش بایەخێکی بێوێنە بە بناغەکانی ئەم باڵەخانە بەرزە دەدات، کە ئەوکات هەر ناوی «کۆشکی لیڤیتانت» بوو. چەند جارێک ئەوەی دووپاتکردەوە کە مرۆڤ لە باڵەخانەیەکی

وەهادا دەتوانێت تەواو بێباک بێت. هەستمکرد گرنگیدان بە باڵەخانەکە بۆ ئەوەیە پێمبڵێت، پوچی هەموو شتەکانی دیکەی دونیا وایانکردوە، ئەم باڵەخانەیە گرنگ بێت، بێباکی درهەق بە ئادەمییەکان وایکردوە ئەم چیمەنتۆیە نرخی هەبێت... لەو دانیشتنەدا بە دەنگێکی کز کە لەدەنگی ڕاستەقینەی خۆی نەدەچوو، گووتی «جەنگیز حەزی من لەم باڵەخانەیە، وەک حەزی دینداریک وایە بۆ خودا، وەختێ شتەکان پوچ بن، ئینسان بۆ شتێک دەگەڕێت لە پوچی ڕزگاریبکات. ئەم باڵەخانەیە بۆ من دەتوانێت شوێنی هەموو موقەدەسێک بگرێتەوە... من ناپەرستم، عیبادەتی ناکەم، بەڵام دەمەوێت بۆ خۆمی بسەلمێنم کە مرۆڤ چ ئاسان دەتوانێت. هەموو شتێک بۆ خۆی دروستبکات، هەتا خوداش بۆ خۆی دروستبکات... من فریوەکەیم مەبەستە، ئەفسونەکەی، ئەو درۆیەی کە مرۆڤ دەتوانێت لەگەڵ خۆیدا هەڵیبگرێت و بیگێڕێت و بۆی بژی». هەندێجار دەنگی نەغمەیەکی گەلێک ناسک و شاعیرانەی تێدەگەڕا. ئەوکات تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، دوای چەند ساڵێک جارێکی تر لێمبیست بە ساردی ژنێکەوە کە عاریفێتی خۆی بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا ڕادەکێشێت، بە یەکێک لە تیوریستێنە ئیسلامییەکان دەڵێت «کە ئەوکات زۆر لە دژی قسەیاندەکرد» «بێباکترین مەخلوق لە سەر زەوی دینداره ڕاستەقینەکانن، هیچ کەس وەک ئیماندارێکی ڕاستەقینە بەرامبەر دونیا بێباک نییە». ئەوکات تێگەیشتم، ئەو پەرستنی خودا بە ڕێگای فەرامۆشکردن و بێباکی دەرهەق بە ئینسان دەزانێت. ئەودەم تیرۆریستەکان لە باکوورەوە بۆ باشوور ئاگریان لە وڵاتەکە بەردەدا، نەغەدە بەخیلی بە بێباکی خودکوژەکان دەبرد، هەستیدەکرد ئەوان لە پلەوپایەی بێبکایدا زۆر لەم لە پێشترن. ئەو جارە بەو مامۆستایەی گووت «مەلا... خوداپەرستی هیچ شتێک نییە جگە لە بێباکی دەرهەق بە ئینسان، ئەوەی ئازاری پوچی بچێژم لای من ئەخلاقیترە لەوەی وەک

تۆ دەرمانێکی درۆ بخۆم، دەرمانێکی درۆ دروستبکەم، دەرمانێکی درۆ بفرۆشم. من زۆرجار دەمەوێت بێباکی تا ئەوپەڕی ڕابکێشم، بەڵام هیچ کات ناگەمە ئەو بێباکییەی لە ناخی ئیمانداریێکی ڕاستەقینەدا هەیە. ئەوەی سەیری هیچ نەکەم باشترە لەوەی لە چاوەڕوانی وەهمێکدا هەمیشە سەیری ئاسمانبکەم. بێباکی من لەوەدا تەواو دەبێت، بورجێکی بێمانا و ئاسنین بۆ خۆم لە هەموو شتەکان دروستبکەم، بەڵام عەشقی تۆ بۆ خودا لەوەدا تەواودەبێت، ڕقت لە دونیا بێت، لەوەدا تەواو دەبێت خۆت بە دونیادا بتەقێنیتەوە. من دەتوانم تا ئەو جێگایە بڕۆم ئازاری پوچی بە خەندەیەکەوە قەبووڵبکەم و لەزەت لەو پوچییە وەربگرم. بەڵام هیچ کەس وەک ئیمانداران باوەڕی بە بێمانایی ژیان نییە، من دەمەوێت بگەمە پلەی ئێوە لە پوچگەراییدا. مامۆستا لەدواجاردا تۆ هەرگیز نە لە من شادتریت و نە لە من بەڕەوشتتریت. بە پێچەوانەوە، من کاری مەحاڵدەکەم بۆ ئەوەی وەک تۆ بەدڕەوشت بم، چونکە بەدڕەوشتی گەورە ئەوەیە بێباک بین بەرامبەر دونیا و تۆش بێباکیت بەرامبەر دونیا، شەو و ڕۆژ تفی لێدەکەیت، هەموو نوێژێکی تۆ جۆرە نەفرەتێکە لە ژیان و لە ئینسان و لەزەوی... من زۆر مەراقمە بگەمە ئاستی تۆ لە بێباکیدا بەڵام ناتوانم و نایگەمێ، چونکە وەک تۆ هۆکان و کەرەستەکانم پێ نییە».

خانم لە سەرەتاوە بەوجۆرە تەعبیری لە بێباکی خۆی دەکرد، بەوەی لە دروستکردنی شتێکی بێمانای گەورەدا بەشدار بێت کە بورج بوو. سەرسامی بە بورج نیشانەی بێباکی بوو بەرامبەر بە ئینسان. لە کۆتایی دەیەی یەکەمی ساڵی دوو هەزاردا کە دروستکردنی خانووی گەورە و فرە قات بوو بە نەخۆشییەکی کوشندە و هەموو جۆرە خەڵکێکی گرتەوە، بەردەوام گوێم لە پیاوان و ژنان دەبوو بە باڵای باڵەخانەکانی خۆیاندا هەڵیاندەڕوانی و دەیانگووت «مرۆڤ گەر خاوەنی ماڵێکی وا بێت. ئیتر دەتوانێت بێخەم و بێباک بێت». ئەودەم وردتر تێدەگەیشتم کە هەر

یەک لە خانمی ماردینی و لیڤیتانت و نزار، پێشوەخت پەیامهێن و پێغەمبەرانی ئەو سەردەمە بوون کە بیست ساڵ دواتر هێدی هێدی ڕوخساری ڕاستەقینەی تەواو دەرکەوت.

لە سەرەتای مانگی حەوتی سکەکەی خانمدا، بۆ یەکەمجار بولبولیارمان لە کۆشکی لیڤیتانتدا بینی، دەرکەوتنی بولبولیار لەو کۆشکەدا و بەوجۆرە مایەی سەرسامی هەموومان بوو. بولبولیار لای هەمووان لە شۆڕشگێڕە هەرە ساف و مرۆڤدۆستەکان بوو، کە بە هۆی زیادەڕەویکردنییەوە لە عەشقی ژیاندا شۆڕش بە کەسێکی پاسیڤ و دوژمنی دەزانی، ئێستا کە بە خۆی و ڕیشە قەڵەمی و نیگا هێمن و قووڵەکانییەوە لای لیڤیتانت دەرکەوت، هەموو ئەو زماندرێژ و دەرون نەخۆشانەی بێباک پێشداوەریدەکەن، هەموو تۆمەتساز و بەدنیازەکانی شار، ئەو پەیوەندییەی بولبولیاریان بە لیڤیتانتەوە بردەوە بۆ خیانەتێکی دێرینی ئەم کوڕە لە هاوڕێکانی و وایاندەرخست ئەمە میوەی نوێی درەختێکی کۆنە و ئەمڕۆ دێتە بەر.

بەڵام من دەمزانی کە دەرکەوتنی زۆری بولبولیار لە بەردەمماڵی لیڤیتانتدا دەگەڕێتەوە بۆ تێکچوونی تەندروستی خانم. بۆ ئەو وابەستەگییە تایبەتی و نهێنییەی کە بولبولیار بە ماردینییەوە دەبەستێت. لە سەرەتای حەوتەم مانگی زگەکەیدا، خانم چەند جارێک بە نامەی تایبەتی، ناردی بەدوای بولبولیاردا و تکایکرد کە زویر نەبێت و بیبینێت. ئەو کات دۆخێکی هەبوو کە پزیشکان تێی نەدەگەیشتن، تایەکی سامناک دەیگرت و لەشی تووشی ڕاتەکان و داچڵەکان و لەرزینی زۆر دەهات، وەک هێزێکی گەورە بیهێنێت و بیبات لە ژوورەکەی خۆیدا شتێکی نادیار یاری پێدەکرد. دکتۆرەکان دەستەوەستان لە حاڵەتەکەی پەیان بە هیچ هۆکارێک نەدەبرد و لەبەر زگەکەشی نەدەکرا دەرمانی لە سەر تاقیبکەنەوە. دەردەکەی تەواوی نیشانەکانی کەسێکی فێگرتووی هەبوو،

بەڵام خۆشی دەرهەق بە دۆخی خۆی نائاگا و سەرسام بوو. بولبولیار لە دوای دواهەمین هەوڵییەوە بۆ پەشیمانکردنەوەی لە شووکردن بە لیڤیتانت، تەنیا دوو جار بۆ هەواڵپرسی، تەلەفونی بۆ تازە بوکەکەمان کردبوو، بەتایبەت خانم جگە لەوەی بەقسەکانی بولبولیار دەربارەی باڵەکانی پێبکەنێت و بکەوێت بە پشتدا هیچ پەرچەکردارێکی نەبوو، ئەو هانبدات لە نزیکەوە لە مەترسی باڵەکان بیپارێزێت. نەغەدە ئەو دەم بە ئازادی کەوتبووەوە هاتوچۆ. ژیانی دوورودرێژی خۆشاردنەوە لە چەند ساڵی پێشوودا ئارەزوویەکی گەورەیان تێدا دروستکردبوو، گوێ نەداتە سکەکەی و نەسرەوێت و بێپشوو بە شاردا بگەڕێت، ئەو دواجار بۆی گرنگ نەبوو منداڵەکەی بژی یان بمرێت. لە پیاسەکانیدا سیحراوی و ویقاردار دیاربوو، خۆی ڕێزی خەڵکی نەدەگرت، بەڵام شێوەی خۆگۆڕین و دەرکەوتنی جۆرە ڕێزێکی تایبەتی بە سەر خەڵکدا دەسەپاند. وردە وردە شار ئەوەی لە یادچووەوە کە سەردەمانێک ژنی دکتۆر مستەفا شوکاک بووە و تەنیا بە «خانمی لیڤیتانت» یان «خێزانی کاک عومەر» بانگیاندەکرد، دەملووس و ماستاوچی و زمانچەورەکانیش ناوی «براژن» یان لێنابوو. نەغەدە ژیانی نوێی پێخۆش بوو، شێتێتی سەردەمی گەنجی و یاخیێتی سەرەتای شاعیریی هێدی هێدی لە ناویدا دەمردن. لیڤیتانت لەو پیاوانە نەبوو کە بە خۆشەویستی یان بە کینە، بە عەشقی شێتانە یان بە زنجیرەی نەرێت و ئاکار ژن دیلبکات، سەیربوو، ئەو پیاوەی ئارەزوویەکی ترسناک پاڵی پێوەدەنا نێرەکان بگرێت و ئەشکەنجەیان بدات تا بچوک و دڵ خەسیو لە بەردەمی دەرچن، دەرهەق بە ژنەکەی گەلێک کراوە و بێگرێ دەردەکەوت... نەغەدە بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا هەستیدەکرد دەتوانێت هەموو شتێک بکات، بێئەوەی ئیشەکانی هاودەمی هەستکردن بە گوناه بن. جوانترین و ترسناکترین ژیانیش ئەوەیە مرۆڤ گوناه بکات بێئەوەی هەستی بە گوناه لادروست بێت، نەغەدەش لەو

دەمەدا بەوجۆرە بوو، دەیتوانی هەر شتێک بکات، بێئەوەی خولیای چاکە و خراپە، ترس یان دوودڵی بیهەژێنێت. لە کۆشکەکەی لیڤیاتانتدا، لەو ژیانە کراوەیەدا، لەو دەسەڵاتە زۆرەدا، لەو ئازادییە بێسنوورەدا کە هەستی پێدەکرد، قووڵ ئەو هەستەی هەبوو کە دەتوانێت دەرهەق بە هەموو شت کەمتەرخەم و بێباک بێت، هەتا هەر گوناهێکیش بکات کەدەیەوێت، بێئەوەی خۆی بخاتە مەترسییەوە. کۆشک بەدیوێکدا بێباکی نەغەدە ماردینی گەورەتر کرد، بەدیوێکیشدا هەندێ ڕەفتاری نوێی تیا چاند کە لەوەو پێش نامۆبوون بەو. گرنگترین شتێک خانم لە سەرەتادا کردی سەردانی بوو بۆ کۆڕە ئەدەبییەکان، لەو دەمەدا بۆ یەکەمجار یەکێک لە گۆڤارەکان وێنەیەکی گەورەی لەگەڵ یەکێک لە شیعرەکانیدا بڵاوکردەوە... تا ئەو کاتە نەغەدە ماردینی، وەک شاعیر ناوی هەبوو بێئەوەی دەموچاوێکی بینراو و دەرکەوتووی هەبێت، زۆربەی ئەدەبدۆستان شتێکیان لە چیرۆکی ژیانی دەزانی، بێئەوەی دیبێتیان. دەرکەوتنی بەو جوانییە و بە ویقاری ژنێکی سکپڕەوە کە ماوەیەکی نزیکی داهاتوو دەبێت بە دایک، سەرسامییەکی زۆری لای خوێنەران و شاعیران دروستکرد، هەڵبەت ئەو ویقار و جوانییە وایکرد، زۆر لە شاعیر و شاعیرۆچکەکانی ئەو زەمانە بخوازن لێی نزیکببنەوە و دۆستی بن، بەڵام بەوەدا زۆبەی شاعیران ترسێکی بێوێنەیان لە لیڤیاتانتی مێردی هەبوو، کەسیان جورئەتی سەرکێشییان نەبوو. ئەویش لەو سەرەتایەدا کە باق و بریق و درەوشەی ناوەکەی خۆی دەبینییەوە، گەرچی بەرامبەر هەمووی بێباک بوو، بەڵام خۆی بە خۆشبەخت دەزانی بتوانێت لە جێگایەکی بڵندترەوە سەیری شاعیرانی تر بکات. هەر زوو هەموو هەستمانکرد، کە ئەو کچە یاخی و نائارامەی ئابڕووی دکتۆر مستەفا شوکاکی برد و شەرەفی خستە ژێر خۆڵ و خاشاک، خەریکە بەرەو ئەوە دەچێت ببێت بە ژنێکی سەلار و ڕەفتاری بە جۆرێکی بەرچاو بەرەو شێوە غرورێکی

ئەرستۆکراتیانە دەگۆڕێت. لەو چەند مانگەی سکپڕیدا بەر لەوەی تەواو نەخۆش بکەوێت، لەگەڵ دوو سێ کچە شاعیری دیکەدا بەردەوام لە یەکێک لە باڵکۆنەکانی کۆشکدا دەمانبینین، چا و کێکیان دەخوارد و پێدەکەنین و شیعریان بۆ یەکتر دەخوێندەوە.

دەمێک ناوی ئەو وەک ژنە شاعیرێک لە پێشڕەوتدا بوو، لە هەمان شان و زەماندا ڕەشمارا بە جۆرێکی بەرچاو درێژەی بە وەحشیگەرییە پێشینییەکانی خۆی دەدا. سەرەتا کە خانمی ماردینی هێنا، هەندێک لە دڵەوە کەوتنە هیوای ئەوەوە، ئەم هاوسەرگیرییە کۆمەک بە لیڤیاتانت بکات تا کەمێک هێور و ئارام بێتەوە، بەڵام من دڵنیابووم شتێکی لەو جۆرە ڕوونادات، چونکە کاراکتەری لیڤیاتانت چەشنێکی تر بوو. ئەو خانمی ماردینی نەکردبووە هاوسەر تا خانم کار لەو بکات، بەڵکو لە ڕێگای نەغەدەوە دەیویست بیسەلمێنێت، کە شاعیران گەرچی تەمۆک و غوبارییەن، بەڵام هەڵگریی بڵندییەکی ئەوتۆ نین پۆڵی پێچەوانەی ئەو بێت. مەخلوقاتن دەستەمۆدەکرێن، دەگیرێن، دەخرێنە پێخەفەوە، ملیان پێ کەچدەکرێت، گۆشتیشیان هەر وەکو گۆشتی ئادەمیزادانی ترە. نەک هەر ئەوە، بەڵکو وەک هەر بوونەوەرێکی خودپەرست و تەنیا خۆبین دەتوانن لە نزیک جەلادەوە بوەستن و هیچ نەڵێن. لیڤیاتانت مەبەستی بوو مۆراڵی شیعر بێلایەنبکات، بێدەنگیبکات، بەجۆرێ نزمیبکاتەوە بتوانێت بخەوێت و لەوە نەترسێت بەهایەکی باڵاتر و بەرزتر هەیە، کە لەو بەهێزترە و دەتوانێت ئاسوودەگی تێکبدات. هەر شەوێکیش لەگەڵ نەغەدەدا دەخەوت، بڕوای وابوو کارێک دەکات، وەک سووتاندنی کتێبەکان، وەک ترساندنی شاعیرانی چاپخانەکە، وەک ئەشکەنجەدانی خوێنەری کتێبە نهێنییەکان... لە ڕێگای چوونە ناو لەشی نەغەدەوە، قووڵ بە ئامڕازە نێرانە ئەستوورەکەی، هەموو ئەو دونیا تاریک و تەلیسماوییەی کتێبی دەکووتا کە بە کردار و هوشیاریی و بیرکردنەوە بۆی نەدەکرا.

هەر لەو ماوەیەدا من بەردەوام چەندین ناوم لە ڕێکخراوە نهێنییەکانی حیزب و ئەنجومەنی باڵا وەردەگرت و بە لیست دەمدایە دەست لیڤیتانت، ئەویش بێباک و بەخێراییەکی سەرسوڕهێن خاوەن ناوەکانی ڕاپێچی زیندان و ئەشکەنجە دەکرد. زۆربەی قوربانییانی ئەو سەردەمەمان ئەندامان و هەوادارانی پارت و تاقمە سیاسییەکانی دیکە بوون کە حیزب چوبووە جەنگێکی بێبڕانەوە لەگەڵیاندا و دەمانویست لە سەر نەخشەی سیاسی لاوازیانبکەین و بیانسڕینەوە. یەکەمین زیندانی بورج لە ژێر زەمینی کۆشکەکەی لیڤیتانتدا بوو، سەرەتا هەموو واماندەزانی کە خانمی ماردینی هەواڵی لەو ژێر زەمینە ترسناکەی ژێر ماڵی خۆی نییە، کە دەرگایەکی نهێنی و تایبەتی هەبوو. زیندانێک کە هەم ڕەسمی و هەم ناڕەسمیش بوو، بە جۆرێکی یاسایی لە تۆمارەکانی ئاسایشی باکور و لەلای ڕێکخراوەکانی حیزب تۆمار نەکرابوو، ناوی وەک زیندانێک لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی زیندانەکان نەبوو، بەڵام هەموو بەعسییە گەورەکان و فەرماندارانی شار دەیانزانی و بەکاریشیاندەهێنا. ئێمە هەر نەیارێکمان بایە و بمانزانیبایە خەریکە بۆنی مەترسی لێدێت، ناوەکەیم دەدایە دەست لیڤیتانت و ئەویش بە تۆمەتی جیاواز جیاواز دەیخستنە ژێر ئەشکەنجەیەکی قورسەوە. لەوەدا لیڤیتانت کۆمەکێکی گەورەی بە حیزبی ئێمە کرد لە ناو شاردا هێزی سەرەکی بین و حیزبەکانی تر بە جۆرێکی بەرچاو خەباتی ژێرزەمینی خۆیان دە قاتی ئێمە ببەنە ژێر زەوییەوە. هەر زوو هەموو زانیمان کە نەغەدە ئاگاداری ئەو زیندانە گەورەیەی ژێر زەمینی کۆشکە و بەڵام تا ئەوپەڕی بێباکی بەرامبەری بێباکە و بەو پەڕی لە سەرەخۆی و ئارامی دادەنیشێت و لە باڵکۆنەکەی خۆیدا شیر دەخواتەوە و شیعر دەنوسێت.

تا خانم گەیشتە مانگی حەوتەمی زگەکەی، هەموو شتێک هێمن و ئارامبوو. بەڵام لە کۆتایی مانگی شەشەم و سەرەتای حەوتەمدا،

تەندروستی بە جۆرێکی کتوپڕ و بەرچاو تێکچوو، ئیدی ژیانی منداڵەکەی کەوتە مەترسییەوە. کە چەند جارێک ئەو نۆبەتە توندانەی دەردی بۆ هاتەوە، ئەو قسانەی هۆشەنگی هاتەوە یاد دەربارەی فریشتەیەک کە جگە لەو کەسی دی باڵەکانی نابینێت، نەغەدە لە ناخیدا باوەڕی بەو چیرۆکە نەبوو، بەڵام ناوازەیی نەخۆشییەکەی، ناوازەیی ئەو چیرۆکەی هێنایەوە یاد و بە نامەی تایبەت بولبولیاری لە دۆخی خراپی خۆی ئاگادارکردەوە. بۆ یەکەمجار هەستیکرد لە مردن دەترسێت. هۆشەنگ نەیدەتوانی ماوەیەکی درێژ بەرگەی داواکانی ماردینی بگرێت، بەڵام کاتێک گەیشتە لای، پەرێشانی و ماندوویێتی خانم سەرسامیکرد، بە درێژایی هەموو ژیانی نەغەدەی بە جلی قەشەنگ و ڕوخساری مەکیاژکراوەوە بینیبوو، بەڵام ئێستا ئافرەتێکی ورگ زلی دەبینی لە ماکسییەکی شینی کاڵدا، بە قژێکی نەشۆراوەوە، بە جووتێک چاوی ماندووەوە، بە ڕەنگێکی زەردەوە، لەگەڵ جووتێک باڵی سپی سپیدا... سپیتر لە باڵی هەموو ئەو فریشتانەی تا ئەوکات بینیبوونی.

بولبولیار جارێکی تر هەموو ئەو حاڵەتەی بۆ باسکردەوە، بەڵام نەغەدە گەرچی شاعیر بوو، کەچی لە ژیانی ڕۆژانەیدا تەنیا باوەڕی بەو شتانە دەکرد کە بە چاوی خۆی دەیانبینێت. بێئەوەی باوەڕ بە هیچ وشەیەکی بولبولیار بکات بە هۆشەنگی گووت «گرنگ ئەوەیە زۆر ئازارم نەبێت... گرنگ ئەوەیە، شتێکم بۆ بکەیت، لەم ئازارە دەرچم». بولبولیار بە ئەسپایی پێیگووت «تاکە کەسێک بە ڕاستی بتوانێت یارمەتیت بدات، دکتۆر مستەفا شوکاکە... دەتەوێت؟؟». نەغەدە تووڕەبوو، هاواریکرد، چەندین جار مشتی کێشا بە لێواری جێخەوەکەیدا، دوا شتێک لە دونیادا بیویستبایە، ئەوەبوو دکتۆر ببینێتەوە. ئاگاداربوو کە دۆخێکی پەرێشانی هەیە، لە لیڤیتانتەوە هەواڵی زانیبوو کە شەوانە لە یانەی پزیشکان بە تەنیا لە سەر مێزێک دادەنیشێت بێ هاوڕێ و

بێ هاوپێک مەستدەبێت. ئێستا بۆ ئەوەی ئازار نەکێشێت و منداڵەکەی نەمرێت، بولبولیار پێیدەڵێت تەنیا ئەو و ژنێکی دی بە ناوی «ڕێزانی مەلەکبین»ـەوە دەتوانن یارمەتیبدەن... هۆشەنگ ئارامیکردەوە و تێیگەیاند کە بینینی دکتۆر دەشێت کارێکی بەوجۆرە بەد نەبێت کە ئەو بیری لێدەکاتەوە. بۆ ڕۆژی دوایی ڕێزانی مەلەکبین و مەهدائیلی فریشتە لە سەر داوایەکی تایبەتی هۆشەنگ هاتن بۆ بینینی خانم. دەبێت بزانین کە «دایکی فریشتەکان» پێشتر دۆخی وەهای نەبینیبوو، مەهدائیلیش تا ئەو دەم ڕێکەوتی دۆخی واسەختی نەکردبوو... خانمێک لە مانگی حەوتەمیدا فریشتەکەی مانبگرێت و بیەوێت بترازێت و بیکێشێت بەزەویدا، لە هەموو شتێکیش بەدتر ئەوەبوو کە خودی خانمی ماردینی باوەڕی بە بوونی فریشتەیەکی وا نەخۆش لە ناخی خۆیدا نەدەکرد. ڕێزان کە لە مەهدائیل و بولبولیار باشتر لە زمانی ئافرەتانی دەزانی، هەر دوای چەند سات‌ێک گفتوگۆ پێیگووت «بەساقە، ئەمەی تۆ هەر نەبووە، باوەڕدەکەیت باشە، باوەڕناکەیت ئارەزووی خۆتە... لە بەرئەوەی تا ئێستا پیاوان بە سەر قاچ و قووڵتدا کەوتوون، وامەزانە ئیتر بووی بە شاژن. ئەوە کوێریش دەیبینێت، فریشتەکەت بیمارە... غرور بنێرە ئەولاوە. ئێمە بەس دکتۆر مستەفا شوکاکی کۆنە مێردی خۆتمان هەیە. هەم شتێک لە ئینسان و هەم شتێک لە فریشتە تێدەگات... بەخوا نازانم، لەوانەیە لە هیچیشیان تێنەگات. مێردی خۆت بووە بەقوربان... مێردی خۆت نەبووە، خۆ مێردی من نەبووە، گەر مێردی من بایە قسەیەکی ترمان لێدەکرد. گەر مێردی من بایە سەد فریشتەم لێدەرچووایە باکم بە هیچ نەبوو، بەس بزانە ئەو شوکاکەی مێردت کەللە پوتێکە، هەشت مەکینە لە سەریدا یادگارییەکانی تۆ دەربهێنن تۆ لە مێشکی دەرناچیت و لە خەیاڵی ناکەویتە خوار... ئەوە بڕوای منە... هەشت مەکینەی گەورە... عەزیزم بە خودا ئەوە ڕاستییەکەیەتی. ئاه

ئەگەر تۆ لە سەری دەرچووبایت، من چیم دەویست. بەس هەق بڵێم تۆ ژنێکی جوانیت، ئەوە یەکەمجارە دەتبینم، بەس ژنێکی جوانی. تۆ بۆ من هەمیشە هەر ژنەکەی دکتۆر شوکاکیت... هەر ئەویت. ئەم ئیشە بەبێ دکتۆر ناکرێت، من ئەم نەخۆشییەم بینیوە، هەموو ئەوانەی کە فریشتە لە گیانیان دەردەچێت بە قۆناغێکی واسەختدا دەڕۆن، مەترسە تۆ خۆت نامریت، مەگەر منداڵەکەت، بۆ ئەوەی هەموو شتێک باش بێت، بۆ ئەوەی خۆت و فریشتەکەت و منداڵەکەت باش بن دەبێت تیمێک دروستبکەین... دەبێت بەردەوام ئاگادارت بین، دەبێت دووانمان بەردەوام لێرەبین. نەبا فریشتەکەت بیەوێت زگەکەت پێ لە باربەرێت. من عەقڵم بێت ئەو فریشتە کەللەپوتەی ناوت، دڵی بەم زگەت خۆش نییە. بەقوربان، ئەم دەموچاوەت بخەرە ئەولاوە... ئەم عەقڵەت بخەرە ئەولاوە... دەبێت دکتۆر شوکاک بتبینێت».

نەغەدە لە هیچ شتێک حاڵی نەدەبوو، لە هیچ شتێک. ئەو کات وەک ژنێکی دوو گیان، کە ژیانێکی نوێ دەژی، دۆخی سایکۆلۆژی تەواو گۆڕابوو، چیتر ئەوە نەبوو بتوانێت بێباکی خۆی بپارێزێت... ترسێکی گەورەی هەبوو ژیانی خۆی لە دەستبدات، کەمێکیش لە مردنی منداڵەکە سڵیدەکردەوە، دواجار مەبەستی بوو منداڵێکی ببێت. ژنان لەو ڕووەوە سەیرن، هەندێکیان ساڵەهای ساڵ شەڕێکی شێتانە دژ بە غەریزەی دایکایەتی خۆیان دادەگیرسێنن، بەڵام لە ناکاو توانای بەرگرییان لاواز دەبێت و شێتانە دەکەونە داوی ئەو تاکە غەریزە بڵند و موقەدەسەی مرۆڤ، هەندێجار هەرەسی ئەو بەرگرییە دەگەڕێتەوە بۆ عاشق بوونیان بەو پیاوەی کە منداڵەکەی دروستکردوە، هەندێجاریش وەک ڕێگایەک بۆ دەرچوون لە بێمانایی ژیان و بوونی خۆیان دەیبینن. پێوەری خۆشەویستی ژن بۆ پیاو ئەوەیە چەندە حەزی لە منداڵەکەیەتی، چەند دەیەوێت ئەو خۆشەویستییە ببێتە شتێکی کۆنکرێت، بە بوونەوەرێکی تر، بە ژیانێکی

نوێ... ئەو غەریزەیە هەرگیز لە پیاودا نییە، خۆشەویستی لای پیاو یان ڕەشەبایەکی تێپەڕە و بە ژیانیدا هەڵدەکات، یاخود غەمێکی قووڵە و هەرگیز لاناچێت، یان ئاواتێکە دێتەدی و تێردەبێت و دەمرێت، بەڵام خۆشەویستی لای ژن زیاتر بە بارگەی زیندەگی قاندراوە، لە کاتێکدا لای پیاو هەر لە سەرەتاوە پڕە لە ئەگەری مردن. بەڵام حەزی ماردینی لە منداڵ، شتێکی سەیرتر و تایبەتی تر دەیجوڵاند، شتێک بوو قووڵ لەو جیهانە تایبەتی و داخراوەی ماردینی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبوو. ئەو ساڵانێک بوو بە کچە یاخییەکەی ناو ڕۆحی، بە ژنە شاعیرەکەی دەروونی دژی ئەو خانمەی ناخی بوو کە دەیویست ببێتە دایک، بەڵام لە ناکاو لە پلەیەکی بێباکیدا گەیشتبووە ئەو دەرەنجامەی کە دروستکردنی منداڵێک ئەوپەڕی بێباکییە، ئەوپەڕی ڕێزنەگرتنی مرۆڤە... هیچ شتێک لەوە ئازاربەخشتر نییە مرۆڤێک دروستبکەیت. گەورەترین بێحورمەتییەک مرۆڤ دەرهەق بە دونیا بیکات، ئەوەیە منداڵێک دروستبکات. ئەوەی بزانیت چ پوچی و ئازارێک چاوەڕوانی ئەم بوونەوەرە دەکات، بەڵام سووربیت لەوەی بە ناوی دایکایەتییەوە دروستیبکەیت، ئەوە ئەوپەڕی بێباکی و نابەرپرسیاریێتی و خودپەرستی مرۆڤە، کەواتە بۆ ئەزموونی نەکات؟ بۆ درێژە بە هەمان ئەو پوچییە قووڵە نەدات کە بەر لەو ئادەمیزادەکانی دیکە گەشبینانە درێژەیان پێداوە... لای نەغەدە هەموو شتەکان بە جۆرێک لە جۆرەکان پێچەوانەی خۆیان دەردەکەوتن، لای ئەو لە دایکبوونی منداڵێک، سەمبولی درێژەدانی ژیان نەبوو، بەڵکو سەمبولی درێژەدان بە بێمانایی بوو... بێماناترین و ئاسانترین و دڕندانەترین کارێک کە مرۆڤ بیکات ئەوەیە منداڵێک دروستبکات، ئەوە هیچی کەمتر نییە لە کوشتن.

جارێک لە کاتی نەخۆشییەکەیدا، بە ڕێزانی مەلەکبینی گووتبوو «ئەوەی وای لە من کرد، منداڵێک دروستبکەم... ئەوەیە بیسەلمێنم،

دایکایەتـی شـتێکی پیـرۆز نییـە. دروسـتکردنی ئینسـانێک و کوشـتنی، دوو شـتی زۆر دوور نیـن لەیـەک». خانمـی مەلەکبینیـش پێیگوتبـوو «ڕاسـتدەکەیت دڵەکـەم. ئـەوەی ئینسـان تووشـی ئـەم نەخۆشـییە بـووە بـەردەوام بـژی، دەردێکـی بێمانایـە. گـەر عەقڵمـان بووایـە بـەر لـەوەی دونیـا کۆتایـی بێـت، خۆمـان لـە نەسل و زاوزێ دەوەسـتاین و تـۆزە تـۆزە کۆتاییمـان بـەم شانۆگەرییە ناخۆشـە دەهێنـا... بـەڵام تـۆ منداڵەکـەی خـۆت دروستبکە و کارت بـەوەوە نەبێـت چـی لێدێـت، هـەر وابکـە وەک دایـە حـەوا پێشـتر کردوێتـی، منـداڵ دروسـتبکە و مەپرسـە دوایـی چـی دەبێـت. ئـاە هەمـوو ئـەم بەزمـە گوناهـی ئـەو نوحـە باوەحیزەیـە. خـودا کـە فەرمـووی تـەواو ئیتـر تـەواو، بـەس ئـەو باوەحیـزە و کەشتییە شـەق و شرپەکەی، وای. بڵـێ تـو خـودا ئـەوە ئیش بـوو نوحـی بەدفـەڕ تـۆ کـردت. ئینسـان چییـە؟ بـەوەی شـیردەدات بـە کۆرپەکـەی و نانـی دەداتـێ، مانـای ئـەوە نییـە لـە ماسـی باشـترە کـە گـەرا دەکات و فرێـی دەدات. نـا عەزیـزم غـرور بخـەرە ئـەولاوە، ئێمـە قـەت لـە ماسـی باشـتر نیـن. ئێسـتا تـۆ بـەم زگـە زلەتـەوە لـە هیـچ باشـتر نیـت، نـە لـە ماسـی، نـە لـە کەروێشـک، نـە لـە پشـیلە، نـە لـە مـن کـە سـوپاس بۆ خـودا هیـچ پیاوێـک نەیویسـتووە ئـاوا وەک تـۆ پەمپـم لێبـدات. نـا تـۆ لـە هیـچ باشـتر نیـت. بەسـاقە، نەغـەدە خـان، منداڵی خـۆت دروسـتبکە و دەمـت داخـە، ئـەوە باشـترین شـتە بـۆ ئـەوەی خـودا و بەشـەرەکانی تـر لێـت نەڕەنجێـن... بـەس ڕاسـتت دەوێـت، مـن تێناگـەم بـۆ ئـەم فریشـتەیەی نـاوت دەیەوێـت ئـەم زگـەت لـە باربەرێـت؟»

زۆری ویسـت تـا نەغـەدە و لیڤیتانـت ڕازی بـوون، دکتـۆر شـوکاک بێتـە کۆشـک. تـەواو ئـا لـەو سـاتەدا بـوو مـن تێکەڵـی چیرۆکەکەیـان بـووم. بولبولیـار هـات بـۆ لام و بـە حوکمـی پەیوەنـدی دێرینمـان تکایکـرد هەوڵبدەم لیڤیتانت بخەمـە سـەر ئـەو بڕوایـەی هاتنـی دکتـۆر پێویسـتە بـۆ پاراسـتنی ژیانـی خانمـی ماردینـی. لـە ڕاسـتیدا مێـردی خانم لـە هیـچ تێنەدەگەیشـت،

کەسیش نەیدەوێرا چیرۆکی باڵەکانی پشت خانمی بۆ باسبکات. هەموو ڕێکبوون لە سەر ئەوەی نەهێڵن چیرۆکی فریشتەکان وەها بڵاوبێتەوە، ببێتە مایەی پێکەنین و مەسخەرەکاری، نە لە بەرئەوەی لە خۆیان دەترسان، بەڵکو لە بەرئەوەی خانمی مەلەکبین، دایکی هەموو فریشتەکان، پێیوابوو، ئەوە فریشتەکەی ناخی مرۆڤ پتر دەتۆرێنێت و تورەیدەکات.

لیڤیتانت بەگومان بوو کە بۆ دەبێت تەنیا دکتۆر شوکاک سەرپەرشتی باری تەندروستی خانم بکات؟ لە کاتێکدا دکتۆری دی هێندە زۆرن، گەر شارەکە بروخێت بە لووتی دکتۆران دەتوانیت ڕاگیریبکەیت. لیڤیتانت نەیدەتوانی قوربانییەکانی خۆی، ئەوانەی زۆر ئازاریداون، لاواز و ناچیز بینیوونی بە گرنگ تەماشابکات، لای ئەو دکتۆر شوکاک، قالۆنچەیەک بوو کە شایەنی پلیشانەوەیە، چۆن ڕێگا بدات ژنەکەی بخاتەوە بەر دەست و پێی ئەو قالۆنچەیە کە ساڵانێک لەوەبەر ویستبووی پانیبکاتەوە. من تا ئەو کاتیش دکتۆر مستەفا شوکاکم ڕوو بە ڕوو نەدیبوو، بەڵام وەک مەهدائیلی فریشتە فێریکردم، دکتۆر تاکە کەس بوو کە دەیتوانی فریشتە نەخۆشەکانمان ببینێت. مەهدائیل فێریکردم بڵێم چی و گووتم «عومەر گیان، ژنەکەی تۆ نەخۆشییەکی تری هەیە، کە جگە لە دکتۆر شوکاک لێزانی نییە. نەخۆشییەکی تایبەتییە چاکترە نهێنییەکەی نەچێتە دەرێ، نەکەوێتە سەر زاری ئەم و ئەو، جۆرە دەردێکی دەگمەنە کە پزیشکانی تر سەری لێدەرناکەن، شوکاک تاکە پسپۆڕێکی شوێن متمانەیە کە دەتوانێت چارەیبکات».

بەوەدا لیڤیتانت زۆر بەلایەوە گرنگ بوو، منداڵێکی لە خانم ببێت، لە هۆمەر بۆتانی جەلادەوە ببێت بە هۆمەر بۆتانی باوک، دوای هێنان و بردنێکی زۆر ڕێگای بە دکتۆر شوکاک دا بێتە کۆشک و ببێتە سەرپەرشتیاری خانم تا منداڵەکەی دەبێت. بەڵام کێشەکە لای نەغەدەش

بوو کە ئاسان ڕێگای نەدەدا دکتۆر بێتە ماڵی. من بە لیڤیتانتم گووت من دەمەوێت خانمی ماردینیش ببینم تا دوو بە دوو هەندێک قسەی لەگەڵ بکەم. لیڤیتانت بڕوایەکی زۆری بە من بوو، منی وەک هاوڕێیەکی دێرین و دڵسۆز و نزیک تەماشادەکرد، دەیزانی من دەتوانم ژیانی لە تووڕەیی شۆڕشگێڕە توندڕەوەکان بپارێزم، بە خۆی و جووتێک پێڵاوی ڕەشی بریقەدارەوە، بە مۆنییەکەوە کە چیتر من لێی نەدەترسام چەندین جار بە ژوورەکەدا هات و چوو، بڕیاریدا و پەشیمانبووەوە، دەنگی پێی پۆستاڵەکانی ئازاری گوێی دەدام، بەڵام ئەو جوانییە نهێنییەی لە قیافەتە سەربازییەکەیدا بوو، جۆرە دڵنیاییەکی پێدەبەخشیم... بەلایەوە قورس بوو من لەو ڕووەوە قسە لەگەڵ خێزانی بکەم، بەڵام من پێمگووت کە من هۆکار و بەهانەیەکی زۆرم هەیە وادەکەن داوایەکی وەهام هەبێت، گرنگە خانم گوێی لە من بێت تا ئەویش دەرگاکانی کۆشک بۆ دکتۆر بکاتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا من جگە لە خانم نیازی تایبەتی خۆشم هەبوو، من و ماردینی بە دەست یەک دەردەوە دەمانناڵاند، ئەوە ئامۆژگاریی بولبولیار و مەهدائیل بوو، من بچم و لە نزیکەوە ئاگاداری خانم بم و سەیریبکەم تا تێبگەم، بەڵکو سوودێک وەربگرم و نەهێڵم فریشتەکەم بترازێت.

دواجار لیڤیتانت ڕێگای دام و چوومە ژووره تایبەتییەکەی خانم لە کۆشک. من و ماردینی یەک سەیری یەکترمان کرد و سەرسام بووین، ئەو زۆر گۆڕابوو، بە خۆی و زگە زل و قژە چڵکن و چاوە ماندووەکانییەوە، منیش بە ماندوێتی چەندین ڕۆژ نەخۆشییەوە، بە ڕوخسارێ یەکێکەوە نزیک بێت لە شێتی، کەسمان لەو دوو مرۆڤە نەدەچووین کە چەندین ساڵ لەمەوبەر لە غەمپاشا یەکمان بینی و دواتر پێکەوە چووین بۆ شاخ. من سەیرم لە باڵەکانی هات، باڵەکانی ئەو لە هی من سپیتر بوون ، ئەوە یەکەمجارم بوو لە ژیانمدا مرۆڤێکی باڵداری تر ببینم... چاوانم پڕبوون لە ئاو، لە مێژ بوو نەگریا بووم، بەڵام بینینی خانم،

بینینی ئەو ڕوخسارە شێواوەی، ئەو چاوە ماندوو و گێژانەی پێیگووتم، چ سەردەمێکی بەد و چ ڕۆژگارێکی سەخت چاوەڕێماندەکات. زۆر لاواز بوو بوو، پەلامارە یەک لە دوای یەکەکانی فریشتە هارەکەی تەواو کاری لێکردبوو. من لە بەر قەرەوێڵەکەیدا چوومە سەر چۆک و بە چاوی پڕ فرمێسکەوە پێمگووت «خانم... خانم... من و تۆ یەک دەردمانە، یەک دەرد... منیش وەک تۆ شتێکی گەورە دەیەوێت لە گیانم دەرچێت و بەڵام دەرناچێت. پێمبڵێ خانم ئەمە چ دەردێکە تووشیبووین، ئەمە چ تاعوونێکە؟». نەغەدە هیچی نەدەبینی، بەڵام هەستمکرد هەمان دۆخی منی هەیە، تای یەک لەدوای یەک، عارەق دەردان، گێژی، لەرزی کتوپڕ، تلانەوە و فێگرتن. بێئەوەی سەیری چاوم بکات گووتی «جەنگیز، چی دەبێت؟... تۆ چیتە؟ من هی زگەکەمە». من دەستم بە لێواری قەرەوێڵەکەوە گرت و گووتم «نا خانم، باوەڕم پێبکە... شتێکی ترە، نەخۆشییەکی ترە، لای من ئازاری وەک ئازاری چەقۆیەکە لە ناوەوە مرۆڤ بکاتە دوو کەرتەوە. وەک چەقۆیەکی گەورە لە سەرەخۆ لەتتبکات... لە ناوەوە بتکاتە دوو قاش». نەغەدە چاوی لێکنا، قژی بە جۆرێکی سەیر بە سەرییەوە نوسابوو، وەک قژی کەم و کورتی من کاتێک دوای نۆبەتە هارەکانی ئەو مەخلوقە بە سەرمەوە دەنوسا. لێوانی کەمێک شین بوون، زگەکەی لە ژێر چەرچەفێکی سەوزی کاڵدا بەرزدەبووە و نزمدەبووەوە، هەناسەی ئاسان بۆ نەدەدرا. گووتی «وایە جەنگیز، راستدەکەیت، شتێکە بەوێنەی چەقۆیەک پارچە گۆشتێکی گەورەت لێبکاتەوە، پارچە گۆشتێک لە ڕۆحت نەوەک لەشت... وایە جەنگیز». من چاوانم زیاتر پڕبوون لە ئاو. خانم لە سەر ئەو پێخەفی نەخۆشییەش هەر شاعیربوو، بەڵام شاعیرێک کە لە ڕۆحی ئەو سەردەم و ڕۆژگارە تاشرابوو، شاعیرێک نزیک لە دڵڕەقییەوە. ئەو چەند ڕۆژەی نەخۆش بوو، هەواڵی نەخۆشییەکەی لەو تاکە ڕۆژنامە سەرەکییەدا

کە بە کوردی دەردەچوو بڵاوبووبووەوە، ڕادیۆیەک چاوپێکەوتنی لەگەڵ کردبوو، هەندێک لەوانەش کە حەزیان لە شیعری بوو، بە ڕاستی لە مەراقدا بوون شتێکی لێبێت. بە گێژییەکەوە، کە زیاتر لە گێژی کەسێک دەچوو تازە لە ژێر بەنج دەرچووبێت، گووتی «جەنگیز وایە، شتێک بەجێمدەهێڵێت... ڕاستە شتێک بەجێمدەهێڵێت». گووتم «خانم، وایە شتێک بەجێماندەهێڵێت». بەخەندەیەکی کەفتەکارانە و بێهێزەوە پرسی «تۆ دەترسیت؟». من بۆ یەکەمجار دانم بە ڕاستیدا نا و گووتم «خانم زۆر دەترسم، بەڵام لەوانەیە چاری هەبێت... لەوانەیە». بەو دەنگە لاواز و نەخۆشەی خۆی گووتی «بۆم گرنگ نییە، چی بەجێمدەهێڵێت، بۆم گرنگ نییە. دەمەوێت منداڵەکەم نەمرێت، دەمەوێت ئەویش هەموو ئەم پوچییە تاقیبکاتەوە». قورگم لە بەر غەم و بە هێزی هەنسک گیرابوو، بە لاوازیی گووتم «دکتۆر شوکاک تاکە دکتۆرێکە لەم دەردە دەزانێت، بهێڵە بتبینێ، لەبەر خاتری منداڵەکەت، لەبەر ئەو. بیر لە ڕابوردوو مەکەوە، بیر لە هیچ مەکەرەوە، هیچ شتێک لەوە باشتر نییە ئینسان بیر لە هیچ نەکاتەوە». من پێشتر لە ژیانمدا وا هەستیار و ناسک نەبووبووم، بێهێزیم نەگەیشتبووە ئەوەی بەو چەشنە فرمێسک برێژم. بەڵام ئەو ڕۆژە نەخۆشییەکەم وەها لاوازیکردبووم، بە جۆرێک لە ناوەوە ڕوخابووم، دەمویست شەو و ڕۆژ بگریم، باوەش بە شتەکاندا بکەم، داوای لێبوردن لە مرۆڤ و بەرد و دیوار و درەختەکان بکەم. خانم بە هێمنی و بێباکی سەیری فرمێسکەکانی دەکردم. لەو ژنانە نەبوو هیچ کات تەواو دڵی نەرم بێت. بەڵام بۆ ئێستێک وەک قووڵ بیربکاتەوە چی بکات، ئاخۆ دکتۆر ببینێت یان نا... وەک ئەوەی لە نێوان دوو ئەگەری قورسدا سووکترینیان هەڵبژێرێت، وەک نەیەوێت من ئاگاداری سەرسەختیی پێشتری بم، گووتی «دکتۆر شوکاک؟ ببینم؟ بۆ نەیبینم؟ باشە دەیبینم». لەو ساتەشدا کە لە نێوان فرمێسکەکانی

خۆمەوە سەیری چاویم کرد، ئەو بێباکییە قووڵەم تێدا بینییەوە کە دەشێت زۆر بەهێز فریشتەکەی ناخی ڕاتەکاندبێت. بڕیارەکەی وەک ئەوە بوو، دکتۆر شوکاک خاڵێکی دوور و بچوک و ناچیز و لە بیرکراوی ژیانی بێت... گەر بیبینێت یان نەیبینێت، جگە لە کۆمەڵێک یادەوەری تەماوی و کاڵ و بێبەها، هیچی تێدا نەجولێنێت.

دکتۆریش کە یەکەمجار نەغەدەی بینی، هەوڵیدا تەنیا پزیشکێک بێت و هیچی دی، هەوڵیدا خۆی لە ئازاری ڕابوردوو خاڵیبکاتەوە، بێلایەن و بێغەم دەربکەوێت. بەڵام هەموو بینیمان کاتێک دوای ئەو هەموو ساڵەی دابڕان، چاو بە چاو لەگەڵ نەغەدەدا سەیری یەکیان کرد، وەک تەزوییەکی ناوەکی ڕایتەکێنێت، وەک هێزێکی نهێنی بە شەپۆل بە جەستەیدا بڕوات، لە شوێنی خۆی وەستا... بینیمان لێوانی دەلەرزێت، دەستی دەلەرزێت، چاوانی پەشۆکانی عاشقێکیان پێوە دیار بوو کە هێشتا عەشقێکی دێرین دەیهەژێنێت. نا دکتۆر لەوانە نەبوو نەغەدەی یادکردبێت، ئەو هەردەم لە خەیاڵیدا بوو. مەسەلەکە هەر ئەو برینە قووڵە نەبوو کە خیانەتی نەغەدە لە نێویدا سەوزیکردبوو، بەڵکو شەیدایی دێرینی پیاوێک بوو کە وادەزانێت جگە لەو خانمە تینوێتی بە هیچ کەسێکی تر ناشکێت. هەندێک پیاو هەن بە جۆرێکی هیستیری دەکەونە عەشقی ژنە خیانەتکارەکانیانەوە، لە بەرئەوەی لای ئەوان لەدەستدان و لە کیسچوون، ژانی لە ژانی بەرگەگرتنی خیانەت ئاسانترە. مەسەلەکە جگە لە خۆشەویستی ترسی مرۆڤە لە بەتاڵییەکی کتوپڕ، هەموو مرۆڤێک دەتوانێت لەوی دی جیاببێتەوە، بەڵام پێشوەخت پێویستە خۆی بۆ ئامادەبکات... جیابوونەوەی مرۆڤ لە کەسێک کە عاشق و سەوداسەرێتی، پێویستی بە مەشق و خۆتەیارکردنێکی درێژ هەیە، بە جۆرێک لەوەرزشی ڕۆحی سەخت. دکتۆر شوکاک جیابوونەوەی نەغەدەی لە ژیانی خۆیدا بە هەرەسی لە ناکاوی بەنداوێکی گەورە

دەشوبهاند کە کتوپڕ بە ئاوێکی بەخوڕ و بێبەزەیی و بەهێزەوە هەموو شتێک ڕادەدات، ئاوێکی گەورە کە یەکجار دێت و بە سەر پێدەشت و کێڵگە و باغاتدا تێدەپەڕێت و وێرانەیەکی گەورە جێدەهێڵێت... بەڵام گەر دکتۆر شتێکی بزانیبایە، لە ڕووی ڕۆحییەوە مەشقی خۆی بکردبایە، هێمن هێمن ژەهرەکەی بنۆشیبایە، ئەوکات دەکرا هێزی شەپۆلەکان و گوژمی ئاوەکە لە سەری وەها توند و کاولکار نەبن. بەڵام لە ڕاستیدا گەر قووڵ بڕوانین، ئەو پیاوانەی دوای خیانەتی ژنەکانیان هەر بە عاشقی دەمێننەوە، ڕەنگە هۆی دیکەشیان هەبێت... ڕاستە مەشقی ڕۆحی بۆ جودایی گرنگە، وەک چۆن مەشقی جەستەیی بۆ بەرگەگرتنی ئەشکەنجە پێویستە، بەڵام من تێبگەم هۆکانی مانەوەی دکتۆر بە عاشقی شتێکی دییە. دیارە بۆ پیاوێکی وەک من کە ژیانم لە دەزگاکانی ئەمنییەت و هەواڵگریدا بردۆتە سەر، بیرکردنەوە لە هەموو دیوێکی ڕۆحی مرۆڤ بەشێک بووە لە پیشەکەم، من لەدوای ئەم عومرە پوچە، دەتوانم بڵێم لە ژیانی هەموو پیاوێکدا دەبێت قۆناغێکی ڕاستەقینەی عەشق هەبێت، هەر مرۆڤێک بە سەختی بە ناو ئازاری عەشقدا نەڕوات، وەک ئەوەیە شتێکی هەرە گرنگی لەدەستدابێت، ئەو پیاوانەی کە نەخوێندەوارن و عاشقن زیاتر لەو پیاوانە لە ژیان تێدەگەن کە پرۆفیسۆرن و هەرگیز بە ڕاستی و بە سەختی عاشق نەبوون... مەبەستیشم لە عەشق ئەوە نییە ئافرەتێک ببینیت و حەزی لێبکەیت و بچیتە داوای، بەڵکو ئەو دۆخەیە لە برین کە خۆشەویستی کەسێک لە ناوتدا دروستیدەکات، ئەو برینە پەیوەندی بەوەوە نییە ئەو کەسە عەشقت لەگەڵدا دەگۆڕێتەوە یان نا، دەبێتە هاوسەرت یان نا، بەڵکو برینێکە دروستدەبێت و تا مردن بەردەوام خوێنی لێدەتکێت، ئازارێکە لە بن نایەت، برینێکە بۆ ئەبەد زانین و حەسرەت و حیکمەتی لێدەتکێت، تێر نەبوونێکی قووڵە لەو کەسەی دەمانەوێت، تێرنەبوونێکی ئەبەدی، کە ویساڵ تەنیا کەلێنێکی

بچوکـی تێـدا دەگرێـت. عەشـق چاڵێکـی گەورەیـە لـە ناوەڕاسـتی زەوی ژیانـدا، ئـەوەی ئـەو چاڵـەی نەبێـت، وەک ئەوەیـە زەوییەکەشـی نەبێـت. مـن خـۆم لـەو پیاوانەبـووم کـە ئـەو چاڵـەم نەبـوو، بۆیـە هیـچ کات تـەواو لـە نـاو ژیانیشـدا نەبـووم، هەمیشـە هەسـتمکردوە ئێسـتا هیچـە و دەشـێت لـە پاشـەڕۆژدا بژیـم. ئـەو پیاوانـەی دیـش، کەسـانێک وەک شـوکاک کـە لـە سـەرەتادا بـەو ئەزموونـەدا نـاڕۆن، خۆشەویسـتەکەی خۆیـان بـێ هیـچ برینێکـی لەوجـۆرە و ئاسـان دەسـتدەکەوێت، لـە دواییـدا لـەو ساتەدا کـە لـە دەسـتی دەدەن، وەک شـێت عاشـق دەبـن. عەشـقی ڕاسـتەقینەی شـوکاک بـۆ نەغـەدە لـە دوای خیانەتەکـەی ئـەوەوە دەسـتی پێکـرد، هـۆی ئـەوەش ناگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی دکتـۆر مسـتەفا شـوکاک لـە ناخیـدا نامـەرد یـان بێعیـزەت یـان نەفسـنزم بـووە، بەڵکـو هۆکـەی ئەوەیـە دکتـۆر لـە قووڵاییـدا فریشـتەیەکی گـەورە بـوو. دوو جـۆر عاشـق لـە دونیـادا هـەن، یەکێکیـان عاشـق بـە مەعشـوقەیەک دەبـن کـە دەیبینـن، یەکێکـی دیـان بـە پێچەوانـەوە شـەیدای مەعشـوقەیەک دەبـن کـە نایبینـن، کـە نایـەت، یـان وندەبێـت و ناگیرێـت... دکتـۆر لـە جـۆری دووهـەم بـوو، ئـەو تەنیـا دەمێـک تـەواو عاشـق بـوو، شـێتانەش عاشـق بـوو کـە نەغـەدە بـوو بـە شـتێکی ئەسـتەم و دوور و نەگیـراو و ئەفسانەیی... خیانـەت بـۆ ئـەو تەنیـا بەهانەیـەک بـوو تـا عەشـقی زیاتـر گڕبگرێـت. ئەوجـۆرە پیاوانـە وەک ئێمـە نیـن، عەشـق نابەنـە ژێـر خانـەی خیانـەت و دڵسـۆزییەوە، بەڵکـو وەک بەهایەکـی جیـا، جـودا لـە جەوهـەری بـاش و خراپـی یـار تەماشـایدەکەن.

ئـەو ڕۆژە کـە بەرامبـەر نەغـەدە وەسـتا، هەمـوو دەمانزانی بۆچـی هاتـووە، لـەو ڕۆژەوەی بولبولیـار هەواڵـی نەخۆشـی خانمـی پێگوتبـوو، زانیبـووی لـە نـاکاو خاتـوون دوو باڵـی لێدەرکەوتـووە، مەراقـی بـوو بێـت و بیبینێتـەوە. بـەڵام لـە ژوورەکـەدا و لـە بـەردەم خانمـدا گەلـەک پەرێشـان بینیمـان... نەغـەدە وەک هەمیشـە بێبـاک سـەیریدەکرد. چاوانـی شـتێکی نادیاریـان

تێدابوو، ئەستەم بوو بزانێت چییە، ئەستەم بوو بزانیت چ جۆرە هەستێک لە ناخیدا دەجولێت. وەها لە پێخەفەکەی خۆیدا دانیشتبوو، وەک ئەوەی بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە هەقی تەواوەتی بەو بووبێت کە ماڵی بەجێهێشتووە و دکتۆری داوەتە دەست گورگان. لەگەڵ ڕەنگ زەردی و نەخۆشییەکەشیدا هێشتا سروشتی بێڕەحمی هەر ئاشکرابوو. بینینی دکتۆر شتێکی تێدا دروست نەکرد، یادەوەرییەکی تێدا نەجولاند، سارد و بێدڵ، بەڵام خەستە و کەفتەکار سەیری هەموومانی کرد و لە چاویدا جگە لە تارمایی دەرونێک کە تەنیا لە خۆی ڕادەمێنێت، هیچی دیکەمان نەبینی. دکتۆریش هیچی نەگووت، بەڵام بێدەنگییە قووڵ و شپرزەکەی ئەو هیچ نەگووتنەی، ئەو هاوارە کپەی ناو ناخی زیاتر بەرجەستەدەکرد. دکتۆر بۆ ئەوەی پشکنینی تەواوی بۆ بکات، فەرمانی بە ئێمەدا بچینە دەرێ و جگە لە ڕێزان کەسی دی لە ژووردا نەمێنێت. من و لیڤیتانت و بولبولیار چووینەدەرێ... دوای ئەوە بە دروستی نەمانزانی چی بوو، بەڵام گوێمان لە هاواری نەغەدە بوو، لیڤیتانت بەپەلە گەڕایەوە ژوورێ. بە نرکە و ناڵەی خاتوونی کۆشکدا تێگەیشتم کە نۆبەتێکی تری پەلاماری فریشتەکەی دەستی پێکردۆتەوە، خانمی مەلەکبین هاواری لە ئێمەش کرد بگەڕێینەوە ژوورێ، من و بولبولیار بە پەلە گەڕاینەوە و خانممان بینی لە ناوەڕاستی جێگاکەیدا دەلەرزێت، لەرزینەکەی بە جۆرێک بەهێز بوو، بە لیڤیتانت و خانمی مەلەکبین دابین نەدەکرا. بولبولیار و مستەفا شوکاکیش توند گرتیان، بە هەموویان وەک مریشکێکی سەربڕاو لە باڵ و قاچەوە چەسپبکەن، لە سەر جێگاکەی خۆی مێخیانکرد... خانم تەواو وریابوو، چاوانی ڕۆشن و دەرپەڕیو و سەرسام دەیڕوانی. هەستمکرد هەمان چەشنە تا و گەرمی و ئازار دایدەگرێت کە پێشتر منی گرتبوو، هێند هەبوو ئەو وەک من هاواری نەدەکرد و بێدەنگ بوو، بە جووتێ چاوی سەرسام، بەڵام خاڵی لە هەر تەعبیرێک، وەک مردوویەک سەیری

ئاسمان بکات، بەو جۆرە برژانگ و پێڵوەکانی جوڵەیان نەبوو، بەڵام لە ناکاو فریشتەکەی تەکانی زۆر سەختی دەدا و جەستەی وەها ڕادەتەکاند بە هەمووان نەدەگیرا. من بەترسەوە سەیری گوژمی ئەو مەخلوقە نادیار و بەهێزەم دەکرد کە لەگەڵ تینی خۆیدا خەریکبوو چرپاکەی دەشکاند و لە پێ دارینەکانییەوە دەیخست. کاتێک فریشتە بەوجۆرە هاردەبێت و بەو چەشنە دەکەوێتە خۆ ڕاپسکان، ئیتر ململانێ لەگەڵیدا ئاسان نییە، بەڵام ئەوەی بەوجۆرە گیر بکرێیت، لەشت بەجێگایەکەوە چەسپ بێت، نەتوانی توند تەکان بخۆیت، توانای ترازان لە فریشتەکەدا خاوتردەکاتەوە. فریشتەیەک کە دەیەوێت بێتەدەرێ و بمرێت، جیاوازە لە فریشتەیەک کە بێدەنگ لە ناخی مرۆڤدا دەپوکێتەوە و دەچێتە ژێرەوە و شیدەبێتەوە و کەس ئاگاداری لەناوچوونی نییە. فریشتەیەک کە دێتەدەرێ، تورەیە، ئارەزووی لەوەیە خۆی بۆ مرۆڤ دەربخات، کارێکبکات ئەو ببینێت و بزانێت چۆن دەمرێت، لێرەوە مەبەستێتی توند مرۆڤ ڕابوەشێنێت و ترازانی ئازارێکی زۆری هەبێت.

دکتۆر بە وردی پشکنینی بۆ تەندروستی خۆی و منداڵەکە کرد، بە درێژایی ئەو کاتەی دکتۆر دەیپشکنی، ئەو وەک ژنێکی مردوو لە سەر پشت ڕاکشابوو و بێئەوەی چاوبتروکێنێت، سەیری بنمیچەکەی دەکرد، من گوێم لە هەژینی بوو، گوێم لە دەنگی قورسی هەناسەی بوو، بەڵام لە ڕوخساردا بێدەنگ و بێگیان دەردەکەوت. خانمی مەلەکبین و بولبولیار و لیڤیاتانت توند دەست و قاچیان گرتبوو... دکتۆر بە ڕۆشنی بە لیڤیاتانتی گووت «خانمی ژنت، دەبێت لە ژێر چاوەدێری بەردەوامدا بێت، ئەو نۆبەتانەی تووشی دێن، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بە زگەکەیەوە نییە، یاخود من لە ڕووی زانستییەوە پەیوەندییەک نادۆزمەوە، بەڵام منداڵەکە بە هیچ جۆرێک بەرگەی ئەم تەکانە بەهێز و بەردەوامانە ناگرێت. بۆیە چ لە ڕووی ڕۆحی و چ لە ڕووی جەستەییەوە پێویستی

بـە چاوەدێـری تایبەتـی هەیـە». لـەو سـاتەدا کـە گوتـی خانمـی ژنـت دەنگـی سـووتان و گڕەیەکـی سـەیری تێدابوو، وەک شـتێک گـەروی داغبـکات وەهـا بـوو... زۆرجـار دابەزیـن بـۆ بنـی دۆزەخ لـە گوتنـی هەندێـک وشـە ئاسـانترە، ئـەو دوو وشـەیەش بـۆ شـوکاک لـەو وشـە سـەخت و کوشـندانە بـوون. لیڤیتانـت بێئـەوەی هەسـت بـەو تـاڵاوەی نـاو گـەرووی دکتـۆر بـکات، قسـەکانی بەراسـت سـەلماند و گوتـی هـەر شـتێک پێویسـت بێـت دەیـکات تـا خانمـی ژنـی بپارێزێـت. هـەر هەمـان ڕۆژ سـێ سیسـتەری لێزانـی گـرت و خسـتنییە بـن فـەرمانـی ڕێزانـی مەلەکبینـەوە، دکتۆریـش بـە تەلەفونێکـی تایبەتـی، بـەردەوام بەوانـەوە بەسـترابوو، لـە سـەر داوای خانمـی ماردینیـش، بولبولیـار ڕۆژانـە دەچـوو و شـیعری بـۆ خانـم دەخوێنـدەوە. ئـەو سـەعاتانەی کـە ئـەو بـە دەنگـە هێمـن و شـاعیرییەکەی خـۆی شـیعری بۆدلێـر و ڕامبـۆ و والـت ویتمـان و ئەپۆلۆنێـر و ڕۆمـی و خەیـام و مەحـوی بـۆ دەخوێنـدەوە، فریشـتەکەی ناخـی ئارامتـر و کـەم جوڵەتـر دەبـوو. ڕێزانـی مەلەکبیـن یەکـەم کـەس بـوو کـە بـە ڕۆشـنی هەسـتی بـە نیـازی دکتـۆر شـوکاک کـرد، ئـەو یەکـەم کـەس بـوو کـە زانـی چ دکتـۆر و چ بولبولیـار کەسیان لـە بـەر نەغەدە نەهاتـوون و نیازێکـی دیکەیـان هەیـە، بـۆ نێچیرێکـی تایبەتـی دەگەڕێـن... بێئـەوەی هیـچ بـە ڕوونـی ئاشـکرابکات، لـە تەنیشـتەوە هـەردوو پیاوەکـەی ئاگادارکـردەوە کـە ئەگـەر خۆیـان کۆنەکەنـەوە و وریـا نەبـن، دەتوانێـت هـەر دووکیـان بـۆ هەتـا هەتایـە دەربـکات و لەبـری ئـەوان دوو خوێـڕی سـەر جـادەکان یـان دوو دزی نێـو بەندیخانـەکان بدۆزێتـەوە و بیانهێنێـت و بیانخاتە جێگایـان. چونکـە خراپتریـن ڕۆحلەبەریـش دەشـێت هـەر بـە ئەندازەی ئەمـان نەفسـنزم و بەدنیـاز بێـت. ڕوو بـە ڕوو بـە هەردووکیشـیانی گـووت «شـەرم لـە هەردووکتـان دەکـەم کـە هیـچ نیـن جگـە لـە دوو پیـاوی گەمـژەی، بێئابـڕووی، سـەخیف».

مـن سـەرەتا هیـچ تێنەگەیشـتم، دواتـر زانیـم کـە هـەر یـەک لـە دکتـۆر

و بولبولیار بە نیازی وەرگرتنی فریشتەکەی خانمن، هەر یەکەیان ئەو فریشتەیەی بە هەقی خۆی دەزانی. دکتۆر پێیوابوو فریشتەکەی ناو ناخی نەغەدە موڵکی ئەوە، ئەو بەشەی نەغەدەیە کە ئەو عاشقی بووە، ئەو نیوەیەتی کە خنکاوە و ئێستا هاتۆتە دەرەوە و بەپێی هەموو یاسایەک، ئەو بەشە دەبێت موڵکی ئەو بێت. بەڵام بولبولیار کە پێشتر هەرگیز غەریزەی موڵکداری نەبووبوو، حەزی بەوە نەدەکرد خاوەنی هیچ بێت... ئێستا هەستمدەکرد دەیەوێت هەر کات فریشتەکەی نەغەدە هاتەدەرێ، ئەو فریشتەیەی کە جگە لە ڕۆحی خاوەنەکەی خاوەنێکی دی نییە، ببێتە موڵکی ئەو.

بۆ ساتێک سەرم لەوە سوڕما... چۆن ئەو مرۆڤەی هیچ شتێکی لەم سەر زەمینە نییە، دەیەوێت ببێتە خاوەنی فریشتەیەک.

# ژیانی بولبولیار لە کەشتیی فریشتەکان

دەبوو هۆشەنگی بولبولیار، دکتۆر نەزمی ئاگاداربکاتەوە. ئەوەی نهێنییەکی وەها گەورەی دەستدەکەوێت، ئەوەی پێدەخاتە سەر کەشتییەکی وەها ناوازە و سەیر، دەبێت نهێنی خۆی لای کەسێک هەر بدرکێنێت... کەسانی دیندار دەچن بۆ لای پیاوانی خودا، سیاسەتپەرستان دەچنە لای سەرۆکەکانیان، ئەدەبدۆستێکی وەک هۆشەنگیش جگە لەوەی بچێتە لای پرۆفیسۆرێکی ئەدەب، پەنای تری نەبوو. دەبوو هەر کەس نهێنی ئەم کەشتییەی زانی لای کەسانی باوەڕپێکراو و شوێن متمانە بیدرکێنێت، چونکە هەموو دەزانن کە نهێنی وەها چەند لە سەر دڵ گران و لەبەر سینە قورسە. بولبولیار بە تەواوی نەیدەزانی دکتۆر نەزمی مەلەکبینە یاخود نا؟ ئەو پێشتر باڵی سەید فەیزی برای خۆی

بینیبوو، ئاخۆ دەیتوانی فریشتەکانی ئەم کەشتییەش ببینێت. وەک ڕێزانی مەلەکبین دەیگووت «بەساقە مەلەکبینین نەخۆشییە... بۆ تۆ وادەزانی چییە؟.. مەلەکبینین نەخۆشییە، هەندێ سەردەمێک دەیگرن و خودا دڵی پێیان دەسووتێت و چاک دەبنەوە. بەس بەقوربانی باڵات بم، ئێمە ئەو ڕەحمەتەی باری تەعالامان بەر نەکەوتووە. بزانە، ئەو دکتۆر نەزمییەی ڕەفیقت بهێنە، بزانە، بزانە، بەڵکو خودا ڕەحمی پێکردبێت و دەردەکەی پەڕاندبێت. عەزیزم بەخودا ئەم بەخت و ناوچاوانە بۆ کەس بە ئاوات ناخوازم».

کە دکتۆر نەزمی هات، ئێوارەیەکی تەمین و لێڵان بوو، هێندەی نەمابوو دونیا بە سەر شەودا بشکێتەوە و تاریکی بکەوێت. گەرچی هاوین بوو، بەڵام دکتۆر چاکەتێکی ئەستوور و درێژی لە بەردابوو، لەگەڵ بینینی دەروازەی کەشتیی فریشتەکاندا، سەری سوڕما... گەرچی چەندین ساڵ بوو بە دەگمەن لەم شارە چووبووە دەرێ، بەڵام ئێستا بە ڕۆشنی دەیبینی هەر خودی ئەم شارە کە لە کوچە و کۆڵانی بێزار بووە، دەشێت ڕوویەکی نامۆ و دیوێکی نەناسراوی هەبێت کە ئەو نەیبینیوە. مرۆڤ ناتوانێت نیشتەجێی تەواوەتی هیچ شارێکی دونیا بێت. مرۆڤ جگە لەماڵی خۆی، نیشتیمانی نییە. سەدان ساڵ لە شارێکدا بژی، هێشتا ئەستەمە هەموو کونج و کەلێنێکی بناسیت. دکتۆر لەبەر خۆیەوە وایگووت. کاتێک گەیشتە بەردەرکی کەشتیی فریشتەکان و مەهدائیل بە خۆی و قژەلوول و بلوسە حەوتییەکەیەوە «کە هەردەم بێ کراس و فانیلە و لە سەر پێستی ڕووت لەبەریدەکرد» پێشوازی لێکرد، باڵە گەورەکانی مەهدائیل هەستی منداڵیکیان پێبەخشی لەخەویدا چووبێتە بەر کۆشکێکی ئەفسانەیی. دکتۆر سەرەتا جگە لە سەرسامی هیچی دیکەی نەبوو، وەک کەسێک باوەڕ بە چاوی خۆی نەکات و تەواوی گەشتەکەی لا وڕێنەیەکی گەورە بێت، بە شوێنەکەدا گەڕا. پیاوێکی بە جوڵە بوو، یەک یەک چووە

سەر هەموو فریشتەکان، جگە لەوەی لە بەر خۆیەوە بڵێت «سەیرە... سەیرە» هیچی دیکەی نەگووت. زۆر لە سەر هەندێک فریشتە وەستا، بە وردی سەیری ژوورەکان و قەرەوێڵەکان و جلوبەرگی فریشتەکانی کرد. لە بەرەوە گوێشی لە چیرۆکەکانی مەهدائیلی فریشە دەگرت کە ئێستا وەک چاوساغی مۆزەخانەی لێهاتبوو، هەر مەلەکبینێکی نوێ دەهات لە نوکەوە چیرۆکی کەشتییەکە و مێژووی سەرنشینانی بۆ دەگێڕایەوە.

دکتۆر دوای تەواوبوونی گەشتەکە زۆر بێدەنگ بوو، لە بێدینێک دەچوو، بۆ چرکەیەک دەرگای دۆزەخی لێکرابێتەوە و هەموو شتێکی دیبێت و ئێستاش کاتی نەمابێت پەشیمان ببێتەوە و بچێتە سەر ڕێگای خوداپەرستی... تابڵێیت دەستەوەستان و سەرسام بوو... سەرسامی روخسارێکی تەواو منداڵانەی بە سیما پیر و نورانییەکەی بەخشیبوو. بولبولیار بە ڕیواقی قاتی خوارەوەی کەشتییەکەدا بەرەو ژوورێکی لاتەنیشت پێش دکتۆر کەوت و دەرگای ژوورێکی تاریکی بۆ کردەوە. ژوورێکی تایبەت بوو بۆ مەلەکبینە تازەکان، هەمیشە دوای گەشتی یەکەمیان لە کەشتییەکەدا لەوێ پشوویان دەدا. بولبولیار خۆشی هێشتا نوێ بوو، خۆشی لە ناو سەرسامی پەنای بۆ پرۆفیسۆر هێنابوو. دکتۆر وەک زۆر ماندووبووبێت و بیەوێت بیر لە هیچ شتێک نەکاتەوە، ماوەیەک تەنیا سەیری ئەساس و کەلوپەلی ناو ژوورەکەی کرد، مۆکێتە سوورەکە، قەنەفە گەورەکان کە پێدەچوو لە چەرمی ڕاستەقینە بن نەوەک شاموا یان پۆلستەر یان هەر مەتریالێکی خۆنەگری دیکە، کتێبخانە گەورەکە کە لە تەختەی دار مازووی دارستانە نزیکەکانی دەوری شار دروستکرابوو، خاڵی بوو لە کتێب، جگە لە یەک دوو پەیکەرۆچکەی فریشتەی باڵدار هیچی دیکەی تێدا نەبوو. بولبولیار ماوەیەک بێئەوەی هیچ بڵێت بەرامبەر میوانەکە دانیشت... جورئەتی گووتنی هیچی نەبوو. دکتۆریش جگە لەوەی هەندێک دەنگی ناڕوون و بێوشەی لێدەرچوو شتێکی نەوتۆی نەدرکاند، وەها پاڵیدابووەوە وەک بیەوێت بخەوێت. بەڵام

پاش ئێستێک و چەندجار ڕوانینی دووبارە لە شتەکان گووتی «هەموو شتێک پێچەوانەیە، کەواتە هەموو شتێک پێچەوانەیە». بولبولیار دڵنیابوو بێئەوەی پرسیاربکات دکتۆر خۆی پتر ڕووندەکاتەوە. «بەڵێ کوڕم... جاری وایە مرۆڤ پێویستی بە چەند هەزارساڵێک دەبێت، بۆ ئەوەی هەڵەیەکی بچوک ڕاستبکاتەوە. چەند هەزار ساڵێک... بیرت نەچێت مرۆڤ هێشتا مەخلوقێکی ساوایە لە سەر زەوی، کۆنترین فەیلەسوفمان کەمتر لە دوو هەزار و چوار سەد ساڵ لەمەوبەر ژیاوە، گەر بەراوردیبکەیت بە تەمەنی زەوی خۆی کە پتر لە چوار ملیار ساڵ دەبێت، دەبینیت، مرۆڤی عاقڵ و بیرکەرەوە چ حەیوانێکی نوێ و ساوایە... هێشتا زۆرمان ماوە بگەینە ئەوەی دەمانەوێت. ئێمە هەموو هەڵەین و دەبێت هەڵەش ڕاستبکرێتەوە». بولبولیار نەیدەزانی بۆ دکتۆر نەزمی لەو سەرەتایەوە دەستی پێکرد. ڕقی لە زمانی ژمارەکان بوو، بەڵام مامۆستاکانی زانکۆ حەزیاندەکرد لەو ڕێگایەوە فرەزانی خۆیان دەربخەن. دکتۆر کەسێکی قسەزان بوو گووتی «بە درێژایی مێژووی ئەم چەند هەزار ساڵە، مرۆڤ وایزانیوە خودا فریشتەی بۆ ناردووە تا بیپارێزێت... فریشتە لە کولتووری دێرینەوە تا ئەمڕۆ پاسەوانی خودایی مرۆڤ بوون. هەمیشە وابوون، پەیامهێن و پارێزەر بوون. بەڵام ئێستا شتێکی ترە، ئێستا لێرەدا دەبینین شتەکان پێچەوانەن. خودا فریشتەی پێنەبەخشیوین تا بمانپارێزێت، بە پێچەوانەوە، ئیشی ئێمە بەردەوام ئەوە بووە فریشتەیەک بپارێزین... ئەوە ئیشی ئێمە بووە. هیچ فریشتەیەک نییە ئێمە بپارێزێت... هیچ فریشتەیەک... هیچ فریشتەیەک... ئێمە بە تەنیاین».

دکتۆر بە نائومێدییەکی قووڵەوە سەیری بولبولیاری کرد.

«ئەوەی ئینسان پاسەوانی فریشتەیە، نەوەک فریشتە پاسەوانی ئینسان بێت، لە دڵەوە بریندارمدەکات. چی لە دونیادا بووە، چی گۆڕاوە؟... بۆ مرۆڤ بە درێژایی مێژوو وایزانیوە فریشتەیەک هەیە

لە ئاسمانەوە هاتووە و دەیپارێزێت، لە کاتێکدا دەبوو بەردەوام خۆی وا ڕێکبخات فریشتەکەی نەرەنجێت... ئەگەر فریشتە بەشێک بێت لە خودی مرۆڤ، گەر فریشتە هیچ نەبێت جگە لە دیوێکی تری مرۆڤ، لە دەموچاوێکی تری، لە زاتێکی دیکەی، ئەوا هۆشەنگ، زۆر چیرۆکی گەورە هەرەسدەهێنێت».

بولبولیار و دکتۆر نەزمی هەردووکیان لە یەک کاتدا دەستیان بۆ ڕیشیان برد و خوراندیان. ژوورەکە سەرەتا بۆ هەردووکیان زۆر تاریک بوو، ئێستا هێدی هێدی جۆرە تیشکێکی کزی تێدەگەڕا. بولبولیار بە ترسێکەوە پرسی «چیرۆکی چی؟».

دکتۆر بە دوودڵی پرۆفیسۆرێکەوە سەیری مەتریاڵێکی ئەفسوناوی بکات، گووتی «هەموو چیرۆکەکان، لە چیرۆکەکانی وەحییەوە تا چیرۆکەکانی تر. پرسیارەکە ئەوەیە، کێ فریشتەی لە ناخی مرۆڤدا شاردۆتەوە؟. ئەوە پرسیارێکە فریشتەکان خۆیان ناتوانن وەڵامیبدەنەوە. دەتوانن؟ نازانم... دەتوانن؟ ئاخۆ خودا وەک چۆن فوویکردوە بە ڕۆحماندا، ئەوانیشی هەمان شێوە لە ناخماندا چاندووە؟ بولبولیار کەس هەیە لەم کەشتییەدا بتوانێت وەڵاممان بداتەوە؟».

بولبولیار بە ترسەوە گووتی «نازانم... دکتۆر... نازانم»

دکتۆر کەمێک بیریکردەوە و گووتی « ولیام بلیک، شاعیر و نیگارکێشی ئینگلیزی، گووتویتی، ڕۆژانە قسەی لەگەڵ فریشتەکاندا کردوە، بەڵام ئاخۆ وابووە، ئێستا من دەپرسم قسەی لەگەڵ چ جۆرە فریشتەیەکدا کردوە، فریشتەکەی خۆی یاخود فریشتەیەکی خودایی یان فریشتەی هەڵهاتووی کەسێکی دیکە. لە ئەدەبیاتی کۆندا فریشتە هەمیشە پەیامێکی خودایییان پێیە. وشەی «ئەنگلیۆس»ی لاتینی، بەمانای ڕەوانەکراو یان پەیامبەر، بۆیە فریشتەکان هەمیشە بە دوو باڵەوە وێنەکراون، لە مەلەکوتەوە دابەزیون بۆ لای مرۆڤ و پەیامێکیان

پــێ بــووە، بــەردەوام لــە نێــوان ئاســمان و زەویــدا بەرێــگاوە بــوون، بــۆ ئــەو فڕینــە دووردرێــژە پێویســتیان بــە باڵــی گــەورە بــووە. زۆر کــەس لـەو بـاوەڕەدان کـە وشـەی لاتینـی ئەنگلیـۆس، وەرگێڕانـی وشـەی مەلەکـە. بیریشت نەچێت وشـەی مەلـەک، وەک هەمـوو بـە هەڵـە تێدەگـەن، عەرەبـی نییـە، مەلـەک وشـەیەکی عیبرییـە، ئەویـش مانـای نێـردراو یـان ڕەوانەکراو، وشـەی فریشـتەی خۆشـمان هـەر ئاڵوگـۆڕی وشـەی فرسـتادەیە کـە هەمـان مانـا دەگەیێنێـت، هـەر وەرگێرانـی هەمـان وشـەی مەلەکی عیبرییـە. فریشـتە هەمیشـە کەدەردەکـەون پەیامێکیـان پێیـە، بـەڵام ئـەم فریشـتە نەخۆشـانە ڕەنگـە هێمابـن بـۆ پەیوەنـدی پچـڕاوی نێـوان زەمیـن و ئاسـمان، بـۆ ئـەوەی چیتـر لـە بـاڵاوە شـتێکی نـوێ نایەتـە خـوار. بەشـەر... مـن ئـەو هەسـتەم هەیـە کـە ئـەوە تەنیـا مـرۆڤ نییـە کاری بـە فریشـتەکان نەمـاوە، خـوداش کاری پێیـان نەمـاوە... خـوداش کاری پێیـان نەمـاوە».

دکتـۆر نەزمـی کەمێـک سـەری بـادا و چاویلکەکـەی کەمێـک ڕاستکردەوە و وەک یەکێـک دوای پرسـەیەکی گـەورە بـۆ تێرامـان لـە مانـای ژیـان ڕوویکردبێتـە خەڵوەتێکـی تاریـک، دەسـتێکی گـرت بـە چاوییـەوە و گووتـی «بـە درێژایـی مێـژوو نەبـووە فریشـتەکان جگـە لـە پەیامهێنـان، جگـە لـە جێبەجێکردنـی خواسـتی خـودا، ئیشـێکی تریـان بووبێـت. دەبێـت بڵێـم ئەمـڕۆ کاتێـک مەهدائیلـی فریشـتەم بـەو سـەرو سـەکوتە ئاساییەوە بینـی، هەسـتم نەکـرد شـتێکی ناسروشـتی دەبینـم، لـە سـیفری دروسـتبووندا کـە یەکەمجـار نـاوی مەلـەک دێـت، هەمـان شـێوە بـۆ ئەبراهـام دەردەکـەون. بەشـەر... لەوێدا فریشـتەکان باڵیشـیان نییـە، سـەرەتا هـەر بـە پیـاوەکان ناویـان هاتـووە... پیـاوەکان، باوەڕدەکەیـت؟ هـەروا وەکـو کەسـی ئاسـایی جلیـان پۆشـیوە، وەک خەڵکـی عـەوام قسـەدەکەن، بـەڵام دوایـی دەردەکەوێت فریشـتەن. لـە بەرئـەوە ئاسـاییە، بـە درێژایـی مێـژوو فریشـتە هـەر بەوجـۆرە دەرکەوتـوون کـە ئێمـە ئەمـڕۆ بینیمـان، سـەیربکە فریشـتەکان لـە هـەزاران

تابلۆدا نیگارکراون... هەزاران تابلۆ. رووبەرێکی گەورەی هونەری شێوەکاری دونیا بە نیگاری فریشتەکان گیراوە، لە زۆربەی نیگارەکاندا فریشتە هەمیشە بە جلوبەرگی ئاساییەوە، لە ڕوخساری مرۆڤی ئاساییدا وەکو من و تۆ دەرکەوتوون. لێرەوە ئەوەی فریشتەکان بەوجۆرە دەبینم سەرسامم ناکات، مرۆڤ بەردەوام فریشتەی بەوجۆرە بینیوە کە من و تۆ ئەمڕۆ بینیمان، سەیری تابلۆکەی گاودینزۆ فێراری بکە کە جوبرائیلی دروستکردوە، لەوێدا بە ڕۆشنی دەبینیت جوبرائیل کەسێکی ئاساییە بە جلوبەرگی ئاساییەوە، یان سەیری تابلۆکەی ژان تازل بکە لەسەدەی حەڤدەدا، نیگارێکی قەشەنگی ڕافائیلی فریشتەی لەگەڵ تۆبیازدا کێشاوە کە ئەگەر باڵە سپییەکان لە رافائیل بکەینەوە، هیچ نیشانەیەکمان نییە تۆبیاز و ڕافائیل لە یەک جیابکاتەوە. سەدان نمونەی تریش... بەڵێ، سەدان نمونەی تر. ئێستا دڵنیام گەر لە ئال گریکۆی دێرینەوە بیگرین تا سەر پەیکەری فریشتە کوبیستەکەی سەلفادۆر دالی، دەبینین مرۆڤ هەمیشە فریشتەی وەک خۆی بینیوە. فریشتە وەک ئێمە وایە، هیچ نییە جگە لە وێنەیەکی تری خۆمان، بەڵام ئەوەی سەرسامدەکات، ئەوەیە کە چۆن مرۆڤ بە درێژایی مێژوو نەیزانیوە کە بەراستی فریشتەکان لە ناو مرۆڤەوە دێنە دەرێ. ئەگەر وابێت، لەوانەیە هەموو ئەو فریشتانەی ئیبراهیم، هاجەر، ئیسماعیل، مریەم، لووت و ئەوانی تر بینیویانن، فریشتەی ڕۆحی خۆیان بووبن. گەر وابێت جوبرائیل و رافائیل و میکائیل و ئەوانی تر هەموو بوونەوەری دونیایی بوون... ڕۆحلەبەری سەر بەم زەوییە بوون، سەردەمێک لە کەشتییەکی دیکەی فریشتەکاندا لە جێگایەکی تردا ژیاون... وانییە بولبولیار... وانییە؟ دەبێت ئەو هەڵەیە ڕاستبکرێتەوە یاخود نا».

بولبولیار بە سەرسامییەوە سەیری پرۆفیسۆری کرد و گوتی «نازانم. هەرچییەک بێت دکتۆر، ئەمڕۆ لێرەن و نەخۆشن و لە بەردەستی

ئێمەدان». دکتۆر لە ناکاو هەستا و بەرەو ڕووی هۆشەنگ ڕۆیشت و توند دەستی گووشی و گووتی «من ئێستا لە زۆر شت تێدەگەم، لە زۆر شت تێدەگەم، بەڵام خۆشحاڵم کە مەلەکبینم. سوپاستدەکەم کوڕم... بەشەر کێ دەیگووت، بەم پیرییەش من توانای بینینی فریشتەم ماوە. بەڵام هەر کاتێک ویستتان مەلەکبینەکان لە جەمعییەتێکدا کۆبکەنەوە، منتان لە بیر بێت... هیچ نەبێت ئێستا شارەکە مەلەکبینێکی لە من پیرتری تێدا نییە». چەندجارێک کڵاوەکەی داگرت و کردییەوە سەری، ئینجا بە پەلە گووتی «دەڕۆم... بەڵام پێش ئەوە دەڵێم خۆزگە مایکڵ ئەنگلۆ، یان رامبرانت، یان هەر کەسێکی تر زیندووبانایە و سەرێکیان لەم کەشتییە بدایە، دڵنیام بە سەعات نیگاری فریشتەکانیان دەکێشا، فریشتە نەخۆشەکان لە پێخەفەکانیاندا... بەشەر، حەیفدەکەیت نیگارکێشێکی باش ناهێنییت نیگاریان بکێشێت. نا بەو فۆتۆ کاڵ و کرچانە مەخەڵەتێ. جوانتری نیگاری مەخلوقات ئەوەیە کە نیگارکێشێکی باش دەیکێشێت، نەوەک ئەوەی کامێرا وێنەیدەگرێت... بەشەر بەقسەم بکە». جارێکی تر توند دەستی بولبولیاری گووشی، چاویلکەکەی داگرت و کردییەوە چاوی، باڵای بە جۆرێک بەرز بوو، بولبولیار لە بەردەمیدا هەستی بە نامۆیی کرد. گووتی « عەفووومبکە کە پیرم و ناتوانم بێم لێرە خزمەتیانبکەم. عەفووومبکە. خۆشحاڵ بووم، کوڕم، خوشحاڵ بووم بە بینینی ئەم کەشتییە. هەر ڕۆژێک کارت بە من بوو وەرە لام، هەر کارت بوو وەرە. من ئەوەتەی ژنەکەم مردوە زۆر تەنیام». دکتۆر نەزمی وایگووت و بێئەوەی هیچی دی بڵێت، بە خێراییەکی بێوێنە، وەک ئیشێکی کتوپڕ و پەلەی بۆ دروستبوبێت، هەم ژوورەکە و هەم کەشتیی فریشتەکانی بەجێهێشت.

***

یەکەمین فریشتەیەکی نەخۆش، کە بولبولیاری هاوڕێمان ئەرکی پاراستن و هاودەمی کەوتە سەرشان میرائیلی پرۆفیسۆر بوو. فریشتەیەکی بالآبەرز، بەلآم بە دوو باڵی لاوازەوە کە هەرکات مرۆڤ دەیبینی وایدەزانی ئێستا نا ساتێکی دی لە بنەوەڕا دەکەون و بەردەبنەوە. لە چاو فریشتەکانی تردا پیرتر دەردەکەوت، بەلآم لە هەر فریشتەیەکی تر خەیالآوی و قووڵتر بوو. هەندێجار بە تەنها بە خۆی و گۆچانێکی ڕەشەوە کە دیاری دکتۆر شوکاک بوو، لە ڕیواقەکاندا دەردەکەوت و دەچووە بەر پەنجەرەی نهۆمی دوو و لەوێوە سەیری درەختەکانی مەلەکئاوای دەکرد، زۆر حەزی لەسەیری باغ بوو، چونکە وەک دەیگووت لە ژیانی خۆیدا وەک نیوەئادەمییەک، خاوەنەکەی ڕێگای سەیرکردنی باغی پێ نەدابوو. کەمبوون ئەو فریشتانەی دەیانتوانی لە پێخەفەکانیان سەربەخۆ بێنەدەرێ و بە تەنها بە ڕیواقەکانی بیمارستاندا هاتوچۆبکەن، ئەو یەکێک بوو لەوانەی کە ئەگەر لە دۆخێکی بەدیشدا بایە، هەر دەبایە پیاسەیەک بە هەوای پاک و بە نێو درەختاندا بکات. لە ناو فریشتە نەخۆشەکاندا میرائیلیان بە فەیلەسوف ناودەبرد. ئەو ڕەشبینترین و نائومێدترین فریشتەی هەموو بیمارستانەکە بوو، یەکێک بوو لەوانەی سەرەتا هەوڵێکی خۆکوژیشی دابوو، بەوەی لە سەربانی نهۆمی سەرەوەی بیمارستانەوە خۆی فڕێدابووە خوارێ و هیچی لێ نەهاتبوو، دوای ئەو هەوڵی خۆکوژییە، قاچەکانی لاوازبووبوون و توانای خۆڕاگرتن و ڕۆیشتنی ڕێک و ڕاستی نەمابوو. بولبولیار خۆشییەکی زۆری بەوە دەهات کات لەگەڵ میرائیلی پیردا بباتەسەر، هەستیکرد زۆر شت هەیە ئەو لە خانمی مەلەکبین یان مەهدائیل زیاتر دەتوانێت ڕوونیانبکاتەوە. ڕۆژێک بولبولیار بە جۆشەوە دەربارەی گرفتی گەورەی مردنی فریشتەکان قسەی لەگەڵ کرد، هۆشەنگ تا پتر بە بناوانی ئەو گرفتەدا بچووبایەتە خوار، هەستیدەکرد نهێنی زۆرتر و دەرەنجامی

وردتری دەستدەکەوێت. میرائیل چاوی بە ئاستەم هەڵدەهات، ئەوی ڕۆژ بە ماندوێتی دەستی خستە ناو دەستی هۆشەنگەوە و بە دەنگێکی لاواز، کە لە دەنگی فەیلەسوفێکی پیر دەچوو، گووتی «فریشتەکان لە سێ جۆر مرۆڤدا دەمرن. ئەوانەی دەرهەق بە دڕندەیی بێباکن، ئەوانەی وەک ئامێریان لێدێت و ملی یەکجۆرە ژیانی مردو و دووبارە دەگرنە بەر، ئەوانەی لە مەزنی مرۆڤ تێناگەن و بۆی ناژین... فریشتەکان لەو سێ جۆر بوونەوەرەدا زوو دەمرن».

میرائیل خەندەیەکی لاوازی گرت و بە دەنگە گڕ و پیر و زامدارەکەی خۆی گووتی « ئێمە بوونەوەرانی سەرسەختین، مرۆڤ زۆر هەست بە بوونمان ناکات، بەر پرسین لە هەندێک شت کە لای زۆربەی مرۆڤەکان نرخی نییە... من جگە لە خەونی مرۆڤێک کە نایەتە دی، هیچی تر نیم... هەموو کۆمەڵێک خەونین و نایەینە دی».

پێکەوە لە باغی فریشتەکاندا پیاسەیاندەکرد. میرائیل پەتۆیەکی تەنکی ڕەشی دابوو بە سەر شانیدا، ڕەنگی تەواو سپی بوو، لەگەڵ ئەو وەڕزیی و پیرییەدا، لە ناو گوڵزاری باغچەکەدا ئاسوودە دەهاتە بەرچاو. «هەر کات دەرکەوت مرۆڤ بۆتە دڕندە یان مەکینە یان کۆیلە، ئیتر هیوات نەمێنێت. فریشتەکان ناتوانن لە ناو مرۆڤی دڕندەدا بژین، ناتوانن لە ناو مرۆڤی وەک ئامێردا بژین، ناتوانن لە ناو مرۆڤی کۆیلە و بچوکدا زیندەگیبکەن... بەڵام ڕۆژ بە ڕۆژ خەڵکی زیاتر و زیاتر تووشی ئەو دەردانە دەبن، بەمزوانە ڕۆژگارێک دێت مرۆڤێک نادۆزینەوە یەکێک لەو دەردانەی نەبێت».

میرائیل، فریشتەی هەڵهاتووی پرۆفیسۆرێکی زانکۆ بوو، کە ساڵ دوای ساڵ بوو بوو بە ماشێنێک کە جگە لە نوقمبوون لە ساردی زانستگەلێکی بێپەیوەست و میکانیکدا، لەوانەی عەقڵ دەئاوسێنن و ڕۆح لاوازدەکەن، خولیای تری نەبوو. پرۆفیسۆر میرەدین، کەسێک بوو

نیشانەیەکی ژیان و بڵندگەرایی هەڵنەگرتبوو، جگە لە ژمارەی وشک و هاوکێشەی موجەڕەد بۆ هیچی تر نەدەژیا. ئێستا فریشتەکەی بۆ مردن گەیشتبووە کەشتییەکە و ئومێدێکی بە پاشەڕۆژ نەبوو.

بولبولیار زۆر خزمەتی میرائیلی دەکرد، زۆر چیرۆکی بۆ دەخوێندەوە، ژیانی خەیاڵی و شاری خەیاڵی و باغی ئەفسانەیی بۆ دروستدەکرد، بە کوچەی نوێ و ژیانی تازە و زانستی نوێ ئاشنایدەکرد، بە شیعری دەناساند، دەیخستە ناو سەربورد و دڵداری و جەنگی وەهاوە کە تێیدا میرائیل هەستیدەکرد زیندووە. لە کاتی چیرۆک خوێندندا، چاوی دەنوقاند و خۆی لەو شوێنە تازە و شارە دوورانەدا دەبینییەوە کە بولبولیار بۆی دروستدەکرد... میرائیل لە ناو گوڵەکاندا بە بولبولیاری گووت «مرۆڤ گەر لە ژوورێکی تاریکیشدا دیل بێت، دەتوانێت هەموو ڕۆژێک ژیانێکی تازە بژی. چونکە هەرچییەک زنجیری لە پێدا بوو مانای ئەوە نییە دیلە و هەرچییەکیش زنجیری لە پێدا نەبوو مانای ئەوە نییە ئازادە... ئینسان کاتێک ئازاد دەبێت بتوانێت زۆر لە دونیا دوورنەکەوێتەوە، بەڵام لە هیچ شتێکیشدا بە جۆرێک نەخنکێت ببێتە کۆیلە و چاوی هیچی دی نەبینێت. فریشتە لە ناو تۆدا کاری ئەوەیە دەرهەق بە گوڵەکانی ئەم باغچە یە و گوڵ لە هەموو باغەکانی دونیادا بێباک نەبێت، گەر بوویت بە باغەوان خزمەتی گوڵەکان نەتکات بە کۆیلە، نەتکات بە ئامێرێک ئەوەت لە بیر بەرێتەوە کە تۆ لەم باغەدا تەنیا کارت ئەوە نییە گوڵەکان ئاو بدەیت... بەڵکو دەتوانیت لێرەدا بخەویت و خەون ببینیت، یاریبکەیت، دڵداریبکەیت، گوڵاوبگریت، سەیری پەپولە بکەیت، گوێ لە بولبول بگریت. گەر گوڵەکانت فەرامۆشکرد و ئاوت نەدان و بە هۆی بێباکی تۆوە مردن، ئەوا تۆ دڕندەیت، گەر بوویت بە کەسێک کە جگە لە ئاودانی گوڵەکان ئەگەرێکی ترت لەم باغەدا نەدۆزییەوە ئەوا تۆ کۆیلەیت، ئەگەر ئاودانی گوڵەکان لە عەشقەوە بوو بە وەسواس،

بوو بەو واجیبەی وابزانیت تۆ جگە لەو کارە هیچی دیت پێناکرێت، بوو بەوەی وابزانیت جگە لە تۆ هیچ باغەوانێکی تر هەقی نییە پێبخاتە ئەم باغەوە، یان هەر باغەوانی بوو بە کارێک ئازارت بدات و تۆ تا مردن هەر بیکەیت... ئەوکات تۆ ماشێنیت».

میرائیل چەند هەفتەیەک بوو زۆر نەخۆش بوو، بولبولیار لە ڕۆژانی خۆشدا دەیهێنایە دەرێ، لە سێبەری درەختەکاندا پەتۆیەکی تێوەدەپێچاو و دایدەنا، یاخود لە سەر عەرەبانەیەکی بیماران بە هێمنی بە ناو گوڵەکاندا دەیگێڕا، گەر خۆی حەزی بە جوڵە بایە هەڵدەستا و پیاسەیدەکرد، بەڵام هەر کات لە هەوایەکی پاکدا بووایە، ئارەزووی بۆ قسەکردن زۆرتر و توانای لە سەر فەلسەفاندنی ژیان گەورەتر دەبوو. لەو کاتانەدا ئارەزووی بولبولیاری هاوڕێشمان بۆ پرسیار و کونجکۆڵی گڕی دەسەند. ئەو ڕۆژە بولبولیار لە فەیلەسوفی فریشتەکانی پرسی «میرائیل، بیهێنە پێشچاوی خۆت کرێکارێک هەیە، بە ڕۆژ تا درەنگ کاردەکات، بەرد دەشکێنێت، شەو ماندوو دەگەڕێتەوە ماڵێ. دەمێ دەگاتە خانەی خۆی بە جۆرێک هیلاک و کەنەفتەیە دەبێت نانێکی کەم بخوات و بخەوێت، تاسبەی بتوانێت کاربکاتەوە. ئەم مرۆڤە جگە لە وەی بێباک بێت بەرامبەر ئەم دونیایە ڕێگای تری نییە، کاتێکی نییە بۆ ئەوەی بیر لە خۆی و ئازاری ئەوانی تر بکاتەوە. گەر وەک ئامێر بەردەکان نەشکێنێت، ڕێکیان نەکات، دایان نەنێت نانێکی نابێت بیخوات... پێمبڵێ، لە ناخی کەسێکی وەهادا فریشتە دەبێت چ حوکمێک بدات و چ ئیشێکی هەبێت؟»».

میرائیل هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گووتی «ئەی فریشتە بەشێک نییە لە خۆت؟ فریشتە لەگەڵ ئەو پیاوەدا هەڵدەستێت، لەگەڵیدا بەردەشکێنێت، لەگەڵیدا کرێکاریدەکات، لەگەڵیدا دەگەڕێتەوە بۆ ماڵێ و پشوو دەدات. بەڵام هەر ئەو فریشتەیەیە کە ساتێک پشوو دەدات، بەو

کرێکارە دەڵێت دەشێت ژیانێکی ترت هەبێت... هەر ئەو فریشتەیەیە وای لێدەکات خەون ببینێت، وای لێدەکات عاشقی بەرد و چەکوشەکەی نەبێت، عاشقی کۆیلەیەتییەکەی خۆی نەبێت... ئەوە ترسناک نییە مرۆڤ کۆیلە بێت، ئەوە ترسناکە مرۆڤ کۆیلەیەکی بەختەوەر بێت. ئەوە ترسناک نییە مرۆڤ زنجیری لە قاچدا بێت، ئەوە ترسناکە زنجیرەکانی خۆی بە خشڵ و تەلا تێبگات. من فریشتەی پیاوێک بووم دەست و پێی لە زنجیری مەعریفە بێڕۆحەکانەوە ئالا بوو، بەلام خۆی هیچی نەدەبینی. تا ئەو شوێنەی تۆ ئازار دەچێژیت، ناچاریت، زەجر دەکێشیت فریشتەکەت لەگەڵتدایە، هاودەمتە، هاوشانت زەجردەکێشێت، بیردەکاتەوە، خەیاڵت گەورە دەکات، بەلام ڕۆژێک ئازار هێندە سادە و ئاسایی بوو لەلات، زەجر و ژانی خۆت یاخود کامەرانی خۆت بە جۆرێک خۆشویست بوویتە کۆیلەی، لەوێدا شتێک لە دڵی ئێمەدا دەشکێت. ئینسان بەردەوام بەپێی خۆی بەرەو زیندان ڕادەکات، هەر کات مرۆڤ عاشقی زیندانەکەی بوو... لەویادا فریشتەکەی دەمرێت».

هۆشەنگ پرسی «زیندان چییە لای ئێوە میرائیل، زیندان چییە؟».

«زیندان شتێک نییە پەیوەندی بە جەستەوە هەبێت، دیلبوون واتە وەرگەڕانی ئینسان بۆ مەکینە یان بۆ جانەوەرێک کە هیچ ئازار و کارەساتێک نایجوڵێنێت. زیندان لە کاری دوو شتە، نەمانی خەیاڵ و نەمانی خۆشەویستی. ئەوەی کە مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ عەقڵ نییە، نا عەقڵ بە تەنیا مرۆڤ ناکات بە مرۆڤ، هەرگیز. ئەوە بکە بە شادروشمی ژیانت، چونکە من دەمرم، بەلام دڵنیام لەم شارەدا سەردەمانێک بەرێوەن، پیاوان و ژنانێک دێنە مەیدان کە وادەزانن عەقڵ یان زانستی ڕووت بە تەنیا بەختەوەری دروستدەکات، بەلام عەقڵ بەبێ خەیاڵ و توانایەکی گەورە لە سەر ئەڤین، ئەڤین بە مانا هەرە گەورەکەی، بە مانای میهرێک کە بۆ هەموو شتێکی سروشتی هەتە، هیچ نییە جگە

لە مەکینەیەکی بێڕەحم و زیرەک. عەقڵ لای من کە ئێستا فریشتەیەکی نەخۆشم و چاوەڕێی مردن دەکەم، تەنیا لە پاڵ خەیاڵ و ئەڤیندا مانای هەیە. ئێمەی فریشتە زۆر پەیوەندیمان بەو شتانەوە نییە کە لە عەقڵی ئێوەدا دەگوزەرێت... ئاخۆ پرسیارێکی ماتماتیکی شیکاردەکەن، ئاخۆ بیر لە هاوکێشەیەکی مەنتیقی دەکەنەوە، یان قازانج و زیانی خۆتان حیسابدەکەن، نا کارمان بەوانەوە نییە... بەڵام کە خەیاڵ مرد، ئیتر خۆری ڕاستەقینە لە ناخدا ئاوا دەبێت، ئەو خۆرەی من پێویستیم پێیەتی... ئەو ڕوناکییە گەورەیەی من پێی دەژیم».

میرائیل گەر زۆر قسەی بکردایە هەناسەی سوار دەبوو، پێویستیدەکرد پشووی درێژ بدات، کۆمەکی لە بولبولیار وەردەگرت تا لە جێگایەکدا دابنیشێت. زۆرجار ماوەی درێژ بێدەنگ دەبوو و تەنیا سەیری ئاسمانیدەکرد، سەیری هەتاوی دەکرد، یاخود چاوی لێکدەنا و لەبەر خۆردا دادەنیشت و چێژی لە تیشک دەبینی. بەڵام دەبوو هەموو ڕۆژێک بێتەدەرێ، هەموو ڕۆژێک خۆی بشوات، پیاسەبکات، سەیربکات بزانێت کە باغەکە گوڵی تازەی گرتووە. سەیربوو لەگەڵ هەموو ئەو نائومێدییە گەورەیەدا، هێشتا ئەو وردەکارییە بچوکانەی ژیان سەرنجیان ڕادەکێشا.
بولبولیار لەوەوە هێدی هێدی شارەزای لەشی فریشتەکان بوو، فێربوو چۆن دەستیان بۆ بەرێت، لە کوێوە بیانگرێت، چۆن لە کاتی لاوازیدا باڵەکانیان بەرزبکاتەوە، لە جێگای خۆیان بیانجوڵێنێت و بیانکاتە ئامێز. زۆربەی فریشتەکان بوونەوەری ناسکبوون، مەخلوقاتی نەرم و لاواز کە بۆ ئەوە دروست نەبووبوون لە مرۆڤ دووربکەونەوە، وەک کۆرپەیەکی زۆر گەورە دەهاتنە پێشچاوی، زۆربەیان شتێکی ئەوتۆیان لە پتەوی و بەهێزی مەهدائیل تێدانەبوو، کە هەمیشە وەک بەهێزترین فریشتەی سەرزەمین شانازی بە خۆیەوە دەکرد. زۆربەی فریشتەکان بەشی هەرە زۆری ژیانیان لە ناو جێگاکاندا دەبردەسەر، نیمچە بێهۆش، لە بەردەم

مەترسی مردنێکی هەمیشەییدا... میرائیلی فریشتە بە پێچەوانەی مەهدائیل و فریشتەکانی دیکەوە، ژیان و مانەوەی فریشتەکانی بە دۆخی دەرونی و ڕۆحی خاوەنەکەیانەوە گرێ نەدەدا، پێیوابوو فریشتەکان بۆ مردن هەڵدێن، توانای مانەوە و ژیانیان گرێدراوی توانای خۆیانە، دەیگووت «فریشتەکان بۆ ئەوە دێنە دەرێ بمرن، ئەم ژیانەی ئێمە لێرەدا دەژین ژیانێکی دەستکردە، ژیانێکی درۆزنە... کەشتیی فریشتەکان هیچ نییە جگە لە درۆیەکی گەورە. زۆرجار دکتۆر شوکاک بە زۆر هەناسەمان پێدەدات، ئێمە بۆیە دێینە دەرێ و دەترازێین، چونکە ئارەزووی ڕاستەقینەی ژیانمان نییە».

بولبولیار بە غەمگینی گووتی «پێتوایە چیرۆکەکان کاریگەریان نییە، پێتوایە هەوڵی ئێمە بۆ زیندەگی و مانەوەتان بێسوودە».

میرائیل گووتی «ژیانی ئێمە لەگەڵ مرۆڤدایە، لە دەرەوەی مرۆڤ فریشتە نرخێکی نامێنێ. نە مرۆڤ بێ فریشتە مرۆڤە و نە فریشتەکانیش بێ مرۆڤ فریشتەن».

بولبولیار دەیزانی میرائیل لەوەدا لە سەر هەقە، بەڵام بە حەسرەتێکەوە گووتی « فریشتەکان نیشانەن بۆ شتێک کە دەبێت بژی. ئێوە لە ناو ئێمەدا بن یان لە دەرەوە دەبێت بژین. هەموو دەمرین... هیچ شتێک مانایەکی هەتاهەتایی نییە میرائیل... هیچ شتێک. بەڵام نرخی ژیانی تۆ لەم ساتەدا، وەک نرخی هەموو جوانییەکانی تری دونیا گەورەیە. وەک نرخی گوڵ لە هەموو باغەکانی دونیادا، وەک نرخی باڵندەکان لە هەموو ئاسمانەکاندا. میرائیل، ژیانی من موڵکی من نییە بە تەنیا، لە بەرئەوەی ژیانی من یان هی تۆ نرخێکی هەیە، ئەو نرخە موڵکی هەموو ئەوانی تریشە. ژیانی تۆش نرخێکی هەیە کە پەیوەندی تەنیا بە تۆوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە مانای ئەم گەردونەوە هەیە. هەر کەسێک خۆی دەکوژێت، لەڕاستیدا تەنیا خۆی ناکوژێت، بەڵکو دەستدرێژی دەکاتە

سەر مانای ژیان لە هەموو گەردونندا... لە هەموو جێگایەکدا. نرخی ژیان بە تەنیا لای خاوەنەکەی نییە، بەڵکو لای هەموومانە، لای ئەوانەی مردون و ئەوانەشی لەدایکدەبن».

میرائیل فریشتەیەکی ڕەشبین بوو، بەڵام حەزی لە تیشک و ڕوناکی بوو، حەزی لە باغ و هەوای ساف و ڕۆژانی ساماڵ بوو. خۆشبەختبوو کە لە بولبولیاردا هاوەڵێکی زیرەکی دەستکەوتووە. گووتی «دەشێت ئەم ژیانە دەستکردە، نرخێکی بۆ ئێوەی ئادەمیزاد هەبێت، بەڵام ئێمە لای مرۆڤ بوونمان نییە، کە فریشتە لە مرۆڤ جیادەبێتەوە، لە بەرئەوەیە مرۆڤ هێزی نرخداننی نامێنێت. ئینسانێک توانای نرخدانانی نەمێنێت، بوونەوەرێکە لەنێوچوو. گەورەترین کێشەیەک من لە بەشەردا ببینم ئەوەیە، توانای نرخدانان لەدەستدەدەن. زۆربەی هەرە زۆری بەشەر، جگە لەوەی گەمژەیی خۆیان لە پشت کۆشک و ماشێن و هەندێک زانستی درۆزن و یەک دیوەوە دەشارنەوە، هیچی تر ناکەن. مەخلوقی وا تێناگات تۆ باس لە چ نرخێک دەکەیت. ئینسان لەوە گەمژەترە بتوانێت نرخ بۆ خۆی دابنێت، هەر مەخلوقێکیش نەیتوانی نرخ بۆ خۆی دابنێت، ناتوانێت نرخ بۆ گوڵ و ئاسمان و هەوریش دابنێت».

بولبولیار گووتی « لە مانا گشتییەکەیدا میرائیل، مانای ژیانی من و ژیانی تۆ و ژیانی گوڵێک وەکو یەکە، سەدساڵی تر کەسمان نەماوین و کەسیش نازانێت بووین، شتێک دەتوانین بەجێیبهێڵین نرخە. ئەو بەها گەورەیەیە کە دەیخەینە سەر شتێکی دیاریکراو. بەهای گوڵێک لەسەد ساڵی داهاتوودا درێژکراوەی ئەو بەهایەیە کە ئەمڕۆ ئێمە دەیدەینێ. میرائیل، مرۆڤ ناتوانێت لە سەد ساڵی تردا گوێی لە دەنگی بولبول بێت، گەر ئەمڕۆ نرخی لە سەر دانەنێت... گەر ئێمەش ئێستا نرخ لە سەر ژیانی تۆ دانەنێین، ئەی هاوڕێم... ئەی میرائیلی غەمگین... چ

شتێک زامنی ئەوە دەکات سەد ساڵی تر ئینسانەکان بەهای فریشتەکەی نێو ناخی خۆیان دەزانن؟»

میرائیل وەک هەموو فریشتەکانی تر، لەو باوەڕەدا بوو کە ناخی مرۆڤ چیتر قابیلی نیشتەجێبوون نییە. بە هێمنییە زامدارەکەی خۆیەوە، وەک یەکێک زۆر لەزەت لە ڕۆژانی خۆش ببات، بەڵام توانای لەزەتبردنی لە بوونی خۆی نەمابێت گووتی «من و هەر فریشتەیەکی تریش، کاتێک ئاسوودە لە ناو ئینساندا دەژین کە نەبووبێتە مەخلوقێکی ناڕەسەن، بە کاڵایەکی فابریکی. ئینسان لەم سەردەمە و لەوانەشدا کە دادێن، وردە وردە خەریکە دەبێتە بوونەوەرێکی کارخانەیی، شتێک کە لە جۆرە کارخانەیەکی گەورەدا دروستدەکرێت... بیرکردنەوەی، هەستی، ڕەفتاری هەموو پێکڕا دەستکرد و سەنعەتی دەنوێنن. هەموو شتێکی ئێوە لەو کارخانەیەوە دەردەچێت و لەو کارخانەیەدا سەوزدەکرێت. ئینسان هێدی هێدی لەوە دەکەوێت ئەو بوونەوەرە سروشتییە بێت، کە هەر یەکەیان شتێکی تایبەت و یەکجارەیە، ئیشی فریشتەیەکی وەک من ئەوە بوو ئەو یەکجارەییە بپارێزم. بەڵام دەمێک ئێوە هەموو هەوڵدەدەن لە یەکبچن، هەموو خولیاتان ئەوەیە بە هێز و بێباک و مەکینەئاسا بن. فریشتەکان ئیتر هەر لە نوتفەوە دەمرن. ڕۆژگارێک دێت کە ئینسان هەر لە لەدایکبوونییەوە فریشتەی نابێت. سەردەمێک دێت فریشتەکان هەر بە منداڵی لە ناخی مرۆڤدا دەخنکێن. کە خەیاڵی مرۆڤ دەبێتە بۆتەیەکی تەنگ، ئیتر من جێگام نابێتەوە... سەیرمکە بولبولیار، بۆ ئەم باڵە زلانە ناتوانن بفڕن؟ چونکە شوێنێک نییە تێیدا بفڕن. فریشە تەنیا لەگەڵ ئینسان و لە ناو ئەودا دەتوانێت بفڕێت. مرۆڤ تاکە بوونەوەرێکە بەڕاستی دەتوانێت بفڕێت، بە ڕووکەش فریومەخۆ، ئەو باڵندانەی کە بە ئاسمانەوەن، خەیاڵی ئەوەیان نییە بزانن چیدەکەن. وەک ئەو هەنگەی هەنگوین دروستدەکات و نازانێت هەنگوین چییە.

ئـەم باڵانـەی مـن، باڵـی هەمـوو فریشـتەکانی دونیـاش، خەیاڵـی ئینسـان دەیانجوڵێنێت... پرۆفیسۆرەکەی خاوەنم ئاسۆی نەبوو، کە ئاسۆ نەبوو فڕینیش نامێنێت، کە فڕین نەما باڵەکانی منیش هیچ نین جگە لە دوو تەنی قورس کە بە زۆر لکاون بە شانمەوە، دەبنە دوو باری قورس، دوو باری پوچ و قورس کە دەبێت ڕزگارم بێت لێیان».

بولبولیار هەستیکرد نائومێدییەکانی میرائیل لەوە قووڵترە ئاسان بە سەریدا سەربکەوێت. ئەو تەنیا فریشتەیەکی نەخۆش نەبوو کە تەواوی ئەم ژیانەی بە دەستکرد دەزانی، بەڵکو مانەوەی خۆشی لەم کەشتییە بەردینەدا بە زیاد و پوچ لەقەڵەمدەدا. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لەو ساتانەدا کە چیرۆکەکانی بولبولیار ئەوەی تێدا سەوزدەکرد کە دەشێت ژیانێکی تر بژی، شادمان دەبوو.

ئەوەی زۆرجار مرۆڤ دەتوانێت تەنیا بە هیوا بژی، بە هێزی فریشتەکەی ناخێتی. فریشتە هیچ نییە جگە لە کارگەرێکی گەورەی ئومێد، ئەو ئومێدانەی کە مەرج نییە هیچ ڕیشەیەکیان هەبێت، بەڵام ئومێدن، ئومێدی سافن و هیچی تر، هیچ کات نابن بە شتێکی دی، ئومێدی ئەستەمن کە نایەنەدی، بەڵام دەتوانن مرۆڤ بۆ زۆر دوور ڕابکێشن. مرۆڤ دەبێت ئومێدێکی ئەستەمی هەبێت، ئومێدێک کە هەرگیز نەیەتەدی، بەبێ ئەوە ئیدی مرۆڤ کۆتایی دێت... ئومێدێکی بێناو، شتێک وا لە مرۆڤ بکات بەردەوام جیهان و ژیان و ناو ئەوانی دی بگەڕێت... شتێک هەرگیز نادۆزرێتەوە، ناوی نییە، نازانین چییە، بەڵام چونکە نادۆزرێتەوە دەبێت هەمیشە بۆی بگەڕێین. کێشەی میرائیلیش لەگەڵ ئینساندا ئەوەبوو کە چیتر بەدوای ئەو ئومێدە نەگیراو و ئەستەمەوە نییە. مرۆڤ ئەو ئومێدەی گۆڕیوەتەوە بە هەندێک خولیا و خەونی کەم بەها و ئامادەش نییە بگەڕێتەوە سەر سەرچاوەی ڕاستەقینەی ژیان، کە ئەو ئومێدە تەماوی و نادیارەیە... مرۆڤ بە بڕوای میرائیل لەدەستچووبوو.

هەر ڕۆژێک بولبولیار لە بیمارستان دەچووەدەرێ، بیری لەوە دەکردەوە کە مرۆڤ تا ئێستا چەند بە هەڵە لە فریشتەکان تێگەیشتووە کە تەنیا وەک هێزێکی چاکەکار تەماشایاندەکات، لە کاتێکدا بوونەوەری دوودڵ، پڕ ئازار، تەنیا، بریندارن.

بولبولیار ئێستا هەستیدەکرد، لە کەشتیی فریشتەکاندا لەنگەرێکی جوانی گرتووە و ماڵێکی گەورەی دۆزیوەتەوە، ڕۆژانە سەری لە زۆربەی فریشتە نەخۆشەکان دەدا، قسەی لەگەڵ زۆربەیان دەکرد، میرائیلی دەگێڕا، گوڵی باغچەکەی بۆ دەکردەوە و بە چەپک دەیخستە ژوور سەرییەوە، بەردەوام هاوڕێیەتی نوێشی لەگەڵ فریشتە تازەکاندا دروستدەکرد. چیتر وازی لەوە هێنابوو خەونەکانی لە ڕێگای سیاسەتەوە جێبەجێبکات، پشتکردنی لە سیاسەت گرێدراوی کینەیەک یان بێبڕواییەک نەبوو، سیاسەتێک ئەو باوەڕی پێبوو لەم سەر زەمینە بوونی نەبوو، ئیدی خۆی بەچییەوە سەرقاڵبکات... بولبولیار لەو ساڵانەی دواییدا ڕوویکردبووە ستایشی شیعر و شاعیران، تەنیا بە خوێندنەوەی ئەدەبیات دەژیا. خوێندنەوەی کتێبی مارکسی و شۆڕشگێڕانەی خستبووە لاوە تا بۆ شتێکی دی بژی. وڵاتەکە بە جۆرێکی سەیر تادەهات خوێناوی دەبوو، ترس و تۆقاندن لە هەموو جێگایەک بوون، دەیزانی بۆ ئەوەی شتێک بکات لەو هەموو خوێنە بە دووری بگرێت، دەبێت جیهانێکی دی بۆ خۆی بسازێنێت نەچێتەوە سەر دزێوییە گەورەکان، یان وەک خۆی ناویدەنا نەچێتەوە سەر گۆمی تاوانە بێکۆتاکان. ئەوەی زۆر سەرنجی هەمووانی ڕادەکێشا، زاهیدبوونی بوو، کەمخۆری بوو، کەمە کەمە دەکەوتە سەر ئەو بڕوایەی کە هیچ شۆڕشێکی ڕەوا لە سەر زەوی نییە، ئەو شۆڕشە نەبێت کە سەرەتا مرۆڤ بە سەر خۆیدا دەیکات. سەرەتا لەو باوەڕەدابوو شیعر ئەو کەرەستەیەیە کە باڵ بە ئینسان دەبەخشێت، تاکە ماشێنێکی ڕاستەقینەی دوورکەوتنەوەیە لە دونیا،

بەڵام کە زۆر تێکەڵی شاعیران بوو، کە هاتوچۆیەکی نزیکی لەگەڵ کردن، دەیبینی چ بوونەوەری لاواز و بێئیرادە و زۆرجار شەڕانیشن... پرسیارێک کە هەمیشە ئازاری دەدا، ئەوەبوو مرۆڤ چۆن بتوانێت شۆڕشگێڕ بێت، بێئەوەی ئازاری هیچ کەسێک بدات. لە سەرەتاوە واتێگەیشتبوو کە شۆڕش یاخیبوونی دیوە باشەکەی ئینسانە بە سەر دیوە چەپەڵ و زۆردارەکەیدا، بەڵام نزیکی لە شۆڕشگێڕانەوە تێیگەیاند کە شۆڕش زۆرجار تەڵەی ڕۆحە شەیتانییەکەی مرۆڤە تا کەسە ئازادیخواکەی ناومان بگۆڕێت بۆ جانەوەرێکی ترسناک. ماوەیەکی درێژ گەیشتە ئەو بڕوایەی کە گۆڕینی دونیا مەحاڵە، شۆڕش ناتوانێت جیهان بگۆڕێت، شۆڕش یارییە، یارییە و هیچی تر، بۆ کەسێکی بێلایەن کەسەر بە هیچ یەک لە دوو تیپەکە نەبێت، چاک و خراپ بوونی نییە... هەر دوو تیپەکە هەمیشە هەمان میتۆد و یاسا و مۆراڵ بەکاردەهێنن، بەهێز بێڕەحمترە و بێهێز پتر داوای ئینسانییەت دەکات. بەڵام لەدوا دەرەنجامدا تەواوی گەمەکە لەوەدا کورتدەبێتەوە، کۆمەڵێک مرۆڤ بە سەر کۆمەڵێکی تردا سەردەکەون. هەمیشە وەهایە، شۆڕش لە قووڵاییدا جگە لە گەمەیەک بۆ بردنەوە و دۆڕان زیاتر هیچی تر نییە. گەمەیەکە مرۆڤ بە جۆرێک بێڕەحمانە دەیکات و هەموو شتێکی تیادا دەهاڕێت، تەنیا شتێک لە مرۆڤدا دەمێنێتەوە، توانایەتی لە سەر وێرانکردن. لە بەرئەوە هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی بە شۆڕشی درێژ و چەکدار و خوێنیندا تێدەپەڕن، دواتر سەردەمی ترسناکی بێڕەحمی و بێباکی چاوەڕوانیاندەکات. کە هۆشەنگی بولبولیار چووەماڵی فریشتەکان، هەستیکرد لێرەدا دەتوانێت لە دروستکردنەوە و پاراستنی دیوێکی ئینسانیدا بەشدار بێت کە هێدی هێدی بەرەو نەمان دەڕوات. دوای ماوەیەکی کەم لە ئیشکردن، گەیشتە ئەو بڕوایەی کە تەنیا شۆڕشێکی ڕاستەقینە ئینسان ئێستا بتوانێت بیکات، ڕزگارکردنی فریشتەکەی ناخی خۆیەتی... بەبێ ئەوە، هیچ شۆڕشێکی دیکەی سەر زەمین بە سەرفرازیی ناگات.

# ترازان

دوای هەشت مانگ و سێ هەفتە، نەغەدە ماردینی کچێکی کوێری بوو. ڕەوشی لەدایکبوونەکە ئارامبوو، لە ساتی یەکەمەوە دکتۆر شوکاک و مامانە یاریدەدەرەکەی، سەرنجی کوێری منداڵەکەیان دا، بەڵام ماردینی بە جۆرێک ماندوو و کەنەفتە بوو، بایەخێکی بەوە نەدا ئاخۆ منداڵەکەی زیندوو یان مردووە، چەند سەعاتێک بەر لە لەدایکبوونەکە بە ڕێزانی مەلەکبینی گووت «منداڵم دەبێت، بەڵام نابم بەدایک». بیرۆکەی ئەوەی دایک بێت، شێتیدەکرد. ئەو کە منداڵێکی دروستکرد لە جەوهەردا بۆ ئەوە بوو بۆ خۆی بسەلمێنێت ناتوانێت ببێتە دایک.

لیڤیتانت بە کوێری منداڵەکەی، گەلێک بێحاڵ و پەرێشان بوو، بەڵام باوکانە لە ئامێزی گرت و ماچیکرد و لەگەڵ سستەرەکاندا تا بیمارستانی ساوایان بردی. وەلێ بۆ نەغەدە وەک ئەوە بوو منداڵەکە بارێکی سەخت بووبێت، دابینابێت و چیدی کاری بە هیچەوە نەمابێت. من دوور بە دوور ئاگاداری خانمی ماردینی و بارودۆخی تەندروستی بووم، ئەو ماوەیە من لە سەر ڕێنمایی بولبولیار و مەهدائیلی فریشتە، گوێم لە مۆسیقا دەگرت و شیعرم دەخوێندەوە و کەمە کەمە لە ژوورەکەمدا خۆم فێری سەمادەکرد، هەموو ئەو شتانەش لەبەر لەشم گەلێک قورس بوون، هەستمدەکرد خۆم لەزەتێکی زۆریان لێ نابینم، کاتێکی زۆریان لێدەبردم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، باڵدارەکەی ناوەوەی منیان هێورکردبووەوە، ئەو ماوەیە فریشتەکەم کەمتر تەکانی دەخوارد، کەمتر خۆی ڕادەوەشاند و لە ناوەوەڕا گڕ و گوڕمی دەخستە کار. مەهدائیلیش کە زوو زوو دەهاتە پشکنینیم، بەردەوام تکایدەکرد، خۆم لە کارگەلێک

بەدووربگرم کە ئەم بوونەوەرەی ناخم تورەدەکات، داوایەک کە نەمدەزانی چۆن جێبەجێیبکەم. یان دەبوو داواکارییەکانی ئەنجومەنی باڵای حیزب بخەمە لاوە، یاخود ئەم باڵدارە شێتەی ناخم تورەبکەم... لەو دەمەدا، ڕۆژانە لەگەڵ ئەفسەرەکانی دەزگای هەواڵگری بەعسدا کۆدەبوومەوە، هەندێک لە کۆبوونەوەکان تایبەتی و هەندێکیان ڕەسمی بوون، دوای هەموو کۆبوونەوەیەک دەرگا نهێنییەکەی ڕۆحم کرتەیەکی تری دەکرد و هەستمدەکرد باڵی فریشتەکەم توندتر لە جاران دەلەرزێت. ئەو کات زۆر مەراقم بوو بزانم نەغەدە چی بە سەر دێت، دۆخی نەغەدە نمونەی ئەو دەردە بوو کە دەشیا منیش گیرۆدەی بم. ئەودەم مەهدائیل و بولبولیار چیرۆکی بیمارستانی فریشتەکانیان لێشاردمەوە، بەڵام مەبەستیان بوو لە نزیکەوە خەبەرداری خانم بم، وەک دروست بزانن من چۆن بیردەکەمەوە، وەک بیانەوێت بە هێمنی و دووراودوور وانەیەکم نیشاندەن.

«ئاسمان» کچە کوێرەکەی لیڤیتانت، لە سەعات دوازدەی نیوەڕۆدا لەدایکبوو، لە سەعات هەشتی شەودا فریشتەکەی خانم کەوتە جموجۆڵێکی سەیر. وەک دەڵێن تەکانەکانی بێوێنەبوون، هەموو هەوڵەکان بۆ گرتن و دابینکردنی بێسوودبوون، بولبولیار دواتر ئەو گوژمە کوشندانەی وەک دەستکردی هێزێکی غەیبی وەسفکرد، کە ڕامکردن و بەستنەوەی لە توانای بەنیئادەمدا نییە، هێزێک بووە وەک بایەکی زۆر بەهێز، گەردەلوولێک مرۆڤ بکەوێتە ناوەندییەوە و گێژەنێک کە مرۆڤ لەگەڵ گوژمەکانی خۆیدا بادات. ئەو شەوە، نەغەدە ماردینی چەندین جار بێهۆش بوو و کەوتەوە سەر حاڵ، بێئەوەی جەستەی لە بازدان و سەما و سوڕاندنەوە و کەوتن و هەستانەوە بوەستێت. لەو شەوەدا جەستەی ماردینی دەبێتە پوشێکی بێهێز و فریشتەکەی تەواویی هێزی دەگرێت و دەیبات، بۆ سەعاتێک باڵەکانی بەهێزێکی وا گەورە تەکاندەخۆن، بوار نادەن هیچ کەس نزیکی بێتەوە و بیگرێت، ماردینی خۆی دەبێتە ئەو تەختە

بێگیانەی کە فریشتەکە خەفەیدەکات تا بتوانێت بێتەدەرێ. بولبولیار و ڕێزانی مەلەکبین و دکتۆر شوکاک بە چاوی خۆیان هەموو شتێک دەبینن، ئەو ساتەی تێیدا فریشتەیەک دێتەدەرێ، دەڵێن وەک دەرچوونی ڕۆحێکە هەزاران ساڵ لە نێو فانۆسێکی ئەفسوناوییدا گیری خواردبێت، ساتێکە تێیدا خاوەن فریشتەکە بێهۆشە، یان پتر وەک دەروێشێکی مەست و دابڕاو لە دونیا بێئاگایە، لە دۆخێکدایە بە دۆخی سەمای سۆفییە مەستەکان دەچێت، بەپێوەیە، دەسوڕێتەوە، پرچی بادەیبات، دەستەکانی بێهێزن، بێویستی خۆی دەجوڵێنەوە، چاوانی تەواو داخراون، ڕوخساری نە ئازاری پێوەدیارە نە بەختەوەری... بەڵام هەموو شتێک دوای چەندین تەکانی زۆر بەهێز ڕوودەدات، لەناکاو تەپوتۆزێکی سپی، تەمێکی زۆر زۆر تەنک ژوورەکە پڕدەکات، ساردییەکی نهێنی وەک ساردیی بایەک بە سەر نەرمە بەفرێکدا ڕۆیشتبێت هەوای دەوروبەر دەگرێت، لە ناو ئەو ساردی و تەمەدا بۆ یەکەمجار باڵەکان ئاسوودە و بێتورەیی، وەک تەیرێکی دەرچوو لە قەفەز بە نەرمی و نازکی دەلەرێنەوە و ئەو مەخلوقە گەورەیە لەدایکدەبێت و ڕوخساری دەردەکەوێت.

دەرچوون و ترازانی فریشتەیەکی بیمار وەک هەڵهاتنی زیندانییەک نییە لە بەندیخانە، بەڵکو وەک هاتنەدەرەوەی کەسێکە لە وێنەیەک، وەک ئەوەی لە ناکاو فیگەرێک لە چوارچێوەیەک هەڵبێت و ببێتە ڕۆحلەبەرێکی نوێ. فریشتەکەی ماردینی بەو جۆرە و لە ناو تەمتومانێکی سپیدا هاتەدونیاوە، هەمان ڕوخساری خاوەنەکەی خۆی هەبوو، هەمان پرچ و هەیکەل و نیگای هەبوو، بەڵام نەرمتر و ئارامتر و غەمگینتر دیاربوو. دکتۆر شوکاک یەکەمین کەس بوو کە باوەشی بۆ کردەوە و لە ئامێزی گرت. مەخلوقێکی زۆر ماندوو بوو، ئەزمونی لەگەڵ فریشتەکاندا فێری ئەوەی کردبوو، چۆن مەلەکێکی نوێزا لە ئامێز بگرێت. بینینی فریشتە ماندووەکەی خانم دکتۆری سەرسامکرد، فریشتەیەک بوو ساتە پاک و

نیگا دێرینەکانی نەغەدەی جارانی هەبوو کاتێک هێشتا کچێکی منداڵکار بوو لە ماڵی دکتۆر جەلال، لەو نەغەدەیە دەچوو کە دکتۆر شوکاک شەیدای بووبوو، ئێستا ڕووت بە دوو باڵی گەورەوە، ماندوو وەک یەکێک لە ژێر داروپەردووی بومەلەرزەیەک دەرهێنرابێت، بێدەنگ وەک کەسێک لە شارێکی سووتاو بڕوانێت... لەم ڕۆحە ماندوو و ئاڵۆز و بێلەنگەرەی نەغەدەی ئەمڕۆ دەهاتەدەرێ.

بولبولیار سەراسیمە سەیریدەکرد، پێشتر فریشتەی وەها جوان و گەنج و ئەفسوناوی نەدیبوو، بۆ ئێستێک ویستی دەستی بگرێت و لە دکتۆر شوکاکی جیابکاتەوە و پێی بڵێت «تۆ فریشتەی منیت». بەڵام دکتۆر بە بینینی فریشتەکە وا سەرشار و خۆشحاڵ بوو، هۆشەنگ توانای نەبوو لەو ساتە عاشقانەیەی دەربهێنێت و لەو مەستییە کتوپڕە وریایبکاتەوە. بولبولیار باوەڕی وابوو بەدترین ئینسان دیکتاتۆرەکان نین، بەڵکو ئەوانەن کە دەبنە هۆی شکانی دڵی عاشقان. تا ئەو کاتە خۆی عاشق نەبووبوو، بەڵام ئێستا لە ناکاو هەستیکرد نا، عاشقی ئەم فریشتەیەیە، عاشقی ئەم باڵندە سەیرەیە... لە پڕێکدا تەزوویەکی نهێنی دایدەگرت، سۆزێکی غەمناک، ئەوەی هەستدەکەیت سەهۆڵێکی سارد لە ناختدا دەتوێتەوە، شتێک وردە وردە لە دڵتدا سارد دەبێتەوە. پێشتر لە ڕێگای ئەدەبیاتەوە زانیبووی کە عەشق جۆرێکی تایبەتییە لە بێهۆشی، تاکە دەردێکە مرۆڤ بێ ڤایرۆس، بێ هەوکردنی هیچ ئۆرگانێک تووشیدێت و لە هەموو نەخۆشییەکی تر کوشندەترە. چەندین ساڵیش بوو، خۆی وەک عاشقێکی بێنیازی ئینسانییەت تەماشادەکرد. بەڵام شتێکی تایبەتی خۆشبوێت کەسێکی تایبەتی... نا. ئەو عاشقی مرۆڤایەتی بوو بە جۆرێکی گشتی، هیچ مرۆڤێکی لەبەر خۆی خۆش نەدەویست، بەڵکو تەنیا لەبەرئەوەی مرۆڤە، سەر بەم جنسە ئازارکێشە بەدبەختەیە کە شایەنی بەزەییە. لە سۆز و میهرەبانیدا بۆ مرۆڤەکانی

تر، بیریدەچووە وە کە خۆشی مرۆڤە و لە هەموو ئەوانی دیش زیاتر شایەنی بەزەییە. بەڵام لەو ساتەدا کە فریشتەکەی خانم دەرکەوت و بەیانبوو، هەستیکرد، ئارەزوویەکی گەورە و تایبەتی هەیە ئەم فریشتەیە هی ئەو بێت، لە نزیکییەوە بێت، بیپارێزێت، چیرۆکی بۆ بخوێنێتەوە، لە باغەکەدا پیاسەی لەگەڵ بکات.

ئەوەتەی فریشتەکانی بینیبوو، حەزی بوو بەردەوام لە تەکیاندا بێت، عاشقی هێمنی و بێدەنگی و قووڵییان بوو، هەتا حەزی لە تورەبوونەکانیان بوو، بەڵام چەندی دەکرد، نەیدەتوانی لە وێنەی ئینسان جیایانبکاتەوە، زۆرجار هەستیدەکرد ئەوانە هیچ نین جگە لە مرۆڤی ناسک و نەخۆش کە دوو باڵی خەیاڵییان هەیە. بەڵام لەگەڵ فریشتەکەی خانمدا، نا... هەستیکرد بە ڕاست فریشتەیەکی پاک دەبینێت، فریشتەیەک کە پەیوەندی بەو ژنە ماندوو و شەکەتەوە نییە، کە نیوە مردوو لە سەر پێخەفی خۆی کەوتووە. بۆ یەکەمجار لە ژیانیدا هەستی بە دوورییەکی کتوپڕ و بێسنوور لە نەغەدەی ڕاستەقینە کرد، هەستیکرد ئەوەی ئەو لە نەغەدە خۆشیویستووە ئەم بوونەوەرە بیمارەیە کە ئێستا کەوتۆتە ئامێزی دکتۆر و شێتانە و مەستانە لە ئامێزی گرتووە و بەچاوی پڕ ئەشکەوە ماچیدەکات و دەیلاوێنێت و بۆی دەگری.

ئەو ئێوارەیە کە بولبولیار و دکتۆر مستەفا شوکاک، فریشتەکەیان هەڵگرت و ژوورەکەی خانمیان چۆڵکرد، هەردووکیان بۆ هەتاهەتایە دابڕانێکی ڕۆحی لە کۆشکی لیڤیتانت دابڕان، وەک ئەوە بوو هاتبن ئەم فریشتەیە بدزن و بڕۆن. ئەوە خانمی مەلەکبینی زویرکرد و پێیگووتن «هەندێجار حەیوانی کەژ و کێو لە پیاو باشترن... کەستان نییە لە حەیوان چاکتربێت. وای... هەرچی غرورە بیخەنە ئەولاوە، بەس پیاو، هەرە باشەکەتان لە کەری کێوی خراپترە. نابینن ئەو ژنە بەستەزمانە نەخۆشە، نیوە مردووە، ئێوەش لە سەر میراتەکەی شەڕدەکەن. گەر

وابکەن، سوێند دەخۆم بە گۆڕی باوکم، بە گۆڕی باوکم ناهێڵم کەستان چاوتان پێیبکەوێت... دەتۆرێک پیاوبن، مستەفای ناموبارەک لە جیاتی ژنێکی ساغ و سەلیم و باش و هەقیقی وەک منت خۆشبوێت، هەر لە سەر شێتی خۆت بەردەوامیت. ئێستا هەردووکتان فریشتەکەتان هەڵگرن و لێرە بڕۆن، من دەبێت ماوەیەک بە دیار ئەم ژنە بەستەزمانەوە بم، وادەزانن کە ئینسان فریشتەکەی ترازا، ئیتر ئینسان نییە. هەر ئینسانە... بگرە دەبێت زۆر زیاتر ئاگامان لێیان بێت. ئینسان بەبێ فریشتە، دوو شتی گرنگی بۆ دەمێنێتەوە کە عەقڵ و ئەخلاقیتی. دوو شت واهەستدەکەم دوو باوەحیزی وەک ئێوە نیتانە. بۆیە من قەت لە ئینسان نائومێد نابم... بەڵام قەسەم دەخۆم کە ئەمڕۆ ئێوە هەردووکتان منتان نائومێدکرد، کەستان نە عەقڵتان هەیە و نە ئەخلاق، بەڵام خەتای خۆتان نییە، خەتای جنسە بەدەکەتانە. ئاخ پیاوان... ئاخ کە جنسێکی خوار و خێچن، قەت نەدەبوو پیاو بە ئینسان حیساب بکرایە... توخودا وا نییە؟ بەس غرور بخەنە ئەولاوە، غرور بخەنە ئەولاوە».

فریشتە نەخۆشەکەی خانمی ماردینی، لە بیمارستان کەوتە ژێر چاوەدێرییەکی بەردەوامی هەر یەک لە هۆشەنگ و دکتۆر شوکاکەوە. هەردووکیان عاشقانە دەچوونە کۆمەکی، دکتۆر شوکاک بەردەوام ڕاشکاوانە دەیگووت «من لە سەرەتاوە عاشقی ئەو نەغەدەیە نەبووم، بەڵکو شەیدای ئەم فریشتەیەی ناخی بووم». هەتا زۆرجار کە حەزی قسەی دەکرایەوە دەیگووت «فریشتەکە بۆیە تۆراوە و لەدەست نەغەدە هاڵهاتووە، چونکە کەمتەرخەمی نەغەدە و بێباکی دەرهەق بە ئەو، دڵی ئەمی شکاندوە و بەرەو ترازان هانیداوە». خانمی مەلەکبین سەری بادەدا و دەیگووت «وای کە قسەی هیچ دەکەیت، هیچ فریشتەیەک بۆ تۆ لە خاوەنی ناتۆرێت، جارێکی دی قسەی وا لە بەردەمی مندا مەکە، باشت دەناسم». فریشتەکە لاواز و بیمار دەردەکەوت، بەڵام خوێندنەوەی

بەردەوامی شیعر لەلایەن بولبولیارەوە وایدەکرد زیاتر زیندوو ببێتەوە. بولبولیار بەردەوام چیرۆکی بۆ دەهێنا، ژیانی نوێی بۆ دروستدەکرد... لە ساتێکدا دڵنیابوو، ئەم فریشتە نەخۆشە، گەر فریشتە نەبایە، گەر ببوایەتە کچێکی ئاسایی، دەیتوانی بیخوازێت و بیکاتە هاوسەری ئەبەدیی خۆی. بەڵام فریشتەیە... فریشتەیە. چاوی لێکدەنا و بیریدەکردەوە و بە غەمگینییەوە دەیگووت «ئەی من؟ ئەی منیش فریشتە نیم؟».

لە یەکەم ڕۆژەوە هەستیکرد فریشتەکەی نەغەدە حەزی لەو چیرۆکانەیە کە تێیدا خۆی وەک شاعیرەیەکی یاخی دەردەکەوێت، شاعیرەیەک لەگەڵ مەعشەری شاعیرانی تردا تێکەڵاودەبێت، دەژی، دڵداریدەکات، لە عەشقدا دەمرێت، خیانەتدەکات، تووشی تەنهایی دەبێت، دەیەوێت غەمی شیعر، ئازاری عەشق، بیکوژێت. ئەو لەیەکەم شەوەوە دونیایەکی تری بۆ ماردینیای فریشتە دروستکرد و ڕۆژانی دواتریش ئەو جیهانەی گەورەتر و گەورەتر کرد.

ماردینیا شەو دوای شەو و ڕۆژ دوای ڕۆژ، پتر خەیاڵی دەکرایەوە و لەگەڵ زیندەگییە تازەکەیدا وەک فریشتەیەکی نەخۆش ڕادەهات. بەخەیاڵ ژیانێکی ڕۆژانەی تری بۆ خۆی هەڵدەبژارد، لەو ژیانەدا بە جۆرێک دەژیا جیاواز لە نەغەدە، لەوێدا گەڕۆک بوو، هەژارانی خۆشدەویست، لە بیمارستان کۆمەکی بە مستەفا شوکاک دەکرد، برینی بیمارانی دەرماندەکرد، لەگەڵ هۆشەنگدا دەچووە ناو گەنجە شاعیرە بێکەسەکانەوە، شەو لەگەڵیان دەخەوت، ڕقی لە هێزبوو، توانای خۆی لە سەر ژیانی بێهێز تاقیدەکردەوە، دەیویست ژیانێک بژی پڕبێت لە جوانییەکانی بێهێزیی و ئەفسونەکانی لاوازیی.

هەموو مەخلوقە جوانەکان جۆرێک لە بێهێزیان تێدایە کە هەرگیز جوانییان لەو بێهێزییە جیانابێتەوە. ڕۆژانی سەرەتای گەیشتنی بە بیمارستان، گەلێک لاواز و نزیکە کۆتایی دیار بوو، دەبوو بەردەوام داڕوی

تینبەخش و ئاوی پاکژ بخواتەوە. جێگاکەی دەبوو لە جێگای فریشتەیەکی بیماری ئاسایی نەرمتر بێت، چونکە بە جۆرێک ناسک بوو، دەکرا هەر بەرکەوتنێکی لەگەڵ تەنێکی ڕەقدا کوشندە بێت. ژوورەکەی ئەو بۆ دکتۆر شوکاک و بولبولیار قیبلەگاهی ڕاستەقینە بوو. سەرەتا هەردوو پیاوەکە ئیرەییەکی زۆریان بەیەک دەبرد و تابڵێی لەیەک خانەگومانیان دەکێشا. هەتا بولبولیار کە دەبوو غەمی سەندن و داگیرکردنی هیچی نەبێت، بۆیەکەمجار لە ژیانیدا هەستیکرد کە شتێک هەیە دەیەوێت بە تەنیا هی خۆی بێت. کاتێک دکتۆر لای ماردینیای فریشتە زۆر دەمایەوە هەستی بە دڵتەنگی و توڕەیی دەکرد، زیاد لەجارێک بێهۆ دەرگاکەی دەکردەوە و دەیگووت «ئۆە ببورە توخودا دکتۆر نەمزانی» یان بیانووی پوچی دروستدەکرد بۆ ئەوەی قسەی نێوان دکتۆر و فریشتەکە ببڕێت، بە ئەنقەست شتی لە ژوورەکەدا جێدەهێشت تا دواتر بگەڕێتەوە. دکتۆریش لەو بەدتری دەکرد، لە کاتی چیرۆک و جەلەسەی شیعر خوێندنەوەدا خۆی دەکرد بە لای خانمی فریشتەدا و دەیپرسی «تەندروستیت باشە؟». یاخود زوو زوو دەیگووت «واهەستدەکەم پێویستت بە هەوای پاک بێت و پیاسەیەکی دوو قۆڵی بۆ ئەم کاتانەت سوودبەخش بێت» یاخود دەرمانێکی نوێی دەکرد بە بەهانە و خۆی دەکرد بە ژووردا، بولبولیاریش لە سەرسەختیدا و وەک وەڵام بۆ ئەوجۆرە ڕەفتارانە هەوڵیدەدا، چیرۆکەکان لەگەڵ ئەودا درێژبکاتەوە.

خۆشبەختانە ڕکەبەری نێوان ئەو دووانە لە سنووری ژووری فریشتەکە تێنەدەپەڕی، لە دەرەوە دوو هاوڕێی نزیکبوون، بەڵام خانمی ڕێزان، لەدەست هەردووکیان بیمار و کەنەفتە بوو، دەیگووت «دوو هیچترین پیاوی دونیام تووش بووە». ڕاشکاوانە بە مەهدائیلی دەگووت «بەخودا ئەم جووتە بەدبەختە نە عەقڵیان، نە دڵیان، نە گوونیان بە باشی ئیش ناکات. هەم من و هەم خۆیان دەخەڵەتێنن».

دوای ترازانی فریشتەکەی، خانمی نەغەدە ماردینی وا دیارنەبوو وەک شتێکی تایبەتی تێدا گۆڕا بێت، هێند هەبوو بە جۆرێکی دڵڕەقانە لەگەڵ کچە نابیناکەیدا ڕەفتاریکرد. هەتا لە ناونانی کچەکەشدا قسەیەکی نەبوو، کە لیڤیتانت ناوی نا «ئاسمان»، بێباکانە گوتی «چی ناودەنێیت ناوی بنێ، کچی خۆتە... گەر حەزتە ناوی بنێ ئاسمان، گەر حەزیشت نییە ناوی بنێ جەهەنەم». هەستیکرد هیچ سۆزێکی دایکانەی بۆ ئەم پارچە گۆشتە گرینۆکە کوێرە نییە. کاتێک وەک منداڵی خۆی خستیانە بەردەمی، جگە لە هەستێکی قووڵ بە ڕشانەوە و پیسی هەستێکی دی تێدا نەبوو، منداڵەکە هیچ نەبوو لای جگە لە بوونەوەرێکی بەدبەخت کە دەبوو دروستیبکات بۆ ئەوەی ساردی ڕۆحی خۆی تا ئەوپەڕ تاقیبکاتەوە، بۆ ئەوەی وەک خۆی دەیگووت، خۆی لە دۆزەخی هەموو عاتیفییەک ئازادبکات. ڕای وابوو هەر ژنێک عاشقی منداڵەکەی بوو، ناتوانێت عاشقی خۆی یان عاشقی هیچ شتێکی دی بێت. هەندێجار لە دانیشتنی ژناندا دەیگووت، ژنان بۆیە منداڵەکانیان خۆشدەوێت، چونکە بە جۆرێک مردون توانای هەستکردنیان بە هیچ شێوە عەشقێکی تر نەماوە، هەتا پێی دادەگرت و خۆشەویستی منداڵی بە جۆرێک لە نەخۆشی یان سزای ئیلاهی تەماشادەکرد کە لە ڕێگایەوە خودا فزول و ئارەزووی ژنان دەکوژێت. گەر هەستی دایکایەتی زۆری بۆ بهێنایە، دەکەوتە شکاندنی قاپ و قاچاغی ماڵەکەی تا لە یادیبکات. دەیگووت «گەر منداڵ نەبایە، ژنان گەورەترین دۆزەرەوە، داهێنەر، کتێبنوس دەبوون، ئەوەی جنسی ئافرەتی لە مێژوودا ڕیسواکردوە، نە ئاینە، نەخودایە، نە پیاوە، نە هیچە، بەس منداڵە». خۆی دەیویست دژ بەو یاسایە شەڕبکات، بڕوای وابوو کۆیلەیی ئافرەت شتێکی بوونگەرایە و لە جەوهەرەوە ژن وەک کۆیلە دێت و دەمرێت، بەڵام هێز و گەورەیی و مەزنی ئافرەت لەوەدایە کە دژ بەو قەدەرە بجەنگێت. ئازادی ئەوە نییە

تەنیا دژ بە پیاو شۆڕشبکەین، بەڵکو دژ بە هەر شتێک بیەوێت بەدرۆ ئازارەکانمان لا موقەدەس بکات، لەوانە ئازاری موقەدەسی دایکایەتیش. من بیستوومە کە گووتوێتی «دایکایەتی جۆرێکە لە کۆیلەیەتی». دەیگووت «کۆیلەیی ژن بۆ منداڵەکەی، لە کۆیلەیی بەندە بۆ ئاغاکەی بەدترە. هیچ شتێک وەک دایکایەتی ژن ناگۆڕێت بۆ ئامێرێکی بێهەست و بێئارەزوو. هەر ژنێک بتوانێت دایک نەبێت، ئەوکات دەتوانێت ژن بێت، دایکایەتی و ژنێتی پێکەوە ناگونجێن، بۆیە زۆربەی ژنان دوای لەدایکبوونی منداڵەکەیان یەکەمین شت بیریاندەچێتەوە عەشقە... وای کە دەردێکی پیسە دایکایەتی، هیچ جۆرە سیستمێکی کۆیلەیەتی لە مێژوو دا وەک دایکایەتی دووردرێژ و ترسناک نەبووە». هەندێجار بۆچوونەکانی تا جێگایەکی وەها سەرپەڕ ڕادەکێشا، بڵێت «دایکایەتی پاشماوەی هەستە حەیوانییەکانی ناو مرۆڤە». هەموو دەمانزانی نەغەدە بۆیە واسەرپەڕ دەگرێت تا بەهێزێکی زۆر بە سەر هەستە گەورە و کوشندە و نهێنییەکانی خۆیدا سەربکەوێت. ئەو منداڵە بەستەزمانەی بۆیە دروستکردبوو تا بیسەلمێنێت، ئەو دەتوانێت ژنێک بێت باوەڕ بە هیچ وێنەیەکی کۆمەڵایەتی ژن نەکات. دەیگووت «لە کویادا پیاوان و خودا ستایشی ژنیان کرد، لەویادا تف لە خۆت بکە». بۆچوونەکانی بە لووت بەرزییەکی بێوێنەوە دەدرکاند، بەزەیی بە بەڵگە و بەهانە پێچەوانەکاندا نەدەهاتەوە، ناوی دەنان بەهانەی ژنانی ژێردەستە، لە هەر شت زیاتر پێکەنینی بە بەڵگە و شێوازی ژنانی ئیماندار دەهاتەوە کە بە حورمەتێکی زۆرەوە پێیاندەگووت «خوشکی موسوڵمان، قسەکانت بەشی ئەوەیە خوای تەبارەک وەتەعالا، ئەو لەشە جوانەت دەرخواردی ئاگر بدا»، ئەویش هەمیشە بە قێز و تانەوە دەیگووت «خوشکی موسوڵمان خەریکی ئەو ئاگرەبە کە لە لەشی خۆت بەربووە و کارت بە ئاگری منەوە نەبێت». ئەو گوێی نەدەدایە و دەیگووت «نوسینی شیعرێک لە

بەخێوکردنی دە منداڵ باشترە بۆ دونیا». لەو کاتەوەی فریشتەکەی مرد و منداڵە کوێرەکەی بوو، هەموو پێنج شەممەیەک بە جوانترین شێوە خۆی دەگۆڕیی و لە باڵکۆنەکەیدا یان لە سەر مێزی گەورەی نانخواردنەکە لە ژووری میوان، پێشوازی لە ژمارەیەک ژنی هاوڕێی دەکرد. هەندێکیان دەهاتن بۆ ئەوەی گوێ لەو بۆچوونە سەیرانەی بگرن کە بەردەوام نرکە و هاواری سەرسامی لێدەردەهێنان، هەندێکیشیان بە شاعیرەیەکی گەورە و شۆڕشگێڕێکی گەورەیان دەزانی. بەڵام ئەوەی دوای ترازانی فریشتەکەی بە ڕوونی پێوەی دیاربوو، لەدەستدانی توانای بوو لە سەر بیرکردنەوە لە پاشەڕۆژ. زۆرجار بۆ ئەوەی بێدەرەوەستی خۆی بەرامبەر هەموو شتێک دەربخات، دەیویست کتێبەکانی خۆی و شیعرەکانی خۆی کۆبکاتەوە و بیانسووتێنێت، پەیمانی شووکردنەکەی بسووتێنێت. بەڵام نەیدەزانی دوای ئەوە چی بکات... دوای ئەوە ژیان چۆن دەڕوات. توانای بیرکردنەوەی لە داهاتوو نەمابوو، بەڵام چ غەمێکی بوو؟. وەک خانمی مەلەکبین دەیگووت، خۆ نەبوونی ترس لە پاشەڕۆژ لە نەبوونی ترس لە خودا بەتامترە.

نەغەدە لە هەفتەی یەکەمەوە دوو دایەنی بۆ منداڵەکە گرت، بەڵام دەبێت بڵێم کە گۆڕانکارییەکان دواتر وەها خێرابوون، نەکرا ئەو دوو دایەنە لە پەروەردەکردنی منداڵەکەدا بەردەوامبن. منداڵەکە پێنج ساڵی سەرەتای ژیانی لایماڵێکی ئاوارە بردەسەر کە تازە هاتبوونە شار و بە بەخێوکردنی «ئاسمان» بڕە پارەیەکیان بۆ خۆیان دابیندەکرد، تا لە ژینگەی نوێدا نیشتەجێبن و برسێتی هەراسانیان نەکات. هەڵبەت ئەوەی بڕیاریدا بەوجۆرە دەست لە بەخێوکردن و پەروەردەکردنی کچەکەی بکێشێتەوە، ژنانی شار و خەڵکانی ناسیاوی خۆی تووشی ڕاچڵەکان و تووڕەبوونێکی زۆر کرد. نەوای خوشکی «کە بەدەگمەن یەکتریان دەبینی»، یەکەم کەس بوو کە تووشی سەرسامی بوو، باوەڕی نەدەکرد

خوشـکەکەی شـێوازی یاخیبوونـی خـۆی لـە دونیـا بـەو ئاڕاسـتەیەدا ببـات. مـرۆڤ دەتوانێـت لـە سـتەم، لـە جـەور، لـە تەنیایـی یاخـی ببێـت، بـەڵام ناتوانێت لـە خۆشەویستی یاخـی ببێـت، ناتوانێـت شۆڕشـی بـە سـەر دونیـادا بگەێنێتـە ئاسـتی شـۆڕش بـە سـەر منداڵێکـی نابیناشـدا. مـرۆڤ دەتوانێـت شـۆڕش بـە سـەر هەمـوو شـتێکدا بـکات، خۆشەویسـتی نەبێت. خۆشەویسـتی تاکـە شـتێکە شـۆڕش بـە سـەر هەمـوو شـتێکدا دەکات و شۆڕشـی بـە سـەردا ناکرێـت. بـەڵام نەغـەدە ماردینـی وەهابـوو، تاقانـە بـوو، بـێ هـاودەم بـوو، تاکـڕەو بـوو... دەیویسـت شـۆڕش بـە سـەر ئـەو شـتانەدا بـکات، کـە هەرگیـز مـرۆڤ بیـری لـێ نەکردۆتـەوە شـۆڕش لـە دژیـان بـکات.

# تێکشکانی شۆڕش

لـە سـاڵی ١٩٨٧ دا، هێـدی هێـدی تەندروسـتیم بـەرەو خراپـی ڕۆی، هـەر لـەو سـاڵەدا، شۆڕشـیش تووشـی پاشەکشـەی گـەورە هـات. مـن لـە سـەر فەرمانـی برادەرانـی چیـا هـەر لـە شـار مامـەوە، بـەڵام چیـدی وەک جـاران بـە سـەلامەتی و هێمنـی نەدەژیـام. هەوڵەکانـی نزیکبوونـەوە لـە نێـوان شـۆڕش و بەعسـییەکاندا، بـە بونبەسـتی تـەواو گەیشـتبوو. لـە ئەنجومەنـی بـاڵای حیـزب بڕیاریانـدا لـە جەنگدا بێدوودڵـی پشـتی ئێرانییـەکان بگـرن. سـەرۆک «خوالێیخـۆش بێـت» چارەنوسـی خـۆی دایـە دەسـت ئەگـەری سـەرکەوتنی هورووژمـی پاسـدارەکان، خـۆی چـووە تـاران و لـە حـزوری ئیمامدا نووشـتایەوە و گوتـی «ڕەهبـەرم، ئێمـە بـە بەشـێک لـە لەشـکری خۆتـان حیسـاببکەن». بـەوە شـەڕیش لـە دەڤـەری ئێمـەدا شـێوەیەکی زۆر خوێناویـی وەرگـرت. مـن لـە ماڵێکـی نهێنیـدا، ژێـر زەمینێکـم سـازکرد و درێـژەم بـە کاری شۆڕشـگێڕانەی خۆمـدا. هـەر ئـەو سـاڵە ڕێکخراوەکانـی حیزبیـش گـورزی

کوشندەیان خوارد، ژمارەیەکی گەورە لە ئەندام شانەکانمان گیران و زۆر لە ڕێکخستنەکانمان هەڵوەشان. ئەو ئەفسەر و عەقید و لیوا عەرەبانەی سالانی رابوردوو لەوە دەترسان دەوڵەت بڕوخێت، ئەو هەستەش پاڵی پێوەدەنان هەوڵبدەن ژێراوژێر سیاسەتمەدارە کوردەکان بکەنە دۆست. ئێستا سەرکەوتنە یەک لەدوای یەکەکانی سوپا و ناکامی ئێرانییەکان هانیدەدان، جارێکی دی ترسی شکست و کوشتن جێبهێڵن و بچنەوە ژێر سایە و سێبەری دیکتاتۆر. لەو بەینەدا سەدام حوسەین چەندین جار لە ناو میللەتدا بە جلی سەیرو سەمەرەوە دەردەکەوت و ڕاشکاوانە بە هەموو دونیای دەگووت کە ئەو سالارێکی ئەبەدی و سەرۆکێکی ئەفسانەیی و خوداکردە.

لەو وەرزەدا بەرپرسانی ناوچەکە و سەرانی ڕێکخراوی بەعس لە باکوور هەموو گۆڕدران... بەعسییەکان بڕیاریاندابوو شەڕێکی سەرتاسەریمان لەگەڵ بکەن، لە ماوەیەکی کورتدا دەیان هەڤاڵی ئێمەیان لە سێدارەدا. ژمارەیەکی زۆر لە شانە و کەرتە هەرە گەورەکانمان ئاشکرابوون، من بەردەوام شتێک لە حەسرەت و بێتوانایی لە ناوەوە دەیخواردم و هێزێکیشم نەبوو بەر بەو گۆڕانکارییانە بگرم. هەستمدەکرد سالانی درێژی شەڕی ناوخۆ و مۆرالی هەندێک لە سەرکردەکانمان کارێکیان کردبوو، نەوەی نوێ تا دەهات لە حیزب دەتۆرا. لەو حەشارگەیەی خۆمدا شەو دوای شەو پەتای فریشتە نەخۆشەکەم دەیگرتم، فێم لێدەهات، زمانم لاڵ دەبوو، لوول دەبووم، ژانی قورسم دەدی. بەڵام فریشتەکەم نەدەهاتەدەرێ، عینادی فریشتەکەم لەوەی ئاسان نەیەتە دەرێ، سەرسامیدەکردم. دڵنیابووم فریشتەکەم بێزارە لێم، تووڕەیە، بەڵام دەیەوێت دەرنەچێت، دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ناوەوە، دەیەوێت شانسێکم بداتێ و فریایبکەوم. شتێک لە فریشتەکەمدا وای دەکرد ئازارم بدات و ئێشم بۆ دروستبکات و جیانەبێتەوە، هەندێجار حەزمدەکرد بڕوات و

ئەوەندە بە دەستییەوە نەخۆش و پەککەوتە نەبم، بەخیلیم بەوانە دەبرد فریشتەکەی ناخیان زوو بڕیاری مردن یان ترازان دەدەن، بەخیلیم بە هەر مرۆڤێک دەبرد کە نازانێت ناخی خۆی فریشتەیەکی زامداری تێدایە. کە توڕەدەبووم و پڕ بە ژوورەکەم هاوارمدەکرد «بەس ئازارم بدە، یان بڕۆ یاخود بگەڕێوە ناوەوە» هێندەی تر سەر شێت دەبوو، من لەو ژێر زەمینەدا تێگەیشتم کە من بە ڕاستی دەتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم، بە قسە ئارامدەکردەوە، پەیمانم پێدەدا کە هەر گونجا ژیانێکی تر دەست پێبکەم، دەمگووت ناتوانم لێرەدا بپچڕێم و لە هاوڕێکانم جیاببمەوە... دەمزانی گوێدەگرێت، بیردەکاتەوە، دوودڵە. زۆرجار چەندین ڕۆژ وەک چووبێتە خەوێکی دووردورێژەوە جوڵەی نەدەکرد، جگە لە باڵەکانی کە گەلێک سووک و بێکێش دەبوون نیشانەیەکی تری نەدەما، بەڵام دەمزانی لەوێیە و چاوەڕوانی من دەکات، سەیرمدەکات، بەردەوام هەست و بیرکردنەوەکانم دەخوێنێتەوە. ئەوە ئازاری دەدام کە دەمزانی وەک جاران ئازاد نیم، بۆ هەموو شتێک دەبێت پرس بە یەکێکی تر بکەم کە تەنیا گوێدەگرێت و وەڵام ناداتەوە... لە دەفتەری سیاسی حیزب دەیانزانی تووشی جۆرە بیمارییەک هاتووم، بەڵام کەس چەشنی دەردەکەی نەدەزانی. بەڵام کێ کاتی هەبوو بایەخ بە دەردی من بدات؟ هەستمکرد هێدی هێدی فشاری سەربازی لە سەر بنکە و بارەگاکانی حیزب لە دەرەوە بە جۆرێک زۆرە، ناو شارەکان بایەخێکی وەها گرنگیان بۆ حیزب نەماوە. هەستێکی ترسناکم هەبوو کە شۆڕش بەرەو کۆتایی دەچێت، گەورەترین نیشانەشی ئەوە بوو، هەندێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵا هەڵدەهاتن و خۆیان دەدایەوە دەست هێزەکانی دەوڵەت و نامەی تۆبەیان دەنوسی و داوای لێخۆشبوونیان دەکرد.

دەمزانی بەعسییەکان دەزانن من لە شاردام، بەڵام نەمدەزانی دەیانەوێت بمگرن یاخود نا. لەو باوەڕەدا بووم کە بە فەرمانی

بەڕێوەبەرە بەرزەکانیان، منیان فەرامۆشکردوە. من ئەو بارگیرە نەخۆشە بووم کە هەردوولا جێیانهێشتبووم بۆ ڕۆژی خۆی... بارگیرێک هەندێک بار هەڵدەگرێت بەبارگیری تر ناکێشرێن. لەو دەمەدا ئارەزوویەکی نهێنیم تێدا دەرکەوت بۆ مردن... ئەوەی لە ناکاو سەردەخەیتە سەر سەرینەکەت و ئارەزوویەکی قووڵی مردن دڵت داگیردەکات. نەمدەزانی ئەو هەستە لە کوێوە هەڵدەقوڵێت، بەڵام دڵنیابووم هەستێکە لە ئارەزووی سێکس بەهێزترە. ئارەزووی مردن تاکە ئارەزوویەکە دەتوانێت لە ئارەزووی سێکس بەهێزتر بێت... شتێک بوو ئارامی لەبەر هەڵدەگرتم. وەک تاکە ڕێگای ڕزگاربوون لە خۆم و لە دونیا دەمبینی. شەوان وەک چۆن عاشقێک دەکەوێتە بیرکردنەوە لە مەحبوبەی، بێوچان بیرم لە مردن دەکردەوە، وەک ئەوەی دەنگێکی نهێنی بێت و لە شوێنێکی ترەوە بانگمبکات، باوەشێکم بداتێ کە هەرگیز نەمدیوە. هەندێجار دەگەیشتمە ئەوەی مردنم وەک تەنیا جوانی و دوا جوانی دەبینی.

لاوازبوونی شۆڕش و تەسلیمبوونەوەی هەندێک لە سەرانی تادەهات لە ناوەوە بێبڕواتریان دەکردم... ئەو هەموو نامە نهێنیییەی لای من کەڵەکەبووبوون کەمە کەمە کاریگەریان لە سەرم جێدەهێشت، زۆر ڕۆژ دەگەیشتمە ئەوەی بپرسم «ئاخۆ سەرانی شۆڕش ناتوانن ڕێگایەکی تر بگرنە بەر». دڵنیابووم گەر ئیمانم بە شۆڕش نەمێنێت دەمرم، دەبم بە جانەوەرێکی بێبار و ترسناک، هەموو ئەو هێزە ڕەشانەی لە ناومدان بە شێوەیەکی کوشندە دێنەدەرێ، نەمدەزانی چیم لێدەگوزەرێت، بەڵام دڵنیابووم کە دەبم بە بوونەوەرێک بە هیچ فریشتەیەک کۆنترۆڵ ناکرێم. من لەو کەسانە بووم گەر ئیمانم بە شۆڕش لەدەستبدایە، بەدترین شەیتانم لێدەردەچوو، هەستمدەکرد «لەو هەستەشدا بە تەنیا نەبووم» ئێمە نەوەیەک بووین نەدەبوو ئیمان بە شۆڕش لەدەستبدەین، چونکە دوای ئەوە هیچ شتێکی دی نەبوو ئیمانی پێبهێنین، شۆڕش بڕوای ئێمەی

بە هەموو شتێک لەقکردبوو، بڕوامان بە خودا، بە مرۆڤ، بە عەشق، بە جوانی... تەنیا شتێک باوەڕمان پێیبوو شۆڕش خۆی بوو، ئێستا کە شۆڕش دەلەقی و لە بێلەنگەریدا بوو، بۆ من مایەی سەرهەڵدانی خەیاڵاتی تاریک و مۆتەکئاسا بوو. من هێدی هێدی هەستمدەکرد لە ناوەوە پارچەپارچە دەبم، بیرمدەکردەوە گەر شۆڕش بخنکێت و لاواز بێت و بگەڕێتەوە بۆ سەرەتا غەمگین و بێهێزەکەی، من چیم بە سەر دێت؟. لەو کاتەدا ئیتر هاتوچۆی نێوان شار و شاخ تادەهات ئاڵۆز و سەخت دەبوو. دەوڵەت هەزاران گوندی تەختدەکرد و دانیشتوانی بەرەو خوار ڕادەگوێزان... من بەردەوام نامەم دەنارد بۆ بیرۆی سیاسی حیزب و وەڵامم وەرنەدەگرتەوە... هەستمدەکرد حیزب لە ئاستی باڵادا پچڕان و شپرزەیی تێکەوتووە. ترسێکی گەورەم تێدەگەڕا لە شۆڕش داببڕێم. ئەوە دوا شت بوو، مردن بوو، کۆتایی هەموو کۆتاییەکان بوو بۆ من.

لەو دەمەدا گۆڕانکاری گەورە ڕوویدا، ئەو ئاڵوگۆڕەی بەعسییەکان لە ئیداراتی دەزگای ئەمنییەتدا کردیان، سەرانی پێشووی لادا و خەڵکانی دی خستە جێگایان. بەڕێوەبەری نوێی دائیرەی ئاسایشی دەوڵەتی، لای خۆیەوە بڕیاری دا دەموچاوە کۆنەکان دووربخاتەوە، یەکێک لەوانەی زۆر بەخێرایی پەراوێز خرا لیڤیتانت بوو. ئەوە سەرەتای چەند ساڵێکی پڕ بەدبەختی بوون بۆ ئەو. نزار ئیدریسیش هێزەکەی زۆر بچوککرایەوە و سنووری زۆر بۆ دەسەڵاتەکانی دانرا. بەڵام کارەساتی گەورە ئەوکاتە بوو کە یەکێک لە ئەندامەکانی سەرکردایەتی حیزب لە کاتی تەسلیمبوونەوەیدا بە دەوڵەت، لیڤیتانتی لە دەمەوەدا و نهێنی پەیوەندییەکانی بە شۆڕشەوە ئاشکراکرد. من یەکەم کەس بووم کە بە هەواڵی دەملێدانەکەم زانی و بەپەلە لیڤیتانتم ئاگادارکردەوە خۆی بشارێتەوە... ئەو کات ماوەیەک بوو ڕوو بە ڕوو ئەوم نەبینیبوو، بەڵام ئەو لە مێژووی درێژی یەکدی ناسینماندا، گەیشتبووە بڕوایەکی تەواو کە من زانیاری دروستم لایە و

لە تەکیدا ڕاستگۆ و بێفێڵم. دەیزانی من شۆڕشم لەو خۆشتر دەوێت، دەیزانی گەر شۆڕش بڵێت لیڤیتانت بکوژە دەیکوژم. هەموو جارێک کەسەیری یەکدیمان دەکرد، هەردووکمان سارد و بێرۆح بووین، ئەو منی وەک ماشێنێکی کۆککراو و من ئەوم وەک ماشێنێکی کۆککراو دەبینی، دوو مرۆماشێن بووین کەسمان بە دروستی شێوەی پەیوەندی خۆمانمان نەدەزانی، بێگومان هاوڕێ بووین، بەڵام هاوڕێی وەها نا شتی گرنگ بۆ یەکدی بەختبکەین... گەر ئەو لە مەترسیدا بایە منی دەکوشت، گەر شۆڕشیش فەرمانی بە من بدایە ئەوم دەکوشت... بەڵام هاوڕێش بووین، بەوجۆرە و بەو مانایەی کە وشەی هاوڕێتی لەو ساڵە ترسناکانەدا دەیگەیاند. من کەسێکی دڵسۆزم ڕاسپارد، لیڤیتانت بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی نهێنی و چەپەک، دەمزانی لیڤیتانت بیری لە ڕۆژی وەها نەکردۆتەوە. من سەرنجمدابوو، سیاسییەکانی وڵاتی ئێمە، بە جۆرێکی غەمناک کورتبینن. لیڤیتانت وای دانابوو کە بەعسییەکان نەبەدیین و پەیوەندی خۆشی بەوانەوە هەر نەبەدییە. هەموو سیاسییەکان تووشی ئەو دەردە دەبن، وەهمێک ناوی دەنێم وەهمی بەردەوامی، ئەوەی کە پێتوایە ژیان هەمیشە بەوجۆرەیە کە بە سەریدا خەوتوویت. غەریزەی کڕکەوتن، ئەو غەریزە هەرە ترسناکەی دەسەڵاتداران دەگۆڕێت بۆ جۆرە ئاژەڵێکی تەمەڵ و سڕ کە بە سەر کورسییەکانیاندا خەویان لێدەکەوێت. منداڵێک چۆن لە بێشکەکەیدا دەخەوێت و ئاگای لە داهاتوو نییە، غەریزەی کڕکەوتنیش جۆرە هەستێکی وا لە دەسەڵاتداراندا دروستدەکات. هەستی ئەوەی دونیا هەمیشە لەم دۆخەی ئێستادا دەمێنێتەوە. لیڤیتانت ساڵانێک بوو بە سەر ئەو شێوە ژیانەدا خەوتبوو، ئێستا لە ناکاو هەموو شتێک وەک با لە ڕیشەی بهێنێت هەڵدەکەنرا. وەک چۆن یەکێکی برسی لە رووی سێکسییەوە، دەبێتە بوونەوەرێکی بێئارام، ساڵارێکیش کە غەریزەی کڕکەوتنی تێکدەشکێت دەبێتە مەخلوقێکی ترساو و دوودڵ

و ناجێگیر، ئەو ڕۆژە لیڤیتانتیش لەو دۆخەدا بوو. ئەو خۆی لە من باشتر دڕندەیی و بێڕەحمی بەعسییەکانی دەزانی، دیبووی بەعسییەکان چۆن ڕیزەکانی خۆیان پاکدەکەنەوە، چۆن ناهێڵن کەس هێزی لە سنوورێکی دیاریکراو تێبپەڕێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر لەو وەهمەدا ژیابوو. من خۆم نامەیەکی تایبەتیم بۆ نوسی و گووتم «ئەندامێکی ئەنجومەنی باڵا تەسلیمی دەوڵەت بۆتەوە و هەموو نهێنی تۆی بۆ عەرەبەکان ئاشکراکردوە». ئەو باوەڕی بە من بوو، نەیدەتوانی باوەڕی پێم نەبێت، هەرچییەک بێت لەوجۆرە دۆخانەدا نەیدەتوانی گاڵتە بە ژیانی خۆی بکات. هەر ئەو شەوە لیڤیتانتمان شاردەوە و من ڕۆژی دوایی بەرەبەیان گەیشتمە لای و گووتم کە دەبێت بە زووترین کات شار جێبهێڵێت. لیڤیتانت زۆر شپرزە و پەشۆکاو بوو. پێشتر وەها نەمدیبوو، هەتا دەمێک هات بۆ لام و تکایکرد پەیوەندی لەگەڵ شۆڕشدا بۆ دروستبکەمەوە، بەم چەشنە نەژاکابوو. ئێستا چین چین عارەقی دەردەداو و دەترسا و هەستیدەکرد بە یەکجار هەموو شتێکی لەدەستداوە. من پێمگووت کە خانمی ماردینیش بهێنێت و من کاروباری ڕزگارکردن و دەرکردنیان بۆ دەرەوە جێبەجێدەکەم. بەڵام وەک شێت تەنیا سەری بادا و گووتی «نایەت... نایەت». دڵنیابووم کە لیڤیتانت قسەی لەگەڵدا کردووە و نەچۆتە ژێر باری ئەوەی دووبارە بچێتەوە شاخ. سەیرم لە ترسی لیڤیتانت هات، ئەوم وەک کەسێکی ترسنۆک نەدەناسی، بەڵام ئێستا کە بیردەکەمەوە، تێدەگەم بۆچی لیڤیتانت ئەو ڕۆژە وەها ترساو و پەشۆکاو بوو. دەسەڵاتی زۆر مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ ترسنۆکترین جۆری ئادەمیزاد. لیڤیتانت دەمێ ساڵ بوو لە شاردا دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو، لەو ساڵانەدا هەرگیز نەیتوانیبوو ئازایەتی خۆی تاقیبکاتەوە، نەیکرابوو ئازایەتی خۆی بنێتە ژێر ئەزموونێکی ڕاستەقینەوە، هەر لە گەنجییەوە زیندانەوان بووبوو، هەمیشە نێچیرەکان بە لاوازی هاتبوونە

بەردەستی، هەمیشە خۆی ئەو هێزەبووە کە فەرمانی داوە. ئێستا لە بەردەم یەکەم تاقیکردنەوەدا دەلەرزی. مرۆڤ زۆربەی ترسنۆکە، بەڵام کەمیان لە تاقیکردنەوەدا ئەو ترسنۆکییەیان بۆ دەردەکەوێت، چونکە کەمیان جورئەتی تاقیکردنەوەکەیان هەیە. زۆربەی ئەو پیاوانەی لە شۆڕشیشدا بە ئازا ناویان دەرچووبوو، لەوانەبوون کە هەرگیز بە تەواویی تاقی نەبووبوونەوە... ئازایەتی وەهمێکی گەورە بوو، هەموو پیاوە ئەفسانەییەکانی شۆڕش ناوبانگی خۆیان لە سەر ئەو وەهمە دروستکردبوو. ئەو سەردەمە بەعسییەکان بووبوونە دڕندەیەکی بێوێنە، ئینسانییەتی مرۆڤەکانیش کاتێک دەردەکەوێت کە ڕوو بە ڕوو بەرابەر بە دڕندە دەوەستن، من ئەو کات نەمدەتوانی لە نێوان ئازایەتی و مرۆڤدۆستیدا پەیوەندییەک بدۆزمەوە، ئازایەتی لای من شتێک بوو گرێدراوی ڕۆحی جەنگاوەرانەی مرۆڤ. لەو سەردەمەدا کە بەعسییەکان وەک جانەوەری بێبەزەیی هەموو شتیان وێراندەکرد، کەمتەرخەمی مرۆڤ بۆ مرۆڤیش گەیشتبووە ئەوپەڕی. لەو دەمانەدا من تێگەیشتم کە دڕندەیی ئەوە نییە ئەوانیدی بکوژیت، بەڵکو ئەوەیە وابکەیت کەس لە بیری ئەوانیدیدا نەبێت.

ئەمڕۆ دوای ئەو هەموو ساڵە کە بیردەکەمەوە، دەڵێم لە کۆتایی هەشتاکاندا، «نامرۆڤبوون» لە ژیانی ئێمەدا پێینایە سەردەمێکی نوێوە... یاخود لەو سەردەمەوە مێژووی نامرۆڤبوون بەراستی دەستی پێکرد. بۆ ئەوەی جیاوازی مرۆڤ و نامرۆڤتان بۆ بکەم، تەنیا نمونەیەکی ڕوون لە خەیاڵمدا بێت ئەوەیە کە بیهێننە پێشچاوی خۆتان، ژمارەیەک ئادەمیزاد لە ترسی هێزێکی نادیار و گەورە بە ڕێگایەکی زۆر سەختدا ڕادەکەن... سەدان ئادەمیزادی جیاواز جیاواز، لە گەنج و پیر، لە گەورە و بچوک، لە ژن و پیاو. هەموو بەڕێگایەکدا هەڵدێن و ناشزانن بۆ کوێ دەچن. لەو ڕێگایەکدا مرۆڤ بوونەوەرێکە یەک لە سەر ئەوی دی دەوەستێت،

گەنجەکان بەپێی پیرەکان و گەورەکان بەپێی منداڵەکان دەڕۆن، هەموو پێکڕا دەستی یەک دەگرن و لە ژێر باری هیچ ترسێکدا دەست لە یەک بەرنادەن، هیچ کەسێک بە تەنیا بیر لە ڕزگاری خۆی ناکاتەوە، بەهێزەکان ئەوانەن کە بەر لەوەی بیر لە مانەوەی خۆیان بکەنەوە، بیر لە مانەوەی ئەوانی دی دەکەنەوە، گەورەکان ئەوانەن کە لە دواوە دەڕۆن و پێش هەمووان خۆیان بۆ مەترسی بەیاندەکەن. لێرەدا هەموو ترسێک ترسە بۆ هەمووان و هەموو هەڕەشەیەک هەڕەشەیە لە هەمووان. بەڵام کە نامرۆڤ دەردەکەوێت، کە ئەو جنسە ترسناکە لە سەر زەوی نیشتەجێ دەبێت... چیتر مرۆڤ ئەو کەسە نییە کە دەستی ئەویدی دەگرێت، نامرۆڤەکان کە دەکەونە سەر هەمان ڕێگا، هەر یەکەیان بە تەنها هەڵدێت، هەر کەسە و بێباک بەرامبەر ئەوانی تر هەوڵدەدات لەو مارشە ترسناکەدا خۆی لە پێشەوە بێت، گەنجەکان باکیان بە پیر و گەورەکان باکیان بە منداڵەکان نییە، نامرۆڤ ئەو کەسەیە کە بەتەنگ ئەوانەوە ناچێت کە نایانناسێت، سنووری عەشقی بۆ مرۆڤ لە باوەشی ئەوانەدا تەواو دەبێت و دەوەستێت کە خۆی و بۆ خۆی خۆشیدەوێن. لە کاتێکدا سەرەتای مرۆڤبوون لە خۆشەویستی ئەوانەوە دەست پێدەکات کە نایانناسین. لە کۆتایی هەشتەکاندا لە شار و دەڤەری ئێمەدا ئەو جۆرە گاڕانە ترسناکە سەریهەڵدا کە هەر کەسە و بە تەنیا بۆ خۆی هەڵدەهات... هیچ کەسێک باکی بەوانی دی نەبوو، کێ دەکەوت و دەمرد، بۆ خۆی دەکەوت و دەمرد، کێ نەیدەتوانی هەڵبێت و جانەوەرەکان دەیانخوارد، کوشتەی لاوازی خۆی بوو... بەهێز ئەوانەبوون کە دەیانتوانی ئەوانی دی لە بیربکەن و پێش هەمووان بە سەر بەربەستەکاندا سەرکەون و هەڵبێن، ئازایەتی تەنیا لە بیرکردن و فەرامۆشکردنی ئەوانی تر بوو... ترسیش ترس نەبوو لە چارەنوسی هەموومان، بەڵکو تەنیا ترس بوو لە چارەنوسی تاک و تەنهای مرۆڤ خۆی. ئەو ڕۆژە کە لیڤیتانتم بینی و

ئەو ترسە بێبن و ناوازەیەم لە چاویدا خوێندەوە، لە بری ترسی مرۆڤ، ترسی ئەو ئاژەڵانەم بەیادا هاتەوە کە بەر لەوەی بیانبەن بۆ قەسابخانە چاویان سامێکی نهێنی تێدەگەڕێت. ترسی نهێنی و شاردراوەی ئەسپە کوژراوەکانی پسمامانم کەوتەوە بیر. ویستم لێیبپرسم «بۆ لیڤیتانت، بۆ، بۆ هێشتت ئەو ئەسپانە بکوژم و ژیانمت بەو دەردە برد؟». بەڵام دەمزانی نازانێت وەڵامم بداتەوە، ئەو هەرگیز نەیدەزانی وەڵامی هیچ پرسیارێکی گەورە بداتەوە... جگە لەوەی ئەو خواستە سادە و سەرەتایی و جانەوەرناسایە بۆ هێز دەیجوڵاند، شتێکی دی نەیدەبزواند. من بۆ ئەوەی ئارامیبکەمەوە، پێمگووت «لیڤیتانت مەترسە، منیش وەک تۆم، پێکەوە دەڕۆینەوە بۆ شاخ. منیش باوەڕم بە ژیان و سەلامەتی ئێرە نەماوە». لەوەدا ڕاستگۆ بووم، من بڕیارمدا کە ئەوجارەش لیڤیتانت ڕزگاربکەم و لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ناو شۆڕش. ئەو بە دەنگێکی نوساو و ترساوەوە، ئەو ڕێکەوتنە دێرینەی بەیاداهێنامەوە کە دەمێ ساڵ لەوەوبەر مۆرمانکردبوو. ئەوەی هەر کات چووە ناو شۆڕش، وەک خائین تەماشانەکرێت و پێشوازی وەفاداران و نیشتیمانپەروەرانی لێبکرێت. من وردەکاریی ڕێکەوتنەکەم یاد نەمابوو، بەڵام ئەو پەیمانەکەی هەڵگرتبوو، کۆپییەکی خستە بەردەستم و ورد خوێندمەوە.

پرسیم «خائین کێیە؟ جەنابی لیڤیتانت خائین کێیە؟ هەستدەکەم وشەکە مانای نەماوە». ئەو قسانەم بە بێزارییەکی گەورەوە کرد، بێزاری لە لیڤیتانت نا، بەڵکو بێزاری لە هەموو دونیا. وەها بوو وەک ئەوەی لە قسەکانمدا بێزارییەکی گەردونی هەبێت. هەستمکرد لیڤیتانت بەقسەکەم ناڕەحەت نییە، خائین لای ئەو وشەیەکی بێمانا بوو، وەک چۆن ژنێک کە دەبێتە عاشقێکی ڕاستەقینە، وشەی خیانەت مانایەکی نامێنێتەوە لەلای، لای ئەوانەش کە دەبنە عاشقی گەورەی دەسەڵات، خیانەت مانایەکی نییە. بەڵام جیاوازییەکە لەوەدایە ژنی عاشق هەر کات

خیانەتدەکات، خیانەتی جوانتر و پاکتر و ئینسانیترە لە دڵسۆزی ئەو ژنە بێهەست و درۆزنانەی بە سەر ڕۆژە مردووەکانی خۆیان و لەپاڵ جەستەی ساردی مێردەکانیاندا دەخەون. بە پێچەوانەی خیانەتەوە بۆ دەسەڵات کە بەدترین و ناشیرینترین جۆری خیانەتە. بەڵام من ئەو ڕۆژە کە ئەو پەیمانە سەیر و دێرینەی لیڤیتانتم لەگەڵ شۆڕشدا خوێندەوە ئەو هەستەم لادروستبوو، کە دەبێت خیانەت چی بێت؟. وشەکە جاران مانایەکی تایبەتی و دیاریکراوی هەبوو، هەر کەس لەگەڵ بەعسییەکان بایە و دژی شۆڕش بایە خائین بوو، هەر کەس هاوڕێکانی حیزبی لەدەمەوەبدایە خائین بوو، هەر کەس نەتەوەکەی خۆی خۆش نەویستایە و خزمەتی بە داگیرکەران بکردایە خائین بوو... بەڵام ئێستا هەستمدەکرد مانایەکی تایبەتیتر و قووڵترم پێویستە بۆ ئەم وشە مەلعونەی کە زیاتر لە هەر وشەیەکی دیکەی دونیا دەیتوانی ویژدانی من بە نائاسوودەگی باربکات. ئەو ماوەیە کە فریشتە بەدەکەم لە ناخمدا ئارامی نەبوو، زۆرجار بە دەم فێ و تا و وڕێنەوە لەگەڵیدا دەدوام و دەمگووت «بۆ دەڕۆیت، بۆ بەجێمدەهێڵیت، خۆ من خائین نیم؟». ئەوە ئەو پرسیارە گەورەیە بوو کە من لەو فریشتە مەلعونەم دەکرد و ئەو وەڵامی نەدەدامەوە... یاخود من گوێم لە دەنگی نەبوو کە وەڵامی دەدامەوە.

من لە لیڤیتانتم پرسی «جەنابی لیڤیتانت، پرسیارێکت لێدەکەم ڕاست وەڵامبدەوە، تۆ لە ناختدا هەستدەکەیت خائینیت یاخود نا؟». بە بێزارییەوە سەیریکردم و گووتی «چۆن من خائینم؟. من چەند ساڵە بە نهێنی بۆ ئێوە ئیشدەکەم، چ ئیشێکی شۆڕش بووە من باش ئەنجامی نەدەم، چ نامەیەکتان بووە من نەمگەیاندبێت... چۆن من خائینم؟». من کەمێک بیرمکردەوە و گووتم «ئەگەر لە ئاست پەیوەندیدا بە شۆڕشەوە سەیربکەیت تۆ خائین نییت... بەڵام لە ئاست پەیوەندیدا بە خەڵکەوە تەماشابکەیت، لە پەیوەندیتدا بە مرۆڤەوە، ئەوە چی دەڵێیت؟». ئەوە

یەکەمجار بوو پرسیاری وەها بە خەیاڵمدا تێپەڕێت. دەمێک لیڤیتانت بە جۆرێکی خوێناوی خزمەتی بە حیزب کردبوو، دڵسۆزانە ئەندامی حیزبەکانی تری تارومارکردبوو، پرسیاری وەها بە خەیاڵمدا نەهاتبوو. بۆ حیزبییەکی سەرسەختی وەک من، لیڤیتانت دڵسۆزی ئێمە بوو، بەڵام لەو کاتەوەی گەیشتبوومە ئەو بڕوایەی، ئەم باڵانەم باڵی فریشتەیەکی نەخۆشە، گەلێک شتی سەیر بە خەیاڵمدا تێدەپەڕی و لە عەقڵمدا پرسیاری نوێ دروستدەبوو. لیڤیتانت کە پرسیارەکەم کەمێک سەرسامیکردبوو، گووتی «من خیانەتم لە دوو شت نەکردوە، یەکەم لە خۆم، دووەم لە حیزب». لیڤیتانت لەوەدا لە سەر هەق بوو. ئەو لە قووڵاییدا کەسێکی مرۆڤدۆست نەبوو تا من بە هیچ شتێک باریبکەم. من هەستمکرد ئەو پرسیارە لە لیڤیتانت پرسیاری من نییە و پرسیاری فریشتەکەی ناخمە. بێویستی خۆم جارێکی تر گووتم «لیڤیتانت، تۆ مرۆڤت خۆشویستووە؟». دیاربوو پرسیارەکانم لیڤیتانت ناڕەحەتدەکات. گووتی «نا... بۆ مرۆڤم خۆشبوێت، یەعنی چی مرۆڤم خۆشبوێت؟». پرسیارەکە هەم بۆ ئەو و هەم بۆ من بێمانا هاتە بەرچاو. لیڤیتانت بە ناڕەحەتییەوە تەماشایکردم و وەک گومانم لێبکات، گووتی «دەتەوێت چی بپرسیت؟». گووتم «ببوورە هیچ... هیچ. ئەوە پرسیاری من نەبوو».

لەو ڕۆژەوە هەستمکرد، فریشتەکەی ناوم شتێکم تێدا دەچێنێت کە نازانم چییە، بەڵام دڵنیابووم شتێکی بەدە و دەشێت تەواوی پەیوەندییەکانم تێکبدات، چی دەردەچێت گەر وام لێبێت هەر کەسێکم بینی بپرسم «مرۆڤت خۆشدەوێت؟ هێی برا، پەیوەندیت بە مرۆڤەوە چۆنە؟». چی دیمەنێکی سەیرم دەبێت، کاتێک هەموان بە گومانەوە سەیرمبکەن و نەزانن بە تەواوی پرسیاری چی دەکەم. هەر چۆنێک بوو دەمی فریشتەکەی خۆمم داخست و بێدەنگمکرد و گووتم «لیڤیتانت ناڕەحەت مەبە، هەرچۆنێک بووە هەوڵدەدەم وەک خائین سەیرت نەکەن».

# من و لیڤیتانت

بەرلەوەی لە شار دەرچین و چەند ساڵێک دووربکەوینەوە، خانمی ماردینیمان گواستەوە بۆ شوێنێکی باش، نەدەبوو ئەمجارە وەک جارانی تر بەدبەختی بکێشێت. من قاتی دووەمی ماڵی دۆستێکم بۆ بەکرێگرت. دڵنیابووم لەوێ هەم سەلامەت و هەم ئاسوودە دەبێت، پلانیشم وابوو هەر کات شتێکی دی هاتە پێشێ بیخاتە مەترسییەوە، جێگای بگۆڕین. من ئەو شەوە هەموو فایل و کاغەزە نهێنییە گەورەکانی خۆم مەحکەم لە شوێنێکی تایبەتدا شاردەوە و بڕیارمدا هاوڕێ لەگەڵ لیڤیتانتدا شار جێبهێڵم.

سەفەری من و لیڤیتانت بەرەو شاخ، سەفەرێکی سەخت بوو، دەوڵەت هێزێکی بێئەندازە گەورەی بڵاوکردبووەوە، بەڵام ساڵانی زۆری هاتوچۆی شاخ و شار، کردبوومی بە ڕێوییەکی ڕاستەقینە، کەسێک لە سایکۆلۆژییەتی ئەوانە تێدەگات کە بۆ پاسکردنی جێیەک دادەنرێن. دەمزانی، هەموو پاسەوانێک لە ناخدا غەمگینە، هیچ پاسەوانێکی بەختەوەر لە سەر زەوی نییە. ئەوەی پاسی جێگایەک دەکات، هەمیشە لە بیری یەک شتدایە، تەواوبوونی ماوەی ئێشکدارییەکەی. هەمیشەش هەموو پاسەوانێک لەو باوەڕەدایە کە لە نۆبەتی ئێشکگرتنی ئەودا هیچ ڕوونادات، ئەوەشی دەیبینێت شتی بێمەترسیین. زانینی ئەو ڕاستییە کۆمەکی پێدەکردم ئاسان هەموو بنکەکانی پشکنین فریوبدەم... چونکە هیچ پاسەوانێک نییە لە قووڵایی ناخیدا ئامادەنەبێت فریوبخوات. لیڤیتانت گەلێک بە تەکنیکەکانی من لە ڕۆیشتن و خۆشاردنەوەدا سەرسام بوو... ئەو لە مێژبوو دەرەوەی شاری نەبینیبوو، ساڵانی ڕابوردوو بووبوو بە

کەسێکی شاری، شێوەی بیرکردنەوە و خۆگۆڕینی تەواو گۆڕابوون، شێوەی خواردن و وەستان و قسەکردنی لە چاو سەردەمی پسماماندا شارستانیتر دەینواند. هەڵبەت هیچ شتێک جانەوەرە دڕەکەی ناو ناخی نەدەخنکاند، بەلام شتێک لە ئەتەکێتی پیاوی مۆدێرنی هەڵگرتبوو کە لەگەڵ جوانی و بۆشناخی ئەودا گەلێک جووت دەهاتەوە. تا زیاتر بەرەو ناوچە شاخاوییەکان سەرکەوتباین، ئەو هەستێکی غەمگینتر دایدەگرت. لە ڕاستیدا منیش وەک ئەو سەرسام بووم، بەلام خۆم کەمتر ئاشکرادەکرد و نەمدەویست کارێکبکەم لیڤیتانت یان فریشتەکەم بکەونە پرسیار و دوودڵی. هەموو نابینایەکیش دەیتوانی ببینێت کە شۆڕش بەرەو لاوازبوونێکی بەرچاو چووە. من بێئەوەی مەبەستم بێت، خۆم زۆر لە بەکارهێنانی وشەی لاوازیی لادەدا، نەمدەویست لیڤیتانت تووشی ترس و نائومێدییەکی کتوپڕ بێت. گەر لەوساتەدا لیڤیتانت وەک من بە لاوازیی ڕاستەقینەی شۆڕشی بزانیبایە، تووشی هەرەسێکی دەرونی دەهات، ئەو فۆبیایەکی ڕاستەقینەی بەرابەر وشەی «لاوازیی» هەبوو.

تا پتر بەرەو نێو کوردستانی ڕاستەقینە ڕۆدەچووین، کوردستانی چیا، کوردستانی پێدەشتی ناکۆتا، سەرزەمینی درەختە غەمگینەکان، سەرزەمینی باڵندەی تەنهای سەر گاشەبەردە ڕەقەکان، کوردستانە ڕاستەقینەکەی من، کوردستانێکی کپ و پڕ لە هەوای ڕۆحێکی مەزن، جێگایەک کە ڕۆحێکی هەیە جیاواز لە ڕۆحی تاک و تەنهای هەر مرۆڤێک، ڕۆحێکی بڵند، شتێک کە جۆرە شانازییەکی نهێنی تێدایە، شانازیی سروشت بە ناکۆتابوونی خۆی، شانازی جێگا بە زمانە ئەبەدی و تایبەتییەکەی خۆی، شانازی بەرزایی و بڵندییەکان بە بێدەنگی ئەبەدی خۆیان... کوردستانەکەی من، ئەو کوردستانەی کە دڵنیابووم فریشتەکەی ناخم ئێستا وەک من سەرسامانە سەیریدەکات. کوردستانێک کە بۆنی ئێمەی لێ نایەت، بۆنی منی لێ نایەت، بۆنی لیڤیتانت و

هەڤاڵ شێرخانی لێ نایەت، کوردستانێک بۆنی تفەنگی لێ نایەت، بۆنی سوپای لێ نایەت، بەڵکو بۆنی ئەبەدییەتی لێدێت. بۆنی شتێک کە زۆر لە ئێمە نەمرتر و درێژتر و ناکۆتاترە... کوردستانەکەی من، کە شتێک بوو لە دەرەوەی مێژوو، خەوتوو لە هەناوی ناکۆتای سروشتدا، نیشتمانێکی ئەبەدی کە گەردناگرێت، پیرنابێت، قسەناکات... بەڵکو تا ناکۆتا غەمگین سەیرماندەکات و سەیرماندەکات و سەیرماندەکات و هیچ ناڵێت. کوردستانە ئەبەدییەکەم، ئەو زەمینەی کە جگە لە ئەبەدییەت موڵکی هیچ کەسێکی دیکە نییە. من هەرکات بەر ئەو کوردستانە قووڵ و دوور و ئەستەمە دەکەوتم، ئەو کوردستانەی دەمزانی هیچ یەکێک لە ئێمە دەستمان پێیدا ناگات، دەمزانی ئەستەمە بەم هەستە بچوکانەی خۆمانەوە تەنانەت مەودای نێوانیشمان بپێوین، بەوە غەمگینییەکی گەورە دایدەگرتم... شادی و کەیف پتر لە دڵمدا دەکوژانەوە. کوردستان لە ناکاو لای من دەبووە ئەو جوانییە قووڵ و نهێنییە، ئەو بێدەنگییە قووڵ و نهێنییە، ئەو جێگا دوور و نەگیراوەی کە نەوەک بە دوژمن، بە هیچ هێزێکی گەورەی تری سەر زەمینیش نەدەگیرا.

لەو گەشتەمدا لەگەڵ لیڤیاتانتدا نزیک و دوور هێزەکانی دەوڵەتمان دەبینی کە لە ناو دۆڵ و لە سەر هەندێک ترۆپک جێگیر بووبوون... لیڤیاتانت زۆر لێیان دەترسا، بەڵام من تەنیا وەک هەندێک گەڵای کەوتوو دەمبینین کە سەنگیان لە پوشێک گرانتر نییە، هێزگەلێک بوون هەرگیز بەو سەرزەمینەوە نەنووسابوون، دەمبینین لە بۆشاییدا وەستاون، جگە لەوەی هەوڵێکی بێهودەی مرۆڤیان تاقیدەکردەوە بۆ تێکشکاندنی سروشت و زەمەن و ئەبەدییەت، هیچی دییان نەدەکرد. داگیرکەر نەبوون، بەڵکو هەوڵی پوچی مرۆڤ بوون، بۆ داگیرکردنی شتێک کە داگیرناکرێت. هیچ شتێک لە مێژوودا لە بنەوبارگەی سوپاگەلێکی غەریب گەمژانەتر نییە، چونکە خۆشیان دەزانن، لەو ساتەدا کە لە سەر زەمینی یەکێکی دی

لەنگەر دەگرن، دەبێت چاوەڕوانی ئەو گەردەلوولە بن کە بەرەو دوا دەیانگێڕێتەوە. من تەنیا لەبەر ئەو هەستە ناسیونالیستییە قووڵەی ناو ناخم نەبوو، باوەڕم بە شکستی ئەو سوپا زەبەلاح و پڕچەک و ترسناکە هەبوو، بەڵکو لەبەر تێگەیشتنم بوو لە پوچی هەندێک هەوڵی گەورەی مرۆڤ. هەموو پەلامارە گەورەکانی مێژوو بە شکستی ترسناک کۆتایی هاتوون، هەرگیز نەبووە سوپای گەورە، جگە لە وێرانی گەورە، شتی گەورەتری بۆ ئەنجامبدرێت... هەمیشەش بەشێک لەو وێرانە گەورەیە، وێرانی سوپا خۆیەتی. زۆرجار لە کاتی سەفەرەکەمدا لەگەڵ لیڤیتانت، دەچووینە سەر بەردێکی گەورە و لەوێوە سەیری ئەو هەموو ماشێن و تانک و زرێپۆش و لوولە تۆپانەم دەکرد کە بەعسییەکان لەو سەر زەمینەدا بڵاویانکردبوونەوە، دەمزانی دەتوانن مرۆڤ بکوژن، بەڵام دەمزانی ناتوانن بگەنە قووڵایی کوردستانە ئەبەدییەکەی من... ئەو کوردستانەی لەو ملیۆنەها باڵندەیە دروستبووە کە سبەی بە ئاسماندا دەفڕن، لەو ملیۆنەها گوڵە دروستبووە کە سبەی دەڕوێن، کوردستانێک کە دەستکردی سیاسەت یان مێژوو یان شۆڕش نییە، بەڵکو دەستکردی ئەبەدییەتە.

لیڤیتانت هیچ شتێک لە من تێنەدەگەیشت، ئەو تادەهات زیاتر دەترسا. بەردەوام بە ناو کەلاوەی گوندی خاپوورکراو و پاشماوەی کێڵگەی سووتاودا دەڕۆیشتین. بە درێژایی ڕێگا، دەیگووت «هەڤاڵ جەنگیز، شۆڕش کۆتایی هاتووە... کۆتایی هاتووە... ئەمە هەرەسێکی نوێیە، بۆ دەبێت من لە ڕۆژێکی وا ڕەشدا ناچاربم ببمەوە بە شۆڕشگێڕ». گەر لیڤیتانت ترسێکی گەورەی لە مردن نەبایە، دڵنیابووم نەدەگەڕایەوە بۆ ناو ڕیزی پێشمەرگە. بنکەکانی پێشمەرگە لە زۆربەی گوندەکان هەڵکەندرابوون، لە زۆربەی جێگاکاندا پاشەکشەیەکی نارێک هەبوو، لە ڕێگا دەمانبیست کە دەیان گوند داگیراون و سەرنشینانیان براون بۆ باشوور.

پاش چەند ڕۆژێک کە گەیشتینە بنکەکانی ئەنجومەنی باڵا، نارێکی و شپرزەیی باڵی بە سەر هەموو شتێکدا کێشابوو... هەموو لە خۆکۆکردنەوەیەکی پەلە و لە بارودۆخێکی دەروونی نائارامدا بوون. کە چووین بۆ ئەو دیو سنوور، بە سەر تەدارەکی گواستنەوەدا کەوتین. هەڤاڵ شێرخان چەند جارێک بە تووڕەییەوە بە منی گووت کە نەدەبوو شار چۆڵبکەم. من بۆم روونکردەوە کە چەندین ساڵە لە ڕووی ڕێکخراوەییەوە من کارێکی ئەوتۆم نەکردوە و تەنیا ئەفسەری پەیوەندی نێوان شۆڕش و دەوڵەت بووم، بەوەدا ئێستا ئەو پەیوەندییە لە نزمترین ئاستدایە، من هەست ناکەم لەوێ کارێکم هەبێت و دەمەوێت لە شار دووربکەومەوە و لە جێگایەکی دی کەمێک بە هێمنی لە پاشەڕۆژی خۆم ڕابمێنم. هەر پێشمەرگەیەک باسی لە پاشەڕۆژی خۆی بکردبایە، هەڤاڵ شێرخان خۆشی نەدەویست. ئێستا ئەو بەرپرسی تەواوی کاروباری لەشکری پێشمەرگە بوو... بوو بوو بە پیاوێکی ئاڵۆز کە هەمیشە بەنیگایەکی ڕەق و بێڕەحمەوە لە شتەکانی دەڕوانی، هەمیشە ئەو مۆنییە قووڵە لە سەر ڕوخساری بوو، مۆنی شۆڕشگێڕێک کە پێیوایە بەشداریکردنی لە گۆڕینی مێژوودا مافێکی زۆرتری لە مافی هەموو دیکتاتۆرە گەورەکانی دونیا پێدەبەخشێت. هەستمدەکرد ئەو چەند ساڵەی دوایی کەمێک پیریانکردوە، لە ساڵانی دواییدا وەک سەرەتای شۆڕش نەدەگەڕا، گەر بهاتبایە و بشکەڕابایە، بە سەر ئەسپێکی ڕەشەوە یان لە جێبێکی تایبەتدا هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر پاسەواندا دەهات و دەچوو. هەستمدەکرد ساڵ دوای ساڵ وڕییەکی گەورە دایدەگرێت. وڕیی شۆڕشگێڕێک کە بەلایەوە گرنگ نییە شۆڕش بۆ کوێ دەچێت. لە ناخودای کەشتییەک دەچوو کە بە سەر سوکانی کەشتییەکەدا خەوی لێدەکەوێت، ئەو کاتانەش کە وریادەبێتەوە، جگە لەوەی وەک پشیلەیەکی قەڵەو و تەمبەڵ سەیری دەریا بکات کارێکی دی ناکات. شێرخانم وەک شۆڕشگێڕێک هاتە بەرچاو

کە بۆی گرنگ نییە کەشتییەکە چۆن دەڕوات، بەس بۆی گرنگە ئەو لە سەر سوکانەکەی بێت و لەوێوە سەیری ئاو بکات و مەستانە باوێشکی گەورە بکێشێت. لە هاوڕێکانمەوە زانیم کە سەدان سندوقی تایبەتی کە پێکرا پڕن لە کەللە پشیلەی بچوک، لە جێگایەکی تایبەتیدا بۆ بارکردن هەڵگیراون... سەیربوو کە سەیرمدەکرد، شێوەی مۆنی و خیشکردن و سەیرکردنی خۆی گوربەیەکی نەخۆشی گەورەی بەیادا دەهێنامەوە.

سەرۆک «خودا لێیخۆش بێت»، هەر شەوی یەکەم چاوی بە لیڤیتانت کەوت. گەرچی هەموو لە سەروبەندی کۆکردنەوەی کەلوپەل و گواستنەوەی بنکەکاندا بوون، بەڵام سەرۆک بە دڵە گەرمەکەی خۆی، باوەشی بە لیڤیتانتدا کرد و بە ماچێکەوە کە خاڵی نەبوو لە ڕیاکاری، بەخێرهاتنی کرد، لەکاتی قسەکاندا سەرۆک شتێک لە پەشۆکانی پێوەدیاربوو، لە ناکاو بێهیچ هۆیەک وەک یەکێک دەرمانێکی بێهۆشی خواردبێت، لیڤیتانتی وەک شۆڕشگێڕێکی گەورە وەسفکرد. سەرۆک «خودا عەفوویبکات»، زوو زوو تووشی ئەو شپرزەییانە دەبوو، زوو زوو لە بری ستایشی پێشمەرگە ڕاستەقینەکان، ستایشی دوژمنانی ئێمەی دەکرد، بەڵام هەموو دەمانزانی پەیوەندی بە شپرزەییەوە هەیە و نیازێکی خراپی نییە و لێی تێکچووە. من دەمزانی سەرۆک زۆرجار لەبیریدەچێتەوە باسی چی دەکات و فریوی زمان و عەشقی بەلاغەت وەها دەیبەن، سیاسەتی بیردەبەنەوە. هەڵبەت من پێمخۆش بوو کە لیڤیتانت قەبووڵبکرێت، بەڵام ناونانی بە شۆڕشگێڕی گەورە بەر لەوەی مایەی سەرسامی من بێت، جێگای پرسیاری خودی لیڤیتانت بوو. دواتر سەرۆک ئەوەی بەوجۆرە تەفسیرکرد، کە ستایشی وەها کارێکدەکات، هەوادارانی دەوڵەت نەترسن و ڕوو لە شۆڕش بکەن. تەفسیرێک لەگەڵ ئەو ساتە گەورەی شکستدا نەدەگونجا کە شۆڕش سەدان قاچی قەرزکردبوو هەڵبێت و بە پڕتاو بەرەو دەرەوەی سنوور ڕابکات.

لە هەفتەکانی داهاتوودا هێرش و پەلامارەکانی دەوڵەت بە جۆرێک بەهێز و بێڕەحمانە بوون، سەرۆک بڕیاریدا تەواوی بنکەکانی دیکەی شۆڕش کە لەمدیو ماون، بڕۆنە ئێران. من ئەو ماوەیە هەر لەگەڵ لیڤیتانتدا بووم، پێکەوە لە کاروباری ڕێکخستن و تەدارەکی گواستنەوەدا بەشداربووین. ئەو هەر لە سەرەتاوە دەیویست بیکەنەوە بە بەرپرسی زیندانی شۆڕش... بەڵام بەوەدا پۆستی بەرپرسی زیندان لە شۆڕشی نوێدا پۆستێکی زۆر گرنگ بوو، هەتا دەکرێت بڵێم لە هەندێک پۆستی ناو ئەنجومەنی باڵاش گەورەتر بوو، بەخشینی بە لیڤیتانت کاری نەکردەبوو. من و ئەو تا ساڵێک دواتریش، دەمێک لە سەقزی ئێرانیش نیشتەجێبووین هەر لە یەک ماڵدا دەژیاین... من هەمیشە بە هۆی حاڵی فریشتەکەمەوە پێویستیم بە شوێنی تایبەت بوو، لیڤیتانتیش بەردەوام ئازار و سەرئێشەی زۆری هەبوو. ستایشەکەی سەرۆک شتێکی گرنگی وەهای پێنەبەخشی. لە ڕاستیدا سەرۆک «خودا لێیخۆش بێت» لەو جۆرە دەم و کاتانەدا قسەیەکی دەکرد و ئیتر تواناى نەبوو دوایبکەوێت و بچێتەوە سەری... بۆ سەرۆک، قسە جۆرێک بوو لە بەرپێکردنی خۆشی ئەو ئان و ساتەی خۆی تێیدا دەژیا. من تەواو هەستم بە ئازاری جەنابی سەرۆکیش دەکرد، هەر کات بانگی بکردبامایە، بە وردی، بە چاوی پیاوێکی شارەزای دەزگای ئەمنییەت، سەیری شێوەی وەستان و هەستان و دانیشتنیم دەکرد. هەندێجار خودی ئەو شێوە سەیرکردنەی خۆم دەیترساندم، من نەدەبوو سەرۆکەکانی خۆشم بە چاوی جاسوسێک نیگابکەم، بەڵام بۆم نەدەکرا، من لە خوداییەوە بووبووم بە جاسوسێکی ئەبەدی، جاسوسیی بووبوو بە شتێک کە لە خوێنمدایە، نەوەک سەرۆک، بەڵکو هەتا مێروولە و پەپولە و باڵندەکانیشم بە چاوی جاسوسێک کە زانیاری گرنگ کۆدەکاتەوە، تەماشادەکرد. لە یاداشتەکانمدا نوسیم «سەرۆک جگە لە قسە، جگە لە چێژی زارەکی، جگە لەو خۆشییە جیاوازانەی لە بەکارهێنانی لێو و

زماندا هەیەتی، پیاوێکی بەدبەختە وەکو من». ساڵەهای ساڵ لە نێو ئەو چیا و کێو و بەردەڵانەدا، جگە لە لەزەتی قسە، لەزەتی بێدەنگی، لەزەتی پێکەنین، لەزەتی تورەبوون... خۆشییەکی تر لە ژیانیدا نەبوو. من دەمزانی هەموو قسەکانی پەیوەندییان بە بیرکردنەوەوە نەماوە و ئەو پردە پێویستەی لە نێوان عەقڵ و زماندا هەیە، لای جەنابیان لە مێژە پچڕاوە. قسەکانی ملکەچی شتێکی تر بوون، شتێک ساڵانی داهاتوو زۆر بە گەورەیی لە سەرۆکدا دەردەکەوێت، هێزێک کە من لە خۆمدا هەستم پێ نەدەکرد، هێزێکی نهێنی کە ناویدەنێم «غەریزە یان چێژی قسەکردن»... بە جۆرێک هەستدەکەم «خوالێی خۆش بێت» چێژی حوکم لەلای بە ئەندازەی چێژی ئەوە نەبوو قسەبکات و کەس تانە لە قسەی نەگرێت. بەڕێزیان تا کۆتاییش هەروا مایەوە، گەر توانجت لە هەموو حیزب و شکۆی بگرتبایە زویر نەدەبوو، بەس گەر عەیبت لە زمان و قسەی بدۆزیبایەتەوە، وەک منداڵێکی بچوک وڕکی دەگرت و دڵی دەشکا. زۆر ڕۆژ من و لیڤیتانتی بانگدەکرد و قسەی بۆ دەکردین، دیاربوو هاوڕێ کۆنەکانی بێزاربوون و گوێی بۆ ناگرن، من و لیڤیتانت دوو کەس بووین بەراستی گوێمان بۆ دەگرت... بۆیەکەمجار لەو دانیشتنانەدا هەستمکرد، لیڤیتانت چ ترس و ڕێزێکی ناوەکی بۆ قودرەت هەیە. لەو دانیشتنانەدا لیڤیتانت وەک گوێگرێکی باش سەری دەلەقاند و هەندێک قسەی بۆ سەرۆک تەواو دەکرد، بەوە نزیکییەکی سەرەتایی و یەکەم لە نێوانیاندا دروستبوو. زۆرجار لەبەرچاوی لیڤیتانت منی بە کوڕی خۆی، یان بە شۆڕشگێڕی دڵسۆز ناودەبرد، زۆرجاریش لەوەسفی مندا وشەی شۆڕشگێڕی وەک شۆڕشگێر لەفزدەکرد، نەمدەزانی ئاخۆ بە ئەنقەست وادەکات یاخود ئەوە ئەنجامێکی سروشتی شپرزەبوونێتی... بەڵام هەرجار لەفزەکەی وەها بگوتبایە، لە ژێر چاویلکەکەیەوە سەیرکردنێکی مانادار و خەنداوی سەیریدەکردم. هەموو دەمانزانی کە سەرۆک شێوازی تایبەتی لە

سوکایەتیکردندا هەیە، بەڵام بۆ دەیویست بەوجۆرە لەگەڵ من بکات... نەمدەزانی. سەرۆک «خودا لە گوناهی خۆشبێت»، هەر کارێکی بکردبایە بەهانەیەکی گرنگتر و کۆنکرێتتری نەبوو، بەهێزتربێت لە بەهانەی بۆ ئەو کارانەی کە نایانکات... هەستمدەکرد شتەکان بۆ ئەوە چووبوونە دۆخی چوونیەکییەوە، ئەو کات هەموو شتێکی لا وەک یەک بوو. بەڵام هەستمدەکرد بە زیرەکییەکی نهێنی و سیمادۆزییەکی حەکیمانە دەیزانی من شتێکی گرنگی لێدەشارمەوە، دەیزانی من بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە چ خەزێنێکی ترسناک و نهێنی ئەو بە ژێردەستمدا تێپەڕیوە... دەیزانی سەدان نامەی نهێنی ئەوم گواستۆتەوە بۆ دەوڵەت و سەدان نامەی نهێنی دەوڵەتیشم بۆ هێناوە. بەڵام دەشیزانی لە ژێر پەنجەی منەوە هیچ نهێنییەکی نەچۆتەدەرێ و هیچ نیازێکی ئیفشانەبووە، بەڵام دەنگێکی تاریک لە دڵیدا پێیدەگووت کە دەشێت لە پاشەڕۆژدا شتی بەد رووبدات. لێرەوە بە دیوێکدا لێمدەترسا و بە دیوێکیشدا خۆشیدەویستم. هەم حەزیدەکرد نزیکیبم و هەم حەزیدەکرد سوکایەتیم پێبکات. من ئەوکات، خەیاڵاتی ئەوەی خیانەت لە نهێنییەکانی بکەم، بە سەرمدا ڕانەدەبورد. وەک هەر پێشمەرگەیەکی وەفادار کە بە کوڕی خۆی ناویدەنام، شانازیم پێوەدەکرد، گەرچی دەمزانی بە زۆرێکی دیکەش وادەڵێت و لەو ڕووەوە قسەکەی سەنگێکی سەنگینی نییە.

لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا، لیڤیتانت بە جۆرێک وەفاداری و بچوکی بۆ ئەندامانی ئەنجومەنی باڵا دەربڕی، جێگای سەرسوڕمانی من بوو، لە کاتی گواستنەوەی بنکەکانیشدا بۆ دیوی ئێران هیمەتێکی وەها ڕیاکارانەی نواند، ڕابوردووی دێرینی لە بەرچاوی سەرکردە گەورەکان و ئەندامانی دەفتەری سیاسی سڕدرایەوە. چیتر وەستان و قسەکردن و نیگاکردنی گومان و دوودڵی ڕۆژانی سەرەتای تێدانەبوو، تەنیا شتێک نەیدەتوانی لەگەڵیدا بژی، ئەوەبوو هیچ کەسی دەست نەدەکەوت ئازاریبدات... ئەوەی

لە نزیکەوە توانای گرتن و ئەشکەنجەدانی لەدەستدابوو، وەک تلیاکییەکی لێکردبوو گیای بێهۆشی لێببڕێت. لە سەقز زۆر شەو دەمبینی عارەقێکی ترسناک دەردەدا، تای لێدەهات، ڕەش دادەگەڕا، گەروی دەگیرا... وەک بکێشێت بە تارماییەکی وەهمیدا، پەلاماری کەسێکی نادیاری دەدا، کە وڕێنە و خەیاڵ دروستیانکردبوو. من لەو شەوانەدا، دڵنیابووم کە لیڤیتانت جۆرە خوویەکی بێوێنە و ترسناکی گرتووە، خوی لێدان لە ئادەمیزاد. لەو شەوانەدا دانی بەوەدا نا ئەگەر ماوەیەک بڕوات و ئەشکەنجەی کەسێک نەدات ناتوانێت ئاسوودە بخەوێت، لاوازدەبێت، گومان لە خۆی دەکات، تای لێدێت، توانای گوێگرتن و بەرگەگرتنی کەم دەبنەوە. پێشتر چیرۆکی حاڵەتەکەیم بیستبوو، بەڵام تەنیا وەک خوویەکی ئاسایی وەرمگرت کە لە هەلومەرجی ئاساییدا ئاسەوار جێ ناهێڵێت. شەوان «کە زۆربەی کات لە میوانی و دانیشتن و گەڕان بووین» تا دەگەڕاینەوە دانی بە خۆیدا دەگرت، گەر لە ناو خەڵکدا باینایە، شپرزەیی خۆی دادەپۆشی، بەڵام من دەمبینی هێدی هێدی ڕەش دادەگەڕێت... لە هەندێک ساتدا دەستی دەلەرزیی و دەنگی خۆی بۆ کۆنترۆڵ نەدەکرا. شەوێک بە پاڕانەوە بە منی گووت دەبێت چارەیبکەم، ئەگینا دەمرێت. من هیچ شتێک بەخەیاڵمدا نەهات ئەوە نەبێت بڵێم لە خۆم بدە. هەستمکرد منیش پێویستیم بە سزایەکی گەورەیە، پێویستیم بە یەکێکە ئەشکەنجەم بدات، یەکێک بەسزای لەش ئازاری ئەم باڵە گەورانەم لە کۆڵبکاتەوە کە هیچ کەس لە ناو شۆڕشدا نەیدەبینین. لەو شەوەوە تا دوو ساڵ من و لیڤیتانت چووینە ناو پەیوەندییەکی سەیرەوە، پەیوەندی دوو نێر کە یەکێکیان پێویستی بە نێچیر و ئەویتریان پێویستی بەجەلاد بوو. ئەوەی سەیربوو ئەوەبوو، دوای لێدانەکانی لیڤیتانت، فریشتەکەم هیچی نەدەکرد، وەک ئاسوودەبێت بەو سزا گەورەیەی خۆمی دەنێمە ژێر، وەک بزانێت من دواجار بەدوای ڕێگا چارەیەکدا دەگەڕێم هەر دووکمان ڕزگاربکات.

دەمزانی فریشتەکەم داوام لێدەکات کە بە جۆرێک لە جۆرەکان ڕۆحم بکێشمە ژێر ئەشکەنجەیەکی قورسەوە، تا لە ڕێگای ئازارەوە دەرونم هێدی هێدی پاک ببێتەوە. ئەوە هەستی من بوو، هەستێک خاڵی نەبوو لە دیوێکی ئایینی، بەڵام کێ دەڵێت فریشتەکەی من دژ بە من نەبووبوو بە فریشەیەکی خوداناس و ئیماندار؟... فریشتەکانمان دەبێت هەمیشە دژ بە ئێمە بیربکەنەوە، تا بتوانن شتێکی دیمان پیشانبدەن. من ساڵانی زۆری دانیشتن و خەوتن و خواردن لە شار، ورگێکی زل و عەقڵێکی تەپیوی بۆ دروستکردبووم، ئێستا ئەو ئەشکەنجە قورسەی لیڤیتانت، خوێنێکی نوێی دەکردەوە بە بەرمدا. هەستمدەکرد بۆ ئەوەی بە جۆرێکی تر لەدایکببمەوە پێویستیم بە ئازارێکی زۆرە، لیڤیتانتیش ئەو ئازارەی پێشکەشدەکردم. من لە مێژبوو هەستمدەکرد پێویستیم بە جەلادێکە... هەموو مرۆڤێک پێویستی بەجەلادێکە، چونکە لە ژێر ئەشکەنجەدا مرۆڤ دەتوانێت جوانتر بیر لە ژیان بکاتەوە.

من و لیڤیتانت هەردووکمان شەرمان لە یەکتری دەکرد. ئەو قامچییەکی تایبەتی دروستکرد و لە ژوورێکی تایبەتیدا کە لە سەقز بۆ نیشتەجێ گرتبوومان، شەو نا شەوێک ئەشکەنجەی دەدام... ئەو وەک خووی هەمیشەیی خۆی پتر، دەست و قاچی بەکاردەهێنا، بەڵام هەندێک شەو کە وزەی نەبایە، من شانم بۆ ڕووتدەکرد و ئەو بە هەموو هێزی خۆی جەلدەی دەوەشاند. کە تەواودەبووین، بە عارەقەیەکی زۆرەوە، لە سەر جێگاکەی خۆی ئاسوودە دەخەوت. هەندێک شەو دوای ئەشکەنجە دەهاتمەدەرێ و لە بەر بای شەودا دادەنیشتم و دەگریام... نەمدەزانی چیم بە سەرهاتووە، بووم بە چ جۆرە مرۆڤێک، چی دەکەم و بۆ کوێ دەچم؟... هیچ کەس نەبوو بە ئەندازەی من لەم دونیایەدا تەنها بێت. گەروم وەک زەمانی زوو، وەک سەردەمانی شپرزەیی دەنوسا، دەمزانی هەم ئاژەڵەکەی ناوم و هەم فریشتەکەی ژێر سینەم بێڕەحمانە دەستیان لێگیرکردوم،

هەردووکیان دڕندانە دەمخۆن و هەلاهەلامدەکەن. هەندێ شەو باڵەکانیشم دەکەوتنەوە جوڵە، بەڵام تەکانی قورسیان نەدەخوارد، وەک بایەک نەرم بیانهێنێت و بیانبات دەجولان. من ئاوێنەیەکی گەورەم بۆ سەیری ئەوان کڕیبوو، هەندێ شەو کە ئاوا بە نەرمی دەجولان، من لەزەتێکی گەورەم لە سەیرکردنیان دەبینی... ئەوەی شۆڕش بەرەو کۆتایی ڕۆیشتبوو، ئەوەی لە شارەکانی ئێران ئاوارە بووبووین، ئەوەی من شتێکم نەدەکرد لە ژیانی جارانم بچێت، خەڵکێکم نەدەبینی لە کەسانی جاران بچێت، لە شارێکدا نەبووم وەک شارەکەی جارانم بێت، فریشتەکەی هێورکردبوومەوە. بەڵام نەمدەزانی تا چەندی تر دەتوانم دڵی ئەم فریشتەیە ڕابگرم. وەلێ دڵنیابووم ئازارە زۆرەکانی لەشم... ئەوەی هەمیشە بریندارم... ئەوەی لە سەر داوای ئەو خۆم خستۆتە ژێر نەشکەنجەوە، ئاسوودەیدەکرد... بەڵام ئاشکرابوو باڵەکانی ناکێشێتەوە... ئاشکرابوو.

## ژیان لە کەشتیی فریشتەکاندا

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٧ ــەوە، تادەهات ژیان لە کەشتیی فریشتەکاندا سەخت دەبوو. شەوانە بولبولیار و مەهدائیل، هەندێجاریش بە هاوڕێتی دکتۆر شوکاک، بۆ هەڵگرتنەوەی فریشتەی نەخۆش و بێکەس و لانەواز دەچوونەدەرێ. زۆر شەو تەنیا تەرمی فریشتەیەکی مردوویان دەهێنایەوە و پێکەوە دەیانناشت. مەهدائیل تاکە کەسێک بوو دەیتوانی فریشتە مردوەکان ببینێت و کۆمەک بە دوو مەلەکبینەکەی دیش بکات لە تاریکیدا ببینن. هێدی هێدی گۆڕستانی فریشتەکان تادەهات گەورە دەبوو. ڕاستە گۆڕستانەکە چەندین فەدان زەوی گەورە و بەرینی بەدەمەوە بوو، بەڵام ڕێزانی مەلەکبین زۆر لەوە دەترسا ڕۆژێک بێت، جێگا بۆ

مەیتی فریشتەیەکی دی نەمێنێتەوە. لە ڕیواقەکانی کەشتیدا، لە بەشی بیمارستان، لە ئیدارە، لە پشووگا، بەردەوام دەڕۆیشت و بەدەم خۆیەوە دەیبۆڵاند و دەیگووت «لە هیچ شارێکی دونیادا، وەک ئەم شارە مەلعونە فریشتە نامرێت... ئەمە چییە، ئەوەندە تەرەس و نامەرد لەم شارەدا زۆرن کە حورمەتی خۆیان ناگرن، دەردەسەرییەکەی دواجار بۆ ژنێکی بێکەس و بەدبەختی وەک منە... من گەر ژنێکی خراپ بوومایە، غرورم نەدەخستە ئەولاوە و دەمگووت، ئەی نەفرەتیان لێبێت، خۆ فریشتەی باوکم نین... بە نەعلەت بن، لە کوێ دەمرن چاویان دەربێت. وای خۆمن ڕۆحم دەرچوو. بەس لە بەرئەوەی من ژنێکی تەنها و بێکەس و دڵپاکم، ئەوەتا دەمبینن... ئەوەتا سەگ بە حاڵم نەبێت. وای هەرچی شتە بیخەنە ئەولاوە، بەڵام بە خودا سەگ بە حاڵم نەبێت».

ترسی ئەودەمی خانم لە جێگای خۆیدا نەبوو، هێشتا گۆڕستانەکە چۆڵ و بەرین بوو، بەڵام هەموو سەرنجی گۆڕانکارییە ڕیشەییەکانیان دەدا، زیادبوونی ژمارەی فریشتە مردووەکان نیگەرانییەکی زۆری دروستکردبوو، بەڵام زەوی گۆڕستانەکە هێشتا هێند بەرین بوو، بەشی فریشتە مردوەکانی شارێکی دیشی دەکرد.

لەگەڵ هاتنی ساڵی هەشتاوهەشتدا، ژمارەی ئەو کوردانەی چەکیان بۆ دەوڵەتی سەدام هەڵگرت و چوونە ڕیزی سوپای دەوڵەتەوە زۆر زیادیکرد، لەوەوبەر نەبووبوو لە مێژوودا، نەتەوەیەک بەو جۆرە لە خۆی هەڵبگەڕێتەوە. خانم دەیگووت «ئەم میللەتە غروری خستۆتە لاوە، غروری خستۆتە لاوە... من مەبەستم ئەوە نەبوو تا ئەو ئەندازەیەش غرور بخەنە لاوە، شتێکی قورسە، من هەمیشە دەڵێم غرور بخەنە ئەولاوە، بەڵام نەگاتە ئەم سنوورە... ها واسەیرم مەکە مستەفا، من بە کەسم نەگوتووە تا ئەندازەی خیانەت غرور بخاتە لاوە». ئەودەم موستەفا شوکاک بەردەوام مەستدەبوو، قسەی نابەجێی دەردەپەڕاند، زۆربڵێیی

دەکرد. هەرکات دەهات بۆ کەشتی و خۆی دەکرد بە ژووری خانمدا، دەکەوتە ورێنەبازی، تیورە لە دوای تیورە دایدەنا و هەڵیدەوەشاندەوە، هەتا جارێک دەرهەق بە زۆربوونی ژمارەی چەکدارانی دەوڵەت دکتۆر شوکاک سەرسەختیکرد و گووتی «زۆربوونی ژمارەی جاشەکان، شتێکی ئاساییە. ئەوەی ڕوودەدات دوور و نزیک پەیوەندی بە خیانەتەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە هونەری ژیانەوە هەیە. مرۆڤ دەبێت بە وردی لە مۆراڵی ژیان تێبگات، ئەوسا دەزانێت چی دەگوزەرێت. بۆ جانەوەرێکی نزمی وەک مرۆڤ، تاکە هونەرێک گرنگ بێت، هونەری مانەوەیە. هەموو شتێک بە سیاسەت تەفسیر ناکرێت. تەنیا خەڵکی نەفام هەموو شت بە سیاسەت تەفسیردەکەن، ئەوانە کتومت وەک ئەوانە وان کە هەموو شت بە دین تەفسیردەکەن. چیمان کردوە خانمی مەلەکبین، ها چیمان کردوە؟ سەد ساڵە ئەوەمان لێوەشاوەتەوە، خورافاتی سیاسەتمان خستۆتە جێگای خورافاتی دین. جاران دەیانگووت خودا لە هەموو شتێک بەرپرسە، ئەمڕۆ دەڵێین جەنابی سەرۆک، فیسارە حیزب لە هەموو شت بەرپرسە. جاران دەیانگووت خوانەناس و ئێستا هەر کەس خوار بوەستێت پێیدەڵێن خائین، ئەمە دینی تازەی سالآنی هەشتایە... هەموو شتێک بووە بە خائین، دار و بەرد... بەڵام ئەوەی هەیە خیانەت نییە، بەڵکو توانای بایۆلۆژی ئەم حەیوانەیە کە پێیدەڵێن مرۆڤ لە سەر خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگەی نوێ و بارودۆخی سەختدا. ئەوەی لەم قۆناغەدا بەعسییەکان واهار نەکەین لە گۆڕی بابی هەموومان بەرن، زیرەکییە. ڕێزان خان زیرەکی جۆری هەیە. هەندێجار بۆ ئەوەی ببیت بە جاش زیرەکییەکی تایبەتیت دەوێت کە جیاوازە لەو زیرەکییەی دکتۆرێکی وەک من پێویستی پێیەتی. نا من ناوی نانێم خیانەت... بەقەد سەرە دەرزییەکیش ناوینانێم خیانەت، ناویدەنێم زیرەکی کوڕی زیرەکی. ئێمە چەکیان لێوەردەگرین، پارەیان لێوەردەگرین، پۆستیان

لێوەردەگرین... بەرامبەر بەوە چی دەبەخشین، ها، چی دەبەخشین... هیچ. ئێمە ئەوەش نەکەین گوندەکان هەر کاول دەبن. ئەوە نەکەین دوور نییە شارەکانیش کاول ببن، بێئەوەی ئەو هەندە پیاوە فس فس پاڵەوانەی باس لە خیانەت دەکەن بتوانن قەپاڵ لە پەنجەی بەعسییەکیش بگرن. دوای ئەوە بۆ خاتری چل و چوار هەزار شەیتان، جەنابی کاک هۆشەنگ پێمبڵێ، ئەو گوندانەی ئێمە... ئەو زەلکاوە گەورانەی نەخۆشی و مەلاریا و گرانەتا و کۆلێرا ڕوخاندیان، کارێکی باشە یان خراپ؟. من دەزانم بەعسییەکان بەخەیاڵی خۆیان کارێکی خراپ بە ئێمە دەکەن، بەڵام برای خۆم، دواجار هەمووی لە قازانجی ئێمەیە... وامەبینن، بەعسییەکان هێز گەمژەیکردون، خراپترین گەمژەش ئەوانەن کە دەسەڵات گەمژەیان دەکات». هەڵبەت هەریەک لە هۆشەنگ و ڕێزان بە هەق بەزەییان بە عەقڵیدا دەهاتەوە و میهرەبان تەماشایاندەکرد و وەک دکتۆر بە ساویلکەیەکی بێچارە ببینن، خەندەیەکی ژێرەوانکێیان دەگرت و دەیانگووت «وای دکتۆر شوکاک لەم تەفسیرانەی تۆ... وای دکتۆر لەم تەفسیرە سەیرانەی تۆ».

مەهدائیلیش لەو دۆخە نوێیە نیگەران بوو، زۆربوونی فریشتە مردوەکان دوودڵییەکی قووڵیان تێدا دروستکردبوو، دەیگووت لە هەموو یادگاری و یادەوری خۆیدا، سەردەمی وا تاریکی نەبینیوە. ژمارەی فریشتە بیمارەکانیش تادەهات لە کەشتیی فریشتەکان زۆرتر و زۆرتر دەبوون، دەبوو هەر ژوورێک و زیاد لە سێ پێخەفی تێدا بێت. حاڵی نەخۆشخانەی فریشتەکان شپرزەییەکی گەورەی تێکەوت، هێمنی جاران نەما، ڕێزان و هاوکارەکانی، گروپێکی لەوە کەمتر و بچوکتر بوون بتوانن کۆمەکی تەواو بە هەمووان بکەن، هەر لەو وادەیەدا هەندێک لە هاوکارەکانیان لە ترسی دیمەنی ئەو هەموو فریشتە بیمارە، لەبەر بەرگەنەگرتنی ئاه و هەناسەیان، لە بەر دڵنیاییان لە مەرگی حەتمی ئەم

بوونەوەرە ناسکانە، وازیان لە هاتوچۆی کەشتی هێنا... هەتا ڕۆژێک هات، شەرمینی چکۆلانەش ئیتر نەهاتەوە بۆ کەشتی. ئاسان نەبوو مرۆڤ ڕۆژانە مردنی فریشتەکان ببینێت، بە دەستی خۆی دەست لە باڵە لاواز و بێجوڵەکەیان بدات، لە پێخەفەکەیاندا بۆنی ساردی غەمێکی ئەبەدی هەڵمژێت. لەدواجاردا سەرپەرشتان بە جۆرێک کەمبوون بەشی خزمەتی ئاسایی ناو بیمارستانیان نەدەکرد... هیچ مەلەکبینێکی نوێش دیارنەبوو.

فریشتە بیمارە نوێکان وەهابوون وەک مەستی و گێژییەکی کوشندەیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابێت، زۆربەی وەخت بێئەوەی هێزی وەستان و هەستانیان هەبێت، لە جێگای خۆیاندا بە باڵە لاوازەکانیانەوە، سەیری جێگایەکی نادیاریان دەکرد. چاویان پڕبوو لە خوماری خەوێکی کوژراو، هەناسەیان پڕبوو لە ئاهی مەستانە. بە پێچەوانەی نەوەکانی دیکەی نێو بیمارستانەوە، ئەم نەوە تازەیە، بێدەنگتر و تەنهاتر و خومارتر دەردەکەوت.

لەو دەمەدا میرائیلی فریشتە، فەیلەسوفی غەمگینی فریشتەکان، ئاشکراتر لە جاران جاڕی ئەوەی دەدا، باشترین ڕێگا فریشتەیەک پیایدا بڕوات مردنە... وایدەبینی لە نێوان مرۆڤ و فریشتەدا شتێکی هاوبەش نەماوە، ئەم ژیانەی کەشتی وەک زیندانێکی تر و دیلییەکی بێمانای دیکە سەیردەکرد... شەو کە هەمووان دەخەوتن، ئەو هەڵدەستا و بە گۆچانەکەیەوە ژوور ژوور دەگەڕا، یان تاک تاک لەگەڵ فریشتەکاندا دەکەوتە گفتوگۆ یاخود کۆیدەکردنەوە و وتەی بۆ دەدان، قسەی لە پوچی ئەم کەشتییە دەکرد، پوچی ئەم هەوڵە بۆ زیندوو ڕاگرتنی شتێک کە لە ڕاستیدا مردوە. تەواوی بیمارستانەکەی بە جێگای ئازارێکی گەورە دەزانی، نەیدەشاردەوە کە لە دڵەوە دەخوازێت بمرێت. هەندێک لە فریشتەکان کە نەخۆشی و لاوازیی و نائومێدی ماندوویکردبوون،

ئەوانەی چیتر ئومێدیان نەبوو، ئازاری جەستە و باڵ و ڕۆح سات دوای سات لاوازتر و لاوازتری دەکردن، بە وردی گوێیان لە گفتی میرائیل دەگرت، هەتا هەندێجار دەشیانگووت «میرائیل... میرائیل... بمانکوژە».

بەڵام ئەو لەوە بێهێزتر بوو بتوانێت کەس بکوژێت. گەرچی لە ناخی دڵدا هەستیدەکرد کوشتنی مەخلوقێکی نائومێد کارێکی چاکەبەخش و فریشتانەیە.

مەهدائیل سەرنجیدا ئەم فریشتە تازانە، لە فریشتەی هەر دەور و زەمانێکی تر لە مرۆڤ نائومێدترن. زۆربەیان فریشتەی ئەو پیاوانەن کە بە جۆرێکی ترسناک لە سیاسەت و جەنگەوە ئاڵاون، فریشتەی ئەو ژنانەن کە نازانن خۆشەویستی چییە... بێزاریان لە مرۆڤ لە هەر چاوەڕوانییەک دەرچووە. ئەو نائومێدییە زۆرە وایدەکرد هەر زوو بمرن، خۆیان کز و کەنەفتەبوون، کە دەگەیشتنە بیمارستانیش میرائیل بە نیگا تاریکەکانی هێندەی تر ئارەزووی ژیانی تێدا دەکوشتن. مەهدائیل کە ڕزگارکردنی فریشتەکان و درێژکردنەوەی ژیانیانی بە کاری خۆی دەزانی، بە جۆرێکی بەرچاو دژ بە نائومێدکردنی فریشتەکان بوو، پێشتر نەبووبوو لە کەشتیی فریشتە مەستەکاندا، جەنگ بکەوێتە نێوان دوو فریشتەوە. بەڵام میرائیل هێدی هێدی هەموو ئەم فریشتە خەستە و تەنهایانەی دەخستە پاڵ خۆی و دەیکردن بە موریدی ڕوانینەکانی.

مەهدائیل سەرنجی ئەوەی دەدا، کە مرۆڤ تا لە دەرەوە بەدتر بێت، تا شەڕ گەرمتر بێت، تا مرۆڤ دەرهەق بە مرۆڤ بێباکتر بێت، فریشتەکان لاوازتر، بێهێزتر، نەخۆشتر دێنەدەرێ.

کارەکانی میرائیل و کۆبوونەوەکانی، هەندێک ڕۆژ دەگەیشتە ئەوەی، فریشتەکان گوێگرتن لە چیرۆک و مۆسقا و شیعر فەرامۆشبکەن و تەنیا بیر لە خێراکردنی مردن بکەنەوە. هەتا کار گەیشتە ئەوەی یەکێک لە فریشتەکان تووشی دۆخێکی دابڕانی تەواوەتی بێت و هەست و ئارەزووی

خۆی بکوژێنێتەوە و دەرمان وەرنەگرێت و هیچ نەخوات و پیاسەنەکات و چاو نەکاتەوە تا دەمرێت.

مەهدائیل لەو نێوەندەدا کە ژیان لە دەرەوە تاریکتر دەبوو، مرۆڤەکان شکستەتر و ملهوڕتر دەژیان، پێشنیاری بۆ خانمی ڕێزانی مەلەکبین و دکتۆر شوکاک کرد لەگەڵ میرائیلی فریشتەدا دانیشن و لەو بانگەشە ترسناکانەی ئاگاداربیکەنەوە... چونکە ئیشی کەشتیی ئەوەیە نەهێڵێت فریشتەکان بمرن.

دانیشتنی ڕێزانی مەلەکبین و مەهدائیل لەگەل میرائیلدا دانیشتنێکی سەیربوو، گفتوگۆی سەرەکی لە نێوان ئەو دوو فریشتە گەورەیەدا بوو کە یەکێکیان نوێنەرایەتی ژیانی دەکرد و ئەویتریان نوێنەرایەتی مردن. ڕێزانی مەلەکبین دانیشتنەکەی بەوە کردەوە بپرسێت «میرائیلی عەزیزم، ئێمە لێرە لەمماڵە کاولەدا فێرنەبووین هەق و حیساب لەگەڵ کەس بکەین، بەخودا فێری کاری وانەبووین. وای چۆن دڵمان دێت بە فریشتەیەکی نەخۆشی بەستەزمان بڵێین وامەکە. بەس عەزیزم، ئەوەی لە سەر تۆ دەیبیستم نیگەرانم دەکات... هەموو دەزانین تۆ فەیلەسوفی فریشتەکانی. بە قەبری باوکم هیچ حەزم لێ نییە، فریشتەکان فەیلەسوفیان هەبێت. ئەم جنسی بەشەرە، فەیلەسوف و شتی وا چەواشەیانکرد... ئاخ لەدەست فەیلەسوف و زانا. هەر فەیلەسوفێک سەری لە هێلکە جوقا، ئیتر تەواو. دەبێت هەموو دەم داخەین و بڵێین جەنابیان گوتیان. وای... کوا ئەو مەڤاڵە مارکسییەمان شوکور ئەمڕۆ لێرە نییە؟ دەزانم لە نێوان ئومێد و نائومێدیدا ناتوانێت بڕیاربدات، بۆیە نەهاتووە. لەوەدا ناهەقی ناگرم... ناهەقی ناگرم».

میرائیل قوماشێکی سپی درێژی لە خۆیەوە ئاڵاندبوو، بە ڕوخسار لە پیرێکی نورانی دەکرد نەوەک لە فریشتەیەکی تووڕە و بێهیوا. شتێک لە غەمباری قووڵ لە دانیشتنەکەیدا بوو، گەرچی زۆر باسی مردنی دەکرد،

بەڵام پێدەچوو لەو ماوەیەدا تەندروستی بەردەوام بەرەو باشی چووبێت. میرائیل بە هێمنییەکەوە جێگای تێڕامان بوو گووتی «هەق نییە لە سەر نائومێدی پرسیار لە من بکرێت». مەهدائیل خۆی بە گەورەی فریشتەکان دەزانی، لە خەیاڵی خۆیدا ئەندازیاری پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و فریشتە بوو، کەسێک نەبوو سانا بخرێتەلاوە. گووتی «بەڵێ، میرائیلی برام، دەبێت لە سەر نائومێدی پرسیارت لێبکرێت». مەهدائیل لە کاتی ئاساییدا هەرگیز باڵەکانی نەدەکردەوە، بەڵام ئێستا تەواوی باڵەکانی واڵا کردبووەوە، وەک پیشانی میرائیلی بدات، وەک بڵێت ئەوەی من دەیڵێم سادە و سانا نییە، قسەی فریشتەیە بۆ فریشتە. میرائیل گووتی «مەهدائیلی برام، پرسیاری چیم لێدەکەیت؟».

مەهدائیل جگەرەیەکی داگیرساند و مژێکی قووڵی لێدا و گووتی «پرسیاری ژیان، پرسیاری ئەوەی بۆ دەتەوێت فریشتەکان بمرن، ئێمە هەموو ئەم کەشتییەمان داناوە تا ڕۆژ بە ڕۆژ و سەعات بە سەعات تەمەنی فریشتەکان درێژبکەینەوە، تا وەکو کەشتییەکەی نوح فریشتەکان لە فەنابوون بپارێزین، لەم تۆفانە بیانپەڕێنینەوە، بەڵام تۆ ئێستا هەمووی تێکدەدەیت... من دەبینم کەم کەم فەلسەفە نائومێدەکەی تۆ دەچێتە دڵی ئەم قەومە نەخۆش و نائومێدەی ئێمەش. من هاتووم بڵێم خۆشەویستی فریشتەکان بۆ ژیان مەکوژە میرائیل».

«بەڵام ئەمە ژیانێکی ڕاستەقینە نییە، مەهدائیلی برام، ئەمە ژیانێکی ڕاستەقینە نییە. ژیان وەک نەخۆش لە کەشتییەکی گەورەدا، ژیانێک بێ پاشەڕۆژ، لە شارێکدا تا دێت ناشیرینتر دەبێت، لەگەڵ بوونەوەرێکی دڕندە و بەهێزدا کە گوێ ناگرێت، کە دەستەمۆنابێت... لەگەڵ جانەوەرێکی گەورەی وەک مرۆڤدا، سوودی چییە؟».

«تۆ پێتوایە میرائیل ئێمە شەڕەکەمان دۆڕاندبێت؟. شەڕی ئێمە و مرۆڤ شەڕێکی ئەبەدییە. لە شەڕێک و دووان دروست نەبووە، لە

هەزاران وردە شەڕ و ئاشتی دروستبووە، ئەوەی لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و فریشتەدا ئاشکرایە، لە سەر جەنگی بەردەوام و ئاشتی بەردەوام دانەمەزراوە».

«لە سەر هەرچییەک دروستبووبێت، تەواو... لە نێوان فریشتەکانی ئەم کەشتییە و مرۆڤدا شتێک نەماوەتەوە. ئەم ژیانە دەستکردە ئەوەندەی ئەوەمان بیردەخاتەوە کە بێسوودین، هیچ نین، شوێنێکمان نییە، سودێکی تری نییە. مەهدائیل تاکەی دەتەوێت بەم ژیانە ئازارم بدەیت، تاکەی دەتەوێت درێژە بەم ئازارە بدەم... ئەم فریشتانە بێگوناهن، لە مرۆڤ دێنە دەرێ بۆ ئەوەی بمرن، بەڵام ئێوە لێرە بەردەوام هیوای درۆیان دەدەنێ. مرۆڤ تەواو... مرۆڤ لە سەر ئەم ئەستێرەیە تەواو، ڕێگای ترسناکی خۆی گرت... ڕێگای هەتاهەتایی خۆی گرت. مرۆڤ بڕیاریداوە بێ فریشتەکان بژی. مرۆڤ ناتوانێت دەست لە زانست، لە خودا، لە ئیش، لە دەسەڵات هەڵبگرێت، بەڵام دەتوانێت دەست لە فریشتەکەی خۆی هەڵبگرێت. مرۆڤ بۆتە گۆمێکی ژەهراویی، دونیاکەشی بۆتە جەنگەڵ... من دەمەوێت بمرم، بەڵام بەر لەوە دەمەوێت کۆتاییەک بۆ ئەم کەشتییە دابنێم. دەمەوێت فریشتەکان لەو خەیاڵە ڕزگاربکەم کە ئینسان دەتوانێت باش بێت... مرۆڤ قابیلی باش بوون نییە، لە نێوان ئێمە و ئەواندا هیچ نەماوە».

«نازانم ئایا دەکرێت مرۆڤ ڕزگاربکەین یاخود نا، بەڵام ڕزگارکردنی مرۆڤ بە ڕزگارکردنی فریشتەکەی ناخییەوە بەندە، ئەوەی کە نابێت ئاسان لە بەردەم مردندا چۆکبدەین، هەم لە پێناوی ئێمە و هەم لە پێناوی مرۆڤیشدایە. تا فریشتەیەک ڕۆژێک درەنگتر بمرێت، کارەساتە گەورەکان ڕۆژێک درەنگتر دێنە پێشێ... عەزیزم میرائیل، بە جۆرێک دەکرێت کارەساتەکە بۆ هەتاهەتایە دوابخەین. مامی مامی، ئیشی ئێمە ئەوەیە کارەساتەکە دوابخەین، هەمیشە کارەساتێک بەڕێوەیە،

بەڵام زیرەکی ئێمە تەنیا لەوەدایە هاتنی دوابخەین. هەر کات بتوانین کارەساتێک زۆر دوابخەین دەتوانین ڕێگای لێبگرین هەرگیز ڕوونەدات. گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بە دەستی خۆی خۆی ویران نەکات. ئێمەش لێرەدا لەگەڵ ئەوەدا شەڕدەکەین، من و تۆ هەردووکمان بەشێکی جیاواز نین لە مرۆڤ، هەردووکمان مرۆڤین، نە من خودام و نە تۆ... تۆ مرۆڤیت و منیش مرۆڤم. ئەوەی فریشتەین لەوەمان ناخات مرۆڤبین، ئەوەی دوو باڵمان هەیە، هیچی ئەوتۆی تێدا نەگۆڕیوین... باڵەکانمان نیشانەی نائومێدیمانن، نەوەک نیشانەی جیاوازیمان بن لەم بوونەوەرە بەدبەختەی ناوی مرۆڤە. گەر فریشتەکان ئاسمان بمرن، ئەوەی دەمرێت تەنیا فریشتەکان نابن، بەڵکو مرۆڤ دەبێت لە سەر ئەم ئەستێرەیە. بۆیە ژیانی فریشتەیەکی وەک تۆ گرنگە، چونکە لە ناو تۆشدا مرۆڤێکی زیندوو هەیە کە دەیەوێت بژی، دەیەوێت گوێی لێبگیرێت».

میرائیل بە ناڕەحەتییەوە هەستا، وەک نەیەوێت لەوە زیاتر دابنیشێت، وەک توانای گوێگرتن و قسەکردنی نەبێت، گوتی « من تازە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای مرۆڤ، تازە لە نێوان من و خاوەنەکەمدا پردێک نەماوە. ئەو ڕۆژەی ترازام لە نێوان خۆم و مرۆڤەکاندا پردەکانم پچڕان... ماڵاوا ئەی جنسی بەشەر... ماڵاوا... ئەی بۆ لەم بەنیئادەمە مەلعونە دەترازێین، بۆ؟ چیتر نامەوێت گوێم لە چیرۆکی ئەوان بێت».

قسەکانی مەهدائیل هەتا بۆ ڕێزانی مەلەکبینیش تازەبوون. چۆن دەبێت لە ناو هەموو فریشتەیەکدا مرۆڤێکی دی هەبێت. چۆن دەبێت؟. بەڵام بێئەوی بپرسێت، گوتی «میرائیلی عەزیز. نامەوێت وەک مرۆڤ یان وەک بەنیئادەم یان هەر شتێکی تر خۆم وادەرخەم و درۆبکەم و بڵێم ژیان هەر خۆی لە خۆیدا نرخی هەیە، بڵێم ژیان موقەدەسە و ئەم شتانە... لەم شارەدا ڕۆژانە ١٠ هەزار مەڕ و گا و گوێرەکە سەردەبڕن... هەفتانە دوو سێ ملیۆن مریشک و کەڵەشێر دەخۆن. لە شوێنی وادا،

ناکرێت من قاچ بخەمە سەر قاچ و بڵێم، گوێبگرە میرائیل، گوێبگرە و غرور بخەرە ئەولاوە، ژیان موقەدەسە و تۆ دەبێت بە فەرمانی من بژیت، چونکە لەم شارەدا هەموو ڕۆحلەبەرێک ژیانێکی پیرۆز و موبارەکی هەیە. هەڵبەت گەر وا بڵێم، تۆ گەر فریشتەیەکی بەدبەخت و کەللەپوت نەبیت، دەم و دەست دەزانی درۆدەکەم، دەڵێیت: بەقوربان موقەدەسی چی؟ بەساقە کامە موقەدەس، خەڵکی ئەم شارە بزن بە کاڵی و گوێرەکە بە تووکەوە دەخۆن... ژیانی چی و موقەدەسی چی؟. ژیانی تۆ کە لای ئێمە زۆر بە نرخە لە بەرئەوە نییە کە تۆ فریشتەیەکی نەخۆشیت و باشترە نەمریت... نا لەبەر شتێکی دییە. لە بەرئەوەی هەر فریشتەیەک کە دەمرێت، مردنی مانایەکی تایبەتی هەیە، مردنی نیشانەیە بۆ هەڵەیەکی گەورە لە ڕۆحی ئێمەی بەنیئادەمدا. مردنی بێدەنگ سوودی چییە. دەبێت دونیا هەستبکات مردویت، بیبینێت. دەبێت خۆت نەکوشتبێت، دەبێت قەهرێکی قووڵ بتکوژێت، دەبێت پچڕانت لە مرۆڤ بگاتە پلەی کەماڵی خۆی. میرائیل وەک ژنێکی قەڵەوی گەمژە سەیرممەکە کە وەک قازی نەخۆش بە سەرو خواری کەشتیدا دێم و دەچم. مردنت نابێت مردنێکی خۆویست بێت، بەڵکو کۆتایی غەمگینی پەیوەندییەکی عاشقانە و گەورە بیت. تۆ دەمریت لە بەرئەوەی کە لە نێوان تۆ و مرۆڤدا پرد نەماوە، نەوەک لە بەرئەوەی خۆت دەتەوێت بمریت. فریشتەکان نابێت خۆیان بیانەوێت بمرن، بەڵکو دەمرن دوای ئەوەی لە مردن زیاتر ڕێگای دیکەیان لە بەردەمدا نەماوە... مردنی تۆ مردنێکی ئازاد نییە، بەڵکو مەرگێکی ناچاری و خۆنەویست و تراژیدییە. نابێت مردنی هیچ فریشتەیەک مردنێکی ئازاد بێت. گەر خۆت مردن هەڵبژێریت، چیتر فریشتە نیت، نەوەڵا بەساقە فریشتەی چییت؟ ها ؟ فریشتە کاتێک فریشتەیە کە بکوژرێت نەوەک خودکوژیبکات. فریشتەکان دەکوژرێن و نامرن، ئیشی ئێمەش لەم بیمارستانە مەلعونەدا ئەوەیە تیماریانبکەین.

بەڵام گەر ئێستا بڵێیت، بە جەهەنەم من مردوم و تەواو، من نەکوژراوم، بەڵکو خۆم بەئارەزووی خۆم ترازاوم و مرۆڤم جێهێشتووە و ئارەزووی ژیانم نییە، دەمریت و ئێمەی ئادەمیزاد گوناهێکمان لە مردنی تۆدا نییە. لە کاتێکدا بۆ ئەوەی مردنی تۆ مانای هەبێت، دەبێت ئێمەی ئادەمیزاد شەرم لە مردنت بکەین... لە بەردەمیدا خەجاڵەتی بکێشین».

میرائیل بێئەوەی هیچ بڵێت لە جێگای خۆی هەستا، گۆچانەکەی خۆی دا بەزەویدا و وەک نەیەوێت لەو ڕووەوە هیچی تر ببیستێت، ڕوویکردە دەرگاکە و بەرەو دەرەوە هەنگاوی نا، مۆن بوو، پێنەدەکەنی، ڕووی مرچ و نێوچاوانی گرژ دەینواند. مەهدائیل بە غەمگینی سەری بادا و ڕێزانی مەلەکبین لە دوایەوە گوتی «ئەگەر مەسەلە مردن بێت، ئێمەش دەمرین... مرۆڤیش ڕۆژێک لە ڕۆژان دەمرێت. بەڵام دەبێت هەوڵبدەین تۆزێک زۆرتر بژین... چەند ڕۆژێک، چەند ساڵێک... تۆ دەڵێیت نرخی نییە؟ دەڵێیت بێ بەهایە گەر کەمتر یان زۆرتر بژین؟ نا من دەڵێم هەتا ئەگەر یەک سەعاتیش زۆرتر بژین، نرخی هەیە، نرخی گەورەی خۆی هەیە».

میرائیل بە زویرییەکەوە لە بەر خۆیەوە گوتی «حەزم لەم ژیانە درۆزنە نییە... خانم کە مانای نەبوو نییەتی... حەزم لێ نەماوە».

وایگووت و چووە دەرێ.

لەو ڕۆژەوە ڕێزانی مەلەکبین تێگەیشت کە قسەکردن لەگەڵ ئەم فریشتەیەدا بێسوودە، ئەوە سەرەتای تێکچوونی تەواوەتی پەیوەندی نێوان میرائیلی فریشتە و خانم بوو.



ماردینیا فریشتەیەکی ڕۆحسوکی لێدەرچووبوو. هەڵبەت خانمی مەلەکبین بە دەستووری هەمیشەیی خۆی هەر بە ماردینیل ناویدەنا و

بانگیدەکرد، بەڵام هەر یەک لە دکتۆر و بولبولیار ڕێکەوتبوون لە سەر ئەوەی ناوێکی دونیایی تری پێببەخشن، ناوێک ئەو هەستەیان نەداتێ کە کچێکی سەر بە ڕەگەزێکی ترە. هەر یەک لە مستەفا شوکاک و هۆشەنگی بولبولیار پێکەوە هەوڵێکی زۆریاندەدا بارودۆخی ڕۆحی فریشتەکە لە نەغەدە خان داببڕن. دەرەنجامی هەوڵەکانیان وەها بوو باوەڕیان هێنا فریشتەکان دەتوانن لە ژێر هەندێک هەلومەرجی نوێدا وەک بوونەوەری سەربەخۆ ڕەفتاربکەن. دکتۆر شوکاک ڕای وابوو مرۆڤ لە جەوهەردا بوونەوەرێکی فرەدیوە، لە ناویدا مەخلوقاتی جیاواز دەژین. دەیگووت جگە لە فریشتە، گورگ، سەگ، باڵندە و چەندەها شتی دیکەش لە ناویدا نیشتەجێن، هەردەم دەیگووت «سەیرە مرۆڤ دەچێت بۆ بینینی باغی ئاژەڵان، هەر کەسێک بگریت، خۆی بۆ خۆی باغێکی گەورەی ئاژەڵانە، جانەوەری وامان تێدایە کەس لە هیچ باغێکی ئاژەڵاندا نەیدیوە»... ڕای وابوو ئەم مەخلوقاتانەی ناو مرۆڤ دەشێت پێکەوە هاریکاربن و دەشێت داببڕێن و کاریشیان بە یەک نەبێت. بولبولیار نەیدەزانی ئەوەی دکتۆر باسیدەکات هەوڵێکی تایبەتی خۆیەتی بۆ سازکردنی بارودۆخێکی دەرونی تا بتوانێت ژیانی ئەم فریشتەیە درێژبکاتەوە یاخود تیۆرییەکی زانستییە و دوای تێڕامانێکی درێژ لە مرۆڤ دکتۆر پێیگەیشتووە. ماردینیا، بە پێچەوانەی فەیلەسوفی فریشتەکانەوە، بە پێچەوانەی خانمی ماردینی خۆشییەوە، بوونەوەرێکی گەشبین بوو، لە دوای تێپەڕینی مانگێک لە چارەسەریی بەردەوام، بولبولیار سەیریکرد فریشتەکە توانایەکی تایبەتی و ناوازەی سەماکردنی هەیە. وەک فریشتەکانی دی بە ئاستەم هەڵنەدەستا و لە سەرخۆ پیاسەی نەدەکرد، بەڵکو فریشتەیەکی بزۆک و چوست و سەماکەر بوو. پێشتر کەشتیی فریشتەکان، فریشتەی وەهای نەدیبوو، لە ڕاستیدا وەک کچێکی مەست و دڵخۆش ڕەفتاریدەکرد، هەمیشە خومارێکی قووڵ لە چاویدابوو، زۆرجار کۆمەکی بە فریشتەکانی تر دەکرد هەستن،

بە دەنگێکی زۆر کزی کچانە، وەک دەنگی خانمێک لە ڕادیۆیەکی کزەوە بێت، شیعری بۆ دەخوێندنەوە، دەنگی تابلێی قووڵ و ئەودونیایی بوو. هەندێ بەیانی بە تەنها بە ناو ڕارەوەکاندا دەڕۆیشت و سەمایدەکرد، لە باغەکەدا دەیانبینی سەرقاڵی سەیرکردنی گوڵەکان بوو، سەرقاڵی سەیرکردنی درەخت بوو... هەموو شتێک سەرنجی ڕادەکێشا، هەموو شتێک ڕایدەگرت. فریشتەکەی نەغەدە وەها بوو وەک ئەوەی زۆر بە ڕزگاربوونی لەو دیوە ئینسانییەی خۆی خۆشحاڵ بێت، وەک باڵندەیەک لە زینداندا بووبێت و ئێستا ئازادبووبێت، جوڵەی باڵەکانی گەلێک نەرم و شەپۆلاوی و شاعیریانە بوو، دکتۆر و بولبولیار زۆر جار پێکەوە لە سەر لێواری حەوزی باغەکە، بە دوو کراسی سپییەوە کە ڕێزان خان بۆ هەردووکیانی کڕیبوو، دادەنیشتن و بە دوو زەردەخەنەی عاشقانە و ڕۆشن و گەورەوە سەیری ئەم فریشتە گەش و سەمازانەیان دەکرد، کە بە جووتێک باڵی سوکەوە وەک باوەشێنی دونیا بکات، هەمووانی ئەفسون کردبوو. زۆرجار دکتۆر «کە خۆی فێری شتێک لە سەماکردبوو» لە نێو درەخت و لە چیمەنەکەدا سەمای لەگەڵ ماردینیادا دەکرد، پێکەوە دەستیاندەگرت و تابلێی سەمایەکی ئارامیان پێشکەشدەکرد. سەرەتا بینەریان تەنها هۆشەنگی بولبولیار بوو، کە ئەو سەمایە هەم دڵخۆش و هەم غەمباری دەکرد، چونکە لە ناخی دڵەوە دەیویست ماردینیا تەنیا فریشتەی ئەو بێت و بەس. بەڵام تا دەهات سەماکەی دکتۆر و فریشتەکەی بینەری زۆرتری کێشدەکرد، وایلێهات هەموو ئێوارەیەک، لە کاتێکی دیاریکراودا ژمارەیەک لە فریشتە و مەلەکبینەکان بۆ سەیری ئەو دوو سەماکەرە کۆدەبوونەوە کە هەرجارەی لە سەر جۆرە ئاوازێک دەجوڵان و باڵیاندەگرت. ئاشکرابوو ماردینیا مەیلێکی ڕوونی بەلای دکتۆر شوکاکدا هەیە... ماوەیەک وەها نزیکبوون دکتۆر جورئەتیکرد و جارێک داوای پێکەوەخەوتنی لێکرد، هەروەک چۆن کاتی خۆی داوای لە نەغەدە

ماردینی دەکرد. پێشتر هیچ کەسێک لەم کەشتییەدا باسی سێکسی لەگەڵ فریشتەکاندا نەکردبوو. وای ئەگەر ئەوکات ڕێزانی مەلەکبین بە شتی وەهای دەزانی، ئەردی لە ژێر پێی دکتۆر شوکاکدا دەکردە ئاگرستان. دکتۆر خۆشی هەرگیز بە خەیاڵیدا نەهاتبوو لە مەهدائیل بپرسێت، ئاخۆ فریشتەکان دەتوانن لەگەڵ کەسدا بخەون؟. کە یەکەمجار داوای جۆرە نزیکبوونەوەیەکی وەهای لە ماردینیا کرد، وەها بوو وەک ئەو سەرسام بووبێت، یان نەزانێت ئەو باسی چی دەکات. هیچی نەگووت، وەک وەڵامی ئەو پرسیارە لای ئەو نەبێت، یان ئەو پرسیارە بە جۆرێک دلڕەقانە بێت قووڵ ترازیدیای بوونی خۆی بیربخاتەوە.

ئەو شەوە شوکاک پرسیارەکەی برد بۆ مەهدائیل، ئەو لە ژوورەکەی خۆیدا زل وەک عەنتەری زەمان لە سەر پێخەفێکی تەمیز ڕاکشابوو، بێشەرم سنگێکی رووت و توکنی بەرەڵاکردبوو، کەمێک دەستی بە سنگی خۆیدا هێناو سەیری شوکاکی کرد و پاش تۆزێک بێدەنگی، گووتی «فریشتەکان ناتوانن سێکس بکەن، چونکە بۆ مردن جیادەبنەوە، ئەو بەشەن لە مرۆڤ کە دەشێت بمرێت و کاریگەرییەکی ئەوتۆ لە سەر زیندوێتی مرۆڤ جێنەهێڵێت. شتێک لە ئینساندایە کە دەکرێت بمرێت و کەچی ژیان هەر بەردەوام بێت، فریشتە زادەی ئەو بەشەن، دەمرن و مردنیان زیانێک لە توانای ژیان نادات، ئینسان بێ فریشتەش دەتوانێت بژی... سێکس بە گۆشت و بۆن و ئارەزوو و خوێنەوە بەندە، نەوەک بە ڕۆح و خەیاڵەوە. فریشتە مەخلوقاتی ڕاستەقینە نین، ژیانیان وەک ژیانی سێبەرێکە لە مرۆڤ جیابووبێتەوە، وەک چۆن سێبەری مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ کەس بخەوێت، منیش ناتوانم، من جگە لە سێبەری مرۆڤ زیاتر هیچی دی نیم».

لەگەڵ ئەو وەڵامە رەش و ناخۆشەشدا، شوکاک بێگلەییەکی ئەوتۆ لای مەهدائیل هاتە دەرەوە، بۆ دەبێت گلەییبکات، ئەوەی دکتۆر لە

خانمی ماردینی خۆی دەستی نەکەوتبوو ئێستا فریشتەکەی بە ڕوونی پێشکەشیدەکرد... سەما و خۆشەویستی.

دکتۆر دڵشکاو دیار نەبوو، هەتا کە لە ژوورەکە چووە دەرێ، مەهدائیل بە بێزارییەوە و لەبەرخۆیەوە گووتی «چ دکتۆرێکی بێمێشکە... عەجەب گەمژەیەکە... عەجەب».

لە ماوەیەکی کەمدا ماردینیا وایلێهات هەندێک شەو بچێتە دەرەوە، لەگەڵ دکتۆر و مەهدائیلدا یان بولبولیاردا بۆ فریشتەی بیمار بگەڕێت، ماردینیا بە جۆرێک میهرەبان بوو، بە شێوەیەک غەمخۆر بوو، ئەوانیدی هەستیاندەکرد لە مەهدائیلی فریشتە زیاتر ئاسوودە و ئارامیاندەکاتەوە، مەهدائیل ئەگەرچی فریشتەیەکی دڵسۆز بوو، بەڵام شێوە و نیگاکردنی بە جۆرێک پیاوانە بوو، هەندێک فریشتەی ناسکی دەترساند. لەو نێوەندەدا بولبولیار هەستێکی نامۆ و قووڵی هەبوو کە ئەم فریشتەیەی خانمی ماردینی، هێندەی دەستکرد و داتاشینی خەیاڵی ئەو و دکتۆر شوکاکە بوونەوەرێکی ڕاستەقینە نییە، ئەو سەمایەی نێوان دکتۆر و ماردینیاشی هەر بە سەمایەکی ڕاستەقینە نەدەزانی... شتێک بوو بە بڕوای ئەو تەنیا لە سەر شانۆی خەیاڵی مەلەکبینەکان روویدەدا. چۆن دەکرێت دکتۆر بەوجۆرە بەخێرایی وەها سەمایەکی جوان فێربێت، ڕاستە دکتۆر لەشێکی جوانی هەیە، نە زۆر قەڵەوە نە لاواز، نە زۆر درێژە نە کورت، زەردەخەنەیەکی ئارامی هەیە، نیگایەک پڕە لە غەمگینییەکی گەرم، بەڵام وەک هەموو پیاوە ناسکەکانی دونیا بەدبەختە. بولبولیار دڵنیابوو ئەم سەما جوانە و ئەو ڕۆحی سەفایەی تێیدا دروستبووە دەستکردی شتێکی دیکەن کە پەیوەندی بە توانا سروشتییەکانی دکتۆرەوە نییە. ئێستا لەگەڵ هەموو عەشقی قووڵ و نهێنی و سەیریدا بۆ ئەم فریشتەیە، بۆ ئەم ژنە ئیدیالەی کە باوەڕ بە بوونی ناکات، بۆ ئەم مەخلوقە باڵدارەی کە هەموو هەوڵێکی لەگەڵ دەدات شیعر

بنوسێت، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا واتێدەگات کە ماردینیا خەونێکە و تەنیا لە سەری خۆیدا بوونی هەیە... زۆرجار کە بەرامبەری دادەنیشت و شیعری بۆ دەخوێندەوە، ئەو هەستەی هەبوو کە لە خەوندا بەرامبەر نەغەدەی ڕاستەقینە دانیشتووە و وەک سەردەمی بیمارییەکەی شیعری بۆ دەخوێنێتەوە، گومانێکی هەبوو ئەوەی دەیکات دووبارەکردنەوەی شریتی هەمان فیلمە بەڵام لە جێگایەکی نوێ و لە خەونێکی دیکەدا. زۆرجار لە دڵەوە دەیویست ئەم عەشقەی خۆی بە تەواوی ببەخشێت بە دکتۆر شوکاک، بەڵام ناتوانێت ئەوە بکات، دڵنیابوو عەشق بۆ کەسێکی هەژاری وەک ئەو هیچ کات لە سەر زەمینی خەون دوور ناکەوێتە، بەشێک لە نیشانە هەرە کوشندەکانی هەژاریی ئەوەیە کە عەشق تێیدا تەنیا لە خەوندا ڕوودەدات، خەونیش تاکە شتێکە هەژار ناتوانێت بڵێت من نیمە، پێم نەدراوە، دەمەوێت بیبەخشم. عەشق نابەخشرێت، گەر ببەخشرایە... وای گەر ببەخشرایە، ئازاری ئەوەندە زۆرە مرۆڤ ئاسان دەیبەخشی. بولبولیار چەند جارێک هەوڵیدا فریشتەکە بخاتە سەر خولیای شیعر نوسین. سەیرە بۆ فریشتەکان دەتوانن چیرۆکی ژیانێکی تر دروستبکەن و ناتوانن شیعر بنوسن؟ شیعر چییە وەها بۆ ئەم جنسە ئەستەمە؟ بۆ ئینسان تەنیا بوونەوەرە کە دەتوانێت شیعر بنوسێت؟ بۆ خودا شیعری نەنوسیوە؟ بۆ کتێبەکانی خودا بە پەخشانێکی وەها خراپ نوسراون؟ بۆ فریشتەکان دەستیان دەلەرزێت و ناتوانن بەیتێک بنێنە سەر کاغەز؟ ئەوە پرسیاری هەرە گەورەی بولبولیار بوو. کە خودا کتێب نوسە، بۆ شیعری نەگووتووە؟.

سەیر بوو، ماردینیا دەیتوانی جوان سەمابکات، دەیتوانی بۆ ژیانی خۆی و ئەوانی تر بیرکردنەوەی نوێی هەبێت، بەڵام نەیدەتوانی شیعر بنوسێت. فریشتەکە هەموو شتە جوانەکانی خانمی ماردینی بردبوو، توانای شیعر نوسین نەبێت.

شەوێک کە پێکەوە لەگەڵ مەهدائیلدا بە کوچەکانی شاردا وەک سێ غەریب تازە هاتبێتنە شارەوە، لەگەڵ عەرەبانە گەورەکەدا دەڕۆیشتن، بولبولیار ئەو پرسیارەی وروژاند کە بۆ فریشتەکان ناتوانن شیعر بنوسن. بۆ زۆر شتی تر دەتوانن، بۆ ناتوانن شاعیر بن. مەهدائیل خۆی وادەردەخست کە لە ناسینی فریشتەدا کەس لەو لێزانتر نییە، کە پرسیارەکەی بیست، جگەرەکەی دەستی فڕێدا و گوتی «تەنیا ئەوانە دەتوانن شیعر بڵێن کە بەتەمای ژیانن... دڵنیان جوانی نامرێت و دەژی. بەس تۆ خۆت بخەرە جێگای فریشتەیەک کە ژیانی هەمیشە بە داوێکی باریکەوە بەندە. کە ڕۆژانە لە لێواری مردندا پیاسەدەکات. نا مامی مامی، بوونەوەرێک کە دڵنیا نییە لە مانەوەی جوانی، ناتوانێت شیعر بنوسێت. شیعر پەیوەندی بە غرورەوە هەیە، بەو بڕوا عەجایەبەی ئینسانەوە کە کارەکانی دەژین و نەمرن. بولبولیاری عەزیز... ئەو غرورە لە ئێمەی فریشتەدا نییە. شتێک کە ئێمە بە خوداوە دەبەستێتەوە نەبوونی غرورە، ئەمە ئەگەر بە وردی ماهییەتی خودا بەوجۆرە قەبووڵبکەین کە ئاینەکان وێنەکەی بڵاودەکەنەوە، خوداش بەبڕوای من وەک ئێمەی فریشتە غروری نییە. خودا کە ئەم گەردونە ناکۆتایەی دروستکردوە، دادەبەزێت و قالۆنچەیەکی بێسوودیش دروستدەکات، ئەوە ئەو پەڕی جوانییە کە بشێت لەگەردوندا هەبێت، ئەوپەڕی سادەیی و خۆ بە گەورە نەبینینە. بیهێنە پێشچاوت خودایەک بەو گەورەییە، بەردەوام ڕۆژانە مشک دروستدەکات، کێچ دروستدەکات، بۆق دروستدەکات، کە مرۆڤ هەتا حەز بە بینینیشان ناکات. نا خودا ئەو سیفەتەی خۆی بە مرۆڤ نەبەخشیوە کە بوونەوەرێکی لوتبەرز و عاشقە ئەبەدییەتە. شیعر دواجار لە پێناوی ئەبەدییەتدا دەنوسرێت، بۆ ئەوەیە بمێنێتەوە. بەڵام ئەبەدییەت خورافەتێکە مرۆڤ دروستیکردوە. شتێکە ئێمەی فریشتە باوەڕمان پێی نییە... ئێمە دەزانین مرۆڤ تێپەڕە، ئێمە تێپەڕین، جوانی

و پاکیش ڕاگوزەر و کاتین. مامی مامی ئێمەی مەعشەری مەلایکەت کارەکەمان لە ئێستادایە، هەموو شتێکمان بۆ ئێستایە، داهاتووی دوور... زۆر دوور... بایەخێکی بۆ ئێمە نییە. هەڵگرتنی شت بۆ ئەبەدییەت، درۆیەکی گەورەی ئینسانە. شیعر درێژکراوەی هەستی خەزێنەخستنە لەم حەیوانە عەجایەبەدا کە ناوی مرۆڤە. جانەوەرەکانی تر تەنیا شتی بچوک، خواردنی کەم خەزێنەدەکەن... گرفتی ئێوەی ئادەمی گەنجینە خستنە، هەموو شت خەزێنە دەکەن، کتێب، مۆزەخانە، باغچە، هەموو دەرکەوتەی توانای خەزێنەکردنە لە ئێوەی نەخۆشدا، ئێوە شیعریش وەک گەنجینەیەکی ئەبەدی بۆ خەزێنەکردنی جوانی تەماشادەکەن، وەک چۆن چاکە بۆ ڕۆژی قیامەت خەزێنەدەکەن، وەک چۆن بۆ جەهەنەم خراپە کۆدەکەنەوە. بەڵام من بزانم ئەو گەنجینە گەورەیەی لە خەیاڵی ئێوەی بەنیئادەمدا هەیە، نە لە ئاسمانی خودا و نە لەسروشتیشدا نییە... خوداش هیچ کۆناکاتەوە، گەر خودا شتی کۆبکردایەتەوە مرۆڤ هەرگیز نەدەمرد، ئێوە جاوید دەبوون، بەڵام بەوەدا خودا هیچ کۆناکاتەوە مرۆڤ بوونەوەرێکی کاتی و ڕاگوزەرە. مامی مامی ئەوە تەنیا مرۆڤە ئەو دەردی گرتووە، ئێوە هەر کۆدەکەنەوە و کۆدەکەنەوە و کۆدەکەنەوە... بەڵام ئێمەی مەلەک نازانین جوانی کۆبکەینەوە، بەڵکو تەنیا لە ناویدا دەژین... هەموو مەخلوقاتی خودا دەژین، بەس ئێوە، ئێوە تادەمرن دەڵێن، ئەمڕۆ نا سبەی دەستدەکەین بە ژیان. تەنیا مرۆڤ دەتوانێت شیعر بڕی، چونکە مرۆڤ تاکە مەخلوقێکە کە بە ڕاستی ناتوانێت بژی».

بەڵام ماردینیای ناسک، کە دەنگیشی لە دەنگی مرۆڤی ئەم سەرزەمینە ناحەزە نەدەچوو. گووتی «نا مەهدائیل... جگە لەوانەش فریشتە بۆیە نانوسێت، چونکە شیعر پێویستی بەدەرونێکی ناکۆک و پڕ گرێ و جەنگ هەیە. شیعر شەڕی ناوخۆی دەرونە. جەنگێکی گەورەیە

تێیدا ڕۆح دابەش دەبێت بۆ سەر دوو بەرەی دوژمن... شیعر لە ئیشی شەیتان و فریشتەیە پێکەوە، بە تەنیا بە ئێمە نانوسرێت. من دڵنیام نوسینی شیعر پێویستی بە کۆمەکی شەیتان هەیە، بێ کۆمەکی شەیتان نوسینی شیعر ئەستەمە».

بولبولیار بیریکردەوە کە خانمی ماردینی ئێستاش هەر شیعر دەنوسێت، چەند ڕۆژێک پێشتر قەسیدەیەکی نوێی لە گۆڤارێکی بەغداد دا دەرچوو بوو. لە خۆی پرسی ئەی چۆن ماردینی دەتوانێت هەر بەردەوام بێت. بە سەرسامییەوە پرسی «بەڵام خانمی ئێوە، ماردینیای ئازیز، مەبەستم خاتوو نەغەدە ماردینییە کە ئێوە فریشتەی ئەوانن، هێشتا دەنوسێت... دوای ترازانی ئێوەش هەر دەنوسێت». ماردینیا بە خەفەتێکەوە گووتی «شیعرەکانی ئێستا هەر فۆرمی شیعریان هەیە. لە ناو شاعیردا شەیتانێک هەیە کە هەر دەیخاتە سەر وەسواسی نوسین، دەڵێت بنوسە، بنوسە... بێئەوەی بۆی گرنگ بێت ڕۆحی ئامادەیە یان نا... شەیتانێک حەزدەکات شاعیر ببینێت کە لە ئاسمانەوە بەردەبێتەوە و وەک باڵندەیەکی تێکشکاو دەکەوێتە سەر زەوی... بەڵام شیعر ، شیعری ڕاستەقینە شەترەنجی شەیتان و فریشتەیە. گەر یەکێک لەو دووانە ڕۆیشتن، شاعیر دەبێتە باڵندەیەکی یەک باڵ، شەل، یەک چاو، یەک دەست».

ماردینیا بە جۆرێکی وەها ناسک وشەی شەترەنج یان شەیتان یان شەلی لە زار دەهاتەدەرێ. دەیتوانی هەر پیاوێکی دونیا بەو وشانە گیرۆدەبکات. هەندێجار هەموو جوانی مرۆڤ لە شێوەی گووتنی وشەیەکدا کۆدەبێتەوە، بەس جوانی ماردینیا بە تایبەت لە ساتی گووتنی ئەو وشانەدا دەردەکەوت کە پیتی «ش» یان تێدایە، شێوەی جوڵاندنی لێو و دەرهاتنی دەنگ و نیگاکردنی لەگەڵ ئەو وشانەدا جوانییەکی تێدابوو لە سەروو خۆگریی بوونەوەرێکی لاواز و هەناسەکێشی وەک مرۆڤەوە بوو.

ئەو شەوە کە بولبولیار گەڕایەوە بۆ ماڵێ، تەنیا یەک شت لە خەیاڵیدا بوو، مرۆڤ خاوەنی شتێکی گەورەیە کە هیچ بوونەوەرێکی تر ناتوانێت خاوەنی بێت، هیچ کەس نە لە سەر ئەرد و نە لە مەلەکوت... شیعر. لە ساتێکدا وەک بروسکە لێیبدات هەستیکرد کە شاعیر لە فریشتە گرنگترە، مەهدائیل لە سەر هەقە، شیعر گەنجینەی هەموو جوانییەکانە، هەستیکرد ئەو بە هەڵە کاردەکات، دەبێت دیسانەوە ڕابکات و بچێت ئەو شاعیرەی ناو خانمی ماردینی ڕزگاربکات، ئەو شاعیرەی کە پەیوەندییەکی بەم فریشتەیەوە نییە، بیریکردەوە کە ڕزگارکردنی شاعیرەکەی ناو مرۆڤیش بە ئەندازەی ڕزگارکردنی فریشتەکەی ناخی گرنگە. وەک ترسێکی بێسنوور گرتبێتی، بە پەرۆشەوە چووەوە سەر ئەو شیعرە نوێیەی خانمی ماردینی بە ناونیشانی «من بەبێ هەموو ئەوانیدی». شیعرێک بوو، لە وشەی جوان دروستبووبوو، بەس وەک جاران بیرۆکەی قووڵی تێدانەبوو، چەندین جار شیعرەکەی لەمسەر بۆ ئەوسەر خوێندەوە. هەستی بە ونبوونی شتێک دەکرد کە نەیدەزانی چییە، شیعری خراپ هەمیشە شتێکی کەمە کە هیچ کەسێک نازانێت چییە، شیعری باشیش، بە پێچەوانەوە، لەپاڵ هەموو شتێکدا، ئەو شتەشی کەم نییە کە دیسان کەس نازانێت چییە. تا بەیانی سەد جار ئەو شیعرەی خوێندەوە... هەرجارە و زیاتر هەستی بە ونبوونی ئەو هێزە نهێنییە دەکرد. وەک مرۆڤێک هەموو شتێکی تەواو بێت، هەتا ڕۆحیشی تێدا بێت، بشجوڵێت، بەڵام لە چاویدا ئەو بریسکەیە ونبێت کە وادەکات تۆ هەستبکەیت زیندووە.

دوای چەندەها ساڵ، ئێستا دەگەڕایەوە بۆ سەر دیوانەکەی بۆدلێر، بۆ سەر گوڵە بەدەکانی ئەو، لەوێدا لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە و دەگەڕا... دەگەڕا... تادووبارە ئەو شیعرەی دەدۆزییەوە «پەترۆس». شیعرەکەی دەخوێندەوە... وەک تەزوویەکی توند بە جەستەیدا بڕوات، شتێکی نهێنی

ڕایدەتەکاند، وەک ئەوەی گومان لە هەقیقەتی خۆی بکات، تێنەگات چی هێزێکی نهێنی لە ناو ئەودا دەستبەکارە، دەوەستا و سەرسامانە ئاوڕی لە دواوەوە دەدایەوە... لەو ڕۆژەی کە یەکەمجار ماردینی لە زانکۆ شیعری خوێندەوە و ئەم وەها نیگایکرد، بێئەوەی بزانێت، بێئەوەی هیچ شتێک لەو خواستە تێبگات، ئەم قەسیدەیەی بۆ برد... پەترۆس... پەترۆسی شارل بۆدلێر... وەک ئەوەی بزانێت کۆتایی هەموو ئەم سەفەرە بە کوێ دەگات.

سەرلەنوێ دانیشت و دووبارە شیعرەکەی خوێندەوە و بە دەستی خۆی نوسییەوە و خستییەوە ناو نامەیەکەوە و نایە گیرفانی چاکەتەکەیەوە. ئەوە دواهەمین جار نابێت کە قەسیدەی پەترۆسی شارل بۆدلێر بۆ خانم دەنوسێتەوە.

***

لەو دە ساڵەی ڕابوردوودا، ئەوا ماردینی چەند جارێک خوازبێنیکەری بۆ هات. بەڵام بەوەدا هەمیشە لە ژێر زەبری خولیای ئەو ماچەدا دەژیا... ماچێکی گەورە لە لێوی مێردی جارانی خوشکەکەی، نەیدەتوانی شوویکات. لەو دەساڵەدا هیچ شەوێک نەبووە چاو لێک بنێت و بیری لای ئەو ماچە نەبێت. هەندێک کەس هەن خولیایەک دەیانکوژێت، شتێک دەچێتە خەیاڵیانەوە و نایەتەدەرێ، لە تەمەنی درێژی خۆمدا سەرنجم داوە ئافرەت پتر ئەو جۆرە هەست و خولیا کوشندانە داگیریاندەکات. زۆرجار کچێک دەبینین شووناکات، خوازبێنیکەر دێن و دەڕۆن و ئەو خەیاڵی لای کەس نییە... زۆرجار ئەو بێخەیاڵییە، هێندەش بێخەیاڵی نییە... ئەو بێباکییە قایمییەکی ناموس و پاکییەکی حەنبەلییانەی داوێنی لە پشت نییە، وەک جارێک خانمی مەلەکبین گووتبووی، لەوانەیە هۆکەی «عیفەت بێت، بەڵام عیفەتێکی شەیتانی». زاراوەی عیفەتی شەیتانی بۆ

مـن شـتێکی نـوێ بـوو، عیفـەت لـە کولتـووری ئێمـەدا هەمیشـە سیفەتی داوێنپـاک و لـە خواترسـان بـووە. بـەڵام عیفەتـی شـەیتانی... هەرگیـز نەمدەزانی عیفەتـی شـەیتانی هەیە؟. بەڵام کە چیرۆکی ئـەوام بـە تـەواوی بیسـت، شـتێکم لـەو مانایـە بـۆ ئاشـکرابوو. عیفەتـی ئـەوا و شـوونەکردنی، هیـچ شتێکی لـە پشـت نەبوو خولیـای ئـەو ماچـە نەبێت. دیـارە هـەر یـەک لـە ئێمـە کـە خەیاڵمـان هـەژارە و شـتێک لـە نهێنـی ڕۆحـی مـرۆڤ نازانیـن لێـرەدا یەکسـەر دەڵێیـن، ئەهـا کـە خانـم وا هێنـدە پەرێشـان بـووە، کـە ژیانـی لـە سـەر وەهـا شـتێکی بچوک و بێمانـا وەسـتاوە، چـی دەبـوو بچێتـە بەردەم دکتـۆر و بڵێـت: ئـەوە حـاڵ و حیکایەتـی منـە، لێگـەڕێ جارێـک بـە کامـی دڵ لێـو بنێمـە سـەر لێـوت و دوایـی تـەواو نـە تـۆ باسـیدەکەیت و نـە مـن. هەمـوو دڵنیابوویـن دکتـۆر شـوکاک، بـە سەرسـامییەوە سـەیریدەکرد و دەیگـووت ئـەوا گـەر دەردی تـۆ بـەم ماچـە دەرمـان دەبێـت، وەرە عەزیـزم، چەنـد دەتوانیـت، چەنـد دەتەوێـت، چەنـد جـار، لـە چەنـد کاتـدا، لـە سـەر یـەک یـان بـە جیاجیـا، لـە یـەک شـوێن یـان لـە شـوێنی جیـاوازدا، بەوجـۆرەی تـۆ مەبەسـتتە، مـن قینـم نایـەت و خۆشیشـم لێدێـت. هەمـوو دەمانزانـی دکتـۆر گەرچـی لەخەسـتەخانە لای دکتۆرەکانـی تـر بەتایبـەت لای دکتـۆرە ژن و سیسـتەرەکان وەک وشـک و بێمـەزە دیاربـوو، بـەڵام لـە ژێـر ئـەو توێـژە غەمگیـن و تێکشـکاوەوە کـە ساڵانێک بـوو لـە سـەر ڕوخسـاری بـوو، لـە ژێـر ئـەو نیگـا بێـزارەوە کوڕێکـی شـاد هەبـوو، کوڕێکـی پـڕ لـە ژیـان، کـراوە و ناسـک، کـە گـەر دونیـا زوڵمـی لـێ نەکردبایـە و بکەوتایـە بەردەسـت هـەر خانمێکـی تـر، جیـا لـەو نەغـەدە بێڕەحمـە، دەیزانـی چـۆن بیپارێزێـت و نەیشـکێنێت و ڕێـزی بگرێـت. بـەڵام ئـەواش لـەوە غروردارتـر بـوو ئاسـان کاری وەهـا بـکات، هەمـوو دەزانیـن مـرۆڤ بوونەوەرێکـی مەغـرورە، مەهدائیـل لـەوەدا لـە سـەر هـەق بـوو، مـن لـەو خاڵـەدا تـەواو قسـەکانی دەسـەلمێنم، مـرۆڤ دەکرێـت تێبـگات کـە ئـەم مەخلوقـە بچوکـە زۆر شتـی

لە چ سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە، لەوانەیە بزانین شەڕانگیزی یاخود خەیاڵ یان دینی لە کوێوە هێناوە، بەڵام زۆر ئەستەمە بزانین ئەم غرورە کوشندە و بێبنە چییە لە ناو ئەم بوونەوەرەدا، ئەوەی لە کوێوە هێناوە. مرۆڤ بوونەوەرێکە هەندێجار بە یەک ڕستە کە بە ڕۆشنی لە زاری بێتەدەرێ دەبێتە بوونەوەرێکی بەختەوەر، بەڵام ناتوانێت ئەو ڕستەیە بدرکێنێت. هیچ مرۆڤێک نییە مەغرور و شکۆبار نەبێت، هەموو مرۆڤەکانی دونیا شکۆبارن، لە خۆباییـن، هەتا یەک مرۆڤیش نییە لە سەر ئەم ئەستێرەیە مەغرور نەبێت، هێند هەیە لەو جێگایانەدا کە هەڕەشەی مان و نەمان دێتە پێشێ، کەمێک دەستبەرداری ئەو غرورە دەبین و دەیگۆڕین بۆ ملکەچی. بەشی هەرە زۆری ئەو غرورەش لەوەوە نایەت کە مرۆڤ کەرامەتی خۆی پێدەپارێزێت، بەڵکو لەوەوە دێت کە خۆی و ئەوانی تری پێ وێراندەکات. ئەواش یەکێک بوو لە ئێمە، لە مرۆڤە شکۆبار ئەوەک شکۆدارەکان. غرور ئەوەندە ڕێگای پێدەدا هەندێجار بچێتە بیمارستان و وابکات وەک ئەوەی بەڕێکەوت دکتۆر مستەفا شوکاکی بینیبێت، ڕێکەوت، ڕێکەوتی سەد دەر سەد. ئەوکات دکتۆر شوکاک هەندێک ڕۆژ لە بەر زۆری ژمارەی بیمارەکانی جەنگ کە بیمارستانی سەربازیی نیوەشی نەدەکێشان، هەر لە بیمارستانی گشتی دەوامیدەکرد و لەگەڵ لیژنەیەک لە پزیشکانی ئەوێدا هاریکاری زامدارانی دەکرد. کە بەرەکانی جەنگ گەرمبایە، ئەوا دەیزانی دکتۆر لە بیمارستانی گشتی دەبێت و گەر بڕوات دەشێت بیبینێت. باوکی هەمیشە بەهانەی یەکەمی بوو، بەڵام بەردەوام هەوڵی دەدا ژمارەی ئەو کچە دکتۆر و سستەرانەش کە دەیانناسێت زۆرتر و زۆرتریان بکات، هەر نەخۆشێک گەر ناسیاوێکی دووریش بایە لە خەستەخانە بخەوتایە چەند جارێک سەریدەدا، بێئەوەی هیچ کەس هۆی نهێنی و ڕاستەقینەی پشت ئەو سەردانانەی بزانێت. گەر لە چەندجاردا جارێک ڕێکەوتی دکتۆری

بکردبایە، بەختەوەر بوو. بە دەنگێکی پڕ شادیی دەیگووت «وای دکتۆر، خۆشحاڵم کە دەتبینم... خۆشحاڵم. وای چ ڕێکەوتێکە... وای». بەڵام غروری ڕێگای پێنەدەدا زیاتر بڕوات. هەر کاتێک دوای چاک و چۆنییەکی لەوجۆرە لە دکتۆر جیادەبووەوە، غەمێکی قورس دایدەگرت، بە درێژایی ئەو کاتەی کە دکتۆر شوکاکی دەبینی زیاد لە هەر جێگایەکی دی سەیری لێوی دەکرد، دکتۆر جگە لە لێوی هەم چاوی، هەم قژی، هەم پێستی جوان بوون، بەڵام ئەوا بیمارانە عاشقی لێوی بووبوو. لێوی جوانترین جێگای دکتۆر بوو بۆی، ئاه ئەگەر بۆی بکرابایە هەمیشە لە هەموو جێگایەکدا پەلاماریدەدا، پەلاماری لێوی، ئەو چیتر مێردی خوشکەکەی نییە... چیتر مێردی ئەو نییە، تا هەست بە ئازاری ویژدان بکات، ئێستا بەس بەشی ئەوە توانا و تاقەتی هەیە غەم بۆ خۆی بخوات، نەوەک بیر لەو خوشکەی بکاتەوە کە خودا لەبری ئەو خوشکە بەد و خۆپەرستە، دەردێکی پێ ببەخشیایە باشتر بوو. خوشکەکەی چیتر خوشکی نییە، چیتر کەسیان نایانەوێت بیبینن، باوکی بە هۆیەوە بەردەوام غەمگینە... لە دڵی خۆیدا بەردەوام بە بێزارییە دەیگووت «خوا هەزار خوشکی وابباتەوە بۆ خۆی». دکتۆر شوکاک هەندێجار سەیری لەوەدەهات چۆن وا زوو زوو ڕێکەوتی ئەوا دەکات، بەڵام بۆ نا، ئەویش کچی دکتۆر جەلال ماردینییە، کچی ئەوە... ڕێگای هەردەکەوێتە لای باوکی... نا هیچ پیاوێک ئەوەندە عاقڵ نییە خەیاڵی بۆ شتی وا بچێت. پیاوان گەرچی مەغرورترین و درۆزنترین بوونەوەری گەردونن، بەڵام لەم مەسەلەیەدا بەوجۆرە وریا نین، دەبێت بچیتە بەردەمیان و پێیانبڵێیت «هێی گەمژە، خۆشمدەوێیت، تێناگەیت» بەس ئەوکاتە تێدەگەن. پێدەچێت سیستمی غەریزیمان وا دروستبووبێت هەر بە دوای نێچیردا بگەڕێین، هەر لە خەیاڵی ئەوەداین کە چیمان دەوێت، کەمجار ئەوەمان لە خەیاڵدایە کە ئێمەش مەخلوقاتێکین دەخورێین، دەشێت

بەدەردی یەکێک بخۆین، دەشێت خۆشمان نێچیری کەسێک بین.

ڕۆژێک دکتۆر شوکاک ئەو خەیاڵە گەمژانەیە هات بە سەریدا و بڕیاریدا بزانێت ئاخۆ ئەوا دەتوانێت خوشکەکەی ببینێت یان نا. دەبێت بڵێم تەنیا پیاوێکی دڵساف و کاڵفامی وەک دکتۆر شتی وای بەخەیاڵدا دێت، چونکە ئەوەی مەلەکبین نەبێت فریشتە نابینێت، ئەوە ڕاستییەکە گەمژەش دەیزانێت، دوای ئەوە هەموو مەلەکبینێک ناتوانێت هەموو فریشتەیەک ببینێت، کەمن ئەوانەی وەک بولبولیار یان دکتۆر شوکاک فریشتەکەی ناخیان وەها چاوتیژ و ڕۆشنبینن، بتوانن چاوی مرۆڤە سادە و کوێر و هیچ نەبینەکەی ناخیان وەلاوە نێن و خۆیان ببنە سەردار. دکتۆر، ڕۆژێک ئەوای لە بەردەم دەرگای ژوورەکەی دکتۆر جەلالدا بینی و تکایکرد بۆ کارێکی تایبەتی سبەی لە ژووری خۆی لە خەستەخانە ببینێت، گووتی کارێکی بچوکە، بەس چەند ساتێکی کورت دەبات، پرسیارێکی سادەیە کە دەشێت بۆ ئەو بێمانا بێت، بەس ئەم مەراقە لە دڵیدا و دەبێت بپرسێت. ئەوە ئەو دەرفەتە گەورەیە بوو کە ئەوا چاوەڕوانی دەکرد، ئەو هەلەبوو کە دەبوو خۆی دروستیبکات، ئێستا ڕێکەوت و بەخت بە پوختی دەیاننایە بەردەمی. دەبوو لەو دەرفەتەدا هەرچییەکی کردوە خۆی لە دەست ئەو مۆتەکە ترسناکە ئازادبکات. ئیدی دەبێت ئەو ماچە بکات و ڕزگاری بێت لە دەردی، دەیەوێت بژی، شوویکات، بیر لە پاشەڕۆژی خۆی بکاتەوە.

بۆ ڕۆژی دواتر، موستەفا شوکاک، لە ڤیاتە بچوک و پوشاو و ناتەمیزەکەی خۆیدا ماردینیای گەیاندە بیمارستانی گشتی، هەر کەس دکتۆری بدیایە لەگەڵ ئەم فریشتەیەدا کە پاڵتۆیەکی ڕەشی لەبەرکردبوو و باڵەکانی لە پشتەوە وەک چوری شیر سپی بوون، سەیری لێدەهات، چونکە شوکاک لە بەردەم باڵاو بۆشناخی و باریکی فریشتەکەدا زۆر بچوک دەینواند، جگە لەوە فریشتەکە بە ناسکییەکی وەهاوە سەیری

دەوروبەری دەکرد، چاوی ڕۆشنایییەکی وەها تیژی تێدابوو، هەرکەس سەرنجی بدایە، دەیزانی شتێکی دوور و نەگیراوی تێدایە لە ئێمە ناچێت. کە گەیشتنە ژووری دکتۆر، ماردینیا لە سەر کورسییەکی بچوک لە کەنارێکەوە دانیشت. دیار بوو دڵی بەم شوێنە ئاشنایە، بە حەزێکەوە سەیری هەموو شتەکانی دەکرد، حەزی کەسێک دوای بیست ساڵ لە ناکاو ببینەوە جێگای منداڵی خۆی. ماردینیا وەها دیاربوو، وەک جگە لە سۆز و یاد و ئەڤین، هیچ شتێکی تر کێشی نەکات، شتێکی لەو ڕۆحە شۆڕشگێرە تێدانەبوو کە لە خانمی ماردینیدا هەیە. کە ئەوای خوشکی هاتە ژوورێ، پڕ بەدڵ ئارەزووی بوو باوەشی پێدابکات. شوکاک لە مەهدائیلەوە بیستبووی کە فریشتەکان هەموو یادەوەری خاوەنەکەیان لەگەڵ خۆیاندا دەگێڕن. بەڵام ئەوا کەمێک شڵەژاو و پەشۆکاو بوو، هیچ شتێکی نەبینی، هەستی بەبوونی هیچ فریشتەیەک لە ژوورەکەدا نەکرد. بە جۆرێک پەشۆکاو بوو، نەیدەزانی دەست و قاچی چۆن دابنێت، ئێجگار جوان خۆی گۆڕیبوو، هەموو کەس دەیزانی بە ئەندازەی نەغەدە جوان نییە، بەڵام گەر وازت لە بەراورد بهێنایە، ئەویش شۆخێک بوو بۆ خۆی. دیاربوو هەموو شتێکی بەتایبەت هەڵبژاردوە، تەنورە تەسکەکەی، تیشێرتە ئەرخەوانییەکەی، ڕەفتە پەمەییە تەنکەکەی ملی، سەعاتە سپییە نازگەکەی، پێڵاوە سپییەکانی، سووراوە مەیلە و مۆرەکەی، هەتا قژیشی و بەتایبەت بۆ ئەو بۆنەیە، وەها ڕەنگێکی کایی لێدابوو، کەسێک زووتر نەیدیبایە دەیگووت هەر لە زگی دایکییەوە بەم ڕەنگەوە هاتۆتە دونیا. ئەوا دوای کەمێک دانیشتن، وەک ئەوەی سەری برینێکی کۆن هەڵبداتەوە تا شتێکی نوێی لێدەربهێنێت گووتی «ئاە دکتۆر، ئەو خوشکە شێتەم، ئەو خوشکە شێتەم چۆن توانی وابکات. ئێستاش من تێناگەم... ئێستاش تێناگەم، ئەوە لەو شتانەیە چەند ساڵ بێت و بڕوات، چەند کات تێپەڕێت

و چیرۆکەکەی کۆن بێت، مرۆڤ لە بیری ناکات». دکتۆر بەردەوام سەیریدەکرد، دڵنیابوو هیچ هەستێکی بەبوونی ئەم فریشتە بێدەنگە نییە، کە بە شتێک لە غەمگینی و ترسەوە سەیری ئەوای دەکرد. کاتی خۆشی دکتۆر ئەوای وەک کچێکی عاقڵتر و کراوەتر دەبینی لە ژنەکەی کە زۆرجار دەیگووت «تەنیا منداڵێکە». ئێستا بۆی ئەو عەترەی کە ئەوا دابووی لە خۆی، ئەو جلە سێکسییە تەسکانەی، هالاوی ئەو گۆشتە ناسکەی کە لە بنەوەڕا ژوورەکەی بە بارگەیەکی نهێنی پڕکردبوو، دکتۆری دەجوڵاند... ئەوەی ئەوا سی ساڵی تێپەڕاندبوو، هیچ شتێکی تێدا نەگۆڕیبوو، هەمیشە لەشێکی تینوو و هاری هەبوو، کە چەند بیویستبایە نەدەشاردرایەوە. دکتۆر شوکاک بێئەوەی بزانێت بۆ، دوای ماوەیەکی درێژ هەستیکرد ئەویش مرۆڤە، ئارەزوویەکی بەد و چەپێنراوی هەیە، پڕە لە ئارەزوویەک کە ساڵ دوای ساڵ دەمێنێتەوە و تێرنابێت، هەستیکرد پێویستی بە مرۆڤێک هەیە وەک خۆی پڕبێت لە ئارەزوو، پڕ بێت لە توانای هەڵەکردن، پڕبێت لە توانای ترسناکی دەرچوون لە خۆی. بۆ یەکەمجار هەستیکرد ئەوەی ناتوانێت لەگەڵ ئەم فریشتەیەدا بخەوێت، دەیکوژێت. ئەو ماوەیە لەگەڵ ماردینیادا وەک بە هەشت بوو بۆی، بەس ئێستا کە ئەم بۆنە ژنانەیە دەچوو بە سەریدا، وەک ئەوەبوو خرابێتە بەر ئەشکەنجەیەکی گەورەوە، لە قووڵایی دڵدا بە خۆی گووت دکتۆر... دکتۆر تۆ چیتر پێویستت بە فریشتە نییە، تۆ پێویستت بە ژنێکە لەگەڵیدا بخەویت. ئەو دەنگە وای لێدەکرد قووڵتر بۆنی ئەو عەترەی ئەوا هەڵمژێت... هەرگیز ئەوای بەوجۆرە نەیبینیبوو، لە ناکاو ئارەزوویەکی نادیار دەیجوڵاند دەست لەم ژنە ڕاستەقینەیە بدات، لێی نزیک ببێتەوە. ئەوا گەر بە هەموو ئەو هەستانەی بزانیبایە لەوانە بوو لە خۆشیدا بفڕێت، چ باشە ژنان نازانن ئێمەی پیاو چ هەستێکمان بەرامبەریان هەیە، چ باشە... ئەوا بیزانیبایە لەوانە بوو

وەک ماردینیا دوو باڵـی لێبڕوێـت، دوو باڵـی شـەیتانی، وەک دکتـۆر شوکاک دواتـر بـە پێکەنینـەوە دەیگـووت. دکتـۆر شـوکاک چەنـد وەخـت بـوو ئـەو هەمـوو کچـە جـوان و خانمـە عەیارانـەی لـە بیمارسـتان دەبینـی و هەسـتی بـۆ کـەس نەدەجـولا، ئێسـتا لـە نـاکاو شـەپۆلێکی تونـدی ئـارەزوو دەیبـرد، هەسـتیدەکرد هەوەسـێکی بەهێـز بـەرەو ئـەم کچـە کێشـیدەکات... هۆکـەی چـی بـوو؟ ئەوەیـە کـە خوشـکی ئـەم فریشـتە بێدەنـگ و ناسـکەیە کـە بـە دوو چـاوی گەشـەوە سـەیریاندەکات؟ نەیدەزانـی.

نـەوا بێئـاگا لـە هەمـوو شـتێک، بێئـاگا لـەوەی دکتـۆر لـە چ حاڵێکدایـە، گووتـی «نەغـەدەی خوشـکم دڵـی هەموومانـی شـکاند، بەتایبـەت بـەو شـووکردنەی... بـەو شـووکردنەی دواجـاری، ئێسـتاش بـەوەی منداڵـە کوێـرە بەسـتەزمانەکەی بەوجـۆرە فڕێـداوە، جارێکـی تـر دڵـی باوکمـی شـکاندەوە، ئێمـە ویسـتمان خۆمـان بەخێوبیکەیـن، بـەڵام ڕەشمارای مێـردی نەیهێشـت. پێشـتر هیـچ کـەس لـە بنەماڵـەی ماردینـی کاری وای نەکـردوە، مـن دەزانـم کـە پێشـتر کـەس وای نەکـردوە. ئـەوەی ژنێکـی شـاعیر و جوانـە هەقـی ئـەوەی نـاداتـێ، بەوجـۆرە پـێ بـە سـەر دڵـی خەڵکدا بنێـت... نـا... هەقـی ئـەوەی نـاداتـێ».

دکتـۆر نەیدەزانـی بڵێـت چـی، ئێسـتا دڵنیابـوو نـەوا فریشـتەکەی خوشـکی نابینێـت. بـەس دکتـۆر پرسـیارێکی لـە خەیـاڵ بـوو دەبێـت بیـکات. تۆزێـک وەسـتا و گووتـی «نـەوا خـان، مـن تـۆم بـۆ یـەک پرسـیار بانگکـرد. یـەک پرسـیار، تـۆ بـاوەڕت بـە بوونـی فریشـتە هەیـە؟». نـەوا بـەردەوام سـەیری لێـوی دکتـۆری دەکـرد، ئێسـتا لێـوی لـە هـەر کـات جوانتـر بـوو لای. نـەوا پرسـیارەکەی وەک جۆرێـک لـە لاقرتـی و گاڵتەپێکـردن حیسـابکرد، بـەڵام بێئـەوەی زویـر بێـت یـان تووڕەبێـت، شـوێنی جانتاکـەی گـۆڕی و گووتـی «بیـرم لـێ نەکردۆتـەوە... هەبـن یـان نەبـن بـەدەردی چـی دەخـۆن؟ فریشـتەش وەک شـەیتان وەهـان، هـەر کـات تـۆ بتەوێـت بـە هاناتـەوە نایـەن.

من لە ژیانمدا داوای کۆمەکم لە شەیتانیش کردبێت نەیداوە پێم. هەموو فریشتەی دونیا دەنگێک حەبی سەرئێشە ناهێنن کە تۆ دەیدەیتە نەخۆشێک». دکتۆر لەو کاتەدا لە پشت مێزەکەی خۆیەوە هەستا، ئەوا بێدەنگ تەماشایدەکرد... شوکاک وەک باسی بابەتێکی سادە و ڕۆژانە بکات گووتی «مرۆڤ دوو جۆرن، هەندێکیان مەلەکبینن، کە ئەوە کەمایەتییەکی زۆر کەمن، هەندێکیان مەلەکبین نین کە ئەوە زۆرینەی دونیان، ویستم بزانم تۆ لە کامیانیت». پرسیارێک بوو دەیویست لە ڕێگایەوە لەو دوودڵی و ڕاڕاییە کتوپڕەی خۆی دەرچێت. ئەوا بۆ فرسەتێکی وادەگەڕا تا شتێکی مانادار بڵێت. «هەڵبەت من مەلەکبینم، دکتۆر... مەلەکبینم... بۆ نا... ئەوە نییە تۆ دەبینم». هەموو ئەو شتەی بە دەنگێکی وەها عەیارانە گووت دکتۆری بەستەزمانی ڕاچڵەکاند. دکتۆر ویستی شتێک بڵێ، بەڵام ئەوا دڵنیاتر لە هەر کاتێکی تر گووتی «هیچ مەڵێ، دکتۆر... هیچ مەڵێ... من نەغەدە نیم، من لەو خوشکە بێشەرمەم ناچم، وابزانم چونکە شاعیرم ئیتر هەقی هەموو جۆرە کارێکی خراپم هەیە. لێت تێک نەچێت، من هەمیشە تۆم وەک فریشتە بینیوە. دەتوانم ماچیشت بکەم گەر بتەوێت». دوا ڕستەی وەها خێرا، سەیر، هێمن گووت، دکتۆر تێگەیشت هیچ هەستێکی گاڵتەکردنی لە پشت نییە.

بێئەوەی هیچ بڵێت، بێئەوەی بزانێت چۆن، لە ناکاو هەستی بە لێوانی ئەوا ماردینی کرد لە سەر لێوی خۆی. لێوێکی تینوو و گەرم و تەڕ، شتەکان وەها خێرا و سەیربوون، نەیدەزانی ئەم لێوی بۆ ئەوا بردوە یاخود ئەو، بەس دڵنیابوو ماچێکی گەرم و درێژ بوو، بۆنی ژنانەی ئەو وەها ڕاکێش و خۆش بوو، وایکرد لەزەتێکی زۆر بەرێت، ماوەیەک وەک شێت دەمی نایە نێو دەمی و بە هەموو قووڵی زمانی لە نێوزاریدا جوڵاند، گەر کەسێک بیدیبانایە، نەیدەزانی تاسەی کامیان بەهێزترە، ئایا

ئەم لە ئەوا زیاتر پێوەی نووساوە، یان ئەوا زیاتر بەمەوە نووساوە. چەندین ساڵ بوو ئەوە یەکەمین ماچی بوو، لە دوای نەغەدەوە ژنی دیکەی نەبینیبوو، لە بەرئەوە ئارەزوویەکی شاردراوە و قووڵ و ئامادە و توندی تێدابوو، بە جۆرێک بوونی ماردینیای فەرامۆشکرد. دکتۆر وەک هۆشی بێتەوە بەر خۆی، یەکەمجار لێوی خۆی جیاکردەوە، بەڵام بەر لەوەی تەواو چاوبکاتەوە و مەستی ئەو ماچە بەربدات، بینی ئەوا لە ژوورەکە دەڕواتە دەر... وەک با بیبات، دەڕوات و جگە لە بۆ عەترێکی ژنانە هیچ جێنامێڵێت.

ئەوا بە درێژایی ڕێگا، لەوانەیە بە درێژایی ژیانیشی، تامی سەیر و سیحراوی ئەو ماچە لە سەر لێوی بوو، لێوێکی نێرینەی گۆشتن و نەرم، نەرم وەک ڕۆحی دکتۆر شوکاک خۆی.

ماردینیا لە بینینی هەموو ئەو دیمەنە سەرسام بوو. چەند وەخت بوو باوەڕی بەو قسانەی میرائیل نەدەکرد، کە فریشتەکان کارێکیان بە مرۆڤەوە نەماوە، دیوارێکی ئەستوور لە یەکیان جیادەکاتەوە، بەڵام ئێستا لە بەردەم بینینی ئەو ماچەدا تێدەگەیشت توانای ئەو لە سەر تێگەیشتنی مرۆڤ بێئەندازە بچوکە. لە ناکاو هەستیدەکرد شتێکی نامۆ و نوێ و ترسناک لە خۆیدا دەدۆزێتەوە... خواستێکی قووڵ بۆ خۆ وێرانکردن.

لە ڕێگای گەڕانەوەدا، دکتۆر شوکاک هەستی بەو بێدەنگییە قووڵەی ماردینیا کرد، هەستیکرد ئەو ماچە شتێکی لە نێوان ئەواندا تێکشکاند. بەوەدا فریشتەکان نازانن درۆبکەن... هەموو ئەو غەمە بە جۆرێکی ترسناک لە چاویدا دیاربوو. لە ڕاستیدا غەمی ماردینیا نە هۆکەی ئەوە بوو دکتۆر ئەوای ماچکردوە، نە ئیرەیی بوو، نە کینە، بەڵکو دۆزینەوەی دووری خۆی بوو لە ئینسان. لە ساتێکدا هەستیکرد ئەو سەر بەو دونیایە نییە کە مرۆڤەکان تێیدا دەتوانن ماچی وەها گەرم

بکەن... هەستیکرد ئەم تەنها نەخۆشێکە... فریشتەیەکی نەخۆشە کە بەزۆر دەیەوێت ڕۆڵێکی تر یاریبکات، وەک مەهدائیلی فریشتە، کە ئەویش فریشتەیەکی نەخۆشە و نایەوێت لە جیهانی ئادەمیزادەکان دوور بکەوێتەوە. هەستیکرد ئەو ماچە توند بەرەو دونیای مرۆڤەکان کێشیکردۆتەوە، بەڵام توندیش بەر ئەو ڕاستییە کەوتووە کە ئەم وەک فریشتە ناتوانێت عاشق بێت، ناتوانێت ماچبکات، ناتوانێت لەشی بنێتە بەر دەست کەسێک... هەموو ئەوانە تەنیا لە توانای مرۆڤدا هەن. عاشقبوون، بریتییە لە خۆدزینەوە لە خۆشەویستی هەموو مرۆڤەکانی تر، لە پێناوی یەک کەسدا. ئەو فریشتەیە... ئەخلاقی فریشتەکان، وەک ئەخلاقی مرۆڤ نییە. دەیزانی کە عاتیفەیەکی گەورەی هەیە، دەیزانی دڵی پڕە لە ئەڤین، بەڵام تەنیا مرۆڤ دەتوانێت ئەو عاتیفەیە ئاڕاستەبکات، نەوەک ئەم... ئەم دەیتوانی دکتۆر شوکاکی خۆشبوێت، بەڵام لە قووڵاییدا بولبولیاریشی هەمان شێوە خۆشدەوێت، مەهدائیلی فریشتەشی خۆشدەوێت، ناتوانێت جیاوازیبکات لە نێوان ئەم خۆشەویستیانەدا، ئەوە دەردی هەرە گەورەیەتی. ئەم بە هەمان هێز هەموو ئەو شتانەی نزیکی خۆی خۆشدەوێت و دەیەوێت بۆ ئەوان لێرە بێت... فریشتەکان تەنیا بەو جۆرە دەتوانن عاشق بن... لە یەککاتدا لە ناو زنجیرەیەک عەشقی گەورەدا بن، زنجیرەیەکی ناکۆتا و درێژ و هەتاهەتایی... بۆ یەک عەشق دروست نەبوون. ئێستا دڵنیابوو نەخۆشە، دڵنیابوو نەفرەت لێکراوە، دڵنیابوو نیوەی هێشتا مرۆڤە و نیوەی بوونەوەرێکی نادیار و نەناسراوە کە ناوی فریشتەیە... فریشتە چییە؟ نەیدەزانی... لە یەک شت دڵنیابوو، لە یەک شت، ئەویش ئەوەیە کە زۆر نەخۆشە.

# جەهەنەم ئەو جێگایەیە کە مردنی تێدا نییە

نازانم چەندی دیکە لە ئوتێل مامەوە، دەمزانی ڕۆژ دوای ڕۆژ تووشی ئیفلجبوونی زۆرتری هەست و بیرکردنەوە دەبم، نەمدەزانی کات و ساڵ کەیە، وردە وردە هەموو جۆرەکانی حیسابکردنم لە یاددەچووەوە، توانام لە سەر کۆکردنەوە و لێکدان لەدەستدەدا، هەستم بە درێژیی و کورتیی زەمەن لە نزمترین ئاستدا بوو. بەردەوام لەو بازنە ترسناکەی بێخەوی، بێهۆشی، وەخەبەرهێنانەوەی دەستکرد، زیندوێتی بێڕۆح، گێڕانەوە بۆ ژووری ئەشکەنجەدا دەژیام. نەمدەزانی بێهۆشییەکانم چەند وەخت دەبەن، ئەو کاتانەی بە ئاگادەهاتمەوە و لە ژێر فشاری زۆری ئاو و دەنگ و ئەشکەنجەدا بە خەبەر ڕایاندەگرتم، مێشکم جگە لە قورسایی تەمێکی ڕەش هیچی دیکەی لە سەر نەبوو. ئێستا زوو زوو دەیانبردم بۆ «بوژاندنەوە»... ناتوانم بزانم چەند زوو زوو دەیانبردم، بەڵام دەزانم لە بەشی بوژاندنەوە دەخەوتم، نانم دەخوارد، دەرمانی بەهێزکەرم وەردەگرت، هێندەش هەستیاندەکرد هەرێمی مردنم بەزاندوە، بێ وەستان دەیانگێڕامەوە بۆ ژێر ئەشکەنجە. دەستێکی شارەزا و نادیار بەرنامەی ئەشکەنجەی منی داڕشتبوو... لە بەشی بوژاندنەوە دکتۆرەکان تکایاندەکرد کە چی نهێنیم هەیە بیدرکێنم، چونکە لەشم بەرەو لاوازییەکی ناوەکی سەیر دەڕوات، ئۆرگانەکانم چیتر بەرگەی ئەوە ناگرن و لەساتێکدا یەکێکیان دەوەستێت و ئیتر ناخرێتەوە کار. من ئاگاداربووم بڕیاری چیمداوە. من مردنم هەڵبژاردبوو و تەواو، مردن ڕێگا و ئاراستەی من بوو. لە ڕاستیدا هیچ ئارەزوویەکم نەبوو بۆ ژیان، ئەو ئارەزووە دێرینەی مردن کە لە مێژبوو لەگەڵمدا بوو گەیشتبووە

ترۆپکـی خـۆی. شـتێکی گرنـگ لـە جیهانـدا نەمابـوو هەوڵبـدەم ببینـم، تەنیـا یـەک ئاواتـم هەبوو، یـەک ئـاوات و هیچـی دی. بـەڵام ئێسـتا هەمـوو شـت ئەسـتەم دەینوانـد... ئـازارم لـەوە زۆرتـر بـوو بتوانـم لـە سـەر کـەس بوەسـتم. ئـەوەی کـە زیندووبـووم بڕیـاری لەشـم بـوو، نـەوەک بڕیـاری عەقڵم. ڕاسـتییەکەی ئوتێـل خـۆی جۆرێـک بـوو لـە ژووری لـە سـێدارەدانی مۆدێـرن، بـەڵام دڵنیابـووم کەسـێک هەیـە نایەوێـت بمـرم. نـەوەک لەبـەر ئـەوەی ڕێزێـک بـۆ خەباتـی ڕابـوردووم لـە حیزبـدا دادەنێـن، بەڵکـو چـۆن منداڵێـک حەزنـاکات بوکەشوشـەکەی زوو بشـکێت، جەلادیـش لـە قووڵایـدا حەزنـاکات قوربانییەکـەی زوو بمرێـت. بەپێـی ئەزموونـی خـۆم لـە ئاسـایش دەمزانـی، خۆشـی جـەلاد لـەوەدا نییـە نێچیـری زوو بمریـت، بەپێچەوانـەوە هونـەری لەوەدایە ئاواتـی ئـەو قوربانییـە بـۆ مـردن تێرنـەکات... هونـەری ئەشـکەنجە لەوەدایـە زیـاد لـە جارێـک بتکوژێـت بێئـەوەی مردبیـت. مـردن جۆرێکـە لـە هەڵهاتنـی زیرەکانـەی نێچیـر، زۆرجـار سـەرنجم داوە کـە جـەلادەکان بـە ڕاسـتی غـەم لـە قوربانییەکانیـان دەخـۆن، چونکـە مـردن گەورەتریـن ڕاکردنێکـە دیلێـک بتوانێـت پێیهەسـتێت، هەڵهاتنـە بـۆ هەرێمێـک ئیـدی هیـچ کـەس دەسـتی پێیدانـاگات، مـن بـە درێژایـی ئـەم ژیانـە مەلعونـەم جـەلادم بینیـوە کـە بـە ڕاسـتی ویسـتوویانە تـا ئـەو هەرێمـەش دوای نێچیرەکانیـان بکـەون، بـەڵام نـا... هەرێمـی مـردن عاسـیترین و ئەسـتەمترین جێگایەکـە کەسـێک بتوانێـت لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا بـۆی هەڵبێـت. کـێ لـە پشـت ئـەم ڕەفتـارە تایبەتـەوە بـوو لەگـەڵ منـدا نەمدەزانـی، کـێ بـوو دەیویسـت زیـاد لە جارێـک بمـرم و هەمیشـەش زیندووبـم؟. کـە خەیاڵـم دەهاتـەوە سـەر خـۆی، بیـرم بـۆ لیڤیتانـت دەچـوو، بیـرم بـۆ خانمـی نەغـەدە ماردینـی دەچـوو، بیـرم بـۆ خـودی سـەرۆک دەچـوو، بیـرم بـۆ هەڤاڵانـی تـری حیـزب دەچـوو، بـەڵام نەمدەزانـی کامیـان فەرمانیـداوە تـا قیامـەت ئـازارم بـدەن، لـەوێ تێگەیشـتم کـە ناهێڵـن بمـرم، تێگەیشـتم کـە جەهەنـەم ئـەو جێگایەیـە کـە مردنـی تێـدا

نییە... بەڵام هەستمدەکرد ئەوەی بەرامبەر من دەیکەن بەدترە لەوەی بەرامبەر هەر دیلێکی تر کراوە، ئەوانی دی دەهاتن، دوای هەفتەیەک دانیان بە گوناهەکانی خۆیاندا دەنا و دەڕۆیشتن، یاخود هەفتەیەکی دی زیاتر دەمانەوە و دەمردن و کۆتاییان بە هەموو شتێک دەهێنا. بەس من ئەم بازنە کوشندەیەی ئازار کۆتایی نەدەهات، وەک ئەوە بوو هەموو ڕۆژێک دەجار هەڵتواسن و بتخنکێنن و بمریت و زیندووببیتەوە. دەمزانی ئەوەی فەرمانیداوە من نەکوژن کینەیەکی گەورەی لە دڵە بەرامبەرم... من بەردەوام بە دکتۆرەکانم دەگووت کە دەمەوێت بمرم، بەڵام سوودی نەبوو. هەموو جار بە کۆمەڵێک دەرزی، خواردنی ئاویی کە لە ڕێگای دەمارەوە دەیاندایە لەشم هۆشیان دەبەخشییەوە پێم و تینیان دەدایەوە بە جەستەم تا بەرگەی سوڕێکی تری ئەشکەنجەی گەورە بگرم. هەمیشە هەستێکم هەبوو چاوانم دەتەقێن، لە هەر شت زیاتر لەوەدەترسام نەمرم و کوێربم، هەر دەم لە قۆناغێکی بێخەوی و ئەشکەنجەدا تارمایی لێڵییەکی ترسناک بە سەر چاومدا دەهات. هەندێک ڕۆژ هەبوو هیچم نەدەبینی، بەڵام نەمدەزانی ئەو نەبینینەم پەیوەندی بە کوژاندنەوەی هوشیاریمەوە هەیە یاخود پەیوەندی بە کوێربوونەوە هەیە. من لە ئوتێلدا لە یەک شت تێگەیشتم کە بە درێژایی ژیانم گومانم بەرامبەری هەبووە. بە درێژایی ژیانم لەو باوەڕەدا بووم، مرۆڤ بەم پێکهاتە مادییەی خۆیەوە ناتوانێت بەرگەی دۆزەخ بگرێت، لەو باوەڕەدابووم لەو دونیا خودا بە جۆرێک لە جۆرەکان پێکهاتی لەشمان دەگۆڕێت، بە جۆرە مەتریاڵێک چەورمان دەکات تا هەم بەرگەی سووتان بگرین و هەم ئازارمان هەبێت. بەڵام لە ئوتێلدا گەیشتمە ئەو بڕوایەی، لەشی مرۆڤ بێ هیچ زیاد و کەمێک وا دروستبووە بەرگەی دۆزەخ بگرێت. هەر کات بەراوردی دۆزەخ و ئوتێلم بەیەک دەکرد، دەمبینی بیرۆکەی دۆزەخ هێشتا لە بیرۆکەی ئەم ئوتێلە مەلعونە بەڕەحمانەترە... هەر لەوێشدا ئەو بیرۆکەیەم بۆ

ئەبەد لە خەیاڵی خۆمدا سڕییەوە کە دۆزەخ هەبێت. ئەستەمە خودا بێڕەحمییەکی وەها دەرهەق بە ئادەمیزادێکی بێچارە و لاواز و هیچ لە باردا نەبوو بکات، تەواوی چیرۆکەکە تەنیا بۆ ترساندنی ئێمەیە، نەوەک بۆ پراکتیکی ڕاستەقینە. لەو ماوەیەدا دەمزانی بەردەوام خەڵکانێک لە ئوتێل دەمرن، هەموومان بە جۆرێک تێکشکابووین کەسمان فریای ئەوە نەدەکەوتین لەوی تەنیشتمان بپرسین، چ کارە و چ حاڵە و لە سەر چی دەمرێت. من لەو ماوەیەدا دووجار تووشی خوێنبەربوونی توندی لووت هاتم کە هەر لەوێدا دەمودەست چارەیانکردم... نەخۆشەکانی تر کەسیان چارە نەدەکران، هەندێکیان لە سەرەتاوە لێدەگەڕان بمرن. هەندێکیان دەیانویست دان بە شتێکدا بنێن و ئازادبن بەڵام کەس ئامادەنەبوو، قسە و دانپیانانیان وەربگرێت. هەستمدەکرد هەندێ کەس دەیانهێنن تا لە ڕێی بێخەویی و مەراقەوە بیانکوژن. کە نێچیر زۆربوو جەلاد وەڕزدەبێت، دەیەوێت هەندێکیان فڕێبدات و لە ناویاندا گوڵبژێری بکات. لە یادمە یەکێک لە گەنجەکان کە بە ڕێکەوت لە تەنیشت منەوە وەستابوو، گووتی «کوشتنی مرۆڤ بە خواردنی زۆر و مەراق و بێخەوی، شتێکی سەیر نییە. وڵاتەکە خۆی هەمووی لە دەرەوە بەو حاڵەدا دەڕوات». هەستمدەکرد ئەو گەنجە لەو ڕووەوە لە سەر هەقە، بەڵام ئەوەی لە ئوتێلدا ڕوویدەدا ڕاکێشانی دۆخە سادە و ئاساییەکەی ژیانی دەرەوە بوو تا ئەوپەڕی، کشاندنی بوو بە جۆرێکی سەرپەڕانە. گەنجەکە هێشتا ڕۆژی یەکەمی بوو، هێشتا سەرحاڵ و بە هۆش بوو «دواتریش هەر لە نزیکی من و لە بەرچاوی خۆمەوە مرد»، گووتی «تۆ نازانیت وڵاتەکە لە دەرەوە هەمووی یان تووشی نەخۆشی خەو یان بێخەویی بووە... چارەنوسی خەڵکانێک لە دەرەوەن، جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ چارەنوسی ئێمەدا نییە». بەڵام من بە جۆرێک ماندووبووم توانای بیرکردنەوەم لە هیچ تێز و بۆچوونێک نەمابوو، مرۆڤ لەو ساتەدا کە واز لەوە دەهێنێت

بزانێت چی ڕاستە و چی هەڵـە، ئیدی مردوە. منیش باکم بەوە نەمابوو بزانـم چی ڕاستە و چی هەڵـە... ئەوانـە پرسیاری کەسانێک بوون کـە سەر بەدونیـان، بـەڵام مـن... مـن چیتـر سـەر بـە دونیا نەبووم و پێمنابووە سـەر خاکی مـردن.

دوای دەیانجار مـردن و زیندووبوونـەوە. ئیتـر ڕەنگی پێست و توانـای بینیـن و تۆنـی دەنگم تـەواو گۆڕابـوون، چـی بـەز و چەورییـەک هەیـە کـە لـە سالانی خۆشی و پشووی سـەر کورسـی دەزگا کۆمکردبوونـەوە، حیـزب هەمـووی لـە ژێـر ئەشـکەنجەدا وەرگرتـەوە، گـەر سـەرەکەچەڵ و گوێچکـە شـۆڕەکانم نەبایـە، گـەر چاوانـم وەهـا دەرنەپۆقینایـە، گـەر پێستم بـە کاریگـەری ئـەو هەمـوو ئـاوە ساردەی بـەردەوام وەک تاڤگـە بـە سـەرمدا دەهاتەخـوارێ تەنـک و نـازک نەبایـە، فیگـەری لاوازی خۆمـم بـە دڵ دەبـوو، بـەڵام بـەو دەنگـە نوسـاوەوە، بـەو دەمـارە گرژانـەوە، بـەو چـاوە جانەوەرئاسـایانەوە، لـە بوونـەوەری دروسـتکراوی نێـو فیلمێکـی ترسـناک دەچـووم... هێـدی هێـدی یادەوەریشـم ئیفلیـج دەبـوو، لـە قۆناغێکـدا وام لێهـات نەمدەزانـی داوای چیـم لێدەکـەن، نەمدەزانـی لـە کوێـم، جگـە لـە هۆشـێکی زەحمەتکێش کـە سـەنگی هەڵنەگیراویـی ژیان لە سەری نیشتبوو، جـۆرە دەرککردنێکـی دیـم نەمابـوو. جگـە لـەوەی دەمزانـی لـە تەمێکـی گـەورەدام نـاوی بوونـە، لـە ئەشـکەنجەیەکی درێـژدام نـاوی ژیانـە، هەستم بـە هیچـی تـر نەدەکـرد. بۆشـاییەکی قورسـم ڕادەکێشـا کـە نەمدەزانـی لـە نێـو ئـەو بۆشـاییەدا چی هەیـە و چـی هەبـووە. زۆر لـەوە دەترسـام تـەواو ئیفلیـج ببـم. کـە هەندێجـار هۆشـم تێدەگەڕایـەوە، لـەوە دەترسـام دواجـار بمخەنـە سـەر عەرەبانەیـەک و بمبەنـەوە بـۆ ماڵـێ و سـەرۆک یـان جێگرەکـەی بێـن و کەناڵەکانـی تەلەفزیـۆن کۆبکەنـەوە و بڵێـن، فڵانـە بەرپـرس ئەمـڕۆ سەردانێکی تایبەتـی لیـوا جەنگیـزی کـرد، کـە ئێستا بـە هـۆی نەخۆشـییەوە لـە بارودۆخێکـی تەندروسـتی دژواردایـە. بڕیارمدابوو گـەر زیندووبـم و کاری

وام لەگەڵ بکەن، بە چەشنێک وەڵامیان بدەمەوە لە باوەڕیاندا نەبێت. بەڵام دەشمزانی ئەوە هەمووی خەیاڵاتە، دەرچوونم لێرە ئەستەمە، لە دڵیشەوە دەمویست لێرەدا هەموو شتێک کۆتایی بێت. دەمویست لێرەدا بمرم و لەم دەروازەیەوە بۆ هەتاهەتایە بڕۆم بۆ جەهەنەم.

شەوێکیان دوای ئەوەی تەواو بێهۆش بووم، بردیانم بۆ جێگایەکی دیکە. بۆ ژوورێکی تر لە بورجدا. کە لە پێخەفێکی گەرمدا چاومکردەوە، چاوم بە ریزێک پەنجەرەی ڕۆشن و بەرز و گەورە کەوت، دڵنیابووم لە نهۆمێکی زۆر بەرزی بورجدا گیرساومەتەوە. ژوورەکە ئاشکرا رووت و بێئەساس بوو، جگە لە ڕاخەر و پێخەفە کۆنێک کە لەگەڵ شکۆی ئەم شوێنە بەرز و ئاسمانشکێنەدا نەدەگونجان هیچی دی تێدانەبوو، گەرچی ژوورەکە لە نێو چینە بەرزەکانی تازەترین بینای وڵاتدا بوو، بەڵام دیوارەکانی لە ناوەوە وەکماڵێکی گڵی کۆن سواغدرابوون. کە چاومکردەوە بۆنی گوندێکی کۆن، بۆنی پسمامان چوو بە سەرمدا، هەڵبەت ئەو پەنجەرە گەورانە لەگەڵ ئەو ژوورەدا نەدەگونجا، بەڵام ژوورەکە وەک بنکە کۆنەکانی پێشمەرگە ڕێکخرابووەوە... شوێنێکی تایبەتی بوو کە هەندێجار بەرپرسە گەورەکانمان، کاتێک ئارەزوو و حەز بەرەو زەمانی کۆن هەڵیدەگرتن، بیری ساڵانی شۆڕش و بۆنی گوندەکان هەڵیدەگرتن، دەهاتن و لە ساڵۆنێکی دەرەوەدا، قات و چاکەت و پانتۆڵە تازەکانیان دادەنا، چاویلکەکانیان دادەنا، جزدانەکانی گیرفانیان دادەنا، لەو پێشهۆڵە گەورەیەدا جلی زەمانی پێشمەرگایەتیان لە بەردەکرد، وەک جاران پشتێنی دەقەفیان دەبەست، جامانەی چڵکنیان لە ملیان دەئاڵاند، شەرواڵی ئەسپێدار، پێڵاوی باتە، کڵاشینکۆفی ژەنگدار، چەقۆی کوول، گۆرەویی کون... هەموو شتێک کە بۆنی ڕابوردووی لێبێت، ئەوانەیان دەپۆشی و لەو ژوورەدا بۆ ئێستێک دادەنیشتن... لەوێ وەک جاران چایان دەخواردەوە، ساوەر و نیسکیان دەخوارد و بیریان

لە ڕابوردوو دەکردەوە. سەیربوو بۆ من لە دوای ئەو هەموو ئازارە لە ژوورێکی لەو چەشنەدا چاوبکەمەوە. من لەوانە نەبووم یادەوەریم زۆر بەم جۆرە جێگایانەوە نوسا بێت، بەڵام بێهیچ هۆیەکی دیاریکراو ژوورەکەی پسمامانی لیڤیتانتنم بەیاددا هاتەوە، ئەو ڕۆژەم بیرکەوتەوە کە لە ژێر شەستە بارانێکی توندا گەیشتمە ئەوێ. گەرچی هۆشم ئیفلیج و خەیاڵم ماندووبوو، بەڵام بۆنی دیوارەکان، هاڵاوی ژوورەکە، دیمەنی سەیری ئاسمان کە وەک چاوێکی گەورە سەیریدەکردم... وردە وردە هەستەوەرە شەکەتەکانیان بە ئاگادەهێنامەوە. شتێک بوو وەک بۆعەترێکی ڕەش، وەک جۆرە بۆنێک لە منداڵیدا چەندجارێک خرابێتە ژێر کەپووم و یادەوەریم توند لە ژێرزەمینە تاریکەکانی خۆیدا هەڵیگرتبێت. بۆنی جێگایەکی تاریک... جێگایەک کە قووڵ، زۆر قووڵ لە نەستمدا خەوتووە... یان ڕاستتر وایە بڵێم لە نەستی هەمووماندا خەوتووە، ئەو پیاوە تەنها و نەخۆش و پیرانەی ئەمڕۆ حوکمی ئەم وڵاتە خەوتووە دەکەین. جێگایەک بوو وەک یەکێک لە سەر ئەندازەی نیگارە نهێنی و شاردراوەکانی دەرونی ئێمە دروستیکردبێت. شوێنێک ڕاستەوخۆ هەموو ڕابوردووی دەهێنایەوە یاد... من کە ئەو بۆنەم کرد، کە دیمەنی خۆمم لە ژێر یەکەمین بارانی شۆڕشدا لە پسمامان هاتەوە یاد، وەک هێزێک لە ناوەوە ڕاموەشێنێت، وەک تەزوویەکی بەهێزی یادەوەری لە تەوقی سەرمەوە تا بنی پێم بڕوات، وەک شۆکێکی توند، ڕاچڵەکانی دڵێک دوای خەوتنێکی درێژ لێدانێکی توند لە خەوی بە ئاگابێنێت، ڕاچڵەکیم و گریام. ئەم بۆنە دێرینە... بۆنی پاکی شۆڕش، بۆنی گوندی ئەبەدیی، بۆنی عارەقەی دێرینی جووتیارەکان، بۆنی ئەو پێشمەرگە بچوک و بێنیاز و غەمخۆر و سادانەی لە سەر شانی خۆیان دڕندەیەکی ترسناکیان گەورەکرد... گریاندمی. من بە ئەستەم چاوم بۆ دەکرایەوە، لەشم دەلەرزی، پێستم چەند مانگ بوو لە ژێر ئاودا بوو، دەستەکانم

سپی و کرژ و لۆچداربوون وەک دەستی مندالێکی تازە زاو... بەڵام ئەو بۆنە وەک چەقۆ، وەک نەشتەرێک بە نوکێکی تیژ تا بنترین دەماری ڕۆح بڕوات، بە ناومدا دەڕۆیشت... بۆنی پسمامان... بۆنی شۆڕش کە بە هەموو دلێکی پاکەوە دەڕۆیتە ناوی، بۆنی پاکی خۆم بەر لەوەی ببم بە لیوا جەنگیز، بۆنی سەردەمانێک کە هێشتا گەنجێکی باریک بووم بە ناوی وەفای ڕەفعەت بەگ، بۆنی گەنجیم، بۆنێک لە بۆنی درەخت و خاک و باران بۆم جیانەدەکرایەوە، بۆنی دلێک کە بۆ شتێکی دیکە چوو بۆ چیاکان، دلێک بە خەونێکی ترەوە چوو بۆ شاخ، بەڵام ئەمڕۆ وێران لە ناو پاشماوەی ئەو یادگارییانەدا دەگریا. بۆنێک هێشتا لە بۆنی ئادەمیزاد دەچوو. تێنەدەگەیشتم چۆن لە بورجدا ژوورێکی وەهایان دروستکردوە، بەچی ئەم بۆن و یادگار و هالاوە کۆنەیان هێناوەتە ئێرە. لە سەر دۆشەکێکی لۆکەی گەورە پالکەوتبووم، دۆشەکی مالە گوندەکییە هەژارەکان، لە ژێر لێفەیەکی گەرمدا.

ئەو هەست و یادگاریانە چاویان پڕکردم لە ئاو.

لە ناکاو دەرگای ژوورەکە کرایەوە و هەڤاڵ شێرخان هاتە ژوورێ... شۆڕشگێڕی گەورەی گەلەکەمان دکتۆر شێرخان فەتحوڵا. ئێستا لە ورچێکی نەخۆش دەچوو، کە هەستابێتە سەر پێ و بیەوێت شتێک بە ورچەکانی دی بلێت. وەک هەمیشە مۆن بوو، زۆر پیر بووبوو، بەڵام ئاشکرا شێرخانە دڕندە و نەخۆشەکە لە ناویدا هەر وەکو خۆی بوو، بگرە گەورەتر بووبوو... زۆربەی بەرپرسەکانی حیزب، پیری مەغرورتر و دڕندەتر و برسیتری کردبوون. تاکە مرۆڤێک لە پیریدا ویقار و حورمەتی خۆی زۆر دەدۆڕێنێت سیاسییەکانن، هیچ شتێک لەم سەر زەمینە وەک سیاسییەکی پیر ناشیرین نییە، کە تێناگات مەخلوقێکە بووە بە گیاندارێکی سەر بە ڕابوردوو. هەموو بوونەوەرەکانی تر لە پیریدا تێدەگەن کە بوون بە بەشێک لە ڕابوردوو، سیاسییەکان نەبێت. شێرخانیش

لەوانە بوو، وایدەزانی هەمیشە نوێیە... هەمیشە کوڕی ئەم ساتەیە، بێئەوەی تێبگات لە نێوان ئەو و دونیادا چی دیوارێک دروستبووە. پیری ئێستا جۆرێک لە بوغزی تێدا چاندبوو لە ژیان و ئادەمیزادەکان زیاتر دووریدەخستەوە... هەندێجار کە لە تەلەفزیۆندا لە ڕیزی تێکۆشەرانی دێریندا دەردەکەوت، بەوەستان و سەیرکردنیدا لە مۆمیای سەردەمێکی تر دەچوو، بۆ نیازێک زیندووبووبێتەوە. هێدی هێدی بووبوو بە سەمبولی پیری شۆڕش، پێدەچوو خواردنی گۆشت، هەوێکی زۆری بە لەشی و بەتایبەت بە قاچی کردبێت. سێ ساڵ بوو لە بەر هۆیەکی نەزانراو بە گۆچان دەڕۆیشت، هەندێک دەیانگێڕایەوە بۆ تەقینی چەندجارەی کۆمی، بە جۆرێک ئازارێکی وەهای دەدا نەیدەکرا قاچ بە ئاسانی هەڵهێنێت. بەڵام هەواڵەکانی من لەدەزگای هەواڵگری حیزب، وایان باسدەکرد کە خواردن و خواردنەوەی بەردەوام بە جۆرێک ئاوساندوێتی ناتوانێت بڕوات. هەموو لەو پازدە ساڵەدا سێ ژەمە گۆشتمان دەخوارد، منیش لە دوای ڕاپەڕینەوە بووبوومە عاشقێکی بێوێنەی گۆشت... خواردنی بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارەم گۆشت بوو. هەر سفرەیەک گۆشتی لە سەر نەبایە ئاوڕم لێ نەدەدایەوە... من دەمێک بوو ڕووبەڕوو نەمدیبوو، گەلێک نامۆ و دوور و نەناس هاتە بەرچاوم، گەرچی زۆر دڵسۆز خزمەتم کردبوو، بەڵام نە ئەو منی خۆشدەویست و نە من ئەو. پەیوەندیمان لە یەکەم ڕۆژەوە تا ئێستا یەک شێوەی هەبوو، پەیوەندی ئاغا و خزمەتکار. خەڵکانێک شێرخانیان ناودەنا دیناسۆرەکەی نەتەوە. کە بە خۆی و مۆنییە ئەبەدی و سمێڵە سپی و سەرە سپییەکەیەوە لە کۆبوونەوەکاندا دەردەکەوت، هەموو میللەت دەیانزانی هیچ قسەیەک ناکات، دەمانزانی جگە لە مۆنی و مرچنی هیچی دیکەی نییە پێشکەش بە نیشتیمانی بکات، لەو هەڤاڵانە بوو کە لە مێژبوو نەیدەزانی چی دەگوزەرێت. کۆشکێکی گەورەی لە هاوینەهەوارێکی نزیک شار هەبوو، لەوێدا

سەیرترین باغی وڵاتی دروستکردبوو باغی پشیلەکان... هەزاران پشیلەی هەبوو... هەر ڕۆژەی یەکێکیانی ڕاودەکرد. وەک بیستبووم خۆی هەرگیز باغەکەی نەدەبینی، تەنیا دەینارد پشیلەیەک یان چەند پشیلەیەکی بۆ بهێنن، لە حەوشێکی داخراو و گەورەدا بەریدەدان و دەینان بە نیشانەوە و وەک هەمیشە کەللە سەرەکەی هەڵدەگرتن. هەموو دەمانزانی هێشتا لە حیزبدا زۆر بەهێز و گەورەیە، بەڵام ماوەیەک بوو پلەوپایەکانی نمایشی و نازناوەکانی فەخری بوون. من ناوی وەزیفەکانیم دەزانی، بەڵام هیچ لە کارەکانی تێنەدەگەیشتم... ساڵانێک بوو تەنیا لە کۆبوونەوەکانی بیرۆی باڵادا وەک بتێک دەردەکەوت، لە تەلەفزیۆندا دەمانبینی، بەڵام دەنگیمان نەدەبیست. بۆیە پیشانی دونیایان دەدا تا خەڵکی بزانن حیزب چەند کۆنە. کە هاتە ژوورەوە بە گۆچانەکەی چەند مەترێک بەرەو ڕووم هات، دوایی بەتوڕەییەوە گووتی «لە یەکەم ڕۆژەوە کە تۆم بینی ئەم ساتەم لە بەرچاو بوو. سی و سێ ساڵ لەمەوبەر وەختێ شاسەی یاسەمینت لە دەمەوەدا، دەبوو ئەودەم لەگەڵ ئەودا تۆش بڕۆیت. دەبوو ئەو شەوە کە دوامکەوتی بۆ بن دیوارەکەی ماڵی مەرزان و واتدەزانی خەبەرم لێت نییە، بتکوژم، مەرزان کە هەرکات یادمدێتەوە ئارەزووم ئاگردەگرێت». من یادەوەریم بە جۆرێک ئیفلیج بووبوو، شاسە و مەرزانم بە یادا نەدەهاتەوە، شاسە... شاسە. ئاە... دوای ئەو هەموو ساڵە کە شاسە خۆڵەمێشیشی نەمابوو، بۆ لە شەوێکی وەهادا لە زاری شێرخانەوە دەهاتەوە ژیان. ئێستا زیاد لەوەی کە ئازاری لەش و دەرپۆقینی چاو و برینی وردی سەر پێست ژانم بدەنێ، ئەو ڕاستییە ئازاری دەدام کە هیچ شتێک لە ناو مرۆڤدا نامرێت... هیچ شتێک. هەمووی لە مندا زیندوو بوو، لە بۆنی بارانەوە لە پسمامان تا بۆنی کۆڵەپەشتە عارەقاوییەکەی شاسە کە من بەخۆڕا بە کوشتمدا. ئەم ژوورە لە ناکاو وەک ئەوەبوو چی شتێک لە ژێرخانە ڕەشەکانی هۆشمدایە بیهێنێتە دەرێ. دەنگی شێرخان هۆشی

هێنامەوە و گوتی «خەڵک هەموو وادەزانن من یادەوەریم لەدەستداوە. خەڵک... خەڵک هەموو گەمژەن. من هیچ شتێکم لەدەست نەداوە... هیچ شتێک، هەموو شتێکم وەک خۆیەتی، وەک شێرخانی کۆن، شێرخانی قارەمانی شۆڕش».

لە پەنجەرەی بورجەوە سەیری شاری کرد و تفێکی تێکرد.

من پێستم پێویستی بە مەرهەمێک بوو... ئازارم زۆربوو، چەندەها جۆری ئازار... ئازارێک لە دەرەوە بەرەو ناوەوە دەڕۆیشت، ئازارێکی دیش لە ناوەوە بەرەو دەرەوە دەجولا، ئازاری سەر پێستی لەش و ئازاری بنی ڕۆح لە جێگایەکی نادیاردا دەیاندا بەیەکدا. ئازارێک لە نێو چاومەوە بەرەو جێگایەکی قووڵ و نادیاری نێو سەرم دەڕۆیشت و ئازارێکیش بە پێچەوانەوە لە جێگایەکی دوور و عاسی ناو سەرمەوە دەهات و لە چاوانمەوە دەڕژایە دەرێ. شێرخان بێئەوەی بزانێت من لە چ حاڵێکدام گوتی «من فەرمانم دا ئەم جێگایەیان دروستکرد، لێرە مرۆڤ دەتوانێت هەمووی لە خۆیدا زیندووبکاتەوە... هەمووی».

دەنگی پێدەچوو دوکەڵی جگەرە و بەڵغی ئەلکهول گرتبێتی. ئاشکرا وەک ژەنراڵێکی پیر لە ژوورەکەدا دەهات و دەچوو، گەر یەکێک نەیناسیبایە وایدەزانی لە شۆڕشدا بەر تۆپ کەوتووە، لە شەڕدا لاقی پێکراوە. بۆیەکەمجار لە ژیانمدا هەستمدەکرد زەردەخەنەیەکی نهێنی لە سەر لێوی دەبینم، بەڵام من بە جۆرێک پەرت و لێدراوبووم، نەمدەتوانی تەماشایبکەم و بە ڕۆشنی تێبگەم بەچی خەندەدەگرێت. وەک سەرکردەیەکی سەربازیی گەورە، وانەیەک بڵێتەوە گوتی «هەمیشە دوو مێژوو هەیە، مێژوویەکیان ئەوەیە لە سەر کاغەز دەنوسرێتەوە، ئەوە مێژوویەکە چاکدەکرێت، دەستکاریدەکرێت، درۆی تێدا دەکرێت، بەڵام مێژووەکەی تر ئەوەیە کە لە ڕۆحماندا دەنوسرێت... ئەوەیان دەستکاری ناکرێت. ڕەشە، سپییە، خۆڵەمێشییە... هەرچییەکە دەستکاری ناکرێت. ئەوەی کردوتە کردوتە.

لە کۆتاییدا بەس تۆ و خودا دەمێننەوە پێکەوە قسەی دەربارە بکەن، بەس تۆ و خودا». دەنگی گۆچانەکەی کە دەیدا بەزەویدا دەیترساندم. ئێستا نزیکی حەفتا و پێنج ساڵ دەبوو، بەس زۆر لەوەش پیرتر دیاربوو. تەنیا گەمژەکان لەم تەمەنەدا تاقەتی سیاسەتیان دەمێنێت، هیچ مرۆڤێکی عاقڵ نییە لەو تەمەنەدا سیاسەت بکات. بە دەنگێکی بەرزتر و دڵنیاتر و لێخوڕتر لە ڕستەکانی پێشووی گووتی «نازانم بە چی بانگتبکەم... بەچی؟ بە هەڤاڵ جەنگیز؟ تۆ چیتر هەڤاڵ نیت، حیزب هەموو شتێکی لێسەندوویتەوە... بە لیوا جەنگیز.؟ چیتر لیوا نیت. کەسێکی نەخۆشیت لە کۆتایی ژیانتدا». نرکەیەک لە گەرووموەوە هاتەدەرەوە، لە نرکەی کەسێک دەچوو بەر لە مردن دەست بۆ فریادڕەسێک درێژبکات. نوزەیەکی درێژبوو لە گەروویەکی نوساوەوە. ئەو گووتی «ئەم جێگایە شوێنێکە جار جار لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی باڵادا بەکاریدەهێنین، وەک کۆن خۆمان دەبەستین، پوزەوانە لە پێدەکەین، جامانە لە مل دەپێچین و دێینە ئێرە، بۆ ئەوە نییە بزانین جاران چۆن بووین، بۆ ئەوەیە بە ڕۆشنی ببینین ئێستا چۆنین. شتێکە وەک ژووری ئەشکەنجە، دروست نەکراوە تا بیری جاران بکەین، بەڵکو بۆ ئەوەی بیری نەکەین... بۆ ئەوەی لە بیری ببەینەوە، من چەندە ڕقم لە پشیلەیە هێندەش ڕقم لەم شوێنەیە... ڕقم لە بۆنی تەپاڵەکانە... شیاکەکانی وەتەن، شیاکەی مانگا نەخۆشەکانی وەتەن. ڕقم لە تۆشە».

من بێدەنگ بووم. هەڤاڵ شێرخانم زۆر زل دەهاتە پێشچاو، ژوورەکە قووتیلەیەکی کۆنی تێدا دەسووتا لەوانەی سێبەری هەموو مێروولەیەک دەکەنە سێبەری فیل. ئەو لەگەڵ جوڵەی خۆیدا تارماییەکی زۆر زەبەلاح و قورسی لە سەر دیوارەکان دەگێڕا. «هەمیشە ڕقم لێت بووە، ئەگەرچی هەمیشە خزمەتکارێکی باش بوویت... تا ئەم دواییە نەبێت... تا ئەم دواییە نەبێت. وەفای ڕفعەت بەگ، ئەگەر لە سەرە مەرگیشدا بێت، خراپ

نییە، ناوەکەی خۆتت بدەمەوە، ناوە ڕووتەکەت، بێ ئەو پلە و پایە و ناو و نازناوەی حیزب چەند ساڵە لێتی دەبەستێت. ناوە ڕووتەکەت. بۆ ئەوەی گەر لەو دونیا بانگیانکردیت، بیرتبێت. من قەت تۆم خۆش نەویستووە، کەسیش لە ئەنجومەن تۆی خۆش نەویستووە، قەت هاوڕێی کەس نەبوویت... تەنیا خزمەتکار بوویت، لەوانەبوویت کە لە سکی دایکیان دەکەونە خوارەوە و خزمەتکارن. بە هەڤاڵانم گوتووە لە بیرۆی باڵا ، لە هەموو ئەوانە بترسن کە لە یەکەم ڕۆژەوە خزمەتکاری دڵسۆز بوون... هیچ ناخێک وەک ناخی خزمەتکارێکی دڵسۆز ڕەش نییە. من لە ژیانمدا لەوانە نەترساوم کە هەموو بەهانەیەکت دەدەنێ خۆشتنەوێن، بەڵکو لەوانە دەترسم بەهانەت پێ نادەن».

شێرخان هاتە نزیکمەوە، لە سەر سەرم وەستا، ڕوناکی قوتیلەکە دوور بوو، لەبەر تاریکی و ماندوێتی، نەمدەتوانی سیمای بە جوانی ببینم کە شۆڕبۆتەوە بە سەرمدا و سەیرمدەکات، لە ناکاو دوور لە هەر چاوەڕوانییەک، تا توانی یەک تفی گەورەی تێکردم. تفێک بۆنی دەمی و هەموو پیسایی گەرووی هەڵگرتبوو، ئینجا هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، هەناسەی دڵنیایی، هەناسەی کەسێک ئاواتێکی گەورەی خۆی مێنابێتە دی، دواتر کەمێک بێدەنگ بوو، پێدەچوو بیەوێت ماوەیەک لەزەت لە تفەکەی خۆی وەربگرێت. دواتر گووتی «ئێستا دڵم پشووی دا، ئەوەتەی دەتناسم حەزمکردوە ئەو تفەت تێبکەم... چەندین ساڵە کە ناوت دەهێنن، حەزم لەوەیە بێیتە بەردەم و ئەم تفەت تێبکەم». ماوەیەکی تر بێدەنگ بوو، دوایی بە هێمنی کەوتەوە ڕۆیشتن بە ژوورەکەدا، دەستی بەرزکردەوە و گووتی «لە ژیانمدا حەزمکردوە ئاوا تف لە زۆر کەس بکەم، لە زۆر کەس، بەڵام ناشیرینی دەسەڵات لەوەدایە چەند هێزت دەداتێ، ئەوەندەش هێزت لێدەستێنێتەوە. لە دوای ڕاپەڕینەوە... کە لە چیا دابەزین، کەمجار ئاوا بۆم ڕەخساوە ڕاستە و ڕاست تف بکەمە ناوچاوانی

ئەوانەی دەمەوێت... وەفای ڕەفعەت بەگ، هەندێجار هێزی ئینسان لەوەدا نییە چ سوپایەکی لە ژێر دەستە و دەتوانێت چی بکڕێت یان چی بفرۆشێت، لەوەدا نییە چەند لە دوژمن دەکوژێت، بەڵکو لەوەدایە کە حەزدەکات تفبکاتە دەموچاوی کەسانی نزیکی خۆی، برادەرە نزیکەکانی، یاوەرە هەرە باوەڕ پێکراوەکانی، بەڵام ناتوانێت... دەسەڵاتی ڕاستەقینە ئەوەیە بتوانیت تفبکەیتە دەموچاوی هەر کەسێک ویستت، لە هەر کاتێکدا بێت، هەر کەس بێت، دۆستت بێت یان دوژمن، ئەوەش ئەستەمە، هەتا بۆ گەورەترین دیکتاتۆرەکانیش ئەستەم بووە. دیکتاتۆر... نا... من ناویاننانێم دیکتاتۆر، ناویاندەنێم دەسەڵاتدارە گەورەکانی مێژوو. هەمیشە مەحکومین بەوەی بەدەم هەندێکەوە پێبکەنین کە لە دڵدا دەمانەوێت تفیان تێبکەین... هیچ دەسەڵاتێک لەم نەخۆشییە رزگاری نابێت».

من چاوم لێکدەنا، هەموو شتێک قووڵ و تاریک و بێدەرگا بوو... وەک ڕۆچوونێکی درێژ بوو بە تونێلکی ئەبەدیدا کە جگە لە بەتاڵی هیچی دی هەڵنەگرتووە، هەستمدەکرد چەندین ساڵە تەنیا بەردەبمەوە... کێشەکە لەوەدا نەبوو کە بەردەبمەوە، بەڵکو لەجۆری ئەو هەستەدا بوو کە قووڵ لە مندا شێوەی گرتبوو. هەستمدەکرد ترسناکی گەمەکە لەوەدا نییە کە ئەم تونێلە کۆتایی نییە، بەڵکو ئەوەیە واهەستدەکەم من لە هەوادا وەستاوم و تونێلەکەیە دەڕوات. تونێلەکەیە بە جۆرێکی سامناک گوڕدەخوات و ڕۆدەچێت و بەرەو ئەبەدییەتی خۆی شۆڕدەبێتەوە، بێئەوەی من لەگەڵ خۆیدا ببات. وەک مردویەک، گۆڕەکەی خۆی ببینێت بەبێ ئەو بەرەو قیامەت دەچێت. وەک وجودێکی هەمیشە هەڵواسراو لە زیندانێکدا کە ئەویش تووڕە و بێزار لە خۆی، بەرەو زیندانێکی دیکە، بەرەو دوا خەرەندی خۆی دەکشێت.

شێرخان گوتی «هەمیشە تۆم وەک گوربەیەک سەیرکردوە، خۆشبەختانە حیزب گوربەی زۆری تێدا نەبوو، حیزب گوربەی کەم بوو...

بەس تۆ شاهەنشایان بوویت. جەنگیز... گوربە پیس و پۆخڵەکەی دەزگای ئەمنییەتی شۆڕش، گوربەی گوربەکان».

سەرم گێژی دەخوارد، ماندوێتی خۆم و نزیکیم لە مەرگەوە وایانکردبوو، ئازاری تونج و تەشەری شێرخان لەوە کەمتربێت کە خۆی نیازی بوو. کاتێک ئەو قسەیدەکرد، هەستمدەکرد مردوم، هەستمدەکرد دەنگی شێرخان لە سەکۆیەکی نێوان ژیان و مردنەوە دێت، لە سەر پلەکانێک دەکەوێتە ئەودیو منەوە. گوتی «دەزانی بۆ هەموو ژیانم ڕقم لە پشیلە بووە، ڕقێکی وا کە حەزدەکەم لە سەر زەوی تۆویان نەهێڵم». ئەوە پرسیارێک بوو جاران زۆر بیرم لێدەکردەوە، بەس ئێستا نا. ئێستا حەزمدەکرد بڵێم «خۆت و پشیلەکانت بۆ جەهەنەم... بۆ جەهەنەم». بەڵام جگە لە هاوارێکی نوساو هیچ لە گەرومەوە نەهاتەدەر. گوتی «من ڕقم لەو حەیوانانەیە کە ناتوانن دۆستت بن یان دوژمن. پشیلە لەو جانەوەرانەیە، لەگەڵ مرۆڤدا دەژی بێئەوەی هاوڕێی بێت، هەمیشە لەدەورمانن، نزیکن لێمان، بەڵام هیچ ڕێزێکی قووڵیان نییە... هەمیشە ئەو ئیفتیخارە حەیوانییە بەدە لە چاویاندایە. سەیری چاوی هەر پشیلەیەک بکە کاتێک سەیرتدەکات، بۆ ئەوە نییە خۆشی بوێیت، بەڵکو بۆ ئەوەیە بتخوێنێتەوە، جگە لە پیاهەڵشاخان عاتیفەیەک لە نیگایاندا نییە، جگە لە کینەیەکی قووڵ و شاردراوە هیچی تر لە چاویاندا نییە. وەک چاوانی تۆ، چاوە مۆن و گوربە ئاساکانی تۆ، چاوی جاسوسێک کە هەر لە لەدایکبوونەوە بەجاسوسی هاتۆتە دونیاوە. کەی تۆ وەک پشیلەیەکی نەخۆش لە حیزبدا ڕەفتارت نەکردوە... کەی؟. لە حیزبدا حەزمان لە وەفا بوو، تۆ وەفات هەبوو، بەڵام قەت نزیک نەبوویت، لە ناختدا حەزت لە حیزب بووە، بەڵام بە شەخسی حەزت لە هیچ یەکێک لە سەرکردەکانت نەکردوە، وەک سەگێک بوویت کە پاسی هەموو ماڵەکەت کردوە، نەوەک پاسی کەسێکی تایبەتی بکەیت. لەوە

تێنەگەیشتوویت کە حیزب لە من و لە ئەو و لە ئەویتر دروستبووە. نە ئەوەیە تەواو لەگەڵماندا بوویت، نە ئەوەیە بتوانیت دووربکەویتەوە. هەر کات ناچاربوویت زۆر لێمان نزیک بیت، بوویت بە گوربەیەکی نەخۆش. وەک پشیلە ڕۆحێکی تەماوییبوویت کە کەس نازانێت تەواو چی لە ناوتدا دەگوزەرێت، بە درێژایی ژیانت تەنها بوویت. زیاد لە سی و سێ ساڵە لەگەڵماندایت کەچی هاوڕێیەکی نزیکت نییە نە لە حیزب و نە لە دەرەوەدا. وەک پشیلە، کە هەمیشە تەنهان، لە تاقم و جەماعەتدا کۆنابنەوە، بە تەواوی تێکەڵ نابن... تۆش هەردەم خزمەتکارێکی تەنها بوویت کە وەزیفەی خۆت جێبەجێکردوە، بەڵام چاوت جگە لە تەنهاییەکی قووڵ، لە ئیفتیخارێکی ڕەش و ترسناک هیچی تری تێدا نەبووە»

زۆر بە ڕوونی قسەیدەکرد، بێئەوەی حەسرەتێک یان غەمێک لە دڵیدا بێت هاتبووە زمان، وەک حیکایەتخوانێکی کۆن بێت و باس لە شکۆی پاڵەوانێکی خەیاڵی بکات. شتێک کە لە دڵیدا بوو دڵنیایی بوو، شتێک کە لە دەنگیدا بوو «یەقین» بوو... دڵنیایی و یەقینی ئاژەڵێکی پیر کە دەمرێت و هەست ناکات دەبێت لە هیچ شتێک پەشیمان بێت، دڵنیایی شۆڕشگێڕە سەرسەختەکان لەوەی هەموو ژیانیان، هەرچی تاوانێک کە کردویانە هەمووی کرداری گرنگ و مێژوویی بوون بۆ باشکردنی دونیا. بە هەمان سافی و یەقینەوە، وەک ژەنراڵێک باس لە شەڕێکی براوە بکات، گووتی «لە بەر هەمان هۆ بە درێژایی ژیانم ڕقیشم لە ژنان بووە، کە خستوومنەتە ژێر خۆم، لە بەرئەوە نەبووە عاشقیان بووم، بەڵکو بۆ ئەوە بووە کینەی خۆمیان تێببرم... ئەوانیش زۆربەیان ئەو پشیلەیەن... ئەو پشیلەیە کە نە ئەوەیە دەستەمۆبن و نە یاخی... وەک تۆ وەفای ڕەفعەت بەگی مەلعون کە هەموو ئاداب و ئەخلاقی گوربەکانت هەیە، کە نە ئەوەیە دەستەمۆ بیت و نە یاخی».

هاتەوە نزیکم، جارێکی تر سەری بە سەرمدا شۆڕکردەوە، بەڵغەمێکی

تری کردە دەموچاوم کە بۆنی لەوی پێشوو توندتر بوو. بەڵام دەنگی هەر وەک خۆی بوو، دڵنیا و ساف، پڕ لە بڕوای تەواوەتی بە خۆی و بە مێژوو و بە داهاتوو، گووتی «چاوت بەردەوام ئەو سەیرکردنەی تێدابووە کە من پێیدەڵێم سەیرکردنی پشیلە مەلعونەکان. سەیرکردنێکە پڕە لە گومان، لە ئامادەیی بۆ هەڵهاتن، لە بێبڕوایی بە هیچ مەخلوقێک و بە هیچ جێگایەک و بە هیچ کەسێک. نە ماڵی بوویت، نە کێوی. بۆیە ڕقم لێتە، پشیلەش تاکە حەیوانێکی دونیایە وەک تۆ نە ماڵییە و نە کێوی. بەڵام ئەو دۆخە لە بری واتان لێبکات شەرمبکەن، چاودابخەن، خۆتان بشارنەوە، ئیفتیخارێکی ترسناک و ڕەشی بۆ دروستکردوون. ئیفتیخاری مەخلوقێکی تەنها کە شانازیی بە بەرەڵایی و تەنهایی خۆیەوە بکات. من وەک سەرکردەیەکی ئەم حیزبە، ڕقم لە هەر بوونەوەرێکە ئیفتیخار بە تەنهایی و بەرەڵاییەوە بکات. ئیفتیخار بە بەرەڵایی و تەنهایی دەبێت دوو سیفەتی سەرۆکەکان بن، دەبێت سیفەتی جەنابی سەرۆک بێت، سیفەتی یاوەرەکانی بێت، سیفەتی من بێت، نەوەک تۆ... ئێوە چین ئیفتیخار و بەرەڵایی پێکەوە کۆبکەنەوە، کە سیفەتێکە لە سیفەتی خوداوەندەکان... ئێوە چین و کێن؟ لە بەرئەوە حەزم لێبووە ئەو ئیفتیخارەت بشکێنم، ئیفتیخاری شۆڕشگێڕێک ئەوەندەی خزمەتکاری مەسەلەیەکە، کۆیلەی مەسەلەیەکە، عاتیفەی بۆ سەرۆکەکانی نییە. بۆ من وەک سەرۆک، کەی ئەوە گرنگە بزانم پێشمەرگەکەی بەردەستم کوردی خۆشدەوێت یان نا... دەردم لەسەد هەزار کورد دا... سندانم لە هەموو کورد دا. بۆ من ئەوە گرنگە بزانم ئایا پێشمەرگەکەم منی خۆشدەوێت؟. ڕقم لە مەخلوقێکە لێمەوە نزیک بێت و نەزانم منی خۆشدەوێت یان نا... نەزانم بۆ لێم نزیکە... نەزانم ناخی چی تێدایە... وەک پشیلە... کت و مت وەک گوربەیەکی ڕەشی کەللە زل کە کەس نازانێت لە پشت سەیرکردن و چاوە ترسناکەکانییەوە چی نهێنییەک خۆی شاردۆتەوە».

نــە دەبـوو هیــچ ڕۆحێــک لــە بەردەمــی ئــەودا تەماوبێــت، دەیویســت هەمووان تاسـەر ئێسقان لـە بەردەمیـدا ڕووت بـن. دیسـانەوە دەسـتیکرد بـە گـەڕان بـە ژوورەکـەدا. «لـەم ئوتێلـەش وەک پشـیلەی حـەوت ڕۆح بوویـت... وەک پشـیلەی حـەوت ڕۆح. ئێسـتا تـەواو، گـەر سـەرۆک هەمـوو شـتێک هەڵنەوەشێنێتەوە، بۆ هەتاهەتایە لـەوێ دەبێـت... لـە مەخـزەن، مەخزەنـی گـەورەی حیـزب... شـوێنی ئەندامـە تێکشـکاوەکان، شـوێنی پاشـماوە و پاشـەڕۆکانی حیـزب... شـوێنی ڕاسـتەقینەی تـۆ... وەک زبڵـی مێـژوو... وەک زبڵـی مێـژوو».

دوای ئەو ڕستە سـەیرە زۆر قسـەیکرد، بەڵام من چیتر لە دۆخێکدا نەبووم بتوانـم گـوێ ڕادێـرم، تـەواو بێبـاک بـووم. مـن دەمزانـی مـردوم، لـە بەرئـەوە پێویسـتییەکم بـەوە نەبوو گوێی بۆ بگـرم، ئـەو وەک شـێت بـەردەوام قسـەی لـە لێکچوونـی نێـوان مـن و ژن و پشـیلە دەکـرد... مـن دەمویسـت نزیـک بێتـەوە، بۆ ئـەوەی بـەر لـە مردنـم منیش تفێکـی گـەورەی تێبکـەم. بـەڵام نا، هەمیشـە دوور دەوەسـتا. منیـش هێـدی هێـدی هەسـتمدەکرد دەکوژێمـەوە و دەکەومـە خـەوێکی قووڵـەوە... هەسـتمکرد بۆ ئەبـەد دەکەومـە تاریکییەکـەوە کـە لـە هەرجێگایەکـی دی پتـر ئاسـوودەگی و دڵنیاییـم پێدەبەخشـێت.

## من و سەرۆک

گەرچـی لـە سـەقز مـن و لیڤیتانـت لـە ماڵێکـدا دەژیایـن، بـەڵام کـەم پێکـەوە قسـەماندەکرد، ئـەو بەشـی زۆری کاتـی خـۆی لـە دەرەوە و لـە نزیـک بەرپرسـە گـەورەکانـی شۆڕشـەوە دەبـردە سـەر، وەک هەمیشـە لـە کتێـب دەترسا، ڕقـی لـەو شـیعر و ڕۆمانـە فارسـییانە بـوو کـە مـن لـە ژوورەکـەدا کەڵەکەمکردبـوون، کاتێـک کتێبێکـی دەگـرت بـە دەسـتەوە، ڕوخسـاری

شێوەی گەمژە و ترسنۆکانی هەبوو، کەسێک ئەژدیهایەک بە دەستی خۆیەوە ببینێت. هەستمدەکرد زەماوەند و خێزان دروستکردنی لەگەڵ ژنە شاعیرێکی ناوداردا، کینەی دێرینی لە شیعرخواز و کتێبناسان کەم نەکردۆتەوە. هەر کوچەیەک کتێبفرۆشییەکی تێدابایە حەزی لێ نەدەکرد. بەڵام من جۆرێکی دی بووم، بە ڕوونی هەستمدەکرد خوێندنەوەکانم کاریگەری باش لە سەر ئارامی فریشتەکەی ناخم دادەنێن. من لە سەقز زۆربەی کاتەکانم بۆ تێڕامان و ئارامی و بیرکردنەوە تەرخانکرد. ژوورێکی بچوکم هەبوو، لیڤیتانت هەر کات بیویستبایە دەگەڕایەوە و بۆی هەبوو لە تاریکیدا بە کرباجەکەی لە من بدات. هەردووکمان ئەو یارییەمان بێدەنگ ڕاییدەکرد، نە ئەو لە بارەیەوە دەدوا و نە من. نە ئەو هەرگیز دەیپرسی بۆ وا بێدەنگ دەوەستیت و لەزەت لە هێزی ئەم قامچییە وەردەگریت، نە من دەمگووت چ خۆشییەک لەوەدایە ئازاری من بدەیت. ئەوە نهێنی من و ئەوە نهێنی ئەو بوو.

لەو سەردەمەوە نۆبەتی یەکەمی ترازانی ڕاستەقینەی من لە حیزب دەستی پێکرد. دەبێت بڵێم کە «نەخۆشی حیزب»، نەخۆشییەکی تایبەتییە، لەو نەخۆشیانە نییە مرۆڤ یەکسەرە بتوانێت چارەسەریبکات، واتە وازهێنان لە حیزب شتێکە دەم دەم و شەپۆل شەپۆلە... مرۆڤ دەڕواتە دەرێ و دەگەڕێتەوە، دەڕواتە دەرێ و دەگەڕێتەوە، بە ئومێدی ئەوەی یان ڕۆژێک بەتەواوەتی بچێتە ناوەوە و لەوێدا ئەو پلەوپایەو جێگایە بگرێت کە دەبێت بیگرێت، یان بە تەواوی لە حیزب دەرچێت و ڕزگاری بێت و ژیان و جیهانێک بدۆزێتەوە، دووربێت لە هەر فریوێکی لەو چەشنە کوشندە. یەکێک لە کێشە هەرە گەورەکانی مرۆڤی ئێمە ئەوە بوو کە جارێک چووە حیزبەوە و لە ناویدا بە ڕاستی ژیا، ئیتر ئەستەمە لە دەرەوەی حیزب ئاسوودە بێت... ئاسوودەیی مرۆڤ ئیتر گرێدەدرێتەوە بە شتێکی نادیار و بێهۆش و بێ ڕوخسارەوە. لە ڕاستیدا

عاشقبوون بە حیزب، هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ عاشقبوون بە مەکینەیەکی گەورە، بە ماشێنێکی زەبەلاحی قیمەکردنی گۆشت، بە ئامێرێکی بێدەنگ کە هیچ هەستێکی نییە. من لە سەرەتای زیندەگییە تازەکەمدا لەسەقز، هەندێجار بە جۆرێک لە دونیا دەپچڕام ئاگاداری هیچ شتێک لە ڕووداوە گەورەکان نەدەمام. دەمویست کارێک نەکەم فریشتەکەم تووڕەبێت و لە ناوەوەڕا تەکانم بدات، بەردەوام گوێم لە مۆسیقای فارسی دەگرت، شیعرم دەخوێندەوە، شتێکیش زۆر بیرمدەکرد بولبولیار و مەهدائیلی فریشتە بوو. بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە لە ناکاو چالاکیم تێنەدەگەڕا و نەدەگەڕامەوە ناو هەڤاڵان... نا حیزب شتێک بوو لە خوێنمدا. ئەو کات تەواوی حیزب بە سەردەمێکی بێئیشی گەورەدا تێدەپەڕی، زۆربەی ئەندام و سەرکردەکان، بە شەو لە ماڵی یەک کۆدەبوونەوە و عارەقی قاچاغیان دەخواردەوە و یاری وەرەقەیان دەکرد، ئێرانییەکان لێگەڕابوون ئەندامەکان و سەرکردەکانمان بخەون. ئەوەی لەو ماوەیەدا شوێنی سەرنج بوو، سەرۆک «خودا لێیخۆش بێت» لە ناکاو ونبوو، لە نێو دانیشتنە شەوانەکان و لە ژوورە قاندراوەکانی خۆرهەڵاتدا بە بۆنی جگەرە و عارەق، چەندین ئەفسانە و چیرۆکی سەیر سەیر لە سەر سەرۆک بڵاوبووەوە، هەندێک دەیانگووت ئەمریکاییەکان بردوویانە دەرسی لە سەر بخوێنن، من هەر کات دەمپرسی چ جۆرە دەرسێک، وەڵامی جۆراوجۆرم دەستدەکەوتەوە. گاڵتەچییەکان دەیانگووت بۆ ئەوەی بزانن مێشکی چی تێدایە، تا لە سەر ڕۆشنایی ئەوەدا پلان بۆ داهاتووی خۆرهەڵات دابڕێژن، چونکە سەرۆک لە سەری خۆیدا پلانێکی گەورەی بۆ داهاتوو کێشاوە کە هیچ کەس نایزانێت خۆی نەبێت و ئەمریکاییەکان مەبەستیانە ئەو پلانە لە سەری سەرۆکدا بخوێننەوە، تا بیدزن و بیکەن بە بەرنامەی کاری خۆیان. هەندێکیش دەیانگووت «ئەمریکاییەکان مەراقیانە بزانن، ئەم پیاوە بۆ ئەوەندە بلیمەتە و چۆن

توانیویێتی لە نێوان ئەم هەموو زلهێزەدا، ببێتە سەرۆکێکی وا کارا و کارامە... دەیانەوێت دەرکی ئەو نهێنییە بکەن». هەندێکی تریش کە گاڵتەیان بە دونیا دەهات و هەر لە توانج و تەشەربوون و چاویان بە سەرۆکدا هەڵ نەدەهات، رایان وابوو «ئەمریکاییەکان دەیانەوێت بزانن چۆن ئەم پیاوە کەللەپووتە، توانیویێتی ئەو هەموو ساڵە سەرۆک بێت و تەلیسمەکەی چییە». هەندێ زمانیان وەک کوردانی خۆرهەڵات بادەدا و دەیانگووت «سەرۆکی نوێی ئامریکا، کورێ کەللە پووتی هەس، گەرەکییە دوای خۆی بیکا بە سەرۆک، لە بەرئەوە قەولێداوە ئەم سەرۆکی ئێمەیە خاس بنێتە ژێر فەحس و ئەزمایش، تا بزانێ چ بەرنامەسازییەک بکات و چ ئیجرایەک بۆ کورِی خۆی دانێ». هەندێکی تر دەیانگووت ئێرانییەکان سەرۆکیان بردوە تا گەر ئیمام مرد، ئێران بێ سەرۆک نەبێت و ئەو بخەنە جێگای، هەتا دەنگۆش هەبوو کە سەرۆک کوژراوە و بەس دایک و باوکی و ژنەکەی هەواڵەکەیان شاردۆتەوە تا حیزب لە یەک نەترازێت. بەڵام دوای هەموو شەپۆلێکی دەنگۆی لەمجۆرە، سەرۆک دەردەکەوتەوە، هەر وەک خۆی بوو، تاکە جیاوازییەک هەستم پێدەکرد ئەوە بوو جار دوای جار کەمێک پیرتر دەردەکەوت، شوشەی چاویلکەکەی تۆزێک ئەستوورتر و دەنگی هەناسەی کەمێک بەرزتر دەگەیشتە گوێم.

من تا سەرەتای ساڵی نەوەد، لەگەڵ رەشمارا و فریشتەکەمدا بەوجۆرە دەژیام، نیوە گۆشەگیر، نیوە شێت، نیوە وەدەرنراو. هەستێکی تەواوم هەبوو کە ئەگەرچی حیزب خۆی بە سەردەمێکی خەوتن و سڕبوونی درێژدا دەڕوات، گەرچی هیچ کارێکی وەهامان نییە، گەرچی جگە لە جگەرەکێشان و چادروستکردن و پەیداکردنی عارەقی قاچاغ و کۆنکەنکردن، خولیایەک لە ژیانی سیاسیماندا نەماوە. بەڵام من هەستمدەکرد کە دەستێکی ئەنقەست هەیە، من زیاتر فەرامۆشدەکات. ئەو کات پەیوەندیم لەگەڵ زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی باڵادا کزبووبوو، گەرچی من ناوە

ناوە جۆشێکی گەرمی ئیشکردن و هەستانەوەی ڕۆحی حیزبیم لە خۆمدا دەبینی، بەڵام ئاشکرابوو ئەندامانی دیکەی حیزب بەساردییەوە لێم دەڕوانن. بەڵام ئەفسوس ئەوە هەردەمێکی کورت بوو، شارەزایی زۆری من وەک کۆنترین کادێری ئەمنی شۆڕش، وەک چاوی هەرە گەورەی نێو زوڵمەتە ترسناک و خەستەکان، جێگایەکی پڕ بەخشیبووم، هەردەم کەسێک بیەوێت سوود لە بەهرە شەیتانییەکان و وریاییە دۆزەخییەکانم وەربگرێت. شەوێکیان دوو کەسی نەناسراو هاتن و گوتیان سەرۆک بە شەخسی ناردوێتی بەدواتدا. شتێکی سەیر بوو لەو دەمەدا کە کەس ئیشی بە من نەبوو، سەرۆک ئیشی بەمن بێت... چما شۆڕش مابوو تا ئیش هەبێت؟. شۆڕش بوو بوو بە لەشێکی هەڵوەشاو، کە ئێرانییەکان تنۆک تنۆک ئاویان بەدەمییەوە دەکرد بۆ ئەوەی نەخنکێت و نوزەیەکی بۆ دوارۆژ تێدا بمێنێت. لە ڕاستیدا دیدارەکەی سەرۆک «خودا لێیخۆش بێت» دووبارە هێمنی و ئارامی تێکدامەوە. سەر لەنوێ کەوتمەوە سەر شێوە ژیانی خەڵکانێک کە لەدەزگاکانی ئەمنییەتدا ئیشدەکەن. سەرۆکم لە نهۆمی دووەمی ئەپارتمانێکی پاک و تەمیزدا لە تەورێز بینی، وردە وردە ئاسەواری ئەو نەخۆشییەی پێوەدەردەکەوت کە دواتر بوو بە هۆی کۆچکردنی. نەخۆشی ژەهراوییبوون بە بۆن. سەرۆک وردە وردە بەرگەی بۆنی کەسانی نزیکی خۆی نەدەگرت، ئەو کات کە من چووم، سەرەتای نەخۆشییەکەی بوو، هێدی هێدی کەوتبووە شیکایەت و گلەیی لە بۆنی پاسەوانەکانی، بەردەوام ناچاریدەکردن خۆیان بشۆن. کە من چوومە ژووری بۆ لای، پێدەچوو هەست بە بۆنی ناخۆشی من نەکات. گوتی «پاسەوانە سەگبابەکانم خۆیان ناشۆن... خۆیان ناشۆن... بۆنیان شێتیکردوم». پاسەوانەکان بێچارە و دەستەپاچە دەردەکەوتن، لە ترسی هەر سووکایەتییەکی تر، ژوورەکەیان بۆ من و ئەو بەجێهێشت. من سەرۆکم وەک پیاوێکی بێوەی دەبینی، پیاوێکی کەساس و غەدر لێکراو

کە هەموو ژیانی لە نێو مەترسی گەورەدا سیاسەتیکردوە، پیاوێک یەک ڕۆژ نەژیاوە، هیچ بیرۆکەیەکی بچوکیشی لە سەر خودی ژیان و هەستە سادە و ئاساییەکان نییە. ئەو کات واتێدەگەیشتم کە ئەم پیاوە ئیختیارە، کە خەریکە خۆگری لەشی و هاوسەنگی ڕۆحی خۆی لە دەست دەدات، بە دەست میللەتەوە گیرۆدە بووە. من ئەو دەم بەراستی بۆچوونم وابوو. لە سیاسەتدا یەک پرسیار هەیە زۆر گرنگە مرۆڤ وەڵامی بزانێت ئەویش ئەوەیە «ئاخۆ میللەت بە دەست سەرۆکەوە گرفتارە یان سەرۆک بە دەست میللەتەوە؟» هەر کەسێک وەڵامی ئەو پرسیارە نەزانێت، ناتوانێت لەم جانەوەرنشینەی ئێمەدا هەڵوێستگیری بکات. ئەوە پرسیارێکی حەتمییە، ناکرێت بڵێیت هەردووکیان بە دەست یەکەوە گرفتارن، یان هیچیان گرفتار نین... گەر بەوجۆرە وەڵامتدایەوە، ئەوە لە شتێکی ڕۆشن ڕادەکەیت و ناتەوێت حەرفێکی ڕوونت دەربارەی خۆت و دونیا هەبێت. سەرۆک پیاوێکی زیرەک نەبوو، من هەرگیز زیرەکییەکی تایبەتیم لێ نەدیبوو، هەتا ڕستەیەکی جوانیشی نەبوو کەس بیڵێتەوە، بەڵام پیاوێک بوو کاریزمای هەبوو. لایەنی کەم بۆ من کاریزمایەکی بێوێنەی هەبوو. ئەو کات تازە ئەم وشەی کاریزمایە هاتبووە ناو ئێمە، هەموو بەردەوام بەکاریاندەهێنا. هەندێک لە هەڤاڵان وشەکەیان بۆ وەسفی گاوگۆلکیش بەگەڕدەخست، دەیانگووت «گۆلکە سووری مامەحەمە، بەقەد جەواهیر لال نەهرۆ کاریزمای هەیە» یان «هێسترە ڕەش سەر و کەللە و کاریزمایەکی هەیە، بە ئەدۆلف هیتلەرەوە نییە». نازانم بۆ وشەکە بەوجۆرە بێمانایە ڕۆیشتبوو. کاریزما ئەوسا و ئێستاش لای من یەک پێناسەی هەیە، ئەویش ئەوەیە خۆت کەسێکی زیرەک نەبیت، زانست و مەعریفەتت بەشی ئەوە نەکەن خەڵکی سەرسامبکەن، بەڵام هۆشکۆرێکی وەها بیت، خەڵک بڕوا بهێنن کە تۆ هەم زیرەک و هەم بەهێزیت. خەڵکانێکی زۆر لە دونیادا هەن، بەوە بەختەوەر دەبن کڕنوش بۆ هێز

بەرن، ئەوە تاکە لەزەتی گەورەیانە، خۆشبەختی خۆیان لەو کڕنوش و خزمەتەدا دەبیننەوە « کەوادەڵێم، من وەفای ڕەفعەت بەگ ئەزموونی ساڵانێکی دووروودرێژی ئەو هەستەم هەیە و دەزانم کە کڕنوشبردن چ خۆشییەکی گەورەی تێدایە و چ ئاسوودەگی و ئەمانێک دەبەخەشێتە مرۆڤ. ئەو هەستە تاقیکردنەوەیەکی درێژی ڕۆحی من و دروستکەرێکی بنەڕەتی کاراکتەری سیاسی من بووە»، لێرەوە خەڵکی کە کەسێک دەدۆزنەوە کرنوشی بۆ بەرن، کە گەورەیەک دەدۆزنەوە هۆشیان بۆ دەکوژێت و لەدەست هوشیاریی خۆیان ئازادیاندەکات، پێیدەڵێن کاریزما. سەرۆکیش لەوجۆرە کەسانە بوو، توانایەکی گەورەی زمانەوانی هەبوو، گەرچی هیچ کات لەهجە و شێوەی گووتنی سەرنجی منی ڕانەدەکێشا، گەرچی هیچ کات ئایدیایەک یان بیرۆکەیەکی جوانی پێ دروست نەدەکرا، بەڵام چونکە دەیتوانی زۆر قسەبکات، دەیتوانی ماوەی دێژ بەبێ مەعریفەتێکی تایبەت بدوێت، پێیدەگووترا کاریزما. ئەو ڕۆژەی کە منیان گرت و ئاوقای زیندانی بورجیان کردم، گەر لەوێدا، دوای ئەو مێژووە درێژە، منت بگرتبایە و بتپرسیایە «عەزیزم لیوا جەنگیز، دوای ئەو هەموو ساڵ ئیشکردنەت لە نێو حیزب و میللەتدا، پێمانبڵێ مێگەل و گاڕانی جەماوەر بە دیدی ئێوە چییە؟». بێئەوەی بوەستم و بیربکەمەوە دەمگووت، مێگەل ئەوەیە بە زمان سەرسام دەبێت نەوەک بە عەقڵ، بە قسەی بێناوەڕۆک مەستدەبێت نەوەک بە حیکمەت، بە دەنگی بەرز و هاوار هاوار جوڵەی تێدەگەڕێت نەوەک بە تێڕامان و تێفکرینی هێمن. ئەوە گاڕانە عەزیزم، ئەوە مێگەلە برادەرم، منیش هەموو ژیانم جگە لە جانەوەری نێو گاڕانی گەورە هیچی دی نەبووم. بەوەدا سەرۆکیش دەیتوانی زمان جوان بجوڵێنێت، بوو بوو بە فریادڕەسی گەورەم، بە کاریزمام. هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕاستیدا هیچ بایەخێکیان نییە، سەرۆک بە جۆرێک دەیگووتن وام هەستدەکرد قسەی گرنگن. زۆری پێچوو

تا تێگەیشتم سەرسامیم بەم پیاوە «خودا لە گوناهەکانی دەرهەق بە من خۆشبێت» سەرسامیمە بە توانای مرۆڤ لە جوڵاندنەوە لە بازنەیەکی بۆشدا. ئەو ڕۆژە لە تەوریز کە بەرابەری دانیشتم و ئەو هەموو چیرۆکەم هاتەوە یاد کە لەو ماوەیەدا بەرگوێم کەوتبوون، کە بیرمکەوتەوە، من چ بەدبەختانە ساڵانێکی درێژە عومرم بۆ ئەم پیاوە بەبادەدەم، حەسرەتێکی ترسناک هەناوی گوشیم، بەڵام من خزمەتکاری ئەبەدی حیزب، ئەو کەسەی کاتێک بەرگریم لە سیاسەتەکانی دەکرد، دەنگم دەنوسا و عارەقم دەردەدا و لەپی دەستم تەڕدەبوو، هەر زوو ئەو هەستەم لە خۆمدا خنکان و وەک جاران بە میهرەوە کەوتمەوە نیگای ئەو. نیگای زەحمەتکێشێک کە عاشقی ئاغاکانێتی. دانیشتم و وام هەستکرد ئەویش لە لەشی خۆی بێزار بێت، تەعبیری سەر دەموچاوی وابوو، وەک ئێستا لە سەر ئەسپێک کەوتبێتە خوارێ و هەستا بێتەوە. هەمیشە بە زمانی منداڵێک قسەیدەکرد، باش هەندێک حەرفی لە هەندێ جێدا بۆ نەدەگووترا، زمانەکەی تێکەڵ بوو لە هەر دیالێکتێک تۆ حەزی پێبکەیت، بە ئەنقەست و بەساڵانێکی درێژ ئەو شێوە زمانەی بۆ خۆی دروستکردبوو، تا کوردی هەموو دەڤەران، بە باوکی خۆیانی بزانن. بە نائومێدییەوە گووتی «جەنگیز، شۆڕش بۆتە تەپارە، کوردوسان بۆتە جەنازە، لە حیزبدا وەکی مردییەک سەیرمدەکەن، دەڕێن ڕەیس بۆگەنی کردییە، وەکی ڕزیبێتم وەها دەڕێن، وەکی وادەم نەمابێ وا لێم دەخوینن، شتگەلی گەلەک خەراپم لە سەر دەڕێن... شتگەلی گەلەک خەراپ. کورم هەڤارانی خۆم، دەفتەری سیاسی خۆم، برا و حەبیبی دوێکە، سەرکردایەتی حیزبی خۆم نەکی هی ناحەز و دوژمن، نوکتە و لاقرتیم پێدەکەن، تەرایفم لە سەر دەردێنن، وادەزانن بوومەتە داهۆرێکی پوچەڕۆک. مەرێ سەرۆک وانییە... من دەزانم وایە، بەرام دەمەوێت بە دو گوێیانی خۆم چت ببیسم، دەمەوێ هەموو چتم هەبی، بزانم عەشامات چلۆنی لە سەرۆکی

خۆیان دەنۆرن... جەنگیز دەزانی بۆ خۆمم لەو ئاپارتمانەی گیرکردییە، بۆ وا خۆم شاردیتیەوە، چونکە پچکێکیش چییە، بڕووام بە هەڤارانی خۆم نەمایە». لەو ساتەدا ترسێکی زۆرم لە چاویدا بەدیکرد، ترسی سەرۆکێکی بەزیو، ترسی سیاسییەکی ماندوو لەدەست دونیا. نیگا دوودڵەکانی ئەو ساتەی، بچوکبوون و کرژبوونەوەی لەشی، هیچی لە نیگا و وەستانی سالانی دواتری نەدەچوو، کە پڕبوو لە شکۆی کەسێک، واماندەزانی هەرگیز ساتی ترس و لاوازی نەبینیوە. سەردەمانێک بە قاتێکی نیللییەوە، بە ویقاری ژەنراڵێکی کارنشینەوە لە بەردەم جەماوەردا دەوەستا، لەگەڵ ئەمریکاییەکاندا وێنەی دەگرت، بە خەندە پانەکانی، خەندەی کەسێک باوەڕ نەکات ژیان چ موعجیزەی جوانی پێیە، لەگەڵ دۆست و دوژمندا دەمانبینی، هەمیشەش دۆستی نزیکی هەموو کەسێک بوو، ئێمە نەبێت، هەڤالانی کۆنی خۆی کە دەیگووت هەموو بۆنی سالانی تەپاڵەتان لێدێت. وابوو دواتر سەردەمانێک کە بەردەوام قاتەکانیان بە عەتری تایبەتی بۆ بۆنخۆشدەکرد، کە هەر جێگایەک پیادەڕۆیشت دەبوو پێشتر گوڵاو پرژێن کرابا، پاسەوانەکانی لە عەترخانە ناودارەکانی پاریسەوە بۆنیان بۆ دەهات، لەو سەردەمەدا ئەندامانی بیرۆی بالا، گەرچی لە سەر تەلەفزیۆنەکانەوە بەردەوام باسی سالانی شۆڕشیان دەکرد، بەڵام لە دانیشتنە تایبەتییەکاندا پێیاندەگووت «سالانی تەپاڵە». بەڵام من هەرگیز ئەو ڕۆژەی سەرۆکم یاد نەچوو، گووتی «جەنگیز... کوری خۆم، هەڤاران قسەم لە بارەوە دەکەن، تۆ دوو کار... نا.. نا سێ کار بۆ بابی خۆت بکە، یەک لەو ئوزلەت و گۆشەنشینییەت بێرەدەر، وەختە دەبییە خەرووت کێشی قەدیمی. برۆ مەجریسی ئەو پیاوانەی، خەبەر لە بۆ بابی خۆت بێنەوە، تۆ بۆ ئەو ئیشەی لە هەر کورێکی دیکەی بابە چاتری، گوێ هەرخە، لەگەریان پێبکەنە، خۆت قسە بجورێنە، خۆت قسە بخەوە، بزانە چی دەرێن و

چی نارێن، گەر بۆت زەبت کرا، بیکە، وە گەر نا هەروەک مەعمولی بیخە سەر کاغەز. وەکی جاران بۆ بابی خۆتت دەکرد، وەقتێ لە شار بووی. کارەکەی دیش ئەوەیە، لەگەریا چتی شەخسی هەموویانم بۆ بدۆزە، خەرکت دەدەمێ، چەن خەرکت دەوێ دەتدەمێ. خەرک بخەرە دویان، وەکی چەسپی دووقرووی با لە دوویان نەترازێن. ئەوە ئەو بێحەیسیەتانە وەقتێ دەزانن شۆرش نەفەسی لێ سەخت بوویە، وا فوو لە گوونی خۆیان دەکەن و دەکەونە بێناموسی، هەموو چتم لە سەریان دەوێ... دەرێن دەچنە کن ئێرانییەکان زوبانی بەدم لێدەدەن، دەرێن سەرۆک فتقی لێهاتیە، لەبەر عەزرەت و ژانی ئەوێندەرێی کەرکی نەماوە. دەیانەوێ ئێرانییەکان هاندەن و وەلاوەم نێن... برێن سەرۆک دەمرێ، چاترە لە ئێستاوە ئەبزارێکی دیکەی دەستی خۆتان لەوێکانە بێ. هەموو چتم لە سەر هەموو چتێ دەوێ. برۆ بابم. خۆم دەنێرمە دووت... تا خۆم نەنێرمە دووت چتێ مەرێ... چیم وت بۆمی دەکەی، بابی خۆت هەمووی لە بەر چاو دەبێت و بۆت لە جێیەکی چاک هەردەگرێ تا ڕۆژی خۆی دێتن».

فەرمانەکانی سەرۆک منی خستەوە گێژاو. ئەوە یەکەمین سەرەتاکانی بێزاریم بوو لە کاری ئەمنییەت و سیخوڕی، ترسم لە توانای خۆم نەبوو، بەلام دڵنیابووم ئەم باڵە مەلعونانە لەگەڵم ناکەن. ویستم بە سەرۆک بڵێم ئەو کارە بە من ناکرێت، من جووتێ باڵم لێڕواوە ژیانیان هەراسانکردوم، ویستم بڵێم نەخۆشم، بڵێم دەردێکی نادیارم گرتووە کە هیچ پزیشکێک دەرمانی ناکات. دەمزانی گەر وام بگووتبایە یان گەلێک تووڕە دەبوو، یاخود دەمودەست دەیگووت فیزەت بۆ وەردەگرم و بڕۆ بۆ ئەڵەمان بزانە چ دەردتە، ئەو کات دەبوو بڵێم دەردەکەم لە توانای پزیشکی سادە و ئاساییدا نییە، شتێکە بەس مەلەکبینەکان

دەتوانن تێیبگەن. ئەویش باوەڕی بە هەموو شت بوو خورافەت نەبێت. من ئەوکات سەیری چاوە ترساوەکانی سەرۆکم کرد، ئیختیارێک وامدەزانی هێندەی لە ژیاندا نەماوە. شتێک لە حەسرەت لە دڵمدا بوو، هەستمدەکرد ساڵانی دووروودرێژی شۆڕش جارێکی تر بە هەدەر چووە و ڕۆژێکی تر شۆڕش لە نسکۆی ئەمڕۆی هەڵناسێتەوە، چاوانی بێهێزییەکی وەهای تێدابوو، بەجۆرێ دەیڕوانی، وەک ساوایەک بێت و چاوەڕوانی کۆمەکبکات. سەیربوو لەو ساڵانەدا کە ئێمە لە ئێران بووین، قەتڵ و عامی گوندەکییەکان لە باشوور گەلەک شێوازی ترسناکی بەخۆیەوە دیبوو، دەمزانی سەرۆک و ئێرانییەکان خەبەریان لە هەموو شتێکە، شتگەلی ئەوتۆ ئێمە درەنگتر بیستمان، بەڵام ئەو ڕۆژە کە سەرۆکم لەو ئاپارتمانە بچوکەدا بینی، چاوی پڕبوو لە فرمێسکی کینە، لە دڵڕەقی بەرابەر هەڤاڵان، خەیاڵی تەنیا لای ئەوە بوو، بزانێت ئەوان چی لە سەر دەڵێن... مەراقێکی نەبوو بزانێت چی لە نیشتیمان دەگوزەرێت، تەنیا غەمی ئەوە بوو هاوڕێ وەفادار و بێوەفاکانی خۆی بناسێت. من بە جۆرێک دڵم بۆی سووتا، گووتم «فیداتبم باوکی میللەت. تۆ چ فەرمانێکت هەیە بە من بکرێت، دەیکەم». ئازایەتی ئەوەم نەبوو لەوە زیاتر هیچی دی بڵێم. پیاوێک بوو کاتێک بەو گووپە زل و منداڵانەیەوە سەیریدەکردیت، حەزتدەکرد کارێکی بۆ بکەیت دڵی خۆش بێت.

من چەندین مانگ لە سەر داوای ئەو کەوتمەوە ناو جیهانی ئەندامانی باڵای حیزب. سەرکردە سەربازییەکانمان کە ژیانی دانیشتن لە شارە قەشەنگ و دڵگەرمەکانی خۆرهەڵاتدا تووشی خاوبوونەوە و بێهیمەتی کردبوون. نائومێدی هەموویانی گۆڕیبوو بۆ پیاوی بێزار، یان بە توڕەیی تەعبیریان لەو بێزارییە دەکرد یان بە لاقرتی و گاڵتەکردن بە دونیا. هەموو خۆشاردنەوە و خۆدزینەوەی بەردەوامی سەرۆکیان بە جۆرێک لە ترسنۆکی دەزانی، نوقمی ژیانی تایبەتی خۆیان بوون، من بۆ هەر

یەکێکیان فایلێکی ئەرخەوانیم کردەوە، شەو و ڕۆژ کەسی خۆمم خستنە دوا، ئەوە یەکەمجار بوو تەواو ببم بە جاسوس بە سەر حیزب خۆیەوە. لەو دەمەدا تێگەیشتم لەشکر لەیەک کاتدا تەواو تێکدەشکێت، ئەویش کاتێک دوژمن دووربێت. بۆ ئەوەی وەڕزی و بێئیشی و چاوەڕوانی ئەبەدی نەمانخنکێنێت، دەبوو بکەومە دوایی حیزب خۆی، لە ناوەوەڕا بیکەمەوە، یەک یەک تێبگەم چی دەکەن، چۆن دەخۆن، چۆن دەخەون، لەگەڵ کێ پەیوەندیان هەیە، کێ دەبێتە میوانیان، بۆ دەبێتە میوانیان، ئومێدیان چییە، خەو بە چییەوە دەبینن، چی دەنوسن بۆ ژنەکانیان، چۆن ژیانی سێکسی خۆیان ڕاییدەکەن، چ جۆرە شەرابێک دەخۆنەوە... ئەوە ناوکە و سەرەتای دارشتنی گەورەترین دەزگای ئەمنی بوو لە وڵاتدا، ئەوە سەرەتای سەرەتاکانی من بوو وەک بەڕێوەبەری دەزگایەکی زەبەلاح. من دەیان کادێری چکۆلەم دۆزییەوە، پیاوان و ژنانێک کە بە سروشتی جاسوسەوە دێنە دونیا. تا ئەو کاتە تەنیا هەندێ کاری بچوکم بە کەسانێک لە ڕێکخراوەکانی شاردا کردبوو، بەڵام بۆ ئەوەی بتوانم لە هەناوی حیزب خۆی بڕوانم، پێویستیم بە ئامێرێکی وردتر و تیژتر و نەشتەرئاساتر بوو. جاسوسەکانم زۆربەیان گەنجانێک بوون لەزەتیان لەو ئیشە دەبینی، وەک سەرەتاکانی من هەوڵێکی زۆریان دەدا، وردتر و بێماناترین کار فەرامۆش نەکەن. من شەوان دەرسم دادەدان، قوتابخانەیەکی جاسوسی چکۆلانەم بۆ کردبوونەوە، هەوڵمدەدا خۆشەویستی ئەو جۆرە ژیانەیان تێدا دروستبکەم... فێرببن چ لەزەتێکی گەورەی تێدایە نهێنی کەسێک تا ئەوپەڕیی بپشکنیت، تەواوی ئەو شتانەی لە سەر بزانیت کە ئەو وادەزانێت کەس نایزانێت. سەیر بوو بەلامەوە کە سەرۆک لەزەتێکی زۆری لە زانینی ئەو نهێنیانەدا دەبینی، شاگەشکەدەبوو کە من پێمدەگووت هەڤاڵ مەلا بێچوو، لە نێوان پازدەی کانونی یەکەم تا بیست و هەشتی ئەو مانگە، دەرپێیەکی کوڵی خۆڵەمێشی لە بەردا بووە و نەیگۆڕیووە.

هەڤاڵ تەحسین وەڕازیی لە دووی شوباتەوە تا دەی شوبات لە بەر ئازاری خۆشەویستی تووشی قەبزیی و زگ ئێشە بووە، هەڤاڵ مامۆستا بەران، لە شەوی دەی کانونی دووەمدا، لە ماڵی فاتیحی یەدولاهی بە تەرەقەومیاو دوو سەد و سی هەزار تومەنی دۆڕاندوە، بەو ناونیشانەی کە لە ئاخیری شەودا وەها مەراقدار بووە خوێنی هێناوەتەوە و ئەو دەستەسرەش کە خوێنەکەی پێ سڕیوە کوڕەکەی فاتیحی یەدولاهی «کە دەڵێن مەکربازێکی بێوێنەیە» بۆی خستۆتە دەڵقێکەوە تا شەوانی دی بەر لە گەرمبوونی قومار بیخاتەوە بەر چاوی. سەرۆک هەموو ڕاپۆرت و هەواڵەکانی منی دەبیست و بە خۆشییەکی زۆرەوە دەیگووت «وای لەو حیزبەی من... وای لەو حیزبە جوانەی من. ئەوڕۆکە درنیام پاشەڕۆشمان روونە». هەرگیز نەمدەزانی لە تەوس و بێزاریدا وادەڵێت یاخود لە خۆشبەختیدا. بریقەیەکی نهێنی و سەیرکردنێکی ئاڵۆز لە چاویدا بوو کە دەرکم بە نهێنییەکەی نەدەکرد. ساڵانێکی زۆری ویست تا تێبگەم سەرۆک لە بەختەوەری و ڕەزامەندیدا وایدەگووت. هەتا کاتێک جنێو و لاقرتی و فەزیحەتە «زەبتکراوەکان»م بۆ لێدەدا، سەرەتا مات دەبوو، دوودڵ دەبوو، دەیگووت «نەوارەکەم بۆ وەگێرە دوا... نەوارەکەم بۆ وەگێرە دوا»، سەرۆک ئەو ماوەیە وشەی خۆرهەلاتیانی زۆر بەکاردەهێنا، دەیگووت دەبێت وەک غەریب نەمانبینن. دوای ئەوەی چەند جار گوێی لێدەگرت، دەیگووت «وەی مستەفا کوری گەحبە. بۆ وا بە باوکی خۆت دەرێی» «ئای، شەفیق، قووندەری قووندەر گاوێ، دەبێ ئەوەت بۆ هەرگرم، دوایی نەرێی بابە گیان، وام نەوتووە». بەلام لە کۆتاییدا هەمیشە بەختیار بوو، شادییەکی مندالانە دەپەڕییە ناو چاوی، گوپەکانی وەک گوپی مندالێکی هار سوور هەڵدەگەڕان، قژە سپییەکەی «کە هەمیشە چڵکن دیاربوو» درێژ وەکی هی دەروێشان دەهاتە سەر چاوی، خۆشحاڵ بوو زۆر نهێنی دەزانێت، بەختەوەر بوو هیچی لە پێشچاو ون نییە.

ورده ورده ئەرشیفی ئەرخەوانیم تا دەهات گەورە دەبوو. زۆربەی سەرکردە سەربازییەکان و کادێرە ناسراوەکان هەم بە کاسێت، هەم بە نوسراو، فایلی تایبەتیان لای من دەستدەکەوت، هەر شتێکم بدایەتە سەرۆک «خودا لێیخۆش بێت»، کۆپییەکم بۆ خۆم هەڵدەگرت. ورده ورده دەریای ئەو نهێنیانەی لە سەری دادەنیشتم تادەهات بەرینتر و قووڵتر دەبوو، لەگەڵ زانینی هەموو نهێنییەکیشدا هەم بڕوام بە خۆم و هەم بڕوام بە مرۆڤ و هەم بڕوام بە خودا زیاتر و زیاتر لەق دەبوون. ئەرشیفی ئەرخەوانی بۆ ئەودەم هیچ بایەخێکی نەبوو، بەڵام ورده ورده هەموو منیان دەناسی، دەیانزانی چاوێک هەیە لە بنەوەڕا چاوەدێری یەک بە یەکی کادێرانی حیزب دەکات، دەیانزانی ژمارەیەک گەنج و مێردمنداڵم لە بەردەستدایە کە زۆربەیان دەتوانن وریایانە کاربکەن. من لەو سەردەمەدا، دەستمکرد بەوەی ببم بە «ئوستادی سیخوڕی» یان «مودەڕیسی جاسوسی» وەک ناویان دەنام، بە وریاییەکی زۆرەوە لە ناو پێشمەرگە و گەنج و کادێرانی هەڵهاتوودا، دانە دانە وەک هەڵبژاردنی میوە لە سەبەتێکی گەورەدا هاوکارم هەڵدەبژارد، یەک یەک ئیشم لە سەر دەکردن، بە هەفتە وانەم دەدانێ، فێری تەکنیکەکانی چاوەدێری و دواکەوتن و خۆگۆڕین و خۆشاردنەوەم دەکردن، لە منداڵ و مەزنی سادەوە دەمگۆڕین بۆ کەسی چاو لەدەر و فرەزان. ئومێدم بوو دواجار ژمارەیەک کەس بۆ کاری ئەمنییەتی شۆڕش و خزمەتی سەرۆکەکان پەروەردەبکەم، نەمدەزانی خۆم چارەنوسم بە دەست ئەو فریشتە رەشەوە بۆ کوێ دەچێت. لە حیزبدا کەس نەیدەزانی بۆ کێ کاردەکەم، بەس بێ ئاگای من خەڵکانێکی تر هەبوون فەرمانی سەرۆکیان دەهێنایە خوارەوە تا کەس رێگری لە کاری من نەکات، رێنماییەکان وەها رۆشن و روون بوون، ئەندامانی تر دەیانزانی من بوومەتە کەسێک، چیتر گاڵتەم لەگەڵ ناکرێت. ئەوە کردبوومییە کەسایەتییەکی تەماوی و ئاڵۆز، دڵنیابووم هەندێ لە

کادێرانی ئەنجومەنی باڵا دەزانن من چاوی سەرۆک و گوێچکەی ئەوم، لە هەر کوێیەک دەردەکەوتم ڕێزێکی گەورەیان دەردەخست، هەندێکیان نزم دەنوشتانەوە لە بەردەممدا، کە دەکەوتنە بەحری قسەوباسەوە، ئەو شتانەیان دەگووت کە زیانیان نییە. بەڵام من ئەزموونێکی وەهام هەبوو، دەمتوانی قسەی دڵ لە نمایشی درۆ جیابکەمەوە. من دەمزانی هێدی هێدی دەبم بە باوک و دامەزرێنەری دەزگایەکی ترسناک، دەمزانی وردە وردە وەک کەسێکی سامناک دەردەکەوم کە هەموو بە ترسەوە لێیدەڕوانن، هەر کەسێک ون ببایە، هەر کەسێک شتێکی بە سەرهاتبایە دەیانگێڕایەوە بۆ کاری دەزگاکەی من، بەڵام لە ڕاستیدا، ئیشی سەرەکی من لەو دەمەدا تەنیا کۆکردنەوەی زانیاریی بوو.

لەگەڵ هەموو مەکر و فێڵەکانمدا، زۆرجار لە کاتی قسەدا دەستێکی نادیار چنگی دەخستە گەروم، وەک سەرەتای گەنجیم دەنگم دەنوسایەوە، عارەقەم دەردەدا، سوور هەڵدەگەڕام. ئەوەی کە هێدی هێدی ژیانی تێکدەدامەوە نەخۆشییەکەم بوو، لەگەڵ کردنەوەی «قوتابخانەی ئەرخەوانیدا» «کارەکەی خۆمم وا ناودەنا» فریشتەکەم دەستیکردەوە بە جوڵە و تەکانخواردن، وای لێهات بەردەوام و لە هەموو شوێنێک ڕایدەتەکاندم، کە هەستم بە جوڵەی باڵە شێتەکانی دەکرد، دەبوو لە هەر کوێیەکم جێگایەکی چەپەک بدۆزمەوە و خۆم قایمبکەم، تا قینی هێوردەبێتەوە، هەندێجار وا ڕایدەوەشاندم، خەریک دەبوو لە ناوەڕاستی ڕێگا و بانیشدا بمدات بە زەویدا. هەندێ شەو کاتێک دەمویست ئاسوودە سەر بنێمە سەر سەرین... وەکو گورگی برسی لێدەهات. چ فریشتەیەکی نەگریس و مەلعون بوو، تادەیزانی من دەترسم و بیردەکەمەوە و ئازارم هەیە خۆی کپدەکرد، بەڵام هێندەی خەیاڵی پشووم بایە، بمویستایە بە ئارامی هەناسەیەک هەڵکێشم، وەها تەکانی دەخوارد، وەخت بوو لە

بنەوەڕا هەڵمگرێت و بەرەو ئاسمان بەرزمبکاتەوە و لەوێوە فڕێمبدات... چەند جار ڕێکەوتیکردوە لە شەوانی توڕەییدا منی لە زەوی بەرزکردۆتەوە و لە هەوادا ڕایگرتووم، وەک خنکاوێک بەر لە مردن لە ئاسمانی ژوورەکەدا پەلم کوتاوە، وەک گوناهکارێکی هەڵواسراو ئەشکەنجەم دیوە، وەک کەسێک ملی بە پەتی سێدارەوە بێت، ژێر قاچی بۆش بێت و نەخنکێت و نەمرێت، پەلەقاژەمکردوە. دڵنیابووم ئەم فریشتە مەلعونەم کێشەی لەگەڵ ئیشکردنی من لە حیزبدا هەیە. من کە هاتمە ئێران بە ڕاستی نیازم بوو دوای خواستی باڵەکانم بکەوم و تا بکرێت لە حیزب دووربکەومەوە، بەس هێندەی حیزب ناردی بە دوامدا، نەمتوانی ئەو بانگەوازە فەرامۆشبکەم. من لەو ساڵانەی دواییدا هیچ نەبووم جگە لەوەی حیزب دروستیکردبووم، مێژوویەکم نەبوو جیاببێتەوە لە مێژووی ئەو، چیرۆکێکم نەبوو جیاببێتەوە لە چیرۆکی ئەو هێزە گەورەیە، ژیانێکم نەبوو بتوانم ناوی بنێم ژیانی تایبەتی خۆم، ئێستا چۆن دەمتوانی بانگەوازی کپ و ئازاراوی ئەم مەخلوقە بێدەنگەی ناو خۆم بگۆڕمەوە بە بانگەشەی ئەم هێزە گەورەیە، کە بۆن و ڕەنگ و بوونی لە هەموو جێگایەک بوو. هەندێ شەو دەگریام و بە فریشتەکەی ناخم دەگووت، بمبورە ناتوانم حیزب بۆ تۆ جێبهێڵم، ئەمە ژیانی منە، ئەمە ڕابوردوومە، ئەمە ئیشەکانمە، نامکرێت دەستبەرداری هەمووی بم. حیزب دەمشارێتەوە، نانم دەداتێ، هێزێکم پێدەبەخشێت کە من نیمە، چاوێکم پێدەبەخشێت کە خۆم خاوەنی نیم، بە هۆی ئەوەوە دەستم دەگاتە جێگای وا کە گەر ئەو نەبێت من چیم بتوانم بگەمە ئەو جێگایانە، گەر حیزب بدۆڕێنم وەک مەلێکی بێ پەڕ، بێ ڕەنگ، بێ شوناسم لێدێت، کە هیچ کەس نایناسێت و نایەوێت و نیگای ناکات. من پیاوێکم هێدی هێدی قەڵەو دەبم، ورگێکی زل دادەنێم، سەرم دەڕووتێتەوە، چاوانم بچوک دەبنەوە، شەرمێکی ژنانە لە نیگامدایە، کەدەشێت شەرمی پێش دڵڕەقی بێت... قسەکەرێکی لێزان

نیم، جوانییەکی وەهام نییە ژنێک ڕابگرێت، گەر دەردێکی دەرونم هەبێت هێندەی دەتوانم بیخەمە سەر کاغەز ناتوانم بەدەم بیڵێم، گەر بە تەنیا بچمە شوێنێکەوە و کەس نەمناسێت، سەرنجی هیچ بوونەوەرێک ڕاناکێشم. من خۆم پاڵەوان نیم، لاوازم، کە قسەدەکەم عارەقە دەردەدەم، شەرم دەمگرێت، قورگم دەنووسێت... چەند هەوڵدەدەم ویقارێکی خۆمم هەبێت، نیمە، چەند هەوڵدەدەم خۆم شتێک بم بکرێت بێ هیچ کەس بژیم، ناتوانم. لە ڕاستیدا هەر لە سەرەتاوە من پێویستیم بە حیزب بووە، چۆن پیاوێکی بیمار و دەرون نەخۆش دوای ژنێک دەکەوێت و دامەنی دەگرێت، بەڵکو عەشقی ئەو لە دۆزەخی هیچێتی خۆی دەربهێنێت، منیش دامەنی ئەم هێزەم گرتووە... حیزب ئامێرە، شتێک نییە بزانێت تۆ چیت و من چیم و ئەو چییە، حیزب مەکینەیەکی بێڕۆحە، مەکینەیەکی تەمەڵی بێڕۆحە کە وزەی دەوێت، بە سووتەمەنی کاردەکات، گرنگ نییە ئەو وزەیە هی کێیە و لە کوێوە دێت. بەڵام مرۆڤ هێندەی بوو بە بەشێک لەو مەکینەیە، وەک برغوویەکی لێدێت کە بۆ هیچ مەکینەیەکی تر دەستنادات، ئیتر هیچ کونێک لە ژیاندا نامێنێت تۆی پیابچیت، هیچ وەزیفەیەکی تر نامێنێت لەگەڵ هونەری تۆدا بگونجێت. ئێستا چۆن ئەم هەموو ڕاستییە غەمگینە بە وەهم و خولیای دوو باڵ بگۆڕمەوە کە لە خۆم و مەلەکبینەکان بەولاوە کەسی دی نایانبینێت... ناکرێت... نا. ئاه مەلەکبینەکان... بە ڕاستی زۆرجار گومانیان لێدەکەم... کێ دەڵێت کۆمەڵێک نەخۆشی وەک من نین کە شتگەلێک دەبینن کە بوونی نییە. نا نەمدەتوانی حیزب فەرامۆشبکەم، لە بەرئەوە تەنیا چارم ئەوە بوو تا زووە ئەم فریشتەیە لە کۆڵ خۆم بکەمەوە، نەدەبوو گوێ لە مەلەکبینەکان بگرم، کە منیان بەرەو ئەوە دەبرد دەست بەم باڵانەوە بگرم، نەهێڵم بترازێن، نەهێڵم لێم جیابنەوە. گەر فریشتەی منە و دەیەوێت بڕوات با بڕوات... چونکە لە ناخدا پێویستیم بە دڵنیایی بوو، دەمویست لەو ئازارە

دەرچم کە ژیانمی لە بنەوەڕا هەڵتەکاندبوو، کاروباری خۆم بە دروستی بۆ بەڕێوە نەدەچوو، لە هەمووشی بەدتر ئەو خواستەی تێدا چاندبووم کە بوونەوەرێکی گوناهبارم و پێویستیم بە سزایە. ئەوەی ئەشکەنجەکانی ڕەشمارا، ئاسوودەیدەکردم، ئەوەی وەها بێباک شانم ڕووتدەکرد و لەزەتم لە لێدانی ئەو دەبینی، هەر هۆکەی ئەو هەستە قووڵەی من بوو کە ژیانم ژیانی خۆم نییە، جەستەم جەستەی خۆم نییە، ئازارم ئازاری خۆم نییە. لەو شەوە سەیر و عاجباتیانەی سەقزدا کە ڕەشمارا درەنگ لە دەرەوە دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، هەمیشە بۆنی کپییەکی تاریکی لێدەهات، مەنگییەک ڕۆژ دوای ڕۆژ پەنگی دەخواردەوە، تەنهاییەک لە لەدایکبوونییەوە لێی جیانەدەبووەوە. دەستی هەمیشە سارد بوو، سەرمای شەوانی سەقز دەیتەزاند، بە هەستی ئەو زەمهەریرە سەقزییەوە دەهاتە ژوورێ، هەندێجار هەستمدەکرد مەستە، بۆنی کهولی لێدەهات. بێدەنگ دەهاتە ژوورێ و منی دەبینی چراکەم کزکردوە و لە شوێنی خۆم ڕاکشاوم، پشتم ڕووتە و دەموچاوم چەقاندۆتە سەرینەکەم و چاوەڕوانیدەکەم. وامەزانن من لەزەتێکم لە ئازار بردوە، دەروون بیمارێکم و مازۆخیانە چێژم ویستووە، نا... ئەو ئازارانەی ڕەشمارا تاکە ڕێگایەک بوو هەستبکەم، لەش لەشی خۆمە، ئازارێک هەیە ئازاری تایبەتی منە، نهێنییەکم هەیە نهێنی ئەوانی تر نییە، بەڵکو قووڵ بە ژیان و دەروونی خۆمەوە گرێدراوە. ئەو لێدانەی لیڤیتانت تاکە هۆیەک بوو بزانم لە دەرەوەی جەنگیزی حیزب، لە دەرەوەی فەرمانبەرە زیرەک و جەهەنەمییەکەی دەزگای ئاسایش، کەسێکی تر ماوە ناوی وەفای ڕەفعەت بەگە، کەسێکە دەبوو ڕەشمارا بە هەموو توانای خۆی لێیبدات بۆ ئەوەی هەستبکات نەمردوە.

ئێستا لە هەمووی بێزار بووم، دەمویست ئەم فریشتەیەم بترازێت، بە ڕاستی دڵنیابووم ناتوانم کارێکبکەم باڵەکانی ئەو مەخلوقە دڵڕەق و ئازاردەرە کە ناویان دەنا فریشتە، بگێڕمەوە ناوەوە. من وەسواس

دەیکوشتم، دەمگووت کێ دەڵێت ئەوە باڵەکانی شەیتانی ناو ناخم نییە کە دەیەوێت دەرچێت، کێ ڕووی ئەو بوونەوەرەی بینیوە تا بزانێت فریشتەیە یان ئەهریمەن؟ کێ دەڵێت ئەهریمەن وەها باڵی سپی نییە و ڕوخساری لە ڕوخساری هەر مەلەکێکی تر جوانتر نییە. گەر مەلەکێکی ڕاستەقینەیە بۆ لێ ناگەڕێت خزمەتی نیشتیمان و حیزب و سەرۆکەکەم بکەم... ئەی مرۆڤ بە درێژایی مێژوو هەر ئەوەی نەکردوە؟ هەر خزمەتکاری وەتەن و عەشرەت و پاشای خۆی نەبووە؟ بۆ فریشتەکەم ئێستا ئەوەی ناوێت؟. دەمپرسی، من تەنیام یان ئەمە چیرۆکی نهێنی هەموو مرۆڤەکانی تریش بووە؟ من تەنیام یان ئەم شەڕە شەڕی ناو ناخی هەموو مرۆڤەکانی تر بووە؟. شەڕێکە هەندێک مرۆڤ لە گەمژەییاندا هەستی پێ ناکەن، هەندێ مرۆڤیش فڕێدەدەنە ناو نەستیانەوە و لەیادیدەکەن، کەسانێکی تریش خۆیان بەدیوێکدا دەخەن و هەر زوو خاڵی کۆتایی بۆ وەها پێکدادانێکی سەخت دادەنێن تا بتوانن بژین. هەندێ مرۆڤیش دەیدۆڕێنن و شێت دەبن، هەندێکیش وەک من دەبێت تا مردن ئازارەکەی لەگەڵ خۆیاندا ڕاکێشن.

من دەمپرسی بۆ ئەم فریشتەیە لە من بێزارە، بۆ لەو دونیایە بێزار نییە کە من تێیدا دەژیم؟. بۆ لە خودا بێزار نییە کە منی فڕێداوەتە ئەم گەردونە ساردەوە و بێ هیچ کۆمەکێک دەبێت وەڵامی ڕاست بۆ هەزار کێشە بدۆزمەوە کە وەڵامیان لە کتێبەکانی ئەودا نییە؟. ئاخۆ بەعسییەکان بکوژم یان نەیانکوژم؟ خودا بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەم ناداتەوە... خائینەکانی حیزب بە خراپ تەماشابکەم یان نا؟ خودا بۆ وەڵامم ناداتەوە. خزمەتی سەرۆکەکەم بکەم کە نازانم بە تەواوی چی لە سەریدا دەگوزەرێت یان نا؟ ئەی گەر خزمەتی ئەو نەکەم خزمەتی کێ بکەم؟ ئەم فریشتەیە چی لە من دەوێت؟ گەر فریشتەی خودا نییە، هی کێیە؟. دەیان شەو دادەنیشتم و بیرمدەکردەوە. دادەنیشتم و بیرمدەکردەوە. تەنیا وەڵامم ئەوە

بوو کە ئەم فریشتەیە بریتییە لە وەهمی جوانی لە ناو مرۆڤ خۆیدا.
مرۆڤ بە درێژایی مێژوو باوەڕی بە جوانی و هەقانییەتی خۆی هەبووە،
مێژووی مرۆڤ هیچ نییە جگە لە مێژووی باوەڕهێنان بە جوانی خۆی،
دین چییە جگە لە هەوڵی هەمیشەیی مرۆڤ تا بە برای مرۆڤی بڵێت
من لە دینەکانی تر لە خودا نزیکترم، من لە تۆ جوانترم چونکە من
خودا لە تۆ زیاتر ڕاستی پێبەخشیوم. مێژووی دین بە سەریەکەوە، بە
هەموو خودا جیاواز و باوەڕە جیاوازەکانییەوە، هەوڵی بەردەوامی مرۆڤە
بۆ خۆجوانکردن، خۆ جیاکردنەوە، خۆ بە باشتر زانین. هەمیشە دینێکی
تری دروستکردوە تا باوەڕی بە خۆی و جیاوازی خۆی و هەقانییەتی
خۆی زیاتر بێت، هەمیشە خودایەکی تری گەورەتر و بەهێزتر و نادیارتری
لە خودای ئەوانی تر دروستکردوە تا باوەڕی بە هێزی نادیاری خۆی
گەورەتر بێت. وەهمی ئەوەی هەمیشە لە سەر هەقین، وەهمی ئەوەی
هەمیشە خودا لەگەڵ ئێمەیە، وەهمی ئەوەی کە ئێمە جوانترینین و
ڕاسترینین هیچ کات لە ئێمە جیانەبۆتەوە. ئێستا ئەوەی ڕادەکات، ئەو
وەهمەیە، ئەم فریشتەیە کە بەوجۆرە من ئازاردەدات، کە بەجێمدەهێڵێت،
لەگەڵیدا ئەو خەیاڵ و خولیایە دەڕوات کە من لەگەڵ سەرەتای شۆڕشەوە
لەگەڵمدا بووە، ئەوەی هەمیشە لە سەر هەقم، ئەوەی هەمیشە ڕاسترینم،
ئەوەی باشترینم... ئەم باڵانەم باڵی ئەو وەهمەیە دەفڕێت... باڵی ئەو
وەهمەیە دووردەکەوێتەوە، دەدا لە شەقەی باڵ و لە ئاسماندا دەمرێت.

شەوێکیان ڕەشمارا گەڕایەوە، وەک زۆر شەوی تر لێیدام، تەنیا بە
لێدانی ئەو هەستم بە لەشی خۆم دەکرد، ئازاری دەستی ئەو، بیری
دەخستمەوە من جگە لە برغووی حیزب، کەسێکم لە گۆشت و خوێن...
دوای لێدان، ئەو هەمیشە دەڕۆیشت، هەمیشە چەند جارێک هەناسەیەکی
قووڵی هەڵدەکێشا، هێمن و بێدەنگ سەیریدەکردم، لێوی دەسڕی، وەک
یەکێک لە کوشتنی ئەهریمەنێک بووبێتەوە، قۆڵی دادەدایەوە و ژوورەکەی

جێدەهێشت، بۆ سبەی کە یەکمان دەبینییەوە بە هیچ جۆرێک باسی ئەو شانۆگەرییە سارد و ترسناک و بێدەنگەی شەومان نەدەکرد. وەک دوو مرۆڤی ئاسایی، وەک دوو هەڤاڵی یەک، لە سەر بەرچاییەکی سادە دادەنیشتین و بێدەنگ نانمان دەخوارد. ئەو شەوە لیڤیتانت نەرۆی، ئەو هەستێکی بە بەزەیی تێدا نەبوو، عاتیفەی بۆ هیچ شتێک نەبوو. یەکێک بوو لە ساردترین و دڵڕەقترین مەخلوقاتی دونیا کە دیبێتم. ئێستا وەک چەتەوڵێکی گەورە لە سەرسەرم وەستابوو، لە ئەفسەرێکی ڕەشتاڵەی بەعس یان کەسێکی دیکەی لەوجۆرە نەدەچوو، بەڵکو لە یەکێک دەچوو خودا بۆ کارێکی تر دروستیکردبێت و بە ڕێگایەکی دیکەدا ڕۆیشتبێت. وەک مرۆڤێک، ئەو سروشتەی لە خۆیدا سڕیبێتەوە کە خودا پێیبەخشیوە و لە سەر ڕووی نەخشی ئەو خۆی شتێکی دی ڕەسمکردبێت. ئەو شەوە لە تاریکی ژوورەکەدا گووتی «جەنگیز چییتە، دەتبینم ئازارت زۆرە، پێمبڵێ چییتە». دەنگی ڕەحمی تێدا نەبوو، دەنگی وەک خاوەن ئاژەڵێک هاتە بەر گوێم، قسە لەگەڵ هێسترێک یان ئەسپێکی نەخۆشدا بکات. دڵنیابوو ئازارەکانم پەیوەندی بە لێدانەکانی ئەوەوە نییە. من دەمم چەقاندبووە ناو سەرینەکە، هێشتا جمکی بەرگە پشتییەکە لە زارمدا بوو، گووتم «بۆتانی، سەوداسەر و روو لێشێواوم، نازانم بۆ کوێ بڕوانم، لە نێوان خۆم و حیزبدا سەرگەردانم، ناتوانم حیزب بەجێبهێڵم، ناشتوانم خۆم لە بیر بچێتەوە، چاوێک لە ناخمدایە بەردەوام سەیرمدەکات... چاوێکی تیژە... نازانم چی دەوێت، بەڵام دڵنیام ئەم ژیانەی منی ناوێت». بێئەوەی زۆر بیربکاتەوە، پرسی «حیزبی چی؟». سەیرم لە پرسیارەکەی هات و گووتم «بۆتانی چۆن حیزبی چی... من بێ حیزب چیم؟ گەر حیزب نەبێت کەس چڵکی خۆشی بە شان و شەوکەتم ناسڕێت». وەک کەسێک بێماناترین و پوچترین ڕستەی ژیانی بیستبێت، گووتی «جەنگیز، حیزب بوونی نییە، حیزب قەت بوونی نەبووە، بوونیشی نابێت، ئەوەی

هەیە، هەندێ خەڵکی بەهێزن وادەکەن بڕوابکەین حیزب هەیە... ئێمە لێرە ئیش بۆ ئەو خەڵکانە دەکەین، وەختێ لە شاریش بووین هەر وامانکردوە. جگە لە مرۆڤی بەهێز و لاواز، هیچ کات هیچی تر لە دونیادا نەبووە. ئێمە بۆ ئەوەی بەخۆمان نەڵێین ئێمە نۆکەری ئەبەدیین، بە خۆمان دەڵێین ئێمە ئەندامی حیزبین، بەوجۆرە ئازاری کۆیلەبوون لە سەر ڕۆحی خۆمان سووکتردەکەین... تۆ لە لاوازەکانیت، بۆ هەتاهەتاشە هەر لە لاوازەکانی و وادەمێنیتەوە». پێشتر وای پێ نەگووتبووم، دەمزانی ماوەیەکە لە ناخدا لاواز و بێنرخ دەمبینێت، بەڵام بەهانەی زۆری بوو ڕوو بە ڕوو نەیدرکێنێت. ئەو پیاوێکی مات بوو، نهێنی کەسی لە دەرەوە ئاشکرا نەدەکرد، بەڵام کە دیوە لاوازەکەتی دەبینی، نەیدەتوانی ڕێزت بگرێت. ئەو بیرۆکەیەی کە دەیگووت شتێک نییە ناوی حیزب بێت، ناوی بڕوا بێت بە ئایدیایەک، ناوی نیشتیمان بێت، تووڕەیدەکردم. لای ئەو حیزب کارخانەیەک بوو وەک هەر کارخانەیەکی تر کۆمەڵێک پیاوی هێزدار دایدەنێن و ناچارماندەکەن ئیشی تێدابکەین... هەموو شتەکانی دی تەنها بەهانەن بۆ ئەوەی کارخانەکە ئیشبکات و نەوەستێت.

هەندێ شەو ڕەشمارا، کە منی بەوجۆرە دەبینی، کاتێک دەیبینی شڵەژان و تا و ڕاچەنین و کەفدەردان هەراسانمدەکەن، وایدەزانی تووشی پەرکەم بووم، بەڵام هەمیشە هێورمدەکردەوە و دەمگووت ئاساییە، هەر هەمان ئەو دەردە کۆنەی خانمی خێزانی ئێوەیە کە لە سەر سکە ناکامەکەی تووشی بوو، بەڵام من لە مێژە گرتوومەو چاکیش نابمەوە، بۆ من بۆتە دەردێکی بێدەرمان. ئەو دەم شتێکی ئەوتۆمان لە دەنگوباسی خانمی ماردینی نەدەزانی، دوا هەواڵ کە پێمان گەیشتبوو دەگەڕایەوە بۆ هاوینی ساڵی هەشتادونۆ، لەوێدا بە درێژیی باسی ئەوەی کردبوو لە سەر دیوانێکی شیعر کاردەکات، زۆربەی کات لەگەڵ شاعیراندا دەباتەسەر، مانگی جارێکیش ئاسمانی کچی دەبینێت. سەیربوو لام ڕەشمارا تەواو

دەرهەق بە خانم بێباک بوو، بۆی گرنگ نەبوو چی دەکات و چۆن دەژی، هیچ شتێکی لە دوودڵی و ئێرەیی پیاوانە تێدا نەبوو. تادەهات من لیڤیتانتم ئاڵۆزتر و سەیرتر دەبینی، ئاسان خۆی لە سیاسییە بەرزەکان نزیکدەکردەوە، پێشتر وەک کەسێک نەمدەبینی حەزی لە دانیشتنی شەوانە و مەجلیسی سیاسەتمەداران بێت، بەڵام بە پێچەوانەوە، بوو بوو بە یەکێک لە ئەستێرەکانی هەموو دانیشتنێک، بەپێی زانیارییەکانم لەو مەجلیسانەدا زۆر قسەی نەدەکرد، نەدەچووە قووڵایی هیچ بابەتێکەوە، خەیاڵی پتر ئەو کاتانە گەرمدەبوو کە باسی پارە پەیداکردن و ئیشکردن دەهاتنە سەرێ، باشترین کاری دونیا لای ئەو ئەوە بوو ببێتە بەڕێوەبەری زیندان، بەڵام گەر ئەوەی دەست نەکەوتبایە دەبوو بە بازرگان. هێدی هێدی تێگەیشتم ڕەشمارا «کۆکردنەوەی پارە»، وەک جۆرێک لە سزادان و ئەشکەنجە بۆ ئەوانی تر سەیردەکات، باوەڕی وابوو هیچ شتێک وەک بینینی کەسێکی زەنگین و پارەدار ئەوانی دی ئازار نادات. لە ناخی دڵیدا بڕوای وابوو لە زینداندا دەتوانێت تەنیا یەک یەک نێچیرەکانی ئازار بدات، بەڵام گەر دەوڵەمەند بێت دەتوانێت سزایەکی هەمیشەیی و ڕۆژانە و دەستەجەمعی بۆ هەموومان ببڕێتەوە. ئەوە وایکرد لیڤیتانت لە سەقزەوە بیر لە بازرگانی گەورە بکاتەوە. دەمانزانی سامانێکی زۆری هەیە، سەردەمێک لەگەڵ بەعسییەکان کارابوو، بە پارەی زۆر خەڵکیان دەگرت و بەریاندەدا. بەڵام نەمدەزانی پووڵی خۆی لە کوێ حەشارداوە، دڵنیابووم هەموو دەزگای هەواڵگری دونیاش بخەمە کار، ئەوەم بۆ نادۆزرێتەوە، ڕەشمارا پارەکانی چۆن و لە کوێ قایمدەکات. لەوەدا ڕێوییەکی بێوێنەبوو. ئەوە سەرەتای سەرهەڵدانی هونەرێک بوو کە دواتر وەها گەشەدەکات، کەسانی نەفامی وەک من فرێدەداتە پەراوێزی دونیا و زەوی لە ژێر پێماندا دەردەهێنێت. هەر لە شەوانی سەقزدا بۆم دەرکەوت ڕەشمارا بیر لە ئیش و پارە پەیداکردنی زۆر دەکاتەوە، لەوردەمەوە پارەی نهێنی هەندێک لەئەندامانی

ئەنجومەنی باڵای حیزبی خستبووە گەڕ. دەمزانی پاسێکی گەورەی بۆ خۆی کڕیوە تا سەرمایەکەی نەمرێت، دەمزانی هێدی هێدی سەروکاریش لەگەڵ بەرپرسەکانی ئیتیلاعاتدا پەیداکردوە. بەڵام لەو دەمەدا زۆربەی بەرپرسەکان و ئەندامانی ئەنجومەنی باڵا سەروکاریان لەگەڵ ئیتیلاعاتدا هەبوو، دڵنیاشبووم بە فیتی ئەوان فارسەکان بە وردی منیان ناوەتە ژێر چاوەدێری خۆیانەوە. من خۆم ئوستادی ئەو یاری مشک و پشیلەیە بووم، کارەکانیشم شتێکی تێدا نەبوو ئازاردان یان یاساشکێنی بێت، دەشمزانی ئێرانییەکان ڕێزێکی تایبەت بۆ سەرۆک قایلن و دەزانن جاسوسی من کارێکە ڕوو لە حیزبە و زیانی بۆسەر قەلەمرەوی ئەوان نییە. ئێران شوێنێکی گرنگ نەبوو بۆ من، ئێمە لەو جنسەین کە تەنیا لە وڵاتی خۆماندا دەتوانین جاسوس بین. فارسەکان ئەوەیان باش دەزانی، قەت لە مێژوودا نەبووە کوردێک هەبێت بتوانێت لە دەرەوەی وڵاتی خۆی جاسوس بێت، لە بەرئەوە دوای یەک دوو بانگهێشت لەبری ئەوەی ڕقم لێهەڵگرن، بەزەییان بە حاڵمدا دەهاتەوە. بەڕای ئەوان گێلترین جاسوس ئەوەیە، وزەی خۆی لە جاسوسیکردندا بە سەر خۆیەوە بەکارببات، منیش لەو جاسوسە گێلانەبووم، لەو دەمەدا هێندەی بە سەر ڕۆحی خۆم و ئەوانی نزیک خۆمەوە جاسوس بووم، بە سەر هیچ شتێکی دییەوە جاسوس نەبووم.

لە بەهاری ساڵی نەوەد دا نزار ئیدریس بە قاسیدێکی تایبەتیدا نامەیەکی بۆ ناردم. کارەکەی بوێرێکی زۆری تێدابوو، کورتەی پەیامی ئەوە بوو حیزب چ کارێکی پێبسپێرێت ئامادەیە بیکات. دەمزانی یاریدەکات، دەشمزانی حەزی لە یاری ترسناکە، بەڵام ئەوەی لەو کاتە سەختەدا سەری هەڵدایەوە، جۆرێک بوو لە بلیمەتی سیاسی، لە هونەری یاریکەرێک کە دەزانێت هەم یاری ترسناکیش بکات و هەم لەزەتیش لەو یارییە وەربگرێت. زۆر لەوە دەترسا ڕۆژێک بێت ڕەشمارا ببێتە

خۆشەویستی شۆڕش و بەرپرسێکی دەست ڕۆیشتوو، دڵنیابووم خۆی کەسی تایبەت و سەرچاوەی نزیکی هەواڵی هەیە، ئێستا شوێن و پایەی نوێی لیڤیتانتی بیستۆتەوە. نزار لەو پیاوە شەیتانانە بوو کە فێربووبوو زیاد لە قەڵغانێک بۆ خۆی دروستبکات، کیسەڵێکی خێرا و شەیتانی کە چەند چینێکی زیاد پشتەڕەقەی لە خۆی بەستبوو. چەند لیڤیتانت باوەڕی بە هێزبوو، ئەویش هێندە باوەڕی بە فێڵ و خۆپاراستن و سەنگەر لێدان بوو. من چیرۆکی نزار ئیدریسم لەگەڵ سەرۆکدا باسکرد، گووتم «گەورەم کەسێک هەیە لە ڕیزی چەکدارەکانی دەوڵەتدایە، بەڵام دەیەوێت لەم میحنەتەدا شتێک پێشکەش بە شۆڕش بکات، لە ناوەوە هەندێ کاری بۆ دەکرێت کە بەکەسی تر ناکرێن، ئێوە فەرمانتان بە چییە؟». سەرۆک لەو گەمەیەدا قاڵ بووبوو، لە ساڵانی ڕابوردوودا خەڵکانێکی زۆری ناردبووە لای دەوڵەت تا لە کاتی پێویستدا پشتیبگرن و نەهێڵن تووشی نسکۆ بێت. بەڵام شکستی ئەمجارەمان وەها خێرابوو، دەوڵەت بە جۆرێک هێزە تایبەتییەکانی خۆی بەکارهێنا، دڵڕەقی و توندیشی بە جۆرێک دڕندانە بوو، کەس نەیتوانی کۆمەکێکی ڕاستەقینەمان پێشکەشبکات. سەرۆک «خودالێیخۆش بێت و لە گوناهی بێشوماری ببورێت»، هەموو هێلکەی خۆی خستە سەبەتەی ئێرانییەکانەوە، ئەوانیش شەڕیان دۆڕاندبوو. ئێستا دەیزانی دەبێت باجی دۆستایەتی ئێرانییەکان بدات، کە سەرکردەکانی سوپایان هەتا لە کاتی شکستیشدا، ڕوویەکی سارد و بێبزە و پڕ غرووریان هەبوو. سەرۆک سەیری لە جەسارەتی ئەم گەنجە هات، دیارە ناوی نزار ئیدریسی لەیاد بوو، دەیزانی چیرۆکێکی لە پشتە، بەڵام هەموو شتەکانی بە وردی بیر نەمابوو، وەک خۆی دەیگووت گەر سیاسەتمەداری کورد زوو زوو زیهنی خۆی لە ڕابوردوو پاک نەکاتەوە، سەری دەبێتە «ئاشپەزخانەی شەیتان». هەستمدەکرد لە زاری سەرۆکدا وشە ئێرانییەکان شیرین دێنەدەرێ، بەڵام لە دڵەوە حەزم بوو بزانم لەو ئاشپەزخانەیەدا

دەشێت سەرۆک چ ژەمە خۆراکێک بۆ دوژمنانی ئامادەبکات. من پێموابوو سەرۆک لەوەدا لە سەر هەقە، ئێمە خۆمان بێ یادەوەریمان دڕندەین، گەر کینەی یادگارییەکانیشمانی بچێتە سەر، دەبینە جانەوەرێکی بەرباد. ئەوەی چیرۆکی نزار لە یادەوەری ئەودا تێکەڵی دەیان چیرۆکی تر بووبوو ئاسایی بوو، ئەوەی ئاسایی نەبوو چۆنێتی ئەو کارە بوو کە بە نزاری سپارد.

سەرۆک لەو سەردەمە و ساڵانی دواتریشدا، دەیویست بە چاکە، بە شیرینی، بە «موحیبەت» نەیارانی خۆی لە ناو حیزبدا بکوژێت، ئەم پێشنیارەی نزار ئیدریسیش لەو سەردەمە سەختەدا، وەک جۆرە کۆمەکێکی ئیلاهی بوو، تا سەرۆک لە پێشچاوی کادێراندا هەر قودرەتمەند و موعجیزەدار دیاربێت. سەرۆک بە منی گووت «ئەو چووکرێتەی ئەو کورە دەیکا، با بێتە گرفانی بابتەوە». ئەوە بوو نزارمان ڕاسپارد کە ژن و کەسوکار و منداڵی هەندێک کادێری حیزب ڕزگاربکات و ئاودیوی سنووریان بکات. لەو دەمەدا خێزان و بنەماڵەی دەیان کادێری گەورەی ئێمە لە شاردا لە ژێر باری هەلومەرجێکی سەختدا دەژیان، بەردەوام لە ترسی دەوڵەت ماڵە و ماڵ خۆیان دەشاردەوە، سەرۆک زۆر بەلایەوە گرنگ بوو بیسەلمێنێت کە لە خەیاڵی ئاسوودەگی کادێراندایە و مەحەبەتی باوکانەی کاڵ نابێتەوە. ئەو کادێرانەی سەرۆک فەرمانی ڕزگارکردن و گواستنەوەی خێزانیانی دا، بەوە ناسرابوون زمانبەد و تانە هاوێژن، بە هۆ و بێهۆ قسەی ناشایستە بە سەرۆک دەڵێن، یان وەک خۆی دەیگووت «ترسنۆک و بێوەفا تەسنیفیدەکەن». دواتر لە پرۆسەیەکی نهێنی و گەورەدا، نزار بە کۆمەکی هەندێک کادری ناو شار، دەیان ژن و منداڵیان بەسەلامەتی گەیاندە ناو خاکی ئێران و خێزانەکان بە ئاگاداری قەرارگای ناوچەیی پاسداران لە پنتێکی عاسی و سەختی سنوورەوە پەڕینەوە. ئەو کردارە لە چاوی زۆر لە کادێراندا نزار ئیدریسی کردە پاڵەوانێکی

گەورە... لە ماوەیەکی کەمدا نزار لە خائینێکەوە بووەوە بە قارەمانێکی بێوێنە. هەمووان کاری ئەومان بە ئیشێکی جوامێرانە دەزانی، لە دڵیشدا دەمانگووت نزار خەوشێکی نییە وەها لێی بەقین بین. ئەوە ڕۆحی نزار نەبوو، بەڵکو ڕۆحی سەردەم بوو وایدەکرد، دەبایە مرۆڤ هەردەم لە نێوان خائین و قارەماندا جۆلانێبکات، ئەوە ڕۆحی سەردەم بوو وایدەکرد لە ناخی هەر یەکێکماندا جاشێک و پێشمەرگەیەک بۆ ئەبەد پێکەوە بژین.

شەوێک ئەو هەواڵەم بە لیڤیتانت دا، زۆر دڵتەنگ بوو، گووتی «من و ئەو بۆ هەتا هەتایە حیسابێکمان لە نێواندایە. تا من زیندوو بم ئەو ئاسوودە نابێت، تا ئەویش زیندوو بێت من ئاسوودە نابم. لەو پازدە ساڵەی ڕابوردوودا، ڕۆژێک نەبووە بیری لێ نەکەمەوە. هەردووکمان ئەو هەستە نهێنییەمان هەیە، هەردووکمان دەزانین بیر لە یەک دەکەینەوە، بەردەوام ئاگامان لە یەکە، تا نزار بژی، هەستدەکەم من بوونەوەرێکی لاوازم. قەت وەک مرۆڤ ناگەمە تەواوی هێزی خۆم، تا نەزانم نزار مردوە... هەمیشە لای من دونیا ترسناک و ژیان شتێکی گەورەی ناتەواوە... وەک ئەوەیە دەستێکم نەبێت، چاوێکم نەبێت، لاقێکم لە شەڕدا پەڕیبێت. وەک ئەوەیە لە خەودا چاوەڕوانی جانەوەرێک بکەم بێت و پەلامارم بدات و بمخوات».

یەکەمجار بوو ترس و تووڕەیی ڕاستەقینەی لیڤیتانت هەست پێبکەم. ئەو ماوە درێژە پێکەوە بووین خۆشییەکم لەوەدا نەدەبینی ئەو باسەی لەگەڵدا بکەمەوە و یادگاری پێشینی تیادا بووروژێنم. دەمگووت ئەو فاسیلەیەی ژیان خستوێتییە نێوان ئەم دوو مرۆڤەوە، بەشی ئەوە دەکات هێدی هێدی ڕابوردوو لە بیربکەن. بۆ ئەو دەم کارەکەی نزارم بە پاڵەوانێتیەکی گرنگ بۆ حیزب لەقەڵەمدەدا، کارێک بوو بێوێنە و گرنگ، ئەوە دیسانەوە

لیڤیتانتی نائاسوودە دەکرد... هەر کات بۆنی نزاری بکردایە، تووشی ئەو پەشۆکان و ترسە دەرونییە دەبوو... ترسی ئەبەدی لە لاوازیی خۆی.

تا ئابی ساڵی نەوەد شتێکی گرنگ ڕووی نەدا، بەڵام لە سەرەتای ئابدا، سەدام حوسەین کاری هەرە گەمژانەی ژیانی خۆی کرد. هەر لەو مانگە گەرمەدا کە سیاسەتی تەواوی گۆی زەوی شێوا بوو، من و سێ هەڤاڵی دیکە، بە فەرمانی سەرۆک، دوای دانیشتنێکی نهێنی ئەنجومەنی باڵای حیزب لە تاران، بە دەیان کێو و بە دەیان پێدەشتی گەرم و لە ناو ترس و خۆپارێزییەکی زۆردا گەیشتینەوە شار. «پیاو هەمیشە دەبێت ئەوەی لە بیربێت، کە مێژووی ڕاستەقینە مێژووی گەمژەییە. زیرەکی هەر ئەوەیە پیاو سوود لە گەمژەیی ئەوانی تر ببینێت، ئەگینا زیرەکی کوا هەیە». هەڤاڵی جێگری سەرۆک، کە قەڵەوێکی سورفلی چاویلکە لە چاوی خیپش بوو، ئەوەندەی شەرابی سوور خواردبووەوە، ڕوومەتی ڕەنگی شەرابێکی گرتبوو بە ئاو ڕوونکرابێتەوە، بە زمانێکی پیاوانە، کە دانی زۆر لە سەر وشەی «پیاو» دادەگرت، ڕازی لە عەقڵی خۆی، وەک قومارچییەک توانیبێتی بە وریایی هەڵەی قومارچییەکی بەرابەری ببینێت، وەک شێرێکی نێر پاڵیدابووەوە و لە نهۆمی سەرەوەی ئاپارتمانێکی سێ نهۆمیدا، لە تەجریشی تاران قسەی بۆ کردین.

دوای ئەو دانیشتنە بە ڕێکەوتینەوە بۆ کوردستان، بەوەدا من لە هەمووان شارەزاتر بووم، سەرۆک بە نابەدڵی چووە ژێرباری ئەوەی من بۆ نهێنییەکی وا مەترسیدار بنێرێت، چونکە منی بە چاو و گوێچکەی خۆی دەزانی، بەڵام هەڤاڵانی ئەنجومەنی باڵا، کە ئەودەم خۆیان ناونابوو «بیرۆ»، بۆ ئەوەی لەم ڕۆژگارە نوێ و هەستیارەدا خۆیان لە زیانی من بە دووربگرن، هەموو سووربوون من بنێرنەوە بۆ شار، دەیانگووت هیچ کەس وەک تۆ توانای ئیشکردنی لە شاردا نییە، هیچ کەس ڕێکخراوەکانی نوێ و پاشماوە کەمەکانی ڕێکخستن وەک تۆ ناناسێت، ئەوانیش بە

تۆ نەبێت، بە کەسی دی متمانەیان نییە. هەڵبەت قسەکان شتێک لە ڕاستیان تێدابوو، بەڵام دەمزانی دوورخستنەوەی من لە خۆرهەڵات و ناردنەوەم بۆ شار، بە ئومێدی ئەوە بوو لە جێگایەکدا لە نێوبچم و نهێنییەکانم لەگەڵ خۆمدا ببەمە گۆڕەوە... لەو دەمەوە کەسانێک بوون دەیانزانی یادەوەری من، ئەرشیفە نهێنییەکەم، خەزنەی سەرم، چ شتی ترسناکی لە خۆ گرتووە. بۆیە تەواوی ئەو کاتەی لە شار بووم، لە ژێر باری ترس و شڵەژانێکی سەختدا دەژیام. خۆم بە جۆرێکی بێمانا دەپاراست، چونکە دڵنیابووم گەر هەڤاڵانی خۆم جێگای نهێنیم نەزانن کەس ناتوانێت من بداتە دەست بەعسییەکان.

دوای ئەو هەموو ماوە زۆرە کە هۆشەنگی بولبولیارم بینییەوە، سەیری لەوە هات کە من هێشتا بە باڵە سپییە گەورەکانمەوە لە سەر زەوی دەسوڕێمەوە. ئەو وای زانیبوو کە مردوم، هەواڵێکی دروستیان لە من نەبیستبوو، کەدەرکەوتم و منی بە باڵە زەبەلاحەکانمەوە بینی، وایان دەزانی لەو دونیاوە هاتوومەوە، یاخود لە ئاسمانەوە دابەزیووم. من باسی ئێش و ئازاری بەردەوامی خۆمم بۆ کردن، پێمگووتن، من نەمتوانیوە فریشتەکەم ڕازیبکەم، نەمتوانیوە لە حیزب دووربکەومەوە، زۆر شتی بەدمکردوە، تا کارێبکەم فریشتەکەم بڕوات و بترازێت، بەڵام ئەو تەنیا ئازارمدەدات، ڕامدەتەکێنێت و هەڵمدەگرێت و تام لێدەهێنێت. بولبولیار پیشانی خانمی مەلەکبینی دام. باوەڕی وابوو خۆی بە تەنیا حوکمی بۆ نادرێت. خانمی مەلەکبینیش باوەڕی نەدەکرد، هیچ فریشتەیەک پێشتر لەگەڵ ڕۆحی خاوەنەکەیدا وەها چووبێتە جەنگەوە، وەها بیەوێت هۆشی بهێنێتەوە بەر، هەم دڵسۆز بێت و هەم تووڕە. خانم بە وردی پشکنینێکی تەواوی بۆ کردم، گووتی «فریشتەکەت چاوی لە ترازانە، ئەوە هەموو کەرێک دەیبینێت و هەر چوارپێیەکیش بێنە هەستی پێدەکات، خۆت نەبێت. ئەوەتا بەساقە من دەیبینم، بەڵام تۆ خۆتی لێ لەباندەکەیت.

دەبێت کارێکبکەیت، کەمتر بترسێت و بەرەو دەرەوە بجولێت... بەساقە پێیبڵێ، خۆ لە دەرەوە خورماو ڕۆنیان بۆ دانەناویت، لە ناو مندا سەری خۆت حیزکە و دانیشە... وای لە دەست ئەم فریشتانە، بەقەبری عەزیزی باوکم، من بم لە جێگای ئەوان سەری خۆم کزدەکەم و دادەنیشم، بەجەهەنەم ئینسانی حیز و دز چی دەکەن». من بە خانمی مەلەکبینم گووت «نا خاتوون گیان، من لە دەرفەتێ دەگەڕێم، تەواو فڕێیدەمە دەرێ، بە فریشتە و بێفریشتە مرۆڤ هەر حەیوانێکی بەدبەختە». ئەودەم یەک ئارەزووم هەبوو، لە قورسایی ئەم باڵانە ئازادبم کە وەک لەقلەقێکی نەخۆشیان لێکردبووم، گەرچی کەس نەیدەبینین، بەڵام من دەمبینین، هەستم پێدەکردن، ڕۆژ دوای ڕۆژ لە سەر شانم سەنگینتر دەبوون... من چیتر پێویستم بەو باڵانە نەبوو، بۆم هەڵنەدەگیران.

لە شەوێکی تاریکیشدا چوومە لای خانمی ماردینی، سەیرم لێهات کە لە جل و بەرگێکی ژنانەی ئێجگار جوان و نوێدا پێشوازی لێکردم، قژی بە جۆرێکی ئەفسوناوی بەردابووەوە، ماڵەکەی بۆنی عەتری لێدەهات. دڵسۆزانە هەواڵی لیڤیتانتی مێردیم پێگەیاند. لە سەیرکردن و دەنگ و ڕەفتاریدا شتێکم نەبینی نیشانەبێت بۆ بایەخدان و گرنگی بەو پیاوە دوور و غەریبە. بە بێباکییەوە گووتی «نە لەشم، نە ڕۆحم، پێویستیان بە هیچ کەس نییە». هەستمکرد غروری تەنهاییەکی گەورە دەژی. کە زانی بەو هەموو بێباکییەی سەرسامم، کە زانی لە ناویدا بۆ شتێک لە عاتیفەی ژنانە دەگەڕێم و نایدۆزمەوە، خۆی بە جۆرە کەمتەرخەمییەکەوە کە تەنیا لە ژنانم بینیوە، گووتی «غەم بۆ من مەخۆ، جەنگیز، غرور بەرهەمی تەنهایی و تەنهایی بەرهەمی غرورە... منیش حەزم لە هەردووکیانە».

وەک بیستم لەو دوو ساڵەدا جگە لە هەندێک شاعیری ژن و چەندانێکی کەم لە شاعیرانی پیاو نەچووبوونە ماڵی. لە دڵەوە دەمویست بزانم لەو دوو ساڵەدا خیانەتی لە ڕەشمارا کردوە یاخود نا. بەڵام دەمزانی گەر

خیانەتیشی لێکردبێت، بۆ ئەوە نەبووە کە عاشقی کەسێکی دییە، بەڵکو بۆ ئەوە بووە بە پلەیەکی دیکەی بێباکیدا بڕواتە خوارێ. ئەو شەوە کە سەیری چاویم کرد، تێگەیشتم بێباکی، قووڵترین و ترسناکترین چاڵێکە ڕۆحی مرۆڤ تێیبکەوێت.

من لەگەڵ هەڤاڵاندا هاتبووم تا ڕێکخراوە کۆن و خەوتوو و مردوەکانی حیزب زیندووبکەمەوە، دەبوو لە ئامادەباشییەکی تەواودا بین بۆ هەر ئەگەرێکی گەورە، بەڵام هەڤاڵانی یاوەرم، هەر زوو لە ناو کوچە و کۆڵان و شوێنە نهێنییەکانی شاردا ونبوون و ژیانی شار و کاری خۆپاراستن دووریخستنەوە و بردنی. ماوەی سەرەتا هێندەی خەریکی خۆشاردنەوە بووین، کارێکی وەهامان نەکرد. من لە نێوان ماڵی سێ هەڤاڵی کۆندا دەسوڕامەوە. دەستکردنەوە بە چالاکی ڕێکخراوەیی ئەستەم بوو، کەسە چالاکەکانی حیزب هەندێکیان لە زیندان بوون، هەندێکیان گیرابوون بە سەرباز و برابوون بۆ باشوور، هەندێکیان باوەڕیان بە هیچ نەمابوو، هەندێکیشیان لە هەلومەرجی وادا خۆیان لە هەر جۆرە پەیوەندییەک دەدزییەوە. خەڵکانێکی زۆر کەم لە شاردا باوەڕیان بە شۆڕش مابوو، خەڵکی دیکتاتۆرێکی بەهێزیان لە ئازادیخوازیکی هەڵاتوو و ملهوڕ پێ باشترە. من ئێستاش هەروا تێدەگەم شۆڕش بریتییە لە سیحرێکی ڕۆمانسی، بەبێ خەیاڵێکی جوان، بەبێ ئادەمیزادانێک ئامادەبن بۆ خەوبینین بوونی نییە، شۆڕش نە بە بیروڕا و نە بە ستەمی زۆر بەرپا نابێت، شۆڕش پێویستی بە کەسانێکە لە جوانی یاخیبوون بزانن، وەک چۆن دەسەڵات پێویستی بە بوونەوەرێکی واقیعی هەیە ئامادەی خوێنڕێژی بێت، شۆڕشیش پێویستی بە کۆمەڵێک ڕۆمانسی هەیە هەمان ئامادەگیان بۆ توندوتیژی تێدا بێت. شۆڕشگێڕان هەمیشە مەخلوقاتی ڕۆمانسین، ئەوەندەی جوانی شۆڕش شێتیاندەکات، بیرۆکەی ئازادی یان عەدالەت بایەخی نییە لایان. لە هەر دەمێکدا هەستی واقعییانەی مرۆڤ بەهێزتر

بوو لە هەستە ڕۆمانسییەکانی، ئەوکات ئارەزووی مرۆڤ بۆ خۆ گونجاندن لە ئارەزووی بۆ یاخیبوون بەهێزتر دەبێت و شۆڕشیش هەموو دینەمۆ ڕۆحییەکانی خۆی لەدەستدەدات. شۆڕش یاخیبوون نییە لە واقیع، بەڵکو یاخیبوونە لە واقعییەت. لێرەوە هەموو دەسەڵاتدارانی دونیا هەوڵدەدەن لە ڕێگای ترسەوە سیاسەت لە لایەنە ڕۆمانسییەکەی پاکبکەنەوە و بیگێڕنەوە بۆ واقعیبوون. هەڵبەت پەتای ڕۆمانسییەتی شۆڕشگێڕانە، شتێکە وەک گەردەلوول لە ناکاو سەردەمێک دێت، بە سەر زەویدا ڕادەبوورێت، دونیا دەلەرزێنێت و دەڕوات و بۆ دەیان ساڵ یاخود هەندێجار سەدان ساڵ وندەبێت، بەڵام لەو نێوەندەدا کەسانی ڕۆمانسی هەر دەمێنن کە شۆڕشگێڕی ئەزەلیین، کە لە هەموو سەردەمێک و بەدەر لە نەمانی هەر جوڵە و جۆشێکیشدا هەر یاخی ئەبەدیین. ئەو کاتەی من هاتمەوە شار، توانای خەڵک لە سەر بیرکردنەوە لە شۆڕش لە نزمترین ئاستدا بوو، بەر لەوەی ترس چۆکی پێدابن، نائومێدییەکی هەمیشەیی لە شۆڕش، لە شکستی هەمیشەیی، لە دووبارەبوونەوەی یەک لەدوای یەکی هەرەس بێهیوای کردبوون. من لەو ماوەیەدا هەندێک شتی سەرەتاییم پێکەوەنا، دەستخستنی چەک لە ناو شاردا کارێکی سەخت نەبوو، بەڵام پەیداکردنی کەسانێک بتوانن و جورئەتی شاردنەوە و هەڵگرتنییان هەبێت ئاسان نەبوو. تاکە کەسێک هیوام پێی بوو «نزار ئیدریس» بوو، بەڵام نزاریش وەک لیڤیتانت یاریچییەکی ترسناک بوو، لە هیچ ساتێکدا بە تەواوی ڕۆشن نەبوو لە بەرەی کێدا و بۆچی دەوەستێت. بەوەدا ئەو بۆ ئەبەد تەنیا یاری بۆ خۆی دەکرد، هیچ هێزێک و لۆژیکێکی تەواو نەبوو بزانێت لە نیهاندا بیر لەچی دەکاتەوە و هەنگاوی داهاتووی چی دەبێت. وەک دواتر بیستم، ئەو ڕۆژانە سەردەمی دوودڵی ئەو بوون، ئێستا لە گەرمەی دەنگۆ و بانگەشە گەورەکانی جەنگدا، وەک پێشتر دەرهەق بە دونیا کەمتەرخەم و فەرامۆشکار نەبوو، گەرچی وەک هەمیشە ڕانک و چۆغەی

شاڵ و پشتێنی ڕەشی دەبەست و چاویلکەی ڕەشی گەورەی دەکردە چاوی، عەتری گرانی بەکاردەهێنا، دەمانچەی جوانی هەڵدەگرت. گەرچی وەک جاران تەنیا ژنانی ڕاوەدەکرد، کچانێکی لە داو دەنا کە بەجوانی و بۆن و قیافەتی مەستدەبوون، بەو زمانە شەیتانییەی تێدەکەوتن کە وەک ڕۆشنبیرەکان قسەی پێدەکرد، بەو دەنگە خۆشەی کە هەستدەکەم ئەهریمەن بەتایبەت لە خودا بۆی قەرزکردبوو. بەڵام هەموو دەیانبینی کە مەنگییەکی نوێ، کپبوونێکی نائاسایی لە ڕوخسارییەتی، وەک هەموو ئەوانیدی بەردەوام گوێی لە ڕادیۆ دەگرت، دەبوو بگاتە یەقینێک و بڕیارێک بدات. من لە نزارەوە دەمزانی، مرۆڤ چەندە وادەربکەوێت بوونەوەرێکی خۆژێن و گزکار و بێدەروەستە، کە مێژوو جوڵا، کە ئەو زەمینەی ژێر قاچی کەوتە لەرزین و لەرینەوە، ناتوانێت بە شێوازی جاران لە سەر زەوی بڕوات. غروری مرۆڤ تا ئەو جێگایە بڕدەکات کە هیچی لە جوڵەی هێزە نادیار و ترسناکەکانی ناو مێژوو و سروشت نەبینیوە، هەر وەخت ئەو دێوە نادیارانە دەرکەوتن، مرۆڤ بچوکی خۆی، بێسوودبوونی غروری وەیادا دێتەوە و دەبێت ڕابمێنێت و تێفکرێت بە چ کوچەیەکدا ڕابکات.

نزار لە شاردا ناوبانگێکی ئێجگار بەدی پەیداکردبوو، منداڵە زۆڵەکانی تادەهات ژمارەیان لە زیادبوون بوو، وەک دەمبیست لەو ساڵانەدا گەرچی وەک هەموو نەوەی ئێمە شتێک گۆشتی گرتبوو، ناوشانی پانتر و دەموچاوی لە جاران خڕتر دەینواند، بەڵام شەهییەتی بۆ قسەکردن و ئارەزووی بۆ تاکڕەویی نەگۆڕابوون. ژنان چەند جارێک ژەهر خواردیان کردبوو، بەڵام وەک هەموو ئەو کەسانەی من ناویاندەنێم «ئێسقانی ئەستووری نەوەی ئێمە» هەرگیز نەدەمرد.

یەکەمجار لە شەوێکی گەرمی سەرەتای پاییزدا بینیمەوە. کاپشنێکی تەنکی ڕەشی بە سەر جلە کوردییەکانیدا لە بەرکردبوو، گەرچی هەستم بە گۆڕانێکی قووڵ لە سروشتیدا نەکرد، بەڵام هەستم بە گۆڕانێکی

بەرچاو لە ڕوخساریدا کرد، وردە وردە لە گەنجێکی یاخییەوە بەرەو ئەوە دەچوو لە پیاوێک بچێت کە تەنیا لەگەڵ خۆشبەختی و کامەرانی خۆیدا خەریکە. هەستمکرد خواردنەوەی زۆر، سێکسی زۆر، دەسەڵاتی زۆر لە بری ئەوەی دڵنیاییەکی تەواوی دەرهەق بە خۆی پێببەخشن، دوودڵیانکردوە. ئاخۆ لەوە دەترسا ئەو شتانەی لەدەست بچێت؟ نا... هۆکەی ئەوە نەبوو، بەڵکو هۆیەکی قووڵتر و بێبنتر و نادیارتری هەبوو. هەموو ئەو مرۆڤانەی بە زۆر هەموو شتێک لە ژیان دەستێنن، ئەو ترسە قووڵەیان هەیە، هەموو ئەوانە تا ئەوسەر لەگەڵ شتەکاندا دەڕۆن، پێکەوە و بە خێرایی هەموو خۆشی و جوانییەکانی ژیان بە لێشاو دەبەن، دواجار دەگەنە بەردەم سنوورێکی داخراو، سەر خەتێکی پوچ، سەر ڕێگایەک کە جگە لە سەحرای ڕاستەقینەی ژیان هیچی دیکەی لێ نییە، ژیان وڵاتێکە دەبێت بە کاوەخۆ پیابگەڕێیت، دەبێت بە هێمنی و تێڕامانەوە شەقام و کوچە و دارستانەکانی بپشکنیت. هەموو هەڵپەیەک بۆ تێکدانی ئەو هارمۆنییەتە بەتێکشکانی قووڵی مرۆڤ تەواو دەبێت. خاڵێک هەیە لە ژیاندا، خاڵی گەیشتنە بە لێواری ئەو سەحرای پوچییە، ئەو سەحرایەی پێشتر بە سیاسەت، بە سێکس، بە شەراب، بەیاری پڕمانکردۆتەوە، خاڵێکە ئیدی هیچ یەک لەو شتانە لە بینینی بێسنووریی و گەورەیی ئەو سەحرایە نامانپارێزێت، مرۆڤ دەبێت تا دەکرێت گەیشتن بە لێواری ئەو سەحرایە دوابخات، ئەوەش بەوەدەبێت، ژیان قوم قوم، نەوەک بەیەک هەڵدان و یەک تەکان بخواتەوە. نزار بە پێچەوانەی پیاو و ژنە ناکام و ترساوەکانی ئەو سەردەمەوە، ژیانی بە تەکان هەڵدەقوڕاند. بۆچوونەکانی بۆ ژیان ئەمجارە لای من پوچ و دووبارە هاتنە بەرچاو، چیتر نەیدەتوانی باش ڕۆڵی یاخیبوویەکی گەنج ببینێت. بەڵام باوەڕی وابوو کە بەعسییەکان دەچنە جەنگەوە و دەشکێن و دەدۆڕێن، گوتی کە ئەو دەتوانێت زۆر شت بکات، پەیوەندی بە تفەنگدارە کوردەکان و سەرۆک

جاش و ڕابەرانی فەوجە سووکەکانەوە بکات... هەر واشیکرد. بە ڕۆژ وەک ژەندرمەیەکی دەوڵەت دەستدرێژی دەکردە سەر خەڵک و بە شەویش وەک پەیامنێری شۆڕش، کاغەزی تایبەتی منی بە پیاوانی دەوڵەت دەگەیاند تا لە ئان و ساتی ڕاپەڕین و یاخیبووندا ڕووی تفەنگەکانیان نەکەنە ئێمە. لەو بەینەدا متمانەم بە نزار تادەهات گەورەتر بوو، گەرچی چیرۆکی زۆرم لە سەر تاوان و دڵڕەقییەکانی دەبیست، بەڵام من چ باک؟ من ڕام وابوو، شۆڕش پێویستی بەم پیاوەیە. دەمگووت، هەندێ شتی گەورە هەیە تەنیا خەڵکانی خۆژێن و فرەدەست و چەندروو دەتوانن بیکەن، ئەو کات باوەڕم وابوو، فریشتە هیچ کات شەڕی شەیتان ناباتەوە گەر شەیتانێکی دی بە کرێ نەگرێت. نزاریش ئەو شەیتانە بوو کە من بەکرێم گرتبوو... بەڵام عەجەب خۆ من فریشتە نەبووم؟.

نزار ئەو ماوەیە توند منی بەخۆی گرت، دەمزانی نزیکی لە منەوە بە قەڵغانی ئەمان بۆ داهاتوو دەزانێت. ئەوە زامنێک بوو منیش ترسم لێی نەبێت. لەو ناوەدا هەندێک شەو پێکەوە شەرابمان دەخوارد، ئەو بۆ خۆشاردنەوە جێگای نهێنیتر و قایمتری پێشنیاردەکرد، ماوەیەک لە ماڵی یەکێک لە پاسەوانەکانی خۆیدا پەنایدام. شەوان کە دادەنیشتین زۆربەی کات باسی ژیانی خۆی لەگەڵ ژناندا دەکرد. ئێستا ئەوە تەنیا جەنگی ڕاستەقینەی بوو، باوەڕی وابوو ئەوە تاکە جەنگێکیشە کە تا کۆتایی، تا ڕۆژی مردن لە ژیانی پیاودا دەمێنێتەوە. کاتێک باسی گەورەیی و گرنگی سێکسی دەکرد، هیچی لە کەسێک نەدەچوو ساڵانێکە لەگەڵ ئاسایش و پۆلیسی سیاسی دەوڵەتدا ئیشدەکات، هەستمدەکرد، هێدی هێدی وای لێدێت ساتی ئۆرگازم و ترۆپکی لەزەتی جنسی بەو ساتە دەزانێت کە مانای هەموو ژیانی تێدا کۆدەبێتەوە، ساتێک کە مرۆڤ لە جەبری هەموو بوون دەردەچێت و تەنها بۆ خۆی دەژی. ساتی ئۆرگازم ئەو ساتەیە کە تێیدا دین، سیاسەت، نیشتیمان پێکڕا پێکەوە دەمرن... زەمەن، جێگا،

عەقڵ، زانست، کۆمەڵگا مانایان نامێنێت... ئەو ساتەیە لە هەموو ئەم دونیایە دەردەچین، ئەو ساتەیە کە تێیدا مرۆڤ دەبێتە بوونەوەرێکی بێمێژوو، بوونەوەرێکی خاڵی لە هەموو جەبەرێک، بارسووک لە داواکانی ڕابوردوو، بارسووک لە داواکانی داهاتوو، بارسووک لە هەر داوایەک لە جێگایەکی دیکەوە بێت. جیاواز لە هەموو ساتەکانی تری ژیان، مرۆڤ تەنیا لە ساتی ئۆرگازم و مردندا ئەوپەڕی تەنهایی خۆی دەژی. بە منی گووت، هەموو هەوڵی ئەو بۆ نوستن لەگەڵ زۆرترین ئافرەتدا بۆ ئەوەیە بە زۆرترین شێوە ئەو تەنیاییە بێسنوور و تاقانەیەی خۆی، لە شوێنی جیاواز و لەگەڵ کەسی جیاوازدا تاقیبکاتەوە. دەیگووت ئۆرگازم تاکە شتێکە ئادەم و حەوا لە بەهەشتەوە دزیویانە و خودا بە درێژایی مێژوو هەوڵدەدات لە مرۆڤی بستێنێتەوە. مرۆڤیش هەوڵدەدات ساتی هاوشێوەی ئۆرگازم بدۆزێتەوە، تاکە شتێکیش کە تا ئێستا دۆزیویێتییەوە و هەمان هەوا و نەشئەی ئۆرگازمی هەیە ساتی سەرکەوتنە... مرۆڤ لە ساتی سەرکەوتندا، ساتێکی کورت و هاوشێوەی ئۆرگازم دەدۆزێتەوە، بردنەوە لە جەنگدا، هیچ نییە جگە لە ئۆرگازمی دەستەجەمعی نەتەوەیەک، ئۆرگازمی کۆکەلی سوپایەک، یان گەمەزانێک ساتێک گۆڵ دەکات، گەر تەماشایبکەیت، ئەو ساتە ساتێکی هاوشێوەی ئۆرگازمە... ئەو ڕاکردنە، ئەو خۆشییە لە چاویدا، ئەو خۆ بەزەویدا دانە، ئەو فەرامۆشکردنەی هەموو شتێک، ئەو دابڕانە ڕەهایە لە هەموو شتێک، تەواو هاوشێوەی ئۆرگازمە. دەیگووت دەزانی بۆ پیاوان زۆر حەزیان لە تۆپی پێیە، چونکە وەک سێکسی حەرام پڕە لە ترس و دوودڵی، دواجار ئۆرگازمێکی شێتانە، ئۆرگازمێکی دەستە جەمعی پێشکەش بە خەیاڵمان دەکات. ڕاشیوابوو بۆیە بەشی زۆری خەڵک حەزیان لە زانست و کتێب و فیکر نییە، چونکە هەموو ئەو شتانە دوورکەوتنەوەیەکیان لە قودسییەتی ئۆرگازم تێدایە... هەر شتێک فڕێمانبداتەوە ناو مێژوو، ناو بیرکردنەوەوە لە داهاتوو، ناو

ئەو پرسیارە گەورانەی وەڵاممان بۆیان نییە، دژی ئۆرگازمە... کە ساتی پێداگرتنی مرۆڤە لە سەر بوونی ئازاد و خاڵی و ڕەهای خۆی.

لەو ساتەدا کە سەرتاپای جیهان سەرگەرمی کۆکردنەوەی سەرباز بوو، تا لە کەشتی گەورەدا بێن و لە ناوەکانی کەنداودا لەنگەربگرن، کە شۆڕش منی ناردبوو بۆ دروستکردنەوەی ڕێکخراوەکانی حیزب... من و نزار چەندەها شەو، کاتی خۆمان بە باسکردنی سیحری ئۆرگازمەوە دەبردەسەر. نزار هەمیشە بەزەیی بە مندا دەهاتەوە کە ئەزموونێکی ئەوتۆم لە دونیای ئافرەتدا نییە و دەربارەیان شتێکی ئەوتۆ نازانم، ئەو چەند ئۆرگازمە کەمەش من دیبووم و لە باوەشی ئافرەتدا تیا ژیابووم، وەک ئەو باسی دەکرد، بەوجۆرە سیحراوی نەبوو. نزار بەردەوام هانیدەدام «جەنگیز، دەبێت ئۆرگازمی ڕاستەقینە بژیت، ئۆرگازمی ڕاستەقینە». ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە نازانم، بە ڕاستی نازانم ئەو شەوانە، بەشێک بوون لە کۆمیدیا تاڵەکانی ژیان، بەشێک بوون لە سێبەری ئەو پوچییە ئەبەدییەی مرۆڤ تێیدا نوقمدەبێت، یاخود قسەی دووروودرێژمان لە سەر ئۆرگازم، سەرەتا بوو بۆ هەموو ئەو ڕووداوانەی دواتر هاتنە سەر شانۆی ژیانمان. ئاخۆ ئۆرگازم تەنیا سەمبولێک نەبوو بۆ ئارەزوویەکی دڕندە کە هەرگیز ناگاتە کۆتایی؟ نازانم. بەڵام دڵنیام ئەو شەوانە، ئەو عەوداڵبوونە بۆ ئۆرگازمێکی شێتانە، ئۆرگازمێکی دووروودرێژ و ئەبەدی کە هەرگیز نەبڕێتەوە، مەرجی گەورەی هەموو بە سەرهاتەکانی تر بوون... بەتایبەت ئەو بە سەرهاتە گەورەیەی ژیانی منی گۆڕی. من لەو دەمەدا کە حیزب ناردمییەوە بۆ ڕێکخستنی ڕاپەڕین، شەوان وەک شێت بەس بیرم لە قسەکانی نزار دەکردەوە دەربارەی چرکەیەک، دەگەیتە ترۆپکی مەزنی خۆت... چرکەیەک ترۆپکی دەسەڵاتت بە سەر لەشی خۆت و هەستی خۆت و هەموو دونیادا دەژی.

لەگەڵ هاتنی ساڵی نەوەدو یەکدا، ئاشکرابوو ئیدی جەنگ دێت و

لادانی بۆ نییە. بەعسییەکان بەلێشاو هێزەکانی باکووری خۆیان بەرەو باشوور دەگواستەوە. ئەوە هاتنی قاسید و هاتوچۆی ئەمدیوەودیوی نێوان ئێمە و ئێرانی ئاسانکرد. من لەو باوەڕەدابووم شتێکی ئەوتۆ گرنگمان بۆ کۆکردنەوەی هێز و ڕێکخراوەکان بۆ نەکراوە. بەڵام نزار ئیدریس کە زۆرجار لە کۆتایی شەودا گۆرانی بۆ دەگووتم بە مەستی قاقای لێدەدا و دەیگووت «شۆڕش لە سەر من، بەڵام شۆڕشێک دەبێت ئاغای جەنگیز بە تەنیا بۆ خۆمی دەکەم، بەڵام تۆش دەتوانیت بەشداربیت لەگەڵمدا».

# مەخزەن

ئایا بە ڕاست هەڤاڵ شێرخانم بینی، بەڕاست تفی تێکردم، ئاخۆ ژوورێکی لەو شێوەیە و بەوجۆرە لە ناو بورجدا هەبوو... نازانم؟. دەشێت هەمووی وڕێنەی پیاوێکی نەخۆش بووبن، یەکێک لە سەرە مەرگدا، پیاوێک کە بێخەویی، بوورانەوەی بەردەوام، ڕۆیشتنی دووروودرێژ لە سەر ئەو هێڵەی مردن لە ژیان جیادەکاتەوە، خەیاڵاتی نەخۆشی خستۆتە سەریەوە.

دوای ئەوە کە چاوم کردەوە، لە ژوورێکی بچوک و سارددا بووم، بە ڕووتی لە سەر زەوییەکی کاشیکراو کەوتبووم، دوو پیاو لەگەڵ مولازم گزنگدا هاتنە ژوورێ. مولازم فەرمانی پێدان جلم لەبەربکەن. نەمدەزانی چۆن گەیشتوومەتە ئێرە، دڵنیابووم ماوەیەکی درێژ بێهۆش بووم، بەڵام هەستمدەکرد هەموو گیانم تەڕە. دەستم لە خۆم دەدا وشک بووم، بەڵام هەستێکم هەبوو هێشتا لە ژێر ئەو دووشە ساردە نەهاتوومە دەرێ، لەو کاتەوە تا ئەمڕۆ، تا ئەو ساتەی ئەم دێڕانە دەنووسم، بەردەوام

ئەو هەستەم هەیە کە تەڕم، لە دەنگی ئاو دەترسم، بە زۆر خۆم دەشۆم، بەترسەوە سەیریدەکەم. ئەوە هەستێکی کوشندەیە کە هەرگیز لێم نابێتەوە، لە باران دەترسم، لە هەور، لە دەنگی تاڤگە... هەتا کە ئاویش دەخۆمەوە ناتوانم زۆر سەیری پەرداخەکەی بەردەمم بکەم. کاتێک مولازم گزنگ بە توڕەییەکەوە گووتی «هەستە، هەستە دەی، تەڕنیت»، تێگەیشتم لەم بازنەی شەیتانییەدا ڕزگاربوونم نییە. ئێستا مولازم دەموچاوێکی هەبوو جیاواز لە دەموچاوی یەکەمین جاری، کاتێک لە کتێبخانەدا بینیم. هیچی لەو خانمە بەویقارە هێمنە نەدەچوو کە ئەوکات خۆی دەردەخست، گەرچی حالّم زۆر بەدبوو، بەلّام ئەو توندییە خۆشحالّیدەکردم، کەسی سەر بە ئاسایش هەمیشە دەبێت وابێت. دەبێت دوو دەموچاوی هەبێت، پێم ئەفسوس بوو، دەموچاوی یەکەمی گزنگ خان ببینم و دەموچاوی دووهەمیم لێونبێت، بەلّام ئێستا دەمبینی، ڕووە ڕاستەقینەکەی خانمی مولازمم دەبینی، ڕووی دڕی هەموو ئەوانەی لەم بورجەوە پاسەوانێتی نیشتیمان دەکەن.

مولازم گزنگ کەمێک بە توندی کۆمەکی دوو پیاوەکەی کرد، تا دەستێ جلی تایبەتم لە بەربکەن، جلێکی ڕەشی تایبەت بەو پیاو و ژنانەی حیزب فرێیاندەداتە مەخزەنەوە. گزنگ بە توڕەییەوە گووتی «بە ملی شکاوت دەبێت دلّت خۆش بێت نەتۆپیویت، دەی تۆزێک قۆلّت بجولّێنە. بە من بووایە ڕۆحم دەردەهێنایت، کەچەلّی تۆپەلّە گوو، نازانم حیزب تۆی بۆچییە هەلّتدەگرێت. بەخوا نانە ڕەقەکەشت پێ حەرامە». من بەختەوەربووم ئەو قسانەم دەبیست، بەختەوەربووم... ئەوە زمانی ڕاستەقینەی کادێرەکانی حیزب بوو، ئەوە دەموچاوە ڕاستەقینەکەیان بوو، ئەمانیش یەکێک بوون وەک ئێمە... قات و پانتۆلّ و بۆینباخ و هۆکی تۆکییەکانی دەستیان، ویقاری مۆدێرنیان هیچ نەبوو جگە لە دەمامکێکی تەنک، ڕوویەکی ساختە. خۆشحالّ بووم بە ڕاستی بیانبینم،

خۆشحاڵ بووم... خۆشحاڵ. ئەوە دەبووە دەرد بۆ من، بڕۆمە مەخزەن و وابزانم ئاسایشەکانی بورج، لە ئاسایشە دەمپیس و جنێودەرەکانی ئێمە لە ناو شار، باشتر و پاکتر و هێورترن.

دڵنیابووم دەمبەن بۆ مەخزەن، بۆ ئەو جێگا سەیرەی هیچ کەس لە دەرەوە نەیبیستبوو، کەستان نازانن کە جێگایەکی وەها بوونی هەیە. هەموو دەمانزانی حیزب بانکی هەیە، گەنجینەی نهێنی هەیە، زیندانی نهێنی هەیە، ئەرشیفی نهێنی هەیە، بازرگانی نهێنی هەیە، بیری نەوتی نهێنی هەیە، پەیمانی نهێنی هەیە، کۆمپانیای نهێنی هەیە. بەڵام مەخزەنێک کادیرە کۆن و بێکەڵک و توڕدراوەکانی تێدا هەڵبگرێت... تا شتی وامان نەبیستبوو. مولازم گزنگ بە وەحشییەتێکی بێوێنەوە مامەڵەی لەگەڵ کردم. حوکمی فڕێدانی من بۆ مەخزەن، بەس دەبوو سەرۆک «خودا لە گوناهە بێئەندازەکانی خۆش بێت» خۆی مۆریبکات، ئەوەشی حوکمی وای هەبایە، ڕزگاربوونی ئەستەم بوو. خاتوو گزنگ دڵنیابوو جارێکی تر خۆری سەر ئاسمانی شار نابینمەوە، دڵنیابوو جگە لە ئێسقانەکانم هیچی تر لەم کارخانە تاریکە ناچێتە دەرەوە، بۆیە بێباک لە سووکایەتی پێکردنم بەردەوام بوو. بەر لەوەی بچێتە مەخزەنەوە، هۆڵێکی چاوەڕوانی گەورە هەبوو، هۆڵێک بوو لە پێشدەری ئەنتیکەخانەیەکی گەورە دەچوو، دیوارەکانی ژوورەکە بە تەختەیەکی تێرڕەنگی ئەسپەرتۆکراو داپۆشرابوون، مۆمیای هەڵۆیەکی گەورە، گەماڵێکی ڕەش، گوربەیەکی زل و نائاسایی، لەگەڵ مارێکی ئەستوور و درێژ لە بەر دەروازەکەدا دانرابوون، پێشتر گەماڵی وا گەورە و گوربەی وەهام نەبینیبوو، تێنەگەیشتم مەبەست و مانای پشت دانانی ئەم جانەوەرانە چییە، بەڵام حیزب و هەڤاڵانی بیرۆی باڵا لەو بیست ساڵەی دواییدا، زمانێکی تایبەت و سیستمێکی ڕەمزی ناوازەیان بۆ خۆیان دروستکردبوو، گەر یەکێک لە نزیکەوە لە ناویاندا نەژیابایە، نوکتەکانی

نەبیستنایە، شارەزای ئەو تێکستانە نەبایە کە دەیخوێننەوە، ئەستەم بوو لە میتافۆرەکانی زمان و لە سەمبولە نهێنییەکانیان تێبگات. ژوورەکە پڕبوو لە کەرەستە و شتی کۆن، مەکینەی کۆنی چاپ، ستێنسڵ، ڕۆنیۆی ژەنگاوی، مەرەکەبی ڕەش لە دەبەی گەورەدا، بەستە کاغەزی بۆر، چەند ئامێرێکی شکاوی ڕادیۆ، بڵندگۆ، ئەمپلیفایەری تۆزاوی، بەکرەی کێبل، دەمانچەی ژەنگاوی، کلاشینکۆفی شکاو، مەخزەنی خوێناوی، چەندین دەرپێی ژنانەی کوردیی، مەنجەڵی گەورە گەورەی پڕ لە نیسک و ساوەر، سەدان سەعاتی شکاو، سۆبای تەنەکە بە دوکەڵکێشە درێژەکانیانەوە، پەرەمێزی شکاو، دەیان فانۆس، لۆکسی خوار و قوپاو، شوشە بیرەی بەتاڵ، جانتای دڕاوی سەفەر، ژمارەیەک دەفتەری خزمەتی سەربازیی، پۆستەری فڕێدراوی ژمارەیەک شەهید... شتگەلێکی زۆری دیش کە یادم نەماون، هەموو پێکڕا بە جۆرێکی ناڕێک، وەک دەستێک بە گشتی لەو گۆڕەی توڕیدابن وەهابوو. وا تێگەیشتم ئێمە، هەموو ئەوانەی لەم مەخزەنەدا بە زیندوویی هەڵدەگیرێین، وەک جۆرە ئاژەڵێکی مردوو، وەک جۆرە سەمبولێکی شکاو، وەک حەیوانێک کە تەنیا وێنەکەیان ماوەتەوە تەماشادەکرێین. ژوورەکە تەنیا کورسییەکی تەختەی کۆنی تێدابوو، ئەوە سەرەتای دەستپێکردنی هەرێمێکی تایبەت بوو کە جودا بوو لە هەموو هەرێمەکانی تری ناو بورج و ناو نیشتیمان. هیچ کەس لە دەرەوەی دەرگای پێش هۆڵەکە بۆی نەبوو بێتە ژوورێ. ئەستەم بوو مولازم گزنگ و یاوەرانی، پێبخەنە ئەم شوێنەوە... ئێرە جیهانێکی تر بوو، کەسانی خۆی هەبوو کە پەیوەندیان بە هیچ کەسێکەوە نەبوو. هێند هەبوو لە بەردەرگای مەخزەن، فایلێک و دوو سەمونیان دایە دەستم، لە سەر فایلەکە نوسرابوو «یادگاریی ژمارە چوارسەدوشەست». فایلەکە لە نایلۆنێکی تایبەتدا دانرابوو، دەبوو لە پێش هۆڵەکە دانیشم تا یەکێک دەرگاکە دەکاتەوە و سەیرێکدەکات تا بزانێت کەسی نوێ

هاتـووە. هەندێجـار ئـەو چاوەڕوانییـە لەوانەیـە چەنـد ڕۆژێکـی پێبچێـت، مانـای زەمـەن لـە مەخزەنـدا جیاوازە لـە مانـای زەمـەن لـە دەرەوە. ئەوانـەی کـە دێنـە ئێـرە دەزانـن کـە چیتـر وەک بەشـێک لـە یادەوەرییەکـی تاریـک و فەرامۆشـکراو سـەیردەکرێن، دەبێـت تێبگـەن کـە چیتـر جگـە لـە یادگارێـک کـە لـە کونجێکـی تاریکـدا هەڵدەگیرێـن، هیچـی تـر نیـن. زەمـەن لێـرە بـە هێمنـی دەڕوات... بـە هێمنـی... زۆر بـە هێمنییەکـی کوشـندە.

دڵنیابـووم پتـر لـە ڕۆژێـک لـە پێـش هۆڵـی مەخزەنـدا مامـەوە، وەهـا ماندووبـووم، دەمودەسـت لـە نـاو کەلوپەلەکانـدا خـەوم لێکـەوت، لـەو سـاتەدا بـەس بمتوانیبایـە بخـەوم، بەهەشـت بـوو بـۆ مـن. مـرۆڤ لـە یەککاتـدا دەبێـت بـە بەشـێک لـە ڕابـوردوو، کاتێـک جگـە لـە مـردن یـان خەوتـن ئاواتێکـی دیکـەی نامێنێـت. منیـش کـە گەیشـتمە بـەردەرگای مەخـزەن، نـە هیچـم دەربـارەی سـاڵەکان و شـوێنەکان لـە یادبـوو، نـە دەمزانـی کێـم، نـە دەمزانـی بـۆ لەوێـم... بووبـووم بـە گەردێکـی بچوکـی نێـو تـەم، تەمێکـی تاریـک و ترسـناک کـە جگـە لـە لێڵکردنـی دونیـا، ئیشـێک و مانایەکـی تـرم نەبـوو.

کـە هاتمـەوە سـەر خـۆم، سـەرنجی هـەر دوو ئـەو دەرگایـەم دا کـە لـە سـەر ژوورەکـە بـوون، دوو دەرگای ئاسـنینی زۆر قـورس و ئەسـتوور دیاربـوون، لـەو جـۆرە دەرگایانـەی بـە ئاسـانی ناشـکێنرێن، هـەر دووکیـان بـە بۆیـەی ڕەش ڕەنگکرابـوون، دیمەنـی دەرگاکان ئـەو هەسـتەی پێدەدایـت هیـچ شـتێک بـە ئاسانی لـەو دەرگایـەوە نایەتـە ژووری و هیـچ شـتێک لەوێـوە ئاسـان ناچێتـە دەر. مـن بەجـۆرێ یادەوەریـم کاڵ بووبـووە، بـە شـێوەیەک شـتەکان لێـڵ و ئاڵۆزبـوون، نەمدەزانی بۆچـی سـزایەکی کۆتاییـم نادەنـێ. دەرمانـی زۆر، بوورانـەوەی بـەردەوام، بەشـێکی یادەوەرییـان سـڕیبوومەوە، بیرم نەدەهـات لـەو ماوەیـەی پێش گرتنمدا چـی بـووم، دەمزانی لە ئاسایش بـووم، دەمزانـی لـەوێ گوێـم لـە جنێـو بـووە، دەمزانـی مـولازم گزنـگ لـە

بورج لە مولازم پرشنگ یان سەعدوڵا قرپاچ باشتر نییە. بەڵام من تەواو چ کارەبووم، نەمدەزانی. یادمبووماڵێکی گەورەی خۆشم هەبوو، کارەکەرێکی ئەتیوپیم هەبوو، بەس چۆن ئەو ماڵەم دروستکردبوو، کارەکەرە ئەتیوپییەکەم ناوی چی بوو، یادم نەبوو... هەستمدەکرد بە ڕاستی یادەوەریم پڕبووە لە چاڵ و چۆڵی گەورە، لە شتگەلێک دەبێت دووبارە بیاندۆزمەوە. لە ناکاو ئەو دەرگایە کرایەوە کە دەبوو بکرێتەوە، پیرەمێردێکی کۆماوەی غەمگین هاتە ژووری، بە جوڵەو جەستە هێشتا چوست و چەڵەنگ بوو، بەڵام ڕوخساری لە سیمای پەیکەرێکەوە نزیک بوو لە سەر دارێکی کۆن هەڵکەنرابێت، سیمای چرچ بەڵام نورانی بوو، دەستێک مراخانی ڕەشی لەبەردابوو، سەر قۆڵەکانی فەقیانەدار بوون. بە ڕێزێکی تایبەتییەوە گووتی «سڵاوت لێبێت کوڕم». دەنگیشی ئاسایی نەبوو، قووڵ و زامدار بوو، وەک غەمێکی کۆن لە گەرویدا شکابێتەوە، وەک هەر وشەیەکیش لە دوو لێوانی دەترازێت، بەو غەمە ڕەنگین بێت. شێوەی جوڵە و قسەی لە مجەورێکی سەردەمانی زوو دەچوو، گووتی «دۆسییەکەت و ژمارەکەتم بدەرێ... بزانم دەبێت جێگایەکت بۆ بدۆزمەوە، بەڵام پێش ئەوە دەبێت هەموو شتێکت بۆ ڕوونبکەمەوە... وەرە لەگەڵم کوڕم، وەرە».

لەو ژوورە نارێکەوە بردمی بەرەو جێگایەکی زۆر تاریک، ڕاڕەوێکی زۆر درێژ، دیوارەکانی هەموو بە ڕەش ڕەنگ بوون. جێگاکە بە جۆرێکی ترسناک بێدەنگ بوو، کپییەک و بۆساردێک لە هەوای جێگاکەدا پەنگی خواردبوو، زەمینی ڕاڕەوەکەش بە مۆکێتێک ڕاخرابوو، کە ئەویش لە پێش چاوی من هەر ڕەش دەینواند. کە بەداڵانەکەدا گوزەرمانکرد، پیرەکە گووتی «من ناوم میرزا ئیحسانە، ڕاستیت دەوێت، دەزانم ئیحسان ناوی خۆمە، بەڵام میرزا لە کوێوە هاتووە نازانم. چەند ساڵێکە پێمدەڵێن میرزا، من تۆ دەناسم، من لە خزمەت جەنابی سەرۆکدا

بووم، لە خزمەت هەموو ئەندامانی دەفتەری سیاسیدا بووم، هەڵبەت شتێکی گرنگ نەبووم، خزمەتی من هەمیشە بچوک و نادیار بووە، لەوجۆرە خزمەتانەی بە ڕوکەش نرخێکی ڕاستەقینەیان نییە، بەڵام ژیانیش بەبێ ئەوانە ناڕوات، وەک ئەوەی ساڵانێکی زۆر ڕۆڵی پارێزەریی یادەوەرییەکانی سەرۆک بووم، مەخزەنێکی نهێنیم دەبردەڕێوە کە ئێستا میرزا سدیق، کوڕی مەلا سەفوەتی ناندار بەرپرسێتی. لەوێ هەموو شتێکمان دەپاراست، لە پێڵاوە کۆنەکانی سەرۆکەوە تا ئەو بەرگە پشتیانەی شەو سەری موبارەکی دەنایە سەریان. لە ڕاستیدا بۆ مێژوو دەبێت بڵێم، سەرۆک سەرەتا ئەو شتانەی زۆر پێخۆش نەبوو، بەڵام یادەوەری هەر یادەوەرییە. بیستوومە دەڵێن لە ئەورووپا شوێنێک هەیە تایبەتە بە پاراستنی تووکەبەری سەرۆکە گەورەکان، بیستوومە دەڵێن لە لویسی چواردەوە تووکەبەریان هەڵگیراوە تا دەگاتە سەر تووکەبەری خاتوو مارغرێت تاتشەر، هاوڕێیەکەم جارێک سوێندی بۆ خواردم کە خۆی پەنجەی لە تووکەبەری ناپلیۆن پۆناپارت داوە... گەر ئەوان بۆ سەرۆکەکانیان وابن، ئێمە بۆ وانەبین. نا وامەزانە من حیزبیم یان زۆر شەیدای سەرۆکەکانم، بەڵام بۆ مێژوو دەڵێم، یادەوەری شتێکی ترە... بە گەنجی ماوەیەک مامۆستای مێژوو بووم، لەوە ئیدراکێکم پەیداکردوە، یادەوەری بەیاسای چاکە و خراپە کارناکات. یادەوەری پێویستە لە نینۆکی شەیتانەوە تا دەگاتە سەر پرچی فریشتە هەموویان پێکەوە هەڵگرێت».

هەستمکرد پاڕەوەکە ساردە، بەڵام ساردییەکی جیاواز لەگەڵ ساردی زستاندا، ساردی جێگایەکی فەرامۆشکراو، شوێنێک سەر بەو دونیایانە نییە کە من بینیومن، دابڕاوە لە هەموو ئەو کات و شوێنانەی پێشتر بەناویاندا ڕۆیشتووم، ساردی جێگایەک پەیوەندی بە هیچ وەرزێکەوە

نییە و وەرزی تایبەتی خۆی هەیە. شوێنێک پێدەچێت پلەی گەرمای ناخی مرۆڤی هەبێت، شێی، شێی ناو یادەوەریمان و نسرمیشی، نسرمی یادچوونەوەمان بێت. میرزا ئیحسان لە پێشمەوە دەڕۆیشت و قسەیدەکرد، گوتی «خۆت دەزانی بورج تازەیە، بورج کۆنێکی وەها نییە، بەتایبەت قاتی سی و سێ. ڕاستە ئەم شوێنە لەگەڵ بورجدا دروستکراوە، ناکرێت بڵێین قاتی سی و سێ پێش بورج بونیادنراوە، ئەگەرچی یادەوری خۆی هیچ مەنتیقێکی نییە، بەڵام مرۆڤ دەبێت تۆزێک مەنتیقی بێت. بەڵام گەر ڕاستت دەوێت ئەم جێگایە، وەک شوێنی هەڵگرتنی شتە فەرامۆشکراوەکانی مێژوو، لە بورج کۆنترە. ئەگەر بورج ئێستا حەقیقەتە، پێشتر هەمیشە وەک خەیاڵ لە ڕۆحی حیزبدا ژیاوە، بورج شتێک نییە ئێستا بەرزبووبێتەوە، بەڵکو ڕوویەکی خەیاڵی هەیە کە زۆر دێرینە. بورج بەر لەوەی دروست بێت هەبووە، ئێستاش کە دروستبووە، ئەم مەخزەنە ئەگەر کۆنترین جێگای نەبێت، ئەوا تاریکترین جێگایەتی. من ئەم شوێنە ناو دەنێم شوێنی یادەوەرییە خنکاوەکان، جاران جێگای ئەو یادەوەریانە ئاشکرا نەبوو، هەموو وڵاتەکە بوو، حیزب هەر کەسێکی نەویستایە، ئەندامێکی فەرامۆشبکردایە، خائینێکی بگرتایە و بیویستایە لە بیر خەڵکی بەرێتەوە، جێگایەکی ئەوتۆی نەبوو، شوێنێکی تایبەتی بۆ ئەو شتانە دیاری نەکردبوو. بەڵام دواجار دەبوو ئەم جێگایە دروستبکرێت، شوێنێک وەک مۆزەخانەی ئینسانە لە بیرکراوەکان، ئەوانەی چیتر بوون بە ڕابوردوو، ئینسان چییە هەڤاڵ جەنگیز چییە؟ ئینسانیش وەک هەر شتێکی دیکە کە کاری نەما، کە بە سەرچوو، دەبێت جێگایەک، مۆزەخانەیەک، شوێنێک هەبێت تێیدا هەڵبگیرێت. ئێرە مەخزەنێکی گەورەیە، مەخزەنی ڕۆحە لە یادکراوەکانە... ئەوانەی شایستەی سزای مردن نین، هەندێ کەس هەن نەشایستەی ژیانن نە شایستەی مردن. ئەوانە دەبێت شوێنێک هەڵیانبگرێت... جێگایەک،

مۆزەخانەیەک، مەخزەنێک، شتێک... وانییە عەزیزم... مەخزەن جێگایەکی وەهایە، شوێنی ئەو مرۆڤانەیە کە نە شایستەی ژیانن نە مردن. من گەرچی خۆم لێرە وەک فەرمانبەر کاردەکەم، بەڵام خۆم بە یەکێک لە ئێوە دەزانم... لە ڕیزی ئەو کەسانەدا خۆم دادەنێم کە نە شایستەی ژیانن و نەمردن».

بیرم نەدەهات هەرگیز ئەم پیاوەم دیبێت یان بیستبێتم، بەڵام من خۆم یادەوەریم نەمابوو، ئەو کەسەی خۆی ببێت بە یادگار، هێزێکی ناوەکی وای لێدەکات نەیەوێت یادبکاتەوە. هیچ شتێک لەوە بەدتر نییە لەساتی مردندا، بیر لە هەموو ئەو ڕێگا درێژە بکەیتەوە کە تا بەردەرکی مردن تۆی هێناوە.

میرزا منی بەرەو ژوورێکی تر برد... ژوورێک سەدان دۆسیەی تێدابوو، مێز و کورسییەکی ڕەش لە ناوەڕاستدا دانرابوون، تەواوی دیوارەکان، ڕەنگی دۆلابەکان، بەرگی دۆسییەکان، هەموو ڕەشبوون. لە بەری دیوارێکدا، پەردەیەکی ئەستووری ڕەش هەڵواسرابوو، بەڵام هەستم نەکرد پشتی پەردەکە پەنجەرە بێت، هەستمکرد هەموو ئەم جێگایە پەنجەرەی نییە. دیاربوو پشتی پەردەکەش هەر دیوارە، ئەوەی هەیە و نییە هەندێک دەلاقەی نادیار و نهێنییە بۆ هەوا کە ئێمە نایبینین. میرزا بە ویقاری پیرێکەوە کە جگە لە سەیرکردنی مردن، هەر شتێکی تر لەلای بایەخی نییە، چووە پشت مێزەکەی خۆی و گوتی «لیوا جەنگیز بە خێربێیت، بۆ گەنجینەی هەڤاڵە لە یادکراوەکان. فەرموو دانیشە». هەستمکرد مردوم و گەیشتومە جێگایەک بەر لە جەهەنەم و ئێرە جێ پێشوازیی منە. وەک بزانێت بیر لە چی دەکەمەوە، گوتی «حیزب دەرهەق بە تۆ لە بەردەم دوو ئەگەردا بوو، یان بتکوژن یان ئیفلیجت بکەن، بە جۆرێک زمان و یادەوەری و ئەو شتانەت ئیش نەکات. بەڵام

جەنابی سەرۆک، وەک وەفایەک بۆ خزمەتی دووردرێژی تۆ بۆ حیزب، بڕیاری دا بتخەنە مەخزەنی هەڤاڵە لە یادکراوەکانەوە، بتخەنە ناو ئەو بەشەوە لە ژیان و یادەوەری حیزب کە دەرچوونی بۆ نییە. هەڤاڵان زۆربەیان لەگەڵ ئەوەدا بوون لە دوا ڕۆژەکانی مانەوەتدا لە ئوتێل بتکوژن، هەتا دەنگۆ لە حیزبدا زۆرە کە هەندێک بەراستی ویستوویانە سەرپێچی ڕێنماییەکانی سەرۆک بکەن و بە جۆرێک لە جۆرەکان کۆتاییت پێبهێنن، من هەموو ئەو شتانەم بە نوسراوی تایبەتی بۆ هاتووە، ئەوەش شتێکی مەنتیقییە. خۆت دەزانی دەرچوون لە ئوتێل موعجیزەیە، ئەوەی کەوتە ئوتێل یان تامردن لەترسدا دەبێتە کۆیلەی هەتاهەتایی حیزب، یان دەمرێت. ئەوەی حیزب ناردی بۆ ئوتێل واتە دەیخاتە بەردەم دوو ڕێگاوە یان کۆیلەیی ڕەها یان مردن. بەلام من و تۆش ماوەی درێژ لەگەڵ سەرۆک ئیشمانکردوە، خۆت دەزانیت سەرۆک لە چاو ئەندامانی تردا زۆر بەرەحمترە... یاخود نازانم؟ زۆرجار هەستدەکەم هەڵگرتنی مرۆڤ وەک مەکینەیەکی شکاو. وەک ئالەتێکی کۆنی چاپکردن کە ئیتر هیچ چاپ ناکات و کەس پەنجەی بەر دوگمەکانی ناکەوێت، مەنتیقی نییە. بەلام سەرۆکیش بێچارەیە، هەندێ کەس هەن شایستەی مردن نین، یان کوشتنیان بە جۆرێک باری ویژدانی حیزب قورسدەکات، وا لە بکوژەکان دەکات لە هەمان چارەنوس بترسن. لیوا جەنگیز من گەیشتوومەتە ئەو بروایەی لە حیزبدا بەزەیی نییە، نا حیزب بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە، گەر لە حیزبدا کەسێک ناکوژن لەبەر ڕەحمەت نییە، بەڵکو لە بەرئەوەیە هەموو دەزانن دەمێک کوشتن دەستی پێکرد ئیتر ناوەستێت. کە تۆ ناکوژن ئەوەیە هەموو هەڤالان دەترسن ڕۆژێک لە ڕۆژان بکەونە جێگایەکی لەمجۆرە. من لەو چەند ساڵەدا چەند لە کۆبونەوە نهێنییەکانی بیرۆی بالای حیزبدا بەشداربوویم، هەمیشە بە ترسەوە سەیریانکردوم، وەک مجەوری شەیتان. من گەرچی هیچ نیم

جگە لە پاسەوانی یادەوەرییە غەمگینەکان، هیچ شتێکم بە دەست نییە جگە لەوەی نەهێڵم لێرە ڕابکەن، نەهێڵم لێرە بڕۆنە دەرێ، بەڵام هەموو دەزانن کە جێگایەکی نادیار هەیە من بەرپرسم لێی، ئەو جێگایە چییە و کوێیە کەس بەدروستی نازانێت. لە سەروو بیرۆی باڵاوە لیژنەیەکی نهێنیتر و کاریگەرتر هەیە، کە سەرۆک خۆی یان کوڕێک لە کوڕەکانی، یان برازایەکی یان نازانم کەسێکی نادیاری تر دەیبات بەڕێوە. من هێز و توانای دەرککردنم بە سروشتی ئەو لیژنەیە نییە، بڕیارەکانی ملکەچی مەنتیقێکی نهێنییە، هەموو شتێک لەوێ زۆر بیری لێدەکرێتەوە، بەڵام من پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆم بە لیژنەکەوە نییە. لیژنەکە کەسانێک وندەکات کە مرۆڤ واهەستدەکات هیچ تاوانێکیان نییە، کەسانێکیش ئازاد و بەرەڵا جێدەهێڵێت کە من بەتاوانبار و دوژمنی حیزب دەیانبینم. ئیشی ئەو جۆرە لیژنانە تێکدانی مەنتیقە، ئەوەش بۆ خۆی زۆر مەنتیقییە. من هیچ نیم جگە لەگەورە پاسەوانی یادەوەرییەکان، خۆت دەزانیت پاسەوانیش هیچ نییە جگە لە دیلی هەموو دیلەکان. نا هیچ کەس لە مەنتیقی ئیشکردنی ئەو لیژنە نهێنییە نازانێت، منیش کارێکم بە لیژنەکەوە نییە. من زۆر کەم دەردەکەوم، تەنیا ئەو کاتە دەردەکەوم کە حیزب بیەوێت ئاماژەیەک بۆ دونیای دەرەوە بنێرێت و بڵێت، ئێمە شوێنی گەلێک نهێنی و ترسناکمان هەیە کە باشترە خۆتانی لێ بە دووربگرن، کاتێک دەیەوێت حەیوانە ترسناک و پیرەکەی ناو ناخی خۆی دەربخات، ئەوکاتە من دەردەخەن. من هەمیشە هەبووم بەڵام کەم کەس منی بینیوە، ئیشی من بە گشتی لە ناو ژیانی عمومی حیزبدا نەبووە. لێرە هەندێک هەڤاڵمان هەیە کە خەڵکی وادەزانن مردون یان سەفەریانکردوە یاخود وازیان لە سیاسەت هێناوە، بەڵام هەموو لێرەن، بەداخەوە لە مەخزەندا ئێوە وا دادەنرێن کە کەس ئەوی دی نابینێت، تەنیا من دەزانم کێ لێرەیە و بۆ لێرەیە. مەخزەن لە کۆمەڵێک دۆڵابی

تاک تاک دروستبووە. لە زیندانی ئاساییدا پێیدەڵێن زینزانە یاخود سلول، من لێرە بە مەنتیقی خۆم ناوم ناون دۆڵابچە یان زینۆچکە. هەر کەس زینۆچکەی خۆی هەیە. هەوڵماونداوە زینۆچکەکەکان وەهابن کە زیندانییەکان یەک نەبینن، چونکە هەمیشە مەترسی ئەوە هەیە حیزب لە ناکاو پێویستی بە یەکێک بێت لە گەنجینەی یادەوەرییە لە بیرکراوەکاندا... ئەگەری ڕوودانی کاری وا زۆر کەمە، بەڵام لەو پازدە ساڵەی رابوردوودا کە من بەرپرسی ئێرەم، ڕێدەکەوێت حیزب ناچاردەبێت مردوویەکی خۆی زیندووبکاتەوە... ناچاردەبێت کەسێک کە پۆستەری شەهیدی بۆ دروستکراوە، چلەی ماتەمینی بۆ گیراوە، یادی ساڵانەی بۆ کراوە، حیزب دەریدەهێنێتەوە و لە ژێر باری کۆنترۆڵێکی گەورەدا زیندوویدەکاتەوە. مەسەلەکە هەر ئەوە نییە حیزب پێمان بڵێت دەسەڵاتی بە سەر ئەم دونیا و ئەو دونیاشدا هەیە، نا، مەسەلەکە ئەوەیە کە جۆرێک لە ملکەچی کوێرانەی ئەندامەکانی دەربخات. ئەوەی وتی بمرن دەمرن... وتی ونبن وندەبن... وتی دەرکەون دەردەکەون ».

لەو بەینەدا کە ئەو قسەیدەکرد، هەندێجار شتێکم دەگووت یان پرسیارێکم دەکرد، بەڵام میرزا ئاگای لە من نەبوو. لەو ئێستەدا سەری بەرزکردەوە و بینی من قسەدەکەم، خەندەیەکی گرت و تۆزێک ناوچاوانە چرچەکەی خوراند و گووتی «هەڤاڵ جەنگیز قسەمەکە. من ناتوانم هیچ ببیستم، من کەرم، پازدە ساڵە هیچم نەبیستووە. کە سەرۆک ئەم پۆستەی پێسپاردم و قەبووڵمکرد، هەر ئەو شەوە لە بیمارستانێکی نهێنیدا بە سێ پزیشکی تایبەتی کەرپانکردم، بۆ هەتاهەتایە توانای بیستنم نەماوە. ئەوە شتێکی مەنتیقییە، ئەوەی ئەم کارەدەکات، نابێت هیچ ببیستێت. سەرۆک خۆی لەوێبوو، پێی گووتم تۆ چەند ساڵە دەڵێیت من دڵ و ڕۆحم دەکەم بە فیدای حیزب. ئێستا حیزب شتێکی بچوکی لێتدەوێت، گوێکانت، بەس ئەوەندە. من زۆر گریام، بەڵام سوودی

نەبوو... ئێرە مەخزەنی دەنگە خنکاوەکانە، ئەو دەنگانەی کەس نایانبیستێت. هیچ قسەیەکی ئێوە لێرە ناچێتە دەرەوە، هەرچی کەسێک لێرە کاردەکات کەرە... هیچ کەسێک نییە دەنگی ئێوە ببیستێت. نە من، نە هیچ یەکێکی تر لەوانەی لێرە کاردەکەن. حاڵی ئێمە لێرە لە حاڵی ئەو غوڵامانە دەچێت کە سەردەمانی زوو لە سەرای حەریمەکانی خەلیفەدا کاریاندەکرد، ئەوانە دەبوو هەموو خەسێنرابن، ئێمەش دەبێت هیچ نەبیستین. هەر خیانەتێک لەم ئەمانەتە، بەوە کۆتایی دێت، یان بکوژرێین یاخود وەک ئێوە لە زینۆچکەیەکدا بگیرسێینەوە. بەڵام لیوا جەنگیز، گەر بیری لێبکەیتەوە شتەکە مەنتیقییە. هەر ئێمە وانین، حیزب لە پازدە ساڵی ڕابوردوودا دەیان هەزار کادێری کەڕکردوە. هەموو ئەو بێژەرانەی تەلەفزیۆن دەبینی، ئەوانەی لە کەناڵی نیشتیمان تیڤی کاردەکەن، کچە جوانەکان کە هەواڵ دەخوێننەوە، پێکڕا کەڕن، بەس دەتوانن ئەو قسانە بخوێننەوە کە دەخرێتە بەردەمیان، دەبێت هیچ شتێکی تر لە دەرەوە نەبیستن. شتەکە زۆر مەنتیقییە».

ئەو هەواڵە موچڕکێکی سەیری بە لەشمدا هێنا، بەڵام میرزا هەستی بە شتێکی تایبەت نەکرد. بەردەوام بوو لە قسە «ئێمە ڕۆژنامەیەکی تایبەتی دەخوێنینەوە، بۆمان نییە ڕۆژنامەکانی تر بکڕین یان پێمان ببینرێت. ئەو کادێرانەی کە نهێنییە هەرە گەورەکانی حیزب هەڵدەگرن دەبێت تەنیا گوێ لە حیزب بگرن. مەنتیقییە... زۆر مەنتیقییە».

« ئیتر زینۆچکەکەت شوێنی ژیانی تۆیە. وەک هەر شتێک کە لە مەخزەندا هەڵدەگیرێت، نایەتە دەرەوە، لەوانەیە من هەندێجار دەرتبهێنم و قسەت بۆ بکەم، تەنیا من ئەوەم بۆ هەیە، بەڵام منیش جگە لەوەی بتهێنم بۆ ئێرە، بۆ ئەم ژوورە، هێزێکی ترم نییە. دەرگاکان وا دروستکراون کە تەنیا کارمەندانی ئێرە دەتوانن پیاتێپەڕن، لەو

دیو دەرگاوە پشکنینێکی توند هەیە، هەتا من کە بەڕێوەبەری بێچەند و چوونی ئێرەم، لە هاتوچۆدا پشکنینی توندم بۆ دەکرێت... ئێرە جێگایەکی مەحکەمە، یادەوەری حیزب دەبێت داخراوترین، تاریکترین، زامنکراوترین جێگای دونیا بێت، گەر وانەبێت شتەکان مەنتیقی نین. واتە لە ئێستاوە تامردن، درێژترین ڕێگایەک تۆ پێیدا بڕۆیت، مەودای نێوان ئەم ژوورە و زینۆچکەکەتە، کە دەکەوێتە دووری بیست مەترێکەوە لێرە... بەڵام منیش خۆم پیاوێکی بێیادەوەرییم، ناچارم بەردەوام یادەوەریی خۆم پاکبکەمەوە تا شوێن بۆ شتی نوێ خۆشبکەم، کەسمان هەیە لە پێش دروستکردنی بورجیشەوە لە زینۆچکەکەی نەجوڵاوە، نامەنتیقی دێتە بەرچاو، بەڵام زۆر مەنتیقییە، زینۆچکەکان لە پێش بورجەوە هەن. ئەوانەی لێرە دەمرن، وەک مردوە ئاساییەکان نانێژرێن، چییان لێدەکرێ؟ نازانم... دەسووتێنرێن، دەخرێنە حەوزی تێزابەوە، قیمە دەکرێن؟ نازانم... بە ڕاستی زانیارییەکی تایبەتم دەست نەکەوتووە، هەندێجار زانینی شوێنی مردویەک لە زانینی شوێنی گەنجینەیەکی نهێنی ترسناکترە. لە بەرئەوە نەپرسیومە مردوەکان دەچن بۆ کوێ، نە دەتوانم بپرسم. بەڵام مردومان زۆرە، مردومان زۆر زۆرە...ساڵانە دەیان مردومان هەیە... ئەوەش مەنتیقییە. یادەوەری شتێکی مەحکەم نییە، هیچ شتێک وەک ئەو شتانەی مرۆڤ لە یادەوەریدا دەیانپارێزێت لاواز نییە، بێدەنگترین مردن، مردنی ئەوانەیە کە دەچنە ناو یادەوەرییەوە».

واهاتە پێشچاوم کە بەراستی غەمگینە بۆم، بەردەوام سەیری چاوی دەکردم، وەک ئەوەی ناتوانێت بە گوێ بیبیستێت، بە چاو بیخوێنێتەوە. زیرەکی و وریاییەکی بێوێنە لە نیگایدا بوو، هەموو جێگایەکی پیربوو، تەنیا چاوی گەنج بوو، تەنیا چاوی. بەڵام دڵنیابووم، وەک هەر کەسێکی تری ئەم وڵاتە ڕقی لە کارەکەی خۆیەتی.

«لیوا جەنگیز گەر بتوانم و یادم بێت، زوو زوو بانگتدەکەم، من لە زەمانی سەقزەوە تۆ دەناسم، ئەو کاتیش کاتبباشی سەرۆک بووم، هەمیشە بە نهێنی لە ژوورەکەدا لەگەڵتان بووم. دەزانم بۆ تۆ ئاسان نییە، بۆ منیش ئاسان نییە، بەڵام دەبێت پێتبڵێم کە من دەزانم تۆ لای خۆتەوە هەڵگری یادەوەرییەکی تریت، مەخزەنێکی تری یادگارییەکانت دروستکردوە. من لێرە نوێنەری یادەوەری ڕەسمی حیزبم... شتێکی مەنتیقییە کە دەبێت وابم».

بۆ یەکەمجار زەردەخەنەیەکی تیژ و زیرەک و نهێنی گرت، بە ئەسپایی گوتی «تۆ نوێنەری یادەوەرییەکی نهێنیت، یادەوەرییەک حیزب نایەوێت دان بە بوونیدا بنێت... یادەوەرییەکی ڕەشترە لەم جێگایە، تاریکتر... بەڵام یادەوەرییەکی یاخییە، زۆر یاخییە، دەیەوێت بترازێت، بڕوات، باڵبگرێت، وەک شەیتانێک بێت و هەڵگەڕابێتەوە، فریشتەیەکی ڕەش بێت و کەوتبێتە خوارەوە». لەو ساتەدا سەیری چاویمکرد، لە منی نەدەڕوانی، بەڵکو وەک کوێرێک سەیری سەقفێکی دووربکات، سەیری جێگایەکی نادیاری ناو ئاسمانێکی نادیاری دەکرد و ئەو زەردەخەنە ڕۆشنە لە چاویدا بوو کە هەرگیز بیرم ناچێتەوە.

هەستا، لە من ماندووتر دیاربوو، وەک هەستبکات زیاتری گوتووە لەوەی دەبێت بیڵێت، گوتی «بابڕۆین. ڕۆژانە دوو ژەم خواردنی سادەتان هەیە، زینۆچکەکەت هەموو شتێکی تێدایە. ئینسان بە هەوا، خواردن، پیسایکردن دەژی، بەڵام لە شەرایتی ئێوەدا، چونکی بوونەتە یادەوەری، شتێکی دی هەمیشە هاوڕێتانە، تاریکی... تاریکییەکی بێسنوور و هەمیشەیی. ئەم جێگایە، جگە لە ژوور و جێگای کارمەندەکان کە بە ڕۆشنایییەکی کز ڕۆشندەکرێتەوە، هیچ تیشکێکی تری تێنایەت. زینۆچکەکان کە دادەخرێن، ئیتر بە فەرمانی من یان سەرۆک نەبێت ناکرێنەوە. زوڵمەتی ئەبەدی لە جێگایەکی خاڵیدا. ببورە مان و نەمانی

تۆ لێرەدا لە دەست ئێمەدا نییە، گەر نەخۆش کەوتیت، ئازارت بوو، هاوارتکرد، بزانە کەس ناتبیستێت، هیچ کەس. کارمەندانی ئێرە ئامێرێکی گەرمی پێویان هەیە گەر بمریت دەزانن، لە بەرئەوە حاڵی تۆ لە زینۆچکەکەتدا جگە لە خۆت هیچ بوونەوەرێکی تر نایزانێت، یادەوەری وەک هیچ شتێک نییە گەر کەسێک لە دەرەوە بانگی نەکاتەوە ناژی، بەڵام بەوەدا ئێوە لە قەڵایەکی قایمدا هەڵگیراون، کەس نازانێت لە چ کونجێکی نیشتماندان، بانگکردنتان ئاسان نییە، بیرت نەچێت کە ئێمە هەموو کەڕین. تا ئێستا سەرۆک کلیل بە دەستی سەرەکی ئەم جێگایەیە، هەر شتێک ئیمزای ئەوی لە سەر نەبێت لێرە ناڕواتە دەرێ، هەر شتێکیش ئەو نەیەوێت نایەتە ئێرە، من شەش مانگ جارێک لەگەڵ خۆیدا دادەنیشم و هەموو هەق و حیسابێک دەکەم... بابڕۆین لیوا گیان... ئیتر شەو دەست پێدەکات، شەوی ڕاستەقینە، شەوی درێژ».

وشەی شەو لە زاریدا ترسناک زرینگایەوە. بە بەستەیەک کلیلی گەورەوە پێشمکەوت. گورج وەک شەیتانێک، لە خزمەتی خودایەکی شەڕانیدا بێت، بە ڕاڕەوێکی درێژدا بردمی. لە دووری بیست مەترەوە، دەرگایەکی ڕەشی ئەستووری کردەوە. بە چپەوە، وەک بیەوێت سامی ئەم ساتە دوو بەرابەرتر بکات گووتی «ئەمە جێگای تۆیە... لێرەدا بە هێمنی، بەبێ هاوار، چۆن بە ویقارەوە ژیاویت، ئاواش لەیادچوونەوەی خۆت بژی... بۆ هەتاهەتایە، بەختەوەر بە بەوەی تا مردن لە مەخزەنی یادگارە غەمگینەکانی حیزبدا هەڵگیراویت». لە دوا ڕستەیدا بێباکییەکی قووڵ هەبوو. ژوورێک بوو تاریک، ژووری چوارسەد و شەست. ژووری هەتا هەتایی من، ژوورە ئەبەدییەکەم، شوێنی تەواوبوونی سەفەرم... جێگای کۆتاییهاتنی یارییە درێژ و ترسناک و خوێناوییەکەم. جێگای مردنی من... جێگای قەشەنگی مردنی بێدەنگی من.

# پەتای نائومێدیی

نەغەدە ماردینی کە بۆ جاری دووەم قەسیدەی پەترۆسی پێگەیشت، ئەمجارەش نەیخوێندەوە، نامەکەی کردەوە، بێباک خستییە ناو کتێبێکەوە و بێباک یادیکرد. بولبولیار دەیزانی چیتر لە نێوان ئەو و ماردینیدا شتێکی گەورە شکاوە، بەڵام بەلایەوە گرنگ بوو خانم سەرەتا سیحراوییەکەی خۆی لە دونیای شیعردا نەشێوێنێت. ساڵانێک لەوەوبەر، نەغەدە پێیگووتبوو «شاعیران لە هەر کەس زیاتر خیانەت لە شیعر دەکەن، بەوەی سەر زەمینێک دروستدەکەن، یەکەم کەس خۆیان ناتوانن بچنە ناوی». بەڵام بۆ بولبولیار گرنگ نەبوو، گرنگ ئەوە بوو سەر زەمینێک هەبێت، مرۆڤگەلێکیش هەبێت هەوڵدەن بگەنە ناوی، ماردینی ئەوەی بە سەمبولی خیانەت و بێباکی شاعیران دەزانی، ئەویش ئەوەی بە سەمبولی ئەو ئەستێرە مەحاڵ و ئەستەمە دەزانی کە تەنیا شاعیران بە دووربینەکانیان دەیبینن.

بولبولیار لە کەشتیی فریشتەکانەوە هەستیدەکرد شتێک هەیە دەمرێت... شتێک هەیە وردە وردە دەمرێت، دەیزانی مردنی فریشتەکان بەشێکە لە مردنێکی گەورەتر. ئەو شەو کە تادرەنگ تێکستەکەی ماردینی خوێندەوە، لە نێوان وشەکان و لە بەینی دێڕەکاندا ئەو مردنە نادیارەی بینی، مردنێکە وەک ڤایرۆسێکی هێمن شتەکان دەخوات. نەیدەزانی چییە و ڕەنگی چۆنە، بەڵام دڵنیا بوو لێرەیە، دڵنیابوو لە هەموو شوێنێک دەیبینێت. مردنێکە یەک کەڕەت نایەت، مرۆڤەکان و شتەکان ناکوژێت، بەڵکو هێدی هێدی لە ناوەوە هەڵیاندەکۆڵێت و بەتاڵیاندەکاتەوە. دڵنیابوو ژیان بەرەو سەردەمێک دەچێت شتەکان تەنیا

قاوغـی بۆشـیان دەمێنێتـەوە، ژیـان وەک گوێزێکـی لێدێـت کـە بەرگێکـی ئەسـتوور و ڕەقـی هەیـە، لەگـەڵ ناوکێکـی پـوچ و ڕەش. ڕۆژێـک لـە ڕێزانـی مەلەکبینـی بیسـت کـە فریشـتەکان بـەراورد بـە جـاران گـۆڕاون، بێرۆحتـر بـوون، پوچییەکـی ناوەکـی گرتوونـی. بـەڵام لـە خانمـی نەپرسـی چـۆن؟ نەیپرسـی بـۆ؟ بەڵکو ئەوەشـی وەک نیشـانەی ئـەو لافـاوی مردنـە گەورەیـە وەرگـرت.

شـتێک نەدەچـووە خەیـاڵ و هۆشـی بولبولیـارەوە ئـەوە بـوو، ماردینیـا ببێتـە فریشـتەیەکی وەهـا غەمگیـن. ئـەو لـەو ڕۆژەوەی لەگـەڵ دکتـۆر شـوکاکدا گەڕایـەوە، وەک هەسـتی بـەو تراژیدیـا قووڵـە کردبێـت کـە بوونـی ئـەوی لـە سـەر ڕاگیـراوە. غەمگیـن خـۆی لـە ژوورەکەیـدا دیلکـرد. بـاوەڕی وابـوو ناتوانێـت هیـچ پێشـکەش بـە مـرۆڤ بـکات ، خـۆی وەک بەشـێک دەبینـی لـە دنیایەکـی کـۆن... تـەواوی کەشتییەکەشـی وەک مۆزەخانەیـەک دەهاتـە پێشـچاو، مۆزەخانـەی ئـەو مرۆڤانـەی لـە ڕۆژگارەکانـی تـردا بـە سـەردەچن و باویـان نامێنێـت. کـە ئـەو ماچـەی نێـوان دکتـۆر و نـەوای بینـی، تێگەیشـت مـرۆڤ ئەگـەر باشـە یـان خـراپ، هەمیشـە پێویسـتی بـە مرۆڤێکـی دیکـەی وەک خـۆی زیاتـرە، نـەک فریشـتە یـان خـوا یـان هیچـی تـر. لـە خـۆی دەپرسـی، ئایا دەبـوو دکتـۆر کاری وەهـای لـێ نەوەشـێتەوە و نـەوا لـە بەرچـاوی ئـەو مـاچ نـەکات، دەبـوو؟ بـەڵام بـۆ ماچـی نـەکات؟ ئەو وەک فریشـتە خاڵـی بـوو لـە غەریـزە، خاڵـی بـوو لـە ئـارەزووی کوشـندەی مـرۆڤ بـۆ ئەویتـر... لـە بەرئـەوە هەسـتیدەکرد هیـچ لـە دونیـا تێنـاگات. بـە درێژایـی ژیانـی وەک فریشـتەیەک لـە ڕۆحـی خانمـی ماردینیـدا تـوڕە و ناڕازیـی بـوو... دەبـوو هەڵبهاتایـە، دەبـوو خـۆی بکوشـتایە، دەبـوو بمردایـە، نەدەبـوو خانـم شـوو بـە ڕەشـمارا بـکات، بـۆ دەسـتی ئـەم کـوڕە هێمـن و جـوان و ڕۆمانسـییەی نەگـرت کـە نـاوی بولبولیـارە و پێـی نەگـووت عاشـقتم؟ بـۆ منداڵێکـی بـۆ جەهەنەمـی ئـەم ژیانـە دروسـتکرد؟... ماردینیـا لـە هەمـوو

چرکەکانی ژیانی ماردینیدا هاواریکردبوو .. بەڵام ئەو گوێی نەگرتبوو. ئێستا بیریدەکردەوە کە دەشێت هەمان ئەو پەیوەندییە کێوی و درندە و بێڕەحم و پڕ هاوارەی لە نێوان نەغەدە و نزاردا بووە، لە نێوان دکتۆر و نەواشدا دروستبێت. ئەوسا فریشتەکانی ئەوان چی دەڵێن؟... دەیزانی کە فریشتە پارێزەری ئەخلاق نییە لە مرۆڤدا، بەڵکو مەخلوقێکە دەیەوێت لە نێوان شتەکاندا جوانترین و باشترین هەڵبژێرێت. بەڵام ئەو ماچەی نێوان نەوا و دکتۆر خستییە گومانێکی قووڵەوە، نە لە بەرئەوەی هیچ خراپییەکی لە خودی ماچەکەدا دەبینی، بەڵکو لە بەرئەوەی ئێستا دڵنیابوو مرۆڤ بوونەوەرێکە چاو دەنوقێنێت و دەڕوات... مرۆڤ بوونەوەرێکە خۆشبەختی خۆی لەوەدا دەبینێت وەک کوێر بە زەمیندا ڕێبکات. مرۆڤ بوونەوەرێکی کوێرە، تەنیا وەک کوێریش دەتوانێت، زەوی وەک نشینگە وماڵی خۆی تەماشابکات، مرۆڤ لەو گەشتەدا، گەشتی نابینایەکی بێنیاز ڕێگای دەکەوێتە ناو باغی بۆنخۆش و ناو ئاگریش، بەڵام ئەو ناتوانێت لە هیچ وێستگەیەکدا بوەستێت، ئەو مەحکومە بە ڕۆیشتن. دەبێت بڕوات و هیچ چارێکی نییە جگە لەوەی بڕوات. ئەوەی دەیەوێت هەمیشە دوورە، هەمیشە مەحاڵە، چارێکی نییە جگە لەوەی کە هەر چییەک لە نزیکییەوە بێت، لە بەردەمیدا بێت هەڵیبگرێتەوە... مرۆڤ هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ هیچ ئاژەڵێکی برسیدا کە بە بیابانێکی چۆڵ و ترسناکدا تێدەپەڕێت، هیچ جیاوازییەکی نییە... چۆن ئەو ئاژەڵە هەر شتێکی بێتە بەردەم دەیخوات بۆ ئەوەی بژی، بۆ ئەوەی هەست نەکات مردوە، بۆ ئەوەی بزانێت لە ڕیزی زیندواندایە. ئەوەی بۆ مرۆڤ گرنگە هەستکردن نییە بە جوانی، بەڵکو هەستکردنە بە ژیان، ئەوەی شتێک بکەیت دڵنیابیت هەستەکانت ماون، تامت نەمردوە، بۆنت نەمردوە، چاوانت هێزی سەرسامیان تێدا ماوە، دەتوانیت بۆنبکەیت، مرۆڤ ناتوانێت بە نیازی گەیشتن بە میوەیەکی خەیاڵی، دەستبەرداری

خواردنی درک بێت... گەر گوڵ نەبوو، مرۆڤ پیسایی بۆندەکات، گەر خواردنی تامدار و پاک دووربوون، مرۆڤ گۆشتی یەکتر دەخوات. ئەوەیە مرۆڤ، لەبەر ئەوە لە بنەڕەتدا بوونی فریشتەیەک لە ناخیدا هیچ نییە جگە لە ئەشکەنجەیەکی ترسناک و دڵڕەقانەی ئیلاهی.

بۆ یەکەمجار ماردینیا دەستی دەخستە سەر دەموچاوە جوانەکەی خۆی، دەستی دەخستە سەر نیگا ساف و یاقووتییەکانی، لە پەنجەرەی ژوورەکەوە سەیری باغەکانی کەشتی دەکرد، سەماکانی خۆی و دکتۆر شوکاکی لە نزیک فوارەکەوە بەیادا دەهاتەوە. ماردینیا وابیریکردەوە فریشتەکان ئامێرێکی ئەشکەنجەدانی مرۆڤن... ئەو بە درێژایی ژیانی هیچ نەبووە جگە لە ئازاردەرێکی خاتوو ماردینی، نەغەدەش ئەو مرۆڤە بێزارەبوو کە دەیویست هەستبکات زیندووە، وەک ئەو ماچە کتوپڕ و تۆخ و شێتانەیەی نێوان ئەوا و دکتۆر شوکاک، کە هیچ نەبوو جگە لە هاوارێکی قووڵ، بانگەوزایێکی بێسنوور بۆ ژیان.

ماردینیا ئەمڕۆ باوەڕی بە نائومێدییەکەی میرائیل دەهێنا، دەیزانی ڕەشبینی ئەو لە جێگای خۆیدایە، بەڵام جیاوازی ئەو لەگەڵ میرائیلدا ئەوەبوو ئەم لە فریشتەکان و ئەو لە مرۆڤ نائومێدبوو. لای ئەو مرۆڤ مەخلوقێکە قابیلی چاکبوون نییە، لای ئەمیش فریشتەکان کەرەستەیەکی ئازارن بۆ ئەم بوونەوەرە لاوازە گەورەیە، کە لە ڕاستیدا هەموو شتێک دەکات، تەنیا بۆ ئەوەی لاوازی خۆی بشارێتەوە.

غەمگینی کتوپڕی ماردینیا هەمووانی سەرسامکرد، ئەو سەرەتا وەک فریشتەیەک دەردەکەوت کە غەم پێی ناوێرێت، بەڵام ئێستا بە جۆرێک تەنها و گۆشەنشین بوو، فریشتەکانی دیش باوەڕیان نەدەکرد. بەردەوام بێدەنگ و دەست لە ژێر چەنە و غەمین بوو. دکتۆر شوکاک دوای چەند ڕۆژێک دڵنیابوو ئەم فریشتەیە بە جۆرێک دڵی شکاوە، هیچ شتێک چاکی ناکاتەوە. هەوڵەکانی دکتۆر بۆ ئاساییکردنەوەی شتەکان،

بـە ناکامـی گەیشـت. بـەڵام ڕۆژان و مانـگان و هەفتەکانـی دواتـر دکتـۆر شوکاک هـەر وەک عاشـقێکی شـەیدا ڕەفتاریدەکرد، ڕۆژانـە چەنـد سـەعاتێک لـە ژوورەکەیـدا دەمایـەوە، فریشـتەکە هیـچ کات وەک جـاران قسەوباسـێکی ئەوتـۆی لەگـەڵ دکتـۆردا نەدەگۆڕییـەوە، بـەڵام هـەر هەستکردنێک بە نزیکـی لەگـەڵ ئـەم خانمـەدا، دکتـۆری بەختـەوەردەکـرد، گەرچـی لـە بێدەنگـی زیاتـر هیـچ شـتێک لـە نێوانیانـدا نەمابـوو، بـەڵام بێدەنگیش وەک دوا پـرد، وەک دوا دەرگا، لای دکتـۆر لـە دووری و مـردن باشـتربوو. غەمگینـی ماردینیـای فریشـتە لـە ڕاسـتییەکی قووڵـەوە سـەرچاوەی گرتبـوو، دۆزینـەوەی ئـەو هەقیقەتـەی کـە فریشـتەیەکی هەڵهاتـوو ناتوانێـت ژیانێکـی ڕاستەقینە بژی، هەتـا گـەر تەندروستیشـی گونجـاو بێـت، هەتـا گـەر بتوانێـت سەماشبکات، بـەڵام شـتە گـەورەکان، موعجیـزە ڕاسـتەقینەکان تەنیـا لەدەسـتکردی مرۆڤـن. ئـەو ماوەیـە هەسـتی بـە سـووکبوونی خـۆی دەکـرد، هەسـتیدەکرد لـە سـەر زەوی نییـە، دڵنیابـوو فریشـتەکان تارماییـن، بوونەوەرێکـن تەنیـا لـە خەیاڵـی ئەوانـی تـردا هـەن و ئـەم کەشـتییەش جگـە لـە کەشـتییەکی لاواز، سـووک، خۆنەگـر، هیچـی تـر نییـە. هەمـوو شـتەکان وەک ڕاسـتییەکی تـاڵ لـە پێشـچاوی بـوون، نـە مـرۆڤ دەتوانێـت گـوێ لـە فریشـتەکەی بگرێـت و نـە فریشـتەش دەتوانێـت مـرۆڤ ڕزگاربـکات. هەردووکیـان دوو بوونـەوەرن هـەر یەکەیـان بـە ئاڕاستەیەک دەڕۆن و ناگەنـە یـەک. غەمگینـی ماردینیـا کاریگەرییەکـی قووڵـی لـە سـەر فریشـتەکانی تـر جێهێشـت، دوای کەوتنـی کتوپـڕی ماردینیـا بـۆ نـاو غـەم، ئەوانـی دیش هەمـوو پەژمـوردە و دڵتەنـگ دەیاننوانـد. بولبولیـار وەک دەرەنجامـی ئیشـی ڕۆژانـەی لەگـەڵ ئـەم بوونـەوەرە ناسـک و نەخۆشـانەدا هەسـتیکرد ئەگەرچـی فریشـتەکان لـە کەشتییەکەدا گۆشـەگیر و دوور دەردەکـەون، بـەڵام ئـەو گیانـی تـرس و شـەڕانگێزییەی لـە شـاردا بڵاوبۆتـەوە کاریگەرییەکـی گـەورەی لـە سـەریان هەیـە. فریشـتە نەخۆشـەکان هەسـتیاندەکرد لـە دووریشـەوە ئاسـۆی هیـچ

جۆرە ژیانێکی جیاواز دیار نییە، وردە وردە لەو راستییە تێدەگەیشتن و ئەوەیان بە یادا دەهاتەوە کە ئەوان بۆیە لە مرۆڤ هەڵهاتوون، چونکە ئەگەری دروستکردنی ژیانێکی تر لە سەر زەوی نەماوە. بولبولیار دەیبینی ئێستا فریشتەکان تادێت زۆرتر دەبن، بەڵام ژیانیشیان کورتتر و کورتتر دەبێت. دواجار کە باسی ئەو ساڵانەی بۆ من کرد، گوتی «ئەو سەردەمە کەشتیی فریشتەکان لە بیمارستانێکی راستەقینە دەچوو».
ئەو دوو ساڵە بەردەوام فریشتە دەهاتن و ماوەیەکی کورت بەبیماری لە پێخەفی مردندا دەمانەوە و دەمردن، زۆربەیان فریشتەی تەنیا و ماندوو و نەخۆشبوون، وەک گەڵای وشکی پاییز ناسک بوون، دەبوو بترسن لەوەی نەوەرن، وەک گوڵێک کە نەکرێت بە ئاستەمیش پەنجەی بۆبەرێت، هەموو مایل بە ژاکان بوون. هەر کات فریشتەیەکی نەخۆش دەهات، دەبوو مەلەکبینەکان بە خێرایی جێگایەکی بۆ ئامادەبکەن و کارێکبکەن زوو نەژاکێت، بولبولیار تا زیاتر لەگەڵ فریشتەکاندا رادەهات، تا پتر لە هەڵگرتن و دانان و کۆمەککردنیاندا قاڵ دەبوو، پتر ئەو هەستە دەیبرد کە لەگەڵ جوانییە نهێنی و شکاو و هەڵهاتووەکانی مرۆڤدا مامەڵەدەکات. هەستیدەکرد ئەوانەی دەیانبینێت فریشتە نیین هەر خودی مرۆڤن، بەڵام لە دوا پلەی ناسکی و تەنهایی و شکستدا. لەو ماوەیەدا کە فریشتەکان دەهاتن و دەمردن، گۆڕهەڵکەنەکانی کەشتی کە دوو کوڕی گەنج بوون، بەردەوام گۆڕیان هەڵدەکەند. هەمیشە هەموو گیانیان لە تۆز و قوڕدابوو، زۆرجار بولبولیار کە تاریک دادەهات، کە دەیزانی فریشتە نەخۆشەکان دەخەون، لەگەڵ دوو گۆڕ هەڵکەنەکەدا دەکەوتە هەڵکەندنی گۆڕ، جار هەبوو بە درێژایی شەو ئیشیاندەکرد، گۆڕی ئامادەیان ریزدەکرد، دەنگی پاچ و بێڵیان لە هەموو فەزای کەشتییەکەدا دەنگی دەدایەوە. میرائیل و ژمارەیەک لە فریشتەکان، هەندێک شەو نەدەخەوتن، لە پەنجەرەکانەوە تەنیا سەیری گۆڕهەڵکەنەکانیان دەکرد. بولبولیار هەستیکرد هەموو

تێکچوونێکی ڕاستەقینەی ژیان لە دەرەوە، هەموو دڕندەییەکی گەورە، هەر شەپۆلێکی گەورەی ترس، فریشتەکان زەردتر و ژاکاوتر و نەخۆشتر دەخات. دەیزانی لە نێوان دونیای دەرەوە و ئەواندا پردێکی نادیار و نهێنی هەیە... وەک ئەوەی هەر فریشتەیەک بە تەنیا قیبلەنمایەک لە دڵیدا بێت، پێی بڵێت حاڵی مرۆڤ چییە و ئەو بوونەوەرە غەمگینە بۆ کوێ دەچێت.

ئێستا دڵنیابوو کە توانای ئەو و دکتۆر شوکاک بە سەر فریشتەکاندا سنووردارە. ئەوەی لە هەر شت زیاتر بەلایەوە سەیربوو، پەشۆکانی حاڵی بەهێزترین و جوانترین فریشتەی هەموو شار، مەهدائیلی فریشتە بوو. لە سەرەتاکانی ١٩٩٠ دا بولبولیار دڵنیابوو کە مەهدائیلیش تا دێت غەمگینتر و ڕەنگزەردتر دەردەکەوێت، نەخۆشی کەمخواردن بە توندی دەیگرێت و بەرەو لاوازیی دەڕوات. مەهدائیل تا ئەو کاتەش باوەڕی وابوو کە دەکرێت شتێک بۆ فریشتە نەخۆشەکان بکەین، بەڵام ئێستا نا، هێدی هێدی تاعوونی نائومێدی دەگەیشتە دڵی ئەویش... فریشتەکانی ئەو سەردەمە زۆربەیان لە دەستی ئەو پیاوانە هەڵدەهاتن کە بووبوون بە تفەنگداری دەوڵەت، کەسانێک لە کوشتارە دەستەجەمعییەکانی کۆتایی هەشتاکاندا بەشداریانکردبوو، یان لەدەست خانمانێک هەڵهاتبوون کە وەک نێران لە زەلکاوی پارەو دەسەڵات و سێکسەوە ئاڵابوون. دەمێک لە مرۆڤ دەترازان هیوایەکیان بە ژیان و بەردەوامی نەبوو، تەنیا نیازی دڵیان ئەوەبوو، لە ناو مرۆڤ و لەگەڵ ئەودا نەمرن. لەو چەند وەرزەدا ڕێزانی مەلەکبین لە هەمووان شپرزەتر بوو. هەموو مەبەستی پشت ئەم کەشتییە ڕزگارکردنی فریشتەکان و دروستکردنەوەی بڕوایان بوو بە مرۆڤ، بەڵام ئێستا هەموو شتێک ئەستەم دەردەکەوت، ئەو هەموو ساڵە کەشتییەکە توانیبووی شوێنێکی کەمێک هێمن بۆ فریشتەکان دابینبکات، بەڵام ئێستا زۆر بچوک و نالانە دەهاتە بەرچاو، نەیدەکرا

هەموو فریشتە نەخۆشەکان لە خۆی بگرێت، کەسیشی نەبوو خزمەت بە هەموو بیمارەکان بکات.

غەمگینترین شتی ئەو ساڵە نەخۆشکەوتنی مەهدائیل بوو، دەردی ئەو کاری دۆزینەوەی فریشتەکانی سەختدەکرد، تاکە فریشتەیەک بوو دەیتوانی عەرەبانەی فریشتەکانەوە بجوڵێنێت، بولبولیار هەندێ شەو بە تەنها بە کوچەو کۆڵانەکانی شاردا دەگەڕا و بەردەوام هەندێک لەو فریشتە نەخۆش و ترساو و سەرگەردانانەی دەبینی کە لە کوچەکاندا سەرگەردان و ترساو بۆ مردن دەگەڕێن. دڵنیابوو هیچ کەس و هیچ بیمارستانێک ناتوانێت هەموو فریشتە هەڵهاتووەکان ڕزگاربکات. هەتا دەمێک کە لەگەڵ مەهدائیلدا دەگەڕا، سەرنجی دابوو، شێخی فریشتەکان، هەڵگری کلیلی دەرگاکانی کۆشکی مەلەکبین، ئەویش بە ناچاری و بێدەنگ زۆر لە فریشتە نەخۆشەکان فەرامۆشدەکات، چونکە دەزانێت چیتر لە توانای کەشتییەکەدا نییە بیماری تر بگرێت، دەزانێت چیتر هیچ چیرۆکێک، ئومێدی هیچ ژیانێکی تر، فریشتەکان ڕزگارناکات.

ڕێزانی مەلەکبین بایەخێکی بێوێنەی بە مەهدائیلی نەخۆش دا، ویستی تەواو لە فریشتەکانی تری جیابکاتەوە و ژوورێکی لە نهۆمی خوارەوە لە تەنیشت نوسینگەکەی خۆیەوە بۆ چاکبکات، بەڵام مەهدائیل بە غەمگینییەکی زۆرەوە قەبوولی نەکرد و بە خانمی مەلەکبینی گووت ئەویش لە فریشتەیەکی نەخۆش زیاتر هیچی دی نییە و دەیەوێت خۆی لەو تەوەهومە ئازادبکات و لەگەڵ هاوڕێ بیمارەکانیدا بژی و بمرێت. ئەوکات بولبولیار زۆربەی کات شەو و ڕۆژ بۆ کۆمەکی خانمی مەلەکبین لە بیمارستان بوو، بەدەگمەن هەندێ شەو بۆ بە سەرکردنەوەی کوچەکان دەچووە دەرێ. خانمی مەلەکبین ئێستا وەها تاک باڵ بوو، گەر کۆمەکی بولبولیاری لێببڕایە، نەیدەزانی خۆی و کەشتییەکەش بەچ دەردێک دەچن. بولبولیار و مەلەکبین، هەردووکیان بە دوودڵییەوە سەیری

دەردی مەهدائیلیان دەکرد، کە تا دەهات بێدەنگتر و کەمدووتر دەینواند، نە وەک جاران جگەرەی دەکێشا و نە مامی مامی بەکاردەهێنا. دکتۆر شوکاکیش لە دەمێکەوە لە فریشتەکەی خانم دابڕا و گەڕایەوە ناو خەڵوەتە فریشتەییەکەی خۆی، لە هەموو شت نائومێد و تووڕە بوو. هەندێجار تەواو باوەڕی وابوو فریشتەکان ڕزگارناکرێن، بوونەوەرگەلێکن جگە لە بێدەنگی و خەڵوەت و تەنهایی، هیچی تریان ناوێت. هەموو مردون بەڵام تەنیا هەناسەیەکی کورت و تەنگیان تێدا ماوە. هەندێجار بێهودەیی بەرامبەر دەرمانەکانی خۆی، بەرابەر ئەوەی بتوانێت ژیانی ئەم مەخلوقە ناسک و وەریوانە درێژبکاتەوە، دەگەیشتە ئاستێک سەر بخاتە ناو کۆشی و بگری. دکتۆر هەموو ڕۆژێک بە چاوی پڕ فرمێسکەوە لەنهۆمی دووەم دەهاتە خوارێ، فریشتەکان دەهاتن و دەمردن بێئەوەی هیچ بڵێن، بێئەوەی کەس بتوانێت ڕێگایەک بۆ ناوەوەیان بدۆزێتەوە، هەموو لە وێستگەیەکدا دەگەیشتنە ئەو ئاستە لە خەڵوەت، هەموو پردێک لەگەڵ دونیای مرۆڤدا بپچڕن. زۆربەی شەوان تەواوی فریشتەکان کۆدەبوونەوە و پێکەوە گوێیان لە میرائیل و وانە درێژەکانی لە سەر بێهودەیی ئەم کەشتییە دەگرت، لە سەر ئەوەی هیچ هێزێک نییە فریشتەکان ڕزگاربکات. ئەوەی سەیر بوو، هێدی هێدی پادشای فریشتە گەشبینەکانیش، هاوڕێی هەرە گەورەی مرۆڤ، مەهدائیلیش بە خۆی و ڕوخسارێکی ڕەنگ زەرد و نەخۆشەوە لە ناو فریشتەکاندا دەردەکەوت، هەمیشە وەک ئەوانی دی شتێکی سپی لە خۆیەوە دەپێچا و بەپێوە لە ڕیزەکانی دواوە دەوەستا و گوێیدەگرت. هەوڵە بەردەوامەکانی دکتۆر و خانمی مەلەکبین و بولبولیار بۆ چاککردنەوەی مەهدائیل بە خۆڕا چوون. بەردەوام ئەوەی دووبارەدەکردەوە کە ئینسان ناتوانێت چیتر فریشتەیەکی هەبێت، ئەو پەیمانە کۆن و ئەبەدییەی لە نێوان مرۆڤ و فریشتەدا لە زەمانێک و سەردەمێکدا دەشێت مۆرکرابێت، ئێستا تەواو...

ئێستا بۆ ئەبەد تەواو. مەهدائیل وردە وردە ماندووتر و ڕەنگزەردتر و کەمێک ترساوتریش لە فریشتە نەخۆشەکانی تر دەینواند. ئاشکرا ڕووی لەوە وەردەگێڕا لەگەڵ خانمی مەلەکبین و ئەوانی تردا قسەبکات، هەمیشە جبەیەکی لە خۆیەوە دەپێچاو وەک دزێک لە گوناهێکی گەورە هەڵبێت، جمکێکی دەدا بە سەری خۆیدا و تێدەپەڕی، کاتێک بولبولیار یان خانمی مەلەکبینی دەبینی، بەخێرایی دەڕۆی یان ڕووی دەکردە ئەولاوە، یان سڵاوێکی ترساوی دەکرد و وەک ئەوەی یەکێک ڕاوی بنێت، دووردەکەوتەوە. فەزای کەشتییەکە لەو دواییەدا بە گشتی فەزای بێدەنگی بوو، فریشتەکان ئێستا جیا لە کۆمەکی مەلەکبینەکان، خۆیان کۆمەڵێک سروتی سەیریان ئەنجامدەدا کە خانمی مەلەکبین و هیچ مەلەکبینێکی تریش پێشتر نەیدیبوو، هەندێ ئێوارێ پێکرا لە باغی کەشتیدا بە بێدەنگی کۆدەبوونەوە و وەک هەموو لە باوەشی یەکدا خەوتبن، بێدەنگ دەکەوتن و سەیری شینایی بێسنووری ئاسمانیان دەکرد، هەندێ شەو کۆدەبوونەوە و بێدەنگ لە یەکدیان دەڕوانی، دەمێکیش لەدەوری میرائیل ئەڵقەیان دەگرت کە گوێیان لەوە دەبوو مردن چ جوانە بۆ فریشتەیەک کە کاری لە سەر زەوی نەماوە، پێکرا وەک ئەوەی ئامێز بە مردندا بکەن، دەستیان بۆ شتێکی نادیار بەرزدەکردەوە و لە تەماشای جێگایەکی دووردا نوقمدەبوون. بولبولیار هەر کاتێک دەیبینین ئاهێکی قووڵ لە ناخییەوە سەردەکەوت، دەستیان هێندە لاواز و باریک بوو دەترسا بشکێن و بوەرێن. تا دەهات فریشتەکان پتر لێی دووردەکەوتنەوە، کەمتر گوێیان لێدەگرت، کەمتر بایەخیان بە شیعر و گۆرانییەکانی دەدا. هەتا میرائیل جارێک پێیگووت کە مرۆڤ هەموو شتێکی پیسکردوە، هەتا شیعریش، هەتا چیرۆکیش، ڕای وابوو مرۆڤ هەتا خەونی ژیانێکی تریشی وەها پڕکردوە لە ژەهر، هەر بوونەوەرێک بیخوات دەیکوژێت. حاڵی بەدی فریشتە نەخۆشەکان و ئەو غەمگینییە زۆرە، تادەهات خانمی مەلەکبین

و دکتۆریشی دەگرتەوە، ئەوە بولبولیاری بە جێگایەکی تەنگ گەیاندبوو. گەر دەرفەتێکی هەبایە لە کەشتییەکە دووربکەوێتەوە و هەوایەک هەڵمژێت، گەر کاتێکی هەبایە پیاسەیەک بە شاردا بکات و ڕوو بە ڕوو لە کوچەکاندا سەیری خەڵک بکات، ئەوەی بیردەکەوتەوە کە ئەویش چەند لە مرۆڤ دابڕاوە، چەند بە چەندە هاوڕێ شاعیرەکانی نەبینیوە، چەند بە چەندە نەیتوانیوە هەواڵی نەغەدە ماردینی بزانێت. کاتێک دەگەڕا، هەستیدەکرد دۆخێکی نائاسایی لە شاردا هەیە، کە سەیری چاوی مرۆڤەکانی دەکرد دەترسا، زۆر دەترسا. تا زیاتر بە ناو شەقام و کوچەکاندا بگەڕابایە، زیاتر هەستیدەکرد دەموچاوی ئەم مرۆڤانەی دەیانبینێت لەگەڵ فریشتەکاندا جودان و هیچ خودایەک کۆیان ناکاتەوە. دەگەڕا و ئەو ڕاستییە دەیترساند کە ئێستا ئەمیش لە مرۆڤ دەترسێت. بە درێژایی ژیانی، خۆی وەک هیومانیستێکی گەورە بینیبوو، بەڵام ئێستا سەیری شۆفێرەکانی دەکرد، سەیری نیگای ترساوی خەڵکی دەکرد لە پەنجەرەی ماشێن و لە ناو پاس و لە پشت جامی دوکانەکانیانەوە و دەترسا، سەیری ژنانی دەکرد لە بەر جلفرۆش و دوکانی عەتار و کۆگای شتە ڕەنگینەکاندا و دەترسا، سەیری سەربازە عەرەبەکانی دەکرد کە بە دوو دڵییەوە لە هەموو شتێک دەنواڕن، سەیری دەستی میوە فرۆشەکانی دەکرد کە بە تووڕەییەوە دەیجوڵێنن، سەیری کرێکار و ڕێبوار و پیاوە شیکپۆشەکانی دەکرد، بەڵام جگە لە ترس، هەستی بە هیچ شتێکی تر نەدەکرد. زۆرجار دوای بیستنی هاوارێک، دوای تەماشاکردنی ڕوخسارێک، دوای سەرنجدان لە دڵڕەقییەکی مرۆڤ، دەیویست خێرا بگەڕێتەوە بۆ کەشتی و لەوێ لەگەڵ فریشتە نەخۆشەکاندا خەریک بێت. لە کەشتی هیچ فریشتەیەکی تر نەبوو ئامادەبێت جێگای مەهدائیل بگرێتەوە، کەس نەبوو وەک جاران لەگەڵیان بێتە دەرێ و فریشتە نەخۆشەکان بگوازێتەوە. هەندێ شەو دوای ئەوەی هەموو ئارام دەبوون

و دەخەوتن، ئەو بە تەنیا دەهاتەدەرێ و لە کوچە تاریکەکانی شەودا بۆ فریشتە بیمارەکان دەگەڕا، ئەوانەی زۆر لاواز بوون و دەبوو بە عەرەبانەکەی مەهدائیل بگوازرێنەوە، ئەوانەی بۆ نەدەهات. بەڵام هەر فریشتەیەک بیدواندایە، بیتوانیبایە بەپێی خۆی بڕوات، بولبولیار شەو لە دوای شەو دوویدەکەوت تا دەیهێنایە سەر ئەو بڕوایەی لەگەڵیدا بێت بۆ ناو فریشتە بیمارەکان. ئێستا هەستیدەکرد تاکە جێگایەک دەتوانێت تیا بژی ناو ئەم کەشتییەیە، تاکە ئیشێک دەتوانێت بیکات کۆمەکی ڕێزانی مەلەکبینە، تاکە جوانییەک دەتوانێت بیبینێت بزەی نێوچاوی فریشتەیەکە. بەڵام لە ناخیدا هەستی بە ترسێکی گەورە دەکرد، بە درێژایی ژیانی هەژار بوو، بەڵام هیچ کات وەک ئێستا نەترسابوو، جارێک خانمی مەلەکبین لە بیرۆکەی خۆی، کاتێک کتێبێکی زۆر گەورە و کۆنی پەرە پەرە هەڵدەدایەوە و بە هێوری پاکژیدەکردەوە، پێیگووت «بەساقەی سەرت بم... گەورەترین هەژارییەک لە دونیادا ئینسان گیرۆدەی بێت، لەدەستدانی باوەڕە بە ئینسان». ئێستا بولبولیار لە بەردەم گەورەترین مەترسی ژیانیدا بوو، دەکرا دابەزێت بۆ تاریکترین و قووڵترین جێگاکانی هەژاریی، جێگایەک هەژاریی تێیدا تەنیا هەرەشە لە جەستە ناکات، بەڵکو لە ڕۆح... جێگایەک دوا سامانی گەورەی ژیانی لەدەست بدات، کە باوەڕی بێسنووریی بوو بە جوانی مرۆڤ. بەڵام ئەو ترسەی لە مرۆڤ شتێک بوو بۆی جڵەو نەدەکرا، تادەهات زیاتر و زیاتر دەچووە ناو دڵی و دەیخوارد. بەڵام چەندە ترسی لە مرۆڤ زیادبووایە، فریشتەکانیش هێندەی دی ترسیان لەم زیاد دەبوو. سەرەتا لەگەڵ دکتۆر شوکاکدا هەوڵێکی زۆری نزیکبوونەوەیان لە مەهدائیل دا، بەڵام مەهدائیل پێیگوتن «وەرزی مردن لە ژیانی فریشتەکاندا، بە بێدەنگییەکی گەورە دەست پێدەکات. منیش وەک هەر فریشتەیەکی دی دەبێت بمرم... من بەدەر نیم لە هەر یاسایەک کە فریشتەکان لە سەری دەڕۆن». بەڵام ڕێزان

وەک هەمیشە تورەبوو لە مەهدائیل، دەیگووت «بەقوربان، ئەمە عەیبی نییە، بەس خۆی وەک هێستر مانی گرتووە و دەیەوێت بمرێت». تاکە جارێک مەهدائیل بە ڕاستی و بێ چەند و چون لە سەر نەخۆشییەکانی قسەیکرد، لەگەڵ دکتۆر مستەفا شوکاکدا بوو. پێیگووت «دکتۆر، من چەندین ساڵە بۆ ئاشتکردنەوەی مرۆڤ و فریشتەکان ئیشدەکەم، ئێستا ماندووم. لەو چەند ساڵەدا تەنیا توانیومە کۆمەکی فریشتە بکەم، ئێستا بە خۆم دەڵێم، ئەوەی بە ڕاستی پێویستی بە کۆمەکە ئینسانە نەوەک فریشتەکان... دەبوو هەموو کاتەکەمان بە مرۆڤ ببەخشیایە، تاکە کەشتییەکی ڕاستەقینە کە فریشتەیەک بە ئارامی دەتوانێت سواری بێت، کەشتی ناو دڵی مرۆڤە و هیچی تر... لەبەر ئەوە ئەم کەشتییە سوودێکی ڕاستەقینەی نییە». بەڵام دڵی مرۆڤ چیتر جێگایەک نەبوو بۆ نیشتەجێبوونی فریشتەکان. لەو بەینەدا ڕەفتاری سەیر لە مەهدائیل دەرکەوت، هەندێجار بینیان دێتە ناو باغ و گوڵەکان دەشکێنێت، بەدزییەوە دادەبەزێتە بیرۆی خانم و وێنەی هەندێ لە فریشتەکان دەدڕێنێت، تادەهاتیش لە میرائیل زیاتر و زیاتر نزیکدەبووەوە، بەڵام بە پێچەوانەی میرائیلەوە کە هەردەم هێمن بوو، ئەم هێدی هێدی شتێک لە شەڕانگێزی لێدەردەکەوت کە پێشتر لە هیچ فریشتەیەکدا نەبینرابوو.

لە دوای ئۆگۆستی ساڵی ١٩٩٠، فریشتەکان لە جاران ئەفسوردە و پڕ غەمتر دەردەکەوتن، بە دەگمەن کەسێک ئارەزوویەکی ڕاستەقینەی ژیانی لە چاویاندا بدیبایە. هەر لەو هاوینەدا فریشتەکەی خانمی ماردینی، نەخۆشی و نەمانی بەرگری و بێهێزییەکی بێوێنە ڕووی تێکرد کە دەرەنجامێکی سروشتی نەخواردن و خۆدیلکردن و دابڕان بوو لە دونیا... گەرچی ڕۆژانە فریشتە دەمردن و حەسرەتیان جێدەهێشت، بەڵام نەخۆشی کوشندەی فریشتەکەی خانم لە بیمارستاندا، غەمگینییەکی قووڵتر و تاریکتری لە هەر غەمگینییەکی ئاسایی دروستکرد. بە کراسێکی سپی

ئیمپراتۆرانەوە، کە هەمان کراسی بوکێنی نەغەدە بوو، کراسێک دکتۆر شوکاک لە سەرەتاوە بۆی هێنابوو تا هەمیشە لە نەغەدەی ناو خەونەکانی خۆی بچێت، لە سەر تەختی خەوتنەکەی خۆی پاڵدەکەوت، تادەهات رەنگی سپیتر و سپیتر دەبوو، قژی رەونەق و بریقەی نەدەما، بەردەوام بە غەمگینی سەیری سەقفەکەی دەکرد، بە هێمنی هەناسەی دەدا، وەک ئەوەی مردن لە هەوادا بێت و بیەوێت بە هێمنی هەڵیمژێت. هەوڵەکانی خانمی مەلەکبین و دکتۆر و بولبولیار بۆ دەرهێنانی ماردینیای فریشتە لە خەڵوەتی قووڵی، بێهودە بوون. کە فریشتەکان دەگەیشتنە ئەو جێگایە لە بێدەنگی، دەگەیشتنە ئەو شوێنە لە خەڵوەت، ئیتر کەس دەستی پێیاندا نەدەگەیشت. مەهدائیل جارێک کۆی ئەو رۆچوونەی وەک گەشتی کەشتییەکی راستەقینە وەسفکردبوو، گووتبووی هەموو فریشتەیەک بەلەمێکی تەنهای خۆی هەیە، کە ساتی مردن دێت، کە بەندۆڵەکانی کۆتایی دەکەونە لێدان، ئەو لەم کەشتییە دادەبەزێت و سوار ئەو بەلەمە تەنهایە دەبێت و قووڵ بەرەو ناو تەمێکی رەش دەڕوات، کە تەمی نیشتووی سەر ئۆقیانوسی ژیان خۆیەتی. بەڵام خانمی مەلەکبین ئەوەی بیر نەچووەوە کە مەهدائیل لە دواجاردا گووتبووی «هەر فریشتەیەک ئەو تەمە رەشە تاریکەی بینی رەنگە ببێتە بوونەوەرێکی ترسناک». زۆر لە فریشتەکان نەخۆشی و لاوازیی و ئازاری ترازان دەیکوشتن، بێئەوەی کاتی ئەوەیان هەبێت قووڵ سەیری ئەو تەمە رەشە گەورەیە بکەن کە لە سەر ئۆقیانوسی ژیان نیشتووە... هەموو ژیانێک، ژیانی مرۆڤ نا بە تەنیا، بەڵکو ژیانی هەموو زیندەوەرێک، هەموو رۆحلەبەرێک کە لەساتێک لە ساتەکاندا هەستدەکات زیندووە و جیاوازە لە بەرد و دار و بێگیانەکانی تر.

لە کۆتایی هاوینی ساڵی ئەوەددا، تەندروستی خانمی فریشتە تەواو تێکچوو، بە جۆرێک لەگەڵ هاتنی پاییزدا، توانای بینین و

خواردنی لەدەستدا. گریانە بە کوڵەکانی دکتۆر شوکاک و سەر کێشانە بەردەوامەکانی بە دیوارەکانی کەشتیدا سوودێکیان نەبوو، بەر لەوەی بگەینە ناوەڕاستی ئۆکتۆبەر، ئێوارەیەک ماردینیای فریشتە مرد. وەک هەموو پێشبینیاندەکرد لە باوەشی دکتۆر شوکاکدا بۆ ئەبەد چاوی لێکنا. ساتی مردنی فریشتەکەی خانم، بولبولیاریش لەوێ بوو، لە نزیک پەنجەرەی ژوورەکەوە بە خۆی و رەینکۆتێکی شینی کۆنەوە وەستابوو، تەنیا و بێدەنگ و ترساو سەیریدەکرد. بە درێژایی ساتەکانی مردن تەنیا لە فریشتە نەخۆشەکەی دەڕوانی کە هێدی هێدی لە دونیای ئێمە دوور دەکەوتەوە، هەستیدەکرد لە چاوانیدا سنووری جیهانێک دەبینێت کە هێشتا ئەو ناتوانێت بزانێت چەند لە خۆیەوە دوورە، بەڵام چاوانی ماردینیا گەش و کراوە و بێترس لە دوورییەکی نادیاریان دەڕوانی. هەستیکرد چاوانی ئەم فریشتەیە بە ئەندازەی چاوانی ئەم کراونەتەوە و دوور دەڕوانن، شەوێک لە چیا گۆڕی بۆ خۆی هەڵدەکەند و جار جار سەری بڵنددەکردەوەوە و تەماشای تاریکی بێسنووری ژیانی دەکرد. ئەم بە جۆرێک لە سەیرکردنی ڕوخساری ماردینیای فریشتەدا قووڵبووبووەوە، هاوارەکانی دکتۆر شوکاکی نەدەبیست کە بە ڕێزانی مەلەکبین و یەکێک لە باغەوانە مەلەکبینەکانی تر گرتبوویان تا خۆی نەکوژێت. دکتۆر هەستیدەکرد ئەمڕۆ بەراستی و بۆ هەتاهەتایە نەغەدە ماردینی لەدەستداوە، دوای لەدەستدانی یەکەم، دوای ئەو هەموو ساڵە لە غەم، دۆزینەوەی ئەم فریشتەیە کەمێک ئاسوودەیکردبوو. دیارە گۆشەگیری ئەو چەند مانگەی پێشوو، دکتۆری زۆر ئازار دابوو، بەڵام ئەم مردنەی ئەمڕۆ، دکتۆری بەرەو ڕۆژگارێکی ڕەشتر و غەمگینتر ڕاپێچدەکرد. ئێستا بە هیچ نەدەگیرا، وەک شێت سەری دەکێشا بە دیوارەکاندا، وەک شێت هاواریدەکرد، وەک شێت دەیکێشا بە سینەی خۆیدا و دەیگووت «خودایە بۆ؟».

لەو شەوەدا بولبولیار بە دەستی خۆی تەرمی خانمی فریشتەی خستە ناو یەکێک لە گۆڕەکانەوە و لە مەراسیمێکی بێدەنگدا کە چەند فریشتەیەکیش ئامادەبوون بە خاکیان سپارد. ئەو شەوە بولبولیار هەستیکرد کەشتییەکە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە نگەری تێکدەچێت و بە هەموو سەر نشینەکانییەوە بەرەو خنکان لار دەبێتەوە.

## من و نزار ئیدریس و شێرخان لە دەرگای دونیایەکی نوێ دەدەین

وەک گوتم، شەوانی بەر لە ڕاپەڕین، من و نزار ئیدریس کاتێکی زۆرمان بە باسکردنی ئۆرگازمەوە دەبردەسەر. نزار بەو دەنگە بەرز و لە ڕووەی خۆیەوە دەیگووت «شۆڕش شتێکە وەک کاری جنسی، گەر تەماشابکەیت هەموو شتێکی شۆڕش هاوشێوەی کاری جنسییە، نەوەستان، شوێن گۆڕین، دۆخ گۆڕین، لێخشاندن لە دوژمن، بۆ بردن، چوونە ناو دوژمن و گەڕانەوە، تەکاندن، فشارکردن... هەموو شتێک، هەموو شتێک... شۆڕش هیچ نییە جگە لە کارێکی سێکسی گەورە کە لە بری ئەوەی یەک کەس بیکات، نەتەوەیەک یان هێزێکی گەورە دەیکات». نزار سەرکەوتنی شۆڕشیشی بە تروپکی ئەو لەزەتە دەزانی. سەرکەوتنی شۆڕش لای ئەو ئۆرگازمێکی دەستەجەمعی بوو.

من لەو ماوەیەدا دوو سێ شانەی چەکداری بچوکم دروستکرد، بەڵام تاکە هیوام، تەنیا هێزەکانی نزار بوو. کە لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩١ دا ئەمریکاییەکان دەستیانکردوە بۆمباباران من لە خەیاڵی ئەوەدا بووم کە دەوڵەت بێ هیچ ماندووبوونێکی ئێمە لە بەیندەچێت و سەرنگون دەبێت، بۆردومانی ئەمریکاییەکان وەها شێتانە بوو مرۆڤ باوەڕی

نەدەکرد سەر زەمینی وڵاتێک بەرگەی ئەو هەموو موشەکە بگرێت و لە بنەوەرا هەڵنەتەکێت. گەرچی هیچ کەس بەدروستی نەیدەزانی ئەو ملیۆنان تەنە لە تەقەمەنی جۆراوجۆر، کوێ دەکوتن و چەند زیانی ڕاستەقینە دەگەێنن و ژمارەی قوربانییانیان چەندە، بەڵام کە ڕۆژانە ژەنراڵەکان چالاکی خۆیان ڕادەگەیاند، هەندێجار ژمارەی موشەکەکان وەها شێتانە و بەرزبوو هەر کەسێکی زیندوویان دەترسان.

باوەڕی ڕەها و بێچەندو چوونی من بە ئەمریکاییەکان لەو سەردەمەوە دەستی پێکرد. خۆشحاڵ بووم کە دەمبیست سەرۆک لەگەڵیاندا چۆتە خەت و خەریکە دەبێتە دۆستی ژمارە یەکیان، کە ئەو هەواڵانەم دەبیست، دەمخواردەوە، مەستدەبووم، بە نزار ئیدریسم دەگووت «تەواو بەوەدا بووینە دۆستی ئەمریکاییەکان، ئیتر لە جەور و ڕەزالەت ڕزگارمان دەبێت... بای بای ئاغای سەدام حوسەین». هێزی ئەمریکاییەکان و لێدانیان بۆ سوپای دەوڵەت وەها گەورەبوو، خۆم بە گەمژە دەزانی کە بەرابەر ئەو هێزە دانیشم و شانەی چەکداری بچوک پێکەوەبنێم، هەستمدەکرد ئەمریکاییەکان دەرفەتی ئەوەیان بۆ ڕەخساندوم، زیاتر لەگەڵ نزار دانیشم و باسی ئۆرگازم بکەم... منیش دەمویست تا دەکرێت لەزەت لەو دەرفەتە وەربگرم.

هەفتەیەک بەر لە خرۆشی گەورە، قاسیدێکی نهێنی شۆڕش هاتە لام و گووتی «هەڤاڵ شێرخان، بە هێزێکی بچوکەوە دابەزیوە و دەیەوێت بێتە شار» من هاتنی شێرخانم بە کارێکی گەمژانە دەزانی، دڵنیابووم هاتنی هێندەی دەبێتە بار و ناچاردەبین جێگا و ڕێی بۆ دابینبکەین کارئاسانییەک بە ڕاپەڕین ناکات، بەڵام شێرخان پیاوێکی دووربین بوو، مەبەستی بوو لەساتە گرنگ و شوێنە ترسناکەکاندا، گەر تەنیا بۆ ناویش بووە، گەر کورت و ڕاگوزەریش بووە سەروسەکوتێک دەربخات و مێژوویەک بۆ خۆی تۆماربکات... ئەوەی وەک جەنگاوەر و ئازا ناوبانگی

دەرکردبوو، تەنیا سەرمایە و سامانی بوو، گەر ئەوەی لەدەستبدایە، وەک هەڤاڵانی تر نە زیرەکییەکی تیوریی و نە لێزانییەکی سیاسی ئەوتۆی نەبوو. کە هات و بینیمەوە، بۆنی ئەو ڕقە دێرینەیم کردەوە بەرامبەر بە خودا و مەخلوقات. دانیشتنی زۆر لە ئێران مۆنتر و دڵڕەقتری کردبوو، وەک هەموو ئەوانەی ماوەیەکی درێژ لە شوێنێکی دی، دوور لە زادی خۆیان دەژین، بڕوایەکی زیاتری لە جاران بە خۆی بوو. ئەوەی سەرنجمدا ئێستا دەمپیستر و جنێوفرۆشتر دەردەکەوت. لەگەڵ بینینیدا دەستیکرد بە جنێودان بەو عەرەبە پیسوپۆخڵانەی کە کاتی ئەوە هاتووە، دونیا لە چڵکنی و دڕندەییان پاکبکەینەوە. من جگە لەوەی سەرەتا بیهێنمە حەشارگەی خۆم و هەمان ئەو تەکنیکانەی لەگەڵدا بگرمە بەر کە بۆ خۆمی ڕەچاودەکەم، هیچی دیم بۆ نەدەکرا. شەوانی بەر لە ڕاپەڕین، من و شێرخان پێکەوە لەگەڵ نزاردا مەستدەبووین. ئەوەی بەلامەوە سەیربوو، ئەو جارە نزار و شێرخان گەلێک نزیک لە یەکتر دەرکەوتن، دوو شتی زۆر گەورە کۆیدەکردنەوە، دوو شت کە زۆر لە سیاسەت زیاتر دەبنە مایەی کۆکردنەوە و دابڕاندنی پیاوان لە یەکدی «ژن و شەراب».
ئەو چەند شەوە کە پێکەوە بووین، نزار هاودەمێکی بۆ دروستبوو کە لەگەڵیدا باسی سەرسامی خۆیان بە ساتی ئۆرگازم بکەن. شێرخان کە یەکەم ژنبازی شۆڕش و نزار یەکم ژنبازی شار بوو، پێکەوە فەرهەنگێکی گەورەیان لە ئەزموونی جیاواز هەبوو، تا زیاتر قسەیاندەکرد، پتر تێدەگەیشتم کە هەردووکیان زۆر بە دەگمەن ئەو ژنەیان بۆ گرنگ بووە کە لەگەڵیدا خەوتوون. کەسیان عاشقی ژن نەبوون، بەڵکو عاشقی ئەو تەنیایەی خۆیان بوون کە تەنیا لەساتی تەواوبوون لە کاری سێکسدا گەیشتبوونە ترۆپکی. من سەرەتا باوەڕم نەدەکرد، دەمپرسی گەر خودی ئۆرگازم گرنگترین ساتی بوونە، بۆچی ئەوە لەگەڵ یەک خانمدا تاقی ناکەنەوە و تەواو. دەمگووت بەوەدا ئۆرگازم لای ئێوە ساتی بەرزبوونەوەی

مرۆڤە بۆ پلەیەکی مەلەکوتی، دەشێت یەک ئافرەت بەردەوام ئەو هەستەتان پێببەخشێت، لەوانەیە بە قەشەنگترین شێوەیەکیش پێتان ببەخشێت و جوانتر لە ڕاکردن و زەوتکردنی بەردەوام بۆ ئەم ئافرەت یان ئەویدی ئەوەتان بۆ فەراهەمبکات. جارێک کە وام گووت «نزار» توند دەستی گرتم و گووتی «نا... تەنیا کاتێک ژن دەگۆڕیت تێدەگەیت چەند تەنهایت، تێدەگەیت خۆت بە تەنیا لە سەر ئەم زەوییە دەژیت، یەک ژن ئەوەت پێنالێت. ساتەکانی ئۆرگازم هەمووی لە یەک دەچن، بەڵام ساتەکانی تەنهایی نا، تەنهایی هەیە لە باوەشی ژنێکدا قووڵترە لە تەنهایی لە باوەشی کەسێکی دیدا. من تا زیاتر حەزم لەو ژنە بێت، زیاتر هەستبکەم ئارەزووم لێیەتی، لە ئۆرگازمدا تەنهایم قووڵترە، هەڤاڵ تەنهایم گەورەترە... بەڵام من شتێکی ترسناک لە سەرمدایە کە پێمدەڵێت ڕۆژێک ژنێک دەدۆزمەوە لە تەنهایی دەرمدەهێنێت. بەڵێ، من نزار ئیدریسی مەلعون خولیایەکی وا چەندساڵێکە لە سەرمدایە. ئەوە گەورەترین نەخۆشی منە، با پێتبلێم گەورەترین نەخۆشی ژن و پیاو ئەوە نییە لە سێکس تێرنەبن، بەڵکو ئەوەیە بەردەوام وادەزانن دەتوانن لە تەنیایی هەڵبێن، من دەڵێم ژن و پیاو دەتوانن یەکیان خۆشبوێت بە مەرجێ بیر لەوە نەکەنەوە خۆشەویستی لە تەنهایی ڕزگاریانبکات... ئەوە دەردی ئەم چەند ساڵەی منە. چونکە ئەوە تووشی ئەو خەیاڵەم دەکات کە دەشێت و دەتوانم لە باوەشی کەسێکی دیدا تەنها نەبم، بەڵام مرۆڤ هەرگیز نە لە تەنهایی تێردەبێت و نە لەتەنهایش ڕزگاری دەبێت، ئەوە گەورەترین نەخۆشی منە، ئۆرگازمیش ترۆپکی ئەو تەنهاییەیە. هەندێک عەشق هەیە، هەندێک ژن هەیە بەجوانیان، بە لەشیان، بە نیگایان پێتدەڵێن وەرە لەگەڵمدا بە و بژی و ئیتر بەوە تۆ تەنها نیت، تۆش دەکەویتە ناو تۆڕەکەوە... وەک ماسییەکی گەمژە دوای بۆنی ئەو خەیاڵە دەکەویت و دێیت تا دەکەویتە ناو تۆڕەکەوە. جار دوای جار

لەگەڵ لەشیاندا دەگەیتە ترۆپک، بەڵام هەموو جارێک کە لەشت تووشی ئەو ڕاتەکانە گەورەیە دەبێت، زیاتر دەزانیت کە تەنیایت، دەزانێت ئەو خولیایە کە پێشتر چۆتە سەرتەوە کە دەشێت ئەم خانمە لەتەنهایی دەرتبکات، تەنیا خەیاڵێکی خۆش بووە و هیچی تر، ئۆرگازم ساتی ڕوونبوونەوەی تەواوەتی تەنیایی ئێمەیە، جائەگەر ژنین یاخود پیاو. لەوساتەدا تێدەگەین کە لە پێش سێکس ودوای سێکس لە تەنهایی زیاتر هیچی ترمان نییە... نهێنی سێکس و سیحری سێکسیش لەوەدایە کە مرۆڤ بۆ ماوەیەک لەو ڕاستییە دووردەخاتەوە. بەڵام دواجار لە ئۆرگازمدا تێدەگەم کە من تەنها خۆم هەم و بەس، هیچ کەسێک ناتوانێت بمکات بە بەشێک لە خۆی... ساتی ترۆپک، ئەوپەڕی هەوڵی من بووە، بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ دونیادا، بەڵام ساتی جیابوونەوە و لێکترازانی بێسنووری منیش بووە لە هەموو مەخلوقات. لەو ساتەدا کە تەواو دەبم و دەعبا تەڕ و لینجاوییەکەم دەکێشمە دەرەوە، وای خودایە... لەو ساتەدا کە سەیری ئەو دەعبا بەستەزمانەم دەکەم کە تەنیا کەرەستەی نزیکبوونەوەی منە لەوانی تر، دەزانم کە ناگەمە تێکەڵبوونی تەواوەتی لەگەڵ هیچ کەس و ناگەمە توانەوە لە هیچ مرۆڤێکی تردا. هەڤاڵ جەنگیز هەموومان بەتەنها بۆ خۆمان هەین و بەس، ئەوە تەنیا شتە دەیزانم... لە بەرئەوە چی بکەم جگە لەوەی لەزەتی کورت لە تەنهایی خۆم بەرم... چی بکەم... چی بکەم؟».

لەو ساتەدا سەیری چاوانی هەڤاڵ شێرخانم کرد، سەیری نیگایم کرد. دڵنیابووم ئێستا دەزانێت من بیر لە چی دەکەمەوە، دەزانێت کە تێدەگەم بۆ ماوەیەکی وەها درێژ، شەیدا و شیفتەی نەغەدە ماردینی بوو. بۆ دیلیکردوە، لەدوای چی گەڕاوە کە ویستوێتی بە هەر نرخێک بووە هەستبکات ئەم ژنە موڵکی ئەوە. کە نزار قسەکانی تەواوکرد، شێرخان هەناسەیەکی هەڵکێشا و دوای ئێستێکی کورت، پرسی «نەغەدە

ماردینی لە کوێیە، ئەو ژنە ئێستا چی دەکات و چۆن دەژی؟». لەو ساتەدا نزار و شێرخان قووڵ سەیری چاوی یەکیان کرد، ئەوە نیگای بەرابەری دوو پیاو بوو، هەر دووکیان ماوەی درێژ لەگەڵ لەشی ماردینیدا یاریانکردبوو، بەڵام ئێستا هەر دووکیان قووڵ لە تاریکی و تەنیایی نێو ڕۆحی خۆیاندا ونبوون.



کە ڕاپەڕین دەستیپێکرد، ئەو چەند شانە چەکدارە بچوکەی من دروستمکردبوون، لە لێشاوی خەڵکدا لە هیچ جێگایەکەوە دیار نەبوو، ئەوە بۆ ساتی خۆی زۆر ئومێدکوژ و غەمهێن بوو بۆم، من هەموو ژیانم لە چاوەڕوانی ساتێکی وەهادا بردبووە سەر، سەرگەرمی ساڵانەم بە ڕێکخستنی شۆڕشەوە لە شاردا بۆ ئەوەبوو لە ساتێکی وەها مێژوویدا ئامادەبم گورزی گەورە لەفاشیستەکان بوەشێنم و تۆڵەی هەزاران مرۆڤی شەهید و هەزاران گوندی سووتاویان لێبستێنمەوە، بەڵام کە ئەو ساتە دەهات و دەگەیشتە پێشێ، دەمبینی چەند بە چەندە هیچ کارێکم لەدەست نەهاتووە، هیچ شتێکم نەکردوە بەڕاست دونیا لە شوێنی خۆی بجوڵێنێت. بیرمدەکردەوە کە ئەگەرچی من هەموو کارێکمکردوە، بۆ ئەوەی لە ناوەڕاستی مێژوودا بم، کەچی تەنیا کاتێک بە شەقام و ڕیواق و ژێرزەمینەکانی مێژوودا گەڕاوم کە بەڕاستی خاڵیبوون و پیادەڕەوی تریان تێدا نەبووە. هەستمدەکرد مەخلوقاتی وەک من تەنیا جۆرە زەخیرە و تفاقێکین کە مێژوو ڕۆژە خاڵییەکانی خۆی پێ پڕدەکاتەوە. ئەو حەسرەتە هێندەی تر شێت و نائومێدیدەکردم.

نزار و چەکدارەکانی، ڕۆژی یەکەمی ڕاپەڕین ڕۆڵێکی بەرچاویان لە هێرشدا بۆ سەر بنکەی فەرمانداری شار بینی، بنکەکە بە ئاسانی گیرا، فەرماندار بەرەو جێگایەکی نادیار هەڵهات و هێزە ئەمنییەکان بێ

بەرگرییەکی ئەوتۆ چەکیان دانا. من و شێرخان پێکەوە سەرپەرشتی چەکدانان و گرتنی هەندێک لە یەکە بچوکەکانی سوپامان کرد، هیچ هێزێکی سەربازیی دەوڵەت شەڕێکی ئەوتۆ گرنگی نەکرد شایەنی باسبێت، لە زۆربەی جێگاکاندا ئەفسەر و سەربازە عەرەبەکان بێ تەقەکردن چەکەکانی خۆیان ڕادەستکردین. لەدەمەو ئێوارەدا کە گەڕاینەوە، من و شێرخان لە ماشێنێکی تایبەتیدا بووین کە نزار لە یەکێک لە هەڤاڵانی خۆی بەتایبەت بۆ ئێمەی خواستبوو. لە نزیک مەیدانی گەورەوە، نزار و چەکدارەکانیمان بینی، لە سەر مەیتی هەندێک پۆلیس وەستاون وپێدەکەنن... نزار لە ماوەی چەند سەعاتێکدا لەلای خەڵک بووبووە بە شۆڕشگێڕ، بەبڕوایەکی گەورەوە لەگەڵ تفەنگدارەکاندا شەقامەکان دەگەڕا و شوێنە گەرمەکانی شەڕی بە سەردەکردەوە و خەڵکیش بە لێشاو، فەرمانگا و جێگا دەوڵەتییەکانیان تاڵاندەکرد. هەوا زۆر لێڵ و سارد و تەماویبوو، لەدوای نیوەڕۆوە ئاشکرابوو دەوڵەت جەبەروتی مێژوویی خۆی بۆ هەتاهەتایە لەدەستداوە. خەڵکی لەناو جۆشی سەرکەوتندا بە جۆرێکی دڵنیاتر لە بەیانی دەهاتنە دەرێ و کۆدەبوونەوە. شێرخان شەیتانی بەدکاری ئەوجۆرە ساتانە بوو، لەو پیاوانە بوو کە دەتوانێت بازبداتە سەر شانی قارەمانێتی خەڵکانی تر و بە ڕەنج و فیداکاری جەنگاوەرە بچوک و بێتەماحەکان بەرەو سەرەوە سەربکەوێت. لە گردبوونەوەیەکی بچوکدا خۆی وەک نوێنەری سەرۆک بۆ سەرکردایەتی ڕاپەڕینی بە خەڵک ناساند، گووتی هێزێکی گەورەی شۆڕش بەیانی دەگاتە شار و کۆنترۆڵی تەواوی جێگاکان دەگرێتە دەست. من دەمزانی ئەوە یەکێکە لە پلانە شەیتانی و بەدەکانی تا نەهێڵێت هیچ هێزێکی دی جیا لە حیزب، بیر لە گرتنە دەستی کاروباری شار بکاتەوە. لە ڕاستیدا هیچ هێزێکی گەورەی حیزب نە لە نزیک و نە لە دووری شار نەبوو، بەڵام لەو ساتانەدا هیچ بوونەوەرێک نییە بتوانێت ڕاست و درۆی هیچ

هەواڵێک بسەلمێنێت... لە ساتی ڕووداوە مێژووییە گەورەکاندا، هێندەی درۆ شتە زەبەلاحەکان دەجوڵێنێت، ڕاستی نایانجوڵێنێت... هێندەی درۆ هەقیقەت دروستدەکات، هەقیقەت خۆی توانای دروستکردنی خۆی نییە.
ساتێک کە شێرخان لە سەرەوە وتاری دەدا، کاتێک دەیگووت هێزێکی گەورەمان بەرەو کۆمەکی خەڵکی ڕاپەڕیو بەڕێوەیە، من سەیری چاویم کرد، ئەو سەیری چاوی کردم، هەردووکمان لە یەک ساتدا هەستمانکرد چەندە ڕقمان لە یەکە، چەندە قێزمان لە یەکتر دێتەوە. لەو کاتەدا تفەنگدارەکانی نزار کە ڕۆژێک پێشتر شەقام و سەرکوچەکانیان بۆ دەوڵەت پاسدەکرد، بووبوون بە پاسەوانی هەردووکمان و لە پشتمانەوە وەستابوون و ئەمجارە لە سەر شانی ئێمەوە بە گومانەوە سەیری خەڵکیان دەکرد. هەموویان کوڕی زۆر گەنج بوون لە ناکاو هەستیاندەکرد لە مەخلوقاتی بێزراو و قێزەونەوە بوونەتە مرۆڤی شۆڕشگێڕ، فریادرەس، وڵاتپەروەر. لە تەمی ئەو ئێوارەیەدا خۆیان کردبووە پەرژین بۆ من و شێرخان و پاسەوانیان لێدەکردین. بۆ من هەموو دیمەنەکان بە جۆرێک لێڵ و دوکەڵاویی و بوخارداربوون، سەرسامیانکردبووم. هەستمدەکرد هەموو ڕۆحەکان هەڵمێکی نوێیان لێهەڵدەستێ، لەوە دەچوو شتەکان پێکڕا خۆڵەمێشێکی وردیان لە سەر بارببێت. من هەموو دونیام گەلێک تەڵخ دەبینی، فریشتەکەم دوو مانگ بوو نەجوڵابوو، هەستمدەکرد وەک هەموو مەخلوقاتی تری دونیا چاوەڕێیە بزانێت ئێمەی ئینسان چی دەکەین و چیتر دروستدەکەین و چی ترمان لێدەوەشێتەوە. بەیانی بەر لەوەی لەگەڵ نزار و شێرخاندا بۆ دەستکردنە ڕاپەڕین بێمەدەرێ، لە بەر ئاوێنەیەکی گەورەی ماڵی میوانداەرەکەمدا وەستام، وەک هەمیشە بە غەم و گومانێکەوە سەیری باڵەکانم کردەوە، دوو باڵی درێژ و زل و زەبەلاح بوون کە تەنیا بینینیان شانی کووڕدەکردم و بەرەو پێش دەیچەماندمەوە. بەم سەرە کەچەڵەمەوە کە هێدی هێدی بەرەو لووسی

تەواوەتـی دەڕۆی، لـە مەلێکـی نەخـۆش دەچـووم قەفـەزی بـۆ کرابێتـەوە و نەیەوێـت بفـڕێـت. یەکەمیـن بەیانـی ڕاپەڕیـن بـوو و بینیـم کـە مـن هیچـم لـەو شـێرە ناچێـت کـە سـالانێک دواتـر کەولّیـم دەپۆشـی و لافـم پێـوە لێدەدا، ئەژنۆکانـم دەلەرزیـن و لەشـم بـە جۆرێکـی نابەجـێ سـەرمای بـوو. شـێرخان کـە هـەردەم غـروری تەتارێکـی دلّـڕەق لـە نیگایـدا بـوو، دەیبینـی دەلـەرزم، دەیبینـی کـە ناتوانـم ئـەو قارەمانـە بـم کـە دونیـا داوایـدەکات. دەمزانـی ئێسـتا دەزانێـت کـە مـن جگـە لـەوەی دەتوانـم سـەگێکی نهێنگـری حیـزب بـم، ناتوانـم پالّەوانێکـی ڕاسـتەقینەی نـاو مێـژوو بـم. بـە درێژایـی ڕۆژ هـەرکات سـاتێک دەهاتەپێـش، کـە دەبـوو تێیـدا لـە مەترسـی نزیـک ببینـەوە، مـن دلّـم بـە خێراییەکـی منداڵانـە لێیـدەدا، مـن پیاوێکـی ترسـنۆک نەبـووم، بـەلام شـتێکی تونـد داوای لێدەکـردم لـەم ڕۆژەدا نەمـرم... هەنـدێ ڕۆژ هەیـە مـرۆڤ نابێـت تیایانـدا بمرێـت، یەکێـک لـەو ڕۆژانـە، ڕۆژی یەکەمـی ڕاپەڕینـە. شـێرخان و نـزار هـەردوو ئـەو ترسـەیان تێدا نەبـوو، نـزار ئێسـتا گەلێکیـش دلّخـۆش بـوو کـە دەیبینـی چ سـادە و خێـرا دەتوانێـت لـە نێـوان هێزەکانـدا خلیسـکانێبکات. ئـەو ئێوارەیـە کـە شـێرخان یەکەمیـن وتـاری ڕاپەڕینـی لـە نـاو حەشـاماتێکدا دا کـە تـا دەهـات و وردەوردە گەورەتـر و گەورەتـر دەبـوو، نـزار هاتبـووە نزیکـی منـەوە. لـەو سـاتەدا کە فاشیسـتەکان وەک سـەهۆلّ دەتوانـەوە، بەختـەوەری خەلّـک سـنوورێکی نەبـوو... منیـش وەک خەلّـک هێـدی هێـدی کینـەی شـێرخان بەریـدەدام و جۆشـی وتـار و خرۆشـی هـاوارم دەجـولاّ، دەچوومـە سـەر شـانی خەلّـک و هوتافـم بـە گیانـی سـەرۆک و خوێنـی شـەهیداندا دەدا. لـەو سـاتەدا خەلّـک بـە دلّـەوە وەک شۆڕشـگێڕێکی گـەورە سـەیریاندەکردم، ئـەوە تەنیـا سـات و دوا سـات بـوو ببینـم حەشـاماتێکی گـەورە، بـە ڕێـز و سەرسـامی و حورمەتـەوە سـەیرمبکەن. مـن کـە لـە سـەر شـانی میللـەت بـووم، دەمانچەکـەم دەرهێنـا و بێهیـچ هۆیەکـی دیاریکـراو، وەک یەکێـک دوا سـەرکەوتنی گـەورەی ژیانـی

بژی، وەک یەکێک ئۆرگازمی چەکەکەی خۆی نمایشبکات، هەندێ فیشەکم بە هەوادا تەقاند. دەنگی گوللەکان توند ڕاپاندەتەکاندم، لە مێژبوو فیشەکم نەتەقاندبوو، وەک ئەوەی دەنگی گوللەکان فریشتەکەمیان لە خەو هەستاندبێت، باڵی فریشتەکەم کەوتە جوڵە... من لە سەر شانی خەڵک وەک بوونەوەرێکی موقەدەس بەرزکرابوومەوە، وەک خودایەکی نوێ خرابوومە سەر عەرشێکی تازە، لە خۆشیدا توند دەسکی دەمانچەکەم گرتبوو، دەمویست لەڕێگای گوللەکانەوە ڕۆحی خۆم لە شتێکی نادیار خاڵیبکەمەوە... کەچی دروست لەوساتەدا کە نەدەبوو بجولێت و هیچ بکات، ئەو فریشتە بەدبەخت و مەلعونەم کەوتە باڵەفرێ. ساتێک بوو تێیدا خەڵک تادەهات زیاتر گرددەبوونەوە و ڕوویان لە مەیدانی گەورە دەکرد، میللەت ساتە هەرە جوان و ڕۆمانسییەکانی شۆڕش دەژیا. ئەو ساتانەی کە تێیدا هەموو یەکدەگرن و لەدەوری سەرکەوتن سەمادەکەن... هەموو خەڵک ئێستا من و شێرخانیان دەناسی، دوو فریادرەس کە لە دوورەوە هاتوون، دوو پێشمەرگەی ئەفسانەیی، دوو ناو کە لە ڕۆژان و ساڵانی داهاتوودا ڕۆڵێکی گرنگیان دەبێت. ئەو ساتەی کە خەڵک دەتخەنە سەر شانیان، ترسناکترین ساتی ژیانی هەموو سیاسییەکی دونیایە، ئەو کاتەی لە سەرەوە لە سەر شانی میللەت دەوەستیت، ساتێکە یان دوای ئەوە دەبێت واز لە سیاسەت بهێنیت بۆ ئەوەی تا مردن ئەو یادەوەرییە بە پاکی لە خەیاڵ و لە مێژووتدا بمێنێتەوە، یان وەهمی ئەو ساتە دەتبات و دۆزەخێک بۆ خۆت و بۆ ئەوانی دیش دروستدەکەیت. من فریشتە مەلعونەکەم لەو ساتەدا ڕاپەکاندم... لەوساتەدا کە هەستمدەکرد ژیانم مانایەکی هەیە، لەو ساتەدا کە مێژووی کۆن و تازەم پێکەوە لە خاڵێکدا یەکدیان دەبڕی، ئا لەویادا فریشتەکەم وەک ئەوەی هەموو خەیاڵات و واهیمە و خولیایەکم بکوژێت بە جۆرێکی شێتانە ڕاپەکاندم. جەماوەر لە خوارەوە ڕاچڵەکان و لەرزین

و کەفدەردانی منیان بینی، جەماوەر بینیان هێزێکی نهێنی لە ناوەوە ڕامدەتەکێنێت و هەڵمدەگرێت و وەختە باڵبگرم و بەربمەوە زەوی... هەموو واتێگەیشتن کە من خرۆشی شۆڕش، حەماسەتی شۆڕشگێڕانە، عەشقی بێبنی وەتەن لە دڵەوە دەمهەژێنێت، وەک پێغەمبەرێک لە ساتی وەحییدا ببینن، وەک یەکێک ببینن ئەڤینی نیشتیمان دەیسووتێنێت و گڕی تێبەردەدا... بینیان کە من لە ڕاتەکان و بێهۆشیدا هاواردەکەم و دەڵێم «کوردپەروەران بمگرن... بمگرن». بینیان بەلادا دێم، عارەق دەردەدەم، کەف دەچنم. خەڵکی ئەو ساتەیان بە ترۆپکی عاشقیم بۆ وەتەن بۆ ژماردم، بەڵام لە ڕاستیدا ساتی هەرە ترسناکی پەیوەندی نێوان من و فریشتەکەم بوو. من لەو ساتەدا کە لە سەر شانی خەڵک بووم، لە بانەوەڕا جوانی میللەت و بەدبوونی ڕۆحی خۆم دەبینی، لەو ساتەدا، جیاوازی نێوان تاریکییەکی قووڵی ناو دەروونی خۆم و ئەو چاوە تینوو و پڕ هیوایانەم دەبینی... ساتێک بوو گەرچی ئەوان منیان وەک باڵندەیەکی ئەفسانەیی موقەدەس دەبینی، بەڵام من خۆم وەک مەلێکی زامدار و شکستە دەهاتە بەرچاو، باڵندەیەکی ڕەش بووم و تیرێکی کوشندە پێکابوومی، دەکەوتم، حەشاماتەکە دەیانگرتم، کەفم دەردەدا... بێهۆش دەبووم و کە هوشیار دەبوومەوە شەو بوو... لە ژوورێکی ماڵی نزار ئیدریسدا چاومدەکردەوە، بە خێرایی هەڵدەستام، بەخێرایی دەچوومە بەر ئاوێنەیەک، هەموو سەیریان لە من دەهات، سەیری خۆمم دەکرد، باڵەکانم لە پشتمەوە زل و سپی و بێڕەحمانە بەرزبووبوونەوە، وەک شێت بووم، ماندوێتییەکی گەورە لە چاومدا بوو، دەنگم نوسابوو، عارەقەم دەردەدا و دەمگووت با بڕۆین بۆ ئەو جێگایەی کە هێشتا شەڕی تێدایە.

ئەو شەوە فریشتەکەم جارێکی تر هێرشێکی دیکەی هێنا. ئێستا دڵنیابووم هیچ چارێکم نییە جگە لەوەی پاڵ بەم فریشتەیەوە بنێم

بۆ دەرەوە... بەریەیان بەر لە هەمووان هەستام و ڕام سپارد یەکێک هۆشەنگی بولبولیارم بۆ بهێنێت. دەمویست گوێم لە دەنگی مەلەکبینێکی تر بێت. شەشی بەیانی بوو، بولبولیار بە چاوێکی ترساوەوە گەیشتە لام، پێشتر هیچ کات وا ماندوو نەمدیبوو، دیاربوو ماوەیەکی درێژە بە باشی نەخەوتووە، بە غەمگینی گوتی «حاڵی فریشتەکان باش نییە، هەڤاڵ جەنگیز حاڵی فریشتەکان باش نییە، حاڵی هیچ فریشتەیەک باش نییە. مرۆڤ بەرەو ترس و دڵەڕەقی دەڕوات». من سەیری چاوانیم کرد، دەمانچەکەم دەرهێنا و خستمە سەر سەری، چاوانم سووربوون، دەستم دەلەرزی، قورگم وشک بوو، گووتم «بولبولیار لەم باڵە حیزانە ڕزگارمبکە... لەم باڵە حیزانە ڕزگارمبکە». بە هێمنی و نائومێدییەوە سەیرێکی دەمانچەکەی کرد، ئەمجارەش هەستمکرد ناترسێت. من ئامادەبووم بیتەقێنم، بەڵام ئەو بێئەوەی دەنگی بلەرزێت، بێئەوەی گەروی لەرەیەکی سامی تێدا بێت، بە هێمنی ڕۆحێکی سووکەوە کە جگە لە سەنگی خۆی، هیچی دی لە سەر بار نییە، چاوی نوقاند و گووتی «هەڤاڵ جەنگیز بیتەقێنە... بیتەقێنە... ڕەنگە گەر من بکوژیت، فریشتەکەت خێراتر بترازێت». ماوەیەکی زۆر چاوی لێکنا، ماوەیەکی درێژ من لوولەی دەمانچەکەم کردە سەری، ساردی لوولەکەی هەر لە سەر نێوچاوانی بوو، من دەگریام، دەمانچەکەم بە دەستمەوە دەلەرزی و دەگریام، بەدەم گریانەوە دەمگووت «هەڤاڵ... هەڤاڵ... ئەم فریشتەیەم بۆ ناڕوات... بۆ فریشتەی هەموو ئینسانەکان دەمرێت و دەڕوات، فریشتەکەی من ناڕوات». چاوانی دەکردەوە... چاوانی گەش و ڕوون و پڕ لەو جوانییە قووڵ و نهێنییە بوو کە تەنیا ڕۆحە هەرە پاکەکان، ئەو ڕۆحانەی بە ڕاستی بە زەلکاوی پیسی دونیادا تێنەپەڕیوون هەڵگرینی. دەیبینی دەگریم... دەیبینی چ زەجرێکی قووڵ دەکێشم، دەمانچەکەی لێوەردەگرتم و توند باوەشی پیادا دەکردم و بەدەم گریانەوە دەیگووت

«هەڤاڵ، فریشتەکانمان باش نین، فریشتەکان هیچیان باش نین... هەڤاڵ هیچیان.... هیچیان».

ساتێکی قووڵی برایەتی نێوان من و بولبولیار بوو، هەر دوو توند باوەشمان بە یەکدا کردبوو، هەردوو دەگریاین. ئەو ساتە من و ئەوی بۆ هەتاهەتایە کرد بە دۆستێکی نزیک و ئەبەدی، بە جۆرێک ڕۆژێک کە دەمرم، ڕۆژێک کە ماڵاوایی لەم سەرزەمینە دەکەم، دەزانم من هاوڕێیەکی ڕاستەقینەم بووە، هاوڕێیەکی دڵسۆز و ئەبەدی کە ناوی هۆشەنگی بولبولیارە.

من هەستمدەکرد پەیوەندی نێوان من و فریشتەکەم، تا دێت زیاتر و زیاتر لە سەر درۆکردن و نیفاق رادەوەستێت. ئەوەی ئەم بوونەوەرە باڵدارەی ناخمی تووشی پەشۆکان و دوودڵی کردبوو، ئەوەبوو من دەمزانی کە فریشتەیەک لە ناخمدایە و دەیەوێت بەجێمبهێڵێت. پێش من هیچ مرۆڤێک لە سەر ئەم ئەستێرەیە ئەزموونی وەها نەژیابوو. مرۆڤەکانی دی باش یاخود خراپ درێژەیان بە زیندەگی خۆیان دەدا بێئەوەی بە ڕوونی وەک من لەوە تێبگەن فریشتەیەک لە ڕۆحیاندایە و باڵەکانی هێناوەتە دەرێ و دەیەوێت لە بەرچاوی ئەواندا خودکوژیبکات. مرۆڤەکانی دی بێئاگا لە بوون و نەبوونی فریشتەکان دەژیان و دەمردن، پێش من کەس بە ژان و ئەشکەنجەی وەها حوکم نەدرابوو. من نە ئەوەبوو بێباک و بێویژدان پاڵ بە فریشتەکەمەوە بنێم بڕوات، نە ئەوە بوو بتوانم بیگێڕمەوە ناو ناخم و لە خودکوژی پەشیمانیبکەمەوە. ئێستا بڕیارمدابوو کە ئەو فریشتەیە بۆ هەتاهەتایە دەربکەم... هەرچییەکم کردوە کارێکبکەم بڕوات و دووربکەوێتەوە، نەمدەتوانی هەموو ژیانم بەرگەی ئەم پەلامار و تا و کەفدەردان و بێهۆشبوونە بگرم، چیتر توانای بینینی ئەو باڵانەم لە پشتەوە نەمابوو. بەوەدا دڵنیابووم لێناگەڕێت ئاسوودەبم، دڵنیابووم لە هەموو ئان و ساتێکی ژیانمدا ڕامدەتەکێنێت،

بێهۆشمدەکات، دەست دەخاتە گەروم، ئیتر دەمزانی ناتوانم وەک مرۆڤێکی ئاسایی، وەک شۆڕشگێڕێک کە پەروەردەی دەزگایەکی گەورەم، وەک کەسێک فەرمانێکی تایبەتیم هەیە، بژیم.

ئەو ڕۆژە بولبولیار بەر لەوەی جێمبهێڵێت، بە غەمگینییەوە باسی نەخۆشی و مردنی فریشتەکانی بۆ کردم. گووتی لە چەند مانگی ڕابوردوودا ڕێکەوتی هیچ فریشتەیەکی نەکردوە بیەوێت بژی، باسی دەردی مەهدائیل و گۆڕانی ئەوی بۆ کردم، دەستی خستە سەر دەستم و گووتی لە ڕۆژانی داهاتوودا سەرم لێدەداتەوە. بەر لەوەی بڕوات، من بۆ ئێستێک ڕامگرت و گووتم «هۆشەنگ، پەیمانم بدەرێ، ساتێک فریشتەکەم دێتەدەرێ، کۆمەکمبکەیت نەمرێت». نازانم بۆ وامگووت، ئەو خواستە قووڵ و نهێنییە لە چییەوە هات، بەڵام ئارەزوویەکی قووڵ و گەورەی ڕۆحم بوو، کە هەموو شتێک بکەم بۆ ئەوەی نەهێڵم فریشتەکەم بمرێت. ئێستا پڕ بەدڵ دەمەویست ئەو فریشتەیەی ناو ناخی خۆم ببینم بزانم لە چی دەچێت، دەمویست کاتێک لە خۆم جیادەبێتەوە بیگرمە باوەش، بیکەمەدۆست، هەوڵبدەم بۆ هەمیشە لەگەڵمدا بێت، دەمگووت بەوەدا مرۆڤ ناتوانێت بەرگەی فریشتەیەک بگرێت لە ڕۆحیدا، دەبێت بەرگەی بگرێت وەک یادگارییەکی ئەبەدی، وەک بیرەوەری جوانییەکی مەحاڵ، وەک هاوڕێیەکی نەخۆش کە بەرگەی هەوای ئەو دونیایە ناگرێت کە ئێمە تێیدا دەژین، وەک بەشێک لە ڕۆح کە هەرگیز نەیتوانیوە بژی.

بولبولیار بێئەوەی پەیمانێکی ڕۆشنم پێبدات ڕۆیشت، پێشتر وەها غەمگین و دوودڵ نەمدیبوو. ئێستا لە کەسێک نەدەچوو لە کۆمەڵگا یان سیستم تووڕەبێت... بەڵکو لە کەسێک دەچوو لە هەموو ئەم ئەستێرەیە نائومێدبێت.

***

دوو شەو دواتر دکتۆر شێرخان و نزار هاتن، هەردوو ڕووخۆش و گوڵڕەنگ بوون، گووتیان ئەمشەو هێزەکانمان دەبەینە سەر گەڕەکی ئەمنەکان.

من ئەوکات دوو ڕۆژبوو، لە بەر تا و گێژی نەمکرابوو بچمەدەرێ. کورت و کەم لە دەمی ئەوانی دییەوە هەواڵی بەرەو پێشچوون و سەرکەوتنەکانی ڕاپەڕینم دەبیست. بەڵام بە جۆرێک ناخم گەرم و لەرزوتای توندم بوو، نەمدەتوانی زۆر خەیاڵ بخەمە سەر دونیای دەرەوە. بەدترین شت ئەوەیە کە شۆرشە تاریکەکانی ناخت هاوکاتی شۆڕشە پڕ خرۆشەکانی دونیا بن. مرۆڤ بوونەوەرێکە تا سەر سەحنەی ڕۆحی خۆی خاڵی نەبێت، ناتوانێت بێترس بڕواتە سەر سەحنەی مێژوو. ئەو ڕۆژە من جەنجاڵییەکی وەها لە سەر تەختی دەرونم بوو، نەمدەتوانی پێ لە سەر هیچ تەختێکی دی دانێم. جگە لەوەی کونجێک بۆ وڕێنە و کەفدەردانم سازبکەم، کاری دیم لە دەست نەدەهات. بەڵام دەمزانی ئەم ئارامییە درۆیەی بۆ فریشتەکەمی دروستدەکەم، ئەوەی زوو زوو خەڵوەت و بێدەنگی بۆ دەسازێنم، جگە لەوەی ئازاری من و ئەو قووڵتر دەکاتەوە هیچی دی ناکات. دڵنیابووم لەو سەردەمە تازانەدا کە بەڕێوەیە، لەو ڕۆژگارە نوێیەدا کە ئێستا خۆری هەڵدێت، بەم فریشتە بەدکار و دژەدڵەوە نامکرێت ئاسوودە بژیم، شانم چیتر بەرگەی قورسایی ئەو باڵانە ناگرێت کە لە ئاوێنەکاندا خۆم دەدی، وەک ڕموزنێکی شێواو، وەک کەسێکی نەفرەت لێکراو خۆم دەهاتە پێشچاو.

ئەو شەوە لەگەڵیان چووم بۆ سەر گەڕەکی ئەمنەکان، گەڕەکەکە جگە لە ژن و منداڵ، کەسی تێدا نەمابوو. پیاوەکان یان هەڵهاتبوون یاخود لە سەنتەری سەرەکی لە ژێر گەمارۆدابوون. بڕیار وابوو هەموو خێزانەکان بخرێنە پاسی تایبەتییەوە و بەرەو دەرەوەی شار بگوازرێنەوە. سەرۆک فەرمانێکی ڕۆشنی دابوو کە کەس دەست بۆ خانەوادە و ژن و

مندالّی دوژمن نەبات، بەلاّم لەو کاتەدا جێبەجێکردنی ڕێنمایی و فەرمانی وا مەحالّ بوو. نزار و دکتۆر شێرخان بە هێزێکی بچوکەوە مالّەو مالّ کەوتنە گەڕان. من لە دەمی دەروازەی سەرەکیدا لەگەلّ شۆفێرەکەمدا لە ماشێنەکەدا مامەوە... هەوای شەو ئازاریدەدام، گلّۆپەکانی ماشێنەکەم بە شۆفێرەکە خامۆشکرد و بە چاویلکەیەکی ڕەشەوە، سەیری تاریکایی قوولّ و بێبنی شەوم دەکرد. لە کۆلاّنەکاندا جگە لە تاریکی، هیچی دی هاتوچۆی نەدەکرد، لە سەرتاسەری شاردا کارەبا برابوو. سەرەتا وام بەخەیالّدا هات یەکێک لە ئەمنە خوێنخۆرەکان هەلّهاتبێت و دووبارە خۆی لێرە شاردبێتەوە، بەلاّم بەوەدا شێرخانم بینی خۆی بێترس دەچێتە ناو مالّەکانەوە، گومانم لە ڕاستی ئەو خەیالّە پەیداکرد. نزیکی سەعاتێک لە ماشێنەکەدا مامەوە، تەنیا شۆفێرەکەم لەگەلّ بوو، هەردووکمان بە قورسی هەناسەمان دەدا... پێشتر ئەم کوڕە شۆفێرەم نەبینی بوو، قەلّەوێکی ورگنی غەبغەبەدار بوو، بەلاّم نە ئەو قسەی لەگەلّ من کرد و نە من ئەوم دواند. کاتێک دوو کەس پێکەوە لە جێگایەکدا دەبن، کات دەڕوات و دەروات، بێدەنگی هەمیشە بالاّدەستە و وشەیەک لە هیچ جێگایەکەوە نایەت، کاتێک ئەو دوو کەسە هیچ نالّێن، کاتێک وادەکەن بێدەنگی تەنیا پردی نێوانیان بێت، ئیدی بێهۆ و بۆ هەتاهەتایە دەبنە دوژمنی یەک، بێدەنگی قوولّ و درێژ لە نێوان دوو مرۆڤدا جگە لە ڕق هیچی تر دروست ناکات. لەو سەعاتەدا من نوقم لە بێدەنگییەکی کوشندەدا، جگە لە هەستی خنکان لە تاریکیدا هەستی دیکەم نەبوو. خۆشحالّبووم کە توانیومە ئەم گەنجە بکەمە دوژمنی خۆم... ئێستا جگە لە ڕق هیچی دیم بەلاوە گرنگ نەبوو.

دوای سەعاتێک بێئەوەی من بیانبینم و بزانم لە کوێوە دێن، نزار و شێرخان گەڕانەوە، بە شۆفێرەکەم گووت ڕوناکی ماشێنەکە هەلّکاتەوە، لە تاریکیدا جگە لە تارمایی چەکدارەکان، سێبەری چوار ژنیشم بینی،

لە تاریکیدا تەنیا دەمتوانی بزانم ژنن، ئارەزوویەکم نەبوو دابەزم و ببینم کێن.

نزار لەگەڵ مندا سواربوو، شێرخان و ژنەکان چوونە ماشێنێکی ترەوە، دوو ماشێنی تری پڕ پاسەوان و چەکداریشمان لەدوبوو. لەگەڵ سەرکەوتنی نزاردا بێئەوەی فەرمانێکی ڕۆشن بە شۆفێرەکە بدات، بەڕێکەوتین. نزار لە پێشەوە سواربووبوو من لە دواوە، هەناسەی شۆفێرە قەڵەوەکە لە کاتی لێخوڕیندا بە جۆرێکی بەرچاو بەرزبووەوە، دەنگی هەناسەی بە جۆرێک بەرزبوو، وەک ئەوەی ماشێنەکە بەپاڵ بناژوێت. نزار بێئەوەی ئاوڕبداتەوە بە دەنگێکی بەرز گووتی «هەڤاڵ، ئەمشەو کاتێکی خۆشمان دەبێت». من لە پاڵتۆیەکی ڕەشی ئەستووردا، ڕەنگوڕووی پیاوێکی تادار و نەخۆشم هەبوو، کەم کەم عارەقم دەردەدا، لێوانم وشکبوون. بە دەنگێکی کز و بێباک لە دونیا گووتم «بۆ کوێ دەچیت بچۆ». لەو ساتەدا هەموو شتەکان لام یەکسان و بێبایەخ بوون... هەموو گەردون لام شتێکی پوچ بوو، تۆپەڵە تۆزێکی بێمانا کە مەخلوقێکی بێمانای وەک مرۆڤی تیادەژیا.

ماشێنەکان ڕوویان لە جێگایەکی چۆڵی کەناری شار کرد. دواجار لە بەردەم بینایەکی گەورەدا وەستاین، کە بە ئەستەم لە زوڵمەتی ئەنگوستەچاوی شەودا سێبەری دەبینرا، لە بەر تاریکی نەمدەزانی ئەم جێگایە کوێیە و لە چوار دەوری ئێمە چی دەگوزەرێت. بەوەدا هیچ چەشنە ڕۆشناییەک دیار نەبوو، هەستمکرد چواردەورمان چۆڵەوانییەکی گەورە و زوڵمەتێکی بێبن بێت. هەموو لە ماشێنەکانمان دابەزین، نزار فەرمانیدا و ژنەکانیان بردە ژوورێ بۆ ناو بیناکە. من نەمدەزانی چی دەگوزەرێت.

پاش ئێستێک هەموو چوونە ژوورێ، من نەبێت ئەوانی دی هەموو لایتی دەستییان هەڵگرتبوو، لەدەرگایەکی بچوک چووین بەودیودا،

شوێنەکە مردوو و بێناسەواری ژیان نەبوو، نزار دەستی منی گرت و گوتی «هەڤاڵ جەنگیز لێرەوە». دەنگی زرینگەیەکی سەیری تێدابوو، لە دەنگی ئەو گەنجە سەوداسەر و یاخی و شێتە نەدەچوو کە پتر لە شازدە ساڵ لەوەوبەر لە زیندانی پسمامان گوێم لەدەنگی بوو... من لەو تاریکییەدا تاکە شتێک بیرم لێدەکرەوە کاریگەری زەمان بوو لە سەر ڕۆحی ئێمە. بەڵام زرینگەی دەنگی نزار، بەختەوەرییەکی وەها نهێنی تێدابوو لەگەڵ ئەو تاریکەییە بێسنوورەدا نەدەگونجا، دەنگی ئەو شاد بوو، بەڵام زوڵمەتی دەورمان غەمگین، غەمگینییەکی قووڵ، غەمگینی جیهانێک شەرم لە بوونی ئێمە بکات.

لە ژوورەوە بینیم چوارکەس پێکەوە لۆکسیان دادەگیرسان، هەر چوار لۆکسەکە پێکەوە هەڵدەبوون. نزار بەو دەنگە خۆش و سەرحاڵەی خۆی لە بەر خۆیەوە گۆرانی دەگووت. لە ناکاو دەوەستا، وەک شتێکی زۆر نهێنی و بەنرخ بڵێت، بە شۆفێرەکەی گووت «وەرە لەگەڵمدا بابچین مەشروبەکان بهێنین».

ژوورەکە پڕ بوو لە قەنەفەی گەورە گەورە و گرانبەها، ڕازاوە بە فەرشی فارسی، مێزێکی تەختەی نەخشداریش لە ناوەڕاستدا بوو. من وەک سەر لێشێواو، وەک کەسێک نەزانێت ڕوو لە کوێ بکات، بە ترسەوە سەیری هەمووشتێکم دەکرد، لە کەسێک دەچووم لە ناوەڕاستی کۆمەڵێک ڕێگادا وەستابێت و نەزانێت بە کویادا بڕوات، چاوم ئاسەواری تایەکی شێتانەی تێدابوو، دەستم لە نێوچاوانی خۆمدا هەمووی عارەقە بوو، یەخەی پاڵتۆ ڕەشەکەم بۆ سەرەوە هەڵدایەوە و بە پاسەوانەکانم گووت «زۆرم سەرمایە». شێرخان بەرامبەرم پێدەکەنی... پێکەنینی کەسێک لەزەت لە ئازاری نەیارانی ببینێت، چاوی ئەو تەعبیرە تەماوی و تاریکەی تێدابوو کە ساڵانی دواتر لە زۆر بۆنەدا دەمبینییەوە، شتێک تەنیا تەعبیری لە کینە نەدەکرد، بەڵکو لەزەتی کەسێک بوو،

دەزانێت هێزی لەوەدایە خاوەنی ڕۆح نییە، خۆ کزکرن و گرمۆڵەبوون و سووربوونەوەی من بە جۆرێک تورەیدەکرد پێبکەنێت... دەمزانی تەنیا کاتێک کە کینەی دەیگرێت، کە ڕقێکی نهێنی دەیخوات و ناتوانێت دەریبخات، وا قیژەون پێدەکەنێت.

پاش تۆزێک تەنیا من و هەڤاڵ شێرخان لە ژوورەکەدا ماینەوە. پاش ئێستێکی کەمێک درێژ نزار بە تەنها گەڕایەوە، لە دەرگاوە بە دەنگی بەرز گووتی «هەڤاڵان هەموویانم مەرەخەسکرد، بەس خۆمان و پاسەوانێکم هێشتۆتەوە لەگەڵ ژنەکاندا... ئێستا شەو، هەموو شەو، هی خۆمانە. دەخۆینەوە، مەستدەبین... هەموو شتێکمان لایە... چوار ژنی ڕووتیش». دەنگی نزار تورەبوون یان کینە یاخود هەوای سەرکەوتنی تێدانەبوو، بەڵکو وەک هەمیشە شەهوەتێکی دڕندانەی بۆ ژیان تێدابوو. هێدی هێدی خۆی قاپە عارەقەکانی داکرد، خۆی بستەی لە کیسەکان دەرهێنا، بە دەنگە خۆشەکەی گۆرانی گووت، لیمۆی قاشکرد، جاچکی دروستکرد، پێکی تێکرد، دواجاریش وەک لە بێدەنگی ئێمە سەرسامبێت، سەیری من و شێرخانی کرد و گووتی «برایان ئەمە ئاهەنگی سەرکەوتنە، با خۆشمان لێ بگوزەرێت». من نوقمی تایەکی ڕەش بووم، شێرخانیش نوقمی زەردەخەنەیەکی بەد و گەندانە بوو، زەردەخەنەیەک ئاوێتەی کینەیەکی نهێنی بوو بۆ من، بۆ نزار، بۆ ئەو ژنانەی لەو دیو چاوەڕوانیان دەکردین... کینەیەکی ئەبەدی، ڕقێک کە لە ئەزەلەوە و بە فیترەت لە سەر ڕۆحی بەرامبەر دونیا هەڵکەنراوە.

چوار ژنی دیلبوون، هەر ژنێک و لە ژوورێکدا. هەر سێکمان یەک لە سەر یەک پێکمان هەڵدەدا، من دڵنیابووم فریشتەکەم ورد ورد سەیرمدەکات، هەستم بە چاوانی دەکرد لە ناخمدا دەجوڵێتەوە، هەستم پێدەکرد دەیەوێت ببینێت، چۆن من خەریکە دوا دیواری بۆ دەشکێنم تا لەو تاریکییە ئەبەدییەی ڕۆحم بێتەدەرێ. من یەکەم پێکم هەڵدەدا

بۆ ئەوەی چی خراپەیەک لە سەر و جەستەمدایە لە خەو هەستێت و ڕوخساری ڕاستەقینەی من دەربخات. هەر سێکمان پێکمان هەڵدا، ئەوان بەردەوام قسەیاندەکرد، من نە قسەی ئەوانم دەبیست و نە خۆم هیچم دەگووت، هێدی هێدی هەستم بە مەستیم دەکرد دەمگرێت، هێدی هێدی هەستم بە مەستیاندەکرد دەیانگرێت. کە هەر سێکمان مەستبووین، شێرخان یەکەم کەس هەستا و گووتی من ئارەزووی ژنێکم هەیە... ئەو شەوانەم هاتەوە یاد کە ژن و کچی جووتیارە بەستەزمانەکانی دەخستە ژێر خۆی، هەستم بە ڕقێکی وەها دەکرد، دەمتوانی لەوێدا بیکوژم. نزار پێدەکەنی، بەردەوام لە سەر نهێنی و ئەفسوونی جەستەی خانمان قسەیدەکرد. بە خۆشییەوە دەیکێشا بە پشتی مندا و دەیگووت «هەڤاڵ جەنگیز، غەمگین مەبە، ئەمشەو تۆ و وەتەن هاودەم دەبن... تۆ و نیشتیمانی عەزیزمان پێکەوە ئۆرگازم دەبن» لەگەڵیشیدا ئەو قاقا خۆش و سامناکەی لێدەدا کە منی لە ڕۆحەوە دەلەرزان. من سەرم داخستبوو، بێباک بووم لەوەی ئاخۆ وەتەن یان شێرخان یان نزار چیدەکەن و چییان بە سەردێت. ئێستا تەنیا خەیاڵم لای ئەو فریشتە بەدەم بوو کە هەستمدەکرد لە پشتەوە ڕا کەم کەم باڵەکانی بەرزتر و بەرزتر کێشدەکردە دەرێ.

تا شەو تێدەپەڕی ئێمە مەستتر دەبووین، من و شێرخان و نزار بە نۆبە چووینە لای ژنەکان. من هێدیێ هێدی بە جۆرێک مەستدەبووم، چاوم بە ڕۆشنی نەیدەبینی، کاتێک هەڵدەستام لەترم دەدا، لالا دەڕۆیشتم، هۆشێکی وەهام نەبوو تام و بۆی شتەکان مانایان بۆم هەبێت، دەرگای هەر ژوورێکم دەبینی دەمکردەوە، دەزانم ژنێکی ڕووتی ترساو لەوێ چاوەڕوانمدەکات، دڵنیابووم دەستم بەر گۆشتی دەکەوێت. چ جۆرە ژنێک بوو نازانم، ڕەنگی قژی چۆن بوو، ناوی چی بوو، کورد بوو یان عەرەب، بە چ زمانێک قسەیدەکرد، دەترسا یان ئاسوودەبوو... هیچ نازانم... هیچ شتێک. هێندە دەزانم کە من لەگەڵیاندا دەخەوتم

و دەگریـام... لەگەڵیـدا دەخەوتـم و تـا ئەوپـەڕی تەنهایـی تەنهابـووم... لەگەڵیـدا دەخەوتـم و گوێـم لـە فریشـتەکەی نـاو ڕۆحیشـم بـوو دەگریـا. لـە کاتـی ئۆرگازمیشـدا ئەوەنـدەی خەیاڵـم لای ئـەو تەنهاییـە قووڵـە بـوو، خەیاڵـم لای هیچـی دی نەبـوو.

سێ شـەو و سێ ڕۆژ بەوجـۆرە بوویـن... سێ شـەو و سێ ڕۆژ بێوچـان مەستدەبووین، دەمانخوارد و دەمانخـواردەوە و سێکسمان لەگـەڵ ئـەو چوار ژنـە بێنـاو و بێسـیمایەدا دەکـرد. ئێسـتا هیـچ شـتێکم لـە لەشـیان یـاد نەمـاوە، هیـچ شتێکم لە بۆنیـان یـاد نەمـاوە، هیـچ شـتێکم لـە دەنگیـان یـاد نەمـاوە... هیـچ شتێک. تەنیـا دەزانـم چـوار ژن بـوون و ئێمـە وەک شێت، وەک مەخلوقاتـی برسـی بـۆ ژیـان ئەتکماندەکـردن. شێرخان و نـزار وایـان دەردەخسـت کـە ئـەو کارەی ئێمـە، تۆڵەیـە بـۆ ژنانـی ئەتککراوی نیشـتیمان، تۆڵەیـە بـۆ هـەزاران ژنـی زامـداری کـورد. بـەڵام بـۆ مـن نـا... لای مـن تۆڵـە بـوو لـەو فریشـتە بـەدەی نـاو ناخـم. هەندێجـار بـۆ ماوەیەکـی کـورت هۆشـمدەهاتەوە، بـۆ ئێسـتێک سـەیری هەردووکیانـم دەکـرد و دەمزانـی مـن زۆر لـە خـۆم دەکـەم بـۆ ئـەوەی لـەم دوو مرۆڤـە بچـم... دەمزانـی مـن لـە سـەرەتاوە، لـە یەکـەم ڕۆژەوە لـە هیـچ یەکێـک لـەم کەسـانە نەچـووم، بـەڵام زوو لـە جێـگای خـۆم دەوەسـتام، بـە خۆمـم دەگـووت ئـەوە وەسوەسـەی ئـەو فریشـتە سـەگەی نـاو ناختـە، کـە نایەوێـت بەجێـت بهێڵێـت. هـەر زوو ئـەو ڕاستییەم دەتاراند و دەکەوتمـەوە پێـک هەڵـدان و خواردنـەوە و خەوتـن لەگـەڵ ئـەو چـوار ژنـەدا.

نزار لـەوەدا لـە سـەر هـەق بـوو، مـن لـە باوەشـی ئـەو ژنانـەدا جگـە لـە هەسـتکردن بـە سـەرما و لەرزیـن و تەنیایـی، هەسـتم بـە هیچـی تـر نەکـرد. کـە دەچوومـە نـاو ئـەو ژنانـە و دەهاتمـە دەرێ... جگـە لەوپـەڕی تەنهایـی، جگـە لـە خۆشـییەکی ڕەش و ترسـناک، جگـە لـە گەیشـتن بـە جێگایـەک لـە تەنیایـی لـە پشـتییەوە هیچـی دیکـە نەبـوو، هەسـتێکی تـرم نەبـوو. خـواردن

و مەستبوون و سێکس... ئەوە سەرەتای ئەو سەردەمە تازەیە بوو کە من لە کاتی تێکەڵبووندا لەگەڵ ئەو ژنە بێناو و بێڕوخسارانەدا، لەکاتی تەکانداندا، لە کاتی گەیشتنمدا بەوپەڕی قووڵایی جەستەیان، دەستم بەرزدەکردەوە و بەوپەڕی ترسەوە تەماشای ئاسۆکانیم دەکرد.

فریشتەکەم هیچی نەدەکرد... فریشتەکەم تەنیا تەماشایدەکرد. منیش هاوارم لێدەکرد، چ فریشتەیەکی بەد و مەلعون و بێکەڵکیت، تا کەی نایەیتە دەرەوە. تاکەی وەک سەگێکی ترسنۆک لە ناوەوە خۆت دەشاریتەوە. تاکەی بەرگەی من دەگریت... تاکەی؟.

ئەو وەڵامی نەبوو... هیچ وەڵامی نەبوو.

ئەمێستا بیرم نییە من و شێرخان و نزار ئەو چەند ڕۆژە چیمان گووتووە، جگە لە ئاوازی ئەفسووناوی، هەندێ لە گۆرانییەکانی نزار شتێکی دیم یادنەماوە. بیرمە هاوارمدەکرد «نزار چ حیکمەتێکی شەیتانی لەوەدایە، خودا دەنگێکی وا خۆش دەبەخشێت بە بەدجنسێکی وەک تۆ... هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە... هیچ... جگە لەوەی دەریدەخات لە دونیایەکدا دەژین دەستێکی نەشارەزا دروستیکردوە». بیرم نییە نزار چی دەگووت، چۆن وەک هەمیشە هەم کەڵکباز و هەم فەلسەفیانە بەرگری لە خۆی دەکرد، بیرم نییە شێرخانیش ئەو چەند ڕۆژە چی کردوە، چی گووتووە، چۆن بەرگەی کینەی خۆی گرتووە.

ڕۆژی سێهەم شەرابمان لێبڕا. هێدی هێدی هاتینەوە هۆش خۆمان. سەیرمانکرد سێ ڕۆژە چ بێڕەحمانە مەستین، چەند عارەق و شەرابمان خواردۆتەوە، چۆن لە سەر پاشماوەی شوشە و خۆراک و زبڵی خۆمان خەوتووین. شێرخان کە بە ئاگاهات شپرزەبوو، تازیاتریش هۆشی دەهاتەوە شپرزەتر دەبوو. سێ ڕۆژ بوو لە دونیا بڕابووین... سێ ڕۆژ بوو نەماندەزانی ڕاپەڕین گەیشتۆتە کوێ. دڵنیابووین حیزب ئێستا کوناوکون بەدواماندا وێڵە، دەمانزانی لە ئەنجومەنی باڵاوە بۆماندەگەڕێن.

من دڵنیابووم ئەم چیرۆکە بە کوێ دەگات... لە یەکەم شەوەوە دڵنیابووم، ئێستا کە هۆشم دەهاتەوە هەموو شتەکانم ساف و ڕوون دەبینی. شێرخان گوتی: «دەبێت تا زووە هەموو شتێک تەواوبکەین. دەبێت پاشماوە جێ نەهێڵین». بۆ یەکەمجار ترسێکی گەورەم لە چاویدا بینی، ترسی پیاوێک نایەوێت بە هۆی ئەم سێ شەوەوە پاشەڕۆژی خۆی لەدەستبدات. نزار ئێستا ڕوویەکی سارد و مەنگی هەبوو، هیچی لە سیمای جارانی نەدەچوو... دەمزانی هیچ کەسی بۆ گرنگ نییە. بەساردی دڵێکەوە پێشتر دڵڕەقی تائەوپەڕ تاقیکردۆتەوە، گوتی «من مەیتەکانیان دەشارمەوە، یەکێک لە ئێوە بیانکوژێت». نزار لە شێرخان دەترسا، ئەو تا دوێنێ وەک نەیاری شۆڕش و پیاوی دەوڵەت ناوی ڕۆیشتبوو، ئێستا لەوە سڵیدەکردەوە شێرخان کوشتنی ئەم ژنانەی بکاتە مل و بەدبەختیبکات. ئێمە هەر سێکمان لە ناو ئەو تەپوتۆز و جەنگ و دڵڕەقییەدا گەورە بووبووین. هەر سێکمان یەکدیمان دەناسی. نزار لەو ساتەدا وەک شازدە ساڵ لەوەوبەری هاتبێتەوەیاد، وەک ئەو شەوەی هاتبێتەوەیاد کە لە دیوەخانەکەی ئاغادا من چیرۆکی غەمگینی خۆم گێڕایەوە، سەیریکردم و بێباکانە گوتی «هەڤاڵ جەنگیز.. بیانکوژە... تۆ بیانکوژە... وەک چۆن چەند ساڵ لە مەوبەر لیڤیتانت ئەسپەکانی لە پسمامان پێکوشتی. بەڵام دڵنیابە ئەمجارە بۆ خۆتی دەکەیت».
من موچڕکێکی سارد بە لەشمدا تێدەپەڕی، دوا ڕستەی دەیترساندم، دوا ڕستەی کوشندە بوو... وەک ئەوە بوو نزار قووڵ ناو ناخم ببینێت، بزانێت لەو ساڵانەدا چ دەردێک بە سەر دڵمدا هاتووە.

من چاوم دەنوقاند و دەمگووت «ئەی فریشتەی بەد، بزانە تۆ پێمدەکەیت».

ئێستا هەر چوار ژنەکە لە ژوورێکدا بوون. هەر چواریان ڕووتبوون، هەر چواریان بێدەنگ و ترساو سەیریان دەکردم. من وەک ئەو ڕۆژەی

لە پسمامان ئەسپەکانم کوشت، سارد و بێباک دەردەکەوتم، دەمویست دەستم نەلەرزێت، ئێستا جگە لە چاویان هیچی دیکەم نەدەبینی، دڵم بە خاوی لێیدەدا، هەناسەم ئارام بوو. چوار ژن بوون هەر یەکەیان لە سوچێکی ژوورەکەدا دانرابوون. من سەیرمدەکردن و بیرم نەدەهاتەوە لەگەڵ ئەمانەدا خەوتبم، ئێستاش نەمدەبینین، هەستمدەکرد لە خەودام، دەبوو بۆ ئەوەی زوو ئەو مۆتەکەیە بڕوات، زوو لە جەوری ئەم ساتە دەرچم، هەموو شتێک بە خێرایی تەواو بێت. دەمزانی نزار و شێرخان سەیرمدەکەن، دەمزانی ئەمانە وەک هەمیشە من دەخەنە ژێر ئەو تاقیکردنەوە قورسەوە بزانن من لەوانم یاخود نا... ئەو هەموو ساڵە لە جەنگدا بەس نەبوو بۆ ئەوەی تێبگەن من لەوانم... ئێستا دەبوو دووبارە بیسەلمێنمەوە.

هەناسەم لە خۆم دەبڕی، تفەنگەکەی دەستم بەرزدەکردەوە، دەمخستە سەر ناوچاوانی یەکەمیان، جگە لە چاوە ڕەشەکانی هیچی ترم نەدەبینی، لەو ساتەدا جگە لە سەیرکردنی ترسی ناو گلێنەی، هیچی دیم بۆ گرنگ نەبوو، ئەوەی رووتە، ئەوەی ژنە نەمدەبینی، بێئەوەی چاو بنوقێنم، بێئەوەی خۆم دەرخەم دوودڵم، تەواوی هەستی خۆم دەخستە سەر ڕاگرتنی هاوسەنگی دەستم و تفەنگەکە، کەمێک هەوام هەڵدەمژی، بۆنی عارەقەی ژنەکە بێزارتری دەکردم، یادی ئەسپە دێرینەکان کە لە نیگای ترساوی ئەوەوە هەڵدەقوولا توڕەتری دەکردم... بێئەوەی چاو بنوقێنم، پەنجەم دەنا بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەمدا... یەک... بێئەوەی چاو بنوقێنم، پەنجەم دەنا بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەمدا... دوو... بێئەوەی چاو بنوقێنم، پەنجەم دەنا بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەمدا... سێ... بێئەوەی چاو بنوقێنم، پەنجەم دەنا بە پەلەپیتکەی تفەنگەکەمدا... چوار.

من وەفای ڕەفعەت بەگ، ناسراو بە هەڤاڵ جەنگیز، بە کوشتنی چوار ژنی بێخەتا، دەرگام لە سەر ڕۆژگارێکی تازە دەکردەوە.

# ئاگر

دوای مردنـی ماردینیـا، دکتـۆر مسـتەفا شـوکاک ئیتـر نەگەڕایـەوە بـۆ بیمارسـتانی فریشـتەکان. خانمـی مەلەکبینیـش نیـازی نەبـوو زۆری لێبکات. بـوون و نەبوونـی دکتـۆر، ئێسـتا شـتێکی ڕاسـتەقینەی نەدەگـۆڕی، نـە دکتـۆر، نـە کەسـی دیش نەیاندەتوانـی کۆمـەک بـە فریشـتەکان بکـەن. لـە کۆتایـی پاییـزی سـاڵی ١٩٩٠ـەوە، کـە تارمایـی جەنگێکـی گـەورە تادەهـات نزیکتـر دەبـووەوە، میرائیلـی فریشـتە وای بڵاودەکـردەوە کـە مـرۆڤ بـەرەو کۆتایـی دەڕوات و دونیـا لـە بـەر دەرگای سـەردەمێکی نوێدایـە کـە جـۆرە بوونەوەرێکـی تـر تێیـدا حاکمـە، کـە تەنیـا بـە شـێوە و نـاو لـە مرۆڤـی پێشـین دەچێـت. میرائیـل ڕای وابـوو کـە ئـەو ڕەوتـە لـە مێـژە کەوتۆتـە گـەڕ و زەوی ئێسـتا سـەرهەڵدانی جانەوەرێکـی نوێـی دڕنـدە بەخۆیـەوە دەبینـێ کە شـتێکی کـەم لەگـەڵ ئـەو جنسـە دێرینـەدا کۆیدەکاتـەوە کـە سـەردەمانێک بەناوی«مرۆڤ»ـەوە لـە سـەر زەوی نیشـتەجێبوون. بولبولیـار زۆر شـەو لـە پشـت دەرگاکانـەوە خـۆی دەگـرت، ئاشـکرا دەچـووە نـاو گردبوونـەوە بچـوک و گەورەکانـی میرائیلـەوە، بـەڵام لەگـەڵ هەمـوو نائومێدیەکیشـدا دەرهـەق بـە مـرۆڤ نەگەیشـتبووە ئـەوەی بـڕوا بەقسـەی وەهـا بهێنێـت. مـرۆڤ هەمیشـە تێکەڵەیەکـی ئەبەدییـە لـە سـۆز و دڵڕەقـی، وایـە و هـەرواش دەمێنێتـەوە. بولبولیـار لـە دانیشـتنە شـەوانەکانی میرائیلـدا جگـە لـەوەی تـرس دایدەگـرت، هەسـتێکی تـری نەبـوو. ئێسـتا فریشـتەکانی وەک ئەندامانـی کۆمپانیایەکـی نهێنـی، باندێکـی نائومێـد دەهاتـە پێشـچاو کـە تادەهـات زیاتـر لـە شـێوەی مرۆڤـی شکسـت و بێداڵـدەدا دەردەکەوتـن نـەک فریشـتە . بـۆ یەکەمجـار لـە نزیکـەوە دەیڕوانـی و لێکچوونێکـی قووڵـی لـە نێـوان ئـەوان و مرۆڤەکانـدا

دەبینی... تا زیاتر نزیکبایەتەوە، تا زیاتر گوێی بگرتایە، ڕابمایە و بینواڕیایە، بە چاوێکی دی فریشتەکانی دەبینی. ئێستا هەندێجار وەک مرۆڤگەلێکی ترساو و تەنهای وەک خۆی دەیبینین کە تەنیا لە وەهمی یەکتردا باڵیان هەیە. هەیان بوو زیاتر لە مرۆڤ دەچوون و هەیان بوو کەمتر... مەهدائیل و میرائیل لە هەموو فریشتەکان لە مرۆڤ نزیکتر بوون. مەهدائیل لە کۆبوونەوەکاندا هەمیشە بە دوو چاوی ترساوەوە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، کە هیچی لە چاوانی ئەو فریشتە غەمخۆر و نەسرەوتە نەدەچوو کە ساڵانێک لەوەوبەر لە یەکێک لە کوچەکانی ئەم شارەدا ناسی، ئێستا بە جۆرێک ژاکاو و ترساو و غەمگین و سپی دەینواند بولبولیار نەیدەناسییەوە . تاکە شتێک لە مەهدائیلدا وەک جاران مابوو، سەردانەکانی بوو بۆ بیرۆی خانمی مەلەکبین، ئێستاش وەک جاران لە دەرگای دەدا و دەچووە ژووریٚ... لەویٚ دەمایەوە. هەندێجار لەگەڵ خانمدا دەنگەدەنگیان بەرز دەبووەوە، بەڵام بولبولیار هیچ کات نەیدەزانی لە سەر چی وا هەرا دەکەن، هۆی ئەو دەنگە دەنگە زۆرەیان چییە.

ئێستا هێدی هێدی بیمارستانی فریشتەکان خاڵی دەبووەوە. فریشتەکان دەمردن و فریشتەی نویٚ بە کەمی دەگەیشتنە بیمارستان... هەوڵەکانی بولبولیار بۆ ڕزگارکردنی فریشتەی زۆرتر سوودێکی ئەوتۆیان نەبوو، ترسی فریشتەکان لە روخساری ئادەمیانەی بولبولیار لەوە گەورەتر بوو، دەرفەتی گەورە بۆ ئەم گەنجە بکاتەوە ببێتە جیٚ متمانەی هەموو فریشتەیەک... بەڵام هەر شەوێک بگەڕابایە، لە زۆر جێگادا فریشتەی مردووی دەبینی، فریشتەی دەبینی لە جێگای جیاواز و لە کونجی جیاوازدا دەکەوتن و گیانیان دەسپارد. دەیبینین هیلاکی و سەرما و باران گۆڕیوونی بۆ بوونەوەری گرمۆڵە و هەڵهاتوو و بێبڕوا... هەستیدەکرد مردن جۆرە بەختەوەرییەکە بۆ ئەم فریشتانە. کە حاڵی ئەو فریشتە

نەخۆشانەی دەبینی، لە سوچی شەقام و لە کەلاوە دووردەست و لە بن درەختە ڕووتەکانی زستاندا خۆیان حەشاردەدەن و جگە لە چاوەڕوانی مەرگ هیچی دییان لە دەست نایەت، جگە لە مرۆڤ... جگە لە خۆی... جگە لە هەموو خەڵکی وڵاتەکە هیچی دی بەیادا نەدەهاتەوە.

لەگەڵ سەرەتای جەنگی ڕاستەقینەدا، جگە لە میرائیل و مەهدائیل کە دوو پیرترین فریشتەی کەشتییەکەش بوون، هیچ یەکێکی دی لە فریشتەکان توانای جوڵە و هەڵسوڕانی تەواوەتیان نەما. دەبوو بولبولیار یەک یەک بە سەریانەوە بگەڕێت و کەم کەم خواردنیان بکات بە دەمەوە و هەڵیانسێنێ و وابکات بجوڵێن و هەناسە بدەن... هەستیدەکرد زیندوێتی ئەم فریشتانەی ئێستا لە بیمارستاندا ماونەتەوە پەیوەندی بە توانای ژیان، یان بە خاوەنەکانیانەوە نییە، بەڵکو تەنیا پەیوەندی بە هێزی ژیان خۆیەوە هەیە، کە زۆرجار بەدەر لە خواست و ئیرادەی بوونەوەرە زیندووەکان، وەک ماشێنێکی تایبەت ناوەستێت و بێ گوێدان بە دڵی ئێمە لە سەر ڕیتمی خۆی دەڕوات. بولبولیار تا بهاتبایە زیاتر دەگەیشتە ئەو بڕوایەی ئەوەی ژیانی لە سەر زەوی ڕاگرتووە، دینامیکییەتی ئەو ماشێنەیە، ئەوەیە بێ گوێدانە بوونەوەران، بێ بایەخدان بە ویستیان، خۆی بە سەریاندا دەسەپێنێت... ئەوە تەنیا مرۆڤ نییە مەحکومە بە سزای ژیان، بەڵکو فریشتەکانیش، پەپولە و بولبول و پڵنگ و مێرولەکانیش، مەحکومن... لەوانەیە خودا خۆشی مەحکوم بێت.

بولبولیار هێدی هێدی هەستی بە نائومێدی خانمی مەلەکبینیش دەکرد، کە چیتر بەرگەی ئەو هەموو ماندووبوونە بەردەوامەی نەدەگرت. ئەوەی دەیبینی فریشتەکان دەمرن، مەلەکبینەکانی هاوڕێی دەڕۆن، کەشتییەکە خاڵی دەبێتەوە، تووشی دڵتەنگی و مەراق و بێخەویی کردبوو. زۆرجار دەچووە ژوورەکەی خۆی و نەدەهاتەدەرێ. هەندێجار بولبولیار بەو جۆرەی مەهدائیل فێریکردبوو، لەدەرگای دەدا و بە هێمنی دەچووە ژوورێ، بەڵام

خانمی وەها نوقم لە بێدەنگی و تەنهاییدا دەبینی، دەیزانی گەر قسەشبکات نایبیستێت. هەندێ شەو کە لە گۆڕ هەڵکەندن یان لە گەشتێکی دەرەوە، یاخود لە چاودێری فریشتە بیمارەکان دەگەڕایەوە، خانمی بە جۆرێکی قژ بژ و پەشۆکاو لە دالان و ڕیواقە درێژەکانی کەشتیدا دەبینی، بە خۆی و چرایەکەوە یان مۆمێکەوە وەک لە شتێکی نادیار بگەڕێت یان لە شوێنێکی دی گەڕابێتەوە، سەرگەردان و وێڵ دەردەکەوت. شەوێک بەر لە ڕاپەڕین، تەواو ژاکاو و پەرێشان، ماکسییەکی مۆری ماڵەوەی لە بەربوو، بچوک و ترساو وەک سەدان تارمایی ڕەش ڕاویان نابێت، بە چاوێکەوە پڕ لە ئاسەواری بێخەویی و گێژی و ڕاچەنینی پەیتاپەیتا بولبولیاری بانگکردە ژوورەکەی خۆی و پێیگووت «هۆشە گیان... یەک شتم لێتدەوێت، یەک شت. بەساقە، دەمەوێت هەموو ئەرشیفی کەشتییەکە، هەموو وێنەکان بگوازیتەوە بۆ جێگایەکی قایم... کوڕی خۆم، تۆ شوکور ئێستا مارکسی نەماویت. سوپاس بۆ خودا، من پارەت دەدەمێ... تێدەگەیت، پارەت دەدەمێ، بەدزی منەوە، بە دزی هەموو کەسێکەوە، جێگایەکی نهێنی دەگریت، ژێرزەمینێک یان هەر شتێک، لە هەر کونێک، بەقوربان تۆ خۆت متمانەت پێبێت. هەموو ئەرشیفی کەشتییەکە دەبەیت بۆ ئەوێ... هەر چی یادگارییەک من هەمە. هەر چی شتێک. ئەوە پارە... تێدەگەیت ئەوە پارە... تا سبەی یان دوو سبەی دەبێت هیچ شتێک لێرە نەمێنێت. بەس نابێت بهێڵیت هیچ ڕۆحلەبەرێک بەوە بزانێت. ئێرە دەبێت هیچی تێدا نەمێنێت، هیچ شتێک». بولبولیار هیچ شتێک لە خانم تێنەگەیشت. بەڵام وەک یەکێک فەرمانێکی نهێنی جێبەجێبکات، کارێکی گرنگ کە هاوڕێیەکی نزیک پێیدەسپێرێت دەبوو شتەکان جێبەجێبکات. هەموو دوو ڕۆژی دواتر بولبولیار تەواوی وزەی خۆی بۆ گواستنەوەی ئەرشیفی گەورەی کەشتیی فریشتەکان تەرخانکرد. وەک خانمیش خواستی، نەیهێشت هیچ کەسێک بە شوێنی نوێ بزانێت.

ڕۆژانی ڕاپەڕین خامۆشی و بێدەنگی باڵی بە سەر خانەی فریشتەکاندا کێشا... یەکەم ڕۆژی ڕاپەڕین کە بەعسییەکانی لە باکوور دەرپەڕاند، میرائیل لە ڕیواقی سەرەکی نهۆمی دووەمدا بولبولیاری لە بەردەم دەستشۆرەکاندا گرت و بەچپە پێیگووت « گوێبگرە. من دڵخۆشم سەردەمێکی وەها تاریک تەواو دەبێت، بەڵام دڵنیام هەموو ئەو مرۆڤانەی من بینیومن کاری جوانیان لێناوەشێتەوە... دڵنیام». وایگووت و بە ترسێکەوە گۆچانەکەی بەرە و پێش تەکانداو دوورکەوتەوە. دەنگی لە دەنگی یەکێک دەچوو نامەیەکی نهێنی لە دوورەوە هێنابێت، ڕەوانەکراو بێت، تەتەری غەیبێکی ڕەش بێت. پاش تۆزێک مەهدائیل بە باڵا بەرز و دێوئاساکەیەوە لە بەردەمیدا بوو، توند پەلیگرت، گەرچی فریشتەیەکی بیماربوو، بەڵام تا ئەو کات هەر بەهێزبوو، بە توندی بردییە لاوە و نوساندی بە دیوارێکەوە و گووتی «نەهێڵیت تێوە گلێیت، نەهێڵیت. جۆش و حەماسەتی کۆنت زیندوو نەبێتەوە. تۆ لەوانەیە تاکەکەس بیت بتوانیت بچیتە شوێنی من. تێدەگەیت». چاوانی مەهدائیل بریسکەیەکی قووڵ و نهێنیان تێدابوو. بەڵام لە ناکاو وەک پەشیمان بووبێتەوە، وەک دەستێکی تر لە ڕۆحیدا بەر گەروی گرتبێت، یەخەی بولبولیاری بەردا و گووتی «نا ببوورە، بڕۆ... بڕۆ... بۆ کوێ دەچیت بچۆ... چی دەکەیت بیکە... چی دەکەیت بیکە». ئێستا ترسێکی گەورە لە دەنگیدا بوو، بە دەنگێک دەدوا لە دەنگی مەهدائیلی فریشتە نەدەچوو، بەڵکو لە دەنگی مرۆڤێکی بێزار و بێئومێد دەچوو.

بولبولیار ڕۆژانی ڕاپەڕین پاڵنەرێکی گەورە پاڵی پێوەنا بڕواتەدەرێ و مرۆڤ لە جۆرە دۆخێکی وەهادا ببینێت. هەستیکرد ڕاپەڕین ساتێکە هەموو ناکۆکییە قووڵەکانی ناو مرۆڤی تێدا دەردەکەون... ئینسان بە هەموو ئیرادە و جوانی خۆیەوە لەوێیە، لە سەر سەحنەی گەورەی مێژوودایە، بەڵام هەمان شێوە ئینسان بە دیوە بێڕەحم و تەماحکارەکەشیدا

هەر لە سەر شانۆیە. مرۆڤ لەو ساتەدا دەتوانێت زنجیری هەزاران خەڵکی دیل بشکێنێت، بەڵام زنجیری نوێش دروستدەکات، کەماڵی مرۆڤ دەگاتە ترۆپکی خۆی، نزمی و نەویتی ئینسانیش دەگەنە نزمترین ئاستی خۆیان. مرۆڤ لە یەککاتدا بەرەو بەهەشت و بەرەو دۆزەخیش دەڕوات. هەم دەفڕێ و هەم بەردەبێتەوە. ئەو لە دڵەوە حەزیدەکرد بەشداری لە ڕاپەڕیندا بکات، بەڵام نەیدەزانی چۆن؟ سەخت بوو بەلایەوە قەبووڵیبکات کە ئازادی دەبێت بە جەهەنەمی تەقە و تاڵانی و سووتاندا تێبپەڕێت... ڕاستییەکی سادە کە هەموو کەس دەیزانی بولبولیار نەبێت. لە هەفتەی یەکەمی ڕاپەڕیندا دوو شتی کرد، تەلەفزیۆنێکی بۆ پیرێژنێک گواستەوە کە لە ئۆفیسی یەکێک لە پیاوانی دەوڵەتدا تاڵانیکردبوو، خۆی لەبەر پیری بۆی نەدەبرا، بولبولیار خستییە سەر شانی و تا ماڵی خۆی بۆی گەیاند. لە ڕۆژی دووەمیشەوە، ئەو دیوانە شیعرانەی شاعیران پێشکەشیانکردبوو، هەمووی هەڵگرت و خستییە سەر عەرەبانەیەک و بە سەر خەڵکی ڕاپەڕیودا کەوتە دابەشکردنیان، هەر هاوڕێیەکی خۆی بدیبایە تکایدەکرد دیوانەکانی خۆیان بهێنن، گرنگ نییە بە چ زمانێک بێت، گرنگ نییە هی چ شاعیرێک بێت، گرنگ نییە... گرنگ ئەوەیە مرۆڤ لە ڕۆژی وەهادا شیعر لە یاد نەکات، گرنگ ئەوەیە شتێک لە ڕۆحی شیعر لەم ساتەدا بژی. لە بەیانی ڕۆژی دووەمدا من بانگمکرد، من دەمانچەکەم نایە سەر سەری، من باوەشم پیاکرد، چاکەتێکی شینی کۆنی لەبەردا بوو، زۆر لاواز بوو، ڕیشی لە جاران درێژتر و ژاکاوتر بوو، بە منی گووت بمکوژە با لە فریشتەکەت ڕزگارت بێت، دەیزانی مرۆڤ و فریشتە چەند بێزارن لە یەک... دەیزانی. ئەو ڕۆژە کە جێیهێشتم و جیابووەوە، من زانیم خۆی مەخلوقێکی ونە، کەسێکە لە نێوان دوو دونیادا سەری لێشێواوە، بوو بوو بە بوونەوەرێکی بێماڵ، نە فریشتە بوو نە مرۆڤ. ئەو ڕۆژە کە سەیری چاویم کرد، لە ترۆپکی تەنهایی

و هەژاری خۆیدا بوو. هەفتەیەک لە سەر یەک دیوانە شیعرەکانی بەشکرد، بەڵام کێ لەو ساتەدا شیعری دەوێت؟. گەر کەسێک ئەو کتێبە کۆن و بێسوودانەی لێوەربگرتایە، بۆ خۆشی و پێکەنین بوو، زۆر کەس وەک ئاوارەی جێگایەکی تر دەیانبینی کە بە ڕیشێکی غەمگین و نیگایەکی بێدەنگەوە کەوتۆتە نێو کوچە و بازاڕ. شیعر لە مێژبوو مردبوو، شاعیرەکان لە مێژبوو مردبوون، هەتا خودی خاوەن دیوانەکان پێکەنینان بە کاری بولبولیار دەهات، ئەوە بەردەرگای سەردەمێک بوو دەشیا شاعیرانی پیاوچن، بەڵام شیعر خۆی نا. دەیبیست لە سەر مینبەرەکانەوە شیعریان دەخوێندەوە، بەڵام شیعرێک کە بووبوو بە خزمەتکاری تفەنگ، شیعرێک بووبوو بە نۆکەری سیاسییەکان، شیعرێک لە هەموو فەخری خۆی دادەبەزی بۆ ئەوەی خەڵک گوێی لێبگرن، ختووکەی هەموو هەستە نزم و سادەکانی دەدا، عاتیفەی هەرزانی دەفرۆشت، بۆ گوێگرێک وێڵ بوو تەنیا سیحری قافییە بیبات. شاعیرانی دەبینی کە تێکەڵ بەم سەردەمە نوێیە دەبن، بەڵام دوای ئەوەی لە سەر مینبەرەکانەوە خیانەت لە شیعر دەکەن. هەستیدەکرد ڕاپەڕین بە سەر بەعسییەکاندا، دەتوانێت لە دەرەوە هەندێک سیخوڕ و ئەشکەنجەچی بکوژێت، بەڵام هەستە خنکاوەکانی مرۆڤ، فریشتە کوژراوەکەی ژێر پێستی، دیوە ناکۆتاکەی ناخی لێرەدا، لە سەر ئەم سەحنە گەورەیەدا زیندوونابێتەوە. هەمووانی بینی لە مەراسیمی بە شکۆدا دەبنەوە بە کوڕی میللەت. لە جێگای خۆیەو، جێگای پیاوێکی تەنها کە تێدەگات شۆڕش شتێکە دەبێت لە ناو خەیاڵەوە بێتە دەرێ، پڕبێت لە بۆنی خەون، دەبێت بۆنی دڵی لێبێت، کشایەوە دواوە، لە ساتێکی قووڵی نائومێدی و غەمگینیدا، بە ئەسپایی کێشای بە سەری خۆیدا و گووتی «وای جیهان هەر وەکو خۆیەتی... مرۆڤ هەر وەکو خۆیەتی». شیعر وەک ئەو دەیویست و تێیدەگەیشت، شوێنێکی لەم سەردەمە تازانەشدا

نەبوو. هەستدەکەم لەوساتەدا بولبولیار، وەک هەموو ژیانی بۆ شتێکی ئەستەم گەڕاوە... بۆ ئاهەنگێکی گەردونی، بۆ لێبووردنێکی گەردونی، بۆ پاکبوونەوەیەکی گەردونیانەی ئینسان لە نمایشی درۆ، لە خۆدەرخستن، لە لووتبەرزی، لە خۆشەویستی بارکراو بە مەرج، خواستی بوو یەکجار خەڵکی ئەم شارە، یان خەڵکی ئەم وڵات و ئەستێرەیە پێکەوە، هەموو، سەرتاپا دەستبگرن و سوێندبخۆن کینە و تورەیی و توندوتیژی نەمێنێت... هیوایەک هەرکات بیری لێدەکەمەوە ناتوانم خەندە نەمگرێت و پێنەکەنم و نەڵێم وای بولبولیار کە گەنجێکی سادە و دڵپاک بوو.

هەفتەی یەکەمی ڕاپەڕین، تەنیا ئێواران دەگەڕایەوە بۆ کەشتیی فریشتەکان. هەواڵێکی لە ماجەرا و ڕووداوەکانی ناو کەشتی نەبوو، هەر کات دەگەڕایەوە لەدەرگای ئۆفیسەکەی خانمی دەدا و لە سەرەخۆ دەیکردەوە... زۆربەی کات، خانم بە جۆرێک لە تاریکی و بێدەنگی و بیرکردنەوەدا نوقم بوو بولبولیاری نەدەبینی، گەر بولبولیار چەند ڕستەیەکیشی بگووتبایە خانم ئەوانەشی نەدەبیست. دواتر بە هێمنی سەردەکەوت بۆ بیمارگەکان، ژوور بە ژوور دەگەڕا، هەمیشەش فریشتەیەکی مردوو هەبوو بینێژێت.

لە دوو هەفتەی یەکەمی ڕاپەڕیندا بیمارستان هێمن بوو، فریشتەکان بە دەگمەن لە ژوورەکانیان دەهاتنە دەرێ، هەتا میرائیلیش زۆربەی کات لە سەر تەختەکەی خۆی هەڵنەدەستا، بولبولیار هەستێکی هەبوو کە تەمێکی تەنک بەردەوام لە ژوور و داڵانەکانی کەشتیدا دەگەڕێت، بەڵام دروست نەیدەزانی چییە. لەو دوو هەفتەیەدا جگە لە فەیلەسوفی فریشتەکان کە بەردەوام دەیگووت «زانیم... زانیم... ئینسان شۆڕشی جوانی بۆ ئەنجام نادرێت... زانیم». فریشتەکانی دی هەموو کەمدوو و بێداوابوون، هەتا مەهدائیلیش هێمن و سەبوور و پیر دەردەکەوت، بەڵام نیگاکانی ترساوتر، قسەکانی لە چەند هەفتەی پێشوو ئاڵۆزتر

دیاربوون. بەڵام بولبولیار سەرنجی شتێکی سەیری دا کە لێی دڵنیا نەبوو، واهەستیکرد باڵەکانی مەهدائیل تادێت بچوکتر و بچوکتر دەبنەوە، چەند جارێک تکای تیاکرد باڵەکانی جارێک بە گەورەیی بۆ بکاتەوە. بەڵام مەهدائیل وەک لە ئاشکرابوونی نهێنییەک بترسێت هەڵدەهات و کاری وای نەدەکرد. بولبولیار جارێک لە خانمی مەلەکبینیشی پرسی «هەست ناکەیت، باڵەکانی مەهدائیل بچوک بوونەتەوە؟». خانم خۆی گەلێک سەرسام نیشاندا و گووتی «بەساقە، چی؟ بۆ باڵی هەیە؟ من ئەوەندە ساڵە دەیناسم و دەیبینم بیرمچۆتەوە کە هەر باڵی هەبێت». تۆنی قسەکردنی خانم شتێکی تێدابوو، بولبولیاری خستە دوو دڵییەوە، بەڵام چ جۆرە دوودڵییەک و بۆ؟ وەڵامی لا نەبوو.

دوای ئەوە بە دوو شەو کارەساتی هەرە گەورە ڕوویدا.

ئێوارە وەک هەمیشە هەموو شت لە کەشتیی فریشتەکاندا ئارام بوو. بولبولیار لەگەڵ دوو گەنجە گۆڕهەڵکەنەکەدا گۆڕێکی نوێیان هەڵکەند، هەندێک کێلیان گواستەوە، لە سەر چەند قەبرێک ناوی فریشتەکانیان نوسی و ساڵڕۆژی مەرگیان تۆمارکردن. ئێستا کەشتییەکە وەک کارمەند بەس ئەوانی تێدا مابوون، باغەوانەکانیش بە هۆی زستانەوە کەم دەهاتن. دواتر پیاسەیەکی بە ناو درەختەکاندا کرد، سەرەتاکانی بەهاری لە سەر لقی درەختەکان بینی، بەڵام هەستیکرد بەهارێکە هێندەی سروشت بەزۆر ناچاریکردوە دەرکەوێت، بە ئازادی و شادی خۆیەوە نەهاتووە. کە تاریک داهات، بە فانۆسێکەوە گەڕایەوە و یەک یەک سەری لە فریشتەکان دا، ئێستا بە ژمارە هەژدە فریشتەی بیمار و بێدەنگ بوون، سەردەمانێک بووە ژوورەکانی ئەو کەشتییە سەد فریشتەشی تێدا بووە، بەڵام وای ئێستا چ خاڵییە، چ غەمگینە، چ بێهودە و بێسوودە ئەم کەشتییە. یەک یەک لە سەریان وەستا و تەماشایکردن، بۆ هەندێکیان پێکەنی، هەندێکی جوان داپۆشین، دەستی لە ناوچاوانی هەندێکیان دا، ناسکانە

چاو و لێوی بۆ هەندێکیان سڕی. دوایی بە ئارامی هاتە خوارێ و چووە ژوورەکەی خۆی و لە سەر تەختی خەوتنەکەی ڕاکشا. پتر لە سەعاتێک لە تاریکییەکی قووڵدا تەنیا بیری لە پاشەڕۆژ دەکردەوە، پاشەڕۆژی خۆی نا، پاشەڕۆژ بە گشتی، پاشەڕۆژی هەموو شتەکان. بیری لەوە دەکردەوە گەر فریشتەکان بمرن چی بکات، بیری دکتۆر شوکاکی کرد، دوا ڕۆژەکانی ماردینیای بەیادا هاتەوە. ئەو پرسیارە بە خەیاڵیدا ڕۆیی کە دەبێت من «مەڤاڵ جەنگیز» چیم بە سەر هاتبێت، ئەم ڕۆژانەی ڕاپەڕینم چۆن بردبێتە سەر؟ ئاخۆ لیڤیتانت گەڕاوەتەوە بۆ شار، نەغەدە ماردینی دەبێت لە چ جۆرە ژیانێکدا بژی؟ هەستیکرد لە ناخەوە بیری خانمی ماردینی دەکات، بیری شیعرە کۆنەکانی دەکات. بەڵام ئەو بووبوو بە ژنێکی بێباک، هۆشەنگیش نەیدەتوانی لە کەسانی بێباکەوە نزیک بێت.

بەدەم ئەوجۆرە خەیاڵانەوە کە زۆر شەو بە ناخیدا تێدەپەڕین، خەوی لێکەوت.

بە دروستی نازانێت کەی هاواری یەکێک لە کوڕە گۆڕهەڵکەنەکان بە ئاگای هێنایەوە. کەسێک لەو دیوەوە پەنجەرەکەی دەشکاند و دەیقیژاند و هاواری لێ دەکرد زوو بێتەدەرێ، بۆ چەند چرکەیەک سەراسیمە و حەپەساو بوو، هەستیکرد دوکەڵێکی زۆر سەنگین لە ژوورەکەدا نیشتووە، بە پڕتاو بەرەو دەرگاکە تەکانیدا، کە دەرگاکەی کردەوە، بڵێسەی ئاگری بینی لە هەموو سوچ و کەلێنێکی کەشتییەکەوە دەردەچێت، بە ناو دوکەڵدا بەرەو ژوورەکەی خانم بازیدا، دەرگاکەی کردەوە، بەڵام دوکەڵ بە جۆرێک خەست بوو هیچی نەبینی... تاریکییەکی خنکاو و ئەنگوستەچاو لەوێ بوو، کڵپەی ئاگرەکان هێشتا وانەبوون ئەم ژوورە چەپەک و داخراوە ڕۆشنبکەنەوە. چەند جار هاواریکرد و بە ناو دوکەڵدا خۆی گەیاندە سەر جێگاکەی ڕێزان و دەستی لێدا، شوێن خەوی خانم بەتاڵ بوو. بە هەمان خێرایی شێتانە بەرەو پلەکانی نهۆمی دوو

تەکانیـدا، بـەڵام ئاگرەکـە وەهـا بەهێزبـوو تـەواوی جێگاکـەی گرتبـووەوە... کەشـتیی فریشـتەکان لـە هەمـوو لایەکـەوە دەسـووتا. بڵێسـە لـە هـەر سـوچێکەوە ناڵـەی دەهـات... بـە نـاو دوکەڵـدا تەکانیـدا بـۆ بـاڵا، بـەڵام شاڵاوی ئاگرەکـە وەهـا بەهێـز بـوو گێڕایـەوە بـۆ دوا... چەندیـن جـار تەکانـی دا سـەرکەوێت و ئاگر نەیهێشـت، هەسـتیکرد خۆشـی دەخنکێت، هەسـتیکرد گێـژ دەبێـت، چەنـد جارێـک وەختبـوو بکەوێـت و بخنکێـت، بـۆ هەڵمژینـی هـەوا دەبـوو بـەرەو دەرەوە بـڕوات... لـە دەرەوەڕا قـەوارەی خورافیانـەی ئـەو ئاگـرەی بینـی، ئاگرێـک هیـچ بوونەوەرێـک لێیدەرنەدەچـوو. زمانـەی کڵپـە لـە هەمـوو پەنجەرەکانـەوە دەهاتـەدەرێ، نێڵـە نێڵـی ئاگرەکـە بۆیەکـی جەهەنەمـی دەدا، تینـی گەرماکـەی بولبولیـاری داغدەکـرد. بـە دوو چـاوی سەراسـیمە و پـڕ فرمێسـک و تـا ناکۆتـا کـراوەوە تەماشـایکرد، نەیدەزانـی چـی بـکات. بـۆ سـاتێک هـات بـە خەیاڵیـدا بـڕوات و لەگـەڵ فریشـتەکاندا بسـووتێت. بـەڵام کـوڕە گۆڕهەڵکەنـەکان گەیشـتنە نزیکـی، چوونـە ژێـر باڵـی و ڕایانگـرت و نەهێشـتیان بـڕوات و نەهێشـتیان بکەوێـت. وەک ئـەو سەرسـامبوون، توندگرتیـان، خۆشـحاڵبوون کـە بولبولیـار دەرچـووە، ئـەو جارێکـی تریش ویسـتی بـەدوای خانمـی مەلەکبینـدا بڕواتـەوە ژوورێ، بـەڵام دوو گۆڕهەڵکەنەکـە نەیانهێشـت، هیـچ بوونەوەرێـک نەیدەتوانـی لـە نـاو ئـەو دوکـەڵ و کڵپـە و بڵێسـەیە دەرچێـت. کەشـتی بـە فریشـتەکانەوە دەسـووتا و دەبـووە خاشـاک و هیـچ هێزێکیـش نەبـوو فریاییکەوێـت. تـا بەربەیـان ئاگرەکـە بـەردەوام بـوو، تـا شـتێک هەبـوو بسـووتێت سـووتا. لـە نزیکـی بەیانـدا، ورده ورده خامۆشـبوو، بینایەکـی ڕەش و خاڵـی جێهێشـت، وەک ئـەوەی ئـەم جێگایـە لـە شاردا نەبێـت، وەک ئـەوەی تـەواوی ئـەم کەشـتییە وەک خـودی فریشـتەکان نەبینراوبێـت، ئـەو ئاگـرە گـەورەیـە سـەرنجی هیـچ مەخلوقێکـی لـەم شـارەدا ڕانەکێشـا. کـە ئاگرەکـە بەشـی ئـەوە هێوربـووەوە مـرۆڤ نەسـووتێنێت، هـەر سـێکیان چوونـە نـاو بینـای کەشـتییەکەوە، لـە

نهۆمەکانی سەرەوەدا هەموو شتێک سووتا بوو. پاشماوەی پەیکەری فریشتەکان و خۆڵەمێشیان لە سەر تەختی ئاسنینی خەوەکانیان کەوتبوو... لە ژوورەکەی میرائیلدا خۆڵەمێشەکەی میرائیلی بینی و بە سەریدا گریا، بەڵام لە هیچ جێگایەک ئاسەواری لاشەی مەهدائیل یان خانمی مەلەکبینی نەدۆزییەوە. هەردووکیان وەک بووبێتن بە گەرد ئاسەواریان نەبوو.

کە هۆشەنگی بولبولیار لە ناو پاشماوەی ئەو دۆزەخە دەرچوو، بێویستی خۆی سەرمای بوو و دەگریا، هەستیکرد زۆر نەخۆشە. بێئەوەی بتوانێت باش خۆی بە پێوە بگرێت، خۆی گەیاندە سەر شەقامێکی نزیک و خۆی گرت تا تاکسییەک هات، خاوەن تاکسییەکە لەو شۆفێرە زۆر بلێیانە بوو کە بەردەوام باسی کەمی و گرانی بەنزین دەکەن... بولبولیار توانای قسەکردنی نەبوو، سەرسام سەیری شۆفێرەکەی دەکرد و نەیدەبیست. دیمەنی ئاگرەکەی شەو بەردەوام لە سەریدا بوو، هەستیکرد گێژە و تای لێدێت. خۆی گەیاندەوە غەمپاشا، گەڕەکی منداڵی خۆی، گەڕەکی هەژارییەکی پاک و بێسنوور و نەبەدی، گەڕەکی ئەوانەی هەمیشە لە هەموو جەنگێکدا هەموو شتێک لەدەستدەدەن، کوچەی ئەوانەی هەمیشە دەدۆڕێن. گەر ئەو بەیانییە بۆنی کوچەکەی غەمپاشای نەکردایە، دەمرد. چووە ماڵی یەکێک لە دۆستە نزیکەکانی کە دەمێ ساڵ بوو لە ژێر زەمینەکەیاندا داڵدەی دەدا، لەوێ چووە ژێر پێخەفێکی ئەستوور و سەرتاپای گیانی دەلەرزی... بولبولیار بیمار بوو، بیمارییەک ترس و سەرسامی پێکەوە دروستیدەکەن. بۆنی بە خۆیەوە کرد، بۆنێکی تایبەتی لێدەهات، بۆنی خۆڵەمێشی فریشتەکان. ئێستا نەتوانای بیرکردنەوە، نە توانای خەیاڵی نەبوو... تاکە شتێک لە ڕێگایەوە دەیتوانی هەستبکات زیندووە، سەرسامی بوو... چاوانی گەش کردبووەوە و سەرسام بوو، لەوەش زیاتر توانای هیچ کارێکی دیکەی نەبوو.

# مرۆڤ بوونەوەرێکی دوو کەرتە و هیچی دی

گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. ئەو ژوورەیماڵی شوعلە خان کە بەشی زۆری ساڵانی هەشتام تێدا بردبووە سەر. سەیری کاتژمێری دیوارەکەم کرد، سەعات٨ ی شەو بوو. شوعلەخان و منداڵەکانی کەسیان لەوێ نەبوون، دەرگای ژوورەکەمم داخست و کلیلەکەیم لە جێگایەکی مەحکەمدا قایمکرد. دڵنیابووم ئەو دێت... هەستم پێدەکرد. ئەو سڕبوون و کپ بوونە گەورەیەی جێگای گومان بوون، دەمزانی گەر بگەمە جێگای دڵنیایی، بگەمە ئەو شوێنەی دڵنیابێت دەتوانێت لە ناوەوەڕا لەتمبکات، دێتەدەرێ. دڵنیابووم فریشتەکەی ناو ڕۆحیشم بوونەوەرێکی شەڕانگێزە... هیچ بوونەوەرێکی ناشەڕانگێز لە گەردوندا نییە، هێند هەیە هەندێک بە هۆ شەڕانگێزن و هەندێک بێهۆ، هەندێک لاوازن و ناتوانن شەڕانگێزبن و هەندێک بەهێزن، هەندێک لەزەت لە شەڕانگێزی دەبەن و هەندێک نا، هەندێک کە جارێک شەڕانگێز دەبن دەیانەوێت دووبارەیبکەنەوە، هەندێکی دیش نا، بەڵام هەبێت مەخلوقێک لە سەر زەوی و مەلەکوتدا هەرگیز شەڕانگێز نەبێت، هەرگیز ئازار دروست نەکات، مەحاڵە. زۆرجار تەنیا ئەوەی زیندووین، ئەوەی لە سەر ئەم ئەستێرەیە دراوسێی ئەوانی دیین، خۆ بەخۆ دەبێتە ژانی هاوسێکانمان... فریشتەکانیش وەک ئێمە، وەک شەیتان، بوونەوەرێکی شەڕانگێزن... دڵنیابووم لێبوردەیی ئەوانیش، لە سنوورێکدایە. من کە گەیشتمە ژوورەکەی خۆم و دەرگاکەم داخست، هاوارم لە فریشتەکەم کرد «تۆ ئەی فریشتەی سەبورم، گەر بە ڕاستی فریشتەیت، لێمببورە». هاوارێک بوو لە ناخی دڵمەوە دەهات. من چەند سەعاتێک لەوەوبەر چوار ژنی بێگوناهم کوشتبوو، ئەتکمکردبوون،

سـواریان بووبـووم، لـە ئامێزیانـدا نوتفـەی بـەدی خـۆم ڕژاندبـوو. بـەڵام گـەر داوای لێبـوردن بکـەم و نەتوانێـت بمبورێـت چ جـۆرە فریشـتەیەکە... چ جیاوازییەکـی لەگـەڵ قازییەکـی دادگادا هەیـە؟. فریشـتە چـۆن دەبێتـە فریشتە گـەر نەیکرێـت لـە گوناهـە گەورەکانمـان ببورێـت؟ گـەر سـزامان بـدات؟. مـن لـەو سـاتەدا هەسـتمکرد لـە هـەر کات زیاتـر پێویسـتیم بـە کۆمەکـی ئـەو فریشـتەیەی نـاو ڕۆحمـە. لـەو ڕۆژەوەی لـە سـەر ئـاوی ئـەو چەمـە مەلعونـە باڵەکانـی خـۆم بینـی، دەمزانـی دەگەمـە سـاتێک هاواربکـەم «تـۆ گـەر بـە ڕاسـتی فریشـتەیت... بمبەخشـە». بـەڵام دڵنیابووم سنووریکم بڕیوە کـە ئیدی هیـچ فریشـتەیەک دەسـتی پیامـدا ڕانـاگات، پێـم خسـتۆتە سـەر خاکێـک کـە گەڕانـەوەی تێـدا نییـە... چـوار ژنـی بێگوناهـم کوشـتبوو، بێئـەوەی بزانـم چیـین، بزانـم کێـن، بزانـم ژنـی کـێ بـوون، چەنـد منداڵیـان هەیـە، سـەر بـە چ نەتەوەیەکـن، ناویـان چییـە. چـوار مرۆڤـم کوشـتبوو، وەک چـوار ئـاژەڵ... چـوار لـە جوانتریـن مەخلوقاتـی ئـەم سـەر زەوییـەم بـێ هیـچ هـۆ و بەهانەیـەک، بـێ هیـچ ناسـینێکی پێشـوەخت، بـێ هیـچ کینەیـەک لـە نێوانمانـدا کوشـتبوو... ئـەوە چ فریشـتەیەکە بتوانێـت ئـەو گوناهـە قەبووڵبـکات، بـەڵام ئـەی ئـەوە چ فریشـتەیەکە نەتوانێـت قەبووڵیبـکات.

تـا ئـەو سـاتە فریشـتەکەم بـە ڕوونـی دیـار نەبـوو، هـاوارم لێکـرد «ئـەی فریشـتەی بـەد بـۆ ناڕۆیـت.. بـۆ». هەسـتمکرد ڕاچەنـی، پـاش تۆزێـک لـە ئاوێنەکـەدا بینیـم باڵەکانـم عـارەق و خوێنـی لێدەتکێـت... سـوێند دەخـۆم بـە خـودا و بـە مـرۆڤ، بـە سروشـت و خالیقـە دیـار و نادیـارەکان. باڵەکانـی خـۆم بینـی کراونەتـەوە و تنـۆک تنـۆک ئەشـک و خوێنیـان لێدەتکێـت... بەجـۆرێ ژێـر قاچـم، وەک گومێـک لـە ئـاو و خوێنـی لێدەهـات. کـە ئـەوەم دی وەک داڵێکـی کەچەڵـە و نەخـۆش کەوتـم بـە زەویـدا. چەنـد تەکانێکـی ترسـناکم خـوارد... مـن بـە پاڕانـەوەوە گوتـم «گوێبگـرە ئـەی فریشـتەکەم... وەک چـۆن مرۆڤـی تـەواو، شـەیتانی تەواو بوونیـان نییـە، فریشـتەی تەواویش بوونی

نییە... مەرۆ. لە بەرئەوەی رۆحم پێویستی پێتە». ئەو توندتر ڕاچەنی، بە هەموو هێزی خۆی باڵەکانی بەرزکردەوە و بەرەو دوا منی ڕاکێشا. من هاوارمکرد و کەوتم، هەستم بە ئازارێکی ترسناک کرد لە هەناومدا، وەک یەکێک هەموو ئەندامەکانی لەشمم پارچە پارچە لەگەڵدا بەشبکات، ئازاری چەقۆیەکی بڕند و تیژ لە سەروەڕا بە هەموو جەستەمدا تێپەڕی. ویستم لە گەروومەوە خوێن هەڵبێنمەوە، بەڵام جۆرە شلەیەکی بۆندارتر و پیستر بەر گەرووی گرتم و ناو زگمی لە ناوەوە ڕاتەکاند و ڕشامەوە... لە سەر چیچکان کەوتم وەک یەکێک هەر پیسییەک بە هەموو ژیانی نۆشیوێتی دووبارە ڕادەستی دونیای بکاتەوە، ڕشامەوە. بەڵام فریشتەکەم بێڕەحمانە بەرزیکردمەوە و بە هەموو توانای خۆی تەکانیدام، دڵنیابووم ئێستا گەیشتۆتە جێگایەک کە ئیتر گرتن و گێڕانەوەی ئەستەمە، بۆ ساتێک ویستم لە ژوورەکە هەڵبێم، ویستم دەرگاکە بکەمەوە و بڕۆمە دەرێ، بەڵکو هەوای پاکی دەرەوە پەشیمانیبکاتەوە، بەڵام وەک یەکێک دوا گورزی خۆی بوەشێنێت، منی سوڕاندەوە و بە جۆرە تەکانێکی ئەفسانەیی باڵەکانی ڕاتەکان و وەک باڵندەیەکی خورافی بڕیاریدابێت قەفەزە ئاسنینەکەی بشکێنێت، منی بەدەمدا خست و خۆی ڕاپسکاند، هەستم بە باڵە درێژەکانی دەکرد دەیدا لە بنمیچەکە، دڵم وەک تەپڵێکی مەست و دێوانە بێ هیچ هارمۆنییەک لێیدەدا، ددانەکانم لەیەک دەخزان و جیرەیان دەگەیشتە گوێم، وەهابوو وەک سەرم کەوتبێتە ژێر فشاری ئامێرێکی سەنگین و هێزێکی کوشندە ملم لە بێخەوە بابدات، بەڵام لە هەمانکاتدا هەستمکرد شتێک خاومدەکاتەوە. لە ناکاو هەموو شتەکان لە پێشچاوم سپی دەبوون، وەک ئەوەی تەواوی ژوورەکە تەمێکی چڕ گرتبێتی. هەستم بە فرمێسکێکی زۆر دەکرد بەرچاوم دەگرێت... دەمویست شتێک بڵێم، بەڵام هەستێکم هەبوو کە چیدی زۆر درەنگە و کاتی قسە بە سەرچووە، شتەکان لەدەست مندا نەماون و بۆ ئەبەد تێپەڕیون. هەستمدەکرد

هێدی هێدی خوێن لە لەشمدا دەوەستێت و چیدی ناسوڕێتەوە، وەک هەڵمێکی سارد بە سەر روخسارمدا بێت، فێنکییەکی کتوپڕ دایگرتم، وەک ئەوەی ئاوی چەمێکی سارد بدات بە روومدا، ساردییەکی نەرم، بێئازار هێوریدەکردمەوە، فێنکی ساردبوونەوەی رۆح، فێنکی لە هۆشخۆچوونێکی قووڵ... وەک بە نەرمی دابەزین لە تونێلێکی سارد و تاریکەوە بۆ بنی جێگایەکی نادیار.

بێهۆش بووم... گەورەترین دەردی مرۆڤ ئەوەیە کە ناتوانێت کەی ویستی وریابێت و کەی ویستی بێهۆش. بێهۆشی تەنیا دەروازەی راکردنی من بوو، دەمزانی هەموو ئەوانەی فریشتەکانیان دەترازێن، بێهۆش دەبن. دوای سێ سەعات بێهۆشی بە ئاگا هاتمەوە، کە چاوم هەڵهێنا و کاتژمێری دیوارەکەم بەرامبەر خۆم بینی، نزیکی یازدە و نیوی شەو بوو. نەمدەزانی چی بووە، وەک ئەوە بوو بەنجێکی قورسم پێدرابێت و دوای خەفەبوونێکی درێژ لە ناکاو، بێهیچ پلەبەندییەک، هوشیاریی تەواوم وەبەرداهاتبێتەوە... نازانم ئاخۆ ئەوەتان ئەزموونکردوە یاخود نا، گەڕانەوە لە بەنج و بێهۆشییەوە بۆ وریایی، هەمیشە هاوڕێی ئازارێکی نهێنی و تیژە... وەک ئەوەی ئۆرگانەکانت، سینەت، بۆشاییە گەورەکانی نێو هەناوت ئەو گەڕانەوەیە قەبووڵ نەکەن، شتێک لە ساردی کوشندە، لە ئارەزووی قووڵ بۆ دووبارە بێهۆشی داتدەگرێت، ئارەزووییەکە ئەمجارە هێندەی ئارەزووی جەستە خۆیەتی، ئارەزووی عەقل نییە... من سەرەتا هەستم بەو سەرمایە کردەوە، سەرمای یەکێک لە ژوورێکی گەرمدا خەوتبێت و لە ناکاو لە بەفر و گێژەڵووکەیەکی زستانەدا بێداربێتەوە. وەک هەوایەکی ساردی نادیار کە لە دەلاقەیەکی ترسناکی ڕۆحی خۆتەوە بێت وەهابوو. بێئەوەی بیربکەمەوە چاوم لێکنایەوە، هەستمکرد هۆشی یەکەمجارم هۆشێکی درۆزن بووە، ئێستا کە چاو لێکدەنێم و هەست بەو ساردییە دەکەم، بە ڕاستی هوشیارم... بەڵام بەوەدا هیچ بیرم لە

ساتەکانی پێش بێهۆشیم نەدەکردەوە، ئەوە نیشانەبوو، دەلیلێکی گەورە بوو بۆم کە هێشتا بێهۆشم.

وەهابوو وەک لە ژێر بەردێکی سەنگینەوە هەستم. هێزێکی زۆرم ویست تا چاو بگێڕم و ژوورەکەی خۆم بدۆزمەوە، هەستمکرد تەواوی دونیا لە نێو مندا ونبووە، ساتێکی سەختە مرۆڤ ناچاربێت لە هۆشی خۆیدا بۆ خۆی بگەڕێت، دڵنیابێت ئەوەی هەستی پێدەکات خۆی نییە، بەڵکو شەپۆلێکی بێناوەڕۆک و بێماهییەتی ژیانە کە دەشێت بە بەری هەر ئاژەڵێک، هەر گورگێک، هەر مشکێکدا تێپەڕێت. یەکەم شت هەستم پێکرد، سەنگی ئەو بۆشاییە گەورەیە بوو لە سەرم، سەنگی هەڵنەگیراوی ئەو سووکبوونە سامناکە کاتێک لە ناکاو هەستدەکەیت هەموو کێشی خۆت لەدەستداوە. سەنگی ئەوەی تێدەگەیت هەستت بە ژیان، لە هەستێکی ترسناک بە بۆشایی جیا نابێتەوە.

تا نەمبینی هۆشم نەهاتەوە خۆم، فریشتەیەکی گەورە و سپی و رووت بوو. لە سوچێکی ژوورەکەدا کزەڵەی کردبوو و دەنگی هەناسەی لە دەنگی هەناسەی نەخۆشێک دەچوو تازە گەیشتبێتە بیمارستان، خێرا، بەرز، پچڕۆک. نەمدەزانی دەمبینێت یان نا، وەک یەکێک بیەوێت هیچ نەبینێت، هیچ نەبیستێت، هیچ بۆن نەکات سەری خستبووە ناو کۆشی خۆی. سەرداخستنی، وەک سەرداخستنی کەسێکی غەمگین نەبوو، نیشانەی ئازارێکی قووڵ بوو، تۆرانێکی ئەبەدی لە خودی خۆی و لە دونیا. باڵەکانی زۆر گەورە بوون، شێوەی پێست و خۆ گرمۆڵەکردنی لە منداڵێکی ساوا دەچوو، لە مەلێکی گەورە کە بە گەردەلوولێکی تەڕدا گوزەریکردبێ و لەو سەر بن پەڕ، لە شەپۆلانی باران دەرچووبێت، چەند دڵۆپە خوێنێکی گەورە بە باڵەکانییەوە بوو، دیاربوو لە ترازاندا زۆر ئازاری خۆی داوە. جگە لە دەنگی هەناسەی، دەنگی دیکەی لێوە نەدەهات. سەیرمدەکرد و دەمزانی ئەوە فریشتەکەی منە، ئەوە هەمان ئەو باڵە دێرینانەیە

کە چەند ساڵە لە ڕۆحمەوە سەری کێشاوە... ئێستا بۆ یەکەمجار فریشتەیەکی راستەقینەم دەبینی... تەنیا فریشتەیەک کە شایستەیە هەموو مرۆڤێک بیری لێبکاتەوە و بیبینێت. فریشتە نهێنییەکەی ناو ڕۆحی خۆمان، فریشتەیەکی ماندوو، کە نەخودا ناردبووی، نە ڕەوانەکراوی هیچ جێگایەکی دیکەبوو، نە پەیامێکی پێبوو، نە هیچ شتێک... فریشتەیەک بوو وەک چۆن ڕۆح لە ناوماندایە، وەک چۆن خەیاڵ لە ناوماندایە، وەک چۆن ئایدیا و حەزەکان لە ناوماندان، وەک چۆن وشەکان لە سەرماندا دێن و دەچن و دەبن بە نوسین، وەک چۆن هەستەکان بە نهێنی لە ژێر پێستماندا هاتوچۆدەکەن، وەک چۆن چاو لێکدەنێم و هەستدەکەم جگە لە تیشکی خۆر روناکییەکی نهێنی لە ناخمدایە، خۆرێکی ناوەکی نەبینراو لە دڵمدایە، وەک ئەو گێژەڵووکە سامناکانەی ناو دەروون کە نازانین باکەی لە کوێوە دێت، وەک ئەو بروسکە نهێنییانەی ناو سەرمان کە لە ئاسمانەوە دانابەزن و لەوێوە چەخماخە نادەن، وەک عەشق کە لەتماندەکات و نایبینین، ئەویش بەوجۆرە لە ناوماندایە. ساڵەهای ساڵ لەگەڵ مندا گەورەبووبوو، ئەو بەشەی وجودم بوو لە هەر جێگایەکدا گووتبێتم «ناچارم... ناچارم، بەم ڕێگایەدا بڕۆم». پێیگووتووم « نا بوەستە ناچار نیت». نازانم ڕەنگە ڕەوانەکراوی ئاسمان بووبێت تا هەموو ئەو هەڵە و کەموکورتیانەی لە دروستکردنی مندا تێیکەوتووە ڕاستیبکاتەوە... مرۆڤ ئەم ئامێرە شکاوە کە دەبوو تاجی بوونەوەران بێت، بە جۆرێک بەدبەخت و پڕ هەڵە و نەگونجاو بۆ ژیان خولقاوە، پێویستی بە فریشتەیەک بووە، وەک میکانیکییەکی مەلەکووتی، فیتەرێکی خودایی تا راستیبکاتەوە، چاکسازێکی ڕۆح، ڕیفۆرمسازێکی ئیلاهی کە لە دەرگاکانی مرۆڤ دەدات و ئێمە ناتوانین دەرگای بۆ بکەینەوە، چونکە تازە زۆر درەنگە... بەڵێ ناتوانین بۆی بکەینەوە، چونکە دەزانین ئەوەی عاشقی فریشتەکەی خۆی بێت، دڕندەکان دەیخۆن. لەوانەشە ڕەوانەکراوی

ئاسمان نەبێت، لەوانەیە فریشتەکانی سەر کەشتییەکەی خانمی مەلەکبین راستیان گووتبێت، هیچیان جگە لە ناخی مرۆڤ ماڵێک و جێگایەکی دیان بۆ بوون نەبێت. وای لە من وای... باوەشم بە فریشتە نەخۆشەکەمدا دەکرد و دەگریام... وای لە دەردی من... وای. دەمزانی ئەم مەخلوقەی ئامێزم، ئەم پارچەیەی بوونم، ئەم نیوە بیمارەی رۆحم، رەوانەکراوی هەموو ئەو ئازادییانەیە کە نەمتوانی بەکاریانبهێنم، رەوانەکراوی هەموو ئەو جوانیانەی دونیایە کە نەمتوانی بیانبینم، رەوانەکراوی هەموو ئەو خۆشەویستییە کوژراوانەیە کە دەکرا من بیانبەخشم و نەمبەخشین، رەوانەکراوی هەموو فریشتە کوژراوەکانی دیکەی ناو ناخی مرۆڤەکانی دیکە بوو، رەوانەکراوی تاریکییەکانی مێژوو بوو، رەوانەکراوێک بوو هەرگیز نەگەیشتبووە رۆحی من، لە رێگا باریک و تاریکەکانی ژیانی مندا گەورەبووبوو، بێئەوەی بتوانێت بگاتە سەر عەرشی رۆحم، بێئەوەی بتوانێت ئەو جانەوەرەی ناوم دەستەمۆبکات، بێئەوەی نەخنکێت و وێڵ نەبێت و بێکارە لەگەڵمدا پوچێتی زیندەگی رانەکێشێت. ویستبووی من بەرەو پلەیەکی باڵاتر لە کەماڵ بەرزبکاتەوە و نەیتوانیبوو، ئەندازیارە غەمگین و شکستەکەی رۆحی خۆم بوو، ویستبووی لە من کەسێکی دی و لە ماڵی ژیانم باڵەخانەیەکی تر دروستبکات... شتێکی تر لە من بسازێنێت... بەڵام نەیتوانیبوو، وەک هەموو شکستخواردوە شەریف و بڵندەکان، وەک هەر قارەمانێکی راستەقینە بڕیاریدابوو بمرێت... لە بەرچاوی من بمرێت.

من ئامێزم پیاداکرد و گووتم «نابێت بمریت.. تۆ منیت.. نابێت بمریت». وەک برایەکی زامدار باوەش بە براکەیدا بکات باوەشی پیاکردم... دەستی هێنایەوە بە دەوری گەردنمدا و بە دەنگێکی زۆر کز گووتی «وەفا». پێشتر هیچ کەس بەوجۆرە بانگی نەکردبووم، وەک بڵێت ئەمە تۆیت، وەک بڵێ لە مێژە دەمەوێت دەموچاوە راستەقینەکەت ببینم، لە مێژە دەمەوێت تێبگەیت من لەگەڵتدام. بەڵام بە جۆرێک

ماندووبوو، سەری خستەوە سەر سنگم و وەک بۆ ساتێکی پشوو بگەڕێت بێدەنگ بوو. هەستم نەکرد، فریشتەبێت یان شتێک، دووانەیەکی پێکەوە نوساوبووین و ئێستا دەترازاین... لە بری ئەوەی خودا یان پزیشکە لێزانەکان لێکمان جیابکەینەوە، خۆمان چەقۆمان دەنایە گۆشتی خۆمان و بە ویستی خۆمان لە یەک جیادەبووینەوە و بۆ ئەبەد دەترازاین.

باوەشم پیاکرد و هەڵمگرت، وەک من سەری ڕووتاوە بوو، گوێکانی لار و داکەوتوو، هەموو شتێکی لە من دەچوو، ئەوە نەبێت سافتر و ڕۆشنتر و هێمنتر دەینواند... نیگای پاکییەکی تێدا بوو، لە مێژبوو ئەو پاکییە لە مندا مردبوو، پێستی وەک پێستی کەسێک بوو هەرگیز خۆری نەدیبێت... ئاسەواری وەرزە جیاوازەکانی دونیای لە سەر نەبوو، ئاسەواری تۆزی زەمینی لە سەر نەبوو. من بە گریانەوە پێمگووت «بۆ بەجێتهێشتم». ئەو بەنەرمی باوەشی پیاکردم و گووتی «وای... وای». خستمە سەر جێگاکەی خۆم و گووتم «من بەجێتناهێڵم. ئەی فریشتەم». بەڵام بۆ ئێستێک لێم گۆڕا و نەمزانی من فریشتەم و ئەو مرۆڤە یاخود بە پێچەوانەوە من مرۆڤم و ئەو فریشتە، یاخود شتەکان تێکچوون... بە جۆرێک هەم مرۆڤ و هەم فریشتە پێکەوە مردون و جگە لە دوو مەخلوقی ئیفلیج هیچی دی بەجێنەماوە، دوو مەخلوق کە نە مرۆڤن، نەفریشتەن، نە شەیتان... هێند هەیە زیندون و جەوری ژیان ڕادەکێشن، ژیانێکی ڕووت کە کورتدەبێتەوە بۆ ئازارێکی دوور و درێژ، بۆ نوقمبوون لە هەموو هونەرەکانی پوچیدا. وەک ئەوەی مرۆڤ لە ناوەوەڕا بووبێتە کۆمەڵێک بوونەوەری جیاواز و بۆ ئەبەد یەکێتی دێرینی خۆی دۆڕاندبێت، بووبێتە کۆمەڵێک پارچەی شکاو، کە هیچ پارچەیەک لە پارچەکانی دەنگی ناگات بەوانی دی.

***

دە ڕۆژ پێکەوە لەو ژوورەدا ماینەوە، ئەو دە ڕۆژە، خۆم وەک بیمارێکی سەخت نیشاندا و لە ژوورەکەم نەچوومە دەرێ. بەردەوام لە ئامێزم دەگرت، سەریم دەنایە سەر کۆشم و قسەم بۆ دەکرد، هەندێ جار بە دەنگێکی نووساو هەندێک شتی دەگووت، دەمزانی باسی دڵڕەقی من دەکات، بەڵام هیچ کات بە ڕوونی تێنەدەگەیشتم دەڵێت چی. دەیویست بمرێت، دەیویست لێم دووربکەوێتەوە، دەیویست نەیبینم و نەمبینێت، بۆ ئەوە ترازابوو بڕوات و تەنیا لە کوچەیەکدا دواجار بە تەنیا سەیرێکی ژیان بکات و تێپەڕێت... بەڵام من بڕیارمدا هەموو شتێک بکەم نەمرێت، مرۆڤ کەمجار فریشتەکەی خۆی دەبینێت، مرۆڤ کەمجار پارچە شکاوەکەی خۆی دەبینێت، کەمجار درزە ترسناکەکانی ناخی خۆی هەست پێدەکات. کەمجار وەک من دەتوانێت بیگرێتە ئامێز و قسەی لەگەڵدا بکات. دواتر زانیم ئەوانەی فریشتەکانیان ترازاون، بەشی هەرەزۆریان توانای بینینی فریشتەکەی خۆیان نەبووە، نە بەزیندوویی و نە بە مردوویی. دیاربوو، من وەفای ڕەفعەت بەگ، مەخلوقێکی دەگمەنم، ئەوەی دەتوانم فریشتەکەی خۆم ببینم و باوەشی پێدابکەم، ئەوە نەفرەتێکە ڕێکەوتی هەموو کەسێک ناکات، بەڵام سوپاس بۆ خودا و هێزە یاوەرەکانی من بەر ئەو نەفرەتە کەوتبووم. دواجار ئەوم بێدەنگ لە پێخەفەکەیدا بەجێهێشت. وەک شێت ڕۆیشتمە دەرێ تا بە دوای بولبولیاردا بگەڕێم. سەیربوو، بولبولیارم لە هیچ جێگایەک نەدۆزییەوە... گەرچی دڵنیابووم لە شاردایە، بەڵام نەمدەتوانی بیدۆزمەوە.

ئاشکرابوو هێدی هێدی ڕاپەڕین بەرەو شکست دەچێت، گرتنی تەواوەتی کەرکوک لەلایەن خەڵکی ڕاپەڕیوەوە ڕووبەڕووی بەرگرییەکی توندی هێزە فاشیستییەکان دەبووەوە. من لەوساتەدا بۆم گرنگ نەبوو دونیا چی بە سەر دێت، بەڵام پەیوەندیم بە نزار ئیدریس و هەڤاڵ شێرخانەوە کردەوە، بۆ ئەوەی لە گەڕاندا بەدوای بولبولیاردا

کۆمەکەمبکەن، هەوڵەکانی ئەوانیش بێسوودبوو، سەروسەکوتی بولبولیار ونبوو، چەندەم کرد هەواڵێکم لێنەبیست و لە جێگایەکەوە ئاماژەیەکی ئەوتۆم نەهاتەدەست... من بەر لەڕەوە گەورەکە، بەرلەوەی هێزەکانی دەوڵەت بگەڕێنەوە و خەڵک بە کۆمەڵ لەشار هەڵبێن، ڕۆژانم بە گەڕان لە دوی بولبولیار و شەوانم لەگەڵ فریشتەکەمدا دەبردەسەر. کاروباری شۆڕش و حیزبم، تەنیا وەک شتی لابەلا و بێبایەخ سەیردەکرد، هێندەی مردنی تەواوەتی فریشتەکەم دەیترساندم، گەڕانەوەی فاشیستەکان موچڕکیان پێدا نەدەهێنام و لەرزیان نەدەنایە جەستەم. ترسناکتر لە فاشیستە دەرەکییەکان، ئازاری ئەوەبوو کە لە ناخمدا فاشستێکی ڕەها بێهیچ بەزەیی و ڕێنماییەک بژی و بێتەدەر، من دڵنیابووم گەر هۆشەنگ نەدۆزمەوە، زیندوو ڕاگرتنی فریشتەکەم کاری مەحاڵە. فریشتەش وەک هەر بوونەوەرێکی دی زیندوو ڕاگرتنی هونەری خۆی هەیە. من شەوان وەک منداڵ لە تەنیشت خۆمەوە دەمخەواند، هەستم پێدەکرد هەندێجار باوەشم پێدادەکات، دەستەکانی لە دەستی من زۆر نەرمتر و سووکتر بوون، تادەهات دەنگی سافتر و ڕوونتر دەبووەوە، بەڵام تا زیاتریش لە من ورد دەبووەوە غەمگینتر دەبوو، ئارەزوویەکی قووڵی مردنم لە چاویدا دەخوێندەوە، بێزارییەکی هەمیشەیی لە هەر شتێک بۆنی ئەم ژیانە دزێوەی لێبێت.

لە ڕۆژانی دواتردا، ژیان لە شاردا پڕبوو لە ترس و ئومێد و خورافەت، هێزەکانی دەوڵەت لە باشوور بە جۆرێکی دڕندانە شۆڕشگێڕە شیعەکانیان تێکشکاند، ئەوە هەم ترس و هەم خولیای خورافیانەی لە شاری ئێمەدا دروستکرد. شاری ئێمە لەو شارانەیە کە هێندەی ترس بینیوە، گەر بەخورافەت ڕووبەڕووی نەبێتەوە ناتوانێت بەرگەی مێژووی خۆی بگرێت... مرۆڤەکانیشمان بەبێ خورافەت بەرگەی ژیان ناگرن. ژیان دەردێکە تەنیا لە ڕێگای ئەفسانەوە تەحەمولدەکرێت، گەورەترین

دەرمانێـك مـرۆڤ بـۆ دەردی بچوكـی و ناچیزیـی خـۆی دۆزبیێتـەوە، ئەفسـانەیە، ئەوەنـدەی ئەفسـانە مرۆڤـی لـە فەوتـان و نابووتـی ڕزگارکـردوە، هیـچ زانسـتێک ئـەو کارەی نەکـردوە. بـەر لـە شکسـتی تەواوەتـی ڕاپەڕیـن ئەفسـانەی شکسـتی گـەورەی هێزەکانـی دەوڵـەت بـە دەسـتی پێشـمەرگە بـە جۆرێکـی بێمانـا شـاری تەنیبـوو، مرۆڤـەکان لـە ڕێـگای درۆوە ئومێدیـان بـە خۆیـان دەدا، دەنگـۆی گرتنـی سـەرانی گـەورەی دەوڵەتیـان بـە دەسـتی پێشـمەرگە بڵاودەکـردەوە، بـەڵام نـزار ئیدریـس ئـەوکات لـە مـن باشـتر لـە ڕەوتـی شـتەکان ئاگاداربـوو، بەمنـی گـووت هەڤـاڵ جەنگیـز تـۆ ناسـاغیت، تەندروسـتیت بـاش نییـە، بـەر لـەوەی بـارودۆخ تـەواو بگاتـە جێگایەکـی بـەد و نالەبـار، نەبـا تووشـی دۆخێـک بیـت لەبـەر خراپـی تەندروسـتیت نەتوانیـت شـار جێبهێڵیـت، بەقسـەم بکـە و بـڕۆ لـەم شـارە، لـە دەرەوەی شـار بنکەیـەک دابنـێ. مـن سـەرەتا ئـەوەم بـە ترسـنۆکی و هەڵهاتـن زانـی، ڕاسـتە هیـچ کات خـۆم وەک دلاوەرێکـی گـەورە و جوامێرێکـی ئەفسـانەیی نەبینیـوە، بـەڵام هەمیشـە هەڵهاتنـی ترسنۆکانەشـم پـێ شـەرم بـووە. بـەڵام دەنگوباسـە ڕاستەقینەکان کـە لـە کەرکوکـەوە دەگەیشـتن پێکـڕا ئامـاژەبوون بـۆ کۆتاییەکـی غەمگیـن و تراژیدیانـەی ڕاپەڕیـن. مـن بیـرم لای ئـەوە بـوو گـەر سـەرتاپای شـار لـە نـاکاو هەڵبێـت، گـەر سـەدان هـەزار کـەس بـە پڕتـاو و بـێ هیـچ ئامادەکارییـەک شـار جێبهێڵـن، دەبێتـە کارەسـاتێکی گـەورە، لەوانەیـە لـەو شـلۆغی و جەنجاڵییـە بێسـەروبنەدا فریشـتەکەم بمرێـت... دوو شـەو بـەر لـە گەورەتریـن هەڵهاتـن لـە مێـژووی کـۆن و نوێـی خۆرهەڵاتـدا، مـن فریشـتەکەم سـوار ماشـێنێکی تایبـەت کـرد و گەیاندمـە نـاو کۆنـە خانوویەکـی فەرامۆشـکراو، لـە دۆڵێکـی چەپەکـی نزیـک سـنوور، خانوویەکـی داکەوتـووی گوندیانـە، لـەو ماڵـە داتەپیوانـەی چەنـد ساڵێکە ئادەمییـەک پێـی تێنەخسـتوون، ئـەو دەم کوردسـتانی وێـران پڕبـوو لەوجـۆرە خانووانـە کـە لـە سـەردەمی ڕاگوێزانـە گەورەکانـەوە جێمابـوون. لـەوێ جێگایەکـی

تایبەتم بۆ فریشتەکەم خۆشکرد و دەرگام لە سەر کڵۆمکرد و بە نیازی گەڕانەوە هاتم بگەڕێمەوە بۆ شار، بەڵام شەپۆلی ڕەوکەران لە شارەوە ڕێگای گرتم و سەفەری پێچەوانەمی وەستاند. لەڕێگا هەندێک لە ئەندامانی ئەنجومەنی باڵام بینی کە لە پێش خەڵکەوە بەرەو سنوور هەڵدەهاتن، ئەوان داوایان لێکردم لیژنەیەکی ڕێکخستن و سەرپەرشتیکردن بۆ خێوەتگەیەک لە سەر سنوور دابمەزرێنم. من لە ناو ئەو کارەسات و جەنجاڵییەدا تەنیا شتێک خەیاڵم لەلای بوو، فریشتەکەم بوو... دڵنیابووم تا دڵنەرم و باش بم، ئەو زیاتر دەژی... زیندەگی ئەو وابەستەی ڕۆحی من بوو، کە لە قووڵاییدا هۆ و سۆنگەیەکی نەمابوو چیتر لەگەڵ دونیادا باش و میهرەبان بێت. لە بەر فریشتە بیمارەکەم کەوتمە خزمەتکردنی ڕەوکەران، بە بڕیارێکی باڵاتر سەرپەرشتی کاروباری ئەوانم گرتە دەست و کەوتمە زەمینەسازی تا بیماران و نەخۆشان بە خێراترین شێوە بگەێنینە ئەو دیو سنوور... دواجار... لە چادرێکی شیندا، ڕێکەوتی «هۆشەنگی بولبولیار»م کرد. ئەو ڕۆژە بە ڕیشێکی درێژەوە «سەمبولی ئەبەدی شۆڕشگێڕان» لە ژێر ئەو چادرەدا لە دەست دەردێکی نادیار دەیناڵاند، نیوەهۆش لە سەر دۆشەکێکی سپی ڕاکشابوو، یەکێک بە چەند بەتانییەکی ئەستوور داپۆشیبوو... یەکێک بە چەند بەتانییەکی ئەستوور داپۆشی بوو... یەکێک... داپۆشی بوو. ئەو دەبوو نەمرێت، ئەو تەنیا کەس بوو بتوانێت فریشتەکەی من و لەوانەیە نەسلی فریشتەکانیش لەم شارەدا ڕزگاربکات، بەڵام خۆی بە جۆرێک لاواز بوو، بە ئەندازەیەک لە مردوو دەچوو، ئێستا بەر لە هەر فریشتەیەک پێویستی بە ڕزگارکردن بوو. من کە لەگەڵ خۆمدا گەیاندمەوە بیمارستانی مەریوان، هیچم نەدەزانی، نەمدەزانی کە کەشتی فریشتەکان سووتاوە، نەمدەزانی چارەنوسی مەهدائیلی فریشتە و خانمی مەلەکبین نادیارە. تەنیا شتێک دەمزانی ئەوە بوو فریشتەکەم بە بێ

بولبولیـار دەمرێـت. دڵنیابـووم زیندوێتـی فریشـتەکان وابەسـتەی مانـەوەی مرۆڤـە جوانەکانـە لـە سـەر زەوی، هـەر کاتێکیـش کەسانی وەک هۆشـەنگ لـە سـەر زەوی نەمـان، ئـەو کات ئیتـر فریشـتەش نامێنێـت... بـەڵام ئێسـتا هۆشـەنگ لـە بەردەممـدا دەمـرد، وەک شۆڕشـگێڕێکی خورافـەت پەرسـت و ئەبـەدی چـاوە بیمارەکانـی لێکدەنـا و خـۆی بـۆ مـردن ئامادەدەکـرد. مـن تونـد دەسـتیم دەگـرت و پێمدەگـووت «هۆشـەنگی بـرام مەمـرە... هۆشـەنگی بـرام مەمـرە». ئـەو دەنگـی لێـوە نەدەهـات... تونـد دەسـتیم دەگووشـی و دەمبینـی دەسـتەکانی ساردن، هەڵدەسـتام و بەڕیواقێکـی درێـژدا رامدەکـرد... بـەرەو ژووری پزیشـکەکان رامدەکـرد و هاوارمدەکـرد... رامدەکـرد و هاوارمدەکـرد... ڕامدەکـرد و هاوارمدەکـرد... دەمزانـی ڕاکردنـی مـن ڕاکـردن نییـە بەڕیواقـی بیمارسـتانێکی دووردا، دەمزانـی تەنیـا هـاواری ترسـاوی پیاوێـک نییـە کـە چەندیـن ساڵە بـە ئـاگا و بێئـاگا، ئـەم بیمـارە ڕەنگـزەردە دەپارێزێـت کـە نـاوی هۆشـەنگی بولبولیـارە، بەڵکـو ڕاکردنـی دێوانەیەکـی گەورەیـە، ڕاکردنـی مەسـتێکی بەدکارە، لـە سـەردەمێکەوە بـۆ سـەردەمێکی تـر. مـن دەچوومـە بەردەمـی ژووری دکتـۆرەکان و هاوارمدەکـرد «فریامکـەون، هۆشـەنگ دەمرێـت». هاوارەکـەم لـە هـەوادا، لـە شـەودا، لـە ڕیواقـی گـەروی گریـاوی خۆمـدا دەنگیدەدایـەوە... مـن دەمزانـی ئـەوە بولبولیـار نییـە دەمرێـت، بەڵکـو منـم، ئێـوەن، ئەوانـی تـرن... لـەو ساتەدا بولبولیـار بـۆ مـن سـەمبولی هەمـوو فریشـتە کوژراوەکانـی سـەر زەوی بـوو، تونـد لـە دەرگای ژووری پزیشـکەکانم دا و گووتـم «بولبولیـار دەمرێـت... دەمرێـت». بـەڵام هیـچ کـەس دەرگای نەکـردەوە، هیـچ کـەس... دڵنیابـووم ئـەو ساتە ساتی کۆتاییـە، ساتێکە جیهـان خاڵێـک لـە سـەر هێڵـی خـۆی دادەنێـت و پێماندەڵێـت «بوەسـتن».

مـرۆڤ دەبێـت هەمیشـە پشـوویەکی درێـژ بـدات بـۆ ئـەوەی بیربکاتـەوە، چۆن لەگـەڵ فریشـتەکەی خـۆی و فریشـتەی ئەوانـی تـردا ڕەفتاربـکات، مـن

هێنده هاوارمدەکرد و هێند توند دەرگای پزیشکەکانم دەکوتا، بێهۆش دەبووم. لەو ساتەدا کە گێژدەبووم و دەکەوتم و سەرم دەیدا بە کاشی زەمینی بیمارستانەکەدا، دەمزانی کە هۆشم دێتەوە، لە سەردەمێکی دیکە و زەمانێکی دیکە و جیهانێکی دیکەدا بە ئاگادێمەوە. بەڵام چ سەردەمێک و چ زەمانێک و چ جیهانێک، ئەو کات ئەستەم بوو هیچی دەربارە بزانم... کە کەوتم و گوێم لە دەنگی لەشی خۆم بوو دەکەوێتە سەر زەوی بیمارستانەکە، دڵنیابووم پێویستیم بە پشووە... پشوویەکی درێژ... زۆر درێژ... پشوویەک تێیدا بتوانم وێرانی دونیا و وێرانی نیشتیمان و وێرانی خۆم لە بیربکەم. ئەوە یەکەمجارم بوو لەزەت لە بێهۆشی بەرم، لەزەتێکی قووڵ، بەتامتر لە لەزەتی ژیان و لەزەتی مەرگ. بەر لەوەی تەواو ئاگام لە خۆم نەمێنێت، بەر لەوەی باوەش بۆ تاریکی و بێدەنگی بکەمەوە، هاوارمکرد «وای چ جوانیت... چ جوانیت... چ جوانیت... ئەی بێهۆشی».

## کۆتایی کتێبی یەکەم